# کورتەیەک لە مێژووی فۆلکلۆری کورد

**دکتۆر مەولود ئیبراهیم حەسەن**
**کۆلێجی زمان - زانکۆی سەلاحەددین**

لە سەرەتاوە کە (زمان) پەیدابوو، بەرە بەرە لەگەڵ زمان (فۆلکلۆر)یش دروست بووە، لەدوای داهێنانی ئەلف و بێی نووسین وردە وردە (ئەدەب)ی نووسراویش سەری هەڵدا، ئەمانە هەمووی بەرهەمی کۆمەڵ و گۆڕانکارییەکانی کۆمەڵی مرۆڤایەتین. ئەگەر ئەم سەرەتایە گشتییە و بۆ هەموو کۆمەڵگایەک وەک یەکە، ئەوا زمان و فۆلکلۆر و ئەدەبی کوردیش لەم یاسایە بەدەر نییە! ئەمانە هەمووی بەرهەمی مرۆڤ و کۆمەڵگای مرۆڤایەتین. (مرۆڤ) و (کۆمەڵگا)یەکەشی بەرهەمی (زەمەن) و (گۆڕانکارییە)کانن. زاناکان بەپێی تیۆر گەشەکردن و خوێندنەوەی مێژووی مرۆڤ زەمەن و رۆژگارێکی دوور و درێژ بۆ گۆڕانکارییەکان دادەنێن، ئێمە لێرە تەنیا پێویستمان بە مێژووی پەیدابوونی زمان هەیە، کە لەدواو لەنێو پەیدابوونی (زمان) ئەوانەی تریش مێژووی خۆیان دەدەنە دەست.

زاناکان زۆربەیان لەسەر ئەوە کۆکن کە سەرەتاو ماوەی پەیدابوونی زمان لە نێوان (١٥٠,٠٠٠) سەد و پەنجا هەزار ساڵ تا (٣٠,٠٠٠) سی هەزار ساڵ پێش زایین دروست بووە، ئەم زەمەنەش زەمەنی مرۆڤی (نیاندەرتاڵ)ە، لەو زەمەنەشدا مرۆڤ لە ئەشکەوتی (شانەدەر) ژیاوە و پاشماوەی بەجێ ماوە، کەواتە زمان بەرهەمی سەردەمی ژیانی نێو ئەشکەوتە و هەر ئەو زەمەن و شوێنەش واتە نێوان (١٥٠,٠٠٠-٣٠,٠٠٠) ساڵ پێش زایین و ئەشکەوتی شانەدەر زەمەن و شوێنی سەرهەڵدانی فۆلکلۆر و هەموو بەشەکانی فۆلکلۆرە، هەروەها چۆن زەمەن و شوێنی زمان و فۆلکلۆرە، ئاواش زەمەن و شوێنی سەرەتاو سەرهەڵدانی ئایین و فەلسەفە و زانستیشە! چونکە ئەمانە هەمووی بەرهەمی کارکردنی جەستەو بەکارهێنانی هێزی دەماغە. ئەگەر زەمەنی (مێژوو) لەگەڵ داهێنانی نووسین دەست پێدەکات و زەمەنی (ئەدەب) دوای داهێنانی نووسین! ئەوا زەمەنی فۆلکلۆر بەدەیان هەزار ساڵ پێش داهێنانی نووسین و داهێنانی ئەدەبی نووسراوە.

زاناکان بەکنەکردن لەنێو (ئەشکەوتی شانەدەر) بەسەر خەزێنەیەک و ئەرشیفێکی کۆن و دەوڵەمەند و گرنگی مرۆڤایەتیدا کەوتن. ئێستا ئەم ئەشکەوتە، تەنیا ئەشکەوتێکی کوردستانی نییە! بەڵکە ئەشکەوتێکی جیهانییە و بنەما و کەرەستەی زۆر بۆچوون تیۆری زانستییە. ئەگەر زاناکانی جیهان، شانەدەر بە ئەشکەوتێکی بەنرخ و کۆن و دەوڵەمەند بزانن، ئەوا پێویستە لێکۆڵەرانی کوردیش بتوانن خوێندنەوەی تایبەتی خۆیان هەبێ، بۆ زانیارییەکانی نێو ئەم ئەشکەوتە، گرنگییەکی ئەم ئەشکەوتە لەوەدایە، ئەگەر پێش ١٥٠,٠٠٠ هەزار ساڵ شوێن و ماڵی کۆبوونەوەی مرۆڤ بووە، هەر ئێستاش، چ ئێستای

سالانی پشكنین و هەڵكۆڵین واتە سالی (١٩٥١- ١٩٦٠) لەسەر دەستی زانایانی وەک (رالف سۆلیكی) و (رۆز) ج ئێستای نووسینی ئەم بابەتە، ئەم ئەشكەوتە هێشتا هەر ئاوەدانە و جێگای ژیانی مرۆڤە، ئەو مرۆڤانەی لە سەرەتاوە تا ئێستا ئەم ناوچەیان چۆڵ نەكردووە و بەردەوامیان بەژیان و بەگۆڕانەكانی ژیان داوە. ئەم ئەشكەوتە وەک كورەیەكی گەرمی بەرهەم هێنی ژیان، بەردەوام كاری كردووە و ژیان و بەرهەمەكانی ژیانی بەرهەم هێناوە، لە نێو ئەو بەرهەمانەش زمان بەرهەم هاتووە، كە دەتوانین بە (زمانی شانەدەرییەكان) ناوزەدی بكەین. ئەگەر دەقێكی ئەو زمانەمان بۆ بەجێ نەمابێ، ئەوا بێشک بۆن و بەرامەی ئەو زمانە هاتووەتە نێو زمانەكانی دوای خۆی، كە لە قۆناغی دووەمدا دەتوانین بە زمانی زاگرۆسییەكان ناودێری بكەین. تا ئێستا ناوی زمانەكان بەناوی (شوێن)ی گرووپەكانەوە ناودەنرێ. دواجار كە (هۆز) و (نەتەوە)ی جیا جیا پەیدا دەبن، كە ئەم ناولێنانەش لەسەر دەستی سۆمەرییەكان پەیدابووە، چونكە زاناكان دەڵێن: سۆمەرییەكان یەكەمین كەس بوون ناویان بۆ گروپەكان دانا. لەگەڵ ناوی هۆز و نەتەوەی خۆیان زمانەكەشیان هەر بەم ناوانە ناودەنرێن، فۆلكلۆر كە بەرهەمی بیركردنەوە و زمان بەكارهێنان و كاركردنی سەردەمەكانی خۆیەتی، دەربڕی جۆری ژیان و بیركردنەوە و كاركردن و بەكارهێنانی كەرەستە و ئاوێتەكراوی خەیاڵە. هەر بۆیە لەنێو ئەم پێكهاتەیەی فۆلكلۆردا وێنە و مانای زەمەن و شوێنی ژیان دەدۆزرێتەوە، بۆ نموونە ئەگەر بەوردی لێكۆڵینەوە لە فۆلكلۆری تەواو كۆكراوەی خۆماندا بكەین، دەتوانین بەرهەمی سەردەمی ژیانی (راو) و (ئەشكەوت) و (گوند) و (شار)، (بەرهەمی دارستان) و (مەڕداری) و (جووتیاری) و (پیشەسازی) زەمەنە جیا جیاكان لەنێو فۆلكلۆری كوردیدا لێک جیا بكەینەوە. ئەمەو لە كاتێكدا نابێ ئەوە لەبیر بكەین كە ئەشكەوتی شانەدەر و زنجیرە چیاكانی زاگرۆس و وڵاتی كوردستان كۆزی سەرهەڵدان و پێگەیشتنی میللەتی كوردن. میللەتی كورد ئەگەر بەشێوەیەكی گشتی بەرهەمی بەردەوامی ژیانی ئەو مرۆڤانەیە كە لە شانەدەرەوە كۆمەڵیان پێكهێناوە، ئەوا ئەم بەرهەمە هەمەجۆر و هەمەڕەنگی تێكەوتووە و هۆز و نەتەوەكان زمانی تایبەت بەخۆیان و فۆلكلۆری تایبەت بەخۆیان بەرهەمهێناوە، بەڵام ئەم زمان و فۆلكلۆرە تایبەتە لێک دوور و لێک دابڕاو نەبوونە، هەر ئێستا زاناكانی زمان پەیوەندی جۆراو جۆر و زۆر و كەم لەنێو ئەم زمانانەدا دەدۆزنەوە، ئەو زمانانەی كە هێندەیان بەخت هەبووە بەر رۆژگاری داهاتنی نووسین بكەون و دەقی جۆراو جۆریان لێ تۆمار بكرێت. ئێمە لێرە مەبەستمان ئەو زمانانەیە، كە دواجار دێنەوە نێو زنجیرەی مێژووی زمانی كوردی و هەر زمانە و وێنەی ئەڵقەیەک ئەو زنجیرە دوور و درێژە پێكدەبەستێتەوە! ئەگەر ئەڵقەكانی پێش زایین بەزمانی مردوو دەناسرێن و زانستی زمانناسی زمانە كۆنەكان بەمردوویان ناودەبات، ئەوا لە ئەڵقەكانی دوای زایین بە(زار) لەهجە ناودەبردرێن. هەر بۆیە زمانی ئێستای كوردی بەرهەمی ئەو زمانە مردووانە و ئەم زارە زیندووانەیە كە ئێستا لەناوچەی شانەدەر و زنجیرە چیاكانی زاگرۆس و تەواوی وڵاتی كوردستان قسەی پێ دەكرێ و بەزمانێكی گرنگ و زیندووی هەموو مرۆڤایەتی دەناسرێ.

ئەم زمانە تەمەن درێژە، واتە زمانی كوردی زمانێكی یەكجار دەوڵەمەندە بە فۆلكلۆر و بەرهەمە جیاجیاكانی فۆلكلۆر، ئەگەر لەو دەوڵەمەندییە تەنیا مەبەست فۆلكلۆری كۆكراوەی چەند سەد ساڵێكی ئەم دواییانەی ئەم میللەتەیە، ئەوا زۆر لەوە دەوڵەمەندتر دەبێ، ئەگەر فۆلكلۆری زمانە مردووەكانی بێنێتە سەر! ئەو زمانە مردووانەی ئەڵقەی گرنگی زنجیرەی ئەم زمانە زیندووەن!

كەواتە دواجار ئەگەر لەڕووی تیۆرییەوەش بێت دەگەینە ئەو قەناعەتە، كە فۆلكلۆری ئێمە لەسەردەمی زمانی شانەدەرییەكانەوە دەست پێدەكات و لەسەردەمی زمانی زاگرۆسییەكان بەردەوام دەبێت و دواجار دێتە نێو و زمانی هۆز و نەتەوەكانی وەكو سۆمەرییەكان و خورییەكان و سۆبارییەكان و لولوبییەكان و گوتییەكان و كاشییەكان و میتانییەكان و نا

ئیرییەکان و ئورارتییەکان و میدییەکان و کاردۆخییەکان و ساسانییەکان دواجار لەگەڵ هاتنی ئیسلام قۆناغێکی تری زمانی کوردی دەست پێدەکات و لەم قۆناغەشدا فۆلکلۆر لەزار و بنزارە جیا جیاکانی زمانی کوردی بەردەوام بەپێی جۆری ژیانی ناوچەکان و ئایین و کلتوورەکان بەرهەم دێت.

نابێ ئەم تەمەنە درێژ و قۆناغە جیا جیایانەی فۆلکلۆری کوردی بە شتێکی خەیاڵی بزانین، ئەگەر لێکۆڵینەوەی زۆر ورد لەنێو دەقە کۆن و جۆراو جۆرەکانی فۆلکلۆری خۆماندا بکەین و شارەزای ژیانی سەردەمەکان بین، کەم و زۆر بەرهەمی سەردەمە جیا جیاکانمان بۆ روون دەبێتەوە. ئەگەر ناسینەوەی بەرهەمی (مەڕداری و جووتیاری و پیشەسازی) ئاسان بێت، ئەوا ناسینی بەرهەمی سەردەمی (راو و ئەشکەوت و گوند و شار)یش زەحمەت نییە! هەروەها لەنێو فۆلکلۆردا، بەرهەمی تام و بۆگرتووەکانی ئایینە جیاجیاکان، ئەوانیش لەنێو دەقە فۆلکلۆرییەکان دەست دەکەون.

ئێستاکە دەرکەوت مێژووی فۆلکلۆر لەگەڵ مێژووی دروست بوونی زمانە، ئەوا فۆلکلۆری کوردیش هەر ئەو مێژووەی هەیە. فۆلکلۆری بەرهەمی بیرکردنەوە و کارکردنی مرۆڤە. کە مرۆڤیش بەردەوام ژیانی لە (گۆڕان)دا بووە، فۆلکلۆریش بەگشتی بەر گۆڕان کەوتووە، بۆ نموونە: ئەو (گۆتە) و (پەند)ەی مرۆڤ لەسەردەمی (راو)دایهێناوە، پاشتر لە (نێو ئەشکەوت) بە شێوەیەکی تر دەری بڕیوە، هەر ئەو پەندە لەسەردەمی (گوند)دا بەر گۆڕانێکی تر کەوتوو و کە هاتۆتە (شار)یش خۆی لەگەڵ شاردا گونجاندووە، ئەم یاسایە کەم و زۆر هەموو بەشەکانی فۆلکلۆری گرتۆتەوە. ئەوە هەیە فۆلکلۆر لەگەڵ ئەم گۆڕانکارییە بەردەوامەدا بەگشتی دەستی لە هەندێ بنەماو پێکهاتە کۆنەکانی خۆی بەرنەداوە. ئەگەر گۆتەی (دەڵێی: پیرێژنی دۆ لێرژایە) بۆ کەسێک بەکاربێنین کە زۆر بلێ و بەگۆتە گۆت بێ ئەو گۆتەیە هی سەردەمی مەڕداری بێت، ئەوا دواتر لەشار و دوای پێشکەوتنی زانست و تەکنەلۆجیا هەر ئەو گۆتەیە بەرگێکی تر لەبەر خۆی دەکات و هەمان مانا و مەبەست بە شێوەیەکی تازەتر دەردەبڕێ، ئەویش ئەوەیە کە لە شار کەسێک زۆر قسەبکات و زۆر بلێ بێت، پێی دەڵێن: (تەسجیلی قووت داوە) یان ئەوەتە دەڵێن: (دکتۆر بۆی نووسیوە) سەیر دەکەین ئەو گۆتەیە لەسەردەمی مەڕداری بە کەرەستە و ئاوهەوای ژیانی مەڕداری دەربڕاوە، ئەویش رژان و خەساربوون (دۆ)یە، دۆش بەرهەمێکی گرنگ و ماندووبوونێکی زۆری کەسانی مەڕدارە، لەنێو مەڕدارانیش پیرەژن لە هەمووان پتر پێیەوە ماندوو بووە و بەرپرسی پاراستن و بەدەست هێنانییەتی، بۆیە لەکاتی رژانیدا ئەو لە هەمووان پتر سوویەتی ئەو سووەش بەزۆر گۆتن دەردەبڕێ و هەر لەو سەردەمەش کورد گوتوویەتی: "زۆر گۆتن، لە زگ سۆتن".

بۆیە ئەگەر کەسێ زۆری گوتبێ، ئەوا بەو پیرەژنە دۆڵی رژاوەیان چواندووە، بەڵام سەیر دەکەین لەشار ئەو زۆر بلێیە بە کەسێکی تر دەچوێنن، ئەویش ئەوەیە کە وێنەیەکی کۆمیدیان داوەتێ و دەڵێن: تەسجیلی قووت داوە. واتە تەسجیلێکی بەکارخراوی قووت داوە و بەدەست خۆی نییە بۆی ناکوژێتەوە و هەر قسە دەکات، لە دەربڕینەکەی تردا، بەشێوەیەکی ترە ئەویش بەو نەخۆشە چوێندراوە، کە دەچێتە لای پزیشک بۆ چارەسەری نەخۆشییەک و پزیشک و چارەسەری بۆ دەنووسێ و ئەویش زۆر بەتەواوی ئامۆژگارییەکانی پزیشک جێبەجێ دەکات و گوێ بەهیچ کەسی دیکە نادا. واتە بووە بە ئەرکێک و ئەو نەخۆشە دەبێ جێبەجێ بکات. هەر بۆیە زۆر بلێییش لەزۆر گوتنەکەیدا بەو نەخۆشە دەچووێنن کە پزیشک چارەسەری بۆ نووسیوە. سەیر دەکەین لەنێوان زەمەنی مەڕداری و زەمەنی شار چەندین هەزار ساڵ هەیە، کەچی ئەو مەبەستە خۆی پاراستووە و لەهەر سەردەمێکدا بە کەرەستەی ئەو سەردەمە خۆی دەرخستووە. ئەم خۆگۆڕینە لە دەرخستنی مەبەستدا تەنیا ئەم گۆتەیەو فۆلکلۆر بەگشتی ناگرێتەوە، بەڵکە هەموو لایەنەکانی ژیانی گرتووتەوە، بۆ نموونە: ئەگەر مرۆڤ لەسەرەتا پەناو کەلەنە شاخ و ئەشکەوتی کردووتە ماڵ، ئەمڕۆ لەماڵ و خانوو

دروستکردندا گەیشتووەتە هونەری سەر سوڕهێنەر.

مرۆڤ هەر خۆی عەقڵی داهێنەر و کارکەری دەستڕەنگینی ئەم هەموو داهێنانەیە. فۆلکلۆریش سەرەتایترین و تەمەندرێژترین و دەوڵەمەندترین بەرهەمی مرۆڤە! کە سەیری مێژووی دوور و درێژی ژیانی مرۆڤ دەکەین لە کوردستان و لە فۆلکلۆر ورد دەبینەوە خۆمان لە بەرامبەر دەریایەکی بێ بن و بێسنووردا دەبینین، ئەمەش دەمانخاتە ژێر بەرپرسیارییەتێکی گران و پیرۆز. ئەگەر تا ئێستا شتێکی کەم بۆ ئەم بەرپرسیاریەتییە کراوە، ئەوا دەبێ بۆ داهاتوو بەزانایی و دڵسۆزی و گرنگییەکی زۆرتر مل لەبەر ئەم کارە پێویستە بنێین.

ئێمە ئەگەر لەم نووسینەدا (ئەشکەوتی شانەدەر)مان کرد بە جوگرافیای سەرهەڵدانی فۆلکلۆر بۆ کورد، ئەوا لەبەر ئەوەیە کە مێژووی ئاوەدانی ئەم ئەشکەوتە دوور و درێژە و لێکۆڵینەوەی وردیش لە پاشماوەکانی مرۆڤ نیشتەجێی ئەم ئەشکەوتە کراوە زانایەکی شوێنەوارناسیش لەمێژە گوتوویەتی: ئەشکەوتی شانەدەر کۆنترین و دەوڵەمەندترین ئەرشیفی مرۆڤایەتییە، هەر ئەم ئەرشیفە دەوڵەمەندەش بۆ ئێمەی کورد لەپێش هەمووانە و دەتوانین بۆ زۆر بابەت سوود لەم دەوڵەمەندییەی ئەشکەوتی شانەدەر وەربگرین.

لێرەش قسە لەسەر فۆلکلۆری شاری هەولێرە لەنێو (ئینسکلۆپیدیا)ی هەولێر، دەنا ئەوە بەو مانایە نییە! کە ئەشکەوتەکانی تری کوردستان و ئەشکەوتەکانی جیهان ئەوانەی هەر لە زووەوە مەڵبەندی ژیانی مرۆڤ بوون ڕۆڵیان نەبووە لەو بەرهەم هێنانە، بەرهەمەکانی ژیان.

ئەم مێژووە درێژەی فۆلکلۆر و ئەم دەوڵەمەندییەی فۆلکلۆر هێشتا بە لێکۆڵینەوەی زانستی بەوردی پۆلین نەکراوە و بەشە جیاجیاکانی مەرج و تایبەمەندییەکانیان دەستنیشان نەکراوە و پێناسەی دروستیان بۆ دانەندراوە، هەر چەندە دڵسۆزان بەپشت بەستن بەکاری میللەتانی تر خانەگیرییەکیان بۆ کردوون و هەندێک لەو بەش و بابەتانەیان جیاکردۆتەوە، ئێمەش لێرە هەر لەسەر ئەم پۆلین کردنە هەندێک لە فۆلکلۆری هەولێرمان خستووتە نێو ئەم کارە، کە بریتین لە: پەند و گۆتە و قسەی نەستەق و بەستە و بەند و حەیران و لاوک و حەکایەت و حەکایەتی گیانداران و ئەفسانە و خەرافو وڕێنە و گۆرانی.

ئێستا چەند نموونەیەک لە پەند و گۆتەی نێو کوردەواری دێنینەوە، کە هەریەکەیان بۆ زەمەنێکی دیاری کراوی کۆنی مێژووی کوردستان دەگەڕێتەوە. ئەم نموونە هێنانەوە دەکرێ بۆ هەموو بەشەکانی تری فۆلکلۆر بکرێ، حەکایەت و ئەفسانەو لاوک و حەیران و بەند و گۆرانی و...تاد.

نموونەکان:

- لە ناوەندان دەخواو لە ڕۆخان پاڵ دەداتەوە: بە جۆرێکی تریش گوتراوە:

- لە سەوزاییان دەلەوەڕێی و لە وشکاتیان پاڵ دەداتەوە

هەرچەندە یەکێ لە مەبەستەکانی ئەم گۆتەیە، ئەوەیە کە باس لە کەسانی خۆپەرست و مەسڵەحەتخواز دەکات، بەڵام لە بنەڕەتدا وێنەیەکی کۆنی کۆتاییەکانی سەردەمی (بەرهەمخۆر)یان دێنێتەوە یاد، کە باس لە کەسێک دەکات، کار ناکات و بەرهەمی ئامادە دەخوات، کە تێریشی خوارد دەچێ لە جێگای وشک و لە ڕۆخان پاڵدەداتەوە. واتە لە وێنەی پشت مەبەست و ناوەڕۆک، وێنەی سەردەمی بەرهەمخۆریمان دێنێتەوە بیرو باسی کەسێک دەکات کە خۆ لە کارکردن دەدزێتەوە. کە زەمەنەکەی بۆ زیاتر لە دەهەزار ساڵ پێش زایین دەگەڕێتەوە.

- کابرا وجاغی ڕۆشنە! لە کوردەواری ئەم گۆتەیە بە کەسێک دەگوترێ کە منداڵ بە تایبەت کوڕی لێهاتوو و لێوەشاوەی هەبێ و کوڕە بە کار و ناو و ناوبانگی خۆی ناوی باوکی بەردەوام بە زیندوویی بهێڵێتەوە.

ئەگەر بە وردی سەیری وێنەکانی پشتی وشە مەبەستدارەکە بکەین، ئەوا بۆمان دەردەکەوێ، کە ئەم وێنەیە لەو داب و نەریتە ئایینییەوە هاتووە، کە لە سەردەمی ئایینی زەردەشتیدا، وەک ئەرک و فەرمانێکی ئایینی دەبوایە پەرستگا، واتە ئاتەشگەدە، بەردەوام بیست و چوار سەعاتەی شەو و ڕۆژ و سی ڕۆژەی مانگ و

دوازدە مانگەی ساڵ و بەردەوام ئاگر لە پەرستگای زەردەشتیدا بسووتێ و نەکوژێتەوە و بە رووناکی ئاگر وەک هێمای خێر لەدژی تاریکی وەک هێمای شەڕ و ئەم دووانەش هێمای ئاهورامەزدای خوداوەند و ئەهریمەنی شەر بوون، هەر بۆ ئەم بەردەوامی ئاگر سووتان و رووناکییە، پەرستگا کەسی تایبەتی بۆ دانابوو، کە بەردەوام ئاگرەکە بە گەشییەوە رابگرن و بۆ ئەم کەسانەش پێویستییەکانی ئاگر دەوڵەت و دەسەڵات ئامادەی دەکرد. هەر بۆیە پەرستگای زەردەشتی بە "ئاتەشگەوە" کە دەتوانین بلێین: دەکاتە "ئاگردار" واتە جێگای بەردەوامی ئاگر ئاودەبرا، ئەمەش مانای ئەوەبوو کە هەتا ئەم ئاگرە لەم پەرستگایە بسووتێ، واتە ئایینی زەردەشت بەردەوامە و پایەدارەو زیندووە و نامرێ! هەر ئەم وێنەیەش بووەتە هێمای ئەو باوکەی کە خاوەنی کوڕی ناودار و لێوەشاوەیە، کە بە ناوداری خۆی ناوی باوکی، ناوی بنەماڵەکەی، ناوی ئاگردانەکەیان کە دەکاتە بنەماڵەکەیان زیندوو رادەگرێ، هەروەک چۆن لە پەرستگا ئاگری زەردەشتی یەم. بەراسـ اغ- اطاغ- ژوور رۆشۆتدرایانەی . ـاواش کوڕ وەک ئاگر شتاغ)ی باوکی بە ناوداری خۆی رۆشنی ناوی- رووناک دەکاتەوە و گوتوویانە "فلانی وجاغی رۆشنە"!

- کەوتوومەتە گێژی ئەسکەندەر: هونەرمەندی گەورەی کورد "حەسەن زیرەک" لە گۆرانییەکیدا دەڵێ:

کەوتوومە گێژی ئەسکەندەر! زانراوە کە لە ساڵی ٣٣١ پ.ز "ئەسکەندەری مەقدۆنی" لەگەڵ پاشای ئێران "دارا" لە نزیک شاری هەولێر- ئەربیل بەشەڕ هاتن لە جێگایەک کە بە "گۆگەمیلا" ناسراوە و شەڕەکەش لە مێژوودا بە "شەڕی ئەربیللا" بەناوبانگە، ئەم شەڕە کە لەنێوان پاشای ئێران و ئەسکەندەری مەقدۆنی روویدا، شەڕێکی گەورەو مەزنی جیهانی بوو! کە مێژوونووسان باس لە ژمارەیەکی یەکجار زۆری شەڕکەری هەردوولا دەکەن، بە تایبەت لەشکری دارا بە زیاتر لە ملیۆن شەڕکەر دەخەملێنن! هەر چۆنێ بێ ژمارەی شەڕکەرەکان یەکجار زۆر بووە، ئەوەی بۆ ئێمەو لێرە گرنگە، شەڕەکە لەسەر خاکی کورد و لە شارێکی یەکجار کۆنی کوردستان روویدا، ئەوە جگە لەوەی کە لەنێو لەشکری دارا کوردێک زۆر هەبوون، کە مێژوو باسی شەڕکەرە میدی و بەختیاری و ئیلامییەکان و زۆری تر دەکات، کە دیارە جگە لە شەڕکەر ئەوە خەڵکی ناوچەکەش واتە دانیشتوانی هەولێر و دەوروبەری ئەوانیش بێ خواستی خۆیان بوونەتە سووتەمەنی شەڕەکەو خەڵکێکی زۆر لە کورد، چ سڤیل و چ شەڕکەر لەو شەڕەدا زەرەرمەند بووینە! بە تایبەت کە قەڵاتی هەولێر جێگاو بارەگای دارا بووە، ئەوەش زانراوە کە شکاوە و هەڵاتووە! ئەوەی لە زێڕ و پارەکە بۆی دەرباز نەکراوە، لە قەڵاتی هەولێر شاردوویەتییەوە! مێژوو باسی ئەوەش دەکات، کە ئەسکەندەر دێتە نێوشاری

هەولێر و قەڵا داگیر دەکات و دەست بەسەر ماڵ و موڵکی دارادا دەگرێ.

هەموو لایەک ئەوە دەزانن! ئەوەی کە باسی دەکەین، شەڕە، شەڕی پاشایەکی شکاو و سەرکردەیەکی سەرکەوتوو لەسەر خاکی کورد و لەنێو شاری هەولێر "ئەربیل" بۆیە لای هەمووان روونە کە چ دانیشتوانی شاری هەولێر و چ کوردەکانی نێو لەشکری دارا، پاش شکان و هەڵاتنی دارا زەرەر و زیانێکی زۆریان لێ کەوتووە! شاریان داگیر کراوە، ماڵیان رووخاوە و بردراوە، پیاویان لێ کوژراوە و بریندار بووە، ژن و منداڵ سەرگەردان بووە، هەر بۆیە "کەوتوومە گێژی ئەسکەندەر" بێ شک دەبێ گوتەی کوردێکی سەرگەردان و لێ قەوماوی نێو لەشکری ئەسکەندەر ئەمەی گوتبێ، ئەو کەسەی ئەم گوتەیەی گوتووە، کوردێکی زیندوو بووە، بەڵام لەنێو لەشکری زۆر و سەرکەوتووی ئەسکەندەردا، لە بارێکی ناخۆشی دەروونی و لە حاڵەتی شکاوە بێ هێزی خۆیدا ئەمەی گوتووە! کە لە ترسان و لەبێ کەسیدا لەنێو لەشکرێکی زۆر و بێ سەروبن سەرشێواو ترساو نەیزانیوە روو لەکوێ بکات و چۆن دەرباز بێت، ئەم حاڵەتە ناخۆش بێ و چارەسەرییەی نێو گێژی ئەسکەندەر، دواجار بووە بە گوتە و پەند و هەر کەسێک، حاڵەتێکی ناخۆشی تووش هاتبێ و چارەسەری نەبووبێ. ئەوا گوتوویەتی: (کەوتوومە گێژی ئەسکەندەر) ئەمەش ئەوەمان بۆ

دەسەلمێنێ کە ئەم گۆتەیە، لە گەرمەی شەڕی ئەسکەندەر و داراوە کەوتووتە سەر زاران و کورد گوتوویانە و لە شاری هەولێر گوتراوە و بە هەموو کوردستاندا بڵاوبووەتەوە. واتە ئەم گۆتەیە لە ساڵی ٣٣١ پ.زایین گوتراوە و ساڵی دروستبوونەکەش دیارە و ئێستاکە "٢٠٠٩" زایینییە، واتە تەمەنی ئەم گۆتەیە دەکاتە "٣٣١+ ٢٠٠٩ =٢٣٤٠" دوو هەزار و سێ سەد و چل ساڵ!

کە ئەمەش مێژوویێکی زۆر راست و دروستبوونی ئەم گۆتە کوردییەیە و هیچ گومانێک هەڵناگرێ.

هەر لەگەڵ هاتنی "ئەسکەندەر" بە سەرکردایەتی لەشکرێکی گەورەو سەرکەوتنی لە شەڕەکە و مانەوەی لەشکرەکەی ماوەیەکی زۆر لە رۆژهەڵات و ئێران و کوردستاندا. ناوی "ئەسکەندەر"یش وەک ناوی کەسێکی ناودار و جیهانی و سەرکردەیەکی گەنج و سەرکەوتوو، بووە ناوێکی خۆشەویست و دیار، کە بووەتە هۆی ئەوەی خەڵک منداڵی خۆیان بەم ناوەوە ناو بنێن، هەر لەو رۆژگارەوە و تا ئێستاش ناوی "ئەسکەندەر" لە نێو کورد بە تایبەت و لە رۆژهەڵات بە گشتی ناوێکی دیار و باوە! ئەم ناوە هێندە دووبارە بووەتەوە و ناسراوە! ئێستا لە کوردستان خەڵکەکە "ئەسکەندەر" بە ناوێکی رەسەنی کوردی دەزانن، دیسان ئەم ناوەش واتە "ئەسکەندەر"یش تەمەنی هاتنی بۆ ناو میللەتی کورد، لەگەڵ تەمەنی دروستبوونی گۆتەکەیە، کە زەمەنەکەی بۆ ساڵی هاتنی ئەسکەندەر دەگەڕێتەوە.

ئێستاش هەندێک گۆتە و پەند شیدەکەینەوە، کە لە سەرەتاوە لە پیشەکانی ژیانەوە هاتوون، وەک "مەڕداری" و "جووتیار" و "پیشەسازی" و زۆری تر، هەر ئەوەندەش نموونە دێنینەوە کە بابەتەکە بسەلمێنی، دەنا ئەگەر پەند و گۆتە کوردییەکان، بە هەموو شێوەزارەکان بەسەر بکەینەوە، دەتوانین بۆ هەموو زەمەن و هەموو پیشەکان نموونە بهێنینەوە.

- بزن بۆ شەوێک جێگای خۆی خۆش دەکات: یەکێ لە تایبەتمەندییەکانی گۆتە و پەندی کوردی ئەوەیە، لە هەر زەمەن و بۆ هەر بابەتێک کەرەستەی ئەو زەمەن و ئەو بابەتە بەکاردێنی، بزن بۆ شەوێک جێگای خۆی خۆش دەکات. ئەمە بەرچاوە کە ئەم گۆتەیە گۆتەی ژیانی مەڕدارییە. لەرووی دەرەوەی ئەم گۆتەیە، ئەوە دێتە بەرچاو، کە هاندانی مرۆڤە بۆ کارکردن، هەتا ئەگەر کارەکە بۆ ماوەیەکی کەمیش بێ، بەڵام بە وردبوونەوە لە ریشەو زەمەنی گوتنی گۆتەکە، ئەوەمان دێتە دەست کە گۆتەکە باسی سەرەتای مەڕداری و هەوار و ماڵ و گوند دروستکردنە. چونکە گۆتەکە بە ئاشکرا رووی لەو کەسانەیە کە هێشتا لە خەمی خانوو دروستکردن نین و گەران و هەوارگۆڕی بە شێوەی سروشتی و رەمەکی و وەک رابردوو چاو لێ دەکەن، بەڵام خاوەن گۆتەکە پێی دەڵێ: ژیان گۆڕاوە و ناکرێ هەر بەم شێوەیە بژی و پێویستت بە گۆڕانە و گۆڕانەکەش دەخوازێ خانوو ماڵ دروست بکەی و کار بکەی، تۆ کە ماوەیەکی زۆر بە مانگ و بە ساڵ لە هەوارەکانت دەمێنیتەوە، پێویستە خانوو ماڵت هەبێ، ژیان بەبێ خانوو و ماڵ چی تر بەڕێوەناچێ، نابینی ئەوەتا "بزن" کە ئاژەڵێکی بەستەزمانە، شەوێک کە لە جێگایەک دەمێنێتەوە، شەو جێگای خۆی بۆ مانەوەی ئەم تەنیا یەک شەوە خۆش دەکات و دەیەوێ جێگای مانەوەی ئەم شەوەی جێگایەک بێ بتوانی بە ئاسوودەیی تێیدا بحەوێتەوە! باشە بزن بۆ یەک شەو ئەمە دەکات، ئەی تۆ کە مرۆڤی و لەهەر هەوارێک بە چەندان مانگ و بە ساڵ تێیدا دەمێنیتەوە، ئەی تۆ بۆچی جێگای خۆت بۆ مانەوەی ئەو ماوەیەت کە زۆر لە مانەوەی شەوێکی بزنەکە درێژترە، جێگای خۆت خۆش ناکەیت و چاو لەم بزنە ناکەیت؟!

لە گۆتەکەدا دیارە، ئەو کەسەی کە خاوەنی گۆتەی "بزن بۆ شەوێک جێگای خۆی [illegible]ش دەکات"ە رووی قسەکەی [illegible] وردی سەیر لە سروشتی رابردووی [illegible]مەبەستدارەک[illegible]ەمەنی و بێ دەسکار[illegible]ردەکەوێ، کە [illegible]نەبڕاوە و نەهاتووەتە سەر ئەو رایەی، کە پێویستە بگۆڕێ و کاربکات و خانووماڵ دروست بکات و زۆر پابەندی ئەو رابردووەی خۆیەتی. کەچی بە پێچەوانەی ئەو خاوەنی "گۆتە"کە زۆر گۆڕاوە و گۆڕان زۆر بە

پێویست دەزانێ. وەک ئەوەی پێشتر زۆری لەگەڵ هەوڵدابێ و نەیتوانیبێ بیگۆڕێ. دواجار وەک تووڕەیی و جۆرێک بێزاری بە حیکمەتەکەیەوە دیارە! پەنا بۆ "بزن" دەبات و دەیکات بە نموونەیەکی گونجاو و بەرچاو کە ئەوەتا ئەم بزنە بە هەموو بزنییەتی خۆی و بە هەموو بەستەزمانییەتێکەوە بۆ شەوێک جێگای خۆی خۆش دەکات. کەچی تۆ مرۆڤی و خاوەنی ئەم هەموو هێز و ئاوەزەی کە زۆر لە هی بزن زیاترە! کەچی ناتەوێ جێگای ژیانی خۆت خۆش بکەیت، کە مانەوەی تۆ لە جێگایەکانی مانەوەت زۆر درێژترە لە مانەوەی کورتی مانەوەی شەوێکی بزنێک.

ئەم گۆتەیە، جگە لە مانا بەرچاو و راستەوخۆیەکەی، لە پشتی وشەکان وێنەی رۆژانی سەرەتای گۆڕانی مرۆڤ و هاتنە دەرەوەی لە ئەشکەوت و لە پەنا سروشتە دەست لێنەدراوەکان دەخاتە بەرچاو، کە ئەو رۆژانە مرۆڤەکان هەندێکیان چ بە زەحمەت تێکەڵی گۆڕان دەبن و چ توند دەستیان بە سروشتی رابردوویانەوە گ[illegible]ر کردووە و کار ناکەن. [illegible]: بەراس[illegible]

ئەم گۆتەرایانەی [illegible]ێکهاتەکەی لە ژیانی [illegible]شت وەرگیراوە و تەواو لەم ژیانەوە ه[illegible]اتۆتە بەرهەم، بەڵام لە پشتی وشەکان چەندین وێنەی ترمان دەخاتە بەرچاو کە نەگوتراون.

ئەم گۆتەیە، هەموو پێکهاتەکەی لە ژیانی "مەڕداری"یەوە وەرگیراوە و تەواو لەم ژیانەوە هاتۆتە بەرهەم، بەڵام لە پشتی وشەکان چەندین وێنەی ترمان دەخاتە بەرچاو کە نەگوتراون.

ئێستاش گۆتەیەک بە نموونە دێنینەوە، کە ئەویش لە ژیانی جووتیارییەوە وەرگیراوە، ئەویش پێ لەسەر کارکردنی بەردەوام و کەم کەم دادەگرێ و دژی کارنەکردن و دانیشتنە بەبێ ئیشی.

- رۆژی لاتەک، سالێ ولاتەک:

لەم گۆتەیەدا کە لە دوو نیوە رستەی کورت پێکهاتووە، بە وشەی "رۆژ" کە مانای زەمەن دەدات و لەگەڵ وشەی ساڵ، بەرامبەر بە وشەی "لاتەک" و "ولاتەک" رادەوەستێ، کە مانای شوێن و جوگرافیا دەدەن.

جووتکردن، لە رابردوو بە کەرەستە و شێوەو کارکردنی پێشان کارێکی زۆر پڕ زەحمەت و گران بوو، وەرەو عەشقێکی کارکردنی زۆری دەویست تا جووتیار بەردەوام کاربکات. لێرە بەدەردەکەوێ، کە جووتیار لە زۆری و گرانی کارکردنی جووت بێزار بووە، بەڵام خاوەن گۆتە زۆر بە حەکیمانە کارەکەی بۆ ئاسان دەکات و پێی دەڵێ: ئەگەر تۆ بەردەوام کاربکەیت و رۆژانە کارێکی کەم بکەیت، هەر هێندەی "لاتێک!!" ئەوا لە ئەنجامی ئەو بەردەوامییە، ئەنجامی کارکردنەکەت لە ماوەی ساڵێکدا هێندەی "ولاتەک" زۆر دەبێ، واتە بە جووتیار دەڵێ: دەتوانی کاربکەیت و خۆشت ماندوو نەکەیت و لە ئەنجامیشدا کارێکی زۆر بکەیت. کە ئەم گۆتەیە زۆر لەگەڵ گۆتەی کەمخۆری دایمخۆر"دا یەک دەگرێتەوە.

رۆژی لاتەک، ساڵێ ولاتەک: واتە ئەگەر تۆ کە جووتیاری رۆژێ یەک لات جووتی بکەیت، ئەوا پاش ماوەیەکی زۆر وەک ئەوە وایە، کە ولاتێکت کێلابێ.

لێرە بە شێوەی کورتبێژی و کورتبڕی، خاوەنی گۆتەکە مەبەستەکەی خۆی گەیاندووە، بەبێ ئەوەی هەندێ وشەی پێویست هەیە گوتبێتی: کە ئەویش وشەی "جووتیار" و "جووتکردن" و "کەم" و "بەردەوام" و "زۆر"ی بەکارهێنابێ. کە ئەمانەش لەنێو کرۆکی مەبەستەکەدا هەن. وەک دیارە هەموو وشەکان، ئەوانەی کە گوتوویەتی، ئەوانەی کە نەیگوتووە: لە ژیانی "جووتیاری" وەرگرتوون و بۆ مەبەستی "جووتکاری" بەکاری هێناون. واتە گۆتەکە تەواو لە ژیانی جووتیاری و جووتکارییەوە وەرگیراوە.

ئەم دوو گۆتەیە، هەر یەکەی باسی ژیانی "مەڕداری" و "جووتیاری"یان دەکرد، ئێستاش گۆتەیەک بە نموونە دەهێنینەوە، کە باسی ژیانی مەڕداری و جووتیاری پێکەوە دەکات:

لە کوردەواری دەڵێن: "ئەگەر مەڕمان نەدیبێ لە پەرێزێ، کشپلمان دیوە لە هەوێزێ" ئەم گۆتەیە لە کاتێکدا دەگوترێ، ئەگەر یەکێک خەڵک لە کارێکدا بە نەشارەزایی بزانن و ئەویش خۆی پێ شارەزا بێ، ئەوا لە وەڵامیاندا دەڵێ: ئەگەر

مەڕمان نەدیبێ لە پەرێزێ، کشپلمان دیوە لە هەوێزێ" لەم گـــۆتەیەدا وشـەکـان باسی ژیانی مـەڕداری و جـووتیـاری دەکـەن، کـە "مـەڕ" و "کشپل" و "هەوێز" تایبەتن بە ژیانی مەڕداری، وشەی "پەرێز"یش تایبەتە بە ژیانی جـووتیـاری، هەرچەندە بە ژمارە وشـەکـانی مـەڕداری زۆرترن! بەڵام وشـەی "پەرێز" مـانایەکی زۆر هەڵدەگـرێ، کـە زۆربەی کـارەکـانی جـووتیـاری دەگـرێتـەوە. کـە دەڵێ: پەرێز، واتە ئەو شـوێنەی دروونەی لێکراوە، کە دروونەش کرابێ، دیارە پێشـتـر تۆدراوە و جـووتیـار جـووتی تێدا کـردووە. جگە لەوەی کـاتێ کە دروونە دەکـرێ، واتە سـەپان دروونە دەکـات و گـیـشـەکـەر سـوارەکـان کۆدەکاتەوە و گیشەکەر گیشە دەکات و لە پەرێزەوە بۆ سەر جۆخینان. کـە هەمـوو ئەم وشانەی وەکو "دروونەکەر و گـیـشـەکـەر و سـوارەو گـیـشـکە و کێشەو جۆخین و جووتیار و تۆدان و جـــووتکردن" تایبـــەتن بە ژیانی جووتیاری.

دیـســان لێــرەش لە گــۆتەیەکی کورتبێژ و سەروادار مانایەکی زۆری لە ژیانی جـووتیـاری باس کـردووە. هەروەهاش لە ژیانی مـەڕداری. کــە ئەم گـۆتەیە دەربڕی ئەو مـانایەیەو دەرخـەری وێنەی ئەو زەمـەنەیە، کـە هەردوو پیـــشـــەی "مـــەڕداری و جـــووتیـــاری" پێکەوە هاوشـــان و هاوز؟مەن بوونە، یان لای کەم باسی کەسانێک دەکات، کە لەنێو هەردوو پیـشـەدا ژیاوە و شـارەزای کـار و کەرەستەکانییەتی.

ژیان بەردەوامــە و پیــشــەکــان پیشەی تر رادەکێشن. لەم گۆتەیەی خوارەوە باسی سەرەتای "پیشەسازی" مەڕداریمان بۆ دەکات.

– گۆتەکە دەڵێ: ژنم دەوێ ژنانە
پێستەکەی بکاتە هەمبانە

لە کوردەواری و ژیانی مەڕداری و جـووتیـاری، ژن و پیـاو پێکە کـاریان کـــردووە، چۆن هەندێ کـــار زیاتر تایبـەت بوون بە پیـاو، ئاواش هەندێ کـار تایبـەت بوونە بە ژن. ژنیش لای مەڕدار ئەو ژنەیە، کە لە پێسـتـەیەکی توکن و تەڕو چەورو نەرم و ئەسـتـوور و گـران هەمـبـانەیەکی تەنک و وشک و ســـــووک دروست بـکات. دیـارە گۆڕینی ئەم پێستـەیە بەم شێوەیە، بۆ شێوەی هەمـبـانە، هەم زانایی و هەم پشـوو درێژی و هەم دەسـتـڕەنگینی دەوێ، کە ئەمەش کاری هەموو ژنێک نییـە. هەربۆیە خـاوەنی پەند ژنێکی دەوێ کارابێ و دەرچووێ و پسپۆڕبێ لە پیـــشـــەســـازی دەســـتی بۆ دروسـتکردنی هەمـبـانە و دواجـار بەکـارهێنانی. ئەگـەرچی لەبەرچاو گـۆتەکە باسی ژنێکی کـارا دەکـات، بەڵام دیارە کــە کـارایـیــەکـــەی لە پیشەسازی دروستکردنی هەمبانەیە، کە ئەمەشیـان کارێکی ئاسان نییـە و کاری هەموو ژنێک نییـە، واتە لێرە لەنێـو ژیانی مـەڕداریدا، کـە وشـەی "پێـســـتـــە" بەدەر دەکـــەوێ داوای پیـشـەسـازی دروسـتکردنی هەمـبـانە دەکات، چونکە هەمبانە بەرهەمێکی پیـشـەسـازی دەسـتـیـیـە و جگە لە کــارکــردن و زانایی پێـویســتی بە شـــارەزایی بەکـــارهێـنانی چەند

ماددەیەکی تریشە، کە بۆ خۆشکردنی پێسـتـەکە پێویستە بەکاربهێندرێ، هەرچەندە کەرەستەکان زیاتر گیایی و رووەکی و سروشتین، بەڵام سیفـەتی کـیـمـیـایی وەردەگـرن، کـە ئەمـەش شارەزایی و زانایی لە هاوکێشەکەدا پێویستە بۆ ئەوەی لە ئەنجامی کـار هەمـبــانەکـە جـوان و قـایم و باش دەرچێ و بێ ترس بەکـــــاربێ و لەبەکارهێناندا بێ زیان بێت.

ئەگەر بە وردی سـەیر بکەین و لەم گـۆتە کـوردییـانە وردبینەوە، ئەوا بۆمـان دەردەکەوێ، لەگەڵ ئەوەی کە گۆتەکان جیان و لە شوێنی جیا جیاو لە سەردەمی جیا جیاو بۆ مەبەستی جیا جیا گوتراون، بەڵام یەک خاڵ لە هەمــوویاندا کـۆدەبێـتـەوە، ئەویش خاڵی پێداگرتنە لەسەر "کـارکردن". کارکردن بە زانایی و بە بەردەوامی و لە وەختی خۆیدا، چونکە کارکردن بە پێی گـــۆتەیەکی تری کـــوردەواری "مـەرهەمی لەشـە" ئەوا زاناکـانیش کـــارکـــردن بە جـەوهەری "ژیـان" و "گـــۆڕان" دەزانن و بە باوکی هەمـــوو داهێنانێکی تێدەگەن.

لە کـــۆتایی[illegible] جـــارێکی تر دەیڵـێـمەوە، [illegible] ـەر قسـەی زانایەکی شـ[illegible] ئەوتی شـانەدەر لە [illegible]ستان ئەرشـیـفـێکی کۆن و دەوڵەمەندی مرۆڤایەتییە! ئەوا فۆلکلۆری کـوردەواریش خـەزنەیەکی کـــۆن و دەوڵەمـــەنـد و دەست بۆ نەبردراوی مـیللەتی کـورد و هەمـــوو مرۆڤایەتییە.

# فۆلکلۆری دەشتی هەولێر

**دکتۆر هیمدادی حوسێن**
**کۆلیژی پەروەردە - زانکۆی سەلاحەددین**

**بەرایی**

جیهانی زانستی فۆلکلۆر جیهانێکی فرە گەورەو بەربڵاوە. لێکۆڵینەوەو تۆژینەوە لە بەش و لایەنەکانی فۆلکلۆری کوردی لەلایەن پشکنەرانی خۆمان و ڕۆژهەڵاتناسان تووشی کێشەو زەحمەتییەکی زۆردەبێت، چونکە وەدەستکەوتن و گەڕان بە دوای کەرەستەی سادە، لێکۆڵینەوەکەیان لەبەردەم ئەنجامێکی ناتەواو و پڕ کەم و کورتیاندا دەهێڵێتەوە، بۆچی؟ چونکە تا ئێستا ئەو گەنجینەو سامانە بەنرخەی فۆلکلۆری کوردی لەسەر زارو لە قووڵایی دڵی پیرەمێرد و پیرێژن و شایەرەکانی کوردستان دایە. جا بۆ ئامادەکردنی کەرەستەی پێویست بۆ لێکۆڵەرەوەکانی خۆمان و بیانییەکان لەلایەک و پاراستن و ڕزگارکردنی ئەو سامانە لە فەوتان و لەناوچوون بە پێویستم زانی و بەخزمەتی دەزانم گەر ئەو چەند لاپەڕە کەمە بەڕاستی و چۆنم لە دەمی کەسەکانەوە بیستووەو ئەوان چۆن گۆیان کردووە، بەو شێوەیەی خۆی بۆ ئێوە بخەمەڕوو، بۆیەش دەڵێم: بەڕاستی و بەپاکی دەیخەمە ڕوو، چونکە هەندی لەو برایانەی خەریکی کۆکردنەوەی بەرهەمی فۆلکلۆرین یان پێشتر خەریکی بوونە، بەپێی ئاستی زانیاری و شارەزایی و پسپۆری خۆیان دەسکاری بەرهەمەکانیان دەکەن یان کردوویانە.

بۆ نموونە: لە فۆلکلۆری دەشتی هەولێری، کە گوێی لێبووە گوتوویانە (مار) لە جیاتی (ماڵ) ئەم یەکسەر هاتووە بە (ماڵ) نووسیوویە، بێ گومان ئەمەش هەڵەیەکی گەورەیە و پێویستە هەرناوچەیەک فۆلکلۆرەکەی بەشێوەی کۆکردنەوەکەیەوە بنووسرێتەوە، کۆکردنەوەی بەرهەمی فۆلکلۆری تا ئێستا لە نێوکورددا باوە، بەڵام لێکۆڵەر لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا هەرگیز تووشی کێشەیەکی وا نابێت و ئەو ماندووبوونە نابینێ لە گەڕان بە دوای کەرەستەی پشکنینەکەی، چونکە زۆر دەمێکە ئەوان لەلایەن کەسانی پسپۆڕو تایبەت بەم کارەوە بەرهەمی فۆلکلۆری خۆیان بەشێوەیەکی ڕێک و پێک و لەشێوەی کتێب و نووسراودا بە چاپ گەیاندووەو ئەرکی سەرشانی لێکۆڵەرەوەکانی خۆیان ئاسان کردووە.

بێگومان فۆلکلۆر دەورێکی گرنگ دەگێڕێ لە پێشکەوتنی ڕەوتی کۆمەڵایەتی و ڕامیاری و بوارەکانی دی ژیان و پەیوەندییەکی تەواوی بە زانست و زانیارییەکانی دی هەیە، بەتایبەتی مێژوو زۆر یارمەتی یەکتر دەدەن لە ڕوونکردنەوەی هەندی دیاردەو ڕووداوی ڕابردوو، هەروا ئاوێنەیەکی پرشنگداری ڕابردوو و ئێستای میللەتە، کە تێیدا پەند و گۆرانی و قسەی نەستەق و داستان و ئەفسانە و قارەمانیەتی و ئازایەتی و سوارچاکی و میوانپەروەری بە ئاشکرا دیارە.

هێندی کەس لەو باوەڕەدان بە پێشکەوتنی زانست و بوارەکانی تەکنەلۆژیا و گۆڕان و پێشکەوتنی بیری مرۆڤ خۆی و کۆچکردنی لادێ نشینەکان بە بەردەوامی بۆ شارەکان هەموو ئەمانە دەبنە هۆی کزی و لەناوچوونی فۆلکلۆر، بەڵام لە ڕاستیدا ئەم بیرکردنەوەیان زۆر هەڵەیە، چونکە فۆلکلۆر لەگەڵ مرۆڤ و سەردەم دەڕوا و کزی بۆ نییە، بەڵام شتێکی دی هەیە، بە گۆڕانی بوارەکانی ژیان

بابەت و کەرەستەی فۆلکلۆرەکەش دەگۆڕێ، بۆ وێنە: جاران شایەری فۆلکلۆری ئەندامەکانی لەشی یارەکەی چ لە جوانی و چ لە ناشیرینی بەو کەرەستە سادەو ساکارانەی ژیانی رۆژانەی لادێ چواندووە، وەک چاوی بە چاوی مارو بۆق باڵای بە بەرزی داربی چواندووە، بۆ نموونە:

**چاوت وەکی چاوی ماری**
**خۆم تێ هەردا سەر دیواری**
**ماچت دەکەم پڕ بە زاری**

یا لە ناشیرینی کچێکدا شاعیر بە پلارو تیرو توانج تێگرتن گوتوویە:

**مەمکت دۆدانە دۆی تیا ترشاوە**
**سینەت ساجەکەل جۆی تیابڕژاوە**

ئەمرۆ بە چاویلکەی یارەکەی و جۆرو مۆدیلی کراس و پانتۆڵ و شێوەی پێڵاوەکەی و ئامێر و کەرەستەی تازە داهێنراودا هەڵدەدات، بۆ نموونە:

**ئەوا هاتە خوار لە جادەی (کاوە)**
**شارلستۆن لەپێ عەینەک لە چاوە**

***

**بەقوربانت بم گوڵەکەی عەشایەر**
**سەعاتی (ریکۆ) تۆ کردت زایەر**

### بەستەی شایی

**هی برام سەری من دێشی**

**هی برام سەری من دێشی**
**غەم لە دری من گەلەکە**
**دەچمە دەشتی قەراجی**
**لە من بەملەکە ملەکە**
**راوکردن لەکی خۆشە**
**رووارە و غەرابە لەکە**
**ئەشقێ سێ کیژان لێدام**
**عەیشێ و فاتێ و گورەکە**
**بە پێش ماریاندا رابردم**
**بەچاوی گازم دەکا**
**لۆ ماڕێی دەبردمەوە**
**چاورەش پەنام لێدەکا**
**من تەعجوبم لە خۆمە**
**ئەو کچە لۆچی وە دەکا**
**دەیگۆت عالەم دیارە**
**هەتیو پڕ کێشم مەکە**
**لە ماری دادەنیشتین**
**چەند جوان نسحەتم دەکا**
**نەسحەتی منت لە گێ بێ**
**قسەی خۆت لۆکەس مەکە**
**بابم گەلەک عینادە**
**داکم لۆ تۆ حەزدەکا**
**ماری دنیاتم نەما**
**خودا رۆحم پێ بکا**
**چاو رەش سەرێ من دێشی**
**دەردێ لە درم دەرنایێ**
**دوو پێختیاران دەنێرم**
**پاشی مەلای عیشایێ**
**هێ برام سەرێ من دێشی**
**دەردێ لە درم دەناری**
**دەبڕێن کیژەی داخوازکەن**
**دەدەم پێنج سەد دیناری**
**بەپێنج سەدی نەیدەدا**
**دەعوای دەکرد هەزاری**
**چەند مەلام بەگژ وەنا**
**ئیختیار لەگەر موختاری**
**قەدری مەلای نەدەگرت**
**قەهرم هەستا یەکجاری**
**گۆتی هەستە با بڕۆین**
**بابێتە دوژمن کاری**
**زۆر زۆرحوکمەت حەپسم کا**
**با بگرێ دوو ساری**
**چاو رەش هەستە با بڕۆین**
**رێگامان دوورو قۆرە**
**لە دەستم جامبێزارە**
**لەنێکم چاردە خۆرە**
**بابت کەلەبچە دەکەم**
**دەیهێنمە ئەو مەغموورە**

بە ئامێران لێی دەدەم
دەسەڵمێنی مەجبووره
ئەوجا هەینی دەیدەمێ
سی دینارو قسووره
هەتیم وێژدانت هەبێ
بابم مەکە مەغدووره
چاو رەش باشم بدوێنە
درم گەلەک مەشغووره
ئەورۆ گەلەک نەخۆشم
تایی گەرمم گرتییە
کەتیمە ناو نووینێ
چ ئاگام لەخۆم نییە
گریان و رۆرۆی ژنان
دنیای خرا کردییە
دەنگی یاسینی دەهات
مەلام لەسەر سەرییە
کاتەک سەرم برند کرد
ژنان شینەک بەستییە
چەندی چاوم دەگێڕا
یاری من لەگەر نییە
یەکجار دەردم گران بوو
کەتم بەبێ دەنگییە
برادەر گازیان دەکردم
کاکە دەردی تووچییە
ئاویان بەلۆکەی دامێ
لە قورگم دا مەییە
چیتکە عەزیەتم مەدەن
چاو رەش ئەمنی کوشتییە
هەندەک لۆم بڕۆنە بەردان
من هەجەلم هاتییە
یێکەک بڕۆنە دویارێ
برێن کوڕه مردییە
بە عەجەلەم بگاتێ
شیفام لەبۆ هاتییە
ئەگەر دەردە یارت بێ
بەسیتە رێ دوور نییە

گریانەک لە دوور دەهات
هەستی خۆم راگرتییە
وەکی چاوم برند کرد
یارم لە پشت سەرییە
پەرچەم دەرێی ئارمووشە
لە دستی ئاراندی یە
کراسی مەلەزکتان
یێقەی خۆی دادڕییە
سینگ و مەمکی لەو گۆڕەی
دەبنی کیژە حۆرییە
روومەتی تۆیە گووره
لە خێنی سۆرکردییە
دەیگۆت لۆ نامدوێنی
کەلکی قسانم نییە
گۆتی لۆ نامدوێنی
هەتیم درم تەقییە
ناتانم دابنیشم
شنکی قسانم نییە
سنکی دامە بەر پشتی
ئۆخەی دەرێی کورسییە
تازە ئەگەر بشمرم
خۆ ئیمانم بردییە

* * *

هێ برام سەرێ من دێشی
دیاربوو درم دەلەرزی
چاوم کەت بە نازدارێ
دەسووتی وەک لۆکزی
بڕۆننە تاقمەی ئەو بووکێ
کۆترۆکەو لەگەر دەرزی
گۆتم لە کێندەر بنووم
لەسەر سینگی قاقەزی
بە خراپە لۆ تو نابم
دەبتە روو رەش و حیزی
بە چاکە لۆ تودەبم
لەو دنیایەش حێفزی
چاو رەش سەرم زۆر دێشی

غەمان لێ کرد هەڵلایە
لێم گەڕێ بڕەک بنووم
چاوم هەردووک شێوایە
چ مەلای پێ نازانم
لەو قەراجەی لەو لایە
بابچین لۆ گرد گراوی
دەرێن مەلای تێدایە
بە پێش مارانیاندا دەچووم
عالەم لە تەماشایە
لە برادەرەکەم پرسی
مارێ مەلای کێهایە
ئەو دەرکەی بەقەمتەرە
بەری لە رۆژ ئاوایە
لە مارێیان دابەزیم
لێینا دوو پیارە چایە
دوو جغارەم پێ دەکرد
کردمان بەعسی دنیایە
دەیگۆ رەفیقت کێیە
ـەتێم لە گەرت نایە
قسەی درێ خۆم لۆ کرد
مەلا ئیشم ئەوهایە
مەلا سوندێ دەخواتن
لۆ منی نەدا فتوایە
هەروگیفم لێ دەکرد
مەلا رەنگی گۆڕایە
تووشی چ قەترم مەکە
دەتکوژم بەو خودایە
هەرچەندی من زۆرم گۆت
مەلا نوتقی نەدایە
گێی پێنج باویم دەرینا
مەلام دەکرد رەزایە
خیلافی حەقمان حەلکرد
خێندی قولووەڵایە
هەردووکمان پێکڕا نووستین
گۆتم چاورەش جێم کەوە
چ هەنجەتت نەمایە

پارم بە سینگی داوە
وەک پەموێ پەڕە کرایە
مەعبەینی سینگ و مەمکان
بە گوراوی رشایە
لە خۆشیان خەوم نەهات
لەو جەنەتەی خودایە
سەعات لە حەفتی شەوێ
عزرایلم هاتە لایە
چۆکی لەسەر سینگی دام
دەفتەرەکیان هێنایە
مەلائیکەت فەرموویتیان
نەڕۆژەک نە سەعاتەک
یەک دەقیقەت نەمایە
تۆزەک مساعەدەکەن
لە خوای دەکەم رجایە
خوایە ئەمن جوانکەمە
تازە ژنم هێنایە
خودای گەورە ئەمری کرد
لێی گەڕێن زۆری مایە
یارێ گازی دەکرد
لاوە لۆ مشەوەشی
دەبنی رەنگت گۆڕایە
سەری منی برند کرد
لەسەر رانی دانایە
بە دەستی باوەشینە
دەیگۆت گەلە گەرمایە
دەستی کرد بە دوعایان
لێم نەستێنی خودایە
نۆ مەڕان دەکەمە خێر
لەگەر دە عەرەبە گەنمان
لەگەر فەردەک شەکری
لەگەر سندوقەک چایە
هەمووی سەدەقەی یارم
لە راهی تو بێ خوایە
تاو و لەرز و سێبەرۆ
بێقەی منیان بەردایە

دانیشتن لە کێ خۆشە
لەگەر چاوی لەیلایە
لەسەر هەردوو مەمکی
ئەو دیو ئەو دیو کوترایە
حاجیلە وکورتێک و بەیبوون
تازە خۆیان لێک دایە

***

بەرام سەرێ من دێشی
دەردێ لە درم وەی وەیە
سبەینەکی سەحەری
فکرم چەغەمیرەیە
لەچیای ئاوا دەبووم
گەیە خدر جیجەیە
شاییەک ئەوا دەگەڕێ
لەکنم وایبی گەمەیە
تووڕە تووڕی شمشاران
تووڕ تووڕەی دێوەرەیە
برادەر دەهاتنە پێشم
ئەوە کاکی شایەرە
کاکە فەرموو دابەزە
دەمەکی لادە ئێرە
دوو ڕۆژە شایی دەکەین
چەند دەکەین نابێ تێرە
بە منت دەگۆ خدرە
هەر شاییەک تۆ نەیکەی
لە کنمان وابێ غەدرە
دوونی بەبێ من هاتن
ئەمن و کردییە مەغدوورە

***

هێ بەرام سەرێ من دێشی
دەردی لە درم گرانە
ئەی وەی لە خدرجیجەیە
جێین کیژو کارانە
ئەو خەفەتە دەمکوژێ
بێ شاهێر و شوهرانە
ئەمن وا بەندی دەرێم
شاهێر وا راوستانە
تەسبێحەکم وەردەگرت
دەستم کرد بەو بەندانە
شاییەکم دادەبەستا
سۆر دەکرا لە کیژانە
ئارەقەی کیژو کوڕان
گەیشتە بن پێ یانە
بۆنی قەنەفران دەڕوا
چ بکەم کۆڕان کۆڕانە
پیرێژن هاتنە دەرێ
یێک یێکە لە مارانە
خوشکینە بابگەینێ
ئەو داوەت و دیلاتە
ئەو شایرە سەربەستە
لە کی هات بەو نیوڕانە
ئەو شاییە لۆێ خۆشە
خزمی سێ چار گوندانە
دێمەکار و خدرجە
ئازی کەند لە گەردانە

***

چاو رەش سەرێ من دێشێ
دەردی لە درم وەی وەیە
دووعا بوونم وەردەگرت
لە بۆ چەغەمیرەیە
تاقمە کیژەکم دەدیت
لەسەر گۆمە خڕەیە
هەتیم وەرە دانیشە
ئیشەکمان بەتوو هەیە
لەگەر یارێ دانیشتین
کوردمان مشاوەرەیە
دەستیان کرد بە گریانێ
تێکڕا دەبنی تازەیە
گۆتم لۆچی دەگریێن
هەرێن لەناومان تازەیە
ناومان بە مەردی زانی
کو ئیجاد بووی لێرەیە

یێکو بەندمان لۆ بری
وە بزانە سەدەقەیە
یێکو ماچم بدەنی
جێژنانە و عالفەیە
بزانە کەس دیار نییە
جێمان کەندو سووگەیە
سەفەریە و رادەبرم
دەچمە کەندیناوەیە
کێندەر گوندەکی خۆشە
ئێ کچێ لە کەندیناوێ
مادام توو بەمن بڕێی
دەتنێرمە سەروچاوی
لە گوندان کێندەر خۆشە
عاڵڵا لەناو ئاقاری
پێی دەڕێن لەسەرخەتی
هێ برام سووتام و برژام
کۆترۆکەی سەر گومەتی
لە گوندان کێندەر خۆشە
گوندی کانەبیم خۆشە
خزمینە لە نەرمانی
وە کچێ بێنە ماچت کەم
چاو رەش چەندە جوانی
هەروا دەڕواو غەرمەی دێ
لەبەر زڕو پۆلیانی
سۆفی سمایلم لەڕێیە
لامەدەدا دیمەکاری
چاوم کەت بە کیژەکی
شیرینە حەوشەی دەماری
بە کراسی مەلەزکتان
ناوقەد وەکی شمشاری
گۆتم بێنە ماچت کەم
لە عالەمێ دیاری
لە گوندان کێندەر خۆشە
خزمینە سۆفی سمایل
یارێ بە ماچەک و دوو
چاو رەش لێت نابم قایل

سۆفی سمایلم زۆر خۆشە
گوندی ئاغە کەللەیە
دەستم کردە گۆتنی
دەستم لە کەلەمچەیە
سواری جێبەکی دەبووم
هاتم لۆ دیبەگەیە
داکی کیژان ئیخبار کرد
ئەمنیان برد لۆ قشرەیە
حاکم ئیفادەی پرسیم
دەرێ کورم مەحکومی
ماددەت سەت و سێزدەیە
بێ خەتاو بێ هووچەیە
کتابەکەم دەنووسی
لۆ عامی دیبەگەیە
کیژ ئیزرابیان لۆ کردم
گرتیان دەرکی قشرەیە
ئەگەر لۆمان بەرنەدەن
دەکەین موزاهەریە
عافەریم لەبۆ کیژان
ئەمنیان کرد تەبریەیە
تیلاکێ خۆم خوارد دەکرد
هاتم لۆ چایخانەیە
لەگەر کیژان دانیشتم
گۆتیان بڕۆ لێرەیە
ئەمە تاقیبمان کردییە
ئیخباریت لە دوو هەیە
سەفەریە و رادەبرم
دەچمە کۆزەپانکەیە
ئەنگۆ ئاگادارم بن
دەچمە کۆزەپانکەیە
حەیفم لۆ شێخ شێروانی
گوندەکی بەقەوغەیە
لە گوندان کێندەر خۆشە
دەچم لۆ گردی گۆمی
چاوم بە دوو قورینگان کەت
دانیشتبوون لەسەر گۆمی

لەو کاتیدا تێنیم بوو
ئەمنیش چووم لۆ سەر گۆمی
هەند لە یارێ رادەمام
لە رکان خلیسکەکم برد
دەوا و دەو کەتمە گۆمی
بەمستان لەخۆی دەدا
دەیگۆت هاوار لە خۆمی
لە گوندان کێندەر خۆشە
حەسەن بەگ لەسەر گردی
لامەدا ماری کیژەی
خزمینە بەشەو وردی
دەیگۆت کو هاتیە ئێرە
عەسری چاوم بەتووکەت
لۆ سەر بیرێ رابردی
بەقۆندەرەی بن عانە
بەکراسی روحلەفەندی
گۆتم دەبمە مێوانت
ئەو شۆکە بەشەو وردی
دەیگۆت لاوە بەخێربێی
تو عارەبی یان کوردی
چاو رەش من کورە کوردم
دەرێن ئەتۆ رەوەندی
سنگم لۆ تو پێشکەش بی
مەمکم وەک شەکرە قەندی
هەرچەند قومی لێم دەدا
دەیگۆت لۆ تارو توندی
سەفەریە و رادەبرم
با نەزانن لە گوندی
چاو رەش لێرانە بڕۆم
پێشم مەلا قەرەیە
تاقمە کیژەک ئەوا دێ
مەعلوم یەکیان سەلمەیە
ماریان وا لە لاپەڕێ
دەرکەی بەقەمەتەرەیە
دستی خۆم لی هەروەشاند
شۆڕ بووە لۆ عاویەیە

لەناو زەوێیی دامەزراند
خستیان دارو پووشکەیە
دەستەکم لە ملی دەکرد
گۆتی تالعت گەورەیە
گۆتم بێنە ماچت کەم
سەر پەنجەت بە خەنەیە
جوتیارەک جۆتی دەکا
دەری ئەوە گولەیە
زانیتی بابزانی
لەکنم گولە گەمەیە
دەچم لۆ سەید عوبێدی
گوندی برایماغەیە
ئەو گوندی قادراغەی
پێی دەرێن شۆڕەزەرتکەیە
دوو یارم لەوێندەرێن
زێنەب و ئامینەیە
یێکیان لەمنی دەپرسی
هەتیو خەرکی کێندەری
ئەسلم چەغەمیرەیە
یاری من کارمامزە
لە زوورگی سی چارەیە
بام داوە لۆ ماجیدی
بە غەرابەو عاویەیە
ناچم لۆ زەمزەمۆکی
لە بۆ من بی فایدەیە
چونکە عارەب زمان نیم
لێی ناکەم ئیدارەیە
دەچم لۆ بەرزەواری
گوندی ئاغە کەللەیە
دوو یارم لەوێندەرێن
مێرەم و حەنیفەیە
مێوانی کیژەی دەبم
ماریان وا لەپەرگەیە
دەرکەیان دوو دەریە
بە کلیل و شمشیرەیە
بەپێش ماریاندا دەچووم

یار دەماری حەوشەیە
خۆی بەباوشی دا دەدام
دەبنی پەرسێلكەیە
لۆ ماری دەگەڕاوە
دایە لەبادی دانێن
مێوانمان هات خدرەیە
جاری لە یارێم پرسی
گۆتم كێتان لێرەیە
هەتیم وەرە دانیشە
لۆ ئیشت بەتارووكەیە
نابی چاو رەش وانابی
لە عاڵڵای را هاتیمە
خۆ ئەوشۆ گەییمە مرادی
ئەگەر توو مەیل بكەی
خۆ ئەوشۆ كەڵەن نابی
گۆتی وەرە دانیشە
لەو دەم ودەستەی نابی
بابم گەلەك مەكرۆیە
بە قسان ئیخفال نابی
ئەدی تەگبیری چێیە
چ مەلا لە گوندی نییە
جێگەی شەوێی تەرتیب كرد
خانەخوێی بەڕاستییە
سینگی كردە قەنەفە
خەوم لەسەر كردییە
تازە ئەگەر بشمرم
من ئیمانم بردییە

* * *

بەستەی بابی كوردان
شێخ مەحمود

برام سەری من دێشی
چ بكەم در بریندارە
بابی كوردان باری كرد
ماری خۆی كرد ئەوجارە
بابی كوردان شێخ مەحموود
دنیایێ تو وبەتارە

ئەو قەومی سولەیمانی
قسمەكی زۆر غەدارە
چونكە خوا مەیلی لێ بوو
نیوەی برد بە فەتارە
فەیزانی ئاوی لێیدا
تێكی دەدا ئەو شارە
بابی كوردان باری كرد
دنیا لە من بوو تارە

* * *

هێ برام سەرێ من دێشی
قەسری بابی كوردانە
دەزگای لە داری كەلی
لە عالەمی دیارە
عافەریم لۆ رسمچی
كوی دەركرد ئەو ئەشكارە
. لۆیێ گریانم لۆی دی
عالەم دەدا بە پارە

* * *

هێ برام سەرێ من دێشی
جەرگم بووتنە كەسیرە
بابی كوردان باری كرد
عالەم هەمووی یەخسیرە
هەرچی پیاوی رەشید با
خۆ لەكنە وی نەدەگیرا
یێكو چەكی دەدانی
خەرجی و نان و زەخیرە
بابی كوردان باری كرد
فیراران هەمووی گیرا

* * *

هێ برام سەرێ من دێشی
غەمان لێكرد هەڵلایە
شەو بابی كوردانم دیت
لە خەونێم دیت ئەوهایە
لەناو باغی جەننەتی
حۆریان دەوریان لێدایە
مەجلیسیان گەلەك خۆش بوو

دنیا لۆ وا ڕۆنایە
جێگەی بابی کوردەکان
مەعلومە فەرەحنایە
گۆتم مێوانی خۆمە
گۆتیان ئەمری خودایە
ئەگەر خوا ئەمر بکا
خۆ جێگەی تو نەگیرایە
ئەمە لەو قسانەدا بووین
دەهات دەنگی سەدایە
دوو مەلایکەت هاتن
دەفتەریان لە مست دایە
گۆتیانە من بڕۆنێ
خێرو شەڕت نووسرایە
عیلمەکی زۆر تەواو بوو
هووردم کرد تەمەشایە
دووبارە سەحیم لێ کرد
چۆکم لەوی شکایە
نێرانە جەهەندەمە
جێگەی جەزاو جەفایە
گریان و ڕۆڕۆ و هاوار
کەس لۆت ناکا شوکایە
هانام بە بەر خوای گەورە
پاشای کوللی ئەشیایە
خوا ئەمریدا پێغەمبەر
بەسی بدمن جەفایە
ئۆمەتی محەمەدییە
لە نووری خوای خەلقایە
ئەمنیان بردە جەننەتی
ئەوەش ڕەحمی خودایە
خزمینە گێولە من بێ
چۆنی دەرێم ئەوهایە
جەننەت لۆ ئەو کەسەیە
عالەمی لێڕەزایە
هەرچی برای دینی بێ
ناکا فەرق و جودایە
داک و بابی هەمومان
باب ئادەم داک حەوایە

* * *

هاتم لەلای مەنداوی
بە (ماجیدی) هەردەڕێم
وا لەسەر کەندێناوی
کیژیان زۆر جوانن
بەجۆت دێنە سراوی
سەرو پەرچەمیان سۆرە
تەرەدەکاتن خوناوی
سەفەرم گیشە کەرە
ڕەش بوو لەبەر هەتاوی
ڕوبعە دینارەکم نارد
لۆ شوشەکی گوراوی
دینارەکم ڕەوان کرد
لۆ سۆراو و سپیاوی
تاقمەی شایی لە خۆدا
دەرچووە ماری پێناوی
ئەگەر ئەمن و یار یەک بین
چ پێناومان پێ ناوی

* * *

لە ڕەو ڕەوی وەردەکان

لە ڕەو ڕەوی وەردەکان
فڕین چوونە سەر دارێ
ئاوی زستانان ساردن
دەگوروێن هەنارێ
خەوی نیوەشەوێم خۆشدێت
لەگەر ناسک و نازدارێ
لە ڕەو ڕەوی وەردەکان
فڕین چوونە سەربانی
قورینگ ڕەویان تی کەتن
لەبەر چاوی پەیانی
برام لەبەر چاوی جوانی
لە ڕەو ڕەوی وەردەکان
دەفڕن نابەن ڕەوی
بەلای ماریاندا دەچووم
سەعات لەچاری شەوی

بە دەستەکی موبارک
یارم هەستاند لە خەوی
بەزارەکی پڕ شەکر
هەتیم ئەتوو چت دەوی
ئەوی ژوانی گرتیمان
کچێ باچینە ئەوی

* * *

هاتم لەلای مەدینە
بە چارۆگی ڕەنگینە
سەرهەریرە بەمبینە
لەسەربالای ئەو کچەی
دەستت دەدەمە
هاتم لەلای لهێبان
سینگ سندوقێ کتێبان
قازی و مەلا بابیکەن
ا دەبییەوە

* * *

هاتییە تەیری گەرمێنی

هاتییە تەیری گەرمێنی
بەوان دەرێن باشووکە
خۆی لە چیای سوورمێدا
فەرخەی بە چرووکە

* * *

هاتییە تەیری گەرمێنی
بەوان دەرێن قەتێیە
هات گەییە جۆگەی ئاکرێ
هێلانەی لە وەردێیە

* * *

هاتییە تەیری گەرمێنی
بەوان دەرێن کۆللارە
بەخۆی بەبار دەفرێ
فەرخەی لە دوای بالداره

* * *

چوومە سەر قەرەچووغی [٤]

چوومە سەر قەرەچووغی
سەر بەرندی ئاشی بایە
پێرێژنان دەورە لێدام
ئەی کاکی لەبەرپایە
مەکانت لەکی لایە
وەک ماری بێ مەکانم
دەگەڕێم لەو دنیایە
ناوی عەسکەریم هاتییە
جێبەک وا راوەستایە
خدرۆکی عەولا خەجێ
ئەویشیان لەگەڕ دایە

* * *

کچ و کوڕ

کچ: ماری بابم دوورە ڕێیە
لانکی ساوام پێیە
قەد ناگەمە جێیە
کوڕ: دەڕۆم و دەنارم
کۆتری پێ بە خارم
لە دوو تو عەبدارم
کوڕ: دەڕۆم و دەزیزم
کۆتری پێ بەزریزم
لە دوای تو عەزیزم

* * *

هانایێت وە بەر دەبەم
دووەمێن بە بەر فەلەکی
لە کیستانان دێتە خوار
خێل و ڕەوەندی هەرکی
دونێم چاو بە یارێ کەت
لەسەر کۆشێ کوڕەکی
لەموایە یاری منی
نەمزانی دۆستی خەرکی
ماچی کچانم هەرزان کرد
دوازدەم هینا عانەکی
حەیفە ئەوها هەرزانی
ئەتوو لە بۆ کوڕێ خەرکی

* * *

هانایێت وەبەر دەبەم
دووەمێن وەبەر پێغەمبەر

هەناسەکەم هەرکێشا
لەدرم دەرچوو دوکەر
لەبەر ئاهو نزای من
دەسوتا مەرگەو پژدەر
یاریّ تیرەکی لێدام
چاو رەش و ئەبرۆ سەقەر
لەلای راستە دەدام و
لەلای چۆپەم دەچووە دەر
هەرچی ئەمنی خۆش دەوی
بەتالوکەم بێتە سەر
هەرچی ئەمن و تووی لێککرد
رەبی حەفت کۆسی کەوی
چی لە ماریّ نەمینی
کیژەکەی بە دوو کەوی
دایکت بە دوو کەوی
چاوت وەک چاوی بازی
روومەتت دەنگی کەوی
قۆلم بۆ بکە بەسەرین
بە جووت خەومان لی بکەوی
* * *
هانایێت وەبەر دەبەم
دووەمیّن بە بەر سوبحانی
حەزم لە کیژەکی کرد
ئەوشۆ دەبمە میوانی
بەژنی یاریّ دەرۆیی
برۆنە دەعیە و عینوانی
عەبا و پێچەی لەخۆی دا
دەستووری شارستانی
کەیفی گۆتنێم هەرستا
وەک عەلی بەردەشانی
دەستم کرد بە گۆتنی
لۆتکەم مەحتی زولفانی
زولف و پەرچەمی زەردن
دەنگی داوە گۆرانی
برۆنە کراوی رەواندزی
تێی ئارانديە کاشانی

دوو هەوری لەملیە
دەستە سر لە گیرفانی
سەرداریەکی لەبەردا
کراسی پەلک رەیحانی
ئاوێنەی لە بەرکیە
شەوقی دایتە کلدانی
زرو پۆلیەی لەخۆی دا
خۆی هەرێخست کیژانی
زولفی شۆری هاتە خوار
کەتە سەر رانەکانی
چاوی قەترانی رەشە
هەروەک چاوی جەیرانی
چاوی خۆی پر دەرمان کرد
نەیکردە بارگرانی
شێت و شەیدا و سەحرامە
جەرگم بوویتە بریانی
گۆشتم لەخۆم حەرام کرد
هەروەک گورگی کەنعانی
خواردنم گیاو گۆرە
لە میسالی حەیوانی
* * *

هی برام سەری من دێشی°

هیّ برام سەریّ من دێشیّ
دەردیّ لە درم هەللایە
دەچمە سەر کۆشک و باران
دەگەرێم لەو دنیایە
دەچمە کاولە عەوێنەی
دوو پۆلیس لیّ کوژرایە
خەبەریان برد لۆ گوێری
چ بووە و چ قەومایە
شەش پۆلیس و سیّ معاوین
قۆمیسەر لەگەر دایە
لا بدەینە شێخ شەروانی
هیّ برام بکەین رجایە
کاکە رجامان بکرن
ساحێبمان لیّ کوژرایە

چووینە لۆ سەر پۆلیسان
یەک مەردییە و یەک مایە
حەمەدۆکی قادری
دوو لەبزی لە زگی دایە
دوو قامچیان لەوی دەدا
ئەویان لە تورمبێلی نایە
کێ ئەو پۆلیسانەی کوشت
رەشید کوڕێ عەولایە
دەورەی دیوەخانێم گرت
پاکەت لە تفەنگێ دایە
مار و مندار و یەخسیر
لە ترۆمبێلیان نایە

* * *

مەحتی یارێ

دەی دەی دەی دەی
لۆو دەکەم مەحتی یارێ
مەحتیشی هەر ئەوهایە
دەنگۆ بڕۆنە حەیرانی
قوللابی لە کێ دایە
سەر کۆترۆکەی بە قاران
هەمووی بە گور لێدایە
لەبەینی هەردوو مەمکان
مامزەکی لی نووسرایە
کورتەک دەرێی بلەورە
لە زێڕی دا رێژرایە
داکی لە ماری نەبوو
دەرکەمان پێوە دایە
دەستەوانەک لە دەستی
قل قلی کارەبایە
دوو جۆت بازنی لە دەستی
ناوی خۆی تێ نووسرایە
تاسەکی زێڕ لەسەری
شەوقی وەک رۆژێ دایە
جۆت شەمامەی سەر سینگی
بەجۆتە هەریان دایە

هەرچی دوو سێوی بۆن کا
بەهەشتی سەر دنیایە
دوونێم دانی هێوارێ
کورتەک بە کوردن دایە
شاگرد وا لە هەولێری
وەستا وا لە بەغدایە
حەفت دەرزیلەی پۆڕابن
لە کورتەکەدا پسایە
چاوت کۆرەبی وەستا
بەکەیفم نەدوورایە
خۆ من کورتەکم دەوی
سەد لیفکەی لێ درایە
لەگە گورینگی هێزارێ
رێی کانی سواری تیایە
سەد ئاغەو بەگلەر لۆی دێن
هێشتا بابی نەیدایە
ئەگەر یارم نەناسن
سەر چەنەگەی کوترایە
بەو قەرەمی نەخشایە
پێم دەگۆ لۆ ماچەکی
رووێ خۆی کرد لەولایە
هەتیم هێروەتر گۆڕایە
گەردن جێیێ خەناوکان
سنگ بە گوراوی رشایە
مەمکی دوو سێوی لاسۆر
لە قەراتێ گیرایە
ئەوشۆزی دەچمە ژوانی
دونێی قەولی پێم دایە

* * *

لە کێم دیت و لە کێم دیت
هێ برام لە وراتی کۆیێ
دەمڕۆنیێ دووربینی
دەستم دەدا برنۆیێ
مەمکی ئەو زالم بابەی
زەردە وەکی لیمۆیێ

* * *

لە کێم دیت و لە کێم دیت
هێ برام لە زوورگەزراوی
هەسپم لە بۆ دەربێن
دەستان دەنە لغاوی
گۆتم بێنە ماچت کەم
ئەسڵ کیژە خۆشناوی
* * *

لاوژۆ

(بۆ شین دەگوترێ)

لاوژەی لەسەر شۆرێ
لاوژەکەم لاوە
دێ دەنگی تەمبووری
لاوژەکەم لاوە
ئەشقە لە کچە پووری
لاوژەکەم لاوە
لاوژەی لە قەراتێ
لاوژەکەم لاوە
دوورەو دەسم نایگاتێ
لاوژەکەم لاوە
* * *

ناربەند

(بۆ شین دەگوترێ)

هەی ناربەندە هەی ناربەندە
ئەو ناربەندەم کوڕە جووە
کیژ دەڕواتن کوڕ لە دووە
* * *
ئەو ناربەندەم لە قەراتێ
ناران لێدەن ڕۆژهەراتێ
کیژ دەڕواتن کوڕ نایگاتێ
* * *
ئەو ناربەندەم کوڕە دیانە
ناران لێدەن سەرخمخانە
* * *

تێکستێکی ئایینی

لە کوڕە ئەسحابان لاوێ چەختی
لە هەسپاندا زین و ڕەختی
هەسپیان حدود مامز گرن
وەکی تەیرێ لە عاسمانێ
هاتن گەیشتنە گەروێ دارێ
شێریان لە پۆرای کرمانێ
وەک ئاوێ دەبڕن زیندانێ
کافر زۆرن بنیان نایە
ئەو کافری بێ ئیمانە
دووربینی دا بەر چاوانە
دیتی خێوەت لە مێرگانە
قاسیدەکی کرد ڕەوانە
بزانی کێ سەرکردەی وانە
بزانە کێ یان سەر عەسکەرە
چیان لازمە لۆیان بەرە
لۆ ئەسحابەی پێغەمبەرە
زێڕیان دەکرد کۆمەرە
هەر قوبەکی ئەوان دەگووت
وە قولە زەنگیان هەروەک بزووت
قامەت درێژیان بەدەن رووت
لەسەر دانیشتن بە سکووت
قەهاریان کا خوای لایموت
قەهاریان کا خوای مەناف
کافری لە حێن نایەنە ژمار
ئەو کافری بێ ئیمانە
گێیێ کورکنی ناو یەکانە
لە کوڕە ئەسحابان لاوێ مەتین
بەعەجەلە کەوتنە ڕۆیین
* * *

٤: تەحسین حەسەن حەمەد.
- لە سالی ١٩٥٧ لە گوندی "قەپلان" لە دەشتی کەندیناوە لە هەولێر لە دایک بووە. ئێستا (معاون طبی) یە لە هەولێر و تەمەنی ٥١ساڵە.هۆنراوەکانی: (چوومە سەر قەرەچووغی، دە هەرپەڕە )م لی وەرگرتووە.
٥: ئەنوەر عومەر وسوو.
(*) لە گوندی "شێخ شەروان" ی سەر بە پارێزگای هەولێر لە دایک بووە و هۆنراوەکانی لە پێشەوە یادداشتمان کردن، جگە لەوانە ئەوانی دی لەم برایە وەرگیراون و لە زاری ئەوەوە تۆمارکراون.



# حەیران!!

## دکتور مەولود ئیبراهیم حەسەن

فۆلکلۆری کوردی لە چەندین بەش و بابەت پێکهاتووە، لەنێو ئەو بەشانەشدا (حەیران) شوێنی تایبەت بەخۆی هەیە، حەیران بریتییە لە (ئەدەب) و (هونەر) واتە (شیعر) و (ئاواز) کە جۆرێکی تایبەتە و لەو تایبەتیەشدا، تایبەتە بە دەشتی هەولێر و لەسەرەتاشدا هەر بە شێوەزاری هەولێر سەریهەڵداوە و گەشەی کردووە، هەرچەندە ریشەیەکی یەکجار کۆنی هەیە و لەگەڵ ژیانی مەرداری و گەرمیان و کوێستان کردن پێگەیشتووە. ئەگەر ئاوازەکەی بریتییە لە (مەجلیسی) و (سەرچیایی) ئەوا ناوەرۆکەکەشی بریتییە لەباسی ژیانی کۆچ و کۆچباری مەرداران و لێکدابڕان و پێکگەیشتنی دلداران، حەیران لە بنەڕەتدا (کوڕ) بەکچیدا هەردەڵێ، بە پێچەوانەی لاوک، کە لەبنەڕەتدا (کچ) بە کوڕیدا هەردەڵێ، هەرچەندە لەگەڵ گۆڕانی ڕۆژگار (لاوکبێژ) و (حەیرانبێژ) لە هەردوولا پەیدابووە، واتە کچ و کوڕ و ژن و پیاو ئێستا هەڵکەوتووی هەردوو هونەرن.

ئەگەر شاری هەولێر لە بیناسازیدا (قەڵا)کەی کۆن و بەناوبانگە، ئەوا لە هونەریشدا (حەیران)دکەشی کۆن و ناوداره.

لێرەدا بەشێک لە هەولی لێکۆڵەرانی حەیران و هەندێک لە حەیرانبێژ و دەقی حەیران دەخەینە بەردەستی خوێنەرانی ئینسکلۆپیدیای هەولێر، بەو هیوایەی کە ببێتە هۆی ناسینی حەیران.



# دەقێکی حەیران

## گوتنی: سەعدی عەلی

کیژ دەرێ: هەولێر هەولێرە،
لە سەری قەراتە لەبنی باژێرە،
سینگ و مەمکێ خۆت لۆ دەکەمە ئەوان دوکان و قەیسەرییان وەرە،
سەبر سەبر هێدی هێدی دەستانی تێ بگێرە.
کوڕ دەرێ: هەولێر هەولێرە،
هەولێر بلاوە لەسەری قەراتە لەبنی ئێکاوە،
یاری خۆشم دەشوبهاند بە قاز و قورینگەکانی گەردەن کێلی شاپەڕ بەخوناوە
دونێ هێوارێ گەیمە بەژنێ باریک لە زارییێ کۆرانێ
دەمگۆ بینە ماچکەم خەت و خارێ گەردەنێ چکو داکی پەسند بوو چەندە جوان زولفی هەرداوە.
* لە کتێبی سەربردەی کۆمەڵە حەیران بێژێکی کورد

# حەیران و هەولێر

خالید جوتیار

**سەرەتا**

دەشتی هەولێر دەشتی تێکەڵاو بوون و بەیەکدی ئاشنا بوون و غەریب بەخۆگر و پەنای لایی دانە، دەشتی چەندان عەشیرەت و تیرە و بەرە و بنەماڵە، دەشتی پیاوچاک و سوارچاک و پیاوەتی و جوانی کێشە و گێچەلیش، دەشتی ژیان بەمانا فراوانەکەی، دەشتی پێکەوە گونجاندن و لە مەنجەڵ نانی چەندان سەر و توانەوەی هەزاران رەنگ و دەنگ و کوراڵی - چەندان دەنگی لاوک و گاز و حەیران، دەشتی ئیمان و تەقوا و سەلاواتی دەرویشان و رافزی و لادەرانیش، دەنگی بەجورئەتی حەیران لە کوڕ و دانیشتنی شێخ و مەلا و دەرویش و مورید و ئاشقان، حەیرانی سەر بەگۆبەندی هەولێر، حەیرانی ماچ و موچ و ژوان و راموسان، حەیرانی بەر ڕێ و پشت ڕێ، حەیرانی سەنیە و مرکیە و کەندیناوە و قەراج.

**هەولێر و حەیران**

شاری هەولێر وەک مێژوونووسان و شوێنەوارناسان باس دەکەن لە بەڵگەنامەکانی سۆمەرییەکان ساڵی ٢٠٩٥ - ٢٠٤٨ لەسەردەمی (شولگی) ناوی هاتووە، دیارە تا ئێستا مێژووی دروستکردنی قەڵای هەولێر دیار نییە، کە زۆر پێش سۆمەرییەکان هەبووە و ئەوان هاتوون داگیریان کردووە، هەمیشە میللەتانی زاگرۆس و ئەو تیرە و هۆزانەی دوایی ئێستای نەتەوەی کوردیان دروستکرد، لێرە ژیاون و بەپێی باری سەردەمیان ژیان و تایبەتمەندی ناوچەییان هەبووە، وابوو شا "سەنحاریب" لەسەردەمی پاشایەتیدا ئاوی لە بەستۆرەوە بۆ شاری هەولێر هێنا و لەسەر یەک لە بەردەکانی دەربەندی ئاوەکە لە نزیک گوندی (قەلامورتکیان) ئەو پرۆژەی تۆمار کردووە، لە سەردەمی کۆندا لە رێگای ئایین و باوەڕی میتولۆژیای ئەوکات، کە دەسەڵاتێکی زۆر باڵای هەبووە لەسەر بیرکردنەوەی خەڵک توانراوە ئەو شوێن و ناوچە دوورانە بپارێزن کە داگیریان دەکرد، شوێنی دیاری هەولێر لەو هەرێمە کاریگەرییەکی زۆری هەبوو لە ئاڵوگۆڕی بازرگانی و ئالقەی پەیوەندی بوو لە بەینی ئاشوور و بابل و کەرکوک، لەگەڵ هاتنی سوپای ئەو نەتەوانە لە هەولێر و دەوروبەری داب و نەریت و باوەڕی تازە بڵاو دەبووەوە و هەندێکی لەگەڵ لێکدانەوەی خەڵکی ناوچەکە دەمایەوە، ئەگەر بەوردی زەین بدەینە مێژوو دەبینین لە سەردەمی سۆمەرییەکان، کە دوور و نزیک پەیوەندییەکیان لەگەڵ کوردی ئەمڕۆ هەبووە، یەکێک لە داب و نەریتە هەرە گرنگ و دیارەکانیان (زەماوەندی پیرۆز) بووە، کاریگەرییەکی راستەوخۆی هەبووە لەسەر پەرەپێدانی هۆشیاری و حەزەکانی مرۆڤ بۆ جووت بوون و پیت و بەرەکەتی زەوی، کە لەم رێگەوە دوعای پیرۆزیان دەکرد بۆ بەروبوومی زۆر و بەپیت و بەرەکەتی، ئەو سەروەتە پەرییەوە بۆ هەموو ئەو شوێنانەی بن دەسەڵاتی سۆمەرییەکان و بەگۆرانی دەوترا و دیالۆگی نێر و مێ بوو بۆ گازکردن و یەکدی وروژاندن بۆ سێکس، زەماوەندی پیرۆز لە نهێنییەکانیدا کاری کردە سەر گوتن و لە حەیرانی دەشتی هەولێر شوێنەوارێکی گیانی بەرز و دیاری جێهێشتووە، دەتوانین رەگە هاوبەشەکانی نیشان بدەین.

ژیانی مرۆڤایەتی بەپێی شوێن دەگۆڕێ، خەڵکی ژینگەی دەشتایی لەگەڵ خەڵکی چیایی لە زۆر لێکدانەوە و روانین جیاوازن، کاریگەری سروشت لەسەر مرۆڤ و پەروەردە بوونی هەندێ جار بیرکردنەوەش دەگۆڕێ، بۆیە

هەر شوێنە و ئەدگارێک هەڵدەگرێ و دەشێ بەرهەمی جیاواز، تەنانەت لەڕووی گوتن و بیرکردنەوەش ساز بکات، بۆیە دەبینین فۆرمی گوتنی چیایی لەگەڵ گوتنی دەشت لە ڕووی لەرینەوەی قورگ و جولان و بەرزی و نزمی دەنگ دەگۆڕێ، **هەولێر بەو شوێنە جوگرافیایەی هەیەتی لە بەرایی مێژوو تایبەتمەندی دیاری بۆ سنووری چێژی دانیشتووانی شیرازە کردووە، کە دەڵێین هەولێر واتا حەیران، ئەو فۆرمەی گوتن کە هیچ ناوچە و شارێکی دیکەی کوردستان وەک هەولێر ناویانگی پێ دەرنەکردووە، ئەگەرچی لە هەندێ ناوچە حەیران گوتن لە هونەرە دیارەکانە.**

**لەسنووری پارێزگای هەولێر بەگشتی حەیران هەیە، بەڵام بەپێی دەق و چێژ سەیر دەکەین، "کەندیناوە" و"قەراج" ناوجەرگەی ئەم جۆرە گوتنەیە کە حەیرانی ئەم دوو شوێنە لە هەموو شوێنەکانی دیکە بەتامتر و ڕەسەنترە.**

### حەیران چییە؟

**پارچە پەخشانێکی شیعر ئامێزە لەجوانی و عیشق دەدوێ، دیالۆگی گازکردنی نێر و مێیە بۆ ژوان، بێ مورادی و بێ بەش بوونە لە جووت بوون، سۆزی ئەڤینە بۆ خاک و شوێنە پیرۆزەکان،** لە داڕشتنیدا پێویستە سەربەند و دوابەند یەک بگرنەوە، کە لە حەیراندا تەسلیم بوونەوەی پێ دەڵێن، لە بنچینەدا پێویستە سێ بەند کەمتر نەبێ. ئەو پێناسەیە چڕکردنەوەی ناوەڕۆکە، بەڵام ئەگەر بێت و سەرنجی دیکەی بدەینێ دەبێ بچینەوە هەوای گوتن، کە دەنگ و ناوەڕۆکی حەیران دەگرێتەوە، لە ڕووی گوتنەوە بەرایی کە حەیرانبێژ هەستانێک دەکاتە پێشەکی حەیرانەکە، ئەوە بانگ کردنی بەرامبەرە، گازی دەکا، ئاگاداری دەکاتەوە کە یەکێک هەیە بەدوایدا دەگەڕێ، دەیەوێ رازێکی پێ بڵێ، رازەکە هی ئەوەیە سۆز و جورئەتی لەگەڵ بەکاربێت، بۆیە ئەو هەڵدانە بە (ئای... ئای...) یان (حەیران ئەمن دەرێم) یان هەر دەربڕینێکی سەرنجراکێش، کە پێش دەقەکە بکەوێ لەکاتی گوتندا حەیرانبێژ دەستی دەخاتە بنا گوێی تا هەست بەسەدای دەنگی خۆی بکات و لەوەوە دەزانی گوتنەکەی سۆزدارە یان نا! بەمجۆرە وەک ئەوە وایە چۆن خۆی بکاتە چاودێری جۆری گوتنەکەی.

بەرزی و نزمی دەنگ یان خێرایی دەربڕین و هێوربوونەوە لەگەڵ ناوەڕۆکەکە هاوڕاز دەبن، ئەمانە هەمووی پەیوەندی بەباری دەروونی و تێکەڵ بوونی حەیران بێژ هەیە لەگەڵ دەق و چێژی گوتن، دەنگ هەڵدان چەندان مەبەستی هەیە: بۆ گەیاندنی راز و ژانی دووری و ژوان بەستان، دوایی کە هێور دەبێتەوە جۆرێکە لە کپ بوونەوە یان خاوبوونەوەی سێکس، ئەوکاتە حەیرانبێژ هەموو ئەو دەرد و دوورییە لەخۆی نزیک دەکاتەوە و دەیهێنێتەوە ناو خەیاڵاتی خۆی تا دواجار لەگەڵ ژانەکانیدا پێکەوە ئارام بینەوە. حەیرانبێژ دوای هەڵدانی بەرایی چەند دێرێکی جوان و شایستە بۆ وەسفەکەی دەردەبڕێ و لەسەر بەندێکدا رایدەگرێ، دوایی سەربەست دەبێ لە دەربڕین و هەڵبژاردنی وشەی جوان و پێکچواندن، هەناسەیەکی قووڵ دەدات، خەیاڵاتی بەسەر هەندێ لایەنی دەروونی دەگەڕێ تا لە کۆتاییدا نزم دەبێتەوە هەتا دەگاتەوە خاڵی مەبەست و ئەوجا بەهەمان قافیە لەدوابەندا تەسلیم دەبێتەوە، حەیرانبێژ هەیە لەگەڵ کۆتایی دوابەند ناڵەیەک یان ئاخێک لەگەڵ دوا وشە تێکەڵ دەکاتەوە، لە دوابەندا حەیرانبێژ زۆر شارەزا و هونەرمەند نەبێ تووشی هەڵە دەبێت، چونکە نابێ دوا وشە بە تەواوی دەربڕی و ئەوجا حەیرانەکە تەسلیم بکەیتەوە، دەبێ دوا وشە لەگەڵ گوتندا تێکەڵ بکەیتەوە و لەگەڵ شەپۆلی دەنگ و هەناسەدا پێکەوە ئاوێتە بێت، بۆیە شارەزایانی حەیران لە هەڵدان و دوابەندا حەیرانی باش و خراپ لێکدەکەنەوە.

لە ناوەڕۆکدا دەقی حەیران بەرزکردنەوەی چێژە بۆ باڵا بوون و گونجاندنی لەگەڵ باری دەروونی خۆی، ڕاهێنان و دەستەمۆکردنی کەسی بەرامبەرە بۆ ئاوێزان و ئەڤین، بۆیە هەوڵدەدا بیباتە پلەی پیرۆزی و لە شێوە گشتییەکەی خەڵکی بترازێنێ و تایبەتمەندی خۆی بداتێ و ڕوانینی خۆی ئاراستە بکات، ئەم ختۆکەدانە بۆ هەست بەخۆ کردن و زیاتر هەڵچوون و وروژاندن لە بارە ئاساییەکەی ڕۆژانەی لادەدا و دەیخاتە کونجی تەنهایی و خۆ دواندن تا رازی بکات بەو وشە جوانانە قایل بێ و ڕێگەی نەگرێ ئەگەر بە دەربڕینی جوان یان بەو دەقە شیعر ئامێزە لە باوەشی بگرێ و هەندێ دەستبازی لەگەڵدا بکات، ئەگەر بە قسە و گوتنیش بێ. بۆیە حەیرانبێژ خەیاڵێکی زۆر فراوان بۆ جوان کردنی دەقەکە بەکار دێنێ و لە گەرمەی ئەو هەڵچوونەدا

ناسکترین شێوەی دەربڕین بۆ گەیشتنە مەبەست دێنێتە ڕوو.

ئەگەر سەرنج بدەینە ناوەڕۆکی حەیران هەست دەکەین، کە تەونی دارشتنەکە و دەربڕینەکانی زۆر سێکسین و تەنیا لە حەیرانبێژان قەبوڵ دەکرێ بەو شێوەیە باس لە بەژن و باڵای ژن بکات، گوێگری حەیران لە بەرامبەریدا ئارام و کپ دەبێ، کە لە هەندێ لای کۆمەڵایەتییەوە ئەو دەربڕینانە ناپەسەندە، کەچی لە کوردەواریدا بەتایبەتی دەشتی هەولێر نەک هەر پیاوان، ژنانیش گوێدەگرن و لەگەڵ گوتنیدا ئارام دەبن، بێ ئەوەی کەسێک دژایەتییان بکات، ئەوە ڕەگ و ریشەیەکی زۆر کۆنی لەگەڵ ئەقیدە و پەرستن و متیولۆژیاوە هەیە، ئەمڕۆ تەنها هێماکانی ماوەتەوە، بەتایبەتی لەدوای هاتنی ئیسلامەتی، کە سنوورێکی لە بەینی حەڵاڵ و حەرام داناوە، ئەو فۆرمەی گوتنی حەیران لەو فراوانییەی نەچۆتە بن باری کپکردن و لەناوبردن، بگرە هەمیشە وەک پێویستییەکی گیانی سەیری کراوە، لە کۆڕ و دانیشتنان بە عیشقەوە داوا لە حەیرانبێژان دەکرێ حەیران بڵێن و بەوپەڕی تاسەوە گوێیان لێ دەگرن و پێشەکیش دەزانن حەیرانبێژ چی دەڵێ، ئەوە ئەو حاڵەیە کە لە دەروونی مرۆڤ شوێنێکی پیرۆزی هەیە، هەموو حەیرانەکان یەک ناوەڕۆکیان هەیە، ئەویش حیرمانە لە خۆشەویستی و ژوان، بەڵام شێوازی جیا هەیە بۆ ئەم مەبەستە. واتا هەرجارەی جۆرێک لە جوانکاری و بەتام کردن و بەرزکردنەوەی ژیژ هەیە بۆ دەقەکان، بەڵام هەندێ حەیران هەیە ناوی شوێنی تێدا نییە لە زەمەن و شوێنێکی بزر دەدوێ، ئەوە خەیاڵی مرۆڤە کە چۆن لە نهێنییەکانی دەدوێ، بۆیە کە بەرامبەر مەرگ دەبێتەوە زۆر جوان، لەو حاڵەتە دەروونییە دەدوێ و شاعیرانە ئەو تەنگژە دەروونییە دەخاتە ڕوو..

**حەیران..... ئەگەر ئەمن مردم**
**ئەنگۆ قەت مەڕێن درەنگە**
**قەبرەکی لۆ من لێدەنەوە لەسەر سینگ و مەمکی نازدار حەیرانێ**
**لێ مەدەن بە کورینگ و بێران بیرازەی تەنگە**
**گەلی برادەرینە.... ئەوجا لۆ من بڕێنە**
**دوو چاوی ڕەشکۆکە کابانی گەورە مارێ**
**دەبا هەموو ڕۆژێ چار شەموان**
**لەگەر گەلی دەستە خوشکان بێتەوە**
**سەر قەبری کورەیەتیم حەیرانێ**
**ئەمان بەهاوار و دەنگە.....**

ئەو دەقە لەڕووی پێکهاتەیەوە باسی هیچ شوێن و ناوچەیەکی دیاریکراو ناکات، بەڵکە حاڵەتی ترس و نیگەرانییە بەرامبەر بوون و حەزی حەیرانبێژە، کە خۆشەویستەکەی بێتە سەر گۆڕەکەی ئەوکاتەی دەمرێ، کە لە ژیاندا ئەو حەزەی بۆ نەهاتۆتە دی. لێکدانەوەیەک دەداتە ئایبندە، دڵی بە دەربڕینێک ئارام دەکاتەوە، کە سەر گۆڕەکەی بە چرپە و دەنگ و ئاواز ئاوەدان ببێتەوە، بۆیە دەکرێ ئەو حەیرانە لە هەموو شوێنێک بگوترێ، سنوورێک نییە بۆ بیر کردنەوەی مەرگ و لە هەموو کەلەبەرێکی دنیادا هەیە، ئەوە پەیوەندی تەنها بەمەرگی حەیرانبێژێکی هەولێری نییە، بەڵکە لەهەر شوێنێک ئەو مرازە هەبێ یان ئەو غەمە دەروونییە هەبێ لەوێ ئەو حەیرانە هاوڕازمانە بۆ دنیای فانی، کە هەمیشە حەز و ئارەزووەکانی وامان لێدەکات بیر لە جوانی بکەینەوە یان بیر لەو ئاواتانە بکەینەوە، کە ڕۆژگارێک لێی بێبەش بووین.

لە هەولێر بەپێی باری جوگرافی دەشتایی و شاخە، بۆیە ئەم لایەنە کاری لە جۆری گوتنی حەیرانیش کردووە و لەڕووی دەنگەوە حەیرانی کردووە بەدوو بەشەوە:

حەیرانی کۆڕ و دانیشتنان، کە "مەجلیسی" پێدەڵێن، حەیرانی سەر "چیایی" واتا هەڵدان و بەرزکردنەوەی دەنگ بۆ گەیشتنە بەرزایی، کە مەرامی خۆیان هەبووە بۆ بەئاگا هێنانی جوانان لە قەدی چیا و هۆشیار کردنەوەیان کە لەخوارەوە بۆ سەرێ بەدەنگێکی بەرزتر لە دەنگی ئاسایی، کاتی گوتنی حەیرانی سەرچیایی هەمیشە لە دەرەوەی ژوور و دیوەخانەکان بووە، ئەو کاتە بووە حەیرانبێژ چەند کچێکی لە چیا بینیوە، ئەویش بۆ گەیاندنی دەنگ و حەزەکانی بەو دەنگە لە چینێکی باڵاتر هەڵدەدا بۆیان، ناچارە وا بکات، چونکە یان ئەو ڕێچکەیە بدۆزێتەوە دەنا مەرامەکانی ناگاتە ئەوان، دڵنیام هەموو حەیرانبێژێک ئەم جۆرەی پێ ناگوترێ ئەگەر لە خودی قوڕگی حەیرانبێژدا تایبەتمەندی بەرزی دەنگ نەبێت، حەیرانبێژان قەت لە گوتندا لە ناوەڕۆکی حەیرانەکانیان شەرمیان نەکردووە و لەبەر خاتری هەندێک سانسۆریان نەخستۆتە سەر جۆری دەربڕین و

دەقەكە، ئەوپەڕی ئازادی بووە، كاتێ بە جۆرێ تەوە تەنانەت ناوی هەندێ كەسیشی هێناوە، لە نموونەی كیژە جوانەكانی وەك (جەواهیری ئەحمەدی بادینان، خەزارە شۆڕی مەلا نەبیان، ئەسمەرێ كابایزی... تاد) ئەوە نیشانەی ئەوەیە حەیران و حەیرانبێژان شوێنێكی دیار و پیرۆزیان هەبووە لە كوردەواریدا و هونەرمەندی بەتوانا بوون، بۆیە كیژە و كەس و كاریشیان شانازیان كردووە، كە ناویان لە حەیراندا هاتووە، بێگومان جارێكی دیكە ئەو لایەنە دەمانباتەوە سەر رەگ و ریشەی مێژینەی حەیران و دابی زەماوەندی پیرۆز، كە تەنها شایستەی نموونەی زۆر جوان و درەوشاوەی سەردەمیان بوون.

لە زەماوەندی پیرۆزدا هەمان ئەو دیالۆگە هەیە، كە لەبەینی كوڕ و كچی دەشتی هەولێر هەیە واتا بەینی نێرینە و مێینە گاز كردنی یەكترییە بۆ خۆشەویستی و هەریەك لەم دوو لایەنە بەجوانییەكانی ئەوی دیكەیان هەڵدەڵێ، چێژی لەش و جوانییەكانی بەرز دەكاتەوە، داوا كردنە بۆ لەباوەشنان بۆ جووت بوون، بۆیە لە سرووتی زەماوەندی پیرۆزی سۆمەرییان "دوموزی" لەگەڵ "ئینانا" - كە دوایی دەبێتە ئەشتار زۆر راشكاوانە باسی ئەندامەكانی نێرینە و مێینەی خۆیان دەكەن و بە سینگ و مەمك و باوەشی یەكتریدا هەڵدەڵێن، واتا یەكدی دەجۆشێنن یان دەوروژێنن بۆ ئەوەی لە پەرستگایەكی تایبەت دوای بۆن خۆشكردنی شوێن و لەش و رازاندنەوەی جێگا و كەمژاوەی هێنان و پێشوازیی لە چەند رۆژ و شەوێكدا ئەو كارە ئەنجام دەدرێ و دەبێتە بەختیاری و دڵشادی دانیشتووان، چونكە بەو بارەی بەروبووم زیاد دەكات و زەوی بەپیت دەبێت، ئەو دیالۆگە ئەگەرچی لە هەموو سەرچاوەكانی زمانی عەرەبی بلاوكراوەتەوە، بەڵام لەبەر زۆر راستەوخۆیی باسكردنی ئەندامی نێرینە و مێینەی ژن و پیاو و ئەنجامدانی سێكسی، ناكرێ من لێرە وەرگێڕانی دەقەكانیان بلاوبكەمەوە، خوێنەر خۆی دەتوانێ بگەڕێتەوە سەر كتێبی (كرایمەر) بەناوی "زەماوەندی پیرۆز" لە سەردەمی سۆمەرییەكان، بەپێی خوێندنەوەی سەرچاوە و هەمیشە سۆراغكردن و خۆشەویستی زۆرمان بۆ حەیران لە هەولێر وامان كرد سەرچاوەكان بخوێنینەوە و بێ ئەوەی بیروڕای كەسێكی دیكە بكەمە رێ نیشاندەر، چونكە من لە ساڵی ١٩٧٤ لە رۆژنامەی هاوكاری كە وتووێژێكم لەگەڵ (سێودین)ی حەیرانبێژ ئەنجامدا بوو نووسیوومە، كە هەولێر كانگەی حەیرانە، بەڵام ساڵی ١٩٧٨ كە بۆ یەكەمجار لێكۆڵینەوەیەكم ئەنجامدا بە هەندێ بەڵگەی ئەوكات و پشت بەستن و بەبیروڕای مامۆستا د. مارف خەزنەدار، لە ئەنجامی لێكۆڵینەوەكەدا گوتوومە: لانكی سەرهەڵدانی حەیران لای (مەهاباد)ە، لە پێش من هیچ نووسەرێك لەناو كورد بەو جۆرەی باسی حەیرانی نەكردبوو، لەبەرئەوە خۆم سەرەتایەكم دەستپێكرد و لەوكاتەوە بەردەوام سەرنج و خوێندنەوەی تایبەتم هەیە بۆ حەیران، من زۆر پێش خەڵكی دیكە دەزانم حەیران لە هەولێر هەیە و زۆریش جوان و سەركەوتووە، ئەوكات زانیارییەكان بەردەست نەبوون، بەڵام من گرفتێكم لەگەڵ مێژووی -كەندێناوە و قەراج- هەبوو كە بەمەڵبەندی سەرەكی حەیران دادەنرێت، من كە زەین دەدەم هەموو ئەو عەشیرەت و تیرانەی لەم دوو ناوچەیە دەژین لە بنەچەدا هی ئەو دوو شوێنە نین، بەڵكو بەشی هەرە زۆریان لە رۆژهەڵاتی كوردستانەوە هاتوون، تەنانەت زۆربەی حەیرانبێژەكان و ئەوانەی دەڵێن: حەیران لە قەراج و كەندێناوە سەریهەڵداوە هی ئەو ناوچەیە نین و چەند پشتێك پێش ئێستا لە شوێنی دیكەوە هاتوون، من دەمەوێ بە لێكۆڵینەوە بگەینە راستییەكان، دوای گەڕانەوە بۆ مێژووی كۆن و خەریك بوون بەمێژووی سۆمەرییەكان، كە كاتی خۆی دووجار هەولێریان داگیر كردووە و لێی ژیاون و پەرستگای ئەشتاری خواوەندیان هێناوەتە قەڵا، بێگومان هەمان دابی زەماوەندی پیرۆزیان لێ ئەنجامداوە، جارێكی دیكە لەگەڵ زانیارییەكانی خۆمدا دەبم، كە حەیران لە سەردەمی سۆمەرییەكان هەبووە و لەبەر ئەو پێكچوونە زۆر راستەوخۆیەی بەینی دەقەكانی حەیران و دەقی دیالۆگەكانی زەماوەندی پیرۆز، كەواتە چوار هەزار ساڵ زیاترە ئەو حەیرانە لە هەولێر هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا بەردەوام لەگەڵ گومانەكانی مێژووی دەشتی هەولێر دەبم تا شوێنەوارناسان سەرەتایەكی دیكەمان پێ دەبەخشن.

### لە بەینی مەهاباد و هەولێردا

زۆربەی عەشیرەتەكانی مركیە و كەندێناوە و قەراج چەند پشتێك پێش ئێستا لە رۆژهەڵاتی كوردستانەوە هاتوونەتە ئەم ناوچانە، بۆیە دەگوترێ حەیرانیش لەگەڵ

ئەوان هاتووە، سەرەڕای ئەمەش لەودیو، حەیران بەشێکی زۆر کاریگەر و زیندوو گۆرانی کوردییە لە گوند و شار و شارۆچکەکان. حەیرانبێژ هەیە دەقی حەیرانەکانیان یان تایبەتە بەشوێنی خۆیان یان باسی شوێنەکانی هەولێر دەکات، بەڵام گوتن و رەزم و تام و چێژی حەیرانی دەشتی هەولێر زۆر جوانتر و شایستەترە، ئەوە لە جۆری گوتن و قورگ و ژان و ژوری حەیرانبێژی هەولێری، دیارە ئەو بابەتە هەوەڵجار لەلایەن د. مارف خەزنەدار ورووژاوە - خالد جوتیار- لە گۆڤاری رۆشنبیری نوێ - ساڵی ١٩٧٨ دوای لێکۆڵینەوە و پێداچوونەوەیەک ئەو بیروڕایەی دووپات کردەوە، جارێ ماویەتی ئەو لایەنە بەپێی هەڵسەنگاندنی مێژوو یەکلابکەینەوە، بۆیە ئێمە پێویستیمان بە لێکۆڵینەوەی زانستییە نەک سۆز و شوێنی نیشتەجێ بوونمان، لەلایەکی دیکەوە لە ناوچەی بادینان فۆرمێکی گوتن هەیە (حەیرانۆک)ی پێ دەڵێن دەشێ چەند لێکۆڵینەوەیەکی هاوبەش -هەولێر - مەهاباد - دهۆک- ساز بکەین بۆ گەیشتن بە ئەنجامی زانستیانە و ورد لە جۆری حەیران و دەقی مێژوو لەگەڵ پەرەسەندنی جوگرافی، کە کا ی خۆی فینلەندییەکانی داستانی -کالیڤالا-یان لێ دیراسە کرد، ئەوکاتە حەیران وەک هونەرێکی کوردستانی بلاو دەکەینەوە، نەک چەقبەستووی سنوورێکی دیاریکراو.

-١-

**حەیران.... ئەورۆ رەندۆلێ زەرزایان لەمن بەتاقە**
**لەسەر کێلە شینی سامرەندان قەندیلی مامەکۆیان**
**سپی ریزی غەیلاتیان رمۆلی بەرانان قوچێ قەزەنێ**
**لەمن شین دەبن هەلالە و بەیبون و سوێسنە**
**نابە خولێی لە باغانم شین دەبن گوڵۆکە مێلاقە**
**ئەوە حەز لێکردنی خەڵکی دەگەڵ کیژۆلا چاردەساڵ و مەمک نەهاتوو**
**ئەوەک من دڵ بەگەردێ دەگەڵ ژنی بەمارە تەلاقە**
**دەبا دەست بەمە تفەنگێ بەحوکمی جامبێزارێ**
**بەگولێکی دە سەگبابان فرێ دەمەوە هەرسێک تەلاقە**

* * *

-٢-

**غوونەی هەولێر**
**حەیران ئەوسار بەوێ فەسرێ پیرە سارێ**
**نازانم لۆ دایەن شارەکەی هەولێرێ**
**لەمن خانە وێرانێ هەر لە تەمێ**
**کیژە حەیرانی من کارمامزەکی داوین بەخوناوە**
**دەگەڕێ سەرگەردان و غەریب لە کاولە ئاقاران**
**بەخۆ راوچیمە هەوەل فەسلا وەرە بوارێ**
**هەرچەندی دەکەم و دەکرێنم**
**سەرێ چەند بوارانە مەنزلی هەند دوورە**
**هاوارتە لەمن هەتا رۆژێ قیامەتێ**
**هەر نایگەمێ.**

**حەیران و زمان:**

هەموو جۆرە گوتنێک بەشێوەزاری ناوچەی خۆی شیرین و مۆسیقیترە لەوەی دەقەکە بە شێوەزارێکی دیکە بگوترێ، ناکرێ و نالەبارێشە ئەو جێگۆڕکێیە بکرێت، چونکە دەربڕین و رەزمی هەر شێوەزارێک خۆی لەخۆیدا جۆرە مۆزیکێک دەبەخشێ لەوەختی دەربڕیندا، بۆیە حەیرانیش تەنیا بەشێوەزاری موکری و دەشتی هەولێر جوانتر دەگوترێ، زەبری دەسەڵاتی شێوەزاری موکری و دەشتی هەولێر بالادەست و کاریگەر بووە، بۆیە تەواوی دەشتی هەولێری داگیر کردووە و هەر عەشیرەتێک و بنەماڵەیەکیش لە هەر شێوە زارێکی دیکە هاتبێتە ئەم دەشتە کەوتۆتەبەر، دەسەڵاتی ئەم شێوەزارە و هەموانی لە بوونی خۆیدا تواندۆتەوە، کەواتە ئەم دەسەڵاتە هی سەردەمێکی لە مێژە و دەسەڵاتی ناوچەکەشی لەگەڵدابووە و شێوەزاری ئاخافتن و راوێژ و باری کۆمەڵایەتی بووە، بۆیە حەیرانەکانیش بەو شێوەیە دارێژراوە و قالبی ئەو دەربڕینەی وەرگرتووە، ئەو تایبەتمەندییە لە ئەدەبیاتی میللی ئەو ناوچەیە رەنگی داوەتەوە، ئەو ناوچەیە لە رووی فۆلکلۆرەوە زۆر دەوڵەمەندە و چەندان حکایەت و بەیت و بالۆرە و شیعر و گوتنی لێ پەیدا بووە، بەڵام هەمووی بەشێوەزاری شیرینی دەشتی هەولێرە.

غوونە:

**(حەیران.... خۆزێ بەخۆزێ داران!**
**کوریکەک بامایێ لە کوریکێ کەس نەناسێ**
**شین بیامایەوە هەموو فەسلا دارە بواران**
**لەسەر گردەکەی کاولە پیرداودی بەرامبەر قوچە برپاسێ**

**کیژ دەرێ کورەتیم حەیران دەتو وەرە دەرم بینەوە لە مارە بابان**
**ئەمن سەرێ چەند سارانە جۆتە شەمامە، شەمامەکانی بەندی باغەرێم پیر کردن سەبارەت بەتو لەبن کەوێ و کراسێ...)**

**شوێن لە حەیراندا:**

شوێن لە مێژووی یاد و بیرەوەرییەکانی هەر نەتەوەیەک رۆڵێکی گرینگ دەگێڕێ، ئەو شوێنەی پیرۆزی پێ دەبەخشرێ لەهەر رێگەیەک بێ بەشێک لە نەمریشی پێ دەبڕێ، بەڵام هەمیشە شوێنەکان لەگەڵ باری روانینی کەسەکان دەگۆڕێ، جۆری رووداو لە لێکدانەوەی مرۆڤدا پەیوەندییەکی هەستەکی دروست دەکات و لە زۆر بۆنەدا دێتەوە خەیاڵان.

لە حەیران ناوهێنانی شوێن بۆ مەبەستی ئەڤین و خۆشەویستی دێ یان شوێن دەکاتە هۆیەک بۆ ژوان و راموسان، تەنانەت شوێنە پیرۆزەکانیش هەر لەو روانگەوە سەیر دەکات، جارێ هەر حەیرانبێژێک هونەرمەند بێ ناوهێنانی شوێنەکان بە زنجیرە و نزیکیان و پەیوەندییان باس دەکات نەک هەر ناوهێنان، واتا ئەگەر حەیرانبێژ سەرەتای حەیرانەکەی بەقەراج دەستپێکرد نابێ یەکسەر دوای ئەوە باسی رواندز بکات یان پیرمام، چونکە ئەو بازدانە گواستنەوەی چێژە لە شوێنێک پەیوەندی بە شوێنی دووەم نییە، شوێنە ئایینییەکان وەکو چاک و پیر و مەرقەد بۆ ئەوەیە لە هەندێ وەرزدا دەبنە جێگای ژوان لەوێ خۆشەویستان پێکدەگەن و ئیدی چاوبازی بەینی عاشقان دەوروژێ، ئەوکاتە مەبەست ئەوە نییە حەیرانبێژێک باسی چاکێک بکات، بەڵکو بۆ ئەوەیەتی دوعا بکات مرازی بێتەدی و چاوی بە خۆشەویستەکەی خۆی بکەوێ، لە حەیران ئەو شوێنانە لە چەمکە دینییەکە رووت دەبنەوە و لێکدانەوەی دنیایی دەگرن.

ئەو شوێنانەی لە حەیرانان ناویان دێ، ئەمانەن (سوڵتان عەولا، مەرقەدی شێخ جامی، شێخ سالحی کاریتان، خەندەکی خەلیفەی، چیای شەرەفان، پیرداود، قوچ، قەپران، لهێبان، کانە وەکازە، کانی داودە رەش، گورگە، سەرگەران، قەراج، کەندیناوە، بیری مەحمودی سەنان، رێی کۆچان).

ئەگەر لەسەر نەخشەی جوگرافی دەشتی هەولێر زەینی بزووتنەوەی حەیران بکەین، دەبینین رێگای کۆچ و کۆچبار و وەرزی بەهار لایەکی دیاری حەیرانەکان دەگرێ، ناوهێنانی ئەو شوێنانە بەزۆری و بەو بارەی چەندان جار دووبارە دەبنەوە واتایەکی دیکەش دەبەخشێ، ئەویش پەیوەندی گیانی حەیرانبێژ و زێدی خەڵکەکەیە، بەلایەکی دیکە ئەو پەیوەندییە پیشان دەدات، کە دەقی حەیران لەگەڵ شوێندا هاوبوون بن، بێگومان هیچ شوێنێک لە حەیران بەبێ هۆ ناوی نایە، دەبێ یاد و بیرەوەری و دەورێکی هەبێ بۆ ئەوەی گوێگر هەست بکات ئەو شوێنە لەگەڵ ناوەرۆکی حەیرانەکە نزیکی دەکاتەوە، گرنگی مانەوەی شوێن لە دەقەکان نەمر کردنی شوێنەکانیشە، مێژوویەک دەبەخشێتە شوێن، کە لە فۆرمی گوتندا جوانتر و پڕ یادەوەری تر دەبێ، هەندێ حەیرانبێژ دنیادیدە و شارەزان، دەزانن کام شوێن بە چ جوانییەک ناودارە، بۆیە دەڵێ (سەربەتاسی خۆشناو، باغەر شۆڕێ دەزەییان، شل و ملی هەولێریان... تاد)، ئەوەها جووتکردنی جوانەکانە لەگەڵ شوێن، کەواتە کیژە جوانەکانی ئەو شوێنانە بەقەد گەورەیی ناوچە دیار و دردوشاوەن، ئەوە هونەری جوانکاری کردنی دەربڕینە لەو دەقانەی بەدوای فەنتازیا و چێژی پڕ بەها دەگەڕێن، لە "حەیرانی دڵداری"دا هەموو شوێنەکان لە خزمەت زەوق و جوانی دنیایین، تەنانەت شوێنە ئایینییەکانیش، چونکە بزوێنەری گوتنەکە باری دەروونی مرۆڤە لە حەزە سێکسییەکان، بۆیە بێباکانە سنووری هەموو لێکدانەوەکان دەبەزێنێ و ئەو رەگانە دەوروژێنێ، کە راستەوخۆ لە ژوان و جووت بوونی نزیک بکاتەوە، بۆیە بەلایەوە ئاساییە گوێ نەداتە بەربەستەکان و لە حەوشی سوڵتان عەولای عارەبی کە خەڵکی دیکە بۆ دۆعا و چاکبوونەوە و پاڕانەوە دەچن، حەیرانبێژ لەوێ چاوبازی دەکا و چاو لە دۆستەکەی دەگێڕێ، ئەوە ئەوپەڕی لادانە لە پەیوەندی باوی کۆمەڵ.

**حەیرانی دەروێشان**

لە ئەدەبیاتی زۆر نەتەوە دوو جۆر ئەدەبیات هەیە، ئەدەبیاتی دنیایی و ئەدەبیاتی ئایینی، نازانرێ دڵداری یان دینداری پێش یەکترین، ئەوەندە هەیە دەروێشانی هەولێر لە تەکیە و خانەقاکان لەکاتی سەرگەرمی و زیکر و

سەرمەستی دەروێشیاندا بۆ نزیک بوونەوە لە شێخ و مەشایخ و ترسی مەرگ و قیامەت یان بۆ زیاتر جۆشدانی زیکر و بەرزکردنەوەی پلەی بالآبوونی جیابوونەوەی جەستە و روح، دەروێشێکی دەنگ خۆش لەگەڵ پرمەی گریان و هات و هاواری دەروێشان حەیران دەڵێت، بەهەمان ئاواز و رەنینی حەیرانی دڵداری، بەڵام دەقەکەی تەواو دەگۆڕن یان دەقی نوێ دادەنێن بۆ باسی مەکە و مەدینە و کێوی عەرەفات، تەکیەی شێخ و موریدان و پیاو چاکان و هاوار کردنی پیری ولیانی و گەیلانی و شێخ نورەدینی بریفکانی و شێخ و چاکەکانی ناوچەی هەولێر و لەو گەرمەی حاڵ و شیر لەخۆدان و هات و هاواردا بەو حەیرانەی بەرەو گریانیان دەبا، سۆزیان جۆشدەدەن و هەموو پێکەوە لەگەڵ دوابەندی حەیرانەکە لە پرمەی گریانێ دەدەن، لەو جۆرە حەیرانەش هەمان دەستووری سەربەند و دوابەند هەیە، واتا نابێ دەستووری حەیران تێکبچێ، زۆربەی تەکیەکان دەنگ خۆش و حەیرانبێژی بەتوانیان هەیە، شەوانی زیکر ئامادە دەبن و ئەوانەش بەزۆری تەرکی دنیا دەکەن و حەیرانی دڵداری نالێن وەکو (دەروێش برایەری سەرگەران) کە پیاوێکی خواپەرست و چاک و خۆشەویستە لای خەڵکی هەولێر بەگشتی و بەدەنگە بەسۆزەکەی چەندان کۆڕی دەروێشانی جۆشاندووە، لێزان و کارامەیە لە حەیران گوتن و دانان. فۆرمی گوتنی حەیرانی دەروێشان هەمان گوتنی دڵدارییەکەیە، لەکاتی ئامادە بوونی شێخ لە تەکیە یان کۆبوونەوەی دەروێشان بەر لەوەی بچنە خزمەت تەکیەی شێخ زیکری فراوان دەکرێ، جۆرەها جموجۆڵی لەخۆدان و ئاگر خواردن و سەڵاوات و حەیران دەگوترێ، لەوێ بەهرەی گوتنی حەیران بەدیار دەکەوێت و چەند حەیرانبێژێک دەکەونە بەرامبەر یەکتری و لێک وەردەگرنەوە تا کۆڕی زیکرەکە گەرمتر و بەجۆشتر بکەن، کەوابێ حەیران گوتن لە دەشتی هەولێر پێویستییەکی روحییە لە دڵداری و دینداریدا هانای بۆ دەبەن و ئارامی و دڵنیایی دەبەخشێتە دڵ و دەروونیان، بۆیە دەکرێ بڵێین: ئەو دینداری پێکردنەی حەیران رەگەکان دەباتەوە سەر ئەو سەرەتایەی گوتمان پەیوەندی بەدابی زەماوەندی پیرۆزی سۆمەرییەکان هەیە، چونکە ئەو زەماوەندە رەگێکی ئایینی هەبوو، لە روانگەی دینەوە چەکەرەی کردبوو، بۆیە دەگونجێ ئەو پەیوەندییە بەرایی سەرهەڵدان و شوێنزاری حەیران توکمەتر و بەڵگەدارتر بکات.

نموونەی حەیرانی دەروێشان

**(حەیران خۆزێ بەخۆزێ داران!**

**کوریکەک بامایە لە کوریکێ نەورۆزێ**

**شێ بیام رۆژێ عالفەی لەسەر کێوی عەرەفات وەکی خیوەتێ**

**حاجیان هەردەدا لەو مەقامی موبارەک لەناو غوبار و توزێ**

**گەلی موسلمانان دەیاڵلا.. یاڵلا بەعام بچینەوە خزمەت**

**شاهی مەدینەی ئەحمەدی موختاری لەوێ لەگەر**

**عەزیز و خۆشەویستان بکەین جێژنە پیرۆزێ)**

### حەیران و ئیرۆتیک

رۆژگارەکانی بەرایی ژیانی بنیادەم سادە و ساکار و بێ گرفت نەبوو، بیرکردنەوە لە خۆ گونجاندن و تەبایی بوون لەگەڵ سرووشت و دیاردەکانی مرۆڤ خۆی لەگەڵ هاورەگەزی خۆی یان لەگەڵ درندە و گیاندارانیش تەنگژەیەکی ئالۆز بوو، بۆیە بیری کردەوە چوار وەرزەکەی ساڵ بەناخۆش و کێشەکانی لەگەڵ خودی خۆی رابێنێ و ساتە ناشیرینەکانی جوان بکات ئەو جوانی کردنە ئاسۆی بیر کردنەوەی فراوانتر کرد.

ناوچە جیاجیاکانی کوردستان بەپێی شێوەزار و جوگرافیا و هەستی جوانبینینی فۆرمی جیاوازی گوتنی سازاندووە، ئەگەرچی هەندێ جار ئەو فۆرمانە سنووری خۆی بەزاندووە و بڵاوتر بۆتەوە.

مرۆڤ بە زۆر شێوە لە حاڵەتە دەروونییەکانی خۆی دەدوێ یان دەیەوێ سروودە نێهێنییەکانی لەو گەردوونە شیرازە بکات، ئەمەش هەوڵێکە بۆ بەنەمر کردنی هەستە ناوەکییەکانی مرۆڤ.

خود لەحەیران هەموو پەیوەندییەکانە ئەو مرۆڤەیە بەدوای تێکشکاندنی پەیوەندییەکان دەگەرێ، گاز کردنێکە بۆ یەکلاکردنەوەی کێشەی دەروون بەرهەڵاکردنی حەزە داپۆشراوەکانی ژیانە بەکاری جوان و پر چێژو هەستی ناسک و خۆ دواندن و تەکاندنی ژەنگ و پێوەند فرێدان بۆ ئازادی تاک لە کوردەواریدا عەقڵی کۆ لەگەڵ فۆلکلۆری ژوان و راموسانداییە. لە راستیدا ئەو هاوارەیان گاز کردنە

لە حەیراندا بۆ ڕەهایی بوونە لە فەزای ئازادی تاک، کە هەمیشە مرۆڤ لە کوردەواریدا بەشایستەی زانیوە، لە فۆرمی گوتنی حەیراندا حەیرانبێژ و گوێگرەکانی غەرقی سەرمەستی و بەمراز گەیشتن، کە لەکات و ساتی ئاساییدا ناکرێ مرۆڤ بیگاتێ، بۆیە لە سایەی ئازادی و دەسەڵاتی هونەری حەیرانبێژدا جڵەو بۆ خەیاڵ بەرەڵڵا دەکەن بگەنە ئەو مەبەستە.

فۆلکلۆری کوردی میراتی هەزاران ساڵ بەر لەئێستایە، ئەڤین و حەز و سێکس شوێنی شیاوی پڕ لە نەفس و جوانی خۆی هەبووە، لە ئاستیدا مرۆڤ گەلێ ئاکاری پەسندی لێ شیرازە کردووە و تەونی خەیاڵاتی بۆ هەڵچنیوە ئەوەی بیەوێ ئەویندار بێ، دەبێ لە هەمان کاتیشدا توانا روحییەکانی ئەوینی خۆی پەرەپێبدا، چونکە بەبێ ئەوە ناتوانێ ئارەزووەکانی دامرکێنێ.

لە کوردەواریدا سێکس سەرجەلەی بەر لەکۆت و پێوەندییەکان دەگێڕێتەوە، کە هیچ داب و نەریتێکی لاییدە سەرپۆشی نەکردبوو، یان نەیتوانی بوو حەزە جوانەکانی مرۆڤی کورد بخاتە بەر ڕکێفی دینداری توند و بەئاکار و روانینێک لە سەرووی مەبەستەکانی دەربڕین دێ، بۆیە ژیانی پڕ گرێ و کێشە و مەینەتییەکانی کردۆتە هێلانەیەکی جوانی و پوشی نەرم و نیانی بۆ ڕاخستووە و ئەوجا لەبانیا سەرنجێکی دوور و قووڵی داوەتەوە ژیان و بەگۆرانی گوتن و لەخۆ دواندن حەکایەتی ژوان و پێک گەیشتنی گێڕاوەتەوە، بۆیە خود لە کوردەواریدا بەرز و بڵندە هەر هەندەش دنیای دەوێ بێتە پێگەی ژوان و دەست لەملانێ، دەنا بۆ دوارۆژێکی بزر، کە نازانێ کەی دێ، لە کوێدا پەیدا دەبێ لەوپەڕی جورئەتەوە کوردەواری دەڵێن:

**سی ڕۆژەی ڕەمەزانێ فەرزە لەسەر ئۆمەتێ**
**لەدونیا پێم لۆنەبووی چت لێبکەم لە قیامەتێ**

ئەوە ڕەچەشکاندن و پێوەند هەڵدانەبەر و ڕەهایی بیرکردنەوەی زاتە، بەهای جوانی و چێژ دەگاتە ئاستی توانەوە لە بوونی خۆی لەگەرمەی لێکدانەوەیەکی سێکسی، بۆیە تەما دادەنێ و ناتوانێ لە چاوەڕوانیدا خۆی تووشی گێژەی گفتەکانی دیکە بکات، گوێ لە حەیرانبێژ بگری چۆن لە رووتکردنەوەی دۆستەکەی دەدوێ، کەچی لە کوردەواریدا بەرێزەوە گوێی لێدەگرن و زۆریش تەبا دەبن و چێژ لە بیستنی وەردەگرن.

زەین بدەنە ئەو چەند تابلۆیەی لە هەندێ حەیران وەرمانگرتووە:

**- کیژ دەرێ کورەتیم حەیران ئەتو خەمان هەرمەگرە،**
**- ئەمن لەماڕە بابان بم یان لەماڕێ گولەکەی مێردان ئەتو شەو لەسەر راموسانێ خۆت بە**
**- کیژ دەرێ... کورەتیم حەیران دەوەرە دەستێ خۆ باوێوە سەر شاملی بەکەزی بەدەستی دی دەرینەوە جۆتە شەمامە شەمامەکانی بەندی باغەرێ.**

- گۆرانی گوتن لە کوردەواریدا مێژوویەکی پیرۆزی هەیە لە تەقسە ئایینییەکانی پێشان و ناو پەرستگا و کونجی تەنیایی و ئەندێشەی پڕ ئەفسوونی مرۆڤ، بۆیە گوتن کە ئاواز مرازەکان دەداتەوە مرۆڤ کاریگەری لەسەر هەموو لایەنەکانی مرۆڤ هەبووە و توانیویەتی بەرامبەری لە گوتندا غەرق بکات و بەجوانی ناپۆشێ و رازی بکات کە مەبەستەکانی گوتن هێندە فراوان و بەدەسەڵاتن، دەکرێ گرێکان بکاتەوە و تەسلیمی خاو بوونەوەی بکات، کە ئەو تەسلیم بوونە گیانی نەمری بەخشیوەتە نهێنییەکانی گوتن، لاواندنەوە و لە ئازار دووان بە رەزمێکی تایبەت بە فۆرمی گوتنەکان پەیوەندییەکی روحی پڕ لە سیحر و فەنتازیای داوەتە ماڵی کردنی سەر کێشەیەکانی مرۆڤ و هێورکردنەوەی، ئەگەرچی مرۆڤ خۆی هەمیشە لەگەڵ حەزە سەرکێش و پڕ ئاشوبەکانی لە چەمکی ژیان و پیرۆزی نزیک بۆتەوە، با ئەو دوو نموونەیە سەیر بکەین و بزانین حەزەکانی حەیرانبێژ لە کوێیە....

**حەیران.... هورە گۆتیە شەماری**
**وەرە مارێ خۆ بارکەین بچینە بەینی هەور و ساماری**
**کور دەرێ لەبۆ من برێنە مەلایان فەقێیان**
**دەبا بڕۆننەوە قورئانێ قەدیم بزانن**
**بەهەشت خۆشترە یان شەوێ لە سێباری نیوە شەوێ**
**خەو لەسەر سینگی نازک و نازداری**
*** * * ***
**خۆزێ بەخۆزێ داران دوو ماچم کردبا**
**لە بەژنێ باریک و دوو چاوی رەشکۆکە**
**زەندەیێ بەبازن یەکیان بەدەستەکی بەخەنە**
**لەسەر دارێ تەونێ لەبن گورینگی هیزاری**

**ئەوی دییان سبەینان لەبەر نانی**
**وەکی روومەتی سۆر دەبن**
**لەبەر هەرمێ ئاگری**

لەوەتەی مرۆڤایەتی دەقی داهێنان و مەزنی خولقاندووە، زمانی داهێنان لای هەموو نەتەوەکان و لە هەموو سەردەمەکان یەک زمان بووە، سەیری دەقی نەمری وەک داستانی گلگامێش بکە، دەبینین ئەوین کۆڵەگەی سەوداسەرییەکەی مرۆڤە بەرەو نەمری، کە هزری مرۆڤی واڵاتر و شکۆمەندتر کردووە، ئەوکاتە هەست دەکەین پەرستگە و مەیخانە و ئەوین سێینەی مەزنی پیرۆزی سۆمەرییەکان بووە، فۆرمی گوتنی حەیران بەجورئەتترین فۆرمەکانی گوتنە لەبارەی سێکس و پەیوەندییە نهێنییەکانی کیژ و کوڕی دەشتی هەولێر و سەربردەی حەز و ئەڤینی دەست لەملانێ و رووت بوونەوە و جووت بوون و پێوەند بەرەڵلا کردن و هەڵدانەوەی شتە داپۆشراوەکانی سێکسە لە مێینەدا و شادبوونی جنسی نێرینەیە و بەپێچەوانەشەوە، حەزەکان هی خەیاڵاتی سەرکێش و باو شکاندنە، بەڵام بەهێمنی و رازی بوون و دڵنیایی خستنە بەر بەرامبەر و قایل کردنی دەوروبەریش بەپێوەندە کۆمەڵایەتییە دواکەوتووەکانیش، بەگوێ گرتن و لەزەت وەرگرتن لەناوەڕۆکی گوتنەکە و وورووژاندنی لایەنە بزرەکانی حەزە بەرەو بەرز کردنەوەی چێژ و دامرکاندنەوە وورووژاوەکان، ئەمانە هەمووی گاز کردنی حەیرانە بۆ کێشان و دیالۆگی تێکەڵی نێر و مێ، جارێکی دیکەش دووپاتی دەکەمەوە، کە دیالۆگی هۆنینەوەی حەیران لەناوەڕۆکدا قسەی نێر و مێیە، بۆیە ئەگەر دەقێکی حەیران کیژ و کوڕێکی هونەرمەند هەریەکیان بەشە دیالۆگی خۆی بچڕێ ئەوە ئەوپەڕی جوانی دەبەخشینە حەیران و تازە کردنەوە، کە لێرەوە دەست پێدەکات و دەبێتە فۆرمێکی پێویستی گەنجان.

**فۆلکلۆریستەکان چۆن حەیران پێناسە دەکەن ؟....**

لە مێژووی لێکۆڵینەوەی فۆلکلۆردا تاک و تەرا باسی پێناسەی حەیران کراوە، تەنها لەو چەند ساڵە نەبێ فۆلکلۆریستانی هەولێری جوان هاتنە مەیدان و بەردەوام دەربارەی حەیران دەنووسن، دوای گەڕان لە سەرچاوەکان دەڵێن:-

١- (د. مارف خەزنەدار): (وشەی حەیران بۆ ئەو بابەتە شیعرە بەکاردێت، کە بەشێوەی کرمانجی خواروو و سۆرانی هەڵدەبەسترێ و زیاتر ناوچەی هەولێر و کۆیە و رەواندز و مەهاباد و سنە...).

٢- خالید جوتیار: (حەیران پارچە پەخشانێکی پاراو و ناسکە بەزمانێکی سادەی خۆمانە نووسراوە دەشێ پەخشانە شیعری پێ بگوترێ، دەستوور و ئاکاری تایبەتی خۆی هەیە ئەگەر سەربەند و دوابەند یەک نەگرنەوە بەحەیران دانانرێت.

٣- رزگار خۆشناو: (حەیران تایبەتە بەناوچەی سۆران، بەتایبەتی لەم هەرێمانە بنجی خۆی داکوتاوە و بووە بەزمانحاڵی خەڵکی دەشتی هەولێر و بەشێک لە خۆشناوەتی و بەشێک لە هەرێمی پشدەر...).

٤- ئەحمەد حەیران: (حەیران پارچە پەخشانێکی کورتە پڕیەتی لە ناسکی و بەسۆز بەزمانێکی پاراو دەردەبڕێ، کە نزیکە لە ژیانی رۆژانەی کوردەواری).

٥- ئەسعەد عەدۆ: (حەیران جۆرە مەقام و ئاوازێکی تایبەتە، ئاوازی شمشاڵی شوانەکانی دەشت و دۆڵ و پاڵ شاخەکانی کوردستانە، ئەو دەنگە زوڵاڵەی رەسەنی کوردە، ئەو پەخشانە رازاوەی سەر و بن گرێدراوەیە، ئەو دەنگەی کە مرۆڤی کورد دەگەڕێنێتەوە جیهانی بەرفراوان و رەسەنی نەتەوەی کورد).

٦- سەعدوڵلا شێخانی: (لەنێوان دەریای هونەری گۆرانی کوردی، حەیران شەقلێکی تایبەتی هەیە لە پاڵ مۆرکێکی رەسەنانەی کورد، هەردەم گۆشکراوی خەم و پەژارەیە).

٧- غەفور مەخمووری: (حەیران ئەو ئاوازە بەسۆزەیە، کەوا لە گەرووی شمشاڵی شوانەکانی کوردستان دێتە دەرەوە و بە رۆژگارێکی دیکەیان ئاشنا دەکات، ئەویش رۆژگاری رابردووی، باسی ژیانی سادە و ساکاری کۆمەڵی کوردەوارمان بۆ دەکات... حەیران جۆرە مەقامێکی کوردییە لەسەر شێوەی بەیات دەگوترێت).

٨- نامیق هاوکار: (حەیران ئەو وشە ناسک و پاراوانەیە، ئەم وشە پڕ جۆش و خرۆشانەیە، ئەم وشە دەروون تەزێنانەیە، کە حەیرانبێژ لەسەربەند و دوابەند لێکیدەداتەوە بەسەروایەکی وەکو یەک دەستی پێدەکا و

کۆتایی پێدێنێت).

٩- پیرداود مەخمووری: حەیران لە گوتندا مەودایەکی فراوانی هەیە، لە هەردوو لایەنی روخسار و ناوەڕۆکدا، دەشێت حەیران لە شێوەی دەرەوەیدا وەکو هەوا و گوتن و لەناوەڕۆکیشدا شتی گرنگ لەخۆ بگرێت، حەیران دەربڕینی هەستێکی پڕ سۆزی خۆشەویستییە، چ حەیرانی خۆشەویستی و دڵداری بێت یاخود حەیرانی قارەمانی و ئایینی رووت بێت، هەندێ جار لە حەیراندا گیانی سەربردە و چیرۆک بەدی دەکرێت و زۆریش درێژ نییە و بۆ کۆنیش هونەرێکی یەکجار کۆنە و لە مەعبەدی زەردەشتییەکان و شوێنەکانی دیکەی خواپەرستی سرووتەکانی پێ ئەنجامدراوە.

شیعری حەیران پتر دێرەکانی کورتن و بەکێشی پەنجەی پەرتەوە دەگوترێت و هەندێ جار حەیرانبێژ بۆ پتر سۆزدانە حەیران دێرەکان لێکدی رادەکێشێ بەپێی هەوا و گوتنەکە لێکدەکشێت، حەیران پتر لە لاوک نزیکە و رەنگە یەک ئاگردان بن، بەلام بەپێی زار و بن زاری شێوەزارەکان لێکدی دوورکەوتبنەوە.

حەیران بەزۆری بەهەوایەکی سۆزدار و غەریبی دەگوترێت، وەکو هەر ژانێکی دیکە وەسفی ژیانی و ژیاری کوردەواری دەکات و حەیرانبێژ بەپێی سەلیقە و جۆری هەوای حەیرانەکە مامەڵەت لەگەڵ پەیڤ و قسەی ساکاردا دەکات.

دەتوانین بڵێین: حەیران هی سەردەمی بەر لە ئەدەبیات نووسینەوەیە و مۆرکی نەتەوەیی پێوە دیارە و لەناو هونەرەکانی دیکە و میللەتانی دیکەش دەناسرێتەوە و مۆدە و تایبەتمەندی پێوە دیارە.

تا ئێستا لە رووی مۆزیکەوە، پسپۆران ئەوەندە گرنگیان بەو فۆرمەی گوتن نەداوە، وەک - مەقام- و پەیژە و چینی دەنگ و بەنوتەکردنی بکەنە بابەتی سەرەکی، ئەگەرچی مامۆستا ئامانج غازی لە کتێبی "حەیران و مەرگی غەریبان" سەرەتایەکی جوانی ورووژاند، کاتی وەلامی هەندێ لەو مۆزیک زانانەی دایەوە، کە دەیانگوت: حەیران بەنۆتە نانووسرێتەوە، بەلام ناوبراو توانی وێنەیەک بلاوبکاتەوە و سەرەتایەکی جوانی لەڕووی زانستی میوزیکەوە لەسەر حەیران نووسی. من وای دەبینم کە میوزیکزانە هەولێرییەکان وردتر و جوانتر دەتوانن ئەم ئەرکە ئەنجام بدەن، لەبەر پەیوەندی روحی بەینی حەیران و خەڵکی هەولێر.

### ناودارانی حەیران

ئەو مێژووە پڕ جوانییەی حەیران لە هەولێر بەو ساڵانەی باسمان کرد، بێگومان نەک سەدان بگرە هەزاران حەیرانبێژ لە هەولێر و دەوروبەری خولقاندووە، مخابن لەبەر نەبوونی خوێندەواری و هۆیەکانی راگەیاندن ئەو دەنگ خۆشانە ناویان بزر بوو، هەوڵدەدەین چەند ناوێکی دیاری بواری حەیران تۆمار بکەین:

- حوسێن عەلیاغا
- جەمیل عەلیاغا
- قوشەی فەقێ عەزیزی
- حەمەد بەگی
- حەسەن حەیران
- عوسمان حەیران
- خدر حەیران
- مستەفا کوری خۆشاوێ
- سەعید باداوەیی
- محەمەد ئۆمەراوە
- رۆستەم سەیداوەیی
- دەروێش برایم
- حاجی عەباس
- فارس حەیران
- حەمەد عەلی
- شێروان شەیدا
- شێروان بێرکۆتی
- تەنیا ئیدریس
- چۆپی فەتاح

سەرچاوەکان:

- گۆڤاری هەولێر ژمارە (١).
- کێش و قافیە لە شیعری کوردیدا، د. مارف خەزنەدار.
- گۆڤاری رۆشنبیری نوێ ژمارە ١٩٧٧/٦٣، خالید جوتیار.
- لاوک و حەیران لە فۆلکلۆردا، ئەسعەد عەدۆ.

# حەیران

## هۆمەری دزەیی

**ئەم لێکۆڵینەوەی هونەرمەند (هۆمەر دزەیی) لەژێر ناوی (هەوڵێک بۆ تێگەیشتنی حەیران)دا بە شێوەیەکی هونەری جوان سەنتەری راگەیاندن و بڵاوکردنەوەی خاک بۆیان چاپکردووە. لە بنەڕەتدا ئەم لێکۆڵینەوەیە، لێکۆڵینەوەیەکی رادیۆییە کە هونەرمەند خۆی لە ساڵانی نەوەدەکانی سەدەی رابردوو لە رادیۆی دەنگی ئەمریکا بەشی کوردی پێشکەشی دەکرد، هونەرمەند هەر ئەو بەرنامە رادیۆییانەی بەهەمان شێوەو بە هەمان زمانی بەرنامەیی چاپ و بڵاوکردووتەوە، کە نەدەکرا ئێمەش لە ئینسکلۆپیدیای هەولێر، ئەمە دووبارە بکەینەوە، بۆیە بە ناچاری هەوڵماندا زمانی بەرنامە بکەین بە زمانی وتار و لێکۆڵینەوە و کورتیشی بکەینەوە، هەڵبەت ئەمە لەگەڵ کارێکی سەر لەبەر بەرنامەیی و رادیۆیی زۆر رێک نایەت، بۆیە داوای لێبووردن لە مامۆستای هونەرمەند و خوێنەرانی ئینسکلۆپیدیای هەولێر دەکەین، ئەگەر ئەم (هەوڵێک بۆ تێگەیشتنی حەیران) وەک خۆی نەماوە و دەسکاری کراوە.**

**د. مەولود**

**بەرایی**

خوێنەرانی بەڕێز، چونکە خۆم لادێییم، هەر لە منداڵییەوە بە ئاوازی حەیران و لاوک و بەکرەیی و گۆرانی تایبەت بە ساوار کوتانەوە و هەموو جۆرە هەڵپەڕکێ و گەمەی رەسەنی کوردەواری فرچکم گرتووە.

سەر لە بەیانییان، دەگەڵ مەلا بانگدانێ، بە دەنگی پڕ ئاهەنگی سەپانی دوورە پەرێزان وەئاگا دەهاتم. ئێوارانی پایزان، لەگەڵ کوڕ و کیژوکاران بە دەوری ساوار کوتانەوە تێک دەقڕاین و بەندەکانمان بۆ دەگێڕانەوە. نیوە شەوانیش کە مێگەل رادەدرا بۆ شەوینێ، زرینگەی زەنگۆڵی ملی نێرییان تێکەڵی لەرەی سەدای شمشاڵ و بلوێری شوانان دەبوو.

مانگەشەوانی هاوینان، پاڵەو رەنجبەری ماندووی رۆژگار، لەسەر گازی پشتی سەرخەرمان، روو لە ئاسمانی شینی بێ پایان، بە دەنگی بە سۆز و زوڵاڵیانەوە جەستەی شەکەتیان بە حەیران دەحەساندەوە.

شنەی شەماڵ ئەو ئاوازە تەلیسماوییەی دەپڕژاندە سەر چاو لە خەوی سەربانان. ئای کە خۆش بوو، پیاو بە دەنگی ئەو ئاوازە هۆشیار دەبۆوە و موچڕکێکی ئەویندار لە تەوقی سەرییەوە تا پەنجەی پێی دادەگرت تێکڕای هەست و خوێن و گیانی دەهێنایە هەژان.

زۆر کەڕەت کە دۆڵ و زورنا دەست نەدەکەوت (یان گران دەودەستا) بۆ شاییەک، لە بریتی دەنگخۆشێکی ئاوایی یان گۆیندەیەکی دۆم (ئەگەر بەرێکەوت لە گوند با) بە دیلانێ و هەڵبەست شایی و گۆڤەندەکەی گەرم دەکرد و دەیگێڕا.



کە هەراش بووم سترانی فۆلکلۆری کوردی و ئەو دەوروبەرەی کە تێیدا گەورە ببووم، جێگایەکی تایبەتییان لەناو دڵ و بیروهۆش و هەناومدا کردبۆوە. خۆشبەختانە یەکەم قۆناغم لە دەرەوەی وڵات ئاموشۆکردنم دەگەڵ کوردەکانی تورکیا بوو. جا ئەوەبوو سەر لەنوێ دەروونم زاخ درایەوە و بە فۆلکلۆری کوردی مشتوماڵ کرایەوە. لەو ماوە دوور و درێژەی لە دەرەوەی کوردستانم بردۆتە سەر بە سەدان تیپی فۆلکلۆری و گۆرانی و

گۆڤەندی زۆربەی میللەتانی ئەوروپای رۆژهەڵات و رۆژئاوا و ئەمریکای باکوور و لاتینی و ئاسیا و ئافریکام دیتن و گوێم لێ بوون. ئەو تاقیکردنەوانە لە دڵیاندا چەسپاندم کە گۆرانی و هەڵپەڕکێی کوردی، ئەگەر خزمەت و خاوەنیان هەبێ، لە هی میللەتانی دیکەی جیهان بەرز و خۆشتریش نەبن، کەمتر نین.

هەروەها لەو ماوەیەی کە خۆم سەرپەرشتی کاروباری هونەری کۆمەڵەی خوێندکارانی کوردم دەکرد لە ئەوروپا (لە ١٩٧٥وە تا ناوەڕاستی شەستەکان)، ئەم راستییەم بۆ ساغ بۆوە، چونکە سەرەڕای دەستکورتی و توانای سنووردارمان وەک هەموو خوێندکارێک ئەوروپاییەکان بایەخێکی تەواویان بە چالاکییە هونەرییەکانمان دەدا. لە ساڵی ١٩٦٠دا پرۆفیسۆرێکی دانیشگەی بەرلین، کە ناوی دکتۆر کریستنس بوو، تکا لە برادەرێکی دێرین و خۆشەویستی خۆم دکتۆر کەمال فوئاد دەکا، کە ئەوساکە لە بەرلین خوێندکار دەبێ یارمەتی بدا بۆ پەیداکردنی کۆمەڵێک گۆرانی فۆلکلۆری کوردی بۆ ئەوەی لێکۆڵینەوەیەکی زانستییانەی لەسەر بکا. ئەوەبوو کە کەمال تەلەفۆنی بۆ کردم هەنگینێ منیش لە شاری میونیخدا دەژیام بۆ ئەو مەبەستە چووم بۆ بەرلین و کاسێتبەندێکی تەواوم لە فۆلکلۆری کوردی بۆ کریستنس پڕ کردەوە کە ئێستاکێ بۆتە سەرچاوەیەکی باش بۆ میوزیک و هونەری فۆلکلۆری کوردی.

لەو هەموو ساڵانەی ژیانی ئەوروپای پڕ لە بریقەوباق و درەوشانەوە کە دەروازەی جیهانی کلاسیک و نۆیەراشیان بۆ کردمەوە، حەیرانەکانی نیوەشەوی سەر خەرمانان یان ناو سەوزەگیای بەهارانی دەشتەکەی پیرە هەولێرێ. نایەکەی حەمە سووری پەنجە زێڕین و شمشاڵەکەی وسوە کۆری دوگردکان، بووکانە بووکانەی کیژوکاران، لای لایەی



کۆرپەداران و سەردوولکە و لاواندنەوەی زگ سووتاو و تازیەداران، ئێستاکەش وەک دوێنێ بووبێ لە گوێمدا دەزرنگێنەوە و وەک تەیرێکی ئەفسانەیی دەمهاوێتە سەر شاپەڕی باڵی خۆی، هێندەی چاو تروکاندنێک، دەمباتەوە بۆ کاولە وڵات، دەمگێڕێ بەسەر ئەو هەموو دەشت و هەرد و تەلان و چیاو دۆڵ و یاڵانە، نۆستالجیایەکی ئاوا دامدەگرێ و کارێکی ئەوتۆم تێ دەکا، کە هەزار براهمز، شوبێرت، لیست و چایکۆڤسی بەسەر یەکەوە ئەو کارەیان تێ نەکردووم و ناخی دەروونیان بەم شێوەیە رانەهەژاندووم.

خۆی لە چەرخی پێشکەوتنی پیشەسازی و تەکنەلۆژیدا فۆلکلۆر بە گشتی و حەیران بە تایبەتی هەتیمێکی بێ دایک و بابە. بۆیە دەڵێم (حەیران بە تایبەتی) چونکە ئەو دەوروبەر و شوێنەوارانەی کە حەیرانیان لێوە سەر هەڵدەدا ئێستاکە بە تەواوی کەوتوونەتە بەر شالاوی مەکینە. شوانی ئەمڕۆکە لەباتی شمشاڵەکەی بەر پشتێنی رادیۆیەکی ترانسیستەری بەمل خۆیەوە کردووە، شرەد پاڵتۆیەکی (مێد ئین هۆنگ کۆنگ) جێگای کۆڵەباڵ و کەرک و کەپەنکە خۆردییەکەی جارانیشی گرتۆتەوە، تراکتەر کارێکی وای بە جووتیار کردووە مەگەر هەوجارِ و گاسن و دێمکەکەی لە مۆزەخانەی شاردا بەدی بکرێن. کۆمباین، مەکینەی درەو، نە پاڵەو پەرێز، نە شەغرەو شەغردکێش، نە خەرمان و جەنجەڕوان و گێرەوان، نە شەنەباو کا و کاکێشانی هێشتووە. ئەم مەکینانە بە تایبەتی لە ناوچە دەشتاوییەکاندا کاریگەرن، بۆیەکا دەڵێم



حەیران مەترسی لەناوچوونی پترە تا لە بەشەکانی تری فۆلکلۆر.

ئەو کارەی کە مەکینە بە حەیرانی کردووە، مەگەر هەر گورگ بە مێگەلە مەڕێکی بێ شوانی بکا. خوا نەخواستە من بابایەکی کۆنە پەرست نیم و بەرهەڵستی خولانەوەی رەورەوەی پێشکەوتن ناکەم و ناشتوانم بیکەم. مەبەستی من هەر ئەوەیە کە ئەگەر بێتو فریانەکەوین و دەست بە لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی ورد و زانستانەی ئەم هونەرە رەسەنە نەکەین، ئەوا نەک هەر ئاوازێکی بەسۆزی کوردی لە دەست دەچێ بەڵکو ئاوێنەیەکی زۆر روونی فەرهەنگی کۆنینە و مێژووی کوردیش وا خەریکە بشکێ. جا لێرەدا وا هەوڵێک دەدەم ئەو ئاگاییەو زانیارییەی کە لەسەر فۆلکلۆری کوردیم هەیە پێشکەشی خوێنەری بەڕێزی بکەم. ئەگەر چ کەم و کورییەکیشتان لەم نووسینە بەرچاوکەوت، ئەوا سێ و دووی لێ مەکەن بۆم راست بکەنەوە هێندەی یەک دنیا سوپاسبارتان دەبم و کورد واتەنی جارێ دەستم بە هەویرە و هەر هەندەم لە بیرە.


حەمەد عەلی

### حەیران: حەمەد عەلی

یاڕەبی هەزار رەحمەت لە گۆڕت بێ حەمەد عەلی!! خوێنەرانی بەڕێز، ئەمە دەنگی کوڕە لاوێکی جوانە مەرگ بوو کە یەکێک بوو لە حەیرانبێژە هەرە دەنگخۆش و هەرە لێهاتووەکانی دەشتی هەولێر.

### خوێنەرانی بەڕێز:

وەک لە سەرانسەری جیهانیشدا هەر وایە، لە کوردستانیش هەر ناوچە و هەرێمێک فۆلکلۆری تایبەت بە خۆیەوەی هەیە و ئاواز و گۆرانی و هەڵپەرکێ و داب و نەریتی کۆمەلایەتی لە ناوچە بۆ ناوچە دەگۆڕێن. حەیرانیش یەکێکە لەو ئاواز و بەندە بە سۆز و خرۆشانەی کوردی کە تایبەتە بە ناوچەیەکی کوردستان و تا رادەدیەکیش تەنیوەتەوە بۆ هەرێمەکانی دەر و دراوسێشی، بەڵام با جارێ بە دیاریکردنی سنووری جوگرافی حەیران دەست پێ نەکەین، ئەمەیان لە پاشاندا دەگەڕێینەوە سەری. با جارێ بزانین حەیران چییە و ئەم وشەیە لە کوێوە هاتووە!

کورد بە دوو شت تێکدەچێ: دووری لە یار، دووری لە هەوار. حەیران جۆرە ئاوازێکی سەنتیمەنتالی نۆستالیژیکی کوردییە کە هەم بە دەنگێکی پڕ لە سۆز و خرۆشانەوە هەم بە هەڵبەستێکی سەربەستی سادە و ساکارەوە هەست و نەستی گوندییەکی کوردەواری بەرامبەر بە یار و هەوار دەردەبڕێ. چاکم لە بیرە، پێموایە ساڵی (٤٨) بوو، ئێمەش ماڵمان لە دوگردکان بوو، ئەو گوندەی کە لێی لەدایک بیووم و ساڵانی منداڵی و مێرد منداڵیم لەوێ بەسەر بردووە، بەڵام زستانان دەبووایە لەگەڵ براکانم خانووێک لە هەولێر بە کرێ بگرین بۆ ئەوەی لەوێ بچینە خوێندنخانە. ماڵەکەی ئەو ساڵەمان کەوتبووە پشت سەرای هەولێر کە بەندینخانەیەکیشی لێ بوو. هەموو ئێواران پاش رۆژئاوا کە دنیا کش و مات دەبوو تاریکی باڵی بەسەر شاردا دەکشاند، لە کولانەی هەرە سەرەوەی بەندینخانەکەوە دەنگو ئاوازێکی زۆر بە سۆز و غەریبی حەیرانبێژێکم دەهاتە بەر گوێ کە کابرای داماو بەسەر یار و گوندەکەی خۆیدا هەڵیدەگوت. کە لێ دەبۆوە ئیتر بۆ ماوەیەک بێدەنگ دەبوو. کە هەستی خۆم رادەگرت دیار بوو لەبەر خۆیەوە دەکورکایەوە. منیش بەو منداڵییەی خۆم کە تێی رادەمام لەناخەوە هەستم دەکرد ئەمنیش لەگەڵ ئەودا هاودەردم: بە حەیرانەکانی ئەو کابرا گیراوە هەموو کەند و کەندەلان، کونده و کوندەلان، کووچە و کۆلان، خانووە قوڕەکان، هەوێز و پەرێز، باعەی مەڕ، زەڕەی نێرەکەر، سەگڕەوی شەوان، بانگی کەڵەبابی دوورە ماڵان و کیژ و کار و کوڕ و گەل و دۆست و یارانی گوندەکەمانم وەک فیلمێکی سینەما دەهاتەوە بەرچاو و ئەمنیش پڕی چاوم فرمێسک دەبوو، گریان لە قوڕگما گیری دەخوارد، دیواری رەشی بڵند و سامناکی حەوشەی تەنگ و تاریک و کۆلانی پڕ لە چڵکاوو بۆنی شێوی پڕ لە قوڕە شینی بەردەمی خانووەکانی هەولێرم لێ دەبوون بە دوژمنی باب کوشتە، ئەمە لەکوێ و ئەو ئازادییە لەکوێ کە بەپای پەتی لەگەڵ کوڕگەل و کیژوکاران بەدوای هێلانە قەتێیاندا ئەم هەموو دەشت و گرد و پەرێزانەمان دەکرد.


جەمیلی عەلی ئاغای ئەزەبی ١٩١٤ - ١٩٩٤

### حەیران: جەمیلی عەلیاغا

خوێنەرانی خۆشەویست، حوسێنی عەلیاغای نەک هەر دەنگێکی زوڵاڵ و بەسۆزی لە حەیران گوتنا هەبوو، بەڵکو وەستای حەیرانان و

سوارچاک و راوکەر و نیشان شکێن و شایکەرێکی زۆر لێهاتووش بوو. حوسێنی عەلیاغای سەت هەزار مخابن تەمەنی هێشتا لە (٥٢-٥٣) سالاندا بوو، کە لە سالی (١٩٧٢) سەری نایەوە.

**وشەی حەیران**

خوێنەرانی بەرێز با بزانین وشەی حەیران لە چییەوە هاتووە، وشەی حەیران لە زمانی کوردیدا چوار واتای هەیە. راستییەکەی هەر چوار واتاش دەگەرێتەوە بۆ یەک سەرچاوە و خزمایەتییەکی نزیکیان لە نێواندا هەیە.

واتای یەکەم بە قوربان بوون و بەفیدابوون دەگەیەنێ. زۆر کەرەت دەگوترێ هەی بە حەیرانت بم! واتا هەی بە قوربانت بم، هەی بە فیدات بم. یان کە دەلێن ئەز حەیرانێ تەمە! مەبەستی لەمە، ئەز قوربانێ تەمە. واتای دووەم سەرسورمان و سەرسامی دەگەیەنێ. پیاو کە شتێکی زۆر بەدڵ دەبێ و زۆر بە گەرمییەوە باسی جوانییەکەی یان خۆشییەکەی دەکا، دەلێ ئەوەندە جوان و خۆش بوو پیاو حەیرانی دەبوو! واتای سێیەم کە ئەمەیان بە زۆری لە ناوچەی هەولێر و کۆیە و موکریاندا بەکاردێ مانای یار، دۆست و گراو دەدا، جا چ کور بێ چ کچ، کور بە یارەکەی خۆی دەلێ کچەتیم حەیران یان نازدار حەیران و کچیش دەلێ کورەتیم حەیران. واتای چوارەمیش ئەو ئاواز و بەندە خۆشەیە کەوا لێرەدا بابەتی ئەم توێژینەوەمانە.

ئینجا با سەرنجێکی ورد بدەینە هەر چوار واتاکان و کەمێک تێی رابمێنین دەبینین کە لە بنەرەتدا هەریەکن. بە قوربان بوون، سەرسورمان لەبەر جوانی، دۆست و یار، ئاوازی حەیرانیش کە تایبەتە بە ئەوینداری و حەزلێکردن هەر چواریان زادەی یەک وشەن. هەوڵ و تەقەلایەکی زۆرم دا بۆ ئەوەی بگەمە سەرچاوەیەکی کوردی وشەی حەیران بە داخەوە نەیگەیشتمێ. ناچار هاتمە سەر ئەو قەناعەتە کە حەیران هەر لە وشەی عەرەبی (حیران، احتار، یحتار، حیرە)تەوە هاتووە، کە ئەمەش هەمان واتا کوردییەکە دەداتەوە یانی سەرسورمان. نەبوونی دەنگی (ح)ش لە زمانی کوردی هەرچەندە کە لەدوای ئیسلامبوونی کورد وا پەریوەتە ناو زمانەکەمانەوە هەر ئەوەمان بۆ ساغ دەکاتەوە، کە وشەکە دەبێ عەرەبی بێ.

ئەوەی کە لێرەدا مەبەستی ئێمەبێ، تەنیا دوو واتاکەی دواییانە.

١- حەیران وەک دەنگ و ئاواز
٢- حەیران وەک دۆست و گراو

خولاسە کە دەلێن چەند حەیرانێکمان بۆ بلێ ئەوە دیارە مەبەستی لە چەند بەندە حەیرانێکی بەکاردێ، جا لەوێدا مەبەستی یان کورە یان کچە. هەر چۆنێکی بێ لەوانەیە حەیران لە سەردەمێکی زۆر زووتردا ناوێکی کوردی هەبووبێ لەباتی ئەم ناوە عەرەبییە، بەلام تا ئێستا هیچ بەلگەیەکی مێژوویی بەدەستەوە نییە، کە ناوێکی دیکەی هەبووە. لێرەدا بۆ دلدانەوەی گوێگر و هی خۆیشم حەزدەکەم ئەوەشی بخەمە سەر کە حەیران تاکە ئاوازی کوردی نییە لێقەوما بێ و ناوی خۆی لەبیر چووبێتەوە. لەبیرمە جاران وشەی گۆرانی هێشتا ئەوەندە باو نەبوو باب و باپیرانمان لەباتی گۆرانی وشەی شرقی و مقامیان بەکاردەهێنا کە هەردووکیان عەرەبین، بەلام یەکەمیان زیاتر لە زەمانی عوسمانلی بەکاردەهات. لەپاشان وشەی شیعر و شاعیر، تا ئەم دواییە کە وشەی کوردی هۆنراوە و هەلبەست پەیدابوون خۆ پێشترێ هەر شیعر و شاعیر بەکاردەهاتن. راستە وشەی هەلبەست لە کۆندا هەر هەبووە وەک کە دەلێن بەندێکت بۆ هەلدەبەستم، بەلام هۆنراوەکە لە هۆناندنەوە هاتووە ئەمەیان جاران تەنیا بۆ پرچی ژنان و هۆناندنەوەی موو و بەن و شتی وا بەکار دەهات نەک بۆ شیعر. بەلام نەبوونی وشەیەکی رەسەنی کوردی کۆن بۆ شیعر. یان بۆ گۆرانی یان حەیران ئەوە ناگەیەنێت د شیعر و گۆرانی و حەیران لە کۆنەوە لە کوردیدا نەبوون. بەلێ هەبوون بەلام دیارە ناوە کوردییەکانیان گوم بوون. ئەمەش هەر بەسەر کورددا نەهاتووە بگرە فارس کە جوانترین شیعری کۆنیان هەیە کەچی وشە فارسییەکەیان بۆ شیعر و شاعیر نەماوە و هەر عەرەبییەکەی بەکاردێنن. بەهەرحال، کە ناوی حەیرانی کوردی رەسەنیش نەبێ خۆ ناوەرۆکەکەی سەت جار کوردییە.



## دارشتنی فۆرمی ئەدەبی
## لە حەیراندا

خوێنەرانی خۆشەویست، هەوڵێک دەدەم، دارشتن و فۆرمی ئەدەبی حەیرانتان بۆ شی بکەمەوە بزانین لادێییەکی نەخوێندەواری کورد ئەم هەڵبەستە سەربەستەی چۆن داناوە و چ هونەرێکی شیعری بەکارهێناوە بۆ پێکگرێدانی بەندەکانی و گونجاندنی لەگەڵ ئاواز و نزمی حەیران.

لەرووی فۆرمی ئەدەبییەوە هەر حەیرانێک بریتییە لە ٣ بەند. بە زمانی ئینگلیزی ئەگەر هەڵبەستێک بریتی بوو لە چەند بەشێک بەو بەندانە دەڵێن ستانزا. دەشێ و زۆرجاریش دەکرێ کە حەیران بێژێک جۆش دەیگرێ و وێ دەچێ کوڵی دڵ بە سێ بەندەکە دانەمرکابێتەوە هەڵدەسێ یەکسەر بەندێکی چوارەمیشی دەخاتە پاڵ، بەڵام هەیکەلی سەرەکی هەر حەیرانێک لە ٣ بەندەوە پێکهاتووە ئەم سێ بەندانە کۆڵەگەی سەرەکی و بڕبڕەی پشتی هەر حەیرانێکن و ناشێ و ناکرێ و نابێ حەیران لەو سێ بەندە کەمتر بێت. حەیرانبێژی رەسەن و کۆن ئەم راستییە دەزانن، بەڵام گەنجەکانی ئەمڕۆکە دەنگێکی زۆر خۆش و زوڵاڵیان بۆ حەیران گوتن هەیە و حەزدەکەن ئەم هونەرە رەسەنەی کوردەواری بە زیندوویی بهێڵنەوە و لە فەوتان و نەمان بیپارێزن، بە داخەوە ئەم راستییانە نازانن و دەست بە حەیران گوتن دەکەن، بەڵام بەناو دەکەون هەر وەک کە لەم چەند ساڵانەی دوایی ئامۆزای خۆشەویست و نامرادم عوسمانی حەسەن ئاغای دزەیی کە بە (عوسمان سەرسۆر) ناسرابوو چەند تێبینییەکی زۆر لەجێی خۆی لە رۆژنامەیەکی کوردیدا نووسیبوو تێیدا دەڵێ (هەیرۆ



... حەیرانم رۆ!) لە تێبینییەکاندا عوسمانی جوانەمەرگ سەرزەنشتی ئەو حەیرانبێژە لاوانە دەکا کە حەیران دەڵێن، بەڵام تێکیان داوە و بەناو دەکەون. هەزار رەحمەت لە گۆڕت بێ عوسمان گیان.

ئێنجا با بێینە سەر دارشتنی ئەدەبی ئەو ٣ بەندە کە حەیرانییان پێ تەواو دەبێ. لێرەشدا دەبێ ٢ شت رەچاو بکەین. یەک، کێش کە بە عەرەبی (وەزن) و بە ئینگلیزی (میتەر)ی پێ دەڵێن، دوو، دوادەنگ یان (سەروا) یان (قافیە)ی عەرەبی کە بە ئینگلیزیش پێی دەڵێن (**Rhyme**).

بەندەکان کێشیان نییە، واتا نە لەسەر شیعری عەرووزی عەرەبی و نە لەسەر وەزنی پەنجەی کوردی تێک هەڵکێشراون. زیاتر وەک پەخشان دێنە بەرگوێ و هەتا حەیرانبێژ لە هەرسێ بەندەکان نەبێتەوە گوێگر هەستی پێ ناکا کە ئەمە شیعرە، بۆچی؟ چونکە راستە کێشیان نییە، بەڵام دوا دەنگ واتا قافیەیان هەیە و هەر بەندێک بە هەموو دێرەکانییەوە یەک تاکە دوادەنگی هەیە کە ئاخیرین وشەی بەندەکەیە. ئەو دوا دەنگەش واتا ئەم سەروایە، یان قافیەیە، لە کۆتایی هەر سێ بەندان دەبێ یەک بێ، بۆیەکا کە هەرسێ بەندت پێکەوە گوێ لێ دەبێ ئێنجا بۆت دەردەکەوێ کە حەیران پەخشانە شیعرە یان هەڵبەستێکی سەربەستە. لێرەدا نامەوێ باسی کورتی و درێژی بەندەکان بکەم چونکە دواترێ کە دێمە سەر ناوەرۆکی حەیران باسی ئەوە دەکەم، بەڵام بەگشتی بەندی یەکەم زۆر کورتە بەندی دووەم کەمێک لەو درێژترە بەندی سێیەمیش لەوان درێژترە، بەڵام دیسان ئەمە قاعیدە نییە، چونکە حەیران هەیە بەندی دووەمی لە هی سێیەمی درێژترە. بەپێی ئوسووڵی هەڵبەستی رۆژاوایی دەتوانین بەندەکانی حەیران لەرووی کێش و دوا دەنگەوە واتا لە رووی فۆرمەوە بەم جۆرە حیساب بکەین.

واتا درێژی بەندەکان یەک نییە، بەڵام دوا دەنگی هەرسێکیان یەکە. دەبا زەینی خۆمان بدەینە ئەم حەیرانە وەک نموونە بۆ ئەوەی ژمارەی دێرەکان و دوا دەنگی هەر یەکێک لەو سێ بەندانەتان باشتر بۆ روون بکەمەوە.

بەندی یەکەم: چیبکەم کوریکەک بوومایێ لە کوریکێ کەسی نەناسی.

بەندی دووەم: شین ببوومایێ لەسەر گومەتی پیرداوودی گۆچان کەسک بەرێ خۆم بدابایە شێراوە و قووچە برباسی.

بەندی سێیەم: کیژ جواب و سوابانم بۆ دەنێرێ بە پلکە پێناوێ سەلام لە کوڕەتیم حەیرانێ سەرێ چەند سارانە جۆتە شەمامە بەندێ باغەرێم هەرگرتینە لەبۆ خاتری کوڕەتیم

حەیرانێ چاوەکەم لەبن کەوێ و کراسی.

زەینێ خۆ بدەنێ هەر سێ وشەی دوایی لە هەرسێ بەندان یەک دوا دەنگیان هەیە. نەناسی، برباسی، کراسی، بەڵام درێژی بەندەکان جودان دەبا ئینجا بە دەنگ گوێ لەم حەیرانە رابگرین.

**حەیران: سمایلی حاجی کەریم**

ئەمە دەنگی سمایلی حاجی کەریمی دوگردکانە و کە هاتە سەر سەربردەی حەیرانبێژان بە درێژی باسی ئەمیش دەکەم.

لێرەدا جێی خۆیەتی هەندێ لایەنی وێکچوون لەنێوان دارشتنی فۆرمی ئەدەبی لە حەیران و فۆرمی ئەدەبیاتی رۆژئاوادا بەراورد بکەم.

ئەوەی کەمێک ئاگای لە ئەدەبیاتی کلاسیکی گریکی هەبێ، دەزانێ کە شاعیری گەورەی یۆنانی ئەو سەردەمە، پیندار، فۆرمێکی بۆ هەڵبەستەکانی خۆی بەکاردەهێنا کە پێی دەڵێن تریادیان تراید واتا سێیینە. ئیتر ژمارەیەکی زۆر لەو سێیینانە بەسەر یەکەوە بەندە بەناوبانگەکانی پینداریان پێک دێنا (پێنداریک ئۆدز). ئەو سێیینانەش بریتی بوون لە سێ بەشەوە بەشی یەکەم بەناوی (ستروٚف) بەشی دووەم بەناوی (ئەنتی ستروٚف) بەشی دواییش (ئیپۆد). ژمارەی دێڕی واتا پێوان یان میتەری هەر بەشێکیان جیا بوو لەوەی تریان. ئەوە لە ئەدەبیاتی کلاسیک. بەڵام ئەمڕۆش لە وڵاتانی رۆژئاوا، کە لەسەر بابەتێک دەنووسن و بە نووسینەکە دەگوترێ (ئێسەی) یان (دیسەرتەیشن) یان (تیسیس) بە کوردیش گوتار و بە عەرەبیش (ئینشا) یان (مەقالە) یان (ئەتروحە)، ئەو گوتارە دەکەن بە سێ بەشەوە، (ئینترۆدەکشن) واتا بەرایی، (دیسکەشن) واتا ناوەرۆک و لێدوان، (کونکلوژن) واتا دەرئەنجام کە بە عەرەبی پێی دەڵێن خولاسە و ئیستنتاج.

من لە ئەنجامی ساڵەهای تێرامان و وردبوونەوەم لە حەیران، هاتوومەتە سەر ئەو باوەڕە کە لادێییەکی نەخوێندەواری کورد بە سەدان ساڵ لەمەوبەر پەی بەم جۆرە شێوازی بیرکردنەوەیە بردووە و ئەو هونەرەی بۆ دارشتنی حەیران هەڵبژاردووە، کە ئەمڕۆکە بۆ نووسینی ئینشایەکی چاک و سەرکەوتوو لە لایەن نووسەرانەوە بەکار دەهێنرێ.

*** وەزیفەی بەندەکان:**

بەندی یەکەم: ئەمەیان زۆر کورتە و زۆرجار لە یەک دوو وشە پێکهاتووە. وەزیفەی ئەم بەندە رێخۆشکردنە یان سەرەتایەکە یان ئافراندن واتا خولقاندنی ئەو دەوروبەرەیە کە



اسماعیلی حاجی کەریمی ١٩٣٢

حەیرانبێژەکە بۆ بابەتەکەی خۆی هەڵیبژاردووە. نموونەیەک بۆ بەندی یەکەمی حەیران:

(دارکەرێ لە داران...) کەواتا وێ دەچێ لێرەدا حەیرانبێژ دڵی چووبێتە کیژۆڵەیەکی دارکەر کە بزانە داخوا لە جۆتی، بەشوانی یان بە رێبواری چاوی پێ کەوتووە و ئیتر ئەمە وەک سەرایییەکە کە بە ئینگلیزی پێی دەڵێن (introduction) بە عەرەبیش (مدخل) بۆ بەندەکانی دیکەی حەیرانەکە. مایکل چایەت لە تێزە بەهادارەکەی دکتۆرای کە لەسەر مەم و زینی زارەکی نووسیوە و (١٩) دەقی جۆراوی بەیتی مەم و زینی زارەکی بەکارهێناوە، باسی دێڕی یەکەمی بەشەکانی دەکا و دەڵێ: بەیتبێژ ئەو چەند وشەیەی لە دێڕێکی کورتدا هەر بۆ ئەوە داناوە وەک ئامێرێک کە بڕیاری دوا دەنگی هەموو دێڕەکانی دیکەی ئەو بەشەی بەیتەکەی پێ بدا. بۆ نموونە کە رەحمان بەکر لە مەم و زینەکەی خۆیدا لە سەرەتای هەر بەشێکی کە بیەوێ بەیەک دوادەنگ یان قافیە کۆتاییان پێ بێنێ، ئەم ئامێرەی بەکارهێناوە کە دەڵێ:

**کێ بوو لەو جووتە ئاشقەی نەوجەوانە؟**
**هەڵدەگرن فەنەرێ، فانۆسی دەگەڵ چرانە.**
**هەرچەندی کۆشک و پەنجەران دەگەڕانە.**
**کۆشکی کاکە مەمی بوو... خاتوونێ نەیبوو چ نیشانە!!**
**سەرنجی خۆ بدەنێ جوانە، چرانە، گەڕانە، نیشانە!**

یان کە دەڵێ:

**کێ بوو لە بەنگینی گوڵباوە؟**
**بانگ لەسەر بانگی لێداوە.**
**چووە دیوانی برایم پاشای راوەستاوە.**

سەرنجی بدەنێ گوڵباوە، لێداوە، راوەستاوە! جا لێرەدا مایکل چایەت دەڵێ بەیت بێژ دێڕی یەکەمی هەر بۆ ئەوە

داناوە کە هەموو دوا دەنگەکانی دواتریی لە بەشێکدا پێ بکاتە یەک بەر لەوەی بیگۆڕێ و بچێتە ناو بەشێکی دیکەوە بە دوا دەنگێکی دیکە. هەڵبەتە مایکل ئەم بۆچوونەی بۆ بەیتی کوردییە، منیش چۆتە ئەقڵم. جا لێرەدا ئەم بۆچوونەی مایکل چایەت بۆ بەیت و ئەوەی خۆشم بۆ حەیران هەردووکی بە باڵای حەیرانیش دا دەکەم و بەمجۆرە دەتوانم بڵێم کە حەیرانبێژ بەندە کورتەکەی یەکەمی بۆ دوو مەبەستە، یەک ئافراندنی دەوروبەر و رێ خۆشکردن بۆ ناو بابەتی سەرەکی حەیرانەکەوەو دوو، بڕیاردانی دوا دەنگی هەر سێ بەندی حەیرانەکە واتا دیاریکردنی سەروا یان قافیە. بەهەرحاڵ حەیرانبێژ کە بەندی یەکەم دەڵێ ئازادی دەداتە خۆی تام و چێژی تایبەتی خۆی پێوەر بکات و وشەی دیکەی جوانی بخاتە سەر. ئەم بەهارات پێوەر کردنە هەر بۆ رازاندنەوە و تام و بۆنخۆشی نییە، بەڵکو بۆ ئەوەو بۆ خێواندنی بەندەکەشە لەگەڵ ئەو نزم و ئاوازەی کە تایبەتمەندی ئەو حەیرانبێژەیە. کە هاتمە سەر نزم و ئاواز پتر لەمە دەدوێم. بۆ نموونە، بەندی یەکەم:

دارکەرێ لە دارێ...

ئەم دوو سێ و وشەیە جەوهەری بەندی یەکەمە لەم حەیرانە و دوا دەنگەکەشی لێرەدا بڕیەوە دەبێ هەر ئەوە بێ واتا لە دارێ .. ێ!

بەڵام حەیران بێژ دەتوانێ ئەمانەشی بخاتە سەر وەکو:

چیبکەم ئەمن. ئەورۆ هێواری، دەمەرۆ مەرۆ ناتگەمێ گەردەن کێل، دارکەرێ لە دارێ..." سەرنجی خۆتی بدێ دارکەرێ لە دارێ هەر وەکو خۆی ماوە، بەڵام شتی دیکەی خستە سەر ئیتر بەمجۆرە هەر حەیرانبێژێک بژارێکی زۆری لە پێشە چەند وشەیەک بخاتە سەر بەندی یەکەم، بەڵام



حەیرانبێژیش هەیە کە هیچی ناخاتە سەر، ئەویش هەر تەواوە، دەبا ئەوجا با باسی حەیرانەکانی حەمەدبەگ بکەم.

**حەیران: حەمەد بەگی**

پێشتر باسی ئەرکی بەندی یەکەمی حەیرانم بۆ کردن کە گوتم ئەو بەندە هەم رێخۆشکردنە بۆ ناو حەیرانەکە، هەم بڕیاردەری دوا دەنگی واتا سەروای هەر سێ بەندەکانی حەیرانێکە. ئێستاش دەمەوێ ئەرک و وەزیفەی بەندی دووەمی حەیران شی بکەمەوە. پاش رێخۆشکردن بۆ دەوروبەر و بۆ ناو جەوی حەیرانەکە لە لایەن بەندی یەکەمەوە، بەندی دووەم پتر بە دوور و درێژی دەچێتە ناواخنی ئەو دەوروبەرەو راستییەکەی ئەگەر بەندی یەکەم لە حەیرانێکدا تەنها بە مەبەستی سەروا نەبێ، ئەوا پەیوەندییەکی گیانی بە گیانی لەنێوان بەندی یەکەم و بەندی دووەمدا هەیە. حەیرانبێژ زۆر بە وەستایی هەڵستاوە ئەو دوو بەندەی تێک هەڵکێشاوە جا ئەگەر ئەم تێکهەڵکێشانە بە زەقیش دەرنەکەوێ ئەوا لە خەیاڵ و دڵی حەیرانبێژدا بە چاکی دیارە. نموونەیەک لەو تێکهەڵکێشانەی کە بە زەقی دیارە ئەمەیە:

بەندی یەکەم: حەیران لە پەرێزە جۆیێ...

کەواتە سەحنەی یان شانۆی خۆشەویستی و حەزلێکردنەکە دیارە لەسەر پەرێزە جۆیێدا بووە:

بەندی دووەم:

ئەمن نازانم مەمکێ یارێم گوواینە لەبەر دەسکێ قەرانگییە، نە لەبەر هەرمی مەرۆیێ... (هەندە حەیرانبێژ دەڵێن قونکی مەرۆیێ).

ئەوجا خوێنەری بەرێز سەرنجی خۆتی بدەیێ دەبینی کە کوردەتیم حەیران لەوانەیە سەپان بێ یان سەرپاڵە بێ و لەسەر پەرێزە جۆیێ دڵی چووبێتە نازدار حەیرانەکەی خۆی کە دەبێ ئەمەشیان گیشەکەر یان تێلەکێش بێ، چونکە کاری کیژۆڵان لەسەر پەرێزێ هەر ئەوەیە ئیتر حەیرانبێژ هەر جارەکی کە چاوی بە دەست و قەرانگی یارەکەی دەکەوێ (قەرانگ ئامێرێکی وشی کردنەو وەک داس وایە، بەڵام دەمەکەی وەک داس تیژ و پانۆکی نییە، بەڵکو خڕۆکییە و تەنها نووکی تیژە) جا لێرەدا حەیرانبێژ بەغیلی بە دەسکی قەرانگێ و مەلۆیەکە دەبا، چونکە یارەکەی هەر جارەکی مەلۆکە بە قەرانگ هەڵدەگرێتەوە دەسکی قەرانگەکە بە مەمکی دەکەوێ لە پاشانیش مەلۆکان هەمووی بە سنگی خۆیەوە دەنێ و لەسەر گیشە یان گەلاوێژی بەرێکوپێکی دادەنێ. ئیتر لە ئەنجامی دووبات بوونەوەی ئەم کارە بە درێژایی رۆژگار مەمکی یارێ هەم بە دەسکی قەرانگەکە و هەم بە

هەڵمی گەرمایی مەڵۆکە کەمێک خاو و شل دەبێتەوە و دەگۆڕێ. حەیرانبێژ لە خەیاڵی خۆیدا حەزی دەکرد ئەو مەمک گۆوانە بە دەست و پەنجەکانی خۆی وەئەنجام بدرایە، نەک بەرێگای قەرانگ و مەڵۆی. لێکدانەوەیەکی دیکەش بۆ ئەم بەندە هەیە. کاتێ کە دۆست و گراو لە جێیێ ژوانێ پێک دەگەن، کوڕەکە کە مەمکی دەگرێ و هەست دەکا گۆواوە بیری هەر بۆ کاری رۆژانەی کچەکە دەچێ کە گیشەکەرییە نەک بۆ شتێکی دیکە. کە گوایا کچەکە دۆستێکی دیکەی هەیە و ئەو دەسبازی لەگەڵدا کردووە، بۆیە مەمکی را گۆوایە. ئیتر خوێنەری خۆشەویست دەبینی کە حەیرانبێژ چەند بە پسپۆڕی بەندی یەکەم و دووەمی حەیرانەکەی تێک گرێ داون کە وێنەیەکی شیعری پڕ لە وردەکاری و جوانکاری خستۆتە نێو چوارچێوەیەکی وا رەنگینەوە. دەبا نموونەیەکیش لەم چەشنە تێک هەڵکێشانەی بەندی یەکەم و دووەمی حەیران بێنینەوە. ئەمجارەیان دانەری حەیرانەکە کچە، بەڵام جاری واش هەیە کوڕ بە زمانی نازدار حەیرانەکەی قسە دەکا.

بەندی یەکەم:

حەیران گەلە بێ مرادە.. (بێ مرادە واتا نەگەیبووە بە مرادی، مرازی حاسڵ نەبووە، دیارە کە باوکی کچە بڕیاری داوە نەیداتێ).

بەندی دووەم: ئوخودا وەرە ماری مە، دەمەکێ دانیشە، مێوان بە. یەک جغارەی تێکە، لەبۆ خاتری کەیفێ درێ من لە دنیایێ سمێرت بادە...

سەیرکە کچەکە کە دەزانێ بابی نایداتە یارەکەی، بەڵام بەخۆی بڕیاری داوە ئەگەر پێشی نەبڕێ ئەوا دەست تێکەڵ کردن و حەز حەزۆکێی لەگەڵدا هەر دەمێنێ، بەڵام دەشزانێ کە کوڕەتیم حەیرانەکەی لەوانەیە ئەم راستییە نەزانێ و بکەوێتە ژێر باری خەم و خەفەتان بۆیە بانگی دەکا دەڵێ: چ دڵ لە دڵی مەدە، وەرە لام و هیچ خەمەت نەبێ، بەڵکو جغارەی خۆت تێکە و سمێڵی لێ بادە، چونکە بە شەرعی و ناشەرعی ئەمن هەر هی تۆم.

خوێنەری خۆشەویست لەم حەیران و لەوەی پێشووش نەمویستووە باسی بەندی سێهەم بکەم، چونکە ئەوەیان بەجێ دێڵم و با جارێ گوێ لەم حەیرانە راگرین بە دەنگی خوالێخۆشبوو ساڵح ئاغای مام زێندینی.

## حەیران: ساڵح ئاغای مام زێندینی

دەبا گوێ لەم حەیرانەش راگرین کە بە تەواوی نازانم، بەڵام پێمـوایە دەنگی تایەرە کە خەڵکی پەرکانەی لای پردێیە.

## حەیران: تایەر

یاخوا ئەو دەنگە غەریبەت هەر بمێنێ تایەر!

حەیرانبێژی کورد پاش ئەوەی بەندی یەکەمی حەیرانەکەی وەک پێشەکییەک، وەک رێخۆشکردنێک بۆ حەیرانەکەی هەڵدەبژێرێ لە بەندی دووەمیشدا بە دوور و درێژی کەشی واتا دەوروبەری شانۆی حەیرانەکە روون دەکاتەوە ئینجا دێ خولاسەی کەلامی لە بەندی سێیەمدا دەخاتەڕوو. ئەم بەندە بە گشتی لە هەر سێکیان درێژترە، بەڵام جاری واش هەیە هێندەی بەندی دووەم دەبێ. بابەتی بەندی سێیەم بەزۆری بریتییە لە خۆزیداری و ئاواتە خوازی کە بە عەرەبی پێی دەڵێن (تەمەنی و تەرەجی) یان پێدا هەڵگوتنە بە جوانی و شۆخ و شەنگی نازدار حەیرانەکە، یان کوڕەتیم حەیرانەکە، یان خەمو خەفەت هەڵگرتنە چونکە پێک نابڕێن، یان قەول و قەرار تازەکردنەوەیە کە هەتا هەتایە بۆ یەک بن، یان بڕیار دان و رێگاو شوێن دانان و تەگبیر کردنە بۆ ژوان و پێک گەیشتن، خۆ ئەگەر چ رێگایەکی کەشیان نەبوو، ئەوا گفتی هەڵگرتن و رەدوو کەوتن بەیەک دەدەن. ئیتر بەمجۆرە هەر سێ بەندی حەیرانێک دەبن بە یەک پارچەی پتەو و تەواوکەری یەکتری. دەوجا با بزانین چۆن هەرسێ بەند بەسەر یەکەوە بابەتی حەیرانەکە تەواو دەکەن و دەیکەن بە مەوزوعێکی پتەوو یەکگرتوو. گوێ بدەنە ئەم حەیرانە:

بەندی یەکەم:

حەیران لە پەرێزە جۆیێ...

کەواتە سەحنەی یان شانۆی خۆشەویستی و حەزلێکردنەکە دیارە لەسەر پەرێزە جۆیێ بووە.

بەندی دووەم: ئەمن نازانم مەمکێ یارێم گۆواینە نە لەبەر



دەسكێ قەرانگێیە نە لەبەر هەرمی مەرۆیێ. (ئەمەشم پێشتر شی كردەوە).

بەندی سێیەم:

ئەمن سوندەكم خواردیە دەست لە بەژنێ باریك هەرنەگرم هەتا ئەوێ رۆژێ حەزرەتی عیزرائیل چۆكم لەسەر سینگی دادەنێ، بەروحم دەبا نسكۆیێ... (سەرنجی خۆتانی بدەنێ حەیرانبێژ لێرەدا سوێند دەخواو قەول و قەراری خۆی بۆ یارەكەی تازە دەكاتەوە كە هەتا ئەوێ رۆژێ حەزرەتی عزرائیل رۆحی دەكێشێ ئەو دەست لە یارەكەی هەڵنەگرێ).

ئەمەیان بەڵێن و ئادو پەیمان تازەكردنەوە بوو كە لە بەندی سێیەمی حەیراندا بەدەردەكەوێ.

دەبا نموونەیەكیش بێنینەوە كە بابەتی سێیەمی تێیدا بۆ ژوان و پێكگەیشتن تەرخانە.

دیسان هەر حەیرانەكەی پێشتر (ئەمجارەیان ئەم حەیرانە كچ دەیڵێ).

بەندی یەكەم:

حەیران گەلە بێ مرادە.....

بەندی دووەم:

توخوا دەوەرە مارێ مە، دەمەكێ دانیشە، میوان بە، یەك جغارەی تێكە، لەبۆ خاتری كەیفی درێ من سمێرت بادە...

بەندی سێیەم:

ناوقەدم بگرە، گەلە جوانی لۆیێ لۆت نمایە لەوێ دنیایێ، بە زەندەكی بەبازن بە ئەستێركم دادە.

خوێنەری خۆشەویست لێرەدا بەروونی دیارە كە كچەكە پلان و تەگبیر و رێ و شوێن بۆ كورەتیم حەیرانەكەی دادەنێ، كە بچێتە ماڵی و پاش حەسانەوەیەك و جغارە كێشانێك ئینجا كچەكە خۆی وای لەخەیاڵ داناوە كە كورەكە ناوقەدی بگرێ و بە ئەستێركی دادا!! (ئەستێرك لە ماڵە لادێییان ئەو شوێنەیە یان ئەو سندوقانەن كە بەرۆژ نوێنی لەناو جاجم و چارشەو بەرەی رەنگاو رەنگدا دەپێچنەوە لە بنەبانی ژووری دانیشتن لەسەری دادەنێن كە هەم بۆ پاراستنی لە تۆز و گەردو هەم بۆ رازاندنەوە و دیكۆری ناو ماڵەكەشە. بەمە دەڵێن ئەستێرك.) جا هەڵبەتە ئەمە نەرمترین شوێنی ناوماڵە كە پشتی كچەكە ئەزیەت نەدا بۆیە كە كور و كچ لە شوێنێكی وا پێك دەگەن و دەست بە دەست لەملانە و ماچ و مووچ دەكەن، بەزۆری كورەكە ناوقەدی كچەكە دەگرێ و بە ئەستێركێی دادەدا كچەكەش هەر خۆشی چاوەڕێی ئەوە لە یارەكەی دەكاو پێی خۆشە بە ئەستێركێی دابدا. دووبارە لەگەڵ ساڵح ئاغا و ئەم حەیرانە:



**حەیران: ساڵح ئاغا**

خۆشە لە هەرەتی لاوی بیت و ناسكە كیژۆڵان بە ئەستێركێ دادەیت!!

دەبا ئەوجا گوێ لە دەنگی غەریب و زوڵاڵ و بە سۆزی كاك محەمەد حەسەن عومەر راگرین لەم حەیرانە تەڕ و بەتام و بۆیەی كە بەهاری لێ دەتكێتەوە. هەستی خۆتانی بدەنێ حەیرانەكە بەندێكی چوارەمیشی بەدواوەیە.

**حەیران: محەمەد حەسەن عومەر**

هەر خۆش بی كاك محەمەد!

گەلی دۆست و یاران

گوتم كە هەیكەلی بنچینەیی حەیران لە ٣ بەندانەوە پێكهاتووە، بەڵام جاری واش هەیە حەیرانبێژ دەتوانێ بەندێكی چوارەمی یان با بڵێین پاشكۆیەكی بخاتەپاڵ. هەر چۆنێكی بێ دارشتنی ئەدەبی ئەم بەندی چوارەمە وەك ٣ بەندەكەی پێشوو نییە. ئەمەیان زیاتر لە شیعرێكی بەكێش و سەروا دەكا و بریتییە لە (٦/٥/٤) دێر بەپێی وەستایی و زەوقی حەیرانبێژەكە. بەهەرحاڵ وەك پێشتریش گوتم بەندی چوارەم جاییزە، بەڵام مەرج نییە، ئەوەی كە حەفت و هەشتی لەسەر ناكرێ هەر سێ بەندەكەی هەوەڵییە.

دەبا وەك نموونە ئەم حەیرانە چوار بەندیەتان بەقسە بۆ بڵێم ئینجا لەپاشان بەدەنگ گوێی لێ رادەگرین.

بەندی یەكەم:

دەمەرۆ شل و مل و چاو بەكل واللە خانەوێران دەنا گەلە بەنازو عینوانی لە بستێ گۆگەمان..

دەمەرۆ مەرۆ بتگەمێ چاوەکەی راستەم....
بەندی دووەم:
دەوجـا دەرێم باسکی برند نابی لەبەر بەربازنان چاوی هەرنایێ خانەوێران لەبەر هووردە پەرچەمان....
بەندی سێیەم:
ئەمن سـوندخـۆرم لەگـەر بابان وێرانێ هەتا ئەوێ رۆژێ دەمێنێن لە قەبری سەدجار، سەد جاران بەخارێی گەردەنێ، بە پانێی جۆت بسکان، بەرووەمەتێ سۆری گورگوری هەتا ئەتو کێژ بی لەماری بابان ئەمن لەدوو چاوی کارمامزێ هەر نەگرم خەمان...

زەینێ خۆتانی بدەنێ سێ بەندەکە کۆتاییان بەم جۆرە دێ: گۆگمـان، پەرچەمـان، خەمـان، واتا هەرسێکیـان هاودەنگن سەروایان وەک یەکن؟

ئینجا لێرەدا حەیرانبێژ هەر یەکسەر پاش هەناسەی، لێی ناگرێتەوە و بەندێکی چوارەمی دەخاتە پاڵ وەک ئەمە:

- دەوجا حەیران حەیرانە..
- بەژنی دارتێلە مەمک فنجانە..
- چاوی چەند رەشە مەعدەنی کل و دەرمانە...
- دەمەرۆ ناتگەمێ چاو کارێ، دەبا سەد جار سەد جاران چاوەکەی راستم ئەوشۆکە پێکەوە بنووین دنیا ئاخر زەمانە..

ئەم بەندی چوارەمـە بە جـۆرێکی دیکەش دەگـوترێ وەک ئەمە:

- حەیران حەیرانە...
- فرمێسک چاوی کاروان کاروانە..
- دەرمانی دەردان مەمک گوشینە، شەوراموسانە
- حـەزلێـک کـردن گـەلە گـەلە خـۆشـە بەران دەست لێک بەردان

دەردەکی گەلە گەلە گرانە.

ئیتر هەر حەیرانبێژێک بە ئارەزوو وەستایی خۆی دەتوانێ قسەی جوانی بخاتە سەر یان بەپێی نزمەکەی خۆی هێندێکی لێ کەم کاتەوە هەتاکو بیخێوێنێتە نزمی حەیرانەکەی خۆی. دواترێ زیاتر باسی ئەم هاوێشـتنە سـەرە و لێ گـرتنەوەیە دەکەم. با ئەوەشتان پێ بڵێم کە بەندی چوارەم پەیوەندییەکی بابەتی بە ٣ بەندەکەی حەیرانەکەوە نییە و حەیرانبێژ دەتوانێ ئەو بەندی چوارەمـە بخاتە سەر هەر حەیرانێکی کە بیەوێ، مـەبەسـتم ئەوەیە بەندی چوارەم تایبـەت بە هیـچ حـەیرانێک نییـە. دەبا ئینجا گـوێمـان لە یەکێک لە حـەیرانبـێژە هەرە لێهـاتووەکـانی دەشـتی کـەندێناوەی دزەییـاتی بیێ، دەنگی قـوشـەی فـەقێ عـەزیزی خـەڵکی لهێبان، هەزار رەحـمـەت لە گۆڕی. بەداخەوە ئەویش بەپیری ئەم کاسێتەی بۆ تۆمار کراوە و لەوانەیە ئەوەندە سافیش نەبێ.

**حەیران: قوشەی فەقێ عەزیزی**

(ئەمەی دواییان بەندی چوارەم بوو).

ئێستاکە دیسان گوێمان لە حەیرانێکی مام قوشە دەبێ کە چوار بەندی بەکارهێناوە.

**حەیران: قوشەی فەقێ عەزیزی**

خوێنەرانی ئازیز و خۆشەویست...

باسی هەرسێ بەندە بنەڕەتییـەکەو بەندە چوارەمـەکـەشی حـەیرانم بۆ کـردن. بەوەش لە شـیکردنەوەی فـۆرمی واتا دارشتنی ئەدەبی حەیران دەبمەوە.

**پێشبەند و دوابەند**

ئینجا دێمە سەر لایەنێکی دیکەی حەیران کە نزم و واتا ئاوازەکـەیەتی و جـارێ بە دوو بەشی ئەو نزمـە دەست پێ دەکەم کە رۆڵی سەرەکییان لە سۆز و خرۆشی هەر حەیرانێکدا هەیە: پێشبەند و دوابەند. بەندی یەکەمی هەر حەیرانێک بە گشتی بە دەنگ هەڵدانێک دەست پێ دەکات کە پێی دەڵێن: پێشبەند.

بەندی سێیـەمیش بە دەنگ دابەزین کـۆتایی پێ دێ کە پێی دەگوترێ دوابەند یان پاش بەند بەم جـۆرە ئەو حـەیرانە ئیتر تەواو دەبێ.

کـەواتە حـەیرانی چاک دەنگتی بۆ هەڵدەدەیت و بەندی یەکەم و دووەم ئەگـەر کرا هەردووکی بەیەک هەناسە دەڵێیت ئینجا پشـووێکی کورتی بۆ دەخۆیتەوە و بەندی سێیـەم کە لەهەر دووەکەی تر درێژترە ئەویشیان بەیەک هەناسە دەیڵێیت و وردە وردە ئیتر ئەو دەنگ هەڵدانەی کە لە سەرەتادا بیوود پێش بەندی حەیرانەکەت لێرەدا بە وەستایی دادەبەزێنێ و نەرمۆکە نەرمۆکە دەنگت بەرەو کزی دەڕواو دوور دەکەوێتەوە تا لە گـوێیـان بزر دەبێ. ئەم دەنگ دابەزینەی کـۆتایی هەر حەیرانێک کە پێی دەگوترێ دوابەند لە راستیدا تەواوکەری دەنگ هەڵدانەکـەی واتا پێش بەندەکـەی سـەرەتای حـەیرانەکـەیە. تۆ کـە دەنگت هەڵدەدەی خـۆ نابێ هەروا بە مۆڵەقی بمێنێتەوە.... دەبێ داشیبەزێنی. ئەم جۆرە ئیتر کە لە هەرسێ بەندی حـەیرانەکـە بوویتـەوە، ئینجـا دەنگت بە دوابەند دێنیتـە خـوارەوە و کـە تەواو بوو دەتوانی ئیتـر پشـووێکی باشی درێژتر لەوەی پاش بەندی یەکەم و دووەمی درێژتر بۆ بخۆیتەوە و خۆت بۆ حەیرانێکی دیکە ئیتر ئامادە بکەیت. دوابەند بەشێکە لە بەشە هەرە گرنگ و سەختەکانی هەر حـەیرانێک. هەمـوو حـەیرانبـێژێک دوابەندی چاکی بۆ

نابێ. دوابەند هەناسـەیەکی زۆر درێژی پێ دەوێ و تا ئەو هەناسەیە نووزەی تیا مابێ، حەیرانبێژ هەر دەنگی لێوە دێ و بەرە بەرە لەگەڵ هەناسەکە بەرەو کزی و دووری دەڕوات تا بە چەشنێکی زۆر غـەریب و بە سـۆز و دڵڕفـێن دوایی دێ و نامێنێ. جا لێرەدا ئەگەر هەر کەسێک لە کۆڕی مـەجلیسـی حەیرانبێژەکە دانیشتبێ یان لەسەر پەرێز یان لەسەر جۆخینان لەگـەڵی بێ، ئەوا ئەو کـابرایەش بەر لە تـەواوبوونی دوابەندەکە کە دەنگی حەیرانبێژ بەرەو دابەزین دەچێ ئەویش لەجـێی خـۆیەوە تواهوویەکی بۆ هەڵدەدا و دەڵێ (تواو هو هو..!!!).

جـا ئا ئەلێـرەدا هونەری هارمـۆنی مـوزیک بەوپەڕی جوانییەوە خۆی دەنوێنێ، چونکە شەپۆلی دەنگی حەیرانبێژ و هی کابرای دیش لە حەوادا یەکدی دەگرنەوە و لەیەک نۆتەی موزیکادا تێکەڵ بەیەک دەبن جا (دۆ) بێ (رێ) بێ (می) بێ... هەر چیـیـەکی بێ، دەبن بە یەک و ئاوازێکی زۆر رۆمانتیک و سەنتیمەنتالی دڵتوێنەرەوە لەوێوە ئیتر لێی دەردەچێ.

جاری واش هەیە ئەگەر حەیرانبێژ خۆی لەبەر خۆیەوە و بە تەنیـا حـەیرانەکـانی بڵێ ئەوا دیسـان لەگـەڵ کـۆتایی دوابەندەکـەی هەر بەخـۆی تواهوویەک بۆ خـۆی لێ دەدا بۆ ئەوەی درێژە بە دوابەندەکـەی بدا. دەست لەبناگـوێ نانیش رێگایەکی دیکەیە بۆ گـەورەکـردن و لەراندنەوەی دەنگ کـە لادێییـەکی کـورد بە سەدان ساڵ لەمەوبەر پەی پێ بردووە و ئەمڕۆ هەر گۆرانی بێژێک کە گۆرانییەکـانی لە ستۆدیۆ بۆ تۆمـار دەکـەن گـوێچکە فـۆنێک کـە بە ئینگلیـزی (**headphone**) یان (**Earphone**)ی پێ دەڵێن دەخەنە سـەر هەردوو گـوێی بۆ ئەوەی دەنگی خـۆی لە گـوێچکەدا بزرنگێتەوە و دەنگ بداتەوە، ئەمەش پتر هانی دەدا، چونکە دەنگەکەی لا خۆشتر دەکا. حەیرانبێژی کورد هەر بە سەلیقە هەردوو دەسـتی لەبناگـوێ دەنێ ئینجـا بۆی هەڵدەدا، ناوە ناوەش هەردوو نـاولەپی دەبزوێنێ و شل و پەیتی دەداتێ بەمـجـۆرە ئیـتر دەنگی پێ دەلەرێنێتـەوە. لەوانەیە ئێستا گـوێگر بپرسێ تواهوو یەعنی چی؟ من پێم وایە ئەمـە لە وشەی تاوەوە هاتووە واتا تاودان، تاوسەندن، تاو وەرگرتن، خەڵکەکە لێرەدا هانی حەیرانبێژەکە دەدەن کە لە تاودانەکەی خـۆی نەگـرێتـەوە و بەردەوام بێ. لە کـرمـانجی باکـووریش لەدوای هەر گـۆرانیـیـەک یان لاوکـێـک یان سـتـرانێک دەنگبێژەکە تەشجیع دەکەن و دەڵێن (تاو تاووو) لێرەدا با قسەیەکی خۆشتان بۆ بگێڕمەوە کە بەسەر خۆم هاتووە. ساڵی (٥٥) یان (٥٦) بوو لە بەغـدا لە مـاڵی چەند برادەرێکی ورد دانیشتبووین و منیش حەیرانم بۆ دەگوتن. کاک حەبیب محەممەد کەریمی فەیلیشمان لە گەڵا بوو، یادی بەخێر، کە کوردی ئێمەی باش نەدەزانی و حەیرانیشی هەر نەبیستبوو. لە پاش هەر دوابەندێکی کـە لێی دەبووەوە برادەرەکـان دەیانگوت تواهوو لە ئاخیری کاک حەبیب خۆی پێ رانەگیراو وایزانی گاڵتەم پێ دەکەن. بە عەرەبی پێی گوتن (ما تخلوا الولد یغنی شنو کل ساع واحد دیخربت علیه!!) واتا (دە لێی گەڕێن کوڕەکە با گۆرانییەکەی بڵێ، ئەوە چییە هەر لێی تێک دەدەن!!) وەڵڵا کردمان بە پێکەنین و تێمان گەیاند کە ئەمە گاڵتە پێکردن نییە، بەڵکو بەشێکی حەیرانەکەیە. دەبا ئەوجا گوێمـان لەم حەیرانە بێ کە لە دوابەندا تـوواهووی بۆ لێ دەدەنەوە. مـیـوانیـشـمـان دۆسـتـێکی دێرینی زۆر خۆشەویـستی خۆمە کە هەر لە منداڵییەوە عومرێکی درێژمان پێکەوە رابردووە. حاجی فـەقێ عـەوڵا یادی بەخێـر!! جـا فەرموون لەگەڵ حاجی لەم چەند بەندە حەیرانە:

**حەیران: حاجی فەقێ عەوڵا**

یارەبی هەر خۆشبی حاجی!



بوهەرحـاڵ گـوێگری خـۆشـەویست، تواهوو لێدانیش هونەری خۆی هەیە. نابێ لە دوای هەر دوابەندێکا دووبارە بکرێتـەوە، بەڵکو ئەوها ناوە ناوەو زۆر کەسیش پێکـەوە لـێی نـەدەن دەنا دەبێتە گەڕەلاوژە. پێش بەند و دوابەند لە ئوسـوولی مقاماتدا زۆر گرنگە کە بە عـەرەبی بە دەنگ هەڵبڕینەکەی هەوەلی دەڵێن مقام واتا ئەو شوێنەی کە دەنگتی لێوە هەڵدەستێ و لە قام و یقومەوە هاتووە واتا هەڵستانەوە دوابەندەکەش لە ئوسوولی مقاماتدا پێی دەڵێن قرار کە واتا ئەو شوێنەی کە دەنگتی تێیدا قەرار دەگرێتەوە و استقرار دەکاتەوە. هەڵبەت ئاوازی حەیرانی کوردی بێ ئەوەی حەیرانبێژەکەی خۆی ئاگای لێ بێ لەسـەر ئوسـوولی مـقـاماتدا دانراوە و نزمـەکـەشی بەیاتە. حەزدەکەم لێرەدا روونی بکەمەوە کە وشەی نزم لە حەیراندا لە (نەزم)ی عەرەبییەوە واتا (ئاواز) وەرگیراوە و چ پەیوەندی بە وشـەی کـوردی (نزم)ەوە نیـیـە، کـە پێـچـەوانەی وشـەی (بەرز)ە. پێشبـەند و دوابەند لەگەڵ ناوەڕۆکی حەیرانەکە

گـرنگـتـرین بەشی هەر حـەیرانێکن. حـەیرانبـێـژ هەن کـە حـەیرانەکـانیـان تەڕ و چڕ و پڕن لە سـۆزی بەجـۆشی خۆشەویستی بەڵام نزمی حەیرانەکەیان یان با بڵێین پێشبەند و بە تایبەتیش دوا بەندەکەیان ئەوەندە کاریگەر و بەسۆز نییە کـە تەئسیـر لە ناخی دەروونی گـوێگر بکا. جـاری واهەیە حەیرانبێژ دوابەندی حەیرانەکەی هەم لە کۆتایی بەندی دووەم و هەم لە کۆتایی بەندی سێیەمیشدا دەهێنێتەوە. من هەستی خۆم داوەتێ کە زۆر لە حەیرانبێژە چاکەکانیش هەندێ جار بەم جـۆرە حـەیران دەڵێن: **لەوانەیە ئەمـەش لەڕووی ئوسـوولی حەیرانەوە راست بێ بەڵام من خـۆم گومـان لەوە دەکـەم، من وای بۆ دەچم کـە یان ئەوەتا حەیرانبـێژ بەپیری حـەیرانەکـەی گوتووە و هەناسەی کورت بووە و ناتوانێ تا بەندی سـێیـەم خـۆی پێ رابگیــرێ لەبەر ئەمــە هەڵدانەکــەی دەنگی لە** پێشبەندا یەکسەر لە بەندی دووەم دادەبەزێنێ و نەفەسێکی باشی بۆ دەکێشێ ئینجا بەندی سێیـەم تەواو دەکـات. تۆ ئەگـەر هەسـتی خـۆت بدەیتـە حـەیرانەکـانی قـوشەی فـەقێ عەزیزی و حەمەد بەگی و جەمیلی عەلیاغای کە هەرسێکیان لە حـەیرانبـێـژە هەرە شـارەزایەکـان بووین، دەبینی جـاروبار بەندی دووەمـیش بە دوابەند تەواو دەکـەن، بەڵام لە بیـرت نەچێ کە هەر سێکیشیـان ئەو کاسێتانەیان کە بۆیان تۆمار کراون بەپیری گوتوویانە. رەملم بۆ هۆیەکی دیکەش دەچێ، لە بەراییدا گوتم کە حەیرانی چاک دەبێ لە ٣ بەندی کورتەوە پێکهاتبێ. جا ئەگەر بێتوو بەندی حەیرانەکە درێژ بوون ئەوا هەڵبـەتا حـەیرانبـێـژ (تحـمل) ناکـا تا کـۆتایی حـەیرانەکـە هەناسـەی خـۆی رابگرێ، جا لەوانەیە لەبەر ئەمـەبێ کـە لە کـۆتایی بەندی دووەم ئیـتـر دەنگی دادەبەزێنێ و پشـوویەکی باشی بۆ دەخواتەوە ئینجا بەندی سێیەم تەواو دەکا.

هەروەکو گوتم ئەمە هەر گومانە و بۆچوونی خۆمە لەوانەیە بەهەڵەدا چووبم و دوورنیـیـە ئەمـە هەر پەیوەندی بە نزمی تایبەتی هەر حەیرانبێژەکەوە هەبێ چونکە هەر حەیرانبێژێک نزمی خـۆی هەیە و دەبێ وشـەکـان و پێش بەند و دوابەند و نزمی حەیرانەکە هەموو لەگەڵ یەکدا بگونجێنێ.

نزمی حـەیران و چۆنیـەتی هەڵدانی پێش بەند و هێنانە خوارەوەی دوابەندەکەش زۆر جۆرن و چ قـاعیـدەیەکی بۆ نییـە کە ئەگەر ئەوهابێ راستـە ئەوها نەبێ چەوتە، نەخێر! ئەمـە هەمـووی دەمـێنێـتـەوە سـەر وەسـتـایی و راهاتن و زەوقی حەیرانبـێـژەکە خۆی. هەروەکو گـوتم هەر حەیرانبێژێک نزم و پێش بەند و دوابەندی خۆی هەیە و زۆر حـەیران بێـژیش هەن کـە نزمی حـەیرانبێـژێکی ناوداری پێش خـۆیان هەڵگرتووە و بەو نزمە حەیرانەکەیان دەڵێن.

خوێنەری خۆشەویست، شەوێکی مانگی رەشەمێ سالی (١٩٧٥) بەفـر تا چۆکـان کـەوتبـوو لەگـەڵ چەند دۆسـتـێکی دێرین و خۆشەویستی خۆم کە پسپۆڕ و شارەزای حەیران بوون لە کۆنە خانوێکی دێی ئازادی نزیک حاجی ئۆمەران باسی حەیران و حـەیرانبـێژانمان دەکرد. منیش قـسـەکـانم بە کاسێت تۆمار دەکرد، ئەوەی کە ئێستا بۆتانی لێدەدەم بەشێکی ئەو لێدوانانەمانە لەگەڵ مـحەمـەدی مەولود هەولێری خوا لێی خۆش بێ و حـاجی فـەقێ عـەولا یادی بەخـێـر، کـاسـێـتـەکـە ئەوەندە ساف نییە، بەڵام بۆ مێژوو بایەخی خۆی هەیە.

### دارشتنی فۆرمی هونەری حەیران و فۆرمی سۆناتا

تۆ بڵێـی بێـتـهـۆڤن حەیرانبـێژ بووبێ؟ دەبێ جووتیارێکی کورد ئاگای لە سمفۆنییەکانی مۆزارت نەبووبێ؟

خوێنەری ئازیز بە شێـتم دامـەنێ! راوەسـتـە با جـارێ لە قسـەکانم ببمەوە ئینجا لە پاشان حەزدەکەم تۆش قسەیەکی لێ بکەی. ئەوەی کە شارەزای میوزیکی کلاسیک بێ دەزانێ کە جۆرە فۆرمێک هەیە بە ناوی سۆناتا فۆرم.

(Sonata form). سـۆناتا فـۆرم شـێـوەی دارشـتنی یان هەیکەلی دانانێکی مـوزیکاڵیـیـە. دانەر چیـرۆکـە موزیکاڵییەکەی خۆی بە چەند بەشێک دەگێڕێتەوە کە پێی دەڵێـن **movement**. واتە بزووتنـەوە. ئەوەی کـە بـاوە بزووتنەوەکـان سێ یان چوار یان کـەمـتـریشن. بەلانی کـەم بزووتنەوەی یەکـەمی هەر پارچە مـوزیکایەک لە بەرە بەری سەردەمی کلاسیکەوە بگرە تا ناوەڕاستی سەدەی بیستەمیش جا سۆناتا، سیـمفۆنی، کونچەرتۆ، موزیکی ژوور، ستـرینگ کوارتێت، پیانۆ تریبۆ یان هەچ فۆرمێکی دیکەبێ، لە شێوەی سۆناتا فۆرم داندراون. سۆناتا فۆرمیش بریتییە لە سێ بەش: بەشی یەکـەم پێـی دەگـوترێ **Exposition** واتا نمایشکردن و پیـشـانـدان. بەشی دووەم پێـی دەڵێـن **Development** واتا رسکان، پەرەسـەندن، بەشی سـێـیـەمـیش پێی دەڵێـن **Recapitulation** واتا گـەڕانەوە بۆ بەشی یەکـەم. جـاری وا هەیە کـە مـوزیککار پارچە مـیـوزیکەکـەی تەنهـا بە یەک بزووتنەوە دادەنێ وەک کـردنەوەکـان واتا **Overtures** ئا لێـرەشـدا ئەو تاکـە بزووتنەوەیەی لە شـێـوەی سـۆناتا فـۆرم دادەڕێژێ واتا بەشی یەکەم و دووەم و سێیەمی تێدایە.

لە بەشی نمایش کردندا، دانەر بیـرۆکـە سـەرەکـیـیـەکـەی چیـرۆکـەکـەی خـۆی دەخـاتـەڕوو. لە بەشی پەرەسـەندن دانەر بەدوور و درێژی دەچێـتـە ناو وردەکاریـیـەکـانی بابەتەکـەی و بەشی سێـیـەمـیش ئامـاژەو نیـمـچە گـەڕانەوەیەکە بۆ بەشی یەکەم، شایانی باسە ئەرکی بەشی یەکەم تەنها نمایشکردنی

بیرۆکەی پارچە میوزیکاڵییەکە نییە، ئەوەشەو دەستنیشان کردنی کلیلی میوزیکاڵی پارچەکەیە کە پێی دەگوترێ (Home key) واتا ماڵ کلیل یان تۆنیک (Tonic) بۆ نموونە ئەگەر بزووتنەوەکە بە (major -A) دەست پێ بکا واتا کلیلی ماڵەوە (a-major) و بەمجۆرە کۆتایی بە پارچەکە دێنێ. بەڵام سۆناتا فۆرم هەمیشە هەر ئەو سێ بەشە نییە. زۆربەی دانەرانی سەردەمی کلاسیک وەک هایدون و مۆزارت و بیتهۆڤن دووبەشی چکۆلانەی تریشیان دەخستە سەر ئەم فۆرمە. یەکێکیان لە بەراییدا بوو واتا لەپێش بەشی یەکەم کە پێی دەگوترێ پێشەکی واتا (introduction) ئەوی تریان لەپاش بەشی سێیەم کە پێی دەگوترێ (coda) واتا کلک یان پاشکۆ. ئەم دووانە مەرج نییە لە هەموو پارچە میوزیکایەکدا هەبن، بەڵکو دەمێنێتەوە بۆ وەستایی و ئارەزووی هونەرمەند خۆی.

جا پاش نمایشکردنی سۆناتا فۆرم با بگەڕێینەوە بۆ حەیرانەکەی خۆمان. تۆ ئێستا ئەگەر بێتو بەوردی سەرنج بدەیتە دارشتنی فۆرمی هونەری حەیران، تێدەگەی بۆچی من پێشتر پرسیارم کرد تۆ بڵێی بیتهۆڤن حەیرانبێژ بووبێ، یان دەبێ جووتیاری کورد ئاگای لە سیمفۆنییەکانی مۆزارت نەبووبێ؟ دە فەرموو با بتگێڕم بەناو فۆرمی هونەری حەیران.

وەک پێشتریش بە دوور و درێژی باسم کرد حەیران بریتییە لە ٣ بەندی کورت. لە بەندی یەکەمدا حەیرانبێژ کتومت وەک سۆناتا فۆرم لە لایەکەوە بیرۆکەی چیرۆکە گۆرانییەکەی خۆی دەخاتەڕوو، لە لایەکی کەوە دوادەنگ واتا قافیە بۆ هەرسێ بەندەکانی حەیرانەکەی دەستنیشان دەکات و لەلایەکی تریشەوە کلیلی دەسپێک و کۆتایی نۆتەکەی دادەنێ. بۆ نموونە ئەگەر بەندی یەکەمی حەیرانێک ئەمە بوو "... حەیران لە پەرێزە جۆیێ.." ئەوا هەم شوێنی رووداوەکە کە پەرێزە جۆیە دەردەکەوێ و هەم دوادەنگ...یێ" دەستنیشان دەکا و هەم بڕیاردەدا بە چ (tonic) دەست پێ بکا. لە بەندی دووەم حەیرانبێژ دەچێتە ناواخنی چیرۆکەکەی و لە وردەکارییەکان دەدوێ. لە بەندی سێیەم ئیتر بە ئاواتە خوازی بێ بەبڕیار بێ، بەهەر جۆرێکی بێ کە گرێدانی بە بەشەکانی پێشترەوە هەیە دوایی بە حەیرانەکەی دێنێ. حەیرانبێژیش وەک میوزیکارە کلاسیکییەکان بەندی یەکەمی لە چ کلیلێک دەست پێ کردبێ، دەبێ دوابەندەکەی بەو کلیلە بەدوایی بێنێ بێجگە لەوە وەک (introduction) واتا پێشەکییەکەی سۆناتا حەیرانبێژیش بەپێش بەندێک دەست پێ دەکات، کە هەڵدانی دەنگیەتی و دوا وشەکانی بەندی سێیەمیش دەکا بە دوابەند کە ئەمەیان بە سۆزترین و هەست بزوێنترین بەشی حەیرانەکەیە ئەگەر حەیرانبێژەکە حەیرانبێژی چاک بێ. دیسان وەک سۆناتا و سیمفۆنیا و کۆنچەرتۆ، جاری وا هەیە، هەرچەندە کە ئەمەیان مەرج نییە، کە حەیرانبێژ کوڵی دڵی بە سێ بەندەکە دانامرکێتەوە، لەپاش دوابەندەکەی ئیتر کۆدا واتا کلک یان پاشکۆیەکی دەخاتە سەر پاشکۆکەش هەندێ جار بریتی دەبێ لە ستانزایەکی سەربەخۆ و دوادەنگ و مەترۆی لەگەڵ حەیرانەکە جیادەبێ. حەیرانبێژ ئەم هەیکەلە زۆر بە وەستایی دارێژراوە و پڕ لە تێک هەڵکێشانی ئاڵۆزی هونەری بەسێ بەندی زۆر کورتی حەیران دەخاتەڕوو کە لە (١.٥ - ٣) دەقیقەیە. جا لێرەدا ئەم لایەنەی حەیران دیسان راماندەکێشێ و دەمانبەستێتەوە بە جۆرە فۆرمێکی دیکەی میوزیکی کلاسیک کە پێی دەڵێن (song cycle) سۆنگ سایکل.

حەیران وەک (song cycle): لە سەدەی نۆزدەمی سەردەمی رۆمانتیزم جۆرە گۆرانییەک پەیدابوو کە بریتی بوو لە چەندین کورتە گۆرانی کە لەرووی دارشتنی فۆرمی ئەدەبی و هونەرییەوە هاوبەش بوون و لەیەک خانەی هەڵبەست و ئاوازدا دادەندران، بەمجۆرە گۆرانییانە دەگوترا (song cycle) واتا زنجیرەیەک یان بازنەیەک لە گۆرانی. گۆرانیبێژەکە ژمارەیەکی لە کورتە گۆرانی رۆمانتیکی وەک (لید)ی ئالمانی یەک بەدوای یەکدا دەگوت و هەمووی بەسەریەکەوە دەبوو بە زنجیرەیەکی بازنە بازنە کە لەیەک بابەت دەدوان و ئاوازەکانیشیان لەیەک دەزگای میوزیکی دابوون و زۆر لێک نزیک بوون. زۆربەی دانەرە گەورەکانی سەردەمی رۆمانتیک ئاوازیان بۆ (song cycle) داناوە لە سەرووی هەموویان بیتهۆڤن و شوبێرت و شومان.

من کە تێی رادەمێنم دەبینم حەیران دەکەوێتە ناو ئەم خانەی سۆنگ سایکلیشەوە. تۆ کە داوا لە حەیرانبێژێک دەکەی حەیرانت بۆ بڵێ، ناکرێ یەک تاکە حەیران بڵێ کە بریتییە لە ٣ بەندی کورت و ماوەی گوتنەکەی لەنێوان دەقیقەیەک و ٣ دەقیقە پتر ناخایەنێ. بۆیە حەیرانبێژ کە دەست بە حەیران دەکا، تا ژمارەیەک حەیران نەڵێ راناوەستێ. واتا زنجیرەیەک لە حەیرانان دەڵێ کە وەک سۆنگ سایکڵ لەڕووی بابەتی و هونەری ئەدەبی و گۆرانییەوە هاوبەشن.

خانمینە، خانمۆڵەینە، کاکی برایان:

هەڵبەت پاش ئەم بەراوردکارییەی حەیران لەگەڵ هەندێ فۆرمی هونەری ئاواز و گۆرانی کلاسیکی رۆژئاواییەکان، پرسیارێک دەبێ سەری قوت بکاتەوە و پیاو لەبەرخۆیەوە پرسیار لەخۆی بکا ئەمە چۆن وایە جووتیاری کورد و بیتهۆڤن

چۆن گەیشتوونەتە یەک!

من لێرەدا هیچ بەڵگەیەکی ئەکادیمی و زانستیم بەدەستەوە نییە، گەر بتوانم خزمایەتی نێوان هەندێ فۆرمی میوزیکی کلاسیکی ئەوروپاییەکان و هەندێ فۆرمی میوزیکی کلاسیکی کوردی پێ ساغ بکەمەوە، بەڵام یەک راستی دەزانم و وەک تروسکەی ئومێدی و سەرە تاڵێک پشتی پێ دەبەستم کە تروسکە ئومێدێکی زۆر کزیشە، چونکە تەنها هزر و بۆچوونە و، با کەس وەک بەڵگەیەکی ساغکراوە لەمنی وەرنەگرێ، بەڵام پرسیارەکە دەرفەت بۆ **هەموو شارەزایەک دەرەخسێنێ تێ رامێنێ و بەڵکو بە هەمووماندەگەینە ئاکامێک**. راستییەکە ئەمەیە و **هەموو زانایانی میوزیکی ئەوروپایی پێی لێ دەنێن**. یەکێک لەوانە **خانم ئان لیڤەر مۆرە** کە لە کتێبی مێژووی میوزیکی ئیسپانی (**a short history of Spanish music ann Livermore**) دەڵێ "... شاری تۆلیدۆ (**Toledo**) بوو بەو ناوەندەی کە بەوێدا کلتووری موسڵمان و جووی ئەندەلوس بەناو هەرێمەکانی دیکەی ئیسپانیادا بڵاوبۆوە و لەوێشەوە بۆ ناو ئەوروپا. لەژێر دەسەڵاتی گەورە مەترانی ئەوێ، دۆن رایمۆندۆ، بە یارمەتی زۆر توێژەرەوەی دیکەش دەست بە تەرجومەی کلتوور و هونەری کلاسیکی گریکی کراو نووسەرە عەرەبە ناودارەکانیش تێبینی خۆیان لەسەر زیاد کرد.

بەمجۆرە شێوەی بیرکردنەوەی ئەوروپاییەکان لەزۆر رووەوە بە تەواوی گۆڕا لەوانە بیروبۆچوونیان سەبارەت بە میوزیکیش." قسەکانی خانم ئان لیڤەرمۆر تەواو بوو.

خوێنەری ئازیز، جا تۆ ئەگەر سەرنجێکی ورد بدەیتە دوا رستە کە دەڵێ بەرێگای ئەندەلووسەوە بیری ئەوروپاییەکان دەرهەق بە میوزیکیش گۆڕا یەکسەر خەیاڵت بۆ زریاب دەچێ. راستییەکی مێژووییشە میوزیکی رۆژهەڵاتی لەلایەن زریابەوە لە سەردەمی عەباسییەکانی بەغدا گەیشتە ئەندەلووس. پێکەوە لەگەڵ ئیبراهیم و ئیسحاق موسڵی، زریاب هونەرمەندێکی لێهاتووی سەردەمی خۆی بووە و ئێرانی بووە. جا فارس دەڵێ فارس بووە و کورد دەڵێ کورد بوو ئەمە ساغ نەکراوەتەوە، بەڵام بێ گومان زریاب وەستای ئوسووڵی دەزگاکانی واتا مقاماتی رۆژهەڵاتی بووە و ئەو ئسوولەی لەگەڵ خۆیدا بردۆتە ئەندەلوس. جا وەک کە ئەوروپییەکان خۆیان دانی پیادەنێن. ئەگەر میوزیکی ئەندەلوس کاری لە میوزیکی ئەوروپا بەگشتی کردبێ و بیروبۆچوونی ئەوروپاییەکانی دەرهەق بە ئوسوولی میوزیک بە تەواوی گۆڕاندبێ، پیاو بۆی هەیە بگاتە ئەو دەرئەنجامە کە خزمایەتی نێوان میوزیکی کلاسیکی ئەوروپا و ئسوڵی مقاماتی شەرقی، کە حەیرانیش بەشێکە لەو، لەو شۆڕشە کلتوورییەی کە زریاب بەرپای کرد، سەرچاوە دەگرێ.

هەر چۆنێکی بێ، لەسەرم حسێب مەکەن، ئەمە تەنیا تێرامان و لێکدانەوەی خۆمە و تا ئێستا لەوە زیاتر هیچ شتێکی وام بە دەستەوە نییە کە پشتی پێ ببەستم. ئێوەش بە تایبەتی ئەوانەی پسپۆڕ و شارەزای میوزیکن هەریەکە لای خۆیەوە با بەدوایدا بچێ بەشکو شتێکمان بۆ دەردەکەوێ.

*** ئایا حەیران بە نۆتەی میوزیکم دەنووسرێتەوە ئەگەرنا بۆچی نا؟**

خۆی حەیران لەسەر مەقامی بەیات دەگوترێ و ئەو مەقامەش پێشەکی تایبەت بە خۆیەوەی هەیە و لەدوای هەر بەندێک یان هەر برگەیەکی ئەو مەقامەش ئامێری میوزیک دەتوانێ دەوری خۆی بنوێنێ و ئەو ئاوازەت بۆ لێبدا کە لەگەڵ مەقامی بەیات بگونجێ جا چ حەیران بێ چ شەرقی و غەزەلێکی دیکە کەواتە میوزیکی باکگراوند هەمیشە دەتوانێ لە دوورەوە بیبیسرێ، بەڵام ئامێری میوزیک ناتوانێ تەواوی ئەو ئاوازە لێ بداتەوە کە حەیرانبێژەکە حەیرانەکەی خۆی پێ دەڵێ. ئەمەش بۆیە وایە چونکە تەواوی ئاواز و نزمی حەیرانەکە بە نۆتە نەنووسراوەتەوە. راستە ئەگەر میوزیکارێکی لێهاتوو بێنی دەتوانێ گوێ لە حەیرانێک راگرێ و هەمووی بەنۆتە بنووسێتەوە. بەڵێ ئەمە دەکرێ، بەڵام ئەگەر واتکرد ئەوا دەستوپەلی حەیرانبێژەکە خۆی و هی ئەوانەی لەپاش ئەویشدا دێن دەبەستێتەوە. چونکە حەیرانبێژ ئەو ئازادییەی نامێنێ کە بتوانێ بە هەوەسی خۆی و بەجۆش و خرۆشی خۆی هەستی خۆی پرتاو بکات و دەستکار و وەستایی خۆی لە نزم و ئاوازی حەیرانەکەدا پیشان بدا. حەیرانبێژ دەبێ ئەوساکە لەگەڵ نۆتەکە بڕوا چی نووسرابوو ئەوە بڵێتەوە بەم جۆرە حەیرانەکە ئەو بایەخ و نرخ و تام و چێژەی نامێنێ کە هەیەتی بەبێ نۆتە هەیەتی. ئەمە لایەنەکی با بڵێین نێگەتیڤانەی نۆتەیە بۆ حەیران. بەڵام لایەنی پۆزەتیڤ واتا باشیشی هەیە: لە سەردەمێکدا کە هێشتا ئامێری دەنگبەند واتا کاسێت پەیدا نەبوو یان هەبوو، بەڵام نەگەیشتبووە کوردەواری، ئەوساکە زۆر باشتر دەبوو ئەگەر میوزیکارێکی نۆتەزان نزمی با بڵێین زایەری بەنۆتە بنووسیبایەوە کە لە چلەکاندا کۆچی دوایی کردووە و دەنگونزمی واخۆش لە حەیرانا کەم هەبووە ئەوا هەرنەبێ ئێستاکە دەمانزانی زایەر حەیرانی چۆن دەگوت و حەیرانبێژی نۆتەزانیش ئەگەر ئەمرۆش نەبا لە دوارۆژا دەیتوانی نزمی زایەر هەڵگرنەوە با تۆزێ دەسکاریشیان بکردایە، بەڵام خۆ

نزمی زایەر بزر نەدەبوو. جا لە وەرامی پرسیارەکە ئایا حەیران بە نۆتەی میوزیک دەنووسرێتەوە؟ دەتوانین بلێین بەڵێ شت نییە نەنووسرێتەوە، بەڵام لە پاشاندا ئەگەر نۆتەکەت لە بەردەم حەرانبێژێکی خوێندەواری نۆتەزان دانا ئەوا ئازادی گەران بەدوای جوانکاری لە نزمەکەدا پێ نامێنێ و ناتوانێ تام و چێژی خۆی پێوەر بکا تەنها مەگەر نزمەکە هەڵگرێ، بەڵام لە پاشان لە نۆتەکە لابداو خۆی دەسکری نزمەکە بکا.

خوێنەری خۆشەویست، شتێک ماوە کە ئەویش هەر پەیوەندی بە کێش و ئاوازەوە هەیە: وشەی هەرەدوایی بەندی هەر حەیرانێک ئەمەش باشترە وشەیەکی ٣ برگەیی بێ بۆ ئەوەی لەگەڵ نزمی دوابەندی حەیرانەکە رێککەوێ، بۆ نموونە با گوێ لەم حەیرانەی جەمیلی عەلیاغای دزەیی راگرین کە وشەی دوایی تێیدا وشەیەکی ٣ برگەییە، هەستی خۆتان باش بدەنێ وشەی هەرە دوایی کە دەڵێ (یەخ/ سی/ رە) واتا یەک، دوو، سێ (سێ برگە).

### شوێنی جوگرافی حەیران

ئەمجارە دێمە سەر باسی شوێنی جوگرافی حەیران. بۆ ئەم مەبەستەش لەکاتی خۆیدا پرسیارم لە حەیرانبێژە کۆنەکان کردووە، رای نووسەرانی دیکەی کوردم وەرگرتووە و سەرنج و تێبینی خۆشم لەم بوارەدا گەڵاڵە کردووە، بەڵام بەرلەوەی دەست پێبکەم دەمەوێ بە گوێگری خۆشەویستی رابگەیەنم کە حەیران هەیە و حەیرانۆک هەیە. حەیران ئەوەیە کە ئێمە وا لێرەدا خەریکین، حەیرانۆکیش تایبەتە بە ناوچەی بادینانی کوردستانی عێراق و بە زاراوەی کرمانجی باکوورە. دواتر کە گەیشتمە سەر بەراوردکاری بە کورتی باسی حەیرانۆکیش دەکەم. بەڵام با بێینەوە سەر حەیران و شوێنی جوگرافی.

بە قسەی شارەزایان مەڵبەندی رەسەنی حەیران دەشتی هەولێرە. بۆیەش دەڵێم دەشتی هەولێر و ناڵێم هەولێر یان ستانی هەولێر، چونکە مەبەستم خودی شاری هەولێرە نەک ناوچە شاخاوییەکانی ستانی هەولێریش. خۆی ستانی هەولێر یان با بلێین ستانی سۆرانی دێرین لە ٢ سروشتی تۆپۆگرافیکەوە پێکهاتووە: دەشت و کێو. حەیران زادەی دەشتەکەیە، بەڵام وردە وردە تەنیوەتەوە بۆ ناوچە شاخاوییەکانیش و تەواوی ئەو ئێڵ و عەشیرەتانەشی گرتۆتەوە کە بەیەکێک لە بن شێوەزارەکانی سۆرانی قسە دەکەن وەک خۆشناوەتی، سوورچی، باڵەکایەتی و ناوچەی رەواندز تا موکریانیش رۆیشتووە، لەلای رۆژهەڵاتیش وڵاتی کۆیە تا دەگاتە پشدەر.

لێرەدا حەزدەکەم بیروڕای هەندێ حەیرانبێژی کورد بخەمە روو کە لە کتێبی دیوانی حەیرانبێژانی ئەحمەد حەیران و کتێبی سەربردەی کۆمەڵە حەیرانبێژێکی کوردی سەعدوڵڵا ئیسماعیل شێخانیم وەرگرتوون، خدر حەیران دەڵێ: لە بنەڕەتدا حەیران هی ناوچەی دزەییاتی بوود ئینجا پەریوەتەوە شوێنەکانی تر...

سەعدی عەلی لەبارەی جۆرەکانی حەیران دەڵێ: سێ جۆر حەیران هەیە کە ئەمانەن: حەیرانی ناوچەی دزەیی و خۆشناوەتی و پشدەری...

مەحمودی عیسەمەتێ دەڵێ: حەیران بەسەر سێ ناوچە دابەش دەکرێ: دەشتی دزەیی، ناوچەی خۆشناوەتی، هەرێمداریێتی کۆیە و پشدەر، رەسول گەردیش حەیران بەسەر ٣ ناوچە دابەش دەکا: دزەییاتی، خۆشناوەتی، پشدەری.

عوسمان هەممەوەندی لەو باوەڕەدایە کە حەیران لەدەشتدا پەیدابووە، مەبەستی دەشتی سۆرانە، بەڵام بەتایبەتی لەدەشتی دزەیی و خۆشناوەتی و پشدەری پەرەی سەندووە.

محەمەد نۆمەراوەیی دەڵێ: تەنیا دەشتی هەولێر کانگای حەیرانە و دارشتنی حەیرانەکانی ئەوێ بەهێزترن لە ناوچەکانی دیکە.

دەروێش عومەری شێخ شەروانیش پێی وایە حەیرانی دەشتی دزەیی لەرووی ناوەرۆک و دارشتن و تام و چێژ و گەلێ شتی تر بەهێزتر و خۆشترە لە حەیرانی ناوچەکانی دیکەی کوردستان.

کاک ئەسعەد عەدۆ کە شارەزا و پسپۆرێکی کەلەپوور و فۆلکلۆری کوردییە لە کتێبی لیرەیەک لە گەنجینەی نەتەوەی کورددا پاش ئەوەی کە دەڵێ ئەمجۆرە گۆرانییە تایبەتە بە خۆشناوەتی و دەشتی هەولێر ئینجا لەسەرایی لاپەڕە (١٥)دا ئەمە دەڵێ: بەرای من لەوکاتەی ئەو گۆرانییە لە کانگا بەدوور دەکەوێ کەمێک لە تام و چێژی تایبەتی خۆی بزر دەکات و حەیرانبێژەکانیش سەرکەوتنیان لەو مەیدانەدا کەمە... قسەکانی کاک ئەسعەد تەواو بوو. بەهەرحاڵ من بە تەلەفۆن قسەم لەگەڵ کاک ئەسعەددا کرد کە ئێستا لە هۆڵەندایە و ئەو باسەم لەگەڵیدا کردووە و گوتی راستە من لەکاتی خۆیدا خۆشناوەتیشم بە مەڵبەندی بنەڕەتی حەیران داناوە، بەڵام ئێستاکە هاتوومەتە سەر ئەو قەناعەتەی کە: (دەشتی دزەییاتی منداڵدانی حەیرانە و تام و چێژی ئەم هونەرە بەرێگای هاتوچۆکردنی مەردارەکان پەریوەتەوە ناوچە شاخاوییەکانیش..

مامۆستا حەمەی حەمەباقی لە گوتارێکی زۆر بەهادا بەناوی سەرەتایەک بۆ مێژووی مۆسیقای کوردی کە لە گۆڤاری ئاوێنە ژمارە (٢٢،٢١) گەلاوێژ خەرمانانی ساڵی

١٣٧٤دا بلاوی کردۆتەوە دەڵێ: جێی خۆیەتی جوگرافیای شێوەگەلی مۆسیقا و گۆرانی کوردی دەستنیشان بکەین... جا کە دێتە سەر ناوچەکانیان کاک حەمە باقی بۆ حەیران ئەم شوێنانە ناودەبا: قەرەچووغ، بێژنگ بەسەر، کەندێناوە، زوورگەزراو، شەمامک، هەولێر، سەفین، هەیبەتسوڵتان، رایات، زینوێ شێخی، رەواندز، هەندرێن، زۆزگ، گەلی عەلی بەگ، داری شەکرانێ، خۆشناوەتی، پشدەر، قسەکانی کاک حەمەی حەمەباقی تەواو بوو.

لێرەدا حەزدەکەم ئەوە بڵێم کە زۆر لەو شوێنانەی کە نووسەر ناوی هێناون یان گوندن یان شاخ و لووتکە شاخن یان دارن کە راستە لەناو حەیراناندا ناویان دێ، بەڵام ناو هاتنەکەیان بەشێکی بابەتی حەیرانەکەیە نەک مانای ئەوەبێ کە حەیران لەوێ واتا لەو دێیە یان لەسەر ئەو لووتکە شاخە یان لەسەر ئەو دارە سەری هەڵداوە. بۆ نموونە بێژنگ بەسەر بەرزترین لووتکەی چیای قەرەچووغە لەنێوان کەندێناوە و قەراج، رایات و زینۆی شێخی دوو دێن لە ناوچەی باڵەکایەتی و لەهەندێ حەیرانان ناویان دێ، داری شەکرانێ تاقە دارێکە لەناوچەی زراری. بەڵام وەک گوتم ناوهاتن لە حەیران مانای ئەوە نییە کە ئەو شوێنە مەڵبەندی حەیران بووە. خۆی لەزۆر حەیرانان ناوی حەمامی عەملۆدە یان حەمامی حاجی قادریش دێ لە هەولێرێ چونکە حەمامی مەنشوور بوون و جەحێڵی ئەو زەمانە لەبەر دەرگاکانیان پیاسەیان دەکرد تا چاویان بە ژن و کچی جوان بکەوێ. بەڵام خۆ حەیران لەناو حەمامی عەملۆدە یان لەناو حەمامی حاجی قادری سەری هەڵنەداوە!! کە پردی رەواندزیش لەزۆر حەیرانان ناوی دێ ئەوە هەر لەبەر ئەوەیە کە پردەکە سەرڕێی کۆچ و کۆچباران بووە و ژنی جوانی جوان پێداچوون نەک مانای ئەوەیە کە حەیران دەبێ لەسەر پردی رەواندزێ سەری هەڵدابێ و پەیدابووبێ. حەیرانبێژ ئاواتەخوازی ئەوەیە کە رۆژێک لەرۆژان باجگر و خەرجەستێنی ماچان بێ لەو شوێنانەی کە لە حەیرانەکەیدا ناویان دێنێ، چونکە کیژۆڵەی جوان جوان و تەڕو ناسکی پێدا دەچوون. جەمیلی عەلیاغای دزەیی کە یەکێک لە وەستا لێهاتووەکانی حەیران بووە لە چاوپێکەوتنێکدا پێی گوتم وڵاتی رەسەنی حەیران دزەییاتی و گەردیاتییە. ئیتر لەوێوە پەڕیوەتەوە بۆ ناوچە شاخاوییەکانی ستانی سۆران و ستانی موکریانیش کە ئەوێ زیاتر مەڵبەند و سەرچاوەی بەیتی کوردین نەک هی حەیران.

**حەیران: حەسەن حەیران**

راستکردنەوەیەک بۆ خوێنەری خۆشەویست.

راستییەکەی خۆشم پێشتر هەروای بۆ دەچووم کە حەیران دەبێ زادەی دەشتی هەولێر و دزەییاتی و گەردیاتی بێ، بەڵام لە ئەنجامی پتر لێکۆڵینەوە و ئاڵوگۆڕکردنی بیروبۆچوون لەگەڵ پسپۆڕ و شارەزایانی کوردستانی ئێران بۆم دەرکەوت کە نەخێر حەیران زادەی دەشتی هەولێر نییە بەڵکو لە هەندێ ناوچەی سۆران زاردکانی دیکەی کوردستانیش هەر هەبووە و لە بادینان و



بۆتانیش حەیرانۆک هەر هەبووە. جا وەک زۆر لە حەیرانبێژ و پسپۆڕ و خوێشم بۆی چووبووین، ئەوە حەیرانی دەشتی هەولێر و دزەیی نییە کە پەڕیبێتەوە ناو هەرێمەکانی خۆشناوەتی و باڵەکایەتی و پشدەر و موکریان. مەبەستم ئەوەیە کە مەڵبەندی رەسەنی حەیران تەنها دەشتی هەولێر و دزەیی نییە، بەڵام بەلای منەوە چۆن ماست کە لەهەموو شوێنێکی کوردستاندا هەیە کەچی ماستی دەشتی دزەیی لە هەموویان خۆشترە، ئیتر بەم پێوانەیە ئێمەی خەڵکی دەشتی هەولێر و بەتایبەتیش دەشتی دزەیی حەیرانی لای خۆمانمان وەک ماستەکەی خۆمان زۆر لە هی ناوچەکانی دیکەی سۆران زاری کوردستان پێ خۆشتر و راستترە. ئەوەی ئەوان زیاتر ئاوازی سەردوولکە و لاواندنەوەی هەیە، زۆر بەلای بەیتدا دەشکێتەوە و ئەوان ٣ بەندی حەیرانەکە و ئاوازەکەیان بەوەستایی و بەڕاست و دروستی لێک نەدووریوە. هەروەکو بیستوومە دەڵێن چارەنووسی هۆرەش وایە. هۆرە لە کرماشانەوە بگرە تا دەگاتە گەرمیانی کوردستانی عێراق و خانەقین هەیە. بەڵام دەڵێن هۆرەکانی کرماشان لە هەموو ئەوانەی ناوچەکانی دیکەی کوردستان رەسەنتر و راستترن. دەڵێن تا بەرەو رۆژئاوا دەڕوا، ئەو تام و بۆیە رەسەنەی خۆی لێ کەم دەبێتەوە. حەیران بە پێچەوانەوە لە دەشتی دزەییەوە بگرە تا بەرەو رۆژهەڵات دەڕوا رەسەنایەتی و روخساری حەیرانی لێ هەڵدەوەرێ. بۆ زیاتر رۆشنایی خستنەسەر ناوچەی جوگرافی حەیران، ئەم مێزگردەم لەگەڵ دوو شارەزای ئەم هونەرە سازکرد. ئەسعەد عەدۆ، نووسەرێکی بەبڕشتی بواری فۆلکلۆری کوردیە کە لە هۆڵەندا دادەنیشێ و سەلاحی پایانیانی کە نازناوی سیامەندە و کوڕە لاوێکی زۆر لێهاتووی دانیشتووی مەهابادە کە ساڵەهای ساڵە خەریکی کۆکردنەوەی فۆلکلۆری کوردییە و ژمارەیەکی زۆر لە هەموو

بوارەکانی فەرهەنگ و کەلەپووری کوردی لەدوو توێی کتێبێکدا بەچاپ گەیاندووە. خۆشم لە واشنتۆنەوە بە تەلەفۆن ئەم مێزگردەم لەگەڵدا سازکردن.

## پۆلاندنی حەیران

ئێستاکەش دێمە سەر بابەتێک کە هەرگیز نەمدەویست باسی بکەم و راستییەکەی هەر بیریشم لێ نەکردبوو، ئەمەش وەنەبێ لەبەرئەوە بێ کە بیرم لەم بوارەدا کورتی هێنابێ و بڕی نەکردبێ ئەگەرچی کورتی هێنان و بڕنەکردنی بیر خەسیەتەکی زۆر ئاسایی و سروشتی توخمی ئینسانە، بەڵام نەکا، لێرەدا لەبەر ئەوەم نەبووە بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە من یەک بە بەشی خۆم پێموایە ئەم شتە هەر هەبوون و وجودیشی لەحەیراندا نییە. هەر چۆنێکی بێ چون زۆربەی ئەو سەرچاوە کەمانەی لەسەر حەیراندا هەن ئەو باسەیان هێناوەتە ئاراو چون هەندێ لە نووسەرانی حەیران لە زمانی حەیرانبێژەکانیش دەیگێڕنەوە کە گوتبیان شتی واههیە، بۆیەکا منیش چارم نەماو بەپێویستم زانی دوو قسەی لێ بکەم. پۆلاندنی حەیران واتا دابەشکردنی حەیران بۆ پۆلّ پۆلّ کە بەعەرەبی پێی دەڵێن تەسنیف و بە ئینگلیزیش (classification) بەکورتی یانی چەند جۆر یان چەند چەشن حەیران هەیە. لێرەدا بەرلەوەی تێبینییەکانی خۆم بخەمە ڕوو با بزانین ئەو سەرچاوانەی کە لەسەر حەیراندا هەن دەڵێن چی:

سەعدوڵڵا ئیسماعیل شێخانی لەکتێبی سەربردەی کۆمەڵە حەیرانبێژێکی کورد لە دامەنی لاپەڕە (٥)دا دەڵێ: جۆری حەیران هەروەک لەدەمی چەند حەیرانبێژێکمان بیستووە دەڵێن: حەیران دوو جۆرە:

١- حەیرانی کۆشک و دیوانان و مەجلیس، ئەمە شێوەیەکی هێمنە و نە بڵندە و نە نزمە تەنیا ئەو کەسانەی کە لە مەجلیسەکە دانیشتوون گوێیان لێیە و دەنگەکە ناپەنگێتەوە و دارشتن و گوتن و ناوەڕۆکەکەی لەدنیای لەخۆگەڕاوەکان دەوەشێتەوە.. کاک سەعدوڵڵا پێدا دەچێ و دەڵێ: ئەمجۆرە حەیرانە تەنیا بۆ ئەوەیە کەسانی مەجلیسەکە گوێیان لێ بێت خەڵکانی دراوسێ هەراسان ناکات...

بەڕێز سەعدوڵڵا شێخانی ئینجا دێتە سەر جۆری دووەمی حەیران و دەنووسێ: " دوو- حەیرانی هەوایی، سەرچیایی، هەڵدانی یان سورای: ئەمجۆرە حەیرانە شێوەی گوتنی جیاوازە لەگەڵ جۆری یەکەم، هەواو دەنگەکەی درێژە دەدا لە گوتندا ئەویش هەردەم شوان یان جووتیار یان راوکەر کە لە بەهاران چاوی بەدارکەر و قەسەرکەر و کەنگر و کاردیکار دەکەوێت، لێیان دووڕە ناچار دەست بە حەیران گوتن دەکات و دەنگی بۆ بەرز دەکاتەوە و هەڵدەدا و تاوەکو ئەوانیش گوێیان لێ بێت و بەلای دەنگ و سەدای بێنە ژوانێ و وەختی پێکگەیشتن دیاری بکەن.." قسەکانی کاک سەعدوڵڵا ئیسماعیل شێخانی تەواو بوو. ئەحمەد حەیران لەکتێبی دیوانی حەیرانبێژان لە دامەنی لاپەڕە (٦)دا دەنووسێ: " ئەم قسانەمان لەگیرفانی خۆمان دەرنەهێناوە، بەڵکو پەیوەندیمان بەخدر حەیران و مستەفا کوێر کرد هەردووکیان هەمان باوەڕیان هەبوو دەربارەی ئەم لایەنە و وتیان حەیرانێک بە دەنگێکی بەرز بوترێ ئەمە سەرچیاییە، بەڵام ئەگەر حەیرانێک لەکۆڕ و مەجلیس بووترێ پێویستی بە دەنگ بەرزکردنەوە نییە، بەڵکو پێویستە لەسەرخۆ بەهێمنی بگوترێ..." کاک ئەحمەد حەیران هەروەها دەنووسێ کە ".... حەیرانبێژ خدر گردگراویش رای وایە جۆرەکانی حەیران دوو جۆرە، مەجلیسی و سەرچیایی..." هەروەها لە زاری حەیرانبێژ سەعید باداوەییشەوە دەگێڕێتەوە کە گوتوویە حەیران چوار جۆری هەیە: هەڵدان و مەجلیسی و ئیختیاری و غەریبی، قسەکانی ئەحمەد حەیران تەواو بوون.

حەیرانبێژ و لاوکبێژ کاک ئەحمەد سابیر عەلی کەلوری لە گفتوگۆیەکی لەگەڵ مامۆستا هەردەوێڵ کاکەیی کە لە گۆڤاری رەنگین ژمارەی (٨٢) مانگی هەشتی ساڵی (١٩٩٥)دا بڵاوکراوەتەوە، هەندێ تێبینی زۆر جوانی لەم بارەیەوە داوە کە برێکی لێ وەردەگرین. کاتێ کە کاک هەردەوێڵ پرسیاری لێ دەکا بۆچی ئەو ناوانە واتا سەرچیایی و مەجلیسییان لە حەیران ناوە بەڕێز ئەحمەد کەلوری کە وادیارە لەناو خەڵکیدا بەحاجی ئەحمەد سەعاتچی ناسرابێ دەڵێ: "... ئەوەی من لە حەیرانبێژە دیدەساڵەکان بیستبێتم سەرچیایی لە دەشتودەر یان چۆڵەوانی بە دەنگێکی بەرز دەوترێ، دووەمیشیان بە دەنگێی نزم لەناو مەجلیس واتا دانیشتواندا دەوترێ، بۆیە ئەم ناوانەیان بۆ هەڵبژاردووە. ئەوەی من بیزانم هەردوو جۆرەکەی لەبناغەوە هەریەکن، چونکە هیچ جیاوازییەک لەرووی ئاواز و شیعرەکانیانەوە نییە، تەنها یەکەمیان بەرزە و دووەمیشیان نزم، جا زۆر حەیرانبێژ هەیە تەبەقاتی دەنگی بەرزە بەهیچ جۆرێک ناتوانێ نزمەکەی بڵێ یان تەبەقاتی دەنگی نزمە بەرزەکەی بۆ ناوترێ، هەشە ژێیەکانی دەنگی یارمەتی دەدا و هەردوو شێوەکەی بە ئاسانی دەڵێت.

### حەیران: خدر شایەر

زۆربەی ئەو نووسەرانەی لەسەر حەیرانیان نووسیوە و هەروەها لەزمانی هەندێ حەیرانبێژانیشیان گێڕاوەتەوە

حـەیران دەکـەن بەدوو جـۆری لێک جـیـا: مـەجلیس و سەرچیایی. بەڵام داخەکەم وێ دەچێ ئەو نووسەرانە ئەوەندە شارەزاییان لەپلەی یان نهۆمی یان تەبەقەی دەنگی ئینسـان نەبێ. زانایانی دەنـگ دەنگی ئادەمـیـزادیان بەپێی بەرزی و نزمی ژێیە دەنگییەکانی ناو گەرووی ئینسان پۆلاندووە. هی ژن بەجیا، هی پیاویش بەجیا. هی ژن هەرە بەرزەکەی پێی دەڵێن سۆپرانۆ لەوە نزمتر پێی دەڵێن مێسۆ سۆپرانۆ، هەرە نزمەکەی ئالتۆ یان کۆنترالتۆ. لەنێوان ئەو نهۆمانەش پلەی دیکە هەن و هەریەکـە ناوی تایبـەتی خـۆی هەیە. هەرچی دەنگی پیاوە، ئەمەیش سەرەکییەکانیان کردووە بە ٣ پلە، هەرە بەرزەکەی پێی دەڵێن: تینۆر، لەوە خوارتر پێی دەڵێن باریتۆن لەهەمووشیان نزم و قەبەتر پێی دەڵێن باس. جا ئەو جیاوازییانەی کە برایانی نووسەر سەعدوڵڵا ئیسماعیل شێخانی و ئەحمەد حەیران و هەروەها چەند حەیرانبێژێک پێیان وایە لەنێوان حەیراندا هەیە راستییەکەی جیاوازی نێوان دەنگی حەیرانبێژانە واتا دەنگی هەندێکیان بەرزە و هی ئەوانی تر نزمتر، بەڵام بەهیچ جۆر پەیوەندی بەخودی حەیرانەکەوە نییە. راستە تەعبیری حەیرانی سەرچیایی زۆر باوە هەم لەناو حەیرانبێژان و هەم لای گوێگرانیش بەڵام ئەمە نابێ وا لێک بدرێتەوە کە گوایا ئەم حەیرانە بەتایبەتی بۆ ئەوە دانراوە کە وەک سەعدوڵڵا شێخانی دەڵێ شوان و راوکەر لە دەشت و چۆڵەواریی و لە قەدپاڵ چیاکان دەیڵێن کە کەڵکی مەجلیسی پیاوانی نییە و خەڵکەکانی دراوسێش هەراسان دەکا..!!

کاک سەعدوڵڵا حەیفت نەکرد دەڵێی حەیران خەڵکی هەراسان دەکا!!! من وا ریشم سپی کرد قەتم نەبیستووە حەیرانبێژی چاک بەڵام دەڵێم هی چاک ها!! هەر جارەکی دەستی لەبناگوێی نابێ و هەڵیدابێ چ لەسەر جۆخین بە مانگەشەوی هاوین چ پایزان لەسەربان چ زستانان لەگوێی ئاگردان، چ بەهاران لەناو گوڵ و گیاو حاجیلە و بەیبوون و کنێران بەرامبەری ناسک و نازداران کەس نەبووە خۆی پێ راگیرابێ و هەموو هەستی خۆی نەدابێتێ چ ئاغا چ کرمانج چ ژن و پیاو و منداڵ!! ئەگەر لێکدانەوەکەی ئەو نووسەرانە راست بێ و هەندێ حەیران تەنیا بۆ دەشت و دەر و سەرچیایان دانرابێ چونکە بەرزن، هێندێکیش تەنیا بۆ مەجلیسان دانرابن، چونکە نزمن ئەوا دەبێ حەیرانبێژی دەنگبەرز، ئەوەی کە حەیرانی سەرچیایی دەڵێ دەبێ کە لە ئاوایی بوو ئیتر قورقەپی لێ بکا و حەیرانبێژی دەنگ نزمیش کە حەیرانی وەک دەڵێن مەجلیسی دەڵێ ئەویش نابێ



کاتی مەشق و راهێنان بۆ سروودەکانی ئاهەنگی نەورۆزی ئەو ساڵە دیە و کورسەکەش لە پشتەوەیەتی.

قەت روو لە چۆڵەواری بکات و ئەو خۆشییە هەرگیز نابینێ کە لە دەشت و چۆڵا حەیرانێک بۆ کیژۆڵە بەرخەوانێک یان داركەرێکی لەداران بڵێ!!! ئەگەر وابێ دەبوایە زایەر و حەمەدبەگ قەت لە مەجلیسان حەیرانیان نەگوتایە چونکە حەیرانەکانی ئەوان تەنها سەرچیایی بوون و قەت بە دەنگی نزم حەیرانیان بۆ نەدەگوترا. ئەمن ئەم گفتوگۆیەم لەگەڵ کۆچکردوو محەمەدی مەولود هەولێریدا بووە کە باسی چوار کەڵە حەیرانبێژی ئەو سەردەمە دەکا: پیرداودی حاجی خەلیل ئاغای، زایەری ئامۆزای، جوامێر، حەمەد بەگ.

*** دەوروبەری حەیران و حەیرانبێژان:**

لایەنێکی دیکەی حەیران کەناوم ناوە دەوروبەری حەیران و حەیرانبێژان.

جێی کاروکاسبی و جێی پەیداکردنی پارووی نان لەو دەشتی هەولێرە بە گشتی ئەمانە بوون: پەرێز، وەردوشۆ، جووت کردن، دروێنەکردن، سەر جۆخینان واتا سەر خەرمانان، شەغرەو کاکێشان، ناو زەوی و ناو دەغڵان، جۆگە و جۆوانی و گۆم و کەند و کەندەڵان، شوانی و شوانکارەیی، بن رەشماڵ و تاوڵان و بەدەیان شوێنی دیکە کە رەنجبەری کورد بۆ گوزەرانی ژیانی خۆیان و خێزانەکانیان تێیدا خەریک دەبن. لەو تەرزە جێگایانە شوان و گاوان و جووتیار و سەپان و رێبوار لە پیاوان دارکەر و کۆڵکەر و گیشەکەر و تۆڵکە و کاردی و کەنگرکەریش لەژنان چاویان پێک دەکەوێ و دڵیان دەچێتە یەکدی و هەست و نەستی ناو دڵ و دەروونی خۆیانیان بەحەیران یان بە بالۆرە بۆ یەکتری دەردەبڕن. بالۆرەش، یان بەلۆری، ئەویش جۆرێکە لە دیالۆگ واتا دەمەتەقێیەکی نێوان کور و کچی دوور لە ئاوەدانی کە بەنۆرە قسەی پڕ لە مانا بەڵام بە شێوازێکی هەڵبەستی سادە و

جوانەوە بە یەکدی دەڵێن، زۆرجار وشەی بەتەوسەوە و تەنانەت جنێوی سەیر سەیریشی تێدایە کە کچەو کوڕە پێکدی دەڵێن، بەڵام هەمووی بریتییە لە پلار و خۆشەویستی. جاری وابووە کە کۆمەڵە کیژێک لە پەرۆشان یان لە قەسەران بوون تووشی کوڕگەلێ هاتوون، یەکێک لە کوڕەکان دەستی لەبناگوێی ناوە و چەند بەندە حەیرانێکی لەم بابەتەی بەسەر کیژۆڕەکاندا هەڵگوتووە" ... دارکەرێ لە داران... چاوم شل بووینە لەرێ و بواران... ئەمن نازانم بە مەزەبی جاحێران بەهەشت خۆشترە یان خەوی سبەینان لەگەر ناسک و نازداران..." پیاخ! کیژەکانیش هەر ڕۆیشتوون و گوێیان نەداونەتێ لەپاشان کە کوڕەی حەیرانبێژ هەر وازی لێ نەهێناون ئیتر یەکێکیش لە کیژەکان پشتیە قەسەرەکەی خۆی داناوە و ڕووی لە کوڕە لاوەکان کردووە و ئەوەی گوتوویەتی نەیگۆتۆتەوە. حەیرانبێژ پیشەی حەیرانبێژی نییە: شوانە، جووتیارە، سەپانە، گاوانە، یان کوڕە ئاغایە، گرنگ ئەوەیە لە دەوروبەرێکی لادێییانە ژیابێ و پەروەردە و نوقمی ژیانی سادە و ساکار و ڕوستیکاڵ یان پاستۆراڵی ئەو دەشتە کاکی بەکاکییە بووبێ. حەیرانبێژ دڵدارێکی دەنگخۆشە، بەڵام کاروکاسبی خۆی هەیە و بەحەیران گوتن خۆی بەڕێوە نابا بە پێچەوانەی لاوکبێژان کە پیشەیان لاوک دانانە و هەریەکە سەر بە ئاغایەک یان میرێکە. لاوکبێژ بە قارەمانەتی و ئازایی و شەڕوشۆڕی نێوان ئێڵ و عەشیرەتی کوردان یان شەڕی کوردان دژی بێگانەدا هەڵدەڵێ یان چیرۆکێکی دڵداری لە کۆشک و دیوەخانی ئاغا و میران دەگێڕێتەوە و بۆ ئەوە پاداشت و خەڵات دەکرێ و مووچانەی تایبەتی خۆی هەیە. کەچی حەیرانبێژ قەت لەلای ئاغایەک ڕانەگیراوە. حەیرانبێژ حەیرانەکەی بۆ دیوەخان و مەجلیسی ئاغایان دانانێ. ئەو تەنها بۆ یارەکەی خۆی، بۆ نازدار حەیرانەکەی خۆی لە چۆڵەوارییان حەیران دەڵێ واتا هونەری حەیران بەهیچ جۆرێک هونەرێکی بازرگانی و بە مەبەستێکی تیجاری نییە، بەڵکو وەک دەڵێن هونەر بۆ هونەرە. هیچ حەیرانبێژێک پارەو پووڵی لەبەرامبەر حەیرانەکانی خۆی وەرنەگرتووە، کەسیش پارەی پێشکەش نەدەکرد، چونکە ئەمە زۆر عەیب دەبوو. هەر لەبەر ئەوەشە کە حەیرانبێژە هەرە ڕەسەن و باشەکان دەچوونە سەر ئێزگەی ڕادیۆ چونکە بەلای ئەوانەوە حەیران گوتن لە ڕادیۆ کارێکی بازرگانییە.

وەک گوتم: حەیران زادەی چۆڵەوارییە. مامۆستا حەمەی حەمە باقی لە گوتارێکی بەنێوی سەرەتایەک بۆ مێژووی مۆسیقای کوردی گۆڤاری ئاوێنە ژمارە ٢١و ٢٢ گەلاوێژ - خەرمانانی ساڵی ١٣٧٤ لە زاری پرۆفیسۆرێکی ئەمریکایی، ڕالف سۆلێکییەوە دەگێڕێتەوە کە گوتوویە: "...گۆرانی فۆلکلۆری کوردی لە باوەشی سروشت و لە هێمنایەتیدا زۆر خۆش دەبیسترێ.." قسەکانی پرۆفیسۆر سۆلێکی تەواو بوو. ئەم قسانە کتومت لەگەڵ دەوروبەری حەیراندا یەکدی گردەبنەوە کە چۆڵەواری و کشی و ماتی و بێ دەنگییە، ئەو دەوروبەرەی حەیرانیش کتومت لەگەڵ جۆرە ئاوازێکی کۆنی ڕۆژئاوایی یەکدی دەگرنەوە کە پێی دەڵێن سێرێنادا. سێرێنادا ئاوازێکی زۆر ڕۆمانتیک و سەنتیمەنتاڵە و لە وشەی سێرێنوسی لاتینییەوە وەرگیراوە کە بە مانای چۆڵەواری و کپ و بێدەنگی دێ. کەوابوو حەیران لە بنەڕەتدا وەک لاوک بۆ مەجلیسی کۆشک و دیوان و دیوەخانان دانەنراوە. حەیران تەنیا بۆ یار و هەوارە، خۆشەویستی و غەریبییە هەم بۆ یار و هەم بۆ هەوار. بۆیەکا من لێرەشدا لەگەڵ بیروبۆچوونی هەندێ نووسەری کورد نیم کە دەڵێن: بابەتی حەیران یان دڵدارییە یان مێژووییە یان ئایینییە یان پیاهەڵدانی منداڵانە و زۆری دیکەش. کە هاتمە سەر بابەت و ناوەڕۆکی حەیران ئەوسا باسی ئەمە بەدوور و درێژتر دەکەم. بەکورتی حەیران و حەیرانبێژی چاک دەبێ لەناو جەرگەی ژیانی لادێی دەشتەکەی پیرە هەولێرێ سەری هەڵدابێ. هەر بۆیەشە کە زمانی حەیرانی ڕەسەن دەبێ زاراوەی دەشتی هەولێرێ بێ و کارتێکردنی شێوەی زمانی شارستان و هەرێمەکانی دیکەی کوردستانی پێوە نەبێ ئەگینا ئەو تام و چێژە ڕەسەنەی پێوە نامێنێ وەک سیمفۆنیایەکی بێتهۆڤنی لێ دێ کە بەجاز لێ بدرێ. کاوێس ئاغا کە هەر لاوکی دەگوت و لاوکیش هەموومان دەزانین بەشێوەزاری کرمانجی باکوورە، یەک تاکە حەیرانی گوتووە و لەو حەیرانەش شێوەی ئاخافتنی خۆی بە تەواوی گۆڕیوەتە سەر شێوەی زمانی دەشتی هەولێرێ. هونەرمەندێکی گەورەی وەک کاوێس ئاغا ئەمەی لەختوخۆڕایی نەکردووە، ئەو دەیزانی حەیران دەبێ بەزمانی دەشتی هەولێرێ بگوترێ.

### حەیران: کاوێس ئاغا

خوێنەرانی خۆشەویست ئەگەر لەبیرتان مابێ لە بەرایی ئەم توێژینەوەم لەسەر حەیران گوتم جارێکیان لە ساڵی ١٩٤٨ یان ٤٩ دابوو کە ماڵمان کەوتبووە پشت بەندینخانەی شاری هەولێر لە کوردستانی عێراق. گوتیشم کە شەو ڕادەکشا و دنیا کشومات دەبوو کابرایەکی گوندیی گیراو هەتا شل و شەکەت دەبوو حەیرانی بەسەر یار و

هەوارەکەی خۆیدا هەڵدەگوت. دەمەوێ ئەوەشی بخەمە سەر جاری واش هەبووە کە لادێیی دەچوونە هەولێر هەڵبەتە ئەوسا بە سواری کەر و هێستران هاتوچۆیان دەکرد جا ئەگەر شەو لە شار بمابانایەوە ئەوا بەخۆو بە دەوارەکانیان لە خانێکی شاردا میوان دەبوون چون لادێیی فێری ئوتێل و میوانسەرایی و شتی وا نەبوون. ئەوجا لەو خانەشدا کە شەو دادەهات ئەوەی کە حەیرانزان بووایە کوڵی دڵی خۆی لەو غەریباتیەی شاری هەولێرا دوور لە یار و هەوارەکەی خۆی بە حەیران دادەڕشت.

لەو سەردەمە ئەمن بەبیرم نایە لە بەندیخانە و خانی کەران نەبێ، لەهیچ شوێنێکی دیکەی شاری هەولێردا بیستبێ!! ئەلعانەکینێ ڕەنگە ئێوە بڵێن باشە بۆچی؟!

کەواتە با بێمە سەر باسی حەیران و شارستان. ئەهلی شار واتا ئەوانەی کە بابەلباب دانیشتووی شار بوون، سەبارەت بە دووریان لەو دەوروبەرە لادێییەی کە حەیرانی لێوە هەڵدەقولا نەک هەر تام و چێژیان لە حەیران وەرنەدەگرت بەڵکو بە هونەرێکی دواکەوتوو بێ بایەخی ژیانی لادێشیان دادەنا. کۆمەڵگای کوردیش وەک زۆربەی کۆمەڵگاکانی جیهان، ئەوسا و ئێستاش، بریتیبوو لە ٢ فەرهەنگی لێک لالووتی جیا جیا، شارستان و گوندی. دانیشتووی شار بە تایبەتی چینی بورژوازی هەموو لایەنەکانی ژیانی لادێی پێ دواکەوتوو بوو: بەرگی کوردی، شایی و هەڵپەڕکێ و دەهۆڵ و زوڕنا و شلە ساوار و نیسکێنە و دۆینە و دۆغەوا و داندۆک، زمانی کوردی گوندان و هەڵبەتە حەیرانیش. چوون ئەمانە گشتی تایبەتن بەژیانی جووتیار و ڕەنجبەران، شارستان حەزی نەدەکرد خۆی دابەزێنێ بۆ ڕێزی ئەوانەوە. چۆن لادێیەکی ڕۆژگارانی پێشووی ئەوروپا وەک شارستانییەک لە هونەری میوزیکی کلاسیک و ئۆپەرا نەدەگەیشت چونکە زادەی کۆمەڵگایەکی بورژوازی بوو لە کۆشک و دیوانی میر و مارکیز و کۆنت و دووک و خانەدانانیدا لێ دەدرا و ڕاستییەکەشی هەر بۆ ئەوانیش دانرابوون، بەهەمان ڕادە شارستانی ئەوروپایی ئەوساکەش ئەوەندە ڕووی خۆی نەدەدایە ئاواز و گۆرانی سادەی لادێیەکانی خۆیان. هەڵوێستی شارستانی کوردیش بەرامبەر بەحەیران ئەوها بووە. چاکم لەبیرە تەنانەت لە زەماوەندی ژن گواستنەوەش نە هەڵپەڕکێی ڕەشبەڵەک لە هەولێردا دەکرا نە دەهۆڵ و زوڕناش دەیکوتا. بەڵام بە هەمان ڕادەی کە ئەم لایەنانەی ژیانی لادێ لەشار نامۆ بوون، ژیانی شاریش لای گوندییان زۆر ناپەسەند و ناخۆش بوو. دەگێڕنەوە دەڵێن لە سەرەتای ئەم سەدەیە دوو گەورە پیاوی ناوداری ئێلی دزەیی برایم ئاغا و ئەحمەد پاشا کە ئامۆزای یەکتری بوون نێوانیان بوو بەحەوت و هەشت، چونکە ئەحمەد پاشا ماڵی لە گوندەکەی خۆی، قشاغلو، بارکردو چوو لە هەولێر دانیشت. برایم ئاغا بەوە زۆر پەست بوو پێی گوت "... ئەحمەد شەرمێ ناکەی دەچی لە شاری هەولێر دادەنیشی!! ئابڕوومان دەبەی! عەشرەت و شاریان گوتووە!؟.

وەڵلا ئەحمەد پاشا ناچار دەبێ هەڵدەستێ بارگەی تێک دەنێ و ماڵی دەباتەوە گوندەکەی خۆی.

ئەم قسانە ڕاستییەک ڕوون دەکەنەوە کە شار و لادێی کوردەواری لە کۆنەوە دووربن لە فەرهەنگی یەکتری و لێک لالووت بوون.

حەیران وەک کە دەبینین دیاردەیەکی ژیانی کۆمەڵایەتی لادێی دەشتی هەولێر بووە و لە شاریش، چوون جۆری ڕابواردن و کەیف و سەفا لەلای چینی بورژوازی زیاتر کۆڕ و مەجلیسی کارمەندانی دەوڵەت بووە و لەو کۆڕ و مەجلیسانەش زۆر جاران ئارەق دەخورایەوە و دەبوویە چەقەنەلێدان و لەو دانیشتنانە یان بەستەی کوردی یان قۆریاتی تورکمانی دەگوتران، ئەم دوو جۆرە گۆرانییەش هەردووکیان لەلادێ نامۆ بوون. لە قۆریات نەدەگەیشتن، چونکە بەزمانی تورکمانی بوو بەستەشیان پێ عەیب بوو، چونکە هی مەجلیسی پیاوی گران و سەنگین نەبوو. لەلادێی دەشتی هەولێر بە دەگمەن بەستە دەگوترا ئەگەر بشگوترایە ئەوا تایبەت بوو بە گۆیندەی گەڕۆک یان بە تایفەی دۆم کە بۆ گوزەران دێ بەدێ، ناوچە بە ناوچە دەگەڕان و ئەو بەستانەیان لە کوردەواریدا بڵاودەکردەوە. لە لادێی دەشتی هەولێردا بێجگە لە حەیران هەموو ئاوازەکانی دیکە بریتی بوون لە ئاواز و بەندی بۆنە واتا موناسەبات و کارکردن وەک بەکرەیی و بەندی ساوار کوتانەوەو شایی و ڕاو و ئەم جۆرە بابەتانە کە ڕێز و حورمەتێکی تایبەتییان لای خەڵکەکە هەبووە، چونکە ئەوەی کە دایدەنان شایەرێکی میللی بووە و شایەریش بەقەدر بوو، چونکە ئەویش وەک حەیرانبێژ بەڵام بە پێچەوانەی لاوکبێژ و دۆمان بۆ پووڵ نەیدەگوت. هەڵبەت کە ئەم قسانە دەکەم مەبەستم لە هەولێری کۆنە کە هێشتا دێهات وێران نەکرابوون و لادێیی ڕوویان لە شار نەکردبوو، بەڵام بێگومان ئێستاکێ ژیان گۆڕاوە و دانیشتوانی دەشتی

هەولێریێ بە کرمانج و ئاغاوە وا لە شارن ئەگەرچی باوەڕناکەم ژیانێکی ئاسوودە و بەختەوەریان لە شارا هەبێ، چونکە وەک دەڵێن کەوتوونەتە بەینی دوو بەرداشان و سەریان لێ شێواوە لەنێوان فەرهەنگ و دەستووری دەشتێ و فەرهەنگ و دەستووری شار. ئەوانە ئێستاکە شاییەکیان لە شارا دەبێ هەم ڕەشبەڵەکی بۆ دادەبەستێ و دەهۆڵ و زوڕنای بۆ دەگێرن هەم بووک و زاواش بە جل و بەرگی ئەورووپایی و کراسی بووکێنی سپی یەکسەر لە ڕۆژی گواستنەوە دەچنە مانگی هەنگوین. گۆرانییەکانی ئەو شاییانەش بە پێچەوانەی شایی لادێ بە زۆری بەستەن. حەیرانیش لەو ئاهەنگ و زەماوەندانەدا دەگوترێ، بەڵام زۆربەی حەیرانبێژەکان جەوانی بەرەچەڵەک لادێیین و لە شار گەورە بووینە، بۆیە حەیرانەکانیان زۆر بێ سەروبەرن و پاردش لە موقابیلی وەردەگرن. ئەگەر حەیرانبێژێکی ڕەسەن بەرێکەوت دۆستی ماڵەبابی زاواکە بێ و بانگهێشت کرابێ لەوانەیە ئەویش چەند بەندە حەیرانێ بڵێ وەک عادەت و ڕەوشتی کۆنی خۆی بەبێ بەرامبەر. خولاسە، شار ئەو دەوروبەرەی لێ نییە کە حەیرانی تێدا بگوترێ و دێهاتیش بەهۆی بەکارهێنانی مەکینە و تەکنەلۆژیای نۆژەن ئەویش ئەو دەوروبەرە ڕەسەنەی لێ نەماوە کە حەیرانی لێوە هەڵدەقوڵێ. کە هاتە سەر باسی ئەوە ئایا حەیران دوارۆژی هەیە یان وا لە ئاوزنگداندایە ئەوسا بەوردیتر لەمە دەدوێم.

لێرەدا حەزدەکەم ئەوەش بزانن کە بە حەیران ناگوترێ گۆرانی و بە حەیرانبێژیش ناگوترێ گۆرانی بێژ. ڕاستە بەپێناسەی گشتی، هەر شتێک بەدەنگ بگوترێ دەکەوێتە ناو خانەی گۆرانییەوە. ئەمە لای میللەتانی دیکەش هەروایە. بەڵام وەک لای میللەتانی دیکە، لای کوردیش هەندێ جۆری تایبەتی، لەو گوایا "گۆرانیانە"، هەن کە ناوی تایبەتی خۆیان هەیە. جاران لە ئیتاڵیای سەردەمی ڕێنسانس جۆرە ئاوازێک هەبوو پێیان دەگوت (مادریگال)، دواتریش لە ئینگلتەرە ئاوازێک پەیدابوو پێیان دەگوت (ayre) یان (ئەیر)ە وە لە سەدەی نۆزدەهەمی ڕۆمانتیکیش (lied) و (فۆلکس ڤایزن) لە ئەڵمانیا پەیدابوون. ئەمانە ئەوسا و ئێستاش کە ناویان دەهات یان دێ هەرگیز وشەی گۆرانی واتا (سۆنگ) یان (شلاگەر)یان بۆ بەکارنایە بەڵکو هەر بەناوە ڕەسەنەکەی خۆیان ماونەتەوە. ئەمڕۆکەش کە بە زمانێکی بێگانەی هی لە ئیتاڵی و ئەڵمانی و ئینگلیزیش ناویان بێ، ناوە بنەڕەتییەکەی خۆیان هەرگیز تەرجەمە ناکرێ. ئێستا لەهەر چ زمانێکا بێ، بە (لید)ی ئەڵمانی هەر دەگوترێ (لید). کوردیش وا. کورد هەرگیز ناشێ بە لاوک و حەیران و بەیت بڵێ گۆرانی و بەدەنگبێژەکەی بڵێ گۆرانیبێژ. ئەمە وەک کە پێشتر باسم کرد هەم لە پایەی هونەرەکە و هەم پایەی هونەرمەندەکە کەم دەکاتەوە. لەڕووی بابەت و ناوەڕۆکەوە گۆرانی و بەستە سووکن و جدی نین و لای خەڵکی لادێ ئەمانە ئاوازی تایبەت بە کوڕی بادەنۆشانی شارستان بوون و هی مەجلیسی پیاوی گران و سەنگین نەبوون. هەر خۆی وشەی گۆرانیش لە گۆرانەوە وەرگیراوە. هەروەک پێشتریش باسم کرد جاران و، تا رادەیەک ئێستاش، دوو کلتووری لێک جیای کۆمەڵی کورددواری هەبوون، دوو چینی کۆمەڵایەتی لادێ و شارستان. لەزۆر ناوچەی کوردستاندا بەم دوو کلتوورە لێکجیایە دەگوترا کورد و گۆران. لای ئەوان کوردەکە خەڵکی لادێ بوو، گۆرانەکەش خەڵکی شار، هەردوو کۆمەڵیش بە چاوێکی سووک سەیری یەکترییان دەکرد، گۆرانەکان کە گۆیا خۆیان بە گەورەتر دەزانی و گۆیا وشەی گۆرانیش هەر لە گەورەوە هاتووە، کوردەکان واتا لادێییەکانیان بەدواکەوتوو دادەنا و کوردەکانیش پێیان وابوو گۆرانەکان، واتا ئەهلی شار، سیفەتی پیاوەتی و مەردایەتی و ئازایەتی گوندییەکانیان تێدا نییە و ترسنۆکن. ئەمە لای عەرەبیش وایە. ئێستاش خەڵکی شارە گەورەکانی عێراق بە خەڵکی (بەدوو) و ڕەشماڵنشین و وشتردارەکان دەڵێن عەرەب.

گوتنێکی کۆنی زۆر باو هەیە لای هەموو کورد کە دەڵێ " مانگەشەوە، تەقەوتەوە، گۆرانە حیزە چاو لەخەوە" دەڵێن گۆیا لادێییەکان شەڕیان کردووەو هەرای تەقە و تفەنگ بووە، کەچی گۆرانەکانی ناو شار لە پرخەی خەوی خۆش دابوون و خۆیان تێکەڵی ئەم شەڕ و شۆڕانە نەدەکرد. بۆ پتر زانیاری لەسەر ئەم بابەتی کورد و گۆرانە بڕوانە نووسینەکانی مامۆستا سدیق بۆرەکەیی. جا لەوە دەچێ کە ئەم ناکۆکییە کۆمەڵایەتییەی نێوان کورد و گۆران، نێوان کولتوور بن-کلتوور بووبێ کە کوردەکانی لادێ وشەی گۆرانییان بۆ ئەهلی شار دروست کردبێ کە بەلای ئەوانەوە بەستەو ئاوازی سووک و هەرزانن و دوورن لەو سوارچاکی و ئازایەتییەی کە لەناو لاوک و بەیتدا باسی لێوە دەکرێ، یان ئەو خۆشەویستییە ڕۆمانتیکەی کە بابەتی حەیرانە. دیارە لای دانیشتوانی

گوند، هەر بابەتەو ناوی تایبەتی خۆی هەبووە. حەیرانبێژ و لاوکبێژ و بەیتبێژی بەراستی و جدیش هەرگیز بەستەو گۆرانی نالێن.

*** حەیران وەک پارێزەری کەلەپووری کورد**

گەلی براو برادەرینە ئێستاکەش دێمە سەر لایەنێکی **دیکەی حەیران کە پاراستنی گەنجینە و سامانێکی زۆر بە نرخی رۆژگارانی باب و باپیرانە.**

**حەیران جگە لە ئاوازە پڕ لە خرۆشان و توێنەرەوەکەی، ئاوێنەیەکی زۆر روونی بێ گەردی کەلەپووری کۆنینەی کوردە، بارکێشی خەزینە گەوهەری کلتوور** و دەستووری جارانی کوردە، زۆر بە ئەمانەتەوە بەبار سامانی بەنرخی ژیانی کۆمەلایەتی جارانی کوردمان بۆ دەگوازێتەوە و لەبەردەمی ژیانی ئێستەمانی هەلدەبژێرێ.

حەیران ناوی جۆرە خشڵ و چەک و زێڕ و زیوی وا، جل و بەرگ و پێلاوی وا دێنێ کە کیژۆڵە و ژنی جارانی کورد خۆیان پێ دەڕازاندەوە، کە لەوانەیە کیژۆڵەکانی ئەم سەردەمە نەک هەر نەیاندیتبێ بەڵکو هەر نەشیان بیستبێ.

بۆ نموونە، تۆق، تەلەسم، مەرجان، مۆری، حەمایل، گۆبەرە، بەربەنە، تاس، قۆپتاس، گوارە و خەزێمی دەستووری هەودلێ، پاشەسەرە، لاسەرە، بسکۆکە، کەمبەرە، خەناوکە، سنجاق، دەرزیلە، کۆترۆکە. ئینجا باسی جل و بەرگی وەک هەوری، هیزار، چارۆگ، گوفەک و گورینگ، داوو دەلینگ، کراسی بەباغەر، کەوێ، بن کەوێ، سەرکەوێ، بەرامپیل، ئینجا قۆندەرەی زرۆقی و قۆندەرەی حەفت رەنگ ئیتر هەزار شتی دیکەش کە بەخوا منیش نایانزانم. بێجگە لەمە، ناوی جۆرەها ئامێری ژیانی جووتیاران کە ئەورۆکە مەگەر هەر لە مۆزەخانەی شاردا بەدی بکرێن، ئەگەر مۆزەخانەیەکیش هەبێ!! حەیران هەروەها باسی گوند و گۆم و سەراو و گرد و بستی و دوریان و کەند و لەند و کەندەلان و کاولە ئاش و هۆبە رەشماڵ و مەڕوماڵات و حەوشە و حەسار و لەودەو کادین و خەندەک و بەکورتی: بە سەدان هەوارگە و جێژوانی جارانی کوردمان بۆ دەگێڕێتەوە کە زۆریان ئێستاکێ هەر ئاتاریشیان لەسەر پاتاریاندا نەماوە. ئەمڕۆکە زۆر لەو گوندانە رەنگە وێرانە بن، کانیاو و گۆم و بیر چکیان کردبێ، کەند و لەند و کەندەلان پڕ بوونەتەوە و کێلدرابن، هۆبە رەشماڵی دزەییان مەگەر هەر یەختیارەکان بە بیریاندا بێ.

هەروەها حەیران چونکە لە بنەڕەتدا لەناو جەرگەی ژیانی کۆمەلایەتی هەرە کۆنی کوردەوە هەڵقوڵاوە، تێگەیشتنێکی تەواوی ناوەرۆکەکەی لایەکی ژیان و داب و نەریتی کۆمەلایەتی باب و باپیرانمان بۆ روون دەکاتەوە وەک حەزلێکردن و جێژوان و رەدووکەوتن و ژن هەڵگرتن. بێجگە لەوە بە وردەکاری و جوانکارییەوە باسی هەست و نەستی حەزلێککردن و دەست لێکبەردانی کچ و کوڕمان بۆ دەکا. کەوابوو حەیران هەرچەندە کە وەک لاوک رووداوی مێژوویی کوردمان بۆ ناگێڕێتەوە، بەلام ئەویش بۆنی مێژووی لێ دێ، بۆنی کۆنینەی لێ دێ، بۆنی ئەنتیکەخانەیەکی ئیتنۆگرافیکی لێ دێ و بۆنی جوگرافیای بەشەری و ژیانی کۆمەلایەتی کۆنی کوردی لێ دێ. کەوابوو حەیرانیش وەک لاوک بەواتایەک مێژووی نەنووسراوەی کوردە. بەلام گەلی یاران بەخۆڕایی نەگوتراوە: حەیران پیر نابێ. حەیران هەرچەندە کۆن بێ ئەوەندەش تەڕو تازەو سەوزە، حەیران هەمیشە بەهارە. هەر بۆیەشە کە یەختیارەکان دەڵێن: حەیران پیر نابێ. جا با لێرەدا هەڵوەستەیەکی بۆ بکەم و کەمێک لەسەر ئەو ئیستیلاحە بڕۆم.

*** حەیران پیر نابێ**

یەختیارەکانی دەشتی هەولێرێ هەر کە گوێیان لە حەیرانێک دەبێ بە هەناسەیەکی سارد و ئاخێکی پڕ لە کەسەرەوە دەڵێن: حەیران پیر نابێ! مەبەستیان لێرەدا ئەوەیە کە لە ناوەرۆکی حەیراندا هەموو ئەو کەلەپوور و دەستووری جاران و گوند و کەند و لەند و بیر و کانی و جێژوانیان وەک فیلمێکی سینەمایی دێتەوە بەرچاو کە بە ئینگلیزی پێی دەڵێن (the good old days) واتا رۆژگارانی خۆشی جاران) کە خۆیان تێیدا کوڕ بوون و ئەو هەموو سەراوو دەراوەی کە لە حەیرانەکاندا گوێیان لێ دەبێ بە خۆیان هەموویان لە هەڕەتی لاویدا کردووە. ئەو رۆژگارە خۆشەی تۆغیانی جحێڵیان ئێستاکێ کە دێتەوە بەرچاو کزەیان لە دڵی ماندوو و شەکەتی زەمانەوە دێنێ، چاوی پووت و کزیان پڕ دەکاتەوە لە فرمێسکی ئەوینداری و حەز لێکردنی سەردەمی لاوی، ئاگریان لە هەناوا بەردەدا بەجۆرێ کە هەموو هەستەکانیان وەئاگا دێنێ و جۆش و خرۆشیان دەدا. ئەورۆکە هەر پیاوێک یان ژنێکی کەمێک بەناو ساڵاچوویی کە گوێی لە حەیرانێک دەبێ ئێستای ژیانی خۆی بە تەواوی لەبیر

دەچێتەوە و بۆ ماوەی حەیرانەکە نۆستالجیاو غەریبی دەیگەڕێنێتەوە بۆ دواوە، بۆ ناو رابردووی جوانی و جەحێڵی. جا لەبەر ئەوەیە کە ئەو پیرانە دەڵێن حەیران قەت پیر نابێ.

بۆ پشتگرتنی ئەم قسانەش با گوێمان لەکۆچکردوو حاجی محەمەدی مەولود هەولێری بێ کە چۆن لە شەوێکی زستانا لەخەو هەڵساوە و دەستی بە حەیرانان کردووە و چۆن پیرەژنێکی ئاواییش کە گوێی لێ بووە هەتا بەیانی بەدەنگی ئەو حەیرانانەوە گریاوە.

*** وێچوواندن لە حەیراندا**

هێشتا هەر خەریکی چیرۆکی حەیرانم و ئێستاکە دێمە سەر خەسیەتێکی زۆر زەق و دیاری حەیران کە وێچواندنە و بە عەرەبی پێی دەڵێن تشبیه.

هەروەکو پێشتریش گوتوومە، ئێستەش دووپاتی دەکەمەوە حەیران وەک لاوک و بەیت رووداوی عەگیدی مێژوویی یان سەرگوزەشتەی دوور و درێژی دلداری ناگێرێتەوە. حەیران بە ۳ بەندی کورت کە لەوانەیە هەریەک تاکە دەقیقە بخایەنێ هەست و نەستی دڵ و دەروونی کچ و کوڕ بۆ یەکتری هەڵدەبژێرێ. بەڵام لەناو چوارچێوەی ئەو چەند بەندە کورتەی خۆشەویستیدا پیاو بۆنی مێژوو و جوگرافیا و ژیانی کۆمەڵایەتی کۆنی کورد و دەستووری جارانی کوردەواریش دەکا. یەک لە ئاکارە هەرە زەقەکانی خۆشەویستی و حەزلێککردن لە حەیرانا وێچواندنە، وێچواندنی یار بە هەر شتێکی جوانی سروشتی کە لەو دەشتی هەولێرە پان و بەرین و کاکی بە کاکییە بەدی دەکرا. لادێییەکی جارانی دەشتی هەولێرێ. ئەگەر سەبارەت بە گەرمیان و کوێستان کردنی سەردەمی شوانکارەیی نەبا کە کۆچ و کۆچباری لێ دەنا و ئەم هەوار و ئەو پاوانی دەکرد یان کە ساڵی جارێکی دەچووە شار بۆ کڕینی پێویستییەکانی ماڵ و خێزانی، ئەگینا بەدەگمەن لە گوندەکەی یان لە دەوروبەرەکەی خۆی دوور دەکەوتەوە.

هەڵبەتە تا ئێستا وا نەماوە، بەڵام هەتا سییەکانیش کە هێشتا ئۆتۆمبێل تاک و تەرا لە دێهاتی دەشتی هەولێرا بەدی دەکرا، رەوە مامزی ئەو دەشتەو بە تایبەتی هی دەشتی قەراجی دەگێڕنەوە دەڵێن بە هەزاران بووە، مامزی دەشت و بەرپاییش لە هەموو رووێکەوە یەکێکە لە حەیوانە هەرە جوانکیلە و ئێسک سووکەکانی کوردستان بە تایبەتیش کارمامز، مامز واتا ئاسک و هەڵبەتە کارمامزیش واتا

کارئاسک، زۆرجار کار غەزالیشی پێ دەڵێن.

جا حەیرانبێژی هونەرمەند زۆر بە وەستایی هەڵستاوە نازدار حەیرانەکەی خۆی بەو کارمامزە چواندووە. هەموومان دەزانین مامز دوو چاوی زۆر رەش و گەورە و جوانی هەیە. حەیرانبێژ چاوی یارەکەی خۆی بەو چاوانەی مامز شوبهاندووە، کە حەیرانبێژ باسی کارمامزی دوو مانگی دەکا و نازدار حەیرانەکەی بەکارێک دەشوبهێنێ. ئەوە بۆمان ساغ دەبێتەوە، کە یاری حەیرانبێژیش کیژۆڵەیەکی تازە پێگەیشتووی لە سونعی چواردە ساڵان بووە. هەمووشمان دەزانین کە مامز گەردەنێکی درێژ و تابڵێی جوانی هەیە، لێرەشدا حەیرانبێژ گەردنی یارەکەی بەمل و گەردنی مامزەکە دەچوێنێ. کە دەڵێ: کارمامزێکی سوورغەری چارپەل بەخەنە، مەبەستی لێرەشدا رەنگی سروشتی یارەکەیەتی کە سوورێکی تێری شەرابی لەبەر هەتاوا هەڵکرووزاوە. هەڵبەتە کچە لادێیی لەبەر کاروکاسبی هەمیشە لەبەر هەتاون و تینی خۆر هەم سووری هەڵگەڕاندوون و هەم ئەسمەریشی کردوون، جا ئەو دوو رەنگە کە تێکەڵ دەبن رەنگێکی شەرابی یان هەناری تاریکی زۆر دڵکێشی لێ پەیدا دەبێ کە پێی دەڵێن سۆرەسمەر و حەیرانبێژ لەکار مامزەکەو نازدار حەیرانەکەی خۆیدا دەیبینێ. کە حەیرانبێژ دەڵێ کارمامزێکی سۆرغەری دوومانگی چارپەل بەخەنە مەبەستی لە چوارپەل بەخەنەش ئەوەیە کە قاچەکانی کارمامزیش لەدوورەوە سوور دەچنەوە و بەجۆرە دەست و پێیە بەخەنە نەخشاوەکەی یارەکەی خۆی دێتەوە بەرچاو. خولاسە، حەیرانبێژ نییە کە بەجۆرێک یا بەجۆرێکی تر نازدار حەیرانەکەی خۆی لەهەموو رووێکەوە بە کارمامزان نەچوێنێ.

*** حەیران: تایەری پەرکانەیی**

هەروەکو کە باسم کرد یەکێک لە ئاکارە سەرەکییەکانی وەسفکردن لە حەیرانا وێکچوواندن واتا تەشبیهە. گوتمان کارمامز لەهەموو حەیوانێکی دیکە زیاتر لای هەموو حەیرانبێژەکان خۆشەویستە کە نازدار حەیرانەکەیانی لە هەموو رووێکەوە پێ بچوێنن. بەڵام بۆ مل و گەردەنی درێژ و رەوت رۆینی بەلەنجەولار، حەیرانبێژ پەنای بردۆتە لای هەندێ تەیروتواڵیش کە لەدەشتی هەولێرا باون و چ لەگوێ ئاوان چ لەتاقی ئاسمانێ بەجوانی و خانومانی بەنێوبانگن. ئەو مەلانەش قاز و قولنگ و سۆنە و مراوین. جاران کە

هێشتا لوولەی ئاوی سازگار بۆ ناو ماڵە لادێیان رانەکێشرابوون ژن و کچانی ئاوایی بۆ کوڵکردن یان دەچوونە سەر رووبارێک یان ئەگەر رووبار لەو ناوە نەبووایە بەهاران دەچوونە سەر کەند و لەند و جۆم و گۆمان کە لەپاش بارانێکی زۆر پڕدەبوون لەئاو و لە پاشانا چکیان دەکرد. هەر ئەو دەوناوانە پڕیش دەبوون لە قاز و قولنگ و مراوی و سۆنە و کۆترە کێویلکە و تیتراوسک و جۆرەها مەلی دیکەش. جا ئەگەر بەهاران سەیری ئەو ناوەت بکردایە دیمەنێکی یەکجار دڵڕفێنت دەهاتە بەرچاو: لەلایەکەوە کوڵکەری ناسک بەدەن مەلەیان دەکرد و جلەکانیشیان لەسەر پنچک و دار و دەوەنان هەڵدەخست تا بۆ ئێوارە وشک ببنەوە، لەلایەکی دیکەش تەیر و تواڵی رەنگاورەنگی جوان جوان خۆیان دەئاوێ هەڵدینا و کە دەهاتنە دەرەوە بەباڵەفڕکێ خۆیان دادەوەشاند. حەیرانبێژی وردبینیش سەرنجی خۆی دەدایە ئەو دیمەنە دڵکێشە و زۆر هونەرمەندانە تێکی هەڵدەکێشان ئەگەر حەیرانبێژ دڵی لە گوندی مووورتکە و سەرچاوەی گوندی گردمەلا بەجێ بمێنێ کە کارێز و جۆگەی لێ بوو، ئەوا گلەیی لێ ناکرێ چونکە کە دەڵێ: "مووورتکە لەمن بەگرازە گرازە.. ئەمن دەچمەوە سەرچاوەکەی گردمەلای لەمن بێ چاوکار نابێ دایمەن بەدایم بە قورینگ و قازە..." لێرەدا قورینگ و قاز هەر خودی ئەو تەیرە ناگرێتەوە بەڵکو مەجازەن کیژۆڵە ناسک بەدەنەکانیش دەگرێتەوە کە بەگەردەنی درێژی بە خەناوکەیان وەک قاز و قولنگ و مراوی خۆیان دەئاوێ وەردێنن. لەبیرتان نەچێ کە مراویش ئاڵقەیەکی جوانی بەدەوری گەردەنیدا هەیە وەک خەناوکەی گەردەنی کیژۆڵە لادێیی.

*** رێی کۆچان**

ئەوجارەیان دێمە سەر بابەتێکی حەیران کە پێی دەڵێن رێی کۆچان. رێی کۆچان ئەو رێگایەیە کە کۆچەری کورد لەکاتی گەرمیان و کوێستان کردنیاندا پێیدا دەچوون. کەم حەیران هەیە ناوی کۆڵێک دێهات و گرد و کەند و شوێنەواری تێدانەبێ کە حەیرانبێژی چاک بەرێز پێیدا دەچێ هەتا دەگاتە هەواری نازدار حەیرانەکەی.

وەک زۆربەی ئێڵ و خێلاتی کوردەواری رۆژگارانی کۆچەری و شوانکارەیی، دزەییش نیمچە کۆچەر بووین و گەرمیان و کوێستانیان دەکرد. دیارە کۆچەر و شوانکارەش سەبارەت بەو مەڕ و ماڵاتەی کە سەرچاوەیەکی سەرەکی ژیانی ئابووریان بووە باشترین و گونجاوترین رێیان هەڵدەبژارد بۆ ئەوەی هەتا دەگەیشتنە دوا قۆناغی خۆیان ئاو و لەوەڕیان لە رێگادا لێ نەبڕێ. جا ئەو رێیەی کە کۆچەر پێیا دەچوون ئەوە رێی کۆچان بوو سا ئەگەر حەیرانبێژ خۆی لەگەڵ ئەو کۆچ و کۆچبارە با یان نا، ئەوا هەست و نەستی خۆی بە حەیران دەردەبڕی و ناوی ئەو دێهات و سەرچاوانەی یەکە یەکە دەخستە نێو حەیرانەکەیەوە، چونکە نازدار حەیرانەکەی بەوێدا چووە. رێی کۆچانیش یەک و دووان و سێیان نەبوون، زۆر رێ رێ هەبوون تا مەرداڕەکان دەگەیشتنە دوا قۆناغ و لەوێ رەشماڵی خۆیان لێ هەڵدەدا و هەواریان لێ دادەکوتا. بەو هەوارگەیەش دەگوترا بنەگە. هەروەها بە کۆمەڵێک رەشماڵی عەشرەتی جۆراو جۆریشیان دەگوت هۆبە بۆ نموونە دەگوترا ئەوە هۆبەی دزەییانە، ئەوەشیان مامە سەنیانە، ئەوی تریان هۆبەی عارەبانە و ئیتر بەم جۆرە. هۆبەش لە زمانە ئەورووپاییەکاندا کامپ یان کامپینگ دەگرێتەوە. عەشرەتەکانی دەشتی دزەیی کە بەهاران بۆ لەوەڕ و پاوان کۆچیان دەکرد یان بەرەو ژوور یان بەرەو ژێر دەبوونەوە. ئەگەر بەرەو ژێر باریان بکردایە ئەوا دەچوونە دەشتی قەراجی کە دەشتێکی پان و بەرین و کاکی بەکاکییە و گەر بارانی تەواوی هەبێ خاکێکی زۆر بەپیت و فەڕی هەیە. دەگێڕنەوە دەڵێن جاران رەوەی مامز لەو دەشتی قەراجە بەهەزاران بووە.

ئەگەر ئەو عەشیرەتانە بەرەو ژووریش باریان بکردایە، ئەوا دەچوونە هەڵەت و هەرد و تەلانەکانی هەڵەجە و بیستانە و ولاتی کۆیە، یان هێشتا هەورازتریش بۆ ناوچە شاخاوییەکانی خۆشناوەتی و سورچی و باڵەکایەتی و رواندزێ. بەپێی حەیرانان، رێی کۆچان بۆ دەشتێ قەراجی ئەگەر من بەهەڵەدا نەچووبم بەمجۆرە بووە: گردی باقرتەی، زوورگەزراو، کەندی کەندێناوەی، سۆفی سمایل و گردی گۆمێ، گاوەرەو کەندار، بیری مەحمودی سەنان، کانیێ داودە رەشی، چیای قەرەچووغی، جالێرەدا یان بە بازارگەی دادەچوون یان بەکەرکێ حوسێنی غازی کلکەی دارە بزمارەی یانیش بە کلکەی کانی وەکازەی، گومەتی براهیمغەی، ئاوێ بن بەردی، قەراتی مەغمووری، خەندەکی غەلیفەی، کەندێ تۆماری، گوندی مەعێجیلە و کاولە مشاری، گەرعەوفارە، گومەتی سوڵتان عەولای عارەبی، یان مەحمەر ئۆمەران هەتا لە بنەبنەی شەرگاتی تەواو دەبوو کە لەوێ ئیتر سنووری

عەرەبستانی عێراق دەستی پێدەکرد. ڕێیەکی دیکەی کۆچانیش هەبوو کە هەر لە مرکیەی بەرەو قەراجی دەچوو، ئەویش بەمێرغوزاریّ گردوانان و گردەسۆری سیانان و ئازی کەندی بن دیاناندا دەچووە گوندی دەربەند و جاستان و قووچ قەرانیشی دەگرتەوە و بەزۆر گوندی دیکەشا تێدەپەڕی کە لەبیرم نەماون. کەم حەیرانبێژ هەبوون لووتکەکانی چیای قەرەچووغی نەخەنە ناو حەیرانەکانیان کە بریتین لە ٣ لووتکەی ناسراو (سەریّ بێژینگ بەسەری، قەرەبێتک، قەرەبۆتک). پێشتریّ گوێمان کۆچ و کۆچباری دزەییان یان بەرەو خوار بۆ دەشتی قەراجی دەچوون یان بەرەو ژوور بۆ ناوچە شاخاوییەکانی دەرەوەی دزەییاتی. لێرەشدا ڕێی کۆچانی خۆیان هەبووە، بەبن شاری هەولێرێدا بۆ ناو گەردیاتی و زرارییان. لێرەدا پێموایە بەم گوند و شوێنانەدا دەچوون: گردجۆتیار، گرد ئاردق، بەحرکە، خاروان و ڕەشوان، بەستۆرە، گردی تەیموسەکی، داری شەکرانیّ، ئینجا بۆ چیای پیرمەمیّ و بەگوندی سەربەنێدا دەچوونە خواریّ کە ئێستاکە بۆتە هاوینەهەواری سەلاحەددین، شەقلاوە، دەشتی هەریریّ، سیساوە، گوندەکانی عەشیرەتی سورچی و خەیلانی وەک گولەک باویان و خرواتان و لە گوندی سەرچیا سپیلکیان دەبڕی و شۆڕ دەبوونەوە بۆ ناوچەی باڵەکایەتی و گەلی عەلی بەگ و رواندزیّ، هێلێتکی دیکەش هەبوو دەچووە لای هەڵەجە و بیستانە و داری دێدەوانیّ، نێرەگێن و بانەموردو بایزاغا، ئەشکەفت سەقاو ناو عەشرەتی کورد و مەنتک و هەڵدەکشا بۆ وڵاتی کۆیە و لە هەیبەت سوڵتانیّ ئاودیو دەبوو بۆ چنارانیّ و خدرانیّ و بۆ دەشتی بیتوێن و ناوچەی مەرگە و پشدەریّ. حەیرانبێژ ئەو هەموو گوند و ئاوو شوێنانەی کە کۆچ و کۆچباری پێدا دەچوون، وەک ملوانکەیەکی زۆر ورد و جوان و لەسەریەک لەناو حەیرانەکەیدا دەهۆناندنەوە و بە ئاواز و نزمێکی زۆر بەسۆز و مێلانکۆلێک دەیچڕی.

**حەیران: عوسمان حەیران**

لێرەدا حەزدەکەم ئەوەش بڵێم کە هەر گوندێکی لەناو حەیراندا ناوی هاتبیّ مەرج نییە لەسەر ڕێی کۆچان بووبیّ. زۆرجاری وابووە کە حەیرانبێژ حەزی کردووە گوندەکەی خۆی بخاتە ناو حەیرانەکەی یان لە دەشتیّ چاوی بەدارکەرێک، کۆڵکەرێک، کیژۆڵە بەرخەوانێک کەوتووە و دڵی چووەتیّ. ئیتر سۆراخ بە سۆراخ زانیویەتی کچەکە خەڵکی چ گوندێکە هەڵدەستا ئەو گوندە و گوندەکانی سەر ڕێشی کە کیژەکە کارەکەی خۆی لە ئاقاری ئەوانا ئەنجام دەدا، هەمووی دەخستە ناو حەیرانەکەیەوە. جاری واش هەبووە کە حەیرانبێژ تەماشایەکی ئاسمانی کردووە و دیویەتی هەورێکی ڕەشی چڵکن بەری ئاسمانی گرتووە و خەریکە دایدەرێژیّ. لێرەشدا نازدار حەیرانەکەی خۆی هاتۆتەوە خەیاڵ کە ڕەنگە یان لەداران یان لە کوڵیّ بیّ و ئەو تاوە بارانە بیگرێتەوە. سەیری ئەم دیمەنە کە حەیرانبێژ لە حاڵەتێکی وەهادا زۆر هونەرمەندانە نیگارێکی ورد و جوانی لە خەیاڵی خۆیدا بۆ ڕاکێشاوە.

بەندی یەکەم:

گەوارەکی دادەینا چەند ڕەشی تاری...

بەندی دووەم:

دەیداوە لە سەرێیّ بێژینگ بەسەری، کلکەی قەرێتک و قەرەبۆتکان، لە من تەڕدەکا دارکەریّ لهێبان، کۆرکەریّ قەپرانی، نابەخوای شۆڕی دەکاتەوە ناو کەندیّ تۆماری...

بەندی سێیەم:

ئەوجا ئەمن دەرێم نازدار حەیرانەکەی خۆم بە چ دەشوبهاند بەوان کار و کار غەزالەکانی سۆرغەڕی دوو مانی چارپەل بەخەنە، کەوەتانی لەبەر حەوت حەوەتیّ سواران، نووسە نووسکیّ تاژییان. فرمە فرمیّ کەحێلان چەندە شیرن لەدوو دایکەی دەناری...

مەبەستی حەیرانبێژ لێرەدا ئەوەیە چۆن لەکاتی ڕاوکردنا کارمامز سەری لیّ دەشێویّ و بەدوای دایکی خۆی ڕادەکا و دەبۆرێنیّ و ناشێگاتیّ، ئەوهاش کە گەواڵە دایدەرێژیّ کیژۆڵە ئاسک بەدەنەکان لەکاتی کۆڵکردنا کەند و جۆم و کولەکەیان بەجیّ دێڵن و بەهەڵەداوان بەدوای دایکیانا بەرەو ئاوایی دەبەزن. تەشبیهێکی چەند جوانە!!

بەهەرحاڵ ئەم قسانەی کە دەیکەم بەداخەوە زۆربەی بۆتە ڕابردوو گوزەشتە. ئێستاکیّ نە کۆچ ماوە نە کۆچبار، نە ئەو هەموو گوند و سەرچاوە و هەوار. بەڵام وەک پێشتریش باسم کرد حەیران زۆر بە ئەمانەتەوە ئەو ژیانەی سەردەمی جارانی باب و باپیران و ئەو گوند و کەند و لەندانەی هەمووی بۆ تۆمار کردووین و وەک خەزێنەیەکی پڕ لە گەوهەر و شەوچراو مرواری لەبەردەمی وەچەی ئەمڕۆی کوردی هەڵڕشتووە.

*** حەیرانبێژی ژن**

خوێنەری خۆشەویست، ئێستا دێمە سەر حەیرانبێژی ژن.

بەداخەوە لێرە لە ئەمریکا هیچ حەیرانێکی بەدەنگی ژنانم لەبەردەستدا نییە و راستە لە کوردستانیشدا سەبارەت بە لەبەرچاوگرتنی داب و نەریتی کۆمەڵایەتی دەنگی ژنان تۆمارنەکراوە، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە ژنی حەیرانبێژ کەم بوون. جارێ بەر لەوەی دەست پێبکەم حەزدەکەم تێبینییەکی زۆر گرنگ لە حەیرانا بخەمە روو ئەویش ئەوەیە **کە لە زۆربەی هەرە زۆری حەیرانان دیالۆگێکی ناوخۆیی لەنێوان کوڕ و کچا هەیە واتا ئەگەر حەیرانبێژەکە کوڕ بێ ئەوا جاری واهەیە بەناوی خۆی و هەم بەناوی نازدار حەیرانەکەشی هەستی خۆشەویستی هەردوولا دەردەبڕێ وەک ئەم حەیرانە: هەستی خۆتانی بدەنێ بەندی یەکەم و دووەم هی کوڕەکەیە، بەڵام لە هی سێیەمدا کوڕەکە دەوری کچەکە دەبینێ و بەزاری** ئەو هەست و نەستی کچەکە بۆ کوڕەکە هەڵدەڕێژێ. یانی کوڕەکە دەچێتە ناو دڵی کچەکە و بە تەواوی دەزانێ چی تێدایە:

بەندی یەکەم: لە چیایان لە چیایێ هەر گۆزێ

بەندی دووەم: مارەبابی نازدار حەیرانێ لێ دەنا، ئاوادەبوو لە زوورگەزراوی رەنگین، دەپەریەوە لە کەندێناوە، شۆڕ دەبۆوە لێ دەشتەکەی کاولە قەراجی هێوارە گەلە گەلە درەنگە بزر دەبوو لە غوبار و تۆزێ...

بەندی سێیەم: کیژ دەرێ هەتیمە لاوە ئەتوو وەرە ماچکە قەفیێ بروێێ، بۆن کە خەتوخارێ گەردەنێ، بترازێنە سنجاق و زیبان، دەستەکی باوێ سەر ملیا بەکەزی، بەدەستەکەی دیش بگرە جۆتە شەمامە و شەمامەی باغەرێ هەر لەباتی جێژنە پیرۆزێ... (بەه بەه بەه بەه!!!).

ئیتر حەیرانی ئا لەو بابەتە یەکجار زۆرن، هەروەها کە ژنیش حەیران دەڵێ زۆرجاران دەوری خۆی و دەوری کوڕەتیم حەیرانەکەش دەبینێ.

بەڵام ئایا چ جیاوازییەک لەنێوان حەیرانی پیاوان و حەیرانی ژناندا هەیە؟ من لەکاتی خۆیدا ئەم پرسیارەم لە جەمیلی عەلیاغای دزەیی کرد کە گوتی: نەخێر هیچ جیاوازییەک نییە، بەڵام کە حەیران لە تازیاندا وەک سەردوولکە یان لاواندنەوە دەگوترێ، ئەوە بەزۆری لەلایەن ژنانەوە دەگوترێ، چونکە دەنگی ژنان زیاتر کاردەکاتە سەر هەست و خرۆشانی تازیەداران و زیاتر دەیانبزوێنێ.

پسپۆری حەیران و فۆلکلۆری کوردی خالید جووتیاریش چاکی بۆ چووە کە لە گۆڤاری بەیان ژمارە (٤٨)ی ئادار و نیسانی (١٩٧٨)دا دەڵێ ".... ژن بێ یان پیاو... مەسەلەی خەم دەربڕین و هەستی بنیادەمانە وەک یەکن... حەیران لای ژنان هەر هەمان ئاوازە فۆلکلۆرییەکەیە و سەربەند و دوابەندەکە هەر لەگۆڕێدان.. بەڵام دانانەکە بەرەو هەستێکی غەریبی دەچێتەوە...." قسەکانی کاک خالید جووتیار تەواو بوون.

با رووداوێکی بەڕاستی قەوماوتان بۆ بگێڕمەوە: لە بەرە بەری سەدەی بیستەم شەڕ دەقەومێ لەنێوان دوو بەرەبابی ئێڵی دزەیی: پاشاو بایز، کە هەردووکیشیان بن ئامۆزای یەک دەبن. مەولودی هیدایەتاغای هەولێری پیاوێکی زۆر ئازاو رەشیدی لای ماڵە بایزی دەبێ. لە شەڕێکیان ٩ گوللەی پێ دەکەوێ، لە ئەسپەکەی دەگلێ و ماڵە پاشای بەدیل دەیبەن بۆ گوندی قشاغلو لەوێ بە برینداری لەناو تەویلەی ولاغان فڕێی دەدەن. هەمینەی مەولود هەولێری خێزانی مەولود ئاغا کە ئەسپی مێردەکەی دەبینێ بەسەر زین و رکێفی خوێناوی دەگەڕێتەوە بۆ گوندی دوگردکان، نایکاتە نامەردی، نایەڵێ هەسپەکە بحەسێتەوە خۆی داوێتە سەر پشتی و لە رکێفی دەدا. پڕتاو قشاغلو خۆت بگرە!! هەمینەخان کە شیری دابووە زۆربەی برایەکانی من هەموومان پێماندەگوت دایە هەمە، دەنگێکی یەکجار خۆش و بەخرۆشی هەبوو لە حەیرانا. کە دەگاتە دیوەخانی ئەحمەد پاشای خزمەتکار بەپێی داب و نەریتی خێڵەکی ئەوساکە جڵەوی ولاغەکەی لێ وەردەگرن و ئەویش یەکسەر تاو دەداتە دیوەخانێ دەبینێ ئەحمەد پاشا و خەڵکێکی زۆر وا دانیشتوون و مشووری شەڕیانە ئەویش بێ سەلامون عەلەیکوم دەچێتە تەنیشت ئەحمەد پاشای و دادەنیشێ و هەردوو دەستی لەبناگوێی دەنێ، دەست بە حەیرانان دەکا بەسەر مەولودی مێردی ئەوەی دەیڵێ نایڵێتەوە!!

وەڵڵا ئەحمەد پاشا پڕی چاوی فرمێسک دەبێ دەڵێ هەمینە بەسە! ئاگرت تێ بەردام!! کورە بڕۆن زەڵام مەولودی لە تەویلەی دەربێن، چاک تیماری بکەن و برینەکانی بپێچنەوە. وەڵڵا مەولود ئاغایان هێنا دیوەخانێ و برینەکانیان تیمار کرد. لەپاش حەسانەوەیەک ئینجا ئەحمەد پاشا گوتی: کورە بڕۆن ئەسپەکی لێ مەولودیش بێنن و با زەلامەک لە تەنیشتی بروا بیگرێ هەتا دەیگەیەنێتەوە دوگردکان.

سەیرکەن، لێی ورد ببنەوە، بزانن نزمی حەیران دەبێ

چەندە بەسۆز بێ بە تایبەتی ئەگەر بە ڕەدەنگی ژنان بێ.
هەمینەخان بە چەند بەندە حەیرانێک مێردەکەی خۆی لە مردنێکی مسۆگەر رزگار کرد، مەولود ئاغا و هەمینەخانیش هەتا ئەو چەند ساڵانەی دواییش مابوون و تەمەنیان نزیکی سەتی کردبوو، هەزار رەحمەت لە گۆڕیان، ئەو قسانەش دایە هەمین خۆی بۆی گێڕاومەتەوە. ژنی دەنگخۆش و حەیرانبێژ زۆرجاران لە تازیانان حەیرانیان بەسەر مردووەکانا هەڵدەگوت بە تایبەتی ئەگەر جوانەمەرگ بان. مەرجیش نەبوو هەر حەیرانی لاواندنەوە و سەردوولکە بڵێن بەڵکو زۆر جار هەر حەیرانی خۆشەویستی و حەزلێکردنیان دەگوت، چونکە مەبەست لێرەدا خۆشەویستی بۆ مردووەکە بوو، بەلام ئەگەر کوڕەکە بکوژرابایە ئەوا بە کورتی ئاماژەیان بۆ کوشتنەکە دەکرد، بەلام لە پاشانا دیسان هەر دەگەڕانەوە سەر خۆشەویستی نازدار حەیرانەکەی کە لەپاش کوڕە لاوەکە بەجێ ماوە. وەک لە چەند حەیرانێک دەردەکەوێ، حەیرانەکان ئاماژە بۆ ڕووداوی مێژوویی دەکەن، بەلام لاوک بەتووڵ و تەفسیلی ڕووداوەکان ناگێڕنەوە، چونکە بە سێ بەندی کورتی حەیران مێژوو ناگێردرێتەوە.

**حەیرانێ: محەمەد حەسەن عومەر**

لە حەیرانبێژی ژنی ناودار بێجگە لەوانەی کە لە کتێبەکەی ئەحمەد حەیران و گوتارەکەی خالید جووتیار هاتووە، منیش ئەوانەم دەست کەوتووە و هەندێکیان هەر خۆم دەیانناسم:

**حەلیمێ بادینی: گوندی قەپران**
**مریەمێ تاژدینێ: گوندی دەربەند**
**مامزێ قوڵتەپەی: گوندی قوڵتەپە**
**زێرینێ ژنی حەسەن لاوکی: گوندی عەوێنە**
**حاجی جەمرە: گوندی قزڕیتان**
**هەمینەی مەولود هەولێری: گوندی دوگردکان**
**هەمینەی ژنی رەحمانی عەولا رەشی: گوندی دوگردکان**
**ئامینەی ژنێ وسوی: گوندی دوگردکان**
**خوچێی خوشکێ زایەری: گوندی دوگردکان.**

دەگێڕنەوە دەڵێن ئەو خوچێیە حەزی لە ئامۆزایەکی خۆی دەکرد شەوان لە سەربانی کە خەوی لێ دەکەوت ئەو حەیرانی دەیگوت بەدەم خەوەوە نەیدەگوتەوە هەمووی بەسەر کوڕە لاوەکەیدا هەڵدەگوت. کە بۆ بەیانی لێیان دەپرسی: کچێ بابان وێران ئەتۆ ئەوشۆ چت کرد!! قەت بڵێی خوچێ هیچی لەبیر نەمابوو.

خوێنەرانی خۆشەویست، دوو تێبینیم لەسەر کتێبی سەربردەی کۆمەڵە حەیرانبێژێکی کوردی کاک سەعدوڵلا ئیسماعیل شێخانی هەیە وا کۆی هاتووە بیانخەمە ڕوو، کاک سەعدوڵلا لە بەرایی لاپەڕە (١١)دا دەڵێ:

"... راستییەکی دیکەیش هەیە سەرنجتانی بۆ رادەکێشم ئەویش ئەوەیە کە حەیرانبێژەکان لە کۆتایی حەیرانەکانیاندا.. بەستە دەچڕن.." قسەکانی کاک سەعدوڵلا لێرەدا تەواو بوو.

ئەوەی من لێی بزانم بەستە گوتنی دوای حەیرانان مۆدەیەکە رادیۆ دایناوە و بلاوی کردۆتەوە. پیاو کە توێژینەوەیەک لەسەر حەیرانا دەکا نابێ خۆی ئەوەندە بە ئێزگە و رادیۆ و کۆڕ و مەجلیس و تیپی میوزیک ببەستێتەوە، بەڵکو دەبێ بگەڕێتەوە بۆ لادێ، بۆ سەر جۆخینان، بۆ سەر پەرێزان، بۆ ناو زەوی و لای جووتیار و شوان و دارکەر و کوڵکەر و تێلەکێش و رێبواران. ئەگەر ئەمەت کرد، باوەڕناکەم، گوێت لە حەیرانبێژێک ببێ کە دەنگ و ئاوازی بەسۆز و خرۆشی حەیرانەکەی هەستی خۆشەویستی خۆی بۆ گراوەکەی هەڵدەرێژێ، باوەڕناکەم کە لە حەیرانەکەی بۆوە یەکسەر بە بەستە و گۆرانی سووک کۆتایی پێ بێنێ. چونکە ئاواز و نزمی حەیران کەش و جەوێکی ئەوەندە رۆمانتیک و شاعیرانەی ئافراندووە کە قەت ناشێ حەیرانبێژ بەگۆرانی سووک و بەستە تێکی بدا!! یانی مەبەستم ئەوەیە قابیلە کوڕەتیم حەیران بە دوورەوە چاوی بە کچەتیم حەیرانەکەی دەکەوێ هەڵستێ حەیرانێکی بۆ بڵێ و لە پاشانا بیکا بە بەستە و بڵێ: دەی دەی دەی دەی ... وەی وەی وەی وەی؟! نەخێر و ... سەد جار نەخێر!! شتی وا قەت نەبووە. وەڵلاهی ئەگەر ئەمەی بکردایە کچەکە بەهەردوو دەستانی گەشکەیەکی پێ دەگرت و دەیگوت ".... ئە... خوڕە چەرەت لێدا.. بێ تام!!" حەیرانبێژ بەوە سووک دەبوو. بالۆرە هەیە بەلام ئەمەیان جۆرێکە لە دیالۆگێکی پڕ لەقسەی سەیر سەیر و پلار و ... تەنانەت جنێویشی تێدایە کە کوڕ و کچ بەیەکدی دەڵێن. بەهەرحاڵ، کاربەدەستانی رادیۆ خۆیان داوایان لە حەیرانبێژی داماو دەکرد کە دەچووە سەر ئێزگە داوایان لێ دەکرد پاش چەند حەیرانێک بەستەیەکی گونجاو واتا لە هەمان مەقام بێ بڵێ هەروەک کە لە مقاماتی عێراقیدا دەیکەن. ئەگینا بەخودای لەشان و شەوکەتی

حەیرانبێژ ناوەشێتەوە دەست بە بەستان بکا هەروەک کە لە شان و شەوکەتی لاوکبێژێکی گەورەی وەک کاوێس ئاغا ناوەشێتەوە هەندێ لە لاوکەکانی بە بەیتی وەک: مامر مامر مـامـر یان هات گـەورانە گـەورانە!!! کـۆتایی پێ بێنێ. حەیرانبێژ و لاوکبێژ، بە تایبەتی کە لاوکە درێژەکانی عەگیدی و دڵداری دەگێڕنەوە، رەنگبێ بۆ خۆیان بەستەش بزانن، بەڵام قەت حەیران و لاوکەکانیان بە بەیتە نابڕنەوە چونکە دەوروبەر و جەوی حەیران و لاوک شتێکە، هی بەستەش شتێکی دیکەیە کە پێشتریش باسم لەوە کردووە. بەهەرحاڵ کاک سەعدوڵڵا ئەگەر مەبەستی هەر لە رادیۆ و مەجلیسی ئەورۆکە بێ ئەوا راست دەکا چونکە شتەکە ئەورۆ وا نەماوە وەک من باسی دەکەم دەزانم لەم زەمانە زۆربەی حەیرانبێژەکان چ لە رادیۆی لە کۆڕی برادەران، حەیرانەکانیان بە بەستە تەواو دەکەن. بەڵام حەیرانی رەسەن نە بۆ رادیۆ دانراوە نە بۆ مەجلیسان، حەیرانی رەسەن بۆ شەخسی یار دانراوە و لە دەشت و چۆڵ و گوند و سەر خەرمانان لەژێر ئاسمانی پان و بەرین و شینی بێ پایان دەچڕێ و ناشێ بەستەی لەگەڵابێ.

تێبینی دووەمم لەسەر کتێبەکەی کاک سەعدوڵڵا ئیسماعیل شێخانی دابەشکردنی حەیرانە لە رووی ناوەرۆکەوە. کاک سەعدوڵڵا لە دامەنی لاپەڕە (٦)دا ئەمە دەڵێ "... حەیران لە رووی ناوەرۆکەوە ئەم بابەتانەی خوارەوە دەگێڕێتەوە:

١- دڵداری، ٢- غەریباتی و دابڕان، ٣- ئایینی، ٤- بەختیاری یان پیری، ٥- مێژوویی، ٦- دڵدانەوە و یادکردنەوە، ٧- پێداهەڵدانی منداڵان..." قسەکانی کاک سەعدوڵڵا تەواو بوو.

بەبیرو تێگەیشتنی من ناوەرۆکی حەیران بریتییە لەیەک بابەت ئەویش دڵداری و خۆشەویستییە. ئەو حەوت بابەتەی کە کاک سەعدوڵڵا باسیان دەکات لە راستیدا هەمووی هەر خۆشەویستییە: غەریباتی و لێکدابڕان هەر لەدووری یار و هەوارەوە هەڵدەقوڵێ، حەیرانی بەختیاری واتا پیری هەر نۆستالجیای واتا غەریبی سەردەمی تۆغیانی لاوییە، هی منداڵانیش هەروەها. حەیرانی مێژوویش هەروەکو چەندین جار دووپاتم کردۆتەوە حەیران وەک لاوک نییە چیرۆکی مێژوویی بگێڕێتەوە، کاری حەیران دەربڕینی هەستی خۆشەویستییە نەک گێڕانەوەی سەربردەی مێژوویی. بەڵام هەندێ حەیران هەیە کە ئەویش هەر لەبەر خۆشەویستی ئاماژە بۆ رووداوێکی مێژوویی دەکا بە تایبەتی ئەگەر کوشتنی کوڕە لاوێکی تێدابوو کە یارەکەی لە پاشی بەجێماوە وەک کوشتنی حەبیبی برایاغای دزەیی و کوشتنی مەولودی حەسەناغای گەردی. سەربردەی خۆشەویستی ئەسمەرێ کابایز و مامەراغای زراریش هەرچەندە کە لە حەیرانان ئاماژەی بۆ دەکرێ، راستییەکەی ئەمن پێموایە زیاتر بابەتی بەند و بەیتە نەک هی حەیران بە تایبەتی ئەگەر حەیرانەکە لەبەر خاتری ئەوەی کە چیرۆکەکەی لێ جێ بێتەوە، چیرەی خۆی درێژ بکاو ئیتر لەشێوەی حەیران دەردەچێ، لێرەدا حەزدەکەم ئەوەشی بخەمەسەر کە بابەتی حەیران دەبێ بەیەک تاکە حەیران تەواوبێ، ناکرێ بەشێکی قسەکانت لەم حەیرانە بێ و بەشی دووەم لە حەیرانێکی دیکە. شتی وا لە حەیران نییە و هەر حەیرانێک، واتا ٣ یا ٤ بەند، سەربەخۆیە و هیچ پەیوەندییەکی بە حەیرانەکەی پاش خۆیەوە نییە. هەرچی حەیرانی ئایینییە ئەمەشیان بەلای منەوە لەبنەڕەتدا شتی وا نەبووە. هەر ئەو حەیرانبێژانەی کە ئێستا تۆبەیان کردووە و بوونەتە دەروێش یان سۆفی شێخێک، لەکاتی خۆیدا ئەگەر حەیرانیان گوتبێ ئەوانیش وەک هەموو حەیرانبێژێکی دیکە هەر بەنازدار حەیرانەکەی خۆیاندا هەڵگوتووە، بەڵام کە لە پاشانا تۆبەیان کردووە ئیتر شێخی ئێستایان شوێنی نازدار حەیرانەکەی جارانی گرتۆتەوە و لێرەشدا باس هەر باسی خۆشەویستییە، بەڵام ئەمجارەیان بەرگێکی سەودای عیرفانی واتا تەسەوفی لەبەرخۆ کردووە. وەک ئەم حەیرانەی دەروێش برایمی کە دەروێشی شێخ عەبدولکەریمی دارەخورمای بوو هەزار رەحمەتیان لێ بێ.

### * باشە چۆن حەیران بپارێزین

خـۆی حـەیران زادەی دەوروبەرێکی پاستـۆراڵی روستیکاڵە. واتە دەوروبەرێکی شوانکارەیی و لادێ و ژیانی گوندی.

حەیران لەسەر زەوی سەوزەگیای دەغڵی بەهاران، لەناو هۆبەی رەشماڵی شوانکاران، لەبەر مەڕی، بە رێبواری لەسەر پەرێزێ، لەسەر رەوسە و جۆخینان، لەسەر جووت، لە داران، لە کوڵێ، یان لە غەریباتی دوور لە یار و هەواری خۆت، ئا لە دەوروبەرێکی ئەوهادا حەیران سەری هەڵداوە.

بەڵام ئەورۆ نە مەڕ و مەڕداری، نە جووت و جووتکاری،

نە هاتوچۆی ڕێبواران، نە کیژوکار لە داران، ئەمانە هیچی نەماون و تەکنەلۆژیای مۆدێرن جێگاکەی گرتۆتەوە و، سەرباری ئەوەش، ڕەشبگیرییەکەی ئەنفالی ساڵی ١٩٨٨یش هاتە سەر ئیتر بۆ دەرمان یەک دانە دێ چییە لەو کوردستانی عێراقە چنگ نەدەکەوت. جووتیارێکت نەدەدی، شوان و مێگەلە مەڕێکت تووش نەدەبوو. ئەگەر ئێستاکە تاک و تەرا هەندێ دێهات ئاوەدان کرابنەوەش هەرگیز ئەو دەوروبەرەی جاران و ئەو دیمەنە دڵرفێنەی گوندی بەخشت و قوڕ دروستکراوی پێشان پەیدا نابێتەوە، کورد وتەنی نە ئەو بوار و ئەو هەوار، ئەمڕۆ ئەلەکتریک و بوتڵی گاز کەوتوونەتە هەموو ماڵێکەوە و ژنە لادێیی ئیتر پێویستی بە پووشکە و قەسەر و پەرۆشە و قشپل و ریخ و سەرگین و تەپاڵە نەماوە. زەلامێک نابینی ئەورۆکە بە سواری ولاخ یان بە پیادەیی لەم گوند بچێتە گوندێکی دی و بەرێوە چاوی بە کیژۆڵە دارکەرێ یان کوڵکەرێ بکەوێ و دوو بەندە حەیرانی بۆ هەڵداو، ئەویش هەر بە حەیران جوابی بداتەوە. ئەورۆکە قەمەرە هەیە، ئۆتۆبۆس هەیە، جیب و ماتۆڕ هەن، کە ئەو دولبەر و دڵدارانەی لێک کردووە. حەیران لەسەر تراکتەر و پیکەب و کۆمباین داناندرێ. هەر هیچ نەبێ گرەگرِی ئەو مەکینانە ژنگەکە تێک دەدات و ئەو کەشە رۆمانتیکە دەشێوێنێ. ئەورۆکە کوانێ گۆبەرە، کوانێ کەمبەرە، کوا لاسەرەو پاشەسەرە، کوا گێلگێلە، کوا قۆیتاسە، کوا پلپلە و کوا هەیاسە! کوا بەربەنە، کوا گەردانە! کوا زردی پۆلیە و پاوانە!

حەیرانبێژی داماو چ ماوە حەیرانی پێدا هەڵبلێ و بەهرە و ئیلهامی لەکوێوە بۆ بێ؟!

ئەمانە هەمووی بەسەریەکەوە جاران ئەو دەوروبەرەیان دەئافراند کە حەیرانی لێوە هەڵدەقولا.

لە پاشان حەیران بەزۆری لەلایەن خەڵکی لادێیی سادەو نەخوێندەوارەوە دادەندرا. ئەمڕۆ زۆربەی خەڵکەکە خوێندەوارن. جەوان و جەحێڵی ئەمڕۆ ئەگەر لادێیش بێ، خوێندەوارە و دانانیشێ حەیران بنووسێتەوە بەڵکو نامەیەک بۆ دولبەرەکەی دەنێرێ. خۆ ئەگەر دولبەر و دڵدارەکە دەستی شیعریان هەبێ، ئەوا هەڵبەست بۆ یەکتری دەنێرن. کەس بیری بۆ حەیران دانان ناچێ. لەبەر ئەو هۆیانە، بەبیروبۆچوونی من، حەیرانی نوێ تازە دەستی لێ بشۆ. کە دەوروبەری حەیران بەسەرچوو، حەیرانیش لە ئاوزینگاندا دەبێ وەک گۆمێک کە وشک بکات ئیتر ماسییەکان بێ ئومێد خەریکی دوا هەناسەن.

حەیران کە دەکەوێتە ناو خانەی (SONG ART) واتا گۆرانی هونەرییەوە وەک (لید)ی ئەڵمانی، وەک ئەدەبیات و هونەری کلاسیک لە هەموو کۆمەڵگایەکی جیهاندا عاشق و هەواداری تایبەتی خۆی هەیە، هەموو توێژێکی کۆمەڵگا چێژ لە کلاسیک وەرناگرێ. لە ئەورووپای جاران هەموو کەس نەدەچوونە ئۆپەرا یان کۆنسێرتی مۆزارت، تەنها چینێکی تایبەت هەبوو کە حەزی لەم جۆرە هونەرە دەکرد. حەیرانیش وا. ئەمڕۆ لاوانی جیهان، بە کوردیشەوە، حەز لە شتی تازە بابەت دەکەن. ئەمە شتێکی ئاساییە و بە تایبەتی لە سەردەمی گلۆبالیزاسیۆن، واتا جیهانگیری کە شەپۆلێکی بە گوڕە، هیچ کۆمەڵگایەک خۆی لەبەر پێ ڕاناگیرێ. لەبیریشمان نەچێ کە لە هەر دەورو زەمانێکدا چێژو زەوقی خەڵکەکەش دەگۆڕێ.

بەڵام ئەگەر حەیرانی تازە داندرێ خۆشبەختانە گەنجینەیەکی دەوڵەمەندمان لەم هونەرە ڕەسەنە بۆ ماوەتەوە. جا پاراستنی ئەم گەنجینەیە لە فەوتان ئەرکی سەرشانی شارەزایان و فۆلکلۆر دۆستانی کورد و گۆرانی بێژی لاوی کوردی ئەمڕۆیە. بە تایبەتی ئەوانەی دەشتی هەولێر، کە لەتەک گۆرانییە نووژەنەکانیان حەیرانیش فێربێن و لە ئاهەنگ و کۆنسێرتان، جار جار حەیرانێکیش بڵێن. بەڵام ئاگادارین سەرو گوێلاکی نەشکێنن بەڵکو لەسەر ئسوڵ و دەستووری کۆنی خۆی بڕۆن ئەگینا لەوانەیە نەوەی دوارۆژمان بەچەوتی فێری حەیران بکەن و ڕەسەنایەتییەکەی خۆی پێوە نەمێنێ. مەبەستم ئەوەیە با حەیرانی نوێ چیدی پەیداش نەبێ بەڵام ئەوانەی کە نووسراونەتەوە بەدروستی بیڵێن.

بەلای منەوە، بۆ خۆشەویستکردنی حەیران لای لاوان بۆ ئەوەی ئەم هونەرە کلاسیکە ڕەسەنەی کوردەواری بپارێزرێ و بمێنێ وەکو کلاسیکی ئەورووپاییەکان ڕێزی تایبەتی لێ بگیرێ، پێویستە بەر لە هەموو شتێک حەیران بە لاوان بناسێنرێ. پێویستە لەسەر شارەزایانی ئەم بوارە حەیران شی بکەنەوەو لەهەموو ڕووێکدا هەموو لایەنەکانی وشە بەوشە ڕوون بکەنەوە جا چ بەرێگای کۆڕ و پانێلی (TV) و ڕادیۆ، چ بە نووسین. هەڵبەت باشتریش دەبێ لە پەیمانگاکانی هونەرە جوانەکاندا وانەی هونەری کلاسیکی کوردیش وەک لاوک و بەیت و حەیران و قەتار و ئەڵلاوەیسی و هۆرەو ئی تریش هەمووی فێری خوێندکاران بکرێ و لە سنووری تەسکی

جوگرافی خۆیاندا تێبپەڕێندرێن بۆ ئەوەی بەراستی ببن بە سامانی میللی نەک ناوچەیی و دانیشتوانی هەموو کوردستان تێ بگەن و چێژی لێ وەرگرن.

ئەمن پێموایە لاوانی ئەمڕۆ ئەگەر بەچاکی لە ناوەڕۆکی حەیران بگەن. لە رووی فۆرمی شیعری و فۆرمی هونەرییەوە و لە رووی سێمانتیکەوە واتا لە رووی مەعناوە هیچ گومانم نامێنێ کە شەیدای حەیران دەبن.

لاوانی ئەمڕۆ وا لەحەیران گەیشتوون کە هی پیرانە. بەلام پێچەوانەکەی راستە.

خۆی لە کۆنەوە گوتراوە حەیران پیر نابێ. حەیران سەربردەی ئەڤینی و دڵداری واتا (STORY LOVE) کچ و کوڕی نەوجەوانە. کە ئەمڕۆ پیرەمێردێک یان پیرەژنێک گوێی لە حەیرانێک دەبێ و دلۆپ دلۆپ فرمێسک بە قوولینچکی چاویدا دێتە خوارێ، ئەوە مانای ئەوە نییە کە ئەم جۆرە هونەرە ئاراستەی ئەو کراوە... نا بەڵکو بۆیە دەگری چونکە جەحێڵی و سەردەمی نەوجەوانی خۆی دێتەوە بیر. تۆ ئەگەر بێتو سەیری ناوەڕۆکی حەیرانان بکەیت دەبینی هەمووی هی نەوجەوانانە. بۆ نموونە زەینی خۆتان بدەنە ناوەڕۆکی ئەم چەند بەندە حەیرانە:

بەندی یەکەم:

دووگردکان لە من سێ لکە.

بەندی دووەم:

ئەمن ئەوسارەکە بەوێ دەرەبوارێ گورم دەچاند نازانم نەتالحێ من بوو، نە تالحێ بەژنی باریک بوو رەشە رحان لێی دەکرد پەلکە...

بەندی سێیەم:

ئەوجا دەرێم خۆزگەم بە هەینێکە وەکی لەجێی ژوانێ دەگەیشتینە یەک، ئەمن تازە دام نابوو خەتی سمێرێ ئەتوو تازە داتنا بنێ مەمکە...

دەبا ئەوجا کۆتایی ئەم توێژینەوەیە بەم چەند دێرە هەڵبەستەی عەبدوڵلا گۆرانی نەک هەر شاعیر بەڵکو هونەرمەندیش بێنین کە دەڵێ:

ئەوەندەم بیست لە مۆسیقا خرۆشی رۆحی بێگانە
میزاجی کوردەواریم تێکچووە دەروێش عەبدوڵلا
دەخیلت بم دەسا بەو لاوک و ئای ئای و حەیرانە
شەپۆلی زەوقی میللی پڕ دەرروونی مات و چۆڵم کە
لە بێتهۆڤن گەلێ زیاتر بەرۆحم ئاشنای وەڵلا!
دە ئەی دەروێش سکالایەک لەگەڵ رۆحی کلۆڵم کە.

*** ئەو سەرچاوانەی سوودم لێی وەرگرتوون بۆ ئەم توێژینەوەیە:**

١- محەمەدی مەلا کەریم: کۆمەڵێک لاوک و حەیران.
٢- حەمەی حەمە باقی: کورتەیەکی مێژوویی مۆسیقای کوردی.
٣- عوسمان شارباژێری: گەنجینەی گۆرانی کوردی.
٤- سەعدوڵلا ئیسماعیل شێخانی: سەربردەی کۆمەڵە حەیرانبێژێکی کورد.
٥- ئەحمەد حەیران، دیوانی حەیرانبێژان.
٦- ئاوازی ئەحمەد حەمەدەمینی دزەیی: فۆلکلۆری کوردی لە ناوچەی دزەییاندا.
٧- ئەحمەد عەبدوڵلا زەرۆ: سترانا لیریکی حەیرانۆک.
٨- عەبدولکەریمە فەندی: زاراڤێت فۆلکلۆری، گۆڤارا پەیڤ، هەژمار ٣/١٩٩٦
٩- بەشیر بۆتانی: حەیرانۆک.
١٠- خالید جووتیار: گوتار یێک لەسەر حەیران لە گۆڤاری بەیان ژمارەیەکی کۆن لەبیرم نەماوە هی چساڵێکە.
١١- چاوپێکەوتنێک لەگەڵ حاجی ئەحمەد سەعاتچی، گۆڤاری رەنگین، ئۆگەستی ١٩٩٥.
١٢- پرسیار و وەرام بەنووسین لەگەڵ یەکێک لە حەیرانبێژە هەرە بە تواناکانی دەشتی دزەیی، کۆچکردوو جەمیلی عەلیاغای دزەیی.
١٣- ئەوانە و کۆلێک کاسێتی حەیرانبێژە ناسراو و نەناسراوەکانی کورد. هەروەها ژمارەیەکی زۆر لە کتێب و سەرچاوەی ئەوروپایی و ئەمریکایی کە لەسەر میوزیکی کلاسیک سوودم لێ وەرگرتوون.

سەرچاوە:

- هەوڵێک بۆ تێگەیشتنی حەیران، هۆمەر دزەیی، لە بلاوکاوەکانی سەنتەری راگەیاندن و بلاوکردنەوەی خاک.

**- وێنە دەستکردەکان،کاری هونەرمەند رۆستەم رەسول ئاغالەیە**

# هەولێر لە کۆڕ و مەجلیسی حەیرانبێژیدا

**پیرداود مەخمووری**

ڕەنگە قسە کردن لەبارەی فۆلکلۆر و کەلەپووری نەتەوەییمان زۆر لەوە ئاسانتر بێت کە ئەمڕۆ لەم مەیدانەدا کاربکات. مرۆڤی کورد هەر لەو ڕۆژەی کە پێی ناوەتە ئەو هەسارە زەبەللاحە و لەو کوردستانە هەزار بە هەزارەدا جێگیربووە، هەر ماشەڵلای پێ دەوێ، کە چۆن خۆی پاراستووە و کەلەپوورەکەی زیندوو ڕاگرتووە، لەگەڵ ئەوەی کە زمانەکەی پاراستووە هەر بەمشێوەیەش توانیوەتی هونەری گۆرانی بپارێزێ، لە پێش هەمووشیاندا هونەری حەیران، کە ڕەنگدانەوەی ژیانی کوردەواری تێدا بەدی دەکرێ.

گومانی تێدا نییە کە خەسڵەت و تایبەتمەندی حەیران لەوەدا بەدیار دەکەوێت کە سۆزێکی لە ڕادە بەدەری ناخە و مرۆڤ لە گوێگرتنیدا هەست بەجۆرە یەکانیەتێک و سەربەخۆییەک دەکات.

کورد دەڵێ: (حەیران و ساوار پیرنابن)، دیارە ڕەسەنایەتی هونەری گۆرانی و مۆسیقای کوردی بۆ سەردەمانێکی یەکجار درێژ پێش ئێستامان دەگەڕێتەوە، هەر لەو کاتەی کە مرۆڤی کورد ئەرکە پیرۆزەکانی ئەنجام دەدا و لەدەدخەمەو شوێنەکانی خواپەرستی (گاتای) زەردەشتیان دەخوێند، هەر بەبەردەوامی مایەوە تا ئەو کاتەی (یارسا)ی ئەهلی هەق هاتە وجود و ئەم جۆرە گۆرانی و سۆزە بە پێی سەردەم گۆرانی بەسەردا هات.

ئەگەر بەروانینێکی زانستیانە سەیری هونەری حەیران بکەین و سەر هەڵدان و بابەتە دەروونیی و دەرهاویشتەکانی شی بکەینەوە، ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە، کە حەیران جۆرە هەڵدان و موناجاتێکە حەیرانبێژ بە جۆرە سۆزێک دەیخوێنێ، هەندێ جار وەک دەڵێن: بەرد بە قسە دێنێ، کە لەگەڵ بارودۆخ و گۆزەگۆزی کوردانداگۆڕانی بە سەردا هاتووە.

من لەم بابەتەمدا کە تایبەتە بە حەیران و حەیرانبێژانی هەولێر، نامەوێ باسی پەیدابوونی حەیران بکەم و لەسەربردەی حەیران بدوێم، ئەوەیان بۆ باسێکی دیکەی سەربەخۆ هەڵدەگرم کە چۆن حەیران لەو پیرە هەولێرەو لەو دەشتە کاکی بە کاکییەی پەیدا بووە و پەرەی سەندووە و لە تخوبی هەولێر تێپەڕی ناوی یەک حەیرانبێژت بەرگوێ ناکەوێ، بۆیە بەدڵنیاییەوە دەڵێم (حەیران تاپۆی هەولێرە) و وەک دوو جمکە لێکدی جودا نابنەوە. با بێینە سەر کرۆکی باسەکەمان، کە بەسەر کردنەوەی چەند حەیرانبێژێکی جارانی دەشتی هەولێرە، کە هەندێکیان ئەگەرچی چوونەتە بەر دلۆڤانیەتی خودێ، وەلێ هێشتا دەنگ و سەدایان زیندوو ماوە و لە کۆڕی حەیرانبێژیدا ناویان بە زێر نووسراوە و لە گەرمکردنی کۆڕ و مەجلیسی پیاوماقوڵان و دیوەخانەی خانەدانان، لە کۆڕ و بەزمی گەڕەلاوژەی جاران، حەیران دەوری سەرەکی هەبووە،

ئەمەش سەرەڕای ئەوەی لە هەموو خۆشی و ناخۆشیشدا هەمان دەوری گێڕاوە.

جاران لە كوردەواریدا هەر كەسێک دەستڕۆیشتوو بوایە، یان هەر یارم كوێخوایەک بوایە، دیوەخانە و نان بدەری دەكرد، دیارە گوێندەبێژ و حەیرانبێژی خۆی هەبووە.

شتێكی دیكەش هەیە نابێ لەیاد بكرێ، ئەویش ئەوەیە، كە ئەو كەسەی لە نزیكەوە هاموشۆی كۆڕ و مەجلیسی حەیرانبێژان و حەڵقە و زیكری دەروێشانەی هەبێ، ئەوا زۆر كەرەت گوێبیستی سۆزی حەیرانێک دەبوو كە لەكاتی حاڵگرتندا یەكێک لە دەروێشەكان دەستی لە بناگوێی دەنا و بەهەموو روحەوە باڵی دەگرت و رووی لە ئەسلی مەقسەد دەكرد، پاڕانەوە و موناجاتی خۆی بۆ ئاسمانەكان بەرز دەكردەوە، حەیرانەی دەروێشانە بە جۆرە سۆزێک دەگوترێ، كە یارم جیاوازیی هەیە لە گەڵ هەڵدانی جۆرەكانی دیكەی حەیران، دەروێش "برایمی لهێبان" لە حەیرانێكدا دەڵێ:

**«حەیران خۆزی بە خۆزی داران!**
**گورەک بام لە گورێ نەورۆزێ،**
**شێن ببام لە سەر كێوی عەرەفات رۆژی عارفەی،**
**وەكی خیوەتێ حاجیان هەردەدا لەو مقامێ عەرەفاتێ لە ناو غوبارو تۆزێ،**
**ئەی گەلی موسلمانان دەیاللا بە عام بچینە خزمەتی شاهی مەدینەی ئەحمەدی موختار،**
**لەوێ لەگەر عەزیز و خۆشەویستان بكەین جەژنە و پیرۆزێ».**

جاران لە كوردەواری خۆماندا هونەر بەگشتی، حەیران و لاوک و گۆرانی بە كارێكی ئەنگ و شورەیی دەژمێردرا، بەڵام دەتوانین بڵێین ئەو شتە حەیرانبێژی رەسەنی نەدەگرتەوە، زۆر جار حەیران و حەیرانبێژیان بە گوڵی مەجلیسان دادەنا، هەر ئەوەش بووە هۆی تۆمار نەكردنی دەنگی زۆربەی حەیرانبێژە رەسەنەكان و ئەگەر دەماودەم حەیرانەكانییان گوترابێتەوە، ئەگینا حەیرانەكانیش بە دەردی ئەوان دەچوون، هەر وەک دەنگی وەستای حەیرانبێژان (سەیدە كۆرە و حەمەد مەندۆ) تازەش كار لە كار ترازاوە ئەو بابەتەی لێرەدا دەكەینەوە بیبلۆگرافیایەكی حەیرانبێژانی دەشتی هەولێرە، تەنها ئەوانەی ناو و دەنگیان باوە و جێ پەنجەیان لە مەیدانەكەدا دیارە و توانراوە لە هونەر و ئەدەبی سەر زارەكی بگوازرێتەوە سەر ئەدەبی نووسراو.

دەگێڕنەوە زۆر لە حەیرانبێژەكان جگە لە كۆڕ و دیوەخانەی پیاوماقوڵان لە چایخانە و قاوەخانەی ئەو سەردەم كۆڕ و مەجلیسیان گەرم دەكرد بە حەیرانە خۆشەكانیان سەرنجی خەڵكیان رادەكێشا.

(ئەحمەد حەیران) لە كتێبی (دیوانی حەیرانبێژان) جگە لەو سێ حەیرانبێژەی لە سەری نووسیون، ناوی چەندین حەیرانبێژی دیكەی رێز كردوون، لەوانەش چەند حەیرانبێژێكی ئافرەتیان لە گەڵدایە.

حەمەد بەگی، محەمەد حوسێن پیركی، حەمەدەمین سمایل فەلاح، عوسمان حەیران، كەریم عەولارەسوڵ ناوبانگ بە (كەریمە رەش)، خدر قادر رۆژبەیانی، حەمەدەمین مەلاقەرە، خدرۆكی هەمینە سۆری، عەبدوڵلا حەمەدەمین، مستەفا كۆری خۆشاوێ، سەعدی حوسێن، شەریف قادر، عوسمان حەسەن باپیر، كەریم ئەسعەد فەتاح، عومەر كارەسور لە گوندی سێقوچان، مستەفا عەولا كارەش لە گوندی كەندارەقەل، حوسێن عەلیاغا لە گوندی قەپران، جەمیلی عەلۆی لە گوندی پەركانە، مەجید جبرایل لە گوندی تریەسپیان، قوشەی فەقێ عەزیز لە گوندی شەنەغەی، خدر عەلی لە گوندی خەرابەدراو، محەمەد عوسمان، عەلی پیرەش لە گوندی پیرەش، عومەر گاوەرەیی بناری قەرەچووغ، مەحمود سەید بەسێ لە گوندی باشتەپە، خدر حەیران لە گوندی گردگراوی قەراج، عوسمان پاقلاود لە هەولێر، حاجی نەجیم حەمەدەمین لە گوندی تریە سپیان، خدرە كۆر لە گوندی باقرت، دەروێش قادر لە گوندی مەلا قەرە، عوسمان هەمەوەندی لە گوندی گردەسۆر، هەروەها كاک ئەحمەد حەیران چەند ئافرەتێكی حەیرانبێژی ناونووس كردوون، كە بەراستی حەیرانبێژ و سەردولكەزانی بە توانا بوون، بەڵام لە بەر هەندێ باری كۆمەڵایەتی دەنگیان نەماوە و تۆمارنەكراوە، كە ئەم حەیرانبێژانەن:-

(عەیشێ عەبدوڵلا سنجاوی لە گوندی عاللا، حەلیم بادینی لە گوندی قەپران، ئامینە كولندە لە گوندی باقرتی قەراج، زولێخا محەمەد ساڵح لە گوندی خەزنەی

کەندێناوە، عەیشێ رەحمان میکائیل لە هەولێر خێزانی عوسمان حەیران، زبێدە عەباس لە گوندی شۆڕە زەرتکە، شەمام مەحموود لە گوندی مەلا کاغە، سۆتە بندیان دێمەکار، فاتە سۆرێ حەمەد عەلی لە گوندی خۆشاو).

هەروەها برای فۆلکلۆریست سەعدوڵلا شێخانی لەکتێبی (سەربردەی کۆمەڵە حەیرانبێژێکی کورد) سی (٣٠) حەیرانبێژی رەسەنی کوردی ناونووس کردووە و لە ژیانیانی کۆڵیتەوە، کە بەراستی ماندووبوونێکی زۆری تێدا کێشاوە.

(جەمیلی عەلیاغای دزەیی، حەمەدەمین حەیران نانەکەلی، خدر خەرابە دراوی، حوسێن کێشکی، سەعدی عەلی، خورشیدی فەقێ عەزیز شەنەغەیی، مەحمود سەید بەسێ، خدر گردگراوی، حەمەد بەگی، جوامێر قەشقەیی، حوسێن عەلیاغای دزەیی، مەحموودی عیسمەتێ، رەسول گەردی، حاجی تەها بانی مارانی، عوسمان هەمەوەندی، دەروێش برایمی لهێبان، گردەشینەیی، سمایل گردە سۆری، درویش قادر خەرابەیی، سمایلە سۆری بانی مارانی، بەدیعە حەمەد مەغی، دەروێش حەسەن حەریری، مەلا ئەحمەدی کۆری کۆیی، جەوهەر جەمیل گردەسۆری، سەعید باداوەیی، عومەر گاوەرەیی حەسەن حەیران تەلەرخێمی، مستەفا حەسەن خەزنەیی، محەمەد ئۆمەراوەیی، دەروێش عومەر شێخ شەروانی) هەروەها کاک خالید جوتیار لە کتێبی (حەیران و مەرگی غەریبان) ناوی چەند حەیرانبێژو دەقی حەیرانی نووسیوە، کە ئەمانەن:

(حەسەن حەیران، حەمەد بەگی، عوسمان حەیران، خدر حەیران، رەسول گەردی، حەمەدەمین حەیران، عوسمان هەمەوەندی، عومەر گاودرەیی، مستەفا حەسەن خەزنەیی، سەعدی عەلی، حاجی نەجیم تریەسپیانی، دێوانە محەمەد تریەسپیانی، سەلام حەمەدەمین پەرێ، مەغدید حەمەدەمین پەرێ، قادر حەمەدەمین پەرێ، مەحموودی سەید بەسێ، مەحموودی عیسمەتێ، خدر خەرابەدراوی، جەمیلی عەلیاغای دزەیی، حوسێن عەلیاغای دزەیی، فارس عەلیاغای، حەمەد عەلی، ئیسماعیل حاجی، دەروێش عومەر شێخ شەروانی، سەعید باداوەیی، قوشەی فەقێ عەزیز شەنەغەیی، سمایل گردەسۆری، قادر دوکەرەیی، حاجی جوامێر..)

هەروەها ناوی چەند ئافرەتێکی دیکەی نووسیوە، کە ئەوانیش لە گۆڕی حەیرانبێژیدا رۆژێک لە رۆژان دەنگ بوونە، کە ئەمانەن:

(بەدیعە حەمەد کەردزی، خەجێ سەرورەێ، فاتمێ سەرورەێ، عەیشێ حەمەدۆکی، ئامەی زێخە، عەیشێ سلێمانی، بەدیعە برایم سەرگەڕانی، عەیشانێ عەزیزی کەنداری، دۆتمامێ عەولا چار بەردەیی، نایلەی ئەحمەد ئاغای مێهدی، زرێخ عەولا قادر دڕکەیی و چەندانی دیکە).

هەروەها مامۆستا عومەر شێخەڵلا دەشتەکی لە کتێبی (داستان و گۆرانی لە فۆلکلۆری کوردیدا)، ناوی چەند حەیرانبێژێکی نووسیون، کە ئەمانەن:

(شای حەیرانبێژان سەیدە کۆر، دادە ئامینە، حوسێنی سمایل لاکێشی، ئەحمەدی تاژدینی، حەمەد بەگی، سمایلە کاکەی چیغلۆکی، خدرۆکی عاللای، جەلالی هۆرێ، شێمحەمەد عەزیز، کاکەرەزای بندیان، حەمەدەمین پیرداود خارەک، عەلی حەسەن خۆخێ، عوسمان حەیران، خدر حەیران، مستەفا حامید و ئەحمەد خدر)

**حەیرانبێژ: حەسەن حەیران تەلەرخێمی:**

ناوی تەواوی (حەسەن قادر خەلیل برایە) گەورەیە، لە گوندی تەلەرخێمی گەورەی سەر بە ناحیەی (گوێڕ) لە ساڵی (١٩٣٧) لەدایک بووە.

چەندی بلێی دەنگ و سەدایەکی دلڕفێنی هەبوو، لاوک و حەیرانی وەستایانە زانیوە، لە (نای و دووزەلە و شمشاڵ) ژەنیدا بێ هاوتا بووە.

لە کاتی حەیران گوتندا خۆی نای دەژنی، لەبەرئەوەی گەنجێکی زۆر دڵتەڕ بووە، زۆری حەز بە سەیران و گەشت کردووە.

یەکێکە لە حەیرانبێژە هەرە بەناوبانگەکانی کورد بوو، بەڵام حەیف و مەخابن مەرگ مەودای نەدا لە هونەرەکەی بەردەوام بێ، ئەوە بوو لە گەشتێکدا لە نێوان شاری نەغەدە و ورمێ، لە رۆژی (١٩٨٤/٦/٢٢) بەهۆی کارەساتی ئۆتۆمبێل وەرگەڕان گیانی پاکی لە دەستدا.

لە پاش مردنی چەندین کاسێتی تۆمارکردووی بەجێهێشتووە.

«چەندی گازدەکەم و گازدەکەم دەرێم: خۆزی بە خۆزی داران!
دەبا ئەمن کوریکەک بامایە لەکوریکێ لەیلایێ،
ئەوەل فەسڵی دەرە بواران شێن بیاما لەسەر قەراتی پیرە هەولێرێ،
هەمـوو دانی سبـەینان دەبا بەرێ خـۆم داپایە هەردوو دەرکەی سەرایێ،
ئەمن دونێ لە مـەرکـەزی ژوانێ گـەیە دوو چاوێ بەرەک،
لە من وابی خەبەرەکیان دەدامێ،
لەمن وابی دەگەمە مراز و مەخسودێ،
ئەمن نەمدەزانی لە پێیانم دەکەنەوە سندانێ،
لە دەستانم دەکەنەوە کەلەمچێ،
گەلە بەدرەکی غـەمبـار دەمنێرنە حەفت قۆناغ لە خوار بەغدایێ».

**حەیرانبێژ عومەر گاوەری**

ناوی تەواوی ( عومەر حوسێن مەحموود)ە، لە ساڵی (١٩٠٧) لە گوندی سێبیرانی گەورەی ناوچەی بەڕانەتی لە دایک بووە.

لە تەمەنی (١٥) ساڵیدا هەستی بەخۆی کردووە کە حەزی لە حەیرانە، جگە لە حەیران، لاوک و مەقامیشی دەزانی، سوودی لە (حەمەد بەگی و مەحموودی سەید بەسێ) وەرگرتووە، لە (ڕەسول ئاسکی) خاڵی فێری حەیران گوتن بووە، دەنگی حەسەن حەیرانی بە دڵ بووە، عومەر گاوەرەیی دەڵێ: لە کۆڕی حەیرانبێژیدا ئەوانە وەستان (حەمەد بۆشناغ، حەمەد بەگی، خدر حەیران، عوسمان حەیران، حەسەن حەیران)ن.

هەروەها دەڵێ:

ئەوکەسەی ئاشق نەبێ نازانێ حەیران بڵێ.

لە مردنی حەسەن حەیرانی جوانە مەرگ، بە حەیرانێکی لاوانەوە بەشداری دەکات و دەڵێ:

«حەیران گۆتمە درێ خۆ لۆ وەها کەسادی،
بوارە باپچینە بێژینگ بە سەری
تێکەر بە کوریکێ نیسانی لەگەر کوریکێ فەرهادی،
گەلە حەیف و مخابنێ دنیایێم دەمینێ لە بۆ چاوی
(حەسەن حەیرانی) کەتە بن خاکی گۆڕ بەبێ مرادی».

**حەیرانبێژ جەمیل عەلیاغای دزەیی**

ناوی تەواوی (جەمیل عەلی خورشید بایز ئاغا)یە، لە ساڵی (١٩١٠) لە گوندی قەپرانی سەر بە کەندیناوە لە دایک بووە، لە هۆزی دزەییە، لە حەیرانبێژاندا دەنگی (حاجی جوامێری) لەلا پەسند بووە، هەروەها حەزی لە دەنگی (زایەر مام زێندین و حوسێن عەلیاغای برای و حەسەن حەیرانی) کردووە.

هەتاکو دوا ساڵەکانی ژیانی لە حەیران گوتندا بەردەوام بووە، ئەمە یەکێکە لە حەیرانەکانی:

«حەیران لە گردی گۆمێ، بەژن برندێ بەیداغی رۆمێ،
لە بۆ من بڕێنە داکی حەیرانێ
گـەلـەکی چەکـان بەنازدار حـەیرانێ وەنەکـا، ناسکە نەوەک بەژنی بچۆمێ»

**حەیرانبێژ حەمەدەمین حەیران نانەکەلی**

ناوی تەواوی (حەمەدەمین ئیسماعیل نادر)ە، لە ساڵی (١٩١٤) لە گوندی گەرەسۆری نزیک شارۆچکەی مەخموور لە دایک بووە.

یەکێک لە خاسیەتەکانی ئەو حەیرانبێژە ئەوەیە، هەموو حەیرانەکانی لە جۆری سەر چیایین، دەنگی ئەم حەیرانبێژانەی بەدڵ بووە و لەزۆربەی کۆڕ و مەجلیسان بەشداری کردوون لە حەیرانبێژیدا،

(حاجی جوامێر، مەحموودی سەید بەسێ، خدر عەباس سنجاوی، حەمەد بەگی، خورشید فەقێ عەزیزی، حەسەن حەیران، عومەر گاوەرەیی، عوسمان حەیران، خدر خەرابە دراوی) کاسێتی تۆمارکراوی هەیە، ئەمەش نموونەیەکە لە حەیرانێک:

«حەیران لە نۆمەراوێ،
چەند شلک و ناسک و نازداری، چاوت رەشە گەردەنت زەردە، پەرچەمت خەنەی پێ ناوێ،
کیژدەرێ: هێتیمە لاوە، وەرە ئەوسار زەندەیێ
بە بازن بگرە بەکێلێ کوێستانێ
هاوینان دەشـتی هەولێـری گـەلەکـە گـەرمـایە نەوەک ڕوومەتی سۆری گورگوری سیس بن لەبەر هەتاوێ».

**حەیرانبێژ حەمەد بەگی**

ناوی تەواوی (حەمەد ئیسماعیل ئەحمەد دیوانە)یە، لە نێـو خـەڵکی بە حـەمـەد بەگی ناسـراو بووە، لە سـاڵی (١٩١٢) لە شـارۆچکەی مـەخـمـوور لە دایک بووە، لە ساڵی (١٩٣٠) دەستی بە حەیران گوتن کردووە، حەمەد بەگی لە سـاڵی چلـەکان چەند کاسێتێکی لە چاپخانەی (مـەچکۆ) تۆمـار کـردووە، لە (١٩٥٤) لە چاپخـانەی (ئەحمەد ئاغا) لە کەرکووک کاسێتێکی تۆمار کردووە. ئیسماعیل ئەحمەد دیوانەی باوکی حەیرانبێژ بووە،

حەمەد بەگی دۆستایەتییەکی باشی لەگەڵ حەیران بێژان هەبووە: (رەسـول گـەردی، خـدر حـەیران) هەروەها لەگـەڵ مامۆستا تایەر تۆفیقیش بەینیان خۆشبووە.

لە (١٩٧٦/٧/٢١) دڵە پڕ حـەیرانەکـەی لە لێـدان دەکەوێ لە گۆڕستانی شێخ محەمەد لە مەخموور دەنێژرێ، ئەوەی دەنگی حەمەد بەگی لە دەنگی حەیرابێژەکانی دیکە جیا دەکاتەوە ئەوەیە، کە تۆنی دەنگی یەکجار بەرز بووە، جارێکیان لە دەرکی بازاڕگەی مەخموور حەیران دەڵێ، لە مـەخـمـوور گـوێیـان لە دەنگ و سـەدای دەبێ کـە ئەو مابەینەش (٢-٣)کم دوور دەبێ.

حـەمـەد بەگی خـاوەن ڕێچکەیەکی تایبـەتی بووە لە حەیرانبێژیدا.

ئەمەش نموونەیەکە لە حەیرانەکانی:

**«کاکە، خزمینە، ئەمن دەرێم ئەستێرەکم لێ هەرات لە تاقی عاسمانێ،**
**مەرۆ ناتگەمێ گەردەن کێل، شەوقی خۆی دەداتەوە لە سەرێ حەسەن موتریب و دار دێدەوانێ،**
**خزمـینە دەرێم لە کـاکـینگۆ سـۆردەکـاتەوە چەولنگی پردێ،**
**لەگـە دار شـیـلانێ، ئەوجـا ئەمن شـەدەکی لۆ بەژنی باریک و قـەدو قـامەتەکی شلک دەکرم لەخمێ کارخـانێ،**
**مـاینەکی دەدەم لۆ گورینگ لێنانی، هەسپەکی دەدەم لۆسیم پێچانێ**
**ئەورۆ سەرێ چەند ڕۆژانە، کاکە، خزمینە، حەیرانەکەی من لێم زیزە لەسەرێ تانێ...»**

**حەیرانبێژ خدر خەرابەدراوی**

ناوی تەواوی (خدر عەلی قـادر)ە، لە هۆزی بلـباسـە، سـاڵی (١٩١٤) لە دایک بووە، جگە لە حەیران، بەستەو مەقامی دروونەو ساوار کوتانەوەی زانیوە، چەند بەیتێکی فـۆلکلۆری زانیـوە وەک، (زەمبـیل فـرۆش، ئایشـە گـوڵ.. هتـد)، دەنگی حـەیرانبـێژان (حـەسـەن حـەیران و سـەعـیـد عەولای قەڵانچۆغانی) لەلاخۆشبووە.

خـدری حـەیرانبـێـژ دەڵێ: سـەرەتای دەست پێـکردنم بە حـەیران لە مـیـری حـەیرانبـێـژان سـەیدە کـۆر فـێـربووم، سێ کـاسـێـتی تۆمـارکـراوی هەیە، ئەمـەش نموونەیەکـە لە حەیرانەکانی.

**«لە بانی بانیان لە بانی کۆیێ،**
**کـیـژ دەبا بەژنت لەبۆ من بمینێ بە شـەترە نەمـامـەکـانی شێن دەبی لە وراتێ خـالیس و مـەندەلی، لەسـەران دەگـرن نارنجە لەبنان دەگرن زەردە لیمۆیێ،**
**وەڵلاهی ئەگـەر سێ ماچان وەرگرم لەگەردەنێ زەرد خۆم نادەم، سەد جاران بەخوای قەسەم، بە حاکمی زاخۆیێ»**

**حەیرانبێژ عومەر شێخ شەروانی**

ناوی تەواوی (عـومـەر رەسـول مـام شـێـخ)ە. لە سـاڵی (١٩١٨) لە گوندی شێخ شەروان لە دایکبووە، کەس نییە بەیتی (تورگـە تورگـە)ی عـومـەر شـێخ شـەروانی گـوێ لێنەبووبێ، دیارە ئەو بەیتـەش سـەربردەیەکی دوورو درێژی هەیە.

جگە لە حـەیران، شـاعـیـرێکی مـیللی بەتوانا بووە. حـەیرانەکـانی کـورت و پڕ واتان. لە کـۆڕی حەیرانبـێـژیدا دەنگی (حـەسـەن حـەیران و سـەعـیـد بادادوەیی و سـەعـیـد سـەلیم دۆلەبەکـردیی و عـوسـمـان حـەیرانی) بەدڵ بووە، ئەمەش نموونەیەکە لە حەیرانەکانی:

**«حەیران لاجان بە چەرخە،**
**لەسەری مەرەو لەبنی بەرخە،**
**حەزلێکردنێ من و کـچـەتیم حـەیرانێ، حەزلێکردنی خاتوون ئەستی و شێخ فەرخە».**

**حەیرانبێژ محەمەد ئۆمەراوەیی**

ناوی تەواوی (محەمەد عەبدوڵلا باپیر ئیسماعیل)ە،

لە هۆزی باڵەكە، لە ساڵی (١٩٤٠) لە گوندی ڕێزان لە دایكبووە.

محەمەد ئۆمەراوەیی لە كۆڕی حەیرانبێژیدا، حەسەن حەیران و عوسمان حەیرانی بە دڵە، دەڵێ ئەو دووە سەر دەستەی حەیرانبێژانن.

چەندین حەیران و لاوك و بەستە و مەقامی لە كاسێت تۆمار كردووە، پتر لە (٥٠) پەنجا كاسێتی لە بۆنە و جەژنەكان تۆمار كردووە.

**«حەیران بریندارم، برینی كەون و نوم پێكەوە كولاوە،**
**سەبارەت بەبەژنەكی باریك، بووێە ماسیەكانی دەرمان خواردی كەتیمە لە دەو ڕووبار و ئاوە،**
**ئەگەر مردم نەرێن درەنگە،**
**قەبرێ من لێدەن لەمابەینی سینگ و مەمكی حەیرانی، لێمەدەن بە كورینگ وبێرە، بیرازی گەلەك تەنگە،**
**خەبەرەكی لەبۆمن بدەنە حەیرانێ، با لەبۆم بگرێ گەلەك بەئاوازو دەنگە».**

**حەیرانبێژ مستەفا كۆری خۆشاوێ**

ناوی تەواوی (مستەفا خدر شێروانی)یە، لەساڵی (١٩٣٩) لە گوندی خۆشاوێ لە بناری قەرەچووغ لە دایك بووە، بە هۆی نەخۆشی لە دنیا بینێ بێبەش دەبێ.

مستەفا كۆر جگە لە حەیران، شایەرێكی میللی بەتوانا بووە، چەندین هۆنراوەو بەستەی بۆشایی هەیە.

لەساڵی (١٩٦٤) سێ كاسێت بۆ تۆمارگای عەبدوللەتیف تۆمار دەكات، حەیرانەكانی هەمووی لەدانانی خۆیەتی، لەزۆربەی حەیرانەكانیدا ڕەوانبێژی و هونەری شیعری تێدایە، لەكۆڕی حەیرانبێژیدا دەنگی (حەمەد بەگی و عوسمان حەیرانی) بەدڵ بووە.

ئەمەش دەقێكی حەیرانەكانیەتی، كە دەڵێ:

**«ئەرێ براینە، چەندم گاز دەكرد، نەمدەگۆ قەراتی پیرە هەولێرێ لە من دێمە،**
**ئەو سارەكە بەوێ دەرە بوارێ، حەیرانەكەم لە گێیانی گوارەدا، چاوەكەم دەرێم لە كەپوانی خەزێمە،**
**ئەو سارەكە سەرێ حەفت سارە، سەبارەت بە حەیرانێ بەرەبەنی لێمە،**
**كیژدەرێ: كورەتیمە حەیران، لەگەر كۆمەرەكێ براو برادەران وەرە كن بابم ماریژگەت وێران بێ،**
**دەوجە دەرێ، ئەگەر ئەمنی نەدایێ،**
**بەقەبری شێ عەلی، بەدوانزدە ئیمامان شەو لە سێ بارێ نیوە شەوێ، بەگرێیێ چارۆكێ لەگەرت دێمە»**

ئەمەش پارچە هۆنراوەیەكی میللی ئەم شایەرەیە:

**لەرەو ڕەوێ وەردەكان — هەردەفڕن نابەن ڕەوێ**
**لۆلای ماریان وادەچووم — لە محەلی نیوە شەوێ**
**یارم شیرن نووستبوو — كورتێ چاو بارەكەوێ**

**حەیرانبێژ حوسێن كێشكێ**

ناوی تەواوی (حوسێن حەمەددەمین ئیسماعیل خۆشناو)ە، لەساڵی (١٩١٨) لەگوندی كێشكێ خۆشناوەتی لەدایك بووە، لەتەمەنی (هەرزەكاریدا) هەولی فێربوونی حەیرانی داوە، لە گەڵ حەیراندا لاوك و بەستەو مەقامیش دەڵێ:

مام حوسێن كێشكێ دەڵێ لە حەیرانبێژیدا سوودم لە سەیدە كۆرە وەرگرتووە، بەڵام لەلاوك بێژیدا لاسایی (كاوێس ئاغا و عەزیز ئاغا) دەكەمەوە.

مام حوسێن كێشكێ خوا تەمەنی درێژكا، ئێستاش لەژیاندا ماوە، دەنگ و سەدایەكی بەتوانای هەیە، چەندین كاسێتی بۆ ئێزگەو تەلەفزیۆنەكان تۆمار كردووە، لەگەڵ تیپە مۆسیقییەكان بەردەوام بەشداری دەكات لە بۆنەو جەژنە نەتەوەییەكان..

ئەمەش نموونەیەكە لە حەیرانەكانی:

**«ئەستێرەكم لێ هەرات وەختی عیشایێ،**
**شەوقی خۆی دەدا لەگومبەتی شێخەڵلای هەولێرێ، لەحەمامی حاجی قادری، زۆر جوان دەداتن لە حەوشی سەرایێ،**
**ئەسمەرێ عەلی كابایزی دەیگوت گەلە حەیفم دەمینێ**
**لەبۆ بابێ جەمیل و مەجیدی، كەتیتە بەندیخانێ لەبۆم نایەتە دەرێ بەماری دنیایێ».**

**حەیرانبێژ سەعدی عەلی**

ناوی تەواوی (سەعدی عەلی ئیسماعیل)ە لەساڵی (١٩٢٥) لەشاری هەولێری دێرین لەدایکبووە، دەنگێکی بەسۆزی هەیە، کە ناوی سەعدی عەلی دێتە کۆڕی حەیرانبێژان، دەبێ ئەستێرەکم لێ هەرات لەلای یەمەنێ» بێتەوە. یاد سەعدی عەلی دەڵێ: لەحەیرانبێژی سوودم لە (حوسێن رەشید سەر بەشاخی و شەریف گەزۆی مەخمووری و شێخە کۆری بیتوێنێ) وەرگرتووە، چەند کاسێتی تۆمار کراوی هەیە، لە رادیۆ و تەلەفزیۆن گۆرانی تۆمار کردووە. سەعدی عەلی ئێستاش لە ژیاندا ماوە.

ئەمەش نموونەیەکە لە حەیرانەکانی:

**«حەیران گەوارەکی داهێنا چەند رەشی تاری،**

**دەگەڵ بەژنی باریک دەچوومە دەرێ لەکاولە مەفتەنێ**

**هەردووکمان دوعامان دەکرد خوایە خۆشی کەی نەکو بباری،**

**لەمنی تەردەکردەوە هەرەتی قەرەبێتک و قەرەبۆتکان**

**کلکەیێ دارە بزماران، مەخلەت و مەخلەتان،**

**زورگێ مەخسوودان گەرێ شاسواری،**

**ئازیکەندێ بندیانان، قەپەکێ مام خاران،**

**گردە سۆری سیانان، باغەرشۆری دزەییان،**

**لفکە شۆری گەردیان قۆندەرە زرۆقی هەولێریان،**

**لەمن تەر دەکا سەرو پەرچمێ پیرەش و کەسنەزانی».**

**حەیرانبێژ عوسمان حەیران سنجاوی**

ناوی تەواوی (عوسمان خدر جەرجیس)ە، لە ساڵی (١٩١٧) لە گوندی چەغەمیرەی کەندێناوە، لە دایک بووە، لە ساڵی(١٩٦٨) کۆچی دوایی کردووە، باوکی هونەرمەندی حەیرانبێژ (عارەب عوسمان)ە، عوسمان حەیران چەندی بلێی حەیرانبێژێکی بە توانا و بەسەلیقە بووە، بەلام بەبێ (تەسبێح) نەیتوانیوە حەیران بلێ، چەند کاسێتێکی تۆمارکراوی هەیە، دەنگی (حەسەن لاوک) کاری تێکردووە، دۆستایەتی لەگەڵ (حەسەن حەیران) زۆر خۆشبووە.

جارێکیان (حەسەن حەیران) لە نەخۆشخانەی نەساغ دەبێ، کە عوسمان حەیران سەردانی دەکات، حەسەن حەیرانی بۆ دەڵێ، ئەویش دەڵێ:

حەسەن ئەتو نەخۆشی ئەوەندە دەنگت خۆشە، ئەدی ئەگەر نەخۆش نەبوای دەبێ چۆن بی.

ئەمەش نموونەیەکە لە حەیرانەکانی:

**«دەرێم براینە برادەرینە، ئەورۆکە بەوێ سبیانێ**

**گاز دەکەم دەرێم لە قەراتان بابە لە قەراتی کاولە دوینێ،**

**ئەوا دەنگۆ جوابەکی بدەنە شێمحەمەداغەیی گەردی، دەبا لەسە کانیەکەیێ بەحرکە جاران ئاوا لێ بدا لەغەمە لەگە نۆیینێ،**

**ئەمانە ئەنگۆ زەینێ خۆ بدەنێ،**

**دەرێم: رەوشە سۆری خەیلاتی ئەسمەرێ زراری،**

**جەواهێرێ ئەحمەد بادینان دێتەوە لە زیارەتی داری دارشەکرانێ**

**ئەوا دەرێم: پەنجەیێ نەرمۆکە گەلەشیرنە شل بووینە لەبە رەوتارو رۆیینێ».**

**حەیرانبێژ خورشید فەقێ عەزیز شەنەغەیی**

لە ساڵی (١٨٧٥)لە گوندی (لهێبان)ی کەندێناوەی لەدایک بووە، زۆربەی ژیانی بە راو وشکار بەسەر بردووە، لەیارییە فۆلکلۆرییەکاندا دەستێکی باڵای هەبووە، دەنگێکی بەسۆزو ناسکی هەبووە، ئەگەر لاوک و حەیرانی بگوتبایە ئەوەندە بەسۆزو لاواندنەوەی دەگووت ئەوەی گوێی لێ بایە دەستی بەگریان دەکرد.

کاسێتی تۆمار کراوی هەیە، لە ساڵی (١٩٨٥) کۆچی دوایی کردووە.

**«ئەورۆ هێوارێ دەرێم:**

**ئاوەدانیی قەرەچووغ لەمن بەزوورگ و تەلانە،**

**دەوجا برژنێ مانگی نیسانێ کۆمەرێ تەیران، پۆرو خەرتەلان، لێیان دانا هێلانە،**

**ئەمن ئەوسا بەمردنی خۆم دەهاتمە بەرێ**

**چبکەم لەگەر ئەو بابان وێرانەی چ ناکرێ**

**دونێ کچە تیمە حەیران گۆتی بینە هێتیمە لاو دەست لێک بەردانە».**

**حەیرانبێژ مەحموودی سەید بەسێ**

ناوی تەواوی (مەحموود قادر لاسە)،

لەساڵی(١٩٠٧) لە گوندی باشتەپەی سەربە قوشتەپە لەدایک بووە، لەتافی لاوێتیدا هەستی حەیران گۆتنی لەلا دروست دەبێ.

لەگەڵ دەروێش سمایل گردە سۆری بەدوو قوڵی حەیران و بەستەی گوتووە، مرۆڤێکی نان بدەرو سەخی تەبیعات بووە، زۆربەی حەیرانەکانی لە دانانی خۆیەتی، دەنگی(حەسەن حەیران و حەمەد بەگی و عوسمان حەیران)ی زۆر لەلا خۆش بووە.

ئەمەش نموونەیەکە لەیەکێک لە حەیرانەکانی:

**«کیژدەرێ: کورە حەیران هەردوو چاوەکەم،**

**ئەمن نێچیری توومە لەناو خەرک و عالەمێ گوندێ خۆمان پەلارم ماوێ،**

**ئەمن هەردەگرم جەرەیێ خۆم، دەچمەوە سەرکانی بەرماڕێ**

**کورە حەیران هەردوو چاوەکەم دەوەرە هەر لەبۆ خۆتم بگرە بەتۆڕو داوێ».**

**حەیرانبێژ خدر گردگراوی**

ناوی تەواوی (خدر ئەحمەد برایم)ە، لەساڵی (١٩١٤) لەگوندی دارەخورمای کەندێناوە لەدایک بووە، چونکە لەگوندی گردگراوی قەراج جێوار بووە، بۆیە پێی دەڵێن خدرگردگراوی.

سەرەتای دەستپێکردنی بە حەیرانبێژی لاسایی (حەمەد بەگی و عەباس ئەحمەد)ی کردۆتەوە، لەهەموان پتر داخباری حەمەد بەگی حەیرانبێژ بووە، لەساڵی(١٩٤٠) سەردانی شێخ مەحموودی کردووە، حەیرانی لەمەجلیسی نەگوتووە.

ئەمەش پارچەیەکە لە حەیرانەکانی:

**«حەیران قەراج بەنوارە نوارە،**

**جێی کارو کارغەزالان گردی باقرتەی، رەبی کۆربیتەوە کاولەرەوارە،**

**ئەمن بوواران دەچمە سەر بێژینگ بەسەرێ خۆمان،**

**رنکی شیرینە عالەم دەزانێ غەردارەی تارە، بەژنێ باریک توخوا بەچاوان برۆنە زێدە جوانێ،**

**وەڵلا لەناو عالەمێ دیارە سۆری چاو کارە».**

**حەیرانبێژ حوسێنی عەلیاغای دزەیی**

ناوی تەواوی (حوسێنی عەلی خورشید بایز ئاغا) یە، ساڵی(١٩١٩) لەگوندی(قەپران)ی دیبەگەی لەدایکبووە، لەساڵی(١٩٧٤) کۆچی دوایی کردووە، لە حەیرانبێژان دەنگی (زایەری مام زێندین و جەمیلی عەلیاغا و حەسەن حەیران و خورشیدی فەقێ عەزیز)ی بەدڵ بووە.

ئەمەش پارچەیەکە لە حەیرانێکی:

**«حەیران کیژۆرە ئەسمەرێ،**

**گەردەنێ خۆت برند کە لۆمن دەبا خار بێنە دەرێ،**

**ماچکەم جێی خەناوکان دنیا مەرگ و مردنە سەتی وەکی من و تو چوویتە بن خاکی گری بەوی کەسەرێ».**

**حەیرانبێژ خدر حەیران**

ناوی تەواوی (خدر عەباس یەعقوب)ە، لە ساڵی(١٩٢٦) لە گوندی شۆڕەزەتکەی نزیک دیبەگە لە دایک بووە، زۆربەی ژیانی لە گوندی ئازیکەندی بندیانان بەسەربردووە.

خدر حەیران دەڵێ: لە ساڵی(١٩٦٠) لەگەڵ (رەسول گەردی) دۆستایەتیم هەبوو، هەوڵی لە گەڵدام بچم بۆ رادیۆی کوردی حەیران تۆماربکەم، پاشان مامۆستا (عەلی مەردان) لە دوای ناردم، زۆرم کەیفم پێهات، بەڵام لەبەر هەندێ داب و نەریتی کوردەواری بۆم رێکنەکەوت بچم.

لە حەیرانبێژان دەنگی (حەمەد بەگی و حەسەن حەیران) لەلا خۆشبووە. خدر حەیران دۆستایەتی لەگەڵ زۆربەی حەیرانبێژان هەبووە، سێ کاسێتی تۆمار کراوی هەیە، جگە لە حەیران هۆنراوە و بەستەی شایی کردنیشی هەیە.

خدر حەیران دەڵێ: لاسایی کەسم نەکردۆتەوە، حەیرانەکانیش هەموویان لە دانانی خۆمن، بە جۆرێک حەیرانم گوتووە کەس نەیتوانیوە لاساییم بکاتەوە.

ئەمەش پارچەیەکە لە دەقێکی حەیرانەکانیدا:

**«خۆزی بەخۆزی داران! برام، ئەمن کوریکەک بام لە کوریکێ بێجانێ،**

**هەموو فەسڵی دەرە بواران، شێن بوومایە لەسەر قەراتەکەی پیرە هەولێرێ**

**سبەینان هەموو سبەینان لەگەر گەزەنگی رۆژێ رووێ خۆم بدای هەردوو دەرکەیێ سەرایێ،**

**دونێ لە مەرکەزی ژوانێ گەیە دوو چاوێ بەرەک بەتەمابووم بگەمە مرازوو مەخسودی دنیایێ،**
**لەگەڵ دووچاوی بەرەک، نەمزانی لە پێیانم دەکەن زنجیرێ،**
**لە دەستانم دەکەن کەلەمچێ**
**هەرم دەدەن حەفت قۆناغ لە خوار شارەکەی کاولە بەغدایێ».**

**حەیرانبێژ جوامێری قەشقەیی**

ناوی تەواوی (جوامێر حەسەن جوامێر محەمەد)ە، لە گوندی قەشقەی سەر بە قوشتەپە لە دایکبووە، لەسەرەتای ژیانی حەیرانبێژیدا دۆستایەتی حەیرانبێژ جەمیلی عەلیاغای کردووە، خەڵکێکی زۆری فێرە حەیران کردووە، پیاوێکی خواناس بووە، بەڵام بە داخەوە کاسێتی تۆمار کراوی نییە، لە ساڵی (١٩٧٣) کۆچی دوایی کردووە.

ئەمەش نموونەیەکە لە حەیرانەکانی:

**«حەیران لە بۆ درێ خۆم بە کێندەردا هەر برێم، دەرێم:**
**هەولێر لە من هەولێرە،**
**لەسەری قەراتە لەبنی باژێرە،**
**دونێ هێواری لەگەر کۆمەرەکی دەستە خوشکان دەهاتەوە لە حەمامێ مۆدە، سەروو پەرچەمی نازدار حەیرانێ گەلە خاوە پەرت بووە لەسەر ملانی،زێدە لە کیژان ئەو زالم بابە خەزێمی زێرە».**

**حەیرانبێژ مەحموودی عیسمەتێ**

ناوی تەواوی (مەحموودی رەسوڵ مەلاک)ە، لە ساڵی (١٩٢٦) لە گوندی ئێلنجاغی گەورە لە دایکبووە، شارەزاییەکی باشی لە حەیران و لاوکدا دەبێ.

لە کۆڕ و مەجلیسی حەیرانبێژاندا دەنگی (حەسەن حەیران و عوسمان حەیران و مەلا عەلی عەزیزە کەلی باشتەپەی) پێ پەسند بووە.

ئەمەش نموونەیەکە لە حەیرانێکی:

**«حەیران ئێلنجاغ و تارەبان لە من ئەوبەر ئەوبەرە،**
**سێوەکیان هەردا ئەوسەر ئەوسەرە،**
**کیژ جوانان دەنێرێ کورە حەیران وەرە**
**لەبۆخۆ دەمەکی دانیشین بکەینەوە گازاندەو گلەییە، چونکە گەلەکی وەکی من و توو چویتەوە بن خاکی گڕی بەو ئاخ و کەسەرە».**

**حەیرانبێژ رەسول بێزار گەردی**

ناوی تەواوی (رەسوڵ محەمەد عەبدوڵلایە)، ساڵی (١٩٢٨) لە گوندی قەلادگەی بەرانەتی چاوی بە ژیان هەڵهێناوە، هەر لەسەرەتای لاوێتیدا خولیا و هەوای حەیران لەسەری دا، خاوەن رێچکەیەکی تایبەتە بەخۆی، لەسەیدە کۆری حەیرانبێژ فێرە حەیران بووە.

جگە لە حەیران لەبەستەو مەقامی کوردیدا دەستی باشی هەبووە، خوێندەوار بووە، بۆیە شیعری شاعیرانیشی کردۆتە بەستە و گۆرانی، نزیکەی (٧٠٠) حەیران و گۆرانی و مەقامی لەرادیۆ و کاسێتەکان تۆمار کردووە، ئەو کتێبانەی بەچاپ گەیاندووە:

کتێبی بژار، گوڵە مێلاقەی کوردستان، شیلان و شلێر، پەنگر، دارە شەکران، کیژۆرە ئەسمەرێ، بەناوبانگترین حەیرانەکانی رەسول گردیین.

ئەمەش پارچەیەکە لە حەیرانەکانی:

**«حەیران قەراتێ شارەکەی پیرە هەولێرێ گەلەک قەدیە،**
**دەرگەی دوو دەری، گەلی برادەرینە،**
**ئەمن ئەورۆ هێوارێ زەینێ خۆم دەداوە ئەو ناسک و ناسک بەدەنەی، دێتەوە لەسەر جۆگەی شێخەڵلای لەبن کراسەکەی کتان جۆتە شەمامە و شەمامەی باغەران بایەکەی شەماری لێ دەدا دەرواو دەلەری، دەمگۆتە حەیرانەکەی خۆم دە تو بینە ماچکەم چەرخێ روومەتێ خارێ گەردەنێ دیاریم هینایە بسکۆکەی بەسەری».**

**حەیرانبێژ حاجی تەها بانی مارانی**

ناوی تەواوی (تەها محەمەد مستەفا)یە، لەساڵی (١٩٢٨) لەگوندی بانی مارانی کۆیە چاوی گەشی بەدنیا هەڵهێناوە، لە حەیرانبێژیدا سوودی لە (سمایلە سۆری بانی مارانی و عەزیز خەرابە دراوی) وەرگرتووە.

ئەمەش نموونەیەکە لەحەیرانێکی:

**«حەیران دەشتی کاولە قەراجی لەکاکی نگۆ قەدیم بە یارە،**

**ئەورۆ سبیانێ دەبا بچینەوە سەر کەرکێ حوسێنێ غازی،**
**زەینی خۆ بدەینە بناری کاولە دیبەگەی،**
**سەر لە سبیانان چەندە بەتۆز و غوبارە،**
**ئەوجـا براینە ئەنگۆ هەمـوودانی هێـواران زەینێ خـۆ نادەنە کانیێ داوەدە رەشی ئەوا دێنەوە کۆمەرەکی شەدە شل و شل وەل وەل بە خەناوکان، بەرام ئەسـمەرێ حەسـەنی زێدە لە خەرک و عـالەمێ گـوندی مـە تەریکە تیـلاکـەی خوارە».**

**حەیرانبێژ عوسمان هەمەوەندی**

ناوی تەواوی (عـوسمـان مەولود عـەبدوڵلا)یە، ساڵی (۱۹۲۹) لە گـوندی گـردە سـۆرێ سـیـانان لە دەشـتی قوشتەپە هاتۆتە دنیاوە.

حەیرانبێـژ لە حوجرەدا خوێندوویەتی و پاشان پۆلی پێنجـەمی سـەرەتایی خـوێندووە، هەر لەسـەرەتای هەستکردنی خولیای کۆکردنەوەی فۆلکلۆرە، سەبارەت بە فێـربوونی حەیران سـوودی لەم حەیرانبێـژانە وەرگـرتووە: (ئیسـمـاعـیل گـردەسـۆری، مـەحـموودی سـەید بەسێ، قورشیدی فەقێ عەزیزی شەنەغەیی، حوسێنی عەلیاغا، عوسمان حەیران و حاجی جوامێر).

**«حەیران سەفێن برندە سەر لە بەفرێدا،**
**سینگێ نازدار حەیرانێ دەشوبهێنم بەوان کاغەزەکانی سەمەرقەندی هەموو دانی سبیانان بەخۆم سەرمەشق لێ دا،**
**دەمگوتە بەژنێ نازدار حـەیرانێ خـۆ تو لەمن نەبویە عـاسمە خانێ خوشکێ عەلی بەگی داسنی، سەرێ حەفت سارانە لەمن عـاسێ بووی نایە خوارێ لەقۆنگرەی قەسرێ دا»**

**حەیرانبێژ دەروێش برایمی لهێبانی**

ناوی تەواوی (ئیبراهیم مستەفا مامەند حەمەد)ە. ساڵی (۱۹۳۰) لە گوندی لهێبانی کەندیناوە لەدایکبووە، سەرەتای دەستپێکردنی، حەیرانی دڵداری دەگوت، بەڵام پاش ئەوەی دەبێتە دەروێشی تەریقەتی شێخ عەبدولکەریمی دارەخـورمـایێ، واز لەم جـۆرە حـەیرانانە دێنێ و روو لە حـەیرانی ئایینی دەکا، هەرچەندە نەخوێندەوار بووە، بەڵام شیعری شاعیران (سافی هیرانی و تاهیر بەگ و مەلای جزیری و سـەعـدی شـیـرازی) ئەزبەر بووە، دەروێش برایم لەدەف ژەنیندا وەستاو کارامە و لێزان بووە، لەکۆڕ و زیکر و ئەڵقەی دەروێشان بە حەیرانە بەسۆزەکانی بەشدار بووە، سەرتاپا حەیرانەکانی لە مەدحی ئایین و باوەڕداری بووە.

ئەمەش بەشێکە لەحەیرانێکی ئایینی:

**«ئاگرێ و ئامێدی لەمن بەدارو ئاوە،**
**گەلی ئیسلامان با خۆ رێک بێخێن بکەین تەدارەکێ مەکەو مەدینان بچینە خزمەت ئەو پێغەمبەرەی کە خوا دنیاو قیامەتی لەبەر خاتری وی داناوە،**
**دەبا دەسـتەو دوعـا راوەستێن لەقـاپی خـوای بەعـام رجای لێ بکەین لەبۆ ئەو دینە پاکەی لۆ خاتری محەممەدی و دینمـان مـەحـفـوز بکەی گەلی ئیـسـلامـان دەنا کـارمـان کراوە».**

**حەیرانبێژ عەلی گردەشینەیی**

ناوی تەواوی (عـەلی رەسـوڵ حـوسـێنە) لەسـاڵی (۱۹۳۰) لە گـوندی گـردەشینەی قـوشـتەپە لەدایکبووە، لەتەمەنی بیست ساڵیدا دەستی بە حەیران گوتن کردووە، لەکۆڕی حەیرانبێژیدا مەحموودی سەید بەسێ و دەروێش سـمـایلی گـردەسـووری و خـورشـیـدی فـەقێ عـەزیزی شەنەغەیی) لەلا پەسەند بووە، جگە لە حەیران بەسـتەو مەقامی زانیوە، لە هەموو گەڕەلاوژە و بەزمی ئەو گوندانەی دەوروپشتی بەشدار بووە.

ئەمەش بەشێکە لەحەیرانێکی:

**«حەیران لە بنەی خۆشاوێ،**
**رۆژێ مـویارەکم لێ هەرات گەزەنگان داوێ،**
**حەیران لەداران بەخۆم لە راوێ».**

**دەروێش قادر غەرابەیی**

ناوی تەواوی (قـادر خـدر ئیـسـمـاعـیل)ە، لەسـاڵی(۱۹۱۳) لەگـوندی غـەرابەی سـەر بەدیبـەگـە لەدایکبـووە. لەحـەیرانبـێـژیدا سـوودی لەسـەیدە کـۆر وەرگرتووە.

ئەمەش پارچەیەکە لە حەیرانەکانی:

**«حـەیران لە لێـری لە لێـرەواری لە هۆزی مـەرزان لەغەرەیێ شاسواری،**

**کیژ دەڵێ:**
**جۆتە سوارم چەند شیرن دەدیت لەبەرایێ کۆچ و کۆچباری،**
**یەکیان حەسەناغەی دزەیی، ئەویدیش مامەراغەی زراری،**
**ئەوجا کوڕ دەڵێ:**
**حەز لێکردنێ کیژ و کوڕان**
**کەنگینێ خۆش بوو فەسڵێ دەرەبواران.**
**لە دەشتی کاولە قەراجی**
**لەناو حاجیلە و قنجیلە و لاو لاوەی هەر لە دوازدە هەواری»**

**حەیرانبێژ سمایل گردەسۆری**

ناوی تەواوی (ئیسماعیل حەسەن ئیبراهیم)ە، لە ساڵی ۱۹۱۷ لە گوندی گراوی سەر بە شاری مەخموور لە دایکبووە.

هەر هەرزەکار دەبێ خولیای حەیران دەکەوێتە دڵییەوە، دەستی داوەتە بەزم و ڕەزم و بەستە و مەقام و لاوک و حەیران و گۆرانی بۆ شایی و دروێنە گوتووە، لە دەستەی حەیرانبێژان سەدای (حەسەن حەیران و عوسمان حەیران و مەحموودی سەید بەسێ) لەلای پەسند بووە. هەتا گیان لە بەدەنیدا مابوو لە بەزم و رابوارادن و کۆڕی حەیرانبێژان وازی نەهێنا.

ئەمەش پارچەیەکە لە حەیرانێکی:
**«حەیران لەخۆم غەمگیرێ،**
**لە بەندێ بەربووم کەتمە زنجیرێ،**
**ماشوقەکەی خۆم دەشێنم بەکارمامزەکانی دوو مانگی شاخ رەشی چاو بەدەرمان، دەڵەوەڕێ لەسەری هەرسێ گومەتان لە بانیێ ئەسمەرێ،**
**چێشتاوی دەکا لە گردی گەییاشی لەبەر ئەوەت ئەوەتی سواران، تورندی بوو پەرپەوە لەزێی بادینان لە بەختێ من کەتە وراتێ کاولە جزیرێ».**

**حەیرانبێژ دەروێش حەسەن حەریری**

ناوی تەواوی (حەسەن حەمەدەمین عەبدوڵلا)یە لە ساڵی ۱۹۳۳ لە ناحیەی حەریر لە دایک بووە، حەیرانبێژێکی بەسەلیقە و خۆش مەشرەف بووە، تا ئێستا ۱۵ کاسێتی تۆمارکراوی هەیە، سەرجەمیان حەیران و لاوک و بەستەن.

ئەمەش بەشێکە لە حەیرانێکی ئەو حەیرانبێژە:
**«حەیران سەرێ من دێشی دەردێ لە درم بەژانە،**
**هێواران و سبەینان کیژ و کارێ گوندێ مە دێنە خوارێ لۆ سەر کانی و کانیاوێ گوندی لۆ باغی بەر گوندی، دەردێ لە درم گرانە».**

**حەیرانبێژ بەدیعە حەمەد مەغی**

ناوی تەواوی (بەدیعە حەمە قادر)ە، لە ساڵی ۱۹۳۰ لە گوندی کەردزی سەر بەناحیەی قوشتەپە لە دایک بووە.

هەتا بڵێی ئافرەتێکی بەسەلیقە و حەیرانبێژێکی بەتوانا و لەکۆڕ و کۆمەڵی ئافرەتاندا حەیرانبێژ و شینگێڕ بوو.

حەیرانبێژ دایکی هونەرمەند جەلال پەرێشانە، ئێستاش لە ژیاندا ماوە، لەبەر هەندێ داب و نەریتی کۆمەڵ نەیتوانیوە وەک حەیرانبێژێک خۆی دەربخا، لە حەیرانبێژانی بەتوانا (حەسەن حەیران و خدر حەیران و خورشیدی فەقێ عەزیزی و رەسول گەردی و مستەفا کوێری خۆشاوێ)ی بە دڵە.

حەیرانبێژ دەڵێ: لە ئافرەتان حەیرانبێژی بەتوانامان هەیە، وەکو: (خەجێی سەوەرێ و فاتمی سەوەرێ لە گوندی سەرگەڕان و عەیشێ حەمەدۆکی و عەیشانی عەزیزی و...هتد)

ئەمەش دەقێکی حەیرانی ئەو ئافرەتەیە:
**«حەیران گوێز قەرەج بە دار و بارە،**
**قەوە هەر کێشا گرتی چار نکارە، ئەمن دانیشبووم لە کەندێناوەی گوتیان: بابان کوێر وەرە دەرێ نازانم بابی فەیسەری نەکوژرایە نەبریندارە».**

**حەیرانبێژ جەوهەر جەمیل گردەسۆری**

ناوی تەواوی (جەوهەر جەمیل ئەمین)ە، لە ساڵی ۱۹۳۹ لە گوندی گردەسۆری سیانان لە دەشتی قوشتەپە لە دایک بووە.

لە حەیرانبێژان دەنگی (حەسەن حەیران و عوسمان

حەیران)ی بە دڵە، ئەمەش دەقی حەیرانێکی حەیرانبێژە:

**«برایانە، برادەرینە، قەشقە و گردەسوور ئاقاریان پێکە،**
**رەشە رەحانم دەچاند سوورە گور شەو ئاویان تێکە،**
**بەزاریێ خۆم نەگەیشتمە حەیرانێ، لە بۆم برێنە پلکە**
**پێناوێ لە زاری من گەلە سەلامی لێکە».**

**حەیرانبێژ مەلا ئەحمەدە کوێری کۆیی**

ناوی تەواوی (ئەحمەد حەسەن نەبی)یە، لە ساڵی **١٩٣٤ لە گوندی سماقەی کۆیە لە دایک بووە، هەر لە منداڵییەوە خولیای حەیرانبێژی دەبێ،** سوودی لە حەیرانبێژ (سمایلە سوری بانی مارانی) وەرگرتووە، جگە لە حەیران زۆرجار لاسایی گۆرانیبێژی گەورەی کورد (حەسەن زیرەک) دەکاتەوە، لە مەقامە کوردییەکان زۆربەیانی خوێندووە، سوودی لە مەلا ئەسعەد وەرگرتووە.

ئەمەش پارچە حەیرانێکی ئەو حەیرانبێژدیە:

**«حەیران، ئەگەر ئەمن مردم قەبرم لا ڕێ بێ،**
**راستی هەر دوو چاوم کولانکەی لێ بێ،**
**وەکی بەژنێ باریک دەڕوا لۆ تازیانی بەرکەم چاوەکم لێ بێ،**
**وەکی دێتەوە لەگەڵ کۆمەڵەکی شل و مل و ناسک بەدەنان، دەرێ ئەنگۆ: نازانن ئەوە کورەتیمە حەیرانەکەی منە بەعام برێن هەزار رەحمەتی لێ بێ».**

**حەیرانبێژ سەعید باداوەیی**

ناوی تەواوی (سەعید حوسێن حەسەن)ە، لە ساڵی ١٩٣٢ لە باداوەی هەولێر لە دایک بووە. لە حەیرانبێژان (سەید کۆرە و حەسەن حەیران و ئەحمەد بۆشناخ و عوسمان حەیران)ی پێ پەسندە، سەرجەم حەیرانەکانی لە دانانی خۆیەتی.

ئەمەش نموونەیەکی حەیرانی ئەو حەیرانبێژدیە:

**«حەیران حەیرانە لە زوران لە زورگی زەرگەتەنی،**
**هێتیمە لاوە لاوێ رەشتارە بەدرێ خۆم ئەتو بێخەبەری هەموو عالەم بە یاری خۆی بوو خەنی، جوابەکیان دەدامێ گۆتیان، یارت گەلەک نەخۆشە سەبارەت بە هەردوو چاوێ نازدار حەیرانێ خەبەرەکی بدەنە موختاری حەفت گوندان بکەنە تازیانە هەتا حەفت ساران نابی کەس پێبکەنی».**

**حەیرانبێژ حەسەن خەزنەیی**

ناوی تەواوی (مستەفا حەسەن عەباس)ە لە ساڵی ١٩٣٧ لە گوندی خەزنەی گوێڕ لە دایک بووە، لە بابەت حەیران سوودی لە حەیرانبێژان (عوسمان حەیران و رەسول گەردی) وەرگرتووە، کاسێتی تۆمارکراوی زۆرە لە بەیت و لاوک و حەیران و مەقام.

ئەمەش بەشێکە لە حەیرانێکی:

**«برایانە، برادەرینە، لە بانی بانیان لەبانی سەر خانێ،**
**پشیەکی بای لێ دایە لەگەر تاوەکی بارانێ،**
**رەق بووم سەرمایێ بردم لە ژوانێ کیژە جوانێ**
**خۆزی بە خۆزی داران! هەموو فەسڵی دەرەبواران باجگری ماچان بام لەگەڵی عەلی بەگی لە خواری خەلیفانێ».**


ئەو سەرچاوانەی سوودیان لێوەرگیراوە:

* فۆلكلۆر بەشی دووەم: کۆمەڵە نووسەرێک ١٩٨٥.
* داستان و گۆرانی لە فۆلكلۆری کوردیدا: عومەر شێخەڵلا ١٩٩٨.
* بناری قەرەچووغ: غەفور مەخمووری ١٩٩٠.
* سەرەتایەک بۆ حەیران و کورتەیەک لە ژیانی حەمەد بەگی، غەفور مەخمووری ١٩٨٩.
* سەربردەی کۆمەڵە حەیرانبێژێکی کورد: سەعدوڵلا شێخانی ١٩٨٨.
* دیوانی حەیرانبێژان: ئەحمەد حەیران ١٩٨٨.
* گوڵە مێلاقەی کوردستان: رەسول گەردی ١٩٦٠.
* فۆلكلۆری کوردی لە ناوچەی دزەییاندا: ئاوازی ئەحمەد حەمەدەمین.
* گۆڤاری رامان ژمارە (٥): تاریق جامباز.
* حەیرانبێژ و مەرگی غەریبان: خالید جووتیار ١٩٩٠.
* چەندین دانیشتن لەگەڵ حەیرانبێژان و کەس و کاری حەیرانبێژان لە ساڵانی ١٩٨٨، ١٩٨٩ هەتاکو ١٩٩٤.


* ئەم بابەتە لە گۆڤاری هەولێر، ژمارە (٩) زستانی (٢٠٠١) بڵاوبۆتەوە.

# حەیرانی حەبیب ئاغای سیاوی

ئەحمەد حەیران

**لەرووی مێژوویەوە:**

بێگومـان مـێـژوو لە هەمـوو بارەكـیـیەوە گەل دروست كەرێتی، مـێـژووی هەمـوو مـیللەتێكیش بریتییە لە رووداو و كارەساتەكانی سەردەم و قۆناغەكانی پێدا تێپەڕیوە، ئەمجا ئەوانە پێ بەپێ لەگەڵ رۆژگار خولاونەتەوەو چوونەتە ریزی مێژوو، هەر ئەم رووداو و كارەساتەش ئەگەر سـەنگێكی وای بووبێ بخـرێتـە ناو تای تەرازوو، ئەوا توانـیـویەتی بخـرێتـە ناو بابەتی رۆشنبـیـرانی سەردەمی خۆی، جا ئەوانە چ مرۆڤە سادە و ساكارەكـان بن یا كەسانی هەڵگری بیر و خاوەن تیۆر.

بۆ نموونە شـەڕە بەناوبانگەكـەی دەربەنـدی بـازیـان لـەدژی لـەشـكـری داگیركەری ئینگلیز و كاسەلێسانی لەپاڵ ئەوەی مێژوونووسان باسیان كردووە و خستوویانەتە ناو قاڵبی شـۆڕشی نوێی كـوردەوە، كـەچی (كـاوێس ئاغـا) بە لاوك باسی كـردووە، یان شـەڕی ناوچەی شارەزوور لەگەڵ توركەكان (سالم) بە هۆنراوە دەربـڕیـوە، ئەوانە و دەیان نموونەی دیكە. بـۆیـە زۆر رووداوی دیـكـەش هـەیـە هـەرچـەنـدە لـە بۆچوونێكی گشتییەوە سەیری بكەین تامی كارەساتێكی ناوچەیی لێدێ، بەڵام لـەبـەر ئـەوەی رەنـگـدانـەوە و خستنە رووی باری سەردەمی خۆیەتی توانیویەتی بپەنگێتەوەو بخرێتە ناو بەستەوبەندی شایەر و گۆیندەكان.

ئەمەش شتێكی خەت پەڕ نییە لە مـێـژووی گـەلان، بۆیە ئەگـەر وانەبوایە (ئۆردیخـانێ جـەلیل) پەرتووكەكەی خۆی بەناوی (سترانێ زارگۆتنا كوردایە تاریقێ) نەدەخستە بەردەست، كە هەمووی لەسەر نموونەی لەم بابەتەن، حـەیرانیش لەم رووەوە بێ بەش نەبووە، بەڵكو چەند رووداوو كـارەسـات هەنە بوونەتە هەوێنی ناوەڕۆكـەكـەی، بۆ وێنە (عـوسـمـان حەیران) لە یەكێ لە حەیرانەكانیدا دەڵێ:" ئەوا دیـسـان ئەورۆكـە بەوێ ئێـوارێ ئەوا حـەبیب دەرێ: یارەبی خودا لێت هەر نەگری (مستەفای خدر وسـوی) وەكی ئەوێ رۆژێ، بوویە سەبەبی ئەوی شەڕێ ئەوی دەعوایێ، دەرێم شەڕەكت لەمن دامەزراند، هەر لەنوێژی نیـوڕانێ، برام لەدەو شـیـوە سۆری، ئەوان چ بكەم كاری خودای بـوو ئـەوا دەرێـم رێـژێـنـگـەی تفـەنگەكـانیـان كـردیێ، جـوتەكێ گـوللانیـان لێ دایە هەریان دەدام لەسەر خانە زینی، ئاوڕێ خۆم دەداوە دیوەخانەكەی (حەمە ساڵح رۆژبیانی) دەرێم لەبەر بۆنی نازداران لەبەر فرمەیێ مەعنەگان، ئەوجا دنیا لەتەمێ لەتەم تومانێ كەس نەبوو جوابەكی بداتە هەمینێ، ئەمن برام گەلە شەپرزەو ماروێرانم، دەرێم دوا دوایە دەست لێك بەردانە، ئەوان لەباتی یاسین و تەرقینێ دەستەكی باوێمە سەشاملیێ بەكەزی، برام بە قەفێ سمێرێ سوسنی گەرێی خەناوكان رامارم).

لێـرەدا دیارە حـەیرانەكـە ناوەڕۆكـەكـەی لە كـارەسـاتێك وەرگیراوە بە شێوەیەكی راستەكی لەدەشتی هەولێر لەنێوان دوو بنەماڵەی ئاغایەتی روویداوە، ئەویش هەردوو بنەماڵەی (بایز ئاغا و فارس ئاغایە) كە هەردوو لایان دزەیین. ئەوانە لەزووەوە وردە ناكۆكیان لە نێواندا دەبێ، بەڵام ناگاتە راددەی خوێن رشتن لەوانەشە ئەم وردە ناكۆكییە دەستی سوڵتانی عوسمانی تیادابێ یان لەسەر زەوی و زاربێ، تاوەكو كار گەیشتۆتە ئەوەی ئافرەتێك بەناوی (فـاتیـمـە) لە گوندی (سیاوی) بروا لەگەڵ پیاوێك بۆ گوندی (شێخ شەروان)، بەڵام هەردووكیان لە خێزانێكی جووتیار دەبن. وا دیاریش دەدا ئەم ئافرەتە و پیاوەكە یەكتریان خۆشویستووە، لەم كاتیش (حاجی عەلۆ) ئاغای

گوندەکە دەبێ کە خۆشی لەنەوەی فارساغایە، بەم جۆرە لای ئەم پیاوە دەمێننەوە، بۆیە بەرەی ماڵی حەبیباغای لەگەڵ ئەوانە قین لە یەکتری پەیدا دەکەن، بەڵام لەم کاتە حەبیب خۆی لە بەندیخانەی موسڵ دەبێ، کە لەلایەن تورکە عوسمانییەکانەوە بەند دەکرێ. ئەمەش لەبەر ئەمە بووە، چونکە حەزی بە حوکمڕانی تورک نەکردووە بەسەر ئەم ناوچەیە، ئەمەش راستە چونکە کاک (فوئاد حەمە خورشید) لە کتێبی خێڵە کوردەکان، کە لە ئینگلیزییەوە کردوویە بە کوردی لە لاپەڕە (٥٠) دەڵێ: بایزاغا کە دەکاتە باپیری حەبیب ٢٥ ساڵ پێش ئێستە هەولێ داوە ناوچە لەوەڕگە سرووشتییەکانی دەشتی قەراج بکا بە کشتوکاڵ، بەڵام تێیدا سەرنەکەوت، چونکە پاش ماوەیەکی کەم دەمرێ و کوڕەکەی جێگەی دەگرێتەوە کە ناوی برایماغا دەبێ دەکاتە باوکی حەبیب، ئیتر بەرە بەرە خەڵکێکی زۆر روو لەم ناوچەیە دەکات، تا وای لێ دێ ژمارەی گوندەکان دەگاتە (سەد) گوند. لەسەری دەڕواو دەڵێ: بەڵام سوڵتان عەبدلحەمیدی دووەم هیچ کارێکی دژی برایماغا نەکرد لەم کردەوەیە ئەمەشی تەنها بۆ ئەمەبوو بزانێ ئایا ئەم کارە مەیسەر دەبێ یان نا، پاش ئەمە کە دیتی خەڵکێکی زۆر لەم گوندانە کۆبوونەتەوەو نیشتەجێ بوون، کشتوکاڵ کردنیش تیایا سەرکەوتوو بووە، بۆیە بڕیار دەدا، کە خاوەنداری زەوی ئەم ناوچەیە بۆ کەس نابێت....

تەنها بۆ دەوڵەت نەبێ هیچ کەسێکیش بۆی نییە ئەمە بخاتە ژێر دەستی خۆی و داگیری بکات، تەنها بەچەند بەڵگەو رێ ورەسمی دیاری کراوەوە نەبێ، کە برایماغا ئەمە دەبیستێ نارەزایی دەردەبڕێ و هەموو ئەم کەسانەی لەلایەن تورکەوە ناردرابوون بۆ چاوەدێری ناوچەکە دەریان دەکا، بەم جۆرە کار لەنێوان حکومەتی عوسمانی و برایماغا ناخۆش دەبێ تاوەکو دەگاتە رادەی شەڕی پچڕ پچڕ، لە ئەنجامدا برایماغا لەگەڵ هەموو ئاغاکانی دزەییاتی ناوچەکە بەجێ دەهێڵن و بەرەو چۆڵەوانی و جەزیرە دەڕۆن، لەپاشان داوای لێبووردن لە سوڵتانی عوسمانی دەکەن و ئاشت دەبنەوە... هتد. لەبەر ئەمە ئێمە بەراستی دەزانین، کە حەبیب دژی تورک بووبێ، چونکە لەپێشتر لەگەڵ برایماغەی باوکی ناکۆکیان هەبووە و هەوڵی ئەوەیان داوە زەوییەکانی ناوچەکەی لە دەست دەربهێنن.

لێرە دەگەڕێینەوە سەر باسەکەی خۆمان، بەم جۆرە بەهۆی رۆیشتنی ئەم ئافرەتە لە گوندی سیاوی بۆ گوندی شێخ شەروان وا دەکا براو خزم و کەس و کاری لەگەڵ چەند کەسێکی دیکە بەدوایدا بگەڕێن، لەم کاتیش (مشیر) ئاغای سیاوێ دەبێ، کە دەکاتە برای حەبیب، چونکە هەروەک گوتمان حەبیب ئەم وەختی بەند دەبێ لەلایەن تورکەکانەوە لە موسڵ، کار بەم جۆرە دەڕوا تاوەکو رۆژێک چەند سوارێکی مشیر ئاغا بەدوو شوێنی کابرادا دەڕۆن، کە ژمارەشیان (٥) سوار دەبێ بەم ناوانە.

١- حەمەڕەشی کارەوان.
٢- سەعیدی حاجی خدر گەزنەیی.
٣- مستەفا کارەوان.
٤- نادر کارەوان.

لەگەڵ یەکێکی دیکە کە ناوەکەی نەزانراوە، لەمانەش سێیانیان برای ئافرەتە هەڵاتووەکە دەبن... لەکاتی گەڕان و سوڕانی ئەم سوارانە تووشی کابرای ژن هەڵگرتوو دەبن لەنزیک گومەتی شێخ شەروان و شێخ جامی، وا دیارە ئەم وەختیش کاتی دروێنە دەبێ، بەم جۆرە دەبێتە تەقە لە ئەنجامدا کابرا دەکوژرێ و مەیتی دەکەوێتە ناو پەرێزی.

لەم حاڵەتە یەکێ لە سوارەکان دەیەوێ تفەنگی کابرا بێنێ، بۆیە ئاگای لە هەسپەکەی دەبڕێ و لەدەستی بەڕەڵا دەبێ، ئەسپیش یەکسەر روو لە گوندی (شێخ شەروان) دەکا کە حاجی عەلۆ ئەمە دەبینێ، ئەویش خۆی دەبەستێ و رەخت و کەلوپەل لەخۆی قایم دەکا و دەچێتە دوویان تاوەکو نزیک گوندی سیاوی وازیان لێناهێنێ، لەم ساتە یەکێ لە سوارەکان لێی هەڵدەگەڕێتەوە دەبێتە تەقە، لە ئەنجامدا حاجی عەلۆ ئاغا دەکوژرێ، بەم جۆرە ئیش هەندەی دیکە تیر دەبێ... بۆیە بەرەی ماڵی فارساغەی دەکەونە تاقیب کردنی ئەوان، واتە ماڵی حەبیب، لە ئەنجامدا ئەوانیش ئاغایەک لەوان دەکوژن بەناوی (ئەحمەد بەگ کە کوڕی حەوێزاغە)، لێرەوە کارەکە بەرەو ساردی دەڕوا لەبەر ئەوەی خوێن بەرخوێن دەکەوێ، بۆیە هەردوولا هەوڵی ئاشتبوونەوە دەدەن. لەم کەین و بەینەش حەبیب لە بەندیخانە بەردەبێ و دەگەڕێتەوە ئاوایی، بەڵام کە ئەم دێتەوە چوار مانگ بەسەر تێپەڕبوونی ئەم کارەساتە رەت دەبێ، کە دێتەوەش یەکسەر گوندی (سیاو)ی بۆ مشیری

برای جێ دەهێڵێ و خۆشی دەچێتە گوندی (هێلەوە). ئیتر کار بەم جۆرە دەڕوا، تاوەکو هەردوو لایان حەز بەئاشتبوونەوە دەکەن، بۆیە بڕیار دەدەن کە فڵانە ڕۆژ هەموو سەرۆکەکان لە هەردوو لایان لەماڵی (حەسەنی سالە سۆری چاوشلی) کە پیاوێکی گەورەو خاوەن مقامات دەبێ بۆ مەسەرەتی لە هەولێر کۆبنەوە، بەم جۆرە هەموویان دێن لەوێ کۆدەبنەوە بۆ گەیشتن بە ئەنجام، ئەوانەی لەم کۆبوونەوەیش بەشداری دەکەن ئەوانە بوونە.

١- ئیبراهیم بایز ئاغا دزەیی.
٢- پیرداود ئاغا دزەیی.
٣- ئەحمەد پاشا دزەیی.
٤- مەحموودی کاکەخان.

لەکۆتایی کۆبوونەوەکە هەموویان بەیەکەوە بڕیار دەدەن چیتر سەر لەبەر سەری یەک نەنێن و واز لەم خوێنڕشتن و شەڕ و هەڵاو هۆریایە بێنن، بەڵام عەلی بەگ کە لەبەرەی ماڵی فارساغا بووە لە هەمان کاتیشدا ئامۆزای حاجی عەلۆی ئاغای شێخ شەروان دەبێت بەم مەسرەتییە ڕازی نابێ، بۆیە شەو بڕیار دەدا (٣٠) سواری چەکدار ئامادەبێ تاوەکو بچن جووت ولاغی ماڵی برایماغا لە مەخموور بە تالان بهێنن، ئەوانەی لەم سوارانەش ناویان زانراوە بەم جۆرەیە.

١- قادر سەعدوون.
٢- خەلیل عەلی.
٣- بەهرام فەتاح کێرەش
٤- شەبیب
٥- ئەمین باپیر.

کە ماڵی برایماغا بەمە دەزانن ئەم ڕۆژی ناهێڵن جووتیار لە ئاوایی دەربچن بۆ سەر زەویی، کە ئەوکات حەوڵ جۆت و جووتیاریان لەدەشتی قەراج گەڕاوە.

سوارەکانیش کە ئەم خەبەرەیان پێدەگا یەکسەر دەگەڕێنەوە بۆ گوندی (گردعازەبان) لای عەلی بەگ، کە ئاغای وێ بووە، لەگەڕانەوەیان لە زوورگە زراوی لەنزیک (چارداغی) کە لەنزیک دێی هێلەوە دەبێ، دەست بەتەقەکردن دەکەن بەسەر ماڵی حەبیباغا هەر لەم کاتەش عەلی بەگ چەند چەکدارێکی پیادە دەنێری بۆ ئەوەی لە کەندی (شێوەسۆر) بۆسە دابنێن نەوەک حەبیباغا زەلام بنێرێتە سەر ڕێگای سوارەکانی، ماڵی حەبیباغاش ئەم تەقە کردنە بۆسەر گوندەکەیان بەشتێکی لەنگی دەزانن، بۆیە مستەفای خدر وسوی کە یەکە دەستە ڕاستی حەبیباغا دەبێ، دەست دەکاتە تفەنگێ و ڕەخت و کەلوپەل و لەخۆی دەبەستێ، بەسواری ئەسپ بەرەو شوێنی تەقەکان مل پێوەدەنێ، کە حەبیباغا ئەمە دەبینێ خۆی پێ ناگیرێ، ئەمیش لەگەڵ چەند سوارێکی دیکە بەدوایا دەڕۆن، لەڕێگا لە دەم کەندی شێوەسۆر هەموویان بەسەر بۆسەدا دەکەون و دەکوژرێن، لەپێش هەموشیان (مستەفای خدر وسوی) دەکوژرێ، چونکە ئەم لە پێشەوە ڕۆیشتووە، ئەوانی دیکەش، کە دەکوژرێن ئەوانە دەبن.

١- عەلی خەیار.
٢- فەقێ حەسەن.
٣- حەبیباغا.

پاش ئەم ڕووداوە کارەکە ئەوەندەی دیکە شلۆق دەبێ، بەتایبەتی دوای کوشتنی حەبیباغای، بۆیە برایماغای باوکی حەبیب، مان دەگرێ و ناچێتە دیوەخان و دەڵێ تاوەکو یەکێک لە شوێنی حەبیب نەکوژنەوە من وازناهێنم، بۆیە چەند کەسێکی گەورەی بنەماڵەکەی دەچنە لای، وەک حەمەدئەمین بایزاغا، خورشید ئاغا، حوسێنی مەلای، داوای لێدەکەن بگەڕێتەوە دیوەخان، کێ دەستی لەسەر دادەنێ بەماوەی هەفتەیەک بۆی بکوژن لەتۆڵەی حەبیباغای، ئەویش دەڵێ: تەنیا خوێنی (حاجی عەزیز) نەبێ هی کەسی دیکەم ناوێ، ئەم حاجی عەزیزەش ئاغای گوندی (عەوێنە) بووە، لەهەمان کاتیشدا ئامۆزای عەلی بەگ و حاجی عەلۆی بووە، بەڵام لەم کاتی ئەم کابرایە لە ئاوایی نابێ، بەڵکو لە بەندیخانەی موسڵ لەلایەن تورکەکانەوە دەگیرێ، دیارە ئەویش حەزی بە حوکمڕانی تورک نەکردووە، بەم جۆرە هەموو ئاغاکانی دزەییان لەبەرەی ماڵی حەبیب تەگبیر دەکەن بۆ ئەوەی بەهەر شێوەیەک بێ حاجی عەزیز ئاغا لە بەندیخانەی موسڵ بگوازنەوە بۆ کەرکوک تاوەکو لەڕێگا بۆسەی بۆ دابنێنەوە و بیکوژن، بەم جۆرە حوسێنی مەلای و خورشیداغا و حەمەدئەمین ئاغا پارەو پولێکی زۆر لەگەڵ خۆیانا هەڵدەگرن بەرەو موسڵ دەکەونە ڕێ، بۆ ئەوەی حاجی عەزیز ئاغای پێ بگوازنەوە بۆ کەرکوک، کە دەگەنە موسڵ دەچنە لای هەردوو بنەماڵەی (نجێفی و سابوونچی)، کە پێوەندییەکی بەهێزیان لەگەڵیاندا دەبێ، بەم جۆرە بەهەر شێوەیەک بە بەرتیل و پارەو پولێکی زۆر حاجی عەزیز ئاغا لەموسڵ دەگوازنەوە بۆ کەرکوک، ئینجا دەگەڕێنەوە، زەلامێک دەنێرن لە (قوشتەپە) چاوەڕوانی ئەم کابرایە بکا، کەی بەوێدا ڕەت بێ ئاگاداریان

بکاتەوە. پاش ماوەیەک حاجی عەزیز ئاغا لەگەڵ چوار جەندرمەی تورک کە پاسەوانی دەبن بەقوشتەپەییدا رەت دەبن بۆ کەرکووک، کابرا کە ئەمە دەبینێ یەکسەر دێ خەبەری حەمەد ئەمین ئاغای دزەیی دەدات لە گوندی (دوو گورتکان)، ئەم حەمەد ئەمینەش مامی حەبیب ئاغا دەبێ لەگەڵ خورشیدئاغا و چەند سوارێکی دی دەچنە سەر رێگای لە (سێ کانیان) نزیک کەرکووک تووشیان دەبن، لەم کاتە حاجی عەزیز ئاغا چاوی بەوانە دەکەوێ داوا لە جەندرمەکان دەکات تفەنگی بدەنێ شەری پێبکات یا ئەوەتە بەرگری لێبکەن، بەڵام جەندرمەکان هیچی بۆ ناکەن، لێرەدا وادیار دەکەوێ کە جەندرمەکانیش بەرتیلیان وەرگرتبێ یان ئەوەتە ئاگاداری ئەم کەین و بەینە کرابن، ئەگینا پاکانەکیان بۆ دەکرد، بەمجۆرە حاجی عەزیز دەکوژرێ، لێرەوە کارەکە بەرەو چاکی دەڕوا، لەبەر ئەوەی خوێن بەر خوێن دەکەوێ، ئیتر بەرە بەرە ئەم ئاگری دوو بەرەکایەتییە بەرەو کوژانەوە دەڕوا، تا وای لێدێ ئەوانە بە تەواوی ئاشت دەبنەوەو مەسرەتی دەکەن ئیتر بەژنان تێکەڵاوی یەکتر دەبنەوەو منداڵیان لە یەکتری دەبێ، بەرە بەرە بەدرێژایی خولانەوەی رۆژگار کەس ئەمەی نایەتەوە بەرچاو، پێویستە ئەوەش بزانرێ کە ئەم دوو بەرەیە هەر لە بنەڕەتەوە ئامۆزای یەکتری بووینە، ئەوەی شایانی باسیشە ئەم شەرە لەساڵی (١٩١٧ز) روویداوە و دەڵێن: لەماوەی ساڵێک بەهەردوولا (١٢٠) کەسیان بە ئاغا و کرمانجەوە لەیەکتر کوشتووە، پاش ئەمە جەنگی یەکەمی جیهانی تەواو دەبێ، عێراق دەکەوێتە ژێر دەستی ئینگلیز بە کوردستانیشەوە، ئیتر شیرازەی ئەم ناکۆکییە هەر بە تەواوی لێکدەترازێ و لەهەردوو لایان کەس باسیشی ناکات، بەڵام لێرەدا شتێک بۆ ئێمە دەردەکەوێ ئەویش ئەوەیە کە لەم دووبەرەکاتی و ئاگر خۆش کردنە، تورکە عوسمانییەکان دەوریان هەبووە، چونکە ئەگەر وانەبوایە چۆن دیلێکی سەر بە بەندیخانەی دەوڵەت لە کاتێکدا جەندرمە و پاسەوانی لەگەڵ بێ دەکوژرێ، بێ ئەوەی بەرگری لێبکەن، هەروەک لە نموونەی کاک (فوئاد حەمە خورشید) هێنامانەوە، سوڵتانی عوسمانی پاش ئەوەی بینی تاقیکردنەوەی کشتوکاڵ و نیشتەجێکردن لەم ناوچانە سەرکەوتووە، کە لەبەر دەستی ئاغاکانی ناوچەی دزەییاتین، بۆیە هەمیشە هەوڵیداوە دووبەرەکاتی بنێتەوە و نەهێڵێ ئەوانە یەکتری بگرن، تاوەکو خۆی رێگای بۆ خۆش بێ دەست بە سەربەرو بووم و زەوییە کشتوکاڵییەکانی ئەم ناوچەیەدا بگرێ، بۆیە زۆر لە ئاغاکانی دزەییاتی دەشتی هەولێر حەزیان بە تورکە عوسمانییەکان نەکردووە، بەڵام دەربارەی مستەفای خدر وسوی پێویستە ئەوە بگوترێ، کە ئەم پیاوە مرۆڤێکی ئازابووە لە بنەڕەتیشەوە خەڵکی ناوچەی کەرکووک بووە و لەهۆزی (شێخ بزێنی)یە، گوایە دەڵێن: ئەم پیاوە خوشکێکی زۆر کۆکی هەبووە، یەکێ لە خەڵکی گوندەکەی دەیەوێ دەستی بۆ درێژ بکا و بەزۆر بیهێنێ، بۆیە مستەفا دەیکوژێ و بەرەو لای حەبیباغا دەکەوێتە رێ، کە لە دوورەوە ناو و ناوبانگی دەبیستێ، لەرێگا سێ کەس لە ئامۆزای کابرای کوژراو لەنزیک (پردێ) دێنە سەر رێگای مستەفا، دەبێتە شەڕ، مستەفا ئەم سێیەش دەکوژێ و تفەنگەکانیشیان لەگەڵ خۆیدا دەهێنێ بۆلای حەبیباغا، بۆیە حەبیب زۆری خۆش ویستووە و بەیەکە پیاوی دەستە راستی خۆی زانیوە.

تێبینی:

لەدەمی شێرە ئیسماعیل بیستراوە لەکاتی گەڕانەوەی ٣٠ سوارەکە، کە خۆی یەکێک بووە لەوان، (مستەفا قەراسۆرانی) لەنزیک کەندی (شێوە سۆرێ) تووشیان دێ، بەتوانجەوە پێیان دەڵێ: کورە ئەوە ئەوانە مەسرەتیان کرد تازە ئێوە بەرەڵلا دەکرێن، چونکە ئاغا ئیشی پێتان نامێنێ، ئەوانیش ئەمە دەبیستن هەموو دادەبەزن سوێند و تەلاق دەخۆن تاوەکو یەکێک نەکوژن نەچنەوە ئاوایی، بۆیە هەموو قسەیان دەکەنە یەک و تەقە بەسەر گوندی حەبیب ئاغا بکەن تاوەکو ئەگەر حەبیب بەدەنگیان وەهات بیکوژن، ئیتر بەم جۆرە کار دەڕوا تاوەکو حەبیب بەدوای تەقەکاندا دێ لەدەم کەندی شێوەسۆرێ بەسەر بۆسەدا دەکەوێ و یەکسەر دەکوژرێ، ئیتر بەم جۆرە کارەکە ئەوەندەی دیکە پیس دەبێ، سوارەکانیش دەگەڕێنەوە ئاوایی لە لایەن ئاغاکەیانەوە هەریەکە لە پاداشتی ئەم کارەیان نانی ساڵێک مزاش وەردەگرن، گایەکیش لەخۆشیان دەکوژنەوە.

# دەقێكی فۆلكلۆری دەشتی هەولێر

مەولود ئیبراهیم حەسەن

فۆلكلۆر بە هەموو بەشەكانییەوە، لە بنەڕەتدا كاری تاكی داهێنەرە، ئەو داهێنانەش لەنێو جەرگەی ژیان و لە گەرمەی ڕووداوەكاندا لە دایک دەبن، هەر ئەو بەرهەمە داهێنراوەش، چونكە بەرهەمی هزری تاكێكە زۆر ورد و باریک بە ژیانی خەڵكەكەوەوە نووساوە، ئەو خەڵكە لێی وەردەگرن و بڵاوی دەكەنەوە و كەم و زۆر گۆڕانی بەسەردا دێنن و ژیان و بەردەوامی پێدەبەخشن.

ئەگەرچی وا باوە كە بەرهەمە فۆلكلۆرییەكان بێ خاوەنن و هی خەڵكن، بەڵام ڕاستییەكەی ئەوەیە كە لەبەر زۆر هۆ ئەوەندی بەرهەمەكان بڵاو دەبنەوە و دەناسرێن خاوەنە ڕاستەقینەكانیان ئەوەندە بەختەوەرنین، كە بە ناوی ڕاستەقینەی خۆیان لەگەڵ بەرهەمە داهێنراوەكانیاندا بژین و ناویان بڵاوبێتەوە.

ئەگەرچی ئەم بەرهەمە فۆلكلۆرییانە دێنە بەرهەم و خاوەنەكانیان لە نێو دەچن، ئەوا زۆرجار ڕووداوە ڕاستەقینەكەش، كە لە واقیعدا هۆی ڕاستەوخۆی لە دایكبوون و داهێنانی بەرهەمەكەیە، ئەویش گۆڕانی بەسەر دادێ یا ئەوەتە هەر بە یەكجاری لە بەرهەمەكە دادەبڕێ و لەبیر دەچێتەوە.

بەم پێیە هەر پەند و گوتە و بەندێک و حەیران و لاوک و چیرۆک و داستان و ئەفسانەیەک بگری، جگە لەوەی لە بنەڕەتدا داهێنەری خۆی هەیە وەکو تاک، ئەوا بێشک ئەو تاكەش بە دنیا بینی خۆی و هاوبەشكردن و وەڵامدانەوە و بیر لێكدانەوەی ڕووداوە واقیعی و مێژوویییەكان، بەرهەمە داهێنراوە - فۆلكلۆر- ی یەكەی داهێناوە، واتە لە ڕاستیدا هەر بابەتێكی فۆلكلۆری كە ئەمڕۆ ماوە و لەسەر زاری خەڵكە و جارجار دەقێكی لێ بڵاودەكرێتەوە، ئەو دەقە ڕووداوێک یان چەند ڕووداوێكی مێژوویی خۆی هەیە.

هەر ئەمەشە كە وایكردووە ئێستا لێكۆڵەرەوەكان لە زۆر ڕووەوە لە بوارە جیاجیاكاندا پەنا بۆ دەقە فۆلكلۆرییەكان دەبەن و ڕەگ وریشە مێژوویی و واقیعییەكەی دەدۆزنەوە.

بۆ نموونە: ئەمڕۆ هیچ لێكۆڵەرەوەیەكی كورد و غەیرە كورد، ئەگەر بیەوێ شتێک لەسەر (قەڵای دم دم) بنووسێ، بە هیچ شێوەیەک ناتوانێ پشت لەو دەقە فۆلكلۆرییانە بكات، كە لە زۆر ڕووەوە باسی داستانی دم دم دەكەن. ئەگەر لێكۆڵەرەوەیەكیش هەبێ بڕوا بە دەقە فۆلكلۆرییەكان نەكات و پشتیان پێ نەبەستێ، ئەوا بێ شک خۆی لە خێر و بێری زەخیرەیەكی زۆر بە دوور دەگرێ و كەم و كورتییەكی زۆریش دەخاتە نێو لێكۆڵینەوەكەی.

ڕووداوە مێژوویییەكانی نێو كۆمەڵی كوردەواری دەقی زۆر و هەمە جۆری فۆلكلۆرییان بەرهەم هێناوە، هیچ ڕووداوێک و كەسایەتییەكی ناودار نییە، كە فۆلكلۆر لە زۆر ڕووەوە بە دەقی خۆی باسی لێوە نەكردبێ، بەڵام ئەوە ئەركی زانستیانەی لێكۆڵەرەوەیە، كە دەبێ بزانێ چۆن بۆ ڕووداوێكی واقیعی و مێژوویی سوود لە دەقە فۆلكلۆرییەكە وەردەگرێ، بۆ لێكۆڵەرەوەی كورد دەقە فۆلكلۆرییەكان دەوڵەمەندترین و نزیكترین و چاكترین زەخیرەن بۆ ئەوەی كاریان تێدا بكات، چونكە لە جیهان ژمارەی ئەو لێكۆڵەرەوانەی كە بۆ تایبەتكاری و زانستەكەیان سوودیان لە فۆلكلۆر بینیوە ژمارەیەكی یەكجار زۆرە.

لە دوای ئەم پێشەكییەوە، دەمەوێ باس لە دەقێكی كورت و گرنگی فۆلكلۆری كوردی بكەم، ئەو دەقەی كە من هەر لە منداڵییەوە لە دایكم بیستووە، دایكیشم بە نۆرەی

خۆی بە منداڵی لە خەڵکی بیستووە. ئەم دەقەش وەک زۆر دەقی دیکەی فۆلکلۆری رۆژ و رووداو و کەسایەتی و شوێنی روودانەکەی دیارە، بەڵام بەداخەوە ئێستا - ناوی دانەرەکەی دیار نییە و (نازانرێت هی کێیە).

ئەوەی بووە هۆی نووسینی ئەم بابەتە نووسینەکەی مامۆستایانی بەڕێز (عەباس هورمزیار و شوان سەرابی) بوو کە لە ژمارەی (٤)ی ئاسۆی فۆلکلۆردا بڵاو کرابووەوە و باسی لە ژیانی کەسایەتی ناسراو و ناوداری هەولێر (مەلا ئەفەندی)[1] دەکات، ئەو دەقەش راستەوخۆ پەیوەندی بەو بەڕێزە واتە - مەلا فەندی - یەوە هەیە و باس لەو رۆژە دەکات کە (مەلیک فەیسەڵ) لە ساڵی ١٩٢٥ بۆ یەکەمجار دێتە هەولێر. ئەو دەقەش کە من لێرە مەبەستمە باسی بکەم ئەو دەقە نییە کە لە (ل ٢٩ی ژمارە ٤ی ئاسۆی فۆلکلۆر) بڵاوکراوەتەوە، بەڵام پەیوەندییەکی زۆریان پێکەوە هەیە، چ لە رووی ناوەڕۆک و رۆژی روودانی رووداوەکەوە، واتە بارە هونەرییەکانی - شیعرە - فۆلکلۆرییەکەوە، کە ئەمەش رێگەی ئەوەمان بۆ خۆش دەکات بڵێین: ئەم دەقەی (ل ٢٩ی ژمارە ٤ی ئاسۆی فۆلکلۆر) و ئەو دەقەی لای من و دەقێکی دیکە کە پێشتر بڵاوکراوەتەوە، بەداخەوە، بە شوێنی بڵاو کردنەوەکەی نەکەوتمەوە، هەرسێکیان ئەگەر لە بنەڕەتا یەک دەق نەبن و هی یەک دانەر نەبن ئەوا یەکێک لە دانەرەکان چاوی لەوەی دیکە کردووە، لەبەر ئەوەی لە نێوان ئەم سێ دەقەدا، ئەوەی کە من بە منداڵی لە دایکمم بیستووە، زۆر بە تەواوتر دەزانم لە دوو دەقەکەی دیکە[2].

ئێستاش دەقەکەی لای خۆم بڵاو دەکەمەوە، بۆ ئەوەی خوێندەواران و ئەوانەی فۆلکلۆر بە گرنگ دەزانن و بە دوای دەمارە مێژوویی و واقیعییەکانیدا دەگەڕێن بە وردی سەرنجی بدەنێ.

دەقە فۆلکلۆرییەکە:

**مەلیک فەیسەڵ مەلیکە**
**پاشایە لە بەغدایێ**
**ترومبێلی ئاگردا**
**بەنزینی بەردەدایێ**
**هێرووەی قەسرێ ئەفەندی**
**عالەم هاتە بارایێ**
**لێی کردەوە باو باران**
**کەس مەیلێ خۆی نەدایێ**
**پاشەو پاش دەکشاوە**
**چۆوە لە بۆ بەغدایێ**[3]

وەکو دیارە ئەم دەقە فۆلکلۆرییە باس لە هاتنی (مەلیک فەیسەڵ) دەکات بۆ هەولێر و باسی چۆنییەتی پێشوازی کردنەکەش دەکات لەلایەن خەڵکەوە.

من لە ساڵانی ١٩٨٦ بە سەرەوە رەشنووسی لێکۆڵینەوەیەکم لەسەر ئەم دەقە فۆلکلۆرییەوە، لێکۆڵینەوە بەڕێز (دڵشاد مەریوانی) شەهید نووسی بوو، کە ئەویش بەراوردی لە نێوان دوو بیرۆکەکەی چیرۆکنووسان خوالێخۆشبوو (محەمەد مەولود مەم) و بەڕێز (دکتۆر مارف خەزنەدار) نووسیبوو، کە هەردوو چیرۆک باس لە هاتنی (مەلیک فەیسەڵ) و پێشوازی لێکردنەکەی خەڵکی شاری هەولێر دەکەن. لەو لێکۆڵینەوەدا چەند خاڵێکی هاوبەشم لە نێوان دەقە فۆلکلۆرییەکەی کە خاوەنەکەی دیار نییە و دەقی دوو چیرۆکەکەدا دەستنیشان کردبوو، بەداخەوە ئەو رەشنووسە لە نێوچوو، ئێستاش سەر و دڵی دووبارە نووسینەوەی ئەم لێکۆڵینەوەم نییە، بەڵام لە پێناو گرنگیدان بەم دەقە فۆلکلۆرییە و هەوڵدان بۆ دەستنیشانکردنی گرنگی دەقەکە لە رووی مێژوویی و هەوڵدانێک بۆ دۆزینەوەی دانەری دەقەکە لێرەوە شەن و کەوێکی دەقەکە دەکەین.

ئەگەر بە وردی سەرنجی تەواوی شیعر - دەقە فۆلکلۆری - یەکە بدەین بۆمان دەردەکەوێ، کە دانەر بێ لایەنانە دەقەکەی داناوە (مەلیک فەیسەڵ مەلیکە) بەبێ ئەوەی وشەیەکی پێدا هەڵگوتن بە (چاک) یان بە (خراپ) بخاتە نێو دەقەکە، لە کوێندەر مەلیکە؟

(پاشایە لە بەغدایێ) ئەگەر سەرەتا ناوی (مەلیک فەیسەل)مان بۆ دێنێ دواتر کارەکەی دیاری دەکات کە (پاشایە لە بەغدایێ) بەوەش جگە لەوەی ناوی مەلیک و شوێنی پاشامان بۆ دیار دەکات، جوگرافیای سەرەتای (سەفەر)ەکەشمان بۆ دەستنیشان دەکات، دواتر دەڵێ: (ترومبێلی ئاگردا، بەنزینی بەردەدایێ) لەوەشدا ئامرازی سەفەر کردنەکەمان بۆ دیاری دەکات، کە (ترومبێل - ئۆتۆمبێل)ە، لە جۆری کارکردنەکەشدا زۆر ورد و هوشیارانە باسی چۆنییەتی کارکردنی (ترومبێل)ەکەمان دەکات، ئەگەر ئەم باسکردنە بۆ ئەمڕۆ کارێکی سادەیە، بەڵام بۆ نزیک هەشتا ساڵ پێش ئەمڕۆ شتێکی یەکجار نوێ بووە.

(ترومبێلی ئاگردا) ئەوە کارێکی ڕاست و زانستییە، کە لە کارکردنی ئۆتۆمۆبێل جاری یەکەم ئاگرەکە بە (سولف) دادەگیرسێ و دواتر (بەنزینی بەردەدرێتێ) لەوەشدا شاعیرە بزرەکەی دانەری دەقە فۆلکلۆرییەکە زۆر زیرەکانە چاوی کامیرا لەسەر (مەلیک) و شاری (بەغدا) و (سولف) کارکردنی ماشێنەکە دەگێرێ. ئێمە دەزانین کە (مەلیک فەیسەڵ) خۆی ئۆتۆمۆبێل لێناخوڕێ (مەلیک فەیسەڵم بینی لە دواوەی ئۆتۆمبێلەکە سوار ببوو، تەنها شوفێری لەگەڵ بوو[٤] وەک بەڕێز مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای فەرهادی دەگێڕێتەوە، لێرە نابێ ئەوە لە شاعیرە فۆلکلۆرییەکە بگرین، کە باسی (شوفێر)ی مەلیکی نەکردووە، چونکە لە ڕاستیدا شوفێرەکە لە هەڵسوکەوت چاوی لە قسەی مەلیک بووە، بۆیێ شاعیری فۆلکلۆر زیاتر تەرکیز دەکاتە سەر مەلیک خۆی و لە باسی (شوفێر) خۆ دوور دەخاتەوە، وەک خۆی لە زۆر کەس و شتی دیکە دوورخستووەتەوە و دەستی بە دەماری سەرەکی ڕووداوەکەوە گرتووە و هونەری (کورت بێژی)یەکەی پاراستووە.

پاش ئەوەی کامیرای چاوی شاعیری فۆلکلۆر دواجار لەسەر (سولف) و کار کردنی ئۆتۆمۆبێلەکە ڕادەوەستێ، یەکسەر لەقتەیەکی دیکە دەمانهێنێتە شاری هەولێر و (هێرەوەی قەسرێ ئەفەندی) ئەو شوێنەی وەک مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای فەرهادی دەگێڕێتەوە "مەلا ئەفەندی (٣٠ - ٤٠) مافووری لەبەر پێی مەلیک ڕاخست"[٥] وەک لەو دەقە فۆلکلۆرییەشدا هاتووە "عالەم هاتە بارایێ" ئێستا کامیرای چاوی شاعیری فۆلکلۆر لە دوورەوە - هێرەوەی قەسرێ ئەفەندی - مان دێنێتە بەرچاو و پێشانمان دەدا، کە خەڵک "هاتوونەتە پێشوازی" سەیرکە چەند هونەرمەندانە خۆ لە باسی ڕێگای دوور و درێژی نێوان بەغدا و هەولێر دەدزێتەوە و باسی ئەو ڕێگایە بە پێویست نازانێ و شوێن و زەمەنی لێک دوور وەستایانە لێک گرێی دەدا، بەبێ ئەوەی کە خوێندەوار - بینەر لە پەنای وشەکانەوە - یان گوێگر - هەست بە بێزاری و کەم و کورتییەک بکات، هەرچەندە بەڕێز مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای فەرهادی دەگێڕێتەوە کە "مەلا ئەفەندی (٣٠ - ٤٠) مافووری لەبەر پێی مەلیک ڕاخست و پێشوازییەکی گەرمی فەیسەڵی کرد."(٦) بەڵام شاعیری فۆلکلۆر باس لە پێشوازی کردنێکی گەرم ناکات، بە تایبەت لە لایەن خەڵکەوە، ئەوەی مامۆستا مەلا عەبدوڵڵا بە گەرمی ناوی دەبات ئەوە پێشوازی (مەلا فەندی)یە نەک خەڵک، چونکە شاعیر هەر دوای هاتنە (بارایێ)یەکە دەنووسێ: "لێی کردە باو باران کەس مەیلێ خۆی نەدایێ"[٧] ئەو مەیل - ڕوو - نەدانە بە (مەلیک فەیسەڵ) هەر تەنیا لەبەر باو باران نەبووە، بەڵکە بە هۆی ساردی مەیلی زۆربەی خەڵکەکە بووە، یان هەر هیچ نەبێ بەشێکی خەڵکەکە بووە، چونکە ئەگەرچی وەکو زانراوە کە بەڕێز (مەلا فەندی) وەک مامۆستا فەرهادی دەگێڕێتەوە: "بەیعەی بە مەلیک فەیسەڵ دا کە ببێتە شای عێراق، بەڵام دانیشتووانی کەرکووک و سلێمانی دەیانویست سەربەخۆ بن"[٨] دیارە کە ئەوەی خەڵکی کەرکووک و سلێمانی ویستوویانە، ویستی بەشێکی خەڵکی شاری هەولێریش بووە، ئەوەش لەو پێشوازییە ساردە بەدیار دەکەوێ، کە بە قسەی شاعیر خەڵکەکە لە مەلیکیان کردووە، چونکە دەرکەوتووە ئەگەر خەڵک (مەلیک)ی خۆیان بە تەواوی خۆش بووێ، هەرگیز بۆ باو باران وازی لێناهێنن، وەک دیارە ساردی مەیلی خەڵکەکە لەگەڵ ساردی باو باران لێکیداوە و بووەتە هەنجەتێک و (کەس مەیلی خۆی نەدایێ) و ئەویش ناچار "پاشەو پاش بکشێتەوە و بچێتەوە بۆ بەغدایێ" لە ڕستەی "پاشەو پاش دەکشاوە." نائومێد بوونێکی تێدایە، لەوەی کە چاوەڕێ بووە، نەیدیوە!! جارێکی دیکە شاعیری فۆلکلۆر کامیرای چاوی لە هەولێرەوە بۆ بەغدا دەگوێزێتەوە و لەوێ پەردەی سیناریۆکە دادەخات و "پاشەو پاش بکشێتەوە و بچێتەوە بۆ بەغدایێ".

وەک دەرکەوت ئەم دەقە فۆلکلۆرییە تەواو لەسەر ڕووداوێکی مێژووی گرنگی عێراق و هەولێر و چەند کەسایەتییەکی دیار و ناسراو دامەزراوە و لە ڕۆژی ڕوودانەکە گوتراوە و بەمەش دەتوانین بڵێین: یەکەمین بەڵگەی گرنگی مێژووییە، کە باس لە هاتنی (مەلیک فەیسەڵ) دەکات بۆ هەولێر بەقەد ئەوەی دەقەکە کورتە، دە هێندە چڕو پڕ بابەتە و بە وشەی کەم و شیعری ڕەوان باسی زۆر بابەتی گرنگی کردووە، کە دەتوانین

بڵێین: بابەتە گرنگ و سەرەکییەکانن.

هاتنی مەلیک بۆ هەولێر لە بەغداوە، بە سواری ئۆتۆمۆبێل، پێشوازی کردنی لە لایەن کەسایەتی ناوداری هەولێر (مەلا فەندی) و هەتا رادەیەک خەڵک و باران و مەیل ساردی خەڵک بە نائومێدی گەڕنەوەی مەلیک، کە ئەم بابەتانە هەر یەکە بۆ مێژوونووسی و لێکۆڵەرەوە بابەتی گرنگ و سەربەخۆ و پەیوەندداری بە یەکەوە. ئەوەی تا ئێستا شیکرایەوە تەنیا ئەو دەقە بوو، کە من لە دایکم بیستووە، ئەگەر سەیری ئەو دەقەش بکەین، کە بەڕێزان (عەباس هۆرمزیار و شوان سەرابی) بڵاویان کردووەتەوە، چەند شتێکی دیکە دێتە بەرچاو، کە جیان لەگەڵ ئەو دەقەی پێشوو.

بۆ نموونە: هاتنەکەی (مەلیک بۆ ناو کوردان) وا باس دەکات کە (لە بۆ کەیف و سەفایێ) بووە، لە هاتنی مەلیکیش "خدر و مەعروف و حوسێن لەگەڵ حەسەنی یایێ"(٩) دەچنە کن مەلیکی و ئەویش یەک و (عەبا)یان دەداتێ، بەڵام وەک دەقەکە باس دەکات (عەبای خدری پاشای) عەبایەکی خەراپ دەبێ و شاعیری فۆلکلۆر بەشێوەیەکی کاریکاتێری باسی دەکات (بنۆکی بزنە زایێ) هەرچەندە وەکو زانراوە (عەبا) لە توکی مەرەز و توکی وشتر دروست دەکرێن، کە هەردووکیان عەبای جوان و پەسەندیان لێ بەرهەم دێت، کەچی بە تەنیا عەبای (خدری پاشای) لە (بنۆکی بزنە زاریێ) یە، ئەمەش بۆ ئەوەمان دەبات کە بڵێین: مەلیک وەک ئەوەی ڕێزی لە (مەعروف و حوسێن و حەسەنی یایێ) گرتووە، ئەو ڕێزەی لە خدری پاشای نەناوە؟! ئایا ئەمە ڕاستە؟ یا ئەوەتە شاعیر لە پەنا ئەم ڕووداوە هەستی خۆی بەرامبەر بە خدر دەربڕیوە؟ بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە دەبێ بگەڕێینەوە بۆ مێژووی ئەو ڕۆژگارە ئەوا واقیعەیە بە دروستی بخوێنینەوە کە هەبووە، ئەمەش کارێکە لە توانای ئەم نووسینە بەدەرە.

– چەند پرسیارێک لە بارەی شاعیری فۆلکلۆرە.

– ئەگەر ڕۆژ و شوێن و ڕووداوەکە دیارە و شاعیر باسی هەندێ کەسایەتی دیار دەکات، ئەوا بۆ خۆشی دەبێ لەو ڕۆژگارەدا ناسراو بووبێ و لەنێو خەڵکەکە، واتە لە شاری هەولێر و دەوروبەری ژیابێ.

– کەسێک دەقێکی ئاوا سەرکەوتوو بە گەرمی بۆ ڕووداوێک بهۆنێتەوە، دەبێ زۆر دەقی دیکەشی بۆ زۆر ڕووداوی دیکەو کەس و بابەتی دیکە هۆنیبێتەوە.

– لەبەر ئەم دوو هۆیەی سەرەوە دەبێ خەڵکی ناوچەکە ئەو کەسایەتییەیان ناسیبێ و سەربردەی بزانن و ئێستاش دەشێ کەسانێ لە ژیان مابن و دانەری ئەم دەقە بناسن و زۆر دەق و ڕووداوی دیکەی ئەم شاعیرە فۆلکلۆرییە بزانن.

– هەرچەندە ئەو دەقەی ئێمە بڵاومان کردۆتەوە ڕێگەی ئەوەمان بۆ خۆش دەکات، کە بڵێین: ئەو دەقە یا ئەوەتە درێژتر بووە؟ یا ئەوەتە شایەری دیکە چاویان لەو دانەرە کردووە و لەسەر کێش و قافیەی ئەو لێیان زیاد کردووە، هەرچەندە لە دەقەکە بەدەردەکەوێ کە توانای شیعریان وەکو شاعیری دەقەکەی لای من نەبووە، من خۆم هەر ئەو ڕایەی دوایی بەڕاستتر دەزانم – واتە شاعیرێکی دیکە چاوی لەو کردبێ.

### تێبینی و پەراوێزەکان

١- لە دەشتی هەولێر و شاری هەولێریش لەنێو خەڵک کەس ناڵێ (مەلا نەفەندی) بەڵکە هەر دەڵێن (مەلا فەندی)، ئەمەش یاسایەکی ڕێزمانییە.

٢- چەند ساڵێک لەوە پێش دەقێکی هەر لەم بابەتە بڵاوکرایەوە، ئەویش لە ڕووی هونەری شیعرییەوە لەوەی ژمارە (٤)ی ئاسۆی فۆلکلۆر نزیکتر بوو، بە داخەوە سەر چاوەکەم بۆ نەدۆزرایەوە.

٣- ئەم دەقە لە دایکم (بەهیە محەمەد رەشید حەویز) وەرگرتووە، کە بە منداڵی لە سییەکانی سەدەی بیستەم لە گوندەکانی (سۆربەش) و (سوریژە) و (یەدیقزلەر) ژیاوە و ئەم شیعرە فۆلکلۆرییەی لە خەڵک بیستووە.

٤- ل ٢٨، ژ ٤، ئاسۆی فۆلکلۆر.

٥- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٦- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٧- لە دەقی مامۆستایانیش ئەم دێرە بەم شێوەیە هاتووە (لێی کردە بەفروباران عالەم ڕووی خۆی نەدایێ)، ل ٢٩، ژ ٤، ئاسۆی فۆلکلۆر.

٨- خۆزگە ئەم ڕووداوە مێژووییانە زۆرتر گرنگی پێدەدرا، ئێستاش خەڵکی وا لە ژیان ماون کە ئەم ڕووداوانەیان چاک لەبیرە.

٩- خدر و مەعروف و حوسێن، هەتا ڕادەیەک لە نووسیندا باس کراون، بەڵام من یەکەم جارە ناوی (حەسەنی یایێ) دەبیسم. خۆزگە ئەوەی کە شتێکی لە بارەوە دەزانی بڵاوی دەکردەوە.

*** ئەم بابەتە لە گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر، ژمارە ٧ ساڵی ٢٠٠٥ بڵاوبۆتەوە.**



شێخ مەحموود      شێخ عەبدولکەریمی دارەخوما

# هەولێر و شێخ مەحموودی مەلیک لە فۆلکلۆری هەولێردا

مەحمود زامدار

شێخ مەحموود وەک پیاوێکی ئایینی و کۆمەڵایەتی و سەرکردەیەکی شۆڕشی کوردایەتی، پیاوێکی ناودار و خۆشەویست بوو، لە شاری هەولێر و دەوروبەری، شێخ زۆر بە پیرۆزییەوە سەیر دەکرا! زۆرجار لەدایکمم بیستووە کە دەیگوت: «شێخ کە دەچووە شەڕێ و دەهاتەوە، کە پژوتێنی خۆی دەکردەوە، گوللە بەردەبووەوە چونکە گوللە نەیدەبڕی» هەر ئەم خۆشەویستی و پیرۆزییەش شێخی کردووەتە هەوێنی

زۆر شیعر و بەستەو حەیران و لاوک و حەکایەت و پەند... تاد. لەم ناوچەیە. ئەم چەند شیعرە فۆلکلۆرییەش کە مامۆستا مەحمود زامدار کۆی کردووتەوە، نموونەی خۆشەویستی شایەرە کە زمانحاڵی خەڵکەکەیە. (ئـ. هـ)

**بابی بابم شێخ مەحموود بە مەلیک داندرایە**
**بەخۆی لەچیاو چۆلان عەسکەری لەسەحرایە**

تانی لە عەسکەریدا، سونگی تاق راوەستایە
هەموو سەیدی زەمانەی بەخۆی وا لەگەردایە
پێنجسەد فەلەی تەیاری سێ حاکمی لەگەردایە
کەریمی فەتاح بەگی عەسکەری تەعلیم دایە
لەدەوری چەمچەمالی دەبووە حەرب و خەزایە
بەعام سپێران لێدەن، سێ تۆپ وا دامەزرایە
کوردان چەکو ببەستن، پشت مەدەن لە خەزایە
ژنو لێ حەرام دەبی، لەگەر ماری دنیایە

* * *

بابی بابم شێخ مەحمود، بەفکری دێ هاوینێ
حەرب و خەزا دامەزرا لەلای مەککەو مەدینێ
کافرو ئیسلام بەرامبەر، ئارەمانیان گەیینێ
شێخ مەحمود هەناردیتی، کوری قوچاخ بچێنێ
تاویان دەنێ وەک شێران، هیچ مەترسێن لە خینێ
تەیارەکیان رەوانکرد، ناردیان لێ بیتوێنێ
لۆم برێنە ئارەمانی، رەببی عەمری نەمێنێ
قاقەزەکیان دەنووسی، ساف نووسرایە لە خینێ
عەسکەرم خەراس بووە، موفلیس مامە لەدینێ

* * *

بابی بابم شێخ مەحمود، سەرکردەی ئارەمانی
تۆپەکی دروست دەکا، بەرپەی لۆ دی دەرمانی
گوللەی قەندی شەکری، ئەو باشە لۆ نیشانی
بەسە ئینگلیزی دادا، لەگە گەردی بەیانی
کورینە تانی لەخۆ دەن، بێن کیژی نەجمانی

* * *

بابی بابم شێخ مەحمود، شێخم بەگفت و گۆیە
چەند سەیدو مەلا کوژرا، دەعوا لەگەر (سمکۆ)یە
حەفت ساران دەسبەسەربوو، لەشاری (پەتری پۆ)یە

* * *

بابی بابم شێخ مەحمود، چەند شێخەکی وەلییە
قاقەزەکی دەنووسی، ناردی لۆ ئینگریزیە
خەبەر بدەنە گەورەکەی، شەرمان لەسەر خینیە

* * *

بابی بابم شێخ مەحمود، شێخم چاک لێ دەزانی
چەند کورو کار کوژرا، لەچەنگ قەومی شەیتانی
چەند ساران دەسبەسەربوو، لەشاری هیندستانی

* * *

بابی بابم شێخ مەحمود، چەند شێخەکی جاحێرە
سەروقەرەمی خۆی کرد، ئیللا هێشتی سمێرە
تانی لە عەسکەری دا، لێیاندەدا سپێرە

* * *

بابی بابم شێخ مەحمود، ئەوم شێخی بەرەوە
قاقەزەکی دەنووسی، ناردی لەبۆ سەرەوە
ئینگریز دەبا دەفن بێ، دەبا هەر کورد بێتەوە

* * *

چەند سەرنجێک

١- ئەم بەندە، پارچەیێکە لەبەندکانی شایەری ناوداری میللی دەشتی کاکی بەکاکی هەولێر (مام عەولای حەمەدەمینی).
٢- ئارەمان: ئارمان: جۆرە تفەنگێکە.
٣- بەندکە لەسەر هەمان کێش و شێوازی بەندە میللییەکانی دەشتی هەولێرە.
٤- وەک لەبەندکە دیارە، هەرچەندە شۆرشی شێخی حەفید لەپردێ بەولاوە تێپەری نەکردووە، بەلام پشتیوانی خۆی لەنێو ئارەزوو و دلی کۆمەلانی خەلکی هەولێر و دەشتەکەی چەسپاندووە، هەروەک چۆن لەلاوکەکەی (کاوێساغا)ش رەنگی داوەتەوە.
٥- لەکاتی خۆی و تائێستاش کە ئێستایە زۆر هەولمدا، بەندی دیکەم دەسکەوێ، بەلام هیچ شوێنەوارێکی نەبوو...!

ئەم بابەتە لە گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر ژمارە (٦) سالی (٢٠٠٤) وەرگیراوە.

# هەولێر لە فۆلکلۆردا

عەلی عەزیز

هەرچەندە کە فۆلکلۆری میللەتان چڕوپڕ و پوخت و هەمەلایەن بن، ئەوا بەهرەمەندی و رەسەنایەتی ئەو میللەتە دەسەلمێنن، دیارە گەلی کوردیش هەر بەو فۆلکلۆرەوە بەشێک لە تەسکەرەی نەتەوایەتی خۆی پاراستووە چ بەهۆی بەرهەمی زانایان و شاعیران و چ لە سینگی گۆیندە و شایەرە میللییەکانەوە بوویێت کە بەرهەمەکانیان بە باریکەڕێی پڕ مەینەتی و نەهامەتی رۆژگارە شەرمەزارەکانی مێژوو بەرامبەر گەلەکەمان، گەیاندە دەستی ئێمەمانان. بۆیە پێویستە ئێمەش بەدوایاندا بچینەوە بابەتیانە، زانستیانە، بژار و لێکۆڵینەوە و تاوتوویان بکەین و نەیاندەینە دەس ناحەزان و داخ لە دڵانی مشتێکی لێ بدەن و دەیکەن بە موڵکی خۆیان و بە بەرچاوی ئێمە سینگیان دەردەپەڕێنن، وەکو بەرهەمە هونەرییەکانمان زەوتی دەکەن. هەولێر وەکو شارێکی دێرین و مێژوویی خاوەنی شارستانیەت و مەزار و پشت و پەنای هەرکەسێ کە ڕووی تێبکا و شوێنی دەیان ڕووداو و کارەسات و بەرگری و ئاوەدانی و خاوەن خەڵکێکی جوان و رەسەن (دوور لە رەگەزپەرستی ئەمە واقیعێکە)و ئاو و هەوایەکی سازگار و خاکێکی بە پیت و بەرەکەت و دەیان شتی تر شایانی ئەوە بووە، کە جێی سەرنجی شاعیران و هونەرمەندان و گۆیندەبێژە میللییەکان بووبێ، ئەگەرچی هێشتا گۆتنە کۆنەکان و بەیتە فۆلکلۆرییەکان زیاتر و بگرە لەگەڵ شوێن و ناوچە جیاجیاکانیش ئاماژەیان بە هەولێر کردووە، لەوانەی کە ئەمڕۆ قەڵەم نووسن و لە بەرنامە جیاجیاکانی ئەدەب و کەلتوور و هونەر کاردەکەن. ئەوەش نیشانەی ئەوەیە هێشتا نەمانتوانیوە سوود لەو دەسکەوتانە وەربگرین، کە بۆمان رەخساوە. لەبەر هەر هۆیەک بێ، ئەوا لێرە جێی نابێتەوە، بۆیە منیش بەش بە حاڵی خۆم، لە گەڕانم بەناو بابەتە فۆلکلۆرییەکان سەیرم کرد شتێک هەیە بەزەقی دیارە، ئەویش (هەولێرە)، کە لە زۆر شوێن، پەنجەی شانازیی و زۆرداریی و وەفاداریی و ئەمەکداری... هتد بۆ درێژکراوە، بۆیە لەوەندی کە لەبەر دەستمدا بوون بۆم هەڵێنجان و دەیکەم بە باقە گوڵێکی جوان و بۆنخۆش وەبەرۆکی قەڵایێ وەدەکەم.

**هەولێر**

**ڕێگای هەولێر بە تۆز و خۆرە**
**کراسەکەی نەسرین گوڕ گوڕە**

سۆرەپیاهەڵدان (١)

* * *

**خۆم لەسەر گردێ شام لەبەر بێرێ**
**دوو مەمکی شامێم پەنیرێ چێرێ**
**شامێ هەردەگرم دەچمە هەولێرێ**

پەنا و داڵدەی لێ قەوماوان (٢)

* * *

هەرات ئەستێرەک لەلای بەیانی
هاتە هەولێرێ قومی شەیتانی
ماینێ حەسەنی شینکێ بە جوانی
حاکم رایکێشا عالەم پێیزانی

گیرکردن (٣)

* * *

رێیێ هەولێرێ بەروە وارایە
ئەوا پێی دادێ مەجید پاشایە
مەیتێ هەر چاران لە ترومبێلێ دایە
لە دەرکێ قشڕەی فرتیاندایە

زۆرداری (٤)

* * *

لانک لانک لانکۆرێ، وەستا هات لە هەولێرێ
لانکێ دروست کا لەبۆ بێرێ
ئامارەی لانکێ کورتە    ناگاتە مەمکی بێرێ

نەتەوەیی لە فۆلکلۆردا (٥)

* * *

یەک لە ماران هاتەدەر    چاورەش ناسکە بێرییە
بە دەستی عیشارگەیدا    کەسمان لە مارێ نییە
بابم چویتە هەولێرێ    برام وا لە ئاشییە
سەگ مان سەرەوی ناها    پیرە داک چاوی نییە

ئەویینداری (٦)

* * *

مەحبوبەک دانیشتبوو    بەپێی لانکی دەژینی
لای لایەی لۆ برای دەگۆ    ناوی منیش لەگەر دینی
هەولێر و کۆیە و کەرکووک    هەمووم دا لە مزگینی

ئەویینداری حاتەمی بێ مەسرەف (٧)

* * *

لە مابەینی هەولێر و کۆ    سعات لێیدا لە هەشت و نۆ
عەبدی خودام یەخسیری تۆ
لە مابەینی هەولێر و پرد    یەکێ لە ناکاو بانگمی کرد
قورت بەسەر لەیلێیان برد

هانا (٨)

* * *

دەچمە شاری هەولێرێ    بە قەیسەری و دوکانە
ئەگەر باوەڕم پێ ناکەن    چاوکاری زۆر تێدانە

شارستانیەت (٩)

* * *

بێ دینۆ چەنۆچەمی هەولێرێ
کچێ گوندێ مەرۆیێن لۆ بێرێ
کێ وەز حەلاندەمبۆنا کنێرێ

پلە و پایەی هەولێر لە دەڤەردەکانی تر (١٠)

* * *

چەندم گۆ حەسەن وەنیە وەمەکە
لە شاری هەولێر خانان کون مەکە
هێستری قەتارچیان لە خان دەرمەکە
لە شاری موسڕێ هەراجیان مەکە...

ئەمەکداری بەرامبەر هەولێر (١١)

* * *

خوا نەکەرۆ نۆ شوت کردەبۆ
تەشریف و خێرت هەولێر بەردەبۆ

گلەیی لەبەر دوورکەوتنەوەی یار (١٢)

* * *

ئامینێ و ئامێ مەر لەبەر بێرێ
شەدەت یەکەم شەدەی هەولێرێ
یار لەسەرینێ وەعدەکەی هەولێرێ
ماچ کردن خۆشە وەعدەی کنێرێ

هیوا خوازێکی پێمەڕەبلاو (١٣)

* * *

بێرەوە سەرتا کێش وەدولانە
هەولێر چۆل دەکەی دەچیەوە بانە؟

.... (١٤)

* * *

ئەگەر دەچیە شایێ    مەرۆ هەتا دەتبینم
دەچمە شاری هەولێرێ    کەمەرەکت لۆ دینم
لەناو گەریێ دیلانێ    لە نێکت دەشەتێنم
ئەوی دۆستە بێتە دیار    بەدکاران پێ دەپسێنم

ئامۆژگاری (١٥)

* * *

چاوت ئەستێرەی سەحەری  هەڵدێ لە بێژینگ بەسەری
کوڕی بێ دۆست قوڕ بەسەری  چارۆگە هەولێریریە
بۆ خۆم دەچمە سەر ڕێی مەڕی  یارم تۆبە بێریە
(١٦) ...

***

هەتیم دەبا هەرپەڕین  لۆ من و تو بێ قەیدییە
بابم چوویتە هەولێرێ  کاکم وا لە جۆتییە
ئەوڕۆ ڕکی بوویتەوە  نان و ئاوی بردییە
کارمامزێ لە خرەبەردی  دەخوا گوفکی هەرمییە
پیلان و فیداکاری (١٧)

***

سینەمەنێ کۆچە کۆچە  بەرەو دەشتی هەولێرێ
دانیشت لانکێ خۆی چاکرد  لەناو گوور و کنێرێ
یاخوا سینەمەنێ جوانێ  کۆچە و بارت بەخێرێ
پێشوازی (١٨)

***

چاوی ڕەش و بەرەک بوو  پڕ لە کلێ سبحانی
ئەو کراوێ ڕواندزێ  لێی ئاراندییە کاشانی
لە بۆیێ خۆشم دەوێ  دەستووری هەولێریانی
شانازی (١٩)

***

کەسم نما هەولێریانە  کەسم نما تەمتوومانە
کەسم نما خۆر بارانە  کەسم نما شێر قرانە
کەسم نما هەولێر گردە  کەسم نما ئەسپێ غوردە
کەسم نما نسکۆ بردە  کەسم نما سواری مەردە
شینی هەولێریان بۆ مەرگی ئازیزان (٢٠)

***

دیوەخان چاکرا پێرێ
هەراش گووری کنێرێ
خەبەر گەییە هەولێرێ
سوارۆ یادت بەخێرێ
پێشوازی کردنی تەرمی قارەمانان (٢١)

***

چوومە شاری هەولێرێ  هەولێرۆک سەر سەحەرە
چوومە دوکانێ جووان  بە دەلاقە و پەنجەرە

***

سێ گەوهەر دانیشتینە  فاتم و لەعلی و ئەسمەرە
در عیدزیان مەکەن  سەر و ماچم لەسەرە
ئەمەکداری کیژان بەرامبەر کوڕەتیمێ هەولێریان (٢٢)

فەرهەنگۆک و پەراوێز و سەرچاوەکان:

(.) ژمارەکانی لەژێر هەر بابەتێک هاتووە دیارە نیشانەی سەرچاوەکەیەتی، بەڵام لە ژێرەوەیان (توانج)، تەعلیقی خۆم لەسەر پێناسەکە و بەڕای خۆم نووسیومە بەڵکە واش نەبێ.

(١) فۆلکلۆری کوردی/ سەعدوڵلا شێخانی.

(٢) فۆلکلۆر و هۆنراوەکانی کوردەواری/ محەمەد کەریم شەریف.

(٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(٤) لە حاجی حوسێن مەیاس (خ. ل) مورتکەییم وەرگرتبوو، پێدەچێ داستانەکەی (حەسەن و مریەم) بێ.

(٥) گۆرانییەکی فۆلکلۆرە، بەڵام گرنگییەکەی لەوەدایە کە مامۆستای گەورە و بەڕێز مەزهەری خالقی گیانی نەتەوەیی بەکارهێناوە و جارێکیان برادەرێکی بەڕێزم خاوەنی تۆمارگا بوو لە ساڵەکانی دوای ١٩٧٥ لە بازاڕ بانگی کردم، وتی: گوێ بگرە ئەوەیە کوردایەتی، مەزهەری خالقی شەقی لە وەستایی تارانێ و ئەسفەهانێ داوە، پەنای هێناوەتە بەر وەستای هەولێرێ بۆ لانکێک...

# حەیران دەیانگرت دەرکی قەراتێ[7]

ئەحمەد حەیران

حـەیران وەک تەرزێک لەسـتـران یاخـود گـۆرانی، رووبەرێکی گەورەو بەرفراوانی لەبەرهەمی زارەکی میللی داگرتووە، توانیویەتی دەربڕی زمانی سەردەمی خۆی بێ. ئەدگـار و رووخـسـار و سـیـمـای گـوزەرانی کـۆمـەڵگەی کـوردەواری لە قـۆناغـێکی مـێـژوویی لەخـۆگـرتووە و پاراسـتـوویەتی، دەق و ئاواز و هەوای حـەیران لەگـەڵ رۆژگاری خۆی ساز و گونجاو بووە، حەیران سترانی بۆنەو پیشە و کاری وەرزی نەبووە، بەڵکو لەهەر چوار کەژەکانی ساڵ بواری گوتن و بیستنی رەخساوە، خەڵک بەتاسە و حەزەوە (متو)ی گوێگرتنی بووە، دەقەکانی حەیران وەک فۆرم لەرووی بنیاتی گشتییەوە بەرجەستەیەکی تەواوی دنیای ئەڤینی و خۆشەویستی و جوانییە، ناوەرۆکی حەیران تامەزرۆی مرۆڤی کورد پیشان دەدات کە تاج ئەندازەیەک تینووی جوانی و سەرسامی رەگەزی مێیە، سەرلەبەری دەقی حەیران گوزارشتە لەو دنیا خەیاڵییەی دڵداری و حەز و ئاواتی شادبوون و توانەوە لەناو رۆح و جەستەی یەکتر، حەیران دنیایەک ژیان و ئاوات و خۆزگە و خواستی هەمەچەشن لەخۆ دەگرێ، دەیان خەونی ئەرخەوانی لەچوار چێوەی حەیران دارێژراوەو لەوپەڕی وردەکاری و وردبینییەوە هۆندراوەتەوە، ئەوەی لە حەیران دا گوتراوەو دەربڕاوە لەگەڵ بارودۆخی رۆژگاری خۆی گونجاوە، حەیران لەرووی ئاواز و دەنگ و دارشتنەوە لەگەڵ دەم و جەمی ژینگەی کۆمەڵایەتی لەباربووە، بۆیە حەز و خولیا و ئارەزووی خەڵک لەگەڵی راهاتووە، حەیران مۆرکی سەردەمێکی هەڵگرتووە ئەویش سەردەمی کشتوکاڵی ئاژەڵدارییە، کۆمەڵگەی کوردەواری لەو سەردەمانەدا کۆمەڵگەیەکی ئاسایی سرووشتی بووە، بەژیانی شار و شارستانی کاریگەر نەبووە و رواڵەتە پێشکەوتووەکانی بواردن کاریان لەبیر و هزری کۆمەڵ نەکردبوو بۆیە زمان و هەڵسوکەوت و گوزەران و ژیانی خەڵک سادە و پاراو بووە تەکنەلۆژیای نوێ پێی نەگەیشتووە و تێکی نەداوە، لەناو ئەو چوار چێوەیەدا حەیران وەک جۆرێک لە گۆرانی بووەتە پشووی هەناسەدانەوەی شەکەتی و بەهۆیەوە بەسەر بێزاری و خاکەساری زاڵبوونە وحەیرانیان کردووە بە دڵدانەوەی ناخ و لەرێگایەوە حەز و ئارەزووە خەفەکراوەکانیان دەربڕیوەو خواستە زایندەییەکانیان ئاوەڵا کردووە، ئەدەبی فۆلکلۆری، ئەدەبی نەریتە، هەڵگری پەیامی کۆمەڵێک بەهاو رەوشتە، بەهۆیەوە ئەدگاری سەردەمی خۆی دارشتووە و مۆرک خاسیەت و تایبەتمەندیەکانی بەرجەستە بووە، حەیران وەک لایەنێک بۆ گوزارشت کردن لەو ئەدەبە میللییە فۆلکلۆرییە سەر زارییە بەشێک لەو نەریت و داب و بەها کۆمەڵایەتیانەی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتووە، شۆڕبۆتەوە بۆ ناو سیما و خەسڵەتە سایکۆلۆژییەکانی تاک و کۆمەڵگە و کەسایەتی کورد، پێکهاتە دەروونییەکانی کۆمەڵگەی کوردستان بەشێکە لەناوەرۆکی گۆرانییە میللییەکانی، لەرێگای سترانە فۆلکلۆرییەکان ناخی

کەسایەتی کورد و توانا و لێکدانەوەی هێزی هزر و هۆش دەخوێندرێتەوە، حەیران دەربڕی لایەنێکی ئەو دیاردانەیە، ئاماژە بە گەلێک بوار دەکات، کە بەهۆیەوە دەتوانین توێژینەوە لەزۆر رووی کۆمەڵگە بکەین، دەتوانرێ چەندین چەمک و بۆچوون دابڕێژرێ بەهۆی گەرانەوە بۆ سەر دەقەکانی حەیران، لە قۆناغێکدا واتە لەکات و ساتێکی دیرۆکی دیاریکراودا گۆرانی میللی شەقڵ و مۆرکی خۆی نووساندوە کاریگەری خۆی جێ هێلاوە خولیا و هەوەسی خەڵکی تێرکردووە و لەگەڵ میزاج و خواستی ناخیان سازاوە ئەو سیما و رێڕەوە لە سترانی میللی تا مەودایەکی دیارکراو دەڕوا دوواتر بەرە بەرە دەتوێتەوە و کز دەبێ ئێستا، ئەو جۆرە گۆرانیە میللیانە بوونەتە کلاسیک، بەگۆرانی گوند و کۆمەڵگە دێهاتییەکان دەدرێنە قەڵەم، شوێن و ژینگەیان گۆڕاوە کۆمەڵ پێی ناوەتە قۆناغێکی دیکە و ژیانی بەرەو پێش چووە و ئەدگار و سیمای نوێ و هاوچەرخ بە گوزەرانیان نووساوە، لەڕووی کات و ساتەوەش گۆرانکاری تێکەوتووە و رووەو بەسەرچوون دەچن. چونکە ناوەرۆکی ئەو سترانە میللییانە وەکو حەیران و ئەوانی دیکە دەگەڕێتەوە بۆ رۆژگارێک کە بەرەو نەمان و تێپەڕین چوونە یاخود دەچن، سەردەمی دەوارنشینی و رەشماڵ گەری و کۆچباری ناوەڕۆکی ئەو گۆرانیانەیان دروست دەکرد، نەوەیەک پێگەییوە بەوکەش و هەوا و ژیان و گوزەرانەی ئاماژەمان پێکرد نامۆیە و بەو جۆرە سترانە میللی و فۆلکلۆریانە دەروونی سارد نابێتەوە و دڵی ئاو ناخواتەوە، لەڕووی فۆرم (شکل) وەک ئاواز هەست و ئارەزوو دەبزوێتن دەتوانرێ بەناوەڕۆکێکی تازە دابڕێژرێنێتەوە، ئەوەی لەگەڵ وەرزەکانی ساڵ دەگوتران وەکو بەندی گۆرانی (دروێنە) ئەوانە تازە دروست نابنەوە و بەرەو توانەوە و نەمانی یەکجاری دەڕۆن، چونکە کەس ئێستا دروێنە ناکات، زۆر گۆرانی دیکەش کە لەبۆنە و پیشەی تایبەتی گوتراون، بەهۆی نەمان و بەسەرچوونی سەردەمی بەکاربردنیان ئێستا نەماون خەڵک پەیڕەوی گوتنیان ناکات، بەشێک لەدیرۆک و بەسەرهاتی کۆمەڵگای کوردستان بەهۆی گۆرانی فۆلکلۆری پارێزراون حەیران وەک جۆرێک لە گۆرانی فۆلکلۆری ئاماژە به هەندێک بەسەرهات و رووداوی کۆمەڵایەتی دەکات. حەیران لەگێڕانەوەی رووداو یاخود بەسەرهات وەکو لاوک نییە، لاوک زیاتر لایەنی قارەمانیەتی و ئازایەتی لەخۆ دەگرێ، باس لە داستان و بەسەرهاتی دڵداری و مێژوویی دەکات، لاوک لە رووداو وەردەگیرێ، بەڵام حەیران دادەنرێ، دەهۆندرێتەوە، شایەر بەپێی زەوق و ئارەزووی دڵی خۆی دەیرازێنێتەوە، ئەڤینی و کۆڤانی دەروونی دەخاتە ناو دەقەکانی حەیران و باس لەتامەزرۆیی، حەز و ئارەزووی خۆی دەکات بۆ جوانی و نەرم و ناسکی ئافرەت، شەیداو سەودا سەر بوون بەدوای لار و لەنجەی ئافرەت ناوەرۆکی زۆربەی دەقەکانی حەیران پێکدەهێنێ، هەروەها هەندێک رووداو یاخود بەسەرهات کە لە رۆژگاری خۆی بەتایبەت لەو رۆژگارانەی کە حەیران زمانی دەربڕینی حەز و ئارەزووی کۆمەڵ بووە باس دەکرێت و ئاماژە بەرووداوی دەکرێت، لێرەدا باس لە رووداوێک دەکەین کە لەزۆر دەقی حەیرانبێژان ئاماژەی پێدراوە، دەقی حەیرانەکە لای زۆربەی حەیرانبێژەکان یەک ناوەرۆکی هەیە، بەڵام هەریەکە بەپێی توانا و شارەزایی و لێهاتووی خۆی دایڕشتووە، عوسمان حەیران باوکی تەنیا عارەب دەڵێ:

**دەرێم ئەوڕۆکە بەوێ سبیانێ**

**زەینێ خۆتان بدەنە بەستۆرە**

**دەرێم: بەستۆڕەیێ گۆرانان گەلە گەلە شیرینە**

**بابە لەبەر بیانێ**

**ئەوا ئەسمەر گاز دەکا دەرێ دایە**

**ئەتو زەینێ خۆیدە بەحرکەیێ جاران**

**دەرێن شێن دەکرێ لەبەر دوکەرێ پیرە کارخانێ**

ئەوجا دەرێ:

**خوا بکا بە خورامی کورە کوڕەیێ (گەردیان) وەکی دەستێ خۆیان دەداوە دارەکەیێ جامبێزارێ دەیانگرت قەراتەکەی پیرە هەولێرێ.**

**وەکی دەیانکوشت (رشیدی باش چاوش).**

**دەریان دینا (کاکلی) بابێ (جەمیلی)**

**لەگەر کۆمەرەکی قاتیلان.**

**بە زەبری خەنجەرێ لەبەندیخانێ.**

لە دەقی حەیرانێکی تر لەسەر هەمان رووداو حەیران

بێژی کۆچکردوو (مستەفا حەسەن خەزنەیی) دەڵێ:

**دەرێم براینە برادەرینە ئەگەر دەرێم بەستۆرە**
**بەستۆرە لەبەر بیانێ**
**ئەگەر بەحرکەی رەنگێن دیار نییە**
**زەینێ خۆ بدەنێ بابە لەتەمێ لە تومانێ**
**وەکی وەسمەر گاس دەکا**
**خوام بە خورامی کورە کوری (گەردیان) کا**
**یاخوا لەروحێ داکێ منیان کەوی**
**ئەوسار بەوێ دەرە بوارێ**
**وەکی (دەشکێنن) دەرکێ (سەرایێ)**
**دەوەتانە (کاکلاغە)ی گەردی**
**بابێ (جەمیل) و (مەجید)ی**
**دەردیننەوە لە بەندی خانێ هەولێری**
**بەخودای دەوەتانە بەزەبری لولەی کارخانێ.**

لێرەدا بەهۆی دەقەکان دەردەکەوێ کە حەیرانەکە باس لە رووداوێک دەکات، بەسەرهاتێک ئاماژە پێدەکات کەوا گەردییەکان، هێرشیان بردۆتە سەر (قشلە، سەرا)ی حکومەت لە قەڵای هەولێر، بەندیخانەیان شکاندووە و پاسەوانی بەندیخانەکە بەناوی (رەشید باش چاوەش) کوژراوە، کاکلاغەی گەردی لەبەندیخانە دەرهێندراوە و بەزەبری لولەی تفەنگ و خەنجەر گرتووخانەکەیان شکاندووە، ئەم رووداوە لەسەردەمی خۆی زۆر دەنگی داوەتەوە سەر بردەیەکە بۆنی یاخی بوون و راپەرین و وەستان لەدژی دەسەڵات و حکومەتی لێدێت، رووداوەکە دەگەرێتەوە بۆ دوا رۆژگاری عوسمانییەکان و لە هەندێ سەرچاوە ئاماژەی پێکراوە لەوانە (العشائر الكرديه) فوئاد حەمە خورشید لە ئینگلیزی کردوویەتی بە عەرەبی لەگەڵ (تراپ اربيل التاريخي) هادی چاوشلی، بەڵام ئەدەبی فۆلکلۆری وەکو حەیران و لاوک و بەیتی دیکە گوزارشیان لەم رووداوە کردووە و لەمیانی دەقەکان هەست دەکەین کە باس لە روداوێک دەکرێ، بۆزیاتر روونکردنەوەی ئەم بەسەر هاتە و چۆنیەتی رەنگدانەوەی لە ئەدەبی میللی واچاکە پێشینەیەک لە مێژووی ئاوەدانکردنەوەی بەحرکە و هاتنی گەردییەکان و چۆنیەتی رووداوەکە بخەینە روو.

شەمدینان قەزایەکە سەر بە پارێزگای هەکاری لە کوردستانی باکوور واتە تورکیا، دەڵێن گەردییەکان پێش زیاتر لە (٢٥٠) ساڵ لەوێوە هاتوون، سەرەتا روویان لەناوچەی پشدەر کردووە، دواتر هاتوونە خوارووی رۆژئاوای کۆیە و لەگوندی (ئەشکەفت سەقا) نیشتەجێ بوون، بەحرکە دەکەوێتە باکووری رۆژئاوای هەولێر ناوچەیەکی چۆڵ و بەئاو بووە، (عەباس ئاغای یەکەم) کەبە عەباسە (شەل) ناسراوە لەگەڵ هەندێ لە خزمەکانی دێت لەبەحرکە ئاکنجی دەبێ و ئاوەدانی دەکاتەوە، دەڵێن مێژووی نیشتەجێ بوونی گەردییەکان لەبەحرکە دەگەرێتەوە بۆ زیاتر لە (٢٥٠) ساڵ بەر لە ئەمرۆ، نەخۆشی رشانەوە لەناوچەکە بلاودەبێتەوە، بۆیە لەسەرانی بنەماڵەکە تەنیا دووکەسیان دەرباز دەبن، ئەوانیش (شێخ محەمەد ئاغا و قادر ئاغا)ی برای بوون، شێخ محەمەد ئاغا پیاوێکی چاپوک و ئازا بووە، پاشای کۆرەی میرنشینی سۆران لەشەرەکانیدا پشتی پێبەستووە و لەشەرێکدا لەدژی رووسەکان دەستەجلێکی پاشایانەی خەڵاتکردووە. ئەو دەستە جلە لەلایەن جەمیل ئاغا پێشکەش بە قونسولی بەریتانی کراوە و ئێستا لەمۆزەخانەی لەندەن پارێزراوە، بەهۆی دەسەڵات خوازی و ناکۆکی لەسەر زەوی و زار زۆربەی هۆز و خێڵەکانی کوردستان ناکۆکیان لەنێوان دا هەبووە، بۆیە شێخ محەمەد ئاغای گەردی لەناکۆکییەکی زۆر بووە لەگەڵ هۆزە گەورەکانی دەشتی هەولێر و دەوروبەری، وەکو دزەیی و خۆشناو زراری و بلباس.

دەڵێن جارێکیان (١٢) شێخی عارەبانی لە (دیبەگە) بەبارمتە گرتووە، داوای لێکردوون تاوەکو رۆژە رێیەک لەناوچەکە دوور نەکەونەوە بەریان نادا، لە هەندێک دەقی حەیران ئاماژە بەم ناکۆکی و شەرانە کراوە بۆ نموونە:

**دەرێم براینە برادەرینە زەینێ خۆ دەدەمە**
**بەینی بەحرکە و براغی**
**دەوەتانە سبەینان لەمن بەدووکەرێ شینە**
**دەرێم براینە برادەرینە**
**بەینی بەحرکە و براغی**
**زەینێ خۆ دەدەمێ**
**سبەینان لەمن بەدووکەرێ شینە**
**دەوەتانە وەکی ئەسمەر گاس دەکاتە مامەری**

**مارت گەلەک وێران بی هەستە لەخەوێ**
**زەینێ خۆ بدێ**
**برەکێ سوارێ دزەییان**
**ئەوە لە سەنگەران دانیشتینە**
**چاوەکەم چەند شیرین**
**دەکەنەوە مشاوەرە لەگەر تەگبیرە**
**دەوجە وەکی وسمەر گاس دەکاتە هەمینێ**
**یارەبی هۆردوو چاوت کوێربی**
**کەست لەمارێ بابان نەمینێ**
**دەتۆ بەسە کۆشکان و بارەخانان بکەوە**
**زەینێ خۆ بدێ**
**ماینێ مەولودی حەسەنی**
**ئەوە دێتەوە لەسەرێ مەیدانێ**
**ئەوجە ئەی هاوار دەوەتانە بەخودای**
**سەر زینی کەوتیە**
**قالتاغی بەخینە**

دیارە زۆربەی ئەو ناکۆکییەی نێوان خێڵ و تیرە و هۆزەکان لەسەر زەوی و زار و شوێنی کشتوکاڵی بووە، هەرکەسە ویستوییەتی سنووری دەسەڵاتی فراوانتر بکات و زۆرترین شوێن و زەوی بەپیت و فەڕ بگرتە دەست، برێکی تر لەناکۆکییەکان حەزی ڕەمەکی بووە، کەسانێکی زۆر لە ئادەمیزاد لەسرووشتەوە نایەوێ کەس لەخۆی بەهێزتر و گەورەتر ببینێ یاخود ناوبانگی لەوچاکتر بێ، لەوانەشە بەشێکی زۆر لەو شەڕ و ناکۆکییانە لەژێرەوە دەستی میری و ڕژێمی ئەو کاتی عوسمانییەکانی تێدا هەبێ. دەسەڵاتدارانی ئەوکات هەوڵیانداوە خێڵ و هۆزەکان لەناکۆکیدا بن تاوەکو بەئاسانی دەسەڵاتیان بەسەر ناوچەکەدا بڕواو نەبنە هێزێکی دیار لەئاست فەرمان و داواکاریەکانیان بوەستن، بەڵکو گەرەکیان بووە بێ هێز و ناکۆک بن تاوەکو بۆ یارمەتی و بەتەنگەوە هاتن ڕوو لەوان بکەن گوێڕایەڵیان بن، بەهەر شێوەیەک بێ (شێخ محەمەد ئاغا) پیاوێکی ئایین پەروەری دیار بووە لەگەڵ دانیشتووانی ناوچەکانی خۆی ساز و کۆک بووە، خاوەن تەلار و دیوەخانێکی گەورە بووە دیوەخانەکە شوێنی گردبوونەوەی خەڵک و داڵدەدانی لێقەوماوان بووە! دەڵێن (١٣) کوڕی هەبووە، یەکێک لەوانە ناوی (کاکل) بووە: واتە کاکل شێخ محەمەد ئاغا، کاکلاغا هەر چەندە کوڕە گەورە نەبووە و برای لەخۆ گەورەتری هەبووە، بەڵام بەهۆی بوێری و لێهاتوویی دوای باوکی دەسەڵات و سەرۆکایەتی عەشیرەت دەگرێتە دەست. لەیەکێ لەشەڕەکان لەگەڵ بلباسان[٣] براو وەک دەڵێن (٨٠) پیاوی لێکوژراوە، دواتر حکومەت نێوانیان دەکا و هەردوو لایان هەریەکە بە (٦٠٠) قران سزا دەدا، کاکلاغەی شێمحەمەداغای گەردی لەساڵی ١٨٣٠ هاتۆتە دنیاو ساڵی (١٩١٠) لەتەمەنی (٨٠) ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە، چەند کوڕێکی هەبووە لەوانە (حەمید، مەجید، جەمیل)، لەدوای کاکلاغا (جەمیل)ی کوڕی دەبێتە ڕاوێژکار و زمان زانی عەشیرەت، لەسەر ڕێورەسمی پێش خۆی دەڕوا، دەڵێن: لە بەڕێوەبردنی کاروباری خێڵەکەیدا ڕاوێژکاری هەبووە، سێیەم سەرۆکی گەردیان بووە لە بەحرکە، جەمیلاغا لەگەڵ فەتاح ئاغای هەرکی، خدری پاشای دزەیی، تەحسین بەگی ئێزیدی، فارس ئاغای زێباری، حوسێنی مەلا، دارا بەگی داودی، میرانی قادر بەگ، هەموو بەیەکەوە ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق بوونە لەسەردەمی مەلەکیدا.

لەدەقی دوو حەیرانەکەدا وەک ئاماژەمان پێدا کە دەڵێ:

**وەکی دەشکێنن دەرکێ سەرایێ**
**دەوەتانە (کاکلاغە)ی گەردی**
**بابێ جەمیل و مەجیدی**
**دەردێننەوە لە بەندیخانێ هەولێرێ.**
**یان دەڵێ:**
**دەیانگرت قەراتەکەی پیرە هەولێرێ**
**وەکی دەیانکوشت ڕەشیدی باش چاوەش**
**دەریان دینا کاکلی بابێ جەمیلی**
**لەگەر کۆمەرەکی قاتیلان**
**بەزەبری خەنجەرێ لەبەندیخانێ.**

لەناوەڕۆکی حەیرانەکان وەک دەرمانبڕی ناوی کاکلاغا و جەمیل و مەجیدی کوڕی هاتووە، وەکو دەست نیشانمان کرد، ئەو خێڵ و تیرە و هۆزانە ناکۆکی لەنێوانیان هەبووە، کاکلاغا لەگەڵ دزەییان نێوانیان ناکۆکی تێدەکەوێ، شەڕ لەنێوانیان ڕوودەدا، بەهۆی ئەو ناکۆکیانە عوسمانییەکان

کاکلاغای گەردی و مەحمود ئاغای دزەیی دەگرن لەقەلای هەولێر بەندیان دەکەن.

هەندێک هۆی گرتن و بەندکردنی ئەوانە دەگەڕێننەوە بۆ یاخی بوون و راوەستانیان لەدژی دەسەلاتی عوسمانیەکان لەوانەیە وابێ، ئەوانە باج و سەرانەیان نەدابێتە عوسمانییەکان ئەوانیش لەبری ئەوە ئاگری ناکۆکیان خۆش کردبێ و وەک نیشان دانی هێز و دەسەلاتیش جاروبار بەندیان کردبن، بەهەر جۆرێ کاکلاغەی گەردی و مەحمود ئاغای دزەیی لەبەندیخانەی عوسمانییەکان لەقەلای هەولێر دەگیرێن، دزەییەکان هێز و توانا و دەسەلاتیان دەبێ و زەبر لەمست بوون، بۆیە گەورەی خۆیان مەحمود ئاغا رزگار دەکەن، کاکلاغا دەمێنێ، دوای ئەم رووداوە لەترسی پاشەڕۆژی خۆی داوا لەخزم و کەس و کاری دەکات لەبەحرکە بێن هێرش بکەنە سەر بەندیخانە و سەرای حکومەت و ئازادی بکەن، ئەوانیش هەردوو کوڕەکەی جەمیل و مەجید ئاغا لەگەڵ خورشید ئاغای مامیان چەندین کەسی دیکە لەخزمانیان بە لەشکرێک کۆدەکەنەوە بەشەو هەڵدەکوتنە سەر بەندیخانە و دەرگا دەشکێنن کاکلاغا رزگار دەکەن، ئەم شێوە هەڵکوتانە بۆ سەر دەزگا و دامەزراوی دەوڵەتی عوسمانی، وەکو راپەرین و یاخی بوون دەکەوێتە بەرچاو، حکومەت بەراوەستان لەدژی دەسەلات لەقەڵەمی دەدات، رووداوەکەش بەشێوەیەکی بەرفراوان لەناو خەڵک بلاودەبێتەوەو کار لەناوو ناوبانگی دەسەلاتی عوسمانی دەکات، بۆیە حکومەت بەمە تەنگاو دەبێ، دوو لەشکر لەمووسڵ و کەرکووک کۆدەکاتەوە بەسەرۆکایەتی (قەلا ئاغاسی و دەوڵەت یار)، دەڵێن: دزەییەکانیش هاوکارییان کردوون، لەشکری عوسمانی بەحرکە دەگرێ دیوەخان و ماڵی کاکلاغا ئاگر تێبەر دەدەن، لەشەرێکی بەرگری خێرادا کاکلاغە و پیاوەکانی بەگوندی (دێرە) پاشەکشە دەکەن دەچن لای هەمەوەندەکان دەگیرسێنەوە، پاشان لەوێ ئاکنجی نابن دەچنەوە ناو خاکی ئێران و لەوێوە ئاودیو دەبن بۆ (شەمدینان) لای شێخ محەمەدی سەدیقی کوڕی شێخ عوبێدوڵلای نەهری رێبەری شۆڕشی ١٨٨٠ لە کوردستانی باکوور دادەمەزرێن. شێخ محەمەد سەدیق لای سوڵتان عەبدولحەمید بڕیاری لێبوردنیان بۆ دەردەکات، بەمجۆرە دوای (٦) مانگ وەک دەڵێن: لە ئاوارەیی و دەربەدەری کاکلاغا دەگەڕێتەوە بەحرکە بەم بۆنەیەوە خەڵک چاویان پاکژ دەکەنەوە ئەمەش نەریتێکی کۆنە بۆ دوورخستنەوەی لە ئاشووب و شەڕ ئەنجام دەدرێت، ئەمە سەربردەی ئەو رووداوە بوو کە لە میانی شیتەڵکردنی دوو دەقی حەیران لێکمان دایەوە و خستمانە روو، دیارە ئەدەبی میللی و فۆلکلۆری وەک ئاوێنەیەک بۆ رەنگدانەوەی ژیانی کۆمەڵگە، بەشێکی زۆر لەبەسەرهات و رووداوی لەم جۆرەی لەخۆ گرتووە، لەمیانی دەقە فۆلکلۆریەکان ئاماژە بە رووداوەکان دەکرێ، کەواتە ئەدەبی میللی ئامرازی گوزاش کردن بووە بۆ دەربڕینی قسەی ناوەوەی دەروونی کۆمەڵ، بەهۆیەوە پەنجە درێژ کراوە بۆ ئەو پێشهات و گۆران و بارودۆخەی هەبووە، رووداوە گرنگەکان، بەسەرهاتە گەورەکان، ئەوانەی کە ناوەندی کۆمەڵ و خەڵکیان هەژاندووە، چوونەتە ناو بەیت و لاوک و حەیران و جۆرەکانی دیکەی گۆرانی و دارشتن و هۆنینەوەی ناوەڕۆکیان رەنگیان داوەتەوە و تۆمار بوونە، مانەوەو پێزانینی ئەو بەسەرهاتە دیرۆکیانە لەرێگەی ئەدەبی میللی، نیشانە و هێمای ئەوە بەدەستەوە دەدات کەوا ئەدەبی فۆلکلۆری لە قۆناغێک لەسەردەم و رۆژگاری کۆن رۆڵی سەرەکی هەبووە لەناو خەڵک. ئامرازی دەستی کۆمەڵ بووە بۆ پاراستنی خەسڵەت و داب و ئاکاری ئەوکات.

سەرچاوەکان:

١- ئەحمەد حەیران، دیوانی حەیران بێژان، ١٩٨٨.
٢- نوری یاسین هرزانی- عەبدوڵلا خورشید، دابینکاری رێکخستنی کۆمەلایەتی لە کۆمەڵگەی گوندنشینی کوردەواری - توێژینەوەیەکی ئەنترۆپۆلۆژییە دەربارەی گوندی بەحرکە- گۆڤاری هەولێر، ژمارە (١)، ١٩٩٨.
٣- ئەحمەد حەیران، قەفتێک لە حەیرانەکانی بەندبێژی میللی مستەفا حەسەن گەزنەیی، گۆڤاری هەولێر، ژمارە (١١)، ٢٠٠١.

# حەیرانی سەید حەسەنی رەشوانی

ئەحمەد حەیران

حەیران ئەو جۆرە هونەرە میللیە رەسەنەیە، كە لەگەڵ پێكهاتنی كۆمەڵگەی كوردەواریدا سەریهەڵداوە، دیرۆك و سەرجەلەی حەیران زۆر كۆنە، رەنگە بەشی هەرە زۆری دەقە زۆر كۆن و لەمێژینەكانی فەوتابن و نەكەوتبنە بەر دەست، مێژووی حەیران لەرێگای دەقە پارێزراوەكانیەوە و بە هۆی پێكهاتەی وشە و رستە توند وتۆڵ و گرێدراوەكانییەوە دەتوانرێ دیاری بكرێ و بخەملێنرێ، كە ئەمەش زۆر شۆڕنابێتەوە بۆ قۆناغە كۆنەكان، بەڵكو ئەوپەڕی تاسەردەمی عوسمانییەكان دەچێ، بەڵام ئەگەر هەواو دەنگی حەیران بكرێتە بەڵگە بۆ مێژووی ئەم جۆرە مەقامە میللییە رەسەنە، ئەوا رۆژگارێكی زۆر كۆن كە بەناخی مێژوودا دەچێتە خوارەوە بەبالای حەیران دەبرێ، ئەمەش دیاریكردنی ئاستەنگە، دەنگ لەگەڵ مرۆڤدا هەبووە، حەیران هەڵبڕینی دەنگە، كەواتە حەیران و مرۆڤ ئاوێتەی یەكترین، هاوكات لەگەڵ ئەم تێكەڵاوبوونەدا، سەربردە و رووداوەكان بوونەتە كرۆك و ناوەڕۆكی هەندێك دەقی حەیران، كە لەڕاستیدا ئەمە پیشەی حەیران نییە، بەڵكو ئەركی پاراستنی بەسەرهاتەكان، لاوك دەیانگرێتە خۆ، حەیران زۆر بەكەمی رووداو لەخۆ دەگرێ، مەگەر لەرۆژگاری خۆی ئەو بەسەرهاتە كە زۆر گەورە و كاریگەر بوایە، ئەگینا ناوەڕۆكی حەیران ئاماژەی بۆ نەدەكرد، حەیران بەرهەمی گوندە، دابونەریتەكانی قۆناغی خێڵەكی و ژیانی دەوارنشینی و ئاژەڵداری و كشتوكاڵی لەگەڵ خۆیدا پاراستووە، رەوشت و نەریتی دیوەخان و بەهاو دابی گشتیی كۆمەڵایەتی لەخۆ گرتووە، ئەم چەمكانە تاڕادەیەكی زۆر پێكهاتەی ناوەڕۆكی حەیران دەگرنە باوەش، لێرە ئاماژە بەناوەڕۆكی حەیرانێك دەكەین، كە رووداوێكی كۆمەڵایەتی گرتووەتە خۆ، ئەویش خۆشەویستی نێوان كچ و كوڕێكە، بۆ نزیكەی (١٦٠) ساڵ بەر لەئەمرۆ دەگەڕێتەوە و لەگوندی (رەشوان) روویداوە، ئەم سەربردە كۆمەڵایەتییە ترسناكە، بەشێوەی تراژیدیا و مەرگەسات كۆتایی نەهاتووە، بەڵكو بەشێنەیی و لەسەرخۆ چارەسەر كراوە، بۆیە بووەتە رووداوی رۆژگاری خۆی و لەئەدەب و هونەری میللیدا رەنگی داوەتەوە، رووداوەكە دەگەڕێتەوە بۆ گوندی (رەشوان)، گوندی رەشوان گوندێكە لەسەر رووباری بەستۆڕە، نزیكەی (٢٠) كیلۆمەتر لە شارۆچكەی عەینكاوە دوورە، سەید حەسەن سەید ئەحمەد سەید محەمەد لەو گوندە هاتووەتە دنیاوە، (سەید حەسەن) بەهۆی (سەید ئەحمەدی دەربەند)ییەوە، جارێكیان دەچێتە لای پاشای گەورە لەرەواندز، پاشای گەورە لەساڵانی (١٨٢٠) تا (١٨٦٣)دا فەرمانداریی میرنشینی سۆرانی لەرەواندز كردووە، لەو سەردانەدا سەید حەسەن لای پاشای گەورە دەمێنێتەوە، لای ئەو پێدەگا و پەروەردە دەبێ، بۆیە ئازا و چاپووك و چاونەترس دەردەچێ، پاشا پێی دەڵێ: «سەید دەتەوێ لەكوێ بتكەمە

سەرکردەو کارگێڕ؟»
ئەویش دەڵێ: «جەنابی پاشا (رەشوان)م لەهەموو جێگایەک پێ خۆشترە.»

بەم پێیە دەکرێ بە فەرماندار و گەورەی گوندی رەشوان، لەوێوە فەرمانڕەوایی ناوچەی خۆشناوەتی دەکات، تا دەگاتە زێی پردێ و زێی بادینان و دەشتی قەراج، دەقی ئەم حەیرانەی پێوەندیی بە رووداوەکە هەیە، بەمجۆرەیە:

**حەیران سبیانە، سبیانەکی گەلە سارە**
**زەینێ خۆم دەدایێ.**
**لەسەری حەیرانەکەی من کەتیە بارەکی هوردە خوسارە**
**کوڕ دەرێ:**
**لەپێش گێیانم گەلە خۆش دێ**
**عەوەت عەوەتی سواران**
**نوسکەیێ تاژیان**
**بۆنی بارووتێ.**
**دەنگی هەرامە جامبێزاران**
**بەژنێ باریک ئەوا سواریان کرد بەنوێژەکەی نیوڕانێ**
**ئاگرم بەربووە هەناوی**
**ئەوە سەبر سەبر دەگریێ لەبن ئارایێ فرمێسکان بەردەداتەوە**
**کەس نایبینی، ئیللا لەپێش چاوێ من گەلە جوان دیارە**
**جەمیلاغە دەستم ناتگاتێ**
**سەید حەسەنی رەشوانێ**
**سەد جاران بەتوو هاوارە.**

دەڵێن (١٦٠) ساڵ لەمەوبەر لە گوندێکی نزیک گوندی رەشوان ماڵێکی دەوڵەمەندی خاوەن جووت و مەڕومالات، ئەو ماڵە منداڵێکی هەتیووی بێ دایک و باوک بەخێو دەکەن، ئەم منداڵە تا گەورە دەبێ لایان دەمێنێتەوە، بۆیە دەیکەنە ناوماڵی خۆیان و لەماڵەوە خزمەتی خۆیانی پێدەکەن، رۆژگار دێت و دەڕوا کوڕە گەورە دەبێ و لەخۆی دەخەفتی، ئیتر بەرە بەرە تاوای لێدێت لەگەڵ کچی ماڵەکەدا دەست تێکەڵاو دەکەن و دڵیان لەگەڵ یەکتردا دەگۆڕنەوە. بەمجۆرە خۆشەویستییەکی لەڕادەبەدەر، لەنێوانیاندا دەست پێدەکات، بۆیە هەردووکیان سوێند دەخۆن و دەڵێن:

**سوێند بێ بە ئاگری نەورۆز**
**سوێند بێ بەهەموو شتێکی پیرۆز**
**یان بۆ یەکین یان بۆ گڵ و هۆز**

بەکورتی دەڵێن (یان بۆیەکین یان بۆ گڵین) ساڵان دێت و دەڕوا ئەم خۆشەویستییە پەرە دەستێنێ، بەڵام زۆر نهێنی دەبێت، نەکەس پێی دەزانێ، نەکەس درکی پێ دەکات، چونکە جیاوازییەکی زۆر لەنێوانیاندا هەبووە، کوڕە هەژار و فەقیر و خزمەتکار، کچەکەش دەوڵەمەند و ناودار و خاوەن پایە، ئیتر کار بەمجۆرە دەڕوا تا رۆژێک هەر لە گوندەکانی دەوروبەری رەشوان، پیاوێکی دەوڵەمەندی خاوەن ماڵ کچەکە بۆ کوڕەکەی داخوازی دەکات، ئەوانیش رەزامەندی دەردەبڕن و دەیدەنێ. بەپێی نەریتی ئەوسا کابرا نزیکەی سەد سوارێک بۆ بووک گواستنەوە ئامادە دەکات. بەم پێیە بووک سواری ئەسپێکی رازاوە دەکەن و دەڵێنە کوڕەی خزمەتکاری ناوماڵ، تۆ وەرە سەری ئەسپی بووکێ راکێشە، ئەویش بۆ ئەوەی رازو نهێنییەکان ئاشکرا نەبێ، بەناچاری مل بۆ داواکەیان شۆڕدەکات و سەری ئەسپی بووکێ رادەکێشێ و دەکەونە رێگا، ئیتر بەرە بەرە کوڕە برینی دەکولێتەوەو گڕی دڵداری پشتی لێ دەستێنێ و هەراسانی دەکات، بۆیە هەوڵدەدا خۆی بکوژێ، بەڵام هیچی پێ ناکرێ، کۆچ و کۆچباریش دەڕواو سوارەکانیش لە کەیف و بەزم و رەزمی خۆیان، ئەم ناوە دەهێننە هەژان، دەست بەتەڕدانێ و تەقوهۆڕ و جیلتبازی دەکەن. دەڕۆن، کاتێ (چێشتان) دەگەنە نزیک گوندی رەشوان و لەنزیک قەڵای گوندا تێدەپەڕن، کوڕەکە هەست دەکات ئەمە گوندی سەید حەسەنی رەشوانە، هیچی پێ نامێنێ، لەداخان، بە گریانەکی زۆر بەکوڵ ئەو حەیرانە دەڵێ، کە دەقەکەیمان نووسیوە. سەید حەسەنیش لەگەڵ جوامێر و ردێن سپیانی ئاواییدا، لە دیوەخانی قەڵا دادەنیشێ و خەریکی قاوە خواردنەوە دەبن، کاتێک هەست بەدەنگە دەنگی سواران دەکات و گوێی لە دەنگی حەیرانەکە دەبێ، روو لەدانیشتوانی دیوەخان دەکات و دەڵێ: «دەنگی حەیرانێکی زۆر غەریب دێتە گوێم، بڕۆن بزانن ئەوە چییە؟.» ئەوانیش دەچن - کاتێ دەبینن ئەوا کاروانی سواران بەبن قەڵاتی رەشوان-دا

دەڕوا، کوڕێکیش سەری (ئەسپ)ی بووک رادەکێشێ و لەبەرەخۆی هەر دەگرێ و حەیرانێک دەڵێ، دوا کۆپلەی حەیرانەکەش وەکو لە دەقەکەدا نووسیومانە: (جەمیلاغە دەستم ناتگاتێ، سەید حەسەنی رەشوانێ، سەد جاران بەتوو هاوارە» دەگەڕێنەوە و دەڵێن: «ئەوا کۆچ و کۆچباری بووکێک رەتدەبێ، بەڵام کوڕێک زۆر بە غەریبی دەگرێ و ئەوەندەی تێگەیشتین، کەوا کوڕەکە خۆی دەخالەتی تۆ دەکا، بۆ ئەوەی فریای بکەوی» ئەویش دەڵێ: «کەواتە ئێستا چێشتانە و کاتی نان خواردنە، برۆن پێشیان لێبگرن، با لادەنە گوند و نان بخۆن». ئەوانیش دەچن بەرایی سواران بۆناو گوندی رەشوان دەگێڕنەوە، ئیتر سوار هەمووی لەگوندی رەشوان دادەبەزن و لەوێ نان دەخۆن، ئینجا سەید حەسەن دەڵێ: «کێ بوو ئەو کوڕەی حەیرانەکەی دەگوت؟ بۆم بانگی بکەن.» ئەوانیش بانگی دەکەن و دەیبەنە لای سەید حەسەن. ئەویش دەیباتە دیوەخان و لای خۆی دایدەنێ و دەڵێ: «کوڕم سەربردەی تۆ چییە؟ پێم بڵێ ئەم گریان و حەیران گوتنەت لەچییە؟» کوڕەکەش وردو درشتی سەربردەی خۆی بۆ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: « ئەمەیە سەربردەی من، بۆیە هیچ چارم نەما، ناچار بووم هاوار بۆتۆ بێنم.» ئەویش پێی دەڵێ: «"کوڕم ئەتوو لەکچەت وییە؟" دەڵێ:"بەڵێ، حەز دەکەن بانگی کەن". بەم پێیە بووکەش بانگ دەکەن.پێی دەڵێ:" راستە کچم تۆ لەگەڵ ئەم کوڕەدا دڵتان بەیەکەوەیە.» بووکەکەش دەڵێ: ...گەوردم ئێمە ماوەیەکی زۆرە شەیدای یەکترین، بەڵام لەبەر ئابڕووی خۆمان لای کەس باسمان نەکردووە و نەمان درکاندووە، ئێستا وادەزانم بۆناو ئاگری دۆزەخم دەبەن، بەڵام چی بکەم چارم ناچارەو هیچ دەسەڵاتم نییە؟» دوای ئەم قسانە سەید حەسەن، خاوەن بووک بانگ دەکاتە لای خۆی و بەدوای زاواشدا دەنێرن، دێت، سەید حەسەن زاوا لەدیوەخانێ بەرانبەر خۆی دادەنێ. پێی دەڵێ: "کوڕم تۆ خێر لەم ئافرەتە نابینی، چونکە دەبێتە سەبەبکاری دوو دڵان، دووکەس لەیەکتری دەکەی، ئەوە بە کەڵکی تۆ نایێ، وەرە دەستی لێ بکەوە.» زاواش دەڵێ: «باشە چی بووە بزانم، ئاخر لەسەر چی دەستی لێ بکەمەوە؟" سەید حەسەن- یش سەربردەکەی بەتەواوی تێدەگەیەنێ، بەم قسانە زاوا بڕوا دێنێ و بێ کێشە و دۆخە دەستی لێهەڵدەگرێ، ئینجا سەید لەبری ئەم پیاوەتییەی زاوا، پێی دەڵێ: «ئەوە گوندی رەشوان لەپێشتە، زیاتر لە (٣٠٠) ماڵ دەبێ، بە ئافرەتی جوان ناوبانگی دەرکردووە، هەموو ئافرەتانی گوند بە کچ و ژنەوە ئێستا لەدەرەوەی ماڵێ، لەحەوشەکاندا نان دەکەن و مەشکە دەژەنن، برۆ لە ئاوایی بگەڕێ، کامەت بەدڵە دەستی لەسەردانێ تا بۆتی بخوازم و لێتی مارە بکەم و بیکەمە حەڵاڵی تۆ، مەسرووفات و پێداویستیش، هەمووی لەسەرخۆم، بەخۆم بۆت دەژمێرم». کابرا دەڵێ: «فەرمایشتە گەورەم، دەست لە بووکە دەکاتەوە، کامە ئافرەت گەردەن کێل و گران و سەنگینە، پەنجەی لەسەر دادەنێ، کچێکی شۆخ و شەنگ، لە بنەماڵەیەکی ناسراو و دەوڵەمەند، دیاری دەکات.سەید حەسەن- یش زۆر پوختە لێی مارە دەکا و زۆر بەرێو جێ بەرێیان دەکا، ئەوانی تریش کوڕە هەژارەکە و بووکە، لەیەکتری مارەدەکات و لای خۆی لەگوندی رەشوان دەیانهێڵێتەوە، ماڵ و خێزان پێکدەهێنن، دوای چەند ساڵێک، خاو و خێزانێکی جوانیان لێدەکەوێتەوە و ماڵ و حاڵێکی باش دروست دەکەن، ئیدی ئەم بەسەرهاتە لەناوچەکە دەنگ دەداتەوەو خەڵک باسی دەکەن و دەبێتە رووداوی رۆژگاری خۆی، بۆیە لەئەدەبی میللیدا رەنگ دەداتەوە و دەچێتە ناو حەیران و بەستە و لاوک، تەنانەت دەبێتە چیرۆکی بەرئاگردان و خەڵک شەوانی دوور و درێژیان پێ بەرێ کردووە و کۆڕ و دیوەخانیان پێ رازاندووەتەوە...

سەرچاوە:
سەربردەی کۆمەڵە حەیرانبێژێکی کورد، سەعدوڵلا شێخانی - ١٩٨٨.

* ئەم بابەتە لەگۆڤاری (رامان) ژمارە (٤٨) حوزەیرانی ٢٠٠٠ وەرگیراوە.

# سەعدی عەلی

## تاهیر کرمانج

سەعدی عەلی یەکێکە لە حەیرانبێژ و هونەرمەندەکانی پیرە هەولێرێ، کە سەدا و دەنگ و ئاوازێکی خۆشی هەیە و پڕ سەلیقە و خاوەن ڕێچکە و دەنگی خۆیەتی و بەرهەم و حەیران و گۆرانییەکانی دەناسرێتەوە، زیاتر لە نیو سەدەش خزمەتی هونەر و ئاوازی کوردی کردووە.

ناوی (سەعدی عەلی کوڕی حاجی ئیسماعیل کوڕی عەلی ئاغا)ی زرارییە.

ساڵی ١٩٢٥ لە هەولێر لە گەڕەکی کوران لە دایک بووە، لە منداڵییەوە لە (مەحموود ڕەشید) فێری حەیرانی "ئەستێرەکم لێ هەرات" بووە، لە باوکی فێری چەند لاوکێک بووە.

لە (خدۆ و بابەکر) فێری چەند گۆرانییەک بووە، هونەرمەند هێشتا منداڵ دەبێ سەروبەند لەگەڵ گۆرانی و ئاواز پەیدا دەکات و شەیدای حەیران و گۆرانی گوتن دەبێت. لە ساڵی ١٩٤٠ دەستی بە گۆرانی گوتن کردووە و لە ساڵی ١٩٥٠ یەکەم حەیرانی لە ئێستگەی کوردی بەغداد بە ناوی (ئەستێرەکەم لێ هەرات لەلای ئێمەنێ) لەگەڵ گۆرانی (یاردکەم مەلا زادەیە) لەگەڵ (لەمنێ لەمنێ بەژنت داری سووسنێ) تۆمارکرد، بێگومان دۆستایەتی و ئاشنایەتی لەگەڵ زۆر لە هونەرمەندانی کورد هەبووە و چەندین جار بە دووقۆڵی و سێ قۆڵی لە بۆنە و ئاهەنگ و دەرفەتان گۆرانیان بۆ شەیدایانی ئاواز و گۆرانی کوردی چڕیوە. بۆ نموونە لەگەڵ ئەم هونەرمەندانە گۆرانی گوتووە:

(حەسەن زیرەک، سەید عەلی سەردەشتی و ئەحمەد شاباز و ڕەسوڵ نادری و مەولوود شەیتان و ئەحمەد شایەر، کە بە ئەحمەد مل سووتاو ناوی دەرکردبوو).

بە یارمەتی کاک (محەمەد دەرباز)ی هونەردۆستی چۆتە ئێستگەی بەغداد، تا ئێستا نزیکەی (٧٢) حەیران و لاوک و گۆرانی لە ئێستگەی کوردی بەغداد تۆمار کردووە، ئەوە وێڕای (٢١) لاوک و حەیران و گۆرانی لە تەلەفزیۆنی کەرکووک تۆمار کردووە.

**"لە کێلم دیت و لە کێلم دیت"**

**کاکە سەرێ من دێشی دەردێ لە دڵم بەژانە**
**دەچمە کەندێ شاقازی ئەوبەر ئەوبەر پاوانە**
**کیژی سەرگەڕی دێنێ بە عام کوڕیان لێدانا.**
**یەکیان خاتوون تەورێزە یەکیان ئامینە خانە**
**چاوی مێوژی ڕەشمیری ئەبرۆی ماڵی کەوانە**
**سینگ ئاقاری هەولێرێ لێم هەرگرت خەت و بانە**
**گەلاوێژی دادەنێن سوندێ دەخۆی دوکانە**
**لەبنی وەکی غەدەنگی لەسەری بنەوانە**
**ئەگەر مێردەکەت بمرێ خۆم دێمە تازیانە**
**لەکێم دیت و لەکێم دیت لە شینکەی نۆغەرانی**
**گەوارەکی داهینا چی کرد با و بارانی**
**سارد و سەرمایی بردم لە ژوانی کیژە جوانێ**
**بابی کیژەم کردە جوو دامنا لەبەر خماخانێ**

رۆژی سەد دارم لێدە کابرای بینە سەیرانێ
جۆتە کۆترەی تەقرەباز دەفڕی دەچووە ئاسمانێ
کەیفم هینا کەوی کەم لۆ خاتری تێرامانێ
لەسەر دەستم هەرفڕی چووە تاقی ئاسمانێ....

یار گەنۆ

کاکە سەرێ من دێشی دڵم دەکا ژانە ژانێ
دەچوومە سەر شینکە شینکەی گەلازێ
قــەرە رەشــمــارەکــیــان هەردابوو چل و شــەش ئەستوندەیان وەبەردابوو
چیـفی خـەت رێژەی سـەر بە گـورینگەیان لە دەورە دابوو
سێ زەری لەبن دانیـشـتـبـوو سێ زەری لەسـەریان ڕاوەستابوو
لەوان زەریان دەپرسی چاوت بۆ وا رەش و جوانە؟
دەیگۆت لەبەر کل و کلدانێ
سەری کولمەت بۆ وا جوانە؟
دەیگۆت لەبەر شەو رامۆسانێ
پەنجەی دەستت بۆ وا نەرم و عەلیمە؟
دەیگۆت لەبەر شەو گەرە دیلانێ،
دەمگۆت ئەی زەری ماڵ وێران؟ نازانی مەلەوانی شەتان و گۆمان چۆمان چنە، دەیگۆت شەهێنن، سەقەرن. شەنقارن. مراوینە. دەمگۆت فەسرەک دادێ لە فەسری بەهارێ لەمن شێن دەبن هەلاێ و سوسێن و بەیبوون لەگەڵ گورە بەرۆنە کیـهـەیان جوانن
کیهەیان مەحبووبن لەسەر ئەوی کاولە دونیایێ؟
دەیانگۆت بچنە خزمەت شەماری. شەمار پیاوەکی گەڕیدەیە
گـەلەک گـەردوون و گـەردۆشی کـردیە لەسـەر ئەوی کاولە دونیایێ.
شـەمـار دەیگۆت هەمـوتان جـوانن. مـەحـبـووبن هەمووتان لایەقن

بەلام چبکەم عومرتان زۆر کـەمە هەندەکـتـان دەچنە رەندۆلێ
زەرزایە قەندیلی مامە کۆییان کۆسرەتی شاڵەبەگیان سەری
کوێسـتـانان بن کەوێ بەفران بەوی بانگی هاوینێ دەچنە باجی
فـەنایێ. بەس ئەمن گـورەکم هەیە لە گـوری لقـایێ ئەگەر وەکی
ئەو گورەبانە باش بوو. ئەکو هەمووتان نابن بە تاقە ماچەکی
ئەمن دەکەم لەسەر کورمەی شیرین لەیلایێ.
جـوابەکم لەبۆ بنێـرن لەبۆ سـەلەفـەکی سـواری ئاکۆییان، جوابەکی
دیم لەبۆ بنێرن لەبۆ سەلەفەکی سواری مەنگوڕان، جوابەکی
دیم لەبۆ بنێرن لەبۆ سەلەفەکی سواری پیران، لەگەر سەلەفە
سوارەکی میـراوە دەلیـان دەچووینە سەر گردی خەم رەوێن
لەبۆ کەیف و سوحبەت و لاقرتیان هەرمان دەستوان پەل کورتی
گوێ مەقەستی گوێ نیشان تێمان بەردا سەک مانی تاژیان دەبووە هەرات هەراتی سواران.
ڕەنگینی ئاوزەنگان بەوی نگی مەعزیبێ لە توزەکی گەردوونمان
وەردەدا لە هەسپی خۆم دەهاتمە خوارێ هەڵم دەکێشا سی کاردەکی چار پولەکە زەرد لەسەری پەل کورتی گوێ مەقەستی
گوێ نیشان دەدا بەری خۆمان دەدا دیوەخانێ
حەماغەی دەقناوێ هەزار سلاوەتمان لە دیداری
پاکی پێغەمبەر لێدەدا..

* ئەم بابەتە لە کـتـێـبی (ژیان و هونەر)ی تایەر کرمانج، بەرگی یەکەم، ساڵی ۱۹۹۰ وەرگیراوە.

# "فەقێ سمایل"ی حەیرانبێژ
# ١٨٧٦-١٩٤٣

جەلال خدر

حەیرانبێژ و غەزەل خوان و مەولوود خوێنی بەناوبانگ، فەقێ سمایلی کوڕی فەقێ ئەحمەدی پەلکانە، لە ساڵی ١٨٧٦ لە گوندی پەلکانەی سەر بە شاری هەولێر چاوی بە دنیای گەورە رووناک کردۆتەوە... لە هەندێ کەسی ترم بیستووە دەڵێن فەقێ ئەحمەدی باوکی بە ئەسڵ خەڵکی رۆژهەڵاتی کوردستان بووە، لە پاشان بۆ خوێندن رووی لە شاری هەولێری قەڵا و منارە کردووە و چۆتە خزمەتی مامۆستا مەلا عومەر ئەفەندی لە مزگەوتی گەورەی قەڵاتێ، کە دەکاتە (باوکی مەلا فەندی) لای ئەو خوێندوویەتی، لە پاشان ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە، لەسەر فەرمانی ئەویش چووەتە گوندی پەلکانەو لە دێ ئیمامەتی و پێشنوێژی کردووە، لە پاشان ژنی هێناوە و ئەو تاقە کوڕەی هەبووە.

فەقێ سمایل لە تەمەنی (٧) ساڵان دەخرێتە بەر خوێندن، سەرەتا لای باوکی دەست بە خوێندنی (جزء عەمەو تەبارەکە و کتێبی ئەحمەدی) و چەندین کتێبی بچووک دەخوێنێ، لە پاشان واز لە خوێندن دەهێنێ و دەست بە کاسبی کردن دەکات. لە تەمەنی (١٨) ساڵان بۆ کاسبی روو لە شاری هەولێر دەکات. لەبەر ئەوەی دەنگی زۆر خۆش بووە لە دیوەخانەکانی پیاو ماقووڵانی ئەو شارەدا لاوک و حەیرانی چڕیوە.

لە ساڵی ١٩١٤ کاتێک یەکەم جەنگی جیهانی دەستی پێکرد لەو ماوەیەدا لە شاری هەولێر و دەوروبەری رەشبگیر دەگیرێ، ئەوەی دەستگیر کرابوایە. ئەوا رەوانەی ناو ئاگری شەڕی سەفەربەلگ دەکرا... فەقێ سمایلیش خۆی دەرباز دەکات و روو لە رۆژهەڵاتی کوردستان دەکات و بۆ ماوەی سێ ساڵ لە شاری سابلاغ دەمێنێتەوە. لە ساڵی ١٩١٧ کاتێک سوپای روسیای قەیسەری هێرشێکی بەربلاو بۆ سەر رۆژهەڵاتی کوردستان و عێراق دەکات هەر لە رەواندز تاوەکو ناوچەی خانەقین و دەوروبەری دەگرێتەوە. ئەویش ناچار دەبێ بگەرێتەوە باشووری کوردستان و بە رێگای شاری سولەیمانی و کەرکووک روو لە شاری بەغدای پایتەخت دەکات.

ماوەیێک لە شاری بەغدا کاسبی دەکات و لە پاشان گرانی دادێت و برسیەتی و قات و قڕی سەرتاسەری وڵات دەگرێتەوە، ئەویش ناچار دەبێت روو لە شاری نەجەف بکات... لەبەر ئەوەی دەنگی زۆر خۆش بووە، خەڵکی ئەو شارەش وا دەزانن لە دەنگخۆشەکانی شیعەی ئێرانە، چونکە فەقێ سمایل زۆر بە جوانی مەقامی دەشتی فارس و مەسنەوی و حیجازی خوێندووە.

خەڵکی شاری نەجەف زۆر رێزی لێ دەگرن و بۆ ماوەی چەند ساڵێک لەوێ دەگیرسێتەوە... لە پاشان لە ساڵی ١٩٢٤ بە یەکجاری دەگەڕێتەوە شاری هەولێر و لە گوندی پەلکانەی مەنزڵگەی زێدی باب و باپیرانی نیشتەجێ دەبێ... لەو ماوەیەشدا بە بەردەوامی هاتوچۆی شاری هەولێری دەکرد بە تایبەتی، لە دیوەخانی مەلا ئەفەندی و محەمەد ئەفەندی موفتی و عەلی پاشای دۆغرەمەچی و ئەدیب ئاغای ئەسعەدی و تەکیەی شێخ شەریف و شوێنەکانی دیکە میوان دەبوو، بەو دەنگە خۆشەی قەسیدەی لە ستایشی پێغەمبەری مەزن (د.خ) دەخوێند.

مام نورەدین موختار بۆی گێڕامەوە گوتی: من زۆرجار ئەو فەقێ سمایلەم دیوە کورتەک و شەڕواڵی لەبەر دەکرد و مەندیلێکی سپی لەسەری دەناو عەبایەکی رەشی سورمەداری دەخستە سەرشانی و دەهاتە تەکیەی شێخ

شەریفی خالّم، کە ئەو کاتە لە قەلاّتێ بوو. بەشداری لە حەلەقەی زکر دەکرد و بەو دەنگە خۆشەی شیعر و قەسیدەی لە ستایشی پێغەمبەری مەزن دەخوێند و زۆرجاریش شان بە شانی دەنگخۆشەکانی ئەو شارە وەک (سەید مەردان) و (عەلی کوێر) و (حاجی عەبدوللآی دەفژەن) دەنگی هەلّهێناوە... بۆ ماوەی چەند رۆژێکیش لە مالّی خالّم دەمایەوە لەپاشان لە شار و گوندەکانی کوردستان دەگەڕا... دواجاریش پاش شۆڕشی رەشید عالی گەیلانی لە سالّی ١٩٤١ ئەو فەقێ سمایلەم دیت هاتە مزگەوتی قەلاّتێ و لە حوجرەی محەمەد ئەفەندی موفتی (کە دەکاتە باوکی رەشاد ئەفەندی) میوان بوو، بەلاّم لە پاشان چاوم پێنەکەوتەوە.

لە لایەکی دیکەشەوە مامۆستای خوالێخۆشبوو جابر پیرداودی هونەرمەند (١٩٢٥-٢٠٠٢) بۆی گێڕامەوە گوتی: فەقێ سمایل دەنگی زۆر خۆش بوو، بە بەردەوامی هاتوچۆی تەکیەی شێخ عەبدولکەریمی دارەخورمای دەکرد، بەو دەنگە خۆشەی مەولوودی لە ستایشی پێغەمبەری مەزن دەخوێند، گەلێک شیعری شاعیرانی کوردی لەبەر کردبوو، منیش هەموو جارێک دەچوومە تەکیەو گوێم بۆ ئەو دەنگە خۆش و زولاّلەی رادەگرت... فەقێ سمایل عادەتی وابوو بە تاقی تەنیا دەگەڕا و کە هەرجارێک دەهاتە تەکیەی دەفەکەی بە دەستەوە بوو.

سەید ئیبراهیمی بەرزنجی (١٩١٢-٢٠٠٣) مەولوودخوێن و دەنگخۆشی شاری هەولێر بۆی گێڕامەوە گوتی: لە کاتی خۆیدا گەنج بووم لەگەلّ دەروێش رەمەزانی سولەیمانی (زڕ باوکم) بەشداریم لە مەولوودی پێغەمبەری مەزن دەکرد لەو شارەدا، زۆرجاریش لە دیوەخانی پیاو ماقوولاّن دەعوەت دەکراین و شانبەشانی (شەهابە و سەید مەردان و حاجی وەلی چایەچی و عەلی کوێر مەقاماتمان دەچڕی، زۆرجاریش ئەو فەقێ سمایلەش بە گەلّمان دەکەوت، شیعر و قەسیدەی دەخوێند، دەنگی زۆر خۆش بوو... فەقێ سمایل جگە لە خوێندنی مەولوود و قەسیدە دەستێکی بالاّی هەبوو لە لاوک و حەیران خوێندن، لەبەر ئەوەی گەڕۆک بوو بە بەردەوامی هاتوچۆی (کاکی هیرانی) دەکرد و زۆرجاریش دەچووە شاری کەرکووک و لە تەکیەی تالّەبانی بەشداری لە حەلەقەی زیکر و تەهلیلەی تەریقەتی قادری دەکرد لەلای شێخ عەلی تالّەبانی میوان دەبوو. زۆرجاریش دەچووە شاری سلێمانی دۆستایەتی لەگەلّ دەنگخۆشەکانی ئەو شارە وەک: (حەمدی ئەفەندی چایەچی و عەلی کاکە و مەلا کەریمی ساحێب قەوان و دەروێش عەبدوللاّدا هەبووە، هاتوچۆی رۆژهەلاّتی کوردستانی دەکرد، دۆستی نزیکی سەید عەلی ئەسغەری کوردستانی بوو.

فەقێ سمایل خەسلّەتی وابوو لە کاتی مەولوود خوێندنەوە یان قەسیدەدا دەستی بە سەلاّوات لێدان دەکرد، بەدەم خوێندنی مەقامات و دەف لێداندا دەیگوت:

خوادا یەکە بە دوو نابێ
بەحری عیلمەو شێلوو نابێ
کەس لە رەنگی ئەو نابێ
سەیدی عالەم سەلّەوات

* * *

ئەی حەبیبی حەبیبوللا
ئامینە درا بە عەبدوللا
لێی ئیجاد بوو رەسوولوللا
سەیدی عالەم سەلّەوات

* * *

لە عاسمانان تۆم ئەحمەدی
لە رووی زەمین محەمەدی
ساف لە نووری ئەحمەدی
سەیدی عالەم سەلّەوات

* * *

ئەو دنیایە سەران سەرە
کێوی لێ کرد بە لەنگەرە
محەمەد و سەر عەسکەرە
سەیدی عالەم سەلّەوات

* * *

سەبارەت بە لێهاتوویی لە لاوک و حەیراندا فەقێ سمایل باسی داگیرکردنی بەندیخانەی عوسمانییەکان لە قەلاّتێ لەلایەن عەشیرەتی گەردییەکانەوە کردووە، کەوا چۆن توانییان (کاکل ئاغای گەردی) لەو بەندیخانە گەورەیەدا رزگار بکەن، لە هەمان کاتیشدا بتوانن (رەشید باشچاوش) بکوژن و بۆ مێژوو لێرەدا پێمان خۆش بوو ئەوە بلّێین، کە نابێ ئەوەشمان لەیاد بچێ کەوا چەندین کەسایەتی ناسراو و بەرچاوی ئەو شارە وەکو (حاجی عەبۆ ئاغای عوزێری و حاجی عەبدولرەزاق ئاغا و وەهاب ئاغا و کەسانی تر یارمەتی گەردییەکانیان داوە تاوەکو بتوانن بە

سەر قەڵاتێ بکەون و کاکل ئاغا رزگار بکەن، بۆ ئەو مەبەستە فەقێ سمایل ئەم داستانە بە شانازییەوە بە بەندێک حەیران دەگێڕێتەوە و روونی دەکاتەوە کە دەڵێ:

**دەرێم ئەورۆکە بەوێ سبیانێ**
**زەینێ خۆتان بدەنە بەستۆرە**
**دەرێم بەستۆرەی گۆرانان گەلە شیرنە**
**بابە لەبەر بیانێ**
**ئەوا ئەسمەر گاز دەکا دەرێ دایە**
**ئەتوو زەینی خۆ بدە بەحرکەی جاران**
**دەرێن شێن دەگەرێ لەبەر دوکەرێ پیرە کارخانێ**
**ئەوجا دەرێ خوام بکا بە خورامی کورە کوردێ گەردییان**
**وەکی دەستی خۆیان دەداوە دارەکەی جامبێزارێ**
**دەیان گرت قەراتەکەی پیرە هەولێرێ**
**وەکی دەیان کوشت (رەشیدی باش چاوش)**
**دەریان دەینا (کاکل)ی بابێ (جەمیلی)**
**لەگەڵ کۆمەرەکی قاتیلان... بە زەبری خەنجەرێ**
**لە بەندیخانێ**

***

**تێبینی:**

هەرچەندە ئەو بەندە حەیرانە لەلایەن هونەرمەندی خوالێخۆشبوو عوسمان حەیران (١٩٢٢-١٩٦٧)، کە دەکاتە باوکی هونەرمەند تەنیا عارەب عوسمان، لە کاتی خۆی لەسەر کاسێت تۆمار کراوە، بەڵام لە راستیدا هی فەقێ سمایلە، چونکە ئەوکاتەی ئەم رووداوە رووی داوە فەقێ سمایل لە ژیاندا بووە و ئاگای لە رووداو و باسەکە هەبووە، نەک عوسمان حەیران... ئەم رووداوەش هەندێک دەڵێن ساڵی ١٨٩٥ هەندێکی تریش دەڵێن لە ساڵی ١٨٩٨ رووی داوە.

***

فەقێ سمایل زۆرجار هاتوچۆی هیران و نازەنینی کردووە و غەزەلەکانی کاکی هیرانی زۆر بە جوانی خوێندووە، بە تایبەتی ئەو غەزەلە فارسییانە کە لەسەر نەغمەی مەقامی (دەشتی فارسی) خوێندوویەتی کە دەڵێ:

**رهنمایان شریعت جمله درفرمان غوث**
**شهریاران حقیقت والەو حیران غوث**
**مسند گیتی نه یارای کمال شاهیش**
**عرش اعظم تختگاه و مرکز سلطان غوث**
**جمله ارباب طریقت کی بمنزل میر سند**
**تا نیاو یزند جان بر گوشه دامان غوث**
**قدسیان عالم بالا به ذکر نام او**
**فیج جویند از شعاع جلوه تابان غوث**
**سالکان کعبەو فیچش هزاران بایزید**
**دیدەی اقطاب هردم بردرحسان غوث**
**نان و اب مطبخ او صیقل قالب عصا است**
**محرم اسرار گردد چون طفیل خوان غوث**
**درمیان بند طانش صافی کمتر است**
**حمد الله سرفطنده بر سر میدان غوث**

فەقێ سمایل لە دوا ساتەکانی ژیانیدا تووشی نەخۆشی رشانەوە هاتووە و مەرگ مەودای نەداوە و لە رۆژی ٩ی مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٤٣ لە تەمەنی (٧٦) ساڵی کۆچی دوایی کردووە، بە دەف و عەلەم بەرەو گۆڕستانی گەورەی هەولێر دەیبەن و لەوێ بە خاک سپێردراوە. ئەو هونەرمەندە بلیمەتە چرای ژیانی بە تەواوی دەکوژێتەوە، بەبێ ئەوەی هیچ شتێکی تۆمارکراوی لە دوای خۆی بەجێ هێشتبێ، بە وجاغ کوێری سەری ناوەتەوە.

***

سەرچاوەکان:

* مەقام شوناس و دەنگخۆشەکانی شاری هەولێر، بەرگی یەکەم، دەستنووس.
* گۆڤاری هەولێر، ژمارە ٨ی پایزی ٢٠٠٠، بابەتی، دزەیی و ناوچەی دزەییاتی دەشتی هەولێر، وشیار عەبدوڵڵا، لاپەڕە ١٢٦.
* گۆڤاری هەولێر، ژمارە ١٥ هاوینی ٢٠٠٢، بابەتی فەقێ سمایل پەلکانە، لاپەڕە (١٧٧-١٨١)، جەلال خدر.

چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەو بەڕێزانەی خوارەوە:

١. خوالێخۆشبوو سەید ئیبراهیمی بەرزنجی
٢. خوالێخۆشبوو حاجی جەمیلی قابقابچی.
٣. خوالێخۆشبوو مامۆستا جابر پیرداود.
٤. سەید ئیسماعیل/ مەولوود خوێن.
٥. مام نورەددین موختار.

ئەم بابەتە لە گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر، ژمارە (١١)ی، ٢٠٠٥ بڵاوبۆتەوە.

# چەند حەیرانێک لە دەڤەری خۆشناوەتیدا

هونەر ئیبراهیم

گومان لەوەدانییە، کە دەشتی هەولێر سەرچاوەی حەیرانی رەسەن و کانگەی پێگەیاندنی حەیرانبێژی شارەزا و دەنگخۆش و نەمرە، خۆشناوەتیش بە حوکمی نزیکی لەم دەڤەرە و تێکەڵبوونی دانیشتووانەکەی بەهۆی کاروان و ئاڵوگۆڕی بەرهەمە کشتوکاڵییەکانەوە، بۆتە هۆی ئەوەی کە حەیران پەلبهاوێ و بگاتە خۆشناوەتی. ئەمە و سرووشتی جوان و دڵڕفێنی ناوچەکە کە چیاییە، تایبەتمەندییەکی دیکەی بە حەیران داوە و هەوا و ئاوازی بڵندی چیایی پێبەخشیوە.

منیش ئەم چەند حەیرانەم لە باپیرم (ئەحمەد بەگ) بیستووە و لە هیچ کاسێت و حەیرانبێژێکم نەبیستووە، جا لەبەر بەهاو گرنگی حەیران و بەو نیازەی ون نەبێت و تۆماربکرێت دەیخەمە سەر گەنجینەی بەنرخ و پڕ بەهای فۆلکلۆری کوردیمان.

دەقی حەیرانەکان:

**میریێ کیژۆران دەیان گۆ راوو تەگبیرە دەبا بەعام بچینە داران**

**دارێ خۆ بکەین لەگەری گەریان لە گەری پیرە سەنکەران**

**لەبەر خاتری کوڕ و کارێ گوندێ خۆ چێشتاوێ خۆ دێخینە گەرگەریێ بەرواران**

* * *

**ئەوجا دەرێم لەبەر خودای گەورە و لۆمەیێ عەبدان نەوێرم هەرینم دەنگێ**

**ئەنگۆ جوابەکێ بدەنە بەژنێ باریک و زەندەیێ بەبازن و سەرەکی**

**بەلاسەر لەبۆ من بنێرێ بازن و گوارە و خەزێمان هەتا بیکەمە تەنگێ میراتە تفەنگێ**

**ئەمن بە خۆم لە کیستانەکێ فەراشینم بەژنێ باریکم بەجێهێشتیە**

**لە گەرمێن و گەرمەسێرێ گەلەک مەترسیان دەکەم جۆتە شەمامە و شەمامەی باغەرێ لەبەر گەرمایێ هەرینێ تۆزۆکە و ژەنگێ**

* * *

**قاسیدەکی لەژێر راهاتی دەبا لەبۆی نەمینێم سەد جاران حەیران قاسیدەی لەژێر راهاتی**

**وەرە تا لەبۆخۆت لێ بپرسم سەر و سۆراغێ کاولە وراتی**

**ئەوجا ئەگەر ئەتو قاسیدێ بەژنێ باریک و زەندەیێ بە بازنی سەد جاران سەر هەردوو چاوێ من هاتی**

**ئەوجا حەیران هەرێمە**

**لە دەستی بازنە لە کەپوی خەزێمە**

ئەگەر رۆژێ سێ جاران ئەو غەدارەی غەدار داک نەبینم
لە من وابی لە چۆلی کاو لە قورفێمە

* * *

هەولێر مەعمورە دەبا لەبۆی نەمینێم سەد جاران
حەیران هەولێر مەعمورە
ئەمن خـــورامی ئەوان هوردە پەرچەمـــان دەبم وەکی عەسکەرەکەی
بابە رەشادی لەسەر تاقی بڕۆێ داهاتینە خوارێ تابور تابورە
بەژنێ باریک دەرێ وەتیـمـە حـەیران ئەتو پێـیـانم لە کۆشێ دەرمەینە
سمێرانم لەسەر ناسکەیێ رورمەتان هەرمەگرە هێشتا ئەستێرەکەی
بەیانی سێ گەزان لە رۆژێ دوورە.

* * *

ئەرێ بابە مـــردم هەندێ لە بۆ نائەســلان و ناعــەدلان دەرینم بەردی بناغێ
مەمکی نازدار حەیرانەکەی مـن سێوەکی لاسۆربوو لەبۆ کاکێ تو هاتبوو بە دیاری لەوراتی شنۆ و کاولە سابراغێ.
ئەوجا کوڕە تیمە حەیران دەرێ بەژنێ باریک ئەمن سەد جاران قوربانی تووبم وەکی شەوێ لە سێ باری نیوە شەوێ
لەسـەر گـولەکەی نەمـێـردان لێدەدەی دەعـیـەی لەگـەر دەماغێ
ئەوجا نە ناری حەیران هەتا کەینێ لە بۆت بناری
ئەمن نانێم مـەیلێ کـیــژان و هەوینێ برادەران هەتا بە کـومـەرەکی براو برادەران لەسـەر سنگێ من دانەنێن بەردێ وەلحەدێ پارێ خۆ نەدەمە کەنداری.

* * *

هێوارەیە رۆژ گەییە زەردی
گەردەنێ بەژنێ باریکم سوسنی بن بەردی
ئەگەر رۆژێ سێ جاران نازدار حەیرانێ خۆ نەبینم
نە چاوم دەبینی نە پێم دەگری عاردی

* * *

حەیران لە دەربەندی کۆڕێ

بوهارە لە گوێیان خۆشدێ دەنگێ سی و قورینگان، کەو و کەوباران لەگەر ئەوێ میراتە بۆرێ
بەژنێ باریکە لانە ئەمن ئەوە دەچمــە دەرێ لەکــاولە مەفتەنێ
هەتا دێمــەوە گـەلەک مـەترســیــان دەکـەم نازدار حەیرانەکەی من مەیلان بگۆڕێ.

* * *

بەغدا بەغدایە بەغدا زەمیرە
دەرکێ مارێ کچەتیمە حەیرانەکەی من دوو دەریکە بە کلیلە و زنجیرە
بەژنێ باریک وەرە لەبۆ خـــۆت هەرگـــرم بەوێ بوارێ بچینە
مەملەکەتی غەریبان ئەوسارەکە ئەحمەدە فەندی حاکمە سەعیدە سۆر وەزیرە

* * *

بابە خەمان پیرکردم خەمان چلێ بکەم
بەژنێ باریک وەرە بچینە سەر زێیەکەی پیرە بادینان
هەتا هەمانت تاق و جۆت جۆت لۆ داوێکەم
ئەوجا ئەمن لە پاشی بەژنەکی برند و ناوقەدەکی زراو نازان و گلەییان لەسەری کێ بکەم

* * *

بوهارە بۆنی گوران دێ
چارۆکەی سپییە شیرین لە ملان دێ
دوونێ هێوارێ لە رێی سەراوێ گەیشتمە پلکە پێناوێ
گۆتم بینە ماچت کەم بۆنی بەژنێ باریکەلانەت لێدێ

* ئەم بابەتە لە گـۆڤـاری ئاسـۆی فـۆلکلۆر، ژمـارە (١٠)ی سالّی ٢٠٠٥ بلاّوبۆتەوە.

# شوناسی ناو لە فۆلکلۆردا (بیری مەحموودی سەنان)

ئەحمەد حەیران

فـۆلکلۆر و ئەدەبی فـۆلکلۆری کـوردی سـەرچاوەیەکی گـرنگ و بەهادارە بۆ دیارکەوتنی ناوی شـوێن و جـێگا و بـوارە جـۆربەجـۆرەکـانی دیکەی ژیانی کـۆمـەڵگەی کوردەواری، لەوانە ناوی ژمارەیەکی زۆر لە کانیاو و گۆم و بیر و سـەرچاوە سرووشتییەکانی دیکە لە ناو جۆرەکانی گـۆرانی فـۆلکلۆری و ئەدەبی مـیللی رەنگیـان داوەتەوە، ئەگەر چاوێک بە بەرهەمە فۆلکلۆرییە کۆکراوەکاندا بگێرین ناونیشانی دەیان و سەدان بابەتی لەو جۆرانەمان دەکەوێتە بەرچاو، ئەم دیاردەیەش لە فـۆلکلۆردا رەسـەنایەتی و تایبەتمەندی فـۆلکلۆری کـوردەواری دەردەخـات، لەهەمـان کـاتیش پەیوەندیی لایەنی دەروونی ئەدەبی مـیللی و گۆرانییە دێرینەکانی کورد دەردەخا، کەوا چۆن تێکەڵ و ئاوێتـەی ژیانی کـۆمـەلایەتی دانیـشـتـوان و خـەڵک و کـۆمـەڵی کـوردەواری بوون، بوونی ئەم جـۆرە دیاردانە لە ئەدەبی فۆلکلۆری هەر نەتەوە و کۆمەڵێک خاڵێکی بەهێزە بۆ نزیکی نێـوان ئەدەب و مـرۆڤ و خـاک و ئاخی وڵات، (بیـری مـەحـمـوودی سـەنان) یەکـێکە لەو دیاردانە و شـوێنێکی دیار و ناوێکی گـەشـاوەیە لەناو ئەدەبی فۆلکلۆری دەشـتی هەولێـر، لە زۆربەی جۆرەکـانی گـۆرانی رەنگی داوەتەوە و تێـکەڵ بەحـەیران و بەسـتـە و گـۆرانییـەکانی کـار و پیشـە مـیللی و وەرزییـەکان بووە، مەحموودی سەنان ناوی (مەحموود حسێن سەنا) بووە، لە هۆزی سـورچی بووە، کـەوا هۆزێکی کـوردن لەمـبـەر و ئەوبەری زێی گـەورە - زێی بادینان ئاکنجین، ئەم هۆزە رۆژگارێک مەڕدار بوون کوێستـان و گەرمێنیان کردووە و بەدوای لەوەڕ و بەخێوکردنی مەڕومالات کۆچەر و گەڕیدە بوون، مەحمـوودی سەنان، کە خەڵکی گوندی (هەرەشێ) بووە لە دەشتی هەریر، خاوەن مەڕومالات بووە، ساڵێکیان لە کـوێسـتـانەوە بەرەو دەشتی هەولێـر دێت و ناگەڕێتـەوە ناوچەی سورچیاتی، ئەوکاتیش دەشتی هەولێر زۆر قەوغە و ئاوەدان نەبووە، دەشـتـەکـە بۆ مـەڕداری و کـشـتـوکـاڵ و ئاژەڵداری دەستـیداوە، بەم پێیە مەحموودی سەنان بەخۆ و مـەڕومـالاتەوە روو لە ناوچەی کـەندێناوە دەکـات لەبناری چیای قەرەچووغ بنەگە و باری لێدەخات و لەگوندی گاوەرە دەگـیـرسـێـتـەوە، دیارە بە پێی مـەزەندەی تەمـەندارەکـان مێژووی ئاوەدانی و نیشـتەجێبوون لە دەشتی هەولێر هەر (۲۰۰) سـاڵێک دەبێ، مەحموودی سەنان، کـە لە تیرەی (مارا باسە) کە یەکێکە لە چوار تیرە سەرەکییەکەی هۆزی سورچی، کە تیـرەکانی (مارا باس، یوسف کاسکی، مـام سار، مـام سام) دەگرێتەوە، مەحموودی سەنان، کە بنەگە و بێریان لە گوندی گاوەرە دەخەن، لەوێ سەرچاوگە ئاوێکی لێدەبێت (بیرەکی لێدەدات) بیرەکە نازناوی ئەو وەردەگرێ و دەبێـتـە بیـری (مـەحـمـوودی سـەنان) لە رۆژگـاری خۆی شوێنەکە کاروان سەرا و شوێنی تێپەڕبوونی خێر و کۆچەری و مـەڕدار و دەوارانیـشـیـان بووە، بەهۆی ئەم بیـرەوە کاروانچیان لایانداوە لەسەر ئەم بیرە پشوویان داوە، بەم پێـیە بیـرەکە ناوبانگی دەردەکـات و دەچێـتە نـاو ئەدەبی فـۆلکلۆری و لەناو حەیران و بەسـتـە و سـترانی شـایی و گـۆڤـەند رەنگدەداتەوە، بیرەکە ئێـسـتـاش مـاوە، کـەوتۆتە نێـوان هەردوو گـوندی گـاوەرە و کـەندار لەبناری چیـای قەرچووغ لە دەرکی بازارگەی نزیکە، بیرەکە زۆر قووڵ نییە هەر یەک دوو بەژن قـوڵە و ئاوی بۆ خـواردنەوە دەست

دەدات ئێستا جادەی سەرەکی مەخموور هەولێری بەسەردا دەڕوا وەک نیمچە پردێک، بیرەکە جێگەی بۆ کراوە و ئێستاش سەرچاوەی ئاوە بۆ ئەو گوندە.

**بەسەرهاتی مەحموودی سەنان**

مەحموودی سەنان پیاوێکی ئازا و چاونەترس بووە، مەڕومالاتی زۆری هەبووە، کوێستان و گەرمیانی کردووە، زستانان هەواریان لە دەشتی کەندێناوە لە بناری قەرچووغ بووە. ساڵێکیان پایزێکی درەنگ رەشماڵ و بنەگە و باریان لە بناری قەرچووغ هەڵدەدەن، رۆژێکیان مەحموودی سەنان ئارەزووی راو و شکاری دەبێت رەخت و فیشەکی لەخۆی دەبەستێ، سواری هەسپە بۆرەی دەبێ بەرەو گەلی دۆڵەکانی قەرچووغ دەکەوێتە رێ، لەپاش گەڕان و سوڕان لە یەکێ لە گەلییەکانی قەرچووغ لە ئەشکەوتێکدا چاوی بە چەند فەرخە گورکێک دەکەوێ. بیر لەوە دەکاتەوە، کە ئەو فەرخە گورگانە گەورەبن و مەڕومالات دەخۆن، بۆیە یەکەیەکە چاویان دەردێنێت و لە شوێنی خۆی بەجێیان دێڵێت بەرەو هۆبە و رەشماڵان دەگەڕێتەوە، ساڵ دەسوڕێتەوە زستان تێدەپەڕێ، هەوا خۆش دەبێ بەرەو زۆزان و کوێستان بەڕێدەکەون، دوای بەسەرچوونی وەرزی کوێستان بەرەو دەشتی هەولێر دێتەوە و لەبناری قەرچووغ لە کۆنە هەواری خۆیان بنەگە و بارگە لێدەخەن، فەرخە گورگەگانیش لە شوێنی خۆیان دەمێنن، رۆژێکیان مەحموودی سەنان لەبن رەشماڵی (٦) ئەستووند دادەنیشێ و لاقی داوێتە سەر لاقی جغارەی بۆندار دەخوا تووتنی (بیشمە) و (ئێنێ)، لەناو ئەم دۆخەدا بیر دەکاتەوە و فکری دەچێتەوە سەر فەرخە گورگەکان، بۆیە رەخت و فیشەکدانی لە خۆی دەدات و سواری ئەسپە بۆرە دەبێت بەرەو ئەشکەوت و گەلی، ئەو شوێنەی فەرخە گورگەگانی لێدەبێ، دەکەوتە رێ، فەرخە گورگەکان کە گێییان لە تەپەتەپی وڵاخەکەی دەبێ لەوان وابێ ئەوە دایکیانە خواردنی بۆ هێناون، بۆیە هەمووویان بەتاو لەئەشکەوت دێنە دەرێ، مەحمووودیش بەهۆی رەوینەوەی ئەسپەکەی لەسەر پشتی وڵاخەکە دەکەوێتە خوارەوە، گورگەکان دەوری لێدەدەن و ماوەی ئەوەی نادەن خۆی رزگار بکات، هەنجن هەنجنی دەکەن و دەیخۆن، هەسپە بۆرە بەرەو هۆبە و رەشماڵان دەگەڕێتەوە، خزم و کەس تەنگاو دەبن، ئێوارە دادێ مەحموود هەر ناگەڕێتەوە، ئەوانیش بەدوایدا دەگەڕێن و بەوناوەدا بڵاوی لێدەکەن، لەناکاو یەکێ لە خزمەکانی لەبەر دەرکی ئەشکەوتەکە چاوی بە هەوری و خەنجەر و تفەنگ و جلوبەرگی خوێناوی دەکەوێت، بەمە دەزانن کەوا مەحموودی سەنان گورگ خواردوویەتی، ئەوەی مابۆوە خڕیدەکەنەوە و دێن لە گردی پیرداود دەینێژن، چونکە لە گوندی پیرداود و گوندی مزەحمەدی خزمی هەبووە، بۆیە لەوێیان ناشتووە، ئەمە سەربردە و رووداوی بیری مەحموودی سەنان بوو، کە لەو رۆژگار و سەردەمە بنەگە و شوێنگەی کاروانچیانی سەردەمی خۆی بووە، بەردەوام کاروان و کۆچەری و مەڕدار بەم ناوەدا تێپەڕیون، شوێنەکە بۆتە جێگای دیداری خۆشەویست و دڵخوازان. ئەوانەی لە شوێن و جێگای ئاوەها دەرەتان و دەرفەتی یەکتر دیتنیان هەبووە، کاروان و کۆچ و کۆچەری ئەوانە لە رۆژانی مەڕداری و بنەگە و بیردا بە جوانترین دیمەن کەوتۆتە بەر دیدە و بەرچاوی گۆیندە بێژان، بۆیە بەندبێژ و حەیرانبێژ و سترانگۆی ئەوکات، بەهۆی پێگە و شوێنگەی ئەو بیرە، کە بنکە و گردبوونەوەی ئافرەتان و پیاوان و رەشماڵنشینان بووە، ناوی ئەم بیرەیان تێکەڵ بە بەندەکانیان کردووە و لەناو ئەمەشدا نیاز و مەبەست و حەز و هیوا و ئاوات و ئارەزووی خۆیان دەربڕیوە و تێخستووە، بۆیە لەناو بەرهەمی سترانگۆیە میللەکانی دەشتی هەولێر بەڕەوانی دەربڕاوە و بەتاو و شەوق و زەوقەوە، بە خولیا و پەرێشانییەکی زۆرەوە لەناو بەند و بەیت و حەیران و گۆرانییەکانی میللی رەنگی داوەتەوە، وەک لەم نموونانەدا دیار دەکەوێت:

**کاکە سەرێ من دێشێ، دەردێ لە درم گرانە**
**دەچمە سەر قەرەچووغی ئەوبەر ئەوبەر پاوانە**
**دەچمە دەشتی قەراجی بەهۆبە و بە عوربانە**
**جۆتە قورینگەک وا رۆیی لۆ گۆمی مارواشانە**
**کەرکێ دارە بزماران جێیێ ناسک بێریانە**
**ئەو گەرەکی بامەندان مورکی مامە سێنیانە**
**بیرێ (مەحموودی سەنان) لەسەر رێیێ کۆچانە**

* * * *

**کاکە سەرێ من دێشێ دەردێ لە درم دەناری**
**دەچمە چیای قەرچووغی بە دار و لێرەواری**
**دوو رەشماری رەشکۆکە هەریاندا لە بناری**
**دوو کیژی گوارە زێرین بە جۆت حەوشەی دەماری**
**دەستم لەبۆ زێی برد سنجاقەی رادەماری**
**دوو گۆی زێرم چاوپێکەوت لەسەر گۆشەی مەتاری**
**وەز بازگرێ ماچان بام لەسەر (بیرێ کەنداری)**
**لە کیژۆرەی دزەییان لەدوای کۆچ و کۆچباری**
**کاکە سەرێ من دێشی دەردێ لە درم دەناری**
**کۆچ و کۆچباریان لێنا ئاوابوون لە تیماری**
**دەچمە سەر هەردوو کەرکان دەرۆغە فاتێ خاری**
**چیغ و رەشمار و چادر هەریاندا لەبناری**
**دوو کیژی گوارە زێرین بە جووت حەوشیان دەماری**
**گۆتمێ بینە ماچت کەم شازولفی هەردەماری**
**حەیفم لۆ کەندێناوەی چۆڵ بوو بەوێ بواری**
**دەغر و دانیان لۆ نەهات مەڕ و بەرخیان بەردانێ**
**کۆچ و کۆچباریان لێنا بەر لە داری شەکرانێ**
**بەرخ و مەڕ بە پێی خۆ بزن بەخۆ و بەکاری**
**خۆزگە بازگری ماچان بام لەسەر (بیرێ کەنداری)**
**لە کیژۆرەی دزەییان لەوانەی دوگمەداری**

بیـر و کـانیـاو سـەرچاوەی ژیان و بەردەوامی گـوزەرانە لەهەر شـوێنێ ئاو هەبێ ئاوەدانیش دەبێت، گـیـرسانەوە و نیشتەجێبوون وا دەکات مرۆڤ بیرلەبوارەکانی دیکەی ژیان بکاتەوە، لەوانە بوارە رۆحی و دەروونییەکان، وەک گۆرانی و شێوازەکانی دیکەی خۆشی و گەشت و زەماوەند و بۆنە شـادی و بەخـتـەوەرییـەکـان، بۆیە کـانیـاو و سـەرچاوە ئاوییـەکـان وەک چۆن سـەرچاوەی ژیان بوون، ئاواش شوێنگەی گەشتیاری و سەیرانکاری و گەڕانی کۆچەریان و کاروانسەرای مەڕدار و رەوەندان بووە.

**کاکە سەرێ من دێشێ دەردێ لە درم دەناری**
**ماری بابی تووم لێنا مەڕ گەییە ناو ئاقاری**
**چارۆگ واوێر تێکەربوون لەسەر (بیرێ کەنداری)**
**کیژێ جوانم لەکێ دیت لە پرینگە و مێرغوزاری**

ئاو یاخـود کـانیـاو یان جـۆگـە و جـۆبار لە ژیانی کۆمەڵگەی گوندیەتی و دەوارنشینی و مەڕدارەکان رۆڵی کاریگەری هەبووە، چونکە بووەتە سەرچاوەی گردبوونەوە و کۆبوونەوەی ماڵە شوانکارە و بنەگەچیان، رۆژگـارێک کە کشـتوکاڵ و ئاژەڵداری پیشـەیەکی سەرەکی بووە لە ژیان و گوزەرانی کۆمەڵی کوردەواری، ئەم جۆرە جێگایانە واتە بیر و کـانیـاو نەک هەر بۆ ئاودان و لە بێـردانی مەڕومـاڵات و شـێـودر و دەوار بەسـوود بوون، بەڵکو شـوێنگەی کـۆر و خاوێن بوونەوە و خۆشۆردن بووە، وشەی (کۆروکانی) قسە و دەربڕینێکی سەرزارەکی ئەو رۆژگـار و سەردەمـەیە، کە مـاناکـەی لە خـۆیەوە دیار دەکـەوێ، واتە کـۆڕ و گـەرمـاو خستن لەسـەر کانی و کانیاو، ئافرەتان بۆ گەرماو خستن بە کـۆمـەڵ و دەسـتـە و تاقم روویان لەسـەر شـۆری دەشت و دەردەکــرد، دانانی ســێکوچکە و مـــەنجـەڵ و تەشت و لەنگەری، لەگـەڵ تاو سـەندنی ئاگـر و بەرزبوونەوەی چڕە دووکەڵی بنەخرنوک و قەسەڵ و قاڵ و پنچک و پووش و پەڵاش، دیمەنێکی مـیللی سـادەی لە جلوبەرگ شـۆردن و هەڵخستن و خۆدانە بەرهەتاو و هەڵمەدووکی مەنجەڵی رەوە کۆرکەران رەخساندووە.

**هاتم لۆ دیبەگەیە رێم دەکەتە کەنداری**
**مەحبوبەکم شیرن دیت داینا کۆر و قەسەری**
**دەیگۆ جلکت فرێدە لەبۆت بشۆم شەرواری**
**بە کراسی مەلەس کەتان راوستام لەقەت پاری**
**کورم دەگرم جۆتیاری هەر بە قەولی حەفت ساری**
**بەران لە رەنگ منداری لە بەژندا بە ساری**
**کیژەکی جوانم هەیە دەتدەمێ بە یەکجاری**
**بە رۆژ جۆتت پێدەکەم بەشەو دەتنێرمە پاری**
**دەستم دەدا دار جۆتی لێخورە جاشکی سێ ساری**

کــاروانی ژنان بەخــۆ و بە لانک و لۆر و پاشــۆل و تێلەگەی پڕ لەجل و جۆڕ و شـمەک، بوخچەی ئاخنراو بە نوردی و تـوێشـووەنان و سـەلکە پیـاز و تۆچا و قـۆڵی و سـەندوقی پیـارە و شـەکردان، ئەمانە سیـمـایەکی جوان و دانسـقـەیان لە ئەدگـار و نەرێت و خـووی کـۆمـەڵایەتی کۆمەڵگەی کوردەواری نیشـانداوە، کاتێ قەتاری کۆرکەران قافڵەی بەستووە بۆ سەر کانی و بیر و دەراوان کەشێکی قەشەنگ و دیمەنێکی ئەندێشە ئامێزیان خولقاندووە، بۆیە لەگـەڵ ئەم وێنەیە و ئەدگـارە جـوان و نایابەدا هۆنراوەی

میللی و گۆرانی فۆلکلۆری هاتۆتە بوون، شایەران و گۆینده بێژانی میللی لە ئاست ئەم دیمەنە بەرچاوانە خۆیان پێنەگیراوە و هۆنراوەی جوان و ئاوازی بە جۆشیان لەسەر ئەم دیاردانە دەربڕیوە، ئەوەتا شایەران و دەنگبێژان لە جوانترین رووخساردا ئەم دیمەنانەیان باسکردووە:

**کەرکێ دارە بزماران جێیێ ناسک بێریانە**
**ئەو گەرەکی بامەندان مولکی مامە سێنیانە**
**(بیریێ مەحموودی سەنان) لەسەر رێیێ کۆچانە**
**کیژێ سەرگەڕان هاتن بەعام کۆریان لێدانە**
**گەردەنیان چەندە زەردە بسکیان رەشە رەیحانە**
**هێ برام سووتام و برژام لۆوان شەدە شلاتە**

هەرچەندە گەڕان و وردبوونەوە بەنێو ئەدەبی فۆلکلۆری کوردەواریدا بکەین، وێنە و دیمەنی جوانتر و کۆکتر لە ئەدەبی فۆلکلۆری سەرزارەکی دەدۆزینەوە، کەوا گوزارش لەمجۆرە دیاردانە دەکات، بەهۆی ئەم هۆنراوە فۆلکلۆریانە سۆزمان بۆ رۆژگاری باوک و باپیرمان دەگەڕێتەوە، کەوا بە چ شێوەیەک ژیانیان گوزەراندووە و چۆن رۆژگاریان بەرێکردووە، ئەو قۆناغەی کەوا نەوەی رابردوو پیایدا رۆیشتوون، ژیانیان زۆر بە گەورەیی، زۆر بە دڵخۆشی، گەلێک بە سادەیی و ئاسایی بەسەربردووە، هەموو ئاوات و هەوڵیان بۆ ئەوە بووە بە حەز و ئارەزووی خۆیان رۆژگار بەرێکەن، بەدوای ماڵ و خۆ زلکردن نەگەڕاون، بۆیە لەناو ئەم جۆرە دیمانەدا بەرهەمی فۆلکلۆری لە دایکبووە، شایەرانمان بە هەستێکی پاراو بە هەستێکی کوردەواریانە هەست و نەست و ویست و خواستی خۆیان دەربڕیوە، لەچوارچێوەی هۆنراوەی نایاب و کەم وێنەدا دیمەنەکانیان نەخشاندووە و هۆنیوەتەوە، نەک هەر بۆنەی کۆر و کانی، بەڵکو لە راو و شکاریشدا وەستایی خۆیان نواندووە، هێما ناوچەییەکانیان تێکەڵاو بە بەرهەمەکانیان کردووە:

**دەچوومە دەشتی قەراج گەرام بە راوشکاری**
**کارمامزەکم هەردەستاند تێم بەردا لە ئاقاری**
**هەریاندەگرت بە سەران لە کەندێ هەوشانداری**
**لە کەرکێ ئاوادەبوون لۆ (گاوەرە و کەنداری)**
**دەچمە سەر حوسێنی غازی لۆ نەخۆشی و تاداری**

کانی و کانیاو لەگەڵ بیر و بەراوەکان رۆڵی گەورەیان لەتێکەڵبوونەوەی هەستی کۆمەڵایەتی و گیانی دۆستایەتی گێڕاوە، ئاو نەک هەر سەرچاوەی ژیانە، بەڵکو بەخشراوێکی گەورەی سرووشتە بۆ نزیک بوونەوەی کۆمەڵ و ئاوێتەبوونی هەست و نەستی مرۆڤ دۆستی، لەسەر بیر و دەراوەکان خەڵک یەکیان گرتۆتەوە، کاروان و قافلە و عێل و عوریان و کۆمەڵی مەڕدار و رەوەندان بیر و سەرچاوە ئاوییەکانیان کردۆتە دەنگۆیانی میللی ئەم شێوە دیمەنانەیان دەرخستووە، لە چوارچێوەی حەز و نیاز و رووخسارە دڵگیرەکان تێکەڵ بە حەیرانەکانیان کردوون:

**حەیران لە سەرێ سەفینی**
**لە برندا پیرە تارینی**
**بایێ شەمارە شێتەی دەبزێوی**
**دەدا لە شازولفی حەیرانێ**
**سەبر سەبرۆکە لە پەرێ خەزێمێ دارینی**
**ئەوجا ئەمن دەرێم خۆزی بە خۆزیداران**
**بازگر و خەرجەستێنی ماچان بام**
**لەسەر پردەکەیا پیرە رواندزێ**
**لە شل و مل و چاو بە کل و نێک بە کەمبەران**
**لە خەزێم شۆرێ خەیلاتیان**
**لە یەکە یەکەیێ گەردیان**
**لە پەرچەم سۆرێ خۆشناوان**
**ناوەڵلا فەسرێ دەرەبواران**
**لەسەر (بیریێ مەحموودی سەنان)**
**لە چاو بەرەکێ دزەییان**
**ناوەڵلا لە حەیرانەکەی خۆم**
**کە دەمشبهاند بە خاتوونە پەری خوشکی یەحیا بەگی**
**کە سەرێ چەند ساران ئاشق بوو**
**لە چیایەکەی مەلا زێندینان**
**ناوەڵلا لە بە کەیفێ درێ خۆم و برادەران**
**بە جەواهێرێ ئەحمەد بارینی**

درکاندنی ناوی بیر و کانیاوەکان، یاخود جۆرەها هێما و ناوی دیکە لە بەند و بەیت وحەیران و لاوک و بابەتی فۆلکلۆری، وەک رێنماییدەرێکی جوگرافی بۆ گەلێک بوار سوودی دەبێت، هەندێک لەم بیر و کانیاوانە سەرچاوەن بۆ چارەسەری نەخۆشی و باداری، بۆیە خەڵک لە دەڤەر و ناوچەی دوورەوە روویان تێدەکەن، رەنگدانەوەی سەرچاوە

ئاوییەکان لە ئەدەبی سەرزارەکی بە تایبەتی حەیران و گۆرانییە میللیەکان، وەک چۆن لە رۆژگاری کۆن سەرچاوەی گردبوونەوە و مۆڵدانی رەوەند و رەشماڵنشینەکان بووە، ئەمرۆش دەکارێ وەک سەرچاوەیەکی گەشتوگوزار سوودیان لێوەربگرین، ئەگەر ئەم کانیاو و دەراوانە شوێن و جێگەی هەڵکەوتنیان بۆ گەشتیاری دەستبدات، دەتوانرێ سەر لەنوێ زیندوو بکرێنەوە و جارێکی دیکە ببنەوە رووگەی خەڵک وەک جاران شوێنی خۆیان لە دەروون و گیانی کۆمەڵ بکەنەوە:

**حەیران دیبەگە لە کێچان**
**لە گێچی زوری**
**حەیرانەکەی من کارمامزەکی چاو رەشە**
**ئاوێ خۆی دەخواتەوە**
**لەسەر (کانییێ داودە رەشی)**
**لەبەر دەنگی پیسە راوکەران**
**بۆنی باروتێ**
**دێتە سەر بیرێ (مەحموودی سەنان)**
**ئاوابوو لە کەرکێ حوسێنی غازی**
**ئاشقە لە کاولە مەخمووری**
**ئەمن حەیرانەکەی خۆم شیرن دەدیت**
**بە زەندەکی بە بازن**
**بە قامکەی بە ئەنگوستیلە**
**بە شازولفەکی بە خەنە**
**لە نەعبێنی دوو دارە بازەی تەونی**
**نەرمۆکە نەرمۆکە**
**دەبری گوفکەی مافوری.**

گۆرانی و بەرهەمە فۆلکلۆرییەکان، پەیوەندییەکی توندوتۆڵیان بە سرووشت و ژیان و گوزەرانی کۆمەڵ هەیە، بۆیە لەگەڵ سیمای خاک و رووخساری دەشت و دۆڵ و زورگ و نیهال و کەژ و کێو تێکەڵاو بوون و دیاردە سرووشتگەرەکانیان لەخۆ گرتووە، کانیاو و بیر و چاوگە ئاوییەکان بەشێک بوون لە جوانکاری و رێکسازی هۆنراوە و دەنگ و ئاوازە فۆلکلۆرییەکان، ئەمە وایکردووە گۆرانی و سرووشت و مرۆڤ لە یەکتری دانەبرێن و هەردەم ئاوێتە و تێکەڵاوی یەکتری بن:

**دەرێم براینە برادەرینە**
**ئەورۆ بەوێ سبیانێ**
**ئەمن بە کێندەرێدا هەربرێم**
**دەرێم: بە بەرانیان**
**دەکو مارت وێرانبێ**
**ئەوجا بەوێ دەرە بوارێ**
**زالم باب وای وای لە گردجۆتیاری**
**ئەمن دوێنێ ئێوارێ**
**لە دەراوێ سێتاقان**
**لە سیلەیێ رەزی عەتەوڵای**
**گەیە ئەوان شل و ملی چاو بە کلی**
**گەردەن کێلە**
**گۆتمێ بێنە ماچت کەم**
**خەت و خارێ گەردەنێ**
**ئەمان بۆن بکەم چەرخەییا رومەتێ**
**بگرم جۆتە شەمامەی**
**شەمامەیێ بەندێ باغەرێ**
**ئەوا سبەی بچمە شاری پیرە هەولێرێ**
**وەکی جاران نەینۆکت لۆ بینم**
**زالم باب کلدان بە دیاری**
**ئەمان ئەوا کور دەرێ**
**بریا ئەمن بازگر و خەرجە شینێ ماچان بومایە**
**هەموو فەسڵی دە رێ بواران**
**لە دەرکەیێ بازارگەی**
**لە حەوشێ سوڵتان عەولای عارەبی**
**لە کلکەیێ کانی وەکازی**
**ئەمان لە جۆتە مەرقەدی**
**شێخ شەروان و شێخ جامی**
**رۆژی لێبدا**
**لە گۆرە گۆری عەبدولعەزیزی**
**ئەرێ وەی ئامان و سەد ئامان**
**لەسەر بیرەکەیێ (مەحموودی سەنان)**
**لە من فەسڵی دەرێ بواران**
**گەلە شیرینە**
**لە مەعبێنی گاوەرە و کاولە کەنداری**

هۆنینەوەی بەند و بەیتی فۆلکلۆری بەم شێوەیە نایاب و جوانکارییە، واتای تێکەڵبوون و توانەوەیە لە نێوان مرۆڤ پیشەگەری بە هەموو ئامراز و پێکهاتەکانییەوە، پەرۆشی و خۆشەویستی ئادەمیزادە بۆ سرووشت و دەوروبەر، دەربڕین و خستنە رووی ناوی جێگە و شوێنە ناسراوەکان، زیندوویەتی ئەدەبی میللی دیار دەخات، کە هەردەم هاوراز و هاویاری مرۆڤ و تێکەڵ بە ئەندێشەو خەون و حەز و خەیاڵ و نیازەکانی دەبێت، زمان بە هۆی ئەم شێوازە هونەری و دەوڵەمەند دەبێت و فەرهەنگ و کولتووری نەتەوەیی و جوگرافی بەهێز و ناسراو دەبێت:

**حەیران گەوارەکی داهێنا چەندە لەبنی**
**دەیداوە لە کەند و لەندی ئازیکەندی بندیانان**
**سەریا بێژینگ بەسەری**
**بەینی گاوەرە و کەنداری**
**(بیریێ مەحموودی سەنان)**
**بەینی گردە بۆر و سۆفی سمایلی**
**بەویێ هێواریێ لەپێش ئەویێ قەرە رەشماریێ**
**چەند شیرن لە سەروپەرچەمێ**
**حەیران دەخونی**
**کاکە براینە ئەنگۆ زەینێ خۆ بدەنە**
**شەدە شلی ترپە سپیان**
**بسک سۆری پیرداودیان**
**چاو رەشی تۆماریان**
**تاج بە سەری هەولێریان**
**سبەینان هەردەستێ لە شیرنە خەویێ**
**دەست و بازنیان دەشۆێ**
**بە قۆندەرەکی زەردی زرۆقی**
**بە دوو شازولفی بە خەنە**
**چەند شیرن دەکەونە**
**سەر دارەبازەی تەونی**

ئەدەبی فۆلکلۆری تۆمارێکی خۆرسکی شوێنگە گوندی و نیشینگە شارییەکانە، هێما دیارەکانی ناوچەکانی ئاشکرا کردووە، ئەمڕۆ بەرهەمی فۆلکلۆری بە تایبەتی بەیت و بەندی گۆرانی سەرچاوەیەکی بەهادارن بۆ گەڕان بەدوای ناوی دێهات و گۆم و کەند و لەند و قۆیکە و شاخ وهەوار و دەواری کۆچەریان و هۆبەگەلی رەشماڵداران و سەرچاوە ژیانییەکان، بە تایبەتی ئەوانەی گوزەرانی مرۆڤ و ئاژەڵ و زیندەوەری پێوەبەندە، وەکو کانیاو و دەراو و بیر و چاوگە ئاوییەکان، نەمری و ناوداریان داوەتە زۆر گوند و ناوچە و گۆم و زورگ و گەلێ گرد و تەپۆڵکە و غەر و رێچکە و بازگەی جیاجیا، لە لایەنە فۆلکلۆری و گۆرانی میللی تۆمارێکی نەپساوە و بەڵگەی رەسەن و متمانەدارن:

**کاولە (کەندار) چەند بە بایە**
**کراسی چیتی لەبەردایە**
**غەمی لە درم زولەیخایە**
*** * ***
**کاولە (کەندار) چەند بە قورە**
**کراسی یارێم چیت دسترە**
**غەمی لە درم مەمک خرە**

دیارە چەندە گەڕان و سووڕان بە ناو سەرچاوە فۆلکلۆرییەکان بکەین، زیاتر بە ناوی شوێنە جیاکان ئاشنا دەبین، چونکە ئەدەبیاتی فۆلکلۆری وێڕای سیما گشتییەکانی، تایبەتمەندی ژینگەی لەخۆگرتووە.

سەرچاوەکان:

* هوشیار عەبدوڵلا، بیری مەحموودی سەنان، ئاسۆی فۆلکلۆر، ژمارە ١٨، ٢٠٠٦.
* عومەر شێخەڵلا دەشتەکی، داستان و گۆرانی لە فۆلکلۆری کوردیدا، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر، ١٩٩٨.
* سەعدوڵلا ئیسماعیل شێخانی، گوڵبژێرێک لە فۆلکلۆری کوردیدا، چاپخانەی ارشاد، بەغدا، ١٩٨٥، ل٤٨.
* سەعدوڵلا ئیسماعیل شێخانی، سێ سەد هۆنراوەی فۆلکلۆری کوردی، بەغدا، ١٩٩٠.
* ئەحمەد حەیران، دیوانی حەیرانبێژان، بەرگی یەکەم،

# قەسری عەتاوڵاغا لەئەدەبی میللی

ئەحمەد حەیران

شوێنەوار و خانووە دێرینەکانی کوردستان بەشێکی گرنگی کەلەپووری شارستانیەتی و کولتووری نەتەوایەتیمانە، لەهەمان کاتیش بەڵگەیەکی گرنگی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی و بلیمەتی نەخشەکار و بیناسازە کوردەکانە، بۆیە پاراستنی ئەو شوێنەوارانە ئەرکێکی نەتەوایەتییە چونکە بەشێکی گرنگی سامانی گەلەکەمانە.

تاوەکو ئێستا ئەوەی زانرابێت هەر داگیرکەران پیادەی کاولکردنی شوێنە دێرینەکانی کوردستانیان کردووە، بەڵام بەهۆی نزمی ئاستی رۆشنبیری، لەگەڵ دەرک نەکردن بەگرنگی ئەم شوێنەوارە دێرینانە. ئەوا گەلێک جاریش خۆمان ئاومان لەئاشی دوژمنان کردووە و بەدەستی خۆمان دەیان قوللە و تەلار و پرد و شواری دێرینمان راماڵیوە و لەرەگ و ریشەوە خاشەبرمان کردوون و سڕیومانەتەوە، بۆ نموونە لەساڵانی پەنجاکانی ئەم سەدەیە قەسرە دێرین و بەناوبانگەکەی مەلافەندی لەگەڕەکی باداوەی هەولێر لەبن و بۆتکەوە هەڵتەکا و پەرەم بەپەرەم کرا، لەکاتێکا ئەم قەسرە بە گرنگترین تەلار و خانووی نەخشەداری ئەم شارە زانراوە، چونکە زۆر لایەنی هونەری تەلارکاری و نەخش سازی کوردەواری تیایدا بەکارهاتووە کەلەسەر دەستی وەستا و بیناسازە بەناوبانگەکانی سەردەمی خۆی دروست کرابوو. قەسری عەتائوڵلاغاش یەکێک بوو لەخانووە دێرین و کۆنەکانی شاری هەولێر لەمانگی (٧) ی ساڵی (١٩٩٤) نوکە شۆفەڵی گەیشتێ و بێ بەزەییانە بەسەر یەکتری دارمێندراو تەخت و بەخت کرا، بەم پێیە شاری هەولێر خانووێکی دێرینی تری لەدەست داو شوێنی لەدیرۆکی شارەکە سڕیەوە. بنەماڵەی عەتائوڵلاغا یەکێکە لەخانەوادە دیارەکانی شاری هەولێر، (رەمزی نافع)یش یەکێکە لە قوربانییە گەورەکانی ئەم بنەماڵەیە کە گیانی خۆی لەپێناوی سەربەخۆیی کوردستان بەخت کرد. (دبلیو-ار- های) لەپەرتووکی (دووساڵ لە کوردستان) بەمەشێوەیە باسی بنەماڵەی عەتائوڵلاغا دەکات، دەڵێ:

کۆمەڵەیەکی نهێنی کە لەچەند لقێکی چالاک پێکهاتبوون لەهەولێر هەبوو، ئەمانە پروپاگەندەیان لەدژی بەریتانیا بڵاودەکردەوە، هەندێ لە دەوڵەمەندەکان یارمەتیان دەدان، لەپێشەوەی هەمووشیان حاجی رەشید ئاغابوو کە پیاوێکی قەدوقامەت درێژی رێک و پێک بوو، زۆریش پابەندبوو بەداب و نەریتی رۆژهەڵاتییەوە، بەڵام رادەی بیرکردنەوەو خوێندەواری زۆر باش نەبوو، کوڕە گەورەکەشی ناوی عەتائوڵلاغا بوو، یەکێکی لاوازی لاساربوو جل و بەرگ و پۆشاکی ئەورووپی لەبەر دەکرد، هەرچەند جاری لەبازاری هەولێر تووشی دەبووم تەزبێحەکی قل گەورەی لەدەستی دەگێڕا، گەلێک چاپووک بوو لەبڵاوکردنەوەی پروپاگەندە لەدژی بەریتانیا.

عەتائوڵلاغا کوڕی حاجی رەشید کوری وەیسییە لەساڵی ١٨٨٢ لەقەڵای هەولێر لەدایک بووە، لەیاری زۆرانبازی پاڵەوانێکی لێهاتووبووە، هەروەها لەبەرزکردنەوەی قورسایش رۆڵێکی

ئێجگار گرنگی بینیوەو گەلێک شتی سەیری لێدەگێڕنەوە زۆرجاران وابووە لایەکی ئۆتۆمبێلی بەتەنیا بەرزکردۆتەوە تاوەکو تایەکی لێ بگۆڕن، یاخود پێنج شەش کەس سەرێکی شێلمانی ئاسنیان گرتووە ئەویش بەتەنیا لایەکەی دیکەی هەڵگرتووە، گەلێ جاریش فەردەی داخ سۆری بەپری بەتەنیا بارکردۆتە سەریشتی ولاخی بەرزە، ئەم پاڵەوانە لەساڵی (١٩٦٣) کۆچی دوایی کردووە.

ئەم قەسرە لەساڵی ١٩١٥ رەشید ئاغای باوکی عەتائوڵلاغا لەبری سەرکەوتنی عەتائوڵلاغا لەشەرە زۆرانەیەک لەگەڵ پاڵەوانێکی ئینگلیز دروستیکردووە، وەستا (بەکری کوڕی وەستا مستۆی) هەولێری دووازدە دەرگای نەخش کراوی ئەم مرۆڤە نەخش ساز و هونەرمەندە خۆڕسکەی تیادا دەردەکەوێ، ئەمە جگە لەچەند ئەستوونداێکی سەیر لەداناني وەستا خەلیلی بەناو نەخشە جوانەکانی عەزیز تۆبیای سووریای نەققاش.

بەر لەراپەرین دەزگای شوێنەوار (مؤسسة الاثار) هەندێک لە خانووە کۆنەکانی قەڵای هەولێری کری، بڕیاری کڕینی خانووی عەتائوڵلاغاشیدا، بەڵام ئەوان واتە بنەماڵەی عەتائوڵلاغا داوای نیو ملیۆن دیناریان کرد، بۆیە نەگەیشتنە یەک و شتەکە بەهەڵواسراویی لەنێوانیان مایەوە، تا سەر ئەنجامەکەی بەم فەتارەتە گەیشت.

قەسری عەتائوڵلاغا سەردەم و رۆژگاری خۆی چوار دەوری هەمووی رەز و باخ بووە، زۆر لەخەڵکی هەولێر بەهاران بۆ سەیران و رابواردن روویان تێکردووە، بۆیە بەشێوەیەکی فرەوان چۆتە ناو حەیران و بەیت و بەندی گۆرانییە فۆلکلۆرییەکان و تێکەڵ بەئەدەبی میللی بووە، وەک لەم وێنانەی خوارەوە دەردەکەوێ:

(عوسمان حەیران) لەکۆپلە حەیرانێکدا دەڵێ:

**ئەمن دوێنێ ئێوارێ**
**لەدەروایێ سێتاقان**
**لە سیلەیێ رەزی عەتەوڵای**
**گەیە ئەوان شل و ملی چاوبەکلی**
**گەردەن کێلە... هتد.**

یاخود لەبەندێکی گۆرانی (دروێنە) کە بەیەکێک لە گۆرانییەکانی کار دەژمێردرێ، هاتووە دەڵێ:

**ئەستێرە وەی ئەستێرە**
**لۆت نەمایە ئەستێرە**
**چاوی توو گەلە رەشن**
**مەمکت کوارگە عەتێرە**
**شوانان مەریان لێ خوری**
**بێرکەران بێرە بێرە**
**دەچمە (باغی عەتەوڵای)**
**هەمووی گور و کنێرە**
**دەسکە گورەک بپەستە**
**لۆم بەدیاری بنێرە**
**هەتیم بەخوای دەم هەنارد**
**لەبەر دایکم نەم وێرە**

یان لەشوێنێکی دیکە بەم جۆرە ناوی قەسری عەتەوڵلا هاتووە و نیشانی بۆ کراوە.

**کاکە سەرێ من دێشی**
**دەردێ لەدرم بەژانە**
**دەچمە (قەسرێ عەتەوڵای)**
**سووربوون گور و رەیحانە**
**دەچمە گەرێ شاقازی**
**ئەوبەر ئەوبەر پاوانە**

یاخود گوتراوە:

**گەر دەتەوێ بمبینی**
**فەرموو لەبۆ هەیوانێ**
**بەژنت دری سنەوبەر**
**زوڵفت رەشی رەیحانێ**
**ددان رێزی مرواری**
**لەسنعی هندستانێ**
**چاوت ئەستێرەی جەددی**
**موقیمە لەعاسمانێ**
**لێو هەترسی فەرەنگی**
**عازر بوو لۆ جۆڵانێ**
**گەردەن سوسنێ کۆسرەتی**
**لێدا بایێ کوێستانێ**
**سینگت (باغی عەتاوڵای)**
**مەمکت سێوی لاجانێ**

هەروەها لەهەندێ بەیت و بەندی دیکە هاتووە و دەڵێ:

**دارێ کەسنەزانی**
**دوو تەیر لێ نیشتینە**
**چوومە (باغی عەتەوڵای)**
**خۆخی لاسوور گرتینە**

بەڵێ بەمشێوەیە رەزو قەسری عەتەوڵلا لە ئەدەبی میللی کوردەواری رەنگیداوەتەوەو چۆتە ناو مێژووی کولتووری شاری هەولێری دێرین، کەچی ئەم بنەماڵە نەشارەزا و دوور لەزانست و شارستانییەتە لەپێناو چڵکی دەست کە دەکاتە ماڵی دونیا، بەدەستی خۆیان مێژووی بنەماڵە و باوک و باپیرانیان سڕیەوەو سەرجەم مێژووی خۆیان کردە قوربانی چەند پولێکی قەڵپ، رۆڵی خۆشیان لەنەخشی ئایندەی شاری هەولێر سڕییەوە.

# داری شەکران
# لە گۆرانی فۆلکلۆریدا

ئا: ئەحمەد حەیران

ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی بەرهەمی دەروونی کەسایەتی مرۆڤی کورد و کۆمەڵگەی کوردەوارییە، ئەو بەرهەمە میللییە خۆرسکە کەرەسەیەکی دەوڵەمەند و لەبن نەهاتووی خۆماڵییە بۆ لێکۆڵینەوە لە قۆناغی گەشەسەندن و ئاڵوگۆڕە زمانی و هزری و رەگەزدۆزییەکانی دانیشتووانی کوردستان، بەرهەمی فۆلکلۆری یاخود میللی گەلێک بوار دەگرێتەوە. هەر لە کەرەسە و ئامرازە بەرجەستە و دەستکردەکان تا دەگاتە بەرهەمە گیانی و دەروونییەکان، کە خۆیان لە بەند و گۆرانی و بەیت و بەسەرهات و داستان و چیرۆک و هەقایەت دەبیننەوە، قۆناغەکانی لادێ نشینی و کۆچ و کۆچبەری و مەڕداری و کشتوکاڵگەری مەودایەکی درێژی لە ژیانی کۆمەڵگەی کوردەواری بڕیوە، ئەم قۆناغەش بە هەموو پێشهات و دەرهاتەکانی لەئەدەبی فۆلکلۆری و بەرهەمی میللی سەرزارەکی رەنگیداوەتەوە، ماک و هێما سرووشتی و ئەفسانەییەکان لە زۆر بواردا چوونەتە ناو بەرهەمی فۆلکلۆری و بە شێوەیەکی فراوان لەناو بەرهەمە سەرزارەکییە میللییەکاندا رەگیان داکوتاوە، بەرهەمی فۆلکلۆری کەبەرهەمی هەست و بیر و ئەندێشە و خەون و خەیاڵی تاک و تەرا و کۆمەڵ و دەستە و تاقمەکانی، پێکهاتە رەگەزییەکانی خەڵکی کوردستانە، توانیویەتی تایبەتمەندی خۆی دیاربکات و مۆرک و رەسەنایەتی خۆی بپارێزێ و شوناسنامەی خۆی هەڵگرێ، سرووشتی کوردستان بە هەموو ئەدگار و شێوە جیاوازەکانی، لە گۆڕانی کەش و هەوا و ئاڵوگۆڕە وەرزییەکانەوە بگرە تا دەگاتە رووداوەکانی و بەسەرهاتە رۆژگارییەکان هەموویان جێگە و شوێنگەی خۆیان لە بەرهەمی فۆلکلۆری و گۆرانی میللی و بەستە و بەند و لاوک و حەیران کردۆتەوە، ناوی گەلێک شاخ و لووتکەی کێو، ناوی دەیان کەند و گۆم و رووبار و جۆبار لە فۆلکلۆر هاتووە، چەندین کەسایەتی کۆمەڵایەتی ناودار کە لە رۆژگاری خۆیان خاوەن جێگە و پایەی کۆمەڵایەتی بەرز بوون لە فۆلکلۆردا ئاماژە بەناویان کراوە، زۆر گەلی و دۆڵ و نیهال ناویان دەربڕاوە، گەلێک گیا و گوڵ و دار و دارستان و غەرەبەرد و قوچەک و مەرقەد و جێنەزەرگە و ئارامگەی پیاوچاکان لە فۆلکلۆر و بەرهەمی میللی ناویان تۆمار کراوە و بوونەتە بەشێکی گرنگ لە کلتوور و دیرۆک ۆ رۆشنبیری میللی کوردستان، (داری شەکران) یەکێکە لەو دیاردانە، ناوێکە لەو دەربڕینانە، رووەکێکی سرووشتی دارێکی خۆرسکی ناوچەیی هەرێمییە، ئەم دارە بە درێژایی چەند سەدەیەکە بووەتە هێما و چەقەنگی زۆر شت لە ژیانی کۆمەڵایەتی خەڵکی ناوچەکە، لە کۆن و ئێستاش ناونیشانە بۆ زۆر لایەن، داری شەکران پاڵپشت و کەرەسەبوو بۆ هۆنەران و گۆیندە و بەندبێژ و حەیران و لاوکبێژان، ناوی داری شەکرانێ وەک گەواهیدەرێک بۆ شارەزایی و دەربڕینی حەز و وشە و خواستی دەروون لەگەڵ بەند و بەسەرهاتی فۆلکلۆری دەربڕاوە، هێما و نهێنییە شاراوەکانی ئەم دارە (داری شەکرانێ) زۆرشت لەخۆ دەگرێ. بەم فراوانییە لە فۆلکلۆر و بەرهەمی میللی رەنگیداوەتەوە، سەربردە و رووداوە دێرینەکانی ئەم دارە لە وانەیە بە ئاسانی ساخ نەبێتەوە و سەرەداوەکانی بە خۆڕایی نەکەونە دەست، بەڵام بەهەر شێوەیەک بێت نموونەی ئەم جۆرە دارانە لە کولتوور و هەست و نەریت و خووی کۆمەڵایەتی گەلان و نەتەوە جیاوازەکانی سەرزەمین یەکجار زۆرە، ئەم جۆرە دارانە و نموونەی لەم شێوەیە لە ولاتان دەپارێزرێ و لەلایەن دەزگا و دامەزراوی رەسمی گرنگی پێدەدرێ و دەکرێنە سەرچاوەی زۆر بوار، خەڵکی بۆ گەشتوگوزار و سەیران و گەشتیاران کەڵکیان لێوەردەگرن و دەکرێنە سەرچاوەی داهات و دەستکەوتی ئابووری، داری

شەکرانێ جووتە دارە، واتە دوو دارن، لەوانەیە ئەم دوو دارە ئاشقە و باشقە بن، بۆی هەیە سەرەتا کە چاندراون نێرە و مێیە بووبن. دارەکان شوێن و جێگەیان کەوتۆتە دەڤەری زرارەتی، زورگی مام خالان زورگێکە لە ناوچەی زرارەتی درێژبۆتەوە، دیوێکی بەستۆڕەیە دیوەکەی دیکەی (گەرووی دەلالانە)، ئەم زورگە کەوتۆتە ناوچەیەکی رازاوە و رەنگین نزیکەی (٣٥) کیلۆمەتر لە هەولێر دوورە. گوندی مام خالان دێیەکی جوانکیلەیە، دەکەوێتە بناری ئەو زوورگەی، کە جووتە دارەکەی لەسەرە، لە عەنکاوە رێگای بۆ هەڵدەکشێ بەرەو شێخ گەزنە و گردجۆتیار و گردئارەق و گردی ماوان و مام خالان و ئینجا دارێ شەکرانێ، خەڵکی ئەم ناوچەیە لەرۆژگاری خۆی دڵکراوە بوون بۆ دابینکردنی پێداویستی ئەو خەڵکەی سەردانی ئەو جووتە دارەیان کردووە، دارێ شەکران دوو داربەرووی خۆڕسکن لەسەر زوورگی مام خالان لە ناوچەی زرارەتی، لەسەر گۆڕی پیاوچاکێک رواون. ئەو پیاوچاکە بە "ئەسحابە شاکر" بەناوبانگ بووە، بەپێی قسەی تەمەندار و بەساڵاچوان ئەو دوو دارە تەمەنیان (٣٠٠) ساڵ دەبێ، گەورەیی و ئەستووری و بەرزی و فراوانی لق و چڵەکانی دارەکانیش گەواهیداری ئەم مێژووەن، کە تەمەنی زۆر کۆنە و چەند سەدەیەکە لەو شوێنە رواون، تەمەندارەکان و ردێن سپیەکانی گوندی مام خالان و دێهاتەکانی دەوروبەری دەڵێن: ئەو ئەسحابەیە کاتی خۆی کۆچی دوایی کردووە، لەوێندەر نێژراوە و شوێنەکەی بووەتە نەزەرگا و ئارامگە، جووتە دارەکەش نازناوی ئەویان هەڵگرتووە، لێکدانەوە و مەزەندەی دیکەش هەیە دەڵێن: ئەو جووتە داربەڕووە بەرەکانیان واتە بەڕووەکانیان شیرینە، هەر لەبەر شیرینی بەرەکەیان بوونەتە داری شەکرانێ و نازناوی شیرینی و شەکریان پێوەنووساوە، ئەو جووتە دارە بە پێی درێژی تەمەنیان رەگیان بەناخی زەویدا چۆتە خوارەوە بەرامبەر کارەسات و گەردەلوولی رۆژگار توانیویانە خۆیان رابگرن، بەڵام کتوپڕ یەکێکیان وشک هەڵدەگەڕێ و ماڵئاوایی لە ئەویتریان دەکات، هۆکاری وشکبوونەکەشی رووننەکراودتەوە و تیشکی نەخراوەتە سەر، ئەوەی مایەی سەرنج و چاوتێبڕینە بە درێژی ئەو زوورگەی کە لە گوندی پەرپیتانەوە دەستپێدەکات تا دەگاتە رێگای گۆپاڵ و سەرلێوار زێی بادینان تەنیا ئەو جووتە داربەڕووەی لێیە، هەردوو دارەکەش تاوەکو بڵێی سیما و رووخسارێکی رێک و پێکیان هەیە، هیچ لقێکیان لە ئەویتریان زیاد نییە، تەنانەت ئەو کەسەی بۆ یەکەمین جار ئەم جووتە دارە دەبینێت، زۆر بە ئاستەنگ دان بەوە دەنێت، کە دارەکان دەستیان لێنەدرابن، جووتە دارەکە بە درێژایی ساڵ گەڵاکانیان سەوز بوون، تەنیا لە وەرزی زستان نەبێت، گشت ئەم دەربڕین و خاسیەتانەی باسمانکرد وێنەی جوان و دیمەنی شیرین و روخساری پیرۆز و شێوە و ناوبانگی گەورەیان بەو جووتە دارە بەخشیوە، بۆیە خەڵک بۆ زۆر مەبەست روو لەم جووتە دارە دەکەن، هەر لە سەیران و گەشت و گەڕان و سووڕانەوە بگرە تاوەکو نیازگرتنەوە و بە مەبەست و ئاوات گەیشتن، ئەگەر مرۆڤ رێگای بکەوێتە ئەو شوێنە و لەژێر ئەو جووتە دارە سەیری ناوچەکە بکات و سەرنج لە دەوروبەری بدات، بێگومان ئەدگار و وێنەی قەشەنگترین تابلۆی دەستکردی بەناوبانگترین هونەرمەندی دەکەوێتە بەرچاو وێڕای دیمەنە دڵڕفێن و سەرنجبەرەکانی، دەتوانرێ دوورترین دێهات و وێنە و هێما و دیارەکانی ناوچەکە لەو شوێنەوە بەدی بکرێ، ساڵانێکی زوو تەنانەت ئێستاش خەڵک زۆر رووی دەکردە ئەو شوێنە لە پاڵ سەیران و گەشت و کات بەسەربردن بۆ مراز و مەخسودیش خەڵک رووی تێکردووە، ئەگەر یەکێک گەرەکی بایە مراز و حەز و ئارەزووی تاقی بکاتەوە روویاندەکردە بناری ئەو جووتە دارە، لەوێ جۆلانەیەکی بچووکیان لە پەڕۆپاڵ دروست دەکرد بە لقێکی دارێ شەکرانێیان هەڵدەواسی بەردێکی بچووکیشیان دەخستە ناو، ئەگەر جۆلانەکە لە خۆیەوە بکەوتایەتە هەژان و هاتووچۆ، ئەوە هێمای ئەوەبوو کەوا مراز و مەبەستەکە هاتۆتەدی و کەسەکە بە ئامانج دەگات، ئەگەر جۆلانەکە نەکەوتایەتە جوولە ئەوە مانای وایە مرازەکە بەدی نەهاتووە، کەسەکە بە مەبەست نەگەیشتووە، هەروەها خەڵک بۆ راز و نیازی دیکەش سەردانی ئەم ناوچەیان کردووە، بۆ چارەسەری نەخۆشی (باداری) چوونەتە ناوچەی دارێ شەکرانێ و لە کەناری زورگی و لە دیوەکەی دیکەی مام خالان لە ئاقاری (زەرواوێ) کانیاوێک هەڵدەقوڵێ پێی دەڵێن: (دەرماناوا)، کە بۆ چارەسەری نەخۆشی باداری خەڵک رووی تێدەکەن، بۆ ئەم نیاز و مەبەستەش خەڵکی خۆیان ئامادە دەکرد و خواردن و خواردنەوەیان لەگەڵ خۆ دەبرد، رۆژگارێک کە هێشتا ژیان دیمەنی دەوارنشینی و کۆچباری و مەڕداری بنەگە و بیری پێوە دیاربوو خەڵک بە گوێدرێژ و دەوار و وڵاغ و کەر و بار و هەگبە و تێڕ و تێرکە روویان لەم شوێنانە کردووە، بە

کاروان و قۆناغ رۆیشتوون، لە وێندەر لەژێر ئەو جووتە دارەدا گیرساونەتەوە، هەموو ئەو خاسیەتانە وایانکردووە داری شەکرانێ لە ئەدەبی فۆلکلۆری بەتایبەتی لە بەند و دانانی هۆنراوەی میللی و گۆرانی و بەسەرهاتی کۆمەڵایەتی رەنگبداتەوە، زۆربەی گۆیندەبێژانی ناوچەکە لە دانانەکانیان ئاماژەیان بەم جووتە دارە کردووە، هۆنەر و بەندگۆیانی دەڤەری هەولێر زۆربەیان جووتە داری شەکرانێیان تێکەڵاو بە حەیران و بەند و گۆرانی و ئاوازەکانیان کردووە، هونەرمەندی میللی گەورە (کاوێس ئاغا) لە حەیرانێکدا دەڵێ:

**ئەمن دەرێم**
**سەردەمەکێ ئەمن راوچی بووم مار وێران**
**دەگەرام لە راوێ**
**لە بنە بنەی مام خاران**
**ئەمن چم نەدەدی**
**رۆژەکی ئەمن دەچوومە (داریێ شەکرانێ)**
**مار وێران**
**ئەمن دەرێم: ئەمن دەچوومە داریێ شەکرانێ**
**دۆستی خۆم دەدی مامزە**
**دەچێرێ لەسەر کونە مێروستانێ**
**پارێزەکم دەبردێ، پارێزەکم لێدەستاند**
**دلم نەدەدینا بەشینکەکە چەکماغساز**
**حەیران گوللاتی ئەمن بکرمێ.**
**لەبەر کاکێ تو دەرۆی مار وێران**
**ئەمن چ بکەمێ شەو لەوەرێ خۆی داوێتە زورگی مامەریان**
**سبیانان چێشتاوێ خۆی دەهینا کاولێ قەفەریان**
**ئەمن چ بکەم بە رۆژ دەستێ بەژنێ باریکم دەگرت**
**بە بنە بنەی رەشوانێم دادەبردە خوارێ**
**بە رۆژ دەم بردە ناو دەغڵ و دانێ خاروانێ**
**ئەمن چ بکەمێ شل و ملێ ناسک بە دراوێ**
**پاش پانی خری داو و دەلینگا توو حوسێنی**
**عەمرێ داکێت نەمێنێ تە وەز کوژی**
**چەند جوان ئێواران دێیەوە**
**لەسەر ئاوێ بە خان و مانی.**

داری شەکرانێ وەکو هێما و نیشانەیەکی دیاری ناوچەی زرارەتی تێکەڵ و ئاوێتەگەر بوو بە هێما و سیمبولە دیارەکانی ناوچە و دەڤەرە جیاکانی دیکە، هەر ناوچە و شوێنێک نیشانە و هێمایەکی دیار و بەرچاوی خۆی هەبووە، هەموو ئەم نیشانە و چەڤەنگانە ئاوێتەی کلتووری میللی و بەرهەمی سەرزاری گۆیندەبێژان بوون و بەهۆیانەوە چەندین شاکار و بەندی جوان هۆندراونەتەوە، لە هەموو بەشە جۆراوجۆرەکانی فۆلکلۆر ئەم ئەدگار و سیما و نیشانە دیارانە دەربراون، زۆربەی گۆیندەبێژان لە بەرهەمەکانیان ئاماژەیان پێداوە،

(مستەفا کوری خۆشاوێ) کە حەیرانبێژێکی بناری چیای قەرەچووغ و دەشتی هەولێرە هەموو ئەو نیشانەی لەگەڵ هۆنینەوەکانی ئاوێتە کردووە و لە حەیرانێکیدا دەڵێ:

**ئەرێ براینە چەندم گاز دەکرد**
**ئەمن نەمدەگۆ بەخۆم پیربوویە**
**کاکیلە دەرێم حەیران سۆنان ناگری**
**مامزێ قەفەری**
**سۆنەی کاولە غازری**
**خۆ من نەبوویە بارانێ پەرێ**
**عەویجەی عارەبان**
**زار کەرکێ حوسێنێ غازی**
**خری عەلی بەگی**
**سەر پردی رواندزێ**
**(داری پیرە شەکرانێ)**
**قەپەکی مام خاران**
**قەراتێ پیرە هەولێرێ**
**ئەرێ براینە نەمدەگۆ**
**حەمامێ حاجی قادری**
**حەمامێ سێ گومەت**
**کورانی خوار زێرینگران**
**مورتکەی عەلی مەحموودی**
**بیستانەی گەورە**
**هەموو کێشتانان کاکیلە**
**سەبارەتێ بە کیژۆرە دزەییان**
**بە عام دەگری.**

دەربرین و ئاماژەکردن بە ناوی ئەم هەموو جێگە و شوێنە جیاوازانە (کەرکێ حوسێنێ غازی، خری عەلی بەگی، پردی رواندزێ، داری شەکرانێ، قەلاتی هەولێر، حەمامی حاجی قادر و حەمامی سێ گومەت، کۆلانی زێرینگران، مورتکەی عەلی مەحموودی، بیستانەی گەورە) هەریەکەیان هێمایە بۆ بەسەرهات و رووداوی تایبەتمەند، یان ئاماژەیە بۆ چیرۆک و مانا و مەبەستی کۆمەلایەتی یا

مێژوویی، کە ئەم جێگانە لەخۆیان گرتووە... دارە شەکران وەک چۆن لە هەستی کۆمەلایەتی خەلکی دەڤەرەکە ئارامگە و مەزارگەیەکی گیانی بووە خەلک بۆ نیاز و مەبەستی تایبەت و گشتی روویان تێکردووە، بە هەمان شێوە شوێنگەی زیارەت و گەشتیاری و سەیران و سۆیەت و سات بەسەربردن بووە، هەر ئەم هۆکارانەش وایانکردووە جووتە دارەکە لە میانی دەرخستنیان لەناو گۆرانی و بەندی گۆیندەبێژان، مانای دیاریکراو و مەبەستی ئاشکرا لەخۆبگرن. (عوسمان حەیران) لە حەیرانێکدا ئاماژە بەم دیاردانە دەکات و دەلێ:

**دەرێم برائینە برادەرینە**
**ئەورۆکە بەوێ سبیانێ گاز دەکەم**
**دەرێم: لە قەراتان**
**بابە لە قەراتی کاولە دیوینێ**
**ئەوا دەنگۆ جوابەکی بدەنە**
**شێمحەمەداغەیێ گەردی**
**دەبا لەسە کانیەکەیێ بەحرکەیێ جاران**
**ئەوا لێیدا لە غەمە لەگە نۆینێ**
**ئەمان ئەنگۆ زەینێ خۆ بدەنێ**
**دەرێم: رەوشە سۆری خەیلانی**
**ئەسمەرێ زراری**
**جەواهێرێ ئەحمەد بادینان**
**دێنەوە لە زیارەتی داری دارشەکرانێ**
**ئەوا دەرێم: پەنجەیێ نەرمۆکە نەرمۆکە**
**گەلە شیرینە، شل بووینە**
**لەبە رەوتار و رۆینێ**

داری شەکرانێ لەناو زۆربەی جۆرەکانی گۆرانی و بەندی میللی رەنگیداوەتەوە، چونکە نیشانە بووە بۆ دەربرینی مەبەست و نیاز لە هەمان کاتیش وەک کاروان سەرا و قۆناغ وابووە، گۆیندەبێژان ئەم جووتە دارەیان بە قۆناغ زانیوە، وەک چۆن بێژینگ بەسەر و زورگەزراو و قەلای هەولێرێ و پردی رواندز قۆناغ بەندی ناو بەندەوارییەکانی حەیران و گۆیندەبێژان بوون، ئاواش جووتە داری شەکرانی هاویار و هاوقۆناغی شوێنانی دیکە بووە لەگەلیان ئاوێتەی وێژە و کلتوور و ئەدەبی میللی بووە.

**دارێ شەکرانێ بەر لە سێبەرە**
**رۆژان دەگرم قەردم لەسەرە**
**دارێ شەکرانێ بەر لە گوێرێ**
**کەمبەری زێرە نێکان دەگێرێ**

**داری شەکرانێ بەر لە دهۆکێ**
**هێ کراست چیتە لەسەر نینۆکێ**
**داری شەکرانێ بەر لە مەخمووری**
**دوو کیژی چاوکار لەبەر مافووری**

هەرچەندە بەناو بەند و بەسەرهات و گۆرانی و بابەتی فۆلکلۆری و میللی شۆڕبینەوە ئەوەندەی دیکە ئەم جۆرە دیاردانە بەدیدەکەین و ناوی جووتە داری شەکرانێ پتر و تۆکمەتر بەناو رەگ و ریشالی بەرهەمی فۆلکلۆری دەچێتە خوارەوە بە ئەدگار و دیمەن و شێوەی هەمەجۆر خۆی دەردەخات.

**کاکە سەرێ من دێشێ دەردێ لە درم دەناری**
**کۆچ و کۆچباریان لێنا ئاواهوون لە تیماری**
**دەچمە سەر هەردوو کەرکان دەرۆغە فاتمێ خاری**
**چیغ و رەشمار و چادر هەریاندا لە بناری**
**دوو کیژی گوارە زێرین بە جووت حەوشیان دەماری**
**گوێمێ بێنە ماچتکەم شازولفی هەردەماری**
**حەیفم لێ کەندێناوەی چۆل بوو بەوێ بواری**
**دەغر و دانیان لێ نەهات مەر و بەرخیان بەردانێ**
**کۆچ و کۆچباریان لێنا بەر لە (داری شەکرانێ)**
**مەر و بەرخ بەپێی خۆ بزن بە خۆ و بە کاری**
**خۆزگە بازگری ماچان بام لەسەر بیرێ کەنداری**
**لە کیژۆرە دزەییان لەوانی دوگمە داری.**

سەرچاوەکان:
* نووسینێکی مامۆستا مەولود قادر بێخالی.
* عومەر شێخەللا دەشتەکی، داستان و گۆرانی لە فۆلکلۆری کوردیدا، هەولێر.
* ئەحمەد حەیران، دیوانی حەیران بێژان، بەرگی یەکەم، ١٩٨٨، چاپخانەی ئەسعەد، بەغدا.
* جەلال مەلا حەسەن خۆشناو. کاوێس ئاغا، بلاوکراوەکانی رۆژنامەی میدیا، زنجیرەی کەلەپوری نەتەوەیی، لاوک، ژمارە (٢)، ٢٠٠٢.
* محیەدین قادر، ئاسۆی فۆلکلۆر، ژمارە (٥)، چیغ و رەشمار لە حەیراندا، ٢٠٠١.
* حاجی فاتیح دارەبەنی، دارە شەکران، ئاسۆی فۆلکلۆر، ژمارە (١١)، ٢٠٠٥.

**ئەم بابەتە لە گۆڤاری (ئاسۆی فۆلکلۆر) ژمارە (٢٠)ی سالی ٢٠٠٦ وەرگیراوە.**

# حەسەن حەیران تەلەرخێمی

سەعدوڵڵا ئیسماعیل

١- چەندی گاز دەكەم و ناكەم سێتاقان لەمن ئەوبەر ئەوبەرە،
ئەوە دەرێیم: جادەكەی كۆیێ لەمن ئەوسەر ئەوسەرە،
كۆشكی مارێ بابی نازدار حەیرانەكەی من بەتاق و پەنجەرە،
ئەوی غەداری غەدار داك جۆتەكی تیرانییان لە جەرگی دایە،
یەكیان ناوی خەجیجە ئەوی دی ناوی ئەسمەرە،
ئەمن دونێ گەلە بە درەنگەوە گەیشتمە بەژنێ باریك حەیرانێ،
دەیگۆ: وەرە بترازینە كلیلێ سنجاقان
بەدەستی من دەربینە جۆتە شەمامە شەمامان
ئەورۆ لە كاولە گوندەكەی مە شایی و گۆوەندە نازانی!
لەمن خڕ بوویتەوە ئاخە لەگەر كەسەرە.
٢- ئەوە دیسان غەمێ لە دنیایێ،
ئەورۆ هێوارێ لەدری كاكێ تو دەیانكرد تەگبیرە لەگەر هەڵلایە،
سەد حەیف و دوازدە مخابنی دنیایێ لەبۆ كوڕیە كیژۆڕەكانی پەرچەم
سێ شەو لە سێباری شەوێ هوردە فرمێسكان بەردەداتەوە بەسەر روومەتی سۆری گور گوری،
گەلە بە درەكی غەمبەبار كەلەكان دەگۆڕی هەر بە تەنیایە،
دونێ گەلە بە درەنگەوە لەزاریێ كوڕانێ گەیە نازدار حەیرانێ
دەیگۆ: وەرە لاوی نەرمۆكە بترازێنە كلیلی سنجاقان
بەدەستی من دەربینە جۆتە شەمامان
هەروەكو گوڵەكەی مێران بەخوا بویتە كندری حەلەبێ لە ملم شەتایە.
٣- ئەنگۆ بە چاوی من بڕۆننێ
دیسان برام گەوارەكی دەهینا چەند دوور دەباری،
ئەوە سۆر دەكاتەوە دەشتی كاولە عارەبان دەگریتەوە
دەشتی كاولە قەراجی، سەری قەرەبۆتك و قەرەبێتكان
دەراوێ قورینگان، گۆمێ ماروашان، دەوزێیەكا بادینان،
گۆمەتەكەی سولتان عەبدوڵڵای عارەبی، سەری قەراتی پیرە مەخمووری،
شۆڕ دەبیتەوە لە دەركی بازارگەی خۆمان
گەلە گەلە بەنازی تەڕ دەكاتەوە سەر و پەرچەمێ شەنگەبێری گاوەرە و كەنداری.
٤- دەرێیم خۆزیا بە خۆزی داران
باجگری ماچان بام لەسەر پردەكەی كاولە رواندوزێ،
ئەوەلەن لە كیژۆرە بارەكیان، لە گەردەن كێلی رواندزیان
لە سەر بەتاسی خۆشناوان، یەقە بە سنجاقی كۆییان
سەر بە پۆشی سولەیمانییان، لە عەبا رەشی هەولێرییان،
لە بسك قوتی سارەییان لە كیژە خێرەكی و رەوەندی و

ئاکۆیی و خەیلانییان
لە شل و مل و چاو.بەکل و باغەر شۆڕی دزەییان
وەکی فـەسلی دەرە بواران دێنەوە لەسـەر چاکـەکـەی سوڵتان عەوڵڵای عارەبی،
لە گۆڕی معێجیلەی، لە گۆمی سێقولینچکی، ناوەڵڵا دەرێم لە کەند و لەندی مشاری.
٥- دەرێم لە زوری لە بۆت بێنم پەرچەم شێ لە زوری مازوری،
دەبا چاوی تـو لەبۆ من بێـنێ بە چاوی کـار و کارغەزالەکانی سۆرخونی
چاوڕەش وەکی دەلەوەڕێتەوە لە دەشتی کاولە قەراجی
هەمـوو دانی سـبەینان گەلە بەنازی کێشتاوی خۆی دەکردەوە لە جۆگەی مەغمووری،
ئەوجا خۆزیا بەخۆزی داران!
دوو راموسانم قەردبایە لەوی غەداری غەدار داک،
یەکـەکـیان وەکی سـبەینان سـۆر دەبی لەبەر هەرمی ئاگری،
ئەوی کە وەکی دانی هێواران دادەنیشی لەبەر تەونی
دەست دەگەینتە مقەسەکی ئینگلیزی گەلە گەلە بەنازی
بەدرەکی غـەم بەبار فرمـێسکان بەردەداتەوە بەسـەر روومەتا سۆری گور گوری
گەلە بەدرەکی غەمبەبار دەبڕی گورینگەی مافووری.
٦- دەرێم: بابە ئەورۆ هێـواری چەندی گـاز دەکـەم زێی بادینان،
لەمن دێ و دەسافێ، شەپۆلی خۆی دەداتەوە لە جسری کەلەکی،
لە عـاوی مـەلا ئۆمـەر و چەمـە دوبزان گـوێڕ و زمـارە و زماران،
هەمـوو دانی هێـواران گـەلە بەنازی پاری خۆی دەدا لە گردەکەی کوشافێ،
دەبا سینگ و مەمکی ئەوی غەداری غەدار داک لەبۆ من بێنێ بە گۆمبەتەکەی سوڵتان عەولای عارەبی،
وەکی هەموو فەسلی دەرە بواران جاحێرەکانی در بەخەم
لە بۆ خۆ گەلە بە درەکی غەم بەبار لێ دەکەنەوە زیارەتە لەگەر توافێ.
٧- دەرێم بابە لەبەر گەلی دۆست و برادەران،
ئەمن نازانم بەکێندەرێدا هەربڕێم چاوەکەم،
دەرێم لە سیلان لە سیلەی مزگەوتێ،
ئەمن لەبۆ خۆ بە تەمای بووم بەوێ فەسلی دەرەبوارێ
بە مرازو مەقسودی خۆم بکەم لەگەر دوو چاوی بەرەک
ئەمن نەمدەزانی پیرە کوردستان کۆسپەی دەیەختێ
ئەوە ماری بابی حەیرانێ لێی دەناوە
ئاوا دەبوو لە زورگەزراوی خۆمان
دەپەڕییەوە لە کەندی کەندیناوێ
شۆڕ دەبوونەوە لە کلکەیێ قەرەبۆتک و قەرەبۆتکان
وەکی دەکێشی سەری شیوەرێ دەرێی قورینگە گەردەنی خۆی هەردەکێشا
دەزانم هەواریان گـەلە دوورە هەریاندەدا لە دەو کـاولە شەتی
دەوجا کیژ دەرێ: عەزیزێ بەدری خۆم
دەتو وەرە دەستەکی لە بۆ خۆ باوێ سەر ملی بە کەزی
بەدەستی دی بترازینە کلیلی سنجاقـان دەربینە جۆتە شەمامە شەمامان
هەرمژە خاری گەردەنان بۆنکە گەڕی خەناوکان بەینی مۆری و مەرجانان
گەلە ئاشق سەری خۆیان نایەوە بن گری
گـەلە مـەترسیم هەیە لەسـەر درمـان بیتـە (کـۆلە لەگـە ئاخرەتێ).
١٧- چەندی گاز دەکەم و گاز دەکەم
دەرێم: خۆزیا بە خۆزی داران! دەبا من کوریکەک بامایا لە کوریکی لەیلایێ،
ئەوەل فـەسلی دەرەبواران شێ ببامـا لەسەر قـەراتی پیرە هەولێرێ
هەمـوو دانی سـبەینان دەبا بەری خـۆم دابایە هەردوو دەرکەی سەرایێ،
ئەمن دونێ لە مـەرکەزی ژوانێ گـەیە دوو چاوێ بەرەک
لەمن وابی خەبەرەکییان دەدامێ
لەمن وابی دەگەمە مراز و مەخسودی، ئەمن نەمدەزانی لە پێیانم دەکەنەوە سندمێ
لە دەستانم دەکەنەوە کەلەمچێ گەلە بەدرەکی غەم بەبار دەمنێرنە حەفت قۆناغ لەخوار بەغدایێ.

*** لە کـتـێبی سـەربردەی کـۆمەڵە حەیرانبێژێکی کـورد وەرگیراوە.**

# بەیتی حەسەنە شەل

ئەحمەد حەیران

ئەم بەیتە لەچەند سەرچاوەیەکی فۆلکلۆری ناوی هاتووە و باسی پیاوێک دەکات بەناوی (حەسەن)، بەپێی پێکهاتنی وشەکان و بیرۆکەی ناو بەیتەکان، بابەتەکە باسی بەسەرهاتێک دەکات کە دەگەڕێتەوە بۆ رۆژگاری فەرمانڕەوایی ئینگلیز لە کوردستاندا. هۆنینەوەی بەیتەکە ئازایەتی و جوامێری حەسەنی تێدا دەردەکەوێ. بەسەرهاتەکە سەرەتا و کۆتایی نییە، تەنیا ئاماژەکردنێکە بۆ مرۆڤێک کە لەسەردەمی ئینگلیزەکاندا گیراوە و لەسێدارە دراوە، حەسەن قارەمانی هۆنینەوەی سەر لەبەری بەیتەکەیە، بەڵام چ بەسەرهات و رووداوێک ئەم پیاوەی کردووە بە قارەمانی بەیتەکە؟ ئەمانە لەناو بەیتەکە نادۆزرێتەوە، چونکە تەنیا لە سێدارەدانی حەسەن هاوسۆزییەکی میللی جەماوەری بۆ دروست کردووە و وایکردووە ئەم مرۆڤە بچێتە ناو ئەدەبی میللی و لە فۆلکلۆری گەلەکەیدا رەنگبداتەوە، ئەگینا رووداوەکانی رۆژگاری فەرمانڕەوایی کردنی ئینگلیزەکان لە کوردستان باسی هیچ قارەمانییەکی ئەم حەسەنە ناکەن ئەنجامی دابێ تا بەم شێوەیە چووبێتە ناو بەیت و بەندی میللییەوە. تەنانەت لەیاداشتنامەی بەرپرسە ئینگلیزەکان و رۆشنبیرە کوردەکانیشەوە ئاماژە بەم ناوە نەکراوە. هەرچەندە بەیتەکە خاسیەتی ناوچەیی پێوە دیارە و تایبەتە بە هەرێمداریەتی هەولێر. بۆچوونی واهەیە دەڵێن: ئەو حەسەنە دز بووە، بەڵام دارشتنی بەیتەکە لەو بۆچوونە بەدوورە، چونکە پیاوی دز هەردەم لەناو کۆمەڵدا سەرزەنشت کراوە نەک ستایش، کەچی لێرەدا حەسەن بووە بەمرۆڤێکی داستان خوڵقێن، لەگەڵ ئەمەشدا کردە داستان ئامێزەکەی دیار نییە. نازانرێ ئەو ئازایەتییە چییە کەوا حەسەن ئەنجامی دابێ بۆ ئەوەی بەم رادەیە بخزێتە ناو ئەدەبی میللییەوە. شێوەی سەربردەکە لەوێنەی بەسەرهاتی (خولە پیزە) دەکات. پێدەچێ حەسەن مرۆڤێکی یاخی و ئەشقیابێ. لەوانەیە مرۆڤێک بێ لەدژی دام و دەزگاکانی سەردەمی ئینگلیز جووڵابێتەوە بۆیە خاسیەتی دزیان داوەتە پاڵ و لەسێدارەیان داوە. هەندێک دەڵێن: حەسەن پیاوی (عەلی پاشا) بووە لە هەولێر نۆ خوێزەی هەبووە. لەمیری حاسێ دەبێ واتە یاخی دەبێ لەگەڵ دووکەسی دیکە بەناوی (مەولود) و (کەریم)، دەگیرێن و لەقەنارە دەدرێن. بەپێی قسەی تر گوایە ئەو حەسەنە لەهۆزی (مامەش) بووە، هاتۆتە ناوچەی هەولێر و لەگوندی ئەشکەو سەقا لای (شێمە حەمە داغەی گەردی) گیرساوەتەوە، لەوێ ناوبانگی عەلی پاشای دەزانێ و دێتە لای دەبێتە پیاوی ئەو، عەلی پاشا کابرایەکی تورک بووە، لەگوندی حەسارۆکان دانیشتووە. گوندەکانی کانی گەنی و عەزە و قونیان و کەسنەزان هی ئەو بووە. لەناو هەولێریش موڵکی

هەبووە، ئەو عەردی لای سینەما حەمرا هی ئەوان بووە. کوڕێکی بەناوی تەحسین هەبووە، پاشان ئەو زەویانەیان فرۆشتووە و چوونەوە تورکیا، دیارە ئەمە سەردەمی عوسمانییەکان بووە. ئینجا دەڵێن: حەسەن لەگەڵ دوو کەسی دیکە بەناوی (کەریم) یەکێکی دیکەش بەناوی (ئەحمەد عەتار) دەبنە نژدەوانی عەلی پاشای. واتە خەبەردار یا پاسەوان، ئەوانە دەسەڵاتداری ناوچەکە بوون. ئەوەی ویستوویانە کردوویانە، پاش ئەوەی دەسەڵاتی تورکە عوسمانییەکان لەم وڵاتە نەماوە، ئینگلیز هاتووە لەسەردەمی ئینگلیزەکانیش ویستویانە وەکوو رۆژگاری تورکەکان بکەن، بۆیە دەچن لە (رەشکێن)ی لەرێگای موسل- هەولێر، قافلەی رووتدەکەن، لە ئەنجامدا دەگیرێن، (حاکمی خێلە) کۆنە حاکمێکی سەردەمی عوسمانییەکان دەبێ، فەرمانی خنکانیان دەردەکا و هەرسێکیان لای (قشرەی سواری) لەقەنارە دەدرێن و تەرمەکانیان لای ئۆردی، تەیارەخانەی فرێ دەدەن، خەڵک چووەتە تەماشایان. (مام رەسول خدر) بلباسە خەڵکی گوندی پیر رەشییە، تەمەنی (٨٠) ساڵ دەبێ دەڵێ: چومە سەریان پەتکیان هەر لەملی بوو زمانیان بەستەک دەرهاتبوو. هەروەها (حاجی محەمەدە سوور) تەمەنی نزیکەی (١١٠) ساڵ بووە لەساڵی ١٩٩١ کۆچی کردووە ئەویش دیویەتی، دەڵێن: پاش ئەم کارە هەولێر هەموو تاسا بۆیە کەس نەدەوێرا دەنگێ بکاو شتی لەم جۆرە کارانە بکات، رووداوێکی دیکە هەیە بەناوی (حەسەن و مریەم) ئەمە باسی چۆنیەتی بەسەرهاتی ئەو دووکەسە دەکات، لە کتێبی (داستان و گۆرانی لەفۆلکلۆری کوردی) دا کۆکردنەوەی مامۆستا (عومەر شێخەڵڵا دەشتەکی) بەدوور و درێژی باسی بەسەرهاتەکە کراوە دەڵێن:

حەسەنە شەل، ئامۆزای یاخود خزمێکی نزیکی ئەو حەسەن و مریەمەیە، بەم بۆچوونە بێ، دەبێت حەسەنە شەل خەڵکی قەشقە بێت، بەهەر پێوودانگێک بێت، بەیتی (حەسەنە شەل) یاخود (چەندم گۆ کوڕە حەسەن) پێویستی بە دواداچوونی زۆر هەیە بۆ ئەوەی بگەینە بنج و بنەوانی سەربردەکە، ساڵی رووداوەکە، کردەوەکانی حەسەن، ئایا یاخی و ئەشقیا بووە یاخود چەتە و رێگر؟ ئەمانە هەموو وردەکاری دیکەی دەوێ، ئەگەر ئەم بابەتەش دەروازەیەک بێت بۆ ساغکردنەوەی بەیتی (حەسەنە شەل) با ئەم کەسەی زانیاری لەم بارەیەوە شک دەبات بیخاتە بەردەست لەپەرتووکی (فۆلکلۆری هۆنراوەکانی کوردەواری) لە کۆکردنەوەی بەرێز (محەمەد کەریم شەریف) لەژێر ناوی (چەندم گۆ کوڕە حەسەن) دەڵێ:

**چەندم گۆ کوڕە حەسەن**
**مەکە خزمەتی دایێ**
**شا کەزیانت لۆ دەبڕم**
**بیکە گورینگەی عەبایێ**
**چەندم گۆ کوڕە حەسەن**
**مەکە خزمەتی دایێ**
**سەرێ خۆمان هەر بگرین**
**بچینە دەر لە دنیایێ**
**ئەو سارە ژن گرانە**
**لێرانە بەکرین نایێ**
**چەندم گۆ کوڕە حەسەن**
**مەکە خزمەتی خاری**
**سەرێ خۆمان هەربگرین**
**بچینە وراتی زێباری**
**چ غیرەت بوو لەبۆ توو**
**یاریان برد بە عەبداری**
**چەندم گۆ کوڕە حەسەن**
**مەکە خزمەتی میری**
**سەرێ خۆمان هەر بگرین**
**بچینە وراتێ جزیری**
**شاکە زیانت لۆ ببڕم**
**بیکە بەندۆکی شیری**
**چ غیرەت بوو لەبۆ توو**
**یاریان برد بە یەخسیری**
**لەوراتی غەریبیان**
**تامنت بێتەوە بیری**
**چەندم گۆ کوڕە حەسەن**
**دەرکێ قشرەی بە (بی) یە**
**شەش خانان مەترۆقینە**
**تابوور عەسکەر هاتییە**
**ئەو سار غەزا غەزایە**
**بەجێما سینگ (سپی) یە**
**چەندم گۆ کوڕە حەسەن**
**دەرکێ قشرەی بەبەردە**
**شەشە خانان مەترۆقینە**
**تابوور عەسکەر لەگەردە**
**ئەو سار بوویتە نەهاتی**
**بەجێما گەردەن زەردە**

چەندم گۆ کورە حەسەن
دەرکێ قشرەی بەناوە
شەش خانان مەترۆقینە
تابوور عەسکەر لەناوە
ئەوسار غەزا غەزایە
بەجێما بەرەک چاوە
چەندم گۆ کورە حەسەن
دەرگەی قشرەم بەناوە
حاکم بەخۆی دەگەڕێ
جەلاد خانەی داناوە
لەسەری حەسانیاندا
بەجێما بەرەک چاوە
چەندم گۆ کورە حەسەن
دەرکەی قشرەم بەقورە
حاکم بەخۆی دەگەڕێ
جەلاد خانەی لەگرە
لەسەرێ حەسەنیان دا
بەجێما مەمک خرە
چەندم گۆ کورە حەسەن
دەرکەی قشرەم هەورازە
حاکم بەخۆی دەگەڕێ
جەلاد خانەی لەترازە
لەسەرێ حەسەنیاندا
بەجێما گەردەن قازە
چەندەم گۆ کورە حەسەن
دەرکەی قشرەم بە (بی)یە
حاکم بەخۆی دەگەڕێ
جەلادخانەی لەتییە
لەسەرێ حەسەنیاندا
جێما مل بە (هەوری)یە
چەندم گۆ کورە حەسەن
مەکە خزمەتی خاری
کەزێێ خۆمت لۆ دەبڕم
بیکە قویەی مەتاری
لەوراتی غەریبیان

**نارەقەی پێ راماری**

هەروەها لەکـتـێـبی (فـۆلکلۆری کــوردی) کــە لە کــۆکــردنەوەی (سەعدوڵلا ئیسماعیل شێخانی)ە. لەساڵی ١٩٨٥ چاپکراوە لەژێر ناوی (حەسەنە شەل) لەبەیتێکدا دەڵێ:

هەی دێ هەی نایە حەسەنم نایە
تیلەکی لێدەن لەبۆ بەغدایە
حەسەن حاسێیە نایەتە رایە
* * *
هەدیارە دیارە هەولێرۆک دیارە
ئەورۆ سێ رۆژە داندرا سێدارە
سێ کەسیان دەبرد لەبۆ قنارە
یەکیان مەولوودە لاوی رەشتارە
یەکیان کەریە بابی عەتارە
ئەوی دی حەسەنە بەخۆی موختارە
* * *
هەرێ ئەستێرەک لەلای بەیانی
هەر لەکن قشرەی هەتا مەیدانی
پۆلیس دادەکشا لۆ چایەخانی
حەسەنیان دەبرد لۆ سەر لێدانی
هی برایان دەبرد مەردی مەیدانێ
* * *
چەندم گۆت حەسەن وەرە قەمتەرێ
هەرکێشە قەمەی لەگەر خەنجەرێ
حاکم ئینگلیزە گەیشتە سەرێ
* * *
هەردێ ئەستێرەک لەلای عیشایێ
حەسەنیان دەبرد لۆلای سەرایێ
چەند سەید و مەلا چوونە رجایێ
ئەو کافر بابە ناگری تکایێ
* * *
چەند دەمگۆت حەسەن وەنیە وەمەکە
مەچووە سەر ڕێیان ڕێگرین مەکە
مەچووەوە سەر رێیـان قافلەی رووت

مەکە
تۆ مارت زۆرە تەماعیان مەکە
پیرۆز جوانە بێ مرادی مەکە
لەعلی گچکەیە بێ بابی مەکە
* * *
هەرات ئەستێرەک لەلای بەیانی
هاتە هەولێرێ قەومی شەیتانی
ماینی حەسەنی شینکی بەجوانی
حاکم رایکێشا عالەم پێی زانی
چەندم گۆت حەسەن هەستە لەخەوێ
لەبەرت بکەم فەرمان و کەوێ
حاکمی سیاسی هەر ئەتۆی دەوێ
* * *
چەندم گۆت حەسەن وەرە قەمتەرێ
هەر کێشە قەمەی لەگەر خەنجەرێ
حاکم ئینگلیزە گەیشتە سەرێ

لەکـۆتاییـدا پێـویسـتـە ئەوە دەربڕین، ئایا خـاوەنی ئەم بەیتـە مـیللیـانە کێن؟ ئەم هۆنەر و شـایەرە بەتوانایانە کێن کەوا ئەم بەیتانەیان هۆنیـوەتەوە؟ لە پەرتووکـەکـەی مامۆستا (محەمەد کەریم شەریف) بەهیچ کلۆجـێک ئامـاژە بەناوی خاوەنی بەیتەکە نەکراوە، لەکاتێکا پێویسـتـە خاوەنی ئەم جۆرە بەیتانە دیار بن. کاک (محمد) کە خاوەنی بەرهەمە کۆکراوەکەیە ئەسەر بردەی بەیتەکە نەخاوەنی بەیتەکە نازانێ و ناناسێ. لەبەرهەمـە کـۆکـراوەکـەی شـێـخـانیـش هەمـان دەرەنجام هەیە، بەڵام لەکۆتایی کـتـێـبەکە ناوەکـانی دیاری کـردووە، کـەچی دیاری نەداوە کێیە خاوەنی بەیتی حەسەنە شەل.

* کاروان ژمارە ١٢٦-١٩٩٨

# گۆرانیی کار لە دەشتی هەولێر

هەنگاو ئەنوەر شێخانی

**بەرایی**

گۆرانیی کوردی، گەنجینەیەکی پڕ بەهایە. مێژوویەکی دێرینی هەیە، هەوێنەکەی لە سرووشتی کوردستانەوە وەرگیراوە. دەماودەم لە نەوەیەکەوە بە نەوەیەکی دیکە گەیشتووە و گواستراوەتەوە و رەنگدانەوەی ژیانی کۆمەلایەتی و ئابووریی و سیاسی نەتەوەی کوردە.

فەرامۆشکردنی گۆرانی کەلەپووری کوردی، رێگەدانە بە لەناوچوونی بناغەیەکی گەورەی کەلەپوور و ناسنامەی کورد بە گشتی.

گیروگرفتی گەورەی ئەم قوناغەی گۆرانی کەلەپووری کوردی دەکرێ لەم هۆیانەی خوارەوەدا تاو توێ بکرێ: بەهۆی بەرەو پێشچوونی رێرەوی ژیان و گۆڕانی گوزەرانی ژیان لە زەمەنێکەوە بو زەمەنێکی دیکە، پێشکەوتنی تەکنەلۆژیاو بلاوبوونەوەی شەپولی جیهانگیری، کەرەستەکانی جێبەجێکردنی ژیانی رۆژانەو پەیوەست بوونی شوێن و سروشتی ئەم گۆرانییانە بە شێوەی هەلسوکەوت و ژیانی مرۆڤی کونی کورد و کارلێکی کاریگەی کولتووری نەتەوەکانی دەوروبەر بەسەر یەکتریییەوە و هەروەها کاریگەریی گەلانی هاوسێی کورد بەهۆی دەسەلات و بارودوخی تایبەتی سیاسییەوە، هەمووی کاریگەری خراپ و ناهەمواری کردووەتە سەر گۆرانی کوردی بەگشتی و گۆرانیی کەلەپووری کوردی بە تایبەتی.

بۆیە کۆکردنەوە و پاراستنی گۆرانی کەلەپووری کوردی، ئەرکێکی مرۆیی و نەتەوەیی و گرنگی ئەم قۆناغەی مێژووی گەلەکەمانە، چونکە بەشێکی زۆری گۆرانییەکانی کەلەپووری کوردی، لە گیان و هۆشی ئەو مرۆڤە کوردانە پارێزراون کە تەمەنیان زۆرەو هێشتا لە ژیاندا ماون. لەگەلّ تێپەربوونی کات، ژیانی ئەو بە سالاچوانەش بەرەو کۆتایی دەچێت و یەک لە دوای یەک ئەم گەنجینە دەولەمەندو بەهادارە لەگەلّ خۆیان دەبەنە ژێر گلّ.

دەشێ ئێمە سوود لە تاقیکردنەوەی گەلانی پێشکەوتووی جیهان وەربگرین و ئەنجامە زانستییەکانیان لە بواری کەلەپوورناسیی موزیکناسیدا بۆ خزمەتکردنی کەلەپووری کوردی بەکاربهێنین.

گەلانی ئەورووپا، پاش برینی چەندین قوناغی گرنگ لە پێشکەوتن و داهێنان، هێشتا گرنگییەکی زۆر بە کەلەپووری خۆیان دەدەن، بەردەوام لە کۆکردنەوەیدان، زانستانە شیدەکەنەوە و سەرلە نوێ بە دارشتنی نوێوە پێشکەشی دەکەنەوە. زۆربەی سەمـا کەلەپووری و میللییەکانی گەلانی ئەورووپا ئێستا بەشێکن لە موزیکی جیهانی.

کەواتە بۆچی ئێمەش، بایەخ بە کەلەپووری گەلەکەمان نەدەین و هەولّی زیندوو کردنەوەی نەدەین؟

گۆرانی کەلەپووری کوردی بناغەی موزیکی کوردییە بە گشتی و بەشێکی گرنگی پێناسەی نەتەوەیی گەلی کوردە. بێگومان گۆرانی کەلەپووری کوردی، جۆری زۆرە و دەشێ لە گەلێک رووەوە پولێن بکرێ.

گۆرانی کار، جۆرێکی گرنگی گۆرانی کەلەپووری کوردییە و دەشتی هەولێریش کە ناوچەیەکی مێژوویی گرنگی کوردستانە، بەم جۆرە گۆرانییە بەناوبانگە. بەو پێیەی کە ناوچەیەکی کشتوکاڵییە و کشتوکاڵ بەشێکی گرنگی ئەم ناوچەیە بووە.

**بنەچەی وشەی هەولێر**

شاری هەولێر یەکێکە لە شارە دێرینەکانی جیهان و هەتا ئەمڕۆش ژیانی تێیدا بەردەوامە. هەندێک لە مێژوونووسان لەو باوەڕەدان، کە (٥٠٠٠) ساڵ پێش زایین، هەولێر شارێکی ئاوەدان بووە(١)، بەڵام هەندێک مێژووناسانی دی بۆ نزیکەی (٤٠٠٠) ساڵ پێش زایینی دەگەڕێننەوە[٢].

بەپێی ئەو ئەنجامانەی توێژەر حوزنی موکریانی لە چەند توێژینەوەیەکدا پێی گەیشتووە، بنەچەی وشەی هەولێر لە وشەی (هۆرلێر) یان خۆرلێر) ەوە هاتووە کە واتای پەرسگەی خۆری بەخشیوە.

هەتا ئەمڕۆش لە زاری هەورامیدا کە زارێکی کۆنی کوردییە، پیتی (ه) وەک پیتی (خ) دەردەبڕدرێ[٣]. ئەم گریمانەیە لەگەڵ بیروباوەڕی ئایینی زەردەشتیدا کە ئایینێکی کۆنی کوردە یەکدەگرێتەوە، لەبەر ئەوەی ئاگر لەم ئایینەدا هێمایەکی زۆر پیرۆز بووە.

سۆمەرییەکان ماوەیەک حوکمڕانیی شاری هەولێریان کردووە و بە ئوربیل ناویان بردووە[٤]. بەڵام بابلی و ئاشوورییەکان پێیان گوتووە: ئەربیل، یان ئەربیلۆ، یان ئەربائیلۆ، کە واتای چوار خواوەند دەبەخشن و لە نووسینە مێخییەکانیاندا یاداشتیان کردووە.

لە نووسینە فارسییە کۆنەکاندا، شاری هەولێر بە (ئەربیرە) ناوبراوە[٥].

لە سەدەی دووەمی زایینیدا پێیانوتووە: حەدیاب[٦]. دوای بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام لە کوردستاندا، نووسەرە عەرەبەکان بە (ئەربیل)ناویان بردووە، بەڵام لە زمانی کوردیدا هەر لە دێر زەمانەوە پێی دەگوترێ: هەولێر، ئەمڕۆ هەولێر شارێکی گەورە و بەناوبانگی کوردستانە و پایتەختی هەرێمی کوردستانی عێراقە.

**جوگرافیای دەشتی هەولێر**

هەرێمی هەولێر لە هەرێمی کوردستانی عێراق، ناوچەیەکی گەورە و فراوانە، دەکەوێتە خۆرهەڵاتی شاری موسڵ بە دووریی (٨٧) کیلۆمەتر و سەرووی شاری کەرکوک بەدووری (٩٦ ) کیلۆمەتر[٧].

دەشتی هەولێر بەشێکی بچووکە لە هەرێمی هەولێر، لە خۆرئاوای باشوورەوە زنجیرە گردی زورگەزراو، لە خۆرئاواوە زێی گەورە، لە باشوورەوە زێی بچووک، لە باکوورەوە بۆ رۆژهەڵات دۆڵی بەستۆرە و چیای دەردەوانە هەیە. رووبەری گشتیی هەرێمی هەولێر نزیکەی (٦٤٠٠) کیلۆمەتری چوارگۆشەیە[٨]، بەڵام رووبەری گشتیی دەشتی هەولێر نزیکەی (٢٥٥٠) کیلۆمەتری چوارگۆشەیە[٩].

بەرزایی دەشتی هەولێر لەسەر ئاستی دەریا لە خۆرهەڵاتەوە نزیکەی ٤٦٠مەترە و لە هەندێک شوێندا دەگاتە نزیکەی ٥٥٠ مەتر، بەڵام لە خۆرئاواوە نزیکەی ٣٠٠مەترە[١٠].

**گۆرانیی کار**

گۆرانی کار ئەو جۆرە گۆرانییەیە کە لەگەڵ کارکردندا دەبێژرێ و پەیوەندی بە هیچ بۆنەیەکی دیکەوە نییە.

هەر کارێک لە دەشتی هەولێر جۆرە گۆرانییەکی خۆی هەیە و هەر گۆرانییەک شێوەیەک لە ئاوازو رەزم و تیژڕەوی خۆی هەیە کە پەیوەستە بە جوولەی مرۆڤ و شێوەی کارەکە. گۆرانییەکان یاریدەدەر و پاڵنەرن بۆ بەردەوام بوونی مرۆڤ لە کارکردن و لەبیرچوونی ئازار و ماندوویەتی.

هەندێک لە کەلەپوورناسان لەو باوەڕەدان، کە گۆرانیی کار کۆنترین جۆری گۆرانییە، بەڵام هەندێکی دی دەڵێن گۆرانیی ئایینی کۆنترە[١١].

هەروەها هەندێکی دی لە کەلەپوورناسان، گۆرانیی شوانی بە کۆنترین جۆری گۆرانی دادەنێن و کاری ئاژەڵداری لە کاری کشتوکاڵی بە کۆنتر دەزانن[١٢].

ئەگەر لەسەرەتای دروست بوونی کۆمەڵگەوە دەست پێبکەین. هەر لەو ساتەوەی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکدیدا دەژین و بە شێوەی جیا جیا کۆمەڵگەیان پێکهێناوە، بەپێی پێویستییەکانی سەردەمێکی دیاریکراو، لەناو ئەو

کۆمەڵگەیەدا لە ڕێگەی زمانەوە لەگەڵ یەکدی پێوەندی دەگرن و هەروەها لەڕێگەی کارکردنەوە بۆ ئاتاجەکانی ژیانی خۆیان لە هەمان کاتدا کولتوورییان بەرهەم هێناوە...... هتد[١٣].

هەروەها بنەمای وشەی کولتوور Culture لە زمانی یونانی کۆن و پاشان لە ڕۆمانەکانەوە وەرگیراوە و(ئەم وشەیەش لە وشەی Colere لاتینییەوە وەرگیراوە کە مانای چاندن دەگەیەنێت، واتە چاندنی زەوی و کێڵگەکان، لەمیشەوە وشەی Cultuo سەری هەڵداوە، کە بە مانای پەرستنی خواوەند دێت[١٤].

گۆرانیش بەشێکە لە کولتووری کۆمەڵگە. لە گۆرانیی کاریش، وشەو بیر زادەی ئیشکردن و لەش جوڵانەوەیە[١٥].

گۆرانی کار لە دەشتی هەولێر رابردوویەکی کۆنیان هەیە، بەو پێیەی ناوچەیەکی کشتوکاڵییە و هەر لە کۆنەوە مرۆڤی کورد لەم ناوچەیەدا خەریکی کشتوکاڵی بووە. دەشتی هەولێر زیاتر بە کشتوکاڵی بەناوبانگە، ئینجا شوانکاری و مەڕ و ماڵات بەخێوکردن.

جۆرەکانی گۆرانیی کار لە دەشتی هەولێر ژمارەیان زۆرن، بەڵام بەهۆی ناهەمواریی باری سیاسی ناوچەکە و بەهۆی سیاسەتی تەعریب کردن و بە زۆر ڕاگواستنی خەڵکی گوندەکان بۆ جێگەی دی و کۆمەڵگە زۆرەملێکان و گەلێک هۆی دیکەش، گۆرانی کەلەپووری و بەتایبەتی گۆرانییەکانی کار گۆرانکاری زۆریان بەسەرداهاتووە و بەشێکی زۆریان لەناو چوون.

پاش هەوڵدان و گەڕانێکی زۆر، ئەوەندەی لە توانادا بوو، نموونەی ئەم جۆرانەی خوارەوەم لە گۆرانیی کاری دەشتی هەولێر کۆکردەوە.

١- گۆرانیی مەشکەژەنین.
٢- گۆرانیی دروێنە.
٣- گۆرانیی شەنەبا یان تارمە هەڵبەستان.
٤- گۆرانیی ساوار کوتان.
٥- گۆرانیی دەستاڕ یان گەنم هاڕین.

### گۆرانیی مەشکەژەنین

مەشکە ژەنین جۆرێکی دیکەی کاری ژنانەی دەشتی هەولێرە، ژنێک یان دووان پێکەوە مەشکەی دەژێنن. ئامێری مەشکەکە لە سێ دار و بەشێوەیەکی هەرەمی سێگۆشەیی دروستدەکرێ. دارەکان لە زەوی دەچەقێنرێن و مەشکەکەی پێوە هەڵدەواسرێ، مەشکەکەش لە پێستی گیانلەبەرێکی ماڵیی دروستدەکرێ و لە دوو سەرەکەیەوە دارێکی تایبەتی پێوە دەکرێ پێی دەوترێ: لۆلەپکە بە هۆیەوە مەشکەکە دەگیرێ.

کاتێک ژنان ئەم کارە دەکەن چەندین گۆرانی هەمەجۆرە دەڵێن، هەندێکیان تایبەتن بە مەشکە ژەنینەوە و هەندێکی دیکەیان باسی بابەتی دیکە دەکەن.

**گۆرانیی یەکەم**

ناوی گۆرانیبێژ: بۆسکان ئەحمەد حەمەد رۆستەم ،
گوندی: برایمەلەک.
ساڵی لەدایکبوون: ١٩١٢
ڕۆژی تۆمارکردن: ٢٠-١٩٩٨/١٢/٢١،
کاتی ئاوازی سەرەکیی گۆرانییەکە: ٠٠: ٦: ٠٠
کاتی تەواوی گۆرانییەکە: ٤٥: ١٢: ٠

**مەشکە**

مەشکە مەشکەی چێرێ سۆرە
کابان لێدا نۆر بە نۆرە
***
مەشکە مەشکەی گاوسی و
کابان لێدا دەرۆیی
***

دەنگەواری ئەم گۆرانییە لە دوو دەنگ پێکدێ و سنوورەکەی میانەیەکی دووانی گەورەیە:

ئەم گۆرانییە لە چواریلەی عەجەم پێکدێ، بەڵام دوو دەنگی ناتەواوە:

میانەکانی گۆرانییەکە:
شێوەی ڕیتمی ئاواز:

**گۆرانیی دووەم**

ناوی گۆرانیبێژ: یاسین تەها ئیسماعیل
گوندی: پیرداود
ساڵی لەدایک بوون: ١٩٣٩

رۆژی تۆمارکردن: ۲۷/۱۱/۱۹۹۸
کاتی ئاوازی سەرەکی گۆرانییەکە: ۱۰: ۸: ۰
کاتی تەواوی گۆرانییەکە: ۰۰: ۵٦: ۱

**مەشکە**

هەی مەشکە مەشکە مەشکە
مەشکە مەشکەی حوشتری
لۆلەپ لە داریٚ گوریٚ
شەقەی گەبیە موسریٚ
هەی مەشکە مەشکە مەشکە
مەشکە مەشکەی بەرانی
دەیژێنم لە تەلانی
نان و کەرەی شوانی
هەی مەشکە مەشکە مەشکە
مەشکە مەشکەی تاوێسی
لۆلەپ لە داریٚ گوری
دەست بە مەشکەی وە نەگری
غەمیٚ خوی زیاتر بگری
* * *

دەنگەواری ئەم گۆرانییە لە پێنج دەنگ پێکدیٚ، سنوورەکەی میانەیەکی پێنجی کەمە:
ئەم گۆرانییە لە تەنیا چواریلەی کورد پێکدیٚ:
میانەکانی گۆرانییەکە:
شێوەی ریتمی ئاواز:

**گۆرانیی دروێنە**

لە سەرەتای مانگی شەشەوە، کاتی دروێنەی گەنم و جۆ لە دەشتی هەولێر دەسپێدەکات، خەڵکی گوندەکان دەچنە سەر زەوییەکانیان و گشتیان پێکەوە و بەهەرەوەزیی هەر جارەی بۆ ماڵێک دروێنە دەکەن.

لەم ناوچانە بەم کارە هەرەوەزییە دەڵێن: زبارە. کەرەسەکانی دروێنە لە داس و قەیناغن. قەیناغیش دوو جۆرە، یەکەمیان لە پێست و دوومیان لە تەنەکە دروستدەکریٚ.

ژنان و پیاوان پێکەوە کاری دروێنە دەکەن و وەک یەک ماندوودەبن. لە سەرەتادا پیاوان دەست بە دروێنەکە دەکەن، پاشان ژنان گوڵەگەنمەکان کۆدەکەنەوە، بە گوڵەگەنمە کۆکراوەکان دەڵێن: سوارە، سوارە کۆ دەکرێتەوە دەبێتە گیشە و بەو ژنانەش کە ئەو کارە دەکەن دەڵێن: گیشەکار. لە کاتی ئەم کارکردنەدا، یەک کەس گۆرانی دەڵیٚ و ئەوانی دی بۆی دەسەننەوە. تیژرەوی گۆرانییەکان لەم جۆرە کارانەدا جێگیرنییە. لە سەرەتای کارکردندا خێراترە و لەگەڵ ماندوو بوونیان، تیژرەوەکەش وردە وردە خاو دەبێتەوە.

**گۆرانیی سێیەم**

**قاسیدم**

ناوی گۆرانیبێژ: خدر قادر رەسوڵ
ساڵی لەدایکبوون: ۱۹٤٤
گوندی: برایە لەک
رۆژی تۆمارکردن: ۲۰-۲۱/۱۲/۱۹۹۸
کاتی ئاوازی سەرەکیی گۆرانییەکە: ٦۰: ۸: ۰
کاتی تەواوی گۆرانییەکە: ۳۰: ۳۲: ۱

**قاسیدم**

قاسیدم هۆی قاسیدم
سبەی دەرۆم بەیانی
قاسیدم گوریٚ باغانم
سبەی دەرۆم بەیانی
کارک و گوریەم لەپێکرد
هەریان دەکێشمە رانی
زێی بادینان خێن بکا
لێیدا بە مەلەوانی
قاقەزی زێرینم پێیە
دەچمە دەرکەی سوڵتانی
ئەگەر سوڵتان نەیپرسی
هاوار غەوسی گەیلانی
قاسیدەم هۆی قاسیدەم
سبەی دەرۆم گەلەکە
* * *

دەنگەواری ئەم گۆرانییە لە پێنج دەنگ پێکدیٚ و سنوورەکەی میانەیەکی پێنجیی تەواوە:

ئەم گۆرانییە لە تەنیا چواریلەی بەیات پێکدێ:
میانەکانی گۆرانییەکە
شێوەی ریتمی ئاواز:

**گۆرانیی چوارەم**
**بابە سەرم چەند دێشێ**
ناوی گۆرانیبێژ: محەمەد عەلی
ساڵی لەدایکبوون: ١٩٤٤
رۆژی تۆمارکردن: ٧-٨/١٢/١٩٩٨
کاتی ئاوازی سەرەکیی گۆرانییەکە: A ٣ ٤٣: ١٨: ٠ B
٣٨: ١٨: ٠

**بابە سەرم چەند دێشێ**
بابە سەرم چەند دێشێ
حەیفم لۆ کەندێناوێ
* * * *
دەغرو دانیان لۆ نەهات
مەرو بەرخیان بەردانێ
* * * *
هێسترو بارگینیان بارکرد
لە بۆ کێلێ کیستانێ
* * * *
گەیشتنە راستی باداوان
ئیسراحەتیان دەدانێ
* * * *
دەستمان لە ملێ یەکدی کرد
دەستمان کرد بە گریانێ
* * * *
ئەوێندەر بووە خورە پوک
لەبەر گەوز گەوزانێ
* * * *
نیشانەی کوڕ و کیژان
نەینوک لەگەر کلدانێ
* * * *
دەنگەواری ئەم گۆرانییە لە چوار دەنگ پێکدێ و سنوورەکەی میانەیەکی چواریی تەواوە:

ئەم گۆرانییە لە تەنیا چواریلەی بەیات پێکدێ:
میانەگانی گۆرانییەکە:
شێوەی ریتمی ئاواز:

**گۆرانیی شەنەبا**
شەنەبا جۆرێکی دیکەی کارکردنی دەشتی هەولێرە، لە وەرزی هاوین لە پاش دروێنە و کۆکردنەوەی دەغڵودان دەسپێدەکات. خەڵکەکە چاوەڕێی شنەبایەک (شەماڵێک) دەکەن، بۆ ئەوەی بە هۆیەوە کایەکە و دانەکەی لە یەکدی جیابکەنەوە. ئەم کارە زیاتر پیاوان دەیکەن و ژمارەیان سێ هەتا چوار پیاو دەبێ. ئەم گۆرانییانەی لەم جۆرە کارکردنەدا دەبێژرێن زۆر هاوشێوەی گۆرانییەکانی دروێنەن، بەڵام کەمێک خاوترن. بەهەمان شێوەی گۆرانی دروێنەش، یەکێکیان دەیبێژێ و ئەوانی دی بۆی دەسەننەوە.

**گۆرانیی پێنجەم**
**لەو بادینان هات خەبەر**
ناوی گۆرانیبێژ: تەها محەمەد ئەمین تەها
گوندی: نۆغەران
ساڵی لەدایکبوون: ١٩٤٧.
رۆژی تۆمارکردن: ٢٠-٢١/١٢/١٩٩٨
کاتی ئاوازی سەرەکیی گۆرانییەکە: A ٨٠: ١٩: ٠ B ٥٧: ١٩: ٠ C: ٥٠: ١٩: ٠ کاتی تەواوی گۆرانییەکە: ٣: ٣٥: ٨٠

**تارمە هەربەستان**
**لەو بادینان هات خەبەر     هۆی ئەڵڵا نەمری کانەبی**
**لەو بادینان هات خەبەر     هێ سراو لە داکت رابی**
**دووسەد سوارن بەدەفتەر     هۆی ئەڵڵا نەمری کانەبی**
**دوو سەد سوارن بە دەفتەر     هێ سراو لە داکت رابی**
**لێکیان دەدا سەربە سەر     هۆی ئەڵڵا نەمری کانەبی**
**لێکیان دەدا سەر بە سەر     هێ سراو لە داکت رابی**
**کانەبیم شەروار شینە     هۆی ئەڵڵا نەمری کانەبی**
**کانەبیم شەروار شینە     هێ سراو لە داکت رابی**
**مەرۆ دەستان هەرینە     هۆی ئەڵڵا نەمری کانەبی**

مــــەڕۆ دەســـتــان هەرینە    هــێ ســراو/ لە داکت رابی
لــــەو بادینان هات دەنگە    هۆی ئەللا نەمری کـانەبی
لــــەو بادینان هات دەنگە    هێ ســـــراو لە داکت رابی
یەک بەرانەو یەک شـەکـە    هۆی ئەللا نەمـری کـانەبی
یەک بەرانە و یەک شـەکـە    هــێ سراو لە داکت رابی
سەر بــە سـەر لێکیـان دەدا    هۆی ئەللا نەمری کـانەبی
سەر بە سەر لێکیـان دەدا    هــێ سراو لە داکت رابی
کانەبیم فـــــەقێ وەیسی    هۆی ئەللا نەمری کـانەبی
کـــانەبیم فــــەقێ وەیسی    هێ ســـراو لە داکت رابی
سـمـێـر جـوقـەی تاوسی    هۆی ئەللا نەمـری کـانەبی
سـمـێـر جـوقـەی تاوسی    هــێ سراو لە داکت رابی
بۆچ لە نەعـــمـان دەپرسی    هۆی ئەللا نەمـری کـانەبی
بۆچ لە نەعـمـان دەپرسی    هــێ سـراو لە داکت رابی

دەنگەواری ئەم گـۆرانیـــــە لە شـەش دەنگ پێکدێ و سنووردکەی میانەیەکی شەشی گەورەیە:

ئەم گۆرانییە لە تەنیا چواریلەی بەیات پێکدێ:

میانەکانی گۆرانییەکە:

شێوەی ریتمی ئاواز:

**گۆرانیی شەشەم**

**هاتیە تەیرێ گەرمێنێ**

ناوی گۆرنیبێژ: تەها محەمەد ئەمین تەها

رۆژی تۆمارکردن: ٢٠-٢١/١٢/١٩٩٨:

کاتی ئاوازی سەرەکیی گۆرانییەکە: ٨٨: ١٨: ٠ A :

کاتی تەواوی گۆرانیـیەکە: ٨٧: ١٨: B٠:

**هاتیە تەیرێ گەرمێنێ**

هاتیە تەیری گەرمێنێ
کوڕ پێی دەرێن کۆلارە
فەرخەی لە دوو خۆ ڕێزکرد
دەڕوا بە گارە گارە
هاتیە تەیرێ گەرمێنێ
کوڕ پێی دەرێن قەتێیە
فەرخەی لە دوو خۆ ڕێزکرد
دەڕوا لۆ ناو وەردێیە
خوام بە خورامی تەیرێکە
خەبەرێ یار و دێی پێیە
مەمکانی سێوی لاسۆرن
وا لە باغێ ورمێیە
هاتیە تەیرێ گەرمێنێ
کوڕ پێی دەرێن سۆفیلکە
فەرخەی لەدوو خۆ ڕێزکرد
دەڕوا چریکە چریکە

دەنگەواری ئەم گـۆرانیـــــە لە پێنج دەنگ پێکدێ و سنوورەکەی پێنجییەکی تەواوە:

ئەم گۆرانییە لە چواریلەی عەجەم پێکدێ:

میانەکانی گۆرانییەکە:

شێوەی ریتمی ئاواز:

**گۆرانیی ساوار کوتان**

لە وەرزی پایزدا، لە پاش کـولاندن و وشکبـوونەوەی گـەنمی سـاوار، دەست بە کـوتانی گـەنمەکـە دەکـرێ. لە سەرەتادا گەنمەکە دەکرێتە چاڵێکی تایبەت یان مەنجەڵێکی گەورەوە و پاشان هەتا توێکڵی گەنمەکە لە ناوکەکەی جیا دەبێتەوە دەکوترێ، هەمیشە چوار پیاو پێکەوە ئەم کارە دەکـەن، دوو دوو بەرامـبـەر یەک دەوەستن و بە نۆرە بە کـوتەکـەکـە (کـوتکەکـە) گـەنمەکـە دەکـوتن. لە کـاتی کارکردنەکەدا گـۆرانی دەڵێن و لێدانەکانی کوتەکەکەش رەزمـــێکی گـونجـــاویان بۆ پێکدێنێ. تیـــژرەوی ئەم گـۆرانیـیانەی ساوار کـوتان جـێگیـر نین و بە پێی وزە و توانای کەسەکان دەگۆڕێ.

**گۆرانیی حەوتەم**

**ساوار کوتان**

ناوی گۆرانیبێژ: عەلی حەمەد خدر

گوندی: قورشاغلو

ساڵی لەدایکبوون: ١٩٤٣

رۆژی تۆمارکردن: ١٩٩٨/١١/٢٩

کاتی ئاوازی سەرەکیی گۆرانییەکە: ٢٠: ٢٢: ٠

کاتی تەواوی گۆرانییەکە: ٠٠: ١٢: ١

**ساوار کوتان**

یا ئەڵڵا
حەی ئەڵڵا
هێتیمەک بووم
لە کاروانی
دیتم مارەک
لە تەلآنی
لامدا ماریان
لە بۆ نانی
یا ئەڵڵا
حەی ئەڵڵا
هێتیمەک بووم
هەروام دەکرد
گازی کیژی
گوندیم دەکرد
ئەوەی جوان بوو
ماچم دەکرد
ئەوەی پیس بوو
هەیدێم لێکرد
یا ئەڵڵا
حەی ئەڵڵا
هەروا دەڕوا
شورا و شورە
کزەی جەرگم
وەک تەندوورە
خەمێ مەخۆ
خوا غەفورە
یا ئەڵڵا
حەی ئەڵڵا
دانیشتبوو
لەسەر جۆنی
ئەو قەیتانەی
رەش دەهۆنی
شەو تاریکە
دەیکا رۆنی
یا ئەڵڵا
حەی ئەڵڵا

* * * *

دەنگەواری ئەم گـۆرانیـیـە لەچوار دەنگ پێکدێ و دەنگەوارەکەی میانەیەکی چواریی تەواوە:
ئەم گـۆرانییـە لە تەنیـا یەک چواریلەی بەیات پێکدێ بەلآم، یەک دەنگی ناتەواوە:
میانەکانی گۆرانییەکە:
شێوەی ریتمی ئاواز:

**گۆرانیی هەشتەم**

**ساوارکوتان**

ناوی گۆرنیبێژ: یاسین تەها ئیسماعیل
گوندی: پیرداود
سالی لە دایکبوون: ١٩٣٩
رۆژی تۆمارکردن: ١٩٩٨/١١/٢٠
-کاتی ئاوازی سەرەکیی گۆرانییەکە: ٩٧: ٠٣: ٠
کاتی تەواوی گۆرانییەکە: ٧٥: ١٣: ٢

**ساوار کوتان**

هەتیمەک بووم هەروام دەکرد
خۆم لەو کۆرانان مات دەکرد
هەرچی جوان با ماچم دەکرد
هەرچی کیژ با هەیدێم دەکرد
هەتیمەک بووم نانی نانی
غەریبەک بووم نانی نانی
نانم لێبڕا لەو کاروانی
دیتم زەریەک لەبەر نانی
کل و کلدان لەسەر رانی
دەیگۆ کەچەر بگرە نانی
دەیگوت هەتیم بگرە نانی
وەڵڵا جوانی ناگرم نانی
هەتا نەیکەم راموسانی
دەیگۆ هەتیم تۆ برۆ لێرە
دوو برام هەیە هەروەک شێرە
گازیان بکەم بێنە ئێرە
بەخەنجەران دەتکەن گێرە

دەرێ یارێ نارۆم لێرە
هەتا ماچت نەکەم تێرە
هەتا بۆنت نەکەم تێرە
دەنگەواری ئەم گـۆرانییـــە لە سێ دەنگ پێکدێ و سنوورەکەی میانەیەکی سیانی تەواوە:
ئەم گۆرانییە لە چواریلەی نەهاوەند پێکدێ، بەڵام دوو دەنگی ناتەواوە:
میانەکانی گۆرانییەکە:
شێوەی ریتمی ئاواز:

**گۆرانیی گەنم هارین یان دەستاڕ**

تەنیـا ژنان کـاری گـەنم هارین دەکـەن و دەسـتـاڕ بەکاردێن. هەندێک جار تەنیا یەک ژن کارەکە دەکات و گـەلێک جـاریش دوو ژن پێکەوە دەیکەن، هەر یەک لە ژنەکان دەستێکی بە دەسکی دەستاڕەکەوە دەگرێ و پێکەوە دەیسوڕێنن، بۆ ئەوەی لە کاتی کارکردنەکەدا زوو مـاندوو نەبن و بەخـۆشی بڕوا، چەند گـۆرانیـیـەک دەبێـژن، بەڵام هەندێک جار ئاوازەکانی ئەم گۆرانییانە، هەمان ئەوانەی گۆرانییەکانی دروێنەن.

**گۆرانی نویەم**

**دەترسم بمرم**

ناوی گۆرانیبێژ: بۆسکان ئەحمەد حەمەد رۆستەم
گوندی: برایمەلەک.
ساڵی لەدایکبوون: ١٩١٢
رۆژی تۆمارکردن: ٢٠-١٩٩٨/١٢/٢١
کاتی ئاوازی سەرەکی گۆرانییەکە: ٣٧: ٠٦: ٠٠
کاتی تەواوی گۆرانییەکە: ٤٧: ٥٩: ٠

**دەترسم بمرم**

دەترسم بمرم
خۆ بەویێ هاوینێ
مەیتم هەر بگرن
بەرنە جۆخینێ
لە رێی رواندوز
لە ژوان هەمینێ
دەترسم بمرم
بەوبێ بوارێ
مەیتم هەر بگرن
بەرنە بن دارێ
لەرێی رواندوز
لەژوان نازدارێ
دەترسم بمرم
بەویێ پایزێ
مەیتم هەربگرن
بەرنە بن گیزێ
لە رێی رواندوز
لە ژوان مامزێ
دەنگەواری ئەم گـۆرانیـــە لە سێ دەنگ پێکدێ و سنوورەکەی میانەیەکی سیانی گەورەیە:
ئەم گۆرانییە لە چواریلەی عەجەم پێکدێ:
میانەکانی گۆرانییەکە:
شێوەی ریتمی ئاواز:

**گۆرانیی دەیەم**

**دەستاڕ**

ناوی گۆرانیبێژ: یاسین تەها ئیسماعیل
گوندی: پیرداود
ساڵی لەدایکبوون: ١٩٣٩.
رۆژی تۆمارکردن: ١٩٩٨/١١/٢٧
کاتی ئاوازی سەرەکیی گۆرانییەکە: ٦٥: ٠٨: ٠٠
کاتی تەواوی گۆرانییەکە: ٥٠: ٢١: ٢

**دەستاڕ**

دەستاڕ لە مارێ کێم و کێ
دەستار لە مارێ داو دۆکی
چەند شیرینە یار بە کەوێ
سەد هەندەش بەو چارۆگێ
دەستاڕ لە مارێ کێم و کێ
دەستاڕ لە مارێ عەلیاسی
چەند شیرینە یار بە کەوێ
سەد هەندەش بەو کراسی

دەستار لە مارێ کێم و کێ
دەستار لە مارێ کیژ جوانان
چەند شیرینە یار بەکەوێ
سەد هەندەش بە چەفیە و خەمان
دەستار لە مارێ کێم و کێ
دەستار لە مارێ خەرکییە
چەند شیرینە یار بە کەوێ
سەد هەندەش بە هەورییە

دەنگەواری ئەم گۆرانییە لە چوار دەنگ پێکدێ و سنوورەکەی میانەیەکی چواریی تەواوە:

ئەم گۆرانییە لە چواریلەی نەهاوەند پێکدێ، بەڵام یەک نۆتەی ناتەواوە:

میانەکانی گۆرانییەکە:

شێوەی ریتمی ئاواز:

### ئەنجامەکانی توێژینەوەکە

لە پاش شیکردنەوەی ٣٩ گۆرانی کاری دەشتی هەولێر، ئەم ئەنجامانەی خوارەوە روونبوونەوە:

١- ئەم چواریلانەی خوارەوە بە رێژەی جیاواز لە گۆرانییەکانی دەشتی هەولێردا بەکاردەهێنرێن.

أ- چواریلەی بەیات بە رێژەی ٤٠ ٪
ب- چواریلەی عەجەم بە رێژەی ٣٠ ٪
پ- چواریلەی نەهاوەند بە رێژەی ٢٠ ٪
ت- چواریلەی کورد بە رێژەی ١٠ ٪

٢- دەنگەوارەکانی گۆرانییەکانی کاری دەشتی هەولێر، چەند جۆرێک بوون و بەم رێژانەی خوارەوە دەرکەوتن.

أ- دەنگەواری دوو نۆتەیی بە رێژەی ١٠ ٪
ب- دەنگەواری سێ نۆتەیی بە رێژەی ٢٠ ٪
ت- دەنگەواری چوار نۆتەیی بە رێژەی ٣٠ ٪
پ- دەنگەواری پێنج نۆتەیی بە رێژەی ٣٠ ٪
ج- دەنگەواری شەش نۆتەیی بە رێژەی ١٠ ٪

٣- نو جۆر میانە بە شێوە و رێژانەی خوارەوە دەرکەوتن.

کۆی میانەکان: ٥١٤
کۆی میانە هەنگاوەکان: بەرێژەی ٤٥٤
کۆی میانە بازەکان: بەرێژەی ٦٠

٤- دە جور لە شێوەی ریتمی بەم شێوەیەی خوارەوە بە دیار کەوتن:

### دەرئەنجامەکانی توێژینەوەکە

پاش بەدەستهێنانی ئەنجامەکانی توێژینەوەکە و تێروانین لێیان، گەیشتینە ئەم دەرئەنجامانەی خوارەوە:

١- دەرکەوتنی چواریلەی یادگار بە بەرزترین رێژە، واتای وایە ئەم چواریلەیە چواریلەیەکی سەرەکیی و گرنگە لە موزیکی دەشتی هەولێردا.

٢- دەرکەوتنی دەنگەواری چواریی و پێنجی بە بەرزترین رێژە، دەیسەلمێنێ، کە بناغەی گۆرانی کەلەپووری دەشتی هەولێر چواریلەکانە و مێژوویەکی دێرینیان هەیە.

٣- دەرکەوتنی میانە هەنگاوەکان بەرێژەیەکی زۆر زیاتر لە میانەی بازەکان، بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە لە گۆرانییەکانی دەشتی هەولێردا میانە هەنگاوەکان لە میانە بازەکان گرنگترن.

٤- زۆربەی ئەنجامەکانی ئەم توێژینەوەیە لەگەڵ ئەنجامەکانی هەر دوو توێژینەوەکەی توێژەران وریا ئەحمەد و سەگرمەدا یەکدەگرنەوە. بە نموونە:

دەنگەواری ئاوازی گۆرانییەکانی ئەم توێژینەوەیە بە رێژەی ٦٠ ٪ چوار نۆتەیی و پێنج نۆتەیین، ئەم رێژەیە لە توێژینەوەی توێژەر (سەگرمەدا) ٦٥ ٪ و لە توێژینەوەکەی توێژەر (وریا ئەحمەد) دا، ٨،٦٤ ٪ ئەمەش بەڵگەیە بۆ ئەوەی موزیکی کوردیی لە بنەچەوە یەک بناغەی هەیە، بەڵام بەپێی دووریی و نزیکیی ناوچەکان هەندێک گۆرانکاری کەوتۆتە نێوان شێوازەکان و موزیکی ناوچەکانەوە.

٥- دەرکەوتنی کێشی سادەی وە٢/٤ و ٤/٤ و ٦/٤ بە زورترین رێژە، بە تایبەتی کێشی ٦/٤ بەرێژەی ٥٠ ٪ بەڵگەیە بو گرنگی ئەم کێشە لە گۆرانی کاری دەشتی هەولێر.

٦- شێوەی ریتمی ئاوازەکان جوراوجورن، بەپێی جوری کارەکان دەگورێن.

**پێشنیازەکان**

- ئەنجامدانی توێژینەوەی هاوشێوە لەسەر جۆرەکانی دیکەی گۆرانیی دەشتی هەولێر.
- توێژینەوەی فراوانتر لەسەر مۆزیکی گشت ناوچەکانی کوردستان بکرێ.
- دارشتنەوە و تۆمارکردنی نوێ بۆ ئاواز و گۆرانییەکانی نێو ئەم توێژینەوەیە ساز بکرێ.

**ناسنامەی ئەو کەسانەی گۆرانییە کەلەپوورییە کوردییەکانیان لێ وەرگیراون.**

ناوی تەواو: بۆسکان ئەحمەد حەمە رۆستەم (دایکی مام خدر)
نازناو: حاجی بۆسکان
رەگەز: ئافرەت
ساڵی لەدایکبوون: ١٩١٢
گوند: برایمەلەک
لە کوێ فێربووە: بنەماڵەی ئێمە زۆربەیان دەنگیان خۆش بووە، منیش یەکێک بووم لەوانە، گیشەکەر بووم و دروێنەشم کردووە.
چ ئامێرێکی موزیکی دەژەنێ: نەخێر
پلەی خوێندەواری: خوێندەواری نییە.
رۆژی تۆمارکردن: ٢٠-١٩٩٨/١١/٢١
شوێنی تۆمارکردن: ماڵی مام خدر لە گوندی برایمەلەک.

* * *

ناوی تەواو: یاسین تەها ئیسماعیل
نازناو: مام یاسین
تەمەن: ساڵی ١٩٣٩ لە گوندی پیرداود لە دایک بووە.
گوند: پیرداود
لە کوێ فێربووە: لە زاری خەڵکەوە لە کاتی کارکردندا فێر بووە.
چ ئامێرێکی موزیکی دەژەنێ: نەخێر
پلەی خوێندەواری: خوێندەواری نییە.
رۆژی تۆمارکردن: ١٩٩٨/١١/٢٧ هەینی
شوێنی تۆمارکردن: ماڵی حاجی محەمەد لە گوندی پیرداود.

* * *

ناوی تەواو: خدر قادر رەسول
نازناو: مام خدر
تەمەن: ساڵی١٩٤٤ لە گوندی برایمەلەک لە دایک بووە.
گوند: برایمەلەک
لە کوێ فێربووە: لە کاتی کارکردندا لە دایکی فێری بووە.
چ ئامێرێکی موزیکی دەژەنێ: نەخێر
پلەی خوێندەواری: نەمخوێندووە، بەڵام خوێندەواریم هەیە.
رۆژی تۆمارکردن: شەوی شەممە لەسەر یەکشەممە ٢٠-١٩٩٨/١١/٢١
شوێنی تۆمارکردن: ماڵی مام خدر لە گوندی برایمەلەک.

* *.*

ناوی تەواو: محەمەد عەلی
نازناو: محەمەد حەیران
تەمەن: ساڵی١٩٤٤ لە گوندی بن بێرز لە دایک بووە.
لە کوێ فێربووە: لە کاتی دروێنەدا لە باوکم، گوندی بن بێرز
چ ئامێرێکی موزیکی دەژەنێ: نەخێر
پلەی خوێندەواری: تاکو پۆلی چوارەمی سەرەتاییم خوێندووە.
رۆژی تۆمارکردن: شەوی دووشەممە لەسەر سێشەممە ٧-١٩٩٨/١٢/٨
شوێنی تۆمارکردن: ماڵی ئیسماعیل شەریف لە گەڕەکی کوران لە هەولێر.

* * *

ناوی تەواو: تەها حەمەد ئەمین تەها
نازناو: مام حاجی
تەمەن: ساڵی ١٩٤٧ لە گوندی نۆغەران لە دایک بووە.
گوند: نۆغەران.
لە کوێ فێربووە: لە کاتی دروێنەدا لە زاری خەڵکەوە.

چ ئامێرێکی موزیکی دەژەنێ: نەخێر
پلەی خوێندەواری: لە مزگەوت قورئانی پیرۆزم خوێندووە، بۆیە خوێندن و نووسین دەزانم.
رۆژی تۆمارکردن: ١٣-١٤/١٢/١٩٩٩
شوێنی تۆمارکردن: مالی مام حاجی لە کۆمەلگای (جەدیدە).

***

ناوی تەواو: عەلی حەمە خدر
نازناو: حاجی عەلی
تەمەن: ١٩٤٣ لەگوندی قورشاغلو لە دایک بووە.
گوند: قورشاغلو
لە کوێ فێربووە: لە باو و باپیرمەوە لە کاتی کاردا فێربویمە.
چ ئامێرێکی موزیکی دەژەنێ: نەخێر
پلەی خوێندەواری: خوێندەواری نییە.
رۆژی تۆمارکردن: ٢٩/١١/١٩٩٨
شوێنی تۆمارکردن: مالی حاجی عەلی لە گەڕەکی نەورۆز لە هەولێر.

پەراوێزەکان:

* بە سەرپەرشتی: ع. ج. سەگرمە، پێداچوونەوەی: پ. د.شوکریە رەسول
١- بڕوانە لاپەڕی (١٨) لە: الجاوشلي، هادي رشيد، تراث اربيل التاريخي، مطبوعات العامة لادارة الثقافة والشباب، ١٩٨٥
٢- بڕوانە لاپەڕەی ١٠٧ لە: حداد، عبدالله محمد احمد، مدخل لدراسة تطور مدينة اربيل للفترة (١٧٧٠ - ١٨٢٠)، مجلة كاروان الاكاديمي، اربيل، ١٩٩٧
٣- بڕوانە لاپەڕە ٨ لە: اربيل في اربعه اعوام (١٩٦٧ - ١٩٦٦ - ٢٩٦٥ - ١٩٦٤)
٤- بڕوانە لاپەڕەی ١٩ لە: اربيل في اعوام (١٩٦٧ - ١٩٦٦ - ١٩٦٥ - ١٩٦٤).
٥- بڕوانە لاپەڕەی (٢٣٧) لە: الحسني، سيد عبدلرزاق، العراق قديما و حديثا، مطبعة دار الكتب. بيروت، لبنان، ١٩٧٣.
٦- بڕوانە لاپەڕەی (٦٠- ٥٨) لە: الجاوشلي، هادي رشيد، تراث اربيل التاريخي، مطبوعات الامانة العامة لادارة الثقافة والشباب، ١٩٨٥).
٧- بڕوانە لاپەڕەی (١٤) لە کتێبی دەرگەلەیی، یوسف ئەحمەد، مێژووی شاری هەولێر لە کۆنەوە تا سالانی شەست، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی ٢٠٠٢.
٨- هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە ١٤٩.
٩- بڕوانە لاپەڕەی ٥٦ لە: عەبدولا عامر عومەر، جوگرافیای هەرێمی کوردستانی عێراق، سەنتەریی برایەتی، چاپی دووەم، هەولێر ١٩٩٩.
١٠- عەبدوللا غەفوور، جوگرافیای کوردستان، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی موکریان، چاپی دووەم، هەولێر، ٢٠٠٠.
١١- بڕوانە لاپەرە ٥٩ لە کتێبی: رەسول، عزەدین مستەفا ـرەسول، ئەدەبی فولکلوری کوردی،بەغدا، ١٩٧٠.
١٢- بڕوانە لاپەرە ٥٩، هەمان سەرچاوەی پێشوو.
١٣- بڕوانە لاپەرە ٢٠٠ لە گوڤاری رامان ژمارە ٧٣: کاکە سوور، نادیە عومەر، کولتوورو کومەلگە، هەولێر، تەمموزی ٢٠٠٢
١٤- بڕوانە لاپەرە ١٩٩، هەمان سەرچاوەی پێشوو.
١٥- بڕوانە لاپەڕە ٦١، د.عزەدین مستەفا رەسول، هەمان سەرچاوەی پێشوو.

سەرچاوە کوردییەکان:

١- سەگرمە، ع، ج، لاپەڕەیەک لە بنەماکانی موزیکی کوردیی، بەرگی یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠٢.
٢- دەرگەلەیی، یوسف ئەحمەد، مێژووی شاری هەولێر لە کۆنەوە تا سالانی شەست، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، ژمارە (١٦٠)، چاپی یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠٢.
٣- دەشتەکی، عومەر شێخەللا، داستان و گۆرانی لە فۆلکلۆری کوردیدا، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر، ١٩٩٨.
٤- شەریف، محەمەد کەریم، فۆلکلۆری هۆنراوەکانی کوردەواریی، لە چاپدانەوەو زیادکردنی سەعدوللا

ئیسماعیل شێخانی، چاپخانەی ئەلحەوادس، بەغدا ١٩٨٦.

٥- رەسوڵ، د.عیزەدین مستەفا، ئەدەبی فۆلکلۆری کوردیی، چاپخانەی دار ئەلجاحز، بەغدا ١٩٧٠.

٦- شێخانی، سەعدوڵلا ئیسماعیل، فۆلکلۆری کوردیی، چاپخانەی عەلا، بەغدا، ١٩٨٥.

٧- دەشتەکی، عومەر شێخەڵلا، داستان و گۆرانی لە فۆلکلۆری کوردیدا، چاپ و بەرگی یەکەم، چاپخانەی سەلاحەدین، هەولێر، ١٩٧٨.

٨- غەفوور، د.عەبدوڵلا، جوگرافیای کوردستان، ژمارە (١)، چاپی دووەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٢.

٩- شێخانی، سەعدوڵلا ئیسماعیل، گوڵبژێرێک لە فۆلکلۆری کوردیدا، چاپخانەی ئیرشاد، بەغدا، ١٩٨٥.

١٠- کۆمەڵێک مامۆستای زانکۆ، جیۆگرافیای هەرێمی کوردستان عێراق، وەرگێرانی سەنتەری برایەتی، پیاچوونەوەی، ئاسۆ کەریم، ژمارە (٣)، چاپی دووەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردەی هەرێمی کوردستانی عێراق، هەولێر، ١٩٩٩.

١١- عەبدوڵلا، سلێمان، بنەما جوگرافییە کاریگەرەکان بەسەر خەسڵەتی باران لە هەرێمدا، سەنتەری برایەتی ژمارە، (١٦)، هەولێر، ٢٠٠٠.

١٢- سنجاوی، جەلال، بەجوگرافیابوونی فۆلکلۆر، گۆڤاری کاروان، ژمارە (١٢٦)، هەولێر ١٩٩٨.

١٣- زامدار، مەحمود، دەروازەیەک بۆ ئاوازو گۆرانی کوردیی، دەزگای رۆشنبیریی بلاوکردنەوەی کوردیی، چاپخانەی ئەلحورییە، بەغدا ١٩٨٠.

١٤- دزەیی، ئاوازی ئەحمەد حەمە ئەمین، فۆلکلۆری کوردیی لە ناوچەی دزەییاندا، ئەمینداریتی گشتیی رۆشنبیریی و لاوان، چاپخانەی ئەلئەدیب، بەغدا، ١٩٨٤.

١٥- بلینکیس کیتی، مارکیز گۆرانی بێژیشە، وەرگێرانی، دڵشاد خۆشناو، گۆڤاری مهاباد، ژمارە (١٢)، کوردستانی ئێران، ١٣٨٠.

سەرچاوە عەرەبییەکان:

١- الحسني، السيد عبدالرزاق، العراق قديما و حديثا، بنفقة الوجيه المحسن الحاج - عبدوالهادي أل الجلبي، في طبعته الخامسة (بالارنست)، مطبعة دار الكتب، بيروت-لبنان، ١٩٧٣.

٢- جمعها و نظمها جماعة من شباب أربيل، أربيل في أربعة أعوام- ١٩٦٤-١٩٦٥-١٩٦٦--١٩٦٧- ناوی چاپخانەو ساڵی دەرچوون وشوێنی پەخشی تێدا نەبوو.

٣- الجاوشلي، هادي رشيد، تراث اربيل التأريخي، مطبوعات الامانة العامة لادارة الثقافة والشباب، طبع بمطابع جامعة الموصل، ١٩٨٥.

٤- الجوهري، الدكتور محمد، علم الفولكلور دراسة في الا نثروبولوجيا، الجزء الاول، من المدخل الي الفولكلور المصري، الطبعة الاولى، مطابع دار المصارف بمصر ١٩٧٥.

٥- اربيل - هەولير - بين الماضي والحاضر، مديرية دار الكتب للطباعة والنشر جامعة الموصل.

٦- هي، دبليو، ار، حاكم أربيل السياسي ايام الاحتلال البريطاني الدابر، سنتان في كردستان ١٩١٨- ١٩٢٠، ترجمة - فؤاد جميل، الجزء الاول - مطابع الجاحظ، الطبعة الاولى بغداد ١٩٧٣.

٧- حداد، د.عبدالله محمد أحمد، مدخل لدراسة تطور مدينة اربيل للفترة (١٧٧٠- ١٨٢٠) مستل من المجلد الاول - العدد ألاول - كانون الثاني-١٩٩٧، من مجلة كاروان الاكاديمي، اربيل ١٩٩٧.

٨- رشيد، د.صبحي انور، الموسيقي في العراق القديم، طباعة والنشر دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد ١٩٨٨.

٩- هي، دبليو. ار (حاكم اربيل السياسي ايام الاحتلال البريطاني الدابر)، سنتان في كردستان ١٩١٨- ١٩٢٠، ترجمة فؤاد جميل، الجزء الثاني، مطابع (دار الجاحظ)، بغداد ١٩٧٣.

١٠- فايد، رجائي، اربيل ٨٨ هەولێر ٩٩ حتي لا تضيع كردستان، مؤسسة موكرياني للطباعة والنشر، مطبعة وزارة التربية، الطبعة الاولى، اربيل ٢٠٠٠.

# لاوك

دكتور مەولود ئیبراهیم حەسەن

لاوک، ئەم بابەتەش لەنێو فۆلکلۆری کوردیدا بابەتێکی گرنگ و تایبەتە! لاوک، کە - مێرانی-شی پێدەگوترێ، هونەرێکە لە شیلەی (داستان) و (ئەفسانە) بەهرەمەندە و ئەمەشیان بریتییە لە (ئاواز) و (شیعر). لاوک بەهۆی درێژییەکەی، هونەری گوتنی چ لەباری گێڕانەوەیدا، چ بە ئاوازی گوتن، رەنگاورەنگە، لاوکبێژ بە پەخشان و بەشیعر، بە ئاواز و دەنگ و بەشێوەی حەکایەتبێژی، ئەگەر پێویست بکات، هونەر دەنوێنێ، وا دەردەکەوێ کە (لاوک) چیرۆکی خۆشەویستی کچ و کوری دلداری پێکنەگەیشتوو و سەر بە کێشە و گۆبەندە، کە زۆرجار کارەسات و پالەوانیەتی و زولم و زۆری تێدەکەوێ و زۆرتر چیرۆکەکە لە مندالییەوە دەست پێدەکات و لەگەنجی و پیری کۆتایی دێت. زۆربەی کۆتاییەکانیش تراژیدین. لاوک بەرهەمی ژیانی نێوان عەشیرەت و هۆزەکانە و هەندێجاریش لەنێوان چین و ئایین و نەتەوەی جیاجیاش روودەدات.

لاوک لە بنەرەتدا (کچ) بە کوریدا هەردەلێ و خواست و ئارەزووی خۆی و دلدارەکەی دەردەبرێ و بەشێوەزاری کرمانجی سەرووە، ئەگەر لە دەشتی هەولێریش لاوک بگوترێ، شێوە کرمانجییەکەی خۆی دەپارێزێ.

**وشەی لاوک.**

لاوک، لە (لاو) و (ک) پێکهاتووە، لاو واتە (گەنج) و (تۆلاز)، (ک) پاشگرە بۆ خۆشەویستکردنی لاوەکەیە، کە کچە بە کورەی دەلێ: کە هەندێجار (لاوۆ) و (کورۆ) و (کورکۆ)ش بەکاردەهێنن بۆ کورەکە نەک بۆ (لاوک)ەکە.

لاوک هەمیشە لەژیانی راستەقینە و رووداوی مێژوویی دەدوێ و (شوێن) و (کەسەکان) دەستنیشان دەکات و بە (بەهار و پاییز و زستان و هاوین)یش باسی زەمەن دەکات، لاوکبێژ لەکاتی گوتندا هەمیشە تەمبوور وەک ئامێرێکی مۆسیقای گرنگ و تایبەت بەلاوک دەژەنێ، هەربۆیە لاوکبێژەکانی سەرکەوتوو، زۆربەشیان تەمبورژەنی باشیشن.

*

# کاوێس ئاغا و لاوکی سارییایێ

## جبرائیل میکائیل هەرکی

کــاوێس ئاغــای هەرکی، لەدانان و چڕینی لاوک و حەیران هۆشمەندێکی لێهاتوو بووە. ئەو لاوکانەی کاوێس ئاغــا دایناون لەژمــارە نایەن، بەڵام بەداخــەوە هەمــوویان لەسەر قەوان تۆمار نەکراون. لاوکبێژی خوالێخۆشبوو حاجی پیرۆی هەرکی، هەموو لاوکەکانی کاوێس ئاغای دەزانی و لەبەری بوون. رێکەوتی ١٩٩٧/٨/١ لەهاوینە هەواری پیرمــام چاوم پێی کەوت، یادی بەخـێـر بۆی گێرامەوە، وتی ئەو لاوکانەی من دەیانزانم نیوەیان هی کاوێس ئاغای رەحمەتین. یادگارییەکانی کاوێس ئاغای دەهاتەوە یاد، لەناخی دڵەوە ئاخی بۆ هەڵدەکێشا. وتی: من هەموو لاوکەکانی کاوێس ئاغا دەزانم، هەر هەمووشیان خۆشن، بەتایبەتی لاوکی "شێخ مەحمودی نەمر" لاوکی دەوایێ و لاوکی سارییایێ"، بەڵام بەداخەوە لاوکی سارییایێ لەسەر قەوان تۆمار نەکراوە، ئەم لاوکە لەمێشکی حاجی پیرۆی هەرکی تۆمارکراوە و لەسەر کاسێت تۆماری کردووە. لە لای بەرێز "مام یەحیــا، خاوەنی تۆمارگەی سەفین"، لەهاوینە هەواری پیرمــام دەستم کەوت، لاوکی سارییایێ کاوێس ئاغا دوو کۆپلەی داناوە، بەڵام حاجی پیرۆ چەند کــۆپلــەیەکی بۆ زیاد کــردووە. لاوکی ســارییایێ باسی خۆشەویستی نێوان کچێک و کورێکی دڵسۆز دەکات. بزانین کورە چۆن وەسفی بەژن و باڵای خۆشەویستەکەی دەکات.

ئەمەش دەقی لاوکی «سارییایێ یە»:

**لێلێ سارییایێ، کولێ کول مال بابێ جیا**
**دانێ ل هێواردا...قۆپچا کراسێ مەلەسی**
**کتان ب قەتینە.. جۆتێ زەرمەمکا ل سەرێ**
**سیپانا رەنگین ل بایێ ساردا.. سارییایێ لۆیلۆ**
**دێ تو وەرە. جۆتەکی راموسانا ل سینگێ سپیێ**
**سەمەرقەندی ل ئەنیەکا کال و کەوەر سەرگیانێ**
**م را کەرەم بکە ئەزێ کەوتیمە ولاتێ غەریبیێ**
**دنیایە مەرگ و مرنە ئەز دمرم دا چ کولک و**
**کەسەر نەمینن ل دلێ ژاردا. سارییایێ لۆیلۆ**
**دەلالێ لۆیلۆ. سارییایێ لۆیلۆ. ئای چبکەم سارییایێ**
**چەتۆنیە غەریبایێ دەردێ ئەم کەتینێ یویویوخ**
**لێلێ سارییایێ ئای باکێ گریداغا شەوتی ل منرا گرەگرە..**
**خزێما سارییایا مەمەدەغا چل و چار مسقاڵە**
**ب سەر لێوێ تەنک را. دزورە..سارییایێ لۆیلۆ...**
**هەرچیێ نەساخێ حەوت سالابێ تاویێ سێ**
**مهابێ. ئەما جوتەکی راموسانا ب قەتینە سارییایا**
**مەمەدەغا عەجێبە ل جیێ بلند بال ناهێتنە ئەو**
**نافرە. سارییایێ لۆیلۆ دەلالێ لۆیلۆ سارییایێ لۆیلۆ**
**ئایێ چبکەم سارییایێ چەتۆنیە غەریبایێ**
**دەردێ ئەم کەتینێ یویویو یوخ**

سەرچاوە:

١- حاجی پیرۆی هەرکی دیمانە ١٩٩٧/٨/١.

٢- کاسێتی تۆمارکراوی لاوکبێژ حاجی پیرۆ.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر، ژمارە ٦، ٢٠٠٤ بلاوبۆتەوە.

# محەمەد عارەب
# ١٩٣٦- ٢٠٠٦

## حاجی فاتیح دارەبەنی

ناوچەی بەرانەتی لاوکبێژی زۆر بلیمەت و لێوەشاوەی لێ هەڵکەوتووە، بەڵام بەداخەوە زۆربەیان دەنگیان تۆمار نەکراوە، با زۆر نەچمە قووڵی ئەو دەریایە، جەوهەری باسەکەم لەسەر لاوکبێژ (محەمەد عارەب)ە، ئەم لاوکبێژە کاتی خۆی لە گوندی (هەویرە)ی سەر بە شارۆچکەی گوێڕ جێوار بووە، پاشان لەبەر هەر هۆیەک بووبێ باردەکا و روو لە گوندی شێخەشەل دەکات، کە ئێستا سەر بە شارۆچکەی بەحرکەیە و لەوێ دەبێتە رەنجبەر... سەپانی و جووتیاری دەکات، محەمەد عارەب لە رەنجبەریدا زۆر ماندوو دەبێ، دیارە یەک گوێدرێژی هەبووە، پاشان لە ئەنجامی زاوزێ کردنی کەرەکەی بووەتە خاوەنی جووتە کەر، دەچێتە لای عوسماناغای بەحرکە، دەڵێ ئاغە چیدی رە نجبەری ناکەم خاوەنی جووتە کەرێکی باشم، جێگای چوار عەلبە گەنمم بدەیێ دەبمە فەلاحی گوندی، ئەویش داوایەکەی پێکدەینی و زیاتریش خاتر و رێزی دەگرێ، چونکە لاوکبێژێکی سەرکەوتوو بووە، هەردەم لاوکبێژ لەلای ئاغا و خاوەن دیوەخانەکان رێزیان لێ گیراوە، ئینجا محەمەد عارەب دەبێتە فەلاح، دەست بە جوت و کێڵان دەکا، لەناو فەلاحان زستانان ئەگەر رۆژەکی جۆت نەگەڕێ دەچنە ئاشی، چونکە رۆژانی تر کەرەکان بێ ئیش نین، رۆژەکی سەخت و سەرما دەبێ ئایا جۆت دەگەڕێ یان ناگەڕێ، ژنەکەی محەمەد عارەبی دەڵێ: " چەند رۆژە لە مارە جیرانان ئاردی قەرد دەکەم، دەبێ بچییە ئاشی...". ناچاری دەکا بچێ، لە رێگا کە بۆ گوندی گەزنەی دەچی، کە ئاش لەوێندەر هەبووە، کەرەکەی لەبن باری دەکەوێ هەتا ملی لەبن باراشەکەی دەردەینی قەدەر وەها بووە کەرەکەی دەتۆپی!!

محەمەد عارەب ئەو لاوکێکی بە کەرەکەیدا هەڵگوتووە، ئەو لاوکە بە لاوکی "کەرێ دێزە" ناوی دەرکردووە، مام سابیر خدر بەحرکەیی کە لەدایکبووی (١٩٣٦)ە و لە ساڵی ١٩٥٥ بووەتە سەرباز، ئەوکات کاسێتی تۆمارکراوی هەبووە، یەکەمین جار کە لەگەڵ مام سابیر یەکترمان ناسی لە ساڵی ١٩٧١ بوو، زۆر حەزم دەکرد بەدڵی خۆم لاوک و بەستەکانی مام سابیر بە دەستی خۆم تۆماربکەم، ریکۆردەرێکم برد ئەو کات هاوین بوو، مام سابیر بە گالیسکە قرشەی دەکێشاوە، پێختەکی خاڵ خاڵی سپی هەبوو، هەر بەستەی بە ولاغەکەی هەر دەگوت، سەرەنجام گوتی: دەبێ بمبووری هەند ماندیە ناتوانم تەنها نیو کاسێتت بۆ تۆمار بکەم، دەبێ پاش جەنجەڕ و شەنەبا بێیەوە، قەدەر وەها بوو هەتا ئێستا رێکنەکەوت، لە رۆژی ٢٠٠٦/٨/٣ مام سابیر بۆ ئەنجامدانی پرسەیەک رێگای کەوتە پێش دوکانەکەی من و لایدا چاکو چۆنیمان کرد، گوتی: دەزانی هەتا ئێستا هەر خۆم بە شەرمەزار دەزانم کاتی خۆی لەبیرتە، کە نەمتوانی داوایەکەت بەجێبێنم، هەر دەتبینم ئەودەم دێتەوە یاد، ئەمنیش گوتم: " مام سابیر لەجیاتی هەنگی بەندی "کەرێ دێزەم" لۆ برێ هی محەمەد عارەبی، چیدیم ناوێ." مام سابیر گوتی: بەسەرچاو قەلەم و کاغەزەکەت حازرکە بنووسە، دەستمان پێکرد بە نیو کاتژمێر تەواومان کرد، هیواداریین بە دڵتان بێت.

**بەندێ دێزە**

دانانی لاوكبێژ/ خوالێی خۆشبێ محەممەد عارەب،
گۆتنەوە و لاسایی كردنەوەی/ مام سابیر بەحركەیی

**سبیانەكی سەحەرییە**
**محەممەدێ رەحمەتییە**
**گازی كابانێ كردییە**
**نانی بكە، برۆم لۆ جۆتییە**
**كابان چووە زگ كەندوێ ئاردییە**
**قەت چەنگەكی تێدانییە**
**گۆتی: محەممەد خێرەت نییە**
**دوو رۆژە دەچمە مارە جیرانان لۆ ئاردییە**
**چكاوێك كابانێ وەگۆتییە**
**محەممەد قەهری گرت خەمی خواردییە**
**كەرێ دێزە جل كردییە**
**رێگای قەزنەشی گرتییە**
**هەتا گەیی بن گوندییە**
**دێزە ساتمەكی كردییە**
**سەری بەبن قەلبی كەتییە**
**هەتا باریان لابردییە**
**كەرێ دێزەم لێ تۆپییە**

*** * ***

**هەوار، هەوار، مەقەدەرە**
**گۆتم: ناچمە ئەو سەفەرە**
**لۆم گازكەنە برادەرە**
**دێزەم تۆپی مام بێ كەرە**

*** * ***

**چوومە شێخەشلێ وێران گچكە دێیە**
**دوو رۆژە محەممەد دەرناچی لە مارێیە**
**هەر لەبەر حادزی كەرێیە**
**رۆژەكی نوێژی عەسرێیە**
**گرتم رێگەی بەحركێیە**
**هەتا گەیە دیوانێیە**
**عوسماناغا بەرێ و جێیە**
**دەستی محەممەدی گرت، رایكێشا سەر چارێیە**
**دوو قەزناغ جۆی دایێ**
**ئەویش باروبۆی كەرێیە**

*** * ***

**سەد ئافەرین شێخ محەممەدی پیرباریيە**
**خوشكە عەنبەر خێزانییە**
**چووە زگ كەندووی ئاردییە**
**دوو سێ ربەی تێكردییە**
**باروبووەكی چاكی كردییە**

*** * ***

**یەكێدی هەبوو لە گوندییە**
**لە دەورەمەندی تاكی نییە**
**سوندی خواردییە بە رەبییە**
**ژنم لۆ كورێ خۆ خواستییە**
**نانی نیلەللامان لە مارێدا نییە**
**چ باروبووشی نەكردییە**

*** * ***

**هەوار، هەوار، مەقەدەرە**
**گۆتم ناچمە ئەو سەفەرە**
**لۆم گازكەنە برادەرە**
**دێزەم تۆپی مام بێ كەرە**

كەندوو: لە قوڕ دروست دەكرا لە شێوەی بەفرگرەی ئێستا وابوو دەرخوونەی لەسەرەوە هەبوو، لە خوارەوەش كونێكی تایبەت بۆ بەتاڵكردنی ئارد هەبوو.

دێزە: هەر گوێدرێژەك رەنگی خۆڵەمێشی بێت پێی دەڵێن دێزە.

یێختە: ئەسپ، ئەگەر لە جۆرێكی نارەسەن بوو، دەیخەسێنن، بۆ ئیش بەكاری دێنن، ئەگەر رەسەن بوو تەنها بۆ سواربوونە.

چەنگ: ئەگەر یەك دەست پڕ بكرێ چەنگە، ئەگەر هەردووك بێ گۆلە.

باروبوو: یارمەتیدان-دەستگرۆیی.

باراش: باری ئاشی، ئەو گەنمەی ئامادەكراوە بۆ هاڕین.

قەزناغ: چوار ربەیە، هەر ربەك نۆ كیلۆیە.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری ئاسۆی فۆلكلۆر، ژمارە (٢٣)ی ساڵی ٢٠٠٦ بڵاوبۆتەوە.

# لاوکی چەتۆ*

## (گوتنی لاوکبێژ نادر مستەفا هیرانی)

سبەیە سبە زووە، سبەیە سبە زووە
چەتۆیێ ئاغایێ گران لە خەوێ شیرین رابووە
بسێ بانگا گازی شیرنێ دەلالێ خۆ کردییە
کـچکێ دینێ دەلالێ شـیـرنێ مـال خراپێ، ئەمان چما ئەتوو نزانی ئەمن
ئەوشۆکە خەونەکی گەلە گەلە گەورەو قەبیعاتم دیتییە
ئەمان لخەونێ مندا وەبییە
تۆزەکێ قالبێ من تێک چووە
نارە ناردک و نرکە نرکەک لە سینگێ من دەرپەرییە
کەتیتەوە ناو چەمییە
چەند کێروشکێ لە لانانە
چەند شێرێ لە بیشانە
چەند کەوێ سەر هێلکانە
چەند ریویێ لەجۆمانە
چەند حەیوانێ لە دەحلان و لەبەرپیان و لە بەحرانە
فـەرخێ خـۆو هێلکێ خـۆو کلکێ خـۆیان وە دەوێ خـۆ گرتینە
کـچکێ دەلالێ مـال خـراپ و لعـارێ بێـدەرێ دەشـتێ مەلیک سینۆیێ کەتینە
ئەمـان تەیرو تاری بە گـۆشـتی وان دەعـبـایان و بەرازان هەموو خەنی بووینە
لـێ لاوۆ لـێ لاوۆ لـێ لاوۆ لـێ لاوۆ لـێ لاوۆ چـەتـۆ

لاوۆ[1]
عەگیدێ سەرێ مەیدانێ بابێ مستێ لۆ رم زراوۆ
* * *
هەنگینێکە شیرنێ دگۆ ئاغایێ گران یێ ئەفەندییە
رۆژێ سێ جاران سـەرێ وێ شیـرنێ دەلالێ خۆ بیتەوە بە قوربانی سەرییە
ئەمـان تەعـبـیـرێ خەونێ توو لەکن فەرحۆیێ پیرە بابێ توو نەبی لە کن چ کەسێکە نییە
ئەوجە چەتـۆ دگۆ شـیـرنێ دەلالێ مـال خـراپێ، لە بۆ من چێ بکە قاوەکا سەحەرییە
هەتا ئەمن بچـمـەوە دیوەخـانێ بابێ خـۆ سـەری حـەفت مانگانە دیوەخانێ بابێ خۆم بچاوێ خۆ نەدیتییە
ئەمـان داخـوە بزانم تـەعـبـیـرێ خـەونێ من مـال خـراپۆ لەوێندەرێکە چیەو یان چ نییە
* * *
ئەوجە هەنگینێکە چما ئەنگۆ نزانن لۆ چەتۆ تێکردییە قاوەکا سەحەرییە
چەتۆ بەسەر هەناوێ خورینی دا کردییە
چەکمە سۆری عامودی بسەر پێ یێ خۆ وەکردییە
ئەوجە چەتۆ بسێ بانگا گاز دکـا کچکێ شیـرنێ دینێ مال خراپێ دەلالێ ئەتوو ئەورۆکە مل بکەزییە
خۆ بکۆلیتی تێرکێ حەلەبێ رابگەینە

ئەتوو تێلی عەیشانێ لە بۆ بەژنێ چەتۆیێ ئاغایێ گران دەربینە
زینێ زەردی شابازی بسە پشتێ دا بینە
ئەتوو تەنگ و بارەخانێ وا لێ بشەتینە
رکێبێ حەیدەری بەولاو بەولا پێدا بەرداینە
کچکێ دەلالێ مال خراپێ دەستەکێ دۆشەکا بینە
لسە خانێ زینی بپێچینە
ئەتوو دەسکەکێ گولان و رێحانان بقرتینە بینە
لەبەر قەرپۆزێ زینی را بچەقینە
کچکێ دەلالێ مال خراپ تێلی عەیشانێ وەکی رۆژێ دەعوایێ لێقەومانێ بووکان و عەرەفاتان بخەملینە
* * *
ئەوجە ئەورۆکە شیرنێ رابووە لسەر فەرمانێ چەتۆیێ ئاغایێ گران تێلی عەیشانی هینا دەرێ بتەمامییە
هەنگینێکە شیرنێ ئەمان تێلی عەیشانی راکێشا دەرێ لە تەویلەخانێ بتەمامییە
زینێ زەردی شابازی لسەر پشتێ قەیم کردییە
رمێ قوتێ گورگانی لسەر پشتێدا چەقاندییە
رکێبێ حەیدەری بەولاو بەولادا پێدا بەردایاندییە
دەسکەکێ گولان و رێحانانی قرتاندییە
لەبەر قەرپۆزێ زینی را کردییە
ئەمان دەستەکێ دۆشەکانی هینایە لسەر خانێ زینی پێچاندییە
ئەوجا ئەورۆکە شیرنێ تێلی عەیشانی لۆ بەژنێ ئاغایێ گران وەکی رۆژێ لێ قەومانێ بووک هینانێ خەملاندییە
ئەوجە شیرنێ لەگلەگێ گرت و دەیگۆ فەرموو سواربە ئاغایێ گرانی ئەفەندییە
یاخوە رۆژێ سێ جاران سەرێ شیرنێ دەلالێ خۆت ببیتەوە بە قوربانی سەرییە
* * *
ئەوجە ئەورۆکە برا لمترا سبەیە گەلەکا زووە
چەتۆیێ ئاغایێ گران لەتێلی عەیشانێ را سوار بووە
ئەوجە ئەورۆکە چەتۆ هاتەوە دیوەخانێ بابێ خۆ سەلامەکی لەدیوەخانێ بابێ خۆو گەلی مەجریسێ کردییە
ئەوجە وانی لە مەجریسێ بابێ وی دا بوون دەیانە گۆ: عەلیکومە سەلام چەتۆ بەخێر بێی سەد جاران بتەمامییە
ئەوجە پاشی مەجریسێ فەرحۆیێ پیرە بابێ وی سەرێ خۆ بلند کردییە
دەیگۆ وە عەلیکومەسەلام کورێ من چەتۆ یاخوە سەد جاران بەخێر بێ ی لسەر چاوێ پیرە بابییە
ئەمان کورێ من چەتۆ سەرێ حەفت مانگانە دیوەخانێ بابێ خۆت بچاوێ خۆ نەدیتییە
کورێ من ئەورۆکە ئەمان کێ ترش و تارانێ توو بزەبرێ دارێ قوتە رمان بردییە
ئەمان کورێ من نزانم کێ سەرێ توو شکاندییە
کێ غەدوور لە توو کردییە
ئەورۆکە هێدی هانات لۆ پیرە بابێ هانییە
ئەوجە ئەورۆکە چەتۆ دگۆ: بابۆ چما ئەتوو نزانی سەرێ تو خۆشبی دەگە سەرێ مەجریسێ بتەمامییە
کەس حەد و وجود نیە غەدوور بکاتن لە چەتۆیێ ئاغایێ کورێ توو بعەینییە
ئەمان بابۆ کەسیش پێ ناکرێ بێتن ترش و تارانێ چەتۆیێ ئاغایێ گران بباتن لۆ بتەمامییە
ئەمانە بابۆ چما ئەتو نزانی راستە سەری حەفت مانگانە دیوەخانێ تووم بچاوێ خۆ نەدیتیە
ئەمن ئەو شۆکە خەونەکێ گەلە گەورەو قەبیحاتم دیتییە
ئەمانە بابۆ تەعبیرێ خەونێم لەگە تووە، ئیشێ خەونێ نەبی لۆ قەت ئیشیتکەم نییە
* * *
ئەوجە ئەورۆکە چما ئەنگۆ نزانن فەرحۆ دگۆ: کورێ من چەتۆ خەونێ خۆ لۆ بابێ خۆ بگێرەوە بتەمامییە
کاخۆ بزانم خەونێ توو کوودو یان کوو نییە
ئەوجە چەتۆ دگۆ: بابۆ چما ئەتوو نزانی دوونێ شەوێ کە وەختی من خەوم لێ کەتییە
تۆزەکێ قالبێ من تێک چووە، ئەمان قرچە قرچەک و نارە نارەک و نرکە نرکەک لە سینگێ من دەردەپەرییە
کەتیتەوە ناو دەشتییەو ناو چۆمییە
چەند کێروشکێ لە لانە
چەند کەوێ سەر هێلکانە
چەند شێرێ لە بیشانە
چەند پلنگێ لو جۆمانە
چەند ریوێ لە شیوانە
چەند حەیوانێ لە دەحلان و لە بەریان و لە بەحران و لە چۆل و چیایانە

ئەمانە فەرخێ خۆو هێلکی خۆیان وە دەوێ خۆ گرتینە
ئای مال خراپۆ وە عاردێ بێدەرێ دەشتێ مەلیک سینۆیێ کەتینە
ودلا بابۆ تەیرو تار بە گۆشتێ وان دەعبایان و بەرازان هەمووی خەنی بووینە
ئەمان بابۆ خەونێ من هەر ئەوەندەیەو ئاغاوۆ قەت چێتکە نینە
* * *
ئەوجە هەنگینێکە فەرحۆ فکرێ خۆ لە خەونێ چەتۆیێ کورێ خۆ راگرتییە
زانی هەجەلێ کورێ وی چەتۆ لە دەشتێ مەلیک سینۆیێ عەردێ بێدەرێ هاتییە
ئەوجە فەرحۆ گۆتی وە چاکە تەعبیرێ خەونێ کورێخۆ بەس بکەم لۆ
تیرێ بنێ بەرێێ نەنێرمە دەشتێ مەلیک سینۆیێ بەلکەم خوایێ گەورە ئەوێ بەلایێ دەفع کاتن ئەوجارە لسەر بەژنێ ئاغایێ گران براستییە
ئەوجە فەرحۆ دگۆ: کورێ من چەتۆ بە سەهو چووی بە غەلەت چووی کورێ من لە وێ خەونێدا توو بە غەلەتی دیتییە
کورێ من خەونێ توو لە دەشتێ مەلیک سینۆیێ لە عاردی بێدەرێ نییە
کورێ من خەونێ توو لە تیرێ بنێ بەرێێ ولاتێ ژێری ولاتێ کۆچەکێ ئێزیدییە
لە کن شێخ گەویێ و شێخ بەدۆیێ و شێخ گورگۆیێ و شێخ میرزۆیێ ئێزیدی ییە
کورێ من هەشتێ و یێک رەشبۆزی بەیازی دامەنتاری ان دابەستییە
ئەمان دەمەوێتن بچی لۆ بابێ خۆ بینی کورێ من یاخوە لۆ بابێ خۆ بێیەوە مالی بسەلامەتییە
* * *
ئەوجە هەنگینێکە برا چما ئەنگۆ نزانن چەتۆیێ ئاغایێ گران دگۆ: بابۆ
من شارەزایی مەملەکەتێ ئێزیدی یان نیمە لۆ بتەمامییە
لۆ تیرێ بنێرەبەرێێ وولاتێ ژێرییە
ئەمان بابۆ توو بینە لەگە من بنێرە خولامەکێ یا پیاوەکێ لۆ شارەزاییە
ئەوجە فەرحۆ یێ دگۆ: کورێ من چەتۆ یاخوە عەمرت نەمینێ دیارە توو لەمن نی کورێ من داخوە داکێ توو فالی لە چ گاوان و شوانان خواردییە
کورێ من ئەتووی وەسەر دنیایێ بێخستییە
ئەوجە هەنگینێکە چەتۆ لە بابێ خۆ تورە ببوو دوعا بوونی لە بابێ خۆ نەخواستییە
روێ خۆی لەتیرێ بنێ بەرێێ وولاتێ ژێری ناو چار کۆچەکێ ئێزیدی یان کردییە
ئەوجەفەرحۆ بسێ بانگا گاز دکاتن کورێ من چەتۆ توو برۆ کن شێخ حوسێنی بەدەوییە
سەلامەکێ بکە لەوییە
بائەو بەتوو بلێتن تەعریفێ شەران و حەربان کووەو یان کوو نییە
ئەوجە چەتۆیێ ئاغایێ گران هەنگینێکە رۆیشتییە
.روێ خۆی لە کۆنێ شێخ حوسێنێ بەدەوی کردییە
شێخ حوسێنێ بەدەوی لەسەر کۆشکو قەلاتێ دارێ دووربینێ لە بەرێ چاوێ خۆ راگرتییە
زەینێ خۆی دریێ ئەوزە سوارەک دێتن لۆ بتەمامییە
شێخ حوسێنێ بەدەوی زەینێ خۆی لێ دایێ باش فکرێ لەو سواری کردییە
زەینێ خۆی دایێ ولاغی لە بنەوی عەیشانێ فەرحۆیێ نەوێ عەلی عوزێراغەیە
بەلان سوارێ سە پشتی وی نەناسییە
ئەوجە شێخ حوسێنی بەدەوی دەیگۆتە وان خولامان و خزمەتکاران ئەوە
سوارەک دێ لۆ مالی مە ئەگەر سەلامی کرد سەلامی لێ وەرنەگرنەوە بتەمامییە
ئەو دەبی خولامەکی گەلەک حیزو دز بیتن
یان دەبی پیاوەکی گەلەک رەشید بیتن
فەرحۆی لۆخۆ کوشتبیتن
تێلی عەیشانی لێستاندبیتن
ئەوجە کە چەتۆ گەیشتە دیوەخانێ شێخ حوسێنی بەدەوییە
سەلامەکی لە شێخ حوسێنی بەدەوی کردییە
کەس جوابێ سەلامێ چەتۆیێ ئاغایێ گران وەرنەگرتەوە بتەمامییە

ئەوجە چەتۆ دگر: شێخ حوسێنی بەدەوییە
ئەتوو لۆ سەلامێ وەرناگرییەوە لەمن براستییە
ئەوجە شێخ حوسێنی بەدەوی دەیگۆ كوڕۆ كەرسوارێ حوسێنییە
چما ئەتوو نزانی مال خراپۆ دەبی ئەتوو خولامەكی گەلەک حیز و دز بی عەیشانت لەفەرحۆی دزییە
ئەمان یان دەبی سوارەكی گەلەک رەشید و ئازابی فەرحۆت لەسەرێ مەیدانێ كوشتییە
عەیشانت بە زەبری دارێ قوتە رمان لێستاندییە
* * *
ئەوجە هەنگینێكە چەتۆ دگۆ شێخ حوسێنی بەدەوییە
ئەمن خولامەكی حیز و دز نیمە عەیشانم بەدزی لەفەرحۆی نەستاندییە
ئەمن فەرحۆم لەسەرێ مەیدانێ كوشتییە
عەیشانم بە زەبرێ دارێ قوتە رمان لۆخۆ هینایە لێستاندییە
ئەمن هاتیمە دەگەرەتووش بكەم سەر بەسەرانەكێ بتەمامییە.
ئەمان لێرانە لەتووش بستینم (كار بزمت خرێ بن بەحری)یە
ئەوجە شێخ حوسێنی بەدەوی دەیگۆ كوڕە شۆڕە سوارێ حوسێنییە
قەسەم بەخودێ ژورێ سەرییە
لەتوو سوار بكەم پەنجا عەگیدی بتەمامییە
ئەلعانەكە خینێت دەكەنەوە تۆزو تەمێ لۆ عاردییە
ئەوجە چەتۆ دگۆ ئەمن چ منەتم بە توو نییەو بە پەنجا عەگیدێ توو نییە
هەنگینێكە شێخ حوسێنی بەدەوی پەنجا عەگیدی لەسەرێ مەیدانێ لە چەتۆ سوار كردییە
ئەمان چەتۆ دوو، سێ سەران هات و چۆ كردییە
هەنگینێكە پەنجا عەگیدی بەزەبرێ دارێ قوتە رمان هەلدەدا لەسەر ولاغییە
ئەوجە چەتۆ هوجومێ سەر دیوەخانێ شێخ حوسێنی بەدەوی كردییە
دەیگۆ كوڕو شێخ حوسێنی بەدەوییە
شەڕێ من دەگە گاوان و شوانێ گوندی نییە
ئەمان شەڕێ من دەگەرەتووەو دەگە چ كەسیدیكە نییە

* * *
شێخ حوسێنی بەدەوی هەنگینێكە دگۆ: بخۆ لێ سواربم ئەلعانەكە لە (كار بزمت خرێ بنێ بەحری)یە
ماقولۆ شۆڕە سوارێ حوسێنییە
خینێ توو دەكەمە تۆزو تەمێ عەردییە
ئەوجە هەنگینێكە شێخ حوسێنی بەدەووی سوار دەبوو لە (كار بزمت خرێ بنێ بەحری)یە
چەتۆ دوو سەران خۆ لۆ شێخ حوسێنی بەدەوی لسەرێ مەیدانێ را شل كردییە
ئەوجە چەتۆ جارێ سێیەم لە شێخ حوسێنی بەدەوی گەراوە بتەمامییە
قونكە رمەكی لە بن قوونێ شێخ حوسێنی بەدەوی هەلدا لەسەر ولاغی فڕێدا عەردییە
ئەوجە چەتۆ بەتیلی عەیشانێ هوجومێ سەرێ شێخ حوسێنی بەدەوی كردییە
ئەوجە چەتۆ خرژنی لەشیرێ خۆ وەهینا دەیگۆ شێخ حوسێنی بەدەوی خاترێ خودێ ژۆری سەری خاترێ فەرخۆیێ عەلی عوزێراغەیە
ئەوجارە كە من توو عەفو كردییە
* * *
ئەوجە شێخ حوسێنی بەدەوییە
دەیگۆ كوڕ و شۆڕە سوارێ حوسێنییە.
خاترێ خودێ خاترێ خودێ ژۆری سەرییە
بەلان هاترێ فەرحۆیێ تەوێ عەلی عوزێراغە چییە
ئەوجە چەتۆ دەیگۆ مامۆ شێخ حوسێنی بەدەوییە
چما ئەتوو نزانی ئەمن چەتۆمە كوڕێ فەرحۆمە.
نەوێ عەلی عوزێراغە بەخۆمە
ئەمن هاتیمە تەعریفێ وێ وولاتێ ژێری تیرێ بنێ بەرێی لۆمن بكە بتەمامییە
ئەوڕۆكە ئەوا لسەرێ مەیدانێ پەنجا عەگیدت لەمن سوار كردییە
سەلامت لەمن وەرنەگرتەوە بتەمامییە
ئەتوو دەعوایێ حەربان و رۆژێ دەعوایێت لەمن كردییە
* * *
ئەوجە هەنگینێكە وەكی ئەو قسەی بەشێخ حوسێنی بەدەوی گۆ، شێخ حوسێنی بەدەوی گوتی: كوڕم ئەمن ئەتوو نەناسی، وەكی چاویشم بە وراغەكەی كەت وراغێ بابێ

توو بوو وەختبو چاوم کوڕەبی لەخەفەتا بابێ توو، کوڕم مادام کوڕێ فەرحۆی بی مەعنای وەیە کوڕێ برایێ منی، فەرحۆ برایێ من بووە، ئەمە دەگەر بابت حەفت رۆژان پێکدیمان هیناو بردییە، چتاقمان چتاقمان پێ وە عاردی نەکەتییە، ئەتوو پشتێ منت لە عاردی دا بەران ئەمن بەتووم شەرمنییە، ئەتوو برازا یێ منی، ئەلعانەکەش بزانم لۆ چ هاتی بەخێر بێ ی سەر چاوێ مامی خۆ هەتا پێت بریم؟ گۆتی: وەلا مامە ئەمن خەونم دیتییە خەونەکەشم کەتنە تیرێ بنێ بەرپی ولاتێ ژێری، ئەلعانیش بابم ناردمییە ئێرانە، گۆتی برۆ کن شێخ حوسێنی بەدەوی ئەو تەعریفێت لەوێندەرێکە لۆ بکاتن هەنگینێکە هەرو، ئەمنیش شارەزای مەملەکەتەکە نیمە لۆیێ هاتیمە. ئێ گۆتی: کوڕم هاتی بەخێر بێی، گۆتی: ئەلعانەکە برۆ هەرو لێرە تێپەربە ئەگەیە کانی ێ جەم چنارێ، بەس لەوێندەرێکە لامەدە لەسەر ئاوێ چەم چنارێ، ئاوەکی گەلە سارده ئەگەر تێنیشت بوو لامەدە ئاوێ بخۆیەوە، دائمە پیاوێ ئێزنی یان عەگیدەکان پالەوانەکان لەوێندەرێکە بەجلکێ ژنان دانیشتینە لەسەر کانیێ، کە ئیسلامەک بەوێندەرێکە دا بچی ئەوان بەرایی لێ بگرن بیکوژن لە خافرەتی بەژنی تێبگاتن، کورم زۆرت ئاگا لێ بی لەسەرخۆیی بەسە. ئێ گۆتی: باشە مامە ئەمن دەرۆم بەران شارەزا نیمە حەزدەکەم هەتا لەوێندەرێکە تێپەڕ دەبم پیاوەکی یان خولامەکی دەگەرە من بنێری لۆ خاترێ شارەزایێ بەپێشم کەویتن. گۆتی: کورم بریابا لە فەرحۆی نەبای، دیارە ئەتوو لە فەرحۆی نی داخوە داکێ توو فاری لە چ گاوان و شوانان خواردیە ئەتوو وەسەر دنیایێ کەتی، ئەگەر ئەتوو لەفەرحۆی بی ئی هەندێی ئەتوو دەحوایێ پیاوەکی کەی کە دەگەرتدابیتێ، بەتەنێ نەوێری برۆی، ئەوجە چەتۆ توورە بوو لەوێندەرێکە دوعا بوونی لەوێش نەخواست رۆیی.

* * *

وەرە لێ لاوۆ لێ لاوۆ لێ لاوۆ لێ لاوۆ لێ لاوۆ
لێ لاوۆ لێ لاوۆ چەتۆ لاوۆ
عەگیدێ سەرێ مەیدانێ بابێ مستی رم زراوۆ
ئەوجە ئەورۆکە چەتۆ رۆیشتییە
دوعا بوونی لەشێخ حەسێنی بەدەوی نەخواستییە
ئەوجە شێخ حوسێنی بەدەوی بسێ بانگا گاز دکاتن
کوڕێ من چەتۆ شەرتبی لەوێ سەفەرێ بگەرێیەوە بتەمامییە
منیشچ مسلی خانێت دەمێ بعەینییە
ئەوجە چەتۆ هەنگینێکە رۆیشتییە
ئەمان چەتۆ زەینێ خۆی دایێ لەسەر ئاوی چەم چنارێ را تێپەڕ بووە وا زەینێ خۆی دایێ پیرە ژنەکی ئێزیدی سەکنییە
لەگەر کیژەکی عومر چاردە سالییە
سەلامی لەوان نەکردییە
لانەدا سەر ئاوێ چەم چنارێ لۆ بتەمامییە
ئەوجە چەتۆ لەوێندەرێکە را تێپەڕبییە
ئەمان هەنگینێکە چما ئەنگۆ نزانن پیرە ژنی ئێزیدی بسێ بانگا گاز دەکاتن کورۆ شۆرە سوارێ حوسێنییە
بگەرێوە سەر ئاوێ باتمانێ بخۆوە قومە ئاوەکی گەلەک سارد و تەزییە
ئەوجە چەتۆ گێی خۆی لە قسێ پیرەژنێ ئێزیدی رانەگرتییە
رکێبەکی لەبن چەنگێ تێلی عەیشانێدا تەقاندییە
چەتۆ هەنگینێکە داخیلی تیرێ بنێ بەرپێ ولاتێ ژێری بووە ئەمان چەتۆ زەینێ خۆی دایێ چل کچێ ئێزیدی یان دەستێ خۆیان دە ئێگدی گرتییە
شایی یەک و داوەت و دیلانەکیان دامەزراندییە
* * *
ئەوجە چەتۆ سەلامەکی لەوان چل کچێ ئێزیدی یان کردییە
چل کچێ ئێزیدی یان دەیانەگۆ وە عەلێکومەسەلام بەخێر بێی شۆرە سوارێ حوسێنییە
سەرچاوێ مە هەر چل کچێ ئێزیدیان بەراستییە
چل کچێ ئێزیدیان دەیانەگۆ کورۆ و شۆرە سوارێ حوسێنییە
بزانم ئەورۆکە سەفەرێ توو لۆ کێندەرێکەیە هاتییە ولاتێ ژێری لیرێ بنێ بەرپێ بتەمامییە
ئەوجە ئەورۆکە چەتۆ دگۆ چل کچێ ئێزیدیان چما ئەنگۆ نزانن ئەمن هاتیمە لۆ تیرێ بنێ بەرپێ ولاتێ ژێرییە
لۆکن شێخ گەوێ و شێخ بەدۆیێ و شێخ گورگۆیێ و شێخ میرزۆیێ ئێزیدییە
هەشتێ و پێک رەشیۆزی بەیازی دامەنتاری دابەستییە

ئەمان نزانم دەبی رەویٚ ئەو ئێزیدی یانە لەکێندەرێکە را مۆل کردییە
چل کچێ ئێزیدی یان دەیانەگۆ شۆرە سوارێ حوسێنییە
وز لە ترش و تارانێ مەملەکەتێمە بینە بتەمامییە
ئەمان ماخرا چما ئەتوو نزانی توتک بابەک گاوانەکیان لەکن دانایە ناوی ئۆغـزە بەهەشـتێ و یێـک عـەگـیـدیان داخیل کردییە
ئەمان بخودێ کەمە بچی لەوێ کە لە توو قیت بیتەوە
ئەمان تۆبدەکت لێداتن بەتۆبزێ رەشێ قەرێ حەلەبییە
خـینێت دەکـاتەوە تۆز و تەمێ بن دەست و پێـیێ سەگلاوییە
***
ئەمان دیسان چل کچێ ئێزدی یان دەیانەگۆ کورۆ شۆرە سوارێ حوسێنییە
ئەتوو وەرە دابەزە برەکێ داوەتێ بکە دەگـەرەمـە لەبۆ کەیفێ دربیە
ئەمان شایی و رەشبەلەک لەبۆ کچکان و کورکان خەم رەوینێ دنیایێ یە ئاغاۆ براستییە
ئەوجـە چەتۆ دگـۆ چل کـچێ ئێـزیدی یانە ئەنگۆ چلن ئەگەر چلیدیکەشو
دەگەدابی هێشتا ناوکەمەوە خولام و کێلکەرێ شیرنێ دەلالێ خۆم گوارە زێری حەیدەرییە
ئەمن نەهاتیمە بکەمەوە داوەتێ و دیلانێ لاتیری بنێ بەریێ ولاتێ ژێری، هاتیـمـە ببـەمـەوە ترش و تارانێ مەملەکەتییە
ئەمـان ئەنگۆ بەمن بلێن: بزانم دانگێ گـارانێ وی گاوانی لە کێندەرێکە مۆل کردییە
ئەوجـە هەنـگینێکە برا چمـا ئەنگۆ نزانن چل کـچێ ئێزیدی یان دەیانگۆ گورۆ شۆرە سوارێ حوسێنییە
سەرێمەت هەر چلی ببیـتەوە بە خولام و خزمـەتکاری سەرییە
ئەتوو ئەمە مەبە ترش و تارانێ مەملەکەتییە
ئەتوو وەرە لە باتێ ترش و تارانی مەملەکەتییە
ئەمە چلێ یێکەکێ لۆخۆ بگرە ببەوە مەملەکەتێ خۆ لۆ خەم رەوینێ دنیایێ لەبۆ کەیفێ دربیە
ئەوجە چەتۆ دگـۆ منێ نەهاتیمە ئەلحانەکە ئەنگۆ چان یێکەکی لەنگو ببەم بەراستییە

تا بلێن: چەتۆ کـورێ فـەرحـۆ کـیـژە قـەرەجـەکی لەبن پرچکان رفاندییە
ئەمـان ئەنگۆ بەمن بلێن ئاخـۆ بزانم ئۆغـزێ گـاوان لە کێندەرێکە مۆلی کردییە
ئەوجـە چل کـچێ ئێـزیدی یان دەیانەگـۆ کـۆرو شـۆرە سوارێ حوسێنییە
ئۆغزی سەباب لەو دیوێ گرێ باتمانێ را مۆل کردییە
دانگێ گارانێ ی لەوێندەرێکە مۆل کردییە
ئەمـان هەشـتێ و یێک رەشـبۆزی بەیازی دامـەنتـاری بەچار دەوری رەشمالێدا پەرت کردییە
بەخـۆێ لەوێندەرێکە رمی لەپشت سـەرێ خـۆ کـوتایە لەوێندەرێکە خەوی لێ کەتییە
ئەتوو برۆ خۆت دە رمێ ئۆغزێ فەلە بکە رمێ وی بینە دەرێ لە عاردییە
ئەگەر رمێ ئۆغزت هەلقەراند لەعاردییە
هەنگینێکە دەگـەرەوەی بکە سـەربەسـەرانێ یەقـینی دربیە
ئەگەر رمێ ویت پێ هەلنەقەنا لەعاردییە
وازی لێ بینە مـێلە لەتوو واگـا بێتن کـافـرێ لۆ بتەمامییە
***
ئەوجە چەتۆ هەنگینێکە لەوێندەرێکە دوعابوونی لەچل کچێ ئێزیدی یان خواستییە
رکێبەکی لەبن چەنگێ تێلی عەیشانێ تەقاندییە
ئەمان رێ یێ دوازدە سەعاتانی لۆ بچار سەعاتان برییە
ئەوجە چەتۆ زەینێ خۆی دایێ ئەوە پیرەمێردەکی عەمی حەفتێ سالی روێ خۆی لە قیبلەی کردییە
ردێنی وی سپی بووە، چەتۆ سەلامەکی لێ کردییە
دەیگۆ وەعـەلەیکومـەسـەلام کـورێ من بەخـێـر بێ ی شۆڕەسوارێ حوسێنییە
ئەوجە چەتۆ دگۆ مام ئەختیارێ حوسێنییە
عومرێ توو حەفتێ سالی زیاتر بیە
مەملەکەتێ ئێزیدی یان لەتیرێ بنێ بەریێ ولاتێ ژێری ناو چار کۆچەکێ ئێزیدی یانە
ئەمان کاخۆ بزانم ئەتوو چاکەی لێرانە
ئەوجە مـام ئەخـتـیـارێ حـوسێنی دەیگۆ: کـورێ من شۆڕەسوارێ حوسێنییە

چما ئەتوو نزانی ئەمن هاتیمە لۆ ئاشییە لۆ باراشییە
ڕێ یێ ئاشیم غەلەت کردییە
تووشم بەکاولە ئاشێ ئێزیدی یان هاتییە
ئەوە سەرێ حەفت ڕۆژانە نۆ هێستریان لەمن ستاندییە
باراشێ من لە ئاشی کەتینە.
مشکان خەلاس کردینە.
* * *
ئەوجە چەتۆ دگۆ مام ئەختیارێ حوسێنییە
دوعایێ بکە یەقینی درییە
ئیشاللە دەدەمەوە توو نۆ هێسترێ توو بتەمامییە
ئەوجە هەنگینێکە چەتۆ دوعا بوونی لەمام ئیختیارێ حوسێنی خواستییە
لەوێندەرێکەڕا وەسەکەت لەگرێ باتمانێ شۆڕ بۆوە ئەو دیوی بتەمامییە
ئەمان چەتۆ هەنگینێکە زەینێ خۆی دایێ ئۆغزی فەلە لەبەر ڕەشمالێدا خەوی لێ کەتییە
هەشتێ و یێک ڕەشبۆزی بەیازی دامەنتاری لەچار دەورەی ڕەشمالێدا
مۆل بووە، ئەمان ئۆغزێ فەلە ڕمێ خۆی لەپشت سەرێ خۆی چەقاند بوو بەخۆی خەولێ کەتییە
ئەوجە چەتۆ هەنگینێکە دوو، سێ سەران هات و چۆ کردییە
ئۆغز لەخەوێ واگا نەهاتییە
ئەمان چەتۆ هاتە خوارێ لسەر تێلی عەیشانێ بتەمامییە
خۆی لەرمێ ئۆغز کرد و ڕمێ ئۆغزێ لە عاردی هەلنەقەنا بینتە درێ بچاکییە
ئەوجە چەتۆ سوار دەبوو لە تێلی عەیشانێ بتەمامییە
دوو، سێ سەرانی هات و چۆ کردییە
ئۆغز لخەوێ واگا نەهاتییە
دیسان لە ئتێلی عەیشانێ دابەزییە
سەرەسمەکەکی لە تەنیشتێ گاوانی کوتییە
دوو پەراسووی لەپەراسووێ ئۆغزی شکاندییە
کاوانێ سەباب لەخەوێ ڕاپەڕییە
ئەوجە ئۆغزێ فەلە دەیگۆ کوڕ و شۆڕە سوارێ حوسێنییە
ئەمن سێ سەددەقەم لەخۆ گرتییە
یێکەکی بتکوژم لۆ دووی دێ ناوو ناوبانگێ منت
نەزانییە
ئەلعانەکە تۆ بزەکت لێدەم بە تۆبزێ ڕەشێ قەرێ حەلەبییە
خێنێت دەکەمەوە تۆز و تەمێ بن دەست و پێ یێ سەگلاوییە
ئەمان چما ئەتوو ناوبانگی منت نەزانییە
بەعەشتێ و یێک عەگیدیان داخیل کردیە و هەشتێ و یێک ڕەشبۆزی بەیازی دامەنتاری یان تەسلیمی من کردییە
ئەمان ئەلعانەکە لێرانە بتکوژم دەلێن عەگیدەکێ ئێزیدی یان منداڵەکی حوسێنی یانی ڕێ و بار کوشتییە
* * *
ئەوجە چەتۆ دگۆ بەلێ ئۆغزێ قسێ توو ڕاستە چ درۆنییە
ئەگەر ئەتوو ئەلعانەکە ئەمن لێرانە بکوژی دەلێن: عەگیدەکی ئێزیدی یان
منداڵەکی حوسێنی یانی ڕێ و بار کوشتییە
ئەمنیش ئەگەر ئەتوو ئەلعانەکە لێرانە بکوژم، دەلێن عەگیدەکی حوسێنی یان چوو گاوانەکی لەبەر دانگێ گاڕانێ لە ئێزیدی یان کوشتییە
ئەمان چەتۆ دگۆ گاوانۆ گوندییە
سەگێ سەباب زگێ توو عەمبارێ نانی خەلکییە
شەڕی من دەگە گاوان و شوانێ گوندی نییە
ئەمن هەشتێ و یێک ڕەشبۆزی بەیازی دامەنتاریم خڕ کردتەوە بەتەقێ قەرەبینایێ بزەبرێ دارێ قوتە ڕمان بتەمامییە
لەگرێ گرباتمانێم ئالاندییە
ئەتوو برۆ هاوارێ ببە لۆ ناو چارکۆچەکێ ئێزیدی یان، لۆ کن شێخ گەوێ و شێخ بەدوێ و شێخ گورگۆیێ و شێخ میزۆیێ ئێزیدییە
هەتا سێ سەعاتی د دیکە لێرانە دادەنیشم ئەگەر دێنە ڕوو ڕەوێ ڕەشبۆزان بابێن لۆخۆ بگێڕنەوە براستییە
ئەگەر نایێن هەتا سێ سەعاتیدکە ئەمن دەڕۆم دەبەمەوە لۆ مەملەکەتێ خۆ لەباتی ترش و تالانێ بتەمامییە
* * *
ئەوجە هەنگینێکە ئۆغزێ دەیگۆ چەتۆ دەچمەوە گوندی هاوارێ دەبەم لۆچار کۆچەکێ ئێزیدی یانە
ئەگەر لەو سەری گەڕاینەوە لۆ مەیدانێ شەڕانە

پێشی هەمووان دەگەرە من بکەی سەربەسەرانەکێ لە مەیدانێ بتەمامییە هەلاتییە

رویێ خۆی لەناو چار کۆچەکێ ئێزیدی یان ئۆغزی فەلە دەیگۆ:

هەوارە هەوارە کورۆ هەوارە شێخ گەوٚیی، کورۆ هەوارە.

شێخ گەوۆ هەوارە، شێخ بەدۆ هەوارە، شێخ گورگۆ هەوارە، شێخ میرزۆ هەوارە.

چما ئەنگۆ نزانن شۆرە سوارەکی حوسێنی هاتییە

ئەورۆکە رەویێ شەهتێ و یێک رەشبۆزی بەیازی دامەنتاری لەمن ساندییە

ئەوجە چەتۆ شەرتێ خۆی دەگەر گاوانێ گوندی کرد و گاوانێ سەباب

ئەوجە ئەورۆکە شێخ میرزۆیێ ئێزیدییە دەیگۆ: کاخۆ بزانن ئۆغزێ گاوان چ لێ هاتییە

نان لەتێرکێ وی خەلاس بووە، کێ سەرێ وی شکاندییە

کێ قالبی وی کوتییە

هێدی هێدی هەراو هۆریای لۆ چارکۆچەکێ مە هینایە بتەمامییە

ئەمان دیسان ئەورۆکە چما ئەنگۆ نزانن ئەوجە هەنگینێکە ئۆغزی فەلێ سەبابی دەیگۆ: گورۆ شێخ گەوۆ شێخ بەدۆ شێخ گورگۆ شێخ میرزۆ چما ئەنگۆ نزانن ئەوە شۆرە سوارەکی حوسێنییە

سەرە سمکەکی لە تەنیشتێ من کوتییە

ئەمان واهاتییە رەوێ رەشبۆزانی لەمن ساندییە

دەلێ شەرێ من دەگەر گاوان شوانان نییە

برۆ خەبەرێ بدە چارکۆ چەکێ ئێزیدی یانە

باوان بێنە دوو رەوێ رەشبۆزێ خۆ بگێرنەوە بتەمامییە

* * *

ئەوجە هەنگینێکە شێخ گەوۆ شێخ گورگۆ شێخ بەدۆ شێخ میرزۆ بسێ بانگا گاز دەکەن گاوانۆ گاوانێ گوندییە

مادامە پێلەقەکی لە توو دابی و سەردسمکەکی لە توو دابی دوو پەراسووی لە پەراسووێ توو شکاندییە

ئەمان راستە لبەر ئێش و ئەزیەتێ پەسووێ خۆت چ ئاگات لە خۆ نییە.

وەرە تەعریقێ وێ سوراێ لۆمە بکە کاخۆ بزانم ئەو سوارە کوونەو یان دوو پەراسووی لە پەراسووێ من شکاندییە

ئەوجە ئەورۆکە ئۆغزێ فەلێ گاوان دەچوو دەیگۆ شێخ گەوۆ شێخ بەدۆ چما ئەنگۆ نزانن ئەوە شۆرەسوارەکا حوسێنییە

لەسەرێ خۆی بەستیە چەفیەو عەگالەکی حەلەبییە

ئەمان رمێ دەستێ وی قوتێ گورگانییە

سم خرێ قوتکانییە

کورە سینگ بەرینی زورنایانییە

ئەمان بازەکی ولاغی وی هەرداتن بە شەش بازی ولاغی تەرحەل غەزالێ دکێویە

ئەمان گێ یێ ولاغی وی کێروشکانییە

ناوقەدێ ولاغێ وی تاژیانییە

هەر بازەکی ولاغی وی هەرەداتن بە شەش بازی ولاغی مە غەزالێ لە کێوییە

* * *

ئەوجەدەرێ گۆتیان: گاوان لێی گەرێ قەیدی ناکە ئەوە خوارزایێ مەیە، کاخۆ ژنی هەرگرتییە، زەلامی کوشتییە، ئەوە لۆ هەندییتی ئەو مارەی بباتن لۆخۆ ئەفرۆشێتن لەوێندەرێکە بداتە هەقێ ژنی، یان بداتە هەقی، زەلامەکە کوشتیتی، لێی گەرێ خوارزایێ خۆیێن ئەوندەی وبەرەکەوێ لێی گەرێ ((نەوێرن بچنە دووی ئەوجە ئەوەندە قسەیان کرد)). ئەوجە دەرێ گاوان لە کنەوان هەرستا هاتە دەرێ گاوانیش گۆتی: دەنا ئەمنیش لێ دەگەرێم مادام چ هەقم هەیە، هاتە دەرێ، عالەمەکە گۆتیان: گاوان عەمرت نەمینێ هەزار جا نەتوو بەهەشتێ و یێک حەگیدی داخیل کرابووی هەر سەربەسەرانە کت دەگە کردبایە لەوێندەرێکە ئەتوو کوو هەندە ترسای هاتییەوە مارێ خۆ.

ئەوجە دەرێ وەکی ئەو قسەیان گۆتی ئۆغزێ دەماری جۆت بوون هەرست گەراوە کن شێخەکان، گۆتی: باشە ئەمن ئەچم ئەگەر ئەو حوسێنییەم کوشت ئەنگۆ ئەو هەشتێ و یێک رەشبۆزەی ئەدەنە من؟. دەرێ گۆتی: دەددەینێ، برۆ بیکوژە گەردەنێ بابیشت ئازابیتن، هەمووشی لۆتۆ بیتن. ئەوجە دەرێ گاوان چۆوە مارێ ووراغی هەبوو لەوێندەرێکە، وراغەکەی زین کرد و رمی دەدورِ دەستێ خۆ گرت و ئەسلەحەی حەربێ ی لەخۆ بەست سواری ووراغەکەی بوو هات، هێدی لۆ کن چەتۆی گەراوە.

هەتا ئەو هاتەوە دەرێ چەتۆش لەووراغی هاتبووە

خواریّ رمەکەی داکوتابوو جەلەویّ تێلی عەیشانێی بەرمەکەی وەکردبوو، ئەگەر قاوەی سەفەری بوو، ئەگە تشتەک بوو لۆخۆی لێینابوو دەیخوارد.

ئەریّ وەکی زەینیّ دایێ یێک تاقە سوار هێدی هێدی هەوراز دێ، چەتۆ چاوی پیّ کەت زۆری لێ ترسا گۆتی دەبی ئەوە لەمن عەگیدتر بی لۆیێ بەتاقی تەنێ وا هەوراز دێ لۆیێ کەسی دەگەدانییە، بەبێ لەشکر هاتییە. دوور و نێزیک لێ ی وەنزیک کەت زەینی دایێ گاوانێ جاران بوو، چەتۆ گۆتی: کورە گاوان ئەتوو چاکەی لەچاکەرێی؟! گۆتی: وەللەهی چەتۆ هاتیمە خێرتە گاتێ ئەگەر نە بمکوژی نە بتکوژم رەوەکەم ویّ بدەیەوەو واز لێکدی بینین، ئەگەر نەخۆ هەتا نەمکوژی نایلێم رەوەی ببەی. چەتۆش گۆتی: بابم لۆ ئەوان نەهاتن لۆخۆ چار شێخن، لۆ ئێک نەهات، لۆ کورەکی خۆیان نەنارد، کورە لۆخۆ بەکوشتێ ئەچی پیاوی چابە برۆ خۆت بەکوشتێ مەدە، کاکی خۆم برۆ بگەرێوە ناو مارو منداریّ خۆ ناشت کوژم هەشتێ و یێک رەشبۆزەکەش ئەبەم هەقت نەبیێ. گۆتی: وەلا نایێلم ببەی، ئەگەر نەمکوژی نایێلم ببەی. ئێ چەتۆی گۆتی: نایێلی ئەوە مەیدان.

دەریّ مەیدانە کیان دیار کرد، لەوێندەرێکە سەریّ مەیدانیان دانا لەوسەر و لەوسەر، داکشانە خواریّ لەبن گردی لۆ ناو مەیدانێ چوون. ئەریّ چەتۆ لۆ گاوانی هەرات، گاوان کەتە دووی رمەکی راوەشاند چەتۆی چەتۆ لەلای چەپەی خۆی لەبن زینی وراغی کوتا لەلای راستەی وەسەرکەتەوە رمەکەی لەقۆیکێ زینی دا هەربگرت لاگێ یێ تێلی عەیشانێشی دەگەسی. ئەوجارەی وەکی چەتۆ گەیشتە سەری، گەراوە جەلەوی وراغەکەی سووراندەوە هاتەوە. ئەو سەرەی گاوان دەبوایە لۆی هەریّ، گاوان لۆی هەرات لەناوەندیّ مەیدانێ چەتۆش رمەکی راوەشاندێ لە بربرێ پشتێ ی دا بستەکیش لە سینگی هاتە دەرێ، لەسەر وراغی دەکەلی هینا لەوێندەرێ کەتە عاردی وەکی کەتە عاردی لەوێندەرێکە چەتۆ هەر هەربکێشا شیری و غاری دایە سەری، گاوانیش دەستی بەگریانێ کرد گۆتی: چەتۆ مەمکوژە خێرتەگاتێ بچووکم گەلەک هوردن مەمکوژە، تۆبە هەتا ئەمن مایە چابمەوە جارەکیدکە وەناکەم. چەتۆش زگی پێ سووتا گۆتی: رۆژەک عەگیدەکیش لەمن عەگیدتر ئەبی ئەمنەکوژیێ ئەبەو تەرزە ئەکەومە بەر دەستی، وەلاهی نایکوژم ئەگەر دینیش دووژمنم بی نایکوژم، ئەوجارە حافییەکەم، بابستەوە ناو مار و منداریّ خۆ بتۆیی، دەریّ چەتۆ لەتێلی حەیشانێ هاتە خواریّ، لەسەر وراغەکەی قایمی کرد و شاپەکی لە وراغەکەی داو رەوانی مارێی کردەوە.

رەوە ئەوەندەی هەبوو نەبوو دەگە رەشبۆرەکان لێکیداو هینای. مام ئەختیار هاتە سر رێی گۆتی: کاهێستریّ من؟. گۆتی: لۆخۆ نۆ هێستران لێ بگرەو ببە، بەس وراغە باشەکان مەبە، ئەویش نۆ هێستری لێ گرتن، بردی باراشێ خۆی بار کرد خۆیی گەمەکەی بردەوە.

ئەوجە چەتۆ هەتا لەولای هاتەوە لۆ ماریّ (قیرۆیێ قەچێ)ش وەختی خۆی بابێ قیرۆی شێخی ئێزیدی یان بوو، ئەو فەرحۆیەی بابێ چەتۆی بابێ ئەو قیرۆیەی لە غەزایێ تۆیاند بوو، ئەو قیرۆیە مندار بوو هێتیمچە بوو کەتبووە ماریّ فەرحۆی. فەرحۆی دەگەر چەتۆی قیرۆی بەخێو کرد، قیرۆی بەخێوکرد قیرۆ گەورە بووەوی لێ هات ئێزیدی یان خەبەریان هەنارد گۆتیان وەرە لەجێ یێ بابت دەتکەینەوە شێخ و هەقت چییە لۆ نابییە شێخ و لۆ لە کنەوانەبی دین دوژمنێ مەن مار خراپ، ئێ گۆتی باشە دێمەوە.

ئەوجە قیرۆ زانی لەماریّ نییە فرسەتی دیت، هەزار و حەفسەت سواری دەگەرە خۆ هینا هات بەسە ماریّ چەتۆی دادا، وەکی بەسە ماریّ چەتۆی دادا، دەریّ کەپوو لوتێ شوان و خورام و گاوانانی بری، دوو، سێ جا لەپێش ماریّ هات و چوو، دوو، سێ رمی لەسەردەریّ خانی دا سەردەریّ خانییەکەی تێکدا، دوو، سێ خشت و مشتی لەبەر هینایە دەریّ، دەیگۆ: کا چەتۆ؟ لۆخۆی دزۆریّ نایە لۆمن نایێتە دەریّ مەیدانەکم دەگە بکاتن، چەلەگەی چیغ و رستەی رەشمارەکی بریوەو رەشماری پارچە پارچە کرد بە شیران و رەوەی لێکداو ترش و تارانی تێکەر ئێکدی کرد و کەزی یەکیشی لە سەریّ شیرنێ بری راست رۆیی.

ئەوجە دەریّ وەکی رۆیی دەریّ چەتۆش گەیشتەوە گوندی، هێشتا چەتۆ لەو بەری ماران بوو، داکی چاوی وێ کەت چەتۆ هاتەوە، بەگریان بە پیرییەوە چوو، ئەریّ گۆتی عەلەللاقەت داکێ من بە پیرەمنەوە نەهاتییە، ئەوە چەند شەر بکەم، داکێ من ئەوجارەی لۆ بەپیری من وەهات دەبی چ قەومابی لە ماریّ من، دەریّ داکیشی چوو گۆتی: کورم

چەتۆ یاخوە بەخێر بێیەوە، بەران کورِم هەتا ئەتوو هاتییەوە بەراستیت پێ برێم گۆتی: ئەوە چ ئیش وە نییە!. گۆتی: دایە چ بووە؟ گۆتی: وەلا کورِم پیاوەکی وەکی قیرۆێ قەچێ قەت ئەمن بە پیاویشی حسێب ناکەم، گۆتی: هات ترش و تارانێ تووی هەمووی لێکدا بردی.ئێ گۆتی: دایە لەمنت نەکەوا، گۆتی: دێم ئیسرەحاتەکییەکەم و دوو رۆژان لەمارێ ئەبم، چەندی بردییە ئەچم هەندەیدیکەش ئێخۆش دینمەوە چ قیمەتی هەیە ئەوە لەکن کورێ توو. گۆتی: کورِم قەزییە ترش و تاران نییە، گۆتی: رەشماری پارچە پارچە کرد بەشیران، گۆتی: چیغێ رەشمارێی برییەوە، گۆتی: دوو، سێ رمیشی لەسەردەرێ خانی دا، گۆتی کاچەقۆ لەمارێ نییە لۆم بینە دەرێ لۆ نایێتە دەرێ، ئێ گۆتی: دایە چقەیدی زانیتی ئەمن لەمارێ نیمە لۆیێ وەی کردییە ئەگە بشی سووتاندبا چ چارە هەبوو - گۆتی: کورِم خەمێ هەندێشم نییە، ئەمان خەمێ ئەو شتەیتم کەپووو لۆتی شوان و خورام و گاوانانیشی برییە. ئێ گۆتی: دایە ئەوانە بەرخێ نێرن لۆ سەربرینێ چاکن، ئەوە یەخسیر بوون لەبەدەستێ وی بوون ئەگە بیکوشتبان چما چاکرا لێی ناترسا خۆ ئەگە بشی کوشتبان تێکرا دەیانکوشتێ ئەوا نەیان کوشتینە لەپیاوەتیێ خۆ. کورِم ئەوە هەمووو بەلایێ خۆ قەت چ خەمێ وەم نییە.گۆتی: ئەدی دایە چ بووە!؟.

گۆتی: کەزی یەکی لەسەرێ شیرنێ برِی بردی. وەکی وەی گو چەتۆ تەزی یەکی لەبنی پێی وەهات لەتۆقی سەری چووە دەرێ.

چەتۆ تێلی عەیشانی برِەکید کە هاژۆت و گەیشتەوە مارێ، شیرین هاتە دەرێ ماندی بوونی لێ کرد چەتۆ پێی گۆ: -

***

لێ لاوۆ چەتۆ لاوۆ
وەرە لێ لاوۆ لێ لاوۆ لێ لاوۆ لێ لاوۆ لێ لاوۆ
عەگیدێ سەرێ مەیدانێ بابێ مستێ رم زاروۆ

ئەوجە ئەورۆکە چەتۆ دگۆ: کچکێ شیرنێ دەلالێ مال خراپێ دەوەرە دەرێ لەمالێ کاخۆ بزانم قیرۆێ قەچێ ئێزیدی بەخۆ بە هەزار و حەفسەت سوارێ کریفان و ئێزیدی یان چ لە مالێ من کردییە.

***

ئەوجە شیرنێ دگۆ: کورۆ ئاغایێ گرانی ئەفەندییە

سەرێ شیرنێ دەلالێ خۆت بیتەوە بەقوربانی سەرییە
ئەمان قیرۆێ قەچێ کەپوو و لوتێ شوان و خولام و گاوانی لە مالێ دا برییە.
چما ئەتوو نزانی ئاغایێ گرانی ئەفەندییە
بەرخێ نێرن لۆ سەر برینێ نەبی لۆ چیدکەیان فایدە نییە.
دەیگۆ: کچکێ دەلالێ مال خراپ چیتکەشی لەمالێ من کردییە
دەیگۆ: ترش و تالانێ تووشی هەموو بردییە
بەلان وەرە دانیشە دوو رۆژان ئیسرەحاتێ بکە براستییە
هەنگینێکە برۆ دوو ترش و تالانێ مەملەکەتێ ئێزیدی یان بتەمامییە
دەیگۆ: کچکێ دەلالێ مال خراپ ئەدی چیتکەشی لەمالێ من کردییە
دەیگۆ: کورۆ ئاغایێ گرانی ئەفەندییە.
سەرێ منت ببی بە قوربانی سەرییە
ئەمان چما ئەتوو نزانی ستونەکی رەشمالێشی بریتەوە رەشمالی پارچە پارچە کردییە بەشیران دوو، سێ رمی لەسەر دەرێ خانی داینە لایەکی خانی رووخاندییە.
ئەمان دەیگۆ کانی چەتۆ لۆمن بێتە دەرێ سەر بە سەرانەکی بکەین لە سەرێ مەیدانێ بە یەقینی دلییە.
ئەمان ئاغایێ گران دەیزانی ئەتوو لەمالێ نی لۆیێ تەلەبێ مەیدانێ ی را لەتوو کردییە.
دەیگۆ: کچکێ دەلالێ مال خراپێ چ لەمالێ من کردییە.
دەیگۆ: ئاغایێ گرانی ئەفەندییە.
قەت چیتکەی لەمالێ توو نەکردینە هەر ئەوەندانەی کردییە
ئەویش زانی ئەتوو لەمالێ نی لۆیێ وەکردییە
ئەمان وەرە دانیشە دوو رۆژان بکە ئیسرەحاتەکێ ئەمان سەرێ شیرنێ ( پسمامی)[1] خۆت بیتەوە بە قوربانی سەرییە.

***

ئەوجە چەتۆ دگۆ: شیرنێ دەلاێ مال خراپی لۆ قسان ناکەی وێ ئێزیدی ئەدی کەزی لەسەرێ توو نەبرِییە.
ئەوجە شیرنێ دگۆ: رەببی خوا بتگریێ یاخوە ئەورۆکە داکی چەتۆی یتەمامییە.

كێڕا خەبەرێ وێ نەخۆشی بەچەتۆی ڕاگەیاندییە.
ئەوجە هەنگینێکە چەتۆ دەیگۆ لۆ کیلای ڕۆیشتییە کاخۆ بزانم ئەنگۆ بەمن بلێن بتەمامییە.
ئەوجە گۆتیان: بەو ڕێ یەیدا ڕۆیشتییە لۆ قیرۆیێ قەچێ سەبابێ ئێزیدییە.

* * *

ئەوجە چەتۆ هەنگینێکە ڕوێ خۆی دایە دەشتێ مەلیک سینۆیێ عاردێ بێدەرێ بتەمامییە.
ئەو جێی ئەوەلێ خەونی پێوە دیتییە.
ئەمام چەتۆ ڕکێبەکی لەبن چەنگێ تێلی عەیشانێ دا تەقاندییە.
ئەمان ڕێ یێ دووازدە سەعاتی بەچار سەعاتان بڕییە.
دیسان چەتۆ لەوێندەرێکە ڕکێبەکیدی لەبن چەنگێ تێلی عەیشانیدا تەقاندییە.
ئەمان ڕێ یێ هەشت سەعاتانی بەسێ سەعاتان بڕییە.

* * *

ئەوجە دەرێ چەتۆ زەینی دایێ ڕێ، یەکە بووە دوو ڕێ نەیزانی نە لۆ ئەو ڕێیەی بچی نە لۆ ڕێی دکە بچی، چ شونیشی دیار نەبوو تیپەڕیبن، چەتۆ گۆتی پەککوو یان دەبی زۆر لەمێژەبیبنەوانە ڕۆیشتبن شونەکە پڕ بوویتەوە لۆیێ ئەمن وێ ناکەوم، یان دەبی ئەمن دەپێشەوانم کردبی، ئەمن هاتبم بەراییم لەوان گرتبیتەوە، دەرێ چەتۆ گۆتی وەلاهی وەچاکە ئەوشۆ کە لەناو ئەو مێرخوزارەی ئیسرەحاتەکەی بکەم ئەوشۆکە، لەمێژە لە شەڕی بویە تازە هاتیمەوە، ئیسرەحاتەکی بکەم ئەوشۆکە هەتا سبەینێ بەدەنگ و بەحسەکی هەر دەکەوم، ئەگەر ئەمن دەپێشەوانم کردبی ئەلعان ئەوان بەسەرەمن دا دێن ئەگەر ئەوانیش دەپێشەمنیان کردبی ڕۆیشتبن پسیارەکی دەکەم چووبنە کیهان ڕێ بە دوویاندا دەچم.
ئەوجە دەرێ چەتۆ لەوێندەرێکە تێلی عەیشانی بەرەلا کرد لەناو باخچەکەی و دەرێ چەتۆ بەخۆی لەوێندەرێکە دانیشت نێرگەلەیەکی تێکرد قەلونەکی خوارد و وەکی قەلونەکەی خوارد حەبای کێشا سەر چاوێ خۆ، چەتۆ واگاهات تێر خەو ببوو حەباشی هێشتا لەسەر چاوێ خۆ هەرنەدابۆوە زەینێ دایێ غەربەغەربەک دەهات، وەکی هەستێ خۆی لێ ڕاگرت ئێزیدی بوون، چەتۆ زانی دەپێشی کردییە.

چەتۆ هەرستا تێلی عەیشانی هینا زینی لێ کرد و زەریف ڕکێبەکانی قەیم کردنەوەو حازری کردو، چەتۆ سواری وراغی بوو چوو لەسەر ڕێی ڕاوەستا، ئەو ئێزیدیانەش لە لەشکرێ قیرۆیێ قەچی ئێزیدی یەکی لەو ئێزیدی یانە خەونی دیتبوو لەسەر وراغیش بەر نەبۆوە هەر بۆڕژا بوو وراغیش هەر ئەڕۆیی.
لەو خەونەیدا لەیوابی گورگەک لەدەشتێ مەلیک سینۆیێ لەعاردێ بێدەرێ وەناو هەزار و حەفسەت سەر مەری کەت قەت گدی گدی یەکی لێ نەهیشت، ئیللا بەرانەکی هێشتەوە، بەرانەکەشی هێشتەوە بیباتەوە مارێ بیکوشتەوە، بەرانەکەش قۆچەکی لێدا لە گورگی، گورگی بریندار کرد گورگ بە برینداری کەتە دوو بەرانی بەرانەکەشی کوشت.
ئەوجە دەرێ گەڕاوە ئێزیدی یەکە گۆتی: کوڕە خزمینە ئەمن خەونەکم دیت تازە! گۆتیان: خەونی چت دیت؟. گۆتی: وەلا لەخەونێ من وابیتن تازە یێک گورگ بەناو هەزار و حەفسەت سەری کەن ئەلەو حاردەی مەلیک سینۆیێ دەشتێ بیدەرێ ئێرانەیە قەت گدی گدی یەکی لێ نەهێشت ئێکەکی قوتار نەکرد، تەنها بەرانەکی هێشت یێک بەران ئەو بەرانەش بردییەوە مارێ کە لەمارێ بیکوشتەوە. نەی گەیاندەوە مارێ هێشتانەکە هەر لەدەشتێ مەلیک سینۆیێ، بەرانەکەش قۆچەکی لە گوردی دا گورگی بریندار کرد، گورگ بە برینداری گەڕاوە بەرانەکەشی لەوێندەرێکە کوشت.
هەندەکان گۆتیان ئەگەر هەبی ئەلێرانە چەتۆیە لێن ڕاست بێتن ئێکن نایێلی، هەندەکانیش گۆتیان بابە خەون درۆیە ئەو قسە ڕاست نییە، هەندەکانیش گۆتیان ئەدی ئەو شێر و ڕمە چییە وێیتن با چەتۆ پیاوبی بێتە سەر ڕێ یێ مە هەتاکو هەریزرێنین. لەو قسانەدابوون، دەرێ چەتۆ لەسەرێ مەیدانێ ڕاوەستابوو، پێشی گەیشتە چەتۆی.
دەرێ چەتۆ ناوێ خواو پێغەمبەرانی هینا لە پێشڕا لێیدا بەسەر باشیدا وەرگێڕاوە خوارێ. هەتا ڕۆژ هات گەزەنگی هاوێشت دەرێ چەتۆ قەت ئێکەکی نەهێشت، ئەوەکەی هەریشاتبایە لایەکی دوو بازی هەرەدا بەتێلی عەیشانێ ئەیگەیشتێ و دەیهیناوە ناو وێندەرێکەو شیرەکی لێدەداو دەیکوشت، ئاخیری بەس قیرۆیێ قەچێ ما کە شێخیان بوو، قیرۆی قەچێشی کرت. قیرۆ گۆتی:

چەتۆ مەمکوژە بابێ توو منی کوشت ئەمنی بەخێو کرد بە منداری، ئەمن بکوژی حەفت مندارم هەیە دەبی هەر حەفتانم لۆ بەخێوکەی، مەمکوژە گوناحتەگاتێ، شەرتبی لەسەر چ دینەکی دێمەوە سەر ئەو دینی - گۆتی: وەلاهی کافر ئیسلام بی ئەمن هەر ناتکوژم بەخۆم، ئێزیدی بی هەبەخۆ ناتکوژم، دیان بی هەبەخۆ ناتکوژم، بەران دەتبەمەوە کن شیرنێ ژنێ خۆم چونکە هەتکت بەوی کردییە ئەگەر ئەو بتکوژێتن شەرتبی دەبەدەستێ ویت دەنێم ئەگەر نەشیکوشتی با قەت نەتکوژێتن.

دەرێ قیرۆ وەکی گێی لەو قسەیە بوو خەنی بوو، گۆتی هەر لێرە هەتا ئەگەینە باخسمانێ و مەمەدانێ قابیلە فێرەکم پێ لە چەتۆی ئەکرێتن. ئێ گۆتی: فەرموو ئاغە با بچین رەوەکەی خرکەینەوە ئەوجە ببەینەوە ترش و تارانەکەی. چەتۆ گوتی باشە تێلی عەیشانی هینا رایگرت رکێفی لۆگرت قیرۆی، چەتۆش گۆتی: رکێفی لۆمن مەگرە بەردە بەخۆت سواربە برۆ رەوەی خۆ ئەوانی ئێ خۆت و وراغەکانی خۆ بینە تێکەر حەیوانەکانی مەی کە لێگدە لەگەر گارانێ مە هەتا ببەینەوە. گۆتی: ئاغە ئەتوو سواربە ئەوجا ئەمنیش دەچم.

ئەوجە دەرێ قیرۆی لەوێندەرێکە رکێفەکەی بەر ئەدا هەتا چەتۆ وەسەرکەت، وەکی وەسەرکەت، ئەویش لەدووی سواری وراغێ خۆ بوو، چەتۆ لەپێشدا بوو قیرۆش لەدووی بوو رەوەیان گێراوە دەرێ یان کردن و راستەرێ بوون لۆ باخسمانێ و مەمەدانێ بگەرێنەوە قیرۆی لە پشترا قەرەبینای وێ بوو (ئەو شێخە ئێزیدی یانەش ئەوانی کە پیاوەکی گەورە بیتن، دەبانچە پێ یانە گۆت قەرەبینا لەبن جلکان دەبەپشتێ خۆی راکردبوو، پیاوەکی گەورە نەبا وێی نەبوو)، هەر هەریکێشا قەرەبیناکە دوو قەرەبینای لە پشتێ چەتۆی دا، وەکی لێی دا چەتۆی بریندار کرد، چەتۆ هەر ئاورەکی داوە زەینی دایێ قیرۆ هەردێتن چەتۆش بە برینداری کەتە دووێ رمەکی راوەشاندێ لە بربڕێ پشتێی دا یێک بستی لە سینگی هاتەدەرێ، لەسە وراغی دەکەلی هینا لەوێندەرێکە بەربۆوە، هەریکوتا سەرێ و شیرەکیشی لەملی دا ملی پەلدا ئەویشی لەوێندەرێکە تۆیاند.

ئەوجە چەوۆ دەرێ لەوێیندەرێکە کەمەر بەند و مەمەر بەندی خۆی لەپشتێ کردنەوەو لە برینەکەی پێچا کە خینەکەی رابوەستێتن، حەگار و مەگارێ خۆی لەسەری کردووەو لێی پێچا کە خینی رابوەستی، چەتۆ هەر چەندی عەوری داخینەکە رانەوەستا، ئاخیری خینەکەش راوەستا چەتۆ برەکی لە مەیتان وەدوورکەوت چەتۆش بەر بۆوە لەوێندەرێکە، هەر پێنج دەقیقە رێ یان ئەگەر وەدوورکەوت لەناو مەیتان، ئەگەر وەدوور نەکەت، چەتۆ لەوێندەرێکە بەر بۆوە خۆی لەسەر وراغی رانەگرت، وەکی بەربۆوە چەتۆ، تیلی عەیشان بێ سوارما.

تێلی عەیشانیش (بار بە ملێ ئەو مامۆستای ئەمن گێم لێ بووە) دەرێ سەری لموزی خۆی دەگەر هەر چار پەلی خۆی بەخێن کرد و راست چۆوە لۆ باخسمانێ و مەمەدانێ لۆکن فەرحۆی، چۆوە برەکی پێکۆرە کرد لەوێندەرێکە خۆی پێشانی مارێ داو تێلی عەیشان، دەرێ لەحیلی داو گەراوە لۆسەر جێی چەتۆی لێ بوو، ئەوجە دەرێ چەتۆ لەو گۆڕی کەت.

وەختی خۆی فەرحۆ ئەو ئامۆزایەی لەسەر تەماحێ دنیایێ بوو ئەگە لەسە هەرچی هەبوو فەرحۆ ئەوی دەستەژۆرتر بوو ئامۆزایەکەی خۆی دەرکردبوو، ئامۆزایەکەی لە باخسمانێ و مەمەدانێ نما بوو چووبووە ئێرانێ، ژنەکی لەوێندەر هینابوو ژنەکیشی لە ئیرانی هینا، دوو ژنی هەبووە دوازدە کوری هەبووینە، ئەو دووازدە کورانە هەموو رۆژێ ناوو ناوبانگێ چەتۆیان زانییە و عەگیدیێ چەتۆی کە چ دەرد دەداتە ئێزیدی یان و قاندرێ ئێزیدی یانە.

دەری ئەوانە زۆریان کەیف بەچەتوی هات گۆتیا: واچاکە بچین سەردانەکی ئامۆزایێ خۆ بکەین، ئەوجە دەرێ ئەوانە لە ئیرانێ راهاتبوون سودفەن ئەو رۆژێ ئەو شەرە لەدەشتێ مەلیک سینۆیێ و عاردی بێدەدێ قەومنا ئەو رۆژێ ئەو دوازدە کەسە گەیشتە ئەوێندەرێکە، وەکی هاتن گەیشتنە ئەوێندەرێکە لەناو مەیتان گەران و سوران زەینیان دایێ هەندەکان خێن لەبەر ئەرواو هەندەک تەواو بووینە و هەندەک هەتا بەخۆ دینۆ قسەیان پێ ناکرێن و کەسی وەیان نەدیت کە قسەکی لێ بپرسن وێ بکەون بلێین: ئەوە چ قەومەییە، دەرێ ئەو دوازدە کەسانە لەناو مەیتان گەران و سوران کەسی وەیان نەدیت هەتا قسەکی لێ بپرسن، ئاخیری ئێک بەسە چەتۆی دا هەر بوو وەکی زەینی دایێ ئەوە ئێک لەوێندەرێکە کەتییە بریندارە چاوی زەقن قەلنەی وەدەستە وا هێدی هێدی قومان لەقەلنەیەدات و حەباشی کێشایتە سەرەخۆ هەتا پشبێندی و لەبن حەبای

چاوی زەقەکرێ.

دەرێ گۆتی: برام وەرنێرە ئەوەتە ئەوە مایە لێرە لەوەی بپرسین کاخۆ بزانین چ قەومەیە، هەر دووازدە کەس هاتن دەورەیان لەچەتۆی دا وەکی دەورەیان لەچەتۆی دا فکری دانێ زەینی لێکردن ئەگەر ئەو سوارانە لەرەسەنێ وان لەبن لەچ رەسەنان هەرنەکەتینە، دەرێ ئەوانیش بەینەکی لەکن چەتۆی دانیشتن دوایی گۆتیان: برام یێک قسەت لێ ئەپرسین راستێ پێبرێ، ئەتوو ئەو خوایە ئەگە راستێ پێ نەرێ ی، ئەوە چ بووە بەو سبەینەی چ قەومەیە ئەوە کێ ئەو فەتحەی لێرە کردییەو کێ ئەوەندە کەسەی لێرە کوشتینە کەسیش لێرە دیار نییە قسەکی لێ بپرسین، ئەتوو مای قسەکەن پێ برێ! گۆتی: وەلاهی کاکە (چەتۆش ترسا گۆتی ئەگەر ئیسلامیش بن نەخۆ بە بەرتیل بەماری تەواومکەن بکوژن چم پێ ناکرێ نەخۆ ئێزیدیش بن تاقیبێ خینێ خۆ بکەن)، چەتۆ گۆتی: وەلاهی کاکە ئەمنیش وەکینگۆ رێ و بارم بێرەدا هاتم گەیشتمە ئێرە تشتەکم تێ ئاراو ئەمنیش لێرە بەربوومەوە جیدکەشم ئاگا لێ نییە.

دەرێ چەتۆش هەر فکری لەوان کرد گۆتی: ئەرێ برام ئەمنیش قسەکی لەنگۆ بپرسم مادام ئەمگۆش بەمن برێن. گۆتیان قسەی کوو؟ گۆتی: ئەنگۆ لەکێندەررا هاتینە لۆ کێندەرێ ئەچن، ئەچنە کێندەرێ؟. دەرێ ئەوانیش خۆیان کر کرد، برایەکەی گچکە گۆتی: برام خۆ ئەگەر ئەوە ببیتە گورگ ئەمە هەموو ببینە مەڕ هێشتا بەمە نوێری ئەوە، وەلاهی پێی دەرێم با نەخۆ بمرێن لە دری ببیتە مەرەق، گۆتی: وەلاهی کاکە ئەمە دەگە چەتۆی بابن ئامۆزانە، بابێ چەتۆی بابێ مەی دەرکردییە مام فەرحۆ، بابێ مە ژنەکی لە باخمسانێ و مەمەدانێ هەبووە ژنەکیشی لە ئیرانێ هینایە، ئەمە هەر دووازدە کورێ وینە ئەوە سەردانێ چەتۆی ئەکەین لۆکن چەتۆی ئەچین.

ئەرێ چەتۆش فکری لێ کرد قسەکەی چووە ئاقری، گۆتی: وەلاهی کاکە ئەگەر قبورم کەن ئەمن چەتۆمە کورێ فەرحۆیە. ئەو جەدەرێ زۆر کەیف خۆش بوون زۆریش گەش بوونەوە وەک گورێ کە چەتۆیان دیت، بەران زۆریش پەرۆش حار بوون کە بەو نەوحەیان دیت بریندار بوو بە ساغیان نەدیت، لەو قسانەدابوون دیتیان تێلی عەیشان وەدەرکەوت، گێ یێ خۆی مووچ کردنەوە کلکی لە ناوەندێ پشتی دانا کە هجومیان کاتە سەرێ بە چەپەرۆکان لێیاندا لەو زەلامانە، دەرێ چەتۆ لێی قیراند لە تێلی عەیشانی، تێلی عەیشان لە جێ یێ خۆ راوەستا گێی بە خۆدا بەردانەوە.

ئەوجە دەرێ گۆتیان: برام فایدەی نییە با ئەمە هەستین ئەو مەیتەی لێرە ببەینەوە چی لێکەین، دەرێ ئەوجە هەر لەوان هەرستان سەری گوریس و هەوساری وراغانیان برین، زۆریان برین ئەوجە ئەگە پازدە ئەگە بیست چەندی بری یان تێکیان هێخست کردیانە گوریس بن بارەکیان هەر بەستا دارێ دار رمان لە پشتێ تێلی عەیشانێ یان بار کرد، ئەو دۆشەکۆکە دەبن قونێ چەتۆشدا بوو لەسە زینی، دەگە ئەوەکەی دەبن قیرۆیێ قەچێ دابوو ئەوانیشیان هینا دەرێ لەناو دار رمەکانیان دانان مەیتێ چەتۆیان لەناو درێژ کرد، وەکی لەناویان درێژ کرد هەندەک هەوساری دیکەشیان برین قەیێیان کرد حەیشانیان لە پێشەخۆ یێخست و بەخۆش هەر دووازدە کەس کتنە دوو حەیشانێ هێدی هێدی لۆ باخمسانێ و مەمەدانێ چوونەوە.

ئەوجو دەرێ فەرحۆش زانی کەحەیشان هاتتەوە مارێ هاواری هینایتەوەو بێ سوار هاتتەوە مارێ و بەخینە زانی شتەک قەومەیە ئەمان دەشتێ مەلیک سینۆیێ دەشتەک بووە وەکی دەشتێ مەسەلەن برێێن بەرانەتی یان چسوانێ کاخۆ لە کێندەرێکە ئەو فەتحە قەومەیە، لە کێندەر ئەو شەرە بووە چسوانی لە کێندەرێکەیە نەیزانی، ئەوجە فەرحۆش هەر ئینتیزارێ ئەوەی دەکرد دەیگۆ بەر کەم ئێکەک بێتێ لێی بپرسم کە بریم شەر لەکێندەرێ قەومە یەبەرکەم سۆراغەکی بکەم بڕۆم. هەر کاروانەک دەهات ئەچووە بەرایی دەیگۆ چم نەزانییە.

ئاخیری فەرحۆ دووربینی لە پێش چاوێ خۆی راگرت زەینی دایێ تۆزەک دەهات نەشی ئەناسین کێ بوون، بانگی شیرنێی کرد گۆتی: کیژم شیرین کاخۆ وەرە بزانە ئەوانە کێنە ئەوە دێن دەرێ لۆم بناسەوە.

* * *

لێ لاوۆ لێ لاوۆ لێ لاوۆ لێ لاوۆ لێ لاوۆ لێ لاوۆ چەتۆ لاوۆ

عەگیدێ سەرێ مەیدانێ بابێ مستێ رم زراوۆ

ئەوجە هەنگینێکە چما ئەنگۆ نزانن برا وا فەرحۆ دگۆ: کچێ من دێ

رابە لجێ یێ خۆ وەرە ئەلحانەکە دارێ دووربینێ لدستێ

مامێ خۆ دەربینە
ئەمان کیژێ من چاوێ خۆ سەرا بحەلیینە
کاخۆ بزانە ئەوانە تۆزو تارمایی یەکە سەحیان بکە بزانە
دۆستێ مەنە یان دووژمنە
ئەوجە شیرنێ دارێ دووربینێ لە مامێ خۆ فەرحۆ وەرگرتییە
شیرنێ باش زەینێ خۆی دایێ فکرێ خۆی لێ کردیە
سێزدە ولاغن دووازدە سوارن دەرێ دانە
نەئێزیدی نەنە ئێرمەنینە
ئەگەر لە رەسەنێ مالێ فەرحۆیێ نەوێ عەلی عوزێراغە
نەبن ئای لە چ رەسەنیدیکە هەلنەکەتینە
ئەوجە شیرنێ دەیگۆ مامۆ چما ئەتوو نزانی شێزدە ولێغن دوازدە سوارن دەرێ دانە
ئەوانە نە ئێزیدی نە نە ئێرمەنی نە
ئەگەر لە ئەسل و نەسەبێ مە نەبن مامۆ لە چ ئەسل و مەسەبیدکە بەباش نەکەتینە
ئەمان مامۆ چما ئەتوو نزانی ولاغەک دەپێشەواندایە بە فکرێ من وابی تێلی عەیشانە بتەمامییە
ئەمان ئەوە بن باریان بدارێ رمان هەلبەستییە
ئەمان گوریسیان لەهەوسارێ سەرێ وولاغیان برییە
لەسەر پێکدیان پێخستییە
بن بارێ بەدارێ بە دارێ رمانیان هەلبەستییە
لەسەر پشتێ تێلی عەیشانیان بار کردییە
ئەمان مامۆ چما ئەتوو نزانی وەلا مەیتێ بابێ مستێ لۆ چەتۆیێ ئاغایێ گرانیان لەناو درێژ کردییە
ئەمان مامۆ لەمن مەعلوم نییە
کاخۆ چەتۆ مایە یان مردییە
* * *
ئەوجە دەرێ شیرنێ کووی چاو دابوێ حەین تەواو بوو قسەکانی، وەکی هاتن زەینی دایێ دووازدە سوار و سێزدە وراغ بوون، کوی ئەمن تازە گۆتم: کە بەبەند لۆنگۆی گۆ حەین قسەی شیرین تەواوو راست دەرچوو، ئەوجە دەرێ مەیتێ چەتۆیان هینا خوارێ لەدیوەخانێ یان دانا.
شیرین گۆتی: مامە هەرو دختۆرەکی لەناو کوردستانێ بینە برینێ چەتۆی پێ دەرمان کە لەمست میرۆی مەنێ ئەوەش هەر وەختی خۆی منداری ئێزیدی یان بووە ترسێکەم بیکوژێتن بە فێر، گۆتی: کیژم ئەگەر حالەم بریندار بی هەرچی نەخۆشی هەبی دێ دختۆرێ لەمارێ مە ئەباتن، ئەمن بچم دختۆرێ لەجێ یان بینم! گۆتی: مامۆ دەمست میرۆی مەنێ، میرۆ بەفێر دەیکوژێتن ئەگەر هەر نەبی دین دوژمنە.
ئەو میرۆیە چبوو لەمارێ وان بوو ئەو میرۆیەش وەکی قیرۆیێ قەچێ فەرحۆی بابێ ئەو میرۆیەی کوشتبوو، ئەو میرۆیەش هێتیمۆکە بوو لەمارێ وان بوو کردبوویە دختۆر لەمارێ خۆ.
ئەوجە دەرێ بەگێی شیرنێی نەکرد برینێ چەتۆی دەمست میرۆی نا، میرۆش جوانی دەرمان کرد برینەکەی سەررێژ کرد و قەپاتی کرد.
ئێزیدی یان لەبنرا خەبەریان دایێ گۆتیان ئەگەر بێت و چەتۆی چا نەکاتەوە وەبکا بیکوژی ئەوجارەی ئەمە کیژێ کیهانی دەیهەوێتن دەیدەینێ لە شێخە ئێزیدییەکان لە جێ یێ قیرۆیێ قەچێش دەیکەینە شێخێ ئێزیدی یان بێنە کنەمە با چەتۆی بکوژی ئەو جارەی چاکی نەکاتەوە.
دەرێ کابرا ئەگەر چشیان نەدابایێ بەرکەم دین دووژمن بوو دەیکرد، هەندەک دەرێن مەرحەمێ سلێمانی و هەندەک دەرێن مازییە شێت، لەسە برینێ چەتۆی دانا (وەکی تیزابێ تەیارە) بەسەدا چۆوە خوارێ وەک جاران هەمووی هەروەشاندەوە. ئەوجە هەرستا سواری وراغی بوو گۆتی ئەرۆم، فەرحۆش بەخۆ بەردێنێ سپی چوو لەسەرێی راوەستا گۆتی: میرۆ کەرۆ هێشتا چەتۆ بریندارە هەتا زەریف چاکەبیتەوە مەرۆ هەنگێ دەرۆی برۆ، هەر بەگێی نەکرد. گۆتی: ئیللا ئەمن دەرۆم قابیل نییە ئەمن لێرە نابم ئەوە چەتۆ چابۆوە خوا رەحمی کرد و چیدکەش لێرە نابم و ئەرۆم لۆخۆ دەچمە مەملەکەتەکیدکە. گۆتی: ئاخر نایێلم برۆی هەتا چەتۆ چانەبیتەوە.
دەرێ چەتۆش فکری لێکرد زانی کوشتی چارەی نما چەتۆش دەبنچەی سوار کرد دەبن دۆشەکێی دانا، گۆتی: میرۆ، میرۆ. گۆتی: بەرێ ئاغە.گۆتی: دەوەرەوە مار خراپ دوو، سێ وەسیەتانت لەکن بکەم ئەتوو گەردەنم ئازاکە ئەمن ئەمرم کاخۆ بزانم چت دەوێ هەتا ئەمن ئەلعان بەخۆمایە بتدمێ نەخۆ دووایێ بابم نەتداتێ یان کوری من نەتداتێ وەرە ئەمن بتدەمێ. گۆتی: ئاغە چاکەبی ئیشاللە کوەمری. هات دەستەکی لەو بەری دەرکەی دانا پێکیشی لەو بەری دانا سەری بەسەر ژۆرێ داگرت و بەسە چەتۆی،

دەیگۆ ئاغە چاکەبییەوە ئیشالاّ ئەتوو نامری بریدنەکانت زەریف چابوونە، بەران ئەمن بەخۆ ئەرۆم و لێرە نابم، چونکە ئەحامولم نییە لێرەبم. گۆتی: میرۆ ئاخە ئەمن ئەمرم وەچت دەوێ لەماڕێ من بتەدەمێ پێم برێ ئاخر حەزت لە چییە ئەمن دەتدەمێ نەخۆ دوایێ کوڕێ من نەتداتێ یان بابێ من نەتدانێ سبەینێ، ئەمن بەخۆ دەتدەمێ ئەلعانێ هەتا مایە. گۆتی: ئاغە چاکەبییەوە ئیشالله نامری.

دەرێ چەتۆ چەندی فکری لێ کردەوە ناهاتە ژۆرێ، هەر هەریکێشا دەبانچەکەی لەبن ڕۆخی دۆشەکێ هینایە دەرێ و دوو گوللەی لەتەختی نێوچەوانی دا.

لەگە تەقەی دەبانچان فەرحۆ غاریدا گۆتی: ئەگەر هەبی یان چەتۆی لەیێکەکی دا، یان یێکەکی لەچەتۆی دا، وەکی هات میرۆی پەلیەکوتان، دەرکەو مەرکە هەموو بەخینێ سۆر ببوون، دەرکەی دیوەخانێ. گۆتی: کوڕم چەتۆ ئیشەکی خراپت کرد دیوەخانێ بابێ خۆت لۆ پیسکرد بە خینندا: بابە ئەتوو نزانی ئەمن دەمرم ئەمان پاشی من هەتا دنیامایە و خراپە بی دێ و دەچیتن هەر چی ئەو بەحسێ ئێ من و میرۆی بگێڕتەوە حەموو کەس پیاوەتیی من ئەرێ نا پیاوتیێ ئەو ئەرێ، کە توو دەزانی چی لەمن کردییە، ئەوە مەرحەمێ ڕەشی هینایە لەسە برینێ منی دانا، برینێ منی وەکی تیزابێ هەموو تاواندەوە، گۆتی: بابە خەبەرەکم لۆ بدە ماڕێ بێنە کنم. فەرحۆی گۆتی: ئەگە هاوارکەم ئەلحانەکە برێم چەتۆ مرد وەرن هەموو لەخۆ چن ئەوانیش ئەمرن.

فەرحۆی گۆتی: شیرن کیژم هەندەک ئاوێ بینە لۆ چەتۆی بخواتەوە تێنیتی، ئەوجە دەرێ شیرین هەندەک ئاوی هینا لۆ چەتۆی کە بخوانەوە. دەرێ چەتۆش ئاوەکەی لێ وەرگرت خواردییەوە. گۆتی: شیرین بانگی مستێ ی کوڕم کە بینێ لەسەر پشتێ تێلی عەیشانێ سواری کەن کاخۆ بزانم ئەگەر بمرم جێم چۆلە یان جێم چۆل نییە.

دەرێ مستێ یان هینا مستێ مندارۆکە بوو هێشتا بارق نەببوو، مستێ سواری وراغی بوو ئەسلەحەی حەربێشی لەخۆ بەست وەک برکی لەسەپشتێ وراغی خۆی چەقاند، داکی پێی گۆت: کوڕم لەبەر خاترێ بابت خۆبگرەو ئاگات لەخۆبی توندبەو گورج بە. وەک بروسکی لەسەر پشتێ وراغی دەهات و دەچوو هیچ دەلاش نەهات، دوو، سێ سەران هات و چوو گەڕاو سوڕا، چەتۆ گۆتی: ئەگەر بشمرم ئەمن سوم لەخۆ نابیتەوە جێم چۆل نییە، ئەوجە دەرێ مستێ یان دابەزاندە خواری لەسە وراغی چەتۆش ئەمری هەقی تەسمیل کرد.

* * *

بەرێ مەنار مەنار مەنار باب خولام مەنار دە مەنار مەنار مەنار توو مەناریتە

ئاخ مەنار مەنار مەنار مەنار باب خولام مەنارینە

ئەوجە شیرنێ دگۆ: دەگەلی خانمان و خوشکان و خاتونان ئەنگۆ وەرن دانێن کەت کەتێ ناز بالیفان خۆش دەنە پارە

ئەما چما ئەنگۆ نزانن چەتۆیێ گران بابێ مستێ ئای بە جۆتە گوللەکێ قیرۆیێ قەچی سەباب لۆ بریندارە

ئەما مەنار مەنار مەنار باب خولام چەتۆ مەنارینە

لۆ مەنار مەنار مەنار باب خولام چەتۆ مانارینە

ئەمە سێ زەریێ تاقێ لەپشت سەرێ توو دانیشتینە

ئەمان یێکەکیان لۆ خوبییە

یێکەکیان لۆ میسلی خانە، یێکەکیان شیرنێ وێ پسمامێ (۲) خۆتە بتەمامییە

ئەوجە ئەورۆکە توو مەنار باب خولام مەنارینە

ئەوە چەتۆ دەعوایێ تاسەکێ ئاوێ سۆزانێ سارد و زولال کردینە

دە هەتا تاسێ ئاوێ هاتن ئاغایێ گران روحێ شیرین تەسمیل کردینە

ئەما مەنار مەنار مەنار مەنار باب خولام مەنارینە

ولاە ئەورۆکە سێ خانمێ سێ زەری یان بێ خودان لە قەسری دانیشتینە

* * *

ئەم لاوکەی چەتۆ لاوک بێژ قادر مستەفا هیرانی لای کاک عبدولەتیف خاوەنی کۆگای عبدولەتیف لە هەولێر تۆماری کردووەو لاوک بێژەکەی خەلکی خۆشناوەتییە و شیوەی بەندەکانی زۆر بەلای شیوەی خۆشناوەتی دا گۆڕیوە، دەنا لاوک شیوەی تایبەتی خۆی هەیە کە شیوەی بادینییە. ڕووداوی لاوکەکەش شتی کەم و زیادی تێدا هەیە کە لەگەڵ لاوکەکانی دیکەی چەتۆ یەک ناگرێتەوە. بەڵام لەبەر ئەوە نووسیومەتەوە چونکە زۆر گرنکی بەسوار چاکییەکەی داوەو بەدرێژی باسی کردووە.

ئەگینا لەبۆ شێوەو ئاوازی لاوک چەند بەندێکم لەلاوکی

چەتۆ لەمام یوسف ئاغای شێخ بزینی بیستووە کە بەتەواوی دەقی بەندەکانی لەسەر شێوەی لاوکی رەسەن و ئاوازی لاوکی بەتەواوی تێدایە کە نموونەی سەرکەوتووی لاوکن. لەبەر ئەوەی دیوەخانەکەیان لەمێژە جێگای لاوک گوتن و رابواردنی شەوانی درێژی زستان بوو بەگوێ گرتن لە لاوک و باسی رابردووی کوردەواری و گەورە پیاوانی و زۆر لەلاوکبێژە بەناوبانگەکان لەدیوەخانی کەوروگوسک لاوکیان گوتووە وەکو: حەسۆ، حەمۆ سەیدۆ، عەبدوللا وەسمان، جەمیلە کوڕ،... هتد. و مام یوسف ئاغا زۆر ئارەزووی لەم جۆرە دانیشتن و شەورابواردنە بەم باس و گێڕانەوەی رابووردووی کوردەواری هەبوو، توانایێکی زۆریشی هەبوو بۆ لەبەر کردنی لاوک و ئاوازەکانی، کە کەم کەس هەیە ئێستا بتوانی ئاوازی لاوکەکانی ئەو بلێتەوە - کەلەم چەند بەندەی خوارەوە لەلاوکی چەتۆ دەردەکەوێ:-

سوارە لمالا بابێ منڕا سواربوو سوارەکا تەرلان و تەڕی

من گوت بەرێ وی سوارێ هەڕتە سەر داوەتان و کێف و خۆشی یان، من نزانی قەزای بەرێ باوێ مستێ کشاندە سەر قەوغان و شەڕی

لەیدانێ عەولی بشارێ شەیباغانە سەریشتێ مەعنەگا هەلانی.

چەرخێ دوماکێ دا قیرۆی کوڕێ مامێ قەنکێ دا دفەتلی.

مامک دگۆ لاوۆ چەتۆ منێ حەفت سالان قاوێ بابێ توو کەلاندییە.

منی توێ ببازێ خۆڕا مەزن کرییە

ژنێ دمن جوانن و بچوۆکێ من زارونن، گەر توو بێ و من بکوژی لەو دنیاو لەو دنیایێ پێ ببنە عادوێ سەرێ توو بعەینییە.

باوڕی یا بابێ مستێ پێ هات پشتێ خۆلێ کرد بەرێ خۆ لێ گهۆڕی.

بلا مامکێ قیرۆیێ خێرێ نەبیتی لپاشڕا بێناموسی دەست هاوێتە کەتەکێ قەرەبینایێ بدەرمانێ ئەستەمبولێ داگرتی، بێناموسی دپاشڕا لکافکا حەیاسێ بابێ مستێ بکار کرد، دەرمان برساسەوە بردە کزەب و جگەرێ پێکەوە دورخان کری.

چەرخێ دوماکێ قیرۆیێ مامکێ قەنکێ دادفەتلی.

گۆ بلا بسەرێ توو بن قوران و هەڕی

حەفت تەبەتا بچییە عەرد حەفتا بچییە عاسمانان، لبە نسێری یا حەربێ دەرناچی و نابی هەڕی

ئادێ خودێ ئەوبی توو بکوژم، بسەلامەتی جارتر دەرنەکەوی لوێ شەڕی

نسێریا حەربێ دقۆلنجا مامکی قیرۆیێ بکار کرد، سێ قەد قایشا کۆسەرا مێردین لبن زگێ هەسپا هەلدبری.

وێلی ئای وێلی وێلی ویلی.

هەی وێلی هەی وێلی هەی وێلی.

بریندارۆ.

* * *

دلێ من دسوتێ مینا بوونا ئاگرا کولا وێ هێتونی

هنگێ دبێژن چەتۆ مرییە، قنج ئەوە بچین لکاولا فەرحۆ دابەستینە دوو باری شوونێ.

ناوەلا هنگێ دبێژن ببرینە، قنج ئەوە جارەکێ بچینە سەرینێ.

فەرحۆی دگۆ: رەسولاغە [3] مێوان گەلەکا مەکروم و عەزیزن، ئاگرا جگەرێش ئاگرەکا قەوی گەرمە، قنجە ئیزنێ من بدەن بدیاری چادرا بابێ مستێ بکەوم بزانم حالێ کوڕێ خۆ ببینم.

کەفیکا شوغلێ حەلەبێ لدەستێ فەرحۆی بوو، بدیاری چادرا بابێ مستێ دا کەتییە، دێنا خۆ دکا باوێ مستێ دەستەکا خۆی داناتینا یێدی حش دکا فەرحۆی دگۆ: لاوۆ چەتۆ برینێ توو چەهودنە.

گۆ: یابە دلێ من گەلە سەغلەتە لەبەر وەجعا وێ برینێ، قەلونکێ ژمنڕا داگرە مژغولیا قەلبێ خۆ بدمە سەر دارا وێ قەلونێ.

فەرحۆ بدلەکا کول و بربندار و بتلییەکا زەری زەیتونی قەلونی لبابێ مستێ را هانینە.

قەلون بچ نیشانە.

باسکی یاسەمانە.

مودمی ئەستەمبۆلی زێر نیشانە.

توتنێ جەبەلی تێدانە.

پولکێ دارێ داربەڕوێ بەمشارێ براندی.

بکێرێ قورساندی.

بگازێ هەلگرت و لسەر دانا مۆدمێ کەهرەب دخیتنە بەر سمبێلا زەری سوسنی، بابێ مستێ قوڕپچما ژقەلونا دداو قەلون دادکشینە.

فەرحۆ رابووە بدیاری عێلێ سناندا کەتییە، گۆ: گەلی پیرەکا بلەیزین، شەتاوێ دارێ رمان لبن کەزیێ فیزان و ژناندا بشدین.

هەنگین دارێ رمان هەلین.

هەتا حەفت رمان لبن کەزیێ قیزان و ژنان دا دەشکەنین.

شریتێ کۆنا ببرن روێ گۆنا لعەردێ کەمن.

گەلی پیرەکا ما هنگ نزانن تازیانا باوێ مستێیە.

گەرەم پیرێ سینان دهاتن گۆتن فارۆ خێر بێژە بلا خێر بێتە رێ یێ تە، نوینا باوێ مستێ نوینا خێرییە.

دکەم و سەر خاترا دلێ تە ناپرا یابۆ.

گۆ: گەلی پیرەکا من بچاوێ سەرێ خۆ دیت ژ برینا باوێ مستێ دا دەردەکەوا دوخانا وێ قەلونێ

وێلی و ئای دوێلی وێلی وێلی.

هەی وێلی هەی وێلی هەی وێلی.

بریندارۆ.

* * *

دگۆ لۆ وەی لۆلۆ وەی لۆلۆ.

هاتی تاوەکی بارانێ نیسانێ برشێنی

گرتە سەرێ سێمدێت رەنگین و حامۆدی دقۆریان، برەک مالێ ناغە لەێتمە بەکرانیان وا لپێشی.

فەرحۆ بجەلەوا هێستری میرۆیێ حەکیم دادچوو دگۆ: حەکیم لبەختێتە دانم حەقێ توو نەبدلێ تووە چاوا توو بسە برینا باوێ مستێ دامەرێ.

گۆ: ناوەلا فارۆ بدینا من بدیناتە، بدینا عیسایێ نوورانی، بدینا نەبی محەمەد، حەقێ من بدلێ منە، هەر چەندی دەرمانا داوێیە برینا باوێ مستێ دبێ حەکیم برینا من بدەرمانێ توو قەنابیشی.

وێلی وَ ئای دوێلی وێلی وێلی.

هەی وێلی هەی وێلی هەی وێلی هەی وێلی.

بریندارۆ.

* * *

فەرحۆی عوزێراغە داد هات گۆ:

هەمێ سەد جارا بمرا هەمێ

هاتمە بەر وێ کولێ بەر وێ دەردێ هاوار بابۆ کوو هاتمە بەر وێ سەددەمێ

بەشێ مەندوحا تلۆیێ لکوشتنێ میرا ئیدی من تۆبەکر، چەتۆ کوو بناخیری عومری دەستێ باوێ خۆ بمیارا خەلکی جارتر شداندنە سەر دارێ کورتە رمێ.

مەنالینە.

میر چاکۆ مەنالینە.

کول مالۆ مەنالینە.

بەسە رۆنتکا بەسەر روکێ زەری و ئەسمەرێ سیناندا مەبارینە.

بەینێ مەو بەشارێ ئاغایێ شێخ دۆدا، ئای لێ لاوۆ لێ لاوۆ ئای لێ لاوۆ لێ لاوۆ، ئای برا رەببێ مەکەریمە.

* * *

دگۆ لێ لاوۆ، ئای لێ لاوۆ لێ لاوۆ، ئای لێ لاوۆ لێ لاوۆ، لێ لاوۆ چەتۆ لاوۆ.

شیرنێ مالادا دهات دگۆ: چەتۆ، کەوەک باما لکەوێ پرێ وێ رەباتێ.

- من دی داربەستێ باوی مستێ لپرێ باتمانێ دەرباز بوو، گریدانا وی داربەستێ دۆخ هەوسارێ هەسپا بوو، پێدادانا وی داربەستێ عەورانییێ سوارا بوو بەرەو مال تێ.

ئافەرحۆیێ عوزێراغە حەفت کور هەنە، ناچن خینێ بابێ مستێ هەلین، هەر هەندە دزانن هنگێ دبێژن شیرنێ دێرانیی رابە دەرکەوە سەر میراتێ.

مەنالینە.

میرچاکۆ مەنالینە.

کول مالۆ مەنالینە.

بەسە رۆنتکا بەسەر روکێ زەری و ئەسمەرێ سیناندا مەبارینە.

بەینێ مەو بەشارێ شەیباناغە ئاغایێ شێخ دۆدا، ئای لێ لاوۆ لێ لاوۆ، ئای لێ لاوۆ لێ لاوۆ، ئای برا رەەببێ مە کەریمە.

* * *

ئای لێ لاوۆ، شینێ مالادا دهات دگۆ: چەتۆ، ئەز کەوەک باما لکەوێ پرێ وێ باتمانێ.

ناوەلا گولەک باما لگولێ زۆقێ فەتاح بەک لوانی محەمەدی، بکۆچەرێ سیناندا بچووباینا سەرە دێ وێ زۆزانێ.

ناوەلا لگەرێ دیلانێ.

لحاویا گووەندێ بکەتباما بەر سەرێ گەژێ بابێ مستێ، ئای لێ لاوۆ لێ لاوۆ، ئای لێ لاوۆ لێ لاوۆ،

ناوەلا بەر فترانا شعرا گرێدانێ.

ئای مەنال.

عەزیزۆ مەنال.

لحێفا بینن بالگیها بدەن بەرپال.

داخوازیکا بابێ مستێ ترارەک ئاو لئاوێ کانیێ سینویێ، لسەرە دێ زۆزانا ژێری دلێ لاوێ لئاویێ سار.

ئەمن لژێررا هانی عەیلا لمن رەبەنێ کوو تیرژێ نەخوار.

ما نە بابێ مستێ نەخۆشە لناو نوینانە، ئای لێ لاوۆ لێ لاوۆ، ئای کولێ جەمیانە هۆگر و هەوال.

* * *

ئای دگۆ لێ لاوۆ، ئای لێ لاوۆ لێ لاوۆ، لێ لاوۆ لێ لاوۆ.

وێ فەلەکێ وێ قۆلەسزێ سالی ئەوسال کوو دمەی یان دای.

ئەمن دیبوو سەحەرێ سبێدێ داربەستا بابێ مستێ لپرێ باتمانێ دەرباز بووی.

پێدادانا وی داربەستێ عەورانی ێ سوارا بووی.

گرێدانا وی داربەستێ دۆخ هەوسارێ هەسپا بووی.

هاوار بابۆ کوو دمە دیار دای

برینێ بابێ مستێ بەر بخێر بووی.

بلا لهەردووک چاوا کۆرەبم، ئای لێ لاوۆ لێ لاوۆ، ئای لێ لاوۆ لێ لاوۆ کوو بفنجانەکا قاوێ ژاندای

ئێ دەمەنال مەنالینە.

بەسە رۆنتکێ بسە روکێ زەری و ئەسمەرێ سیناندا مەبارینە.

بەینێ مەو بەشارێ شەیباناغە، لێ لاوۆ لێ لاوۆ، ئای برا رەببێ مە کەریمە.

* * *

دگۆ لێ لاوۆ، ئای لێ لاوۆ لێ لاوۆ، ئای لێ لاوۆ لێ لاوۆ لێ لاوۆ چەتۆ لاوۆ.

زەریێ سینان دادهاتن دگۆتن: چەتۆ، گوتیا باوی مستێ چل و سێ نە.

لگەریێ دیلانێ و دوحاوی یا گۆوەندێ بسەر ئەنی و خالا گەردەنێدا دچن و دێنە.

ئای لێ لاوۆ، ئای لێ لاوۆ لێ لاوۆ، حەیفێ من دەمینێ پاشمێرێتە خولامن، ئای رۆژا تول و تەنگاوێ ی خولام لتەرا کورێ دخەلکینە.

مەنال، میرچاکۆ مەنال، چەلەنگۆ مەنال.

لحێفا بینن بالگیها بدەن بەر پال.

داخوازیکا بابێ مستێ ترارەک ئاو لئاوێ کانی ێ سینۆیێ، ئلسەرەدێ زۆزانا ژێری دلێلاوێ لئاوێ سار.

ئەمن ژێررا هانی عەیلا من ردبەنێ کوو تێر ژی نەخوار

* * *

ئای لێ لاوۆ لێ لاوۆ، ئای لێ لاوۆ لێ لاوۆ

لێ لاوۆ چەتۆ لاوۆ

چل و چارە بزاوێ سەحەرێ سبێ لحاویا گۆوەندێ بسەر ئەنیاندا دێنە خوارە.

ئەمن گۆ حەیفە هاتە کوشتن بابێ مستێ ئلوەرتێ مەیدانێ، ئۆف پاشمێرێتە خولامن، ئای لێ لاوۆ لێ لاوۆ، برا رۆژا تۆل و تەنگاویێ خولام لتەرا هەر نەیارە.

مەنالینە، میرچاکۆ مەنالینە.

بەسە رۆنتکا بسە روکێ زەری و ئەسمەرێ سیئاندا ببارینە.

بەینێ مەو بەشارێ شەیباغانە، ئای لێ لاوۆ لێ لاوۆ، برا رەببێ مە کەریمە.

(١) پسمام: راست نییە، چونکە، کور پسمامە، دەبوا بلێ دۆتمام.

(١) ئەم دوو دێرە دوا بەندن، لە کۆتایی هەر بەندێکدا دووبارە دەکرێنەوە و لەهەموو بەندەکاندا هەیە بەڵێم من تەنیا لەم بەنددا نووسیومەتەوە.

(٢) پسمام هەڵەیە. راستەکەی دۆتمامە.

(١) بەراستی کاک عبدولەتیف هاوبەشی یەکی باشی کردووە لە ژیاندنەوەی کەلەپووری کوردەواری، کە گۆرانی و بەستە و لاوک و حەیران و بەیت و مقامی زۆر لەشایەر و لاوک بێژ و حەیران بێژو مقام بێژو گۆرانی بێژەکانی کوردی تۆمار کردووەو زۆر بەدوایاندا گەڕاوەو ماندوو بووە. لەم پێنج لاوکەی کە من نووسیومەتەوە لەم کتێبەدا تەنیا ئەو چەند بەندەی لاوکی چەتۆ کە بۆ نموونە لەدوای لاوکی چەتۆدا نووسراوەتەوە لای ئەو تۆمار نەکراون، چونکە لاوک بێژەکە رێگای ئەوەی نەداوە دەنگی تۆمار بکرێ و خەڵکی دیکە لەسەری تۆمار بکاتەوە.

(٣) رەسولاغەی بانۆکان: خەزوری چەتۆیە، باوکی شیرینی هاوسەری چەتۆیە.

* لەکتێبی (سوار چاکی لە لاوکی کوردەواری دا)

(شێوازێکی تێکەڵە لە نێوان شێوەی بۆتانی و شێوەزاری هەولێریدا)

– کۆ کردنەوەی: محەمەد کەریم شەریف

# لاوکی لاس و خەزاڵ*

**گوتنی: قادر خۆخێ**
**بەشێوازی دەشتی هەولێر**

رەبی ئەوی ئەمن دیتم لە دنیایێدا قەت نەبینی بە چاوییە
دەرێ عومری بابی تۆ دەرۆیی لۆ حەڤدە هەژدە سارییە
رۆژەکی لە رۆژان دەرم دەکێشا بۆرەی خار خارییە
دوو تاژیم لەرستێ کردییە
ئەمن راوێ خۆم دادەبەخشی لە کەندی بەر ماران
کێروشکەکی مارویران گەرمەلانی لەبابی تو گرتییە
بەرامبەری کێروشکی مارویران هەروەستەم کردییە
وەکی زەینم دەدایێ سوارەکی رەشی عەبەنوسییە
هەموو ئەسلەحەی لە رەشی
ئەوجا لەپشترا سەلامی لە بابێ تۆ کردی
دەیگۆ رەبی مارت ویران بی ئەحمەد بەگی شارەزوورییە
قەت شەرمت بەخۆ نییە
راوێ خۆت بەسەر کێروشکێ عەمر نەمای لەدنیایێدا بەخشییە
کێروشکی عەمر نەمای لەبۆ عەگیدان چییە
ئەگەر ئەتوو کەیفت راووشکارێ دەینی
رووی خۆت بدە دەشتێ سروتێ
راوی خو دابەخشە بەسەر کاران و کار غەزالان
چەندە شیرین وا دەقۆرن لەدو داکێ
دەرێ رۆرە لاسە وەکی ئاورم دەداوە
چل سوار لەپشت بابێ تودانی
ئەمن هەر لەوێرا راوی کێروشکێ عەمر نەمام تەرک کردییە

جرەوی مارویرانم شرکاندییە
سەبر سەبر شلم دەکرد دەرۆییمە خوارێ
بەناو عارەب و عروبێ بەسەر دەشتێ سروتێم دا رۆنییە
چەند شەوو رۆژان لەچۆل و بەرپاو بیابانێ
رۆژەکی لەرۆژان تازە گەزەنگی رۆژێ لە بابێ تو هەراتییە
وەکی زەینم دەدایێ تۆزو غوبار و گەردەلوولە
بەری عاسمانێ لە دەشتێ سروتێ گرتی
وەکی لەوان نێزیک دەبووم زەینم دەدایێ
پێنجسەد عەگیدی عارەبی
هەموو جلەی داودێ لەسەر شانییە
هەموو شیر و روتەی گورگانی بەدەست وەرگرتییە
هەموو رمی لە تەنکێشی وراغی
بەو پێنجسەد عەگیدەی دەورەی کەرە غەزالەکی مارویرانیان گرتییە
لەبەینی خۆ تەگبیریان کردییە
ئەو کەرە غەزالە لەبەینی کێ دەرچیتێ لەناوەندی مەیدانێ
ئەوجا مارویران دەبی بستە دوێ
تا کەرە غەزالی دەگری دەینیتەوە لە بۆ شێخی بە سەلامەتییە
دەرێ وەکی کەرە غەزالی مارویران لەناوەندی عەگیدێ عارەبی
رەبی مارت ویران بی رۆرە لاسە

چاوی بەتاقە سوار و بەمن كەتییە
دەرێ لەناوەندی سواران دەردەپەڕی رووی خۆی لەمن كردییە
ئەمن جۆتە تاژیم بەردەدا دو كەرە غەزالی ماروێران
لەدەشتێ سروتێ پێنجسەد عەگیدێ عارەبی
هۆسەی لێدەدا لەدو بابێ تو رێزەیان كردییە
ئەوجا دەرێ مدەی یەک سەعاتی
وەكی ئاورم دەداوە تۆزی بابی تویان نەشكاندییە
ئەوجا دەرێ جۆتە تاژی وەكی كەرە غەزالیان لەعەردی گیر كردییە
هاتمە خوارێ لەسەر پشتی بۆرەی ماروێران
سەرێ غەزالێم بڕی
وەكی واورم دەداوە قەرە رەشمارەكی گەلە گەلە گەورە
لەبابێ تولەسە بستێ بەدەركەتییە
ئەوجا دەرێ رەبی مارت وێران بی
دەرێ چارپەلی كەرە غەزالێم بەدەست وەگرت
بەدەستێ راستەم هەرگرتییە
بەدەستێ چۆپە جرەوی بۆردم رادەكێشا
سەبر سەبر لەبۆ قەرە رەشمارێ سەگردییە
كە نێزیک دەبووم لە قەرە رەشمارێ وەكی زەینم دەدایێ
كیژەكێ عارەبی لەبەر دەركەی رەشمارێ هەروەستەی كردییە
كراسەكی رەشی عەبەنووسی لەبەر خۆكردییە
كەمەرەكی زێڕی ئەونێک ئەونێک كردییە
رەبی ماری ئەو كیژەی وێران بی
هەر بەوێ دەمێ
ئەمن چاوی ئەو كەرە غەزالە ماروێرانەم بەو كیژەی شپاندییە
ئەوجا دەرێ رۆژە لاسە
وەكی كەرە غەزالی مروێرانم لەكن كیژێ بابە شێخی لەعەردی گیر كردییە
ئەمن سەلامم لەكیژەی كردییە
دەرێ سەلامی لەمن وەردەگرتەوە بەعارەبی
بەران زمانم نەدەزانی بەراستی
ئەوجا دەرێ كیژێ ماروێران
بەدەستی ئیشارەتی دیوانێ بابی خۆی لەبۆ من كردییە
ئەمن كە دەگەیشتمە دەركێ دیوانێ
سەلامم لەدیوانێ كردی
چەند نەفەرێ شێخی عارەبان دانیشتیە
ئەوجا دەرێ بابەشێخی عارەبان
وەكی لەبنەبانێ چاوی بەمن كەت و لەجێوە برند دەبوو هاواری كردییە
دەرێ رەبی بەخێر بێی شۆڕەسواری كوردییە
قەت مێوانی وەكی تۆم خۆشەویست لەدنیایێدا نەدیتی
دادەنیشتم لە بنەبانێ دیوانێ عارەبی
ئەوجا دەرێ مارت وێران بی
بابە شێخ بەخۆی فنجانێ قاوەی لەبۆمن راگرتی
بەران لە باووباپیرێ خۆم زانییە
ئەگەر عاردب زەفەر بەپیاوی نەبەن لە مەیدانێ
بە زەبری دارە رمی دەیگرن لە ناوەندێ دیوانێ بە یەخسیری
ئەگەر بڕوا دەكەی رۆژە لاسە
بەو خالیقەی لە ژۆری سەرییە
ئەمن دەستی راستەم لەسەر قەفزەی شیری ماروێران هەرنەگرتی
دەرێ رۆژە لاسە
بەرێ رەبی ئەوی ئەمن دیتیتم لە دنیایێدا قەت نەبینی بەچاوی
دادەنیشم لە دیوانێ بابەشێخی
ئەوجا دەرێ هەندەی پێ نەدەچوو
ئەو پێنجسەت عەگیدەی لە دەشتێ سروتێ
كەرە غەزالم لەوان رفاندییە
هەر پێنجسەتی دەورەی عوربانێ بابەشێخی گرتی
دوو سوار رووی خۆیان لەمارێ بابەشێخی كردییە
تیرەگەی راستێیان بەسەر چۆپێدا هێنا خوارێ
تێكیان دەدا بە یەكجاری
ئەوجا دەرێ حوربانێ بابەشێخی
دەكەوتە زەقزەقەو هۆشی لەبەدا نییە
دەرێ وەكی دەهاتن دوو سوار لەبۆ دەركەی دیوانێ
لەباتی سەلام و كەلامیان لەبابەشێخی نەكردییە
لێی بەجواب هاتییە
ئەرێ دەرێ كورە مارت وێران بی كەنگێت وەلێ هاتییە
ئەتو كەرە غەزالێت لە دەشتی سروتێ لەمە رفاندییە
لەناو پێنجسەد عەگید و شەمەڕان بە زەبرێ دارێ

رمییە
ئەگەر کەرە غەزالمان نەدەیەوە لە دنیایێدا بەسەلامەتییە
ئەلعان مار و مندارت دەبەین بە زەبرێ دارێ رمی هەر
بە یەخسیرییە
سەرێ تو دەکەینە توزێ عەردییە
ئەرێ دەرێ رۆرە لاسە رەبی مارت وێران بی
رەبی ئەوی ئەمن دیتیتم لە دنیاییێدا قەت نەبینی بە
چاوییە
ئەمنیش وا دانیشتیمە لە دیوانێ بابەشێخییە
بەران بەگێیان گێم لێم راگرتییە
بەچاوان چاوم لێ کردییە
ئەوجا دەرێ رۆرە لاسە وەکی زەینم دەدایێ
کیژێ بابەشێخی سەبر سەبر لەبۆ دەرگەی دیوانی بابی
هات و
هاواری کرد و فرمێسکی لەچاوی دەهاتە خوارێ
بەسەر رووومەتی سۆری گور گورییە
دنیا لەبابی تو وێران بی و چاوم عەردی نەدیت و
لەمن وابی دنیا کەسی تێدا نییە
ئەرێ دەرێ کیژێ بابەشێخی هاواری کردییە
ئەرێ دەرێ کورە بابە
مادام غیرەتی مێران و لەبەدەنێدا نەبوو
ئەو قاوە خواردنەوەو لە دیوانێ لەبۆ چییە
ئەوە تیرگەی رەشماری لایێ راستیان هینا خوارێ
بەسەر چۆپی
وا مار و مندارن دەبەن بە زەبرێ دارێ رمی هەر بە
یەخسیرییە
ئەتو دانیشتی لە ناوەندێ دیوانێ لۆ خوێت وەلێکردییە؟
ئەوجا دەرێ رۆرە لاسە
بابە شێخی مارویران لەکیژێ بەجواب هاتییە
ئەوجا دەرێ رۆرە ئەگەر بروا دەکەی بەو خالیقەی لە
رۆژی سەرییە
ئەمن چم پێ ناکرێ لەگەر پێنجسەد عەگیدێ عارەبی
حەمو زرێ داودی لەسەر شانییە
حەمو شیر و روتەی گورگانی بەدەست وەگرتییە
حەمو رمێ لە تەنکێشی وراغی
ئەگەر مار و مندارێشم ببەن بە زەبری دارێ رمییە
ئەگەر سەرێ منیش لەناوەندێ دیوانێ ببرن بەرووەو
کافرستانییە
ئەوجا دەرێ رۆرە لاسە رەبی مارت وێران بی
رەبی ئەوی ئەمن دیتیتم لە دنیاییێدا قەت نەبینی
بەچاوییە
ئەوجا ئەوێ دەمێ کیژێ بابەشێخی
فرمێسکی بەچاویدا دەهاتە خوارێ دەگەراوە لۆ قەرە
رەشمارێ سەر گردییە
بەوێ دەمێ فکرم لەخۆ کردییە
دەمگۆ رەبی عەمرت نەمینێ ئەحمەد بەگی شارەزوورییە
لەبۆ کەنگینێ چاوی خۆت لە دیوانێ بابە شێخی مات
کردییە
ئەو گێچەرە ئەتو بەسەر بابەشێخی مارویرانت وەکردییە
بابەشێخ ئاگای لێ نییە
دەرێ رۆرە لاسە
رەبی ئەوی ئەمن دیتیتم لە دنیاییێدا قەت نەبینی بە
چاوییە
ئەوجا بەوێ دەمێ فکرم لەبەر خۆ کردییە
دەمگۆ رەبی مارت وێران بی ئەحمەد بەگی
شارەزوورییە
ئێران و تورانت کاول کردییە
بە زەبری دارێ رمی لەتەماعی دنیایێ چیدیت لەبۆ
نییە
لەبۆ کەنگینێ خۆ راگرتییە
دەرێ بەوی دەمێ تەلەبی بۆرەی ماروێرانم لە بابە
شێخی کردییە
بابەشێخ برند دەبوو سێ جاران نێوچەوانی توی ماچ
کردییە
لەناوەندێ دیوانێ عارەبییە
ئەرێ دەرێ شۆرشەسواری کوردییە
رەبی سەری بابەشێخت ببی بە قوربانی سەرییە
ئەتو سوار مەبە لە بۆرەی
چت پێناکرێ لەگە پێنجسەد عەگیدێ عارەبییە
حەمو زرێ داودی لەسەر شانییە
حەمو شیرەو روتەی گۆرگانی بەدەست وەرگرتییە
حەموی رمێ لە تەنکێشی وراغییە
با مار و مندارێ من ببەن بە زەبرێ داری رمی هەر بە
یێکجاری و

بە یەخسیرییە
با سەرێ من ببڕنلە ناوەندێ دیوانێ
بەرانەکونێ ماروێران ئەتو مێوانی
لەبۆ مێوانێ لەدنیایێدا چ نییە
ئەوجا دەرێ ماروێران لە بابەشێخم قبور نەکردییە
کە بۆریەیان لەبۆ بابی تو لەبەر دەرکەی دیوانێ عارەبی راگرت و
پێم لە رکێبی بۆرەی ماروێران گیر کردییە
ئەگەر بڕوادەکەی رۆرە لاسە بەو خالیقەی لەژۆری سەری
ئەمن سێ سەران لە پێش قەرە رەشمارێ سەگردێ بابەشێخیدا
هات و چۆم کردییە
لۆیەم بوو چاوەکم بکەوێ بە چاوێ کیژێ بابەشێخی
ئەگەر بشکوژرێم تازە دنیا لەبۆ من چی تێدا نییە
ئەرێ دەرێ رۆرە لاسە
بەران رەبی ئەوی ئەمن دیتیتم لە دنیایێدا قەت نەبینی بەچاوییە
ئەوجا بەوێ دەمێ کیژێ بابەشێخی ماروێران
دەهاتە دەرێ لەبەر دەرکێ تاولێی ماروێران
بەران کراسەکی رەشی عەبەنووسی لەبەرەخۆ کردییە
کەمەرەکی زێڕی ئەونێک ئەونێک کردییە
دەتگۆ رۆژە لە برسان هەراتییە
رەبی ماری کیژی بابەشێخی وێران بی
بەندی درێ بابێ تو پسا لە ناوەندێ مەیدانێ هەر بە یەکجارییە
وەکی چاوم بەوەندەی کەتییە
ئەوجا کیژێ بابەشێخی ماروێران
چاوی چۆیەی لەمن قوچاند و چاوی راستەی برند کردییە
لەمن وابی دنیا نێری تێدا نییە
ئەرێ دەرێ رۆرە لاسە
تاوەکو ئەورۆ لەسەر جێ و بالینگانان لەداکێ خۆت نەزانی
ئەگەر بڕوا دەکەی بەو خالیقەی لە ژۆری سەرییە
وەکی بەناو حوربانێ عارەبی دەکەتم و
بەناو پێنجسەد عەگیدێ عارەبییە
بەمدەی دوو سەعاتان مارت وێران بی
پێنجسەد عەگیدێ عارەبیم پەرتان پێیێخستییە
ئەوی دەمگرت بە یێخسیری ئەوی فڕێم دەدا لەسەر خانەی زینییە
ئەوجا ئەوی دەشمگرت دەمهینا
لەپێش دەرگەی دیوانێ بابەشێخی هەر رامگرتییە بە یێخسیرییە
دەمگوت بابە شێخ وەرگرە ئەمانەتێ
لەشۆرەسوارێ کوردییە
دەرێ بابەشێخ لەناوەندێ دیوانێ بە پیرم وەهاتییە
جرەوی بۆرەی بەخۆ گرتییە
دەیهینا خوارێ لەسەر پشتی وراغییە
سێ جاران نیوچەوانی بابی توی لە ناوەندی دیوانێ ماچ کردییە
دایدەنام لە بنەبانێ دیوانێ
دەرێ رەبی بەخێرێ شۆرەسواری کوردییە
ئەوجا دەرێ رۆرە لاسە
بەران تیرێ واشقێ جەرگێ بابی توی بڕییە
هۆشم لەبەدەنێ خۆدا نییە
ئەوجا دەرێ پاش نوێژی نیوڕوانێ داهاتییە
ئەگەر بڕوا دەکەی رۆرە لاسە
دەمگۆ بابەشێخ ماینەکەم گەلە گەلە ماندییە گەلەکیشی تێنییە
رەبی ماری بابەشێخی وێران بی
لە وەلەکە عارەبانی قیراندییە
پازدە پازدە جرەوی بۆرەیان گرتییە
بیبەن لەبۆ سە کانییە
خۆ ئەمن لۆ ماین ئاودانێم نەبووە بیبەن لەبۆ سە کانییە
لۆیەم بوو بە خۆم بەشکو دەچوومە دەرێ
چاوەکم دەکەوی بە چاوی کیژێ بابەشێخی
ئەوجا لەسەر وانم رادەبارد
دەمگۆ بابەشێخ ئەوانە گەلەک ماینەکەم ماندی یەکەن
نازانن عادەتی ماینی من ئاو خواردنەوەی چییە
لەبۆ عەگیدان عەیبی تێدا نییە
ئەمن بەخۆ ماینی خۆم دەبەم لە بۆ سە کانییە
بابەشێخ دەرێ فەرموو شۆرەسواری جافییە
ئەوجا دەرێ رۆرە لاسە
وەکی جرەوی بۆرەی ماروێرانم رادەکێشا

بەرووتی لەبۆ سەکانی
ئەمن دەگەیشتمە سەکانی عارەبییە
وەکی زەینم دەدایێ چاوەکەم هەر لە قەرە رەشماری سەر گردییە
وەکی زەینم دەدایێ کیژێ بابەشێخی ماروێران
دەستی دەدا مەسینە و گوم گومەکی عارەبییە
سەبر سەبر شۆڕ دەبۆوە لەبۆ سە کانی
ئەوجا دەگەیشتە سەکانییە
دەمگۆ کیژێ بابەشێخی گەلە گەلە ماندیە گەلەکیشم تینییە
دەرێ کیژێ بابەشێخی ماروێران
لە ناوەندێ ئاوی کانیێ پڕ کردییە
جامەکی ئاوێی بە دەست و پەنجەی بە خەنان لە بۆ من راگرتییە
دەرێ فەرموو شۆرەسواری کوردی
ئەگەر ئاو قابیل بەتو نەبی لە دنیایێدا
قابیل بە کەس نییە
ئەوجا دەرێ رۆرە لاسە رەبی مارت وێرانت بی
رەبی ئەوی ئەمن دیتیتم لەدنیایێدا قەت نەبینی بەچاوی
بەران تەقدیری لەکن خوای بێ
بەتار بوونی لەدنیایێدا قەت لەبۆ نییە
ئەمن قومم لەبۆ ئاوێ بردییە
وەکی زەینم دەدایێ کیژێ بابەشێخی پشتی لە بابی تو کردییە
تەحریکی مێردان گەلە گەلە گرانە
بەران تەقدیری لەکن خودای بێ لە دنیایێ بەتار بوونی لۆ نییە
لەمن وابی ئەهمیەتی منی لەکن نییە
ئەمن لەدرێ خۆم فکرم کردییە
دەمگۆ پێنجسەد عەگیدێ عارەبیم
لەناوەندی مەیدانێ بەدوو سەعاتان فرێدا لەسە خانەی زینێ
بەزەبری داری رمی
ئەلعانیش کیژێ بابەشێخی
قومە ئاوەکی دایتە دەستەمن پشتی لەمن کردییە
دیارە ئەمنی بە چ تێنەگەییە
ئەوجا دەرێ وەی کیژێ بابە شێخییە
بەتوکەمە بەو خالیقی لەژۆر سەرییە
ئەگە بابی نەمداتێ بە پیاوەتی
شەرت بی رایکێشم بە زەبری دارێ رمی
بیبەمەوە ناو حوریانێ جافییە
بەران لەسەر جێو بالینگانان نێزیکی نەبم بە ژن و بەمێردایەتی
هەتا دۆخینی شەروار و دەرپێم نەکاتەوە
لە تۆرەی پشتی لە کانیێ لەمن کردییە
دەرێ رۆرە لاسە
رەبی ئەوی ئەمن دیتیتم لە دنیایێدا قەت نەبینی بە چاوییە
ئەمن دەگەڕامەوە لەبۆ حوریانێ بابەشێخییە
دادەنیشتم لە ناوەندێ دیوانێ
بەرانەکونێ بڕوا دەکەی بەو خالیقی لەژۆر سەرییە
فنجانێ قاوەی بابەشێخ بەدەستی خۆی لە بۆ من راگرتییە
ئەوجا سێ شەوو سێ رۆژان
دادەنیشتم لەناو دیوانێ بابەشێخی بە مێوانداریبە
چونکە عادەت لەناو عارەبان
سێ شەو و سێ رۆژان سوئال و جەواب نییە
ئەوجا رۆژی سێیەمینێ
دەمگۆ بابەشێخ بەو قودرەتی کەمە بەو خالیقێ لەژۆر سەرییە
ئەمن دوازدە هەزار ماری جافیم
بەبێ ئاغا و عەگید و جەبار بەجێ هێشتی
ئەوجا دەگەڕێمەوە لەبۆ ناو قەومی کوردی
دەرێ بابەشێخ دەچووە دەرێ گازی دیوانەی کردییە
ئەوجا راو تەگبیری لە عارەبێ قەومێ خۆ وەرگرتییە
چ قابیل بەو سوارەی دەبینێ لە دنیایێ
چاکەکی گەلە گەورەی لەگەمە کردی
ئەوجا دەیانگۆ بابە شێخ دیارە ئەو سوارە عەوجە بەماری دنیایێ نییە
ئەوجا بە زێڕ و زەبەن نییە
مادام لەتۆرەی ئەو چاکەی
ئەتو سەری چەند سارانە گوردکت هەیە لە باغێت راگرتییە

ئەو سوارەی قابیل بەو گورەیە قابیل بەکەسی دی نییە
ئەوجا دەرێ رۆرە لاسە رەبی مارت وێران بی
ئەگەر بڕوا دەکەی بەو خالیقەی لە ژۆری سەرییە
وەکی بابەشێخ دەهاتەوە لۆ ژۆرێ
زەینم دەدایێ مەلای لەگەرەخۆ دەست گرتییە
ئەوجا دەستی منی لەناو دەستی خۆ گیر کرد و
مەلا کیژەی لەمن مارە کردییە
ئەمن دەمگۆ وەی بابەشێخی حوربانییە
بەتوکەمە بەو خالیقەی لەژۆر سەرییە
ئەمن ئەلعان کیژێ تو نابەمەوە
لەبۆ ناو دوازدە هەزار ماری جافییە
کەس پێم بڕوا ناکا برێم کیژی بابەشێخییە
دەرێن داخوە کیژی کی حوشترەوانەکییە لە ئاقارێی رفاندییە
هینایتیەوە دەرێ کیژێ بابەشێخییە
ئەمن لەدوی دەنێرم پێنجسەد عەگیدێ جافییە
حەمو زرێی داودی لەسەر شانی بی
حەمو شیر و روتەی گورگانی لە تەنکێشی وراغی وەکردی
ئەمن لەدو وان بار دەکەم
پێنجسەد هێستری بارە باخەران لەبۆ حوربانێ بابەشێخییە
ئەوجا دەیبەمەوە ناو دوازدە هەزار ماری جافییە
ئەوجا دەرێ رۆرە لاسە
بەران رەبی ئەوی ئەمن دیتیتم لەدنیایدا قەت نەبینی بەچاوییە
وەکی وام بە باشی گوتییە ئەوجا بابەشێخ برند دەبوو
سێ جاران نیوچەوانی بابێ توی لەناوەندێ دیوانێ ماچ کردییە
گەلە گەلە کەیفی پێوە هاتییە
دەرێ رۆرە لاسە
بەران بڕوا دەکەی بەو خالیقەی لە ژۆری سەرییە
وەکی بەسە پشتی بۆرەی کەتم دو تاژیم لەرستێ کردییە
سەبر سەبر دەگەرامەوە لەبۆناو قەومی جافی
کە گەیشتمەوە ناو قەومی جافی
ئەگەر بڕوا دەکەی بەو خالیقەی لەژۆر سەری
رۆرە لاسە تیرێ واشقێ جەرگێ بابێ تۆی بری
هۆشم لە بەدەنێ خۆدا نییە
بەران عەکسی مێردان گەلە گەلە گرانە
تەقدیری لەکن خودای بی قەت بەتار بوونی لەبۆنییە
مدەی دوو ساران ئەمن وازم لە کیژێ بابەشێخی هێنا
نەقاقەزو نە قاسیدم لەبۆ نەناردییە

ئەوجا دەرێ رۆرە لاسە لێی گەرام سەری دوو ساران بەتەمامییە، وەکی دوو سارە بەتەمام بوو بەتەمامییە بە ئاشق لەبابی توکاری کردییە، دەرێ هەرستام دیسان جرەوی بۆرەم دەرکێشا، بەسە پشتی بۆرەی کەتم، دوو تاژیم لە رستێ کردییە، سەبر سەبر بەتاقە سواری بەرێکەتم گەرامەوە لۆناو حوربانێ عارەبی. دەرێ بەسەر دەشتێ سروتێ هاتمەوە لەبۆکن بابەشێخییە، دەرێ وەکی هاتمەوە لەبۆ کن بابەشێخییە، لەئاقاری چاویان بەمن کەتییە، دەرێ خەبەریان لۆ بابەشێخی بردییە، دەرێ کە گەیشتمە دەرکێ دیوانێ بابەشێخ لەبەرم برند بوو، دەرێ گۆتی دەک مارت وێران بی شۆرە سواری جافییە، لەبۆ عەگیدان عینادی لەدنیایێ گەلەک باش نییە، سەری دوو سارە گەڕایەوە ناو قەومی جافییە، قەت جارەکی قاسیدەک جوابەکی خۆت لە بۆ من نەناردییە، لەمن وابی داخوە چت بەسەر هاتییە لە دنیایێ. گۆتی لێمگەرێ بابەشێخ ئیشی من هەر ئەوهایە لەدنیایێ چیدی نییە، دەرێ زۆرە دانیشتم لەدیوانێ بابەشێخییە، مدەی سێ رۆژان بەمێواندرییە:

(( ئارێ... دەرێ وەکی سێ رۆژە تەمام بوو بە تەمامییە
ئەوجا دەرێ رۆرە لاسە
رەبی ئەوەی ئەمن دیتیتم لە دنیایێدا قەت نەبینی بەچاوییە
ئەوجا دەرێ رۆرە لاسە
دەگەڕامەوە لەبۆناو حوربانێ جافییە
دەرێ وەکی بەسەر پشتی بۆرەی مارویران کەتم
زەینم دەدایێ کیژێ بابەشێخییان
سواری کە وێتەکی قاپ رەشی بێ نیشان کردییە
ئەرێ دەرێ رۆرە لاسە
بەرانەکونێ لەدو منیان ناردییە
دەرێ وەکی دەچوینە دەرێ لەناو حوربانێ عارەبییە
ئەوجا دەرێ کیژێ بابەشێخی لەمن بەجواب دەهاتییە
دەرێ رەبی مارت وێران بی شۆرەسواری کوردییە

رەبی سەری ئافرەتانت بی بە قوربانی سەری
ئەتو سەری دوو سارانە گەڕایەوە لەبۆ ناو قەومی جافییە
قەت جارەکی لەجاران جوابەکت لەبۆمن نەناردییە
بەرانی عینادی لەبۆ پیاوان لە دنیایێدا گەلەک باش نییە
رەبی مارت وێران بی
ئەگەر دنیابوو قاسیدێ بابم لەدومە هاتی
تازە مەگەڕێوە لەبۆناو حوربانی عارەبییە
ئەوجە دەرێ لاسە
ئەوجە کیژێ بابەشێخیم دەیناوە لەبۆناو حوربانی جافییە
دەرێ یێکە و دوازدە جار ماری جافی
بەنۆبەت تەماشای کیژێ بابەشێخیان کردی
بەران دەتگۆ رۆژە لەبرستان هەراتییە
دەتگۆ مانگی چاردەیە لەبەری ئاسمانێ
ئەستێرە دەورەی لێ گرتییە
دەرێ رەبی ماری بابی وێران بی
ئەوجا دەرێ حەفت شەوو حەفت رۆژان
لێمدا لە دۆر و زوڕناو شایی و گۆوەند و
بەزم و سەیرانم لەناو دوازدە هەزار ماری جافی گێرایەتەوە
بەران وەکی کیژێ بابەشێخیان لەبۆمن دەبردە ژۆرێ
لەژۆرێیان کردییە دەچوومە کن کیژێ بابەشێخی
ئەگەر بروا دەکەی رۆرە لاسە
بەو خالیقەی لەژۆری سەری
ئەمن ئێوارێ پشتم لە کیژی بابەشێخی دەکرد و
کەلەکەم نەدەگۆری هەتا سبەینێ هەردەستام لەبۆ نوێژی،
چ جاران دەستەکم بەژن و مێرداتی درێژ نەکردییە)
سەری دوو ساران لەسە جێ و بالینگانەکی لەگەمن رابارد، ئەو ژنە جارەکی لەجاران ئاوڕەکم لێنەداوە، دوو گفتوگۆم لەگەر نەکردییە، دەرێ وەکی دوو سارە تەماو بوو بەتەمامییە، چی لەبابی تو چاو پێنەکەتییە، ژنە فکری کرد گۆتی دیارە بەنان و بەرگ ئەمنی هینایتە ناو قەومی جافییە، شەوەکی لە شەوان وەکی هەرستامەوە کیژێ بابەشێخی هینایتە ناو قەومی جافییە، شەوەکی لە شەوان وەکی هەرستامەوە کیژێ بابەشێخی نەمابوو، وەکی زەینم

دایێ، دەرێ کیژێ بابەشێخی گەڕاوە لەبۆ ناو حوربانی بابی خۆی رۆییە، بەچۆل و بەرپاو بیابانێ بەتاقی تەنێ هەتا دەگاتەوە ناو حوربانی بابییە.
( ئەوجا دەرێ
وەکی کیژێ بابەشێخی مارویران
شەوێ لەسێ باری شەوێدا
لەناو دوازدە هەزار مارە جافی رووی لە چۆل و بەرپاو بیابانێ کردییە
دەگەڕاوە لەبۆناو حوربانێ عارەبییە
ئاوجە دەرێ رۆرە لاسە
کە کیژێ بابەشێخی دەگەیشتەوە ناو حوربانێ عارەبی
عارەب بە پیلی وەهاتن و بابی لەدووڕا هاواری کردییە
دەیگۆ رۆرە دیارە ئەحمەد بەگی شارەزووری
نمایە لەدنیایێ لۆیە بەتاقی تەنێ رووی خۆت
لەچۆل و بەرپاو بیابانێ کرد و هاتییەوە ناو حوربانێ عارەبییە
ئەوجا کیژە دەستی بەگریان و فیغانێ کردی
ئەرێ دەرێ رەبی مارت وێران بی بابە
خۆتو ئەمنت نەدا ئەحمەد بەگی بەنان و بەشیوو بە بەرگییە
ئەگەر بروا دەکەی بابە بەو خالیقەی لە ژۆرێ سەرییە
سەری دوو سارانە لەگەمن لەسەرجێ و بالینگانەکی رابیاردییە
کەهێواری داهات لە بۆ نوستنێ
کەلەکەی خۆی نەدەگۆری هەتاکو سبەینێ هەردەستا لەبۆ نوێژێ
چ جاران گفتوگۆی لەگەر من نەکردی
چ جاران دەستەکی لەبۆمن درێژ نەکردی بەژن و مێردایەتییە
ئەوجا دەرێ بابە
سەرێ خۆم هەرگرت و هاتمەوە ناو حوربانێ عارەبییە
ئەرێ دەرێ رۆرە دانیشە عیلاجم نییە
دەرێ سەری دوو ساران ماوە کیژێ بابەشێخی
لە حوربانی عارەبی مارویران بە یاندییە
ئەوجا دەرێ رۆرە لاسە
بەران رەبی ئەوی ئەمن دیتیتم لەدنیایێ دا قەت نەبینی بە چاوییە

تیرێ واشقێ جەرگی بابێ توی بری
بەران قسەی پیاوان پێکەو لە دنیایێ
ئەگەر بەدوو بوو تامی لەبۆ نییە
سوندەکی گەلە گەورەم بە بەرردێ خۆدا واو هاتییە
ئەوجا دەرێ رۆرە لاسە
وەکی دوو سارە تەمام دەبوو بە تەمامی
ئەمن دەگەڕامەوە دیسان سوار دەبووم
لەبۆرەی خارخارێ دوو تاژیم لەرستەی کردییە
بەتاقە سواری سەبر سەبر دەهاتمە خوارێ بەسەر دەشتێ سروتێ
لە بۆ ناو حوربانێ عارەبییە)

کە کیژە دەگاتە ناو حوربانێ دەمینێتەوە، سارەک دوو ساران هەردستێ دەرێن بابە ئەحمەد بەگ پیاوەکی شەیتانە پیاوەکی شەڕکەرە، هەموو رۆژێ لەمەملەکەتانە خوا دەزانی کوژرایە: تازە وازی لە کیژی بابەشێخی هێنایە، هەرستا ئامۆزایەکی خۆی هەبوو لێی مارە کرد، شەوێ بووە دۆرو زوڕناو بەزم و سەیران. دەرێ هەرستا کیژێ بابەشێخییان لە ئامۆزای گۆزتەوە، دەرێ لێیدا لە شوقەیان کرد، شەوێ پاشی نوێژی عیشایێ ئامۆزا لێیدا لۆکن بووکێ چوو، شیری لەقەدی خۆ بەستییە، دەرێ وەکی گەیشتە دەرکەی رەشمارێ کردەوە، وەهای کردێ جورجەک لەو کونەی هاتە دەرێ، لو ئەو کونەی دەڕۆیی، دەرێ هەریکێشا شیری گوتی: ئامۆزا تەماشاکە هەر دەرتێ ئەحمەد بەگ عەگیدە، کابرایەکی کورد و هیچی کردییە؟. ئەمن بەو شەوەی نایەمە کنەتوو هەتا ئەو عەگیدی لەبن عەردی دەرنەینم لە بۆتۆ بەدیاری رانەگرم. دەرێ ئەگەر جورجی هات و چۆی دەکرد، هەر دڕەعەردی بینەو ببەو هەتا پێشی بەیانیان، دەرێ پێشی بەیانیان جورجی کوشت، بەسەری رمی وەکرد، هینای لەپێش کیژی بابەشێخی لەعەردی گیر کردو وەرگرە ئەو ئەماناتەی لە ئامۆزای خۆت ئەوجا بزانە ئامۆزای خۆت بناسە چتۆ عەگیدە، بنووسە بە عەگید، دەرێ ئەو دانیشت لەتەنیشتی کیژێ بابەشێخی دەستی دا مەسینەی هاتە دەرێ، دەرێ راست لۆ مارێ چۆوە دەرێ بابی گۆتی ها کیژم ئەوەش هەر نێر نەبوو؟ ئەوە چبوو؟ گۆتی بابە لێم گەڕێ لەپاشی ئەحمەد بەگی شارەزووری شەرتبی لەشەرتێ خودای مێرد لەمن حەرام بی لە دنیایێ، ئەو مار وێرانە لە نوێژی مەغریبێوە هاتییە، ئەوە بەیانی دا، لەگەڵ جورجەکی کەتە سەری مەیدانی، هەتا جورجی کوشتییە بەسەری رمی وەکردییە، هینایتی لەپێشەمن رایگرتییە، دەرێ وەرگرە ئەو ئەمانەتەی لە ئامۆزای، ئەمن ئەو مێردەی چ لێ بکەم، گۆتی دانیشە کیژم عیلاجم نییە. دەرێ دانیشت کیژە دەرێ رۆرە لاسە ئەوجا دوو سارە پێچوو بەتەمامییە، سواری بۆرەی خار خار بووم هاتمە خوارێ بەسەر دەشتێ سروتێ، سەبر سەبر دوو تاژیم لەرستێ کردییە، هاتمە خوارێ لە بۆ حوربانی بابەشێخییە، دەرێ وەکی نێزیک بووم لە حوربانێ بابەشێخی. شوان و گاوان هەرچی چاوی بەمن دەکەن، پشتی لەپاش دەکرد و دیار بوو دەمزانی توورە بوونە بەتەمامییە. دەرێ عیلاجم نەبوو لێمدا لۆ دەرکێ رەشمارێ رۆیشتم.

(ئای.... وەواو... واو... واو... واو... وای
رەبی ئەوەی ئەمن دیتیتم لە دنیایێدا قەت نەبینی بەچاوییە
کە گەیشتمە دەرکێ دیوانێ عارەبییە
ئەمن بەدەستی ئیشارەتێ سەلامێم کردییە
کەس لەجێی خۆ برند نەبوو سەلامی لەبابی تو وەرگرتەوە بەراستییە
کەس جرەوی بۆرەیێ بابی تو لە بەردەرکەی دیوانێ نەگرتییە
بابەشێخ لەجێی خۆ خۆی نەجولاندی
ئەوجا دەرێ وەکی وامزانی
ئەگەر بروا دەکەی بەو خالیقی لە ژۆرێ سەرییە
دونیا لەپێش چاوی بابی تو تاریک داهات و
هۆشم لەبەدەنێ خۆدانی
ئەمن هەردەمدەکێشا شیری رووتەی گورگانییە
رستەکەی رەشماری دیوانێم هەردەبری
جرەوی بۆرەی ماروێرانم بێکادەدا
دەچوومە سەرسەری بابە شێخییە
ئەمن هاوارم کردییە
دەمگۆ رەبی مارت وێران بی بابەشێخ
دیارە ئەمیەتی پیاوانت لە دنیایێدا لە کن نییە
لۆیە ئەمن سەلامم لەمن وەرنەگرتییە
ئەگەر نەرتێ بابە شێخی حوربانی
بەو خالیقەی لە ژۆرێ سەری لە ناوەندی دیوانێ

تەواوت دەکەم هەر بەیەکجارییە
ئەوجا بابەشێخ برند دەبوو لە ناوەندی دیوانێ
جرەوی بۆرەی گرتییە
دەرێ کورە مارت وێران بی شۆڕەسواری کوردییە
رەبی سەری بابەشێخت ببی بەقوربانی سەربیە
ئەتو نازانی سەری چەند سارانە لەگەمن چ هات و چۆت کردییە
عەیاو ناموسێ منت لە دنیاییێدا بردییە
ئەوجا دەرێ رۆرە لاسە
دەهاتمە خوارێ لەسەر پشتێ بۆرەی خار خارییە
دادەنیشتم لەناوەندێ دیوانێ لەگە بابەشێخی
ئەمن سێ رۆژان بە مێواندارییە
رۆژی چارەمینێ دەمگۆ هەرەستم بابەشێخ
دەگەڕێمەوە لەبۆناو حوربانێ جافی
ئەمن بەسەر پشتی بۆرەی مارویران دەکەتم
کە ئاورِم دەداوە کیژێ بابە شێخیان
بەسە پشتی کەوێتەکی بی نیشان یێخستییە
بە دوو بابی تویان یێخستییە
ئەوجاکە دەهاتینە دەرێ لەناو حوربانێ عارەبی
کیژێ بابەشێخی هاواری کرد و قیراندی
ئەرێ دەرێ کــورە مــارت وێران بی ئەحــمــەد بەگی شارەزووری
رەبی سەرێ منت ببی بە قوربانی سەری
عینادی لە بۆ پیاوان و لەبۆ عەگیدان
لەدنیاییێدا گەلەک باش نییە
ئەو عینادیە چییە لە دنیاییێدا لەگە منت رابااردی
سەری شەش سارانە لەمارە بابان و لەناو قەومی جافی
لەناو کوردەواری ئەمنت وا راگرتی
لۆوت لەمن کردییە
ئەمن عەیبم لەدنیاییێدا چییە
ئەوجا دەرێ رۆرە لاسە
کە کیژێ بابەشێخی ئەوەندەی گۆتییە
بەران گاسی دەکرد و هاواری کردی
ئەرێ دەرێ کــورە مــارت وێران بی ئەحــمــەد بەگی شارەزووری
ئەگەر دنیا بوو قاسیدی بابم لەدومە هات
تازە مەگەڕێوە لەبۆ ناو حوربانی عارەبی
ئەوە فێرە لەدنیاییێدا لەبۆ تویان دامەزراندییە
دەتفەوتێنن لەناو حوربانی بابی من هەر بەیەگجارییە
دەرێ رۆرە لاسە
لەسەر ئەو حارەی کیژە بە غەک بوو لە دنیایێ
ئەو نسحەتەی بابێ توی لەناوەندی رێیێ کردییە
وەکی واورِم دەداوە
دەمدی تۆزە لەدوو بابی تو هاتییە
دەرێ لەجێوە هەرودستەم دەکرد و بەبۆرەی مارویران رام گرتییە
ئەوجا کیژێ بابەشێخی هاواری کرد
دەرێ کـورە مـارت وێران بی لەوەتی لەحوربانی هاتینە دەرێ
ئەمن نسحەتی توم کردییە
نارێم ئەوە قاسیدێ بابم لەدومە هاتی
ئەوجا دەرێ کچێ مارت وێران بی
ئەوێ دەمێ بەجواب هاتم لەکیژی بابەشێخییە
ئەرێ دەرێ کچێ مارت وێران بی
خۆ دونیا عیزرائیل نییە
دەبا بێ با بزانم ئەو سوارە مەخسەدی
لەگەرە من چییە
ئەوجا دەرێ کە سوار دەهات و هاواری دەکرد و
لەدووڕا سەلامی لێ کردییە
ئەرێ دەرێ کورە مارت وێران بی شۆڕەسواری کوردی
بەران وەکی چویە دەرێ لە حوربانێ عارەبی
بابەشێخ قسەکی گەلە گەورەی لەدری خۆی گرتبوو
لەبیر چوو پێت برێ بەراستی
بەران گۆتی بابگەڕێتەوە ناو حوربانێ عارەبییە
هەندەی پێ دەرێم ئەوجا ئەمن بەیێکجارییە))

جا کە وەی پێدەگۆتم قاسیدی بابەشێخی، جرەوی بۆرەم باداوە لەبۆ ناو حوربانی بابەشێخییە، ئەوەندەی کیژێ بابەشێخی بە نوقورچان و بەچاوان لەگە منی کردییە، لەمن وابی لەگەمنی نییە، گەرامەوە لەبۆ ناو حوربانی گەیشتمە دەرکێ دیوانێ، سەلامم لەدیوانێ کرد، تەماشام کرد دیوان چۆلە بەس بابە شێخ بەتاقی تەنێ دانیشتییە، ئەویش فرمێسکی بەچاوی دێنە خوارێ دەگریێ وا ئاگای لەخۆ نییە، دەرێ سەلامم لێکرد سەلامی وەرگرتەوە، دانیشتم لە

تەنیشتی نەهاتمە خواری، گوتم چییە بابە شێخ لۆ لەدوومنت ناردییە؟ گوتی رۆرە شۆرە سواری كوردی رەبی سەری بابەشێخیت بە قوربانی سەرییە، لەپاشەویش عارەب دەورەی لەبابەشێخی دەدەن، دەرێن ئەتو ئەو كیژەت سەری چەند سارانە لەگەر ئەو كابرایە كوردەی یەخسیر كردییە، كەس نازانی ئەو كابرایە نێرە مێیە! بەراستییە، لەدووی بنێرە با بگەرێتەوە بینێرە لۆ ناو چەمی شێرەك سەری چەند سارە لەمە غەزرییە، ئەو ئاوەی لەمە مەنع كردییە، بینێرە لۆ سەر شێری، ئەگەر شێری پێ كوژرا، ئەوە هەر لەبۆ ویبی كیژە، شێریش ناكوژرێ، شێر دەیفەوتێنی كیژەش دەمینیتەوە لە حوربانی لەبۆ خۆمان، چییە ئەو گێچەلەت لۆمە لێرە پەیا كردییە، بابەشێخ لەولایە پێی خۆش نییە، بەران لەبەر حوربانی عیلاجی نییە، دەرێ هات دانیشت گوتی وەللاهی كورم ئیشەكی گەلە گەوردەم بەتو كەتییە، نازانم پێشت برێم یان پێشت نەرێمن ئیشەكە زۆر زەحمەت و خراپە.

( ئارێ دەرێ هەرمكێشا شیرێ میسرییە
ئەوجا لەسەر تۆقی سەری بابەشێخیم راگرتییە
دەمگۆ پێم برێ بەراستیە
بزانم مەخسەدێ درت لەدنیایێدا چییە
ئەوجا بابەشێخ مارویران
فرمێسكی لەچاوی دەباراندن هاواری كردییە
دەرێ رۆرە بەتۆ دەرێم مارویران
ئەحمەد بەگی شارەزووری
ساحێبی نۆزدە هەزار ماری جافی
ئەتو ئەوێ رۆژێ پێنجسەد عەگیدت
لەبەر دەركەی دیوانێ من فرێ دا
لەسەخانە زینی بەمدەی دوو سەعاتان
بە زەبری دارێ رمی لەتو وابی نێری تێدا نی
ئەگەر بروا دەكەی بەو خالیقەی لە ژۆری سەرییە
سەری حەفت سارانە
شێرەك لەناو چەمی لەمە غەزرییە
ئەو ئاوەی لەمە مەنع كردییە
مەرو ماری مە حەمو لەتێنان قڕ بووە ئاگامان لێنی
ئەگەر عیلاجەكمان لۆ بكەی ئەو شێرەی بفەوتێنی
ئەوجا بگەرێیەوە لە بۆ ناوی قەومی جافی هەر بە یێكجارییە )

شەرێ شێریم نەكردییە، دەرێ بابێ تو تەزیەك لەبنی پێم هات لەتۆقی سەر دەری كردییە، ئەگەر بروا دەكەی بەو خالیقی لەژۆری سەرییە، رۆرە لاسە شیر لەدەستم دابوو دەلەرزی شیر بەربۆوە سەر عەردی، هۆشم لەبەدەنی دانییە چونكو شەرێ شێریم نەكردییە شێرم نەدیتیە، دەرێ بەران لەبەر بابەشێخیان عیلاجم نییە، هەرستام دەرێ گوتم بابەشێخ ئەمن دەچم لۆ سەر شێرییە دەرێ جرەوی بۆرەم راكێشا بە بەر دەركەی دیوانێ بابەشێخی، بەبەر قەرە رەشماری سەر گردییە، وەكی زەینم دایێ كیژێ بابەشێخی زێدە لە حوربانی هاتە دەرێ هاواری كردییە، مشكی بەسەر خۆی دا كردییە.

(ئارێ دەرێ رەبی مارت ویران بی شۆرە سواری جافییە
رەبی سەرێ كیژێ بابەشێخیت ببی بە قوربانی سەرییە
ئەمن نەمگۆ مەگەرێوە لەبۆناو حوربانێ عارەبی
فێرە لەبۆ تویان دامەزراندنییە
بنیادەم زەفەر ببا لە دنیایێدا بەشێری
ئەوە لۆیە ئەتویان دا وی شێری
تا بفەوتێنی هەر بەیێكجاریە
ئەمنیش بمینێمەوە لەبۆحوربانی عارەبییە
ئەوجا دەرێ وەكی كیژێ بابەشێخی
ئەوەندەی لەدیار قەرە رەشمارێ سەرگردی بەمن گوتییە
ئەوێ دەمێ گەلە گەلە فكرم لەبەدەنێ خۆ كردی
زۆر زۆر خۆم بە غەریبی زانییە
فرمێسكەك لەچاوی من دەهاتە خوارێ هەر بەیێكجاری
ئەوجا عیلاجم نەبوو هەر دەچم لەبۆ سەرسەری شێری
بەران دەمگۆ بەكیژێ بابە شێخییە
مادام دەزانی نایێمەوە لەسەر كوشتنی شێریە
ئەوجا مارت ویران بی وەرە لەدیار حوربانێ عارەبی و
لەدیار بابت با دەستەكی باوێمە شاملەكی بەكەزی
بەران بادوو رامووسانان بكەم لە روومەتی كیژێ بابەشێخی
ئەگەر بەدەوی شێریش بچم لەدنیایێ وەمزانی ئەمن
دنیام سەرێ حەفتێ سارە بەچاوی خۆ نەدیتییە
ئەوجا دەرێ رۆرە لاسە
بەران رەبی ئەوی ئەمن دیتیتم لەدنیایێ دا قەت نەبینی

بەچاوییە
رەبی مـاریَ كـیـژیَ بابەشـێـخی وێران بی هەر بە یێكجاری
ئەوجا شەرمی لەباب و لەناو حوربانی عارەبی نەكردی
سەبر سەبر شانی چەپەی لەبۆمن داوێشتیی
ئەمن دەستەكم دەهاویشتە سەملی كیژیَ بابەشێخی
دوو راموسانم لێكردییە لەدیار حوربانیَ عارەبییە
ئەویَ دەمیَ كیژیَ بابەشێخی هاواری كردییە
دەریَ رەبی مارت وێران بی ئەحمەد بەگی شارەزوورییە
ئەویَ رۆژێت بەبیر نی وەكی چاوی چۆیەم لەتو قوچاندو
چاوی راستەم لیَ برند كردی
پێنجسەد عەگیدیَ عارەبیت بەمدەی دوو سەعاتان
فرێدا لەسەر خانەی زینی
هەمووت لەبەر دەركەی دیوانیَ بابەشێخی بابی من
سەبارەت بەمن لەبۆ راگرتییە
ئەورۆ لەدیار حوربانی عارەبی و لەدیار بابی من
دوو راموسانت لەمن كردییە
دەستت هاویشتیتە شامڵیَ بەكەزی
نازانی ئەو ماچانە مارویَران بەبێ قەرد نییە
ئەگەر بڕوا دەكەی بەسەری شێری
عەمری شێری نەمینیَ شێر لەدنیاییَدا چییە
خۆشێری مارویَران رم و ئەسلەحەی لەبەر نی
چ شێری لەدەستیدا نییە
ئەتو دەچی لۆسەر شێرییە مییە لە شێر بتگاتیَ
دەستی برندكا باوێتە سەرشانت بتشكێننتە سەر عەردی
ئەویَ دەمیَ هاواركە خواو پێغەمبەری و لێیدە لەچار پەلیَ
شێری و شێر دەكەوتە سەر عەردی و هەر بەیێكجاری
سەری شێری ببڕە وەكی كارە كۆرپەی بەرداكی
ئەوجا دەریَ رۆرە لاسە
كە ئەوەندەی لەناو حوربانیَ عارەبی بەمن گۆتیە
لەمن وابی قسەی كیژیَ بابەشێخی راستە
هیچ درۆی تێدا نییە
لەمن وابی شێری عەمر نەمای لەمەیدانیَ لەدیار بابی تو چ نییە
ئەوجا دوعا بوونم لەكیژیَ بابەشێخی سازاندییە
جرەوی بۆرەم رادەكێشا لە بۆ دەركەی چەمی
دەرۆییمە خواریَ لەبۆناو حوربانی عارەبی
بەران وەكی واورم دەداوە زەینم دەدایێ
چەن هەزار مـاری عـارەبی هەمـووی لێدەدا لەشـایی و گۆوەندی
بەزم و سەیرانیان دامەزراندییە لەناو حروبی
تازە رۆیی لۆ ناو چەمی ناگەرێتەوە هەر لە دنیاییَدا بە سەلامەتییە)

كـە رۆیشـتم لە بۆ دەركـەی چەمـیـیـە، ئەو خـوربانە هەمـووی لەهەلهـەلەو حـروبیـیـە، لەوان وابی شـۆڕەسـواری كـوردی رۆیی ناگـەرێتـەوە بەسـەلامـەتیـیـە، ئەوجـا دەریَ گـەیشـتـمـە دەركـەی چەمی زەینم دایێ شـێـر لەسـەر كـانیێ غەزریە، ئەو سەگباب خێوە لەدووڕا كە چاوی بەمن كەت. دەوی لێک كـردەوە دەتگۆ ئەشكەلكی عـارەبانە، بنیـادەم بەتەمـامی بەدەوی دەرۆییەوە خواریَ بەیێكجارییـە، دەریَ وەكی چاوم بەشـێـری كـەت دەسـتم بە لەرزینێ كـرد، دەریَ تەزیەک هات لەبنی پێم و لەتۆقی سـەرم رۆییە، شـێـر لە دەسـتی راسـتـەمدا بوو، شـێـر بەربۆوە سـەر عـەردییە، چ عیلاجم نییە، دەستم بەلەرزینێ كردییە، ئەوجا دەریَ ئەویَ دەمی بەبیـرم هاتەوە قـسـەی كـیـژیَ بابەشـێـخی، كـە دوو رامـوسـانم لیَ ستاندییە بەسەری شێرییە لەدیار حوربانیَ تانی لەمن گـیـر كـردییـە، ئەوجا بەبیـرم هاتەوە گـۆتم خۆ شێری عەمر نەمای زرێی داودی لەسەر شانی نییە، شـیر و رووتەی گـورگـانی بەدەست وەنەگرتییـە، رمی لەتەنكێشی وراغی نییـە، شـێـر چییـە!، دەریَ شـیرم هەرگرتەوە لەپێش نێـوچەوانی خـۆم راگـرتیـیـە، ئەگـەر بڕوا دەكـەی دەمـاری كـەللەی سـەری بابی خـۆت هەمـوو لەناو ژمـاردییـە، ئەوجا زانیم فەتحم بەجێیە قەت بەجێ نییە، ئەمن شیرم بەرووتی گرت بە دەستی راستە لۆشـێری چووم، شێر لەوێرا نەڕاندی و لەبۆ بابی توهات، دەریَ كە نێزیک بووم لەشێری، دەریَ شێـر لە تو وابی كـیـژیَ بابەشـێـخی لەحەیاتی خـۆی شەڕی لەگە شێری كردییە دەریَ هۆردوو دەستی پێشەوەی برند كرد باوێتـە سەر شانم بشكێننتە سـەر عـەردییـە، دەریَ هاواری خـوا و پێـغـەمـبـەرم كرد و شـیـرم راوەشـاندییـە، لەهەر چار پەلی شێرم دا. شێر بەربۆوە سەر عەردییە، دەریَ پێم لەسەر ملی شـێـری گـیـر كـرد و سـەریَ شـێـریم بڕیوو وەكی كـارە كۆرپەی بەر داكییە. دەریَ هەرستام شێرم كەور كرد، هەر

پشکە گۆشتەکی شێریم لەبن بنە دارەکی شاردەوە، جلک و بەرگی خۆشم هەموو رەق کرد لە خینێ شێریدا وەردا، زرێ و هەراو هەراو داوو دەرێ هەموو شیرەکەشم لەخینێ وەردا، دەرێ پیستەی شێرم راکێشا بن دارە لاسی سەکانێی، دەرێ لەسەر پیستەی شێری درێژبووم، گوتم زێدە لە حوربانەی ئەگەر دنیابوو کیژێ بابەشێخیش نەهات بزانم چم بەسەر هاتییە، شەرتبێ ئەویشم نەوێ بگەرێمەوە لۆ ناو حوربانێ کوردییە، تازە عاشای بکە عارەبی سەگباب غەکیان نییە، ئەگەر کیژەش هات ولەسە پشتێ شێری و لێرە ئەمن مەخسەدم ئەدا نەبی قەت نابی، دەرێ رۆرە لاسە ئەمن درێژبوو بووم خۆم کردە مەیت، لەتو وابی حەفت سارە روح لەبەدەنی بابی تودا نییە.

( ئای... ئەوجە دەرێ مەدەی دووسەعاتێ پێچوو بەتەمامییە

ئەمن خۆم لەسەر پیستەی شێری لەبن دارە لاسی
لەسەر کانی و کانیاوێ درێژ کردییە
کیژێ بابەشێخیش دەیزانی ئەحمەد بەگ نەگەراوە هاواری کردییە
ئەرێ دەرێ بابە مارت وێران بی
مادام گەردەنت ئازا ناکەم لەدنیایێ و قیامەتان
ئەوێ رۆژێت بەبیر نییە وەکی مارومنداری تویان
تیرەگەی رەشمارێ لایێ راستەیان
دەینا خوارێ بەسەر چۆیی
بیبەن بەزەبرێ دارێ رمی بەبیرت نییە
بەقسەی حوربانێ عارەبی
کو ئەحمەد بەگی مارۆێرانت نارد لە بۆ سە شێری
مادام ئەوهاشت بەدەوی شێری بەکوشتێ دا لەناو چەمییە
لێمگەرێ دەچم ئەگە هێسکیشی مابی
لەبە دەوی شێری دەهێنمەوە لەدیارە خۆم لەناو قەبری دەنێم
مارۆێران لەبۆخۆ دەگرییێم هەر بەیێکجارییە
ئەوجا بابە شێخ کیژەی ئیزن دەدا
کیژە هۆشی لەبەدەنێ خۆدا نییە
چاوی عەردی نەدیتیە شەرێ شێری نەکردییە
بەران شێری هەر بەبیر نییە

سەبر سەبر لەبۆناو چەمی رۆییە
تا تووشی سەکانیو کانیاوی کەلەشی ئەحمەد بەگی بوو
لەبن دارە لاسی دەتگۆ تەراشە درێژ بووە
هۆشی لەبەدەنی دا نییە
رەبی ماری ئەحمەد بەگی وێران بی
وەکی چاوی بەکیژێ بابەشێخی کەتییە
لەتو وابی حەفت سارە روح لەبەدەنی ئەحمەد بەگی دانییە
دەرێ رۆرە لاسە
رەبی ئەوی ئەمن دیتیتم لە دنیاییدا قەت نەبینی بەچاوییە
ئەوجا کیژێ بابەشێخی دەرێ برندی دەکردم
ئەودیو ئەودیوی دەکردم
ئەمن روحم لەبەدەنە خۆ نەهێشتییە
ئەوجا کیژێ بابەشێخی مارۆێران
دادەنیشت لەسەرینگانم دەستی بەدادو فیغانێ کردییە
رەبی ماری کیژێ بابەشێخی وێران بی
دەرێ رەبی مارت وێران بی ئەحمەد بەگی شارەزووری
دریە منی چەندە دێشی دری منی گەلە بەمەگری مەگری
بم بە قوربانی جۆتە تاژییەکانی گێ بەری شۆری
قەرە زێری وا دەخولێنەوە لەناو حوربانی عارەبی
دەنووسکێن و روویان لەعاسمانێ کردییە
بەران فرمێسکیان بەچاوی وە دێتە خوارێ
دەزانن ساحێبان لەدنیاییدا نییە
ئەرێ دەرێ رەبی مارت وێران بی ئەحمەد بەگی شارەزووری
سەرییە منی چەندە دێشی دریە منی گەلە بەگازە گازە
بم بە قوربانی بۆرەکەی خارخاری ناو قەد تاژیانییە
وا بەستراینەوە لەبەر دەرکی دیوانی حوربانی عارەبییە
چەندی بۆرە دەحیلێنی و سەری برند دەکا لەبۆ عاسمانێ
فرمێسکی لەچاوی دێنە خوارێ چ ساحێبی دیارنی
ئەرێ دەرێ رەبی مارت وێران بی ئەحمەد بەگی شارەزووری
کەهاتی لەبۆ ناوچەمی دوو رامووسانت
بەقەرد بەسەری شێری لەمن وەرگرتییە
کە ئەو رامووسانەت نەدا من لەدنیایێ هەر بەراستی

بەران گەردەنت ئازا ناکەم لەدنیا و قیامەتان هەر بەیێک جارییە

خۆم مراندییە کیژە چی پێنەما، دەرێ گوتی، کیژە فکری کرد لەدری خۆی گوتی یارەبی خوایە، شەش سارم دەگەر حەمەد بەگی رابارد نەمزانی ئەحمەد بەگ نێرە مێیە، خۆ لەوهەی فرسەت تر نییە، تازە مردییە ئاگای لەچدانییە با پێبکەوم بزانم نێرە یان مێیە! دەرێ کیژە... وەکی تەڕایشی ئەمن خۆم درێژ کردبوو، پشتاو پشت درێژی کردم، دەرێ دۆخینی شەرواری کردمەوە، دۆخینی دەرپێی دەست لۆ بردم، رۆرە لاسە سوندەکەم جێبەجێ بوو، تەمامو توند زەنگەی دەستیم گرت، گوتم: ئەوی ئەورۆت دەکرد شەش سار لەوەی پێشتر بکردبایە شەش ئەولادت دەبوو، گوتی لۆ؟ گوتم ئەدی لەبیرت چوو وەکی لەسەکانیێ قومە ئاوەکت دامێ پشتت لەپاش کرد؟ ئەهمیەتی منت نەزانی؟ کورە گوتی: مارت وێران بی لەشەرمان، شەرمم لەتوکرد، چما لەبەر بێ ئەهمیەتی بوو، ئاوم لەتو لامە کرد؟ ئەوجا دەرێ رۆرە لاسە، لەسە پشتی شێری لەبن دارە لاسی لەسە کانی و کانیاوێ لەگە کیژێ بابەشێخی بەزاوا بووم، دەرێ حوربانیش واشایی و گۆوەند و بەزم و سەیرانەکە کەس ئاگای لەکەس نییە، گوتیان ئەحمەد بەگ رۆیی فەوتا، دەرێ هەرستام دەستی کیژێ بابەشێخیم دەناو دەستی خۆنا سەبر سەبر بەجۆتە گەڕاینەوە لەبۆناو حوربانی، پیستەی شێریشم لەدوو خۆ راکێشا دەرێ وەکی حوربان چاویان بەپیستەی شێری کەت و چاویان بەکیژەی کەت وا دەستی لەناو دەستمە! هەر بابا بوو چووە ژۆری دەرگەی چیغێشی قەیم کرد، بووە شەوە رەش، بەشەرێ خوای لەوێ نەما، دەرێ لێمدا لۆکن بابەشێخی چووم، بابەشێخ وەکی چاوی پێکەت، گوتی کوڕم حەقتە، دەرێ هەر لەوێندەرێ نەچووین دابنیشین یا بچینە ژۆرێ، دەرێ هینامە دەرێ، کەوێتەکی خارخاری ناوقەد تا ژیانی لەبۆ کیژێ بابەشێخیم بەدەستی خۆ راگرتییە، ئەوجا برندم دەکرد لەسەر پشتی کەوێتیم گیرکردییە، بەخۆم بەسە پشتی بردی کەتم، بەجۆتە سوارە دوعابوونمان لەبابەشێخیش نەخواستیە، لێمدا گەڕامەوە هاتمەوە لەبۆناو حوربانێ جافییە، ئەوجا دەرێ رۆرە لاسە، ئەتو لەو دایکە و لەو بابەی کو جارەکی لەدایکی خۆت نەزانییە کەبابی تو چی لەدنیایێ بەسەر هاتییە، ئەورۆش چەندی زەین دەدەمە نیوچەوانی لاسی چ جەوهەری پیاوانی تێدا نییە، جارەکی لەجاران نەمبیست لە شوان و گاوانان لە ئاقاری بێنەوە برێن ئەورۆ لاسمان لەبنەی چیای دیتیە رەوەکی شینبۆزانی بەپێشەخۆی هێخستییە هینایەوە لۆ ناو حوربانی بابی وییە، هەر دەبینم لەدیوانێ دانیشتییە، کەیف و سەیرانێ دەکەی لەراوو شکارێ ئاگات لەدنیایێدا نییە. رۆرە لاسە لەوێندەرێ لەبن دارە لاسی لەسەر پیستەکەی شێری لەسەر کانیو کانیاوێن عەهدم دەگە خوای کرد گوتم: خوایە ئەولادەکەم بدەیێ ناوی لێبنێم لاسی ئەحمەد بەگی شارەزووری بەرکو جێی بابی خۆی دەگری لەدنیایێ رادەبێری بە عەگیدیە، ئەورۆش ئەتو چ غیرەتێ پیاوانت لەبەدەنی دا نییە.

(ئای.. هۆ هۆ... ئەوجە دەرێ رۆژەکی لەڕۆژان وەکی خەزارە شۆڕی مەلا نەبییانم هەر دەستا لەخەوێ لەجێ و بالینگانێ

دەستی دەکرد بەشین و بەگریانێ

فرمێسکی چاوی دەهاتنە خوارێ، دەستی دەکرد بە گریانێ

ئەوجا گازی دەکردە کارەکەرو نۆکەران

هاواری کردییە

ئەرێ دەرێ کچێ ئەستی و خوبی و رابییە

دەنگۆ برۆن لەبۆمن گازکەنە مامە دەروێشی عەبدی

بەران وەکی مامە دەروێشی عەبدی هاتییە

لەدوورا بەپیری وەڕۆییە

دەروێشی ماروێران لەدورا هاواری کرد و سەلامی لێ کردییە

ئەرێ دەرێ وەی خەزارە شۆڕی مەلا نەبی

لەوەتی ئەوێ رۆژێ لەناو هۆبەی مەلا نەبییانم رابارییە

قەت جارەکی لەجاران ئەتو لەدوو منت نەناردییە

دیارە ئیشەکی گەلە گەورەت بەمن کەتییە

لۆیە بەو بەیانییەی لەدوو منت ناردییە

ئەرێ دەرێ کورە مارت وێران بی مامە دەروێشی عەبدییە

بەتوو کەمە بەو خالیقەی لەژۆری سەرییە

ئەمن ئەوشۆکە خەونەکی گەلە گەلە ناخۆشم بەدرێ خۆوە دیتی

بەرانەکونێ بەرکو دەگەڕێی لەدنیایێ
جوابی ئەو خەونەم لۆ دەینییەوە بەسەلامەتییە
ئەوجا دەرێ دەروێشی مارویران هاواری کردییە
ئەرێ دەرێ وەی خەزارە شۆڕی مەلا نەبییان
ئیشی تو بەسەر سەر و چاوم
چ منەتی لەدنیایێ لەبۆتو تێدا نییە
ئەرێ دەرێ کورە مارت وێران بی مامە دەروێشی عەبدی
هەر چار ئەقلیمێ دنیاییێت دیتییە
بەران ئەمن ئەوشۆ لەسەر جێ و بالینگانان
چاوم بە بەژنی لاسەکی کەتییە
بەژنی ئەو لاسەی دەمنی شترە نەمامەکانی لەباغان
روومەتی ئەو لاسەم هەر دەرێی تۆپی گوری
سمێری ئەوی لاسەم دەمنی جۆقەی بەری تاوسی
کورە هەتا ئەورۆ جارەکی لە جاران
جوابی ئەو لاست لەدنیایێ لەبۆمن نەزانییە
ئەوجا دەرێ رەببی ماری دەروێشی وێران بی
هاواری کردییە دەرێ وەی خەزارە شۆڕی مەلا نەبییان
بەتو کەمە بەو خالیقی لەژۆری سەری
ئەگەر بروا دەکەی ئەمن هەر چار ئیقلیمی دنیاییم
بەحوکمی داروەکازو کەشکۆری کردییە
ناوبانگی ئەو لاسەی لەتۆ نەبی لەدنیاییدا تا ئەورۆ لەکەسم نەزانییە
ئەوجا دەرێ خەزاری مارویران کەشکۆری لە دەروێشی وەرگرتییە
پڕ بە کەشکۆری زێڕی مەلانەبییان
لە بۆ مامە دەروێشی داگرتییە
کە دەروێشی مارویران چاوی بەو زێڕەی کەتییە
دەرێ وەی خەزارە شۆڕی مەلا نەبی
شەرتبی لەشەرتێ خوای لە خۆم حەرام کەم
مار و منداڕێ خۆ لە دنیاییدا هەر بەیەکجارییە
ئەمن بگەڕێم هەر چار ئیقلیمی دنیایێ
هەتا لەبۆ تو دەینمەوە ناوبانگی لاسی ئەحمەد بەگییە
ئاوجا دەرێ دەروێشی مارویران
دەگەڕاوە لەبۆ مارێ هاتییە
گەردنی خۆی بەمارێ ئازا کردییە
کەشکۆری دەهاویشتە ملێ داروەکازی بەدەست وەگرتییە
سەبر سەبر هۆبە بەهۆبە دێ بەدێ شار بەشار
پێدا رۆیی دەپرسی لە شارەزووری
هەتا نێزیک دەبوو لە شارەزووری
ڕۆژەکی لەرۆژان زەینی دەدایێ حووربانەکی لێ بەدەرکەتییە
هۆبە گەلە زۆرە نەسەری دیارە نە بنی
ئەوجا لەدووڕا سوارەکی چاوپێکەت و
لەبۆکنی دەرۆیی لەدووڕا هاواری کردییە دەرێ شوانە شوانە مەڕییە
رەبی لەتوم مومبارەک بی ئەو بەرانە گەورەی ناو مەڕییە
توخوا ئەگەر پێم نەرێی
ئەو هۆبە گەورە و گرانە هی کێیە و بەراستییە
ئەوجا دەرێ شوان لێی بەجواب هاتییە
دەرێ رەبی مارت وێران بی مامە دەروێش
دیارە دنیات نەزانی
ئەوە هۆبەی لاسی ئەحمەد بەگی شارەزوورییە
حوکمی دەکا لەسەر دوازدە هەزار ماری جافییە
لەوی وابی نێر لەدنیاییدا نییە
ئەوجا دەرێ دەروێش لەکەیف خۆشیان
رووی خۆی لەدیوانێ لاسی کردییە
دەرێ دەگەیشتە بەردەرکەی دیوانی لاسی
ئەوێ رۆژێ لاسی مارویران سوار دەبوو
لەبۆ راوی حەفت شەوو حەفت رۆژەی رۆبییە
کەلەبەر دەرکەی دیوانێ چاوی بەسی کەت
لەسەر پشتی شێخ غەزالی
شێخ غەزال لەهەورانی رۆنییە
رەبی ماری لاسی وێران بی
دەتگۆ شێرە لە چەمێدا غەزرییە
ئەوجا لەلای راستی سوار دەبوو پێنجسەد عەگیدی جافی
حەمو زرێی داودی لەسەر شانییە
حەمو شیر و روتەی گورگانی بەدەست وەگرتییە
حەمو رمی لەتەنکێشی وراغی
بەران لەلای چۆپی لاسی سوار دەبوو
پێنجسەدی دییە

حەمو باز و شەهێن و سەقەری لەسە دەستیە
لەدو لاسی باردەکرا پێنجسەد هێستری بارەبان
لەرون و لەگۆشت و لە برنجیە
حەموی لەبۆ راوی حەفت شەوو حەفت رۆژەی گەر لاسییە
وەکو دەرویێشی ماروێران چاوی بەو عارەی کەت
سەری برند دەکرد و رووی لە عاسمانێ کردییە
دەرێ یارەبی خوایە
بەمن دەرێن مامە دەروێشی عەبدی
هەر چار ئەقلیمێ دنیایێم بەدەروێشی کردی
ئەمن ئەو دەستوورەم هەتا ئەورۆ
نە لە چ پاشایان و نەلەچ گەداو نە لەچ عەگیدان دیتییە
ئاوجە دەرێ رەبی ماری دەروێشی وێران بی
کە لاس دەرۆیی لۆ راوی حەفت شەوو حەفت رۆژەی
رووی خۆی لەدیوانی لاسی کردی
بەران دادەنیشت لەدیوانی لاسییە
دەرێ کەنیودرۆ لەبۆ دیوانی لاسی هاتییە
هەر بەدوو پیاوان سێنییەک دادەنرا لەدیوانی لاسی
رەبی ماری دەروێشی وێران بی
هەر پاری لێدەداو ئاوای کردییە نەیدەجوی بەراستییە
دەیگۆ یا رەبی خوایە ئەو تەعامانە چییە)

لە دیوانی لاسی پاری داوە، دیتی تەعام زۆرەو شیوو نان پوختەیە، گوتی یارەبی خوایە ئەمن هەر هاتم جوابی لاسی ببەمەوە، لەدنیایێ بزانم لاس هەیە یان نییە لەبۆ خەزارێ، ئەگەر ئەمن جوابی لاسی ببەمەوە با پێبکەوم ئەو حەفت شەو و حەفت رۆژەی لێرە پار دەدەمەوە ئیسراحەتەکی دەکەم، پێبکەوم بزانم لاس ژنی هێنایە یان نەیهێنایە، ئەگەر ببەمەوەش ئەو جوابەی لە بۆ خەزارێ ئەو جارە دو کەشکۆر زێڕی مەلا نەبییانم دەداتێ، دەرێ دەروێش لێی پارداوە، هەتا حەفت شەوو حەفت رۆژە تەواو بوو، رۆژی حەفتەمینی گوتیان ئەورۆ لاس دەگەڕێتەوە، دەرێ دیوان هەمو عالەم راوەستاینە ئینتیزاری لاسی دەکەن، دەرێ دەروێش گوتی یارەبی خوایە ئەو لاسە بێ و بگاتە جێی خۆ لەناوەندێ مەیدانێ، لەناو ئەو هەموو عەگیدەی کوو لێدەگەرێن بگەمە کن لاسی، هەر نەبی دەرێن دەروێشە فەقیرە و برۆن چشتەکی بدەنێ بەرێی کەن، ناوەڵلا گوتی چاک نەودیە خۆم لەپەنا دەرکەی دیوانی مات کەم هەر دەمێ گەیشتە دەرکەی دیوانێ بێمە دەرێ توند جرەوی وراغی بگرم، ئەگەر ئەسل و نەسەبی هەبی، پاشازادە بی و عەگید بی، سوئال و جوابم لێ دەکاتن، دەرێ مام دەروێش لۆ جرەوی شێخ غەزالی منت گرتییە، ئەگەر سوئال و جوابیشی لێ نەکردم دیارە ئەو سەگبابە شوان و گاوانە چ نییە و ئەقری نییە، دەگەرێمەوە دەچمەوە کن خەزارێ دەرێم خەزار لاس هەیە وا لە شارەزوورییە.

( های... هاهای... های...
ئەوجا دەرێ رەبی ماری دەروێشی وێران بی
رۆژێ حەفتەمینی لەگە نوێژی بەیانیان
خۆی لەپەنا دەرکەی دیوانێ مات کردییە
کەچێشتان گەرم بوو بەتەمامییە
خەبەر لەبۆ دیوانی هات
لاس گەڕاوە حەفت شەو و حەفت رۆژەی
رەبی ماری لاسی وێران بی
دەمنی تاوسی مەستە و هۆشی لەبەدەنێدا نییە
دەرێ جرەوێ شێخ غەزالیی
لەبۆ دەرکەی دیوانێ شل کردییە
دەگەیشتە بەر دەرکەی دیوانێ
سەلامی لە دیوانێ کردییە
چەن هەزار نەفەر لە دیوانی لاسی دانیشتییە
هەمووی برند دەبوو لە پێوە هەر وەستەی کردییە
کەس تاقەتی دانیشتنی نی
هەتا لاس دانەبەزیوو دانەنیشی لەدیوانێ بەتەمامییە
دەرێ رەبی ماری دەروێشی وێران بی
خوا غەزەبی لەدەروێشی ماروێران گرتی
ئەوجا دەهاتە دەرێ لە پەنا دەرکەی دیوانێ
بە هۆردو دەستان جرەوی شێخ غەزالی لاسی گرتییە
ئەوجا لاسی ماروێران دانەدەبەزی لەسە پشتی غەزالی هاواری کردییە
ئەرێ دەرێ کورە مارت وێران بی دەروێش
شەرمەزارت کردم لەناو هۆبەی جافی
بەران پێم برێ لەنیایێ کێ غەدری لێ کردی
غەدرت لەکێ کردییە
ئەرێ کورە مامە دەروێشە بەتووکەمە

بەو خالیقەی لەژۆری سەری
ئەگەر هەزار سواری جافیت بەدەستی خۆت سەربڕییە
مادام گەیشتیە دیوانی لاسی
تازە تانی شەترت لەدنیایێ لەبۆ تو نییە!
ئەوجا دەریێ رەبی ماری دەرویشی ویران بی
لێ بەجواب هاتییە
ئەریێ دەریێ کورە مارت ویران بی بەتو دەرێن پاشازادەی جافی
ئەگەر بڕوا دەکەی بەو خالیقی لەژۆری سەرییە
نە غەدرم لەدنیاییدا لەکەس کردییە
نەکەس غەدری لێ کردیە بە راستی
بەران سەری حەفت رۆژە دانیشتیمە لەدیوانێ لاسییە
کەس بەمن ناریێ مامە دەرویش ئەتو ئیشت لێرانەدا چییە
ئەریێ دەریێ کورە مارت ویران بی مامە دەرویشی عەبدی
ئەگەر حەفت رۆژە دانەنیشی حەقدە ساردانیشی
لەدیوانی لاسی
هەر لەبۆ خۆ بخۆ برنج و گۆشتی
کەس تاقەتی ئەوەی نییە بەتو بریێ مامە دەرویش
ئیشت لێرانە چی
ئەگەر وە بەتو برێن داخوە برێن لەبە نانەکی
وەیان بەمن گۆتییە
ئەویش نا پیاوەتییەکە لە بۆ لاسی ئەحمەد بەگی شارەزووریە).

لاس هاتە خواریێ دابەزی، قسەی مامە دەرویشی لەدری کار کرد، دەریێ دابەزی، دەریێ نانیان لەدیوانێ لەبۆ لاسی حازر کرد دەرویش لەدیوانێ دانیشتییە، لاس فکری کردو گۆتی ئەو دەرویشە بێ ئەسەل نییە، جرەوی وراغی منی گرتییە، دەریێ سەری حەفت رۆژە دانیشتیمە لەدیوانێ دەنگی برند کرد و هاواری کردییە، ئەریێ دەریێ کورە مامە دەرویشی عەبدییە، مادام غەریبی لەناو دوازدە هەزار ماری جافییە، هەستە وەرە نانی بخۆ لەگەر بەگزادەی جافییە، ئەوجا دەریێ دەرویش لێی بەجواب هات، گۆتی: بەتوو کەمە بەو خالیقی لەژۆری سەرییە، نان خواردنی دەرویشان لەگە بەگزادان لەدیوانێدا نییە، گۆتی مامە دەرویش ئەو قسانەی تۆ لەدری من کاری کردییە، نانی پێ ناخوریێ بە راستییە، هەستە وەرە، بزانم مەخسەدت چییە.

( ئەوجا دەریێ دەرویشی ماروێران لەناوەندی دیوانێ لێی قیراندییە
ئەریێ دەریێ کورە مارت وێران بی بەگزادەی جافییە
بەو شەرتەی نانت لەگە دەخۆم لەدیوانێ بە راستییە
ئەمن یێک قسەم لەدری خۆ گرتییە
ئەگەر جوابی ئەو قسەیەم دەدەیەوە لەناوەندی دیوانێ بە راستییە
دەریێ کورە مارت وێران بی مامە دەرویش
قسەی تو بەسەر سەر و سەرچاوم
لەبۆ تو چ منەتی تێدا نییە
مادام ئەتو غەریبی لەناو دوازدە هەزار ماری جافییە
بەران لە حەژمەتان دنیام لێ وێک هاتییە
ئەوجا دەرویش لە ناوەندێ دیوانێ
چەند هەزار نەفەر دانیشتییە
برند دەبوو لەبۆ کن لاسی سەلامی کردییە
لەبەری برند دەبوو بەگزادەی دوازدە هەزار ماری جافییە
دەرویشی دادەنا لەلای راستی خۆی
دەریێ مامە دەرویش نانت لەمن حەرام کردییە
بەتوکەمە بەو خالیقەی لەژۆری سەرییە
تا نانمان نەخواردییە پێم بریێ مەخسەدی تو
لەدنیایێ لەگە لاسی چییە
ئەوجا دەریێ دەرویشی ماروێران خوا غەزەبی لێگرت و بەجواب هاتییە
ئەریێ دەریێ کورە مارت وێران بی لاسی ئەحمەد بەگی شارەزووریە
لەهەر چار ئیقلیمێ دنیایێ ناوبانگی تو رۆییە
بەران بەتوکەمە بەو خالیقەی لەژۆری سەرییە
ئەگەر پێم نەریێی بەراستییە
ئەتو مەخسەدێ ئەو قسانەت لەگە من چییە
ئەریێ دەریێ کورە مارت وێران بی لاسی ئەحمەد بەگی شارەزووریە
بەتوکەمە بەو خالیقی لەژۆری سەرییە
ئەتو ماری خۆت بەچاوی خۆت دیتیە یا نەدیتیە
ئەوجا دەریێ وەکی وەی بەلاسی گۆتییە

لاس لەرکا هەردوو چاوی دەچووە تۆقی سەرییە
مووی لێ دەردەپەڕی وەکی نەشتەر و دەرزی
بەران لەبە مامە دەروێشی لەناوەندی دیوانێ
دەستی بەپێکەنینێ کردییە
دەرێ رەبی مارت وێران بی دەروێش
لەگە سوئال و جەوابی لەو دنیایە لەمنت کردییە
چ مەخسەدت لەگە لاسی
ئەگەر بڕوا دەکەی بەو خالیقەی لەژۆری سەرییە
ئەمن هێشتا ماری خۆم لەدنیایێ دا
بەچاوی خۆ نەدیتی
بەران سێ گراوم لەناو حوریانێ خۆ هەربژاردییە
یێکیان هەمینی ئامۆزایە
سەری حەفت سارانە رستەکەی رەشمارێ لە پاررا
لەگەر رستەکەی رەشمارێ تێکەر کردییە
هێشتان جارەکی ئاوڕەکم لێ نەدایتەوە بە دەزگیرانەتییە
ئەویدیان کیژێ عەباس بەگی
ئەویدیان خاتوونەکە دەمنی رۆژی لەبرسان هەراتی
دەمنی مانگی چاردەیە لەبەری ئاسمانێ
وەستێرە دەوری لێگرتییە
ئەمن بەوانەشم قەناعات نییە
چەند دەروێشم بە دنیایێ ێخستییە
ببیننەوە لایەقەک قابیل بەلاسی
ئەو دەروێشە چتاقی نەگەڕایتەوە لەبۆ ناو هۆبەی جافییە
ئەوجا دەرێ رەبی مارت وێران بی مامە دەروێش
بەتو کەمە بەو خالیقەی لەژۆری سەرییە
ئەگەر پێم نەرێی بەراستییە
ئەوەندە عومری هەتا ئەوڕۆت لە دنیایێ رابادری
وەبزانە هەمووی بە زایع رۆییە
دنیات بەچاوی خۆت نەدیتییە
ئەمنم مامە دەروێشی عەبدییە
هەر چار ئیقلیمی دنیایێم
بە حوکمی دارەکازو کەشکۆری کردی
بەران لەپیاوانم لەعەگیدان لەتوم رەشیدتر و عەگیدتر
لەدنیایێدا چاو پێنەکەتی
بەران لە ئافرەتانیش لە دنیایێدا
لەبۆ توم یێک شاس کردییە
ئەویش ماری بابی کیستان و گەرمێنی دەکەن خێرەکی
رەبی ماری ئافرەتێ وێران بی
ناوی خەزارە شۆڕی مەلا نەبی)ە.

دەرێ لاس دنیای لێ وێکهات، چاوی عەردی نەدیت، هاواری کرد، گۆتی مامە دەروێشی عەبدییە، خوا بتگری لەگە مسیبەتی بەسە منت وەرکردییە، مادام وەتگۆتییە ئەتو سەری حەفت رۆژانت بەبێ عەگید لەدیوانێ رابواردییە بە میوانداربییە، ئەوشۆش میوانی من بە تا نوێژی بەیانییە، نوێژی بەیانیا کەشکۆری باوێ ملی، دارەکازی بەدەست وەبگرە، بگەرێ لەناو دوازدە هەزار ماری جافییە، ئەو سێ گراوی بە توم گۆ بەچاوی خۆت ببینە،.بزانە لاس لایەقەتی وانە کوە لەگە خەزارە شۆڕی مەلا نەبییە، بەران دینی خۆت مەبە لەسەر ژنان لە دنیایێ چی لەبۆ تو تێدا نییە، دەرێ ئەوێ شەوێ گۆتی لەبۆ خاتری تو ناگەڕێمەوە دەنا ئیشم نییە لێرانە ئەمن دابنیشم دەرێ ئەرێ شەوێ لەگە لاسی دانیشت هەر بەحسی سەرمێرگان و خەزارێی لەبۆ کردی هەتا بابی لاسی بەگاندا، هەتا نوێژی بەیانیان لاسی وەلێکرد هۆشی لەدنیایێ نەما هەر گۆتی خەزارە شۆڕی مەلا نەبی، دەرێ نوێژی بەیانی دەروێش کەشکۆری هاویشتە ملی دارەکازی بەدەست وەگرت بەناو هۆبەی جافی دا رۆیی هەتا نوێژی مەغریبی هەر سێ گراوی لاسی بەچاوی خۆی دیت و هاتەوە لۆ دیوانێ، دەرێ لاس ئینتیزاری دەکا چاوی پێکەوت، دەروێش لەدوورا هاتەوە، لاس لەدیوانێ هەرستا بەپیر دەروێشیەوە چوو.

(ئای.. ئەوجا دەرێ لاسی ماروێران
هەردەستا لەدیوانێ بە پیر دەروێشیەوە رۆییە
لەدوورا دەستی بەپێکەنینێ کرد و هاواری کردییە
دەرێ کورە مارت وێران بی مامە دەروێشی عەبدییە
بەتو کەمە بەو خالیقیی لەژۆری سەرییە
ئەتو دینی خۆت مەبە لەسەر ژنێ لەدنیایێدا چی لەبۆ تو تێدا نییە
بزانم لایەقەتی وانە کوبوە
ئەو سێ گراوی ئەوڕۆ دیتت لەناو هۆبەی جافی
لەگە خەزارە شۆڕی مەلا نەبییە

ئەوجا دەرێ رەبی ماری دەروێشی وێران بی
دەنگی برند دەکــرد و هاواری دەکــرد و دەســتی
بەپێکەنینێ کردییە
ئەرێ دەرێ کورە مارت وێران بی
بەتو دەرێن لاسی ئەحمەد بەگی شارەزووری
ساحێبی دوازدە هەزار ماری جافی
ئەمن دونێ هێوارێ خەبەرم بەتو گەیاندی
نەمگۆ ئەوەندە عومری لەسە ئەو گراوانەت راباردیە
هەمـووی بەزایەع رۆییـە وەبزانە دنیـات بەچاوی خۆت
نەدیتییە
بەران ئەگەر بڕوا دەکەی بەو خالیقەی لەژۆری سەرییە
بەمن دەرێن مامە دەروێشی عەبدی
بەران خەزارە شۆڕی مەلا نەبییان سێ کارەکەری هەیە
ئەستێ و خوبی و رابییە
ئەگەر بڕوا دەکەی مارت وێران بی
ئەو سێ گراوەی توم هەر بەو سێ کارەکەران شپاندییە
ئەوجا دەرێ رەبی ماری لاسی وێران بی
کە گێی لەدەروێشی دەبوو وەی پێگۆتییە
دنیا نەلاسی وێران بوو چاوی عـەردی نەدیت و هاواری
کردییە
ئەرێ دەرێ کــورە مــارت وێران بی مــامــە دەروێشی
عەبدییە
خوا غەزەبی لەتو گرتی
مادام وەتگۆتییە ئەمن لەبۆت دەپێچمەوە
باقە گوڵ و رەیحان و سوسن هەرارو بەیبوونی
لەبەر دەرکەی دیوانی جافی باوێ بنێ باغەرێ
ئەگەر دنیا بوو چوویەوە هۆبەی مەلا نەبی
بەدەستی خۆیدە خەزار شۆڕی مەلا نەبییان
برێ ئەوە لاسی ئەحمەد بەگی شارەزووری
ساحێبی دوازدە هەزار ماری جافی
لەبۆتوی لەوێرا بەدیاری ناردییە
ئەوجا دەروێش خۆی گران کردییە
دەرێ مارت وێران بی
بەرکو دەمرم ناگەمەوە هۆبەی مەلا نەبییان
بەران لەبەر دری توش داوێمە بنی باغەرێ
رەبی ماری لاسی وێران بی
کەشکۆری لەدەروێشی وەرگرتییە
دوکەشکۆر زێڕی بەسەر مارێ داگرتییە
ئەوجا دەرێ مارت وێران بی دەروێش
عیلاجی من لەدنیایێ دا چییە و کو دەگەمە وی
ئەرێ دەرێ کورە مارت وێران بی
لاسی ئەحـمەد بەگی شـارەزووری ئەگەر بەمنیـشت بڕوا
نییە
ئەگەر بڕوا دەکەی هێشتا لایەقەتی خەزارێم
لەبۆتو تەمام نەکردی
ئەتو وەرە بەچاوی خۆت خەزارێ ببینە
بزانە نەوعی خەزارێ لەدنیایێدا چییە
ئەرێ دەرێ کورە مارت وێران بی دەروێش
کو دەگەمە خەزارە شۆڕی مەلا نەبییە
دەرێ رەبی مارت وێران بی
لەتو وابی ئەو پاشازادەیە لەدنیایێ
هەر لەبۆ توە لەبۆ کەسی دی نییە
مادام وابی لەبەر خۆکە بەرگەکی دەروێشی
کەشکۆرەکی باوێ ملێ
داروەکازەکی بەدەست وەبگرە بگەرێ لەدنیایێ
بپرسە لەهۆبەی مەلا نەبی
دایمەن بەدایم مارێ مەلا نەبییان
رەشماریان لەسەر هەژدە تیرەگان هەردرایە
خەزارە شۆڕ لەبەر دەرگەی تاورێ تاورێ هەر وەسـتەی
کردی
ئەوجا بە چاوی خۆت خەزارێ ببینە
ئەگەر بڕوا دەکەی بەوخالیقەی لەژۆری سەری
ئەمن هێشتا مەتحی خەزارێم لۆ نەکردی )).
دوعــا بوونی لە لاسی خـواست و لێـیـدا بەرەو خــوار
گـەراوە، دەروێش دوو کـەشکۆری زێڕی وەرگـرتـیـە، لە
هەورازان هاواری چاک و پیران دەکا، لە نشێوان کەسی بە
بیرنییە، دێتە خوارێ لۆ هۆبەی مەلا نەبییە، دەرێ لەوەتی
ئەوێ رۆژێ هۆبەی مـەلا نەبیـیـانیش، دەروێش رۆییـە،
هەموو رۆژێ خەزار دێتە دەرێ دەست بە گریان دەکا.
دەرێ مـامـە دەروێشـمـان لە حوربانێ مـە، سـەری چەند
سـارەت رابواردیە، ئەویش بزر بوو بی ئەسـەر رۆییـە، دەرن
لۆ دەگـرێیی کـارکـەرو نۆکـەر، دەرێ لەبۆ مـامـە دەروێشی
عـەبدییە، ماروەنداری بێ ساحێب ماوەی کەس ئاگای لێ
نییە.

دەرێ لە نکاوەکی شوان و گاوان چاویان بە دەروێشی کەت، خەبەریان لەبۆ خەزارێ بردو هەراتن چوونەوە گۆتیان لە تۆمان مزگێنییە خەزارە شۆڕی مەلا نەبییە، مامە دەروێشی عەبدی هاتەوە لەبۆ هۆبەی مەلا نەبییە، ئەوجا گۆتی بگرن دەودەمێ بەخشیشی مامە دەروێشیە، دەرێ بە پیل دەروێشی وەهات، لە دوورا هاواری کردییە.

((ئای..

ئەوجا دەرێ خەزار بە پیر دەروێشی وەهاتییە
لە باتی سەلام و کەلامی لە دەروێشی نەکردییە
دەرێ ئەرێ کورە مارت وێران دەروێش
لە بۆ منت هێنایە جوابی لاسی ئەحمەد بەگی شارەزوورییە
یانە نییە
ئەوجا دەروێشی مار وێران لێی قیراندی
دەرێ رەبی مارت وێران بی لەگە خەونی دیتیت
لەسە جێ و بالینگانانم دەبیست هەندەش باوێمە سەرێ

لەبۆ لایەقەتی لاسە شۆڕی لە دونیایێدا قەت درۆی تێدا نییە
ئەوجا دەرێ رەبی مارت وێران بی
ئەوێ رۆژێ گەیشتمە بەردەکەی دیوانێ لاسی
ئەوی رۆژێ لاس سوار دەبوو راوی حەفت شەوو حەفت رۆژ رۆیی
بەران لەسەر پشتی شێخ غەزالی دەتگۆ شێرە
لە چەمیدا غەزرییە
رەبی ماری ئەو لاسە وێران بی
پێنجسەد عەگید لە لای راستی سوار دەبوو
هەموو زرێی داودی لەسە شانی
حەمو شیرو رووتەی گورگانی بەدەست ودرگرتییە
هەموو رمی لە تەنکێشی وراغییە
ئەوجا لە لای چەپی لاسی سوار دەبوو پێنجسەد عەگیدی دییە
ئەویش هەموو بازو شەهێن و سەقەری لەسەر دەستییە
بەران لە دوو لاس بار دەکرا چەن چەند هێستری بارەبان

لە گۆشت و لەبرنج و رۆنییە
لە بۆ راوی حەفت شەوو حەفت رۆژەی گەر لاسییە
ئەگەر بروا دەکەی ئەمن لە دیوانی لاسی
پام دایتەوە وەکی تەداتی
بەران کە خواردن لەبۆ دیوانی لاسی دەهات
هەر بەدوو پیاوان سێنییەکیان دادەنا
کەس نەیدەزانی ئەو تەماعە چییە
رەبی مارت وێران بی
ئەگەر بروا دەکەی بەو خالیقەی لەژۆری سەری
ئەو باقە گورو رەحان و سوسن و هەرارو بەیبوونەی
بەدەستی خۆی پێچا لەبەر دەرکی دیوانێ جای
لەوێرا بۆ توی بەدیاری ناردی
ئەوجا دەرێ مارت وێران بی خەزارە شۆڕی مەلا نەبییە
بەران ئاگات لەخۆبی لەدنیایێدا
چیدی ئەو رەزیلیەی کە لەمارێ بابت لەدنیا دی
نەکو لاس گەلە بەفکرو ئاقرە بگەڕێ لە دنیایێدا بە دەروێشی
بێ سەعەت کاتەوە بزانی پیاوەتی خەزارێ چییە
ئەگەر بتبینێ بە رەزیلی دەگەڕێتەوە خۆت نیشان نادا هەر بە یێکجارییە))

ئەوجا دەرێ کەوەی بەخەزارێ گۆ، خەزار هەرستا کەشکۆری لەدەروێشی وەرگرت، کەشکۆرە زێڕەکی لۆداگرت، دەرێ دەروێش چۆوە دوو سێ دەروێشی تێگەیاند، گۆتی سبەینێ لەگە نوێژی بەیانیان برۆنە بەردەرکەی مارێ مەلا نەبییان، هەق و هوی بکەن، کورە گۆتی: ئەمە بە نیوراِنان ناوێرین کەوچکە رۆنەکمان نادەنێ دەکەونە دومان، گۆتی: برۆن ئەمن شەریکتانم، دەرێ سبەینێ لەگە نوێژی بەیانیان، دوو سێ دەروێش گەیشتنە بەردەرکەی مارێ مەلا نەبییان، هەق و هۆیان کردن، دەرێ تاریک بوو هێشتان، دەرێ کارەکەر و نۆکەر لێیان هاتنە دەرێ، گۆتی قەحپەباب دەروێش بەو بەیانییەی بەردەرکەو لەمە گرتییە، ئەو هەق و هوەو لەبۆ چییە، چییە چتان دەوێ بەو نوێژی بەیانییە، دەرێ خەزار لەخەوێ دا راپەری، کچێ گۆتی: ئەستی و خوبی و رابیە، بدەنە مام دەروێشی مەنجەرێ زنجیردار بەیێکجارییە، دەرێ کە مەنجەرێ زنجیرداریان راکێشا، دەرێ بەسێ چوار کارەکەران دایانە دەروێشی، دەروێش هات گەیشتنێ لەگەری راکێشا روونی شی برد، دەرێ هەر دەروێش فێربوون هەق و هویان دەکرد، دەرێ روونی دەدانێ، ئەوێ سارێ مارێ مەلا نەبی

رونیشیان دەخرى هێوارێ شیو نەدەما لێنێن، هەر دەیدا دەروێشان، دەروێش فێر بوون وازیان لەخەزارێ نەینا.

لاس فكرى كردەوە، گۆتى یا رەبى بەمن دەرێن لاسى ئەحمەد بەگى شارەزوورى ساتیى دوازدە هەزار مارى جافییە، عالەم لەشایى و گۆوەندە لە بەزمە لەسەیرانە، لەژن هێنانە لەشایى و بەرخ تێبەردانە، ئەمنیش دانشتیمە لەدیوانێ بەتاقى تەنێ، لاسە... ساحێبى دوازدە هەزار مارى جافییە، چى لۆمن تێدایە ئەوە؟ دەرێ شەوێ نیوەشەوێ هەرستا زرێى داودى هاویشتە سەرشانى، شیرى راستەوچۆیەى لەخۆدان، بەرگەكى دەروێشى دیتەوە لەبەرەخۆى كردن، كەشكۆرەكى هاویشتە ملى دار وەكازەكى درێژى پەیدا كرد، دەرێ نیوەشەوێ لەناو هۆبەى جافى هاتە دەرێ، گۆتى خوایە بەتەماى تو، نەیدەزانى كێوە دەروا، ملى رێى گرت.

( ئاى...ئەوجا دەرێ لاس دەگەرێ بە دەروێشییە
لەبۆى دەینێ چیلكە نانییە
نەوەردەگرێ نانییە نە وەردەگرێ رۆنییە
هەندەكان كیژوكاران دەكەنە پیرێژنەكى حیز و دزییە
گەرى خۆیان بەپیرێژنێ گرتییە
بە وەختى خۆى بیست و چار مێردى كردییە
ئەرێ دەرێ لاسى دەروێشە
نە وەردەگرى نانى وەردەگرى رۆنى
دەرێ رۆرە رەبى چاوى داكى دەروێشى كۆرەبى
بەژنى دەروێشى منى شترە نەمامەكانى لەباغاندا
روومەتى دەروێشى دمنى تۆیە گورى
سمێرى دەروێشى دەمنى پەرى تاوسییە
ئەو دەروێشى دەگەرێ لە دنیاییدا
نە حەوجەى بەنانییە، نە حەوجە بە رۆنییە
ئەوجە سەرى چەند مانگ و ساران دەگەرێ لە دنیایێ
عەبدارى دودرییە ).

ئەوجا دەرێ دەروێشى لێیدا هاتە خوارێ، هۆبە بەهۆبە شار بەشار دەپرسى، هەتا نێزیك بۆوە لە هۆبەى ئالى داودیان لەبەر دەركەى دیوانى پرسیارى لێكرا وەكى گەیشت، گۆتى مامە دەروێش لۆ تەنگاوى؟ نەفەسى بڕییە، ئافرەت لە بەدەنێدا هاتییە؟ مارم خرابى لۆ لە هۆبەى مەلا نەبییان دەپرسى؟ دەرێ لێرە تێرنان بخۆ تیسراحەتەكى بكە، دەزانى ئەوسارە خەزارە شۆرى مەلا نەبییان رونى لەدر لەخۆ گرتییە، لۆیە تەنگاوى بگەیە هۆبەى مەلا نەبییان مەنجەرە رونەكى وەربگرى؟ بە دەروێشییە، گۆتى بەینى مەو بەینى هۆبەى مەلا نەبییان دوو گەروو مایە و نیو سەعاتە رێ چیدى نییە، دەرێ كە وەیگۆ لەلاسى وابى تازە لەدایكى بەوەلەد بووە، دەرێ كەشكۆرى هاویشتە ملى دار وەكازى بەدەستەوە گرت، هاتە خوارێ لۆ هۆبەى مەلا نەبییە، دەرێ كە نێزیك بوو لە هۆبەى مەلا نەبییان لە دوورا ژماردى رەشمارێ مارێ مەلا نەبییان بەقسەى مامە دەروێشییە، تەماشاى كرد خەزارە شۆر لەبەر دەركەى راوەستایە هەروەستەى كردییە، دەستى لەسەر ئەستوندەى گرتییە، دەرێ وەكى چاوى بە دۆرواوێ خەزارێ كەت، گۆتى دەك مارت وێران بى مامە دەروێشى عەبدییە، چ مەحتى خەزارێى لۆمن نەكردییە لایەقەتى خەزارێ، ئەگەر ئەمن دەروێش بم بیست هەندەش باوێمە سەرێ، چم لەبۆ لایەقەتێ خەزارێ تێدا نییە، ئەوجا دەرێ سەبر سەبر چووە پێش خەزارێ كەشكۆرى لە عەردى گیر كرد و هەق و هوى كردییە.

( ئاى... ئەوجا دەرێ دەروێش كەشكۆرى لەعەردى گیر كردییە
رەبى مارى خەزارێ وێران بى هاوارى كردییە
لەكارەكەر نۆكەرانى راخوڕیە
ئەوجە دەرێ كچێ ئەستێ و خوبى و رابى
دەنگۆ لەبۆ مامە دەروێشى بینێ رۆنى رۆژییە
ئەرێ دەرێ كورە مارت وێران بى مامە دەروێش
بەتوكەمە بەو خالیقى لەژۆرى سەرى
لەو مەنجەرە زنجیردارەى ئەوەشم بەدرەنگەوە
دونێ هێوارێ بەخۆم گەرم كردییە
ئەوجا دەرێ رەبى مارى لاسى وێران بى
لێى بەجواب هاتییە
ئەرێ دەرێ كورە مارت وێران بى
خەزارە شۆرى مەلا نەبییان
ئەگەر بروا دەكەى بەو خالیقەى لەژۆرى سەرى
ئەمن نەدەگەرێم لە رۆنییە نەدەگەرێم لەنانییە
هاتم بزانم پیاوەتى و كەرامەتى خەزارە شۆرى

لەدنیاییدا چی
ئەمن ئەوشــۆ لێــرەمــە لەهۆبەی مــەلا نەبیــیــان بەمێواندارییە
بەران سبیانێ لەگەر نوێژی بەیانیان
هەر دەگەڕێمەوە لەبۆ شارەزوورییە).

لێیدا لاس بۆ دیوانی مەلا نەبییــان رۆیی، لەوی وابی دیوانی نیــیــە، هەنكوە بچی برێن بەخــێــر هاتی، دەرێ گەیشتە دەركەی دیوانی سەلامی كرد. كەس سـەلامی لێ وەرنەگـرتەوە، مـەلا نەبی چاوی بەدەروێشی كـەت. گـۆتی هەک قــیــامــەتت لێ هەسـتی بەزاتی خـوای لێناگـەرێن شێوەكی بەروونەكەی بخۆین هەوسار دەروێش لێمان بوینە ئەوە، دەرێ كـەس نەیگۆ بەخــێــر هاتی لەلای پێــراوان دانیشت، هەتا هێواری، دەرێ هێواریش جوامێر لەدیوانێ خڕ بوونەوە، سـەد دوو سـەد زەلامی هۆبەی هاتن، مـارێ مەلا نەبی شێویان كردییە، دەرێ لاس لەدری خـۆی گـۆتی یارەبی خـوایە ئەگـەر مـەخـسـەدت بی شـتـەک ئەدا بی، ئەوهایە، ئەو شیوە كە لێندرایە خەزار ئەگەر بە خۆشی لێی نەنابی، هەروەسـتـەی لەدیار كردییە، بۆنی خەزارتیی لێدێ، ئەورۆ لێرە تێر دەخۆم چەند رۆژە ئەمن دەگەڕێم بەدەروێشی چم نەخـواردییـە، دەرێ ئەوێ رۆژێ مـاری مـەلا نەبیــیــان ئەوەل دۆینەی بەزرەی پونگیــان لێنایە، هۆبەیان دەعــوەت كردییە، دەرێ هێوارێ گۆتی برۆن شیوی بێنن، وەكی هاتە دەرێ تەمـاشـای كـردێ تەشـتـەكی لەسـە سـەرییـە، تەشت شەش حەفت مراكی داری لەناو داندرایە، دەرێ زرە پونگی كویستـانێ لەناو دۆی راكێشایە دەمنی كاریـتـەیە لەئاوێت راكردییە، دەرێ دایان نا لەمەجریسێ دەسـتیـان بەخواردنێ كـرد، كـەس نەیگۆتە دەروێشی وەرە پارەكی بخـۆ، دەرێ ئەوێ دەمێ لاس فكری لەبەرەخۆ كـرد فرمێسـكی لەچاوی هات، دەک گـوتی: عـەمـرت نەمـینێ بەمن دەرێن لاسی ئەحـمـەد بەگی شـارەزووری سـاحـێـبی دوازدە هەزار مـارە جـافــیــیــە، رۆژێ دوو هەزار كــەس لەدیوانێ من برنج و گۆشتی لەبەر دەمـینێـتـەوە، لەبەر تاژی و تووله و سـەیان روو دەكرێ، چ بەحسی نییە، لێرە نازانم شیوەكەش چییە، خۆ نارێنە مێوانی وەرە پارەكی باوێ سەر دەویە، زۆریشی برسـیـبـوو دەرێ دانیـشت هەتا ئەوان خـواردیان، چركـاوی دۆینەی چ بمینێـتـەوە، مـەلا نەبی گـۆتی: دەبزانن دەروێش دوو سێ مراكـان ناخوا؟ گۆتی ناوەڵلا مەلا نەبی لەهۆبەی حاجی داودیان نیوڕوانێ هەندەم نان و رون و كەرە خواردیە لەنیـوڕوانێـوە لەبەر زگم چ عـەجـمـانم نیـیـە، قـەت چم پێ ناخـورێ، دەرێ هەتا سـەعـات بووە دوو و سـێی شـەوێ، مەجریسی ئیختـیـاران هەرستا، مەلا نەبی هەرستا چوو لۆ مارێ بچـتەوە، بووە مەجریسی جاحێران، شوان، گاوان و جاحـێر دەرێ بووە بەزم و سـەیران ئەو گـۆتی مـام دەروێش چشـتـەكـمـان لۆ برێ، ئەمن هێلكەت لۆ دەینم، ئەو گـۆتی ساواری دەینم، ئەو گۆتی رونی دەینم، وەڵلاهی گۆتی كاكە چی ئەوها نازانم لەرێیێ دووسی كـەلیـمـان فـێـربوویە، دەترسێم ئەو دووسێ كەلیمەش و لۆ برێم یان لێم بدەن یان غـەدرم لێبكەن، دەرم بكەن، دەرێ ئەوی خەنجـەری پێ بوو خەنجـەری هەركـێـشـا، كێ حـەدی هەیە دەنگێ بكا، ئەوی شـوان بوو قـووتە گۆپاری هەردەوەشـاند دەیگۆ كـەس هەیە برێ مـەرێ، برێ وەڵلاهی گـۆتی لۆتان دەرێم دەشـــزانم تووشی رەزالەتیشم دەكەن.

(ئای... ئەوجا دەرێ لاسی مارویران
بەدەروێشی لەبۆشوان و گاوان و جاحێری هۆبەی مەلا نەبییان
دەستی بەگۆتنی كردییە
بەران ئەو گۆتنەی لەبۆ وان نەگۆتییە
ئەرێ دەرێ كورە مارویران بی
بریا دارەک بامە لەبن داری سێوی
ئەمان شێن باما لە ئەترافی سولەیمانییە
لەبن لكەكەم دابنیشتبایە گۆمی كوانەكانی كۆییە
ئەمان گەورەو عەیانەكی كەركووكییە
لەبن لكی دیم دابنیشتبوایێ
ئەمان گەورەو عەیانەكی كەركووكییە
بەران لەبن لكی دیم دابنیشتبایێ
بەتاقی تەنێ خەزارە شۆڕی مەلا نەبییە
ئەرێ دەرێ بریا دارەک بووماێ لەداری رۆرەكییە
ئەمن كەتبامایە دەست دۆمان بیاندامایە لە قەراتییە
ئەمنیان بكردبامە بە تیرۆگەكی خاسەرەنگییە
بیـانگێـرابوومـایە لەناو هۆبەی مـام سـار و رەوەند و خەیلانی و بارەكی
بەشكو تیرۆگی مارویران

خەزارە شۆڕی مەلا نەبییان کیژ بوو لەمارە بابان
لەبۆ خۆی کڕییە
بەران سبەینان هەموو سبەینان
لەهەنگوتک بڕینەوەی دری نەهاتبا
تیرۆگێ دابنێ لەکن ئاگری قشپلییە
سەرەکی هەر دادەنێ لەسەر هەرامە شلکەیێ دەرانییە
ئەرێ دەرێ وەی مارو وێران بی
بریا دارەک بوومایە لەداری شەنگەبی
بەران لەبن لکەکم دابنیشتبووانە
کۆزو کوارەکانی کۆیی
سەر بەهێزارو لیفکە شۆڕی دزەیی
بەران لەبن لکەکی دیم دابنیشتایە بەتاقی تەنێ
بەس خەزارە شۆڕی مەلا نەبییە
ئەوجا دەرێ رەبی ماری وێران بی ئەوەندەی گۆتییە
شوان و گاوان و جاحێر دەورەیان لە دەروێشی گرتی
ئەوی دەستی نەدەگەیشتە سەرە داری
لۆ هورگی رەوان کردییە
ئەرێ دەرێن سەبابی دەروێش
ئەتو ئەو بەندەت بەکیژە ئاغای مەدا هەرگۆتییە
بەو شەوەی نەچییە دەرێ دەناو هۆبەی مەلا نەبییان
ئەلعان سەرت دەبڕین لەناوەندی دیوانێ هەر بەیێکجارییە
ئەرێ دەرێ کورە مارو وێران بی
شوان و گاوان و جاحێر هێواری خەبەرم بەنگۆ گەیاندی
پێم گۆتن سێ کەلیمان فێربوویە لەشوان و گاوانی گوندی
ئەوەندشو لۆ دەرێم بەیێکجارییە
مادام وەشو لێکردم
ئەوشۆ لێم گەرێن بەشەو دنیام نەدیتییە
شارەزای ئەو مەملەکەتەی نیمە
بەران سبیانێ لەگەر نوێژی بەیانیان
هەر دەچمە دەرێ لەهۆبەی مەلا نەبییە
ئەوجا دەرێ شوان و گاوان و جاحێر لەهۆبەی مەلا نەبییان
لەحەژمەتان چونکە بەندیان بەکیژە ئاغەی دا هەرگۆتی
هەر بابا بوو هەردەستا لەدیوانێ
ئەوی جاحێری دێهاتی بوو

هۆشی لە بەدەنێ خۆ نەدەما نەدەگەیشتە سەرجێ و بالینگانان
لەبەر دەرکی هەمووی لەسەر چاوان درێژ دەبوو
دەستیان بەنارەنارێ کردی
ئەوی شوان بوو دەستی دەدا گۆپاری
بەو شەوەی مەرێ لۆ ئاقاری بردی
ئەوجا دەرێ مارو وێران بی
خەزارە شۆڕی مەلا نەبییان لەسەر جێ و بالینگانێ خۆ
خەوی لێ نەکەت و گۆتی ئەو سەبابە دیارە دەروێش نی
ئەگەر دەروێش بایە دوونێ مەنجەرە روونەکم داێ
پارەکی بخوا بەمارو مندارەوە خلاس دەبی
رونی لەمن وەرنەگرتییە
دەبا بچمە دەرێ بەندەکی بەو دەروێشەی دا هەر برێم
ئەگەر دەروێش بی بەراستی
سبەینێ دەچێتەوە بەشکە دەرێ
کیژی مەلا نەبی قەحپەیەو بەکاروانێ رەوی
ئەگەر دەروێش نەبی بالێم ئاشکرا بی
تەقم کرد سەری لەمن گۆڕی لەسە جێ و بالینگانان
چ ئاگام لەخۆنییە
ئارێ دەرێ لەدیوانێ خەزاری دەهاتە دەرێ
لەسەجێ و بالینگانان لەبۆ دەرکی دیوانێ بابی هاتی
ئەوجا دەرێ لاسی گەلە بەعێجزی
لەسە جێو بالینگانان پاری دایتەوە
هۆشی لەبەدەنێ خۆدا نییە
لەبەر دەرکەی هاواری کردییە
ئەرێ دەرێ کورە مارت وێران بی مامە دەروێشی عەبدییە
بەتوکەمە بەو خالیقەی لەژۆری سەری
هەستە وەرە دەرێ
بزانم مەخسەدی ئەو سێ بەندەت
لەکن شوان و گاوانان لۆ بەمندا هەر گۆتیە
ئەرێ دەرێ لاسی مارو‌ێران لێ بەجواب هاتی
دەرێ رەبی مارت وێران بی
وەی خەزارە شۆڕی مەلا نەبییان
بەتوو کەمە بەو خالیقەی لەژۆری سەری
ئەگەر بڕوا دەکەی هێوارێ لەهۆبەی مەلا نەبییان
گەلەکم دۆینەی بەزرە پونگی مارو‌ێران خواردییە

دۆینە لەزگی من نەکەتییە
لەئێوارێوە عەجمانم نی
ناتوانم لەجێ یێ خۆم برندبم بێمە دەرێ بە سەلامەتییە
ئەمما بەتووکەمە بەو خالیقەی لەژۆری سەری
ئەوجێ لەدەروێشی نا هەتا ناوەندی دیوانێ
بەرتەنکی دەروێشی هەر بەیێکجاریە
ئەوجا دەرێ رەبی ماری لاسی وێران بی
**کەوەی گۆتیە، دەرێ خەزارە شۆڕی مەلا نەبییان وەخۆی نەگرتییە**
**سـەبر سـەبر بەپەنجـەکـەی بەخـەنە دەرکـەی دیوانێی ترازاندو**
لەبۆکن لاسی رۆیشت سەلامی لێکردییە
لەبەری برند دەبوو بەگزادەی جافی
ئەرێ دەرێ کورە مارت وێران بی شەوت لەمن گۆڕییە
دنیات تاریک کردییە
تـوخـوا ئەگـــەر پێم نەرێی ناوو رەســەنی بابی خــۆ بەتەمامییە
ئەوجا دەرێ وەی خەزارە شۆڕی مەلا نەبییان
ئەگـــەر بڕوا دەکـــەی ئەمنم لاسی ئەحـــمـــەد بەگی شارەزوورییە
ساحێبی دوازدە هەزار ماری جافی
ئەمن سەبارەت بەخەزارە شۆڕی مەلا نەبییان
بەرگی دەروێشیم لەبەرە خۆ کردییە
کەشکۆرم هاویشتە ملی داروەکازم بەدەست وەگرتییە
لەهەر چار ئیقلیمی دنیایێ
گەڕام و پرسیارم کرد هەتا گەیشتمە هۆبەی مەلا نەبییە
ئەرێ دەرێ رەبی مارت وێران بی
وەکی دەرێن لاسی ئەحمەد بەگی شارەزوورییە
ئەگەر بڕوا دەکەی ئەمنم خەزارە شۆڕی مەلانەبییان
لەوەتی ئەوێ شەوێ لەسەر جی و بالینگانان
خەونم بەدرێ خۆ دیتییە، چاوم بەتو کەتییە
لەمن وابی لەپاشی لاسی مێر لە دنیایێدا نییە
ئەوجا خەزار دەگەڕاوە لەبۆمارێ رۆییە بەشەرتی پانی
بەران ئەوێ شەوێ کاشیر لەمارێ نی
دەگەڕاوە لەبۆ مارێ رۆییە
چەند کەچە کورتانی پیرە بارگینی
رەوەند و خەیلانی و بارەکیان هەبوو

هەمووی لەسەر پشتی بانی مەلا نەبییان کەرەک کردییە
ئەگـەر دنیــاش خـرابی نەتوانی راست بیــتــەوە بە سەلامەتی
ئەوجا مەلا نەبی دەستی بەهاوارێ کردییە
دەیگۆ کیژم مارت وێران بی زێدە لەشەوان
ئەو بارگرانییەت وەسە نەخستم
هەرما هۆشم لەبەدەنێدانی
ئەرێ دەرێ مارت وێران بی بابە
بڕوا دەکـەی هێـوارێ لەبەرخ گـرتنەوەی گـەلە گـەلەکن ئارەقە کردییە
ئەوشـۆش پایزی لادەدەن لە کـوێسـتـانی وان دەسـتـەی بەنەرمییە
نەکو بتهەنگێوی بەئیختیاری
لۆیێ ئەمن ئەتوم گەرم داپۆشتییە
ئەوجا دەگەڕاوە لەبۆ کن لاسی
-دەرێ لاس لەبەرەخۆی دەکردەوە بەرگی دەروێشیە
رەبی ماری لاسی وێران بی
دەتگۆ شێرە لە چەمیدا غەزرییە
ئەوجا دەهاتە بەری پاشازادەی جافی
زرێی داودییەی لەسە شانییە
شێری راستەو چۆپەی لەبەدەنی
بەران لەگەر خەزارە شۆڕی مەلا نەبییان
دەستیان بەگفتوگۆ و گەمەو سوعبەت و سەیرانی کردییە
ئەگەر بڕوا دەکەی لەبەر هات و چۆیێ یێکدیان هێنایەو بردییە
تیرەگەی رەشماری ماری نەبییان لەگە لەرییە
ئەگەر بڕوا دەکەن
لەبەر درو داوار و یاقوتی بەر خەزارێ
ئەوێ شەوێ مەڕێ مارێ مەلا نەبییان
چتاقی هەوێزی نەگرتی
بەران شونەکیان هەبوو ناوی (کەرکان) بوو
(کـەرکـانی ) سـەباب کـەیفی خـەزارە شـۆڕی مـەلا نەبییانی دەینا بە راستی
وەکی چاوی بەو عارەی کەتی
دینای لێ وێک هاتییە
هەمووی بەچاوی خۆی دیتیە
دەرێ کە نوێژی بەیانیان داهاتییە

خەزار گاسی دەکرد لاسی ئەحمەد بەگی شارەزوور
مارت وێران بی هۆشت لە بەدەنێدا نییە
ئەتو ئاگات لە خۆ نییە
وا بەیانی بەردا بە یێکجارییە
بزانم راوو تەگبیرت لەسە چییە
ئەوجا دەرێ لاسی مارویران لیّی بەجواب هاتییە
دەرێ وەی خەزارە شۆڕی مەلا نەبییان
خۆ من لە شارزووریّ نیمە حوکمێ بکەم
لەسەر دوازدە هەزار ماری جافی
ئەمن لێرەمە لە هۆبەی مەلا نەبییان بە دەرویّشی
ئەورۆ راو و تەگبیر لە دەستە توە لە دەستە من نییە
ئەرێردەرێ کورە مارت وێران بی بەگزادەی جافی
مادام هەندە بە عەجەلە دەگەرێییەوە لەبۆ شارەزووری
ئەتو لێرەبە سبیانێ لەکن بابم مەلا نەبی
داتدەمەزرێنم چ بە بەرخەوانی چ بە قاوەچییە
رەبی مارت وێران بی).

ئیزنی لە لاسی خواست و هاتەوە دەرێ چووە سەرجێ و بالینگانێ خۆی، هاواری کرد گۆتی شوانە شوانی (کەرکانە)، ئەوشۆ زێدە لە شەوان لۆ مەرت شەوێن نەکردییە، ئەوا بەیانی بەردا بە یێکجارییە، تا بابم هەرنەستایە لە خەویە، ئای گۆتی مارت وێران بی خەزارە شۆڕی مەلا نەبییان، چمان ئەتۆ نانی گەرمت لۆمن عازر نەکردییە؟ ئەی گۆتی مارت خرابی کەنگی ئەتو وێرای لەبۆ نانەکی سارد برێیە خەزارە شۆڕی مەلا نەبییان، هەنجەتی نانی گەرمت بەمن گرتییە، هەستە مەری باژۆ نایێلم رۆژ هەرێ نانت دوو بەدوو دەنێرم بە سوارییە، دەرێ (کەرکانی) مارویران قوتە گۆپاری گرت و فرێدا، هاواری کرد گۆتی خەزارە شۆڕی مەلا نەبییە، بەتوکەمە بەو خالیقەی لەژۆری سەرییە، ئەوشۆ لەخەوێدا چاوم پێکەتییە، دوو لایەق پێکدی گەییینە، چەند جارێ یێکدیان هێنایە و بردییە، هەژدە تیرەگەی رەشماری مەلا نەبییان لەگە لەریە، لەبەر دورو دەوارو یاقووتی چ تاقە مەرێ مەلا نەبییان هەوشۆ هەوێزی نەگرتییە، تازە ئەو شوانییە لە دنیایێ لەبۆ من چییە، قوتە گۆپاری گرت فرێی دا گۆتی تازە ئەو شوانییەی ناکەم، دەرێ لێیدا (کەرکان) مەری بەجێ هێشت دەرێ مەر لە هەوێزی ماوەو سبەینێ مەلا نەبی لەخەوێ هەرستا گۆتی کیژم خەزارە کاکت لەمارێ نییە عیلاجەکی کە، بەرخەوانیان ناردە بەری مەری، بەرخ لە هەوێزی ماوە، گۆتی بابە بچم بزانم نابینمەوە کەسەکی؟ دەرێ چوو لەبن رەشمارێ بڕەک خۆی خافراند، هاتەوە گۆتی وەڵلاهی بابە مندارێ ناو لانکانیش بێ ئیش نییە، ئەورۆ رۆژی بەرخ بەردانییە؟ عالەم مەشغولە و ئەوەیەو بەران ئەمە دەروێشەکمان مێوانە و لۆ ئەو دەروێشەی نەگرین یەکجاری بە بەرخەوانی؟ با حەقی خۆی لەناو مەری حسێب کا بە زیاد، گۆتی کیژم بکە لەراهی خوای ردێنم لەگە ردێنی دەروێشی تێکەر مەکە، دەروێش فێرە چینکە چینکەی نانی و کەوچکە کەوچکەی رۆنی، بەنان و ژاژی لۆمە کو دەشتە ئەقاری؟ گۆتی: بابە ئەو دەروێشە نیوچەوانی زۆر نورانی و خاوێنی هەیە، دەزانم دەکا، گۆتی: دەگازی کە، گازی کرد دەروێش، گۆتی ها گۆتی ئەوەلی عومریتە خانەخرا، عومرت بیست ساری تەمامییە کەشکۆرت لەملی کردییە داروەکازت بەدەستەوە گرتییەن شەرمت بەخۆ نییە، تازەت تۆبە کردییە، وەرە ببە بەرخەوانی مە تا بەرخ لەمەری دەکرێتەوە، حەقی خۆت لەناو مەری بەزیادی حسێب کە، هەنگینێ ئەو تۆبەی فرێ دە، دەرێ دەروێشیش گۆتی وەڵلاهی دەنا مادام وابی ئەمن تازە ئەو تۆبەی ناکەم، دەرێ کەشکۆری گرت فرێی داو لەبەر دەرکێدا کردییە هەزار پارچە و گۆتی یا شێخ بگرە وەختی تۆبە کردنێم نییە، دەرێ هەستا قوتە گۆپارەکی لۆ هینا، بەرخی لەهەوێزی راقەناند، دەرێ خەزار گەراوە گۆتی بابە گۆتی ها گۆتی ئەو فەقیرە دەروێشە شارەزایی بە پووش و پاوان و ئاقاری مە نییە، هەنکوە دەچی تێ بەرللا دەکا لەوی وابی دەرێ هەموو هی مارێ مەلا نەبییە، عالەمیش دێنە سەروگوێی مە، گۆتی کیژم وەڵلاهی دەنا عیلاج نییە.

دەبێ هەورۆکە ئەتو بچی فێری بکە، برێ ئێرە نەخورایە و ئێرە پاوانە و ئێرە ئی مەیەو، گۆتی وەڵلاهی بابە ئەورۆ زۆر نەخۆشم، بەران لە مەلاشم زانییە، دەرێ ئەگە ئەولاد قسەی باب و داکی شکاند بەحەشتێ بەچاوی خۆی نابینی، عیلاج نییە دەچم، دەرێ لاسی بەپێش بەرخان یێخست بەخۆ بەلەچکە چارۆگان کەتە دوو بەرخان هەتا دوو سێ گەرووی لەماران ئاوا بوون، چوو لەباتی پووش و پاوانێ بابی پووش و پاوانێ خۆی هینا مەیدانێ، دەرێ

نەیانزانی بەرخ لۆ کێها مەملەکەتی رۆیی، هەتا ئێوارێ دەرێ ئێوارێ گەڕانەوە.

دەرێ بێینە سەر بەحسی (کەرکانی)، دەرێ (کەرکانی) مارویرانیش خوا غەزەبی لێگرتییە، چونکوو چاوی پێکەت خەزاری وەلێکردییە، دەرێ خەزاریش لەباتی نۆخینان لە (مەمەندی ئاری وەیسیان) مارە کرایە، مامەندی ئاری وەیسیان لە لاسی زەبر بەدەست ترو هیلاکترە، دەرێ لێیدا لەبۆ کن (مەمەندی) خەبەر بداتە (مەمەندی).

(ئای... ئەوجا دەرێ کەرکان
وەکی دەگەیشتە دیوانی مەمەندی ئاری وەیسییە
هەر لە دەرکەی دیوانێ دستی برند دەکرد و
بەدەستی عیشارەتی بنەبانی دیوانێی
لەبۆ(مەمەندی ئاری وەیسیان)سەلامی کردی
ئەوجاقاوەچی لێی برنددەبووهاواری کردییە
شەقەکی لەبنی گێی گیرکردییە
دەرێ مارت وێران بێ شوان وگاوان
ئەوسەلامەت لەبۆ(مەمەندی ئاری وەیسیان) لە بۆچی
وەرەدانیشە لەناو پێراوان
ئەگەر بەبەرت قاوەکێ باوێ سەردەویە
نەکو ملت بشکێنە لەبۆچۆل وبەریە
ئەو جادەرێ رەبی ماری (کەرکانی) وێران بی
دەیقیراندو سەلامی کردییە
دەرێ مەمەندی ئاری وەیسیان چاوی پێکەت و
گازی کەرکانی کردییە
بەران کەرکانی مار وێران لەسەر شەرمانی بردی
دەرێ هاواری کردو سەلامی لێ کردییە
دەرێ بەتو دەرێن مەمەندی ئالی وەیسی
رەبی مارت وێران بی
لە هەر چار ئیقلیمی دنیایێ ناوبانگی خۆت دەرکردییە
دەرێن شێرەکی وەکی مەمەندی ئالی وەیسی لە دنیاییدا نی
ئەگەر بروا دەی بەو خالیقەی لە ژۆری سەرییە
ئەوشۆ دەروێشەکی ماروێران هاتییە
چەند جارێ بەژنی خەزارە شۆڕی مەلا نەبییان لەگەلەرییە
لەبەر دورو دەوارو یاقوتی بەر خەزارێ
چتاقی مەڕی مەلا نەبییان هەوێزی نەگرتی
ئەمن شوانێ وان بووم
چاوم بەو عارەی کەت و غیرەتم قبوری نەکردو
لۆیە مەرم بە جێهێشتییە
ئەوجا دەرێ کە لە دیوانێ وەیگۆ
مەمەند لە دنیایێ چاوی عەردی نەدیتیە
سەری بەسە عەردی دادەگرت و
مووی دەردە پەڕین وەکی سەری دەرزی
بەران دەستە راست و دیوانی دەورەیان لە مەمەندی گرتییە
دەرێن حەیف لۆ شێرەکی وەکی مەمەندی ئاری وەیسییە

لە هەر چار ئیقلیمێ دنایێ ناوبانگی خۆی دەرکردی
کەس نییە لە دنیایێ
دەستی لە بە دەستی تو هەر دابی بە راستییە
رەوسەی شوان و گاوانان خۆ لە دیوانێ هیشک کردییە
نوتقیان لەبەرە خۆ برِیە
مادام وابی هەرستەو سەر رووی
ماروێران قاقەزەکی بنووسە لەبۆ مەلا نەبی
دەبا بوکی حازرکا
دەیگۆزینەوە بەسێ رۆژی دی هەر بە یێکجارییە )

دەرێ کە وەیان بە مەمەندی گۆ، مەمەندی سەری راست کردەوە قاقەزو قەرەمی هینا، قاقەزەکی نووسی دوو سواری سوارکرد لۆکن مەلا نەبییانی نارد، دەرێ کە ناردی قاقەز گەیشتە کن مەلا نەبی، مەلا نەبی هەرستا بەخۆی جرەوی وراغی قاسیدی مەمەندی ئاری وەیسییانی گرتییە، قاقەزی لێوەرگرت و گۆتی: برێنە مەمەندی ئاری وەیسییە چ ئەورۆ بێ چ سبەینێ بووک حازرە، وا لەبەر دەرکەی رامگرتییە، لەبۆ مەمەندی نەبی لەبۆ کێیە ؟، دەرێ نیوەرۆژی لەبۆ سوارەکان کرد، دەرێ پاشی نیورانێ خەزار کە ئەو خەبەرەی زانی، چارۆگەکەی هاویشتە سە سەری لێیدا لۆ کن لاسی رۆیشت، لاسیش وا لەبە بەرخانە، دەرێ لە دوورا لاس چاوی پێکەت، ها گۆتی خەزار چ قەومایە پێم برێ بە راستییە لەناو هۆبەی مەلا نەبییە، لۆ وەها رووت لە چۆل و بەرپاو بیابان و کنە من کردییە، چارۆگەت هاویشتیتە سە سەرییە، گۆتی مارت وێران بی لە دنیایێ لەتو وابی هەر ئەتو نێری چ نێری دی نییە، نازانی ئەمن بە

منداری مارە کرایە لە مەمەندی ئاری وەیسییە، لە بەدەل نۆ خینییە، ئەلحانیش وا قاسیدی ناردییە، بەسێ رۆژیکە دەمبەن لەبۆ ئاری وەیسیانە، بە یێکجارییە، بزانم راوو تەگبیرت لەسە چییە، وەڵلاهی گۆتی: ئەمن بەر خەوانەکەم لە کن مەلا نەبییە، راو تەگبیرم لەسەر چییە، دەرێ بەوەی دەمێ جـۆتە سـوار هاتنە دەرێ لە هۆبەی مـەلا نەبی دەگەرێنەوە، لە بۆ کن مەمەندی ئاری وەیسییە، دەرێ لە ناوەندی رێییێ لەسـەر بەردەکی دانیـشتن هەتاسـوارەکـان گەیشتنەکنی، دەرێ هاتن گەیشتنە کنی سەلامیـان لە بەرخەوان مەلانەبییە کـردییە، دەرێ برند بوو لە جێـوە جرەوی هۆردوو وراغـانی گـرت هۆردووکی هینایە خـوارێ لەبن چۆکی خۆی گیر کردن، دەرێ کەپووی یێکیانی بڕی لە بنڕا بە تەمامیە، گێی یێکیشی لێکردەوە بە یێکجارییە، ئەوجا سواری وراغی کردن گۆتی بڕۆن گوو بە ریشی بابی مەمەندی ئاری وەیسیـان بیتن، کە ئەنگۆی لەدووخەزارێ ناردییەدەرێ سوارەکان مەدەی سەعاتەرێیەکی هەر ئاوڕیان نەدەداوەولەوان وابی بەرخـەوانیـان بەقـوتەگـۆیاری بەدووکتیە، هەراتن دەرێ گەراوە لۆمارێ ئەویش رۆیی

دەرێ وەکی قاسید گەیشتەوە هۆبەی مەمەندی ئاری وەیسییە، وەکی مەمەندی ئاری وەیسیان چاوی بەقاسیدان کەت گێ وکەپوویان لێکرایتەوەو سەرزینیان لەخینی سۆرکردییە، دەرێ لەرێیی تەگبیریان کرد گۆتی برێشوانەک وبەرخەوانەک یان سوارەک وەی لەمەکرد لەرێیی، ئەگەر بە وئەجەلەش نەبی مەمەندی ئاری وەیسیان تەواومان دی کا، ناوەڵلا چاک وەیەبرێین مـەلا نەبی ئەوهای لێکردین، لەناوەندێ دیوانێ منداری لەسـەر کـەرەک کـردین، گێ وکەپووی بڕین ئەمەی رەوان کردەوە، گۆتی: گوو بە ریشی بابی مەمەندی ئاری وەیسیـان بی، کیـژی من قابیل بەو نییە.

(ئای...ئەوجەدەرێ
وەکی مەمەندی ئاری وەیسیان چاوی بە قاسیدان کەتن

سەر زینیان لە خێنێدا سۆر کردییە
کە پویان لە خێنێدا نی
ئەوجا دەرێ لاوی لە قەمەندی وێرابی راوەستی
شێرەکی لە چەمی عەزری
هۆشی لە بەدەنێدا نی و هاواری کردییە

ئەرێ دەرێ کورە سەباب پێم برێن بە راستی
چ عەشیرەتەک وەی لەنگۆ کردییە
تا لە بن و بۆتکەوەی بینم
منداری ناو لانکانی بنێرم هەر بە یێکجاری
ئەوجا دەرێ یێکەک لەوان بە جواب هاتییە
دەرێ مەمەندی ئاری وەیسیان
مادام ئەتو دۆستایەتیت نەبوو لەگە مەلا نەبی
لۆ ئەمەت بە قاسیدی ناردی
کە قاقەزی تومان لە ناوەندی دیوانێ دەدا دەست مەلا نەبی
ئەگەر بڕوا دەکەن
چەند منداری رەوەندو خەیلانی و بارەکیان هەبوو
هەموو لە پشتی مەکەرەک پێکردییە
بەخۆی دەستی دەدا قەرەمبرێ
گێی هۆردوکمانی لێکردەوە لە بنڕا بەیێکجاری
بەران دەیگۆ بڕۆن گوو بە ریشی بابی مەمەندی ئاری وەیسیان بی
کیژی من قابیل بەوی نییە
ئەوجا دەرێ رەبی ماری مەمەندی وێران بی
کە ئەو خەبەرەی وەرگرتی
دنیای لێ وێک هات و چاوی عەردی نەدیتی
لە ئامۆزای قیراندییە
هەر بەوی دەمێ تەلەبی ئامۆزای کردییە
دەرێ ئامۆزا دەمەوێ سوار بی لەگەر پێنجسەد عەگیدی

بچییە هۆبەی مەلا نەبیا
کەسی تێدا نەیێلی لە دنایێدا بە سەلامەتی
بەران منداری ناو لانکانیان زگ بدرە
بە زەبری داری دارێ رمییە
بەس خەزارە شۆڕی بهێلە لە دنیایێدا بە سەلامەتی
ئەویش بە پەرچەمان
بە قەد وراغی وەکە رایکێشە هەر بە یێکجارییە
ئەوجا دەرێ ئامۆزای مەمەندی ئاری وەیسیان
دەرێ بەسەر سەرو بەسەر چاوم
چ منەتی لە دنیایێ لە بۆ تو تێدا نی
رەبی ماری ئامۆزای مەمەندی ئاری وەیسیان وێران بی
پێنجسەد عەگیدی وەدو خۆی یێخستییە

غەرەب نیو چەوانی وان سوارانی گرت و
دەهاتنە خوارێ لە بۆ هۆبەی مەلا نەبی
بەران لە وێندەرێ مارە مەلاش وێران بی
لەسەر بێرو بەر بێران هەر وەستەی کردییە
ئەوجا گازی دەکرد وەی خەزارە شۆڕی مەلا نەبییان
بە تو کەمە بەو خالیقەی لە ژۆری سەرییە
ئەگەر پێم نەرێی بە راستی
ئەو بڕە سوارەی وا دێتە خوارێ لە بۆ هۆبەی مەلا نەبی
سوارەی خێرێیە یا سوارەی شەڕییە
ئەوجا دەرێ رەبی ماری خەزاری وێران بی
هاواری کردو دەستی بە گریانێ کردییە
ئەرێ دەرێ کورەمارت وێران بی
بەتو دەرێن لاسی ئەحمەد بەگی شارەزووری
ساحێبی دوازدە هەزار ماری جافی
ئەتو جارەکی لە جاران لە پیرو پێشینان
لە بابی خۆت لە دیوانێ نەزانی
رەبی مارت وێران بی
ئەگەر بڕوا دەکەن بەو خالیقەی لە ژۆری سەری
ئەگە ئەوە سوارەی خێرێ بایێ
بەران ئەوان سواران نێو چەوانیان غەزەبیان لێکەتییە
دێنە خوارێ لەبۆ هۆبەی مەلا نەبییان لەبۆ شەڕی
ئەوجا دەرێ رەبی مارت وێران بی خەزار
قسەی تو راست بوو هیچ درۆی تێدا نییە
لۆیە لە تۆم پرسیار کردییە
بزانم ئاقرێ تو کوە لەگەر ئافرەتان چی
رەبی ماری خەزاری وێران بی
دەرێ ئەوجە وەی پێگۆتی
دەرێ لە شکری مەمەندی ئاری وەیسیان
هەر چار دەورەی ماری مەلا نەبییانی گرتییە ).

ئەوجا دەرێ ئامۆزای مەمەندی ئاری وەیسیان لەشکری پڕ کرد، هەرچار دەورەی ماری مەلا نەبییانی گرت، دەرێ مەلا نەبیش ئاگای لەچ نییە و دەرێ کە چاویان بە لەشکری مەمەندی ئاری وەیسیان کەت، ژن بەپەلە کەتن، لەبۆ کفتە لێنانی، دەرێ بووکیان گاز کردەوە، بیرازێننەوە، کە لۆ مەمەندی ئاری وەیسیان دەچی، نەیزانی حسێب لەولایە، وەکی خەبەریان دا مەلا نەبی، مەلا نەبی لچکە کەوتی بەددانی گرت، غارە لۆکن ئامۆزای مەمەندی ئاری وەیسیان، گۆتی بابە سەبەب چییە، گۆتی: مەلا نەبی نازانی قاسیدی مەمەندی ئاری وەیسیانت لە ناوەندی دیوانێ بێ گێ و کەپو رەوان کردتەوە، گۆتیتت گو بەریشی بابی مەمەندی ئاری وەیسیان بی، کیژی من قابیل بەوی نییە، دەرێ مەلا نەبی گۆتی: بەو قورعانەی بەخۆم لێم خیندیە، ئەمن ئاگام لەو حسێبەی نییە، ئەمن واشیوم حازر کردییە، بووکم لەبەر دەرکەی دیوانێ راگرتییە لە بۆ مەمەندی ئاری وەیسییە، ئەوجا دەرێ ئامۆزای مەمەندی ئاری وەیسی گۆتی: دیارە ئەو سەگبابانە داخوە لەکێندەرێ ئەوهایان لێکرایە ئەو بوختانەیان بە مەلا نەبی وەکردییە، دێیەلم دابەزن بکەنە شایی و گۆوەند و بەزم و سەیران، بووکێ دەبەینەوە، هەنگینێ مەمەندیش ئیقناع دەکەم، دەرێ هاتن پێنجسەد سواری مەمەندی ئاری وەیسیان لەدیوانێ دابەزین بووە شایی و گۆوەند و بەزم و سەیران و رەشبەرەک، کەس ئاگای لەکەس نییە، دەرێ ئەوێ دەمێ خەزار هەرستا لەناو ژنان دەرپەڕی لێیدا لۆ ئاقاری لۆکن لاسی رۆیی، لاس چاوی پێکەت، دەرێ خەزار دەگریا، فرمێسکی چاوی دەهاتە خوارێ بەسەر روومەتی سۆری گور گوریە، ئەوجا دەرێ لاس بەخۆو بەقوتە گۆپارەوە بەپیلی وەهاتییە، گۆتی: خەزارە شۆڕی مەلا نەبییان لۆ دەگرییی فرمێسکت دێتە خوارێ بەسەر روومەتی سۆری گور گورییە؟ گۆتی: مارت وێران بی وا دەمبەن لەبۆ مەمەندی ئاری وەیسییە، هەر بە یێکجارییە، بزانم راو و تەگبیرت لەسەر چییە؟ گۆتی خەزارە شۆڕی مەلا نەبییان، ئەمن یێک قوتە گۆپارم بەدەستەخۆ گرتییە، واسەری چەند مانگانە بەرخی مەلا نەبییان دەچەلێنم لە ئاقارییە، چم پێدەکرێ ئەگەر پێنجسەد عەگیدی مەمەندی ئاری وەیسیان، ئەگەر بتبەن و نەتبەن چ عیلاجم نییە، دەرێ خەزار دەستی بەگریانێ کرد، بەروە پاش گەڕاوە، لەبۆمارێ، دەرێ لاس لەدوو خەزارێ دەستی بەگۆتنێ کرد.

(ئای.. ئەوجا دەرێ
لاسی مارویران دەنگی برند دەکرد و هاواری کردییە
ئەرێ دەرێ یا رەبی خوایە
ئەمن چبکەم لە بۆ شێخ غەزالی
ئەوا بەستاریتەوە لەناو تەویلەخانەی
ئەحمەد بەگی شارەزوورییە

ئەمن لێرە کەس نامناسی
کەس نامداتێ پیرە بارگینەکی
ئەمن سوار بم لەدوو بووکێ
دەمەکێ لۆ خۆم پێبکەم جریت و رمبازیە
ئەوجا دەرێ کە وەی پێگۆتییە
رەبی ماری خەزارێ وێران بی
دەگەڕاوە لەبۆکن لاسی و هاتییە
ئەرێ دەرێ کورە مارت وێران بی
بەگزادەی جافی خەمێ مەخۆ
خەم لەبۆ پیاوان لە دنیایێدا چانی
ئەلعان لەبۆت دەرکێشم بۆرەی بابی
کە بە حەفت رۆژان جارەک هەتاوی نەدیتییە
لێدەم زینەکی موعتەبەری
ئەتو سواریە لەدوو بووکێ لەبۆ عێجزی درێ خۆ
دەمەکی پێبکە جریت و رمبازییە
کەوەی بە لاسی گۆ
لەلاسی وابی تازە لەداکی بەوەلەد دەبوو
دنیای بەچاوان نەدیت و هاواری کردییە
ئەرێ دەرێ وەی خەزارە شۆڕی مەلا نەبییان
ئەگەر ئەو قسەی کردت راست بی چ درۆی تێدانی
ئەتو لەبۆ من بینی بۆرەی بابی
لێیدەی زینەکی موعتەبەری
بەتوو کەمە بەو خالیقی لەژۆری سەرییە
ئەگەر بەسە پشتی بۆرەی کەوم
لەدنیاییدا بە سەلامەتی
ئەگەر پێنجسەد نەبن هەزار بن
نایەلم بچنە دەرێ لەهۆبەی مـــەلا نەبیـــــان هەر بە سەلامتییە
ئەوجا دەرێ رەبی ماری خەزاری وێران بی
کە ئەو خەبەرەی وەرگرتییە
بەروە پاش دەگەڕاوە بە کەندانیش هەروەستەی دەکرد و
هەتا دەری دەکێشا بۆرەی بابی و
لێیدەدا زینەکی موعتەبەری
بەران لەبۆ لاسی ناردییە
لاس رایدەکێشا دۆرەکی لەبەرەخۆی دەکردەوە
بەرگی دەرویێشی
دەهاتە سەر بەرگی پاشازادەی جافی

رەبی ماری لاسی وێران بی
دەتگۆ شێرە لەچەمێدا غەزرییە
زرێی داودیەی لەسە شانییە
شیری راست و چۆپەی لەخۆی گیر کردی
ئەوجا بەسە پشتی بۆرەی کەت و
سێ سەران بۆرەی لەکەندێ هینایە و بردییە
بۆرەی لە ئارەقەیدا رەش کردییە
لۆ وەی کرد نەیناسن بۆرەی مەلا نەبییە
ئەرێ دەرێ رەبی ماری لاسی وێران بی
جرەوی بۆرەی لە بۆ ناوەندی
دیوانی مـــەلا نەبیـــــان و لەشکری مـــەمـــەندی ئاری وەیسیان
شل کردییە
کە دەگەیشتە بەر دەرگەی دیوانێ
سەلامی بەدەستی عیشارەتی دیوانێ کردی
پازدە پازدە برند دەبوون
جرەوی بۆرەیان گرت
رەبی ماری لاسی وێران بی
بەجواب هات و هاواری کردییە
ئەرێ دەرێ کورە قەومی مەلا نەبییان
مەگرن جرەوی بۆرەی
نەهاتیمە دابەزم لەبۆ کفتەی مەلا نەبی
ئەمن چاوم لە کفتەکی مەلا نەبییان نییە
رێی من گەلە دوورە وەختی دابەزینێم نییە
بەران حـــەیف لە بۆ شـــێـــرەکی وەکی مـــەمـــەندی ئاری وەیسیان
پێنجسەد عەگیدی لەدوو بووکێ ناردییە
هەموو لەوان وابی لەتازییەی دانیشتی
هەموو چاویان لەکفتەکی مەلا نەبییان لەدیوانێ داگرتی
رەبی مارو وێران بی
نەبەزم و سەیران و عەگیدیان نی
ئەمن دەمەوێ دوو عەگید لەبۆ من بێنە مەیدانێ
دەمەکی بکەن جریت و رمبازییە
چونکە، رێی من گەلە دوورەو وەختی دابەزینێم نییە
ئەوجا دەرێ ئامۆزای مەمەندی ئاری وەیسیان
لەبنەبانێ تیلاکی لێ خوار کردییە
شیری راست و چۆپەی لەخۆ گیر کردییە

زرێی داودیەی لەسە شانی
بەدزی گازی دوو عەگیدانی کردییە
دەیگۆ دەمەوێ دوو سەران بهێنن و بیبەن
لەمەیدانێ بیێخنە سەر عەردییە
بەران ماینەکەی گەلە ماینەکی باشە
بەشکو لەپێش بووکێ دەبەمەوە
لەبۆ مەمەندی ئاری وەیسیان بەدیارییە
لەبەر دەرکێ دیوانێ مەلا نەبییان
دەرێ چەند حوربانێ عالەمێ ماری وێران بی
تەماشای وان سوارانیان کردییە
ئەوجا دەرێ لاس دوو سەران
لەگەوان سواران هات و چۆی کردییە
چەندی پشتی دەداتە وان سواران
دەبینی چ نەفەر لە مەیدانێ لەوان سواران نییە
رەبی ماری لاسی وێران بی
یێکی بەلای راستی بەرداوە سە عەردی
ئەوی دیکەی بەبن دەست و پێی بۆرەی یێخستییە
چونکو گەلە جاران لەدیوانێ بابیی پێی گۆتیە
پێنجسەد سوار بەیێک و دوو لە مەیدانێ بنی لەبۆ نییە
گۆتی چار دەوری بەناویان کەووە خۆسەبابە چ نێریان تێدا نی
رەبی ماری لاسی وێران بی
دەرێ جرەوی بۆرەی مارویرانی
لەناوەندی دیوانی مەلا نەبییان
بەسە سەری پێنجسەد سواری مەمەندی ئاری وەیسیان کڕ کردییە
دەرێ بەمدەی دوو سەعاتان
هەر پێنجسەدی فەوتاند و هەراتییە
ئەوی دەیگرت بەیێخسیرییە و ئەوی هەراتییە
ئەوی خۆی لەبن کەچە کورتانی پیرە بارگینی
رەوەند و خەیلانی و بارەکیان مات کردییە
ئەوجا دەگەڕاوە لەگەرویە
لەپێش دیوانی مەلا نەبییان
لەپێش مەلا نەبی رمی لە عەردی گیر کردی
ئەرێ دەرێ کورە مەلا نەبی مارت وێران بی
ئەوجا وەرە بزانە
کیژی تو قابیل بەمنە لە دنیایێ یان قابیل بەمن نییە

رەبی ماری مەلا نەبی وێران بی
چی حازر با لەدنیایێ
دەیگۆ کیژی من قابیل بەتوەو قابیل بەکەسی دی نی
ئەوجا دەرێ کورە مارت وێران بی
بەتو دەرێن لاسی ئەحمەد بەگی شارەزووری
ساحێبی دوازدە هەزار ماری جافی
ئەدیکو بەجێم دێڵی لەناو هۆبەی مەلا نەبییان،
جواب چۆوە لەبۆ مەمەندی ئاری وەیسییە
دیارە چەند هەزار نەفەری سوار دەکاو
دێتە خوارێ لە بۆ هۆبەی مەلا نەبی
ئەمن رادەکێشی بەزەبری دارێ رمی
دەمبا لە بۆ خۆی هەر بە یێکجاری
خۆ کەس نییە دەستی لە بەر راست بکاتەوە بەراستی
ئەوجا دەرێ وەی خەزارە شۆڕی مەلا نەبییان
بەتوو کەمە بەو خالیقەی لەژۆری سەری
ئەمن بەو نەینەی ناتبەمەوە ناو دوازدە هەزار ماری جافی
کەس بە من بڕوا ناکا بڕێم ئەوە خەزارە شۆڕە مەلا نەبییانە
بەزەبرێ دارێ رمیم هێنایتە دەرێ
لەناو چەند هەزار مارییە
دەرێ داخوا کیژی چ شوان گاوانییەکییە
لەئاقارێی رفاندیە
لاس دەرێ خەزارە شۆڕی مەلا نەبی
ئەمن دەچم ئەوڕۆ سەری مانگێ تا یێکی مانگی نوو
سەرو لێدەمەوە بەراستی
چ بێمەوە بەتاقە سواری
چ بینمەوە لەشکری جافستانێ بە یێکجارییە
ئەوجا دەرێ رەبی ماری لاسی وێران بی
دوعا بوونی خواست و لێیدا
جرەوی بۆرەی شل کرد و دەگەڕاوە لەبۆ شارەزووری
لەولایە جواب لەبۆ مەمەندی ئاری وەیسیان چۆوە
پێنجسەد عەگیدی وای لێهاتییە
دەرێ مەمەندی ئاری وەیسیان لەحوربانێی قیراندییە
چەند هەزار سواری سوار دەکرد و
لەشکری بارەگای هەرگرتییە
دەرێ خیوەت و بارەگای لەگەروان ناردییە

بەخۆی بەپێش کەت و هاتە خواریّ لەبۆ هۆبەی مەلا نەبییە).

دەریّ لێیدا هاتە خواریّ لەبۆ هۆبەی مەلا نەبییان، لاسیش گەڕاوە لەبۆ شارەزووری بەتاقە سوارییە، دەریّ کە دەورەی هۆبەی مەلا نەبییانی گرت، مەلا نەبی غاری دا کنی، گۆتی: بابە هەرچی دیّ غەدر لەمن دەکا، خۆ ئەمن کیژم لەتو زەفت نەکردییە، سوارەک لەغەیبێڕا نازانم لەکێڕا هات بەناو لەشکرت کەت، ئەوی کوشتی ئەوی هەرات، هەندەکیش وا لەبن کەچە کورتانی ردودند و خەیلانیان نایێتە دەریّ، دەرێن رۆیە، پێن بڕوا ناکا، دەریّ نا بە کوشتنمان دەدەی خۆ ئەمن ودم نەکرد، کیژیّ منیش ئەود مایە لۆتوە لۆ کەسی دی نییە، ئیّ گۆتیان: چهەقت لەسە مەلا نەبی نییە، دەریّ خیوەت و بارەگای هەردا، چەند هەزار سوار دەریّ لێیدا، لەشایی وگۆودند و بەزم وسەیرانیّ، لەعا لەمیی گێراوە، دەریّ دینا لەویّ قڕ قڕا، بوەبەزم ورەشبەرەک کەس ئاگای لەکەس نییە، دەریّ ئەویّ شەویّ کە سبەینیّ بووکیّ ببا، لۆشەویّ خەزار فکری کرد گۆتی: یارەبی خوایە بێو مەمەندی ئاری ودیسیان ئەمن بباو لاس سەری مانگیّ لەمن بپێچێتەوەو چاوی لاسی بەچاوی من بکەوی، چ ژینەکە لەدنیاییّ لە بۆ من، سەبارەت بەمن پێنجسەد عەگیدی مەمەندی ئاری وەیسیان بەمەدەی دوو سەعاتان لەبەر دەرکەی دیوانیّ بابیّ من فریدە، دەریّ نیودی شەویّ هەرستا، کارک وگۆریەکی هەرکێشا چەفیەو عەگالەکی عارەبی، شیرەکی لەقەدی خۆبەست، بەسەرپشتی وراغەکی کەت لێیدا رۆیی لەهۆی چوەدەریّ، دەریّ لەگەر بەیانیان چووە ئەوهەریرو هەریر بەگیان، هەنگین حوکم حوکمیّ خانزادەخاتونیّ خوشکی میرسرێمان بەگی بوو، دەریّ کە لەدەرکەیدا خزمەتکار و نۆکەر جرەوی وراغیان گرت، گۆتیان: دابەزە ئەی سوار، گۆتی دانەبەزم لۆم گازی خانزادیّ بکەن، گۆتیان: بابەکیّ دەوێری هەرستێنی لەخەویّ هەتا بەخۆی هەرنەستیّ، گۆتی: بۆنگاسی کەن برێن سوارەک لەوعارەی لەورەنگەی تەلەبی توی کردییە، دانەبەزی، دەریّ کەخانزادیان هەرستاند، خانزاد هات وەهای کردیّ لایدا چاوی پێکەت، دەک گۆتی: مارم وێران بی ئەوچەفییەو عەگالە چییە ئەو کارک و گۆریە چییە، ئەو شیرە چییە، لەقەدیّ چ قەومایە، پێم بریّ، گۆتی: خانزادە خاتونیّ خوشکی میر سرێمان بەگییە، بەو خالیقی لەژۆری سەرییە، دانەبەزم لەدیوانی میرسرێمان بەگییە، ئەگەر نامدەیّ بابم لەشکری مەمەندی ئاری وەیسیان تا لاس لێم دەپێچێتەوە سەری مانگیّ ئەوە دادەبەزم، ئەگە دەشمدەیەوان، گۆتی: پیّ لەرکێبی نایمە دەریّ هەتا نەچمە نەفسی شارەزووریان، ئەوجا خانزاد گۆتی: بەسەری میرسرێمان بەگییە، بەخاکی هەریر و باتاسێم، هەموو دابی هەمووبەیێکجارییە، لەشکری ئێزیدیانیشم کردییە هەمووم دابی لەسەردتوو، بەراستیە، ناتدەمەود نەبابت نە بە مەمەندی ئاری وەیسییە، هەتا لاس سەری مانگی لێت دەپێچێتەوە بەیێکجاریە، دابەزە، گۆتی: ئەوجا دەریّ دابەزی، خەزار لە خانزادیّ جوانتر، خانزاد لەخەزاریّ جوانتر، دەریّ سبەینیّ چوونە سەرکانییّ دانیشتن، دەری سبەینێش مەلانەبی زانی کیژی نەمایە، مەمەندی ئاری وەیسیان لەسەر مەلانەبی کردیان هەقی نۆخینان یان کیژم دەویّ، مەلانەبی ئەگەر بەهەق لییّ بستاندبا هەقی هەژدەخینی دەدایّ لەباتی نۆ خینان، بەران هەمووی دەبرد هێشتا دەیگۆ دووخینت لەسەرمایە، گۆتی با بەژنەبیّ ئەقرە خۆی هاویشتە جێکی دووسیّ رۆژ مۆرەتم بدیّ ئەگەر دیتمەوە هێنامەوە...هێنامەوە ئەگە نەمهێناوە ئەمن دەرەقەتی تور نایێم، چم لێدەکەی بەحوربان وهۆبەود چم لێدەکەی بکە، گۆتی باشە، دەریّ مەلانەبی پرسیاری کرد ئەگە لەهەریرێیە، هەرستا سواری پیرە بارگینەکی کورتان خوار بوو لێیدا لۆ هەریرو هەریر بەگیان.

ئەویّ رۆژیّ مەلا نەبی، ئەویّ رۆژیّ خانزاد و خەزار لەناو چارباغی لەسە کانییّ دانیشتبوون، سەریان لیّ کۆت کردبوو، هەتا گۆزینگان لە ئاویّ راکردبوو، شەوقیان لەئاوی بریبوو، لەبەرخۆش فکریان دەکرد دەیانگۆ یا رەبی خودایە دەبی لەمە لایقتر و جوانتر هەبی، لە دنیاییّ، دەریّ لەو ئەسنای سەری برند کرد خەزار چاوی پێکەت، دەروێشەک بەبن شورەی رەزیدا دەڕۆیی، دەروێش بە غاردانە دەڕۆیی، دەریّ هەرچی بەسە خەزارێش هاتییە بە قسەی دەروێشی هاتییە.

( ئای.... ئەوجە دەریّ

وەکی خەزار سەری برند کرد و چاوی بە دەروێشی کەتییە

لەبن شورەی رەزی بەغار رۆییە

هەرچی بەسەر خەزاریّ هاتییە
دەریّ بەقسەی مامە دەرویّشییە
دەریّ بەخۆیّ نەکردو لەسەر روا گازی دەرویّشی کردییە
ئەریّ دەریّ کورە مارت ویّران بی مامە دەرویّش
مامە دەرویّشی عەبدییە
بەتو کەمە بەو خالیقەی لەژۆری سەرییە
ئەگەر نێی بزانم ئەو غاردانەت لەسەر چییە
ئەوجا دەرویّشی مارویّران کە سەری برند کردییە
چاوی بەوان کەت و بە هۆردوو دەستان چاوی خۆی گرتییە
دەریّ یارەبی دایکم خوا کارو راست نەینی
سەری حەفت ساران تۆبەم کردی
ئەوەندە تۆبەشم لەدنیایی بەلاش رۆیی
ئەنگۆ سەر و لیّ کۆت کردییە
پیّ و پیّخواس کردییە لەئاوی راکردییە
شەوق و لەئاویّ بڕییە
ئەمن نەکەس غەدری لیّ کردیمەوە نە غەدرم لەکەس کردییە
ئەریّ دەریّ کورە مارت ویّران بی مامە دەرویّش
ئەو غاردانەی توو بیّ ئەسەل نییە
توخوا ئەگەر نێی بزانم لەسەر چی
دەریّ سەری برند دەکرد و ئاوا دەبوو لەشوورەی رەزی لەبۆ کنەوان هاتییە
دەریّ سەلامی دەکرد لەوان حۆرییە
ئەوجا لەبەری برند دەبوو خەزارە شۆڕی مەلا نەبییان
دایدەنا لە تەنیشت خانزادە خاتوونیّ
خوشکی میر سریّمان بەگی،
ئەریّ دەریّ کورە مامە دەرویّش ئەگەر بڕوا دەکەی
مەرەقەکی گەلە گەورەت بەدری من ییّخستی
توخوا ئەگەر پیّم نەرتیی ئەو غاردانەت لەسە چییە
ئەریّ دەریّ دایکم چت لیّ بشیّرمەوە
لە دارەتی دنیاییّ شکم دەبرد ییّک پیرە بارگینی
لە بۆخۆ لە دنیاییّ پیّدەگەڕام سوالم پیّکردی
ئەو پیرە بارگینەشیان ئەورۆ سەری چەند رۆژە لەمن دزییە
لەعالەمیّم پرسیار کردییە
دەریّن لاسەک دەگەڕیّ لە دنیاییّ بە دەرویّشییە
ئەوجا دەریّن لاس پیرە بارگینی منی دزی
بردیتیەوە لەبۆ شارەزوووریە
بەرکو دەیگەمیّ هەتاکو نەیفەوتاندییە
رەبی ماری ویّران بی کە دەرویّش ئەوەی گۆتییە
خانزاد و خەزار لە تریقەی پیّکەنینیان دایە
ئەو پیّکەنینیّ چ تاقە بنیادەم بەچاوانی نەدیتییە
دەرویّش لە دیارەوان دەستی بەردیّنی دادەیناو
رووی لە عاسمانیّ کردییە
ئەریّ دەریّ یارەبی خوایە
خۆ ئەمن چ خیلافم نەگۆتییە
ئەو ئافرەتانە لۆ وایان لەخۆ کردییە
هەتا مدەی ییّک سەعاتی دەستیان بە پیّکەنیّنی کردییە
ئەوجا سەری برند دەکرد خەزارە شۆڕی مەلا نەبی
ئەریّ دەریّ کورە مارت ویّران بی مامە دەرویّش
ئەورۆ سەری چەند رۆژە پیرە بارگینت رۆییە
دەریّ دایکم ئەورۆ سەری سیّ رۆژە
دەریّ رەبی مارت ویّران بی قسەی عالەمیّ راستەو هیچ درۆی تیّدا نی
ئەگەر بڕوا دەکەی ئەو لاسە
چ بارگینی بابی منیش هەیە لە ئاقاری
هەمووی دزییە و بردی لەبۆ شارەزووری
ئەریّ دەریّ کورە مارت ویّران بی مامە دەرویّش
برۆ بیگەییّ هەتا نەیفەوتاندییە
ئەوجا دەریّ یارەبی مارت ویّران بی مامە دەرویّش
مادام هەر دەچی لە بۆ شارەزووری
ئەمن ئەو قاقەزەت لەبۆ دەنووسم بە فرمیّسکی چاوییە
بدەمە دەستت لاسی ئەحمەد بەگی شارەزووری
وە دەکەم لیّ دەنووسم ئەگەر چ پیرە بارگینی توشی تیّدا نەیی
لەویّ بداتیّ ماینەک بەخۆ بە دیارییە).

خانزاد و خەزاریّ قاقەزەکیان نووسی بە فرمیّسکی چاوی هەردووکان تەواویان کرد، دایانە دەست دەرویّشی، دەریّ دەرویّش لە هەورازان هاواری چاک و پیرانی دەکرد لەنشیّوان شۆڕ دەبۆوە دەرۆیی لەبۆ شارەزووری. دەریّ پاش وان مەلا نەبی، بەخۆو بەپیرە بارگینی رەوەندی کورتان

خوار بەڕۆڕێ دەكەت، سەلاموعەلیكوم، وە عەلەیكومە سەلام، دابەزی هەتا نیو رۆژی خوارد، گۆتی: كیژم بكە لە راهی خوای ئەو مارویرانە غەزەبە، هۆبەكەی من چ نایێلی، وەڵلاهی لەباتی نۆ خینان هەژدە خینی دەدەمێ، هەموو لیرەی زەردی عوسمانلییە، بەران فایدەی نییە، هەستە بچینەوە خوا قبور ناكا، وەم لێ مەكە، گۆتی: بابە زۆر گۆتن لۆ قورعانێ خۆشە، فایدەی نییە، ئەمن ژوانم لەگە ئەو سوارەی گرتییە كە لەگە پێنجسەد سواری لەبەر دەركەی تۆ بە مودەی دوو سەعاتان فڕی دا لەسە خانەی زینییە، هەتا یێكی مانگی نو ئەگە لەسەر دەستی خانزادێ نامدەیە مەمەندی ئاری وەیسیان، هەتا دەرێن ئەورۆ یێكی مانگی نوە، ئەوە دێمەوە، ئەگە دەشمدەیێ وەڵلاهی نایێمەوە، گۆتی هەستە كیژم لەسە دەستی خانزادە خاتوونێ خوشكی میر سلێمان بەگییە، شەرت بی نەتدەمەوە مەمەندی ئاری وەیسیان هەتا وەكو دەرێن ئەورۆ یێكی مانگی نوە، ئەوجا بە تەمامی دەتدەمە مەمەندی ئاری وەیسییە، ئەگە هەتا یێكی نو هاتیش ئەوە كەیفی خۆیتیان، دەرێ لێیدا بەگەری كەت هینایەوە، دەیگۆتە مەمەندی ئاری وەیسیان ئەورۆ كەوتی لەسە خەیاتییە، ئەورۆ فران دەستە خوشكی هاتییە، دەرێ بەو فێرەی هەر مەڕە ئەستەویری لۆ لەشكری كوشتەوەو شایی و گۆوەند و بەزم و سەیرانە، كەس ئاگای لەكەس نییە.

بێینە سەر بەحسێ دەروێشی، دەروێش كە گەیشتە شارەزووری، لەلای هێروە گەیشتە پیاوەكی سەلامی لێكرد، سەلامی لێوەرگرتەوە ئەرێ گۆتی كاكە دیوانێ لاسی لەكێیە؟ گۆتی لۆ بابە وەها خۆت تەنگە نەفەس كردییە، ئارەقەت لەنێوچەوانی هاتییە ئەگەر برسیتە وەرە تێر نانت كەم، ئەگەرشتەكت پێ دەوێ ئەمن لەباتی لاسی بتدەمێ، گۆتی بابە ئەمن بۆ سوال ودەرۆزەی نەهاتیمە ئەمن لەدیوانی لاسیم پرسیاركردییە، گۆتی مارت وێران بی لاس ئەورۆ سەری سێ رۆژە بابی مردییە، هەشریق ومەشریق لەدیوانی لاسی دانیشە، خوابەخۆی بزانی نەسەری دیوانێ دیارە نەبنی دیوانێ دیارە، ئەتو چت بەلاسی گۆتی ئەمنیش زانیم ئەحمەد بەگ مردییە، هاتیمە فاتیحایەكی لێبدەم لەدووڕاش بی قەیدی ناكا، دەرێ لێیدا لۆ دیوانی رۆیی، وەكی تەماشای كردێ، هەمووی دەمنی بەگزادەیە، كراوقوچی جافی دانیشتیە، نەسەری دیوانێ دیارەنەبنی دیوانێ، دەرێ دانیشت كە نیورۆژ لە بۆ دیوانێ هات، لەفكری دەكرد برسی بووە فكری لەبەدەنی خۆ دەكرد دەیگۆ ئاشەعازری ئەو مارویرانە دزەكی زۆر نەقۆرایە، عالەم لێی دەترسێ، لۆیە پیرەبابەكی سەد ساری هەیە مردییە، ئەو عالەمە هەموو لەتازییەی دانیشتیە، وەڵلێهی بابی بمری و نەمری ئەمن لە پیرە بارگینی خۆم خۆش نابم، پیرە بارگینم هەر دەوێتەوە، دەرێ هەتا وەكو نیوەڕۆژ لە بۆ دیوانێ هات زۆری برسی بوو، دەرێ كە نیوەڕۆژ هات هەر بەدوو پیاوان سێنییەك داندرا، دەروێش پارووی لێدا گۆتی خوایە بەتەمای توو، تێر و پڕی خوارد، شادەو ئیمانەكی بەهەقی هێنا، گۆتی یارەبی خودایە گەردەنی بابی ئازابی، دەپیرە بارگینی، شەرتبی ئەوی بەپشتی پیرە بارگینیشم پەیا كردییە هەوسار ئەو ساوار و رونی لەمارێمدا هەیە، شەرتبێ بیهێنم لەبۆ لاسییە، ئەمە لۆ چمانە، گۆتی ئەو سارە دوازدەی مانگێ هێوارێ دەچمەوە، ژنەكە دەرێ یا خێمان نەبوو، یا رونمان نەبوو، یا شیوەكیش لێنیانی، ئەمن ئەو مارەم لە بۆ چییە، دەرێ دانیشت لە دیوانێ لاسی ئەوی شەوێ فكری كرد، هاواری كرد، گۆتی: خوایە ئەوە ئەمن ئیشی خۆم ئەوە گەردەنم ئازا كرد، لە پیرە بارگینی ئەدی ئەو قاقەزەی كوو دەگەمە لاسی بیدەمێ؟ خوایە ئەتو چشتەكی ئەوها بكەی ئەو قاقەزەی بدەمە لاسی، دەرێ ئەوێ شەوێ هاواری چاك و پیرانی كرد، دەرێ لۆ ئەوێ شەوێ لاس خەزاری وەبیر نەهاتەوە؟ خەونی بەخەزارێوە دیت، سبەینێ لەگە نوێژی بەیانیان لاس هەرستا لەخەوێ لەبۆ دیوانێ هات، عالەم دانیشتیە كەبێ و دابنیشی و فاتیحە لێبدرێ، دەرێ لاس دانەنیشت دەستی بەگۆتنی كرد لەناوەندی دیوانێ.

(ئای... ئەوجا دەرێ
لەگە نوێژی بەیانیان رۆژی سێیەمینێ
لەتازییەی ئەحمەد بەگی دانیشتییە
لاس خەونی بە خەزارێوە دیتییە
لەخەوێدا چاوی پێكەتییە
لەوی وابی خەزارە شۆڕی مەلا نەبییان
بەپەرچەمان بە قەرپۆزی وراغێ وەكردو
رایانكێشا لە بۆ مەمەندی ئاری وەیسیان برد بە زۆرییە
ئەوجا دەرێ لەگە نوێژی بەیانیان لە بۆ دیوانێ هات و

سەلامی لە دیوانێ کردییە
دیوان برند بوو هەموو لەپێوە هەروەستەی کردییە
کەس تاقەتی دانیشتنێی لەدیوانێ نییە
تا لاس دانەنیشی بەتەمامی رەبی ماری لاسی وێران بی
دانەنیشت لە دیوانێ دەستی برند دەکرد و هاواری کردییە
ئەرێ دەرێ وەی قەومی جافی
لۆمەم مەکەن لۆمەم لە بۆ نییە
مەرێن ئەورۆ سەری سێ رۆژە ئەحمەد بەگی مردییە
لاس لەتازییەی دانیشت و دەستی بەگۆتنی کردییە
ئەمن لەدنیایێ خوا نەیدامێ برای لەداک و بابییە
ئەمن چ لێبکەم مار و دەورەتێ
ئەحمەد بەگی شارەزووری بەتاقی تەنێ و
ئەمن هەیتم لەدنیایێ
یەک خوشک لەدایک و بابییە
یەک پیرە داکی رزییە
بەران ئەی قەومی جافی
لۆمەم مەکەن لۆمەم لەبۆ نییە
ئەمن ئەوشۆ خەونەکی گەلە گەلە ناخۆشم بەدرێ خۆوە دیتییە
لەخەوێدا چاوم پێکەتی
خەزارە شۆڕی مەلا نەبییان
بەپەرچەمان بە قەرپۆزی وراغی وەکرد و
رایانکێشا لەبۆ مەمەندی ئاری وەیسیان بە زۆرییە
ئەوجا دەرێ وەی قەومی جافی
لۆمەم مەکەن لۆمەم لەبۆ نییە
ئەوا بێتێ ئەلعان لە دیوانێ جوابەکم بداتێ
جوابی خەزارە شۆڕی مەلا نەبییان لە دنیایێدا بەسەلامەتییە
کە نەیانبرد و لە بۆ مەمەندی ئاری وەیسی
ئەمن شک دەبەم لەدارەتێ دنیایێ
یەک خوشک لە دایک و بابی
شەرتبی ئەویشی بدەمێ هەر بە یێکجارییە
ئەرێ دەرێ کێ بی لە دیوانێ جوابەکم بداتێ
جوابی خەزارە شۆڕی مەلا نەبییان
لەدنیایێدا بە سەلامەتی
ئەمن دەیدەمێ مار و دەورەتی ئەحمەد بەگی شارەزووری هەر بە یێکجاری
بەس دەبەمە دەرێ شێخ غەزالی بەتاقی تەنی
ئەرێ دەرێ کێ بی لەو دیوانەی جوابەکم بداتێ
جوابی خەزارە شۆڕی مەلا نەبییان لە دنیایێدا بەسەلامەتی
ئەمن شک دەبەم لە دارەتی دنیایێ یەک پیرە داکی رزی
شەرتبێ لەشەرتی خوای
ئەویشی هەر بدەمێ هەر بەنان و شیوییە
ئەوجا دەرێ رەبی ماری دەروێشی وێران بی
گێی لە لاسی بوو کە وەی گۆتییە
چونکو خوا بە دەروێشی مارویرانی بەخشاندی
ئەوجا دەروێشە لە جێوە برند دەبوو
قاقەزی بەدەستەوە گرت و لەبۆ کنی رۆییە
ئەرێ دەرێ کورە مارت وێران بی بەگزادەی جافی
ئەمن دەتدەمێ جوابی خەزارە شۆڕی مەلا نەبییان بەسەلامەتییە
دەرێ دەروێش بەتوم بروا نییە
بەدانێ ناونیشانەی خەزاری بزانم چییە
ئەوجا دەرێ رەبی مارت وێران بی
گێت لێ بی ناونیشانەی خەزاری چییە
ئەگەر بروا دەکەی بەو خالیقەی لەژۆری سەری
ئەوێ رۆژێ هاتم لەلای ژۆری دۆری بەگیان
لەگەر خانزادە خاتوونێ خوشکی میر سرێمان بەگی
لەسە کانیێ دانیشتبوون
سەریان لێ کۆت کردبوو
پێیان پێخواس کردبوو لە ئاوێیان راکردی
بەجۆتە شەوقیان لەئاوێ برییە
ئەو قاقەزەشیان بە فرمێسکی چاوی هۆردووکان لەبۆ تۆ تەواو کردی
ئەگەر برواشت بەوەی نییە
گێت لێ بی لە ناونیشانەی خەزاری چییە
بەران رەبی مارت وێران بی
کە سبەینان هەردەستی خەزارە شۆڕی مەلا نەبییان لەخەوێ
لەعالەمێ وابی ئەو رۆژە لە برندان هەراتی

ئەگەر بڕوا دەکەی لەبەر دەوارێ و یاقوتێ بەر خەزارێ
مارت وێران بی دنیا شەوقی لێبردی
ئەگەر بەوەشت بڕوا نییە
لەبۆ خۆت شەرمە و چ عارەت نییە
ئەوجا بەبیرە خۆت بینەوە بەراستییە
چەن رۆژان بەرخەوان بووی لەکن مەلا نەبییە
کە وای بەلاسی گۆتییە
لاس دەوی دەروێشی گرتییە
دەرێ مارت وێران بی مامە دەروێش
بەتوم بڕوا کرد بە کەسی دی نییە
ئەوجا ددرێ بەوێ دەمێ گازی مەلای کردو
خوشکی خۆی لێ مارە کردییە
دەرێ شەرتبی پیرە داکیش هەر لۆتۆبی هەر بەنان و شیوی
بەران لەدیار چەن هەزار ماری جافی لەناوەندی دیوانی
تانجی لەسەر سەرێ خۆ دەینا خوارێ
لەسەری دەروێشی کردییە
ئەرێ دەرێ وەی قەومی جافی
لۆمەم مەکەن لۆمەم لە بۆنییە
وەبزانن ئەحمەد بەگ نەمردییە و
ئەوە لەجێی ئەحمەد بەگی دانیشتییە
ئەوجا دەروێشی لەجێی خۆی دادەنا
لەناوەندێ دیوانێ بە ئاغایەتییە
کەس ئاگای لەکەس نییە
ئەوجا لەناوەندێ ژنان لەدوورا بەدەستی
ئیشارەتی سەلامی داکی کردییە
رەبی ماری ئەو دایکەی وێران بی
دەرێ وەکی چاوی پێکەت و دنیای لێ وێک هات و
ئەحمەد بەگ ئەورۆ سەری سێ رۆژە مردییە
لاس بەسە پشتی شێخ غەزای کەتی
لەدوورا هاواری دەکرد
دەیگۆ حەیف لۆ شێرەکی وەکی ئەحمەد بەگی شارەزووری
ئەورۆ سەری سێ رۆژە مردییە
رۆژە شەرمت نەکردییە
بەسە پشتی غەزای کەتی
رووی خۆت لەراو و شکارێ بەزم و سەیرانێ کردی

ئەوجا لاسی مارۆێران
فرمێسکی بەسە چاوێدا باراند و هاواری کردییە
ئەرێ دەرێ مارت وێران بی دایە
ئاگات لەدەردی من نییە
ئەمن جوابەکم لەبۆ هاتییە
ئەگە بەسێ رۆژی کە نەگەمە خەزارە شۆڕی مەلا نەبییان
دەیبەن لەبۆ مامەندی ئاری وەیسی
چ غیرەت و ناموس تازە لە دنیایە لەبۆ من تێدا نییە
ئەمن هاتم پرسەکەت پێ بکەم بە داک و کوڕاتی
تازە نازانم نەبیەم لەشکری جافستانێ هەر بە یێکجاری
نە بچم بەتاقە سواری
ئەرێ دەرێ رۆرە رەبی مارت وێران بی
هەتا بابت مابوو هەموو شەوێ لەسەر جێ و بالینگانان
سەری لەبن سەرێ من دەدا
دەیگۆ لاس لەتوە لەمن نییە
ئەگەر لەمن با ئەویش ناوەکی دەردەکرد لەوراتی
ئەگەر ئەلحان بە لەشکری جافستانێ بیهێنیتە دەرێ
لەناو هۆبەی مەلا نەبییان و لەشکری مەمەندی ئاری وەیسی
خۆ چ پیاوەتی لەدنیایێ لەبۆ تو نییە
مارت وێران بی ئەگە وەکی بابی خۆت
کە ئەمنی هینا دەرێ لەناو چەند هەزار ماری عارەبی
بەزەبری دارێ رمی بەتاقە سوارییە
ئەوجا بینییەوە ناو قەومی جافییە
ئەو دوازدە هەزار مارە سار وەرناسوڕێ
دەبیتە بیست هەزار مار
ئەرێ دەرێ مارت وێران بی دایە
مادام وەتگۆتیە توخوا گەردەنم ئازاکە
لەو چۆرشە شیرەی لەکنە توم خواردی
ئەوجا دەرێ رۆرە
رەبی گەردەنت خۆش و ئازابی
ئیشاڵلا دەگەڕێیتەوە کن داکی خۆ بە سەلامەتییە
رەبی ماری ئەو دایکەی وێران بی
لە تو وابی جەرگ لە بەدەنی ئەو داکەی نی
رەبی ماری لاسیش وێران بی
جرەوی شێخ غەزالی لەچۆل و بەرییایانی کردییە

بە بیست و چار سەعاتان لەهەریر و هەریر بەگیان رەت دەبوو
هۆشی لە بادەنێدا نییە).

ئەوجا دەرێ هات، کەلە شاری کۆیێ رەتبوو، دەرێ وەهای کردێ، تەماشای کردێ هەر چار پەلی وراغەکەی ناری پێوە نمایە، گۆتی دیارە نیگبەت شانی منی گرتییە، لۆیە بە بیست و چار سەعاتان شێ غەزال ناری بە بنی پێوە نمایە، دەرێ گەڕاوە لۆشاری کۆیێ پرسیاری ناربەندی کرد لەکن ناربەندی دانیشت، دەرێ هەر نارەکی لۆی لێنا، وەهای دەکرد هوردی دەکرد بەپشتی ملی ناربەندی دادەدا، دەیگۆ ماروێران ئەو تەنەکانە چییە؟ دەرێ ناربەند گەڕا لەشاری کۆیێ، یەک جوتە نار ما لۆی هینا، گۆتی ئەوی پاشازادەی جافی، لەو جوتە نارەی پێوەتر دانییە، ئەگەر دەرتێ لۆت لێدەم، ئەگەر دەشرتێ لۆت لێنادەم، هەموو پشملت گۆواندم بە پەرکە ناران، گۆتی لۆم لێدە عیلاجم نییە، بەران بزماری پێشەوەی برەک درێژ بێ، لەبەر هۆدانەوەی شەریە، دەرێ کە لۆی لێدا دەستی لەبەرکی راکرد چەنگەکی رووپییە و مەجیدی لۆ ناربەندی فڕێدا سەر عەردییە، دەرێ ناربەندیش هەندی لەگە وراغان هاتووچۆ کردبوو، قوەتی هەبوو، دەرێ وەهای کردێ نینۆکی لە دوو روپیەی گیر کرد روپیەی قەرپ دەکرد رنگ رایدەوەشاند لەپشتی ملی لاسی گیر دەکرد، دەیگۆ مارت وێران بێ لەمن وابێ ئەتوی عەگیدی لەناو قەومی جافییە، هاتی دەرۆی لەبۆ چ مەملەکەتەکییە، نەمزانی چاوەش لەبۆ بوکێ رۆیشتی ئەو بەخشیشەیان بەتو بەخشاندیە، ئەو روپیە قەرپانەیان دایتە تو، لەباتی شاباشییە، گۆتی: وسبە سەباب خەنیت دەکەم بەزێرییە، دەرێ هەگبە زێڕی لێک دەکردەوە لەپشتی ملی ناربەندی دا، لەتوو وابێ حەفت سارە روح لەبەدەنێ ناربەندیدا نییە، دەرێ لێیدا لۆ سەپشتی شێ غەزالێ هات لە هەریر و بەگیان کەت، چونکە قاقەز لە هەریرێ هاتییە لەهەریر و هەریربەگێن فکری دەکرد، گۆتی: ئەمن روو بدەمە دیوانی میر سرێمان بەگییە، ئافرەتەک حوکمی لەسە کردییە، توخوا ئەو مێواندارییە لەبۆمن چییە، هەندەم نەمایە ئەورۆ سبەینێ ئەگەمە خەزارە شۆری مەلا نەبییان دەیبەن، لەبۆ مەمەندی ئاری وەیسییە، گۆتی: چاک ئەوەیە دوو سێ جاران گاسی

خانزادی کەم ئەگەر خەزار لەوێ بێ خۆ ناگری دێتە دەرێ، وەکی چاوم بە خەزارێ کەت، ئەوجا لادەدەم مەسەلەکی دەکا دەرێ هەم زیارەت هەم توجارەت، یەکجاری لادەدەم، ئەگە خەزاریش لەوێ نەبێ، ئەمن دەرۆم سبەینێ بگەمە دیوانێ مەلا نەبییە، نەکو ئیشەکە دەفەوتێ.

(ئای... ئەوجا دەرێ
لاسی ماروێران دەنگی برند دەکرد و
بەبن شۆرەی رەزێدا رۆیی
ئەوجا دەنگی برند دەکرد و هاواری کردییە
ئەرێ دەرێ وەی خانزادە خاتوونێ
خوشکی میر سرێمان بەگییە
بەتو کەمە بەو خالیقەی لەژۆری سەری
ئەو ئەمانەتی لێرە بوو لێرەمایە یان رۆییە
ئەوجا دەرێ خانزاد لێی بەسە دەکەتە
سەر کۆشک و قاوەخانەی میر سرێمان بەگییە
هاواری کردییە
ئەرێ دەرێ کورە مارت وێران بێ
بەتو دەرێن لاسی ئەحمەد بەگی شارەزووری
ساحێبی دوازدە هەزار ماری جافی
ئەتو لەدنیایێ را ئەو ئەمانەتەت لە بۆ چییە
وەکی سبەینان سارەوانی گرتبوو
لەگەر ئەحمە ئاغای سۆرکان هەموو رۆژی لەسە کانی و کانیاوێ
بیست و چار راموسانانی لەو ئەمانەتەی توو کردییە
لۆیە ئەمن دەرم کردی
دەرێ وەی خانزادە خاتوونی خوشکی میر سرێمان بەگییە
توخوا ئەگەر پێم نەرێی
ئەو ئەمانەتەی لێرەبوو لۆ کێ لای رۆییە
ئەرێ دەرێ کورە مارت وێران بێ
ئەتو ئەو ئەمانەت لە دنیایێدا لەبۆ چییە
وەکی سبەینان هەردەستا لەخەوێ
سەری پڕ دەبوو لە رشک و ئەسپێ
چەند منداری رەوەند و خەیلانی و بارەکیان هەبوو
بەدووم پێخستوو دەرم کردی
دەرێ وەی خانزادە

خانزادە خاتوونێ خوشکی میر سرێمان بەگی
بەخوای ئەگە پێم نەرێی بەراستییە
ئەو ئەمانەتە لەبۆ کێ رۆییە
ئەرێ دەرێ کورە مارت وێران بی
ئەتوو ئەو ئەمانەتەت لەدنیاییێدا لەبۆ چییە
چەند منداری رەوەند و خەیلانی و بارەکیان
هەمووی لەئاقاری بەو ئەمانەتەی تویان
ساری دوازدە مانگی رابوردییە
ئەتو ئەو ئەمانەتیەت لەبۆ چییە
وەرە ئەمن مارەکە دانیشە لەجێی میر سرێمان بەگی
ئەوجا حوکمی بکە لە برێی گۆیاری
هەتا چیایێ داسینان
هەر لەبۆ خۆ مارویران بە راستییە).

دەرێ وەکی وای پێگۆ، گۆتی نا دیارە خەزار لێرە نییە، ئەو بۆرە بۆرەی لەبۆ چییە، ئەوە چن لۆ دەرێ، دەرێ جرەوی شێ غەزالێ شل کرد، لێیدا رۆیی بەبن شورەی، خانزاد چی پێنەما گۆتی ئەی لاسی ئەحمەد بەگی شارەزووریيە، بەتوو کەمە بەو خالیقی لەژۆری سەرییە، ئەگە دنیا بوو لەو سەری گەرایەوە لەناو هۆبەی مەلا نەبییان و لەشکری مەمەندی ئاری وەیسییە، بە سەلامەتییە، لادە دیوانی یەخسیران بەچاوی خۆ رۆنانێم شەوەکی بە مێواندارییە، دەرێ لێیدا رۆییە خوارێ، ئەوی جرەوی شێ غەزالی شل کرد، لەبۆ هۆبەی مەلا نەبییان نێزیک بووە، دەرێ ئەوی شەوێ خەزارە شۆڕی مەلا نەبییان خەونی بە لاسییەوە دیتییە، دەرێ لەگە نوێژی بەیانیان هەرستا لە خەوێ سێ کارەکەری هەبوو ئەستێ وخوبی و رابی، گۆتی کچێ ئەو سێ گۆیەم لەبۆ بینن، کێ بەشەر خەبەری ئەو سوارەم بداتێ دەیدەمێ مزگێنی ئەو سنجاقە سەر بە زێڕەی بە راستییە، دەرێ هەر کارەکەر بوو دوعای دەکرد خوایە لەو ریێەی بێ دەرێ ئەوێ رۆژیش مارێ هۆبەی مەلا نەبییان، دەرێ لەشکری مەمەندی ئاری وەیسیان دەرێ ئاخیر رۆژە، گۆوەندە بەزمە، دەرێ چێشتان داهات مەڕ هاتە بەر بێرێ، دەرێ لێیدا لۆ بەر بێرێ هات بچی رابوەستی بێری بکا بدۆشی، دەرێ کارەکەرەکیان بە گاگۆڕەو قونەخشکە خۆی گەیاندە بن رەشمارێ، گۆتی: خەزارە شۆڕی مەلا نەبیان، لە توم مزگێنییە، ئەو تاقە سواری دەرێی واهاتەوە، خوارێ لۆ هۆبەی مەلا نەبییە، تۆزی بەری عاسمانێی گرتییە، دێتە خوارێ لەوی وابی نێر لە مەملەکەتی دانییە، گۆتی ماکەر مەکە مەدحی ئەو سوارەی گەلەکم بە چاوی خۆ دیتیە، بگرە سنجاقی سەر بە زێر مزگێنییە، دەرێ لێیدا دەستی دا مەنجەرێ لۆ بەر بێری چوو، گۆتی: ئەگەر عەزیز بی و پاشازادە بی نایێ لە رەشماری چۆل و هۆل دابەزێ، هەتا ئەمن ئەو هەزار مەڕەی دەدۆشم، ئەگەر عەگیدیش نەبی و ئەسل زادە نەبی، با لە رەشمارێ دانیشی هەتا ئەمن مەڕێ دەدۆشم، دەرێ لێیدا بەر بێری بردە سەر بستێی داینا، دەرێ بابی و برای مەڕی هەر دەکەن، بەخۆ دەستی بە مەڕدۆشینێ کرد، دەرێ لەشکری مەمەندی ئاری وەیسیانیش بەرامبەری واشایی و گۆوەند ئاخر زەمانە، دەرێ لاس رووی لە رەشمارێ کرد، دیتی رەشمار چۆلە کەسی تێدانییە، دەرێ جرەوی شێ غەزالی باداوە لۆ بەر بێرێ، دەرێ شوان لەپشت مەڕییە، مەڕی هەردەکرد لۆ بەر بێری، گۆتی شوانە شوانی پەزییە، لەتوم مبارەک بی ئەو بەرانە گەورە چار قۆچییە، توخوا پێم برێ خەزار مایە ئانە رۆییە، دەرێ ئەو وەیگۆ خەزار لەبەر بێرێ لە دیار بابی و برای شەرمی نەکردییە، بەرامبەری لەشکری مەمەندی ئاری وەیسییە هەرستاوە دەرێ جرەوی شێ غەزالی گرت، سێ جاران نیوچەوانی شێ غەزالی ماچ کرد، گۆتی لاست لەوێرا لۆمن هینا، مەملەکەتی بەسەلامەتییە، ئەوجا دەرێ رکێبی گرت هینایە خوارێ دەستی لەراست دەست لاسی گیر کرد و لێیاندا لۆ رەشمارێ هەژدە تیرەگە چوونە خوارێ، گۆتییە بابی شیرەکەی پاسکە مێشی نەکەوتی، بەلچکە کەوتێی مەلا نەبی ما شیری پاس کا، دەرێ لێیدا چوونە بن رەشمارێ گۆتی خەزار باس خواس، گۆتی ئەی مارت وێران بی ئاگات لێ نییە، دۆرو زورنا و شایی و ئەورۆم مایە بەخوای نەگیشت بایێی سبەینی لەگە نوێژی بەیانیان سواریان دەکردم، گۆتی شیخ غەزالم، گۆتی ئەی مارم وێران بی شیخ غەزالم بە سێ شەو و سێ رۆژان لەشارەزوورێ راهینایتە هۆبەی مەلا نەبییە، ئەو بەستەزمانە لێی گەرێ ئیسراحەت کا، ئەورۆ خۆ رۆژی شەرێ نییە، گۆتی لۆ ئەقری ژنان لەگەر ئی پیاوان هەر نەقوستانە، ئەورۆ ئەمن دەچم دوو قسە لەگەر مەمەندی ئاری وەیسیان دەکەم، بزانم جەوهەری پیاوانی لە نێوچەوانیدا چییە، ئەوجا دەگەرێمەوە ئەمن ئەوشۆ لەکنە توو، مێوانم هەتا نوێژی بەیانییانە،

ئەوجا نوێژی بەیانیان دەکەوینە سەری مەیدانێ و لەگە مەمەندی ئاری وەیسییە، ئەوی لەشکر بوو گۆتیان ئەوە هەبی و نەبی دەرێن قرانی سواران دەینی ئەوە هات، دەرێ لەشکر پەرتاو پەرتانی پێکەت، شایی چ و عاری چ.

(ئای... ئەوجە دەرێ
لاسی ماروێران بەدەستی ئیشارەتێ
سەلامی لەشکری کردییە
هەر بابا بوو لەجێوە هەروەستەی دەکرد و
بەرامبەری لاسی
دەرێ تەماشای کردییە
لەبەینی خۆ دەرێ هەر بابا بوو
گێی لەبن گێی یێک کردییە
دەرێ هەبی و نەبی ئەوەیە لاسی ئەحـــــمـــــەد بەگی شارەزووری
دەرێن قرانان لەبۆ سواری دەینی لە مەیدانێ
بە زەبری دارێ رمی
لەوی وابی نێری تێدا نییە
ئەوجا لە لەشکری مەمەندی ئاری وەیسیان
دەبووە پشێوویە
ئەوجا لاس دەنگی برند دەکرد و هاواری کردییە
دەیگۆ کێیە مەمەندی ئاری وەیسی
کە خەبەریان بە مەمەندی گەیاندو
بەسە پشتی وراغی کەت و هاتنە مەیدانێ
بەرامبەری لاسی هەروەستەی کردییە
رەبی ماری مەمەندی وێران بی
لەلاسی گەلە عینادتر و عەگیدترە
لە دنیایێدا چی کەم نییە
ئەوجا دەرێ لاسی ماروێران هاواری کردییە
ئەرێ دەرێ کورە مەمەندی ئاری وەیسیان
ئەتوو لە پیرو پێشینانت نەزانییەو
لەباو و باپیرێ خۆت نەبیستییە
توخوا ئەگەر ژنەک بە پیاوی قایل نەبی
لە دنیایێ پیاو ئەو ژنەی بە پوولەکی لەبۆ چییە
ئەرێ دەرێ کورە مەمەندی ئاری وەیسی
ئەوە درایەتە تو لەباتی نۆ خینە
تەراقی دە وەکی برایەکی چاو لە مەیدانێ
دەتدەمێ هەموو لیرەی زەردی عوسمانلی
ئەگەر بەو حارەش تەراقی نادەی دەیکەمە عینادی
ئیشاڵلا سبەینێ لە ناوەندی مەیدانێ
هەر لێت دەستێنم بە زەبرێ دارێ رمییە
ئەوجا دەرێ رەبی ماری لاسی وێران بی
کە ئەوەندەی بە مەمەندی ئاری وەیسیان گۆتو
جرەوی شێ غەزالێی بادەداوە
لەبۆکن خەزاری هاتییە
ئەوێ شەوێ لەبن رەشمارێ هەژدە تیرەگەی
مەلا نەبییان لەگە خەزارێ
گەمەو سوعبەت و سەیرانی کردییە
ئەمان نوێژی بەیانی بەسە پشتی شێ غەزالی کەتو
لەبۆ مەیدانێ هاتییە
ئاورێ دەداوە دەیگۆ وەی خەزارە شۆڕی مەلا نەبی
ئەمن لە باو و باپیر و پێشینانم زانی
دەرێ ئەگەر
لەکن پیاوی چ نێری تێدا نییە
رەبی ماری خەزاریش وێران بی
وا تێدەگەیی بێتە مەیدانێ
لەوی وابی گۆتیتی چاوت دەبینی
مەمەندی ئاری وەیسی
ئەوجا دەرێ لاس رووی خۆی لە مەیدانێ کردییە
لەگە نوێژی بەیانیان
لەگە مەمەندی ئاری وەیسیان دەکەتنە سەری مەیدانێ
لەسە پشتی شێ غەزالێ
ئەوجا دەرێ بەشیر و تیر و
پێکدیان هینایە و بردییە
هەتا نوێژی نیوەڕوانێ
چتاق زەفەری بەچتاقی نەبردییە.

* نووسینەوەی: پیرداوود مەخموری
- لەکتێبی ( لاس و خەزاڵ) هەولێر - ٢٠٠٢

# ئەفەندی

ئەفەندی چینێکی دەوڵەمەند و دەسەڵاتدار و شارستانی و رۆشنبیر بوو، لە سەردەمی عوسمانلی و سەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق. لە کوردستانیش وەک توێژێکی تایبەت لەنێو کۆمەڵدا دیاربوون، زۆرتریش لە دەسەلات نزیک بوون. ئەگەر کەسانی رۆشنبیر و پیاوچاکیان لێهەڵکەوتووە، ئەوا ئەفەندی واش هەبووە کە ردشە خەڵکەکە خۆشیان نەویستووە و ئەم خۆشنەویستنەش لە فۆلکلۆر بەگشتی رەنگی داوەتەوە، سەیرکە لەم بەیتە شایەر چی بە ئەفەندی کردووە. (ئـ. ه).

هاتمەوە لە هەولێری
رێم دەکەتە دۆغانێ
لە پیرێژنەکم پرسی
پیری ئاخری زەمانێ
رێی دیوەخانێ کانێ
دەچومە دیوەخانێ
ئەفەندیەک دانیشتبوو
پیری ئاخری زەمانێ
جغارەکی دەدامێ
قونک دارێ خلتانێ
ئەفەندی لۆ عێدزی
دەیگۆ لەبێ سەپانی
ئەگەر تەماعی بدەی
ئەمن دەکەم سەپانی
مەعمەلەکی با بکەین
مەعمەلەمان با دیار بی
عەربە گەنمەکم دەوێ
هەر نانانەی سەپانی
جۆتە کراشەکم دەوێ
بن کەوێم لۆ خێزانی
عەسیرە خورماشم دەوێ
لۆ چێشتێ سبەینانی
سێ گرۆز پاکەتم دەوێ
لە بۆ سەعەتی گیانی
هۆقە رونەکم دەوێ
لە بۆ دست و هەسانی
فەلاح چت لۆ نەماوە
دەوجە دستی لە گونانی

# ئەفسانە

**دکتۆر هیمدادی حوسێن**
**کۆلیژی پەروەردە- زانکۆی سەلاحەددین**

**• کابرایەکی گێل و نەزان و بێ بەخت**

حەکایەتبێژ/ وەستایەکی بەننا، گوایە لە چایخانەی بەننایان لە بنەوانی رەمەزان گوێی لێبووە، نەخوێندەوارە

**کۆکردنەوەی: عەبدولباقی ئەکرەم ئەحمەد**

دەڵێن کابرایەک هەبووە، زۆر بێ بەخت و نەزان و گێل بووە، وای لی هاتییە لە قەلبی خۆی بێزار بووە.

رۆژەک کابرایەک لێی دەپرسی ئەوە لۆ غەمگینی؟ ئەویش جوابی دەداتەوە: لە هیچ شتەکی بەختم نییە، نازانم چ بکەم. کابرا پێی دەرێ برۆ بە دووی بەختت، وا لە فلانکە بیرییە. بێ بەخت خۆی رێک دەخات بەرەو فلانکە بیر دەروات بۆ هێنانی بەختی خۆی.

لە رێییێ شێرێک تووشی دەبێ، دەڵێ: لۆ کێندەر دەچی؟

ئەویش دەڵێ: بە دووی بەختم.

باشە ئەتوو هەر دەرۆی، بزانە ناپرسی لۆ وابێ تاقەت و لاوازم وەکی شێران نیم.

بێ بەخت هەر ئەوەندە باشم، بە جێ دەهێڵێ دەروات دەگاتە سەر ئاوێک، لە جێی پەرینەوە ماسییەکی گەورە عاسێ بووە، بوویتە پرد عالەم بەسەرایدا تێدەپەرێ. کە بێ بەخت دەپەرێتەوە ماسی دەڵێ: لۆ کێندەر کابرا؟

بە دووی بەختم!

- باشە هەر دەرۆی بزانە ناپرسی لۆ لێرە عاسێ بووم؟

بێ بەخت: هەر ئەوەندە باشە. دەپەرێتەوە ماسی بەجێ دەهێڵێ. دەست دەکا بە رۆیشتن. دەگاتە باخچەیەک.

- لە باخچەی کابرایەک گازی دەکات هۆ کابرا لۆ وەها عەجەلەی، خێرە؟

کابرای بێ بەخت: بە دووی بەختمدا دەرۆم.

- باخچەچی دەڵێ بەخوای نازانم لۆ ئەو دارە بەری نییە زۆریش خزمەتی دەکەم، بزانە ناپرسی لۆ وەهایە.

- بێ بەخت: هەر ئەوەندە؟ باشە.

- کابرای باخچەچی بەجێ دێڵێ لۆ ئەوەی بگاتە فلانکە بیر. دەستدەکا بە رۆیشتن، لە رێییێ دەبینێ کۆمەرەک پاسەوان راوەستاینە یەکەکیش لەسەر ئەسپەکییە، کە کچە میرە.

کچە میر پاسەوانێکی گاز دەکات، دەرێ:

ئەو کابرایە گاز بکە

وەڵڵا کابرای گاز دەکەن و دێتە پێش، کچە میر لێی دەپرسێ:

- لۆ وەها تەنگاوی، کێوە دەچی؟

کابرای بێ بەخت: بە دووی بەختمدا دەچم.

بزانە هەر دەرۆی لۆم بپرسە بزانە لۆ وەها دڵم توند دەبێ و لە قەلبی خۆم بێزار دەبم.

کابرای بێ بەخت و گێل:

هەر ئەوەندە.؟! سەرچاو.

کچە میر: بەران لە فکرم نەکەی جوابم لۆ بێنەوە باشە.

کابرای بێ بەخت لێدەدا دەروات، دەگاتە بیرەکەو هاوار دەکا بەختم، دەنگ دەداتەوەدو برۆ، واهات. پێش ئەوەی برۆم چەند سوئالەکم هەیە.

کچە میرەک پێی گۆتم لۆم بپرسە بزانە لۆ وەها دڵم توند دەبێ، لە قەلبی خۆم بێزار دەبم، گوتی: پێی بلێ با مێردەکی بکات دەکەوێتە خۆشی و دڵی فراوان دەبێ.

باشە ئەدی باخچەچییەکە دەڵێ داری باخچەی بەر ناگرێ؟ دەڵێ پێی بڵێ لەبن دارەکەی حەفت کوپە زێڕ هەیە، دەریان بینێ، ئەوا دارەکە بەردەگرێ.

سوئالێکی دی، باشە ئەو ماسییە چی بکات، کە لەو جێیە عاسێ بووە، بوویتە پرد، عالەم بەسەریدا دەڕوا.

دەڵێ، پێ برێ: گەوهەرەک لە قوڕگی عاسێ بووە، با فرێی دا ئەویش وەکی ماسییەکانی دی دەگەرێ و قوتار دەبێ.

ئەدی ئەو شێرە بێ تاقەت و لاوازە چ بکات.

دەڵێ با گێلەک یا نەزانەک یا بێ بەختەک بخوات چاک دەبێ و دەگەڕێتەوە سەر تاقەتی خۆی.

ئەوجا کابرای بێ بەخت دەگەڕێتەوە لۆ جێی خۆی کە دەگاتە کچە میر جەوابەکەی پێ دەرێ، کچە میریش دەڵێ: وەرە مەچوو لێرەبە ئەمنیش مێردت پێدەکەم، دەڵێ برۆ ئەمن بەختم هاتییە، لێدەدا دەڕوا.

کە دەگاتە باخچەچی پێی دەڵێ: لە بن دارەکە حەفت کوپەرە زێڕ هەیە دەرهێنەو دارەکەت بەری دەبێ.

باخچەچی، کوڕم ئەمن پیرم وەرە بەیەکەوە دەری بێنین، بەشی بکەین، کابرای گێل و نەزان دەڵێ ناتانم دەبێ برۆم بەختم هاتییە، لێدەدا دەڕوات.

دەگاتە ماسی لەسەر پشتی پێی دەڵێ: ها کابرا، جەوابی دەدات و دەڵێ: گەوهەرەک لە قوڕگت عاسێ بووە فرێ دە چا دەبییەوە، وەکی ماسییەکانی دی لۆ خۆت دەگەرێی. ئەویش دەڵێ: هەر فرێی دەدەم وەرە لۆ خۆت هەڵیگرەوە.

– چ؟ ئەمن بەختم هاتییە، گەوهەرم لۆ چییە.

کە دەگاتە شێری لاواز و بێ تاقەت مەسەلەکەی لۆ دەگێڕێتەوە، دەڵێ ئەتوش گێلەک یا نەزانەک بخۆ چا دەبییەوە، دەگەرێتەوە سەر تاقەتی خۆت و بە قووەت دەبی.

شێر گوێی لەو قسانە دەبێ، دەرێ وەڵڵاهی لەو کابرایە گێل و نەزان و بێبەختتر نابینمەوە. دەرێ: کابرا گوێم لێ نییە وەرە پێش هەتا باش گوێم لێبێ. کابراش دێتە پێش، شێر پری دەداتێ و دەیخوا.

ئەمنیش لەو سەر هاتمەوە.... هیچم لۆ نەبرایەوە.

***

**• فاتمەی تاقە خوشکی حەفت برا**

تەمەنی خاوەن ئەم ئەفسانەیە (٧٠) ساڵەو نەخوێندەوارە. شوێنی دانیشتنی گوندی تەتەراوەیە.

**کۆکردنەوەی: ڕوشدیە شەریف.**

فاتمە تاقە خوشکی حەفت برایان بوو، ئەو برایانە بێجگە لەو خوشکە خۆشەویستە، کەسی دیکەیان نەبوو، فاتمەش هەموو وەخت و خۆشی خۆی لۆ برایەکانی سەرف دەکردو بەخێویانی دەکرد، فاتمۆکەش (فاتمە) پشیلەکی هەبوو هەموو رۆژگاریان پێکەوە دەبردە سەر، رۆژەک فاتمۆک هەندەک مێوژی دەکڕی و لەگەر پشیلەکەی دەخوێ، پاشی دوو سێ رۆژان پشیلەکە لە فاتمۆکەی داوای مێوژی دەکات، ئەویش دەرێ وەڵڵا نەمایە. پشیلەش دەرێ هەر دەمەوێ، ئەگەر نا ئەو ئاگردانەت لێدەکوژێنمەوە، کە فاتمۆکە غەیری ئەو ئاگرە هیچ ئاگرەکی دیکەی نەبوو، لۆ ئەوەی لە مارێ کاروباری پێ جێبەجێ بکات لە شیولێنان یان ئاو گەرم کردن.... هتد.

فاتمۆکە زۆر لێی پاراوە، کە واز لەو کارەبێنی، بەڵام پشیلەکە هەر لە سەر قسەی خۆی بوو، ئیدی ئاگرەکەی لە فاتمۆکەی کوژاندەوە و هەرات. فاتمۆکە زۆر داماو و بێ هێز بوو، نەیدەزانی چ بکات هەتا ئاگردانەکەی دابگیرسێنێتەوە، ناچار بەرێیاندا دەرۆیشت لە دوو ئاگری دەگەڕا، لە دوورەوە رووناکییەکی دیت و دری بەو رووناکییە خۆش بوو، وردە وردە لێی نزیک دەبۆوەو دیتی سێ ژن لە پێش ئاگردانێک دانیشتینە و دێوەک سەری بە کۆشی هەر سێ ژنەکەی کردییە، فاتمۆکە داوای لە ژنەکان کرد، کە لە دارێکی بە ئاگری بدەنێ لۆ ئەوەی ئاگردانی خۆی پێ داگیرسێنێتەوە، ژنەکان گۆتیان کچێ ئاگری مەبە، دێوە ئەگەر بەو حارە بزانێ دوایی دەمانخوا، فاتمۆکەش گێی نەدایە ئەوان داهاتەوە لۆ ئەوەی کەلە دارەکی بە ئاگر ببات، بەس لە کاتی بردنی ئاگرەکە سەرکە بەنێک لە گیرفانی فاتمۆکە دەکەوتە خوارێ، کەسەرەکەی هەر لە گیرفانی فاتمۆکەیەو وا بەرەو مارێ دەڕوات. ئەو سەرکەبەنەکەش هەروا خل دەبتەوە (واتە لەلای سێ ژنەکەم دێودکە سەر کەبەنەکە خلۆل دەبتەوە) هەتا فاتمۆکە دەگاتە مارێ داوەکە خلاس دەبی و سەرەکەی تری داوەکە ئەوەی، کە لە گیرفانی

فـاتمۆکـە دەبێ ئەویش دەکـەوتە سـەر عـەردی. دێوەکـە لە خەوێ هەردەستێ و دڵێ: "بۆن دێ بۆنی بێگانان دێ ... لە هەرسێ ژنەکـە دەپرسێ، دەرێ کێ هاتبووە ئێرانە، ئێسـتا ئەگەر پێم نەرێن هەرسێکتـان دەخۆم، بەران کە دێوە چاوی بە داوە بەنەکی دەکـەوێ، یەکـسـەر بە دوای داوەکـەدا دەڕوات، دەڕوات هەتا داوەکـە لە پێش مـاری فـاتمۆکـەی خلاس دەبێ، ئەوجا دێوە لە دەرکەی دەدات و فاتمۆکەش کە دەرکەی دەکاتەوە دەبینێ دێوەیە، زۆر لێی دەترسێ و لێی دەپارێتەوە، دێوەش دەرێ مادام ئەوا دەترسێی قەیدی ناکا ناتخـوم، بەران داوایەکم هەیە، دەبێ جـێـبـەجـێی بکەی، ئەگـەر لۆشم جـێی بەجێی نەکـەی، ئەوا هەر حـەفت برات بەیەک جار دەخۆم، داوایەکەش ئەوەیە، دەرێ هەموو رۆژێ ئەنگوستی گچکەت دەمژم، فاتمۆکەش بەوەی رازی دەبێ، بەران دێوە پێی دەرێ نابێ براکانت بزانن.

ئێـــدی دێوە هەمـــوو رۆژێ دەهات و تا بـەینـەکی ئەنگوستی دەمـژت، وای لێـهـات رۆژ لە دوو رۆژ، فـاتمۆک بێ هێـزو رەنگ زەرد و سیس دەبوو. رۆژەکـیـان براکـانی فاتمۆک تەمەشایەکیان کردو گۆتیـان: ئەوە لۆ ئەوها رەنگت زەردە؟ جاری یەکەم گۆتی: هیچ نییە، پاشان دیسان لێیان پرسیەوە، ئەوجارە ناچاربوو، هەموو بەسەرهاتەکەی خۆی لۆ برایەکانی گێڕاوەو گۆتی: دێوە هەموو رۆژێ لە فلانە کات و شوێن دیت، براکـانی گـۆتیـان: ئەو جارەیان فـێـرەکی لە دێوەی دەکـــەین، چارەکی لۆ لێ دەدەین و بەخـــۆر پڕی دەکەینەوەو دەیکوژین، سبـەینێ ئەگـەر بەیانیـان براکـانی فاتمۆک چارەکەیان هەرکەناندو سەرەکەیان داپۆشت، دێوەش لە کـات و شـوێنی خـۆی هەروەکـو هەمـوو رۆژەکـانی دیکە هاتە لای فـاتمۆک بۆ ئەوەی پەنجـەی بمژێ، لەگـەر کـە هاتە ژۆرێ و کەتە ناو چارەکە، ئەوجا براکانی ویستیان بەخۆر سەرەکەی پڕبکەنەوە هەر لە ناکاوەکی دێوە هاواری فاتمۆکی کرد و گـۆتی (هۆ فاتمۆکـە، ئەگەر سەرمـتـان بەخۆر قـەپات کرد، ئەوا هەمـوو رۆژی بە هەویراو سەرەکەم ئاوبدە) ئەوجا سەرەکەیان پڕکردەوە دریان داکەت، ئێدی فاتمۆکە قسـەکەی دێوەکـەی لە فکر نەکـرد هەمـوو رۆژێ بە هەویراو سـەری ئاودەدا تا رۆژەکیان چەند قیچکە پیازەک لە سەر دێوە شین بوون، رۆژێکیـان فاتمۆکە شیوی لێدەنا پێویستی بە پیاز بوو هەسـتـا پیـازی سەر دێوەکـەی لەسـەر زەوی بچڕاندن و هاوێشـتـیـیـە ناو شـیـوەکـەی، شیـوەکـەی لەپێش برایەکانی داناو نانیـان خـوارد، پاشـان هەر حەفت برایەکـەی فاتمۆکە بوونە بەراز، فـاتمۆکـە زۆری لە خـۆی داو هەرچەندی کـردو هات و چوو سـەری لێ شـێـواو زۆر بێـچـار بوو هەردەگـریاو نەیدەزانی چ بکات، رۆژەکـیـان فـاتمۆکـە زۆر بەمـات و مەلووری و رەنگ زەردییەوە دانیشتبوو، شوانەکی پیریش بەوێ داهات، لێی پرسی: ( ئەرێ لۆ ئەوها خەمـبـاری؟) فـاتمۆکـەش گـۆتی چت لۆ باس بکەم ( حـارو حـیـکایەت ئەوهایە).

شوانەکە گۆتی: ئەمن هەر حەفت برات بە مەرجەکی لۆ چاک دەکەمەوە، فاتمۆکەش گۆتی: چییە؟

گۆتی: " دەبی مێردم پێ بکەی. "

فاتمۆکە گۆتی: رازیم، ئەگەر براکانم لۆ چاک بکەیەوە.

بەو حارەی لەگەر یەک پێکهاتن، شوانە گۆتی: ئەمن لە هەر حەفتیـان دەدەم، بەران ئەگەر براکانت هاواری تۆیان کـرد جـواب نەدەیەوە: گـۆتی: باشـە. لە هەر هەمـوویانی دا فـاتمۆکـە هیچ دەنگی نەکـرد، هەرچەندە ئەوان هاواریان لۆ دەبرد، بەران لە حـەفتـەم برای، کـە براکـەی گـۆتی: ( وەی فـاتمۆکـە) فـاتمۆکـەش گـۆتی: وەی گـیـان، لەبەرئەوە برای حەفتـەمی نیـوەی چابۆوەو نیـوەکەی دیکە بە بەرازی ماوە.

شوانەکە فاتمۆکەی لۆ خۆی بردەوە مارێ، ئەو شوانە بەخۆی ژنەکی هەبوو بەناوی (ســـۆرێ چاوشین). ئەو ژنە کـــە بەهاتـنی فــاتمۆکــەی زانی، زۆر رکی لێ بۆوە، فکری لە کوشتنی فاتمۆکە کردەوە، رۆژەکیان فاتمۆکەی هاوێشتە ناو چارەکی و کـووشـتی، روحی فـاتمۆکە بووە دوو کـۆتر، ماری سـۆرەی چاوشین چووە ناو دارسـتـانی (باری کـرد)، دوو کۆترەکەش چوونە سەردارەکانی ناو دارستانەکە، رۆژەکـیان (سۆرێ چاوشین) زۆر نەخۆش دەبێ، حەکیمیان دێنە سەری دەرێن هەر بە گــۆشـــتی کـــۆتری چاک دەبێ، خـــەرکی ناوچەکـەش دەچن دوو کـۆترەکەی دەگـرن و لەسـەر رووباری ســەریان دەبڕن و دەیێن، حــەکـیــمــەکـان دەرێن دەبی بە مـەرجـەکی سـەری، کـۆترەکـان ببـڕن، کـەخێن نەکـەتە سـەر عـــەردی، بەران دوویشکە خێن لە کـــاتی ســەربڕینی کـۆترەکـاندا کـەوتە ئەوبەرو ئەوبەری رووبارەکـەو ئەو دوو پشـکە خـیـنە بووە باغ و باغـــاتێکی زۆر گـــەورە. پاش مـاوەیەک سـۆرێ چاوشین کـوڕەکی دەبێ، داوای لانکەکی

دەکا لۆ کورەکەی، کە لە داری ئەو باغـاتە دروست بکرێ، لانکیان لۆدروست کرد، کورەکەیان هاویشتە ناو لانکەکە، ئەگەر دایکەکەی مندارەکەی راهەژاندبایە ئەو مندارە کە دەستی بە قیژاندن دەکرد، ئەگەر بابی مندارەکەی لانکەکەی راهەژاندبایە ئەوا مندارەکە نەیدەقیژاند، لەبەرئەوە ژنە کە گوتی: ئەو لانکەی دەبێ بشکێنم و بسووتێنم، لانکیان سووتان دوو کزە کزەی دەهات، پاشان فرێیان دایە ئەو بەروە لە شکلی کۆلکە داردکی سووتای بوو، ژنە گاوانەک کۆلکەداردکەی دەباتەوە مارێ لە حەوشی خۆیان دایدەنێ، ئەو کلکە دارە لە جێی خۆی دەبیتەوە فاتمۆکەی جاران، رۆژەکیان خەرکی ئاوایی قاشوانێ دەکەن و داری یاری کردنەکەیان دەکەوتە حەوشی ماری گاوان، کورە ئاغای گوندیش یاری لەگەڵیان دەکرد، لە حەوشەکە چاوی بە فاتمۆکەی دەکەوێ و لەبەرجوانی فاتمۆکە کورە ئاغا لەخۆ دەچی، پاشان بەپەلە دەگەرێتەوە و داوای لێدەکات کە کچەکەی بدەنێ، پێی دەرێ چت دەوێ:

– گاوان و ژنەکەش سەریان سوڕدەمێنێ، بەران پاش ئەوەی تەماشا دەکەن، کە بەراستی کیژەکیان لە حەوشەدایە، دەرێن: ...کیژەکەمان سەرەکی بە زێرو سەرەکی بە پەتە دەکێشێن؟،ئاخیری فاتمۆکە دەبیتە ژنی کوری ئاغای، کراسم درا چیم پێ نەبرا.

* * *

### • سێ سێوی زێڕ

ئەم ئەفسانەیەک لە دایکم وەرگرتووە، کە ناوی (سەبریە محەمەد) ە و تەمەنی (٤٨) ساڵە. دانیشتووی گەرەکی (شۆرش) – هەولێرە.

**کۆکردنەوەی: ناهیدە تەها نادر.**

هەبوو نەبوو پاشایەک هەبوو، سێ کچی هەبوو، ئەو سێ کچەش یەک لەیەک جوانتر و خانەدانتر بوون، پاشایەکەش تا بڵێی دەسەڵاتدارو دەوڵەمەند بوو.

رۆژێکیان پاشا بیری کردەوە گوتی: با پلەی زیرەکی کچەکانم دیاری بکەم، ناردی لە دوو هەر سێ کچەکان، لە کچی گەورەی پرسی گوتی: (ئەگەر بێت و داخوازیت هات مێرد بە کێ دەکەی) کچەکەش لە وەڵامدا گوتی (پیاوێکی دەوڵەمەندو پایەبەرز و دەسەڵاتدار بێت مشکلە نییە پلەی عەقڵی هەرچەند بێت)... بابەکە ئەوەی پێ باش بوو.

ئینجا لە کچە ناوەنجییەکەی پرسی؟ ئەویش بە هەمان شێوە وەڵامی دایەوە واتە مێرد بە پیاوی دەوڵەمەند دەکات. ئینجا لە کچی بچووکی پرسی، کچەکەش وەڵامی دایەوە گوتی (بەس عاقڵ بێت و بەرێز بێت ئەگەر دەوڵەمەندیش نەبێت موشکلە نییە) بابەکەش وتەی ئەم کچەی زۆر پێ ناخۆش بوو، قراری دا کە بیداتە پیاوێکی عاقڵ و فەقیر.

پیاوە فەقیرەکە هیچ ماڵ و شوێن و جێگای نەبوو ئەم کچەی تیادابنێت، لە ئەشکەوتێکی دانا، کچەکەش زۆر عاقڵ و زیرەک بوو، بیری کردەوە لەگەڵ ئەم پیاوە چۆن ژیان بەسەر بەرێ. بە پیاوەکەی گووت، برۆ بۆ شار کارێک بدۆزەوە بۆ خۆت بۆ ئەوەی مەعیشەتمان بسوورێ. پیاوەکەش رۆیی بەرەو شار، لە رێگادا بینی چەند سوارێک بە وڵاخەوە لە دیار بیرێک راوەستاون. کە ئەویش نزیک بووەوە، پرسی بۆچی وا راوەستاون؟ ئەوانیش گوتیان: ئەوا هەندێک شت و مەکمان لێکەوتۆتە ناو بیرەکە، بەڵام سوارەکان دڵیان نەهات یەکێک لە پیاوەکانی خۆیان بخەنە ناو بیرەکە. ئینجا پیاوە فەقیرەکەیان خستە ناو بیرەکە بۆ ئەوەی شت و مەکەکانیان بۆ بهێنێتەوە.

پیاوە فەقیرەکەش لەناو بیرەکەدا بیری کردەوە، کەوا بزانێ چ رێگای دیکە هەیە بۆ ئەوەی لەو بیرە دەربچێ. دیتی لەناو بیرەکە کونێک هەیە، ئەویش بە دوای ئەو کونە رۆیی رۆیی. هەتا گەیشتە دەرگایەک، لە دەرگاکەی دا دەرگاکەیان بۆ کردەوە، دیتی غورفەیەک پڕیەتی لە کچی جوان جوان. ئەویش پرسی ئێوە چین؟

ئەوانیش وتیان: ئێمەی خادمەی پاشاین، وتی ئەی کوا پاشا؟ ئەوانیش وتیان: وا لە ژوورەکەی دیکە دانیشتووە.

ئینجا چووە ژووری پاشا، دیتی ژنێک لەتەک پاشا دانیشتووە، ئیجگار ناشیرین و رەزاگرانە و ددانێکی درێژی هەیەو ژنێکی جوان و جاحێریش، کە وەک مانگە لەبەردەستیان دێت و دەچێ. پاشا لە پیاوەکەی پرسی کامیان جوانترە ئەو ژنە جاحێرە یان ئەوەی لە تەکم دانیشتووە. پیاوەکەش بیری کردەوە وتی: دیارە ئەو

پرسیاره شتێکی تێدایه. وتی: ئەو ژنەی لە تەکت دانیشتووه. پاشایەکەش وتی: دەبێ (سێ سێوی زێڕ)ت خەلات بکەم، لەبەر ئەوەی ئەو ژنەت پێ جوانه، وتی: چەندین کەس وتیان ژنه جاحێرەکە جوانە منیش ئیعدامم کردوون.

پاشا، کە هەستا چوو سێ سێوەکە بهێنێ، پیاوەکەش پرسی لە ژنەکە ئەو مەسەلەیە چییە؟ ئەویش وتی: بەختی ئەم کچە جوانه شاردراوەتەوه، بەلام بەختی من وەکو زەنگورە هەرچەندی بای لێ بدات دەزرنگێتەوه. ئینجا پیاوەکە سێ سێوەکەی وەرگرت و بەلایەکی دیکەی بیرەکە چووە دەرەوه، کە گەڕایەوە مالەوه ئەوەی بەسەرهاتبوو بۆ ژنەکەی خۆی گێڕایەوه. ژنەکەشی زۆر دلخۆش بوو. کەوا ئەم سەروەتە و سامانیان بە دەست کەوت.

ئینجا بە ژیانی پڕ لە خۆشی و ئاسوودەیی دەژیان. هەردوو خوشکەکەی ژنەکە مێردەکانیان پارەیان نەمابوو، فەقیر ببوون، بۆیە مێردی کچە بچووکەکە یارمەتی هەردوو خوشکی ژنەکەی خۆی دەدا.

***

**• سولتان مەحموود و حەسەنی مەمەندی**

ئەم چیرۆکە لە (عەبدولڕەزاق سدیق) وەرگیراوه، کە لەدایکبووی سالی (١٩٣٦) و لە شارۆچکەی (تەق تەق) نیشتەجێیە و خوێندەواره.

**کۆکردنەوەی: مەسعوود عەبدولڕەزاق سدیق**

ڕۆژێک لە ڕۆژان سولتان مەحموود، کە پاشای شارێک بوو، داوای لە (حەسەنی مەمەندی) کرد، کە جل و بەرگی پاشایی دابکەنن و جلی دەروێشی لەبەر بکەن و بەناو کوچەو کۆلانەکانی شاردا بسووڕێنەوه، لۆ ئەوەی دەنگ و باسی ناو شار بزانن. لە یەکێک لە کۆلانەکان دەرۆیشت، لەو کاتە گوێیان لە ژنێک بوو، کە بە پیاوێکی دەگوت: پیاوەکەم لە ماریّ نییە و داوای لێکرد کە ئەو بچێتە کنی، پیاوەکەش گوتی: بەو شەرتەی دێمە کنت ئەگەر مێردەکەت لەمار نییە سەری بیرێ و سەرەکەی بینی بێخەمە بن پێم، لۆ ئەوەی لە جۆگاکە پێی بپەڕیمەوه.

سولتان کە گوێی لەو قسەیە بوو بە (حەسەن مەمەندی) گۆت: برۆ ختمی سولتان لە قاپی ئەو مارە بدە لۆ ئەوەی سبەینێ بیناسینەوه. دەلێ (حەسەن) چوو ختمی لە مارەکەدا. کە پاش چەند وەختی ژنەکە هاتە دەرێ و پێ ختمی سولتانی چل مار لەولاو چل مار لەم لای ماری خۆیانی ختم کرد. لۆ بەیانی کە پاشا هاتە کۆشکی پاشایەتی جلک و بەرگی سوری لەبەرکردبوو ( ئەو جلکە سوورەش نیشانەی تورەیی پاشابوو، واتە پاشا لەو ڕۆژە یەکێک ئیعدام دەکات). دەرێ پاشا بە حەسەنی گۆت: برۆ لەو مارەی کە ختمی لێدرا، ژنەکەم لۆ بێنه، دەرێ حەسەن ڕۆیی و گەڕایەوە گۆتی: جەناب نەمناسییەوه، چونکە چەند ماری دیکەش ختم کرایەو نازانم کامەیان هەوه. دەرێ سولتان لەو کاتەدا ئەمری کرد گۆتی: من دەڕۆم لۆ سەفەرێکی چەند ڕۆژێ، بەلام هەتا دێمەوە نابی لەو شارە یەک ژن بمینێ و هەموویان ئیعدام دەکەی، لە پێش هەموویان ژنەکەی من ئیعدام دەکەی، دەرێ: حەسەن دوایێ، کە پاشا دەڕوا دەچێتەوە ماریّ. حەسەن باوکێکی ئەختیاری دەبی و لەبەر ئەختیاری لە ناو قەفەسی دانایە، هەموو ڕۆژێ حەسەن نان و خواردنی دەداتێ، بەلام حەسەن ئەو ڕۆژە لەبەر قسەکەی پاشا لە بیری دەچی بیداتێ. باوکی پێی دەرێ حەسەن لۆ وا عادزی و منت لەبیرکردییە، خواردن و خواردنەوەم نادەیتێ، حەسەنیش هەردەستی خواردن و خواردنەوە لۆ باوکی دەباو دەیداتێ. پاشان سەرگوزشتەکەی لۆ دەگێڕێتەوه، باوکی پێی دەرێ: کوڕم ئەم کارە ئەنجام مەدە ئەگەر سولتان گەڕایەوە ئەوا من ببە کنی و چەند قسەیەکی لەگەل دەکەم.

پاش چەند ڕۆژێ سولتان دەگەڕێتەوە لۆ شارەکەی و ئەهالی شار بە ژن و پیاوەوە بەرەو پیری دەچن. کە سولتان چاوی بە خەلکەکە دەکەوێ دەبینێ، کە ژن زیاد بووە کەم نەبووه. دەرێ سولتان یەکسەر دەچێتە شوێنی خۆی و دەنێرێ بە دوای حەسەنی مەمەندی و بڕیار دەدات، کە ئیعدامی بکەن. کاتێ، کە حەسەن دێ دەرێ جەنابی سولتان من ناپاڕێمەوە لۆ ئەوەی ئیعدامم نەکەی، بەلام باوکێکم هەیه، کە زۆر ئەختیارە و دەیەوێ چەند قسەیەکت لەگەل بکا، دەرێ: پاشا بە حەسەنی گوت باشە برۆ باوکت بێنه. حەسەنیش باوکی دەینێ، کە لەناو قەفەس دایەو لەسەر مێزێک بەرامبەر بە سولتان دایدەنێ. (مەمەند)

یش، کە باوکی حەسەنە لەگەڵ سولتان دەکەوێتە گفتوگۆ و دەرێ: پاشا سەرت سەلامەت بێ: من وەختێک لە گوندێک دادەنیشم، هەموو شەوێک لەو گوندەی ئێمە زەلامێک دەکوژرا، کەس نەیدەزانی کێ دەیکوژێ. شەوێک لە شەوان گریان و هاوار لە ماری یەکێک لە جیرانەکانمان پەیدابوو، کە چووم دیتم زەلامەکەیان کوژرابوو. دەرێ لۆ شەوێ دوایی زانیم، کەوا سرە دێتە سەر من. من ماینێکی زۆر چاکم هەبوو، شیرو چەک و تفاقی خۆم ئامادەکردو بڕیارم دا، ئەو کەسە بکوژم، کەوا خەڵکی ئەو دێیەی هەموو خەلاس کرد. لەو کاتەدا من ئامادەبووم. لەقاپییەکەمان درا، کە چوومە دەرەوە سوارماینێک بوو کە منی دیت گۆتی: بابڕۆین، منیش سواری ماینەکەم بووم و چوومە دەرێ و ڕۆیشتین. کاتێ لە گوندەکە چووینە دەرێ ئەو لە پێش منەوە دەڕۆیشت. لەو کاتەدا چەند جارێک ویستم بیکوژم لە دواوە، بەلام غیرەتم قبولی نەکرد و گۆتم بزانم نەتیجەکەی چییە و بۆ کوێ دەچین. هەر ڕۆیشتین هەتا گەیشتینە ئەشکەوتێک کە لە دووری گوندەکەمان بوو. سوار ماینەکە دابەزی و گۆتی: تۆش دابەزە. لەو کاتەدا کە هەردووکمان دابەزین و ئەو دەستی دایە شیرەکەیی و چووە ناو ئەشکەوتەکەوە. گۆتی ئەگەر پاش نیو سەعاتی دیکە نەهاتمەوە ئەوا ماینەکەم بەرەو نیشانەی ئەوە من کوژراوم و نەماوم.

پاش نیو سەعاتەکە وەختێک دیتم هاتەوە لای من و پێمی گوت: سواری ماینەکەت بەو بابڕۆین لۆ ماری خۆت. دەرێ: کە گەڕاینەوە گوندەکەو چووینەوە مارێ خۆمان بەژن و مندارەکانم گوت، ئاگرمان لۆ بکەنەوە و خواردنمان بۆ دروست بکەن.

پاش نان خواردن و ئیسراحەت کردن. پێی گوتم: لە گوندەکەتان مەلا هەیە؟ ئەمنیش گوتم: بەرێ. ئەویش گۆتی بنێرە لە دوی مەلا با بێ لۆ ئێرە. منیش ناردم بە دوای مەلا، کاتێ مەلا هات. سوارەکە دەم و چاوی کردەوە و خۆی ئاشکرا کرد کەوا ئافرەتە. گۆتی: من قابیل بە هیچ کەس نیم ئیلا تۆ نەبێ. منیش لێم پرسی:

باشە سەرگوزشتەی تۆ چییە و بۆچی چووینە ناو ئەو ئەشکەوتە؟ ئەویش گوتی: برایەکم هەبوو دێو بردبوویان و کوشتیان. منیش هاتمە ئەو گوندە لۆ ئەوەی زەلامێکی حازر و ئازا بیینمەوە و لەگەڵ خۆم بیبەم تا دێوەکان بکوژم، دەرێ لە هەر قاپییەکم دەدا دەمدیت کابرا بە (نەعل) ێکەوەدو بە جل و بەرگی خەوەوە دەهاتە دەرێ، منیش یەکسەر شیرەکەم لەسەری دەداو دەمکوشت، تا ئەوە بوو هاتمە ماری تۆ، کە دیتم کەوا تۆ زۆر مەزبووت و حازر بەدەستبووی، بڕیارم دا لەگەڵ خۆم بتبەم. ئەوەبوو چووین و دێوەکەی لەناو ئەشکەوتەکەم کوشت. پریسکەیەکی دەرهێناو گوتی ئەوە لچ و لێوی دێوەکەیە کە کوشتوومە. ئینجا مەمەندی بە پاشا دەرێ: پاشام من کە ئەو سەرگوزشتەیەم لۆ توو نەقل کرد، مەبەستم ئەوەیە کەوا لە دنیادا ژنیش هەیە و ژنۆکەش هەیە، بڕوا بکە پاشا، حەسەن کە کوڕی منە لەو ژنەیە کەوا لۆتم باس کرد. لێرەدا ناپاڕێمەوە، کە حەسەنی ئیعدام نەکەی، دەرێ پاشان پاشا بڕیاریدا کەوا حەسەن عەفوی بکات و ئیعدام نەکرێ.

***

**• بەسەرهاتی جوولەکە**

ئەم ئەفسانەیەم لە دایکم وەرگرتووە کە ناوی (فەهیمە سابر وەیسی) یەو دانیشتووی گەڕەکی کورانە: تەمەنی ٤٠ ساڵە.

**کۆکردنەوەی: سەحەر سلێمان**

هەبوو نەبوو کەس لە خوای گەورەتر نەبوو، جارێکیان پیاوێکی جوولەکە هەبوو، زۆر زۆر دەوڵەمەند بوو، گەلەکی (لیرە) هەبوو، هەموو ڕۆژێ ئەو پیاوە جوولەکەیە دەچووە بازاڕی پیاوێکی موسڵمانی کرێکاری دەبرد، دەیگۆتە پیاوە کرێکارەکە هەندێ ئیشم هەیە بۆمی دەکەی؟ پیاوە کرێکارە موسڵمانەکەش لەگەڵی دەچوو، لەبەر فەقیری و دەست کورتی، بەلام پیاوە جوولەکە کە مەبەستی خۆی هەبوو، ئەویش ئەوەبوو، کە موسڵمان نەهێڵێ و لەناویان ببات.

ئەو شوێنەی، کە کرێکارەکانی دەبرد شوێنێکی زۆر ناخۆش بوو، شاخێک بوو هەر چوار دەوری ئاو بوو شاخەکەش زۆر ڕاست بوو، کەس نەیدەتوانی بەسەربکەوێ لەبن شاخەکەش ئەشکەوتێک هەبوو ناو ئەشکەوتەکەش پڕی (لیرە) بوو.

ئینجا جوولەکە بەخۆی و پیاوە موسڵمانەکە بە بەلەم دەچوونە ناو ئەشکەوتەکە، لە گەڕانەوەدا دەیگووت: پێڵاوەکانم لەبیرکردووە، برۆ بۆم بهێنەوە، لەناو ئەشکەوتەکە، پیاوە موسڵمانەکەش دەچوو لە گەڕانەوەدا تەماشا دەکا پیاوە جوولەکەکە بەجێی هێشتووە بەتەنها لەوێ بێ نان و خواردن دەمایەوە، شوێنەکەش کەسی بەسەر نەدەچوو، ئینجا لەوێ دەمرد. چەندین پیاوی بەم شێوە بردن و کوشتنی.

ڕۆژێکیان دیسان چوو بۆ بازاڕ، پیاوێکی لەگەڵ خۆی برد، بەڵام پیاوەکە زۆر زۆر بە دین و موسڵمان بوو بەهەمان شێوە پیاوەکەی بەجێهێشت.

پیاوە موسڵمانەکە دانیشت، زۆر بیری کردەوە، گوتی: بابەسەر ئەم شاخە بکەوم، ئەگەر دەربازبووم باشتر، ئەگەر دەربازیش نەبووم ئەوا دەکەومە ناو ئاوەکەو دەمرم: (بەتەمای خوای).

ئینجا بەسەر شاخەکە کەوت بە هەزار(قول هو الله) دەربازی بوو، گەلێک ڕۆیی تا گەیشتە گوندێک، کەوا کەسی لێ نەدەناسین، عادات و دەستووریان لەگەڵ هی پیاوەکە زۆر جیاواز بوو، بەڵام بەهەرجۆرێک بێت خۆی لەگەڵیان گونجاند. چەند ساڵێک لەوێ مایەوە تا حەزی لە کچێکی گوندەکە کرد، بەڵام ئاغای گوندی پێی وت: بۆ تۆ زەحمەتە، چونکە ئەگەر پیاو مرد، دەبێ ژنەکەی ئەو لەناو بیرێک شۆڕی بکەنەوە خوارەوە، نان و خواردنی تەنها سێ ڕۆژی لەگەڵ دەنێرنە خوارەوە ئەگەر ژنەکەی بمرێ ئەوا پیاوەکەش بەم شێوەیە تاکو دەمرێ. پیاوەکەش وتی: مشکلە نییە خوا کەریمە هەتا من یا ژنەکەم دەمرین. ئینجا ژنەکەی هێنا پاش چەند ساڵێک ژیانیان بەسەربرد و منداڵێکیان بوو ڕۆژێکیان ژنەکەی نەخۆش کەوت هەر لەسەرمردن بوو، پیاوەکەش وتی: با هەڵێم، لە دڵی خۆیدا وتی: بۆچی بەبەڵاش من بمرم، ئینجا هەڵات ڕۆیی. لە ڕێگادا بیری کردەوە، وتی: بەشکم ژنەکەم نامرێ چاک دەبێتەوە، من بۆچی بەجێمهێشت!! یەکسەر گەڕایەوە، کە گەڕایەوە دیتی ژنەکەی مردووە، ئەویش هیچی لە دەست نەما، تازە چی پێ ناکرێ ! خەڵکی گوندی پیاوەکەیان لەگەڵ ژنەکە نانی سێ ڕۆژیان دایێ ڕەوانەی خوارەوەی بیرەکەیان کرد.

دوای دوو ڕۆژ لەوێ مایەوە لە کاتێکدا دەبینێ لە سەرەوەی بیرەکە گارە گار و دەنگە دەنگێ دێت، سەیری کرد وا مەیتی پاشایان لەگەڵ ژنەکەی خۆی، واتە (ژنی پاشا) ڕەوان کردە خوارەوە.

کە ژنەکە هاتە خوارەوە پیاوەکەش پێی وت: مەترسە هیچت لێناکەم بەس ئەو خواردنەی پێتە بەیەکەوە دەیخۆین. هەندەی پێنەچوو، گوێیان لە خشپەخشپەیەک بوو دیتیان عەزیایەک وا ئێسکی مەیتەکان دەخوات. پیاوەکە بیری کردەوە، گوتی: با بە دوای ئەو عەزیایەدا بچم بەشکو، دەگەمە سەر زەوی. ژنەکەش (ژنی پاشا) چەندی لەبەری پاڕایەوە وتی: بەجێم مەهێڵە ئەویش پێی وت وەڵڵا - ئەگەر ڕێگام دیتەوە بۆ دەرچوون، ئەوا دەگەڕێمەوە دوات دەتبەم لەگەڵ خۆم، ئینجا هەر ڕۆیی ڕۆیی تا چەند ڕۆژێکی پێچوو. هەر بە دوای عەزیایەکە تاکو گەیشتە ڕوناکییەک، دیتی کونێک هەیە لەسەر زەوی دەردەچێ ئینجا گەڕایەوە زۆر دڵی خۆش بوو، ژنەکەی لەگەڵ خۆی برد و چوونە سەر زەوی، بەڵام ئەو زەوییەی لێی دەرچوون گوندی خۆیان نەبوو، بەڵکو سەحرایەک بوو چۆڵ و هۆڵ.

چەند ڕۆژێک بە ڕێگاوە بوون، پیاوەکە بە ژنەکەی وت: بۆچی مێردم پێناکەی تازە ئێمە هەر ناگەڕێینەوە گوندەکەی خۆمان؟ ژنەکەش ڕازی بوو مێردی پێکرد.

پاش ئەو هەموو بەسەرداچوونی ماوەو ڕۆیشتنی ڕۆژگار، ئەو هەموو ساڵەی پڕ لە خۆشی و ناخۆشی و کارەساتە، بیری کردەوە، کە بچێتە شارە ڕەسەنەکەی خۆی و ژنەکەش لەگەڵ خۆی ببات. کە گەڕایەوە جێ و شوێنێکی بۆ خۆی و ژنەکەی خۆی پەیا کرد.

ڕۆژێکیان دیسان چوو بۆ بازاڕ بۆ ئەوەی بزانێ جوولەکەکە ماوە تاکو تۆڵەی خۆی و هەموو ئەو موسڵمانە بێ تاوانانەی لێبکاتەوە.

کە چوو بۆ بازار زۆر گۆڕابوو، دیتی وا جوولەکەکە پیر بووە بە هەمان شێوەی زەمانی قەدیم دەیەوێ کرێکاران ببات بۆ ئەشکەوت، پێی دەگوتن: من توانای ئیشم نییە پیرم کێ دێ ئیشم بۆ بکات؟ من چەندی پارەو پولی بوێت دەیدەمێ.

پیاوەکەش خۆی لە گێلی داو پێی وت: من لەگەڵت

دێم. پیاوەكە جوولەكەكەی دەناسییەوە، بەڵام جوولەكەكە پیاوەكەی نەدەناسییەوە، ئینجا بە هەمان شێوە لەگەڵی چوو بە بەلەم. لە گەڕانەوەدا دیسان جوولەكەكە بەقەستی پێلاوەكانی لە ئەشكەوتەكە بە جێیهێشت، بە پیاوە موسڵمانەكەی وت برۆ بۆم بهێنەوە پیاوەكەش وتی تاقەتم نییە پێلاوەكانت بۆ ناهێنمەوە. جوولەكەش وتی ئەی من تۆم بۆچ هێناوە غێر ئیشم لەگەڵ بكەی؟

بۆچی پێلاوەكانم بۆ نایێنییەوە؟ موسڵمانەكەش وتی خۆمن خادیمەی تۆ نیمە.

پیاوە جوولەكە چی لە دەست نەما هەستا بە خۆی پێلاوەكانی خۆی بێنێتەوە، لە گەڕانەوەدا دیتی پیاوە موسڵمانەكە بەجێی هێشتووە لە دوور راوەستایە. پێی پێدەكەنی، هەرچەندی هاواری كرد كوڕە بەجێم مێڵە هیچ گوێی نەدایێ و پێی وت من فلانم، كە فلان رۆژ و فلان ساڵ ئەمنت بەجێ هێشت بەم شێوەیە.

هێشتا پیاوە موسڵمانەكە نەرۆیشتبوو پیاوە جوولەكەكە بەسەر شاخەكە كەوت تەپەی لێوە هات و كەوتە ناو ئاوەكە و خنكا. بەم شێوەیە توانی تۆڵەی ئەو هەموو بێ تاوانانەی لێبكاتەوە، ئەو لیرەی لەناو ئەشكەوتەكە دابوو لەگەڵ خۆی گەڕاندەوە و دابەشی كرد بەسەر ماڵە فەقیرەكان و بەخۆو بە ژنەكەی ژیانێكی خۆشیان دەبردە سەر، هەموو شتێكی هەبوو بگرە لە پارەو پول و ماڵ ومنداڵان.

چونكە پیاوە جوولەكەكە هیچی لێی نەدەخوارد، ئەوەیە پێشینیان وتویانە ( ماڵی نەخۆری لۆ چەكمە سۆرێ).

***

– ئەم دەقە دەقێكی هورێنە (خەرافە)یە و جیایە لە ئەفسانە و جۆرەكانی تری حەكایەتە فۆلكلۆریەكان (ك. ه).

**• مەندی مەندان**

لە (جەمیل عەبدوڵڵا ئەحمەد) وەرگیراوە، خوێندەواری نییە تەمەنی (٧٠) ساڵە، لە گەڕەكی موفتی – هەولێر دادەنیشێ. كۆكردنەوەی: سەروین محەمەد جەمیل

هەبوو نەبوو مەندی مەندان
دایكەكی هەبوو لەناو كەندان
تیرەكەی هەبوو بەبێ كەوان
بای دەدا كەروێشكی پێ نەدەكەت
دەی كوشتەوە...

مەنجەڵێكی كۆنی هەبوو.... گۆشتەكە دەڕژا ئاوەكە دەما، توولەكی هەبوو دەی لێستەوە، مستەكی لێ دا حەفت گەز قوماشی پێ بڕی...

گۆتی نازانم ئەو قوماشە بكەم و بەرانك و چۆغەلێكیان بیدەم بە كەڵەبابی زێڕ، كاروانی پێ بكەن لە بەینی ئێران و هەولێر.

رۆژێك بارەك هەرزنی هێنابوو، بەستۆرە ئەو مل ئەو مل هاتبوو، هەموو دنكە هەرزنەكان بە بەردەكانی پەرانەدەوە..

كە چووە ئەوبەری هەموو دنكە هەرزنەكانی خڕ كردەوە هاویشتییە لاتیرەكان، دنكێك هەرزنی لێ بزر بوو، هەرچەند بەردی بەستۆرە هەیە خستییە لا تیرەكەی دی، بارەكە راست نەبووەوە، هەرزنەكەی هیناوە پشتی كەڵەباب كول ببوو، بردییە لای دكتۆر، گوتی گوێزەكە بسووتێنە وردی بكە لە پشتی چاك دەبێتەوە، گوێزەكە بوو بە بنە دارەكی یەكجار گەورە لەسەر پشتی كەڵەبابەكە، رۆژێك كەستەكێكی هاویشت لۆ كەڵەبابەكە بە پشتی كەت بوە زەوییەكی گەورە، حەفت گوندی لی دەحەواوە، حەفت جووتیار جۆتی لێدەكرد، حەفت عەربە گەنمیان لێ چاندبوو، رۆژەك چێلی ماڵی حەمەد كوتكی، چووە ناو دەغڵەكە، گەڕان نەیاندیتەوە، گەنمەكەیان دوورییەوە.... كێشایانەوە...

كوتایانەوە.... نەیاندیتەوە
بەبایان كرد.... نەیاندیتەوە
بردیانە ئاشی.... نەیاندیتەوە
كردیانە هەویر... نەیاندیتەوە
كردیانە ئەنگوتك... نەیاندیتەوە

خستیانە سەر سێری پۆقژەكی كرد، لەناو پۆقژەكەی چێل هاتە دەرێ بە خۆو بە گۆلكەوە قامكە گیایان بە دەمەوە بوو...

**پاشا سوڵتان موزەفەر**

ئەم دوو حەکایەتە فۆلکۆرییە، (پاشا سوڵتان موزەفەر) و (جۆگەی عاشقان) هەریەکەیان باسی پادشایەکی دیار و مێژوویەکی کۆن و زانراو دەکات کە هەریەکەیان لەم شاری هەولێرە حوکمیان کردووە. سەنحاریب کە لە حەکایەتی جۆگەی عاشقان ناوی هاتووە لە سەدەی حەوتەمی پێش زایین و سوڵتان موزەفەرەدین گوگبەری لەسەدەی حەوتەمی کۆچی حاکمی هەولێر بووە. هەردووکیان پاڵەوانی حەکایەتە فۆلکلۆرییەکانن، ئەوەی سەیرەو تایبەتمەندی ئەفسانەی پاراستووە، حەکایەتی جۆگەی عاشقانە، کە باسی ئاوهێنانی سەنحاریب دەکات بۆ شاری هەولێر، بەڵام بەشێوە مێژوویییەکەی نا! بەڵکە بەشێوەی حەکایەت، لەویشدا شاری هەولێر وەکو جوگرافیای رووداو و سەنحاریب وەکو پاشای ئاوهێنەر و ئاوهێنان وەکو کاری پاشا وەک خۆی پارێزراوە، بەڵام شێوەی ئاوهێنەر و ئاوهێنان وەکو کاری پاشا وەک خۆی پارێزراوە، بەڵام شێوەی حەکایەت ئەوەیە. سەنحاریب، بە ئەندازیار و وەستا و کرێکار ئاو ناهێنی، بەڵکە وەک حەکایەت باس دەکات بە مەرجی کچە جوانەکەی، کە هەرکەسێ ئاو بۆ هەولێر بێنێ دەیداتێ، لەوەش سەیرتر دوو وەستا یەک مەسیحی و یەک موسڵمان. حەکایەتخوان تێکەڵ رووداویان دەکات، لە کاتێکدا، ئەو وەختە نە ئایینی مەسیح و نە ئایینی موسڵمان هیچیان پەیدا نەببوون، ئەوەش یەکێکە لە تایبەتمەندی حەکایەت و فۆلکلۆر کە بەپێی زەمەن دەگۆڕێ.

لە حەکایەتی سوڵتان موزەفەر، بەسەرهاتێک دەگێڕێتەوە، کە دوورنییە روویدابێ، کە پێکهاتە و شوێن و کارەکتەر و مەبەستەکان زۆر گونجاون لەگەڵ شوێن و زەمەنەکە. لە هەردوو حەکایەتیش (شوێن) جوگرافیای رووداو شاری هەولێرە. (ئ. ه).

هەبوو نەبوو، کەس لە خوای گەورەتر نەبوو. دەڵێن پاشایەک هەبوو لە شاری هەولێرێ ناوی سوڵتان موزەفەر بوو. دەڵێ ساڵێکیان بەهار هات وەزیرێکی لەجێی خۆی دانا و بۆ کوێستان چوو وتی: دەگـوێرم. دەڵێ بار و بارخانەی عەسکەری تەباخ و هەموو شتی خۆیان برد و هەروەها وەزیر و پیاوی ئیختیار (پیاو ماقوڵ) لە کوێستان لەو دۆڵ بۆ ئەو دۆڵ رۆیشتن گەیشتنە سەر حدود تەماشای کرد رەشماڵێک هەڵیداوە. رەشماڵەکە حەوت ئەستوند بڵند بوو و دیتی پەنجا سوار دەهات، پەنجا سوار دەڕۆیشتن. سەرۆکی عوربانەکە کە پیاوێکی باش بوو ناوی مام خواجە بوو، پاشا وەزیری نارد وتی: بڕۆ بزانە ئەو پیاوە خانەدانە کێیە؟ تا بچین میوانی بین تا بزانین چ جۆرە پیاوێکە! دەڵێن چوون چاویان دایە عوربانەکە، پاشا چووە ناو عوربانەکە و کەس نەیزانی پاشایە. دوایی بە گەرمی بەخێرهاتنیان کرد و رێزیان لێنا. پاشا بە پیاوەکانی گوت: کەس بانگم نەکات بە پاشا، پیاوێک هات لە سەرووی دیوەخان دانیشتبوو، ئەمری کرد، کە خواردن بێت، یەک جۆر خواردن لەپێش هەموان دانرا بەبێ جیاوازی، کە نانیان خوارد خواحافیزیان کرد.

(شێخ)یش بە پاشای گوت: چ خزمەتێکت نییە بۆت جێبەجێ بکەین؟ گوتی: ناوەڵڵا.

وەزیر بە پاشای گوت: ئەو شێخە شێخە، بۆیە وا دەوڵەمەند بوو، قەت نانی بە کەمی نەخواردوە و یارمەتی خەڵکی داوە لە رێگای خودا. بواری خۆیان کرد و گەڕانەوە شاری هەولێرێ، پاش ئەوەی دە ساڵی بەسەر چوو ساڵێکیان بەفر و باران گەلێک زۆر بوو، زستانێکی سەخت بوو. ئەوەی مەڕومالات بوو، هەموو مرد و رۆیی. ئەوەی ماوە و نەماوە تەنها (شتێکی کەم) ماوە لەگەڵ ماڵ و منداڵ بۆ ئەشکەوت رۆیشتن، وایلێهات ئەوان سواڵ بکەن.... مام خواجە، ویستی بێتە شاری هەولێرێ بۆ سواڵکردن بۆ ئەوەی شتێک پەیدا بکات بۆ ماڵ و منداڵی بباتەوە، لە شاری هەولێرێ قاوەخانە بە قاوەخانە گەڕەک بە گەڕەک دەگەڕا. ئەو رۆژە پاشای شاری لەگەڵ وەزیرەکانی دەگەڕا عەینی پیاویان دیت ( واتەشێخەکە). پاشا بە وەزیرەکانی گوت: ئەی ئەوە پیاوە دەوڵەمەندەکە نەبوو، میوانی بووین؟ وتیان: بەرێ وەڵڵا.

پاشا ئەمری کرد پاسەوانەکان بڕۆن بیهێنن بۆ جێیەکی پاک و خاوێن. نانەکی گەرمی بدەنێ بزانن مەسەلەی چییە، ئەگەر نەهات ئەوا بە تۆبزی بیهێنن، دوایی بیبەنە سەرتاشخانە سەری بتراشن و دوایی پێی بڵێن: بچین بۆلای پاشا، هێنایانە میوانخانەی نان و هەموو شتی خوارد و سەریان تاشی و قاتێکی نوێیان بۆ دانا، کابرای شێخ گوتی: من ئەو قاتە لەبەر ناکەم ئەگەر لەبەری بکەم کەس خێرم پێناکات، وتیان ئەوە ئەمری پاشایە. پاشا دێتە

دیدەنیت، کابرای شێخ گوتی: هەبێ و نەبێ ئەو پاشایە ئیلا منی بە دەوڵەمەندی دیوە، ئەوجا خەبەری پاشایان داو گوتیان: ئەوە سەرمان تاشیوە و پاک و خاوێنە. پاشا گوتی: ئەوەک بەو حاڵەی کە پیس و پەڵۆخ بوو بیبینم زگی بەخۆی بسووتێ.

پاشا چوو بۆلای تۆقەی لەگەڵ کرد، پاش گفتوگۆ قسەکردنێکی زۆر، پاشا لێی پرسی: ئەوەی من تۆم دیتبێ تۆ پیاوێکی دەوڵەمەند بووی. بۆ وات لێ هاتووە؟ سەر و سەربردەکەی خۆی بۆ گێڕایەوە. مام خواجە گوتی: دەبێ سبەی زوو بگەڕێمەوە شتەکیان بۆ ببەم تا لەبرسان نەمردوون. پاشا گوتی: سبەی ناچییەوە بەڵکو لێرە دەمێنیەوە تاکو حەفتەیەکی ئینجا شتت بۆ حازر دەکەم و پێکەوە دەڕۆین. پاشا ئەمری لەسەر پیاوی خۆی کرد، کە سێ سەد هێستری بکڕن و زەخیرەی لێ باربکەن، پاشی سێ ڕۆژان گوتی: یەڵلا مام خواجە خۆت حازر کەو بڕۆین، دەڵێ ڕۆیشتن هەموو شتیان برد، قۆناغ بە قۆناغ، ڕۆیشتن تا گەیشتنە کوێستانێ، دەڵێ دیتیان ڕەشماڵەکی حەوت ستوون هەڵدراوە. عەینەن وەکی جاران، پەنجا سوار دێ و پەنجا سوار دەڕوات، پاشا گوتی: مام خواجە ئەوە هەروەک جارانە. مام خواجە وتی: چ بڵێم ئەوە کاری خودایە، کە من بەجێم هێشت ئەوها نەبوو. دەڵێ چوونە ناو عوربانێ بە گەرم و گوڕی بەخێرهاتنی مام خواجەیان کرد و ناسیانەوە بە کەیف و خۆشی و دڵگەرمی، پاش نان خواردن و حەسانەوە ژنی مام خواجە خەبەری نارد، کە دوایی بێن بۆ ماڵی مام خواجە. دەڵێن چوون بۆ ماڵی مام خواجە ژنەکەی ئەمری کردە دوو پیاوان، کە (کوپەزێڕ)ی هێنا لەناو دانیشتوان لەپێش پاشایان دانا و خڕەی لێوەهات، ژنەکە گوتی: پاشا لەوانەیە ئێستا تۆ بڵێی مام خواجە درۆی بکات، کە بەتۆی وتوە: من لێم قەوماوە، لەوانەیە بپرسی چۆن ئەو ماڵە ئەوهای لێهاتووە. پاش ئەوەی مام خواجە چوو بۆ شار بۆ سواڵکردن و ئێمەی بەجێهێشت، لەناو ئەشکەوت، من لەدوای ئەو هەستام دەسم کرد بە قوڕ شێلان بۆ ئەوەی تەندوورەکی دروست بکەم نانی بکەم تاکو لە برسان نەمرین. هەر کە دەستم دایە خاکەناسی لە ئەرزم چەقاند خاکەناس لە شتێک گیر بوو، منیش سەرم هەڵدایەوە دیتم کوپەڵەیەکی گەورەی لێبوو، پڕ بوو لە زێڕ، منیش هەستام پیاوم نارد و دەستم کرد بە شت کڕین مەڕ و ماڵاتم کڕی و عوربانمان دامەزراندەوە، ئەوەیە بەسەرهاتی ئێمە پاشا، پاش ئەوەی ماوەیەک لەلایان مایەوە دوایی هاتەوە بۆ شاری هەولێر.

* ئەم بابەتە لە کتێبی (هێلکەی نامێ) بەرگی یەکەم - بەشی دووەم، مەولوود ئیبراهیم حەسەن، وەرگیراوە.

**هەقایەت:**

**جۆگەی عاشقان**

**کۆکردنەوەی: نیهایەت یوسف ئەحمەد.**

**گێڕانەوەی: عەلی عومەر حەمەد.**

دەگێڕنەوە لە زەمانی پاشا (سەنحاریب)دا. ئەو پاشایە خەڵکی هەولێر بوو، کچێکی زۆر جوانی هەبوو، ئەو پاشایە شەرتێکی کرد کە ئەوەی ئاو لە زێی بادینان بۆ بگەیەنێتە هەولێر، ئەوا کچەکەی خۆمی پێشکەش دەکەم، ئینجا دوو پاڵەوان هاتن یەکیان موسڵمان بوو ئەوی تریان مەسیحی بوو بۆ ئەو کارە دەست بەکار بوون. هەر یەکەیان لەلایەکەوە دەستیپێکرد، بەڵام هەردووکیان دژایەتی یەکتریان دەکرد. بۆ ئەوەی زووتر کارەکەیان تەواو بکەن. موسڵمانەکە لە (قولیلان) لە نزیک بەستۆرە ئاوی بە ژێر زەویدا هێنا تا گەیاندییە نزیک هەولێر. ئەوی دیکەیان لە زێی بادینانەوە دەستی پێکرد، بەڵام کە زانی پیاوە موسڵمانەکە زۆری نەماوە کارەکە تەواو بکا، پیاوە مەسیحییەکە ویستی فێڵێک بکا. بۆ ئەمەش پیاوێکیان لە نێوان بوو تا بزانی کامەیان زووتر کارەکەیان تەواو دەکەن. پیاوە مەسیحییەکە هەندێ پارچە قوماشی تولی هێنا هەر لە زێی بادینانەوە رایخست تا بە دەوری قەڵای سوڕاندەوە، ئینجا هەندێک پارە و زێڕی دا بە پیاوەکەی نێوانیان تا بچێت بە پیاوە موسڵمانەکە رابگەیەنێ کە پیاوە مەسیحییەکە ئاوی گەیاندۆتە قەڵا. ئینجا پیاوەکە چووە لای و پێی گوت، کە پیاوە موسڵمانەکە ئەمەی بیست هاتە دەرەوە تەماشای کرد، کەوا تولەکە سپی دەچۆوە، وایزانی کە ئاوە، بۆیە یەکسەر ئەو قازمەی کە جۆگەی پێ هەڵدەکەند لە سەری خۆیدا و خۆی کوشت. تا ئێستاش شوێنەواری ئەم ڕووداوە ماوە لە ئاقاری بەحرکەیە.

# عەلی مەڕێ

محەمەد کەریم شەریف

هەبوو نەبوو پاشایەک هەبوو، سێ ژنی هەبوو چ منداڵی نەدەبوو. ڕۆژەک دەروێشێک هاتە دیوەخانێ پاشا.

گوتی: پاشا ئەو سێ سێوە بدە ژنەکانت یێک و منداڵیان دەبێ. سێ سێوی دایە دەست پاشا و لێیدا ڕۆیی.

پاشا چۆوە ماڵێ هەر سێ سێوەکانی دایە هەر سێ ژنەکانی، ژنێ گچکەی لەبەر نانی بوو، سێوەکەی خۆی نەخوارد لەسەر ڕۆخی (فەرشە)[1] کەی دانا. لەپڕ پیرە مەڕەکی (لەغەر)[2] هات سێوەکەی خوارد. ژنە لە (خەفەت)[3] ی سێوەکە بەزگی داو مرد. دوو ژنەکەی دیش هەردووک سێوەکانی خۆیان خوارد.

ژنە گەورەکە منداڵەکی بوو، بەخۆ بەمنداڵەوە مردن، ژنەکەی ناوەندیش منداڵەکەی مرد.

(ئۆباڵ بە ملێ ئەو مامۆستای ئەمن گێم لێی بووە)[4] دەڵێ پیرە مەڕەکەی سێوەکەی خواردبوو، هەتا دەهات زگی گەورە دەبوو، ڕۆژەک کۆخی، لەگەر کۆخینێ (پۆرگ)[5] ەکی لە دەوی دەرپەڕی، وەکی پۆرگەکەیان تەقاند منداڵەکی تێدا بوو.

پاشا ناردی کوڕەکەیان هینا دیوەخانێ.

گۆتی: حاڵا و مەسەلەی ئەو کوڕە ئەوهایە ! ئەوجە چ ناوی لێ بنێین؟

وەزیری دەستە ڕاست گۆتی: چونکە لەمەڕ بووە دەبا ناوی لێ بنێین (عەلی مەڕێ). ئەوانی لە دیوەخانێ پاشا دانیشتبوون هەموویان قسەکەی وەزیری دەستە ڕاستیان پەسند کرد.

عەلی مەڕێ هەر لە منداڵی ڕا بەزاخ بوو، ئەگەر بچووبایە ناو منداڵان گێی هەر منداڵێکی بگرتبا لەبنڕا دەریدەهینا، یان لە قاشوانێ نقی لە گۆ بدابایە بەلاقێ هەر کەسی بکەوتبایە قاپی دەشکاند.

ماڵێ پاشا لەناو (ڕەوە)[6] پیرە ماینەکی بەحری یان هەبوو، ئەو ماینە هەموو ساڵێ دەچۆوە ناو بەحرێ (کەلی دەخوارد)[7] و دەگەڕاوە ناو ڕەوەی هەتا وەختی دەهات کە بزێ، دیسان دەچۆوە ناو بەحرێ زگەکەی دادەنا ئەوجە دەهاتەوە.

دەڵێ ساڵەک کە ماینەکە چۆوە دەو بەحرێ هەر کە (زگەکەی)[8] دابنێ، عەلی مەڕێ بەدووی دا چوو، لەدەو بەحرێ کە ماینەکە زا جوانییەکەی گرتەوە.

ئۆباڵ بە ملێ ئەو مامۆستای ئەمن گێم لێی بووە، دەڵێ: جوانییەکە گوتی: عەلی عەلی مەڕێ مەمگرەوە، ئەمن بەتوو بەخێو ناکرێم! ؟ عەلی مەڕێ بەری نەدا. سێ جاران جوانییەکە گوتی: عەلی مەڕێ بەرەڵام کە ئەمن بەتوو بەخێو ناکرێم، ئەمن خواردنم برنجە و خواردنەوەم شەکراوە. عەلی مەڕێ هەر بەری نەدا، هێنایەوە ماڵێ بەتەنێ لە هۆدەی کرد، بەخۆشی شەو و ڕۆژ هەر لەدیاری بوو، هەموو جەمێ برنج و شەکراوی دەدایێ. هەتا وەختی هات (پشتی بکرێ)[9].

ژنێ پاشا زۆر ڕکی لە عەلی مەڕێ دەبۆوە چونکە منداڵەکەی وی مرد و عەلی مەڕێ ما، لەبەر هەندێ لەدوو ئەوە دەگەڕا (بە فەتارەتی بدا)[10]، ڕۆژەک چوو هەندە بزماری (ژەحراوی)[11] ی لەپێش کۆسپەی (هۆدە)[12] کەی عەلی مەڕێ و جوانییەکە چەقاند، نووکێ هەموویانی هێخستبووە سەرەوە هەتا ئەگەر عەلی مەڕێ هاتەدەرێ لەپێی (ڕابچی)[13] و بیکوژی. عەلی مەڕێ بەتەما بوو بێتە دەرێ دەست بە ئاو بگەینی.

ئۆباڵ بەملی ئەو مامۆستای ئەمن گێم لێی بووە، دەڵێ وەکی عەلی مەڕێ دەستی گەیاندە مەسینەکە بچێتە دەرێ

جوانییەکە گوتی: ئەوە چ دەکەی؟
گوتی: دەچمە سەر (دەستاو)[١٤] ێ.
گـوتی: برۆ (توورەگـە)[١٥] ک لەگـە خـۆت ببـە، چەند بزمار لەپێش دەرکە چەقاندرایە هەمووی بەزانایی دەرینە، دەستت بریندار نەکاتن. بیانهاوێ ناو توورەگەکەو لەدوور لەبن عەردیان بنێ. دەڵێ ئەویش چوو وەی کرد.
دەڵێ عەلی مەرێ ورما (متـوی)[١٦] جوانییـەکە ببوو شـەو و رۆژ لێی (دانەدەبرا)[١٧] ژنێ پاشـاش هەند لێی بە تەنگاو بوو بیکوژێ.
ژنە گۆتیە پاشای: ئەتوو لۆ ناچی ئەو کورە ببینییەوە نانەکی لێـرە بخـوا، لەژۆرێ هیـشـک بۆوە لەگـەر ئەو جوانییە.
دەڵێ پاشا چووە دوو عەلی مەرێ (کـووی هەبوو)[١٨] رازی کرد کە لەگەڵی بچیتەوە ماڵێ.
ئۆباڵ بەملێ ئەو مامۆستای ئەمن گێم لێی بووە، دەڵێ عەلی مەرێ خۆی رێک یێخست بچێتە دەرێ. جوانییەکە گۆتی:
کێوە دەچی؟
گۆتی: دەچمە ماڵێ بابم.
گـۆتی: ئاگـات لەخـۆبی، هەر خـواردنەکی لۆ تـوویان هێنا، پێشـان هەندەکی باوێ بەر پشـیلەک یان سـەیەک، ئەوجە بەخۆت بیخۆ؟
گـۆتی: ئێ.نی پاشـاش (شـیـو)ی[١٩] لێنابوو، لەبۆ عـەلی مـەرێ زەهری تێکردبوو، هەر کـەشـیوی لۆیان دانا، عەلی مەرێ چاوەرێی کرد هەتا پشیلەیەک بەوێ دا رابرد، پشکە گۆشتەکی لۆ تێهەڵدا، پشیلەکە هەر خواردی و (جێ بەجێ)[٢٠] (فـەراقی لەبە برا)[٢١] عـەلی مـەرێ راست هەستـاو لێیدا گەڕاوە کن جوانییەکە و بەسەرهاتەکەی لۆ گێراوە.
جوانییەکە گۆتی: جارەکیدی بەبێ پرسی من (داری لەسە بەردی دادەنێی) (٢٢)؟
ژنێ پاشـا زانی هەتا ئەو جوانییـە بمێنێ هەرچی بکا کەلکی نییە. لەبەر هەندێ دەستی بەناز و فیز کرد.
گۆتی: ئەز زگم هەیە (مەگیرانی)[٢٣] بەگۆشتی جوانی دەکەم:
هەژارانە ژانە ژانە.
ژانم ژانی کورانە
گۆشتی جوانیم دەرمانە.
دەڵێ: هەر چەندیان لەگـەڵ عـەلی مـەرێ گـۆت هەی داکت چا، هەی بابت چا، (خۆی لەگوورە نەبرد)[٢٤] هەر کە جـوانیـیـەکـە بکوژێتـەوە، دوایێ پررو پێـرژن (بە بەری داکـەتن)[٢٥] گـۆتیـان بەڵکو برایەکت دەبێ و دەبێتـە پشـتـیـوانت، جـوانی چیـە هەندە چاوت لە دووە، ئەودنا یێکی دی، کووی هەبوو پێیان سەلماند و ئیخفالیان کرد کە بچی جوانییەکەی بینی بیکوژێتەوە.
ئۆباڵ بەملێ ئەو مامۆستای ئەمن گێم لێی بووە وەکی جوانی گۆتی: هەر دەمکوژییەوە؟.
گۆتی: ئا.
دەڵێ جـــوانێ گـــۆتی: دە وەرە زین و لغــــاوم (بشدینە)[٢٦]، دوو سێ سەرانم هات و چوو پێ بکە ئەوجە بمکوژەوە؟
گۆتی: ئێ.
وەڵڵا دەڵێ وەی کردو لەپشتێ جوانی سوار بوو هات لە پێش خەڵکەکـەی دوو سێ سـەران (رمـبـازی)[٢٧] کـرد ئەوجـە جـوانیـیـەکە گـۆتی: عـەلێ مـەرێ چاوت بقـوچێنە (عـەلـێ مـەرێ چاوی قـوچاند)، برەکی پێ چوو گـۆتی: چاوت هەڵێنە (وەکی چاوی هەڵێناوە نە لە مـەملەکـەتێ خۆی مابوو، نە کەسیش دیار بوو).
گۆتی: تەمەشام بکە چ جێم تەڕ بووە!؟
گۆتی: ئا سمەکت تەڕ بووە.
گۆتی: (لە حەفت بەحرم دایە)[٢٨] هەتا گەیشـتیـمە ئێرە.
دەڵێ جوانییـەکـە گـۆتی: ئەتوو جلک و بەرگێ خـۆت لەسـەر زینەکـەم (قـایم کـە)[٢٩] (کـەچە)[٣٠] جلکەکی دی لەبەرکە، هەڕوو لۆ خۆت لەو شـارێهێ (بقەتێنە)[٣١]، هەر دەمی کەیفیشت هێنای و هەوەسـتی رمبازیت هەڵستا، ها ئەوە دوو کـەلەمـووی خـۆمت بدەمێ، وەرە لێـرە مـووەکـان لێکدە ئەمن دێمەوە ئێرە تێر تەڕادانی بکە، دیسان هەڕۆوە ناو شـاری و ئەمنیش دەچمـەوە ناو بەحرێ. چونکە ئەوها نەبی ئەمن لۆ توو نابم، پاشـــائ ئەو شـــارە ئەمنت لێ (زەفت)[٣٢] دەکا.
عەلی مەرێ جلک و بەرگێ خۆی لەسەر زینێ جوانی پێـچاو، جـوانی چۆوە ناو بەحـرێ. عـەلی مـەرێش کـەچە بەرگـەکی کـەونی لەبەر کـرد و هێـدی هێـدی چووە کن

شوانەک، مەڕەکی کڕی و پێستەکەی لەسەرێ خۆی پێچاو بەرێ خۆی دا شارەکە.

خۆی لەماڵێ پیرەژنەکی کوتا. پیرەژن جێی نەکردەوە.

گۆتی: کوڕم ئەمن وا جێی خۆم نییە جێی تووم لەکێ بوو، پیرەژن دەستی بە پۆرەپۆر کرد. عەلی مەڕێ چەنگە لیرەکی لە دوڕ دەستێ پیرەژن نا، پیرەژن لە خۆشیان دیزەی بە گۆزەی دادا و گۆزەی بەدیزەی دادا، جێی لۆ کوڕە کەچەڵ کردەوە.

عەلی مەڕێ گۆتی: پلکێ ئەتوو چ ئیش دەکەی؟.

گۆتی: وەڵڵا کوڕم ئەمن سەر شۆڕی کیژێ پاشامە.

ئێ گۆتی: پلکێ ئەمن دەبمە کوڕی توو.

گۆتی: ئەرێوەڵڵا کوڕم ئەمنیش چ کوڕم نییە.

لۆ سبەینێ کوڕە کەچەڵ بە پیرەژنی گۆ: ئەگەر ماڵێ پاشا ئیشەکم پێ بکەن؟

پیرەژن چوو بەکیژێ پاشای گۆت: خانم ئەمن کوڕەکم هەبوو چەند ساڵە بزر بووە دوونێ هاتیەوە، ئەگەر ئیشەکی پێ بکەن.

کیژەکەش گۆتی: پورێ مادەم کوڕێ توو بیت قازەوانمان نییە دەبا بێ بچیتە بەر قازان.

گۆتی: باشە.

سبەینێ وەکی پیرەژن کوڕە کەچەڵی بردە کن کیژێ پاشا. مێش دەورەیان لەسەرێ کوڕە کەچەڵ دابوو، کیژە (هەر بابای بوو)[٣٣] کوڕە کەچەڵ دوور بکەویتەوە.

گۆتی: ئێ ئێ پوورێ، لایبە با بچیتە بەر قازان.

دەڵێ کوڕە کەچەڵ قازەکانی بردە دەو بەحرێ. کیژە چووە سەر کۆشکێ گۆتی: بزانم ئەو کوڕە کەچەڵە چی لە قازەکان کرد. وەکی بە دووربین تەماشای کرد (هۆیەکی لەخۆ زانی)[٣٤] چاوی بە چ بکەوی: ئەوە کوڕە کەچەڵ سواری ماینەکی بەحرێ بووە وا لەدەو بەحرێ ئەوسەرو ئەوسەر دەکا، هەر چەندی بلێی کوڕەکی قۆزە. کیژە سەری سوڕما، لەسەر کۆشکێ دلی لەخۆ بۆوە (سەرانگر)[٣٥]ی خوارێ بوو کارەکەر گەیشتنێ، خوشکەکانی هاتن پاک و پوکیان بوو.

گۆتیان: خوشکم ئەوە چیبوو لۆ وەت لێهات!؟

گۆتی: وەڵڵا چوومە سەر کۆشکێ بڕۆنمە قازەکان داخوە کوڕە کەچەڵ کێوەی بردیە، سەرم سوڕا ئەوهام لێهات.

کوڕە کەچەڵ هێوارێ هاتەوە، لەڕێ پەللارە دارەکی هاوێشت پێی قازەکی شکاند، قازەکەی بەدەست گرت هێنایەوە کن پیرەژن.

پیرەژن لە (حەژمەتان)[٣٦] ماڵە سەرێ خۆی بداو (مشکی)[٣٧] بەسەرە خۆیدا بکا و سەرکۆنەی کوڕە کەچەڵ بکا کە ئەو کەتنەی کردییە.

بەگریان و قوڕپیوان قازەکەی لۆ کیژێ پاشا بردەوە، گۆتی: ئەو کەچەڵە بەڵاگیرم بی، ئورۆ پێی ئەو قازەی شکاندیە:

کیژەکە گۆتی: داپیرە قەیدی ناکا قازەکە بەڵاگیری ئەنگۆبی. ها ئەو هۆقە روونەش ببەوە لۆ خۆتان قازەکەی پێ لێنێن بیخۆن.

دەڵێ رۆژێ پاشترێ کوڕە کەچەڵ کە هێواری قازەکانی هیناوە، ئەوجارە پێی دوو قازی شکاندبوو. پیرەژن ئەوجارە یێکجاری (زەندەقی چوو)[٣٨] تاسا.

گۆتی: ئەوە دوونێ لێمان خۆش بوو، ئەورۆ دووە! ئەوجارە قوڕێ کێندەرێ بەسەری خۆم بکەم. بەهەر ترس و لەرزی هەبوو خۆی گەیاندە کن کیژێ پاشای.

گۆتی: بەڵاگێرت بم ئەو کوڕە کەچەڵە ئەورۆکە قوڕی بەسەرم کردییە، پێی دوو قازی شکاندیە، نازانم قوڕێ کێلا بەسەرێ خۆم بکەم!؟

کیژە گۆتی: داپیرە گێ مەدێ. ها ئەوە دوو هۆقە روونیش لەگە خۆت ببە لۆ خۆتان لەناو روونیان سۆرکەنەوە بیانخۆن.

لۆ سبەینێ کیژێ پاشا دوو خوشکی لەخۆی گەورەتری هەبوو پێی گۆتن: خوشکینە ئەمە هەتا کەنگی ئەوها دانیشین، خۆ هەر دەبی مێرد بکەین!؟...

گۆتیان: ئاخر ئەمە چاو و روومان نایینی بە بابمان بلێین، شەرمێ دەکەین:

کیژێ گچکە گۆتی: ئەمن خەبەری دەدەمێ.

گۆتیان: دەباشە.

کیژە سێ گندۆرەی هێنا لەسەر سێنییەکی دانا پەشتەماڵەکی بەسەدادا، یێکەیەکیان زەرد بوو، دووەمیان (ماتەی دابوو)[٣٩] سێیەمیان (کارک)[٤٠] بوو.

بەکارەکەرەکی گۆت: ئەو سێنییە لۆ دیوەخان بنێرە.

هەرکە سێنییەکە چووە پێش پاشا، پاشا پەشتەماڵەکەی لەسەر هەڵداوە گندۆرە بوو. قەلەمبری دەربنا هەتا سپی بکات، قازی گۆتی: ئەوە چ دەکەی

گەوردم؟ ئەو گندۆرانە لە بۆ خواردن نەهاتینە.
پاشا گۆتی: ئەدی لۆ چیە!؟
گۆتی: پاشام خۆشبێ، گندۆرە زەردەکە کیژێ گەوردیە.
دەڵێ: ئەمن لەمێژا وەختێ مێردکردنم هاتییە. ئەوەی دووەم کیژێ ناوەنجییە. دەڵێ: هەرەتی مێرد کردنە. گندۆرەی سێیەمیش کیژێ گچکەتە. دەڵێ: ئەمنیش مێردم دەوێ.
پاشا (جارچی)ی[41] بەناو بازار هێخست بانگی راهێشت کە دەبێ هەموو خەڵکی شار بێن لە مەیدانێ کۆشکی پاشا (خڕبنەوە)[42] بەشەلەو کەچەڵ و کۆرەو (نەقوستان)ەوە[43] لۆ هەڵبژاردنی زاوا لە بۆ کیژەکانی پاشا. کەس نەچتە سەر ئیش و کاری خۆی.
لۆ سبەینێ هەموو خەڵکی شاری خۆیان رازاندبۆوە، چوونە مەیدانێ کۆشکی پاشا لەوێ خڕبوونەوە (هەرسێ کیژێ پاشا یێک و سێویان لە مستدا بوو، سێوی خۆیان لەکێ بدابایە ئەو کیژە لۆ وی دەبوو).
کیژێ گەورە سێوێ هاوێشت لەکورێ قازی دا، کیژێ ناوەنجیش سێوی خۆی راوەشاند لە کورێ موفتیدا، کیژێ گچکە سێوی خۆی هەر بەدەست گرتبوو نەیدەهاوێشت، هەندی چاوەڕێیان کرد کەڵکی نەبوو.
گۆتیان: کا دە بزانن کێ مایە نەهاتیتە ئێرە؟!
گۆتیان: کەس نمایە ئیللا کورە کەچەڵ نەبی، ئەویش وا لەبەر قازانە.
گۆتیان: دە هەروون بێهیننەوە.
پیاوەکی ماڵێ پاشا چووە دوو کورە کەچەڵ. وەکی دەچی وا مێش دەورەیان لێدایە، گورزە گورزە مێش لەسە سەری بلند دەبی. کابرا قەمچیەکی خێواندە ناو شانێ کورە کەچەڵ.
گۆتی: وەرە بەپێشم کەوە. کورە کەچەڵ بەپێشی کەت.
(ئێ ئاخر ماڵێ پاشا چ ئیشیان بەمنە)؟ کابرا قەمچیەکی دی راوەشاندێ گورزە مێشەکی لەسەر سەری بلند کرد. بەو چەشنەی گەیاندیە مەیدانێ کۆشکی پاشا.
ئۆباڵ بە ملێ ئەو مامۆستای ئەمن گێم لێی بووە. دەڵێ هەر کە کورە کەچەڵ گەیشتە وێندەرێ. کیژێ گچکە سێوی راوەشاندێ لە (تریقەی پشتی) دت[44]، بە باران مێشی لێ بلند بۆوە. کورە کەچەڵ دەستی بەهاوار هاوار و بابەرۆ کرد. ئێ گۆتی: ئەمن چم کردییە لێم دەدەن؟!
ئەوی تەنیشتێ راستەی گۆتی: سەگباب ئەوە لۆمنی هاوێشت بە توو کەت. ئەوی تەنیشتێ چۆپەی گۆتی: قەحپەباب لۆ منی هاوێشت بەتوو کەت. ئەوی پێشی و ئەوی پشتی لێیان قیراند، لێی بووە هەرا، هە یێکە دەیگۆ: لۆمنی هاوێشتیە بەتوو کەتیە (کەرەسیسە) یان[45] لەسەر کرد.
کورە کەچەڵ گوتی: ئێ دەبا لۆنگۆبی خۆ ئەمن نەمگۆتیە پێم بکەوی، دەبا بەنگۆ کەتبی! ئەوانی وێندەرێ هەموو (سوویان دەبۆوە)[46] ئەو کیژە نازدارە لۆ ئەو کەچەڵە بیت.
لەبەر هەندێ گوتیان: با ئەوجارە باوێتەوە نەکوو نیشانەی خوار چووبی. ئەوجارە کورە کەچەڵیان لەوێ گۆستەوە. دیسان کیژە سێوەکی خێواندێ و مێشی لێ بلند کرد. ئەوانی لەدەورو پشتی بوون دیسا دەستیان بەجوندان کرد لێیان کردە هەروگیف کە سێوەکە لۆ وان هاویشترایە نەک لۆ کورە کەچەڵ.
ئێ گۆتی: خۆ ئەمن چم نەگۆتیە، دەبا لەنگۆی دابا!
دەڵێ دیسان کورە کەچەڵیان لەوێ گۆستەوە. کیژە هەر بۆ وی هاوێشتەوە.
دەڵێ ئەوجە پاشا گۆتی: دەک پیرۆزی بی، مادەم بەخۆی ئەو کەچەڵەی بووێ با وەبێ. (بەڵام پاشا چەند تووڕە بوو پتت لێ بدابایە دەتەقی).
کیژێ گەورەو ناوەنجی درانە کورێ قازی و موفتی. بەدڵخۆشی حەفت شەو و حەفت رۆژ شاییان لۆ گەڕا. کیژێ گچکەشیان دا کورە کەچەڵ و (هەیدێیان کرد)[47]. کەوتە ئاشەک لەدووری شاری هەبوو لۆیان چۆل کرد و ناردیانە وێندەرێ.
پاشا گۆتی: مادەم ئەو مێردەی لۆخۆی بژارد با لەبەر چاوم نەمینێ، هەر ئەو کەونە ئاشەی لێ دەوەشێتەوە.
دەڵێ کیژە خۆی خۆش کرد بوو هەر کە کورە کەچەڵ شەوی بە زاوابوونی ئەو جلک و بەرگەی لەبەر بکا کە پێی سواری جوانە ماینێ بەحری ببوو، بەڵام کورە کەچەڵ هەر بە کچە جلک و بەرگێ کەچەڵی چووە کنی. دەڵێ کیژە هەرچەندی خۆی لەدار و دیواردا و هێقەی کورە کەچەڵی گرت کە تەنیا ئەوشۆ ئەو جلک و بەرگەی لەبەر بکاتن کە پێی سواری جوانە ماینێ بەحری ببوو.
کورە کەچەڵ گۆتی: نەخێر ئەمن هەر ئەوها بوویە، کێ

گۆتی ئەمن لۆخۆت هەڵبژێرە. هەر چەندی کیژە بە بەری دا کەت: هەی داکت چا، هەی بابت چا، کورە ئەمن ئەتووم ئەوها ئەوها لەکەلێ شەیتانی وەرە خوارێ (لەگەری چی پێ بەچ نەکرا).

لەو کاولە ئاشی مانەوە، کورە کەچەڵ دەچوو لە (ئاقار)[٤٨] فاقی دادەناوە رەشۆلە و قەل و کۆتر و مۆتری دەگرت هەتا خۆراکی خۆیانی پێ پەیا دەکرد. بەو دەردە سەربەیان رادەبوارد.

هەندەی پێ نەچوو پاشا (گوری)[٤٩] بوو، هەر چەند دختۆریان هینا سەرێ کەڵکی نەبوو. ماوەکی پێ چوو دختۆرەکی هاتە سەرێ گۆتی: ئەو گوری بوونە یێک دەرمانی هەیە ئەگەر لۆی پەیا نەکەن چانابی، ئەویش:

شیری شێری
لەمەشکەی شێری
شێر بینی
شێر بژینی

هەموو کەتنە باردکی خەمان، ئێ ئاخر ئەو ئیشە بەکێ دەکرێ، دەی دەی، ئەولاو ئەملا، لەکورێ قازی و کورێ موفتی لێوەشاوەتر نابیننەوە کە بەدوو ئەو دەرمانەدا بچن. خەڵکی شاریش ئەوەی لەخۆی رادەدیت خۆیان رێکهێخست و سواری ولاغێ خۆیان بوون.

کورە کەچەڵیش ژنێ خۆی هەنارده ماڵێ پاشا، بچی شیرەک و ولاغەکەی لۆ بینی، ئەویش بە دوو سوارەکاندا بچی.

کیژە هەر (قەتتەرە)ی[٥٠] حەوشەی ماڵێ پاشا چووە ژۆرێ رایان گرتە بەر جوونان قووندەر، قەحپە، وها وها لێ کرای، لەگە جوونان شوشتیانەوە. نەگەر مێردت بەو کەچەڵە سەگبابە نەکردبایە هەنکوە مێردێ تووش لەگەر کورێ قازی و موفتی بەهانای پاشا دەهات و دەچوو دەرمانی لۆ دەهێنا. کیژەیان وەلێکرد (لەبەر سەیان رووکرد[٥١] کیژە دەستی بەگریان کرد و بەشەرمەزاری لەوێ چاوی(نز)[٥٢] کربۆوە بەڵکو شیرەک و ولولاغەکەی دەدەنێ لۆ کەچەڵی ببات.

پاشا گۆتی: (لاکەوە)[٥٣] لەبەر چاوم نززە. ئەوانی وێندەرێ بەقازی و موفتی بەبەر پاشای داکەتن گۆتیان: (گوناحە)[٥٤] ئەویش کیژێ تووە، بەخۆی دا مەشکێنەوە گوناحت دەگاتێ.

ئەجە پاشا گۆتی: کەچە شیرەک وا لەکن کۆلیتێ مریشکان کەتیە لۆی بینن، لەگە پیرە هێسترەکەی ناو تەویلە. کیژە کەچە شیر و پیرە هێستری لەبۆ کەچەڵ هینا.

کەچەڵ شیری بەملێ خۆ وەکرد و پیرە هێستریشی لەدوو خۆی راکێشا (پیرە هێستر هەموو سەر شان و ملی بریندار بوو). برە لەشاری دوور کەتەوە، پیرە هێستری لە (جۆم)دک[٥٥] (راتەولاند)[٥٦] وفاقەکی لەسە پشتی داناوە، هەردوو مووەکەی دەریناو لێکدا جوانە ماینێ بەحری لێ پەیدا بوو، پیستە و جلکە پیسەکانی لەبەرە خۆی دارنی لەسە پشتی پیرە هێستری قایم کرد، جلک و بەرگێ خۆی لەسە پشتێ جوانە ماینێ بەحری هینا خوارێ و لەبەری کرد، رمی بەدەست گرت و سواری پشتێ جوانە ماینێ بەحری بوو (سوار چ سوار، بکەی نە بخۆی هەر تەمەشای بە ژن و بالای بکەی).

عەلی مەرێ ماینێ بەحری تاودا، لەرێ گەیشتە کورێ قازی و موفتی. وا لەدەور و پشتی هەندە بنە تووترکان دەگەرێن و دەسورێن، لایدا کنەوان دیتی برەک دەچنە ناو تووترکەکان رمێ خۆیان رەوان دەکەنە ناو تووترکەکان، دەعبایەک ویقەی دێ هەندە لەخۆیان هەڵدەدەن دەکشێنەوە.

عەلی مەرێ سەلامی لێیان کرد و پرسی: کووە لێرە راوتان دابەستایە؟

گۆتیان: پاشای شارەکەمان دەردەکی وەی گرتیە. دختور دەرمانەکی لۆ دانایە هاتینە لۆی پایەکەین.

گۆتی: ئەوە چ دەرمانە؟!
گۆتیان: شیری شێری
لە مەشکەی شێری
شێر بینی
شێر بژینی
ئێ گۆتی: ئەوجە ئەوە ئەنگۆ خەریکی چنە؟!

گۆتیان: ئەوە شێرەک لەناو ئەو تووترکانەیە خەریکین بیگرین. ئێ گۆتیان: کاکە ئەدی ئەتوو هێ کێندەرێی؟

گۆتی: ئەمن کورێ پاشای رۆژهەلاتم، لۆ رۆژ ئاوا دەچم. خاترێ خۆی لەوان خواست و ئەوانی لەوێ بەجێهێشت.

ئۆباڵ بەملێ ئەو ماموستای ئەمن گێم لێی بوو، دەلێ گەیشتە ناو دارستانەک دیتی وا داکە شێرەک لەناو بێشەدایە، لەسەر تەنیشت کەتیە، نرکە نرکیتی، ئەو

دارستانەی پڕ کردبیە، لۆی چوو.

جوانە ماینێ بەحری گۆتی: نەکەی ئەوها (تخوون)ی[٥٧] بکەوی ئەوە (قونێر)ەکی[٥٨] لەبن پێی هاتییە گەلەکی دێشی، ئەو ناڵە ناڵ و نرکە نرکە ئێ هەندێیە. کەلە قەمیشەک بینە سەرەکی تیژ بکە بە (پەنادزە)[٥٩] لۆی هەڕوو، قونێرەکەی وا زەرد بووە لۆی (دەربکە)[٦٠] ئەوجە هەرچی بلێی لۆت دەکا. بەلام زوو خۆتی پێ پیشان نەدەی هەتا ئێشەکەی دادەکەوی نەکوو تێکت دەشکێنی.

دەلێ عەلی مەرێ چوو لکە قەمیشەکی درێژی هینا سەرەکی تیژ کرد، وەکی زەرگی لێ کرد، (لاونیو)[٦١] لۆ شێرەکە چوو، هەتا لێی نیزیک بۆوە،خۆی خێواندێ، هەتا (تین)ی تێدابوو، قەمیشەکەی لەقونێرەکەی راکرد و زووخۆی شاردەوە. شێرەکە هەتا تێیدا بوو نەڕاندی و پڕی دەدا هارچی دەورەی خۆی، ئەوێندەرێی کردە خۆلە پۆک، چاوی سۆر ببوو چەندی گەڕا چی بەبەر چەنگی نەکەت بشکێنی و کۆلی خۆی پێ دابمرکێنی.

هەتا ژانەکەی داکەتەوە، ئەوجە کە ژانی پێی شکا دلی داکەت.

ئۆبالێ بەملێ ئەو مامۆستای ئەمن گێم لێی بوو، دەلێ شێرەکە گازی کرد گۆتی: ئەوە کێ بوو ئەو چاکەیەی لەگەرە من کرد، بخوازی مالی دنیایێ؟. (عەلی مەرێ دەنگی نەکرد) جارەکی دی گۆتی: ئەوە کێ بوو ئەو چاکەیەی لەگە من کرد بخوازی مالی دنیایێ؟ (دیسان هەر خۆی کڕ کرد). جاری سێیەم عەلی مەرێ گۆتی: ئەمن بووم.

گۆتی: بخوازە مالی دنیایێ؟

گۆتی: خۆشیەکی تووم دەوێ.

دیسان گۆتی: بخوازە مالی دنیایێ؟

گۆتی: خۆشیەکی توو.

جاری سێیەم گۆتی: بخوازە مالی دنیایێ؟.

گۆتی: چت لێ بشارمەوە، پاشای شارەکەمان گۆڕی بووە. دختۆریش دەرمانەکی وەی لۆ دانایە هەندی دلم نایێ پێت بلێم.

گۆتی: دەرمانە چیە؟

گۆتی: شیری شێری
لەمەشکەی شێری
شێر بینی
شێر بژێنی

گۆتی: ئەوسالێ حەفت سالە لەو ئێش و ئازارەدا بووم، خۆزیا حەفت سالیدیش ئەوها بامایە، بەلام ئەوەت لەمن نەخواستبایە، بەلام، چونکە ئەو چاکەیەت لەگە من کردبیە.

هەڕوو بلێ فەرخەکانم داکتان مردبیە، (کێهانیان)[٦٢] پێکەنی، زوو سەری ببڕەو کەولی کەو پیستەکەی بینە ئێرە.

دەلێ عەلی مەرێ چووە کن فەرخەکان گۆتی: داکتان مردیە! هەموو دەستیان بەگریان کرد یێکەکیان نەبی پێکەنی، عەلی مەرێ ئەوی گرت و کوشتیەوەو کەولی کرد. سەرو پێچکەکەی لەناو هەگبەی کرد و پیستەکەی هیناوە کن داکە شێرەکە.

شێرەکە پیستەکەی لۆ پڕی شیر کرد، (عەلی مەرێ گۆتی: وەبکە دەرمانی دەردەکە بێتە سەر و پێچکەکە) گازی دوو بەچکەی خۆی کرد، پیستە شێرەکەی نە یێکەکیان بارکرد و ئەویدیشی بەدوویدا.

عەلی مەرێ هۆردوو بەچکە شێری بەدوو خۆی دا و سواری جوانە ماینێ بەحری بوو لێیدا گەڕاوە. وەکی هات لەرێ گەیشتەوە کوڕێ قازی و موفتی، هەر وا خەریکی بنە تووترکەکانن، لێیان چووە پێش و سەلامی کرد.

گۆتی: ئەوە ئەنگۆ لە بەیانییەوە هەر خەریکی ئەو بنە تووترکانەنە؟!

گۆتیان: ئەرێ وەلا ئەوە شێرێکی لەناو (غەنزریە)[٦٣] هەر چەندی دەکەین پێمان ناگیرێ. ئەویش رمەکەی لۆ ناو تووترکان رەوان کرد و رێویەکی بەسەرێ رمەکەوە کرد و گۆتی: هەی داوەشێن، ئەوە لە بەیانیانەوە خەریکن، هێشتا ئەو رێویەتان پێ نەگیرایە ئەدی کوو شێرتان پێ دەگیرێ؟! دەستی بۆ شێرەکان رەوان کرد گۆتی: ئەوانە شێرن.

کوڕێ قازی و موفتی واقیان ورما، دەویان بەش بۆوە گۆتیان: قوربانە ئەوە کووت پەیاکردا!؟

گۆتی: ئەوە (لە سەرێ دی)[٦٤] وەکی بێرەدا هاتم دیاربوو ئەنگۆ لەدوو ئەو دەرمانە دەگەڕان، گۆتم بالەگەرە خۆم لۆیان ببەم.

ئێ گۆتیان: ئەوجە کوومان دەدەیێ؟!

گۆتی: بە خۆتان دەزانن ئەمن پێویستم بەپارەو بەمالی دنیا نییە.

ئەدی گۆتیان: بە چ دەدەی؟

گۆتی: ئەو ئەنگوستیلەی دەستم داغ دەکەم بە قوونێ هۆردووکتانەوە دەنێم.

دەڵێ کورێ قازی و موفتی کردیانە پسە پس، کوو دەبی، ئەوها ناکەین و ئەوڵاو ئەملا، ئێ گۆتیان: خۆ ئەو کابرایە ڕێبوارە، هێ ئەولایە نییە، خوا دەزانی داخوە جارەکی دی ڕێی دەکەوێتە شارێ مە یان نا، دەبا شێرەکانی لێ وەرگرین. دلێ خۆیان بەوە دەداوە، هاتنە سەر ئەوەی کە هۆردووکیان قوونێ خۆیان رووت کرد، عەلی مەرێ یێک و مۆری بە ئەنگوستیلەکەی دەستی لە لاقوونیان دا، لەسەر مۆرەکە نووسرابوو عەلی مەرێ.

عەلی مەرێ لێیدا ڕۆیی، ئەوانی بەجێهێشت هاتەوە کن پیرە هێسترەکەی کە پاشا دابویە ژنەکەی. جلک و بەرگە جوانەکەی لەسەر پشتێ جوانە ماینێ بەحری پێچاوەو جوانییەکە لێیدا ڕۆیی چۆوە ناو بەحری. عەلی مەرێ کەونە جلکەکانی لەبەر کرد و پیستەکەی لەسەرێ خۆی پێچاوە. قاقەکەی سەر پشتێ پیرە هێستریش دوو قەلی پێوە ببوو، ئەوانی لێکردەوەو بە دەستی گرتن، سەر و پێچکێ شێرەکەشی کردە ناو توورەگەو پیرە هێستری لەدوو خۆی ڕاکێشا (یاغر یاغر)[٦٥] بەرەو شار بۆوە.

لەرێ کورێ قازی و موفتی گەیشتنە کورە کەچەڵ، ئەوە نەرە نەرێ شێرانە، گۆتیان: خۆت لادە سەگباب، بەبن دەست و پێی شێران نەکەوێ، ژنەکت زەفت کردییە رووحێ باب و باپیرت دینی، لاکەوە لەسە رێ. ئەگەر ئەتووش پیاو بای لەگەرەمە دەهاتی لۆ ئەو دەرمانە.

دەڵێ کورێ قازی و موفتی بەخۆ بەشێرەکانەوە هەڵیانکرد تا لۆ کۆشکێ پاشا چوون. خەڵکی شاری بە پیلیانەوە چوون بووە دەنگ لەناو شاری کە کورێ قازی و موفتی (ئەو دکرەیان کردییە)[٦٦]، بووە شایی و خۆشی لەماڵێ پاشا. شیریان لۆ پاشا کولاند و لە پێشیان دانا، بەلام هەر چەندی شیرەکەی دەخواردەوە دەردەکەی پێ گرانتر دەبوو.

کورە کەچەڵیش کە گەیشتەوە ماڵێ گۆتیە ژنەکەی: ئەو سەر و پێچکەی لێنێ؟ وەکی سەر و پێێک کولا. گۆتی: ها قاپەکی لۆ بابت بەبە، با بخوا.

کیژە قاپەکی لەسەر و پێچکەکە لۆ بابی برد، بەلام چ بردن، پاشا هەر چاوی پێکەت (تێی بەربوو)[٦٧] بەجوندان، گوتی: نەخۆت کاو نەسەرو پێچکت، هەموومانت شەرمەزار کردییە بەو کەچەڵە پیسە، برۆ لێرە نەمینێ (بەدێوم)[٦٨] لەپێش چاوم بزربە.

قازی و موفتی لەپاشا پارانەوە گۆتیان: کیژێ خۆتە هەر کوی هەبی لەبەر خاترێ مە، دلی مەشکێنە، قاپەکەی لێ وەرگرەو هەندەکی لێبخۆ. پاشا وەریگرت هەندەکی لێخوارد، هەستی پێکرد دەردەکەی سووکتر بوو، هەندەکی دیشی خوارد، پێ چاتر بوو، ئەوی لەناو قاپەکەدا بوو هەمووی خوارد، تەواوەک پێی چاتر بوو، پاشا تەواو باوشکی خۆش بوو. گۆتی: کیژم چیدیتان لەماڵێ نمایە لۆم بینی!؟

گۆتی: وەڵڵا بابە هەندە چرکاو مایە بەرماوەی پێش کورە کەچەڵە.

گۆتی: هەروو ئەویشم لۆ بینە - کیژە چوو ئەوی لەماڵی مابوو هینای، پاشا ئەویشی خوارد بە یەکجاری دەردەکەی لەسەر لاچوو.

حەفت شەوو حەفت رۆژان لەشاری بووە خۆشی و شایی، بەلام خۆشی و شایی لۆ کەس هەتا سەری نییە.

قەدەرەکی پێ چوو پاشایەکی دی کە پاشای شارەکی دی بوو، پێشتری هاتبووە داخوازی ئەو کیژەی کە درابووە کورە کەچەڵ، پاشا کیژە گچکەکەی نەدابووە کورێ ئەو پاشای. کە زانییەوە ئەو کیژەی داینە کەچەڵەکی شارەکەی خۆی، زۆر پێ توورە بوو. گۆتی: دیارە ئەمنی بە چ نەزانییە، لەشکری خڕ کردەوەو هات بەسەر شارێ پاشای بابێ سێ کیژەکە دابدات، قاقەزی بە (قاسید)ەد[٦٩] لۆ هەنارد گۆتی: خۆی رێک بێخی ئەمن هاتیمە تۆڵەی خۆمی لێدەکەمەوە. دیارە کەچەڵەکی پێ لەکورێ من لێوەشاوەترە کە کیژێ خۆی بداتێ. بزانین خو بە کێهانمان دەدا.

دەڵێ پاشا هیچ چارەی نەبوو، لەشکری رێک هێخست و هۆردوو لەشکر خیودتیان بەرامبەر یێک هەڵدا، ژنەکانیش لەسەر کۆشکێ ماڵێ پاشا دانیشتبوون تەماشای لەشکریان دەکرد. هۆردوو کیژی پاشاش بەچەپۆلۆکان لەسەر و گیلاکێ خوشکە گچکەکەیان دەداو دەیانگۆت! ئەو شەرە هەموو لەنیو چەوانێ توودە، ئەگەر مێردت بەو سەگبابە نەکردبایە، ئەو شەرەمان بەمل دا نەدەهات. خوشکێ گچکەش لە گریان پتر چی لە دەست نەدەهات، چونکە دەیزانی شەرەکە (سەبارەت بەویە)

(٧٠).

کەچەڵ کەچە شێر و پیرە هێستری لە کاولە ئاشی دەرینا و لەشاری چووە دەرێ، لەوێ هۆردوو کەلە مووێ جوانە ماینێ بەحری دەریناو لێکیدا، جوانێ لەوێ حازر بوو، جلک و بەرگێ خۆی گۆڕی و لەجوانە ماینێ بەحری سوار بوو، بەلام چتۆ سوار، لەدەورا پشتی ئەو شاری کەس سوار ئەوها قۆزو لێوەشاوەی نەدیتبوو. دوو سێ سەران لە مەیدانێ هات و چوو، لەناوەندێ مەیدانێ راوەستا.

هەردوو لەشکر لەخوای دەپاڕانەوە کە ئەو شۆڕە سوارە بەهانای وانەوە هاتبێ، هۆردوولا هەستێ خۆیان راگرتبوو داخوە شەڕ دابکەوێ ئەو سوار چاکە خۆی بەکێهان لادا دادەگری و شەڕ لەگەڵ کێلا دەکاتن.

کیژێ پاشا کە چاوی بەو سوارەکەت دڵی داخرپا، ناسییەوە، زانی ئەوە سوارەکەی دەو بەحرێیە، لە خۆشیان پێی عەردی نەدەگرت دەستی بە هورینە کرد دەیگۆ: بەخوای ئەوە هەوە، بەخۆیتی.

خوشکەکانی دیسان سەر و گێلاکیان کوتیەوە.

گۆتیان: ئەوە چ دەڵێی هەی قووفرێ، ئەو کەتنە هەمووی لەسەردتووە هێشتا چاو و رووت هەیە ئەوها بکەی؟!

کیژە وێک هاتەوەو لەدڵی خۆی دەیگۆت ئەمن ئەوها دەکەم ئەگەر هەو نەبێ ئەمن چیان پێ بلێم - کیژە دەمەک پێدەکەنی و دەمەک دەگریا، نەیدەزانی کوو بە خوشکەکانی بلێ کە ئەو سوارە بوو ئەمن لۆ خۆم هەڵبژاردیەو مێردم پێی کردییە.

ئۆبالێ بەملێ ئەو مامۆستای ئەم گێم لێی بووە، دەڵێ هەموو دڵیان لەسە دەستیان بوو هەتا شەڕ داکەت و سوارەش دەکەتە مەیدانێ، داخوە ئەو سوارە لایێ کێهان لەشکرە!؟ مەیدان گەرم بوو، سوارەکە بەناو دوژمنەکانی بابێ سێ کیژەکە کەت (توورکان)ی[٧١] هەر لایەک دەبوو تەرت و فەرتی دەدان و پەرەی دەکردن، هەتا لەشکرەکەی شکاندو بەشکەستەیی و مل شۆڕی ملێ رێیان گرت و گەڕانەوە شارەکەی خۆیان. ژنێ کەچەڵیش لەگەڵ خوشکەکانی لەسەر کۆشکێ تەمەشایی شەڕەکەیان دەکرد. دەمەک پێدەکەنی و دەمەکیش دەگریا، نەیدەزانی لەکن خوشکەکانی بلێ ئەوە مێردێ منە یان نا. خوشکەکانیشی کوزرو بەربایان لێ گرتبوو، هەر دەم نا دەم (کوزر کرتی)[٧٢] وەردە گەڕانە سەر و گێلاکی بەچەپەلۆکان.

عەلی مەرێ وەکی لەشکرەکەی شکاند چاوێ خۆی دا رەشمالێ پاشای خەزووری، هەموو بە پیلیەوە چوون، مالەبەری بێن و بچن، پاشا ناوچەوانی ماچ کرد و بە رێزەوە هێنای لە تەنیشتە خۆی دانا.

عەلی مەرێ گۆتی: ئەوە ئەو شەڕ و هەرایەتان لەسەر چیە؟

پاشا گۆتی: ئەوە کچەتیمەکم هەیە پێشترێ ئەو پاشایەی کە بەسەرەمەی دادا هاتە داخوازیی لۆ کوڕەکەی خۆی، ئەمن نەمدایێ گۆتم: دوو خوشکی لەخۆی گەورەتری هەیە، هێشتا ئەو وەختی مێرد کردنی نەهاتیە، پاش هەنگی لەگەر خوشکەکانی دیار بوو هەوەستی مێرد کردنیان هەبوو، ئەی مێردی بە کەچەڵەکی پیس کرد. سەبارەت بە هەندێ ئەو شەرەمان بەمل داهات. خوشکەکانیشی یێکیان مێردی بە کوڕێ قازی کردو ئەویدیش مێردی بە کوڕی موفتی کرد. ئەوان لە وەختی ناخۆشی و تەنگانەیی گەلەک بەکەڵکم هاتینە. دەردەکی گەلە گرانم لێ بوو، دختۆر دەرمانەکی وەی لۆم دانابوو نەبایە بە کەسیدی پەیا نەدەبوو.

گۆتی: ئەو دەرمانە چ بوو؟

گۆتی: شیری شێری
لەمەشکەی شێری
شێر بینی
شێر بژینی

ئەویش ئەو دوو زاوایەم پەیایان کرد (کوڕێ قازی و کوڕێ موفتی خۆیان لەپەنایی خەڵکەکە شاردبۆوە، هەر پاشەکشەیان دەکرد و خۆیان کورژ کردبۆوە نەکوو عەلی مەرێ بیانبینێ و بەسەریان بگرتەوە).

پاشا لە عەلی مەرێی پرسی: ئەدی کووە ئەتوو رێت کەوتیتە ئەولایە؟.

گۆتی: ئەمن دوو پیاوم لەو شارەیە هاتیمە بیانبەمەوە کوڕێ قازی و کوڕێ موفتی لە ترسان (حەجمانیان نەبوو)و[٧٣] پێیان عەردی نەدەگرت).

پاشا گۆتی: چەند پیاوت دەوێ، لێرەو لەناو شاری ببژێرە، شاری خۆتە.

گۆتی: نا ئەمن لەو دوو پیاوەی خۆم پترم ناوێ، فلان و فیسکە.

پاشا گوتی: کوڕە کوو دەبێ؟!، دەبێ باشیان نەناسی، ئەوانەی ئەتوو دەڵێی، یێکیان کوڕێ قازییە، ئەویدیش کوڕێ موفتییە (هۆردوو زاوایێ پاشا یێکجاری (چۆکیان شکا)[٧٤].

ئەوجە گوتی: پاشا ئەمن لەخۆڕا وەناڵێم، نیشانەی خۆم بە قوونێ ئەو پیاوانەوە نایە، ئەگەر ئەو نیشانانەیان پێوە نەبوو ئەوە هەر کەس لەماڵێ خۆی. خۆ ئەمن لەختو خۆڕایی (بەرینگار)[٧٥] یان نابم.

قازی و موفتیش هەندە پشتیان بە کوڕەکانیان قایم بوو بە (بێ باک)[٧٦]ی و بە تووڕەیی گوتیان: دەبینێ بڕۆنە نیشانەکانیان، ئەگەر وەبێ با چیان لێدەکا وەیان لێکا (نەیاندەزانی کەر لەکێ کەتییە و کوندە لەکێ دڕایە، وا کوڕە کانیا داغ کراینە). هۆردوو زاوای پاشایان پەلەکێش کرد، هەرچەندی خۆیان ڕاتەکاند و پەلە پەلیان کرد کەڵکی نەبوو. (لەخرتۆلیان وەردان)و[٧٧] دەرپێیان لە قوونیان کردەوە، لاقوونی هۆردووکیان داغ کرابوو مۆرێ عەلی مەڕێی لەسەر بوو.

عەلی مەڕێ گوتی: تەمەشایی مۆرێ ئەو ئەنگوستیلەی دەستم بکەن، چی لەسەر نووسرایە؟.

قازی و موفتی گوتیان: لەسەری نووسرایە عەلی مەڕێ.

ئێ گوتی: دەبڕۆننە داغەکەی سەر قوونێ وانیش؟

ئەویشیان خیندەوە گوتیان: ئەویش نووسرایە عەلی مەڕێ.

ئەوجە عەلی مەڕێ سەر و سەربردەکەی خۆی لۆ پاشا گێڕاوە گوتی: ئەمن ئەو کوڕە کەچەڵە بووم کە کیژێ گچکەت ئەمنی هەڵبژارد و مێردی بەمن کرد، ئەوها (سووک و هەرزان) تان کرد لەسەر هەندێ، پاشا عەلی مەڕێی لەجێی خۆی دانا کردییە پاشاو قەسرەکیشی لە تەنیشت قەسرێ خۆی لۆ دروست کرد.

گوتی: کوڕم ئەمن پیر بوویمە توانای پاشەیەتیم نمایە، لەتووش لێوەشاوەتر نابینمەوە لەجێی خۆی دانێم، پاشاش چ کوڕی نەبوو هۆردوو زاوایەکەشی کردە پیاوێ عەلی مەڕێ، ژنەکانیشیان بوونە کارەکەری (ژنەکەی عەلی مەڕێ).

ئەمنیش هاتمەوە کلاشم دڕاو چم پێ نەبڕا.

*****

(١) فەرشە: پنە.

(٢) لەغەر: نەخۆش و لاواز، لەڕوو ناساغ.

(٣) خەفەت: داخ.

(٤) (نۆبال بەملێ ئەو مامۆستای ئەمن گێتم لێی بووە) هەقایەت بێژ ئەگەر لەگێڕانەوەی ڕووداوێک هەستی کرد گوێگرەکان گومان لەڕاستی ڕووداوەکە دەکەن. ئەم ڕستەیە دەڵێت: بۆ ئەوەی لەسەر خۆی لابدات و بیخاتە سەر ئەو کەسەی لەکاتی خۆی ئەم هەقایەتەی لێی بیستووە و لێی فێربووە.

(٥) پۆرگ: وەکو میزڵدانە پڕبێ لە ئاو و خوێن و گۆشت.

(٦) ڕەوە: کۆمەڵ.

(٧) کەلی دەخوارد: بەفاڵ دەهات، فاڵی دەخوارد، بەتەڵەب دەهات.

(٨) زگەکەی: بێچوەکەی ناو سکی.

(٩) پشتی بکرێ: بگاتە ئەو تەمەنەی کە توانای سوار یا بار هەڵگرتنی ببێ واتە بۆ سواربوون و بار هەڵگرتن ئامادە بکرێ.

(١٠) بەفەتارەتی بدا: بەکوشتنی بدا.

(١١) هۆدە: ژوور، وەتاغ.

(١٢) ڕابچی: بچەقێ، بچێتە ناوییەوە.

(١٣) ژەحراوی: ژەهراوی

(١٤) دەستاو: ئاودەست.

(١٥) توورەگە: کیسە.

(١٦) متوو: مەراق، ئارەزوو.

(١٧) دانەدەبڕا: جیانەدەبۆوە.

(١٨) کووی هەبوو: هەر چۆنێک بوو.

(١٩) شیو: چێشت.

(٢٠) جیبەجێ: دەست بەجێ، یەکسەر.

(٢١) فەراقی لەبە برا: مرد، گیانی دەرچوو، ڕوحی دا، عەمری خوای کرد.

(٢٢) داری لەسە بەردی دانەنێی: هیچ کارێک نەکەی.

(٢٣) مەگیرانی: ژنی سک پڕ (ئاووس) کە تامەزرۆی خواردنێک بێ. بێزوو.

(٢٤) خۆی لە گوورە نەبرد: خۆی شێلو نەکرد، گوێی نەدایێ، خۆی تێک نەدا.

(٢٥) بەبەری داکەتن: یاخەگیری بوون.

(٢٦) بشدینە: توند ببەستە، شەتەکی بدە.

(٢٧) ڕمبازی: تەڕادانێ، سوار سوارانێ، هاتوچۆی بەتاو بە سواری ولاخ.

(٢٨) لە حەفت بەحرم دایە: لەحەوت دەریا پەڕیومەتەوە.

(٢٩) قایم کە: ببەستە.

(٣٠) کەچە: کۆنە.

(٣١) بقەتێنە: ڕابوێرە.

(٣٢) زەفت: بەزۆرداری لێستاندن.

(٣٣) هەر بابای بوو: بەپەلە بوو، ئاواتەخواز بوو، تەنگاو بوو.
(٣٤) هۆیەکی لەخۆ زانی: لەخۆی کەوتە گومانەوە.
(٣٥) سەرانگر: سەراوسەر، سەرەوژێر.
(٣٦) لەحەزمەتان: لەتاوان، لەداخا، لەشروان.
(٣٧) مشکی: خۆلەمێش.
(٣٨) زەندەقی چوو: زراوی رژا، زارەترەک بوو.
(٣٩) ماتەی دابوو: تازە پێگەیشتبوو. مێوەی تازە پێگەییو.
(٤٠) کارک: کاڵ، مێوەی پێ نەگەیشتوو.
(٤١) جارچی: دەلال: ئەو کەسەی لەکۆلانان و بازاردا بانگ رادیلی.
(٤٢) خڕنەوە: کۆبنەوە.
(٤٣) نەقوستان: ناتەواو، کەسیرە.
(٤٤) تریقەی پشتی: برِبڕەی پشتی.
(٤٥) گەرِەسیسە: پاڵەپەستۆو ۆبوونەوەی زۆر کەس.
(٤٦) سوویان دەبۆوە: بەزەییان بەکچەکەدا دەهاتەوە.
(٤٧) هەیدێ یان کرد: تۆڕی یان کرد، شاربەدەریان کرد.
(٤٨) ئاقار: هەقار، چۆلەوانی، دوورە ئاوایی.
(٤٩) گوڕی: کروو، گەر، گولی.
(٥٠) قەنتەرە: دەرگای حەوشەی گەورەی دوو دەری بێ.
(٥١) لەبەرسەیان رووکرد: ئابروویان برد، شرت و شۆیان شکاند.
(٥٢) نز: مۆن.
(٥٣) لاکەوە: خۆت لادە، رێگا بەردە.
(٥٤) گوناحە: بێ چارەیە، بەستەزمانە.
(٥٥) جۆم: شیو.
(٥٦) راتەولاند: بەستانەوەی ولاخ لەناو گیا بە پەتێکی درێژ بۆ ئەوەی لە چواردەوری خۆی بلەوەرێت.
(٥٧) قونێر: دومەڵ.
(٥٨) پەنادزە: بەجۆرێکی وا بچی کە نەبیندرێ.
(٥٩) دەریکە: کونێکی تێ بکە تا خوین و کێمەکەی لێ بێتە دەرەوە.
(٦٠) لاونیو: بەلای تەنیشیکیەوە بۆی چوو تا نەبیندرێ.
(٦١) تین: هێز، توانا.
(٦٢) کیهانیان: کامیان.
(٦٣) غەنزریە: یاخی بووە.
(٦٤) لەسەرێ دی: جاری پێشوو. گاوێ دی، چاخێ دی.
(٦٥) یاغر یاغر: لەسەرەخۆ، هێدی، بەکاوە خۆ.
(٦٦) ئەو دکرەیان کردیە: کارێکی وایان کردیە کە بۆ دووا رۆژ هەر بیگێرنەوە.
(٦٧) تێی بەربوو: بەریسگاری بوو، یاخەگیری بوو.
(٦٨) بەدێوم: بەد فەسال، شووم.
(٦٩) قاسید: ئەو کەسەیە کە نامە یا قسە لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی تر ببات.
(٧٠) سەبارەت بەوی یە: بەهۆی ویەوەیە، لەسەرویە.
(٧١) توورکان: هێرش بردن، تاودانە شت، بۆ شت چوون بەغار.
(٧٢) کوزر کوتی: لێدان و کوتانی بێ بەزەییانە.
(٧٣) حەجمانیان نەبوو: ئۆقرەیان نەدەگرت. ئارامیان لێ هەڵگیرا بوو.
(٧٤) چۆکیان شکا: ئەژنۆیان شکا، قەدەمیان شکا.
(٧٥) بەرینگار: یاخەگیر، هێقەگرتن، بەگژداچوون. گەڕ کردن.
(٧٦) بێ باک: سەرمەست، خورت.
(٧٧) لەخرتۆلیان وەردان: لەناو خۆلیان گەوزاند، لەخۆلیان وەردان.

* ئەم هەقاتانەی خۆشناوەتی زۆر لەوشەکانیان لەگەڵ یەک بەستراوەتەوەو ئێجگار کورت کراونەتەوە وەکو:-

کێلکەر = کارەکەر
لەمە = لەئێمە
تێکرامان = سەیری یەکتریان کرد
چاکەی = چی دەکەیت
لێکیاندا = لە یەکتریان دا
هەنێکەکی = هەر یەکێکیان
چن = هیچمان
چنیە = هیچ نییە
ماخرا = ماڵ خراپ
تۆیاند = سەگ تۆپی کرد
چم ناوێ = هیچ شتێکم ناوێ
کێواچی = بۆکوێ دەچی
هەستین = هەڵبستین
ئێکو = هەر یەکەیان
شە = شانە
چیدین = هیچی ترمان

جارێ کە دەلێ: لۆ خۆ، واتە لۆ خۆم،لۆ خۆت،لۆ خۆمان،لۆخۆتان،لۆ خۆیان. بۆ هەموو جۆرە راناوەکان بەکاردێت، تەنیا جارو بار لە باتی لۆ خۆتان دەڵێ: لۆ خۆو، یا لەباتی لۆ خۆمان دەڵێ لۆخۆن.

یان ئەو (ن) ەی دووایی دەخاتە دووایی وشەکەی پێشتر وەکو هەموون بەخۆ خوارد، شەکرەکەی لۆ خۆ برد، چان لۆ خۆ خواردۆ....هتد.

بۆ (و) ەکەی لۆ خۆویش دەڵێن: هەموو بەخۆ خوارد، شەکرەکەو لۆ خۆبرد چاو لۆ خۆ خواردۆ.

لەکتێبی (هەقایەتی کوردەواری) ١٩٨٥.

# ئەحمەدێ کورێ هەسپی

## کۆکردنەوەی:محەمەد کەریم شەریف
## بە شێوەزاری خۆشناوەتی

پاشایەک سێ کیژی هەبوو دەگە سێ کوران، **گۆتی:** کورم ئەمن ئەوە دەمرم بەرێ وەکی مردم سێ دەروێش دێن هەر سێ کیژەکانیان بدەنێ.

**گۆتیان:** ئێ.

گۆتی دەروێشەک هات کیژێ گەورەیان دایێ، دەروێشەکی دی هات کیژێ ناوەنجییان دایێ، دەروێشی دیکە هات کیژی گچکەیان دایێ.

گۆتی داکە کە دەستی بە گریانێ کرد گۆتی: کورم ئەوە ئەوسار چەند سارە ئەو خوشکۆرانەو بزربوونە، ئەنگۆ هەندە بێ ویژدانن لۆ وە دوویان راناچن!

گۆتی وە دوویان راچوون، هەر ئێکی دەچوو دێوەکە دەیگرت دەیهاوێشتە ژێر زەمینێ، هەر سێ برایەکانیان هاویشتە ژێر زەمینێ.

گۆتی داکەکە بەخۆ وە دنیایێ کەت، سواری هەسپی بوو رۆیی. هەند ماندی بوو، هەند گەڕاو سووڕا، هە لە تینان هیلاک بوو، هەسپ میزی کرد دەوێ خۆی بە میزێ هەسپێ گرتەوە میزێ هەسپی خواردەوە.

هاتەوە مارێ زگی بوو (پیرەژن) کورەکی بوو، کورەکەیان ناو لێنا ئەحمەدێ کوری هەسپی.

ئەحمەد وەی لێهات پارەوانەکی بە (قووەت)[1] بوو لەناو مندارۆکان دەچوو قاشویانێ یە کرد، گۆیەکی لە (لاق)ێ[2] کورێ پیرەژنەکی دابوو لاقی شکاند، پیرەژنەکەش هات **گۆتی:** هەتیمی کورێ کەس نا، کورێ هەسپی، **گۆتی:** ئەتوو لۆ سێ براو سێ خوشکت دێوان بردینە (مادام[3] هەندە پارەوانەکی بەقوودەتی ناچی خوشک و برایێ خۆ بینییەوە، لۆ لاقێ کورێ منەشکێنی).

**چوو گۆتی:** دایە!

**گۆتی:** ها.

**گۆتی:** ئەمن سێ براو سێ خوشکم هەنە دێوان بردینە؟!

**گۆتی:** نا کورم درۆیەکەن.

**گۆتی:** بەرێوەڵلا، وەڵلا (ئەلحان[4]) دەتکوژم پێم نەرێی.

**گۆتی:** ئەرێوەڵلا کورم حار و مەسەلەکی ئەوهەیە.

**گۆتی:** دەنا وەکی وەبی هەرِوو هەسپەکەم لۆ بینە.

وەڵلا گۆتی هەسپەکەی هینا گوزرو کەمەندەکەی هینا، تەمەشای کرد گۆتی: هارِ هوو ئەو گوزرە سووکە، گوتی هەندێکی دیکەی لەکن وەستای گرانتر کرد و هاوێشتیە سەرێ و رۆی.

چوو (داخیل)[5] بە باغ و باغاتێ دێوێ گەورە بوو. چوو لەوێ لایدا سەکانی نوێژی کرد و وراغێ خۆی بەستەوەو ئالێکی بەسەری وەکرد و دەستی بە نوێژ کردنێ کرد.

کێلکەڕێ خوشکەکەی هاتن چاویان دایێ دەبینن پیاوەکی ئەوەندە جوان وا لەسە کانیێ نوێژێ دەکاتن کەس دری نایێ چاوی داتێ، هەستان مەسینەکانیان پر کردن و چوونەوە.

**گۆتی:** ئەنگۆ لۆ هەندە گیر بوون هەی قەحپەینە، قووندەرینە، ئەنگۆ لۆ هەندە گیر بوون؟!

**گۆتیان:** ئاغەژن پیاوەکی حوسێنی ئەوە لەسە ئاوێیە نوێژێ دەکا وکی تووە (حەینی)[6] سەرێ توو برایە بەسەرێ وی وەندرایە، هەندی توو جوانە، ئەمە (لەشروان)[7] دزن لەخۆیبێوە لەوێ هە تەمەشانەکردن(خۆن)[8] لە بیر کردبوو.

**گۆتی:** دەهەرِوون، هەرِوون گازی کەنێ برێن وەرە ئێرە. (گۆتی خوایە خۆ ئەمن چ برام نمانە)، دەبی ئەوە چبی؟! (دەبی داکێ من میردی کردبی برایەکیدکەم ببی).

چوون (بەرایی)[9] یان لێ گرتەوە **گۆتیان:** ئەوە خانم دەرێ بێتە ئێرە.

**گۆتی:** داکم خانی (چیش)[١٠] بەمنە؟!

**گۆتیان:** بەدی دەرێ دەبی ئیللا بێ.

**گۆتی:** هەستا چوو، گۆتی چوو، وەڵڵا بەخێری هیناو، هەستان شاردیانەوە.

**گۆتی:** هێواری دێوە هاتەوە لە لرمە لرمی داو **گۆتی:** ئەحمەدێ کورێ هەسپێ، لە حاسمانانم دەویستی لە حەردانم وەدەست کەتی.

**گۆتی:** کافر ئەوجە ئەو لرمەی لەچاکەی، ئەتوو لۆ گرمە گرمێ کەی، ئەمن مێوانێ توومە، ئەوشۆکە رادەبێرین و سبەینێکە ئەوجە لێک برن دەبین خوا بەکێهانی دا.

سبەینێ لێک برندبوون لێکاندا (جەمێ وی حوشترەک بوو، جەمێ ویش ئەهەندۆکۆکە بوو).

**گۆتی:** ئەتوو هەندی دەبن کلۆرایی ددانێ خۆت نیم، ئەمن حوشترەکیە خۆم، ئەتوویێک لەگەنە شیوت خواردیە!

**گۆتی:** کافر ئەتوو کافری ئەمن ئیسلام. وەڵڵا لێک برند بوون دێوەکەی تۆپاند. چوو برایەکەی لە ژێرزەمینێ دەرینا، دوو رۆژان ئیسرحاتی بوون.

رۆیی چووە کن دێوی ناوەنجیێ، دیسان نوێژی کرد هەتا کێلکەرەکان هاتن و گازیان کردێ چووە مارێیان، چوو وێ، دێوەکە هاتەوە **گۆتی:** ئای ئەحمەدێ کورێ هەسپێ، **گۆتی:** لەحاردانم وەبەدەستی کەتی. **گۆتی:** دوونێ برایەکی منیشت کوشتیە!

**گۆتی:** کافر گارە گارێ مەکە وەرە دانیشە مێوانی توومە و ئیسراحاتەکی بکەین.

وەڵڵا گۆتی سبەینێ نوێژی سبەینێی کردو لێک برندبوون.

**گۆتی:** یارەبی خوایە نوێژی نیورانیم نەچێتن بەدەستێ ئەو کافرەی ئەگە بکوژی شەهیدم بکا، ئەگەنا بیکوژم نوێژی نیورانیم نەچێتن.

وەڵڵا گۆتی ئەویشی تۆپاند، چوو ئەو براشی لە ژێرزەمینێ هینا دەرێ، ئەو برایێ دیشی هەر وەکی وان ئەوهانە هەرسێکی رزگار کردن هەرسێ دێوەکەی کوشتن و **گۆتی:** (هەتا دوو سێ رۆژان برایەکان وەخۆ هاتنەوە رۆیشتنیان پێ کرا.)

**گۆتیان:** ئەوجە برام ئەمە هەستین برۆین. هەئێکەکی سێ کێلکەر یان هەبوو، هەموو ئێکو وراغەکیان لەزێڕی بار کرد، هەمووش ئێکو هەگبەکیان پڕی زێر دەبنەخۆ دائینا.

**گۆتیان:** ئەحمەد ئەتوو لۆ لۆخۆ نایینی!

**گۆتی:** برام ئەمن لۆچمە؟ مارێ دنیاییم لۆچییە؟ ئەمن مارێ دنیاییم ناوێ، ئەمن بەخۆ پیاوم مارێ دنیاییم لۆچییە؟! ئەنگۆ لۆخۆ دینن بینن کەیفی خۆیتو، ئەمن مارێ دۆژمنم ناوێ.

**گۆتی:** ئەویش چەنگە زێڕەکی دە(هەگبە)ی[١١] کرد لۆخۆ. رۆیشتن لەرێ میزی هات، برەکی خۆداپاش، لەرێ برایەکان **گۆتیان:** وەرن ئەمە بیکوژین، ئەوەچی لۆخۆ نەهینایە، ئەوە لەمە (زەبر بە دەست)[١٢] ترە، بچین لەشاری کلێکەرەکانن لێ دەستێنی، خوشکەکانیشن لێ دەستێنی. وەرن بیکوژین (گۆتی ئەویش گێی لێ بوو).

**گۆتی:** وەڵڵاهی برام ئەمن ئەنگۆم رزگار کردییە، برۆن ئەمن دەگەنگۆ نایێم.

**گۆتیان:** (کورە بابەکەم لۆ نایێی).

**گۆتی:** نایێم برۆن ئەودتە شار وەنێزیک کەتینە ئەمن وا بەگەرێمەوە. گۆتی وەڵڵا هەستا لێیان دابرا و گەڕاوە، (ئەوانی رەوانی شاری کردن). ئەوان چوون لەوێ زێڕەکەشیان نما چیان نما، هەموو بوونە کەناس و کەس نزانی چیان بەسەرهات.

ئەویش هەستاوە چیای هەگەرا، وکی دەبینی دێوەک واسەرێ خۆی دەکونە دیوارۆکەکی نایە، واگێی خۆی لێ راگرتییە.

**گۆتی:** کورە کافر ئەتوو ئەوە چاکەی.

**گۆتی:** (وەڵڵاهی ئەحمەدێ کورێ هەسپێ، ئەوە ئەو سارە حەفت سار شوژنەکم بزر کردییە وا هەر زرینگەی دێ، و حەردی دا دەستە خوارێ، ئەمنیش هەوا گێێ خۆ دەدەمێ پێم نابیندرێتەوە.

**گۆتی:** (وەرە، وەرە، نارەکی دەگوێی کرد کردییە دیلێ خۆ.

دەبینی ئەوە ئێکەکیش تیروکەوانەکی دەگرتە کێستانان، مێرگەکە لەناو مێرگەکەی غلۆرەبتەوە و پێدەکەنی، غلۆرەبتەوە بنێ گەری.

**گۆتی:** (کافر ئەتوو ئەوە چاکەی؟!).

**گۆتی:** (وەڵڵا ئەحمەدێ کورێ هەسپی، یارەکم گرتییە وا لە سەکەویان راوەستایە تەشیە ریسی، تیر و کەوانەکی دەگرمێ لەداوێ تەشیەدەم، داوێ تەشیێی لێدەپسێنم)،

دەرێ(حەکە)[١٣] دەستت شکێیاخود. ئەمیش لەکەیفان پێیەکەنم).

**گۆتی:** وەرە وەرە ولا گۆتی نارەکیشی دەگوێی وی کرد، ئەویشی دەگەخۆ برد. هەستان چوونە ئەشکەفتەکێ.

**گۆتی:** لە ئەشکەفتەکەی شیویان لێنا. ڕۆژەکی دێودک گەڕاوە شیوی لێنا، تەیرەکی سپی هات خۆی لێدا شیوەکەی لێ ڕێشت، ئەویش بەخۆرو مۆردوە خڕی کردەوە و دە مەنجەڕێی کرد (چیدکە نەبوو). ئەحمەد هاتەوە هەندەکی خوارد چ دەنگی نەکرد. ڕۆژێ پاشترێ ئەو دێوێدکە گەڕاوە. تەیرە سپییەکە هات خۆی لێدا شیوەکەی ڕێشت دیسان، دەستی بەگریانێ کرد **گۆتی:** (هەنکوە ئەحمەد بێتەوە دەمکوژی، بەخۆرو و مۆردوەی دەناو مەنجەرێ کردەوە). ئەحمەد هاتەوە ئەویشی خوارد چ دەنگی نەکرد.

گۆتی ڕۆژێدکە بەخۆ گەڕاوە، تەیرەکە هات خۆی لێدا، کلکێ تەیرەکەی گرت، بەدەستەکیش مەنجەرە شیوەکەی گرت، تەیردکە هەند بەقووەت بوو پێی ڕانەوەستا، مەنجەرەکەی نەهێشت بڕێژی.

تەیرەکە چوو هە (لەدوڕ)[١٤] ئەشکەفتێ وێدا چووە خوارێ کونی تێدابوو. وەڵڵا گۆتی شیوەکەی هێوارێ خواردیان دێوەکان (تێکڕامان)[١٥] ، (تام)[١٦] خۆری لێ نایێ.

**گۆتی:** ئەنگۆ ئەوە لۆ تێکڕامینێن، ئەوی شیوی لەنگۆ ڕێشت هات لەمنیش بڕێژی بەرێ ئەمن لێنەگەڕام ئەمن لەنگۆ پیاوتر بووم.

سبەینێ **گۆتی:** (ئەوڕۆ ڕاو بەتارە. وەرن ئەمن ئێکو شۆڕکەمەوە دوڕ ئێرە، داخوا چی تێدایە؟). ئێکیان شۆڕ کردەوە **گۆتی:** (کوڕە سووتام، لەڕێ خوای سووتام هەرمکێشنەوە؟!) هەریان کێشاوە. ئەویدکەیان شۆڕ کردەوە. کوڕە **گۆتی:** (لەڕێ خوای سووتام، لە ڕێ خوای سووتام؟!). ئەویشیان هەر کێشاوە.

**گۆتی:** (ئەحمەدیان شۆڕ کردەوە (دێوەکان کافر بوون و ڕوحمیان پێدا نەبرد). کوڕە **گۆتی:** (بابم هەرمکێشنەوە سووتام. گۆتی ڕاست شۆڕیان کردەوە کەتە بنی).

کەتە بنی وکی دەیبینی وا لەمیرگ ومێرغوزار کانی و کانیاوەکە قەسرەکی لەناو کرایە گەلە خۆشە. بەقەسرەکەی هەر گەڕا وکی تەماشا دەکا دەبینی دێودک وادرێژ بووە بەسێ ژنان وا دەیشێلن.

**ژنەکان گۆتیان:** کوڕە (هێروە)[١٧] نیێ.

گۆتی (کوڵکەکی لە بنی پێی هاتبوو، لەبەر کوڵکەکەی خەوی لێ ناکەت، کوڵکەکی ئەوەندەی لەبنی پێی هاتبوو، دێوەکە، لەبەر کوڵکەکەی خەوی لێ ناکەت).

**گۆتی:** ئەویش نشتەرەکی کرد، تیژی کرد) نشتەرەکەی دەبنی پێی دا **گۆتی:** (ئۆۆۆی ئەوە مێش بوو چبوو کیژێ بەپێی وەدام گۆتییە ژنەکان).

**گۆتیان:** (ناوەڵڵا ئەوە پێت دەربوو پێ.)

**گۆتی:** (وکی وهای کردێ دەبینی ئەوە پێی دەربووە، لەبە ژانەکان چەند ڕۆژبوو خەوی لێ ناکەت، لەو دەقەی ژانەکەی لەقەلبی خەلاس بوو خەوی لێ کەت.)

**ژنەکان گۆتیان:** کوڕە ئەوە ڕۆحی خۆی دەکودیێ کردییە ئەودتە بیرەی وەکردییە.

گۆتی وەڵڵا چووە سەر پشتێ ژنەکی هینایە خوارێ و ڕاست هووردی کرد، کوشتی.

**ژنەکان گۆتیان:** (کوڕە ئەحمەد ئەو دێوانە لەسەرۆ با ئەتوو پێشان هەرکێشن، ئەگە ئەمە هەرکێشن لەدوایێ ئەوان ئەتوو هەرناکێشن لەبەمە.

**گۆتی:** ناوەڵڵا ئەمن ئەنگۆ لێرە بەجێ نایێلم دەبێ ئیللا ئەنگۆ پێشی من هەرکێشن.

ئێکەکیان هەرکێشا.

**ئەوی گۆ:** (لۆ من بی.)

**ئەوی گۆ:** (لۆمن بی)

لێکیاندا.

ئەویدیشیان هەرکێشا.

**ئەوی گۆ:** (نەڕ ئەمن ئەوە دەوێ).

ئەوی گۆ (ئەمن دەوێ)

ئەوی دوایێ لەهەمووان جوانتر بوو.

**ئەوی گۆ:** (دەبی ئەوە لۆمن بی).

**ئەوی گۆ:** (دەبی لۆ من بی).

ئەوجارە لۆ ئەحمەدیان شۆڕکردەوە، سەرێ ئەحمەدیان دیت زانیان ئەحمەدە ڕاست کندڕەکەیان بڕی - کەتەوە بنی.

دێوەکان لەوێ (وەرگەڕانە ئێکدی)[١٨]

**ئەوەیەگۆ:** (دەبی ئەوە لۆمن بی.)

**ئەویش دەگۆ:** (نەڕ)، دەبی ئیللا (ئەوی جوانەکە) لۆ من بی. ئەحمەدیش ژنەکە پێ گۆ **گۆتی:** (کوڕە ئەحمەد ئەگە ئەتوویان هەرنەکێشا، دوو بەران دێنە سەر ئەو ئاوەی،

ئێک رەشە ئێکیش سپیـە، ئەگە بکەونە سە پشتێ ئەوی سپی سێ رمـان لەسـە دنیـایێ برند دەبی، ئەگـە بکەویە سەپشتی ئەوی رەش حەفت تەبەقان دەبن دنیـاییێت دەباتە خوارێ.)

بەرانەکـان هاتن، خـۆی لێ دانووسـاندن، بەرانەکـان بەجۆت هاتن، دەوێ خۆیان دەئاوێ نا. ئەوی خۆ هەردا سەر پشتێ بەرانێ سپی، کەتە سە پشتێ بەرانێ رەش، حەفت تەبەقان دەبن دنیایێ چووە خوارێ.

**گـۆتی:** (چووە گـوندەکی لە گـوندەکـە چووە مـارێ پیرەژنەکێ. چەنگە زێرەکی دا پیرەژنەکەی، پیرەژنەکە جێی کردەوە).

**گۆتی:** (داپیـرۆکـە گـەلەکم تێنییـە، پیـرەژن چووە ناو کەندوێ (چرچرچڕ) میزی لۆ کرد، میزی بداتێ!).

**گۆتی:** (داپیرە ئەوە چم دەدەیێ، میزێ خۆمە دەیێ؟!)

**گۆتی:** (لۆ داپیرە).

**گـۆتی:** (کـورم بەخـوای چ (پشک)[19] ئاوەک نییـە، بخۆیەوە.

**گـۆتی:** (حـەزیا [20] یەک واخـۆی دەئاوێ وەرینایە، ئاوێ ئیزن نادا ئاو بێتە خوارێ. هەنکۆ کاێ کیژێ پاشای ئەو گوندەی، حەیوانەکی دەکوژنەوە شێوی لێ دەنێن لەسە (سنی) [21] یەکی دادەنێن (حـەمـووی) [22] دەبەن لۆ ئەو حەزیایەی، هەتا حەزیایەکە کیژەکەی دەخواو شیوێ دەخوا ئاو دێتـە خـوارێ، ئەمـەش لۆخـۆ ئاوەکـەی دینین، ئەوجـە ئاوەکەن لێ (خەلاسەبی) [23].

**گۆتی:** (ئەوها؟)

**گۆتی:** ئا.

هەستا چوو هەوراز چوو، کەوتە (رەز)ەکی[24] لێ بوو چوو تیـر و کـەوانی لێ دروست کـردن، خۆی دەپەنێ بەردی نا. کیژەکە بەگریان دەهات لۆ کن ئاوەکەی.

گۆتی ( وەرە وەرەداکم مەگریێ).

**گۆتی:** (بابەکـەم لەرێ خـوای ئەو شـیـوەی لۆ حەزیای دەبەم، شیوێ مەخۆ.).

گـۆتی ( نا نا ئەتوو وەرە شـیـوەکـەی بینە. لەسـە شیوەکەی دانیشت تێری شیو خوارد و کیژەکەی دەپەنەی خۆنا).

١. حەزیایەکـە سێ سەری پێوە بوو سێ تیـروکـەوانی لێـدا هەرسێ سـەری کـون کـردن، حـەزیـایەکـەی کـوشت.

هەریکێشا شیری (شەق و پیری کرد) [25].

گـۆتی ئاو چوو گـەرەکێ مـارێ جـوولەکـانی برد. وەڵڵا حەزیایەکەی کوشت، کـیـژەکـەش ئاقر بوو (چەنگ)ی[26] خـۆی لە خوینەکەی دا (پەسـتـەکەکی دەبەدابوو) (لەپ)ێ [27] خـۆی دەخـوێنی دا لە بن پەسـتـەکی لەپشـتـێی دا، نیشانەی پێوەنا.

پاشـا بانگی راهێشت **گۆتی:** (کـورە کێ ئەو ئیشـەی کردییە بێ بخوازی ماری دنیایێ؟)

**ئەوی گۆ:** (ئەمن بووم.)[28]

**ئەوی گۆ:** (ئەمن بووم.)

**کیژەکەی گۆ:** (بابە ئەمن دەیناسم، (ئەویش چ نەیدەگو ئەمن بووم، دەنگی ناکرد) کیژەکە هەستا چوو چۆتی: (بابە ئەوانە ئێک نینە. ئەوەتە ئەودیە).

**پاشا گۆتی:** (بابم، کیژت دەوێ، مـارێ دنیـایێ چێت دەوێ بتدەمێ؟)

**گـۆتی:** (چم ناوێ پاشـــام خـــۆشــبی، ئەمن ئێ سەدنیـاییمە، ئەگە پێت بکرێ بچمەوە سە دنیـایێ، ئەگە نا ئەمن چم ناوێ.).

**گـۆتی:** (سـیـمـرخ لە فـرانکە جـێی هەیە، هەروو (هەنکوە) [29] لەو رۆژانە سـیـمـرخ فـەرخـەی هەردینی. هەروو ئەگـەر کـونێ سـیـمـرخی، ئەگـە(حـیـلاج)ەکی[30] بەسیمرخی بکەی، ئەگەنا چم پێ ناکرێ.

**گۆتی:** (هەستـا چوو دوو سێ رۆژان خۆی دەپەنێ نا. سـیـمـرخ فـەرخـەی هەرینا، سـیـمـرخ رۆی چوو کـەرتکە شاخەکی لەسەر پشتێ خۆ دانا، بینی بەسە حەزیای دابدا. حەزیا وەسە دارێ هەرگەرا بچی فەرخان بخوا، ئەویش چوو بە تیروکەوانی حەزیایەکەی کوشت و حەزیایەکەی شاردەوە. فەرخەکان گازیان کرد.)

**گـۆتیـان:** (وەرە خـۆ دەبن بارێ مـەبنێ نەخـۆ داکێ مـە کەرتکە شاخت پێدادا.)

بەسـەدارێ دا (هەرگـەرا) [31] چوو خـۆی دەبن بارێ فەرخۆکەکان نا، خۆیان بەسە داهینا.

وەڵڵا سیمرخ هات کەرتکە شاخەکی لەسە پشتێ یە.

بارە فرکەیان لۆبرد **گۆتیان:** (ئەمە (ماینە) [32] دایە، ئەتوو شاخێ فرەدە.

وەڵڵا گۆتی شاخەکەی فرەدا، گرمەی هات وەکی تۆپێ شاخی فرەدا هات لەسە بەردی هەرنیشت.)

**گۆتی:** (ئەوی ئەو ئیشەی کردییە بخوازی ماری دنیایێ، هرچی دەوێ دا لۆی بکەم، سێ جاری گازکرد. جارێ سێیەی **گۆتی:** بابە ئەمنم ودم کردییە، چم ناوێ مارێ دنیایێ، دەمهەوی ئەمن ئێ سە دنیایێمە بمبەیەوە سە دنیایێ.)

**ئەی گۆتی:** (ئەو سار حەفت سارە فەرخەمخورێ، ئیللا (ئەوچینە) [٣٣] فەرخۆکەم مابوو، ئەو چینە فەرخۆکەشم حەزیا بیخواردبا بەرێ ئەو قسەت نەکردبا. پیر بوومە (تاقەت)م [٣٤] نمایە (زگسووتان)م [٣٥] دیتیە.).

**گۆتی:** (وەڵلا ئەوهەیە.)

**گۆتی:** (هەڕوو کوندە ئاوان، حەفت کەلەشە حەیوان حەفت نوردییە نانان، حەفت قەندە شەکران بینە دەسە پشتم (قەیم)کە [٣٦].

وەڵلا گۆتی چوو **گۆتی:** پاشا بینە حازرکە. وەڵلا حازریان کرد. دەسە پشتیان قەیم کرد و بەسەکەتن. هەددیگۆ: برسیمە و تشتەکی وەدوڕ دەوی دەهێخست، کەلەشە حەیوان و قەندە شەکر و کوندە ئاوو هەرچی بیگۆتبا وەدوڕ دەوی دەهێخست.)

**گۆتی:** (دنیات چەند لێ دیارە؟)

**گۆتی:** (هەندی هێرگەکی.)

گۆتی (دنیات چەند لێ دیارە؟)

**گۆتی:** (هەندی بێژینگەکی.)

**گۆتی:** (دنیات چەند لێ دیارە؟)

گۆتی (هەندی چارۆگەکی.

دەی دەی وەسەکەتن.

**گۆتی:** (برسیمە!).

رانێ خۆی لێکردەوە و دوڕ دەوی هێخست.

ئەویش وەهای کردێ شیرین بوو گوتی: (وەڵلاهی گۆشتی خۆیتی، ( زانی چی وێ نمایە. **گۆتی:** (داخوان چتۆ پیاوە ئەو پیاوە) وەڵلا گۆتی دەبن ددانی خۆی نا، ددانی ژانی شکا.)

**گۆتی:** (برۆ!.)

**گۆتی:** (ناوەڵلا نارۆم!).

**گۆتی:** (دەبرۆ؟)

گۆتی (نارۆم.)

**گۆتی:** (ئاخە هەتا ئەتوو نەڕۆی ئەمن نارۆم (سیمرخ وەگۆ)

هەستا رۆیی پێی ناکرا بڕوا دەشلی.

**گۆتی:** (ئەوە لۆ دەشلی؟)

گۆتی وەڵلا لەسە پشتێ توو (بڕکۆکەک)ی [٣٧] ماندی بوومە.

**گۆتی:** نا نا بینە. وەڵلا گۆتی هەستا چوو (نقووم بوو) [٣٨]

دەرمانەکی هینا، هینای لێیداو پێی وەناوە، رانەکەی بەستەوەو، برینەکەی پێ چابۆوە، بەدەرمانەکەی - **گۆتی:** (ئەوجە سیمرخ رۆیی).

ئەویش بەردو چەرخی لێدا هەسپەکەی هات، سواری هەسپەکەی بوو.

وەکی دەچێتن لەئەشکەفتەکەی وا دێوەکان هەروا لێکەدەن لەسە ژنە جوانەکەی. (مەندیل)دکی [٣٩] لەسەرێ خۆنا.

**گۆتی:** (ژنەکان گۆتیان): ئەهە ها گازی ئەو مەلایە کەن، ئەو مەلایە بێ شرحێن لۆبکا (ژنەکان ناسیان) گازیان کردێ و گۆتیان وەرە شرحێن لۆبکە (دێوەکان نەیاننانسیەوە).

**گۆتی:** (ئەمن تیر و کەوانی داوێم، کێهان پێشان تیرەکەی هیناوە، ئەو ژنە جوانە لۆوی بی.)

**گۆتی:** ( تیر و کەوانەکی لۆ ولای هاوێشت، ئێکیشی لۆ ولای هاوێشت. دێوەک لۆ ولای چوو، ئێکیش لۆولای چوو. ئەویش ژنەکانی لەگە خۆ سوار کرد.

وەکی هاتەوە دەبینی برایەکانی ئێکەک وا بوویتە کەناس و ئێکەک وا لە بەدەستێ قەسابان خوون و پیسی پێوە، ئێکەک وە لەشاری گو رێژە. خوشکەکانیشیان هەموو بەمێرد دابوون و کێلکەرەکانیان بەمێرد دابوون، زێرەکانیان هەموو فەوتاند بوو. (چکو [٤٠] چ نەبوون پیاو نەبوون مارەکەیان هەموو فەوتاند بوو.

وەڵلا گۆتی هەستا هینای ئێکی کردە قاوەچی و ئێکی کردە نزانم چ و ژنی لۆ هەرسێکان هیناو.)

**گۆتی:** (ئەنگۆ ئەمنە ناسن؟)

**گۆتیان:** نا.

چۆوە سەر پاشایەتیێ خۆو جێی بابێ خۆ

کراشم درا چم پێ نەبرا.

* ئەم هەقایەتانەی خۆشناوەتی زۆر لەوشەکانیان لەگەڵ یەک بەستراوەتەوەو ئێجگار کورت کراونەتەوە وەکو :ــ

کێلکەر = کارەکەر
لەمە = لەئێمە
تێکرامان = سەیری یەکتریان کرد
چاکەی = چی دەکەیت
لێکیاندا = لە یەکتریان دا
هەئێکەکی = هەر یەکێکیان
چن = هیچمان
چنیە = هیچ نییە
ماخرا = ماڵ خراپ
تۆیاند = سەگ تۆیی کرد
چم ناوێ = هیچ شتێکم ناوێ
کێواچی = بۆکوێ دەچی
هەستێن = هەڵبستێن
ئێکو = هەر یەکەیان
شە = شانە
چیدین = هیچی ترمان

جارێ کە دەڵێ : لۆ خۆ، واتە لۆ خۆم، لۆ خۆت، لۆ خۆمان، لۆخۆتان، لۆ خۆیان. بۆ هەموو جۆرە راناوەکان بەکاردێت، تەنیا جار و بار لە باتی لۆ خۆتان دەڵێ: لۆ خۆو، یا لەباتی لۆ خۆمان دەڵێ لۆخۆن.

یان ئەو (ن) ەی دووایی دەخاتە دوایی وشەکەی پێشتر وەکو هەموون بەخۆ خوارد، شەکرەکەی لۆ خۆ برد، چان لۆ خۆ خواردۆ....هتد.

بۆ (و) ەکەی لۆ خۆویش دەڵێن : هەموو بەخۆ خوارد، شەکرەکەو لۆ خۆبرد چاو لۆ خۆ خواردۆ.

١. قووەت : هێز.
٢. لاق : پێ.
٣. مادام : کەواتە.
٤. ئەلحان : ئێستا، ئەلعان، هەنووکە
٥. داخیل : چووە ناو، گەیشتە ناو.
٦. حەینی : عەینی، کت و مت، دەقا و دەق.
٧. لەشروان : لە حەژمەتان، لەعەزرەتان، لەمەرەقان.
٨. خۆن : خۆمان.
٩. بەرایی : پێشەوە.
١٠. چیش : چ ئیش، چ کار.
١١. هەگبە : تێرکەیەکی بچووکە لەسەر پشتی ولاخ باردەکرێت.
١٢. زەبر بەدەست : بەتوانا، دەست رۆیشتوو.
١٣. حەککە : کاشکی، بریا، خۆزگە، یاخوە.
١٤. لەدور : لەناو.
١٥. تێکرامان : سەیری یەکتریان کرد.
١٦. تام : چێژ.
١٧. هێورە : هێروە، بۆ ئێرە، بەرەو ئێرە.
١٨. وەرگەرانە ئێکدی : بەربوونە گیانی یەکتر، تێکبەربوون.
١٩. پشک : دلۆپ.
٢٠. حەزیا : ئەژدیها.
٢١. سینی : خوانچە.
٢٢. حەمووی : گشتی.
٢٣. خەلاسەی : دەبڕێ، نامینێ.
٢٤. رەز : باغ، باخچە، مەزرا.
٢٥. شەق و پیری کرد : پارچە پارچەی کرد، لەت لەتی کرد، لەت و پەتی کرد.
٢٦. چەنگ : لەپ، مست، گۆلم، بەرێ دەست، مشت، چەنگ.
٢٧. لەپ:چنگ
٢٨.
٢٩. هەنکوە : هەنووکە، ئێستا.
٣٠. حیلاج : عیلاج، چارە.
٣١. هەر گەرا : هەڵگەرا، سەرکەوت.
٣٢. ماینە : ماوین، نەمردووین.
٣٣. ئەو چینە : ئەوجارە.
٣٤. تاقەت : توانا، هێز.
٣٥. زگسووتان : مردنی منداڵ بۆ دایک و باوک دەبێتە زگ سووتان.
٣٦. قەیم : توند.
٣٧.نقووم بوو : بزر بوو، وون بو، کەوتە ژێر ئاو.
٣٨.برگۆکەک : نەختێ، هەندەک، پیچەک، قیچەک.
٣٩. مەندیل : شاشک تەنیا حاجی و مەلا لەسەریان دەبەستن.
٤٠. چکو : چونکە.

# فاڵ و جادوو لە هەولێر

ستار محەمەد ئەمین

ڕەنگە مێژووی جادوو بۆ پێش چەند هەزارساڵێک بگەڕێتەوە، چونکە مرۆڤ لە کۆنەوە ویستوویەتی لایەنە شاراوەکانی ژیان بزانێت وکاریگەری بەسەریانەوە هەبێت، بۆیە پەنای بردۆتە بەر ئەو کەسانەی پێیان دەگوترێت (جادووکەر) بەو هیوایەی ئەوان لە کردنەوەی گرێ کوێرەی ئاواتەکانیان هاوکارییان بکەن.

لە سەردەمانی زووی ئاشووریەکاندا قەڵای هەولێر جێگای پەرستگەی خوداوەندەکانی عەشتار بوو، لەو سەردەمەدا پاشاکانی ئاشوور لەکاتی لەسەرنانی تاجی پاشایەتی و چوونیان بۆ بەرەکانی شەڕ، لەپێشدا سەردانی ئەم پەرستگەیانەیان دەکرد و بۆ پیرۆزی وگەیشتن بە مرازەکانیان، گیاندارێکی باشیان لەگەڵ خۆیاندا دەبرد بۆ پەرستگە.لەوێدا دوای (تەعویزە) و (بخوور) سووتاندن، گیاندارەکەیان بەشێوەیەک سەردەبڕی کە خوێنەکەی نەکەوێتە سەر زەوی، ئەوان دڵی گیاندارەکەیان دەردەهێناو بەشەکانی تری گۆشتەکەیان بەسەر (کاهین)ەکاندا دابەش دەکرد.

کاهینەکان لە بەرامبەر خواوەندەکانیان دەیانگوت (ئەی خواوەند.. پاشا ئەو گیانلەبەرەی بۆ تۆ سەربڕیوە سەری گیانلەبەرەکە لە جیاتی سەری خۆی، دەست وقاچەکانی لە جیاتی دەست وقاچەکانی خۆی و کەلەشەکەشی لە جیاتی کەلەشەکەی خۆی لێوەرگرە)

پاشان بەگوێرەی هێڵی خوێنی دڵی گیانلەبەرەکە فاڵیان بۆ پاشا دەگرتەوە.

بابلیەکانیش لەسەردەمی خۆیاندا مانگ وڕۆژو تەنها (٥) ئەستێرەیان ناسیوە و بۆ هەریەک لەم ئەستێرانە ڕۆژێکیان دیاری کردووە وەک نیشانەی باشی وخراپی بەخت.

راستە مێژووی فاڵگرتنەوەو جادوو بۆ سەردەمانێکی کۆن دەگەڕێتەوەو ئاشووری وبابلیەکان پەنایان بردۆتە بەر، بەڵام تاکو ئەمڕۆ لە زۆربەی کۆمەڵگا جیاوازەکاندا بوونی هەیە، کە کۆمەڵگای کوردەواریش بەشێکە لەوانە.

ئەمڕۆ لە کوردستانیش زۆربەی ئەوانەی پەنا دەبەنە بەر فاڵ وجادوو ژنانن، تەنانەت بەشێکی زۆری فاڵگرەوەکانیش (ژنن)و پرۆسەی بەخت خوێندنەوە وفاڵگرتنەوە لە ماڵەکانی خۆیاندا ئەنجام دەدەن.

کەواتە بەزۆری ئەو هاوسەرانەن کە کێشەی خێزانی وکۆمەڵایەتیان هەیە، یاخود ئەو کوڕو کچەعاشقانەن کە هەستدەکەن بەربەستێکی گەورە لە نێوان ئەوان وخۆشەویستییەکەیاندا هەیەو

دەیانەوێ چارەسەرێکی بەپەلەی بۆ بدۆزنەوە.

سالآنێک لەمەوبەر فاڵچییەکان خۆیان وەک خەڵکانی ئایینپەروەر نیشان دەدا، بۆیە خۆیان دەکرد بە سەید وشێخ وقوماشی سەوزیان لەپشتی خۆیان دەبەست، چەند کتێبێکیشیان بەدەستەوەدەگرت وبە کۆلآناندا دەگەڕان.

ئینجا ژنان وکچانی گەڕەک دەوریان دەدان وئەوانیش کتێبیان بۆ دەگرتەوەو بەختیان بۆ دەخوێندنەوە، ئەگەر بشیانویستبا جادوویان بۆ دەکردن.

سەردانی یەکێک لەجادووگەرانی ناوشاری هەولێرم کرد، بەبێ ئەوەی بزانێ کە من کاری رۆژنامەنووسی دەکەم، پێمگوت (کێشەیەکم هەیە پاش ئەوەی هەردوولا رێک کەوتین کەبە بڕی ٤٥٠٠٠٠ چوارسەدو پەنجا هەزار جادووەکم بۆ بکات بە مەرجی ئەوەی کێشەکەم بۆ چارەسەر بکات وبمگەیەنێت بە ترۆپکی ئاواتەکانم........ من لەسەرەتا گوتم (لەدەرەوە هاتووم کاتی کەمم ماوە)گوتی: هیچ کێشە نی یە ئیمەیلەکەتم بدێ من جادووەکەت بە ئیمەیل بۆ رەوان دەکەم. گوتم: ئەوە چۆن دەبێ. گوتی: من لەم جۆرە کارانەم زۆر کردووە سەد لە سەد سەرکەوتوو بووە.

واپێدەچوو بەهەر رێگایەک بێ قەناعەتم پێ بێنێ، بەڵام ئەوەی گوت: کە بە ئیمەیل گرانتر رادەوەستێ. منیش پێمگوت: ئەگەر ئەوەت کرد ئەوامن لەسەر رووپەڕی رۆژنامەکان "ریکلام"ت بۆ دەکەم، یەکسەر زانی بۆ کاری رۆژنامەنووسیمەو گوتی: کاکە ئەوەی تۆ ناکرێ و تکایە کامێراکەت هەڵگرە با تووشی کێشەی زیاتر نەبم.

دوابەدوای ئەوە لەگەڵ برادەرێک چووین بۆ شارۆچکەی عینکاوە بۆ ماڵی ژنێک بەناوی (ر)کە فاڵمان بۆ بگرێتەوە، بەڵام (ر)رێگەی نەداین بچینە ژوورەوە هەر لەبەر دەرگا گوتی: کێشەکەت چییە؟ بۆم لەسەر پارچە کاغەزێک بنووسە ئێمەش بە زار پێمانگوت، گوتی: باشە ناوی خۆت ودایکتم بۆ بنووسەوە ٥٠٠٠٠ پەنجا هەزار دیناریشم بدەنێ تاکو کارەکەت بەباشی بەڕێوە بچێت کە هاتیەوەش دەبێ ١٥٠٠٠٠سەد و پەنجا هەزار دینارم بدەیتێ.

ئەوەندەی گوتم: با دانیشین و قسە بکەین پارە مشکیلە نییە، بەڵام! ئەو گوتی: ئێستا پیاوەکەم قبوول ناکات من ئەو ئیشە بکەم.

بەڵام لەبەر خاتری (س) کە ئەو رەوانی ئێرەی کردی. گوتم: با ئەوەندە رێگایە ماندووبوونی بە فیڕۆ نەچێت. هاوڕێکەم گوتی: ئەوە رۆژنامەنووسەو دەیەوێ چاوپێکەوتنت لەگەڵ بکات.

هەر کە ئەوەی زانی دەرگای لەسەرمان پێوەدایەوە وگوتی: خواحافیزتان بێت.

بەڕاستی سەیرە دەبێ ئەوانە کە هەموو شتێکیان پێ بکرێ بۆ لە رۆژنامەنووسان و زوومی کامێراکان بترسن؟

### یەکێک لە قوربانیانی دەستی جادووگەران

من کێشەیەکم لەگەڵ کوڕەکەم هەبوو، ئەو شکاتی لێکردم و بردمیە بەردەم دادگا کە دەکرا لە رێگای دیکە چارەسەر بکرێ، بەڵام کوڕەکەم وازی لێ نەهێنام و لەلای زۆر کەس و ناسیاو باسم کرد، کە چۆن کوڕەکەم وازم لێدێنێت، تاوەکو ناسیاوێک بەناوی (ئـ خەیات) پێ گوتم: کە کەسێک هەیە دەتوانێت تۆ لەم کێشەیە رزگار بکات، بەڵام ئەوە پارەی تێدەچێت، منیش گوتم کێشەبێ و لەگەڵ کوڕەکەم بەپارە چارەسەی بکرێ من ئامادەم. ئەویش گوتی: کوڕێک هەیە بەناوی شێخ (م) نووشتەیەکت بۆ دەکات تا لە رۆژی دادگا کوڕەکەت تەنازوولت بۆ بکات.

رێککەوتین لەسەر پارەکە بە مەرجێک نووشتەکە ئیشی خۆی

بکات، ئەگەر نا پارەکەم بۆ بگێڕێتەوە، چەندین جار چووینە بەردەم حاکم لە دادگا بێ سوود بوو، بۆیە کە لەوادەی خۆی دەرچوو، ئێمە داوای پارەکەمان لە شێخ کردەوە، بەڵام وەڵامی نەدایەوەو تەلەفۆنیشی لەسەر داخستین.

براکەم ئەمە هەمووی قەشمەریاتە، ئەمانە قەشمەری بەخەڵک دەکەن من بە ناچاری پەنام بۆیان برد، کورد دەڵێ: ئەگەر لە تەنگانە کەوتیتە ئاو، دەست بەپەلی رزیو دەگریت، بۆ ئەوەی نەخنکێی، بەراستی ئەوانە نەدین ونە ئیمانیان هەیە تەنیا قوڵی خەڵک دەبڕن و پارە کۆدەکەنەوە.

دکتۆر مەلا محەمەد گەزنەیی: فاڵ وجادو و راست نییە، ئەمانە هەمووی تەزیفە کابرای جادووکەر قسەی خۆشت بۆ دەکاو دەڵێت: بڕۆن ئەوە دڵی کابرامان بۆ نەرم کردووی وکچەکەت دەداتێ، کە ئەو هات پێی دەڵێی: زۆر وریا دەبی و قسەت بۆ دێ و مناقەشە دەکەی و لەوکاتەدا کابرا بڕوات پێدەکات، لەبەرئەوە نییە کەوا جادووەکە کاریگەری هەبووە بەسەر کابرا بەڵکو کاریگەری هەبووە لەسەر خودی خۆت و وەرەت بەرز بۆتەوە توانای قسە کردنت باشتربووە، لایەنی دەروونی زۆر کاردەکاتە سەرت، بەهیچ جۆرێک جادوو کاریگەری نییەو حەرامە نیمچە شەریک پەیداکردنێکە بۆ خودا، لەبەرئەوەی ئەگەر بڕوات پێی هەبوو تۆ هەندێ سیفاتی خودا دەدەی بەکەسێک بۆیە کوفرە.

قەشە لویس بنیامین جادوو نووشتە لەعەقیدەی مەسیحی نییە ومەحرومە لە کتێبی موقەدەس واتە ئینجیل ئەو شتە نییەو حەرامە لەبەرئەوەی دژی ئیرادەی خودایەو فرتوفێڵە و تەنیا بۆ کۆکردنەوەی پارەیە.

لەوانەیە خەڵکانێک هەبن بە ناوی قەشە یاخود ئاینی مەسیح ئەم کارانە بکات، بەڵام بە ئاشکرا نییە.

ئەوەی ئەو کارەش بکات ئەوا مەحروم دەبێت لە هەموو کاری کەنیسە، بەڵام ئەمڕۆ ئیشکردنی فاڵگرەوەو جادووکەران گۆڕانی بەسەر داهاتووەو زۆر بەیان لەماڵەکانی خۆیان یان لە هەندێ شوێنی تایبەت دادەنیشن وخەڵک روویان تێ دەکەن.

یەکێک لە رێگاکانی جادوو ئەوەیە، کە جادووکەر جامە ئاوێک دادەنێت و بەرماڵێکی بەسەردا دەداو لەسەری دەخوێنێ.بۆ ئەوەی قسە لەگەڵ جنۆکەکان بکات و بزانێ، کێشەی ئەو کەسەی کە رووی تێکردووە چییە؟ پاشان هۆی کێشەکە بۆ سەردانکەرەکەی روون دەکاتەوەو هۆکارەکەی بۆ باس دەکات، بۆ نموونە دەڵێ: دوعات لێکراوە یان چاوو نەفەس کاری تێکردووی.

خۆ ئەگەر کەسەکە بڕوای بە قسەکانی کرد ئەوە دەبێ لەبەرامبەر بڕێک پارەدا، جادووکەرەکە سیحرێکی بۆ بکات بۆ ئەوەی ئەو دوعایەی کە لێی کراوە بەتاڵ بێتەوە.

زۆربەی جادووکەرو فاڵگرەوەکان دەڵێن: ئەو پارەیەی کە وەری دەگرین بۆ ئێمە نییە، بەڵکو ئێمە ئاژەڵی پێدەکڕین وبۆ جنۆکەکانی سەردەبڕین، بۆ ئەوەی زووتر مرازەکانتان حاسل بێت.

جادوو زۆر جۆرو ناوی جیاوازی هەیە، لەوانە: باڵا بەژن - ئەبودووجانە -رووقیە، کە لەسەر کاغەزێک دەنووسرێنەوە درێژییەکەیان دەگاتە چەند مەترێک، بەڵام ئەو وشەو دێرانەی کە لەسەر کاغەزەکاندا نووسراون، زۆر بەزەحمەت لەلایەن خەڵکی ئاسایی دەخوێنرێنەوە.

نرخی جادوو بە گوێرەی گەورەیی وبچووکی کێشەکەتەوە زیاد و کەم دەکات، کە نرخی هەندێکیان ٢٠دۆلارە، بەڵام جاری وا هەیە تەنها بۆ یەک جادوو نزیکەی ٢٠٠دۆلار وەردەگرێت، هەندێ لە جادووکەرانیش لەگەڵ سەردانکەرانیان رێکدەکەون، کە ئەگەر جادووەکەیان سەری نەگرت،

ئەوە پارەکەیان بۆ دەگێڕنەوە.
ئەو ژمارە زۆرەی خەڵكی كە رووله جادووكەران دەكەن، نیشانەی ئەوەیە کە تاكو ئێستاش توێژێكی فراوان باوەڕیان پێی هەیە، بەڵام لە پاڵ ئەمەشدا خەڵکانێکی تر بڕوا بەفاڵ وجادوو ناکەن پێیانوایە تەنها خەیاڵەو هیچ بنەمایەکی نییە.
وەنەبێ ئەمڕۆ جادوو تەنها لەناو کۆمەڵگای کوردەواریدا یان لە وڵاتی موسڵمان نشیندا مابێتەوە، بەڵکو لە زۆر وڵاتانی پێشكەوتووی ئەورووپاو ئەمریكاشدا بوونی هەیەو خەڵکانێکیش باوەڕ بە قسەکانی جادووکەر دەکەن، هەروەک لە ئاینەکانی مەسیحی وجوولەکەو بووزی وتەنانەت لای هیندییەکانیش جادوو دەکرێت.
جادووكەران بە گشتی شێوازی مامەڵەکردنێکی تایبەتیان هەیە لەگەڵ ئەوانەی سەردانیان دەکەن، تاکو زیاتر بڕوایان پێ بهێنن، ئەویش لە ڕێگای دروستکردنی هێڵکاری وسووتاندنی کاغەز و سەیرکردن و قسەکردن وهەندێ جاریش ئاماژەکردنیان بەدەست بۆ شتێکی دیاریکراو، زۆر جاریش ئەم هەڵسوکەوتە سەیرانەی جادووكەران دەبێتە هۆی ترساندنی سەردانکەر و تووشی نەخۆشی دەروونی دەکات، یاخود کێشەی کۆمەڵایەتی وجیابوونەوەی ژن ومێردی لێدەکەوێتەوە.
هەندێک هەن پێیانوایە جادوو ژیانی لێتێکداون، چونکە جادوو وایکردووە لەبەر چاوی کەس وکاریان خۆشەویستەکەیان ڕەش بێن، بەڵام هەندێکی دیکە ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە جادوو لەکردنەوەی هەندێ گرێ کوێرەی گەورەدا هاوکاریان بووەو بە مرازی خۆیان گەیشتوون، بەڵام ئایینەکان بە تایبەتی ئایینی ئیسلام ومەسیح بە هەموو شێوەیەک فاڵ وجادوو ڕەتدەکەنەوەو بە کارێکی شەیتانی لەقەڵەم دەدەن.
شێخ ئاریان بەرزنجی سەبارەت بەم مەسەلەیە دەڵێ: هەرچەندە زۆربەی خەڵک پێیان وایە نووشتەو جادوو پەیوەندیان بە پاراسایکۆلۆژییەوە هەیە، بەڵام شێخ ئاریان پسپۆر لە بواری سایکۆلۆژی دەڵێ: نووشتەو جادوو بە هیچ جۆرێک پەیوەندیان بە پاراسایکۆلۆژی نییە، تەنیا ئەوە نەبێت ئەرکی پاراسایکۆلۆژییەوە ڕاڤەکردنی هەموو دیاردەیەکی سەرسوڕهێنەرو سەرنجڕاکێشە کە لە بوونەوەر داهەیە، یان لای مرۆڤ هەیە، ئاستی نزمی ڕۆشنبیری خەڵک لە پاراسایکۆلۆژی وایکردووە کە فاڵ وجادوو یاخود نووشتە بدرێتە پاڵ ئەم زانستە بۆ نموونە گفت خوازی ڕۆڵێکی زۆر گرنگ دەبینێت لە جادوو.
کاتێک کابرای جادووكەر باس لە ٤٠دۆلار یان ٦٠دۆلار دەکات، قەناعەتێک لای کەسەکە دروست دەبێت کەوا جادوو بە شتێکی گەورە بزانێ وبڕوای پێبکەن.
لایەنی دەروونی وسایکۆلۆژی ڕۆڵێکی سەرەکی دەبینێت لەسەر ئەم بابەتە، ئەگەر هاتو تۆ باوەڕت بە کەسێک بوو کە چەند دێڕێکت بۆ بنووسێ، بۆ ئەوەی شتێکت بۆ بکات، پێموایە ئەگەر ئەو چەند دێرەشت بۆ نەنووسێ، تەنیا چەند وشەیەکت لەگەڵدا بدوێ، لەوانەیە تۆ لە ڕووی دەروونییەوە پشوو بدەی و دڵنیا بیت لەوەی کەوا کارەکەت یاخود گرفتەکەت چارەسەردەکەیت، کە تۆ دڵنیابوویت لێرەدا چی دروست دەبێت ئەو ژیریەی ناوخۆیە جۆرە فەرمانێک دەدات بە مێشکی مرۆڤ.
مێشکی مرۆڤ جۆرە بڕوایەکی پێدەو بە خۆی پەیدا دەکات، لەوبوارەدا هەرکەسێکیش بڕوای بەوکارە هەبێ کە دەیکا ئەوکارە بە بڕوای ئەو سەرکەوتوو دەبێ و زاڵ دەبێ بەسەر کێشەکەی.
د. مەلا محەمەد گەزنەیی: جادوو لە کوردەواری خۆمان بەرامبەر عەرەبیەکەی بە سیحرو کەهانە دێ، هەندێ جار "سیحر"و "کەهانە" لەوەی کە یەکێک بتەوێ

شتێکی بەسەربێ یاخود خۆشت بووێ یاخود بتەوێ شتێکت بۆ بکات، تەنەزولت بۆ بکات ئەوە سیحرە، ئەوەی دیکەیان کە غەریب زانە و باس لەوە دەکات، کە شتی بزربووی بۆ بدۆزێتەوەو ئەوە پێیی دەڵێن کەهانە.

هەر لە کۆنەوە "سحر"و "کەهانە" زۆر باو بووە، ئێستاش لەناو کۆمەڵگای دواکەوتوو زۆر باوە چونکە لە قسەکانیان پێدەچێت، هەندێ کتێبیان هەبێ لەسەر عیلمی قیافەو فراسەت دیارە ئەوە دەبێتە هۆی ئەوەی بتوانن لەدەم و چاو و شکلەوە خەڵک بخوێننەوە، ئەوەش لە دینی ئیسلام حەرامە و فەرموودەی پێغەمبەری لەسەرە کە دەفەرموێ: هەر کەسێک بچێتە لای کاهینێک وبڕوای پێبکات ئەوە لە دینی محەمەد کافرە، چونکە لە دینی ئیسلام هاتووە بۆ بەربەرەکانی ئەم خرافاتیانە کە خەڵک بەکاری دێنن بۆ کەسێکی لاواز ئەو خەڵکە لاوازانەش پێی دەڵێن (مورتەد)ئەوانەی کە غەدریان لێکراوە، ئەوانەش ئەو عەقلەیان نامێنێ، وەک کابرایەکی مولتەزیم ئیتر ئەو کەسانەی کە تووشی گیروگرفت دەبن ئەوانە ئیستغلال دەکرێن لەلایان جادووکەرانەوە.

باشتر وایە ئەگەر یەکێک کێشەیەکی هەبوو بچێ لەرێگای قانوونەوە چارەسەری بکات، نەک جادوو.

ئەگەر نەخۆشی هەیە بابڕوات خۆی بەدکتۆرێک پیشان بدات، ئەگەر هەموومان پەنامان بردە بەر سیحرو جادوو کۆلیژی پزیشکی ومافمان بۆ چییە؟ دیارە ئەوانە هەموو کۆمەڵگا بەرەو نەزانی دەبات لەگەڵ دینی ئیسلام ناگونجێن.

هەر لە قسەکانی، د. گەزنەیی سەبارەت بەم مەسەلەیە دەڵێت: پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموێ ئەگەر راستیش بکەن نابێ باوەڕیان پێبکەن، چونکە ئەو قسانەی ئەوان دەیکەن یان چەوت دەبێ یان راست دەبێ.. ئەگەر راست بوو نابێ باوەری پێبکەن).

زۆر جار فاڵ و جادوو دەرەنجامی خراپی لێکەوتۆتەوە، بووەتە هۆی تاوانکردن، بۆیە وەکو مامۆستایەکی ئایینی پێمخۆشە خەلک لەم دیاردە خراپە دوور بکەوێتەوە، لە رێگای زانست و دادگاکانەوە کێشەکانی خۆیان چارەسەر بکەن و با چیتر پەنا نەبەنە بەر شتی خورافیات.

بۆیە زانستخوازان و ئەوانەی دەخوازن کۆمەڵگا بە ئاقارێکی باش و تەندروست بڕوا، هەرگیز پەنا نابەنە بەر شتی درۆو دەلەسە و جادوو و فالگرتنەوە... میللەتان بۆ خۆشی فاڵ دەگرنەوە، ئێمەش بۆ بەدبەختی.

**قسەی خەڵک..**

هاوولاتییەک: بەڵێ من سەردانی جادووکەرانم کردووە بۆ نزیک بوونەوە لە خۆشەویستەکەم پێی گوتومە برۆ ئەوەت بۆ دەنووسم، بیبە سەر گۆری مردوویەک لە قەبرستان، کە تازە هێنابیان بۆ سەر قەبران، بەلام ئەوەم کردووە هیچ ئەنجامی نەبوو.

کچێک: من هیچ بڕوام بە جادوو نییە، لەبەر ئەوەی ئەزموونم هەیە هەمووی درۆیە و تەنیا ئامانجیان پارە کۆکردنەوەیەو بەس، هەروەها خراپکردن وتێکدانی شیرازەی ماڵەکانن.

مامۆستایەکی زانکۆ: ئەگەر جادوو یان فاڵ راستە با واز لە زانست و تەکنەلۆژیا بهێنین وجادوو کارەکانمان بۆ جێبەجێ بکات.

نەخوێندەوارێک: من لەسەرەتا بڕوام بە فاڵ و جادوو نەبوو، تا ئەو کاتەی بە دوای خۆشەویستەکەمدا دەگەڕام وبرادەرێک بردمی بۆ لای یەکێک لە وانەی جادوو دەکەن، پێی گوتم: لەم رۆژانە خۆشەویستەکەت دەبینی. ماوەیەکی کورت بەیەک شادبووینەوە، بۆیە ئێستا باوەڕم بە فاڵ و جادوو هەیە.

# بالە لە دەشتی هەولێر

جەلال سنجاوی

**بەرایی:**

هەر لەو کاتەی مرۆڤ وەک بوونەوەرێکی دەستەبژێر لەسەر زەوی چاوی بە ژیان کردۆتەوەو ئاوێزانی دیاردەکانی سرووشت بووە، ئیتر هەموو زەین و بەرنامەکانی ژیانی رۆژانەی بۆ خۆگونجاندن و نینۆک لەخاک گیرکردن و کردنەوەی گرێ کوێرە ئاڵۆزەکانی گەردوون تەرخان کردووە و لە ململانێیەکی سەخت و درێژخایەندا رووبەرووی کارەساتە گورجگبڕو پەژمووردەکان و ئاژەڵە دڕندەو نەفرەجاکان بۆتەوە و بەرامبەر ساتە وەختە تاڵەکان چۆکی دانەداوە.

زانایانی ئارکیۆلۆژی و بیرمەندانی مێژووی کۆن، لە ئەنجامی پشکنین و کنەکردن و رامان لە پەیکە قورینەکان و شاکارە هونەرییەکانی هەڵکۆڵین و کۆڵینگکاری لاپاڵی ئەشکەوتەکان و بەرزایی گابەردەکان لە شاخەکانی کوردستاندا، گەیشتوونەتە ئەو قەناعەتەی، کە هێڵکاری و کاری هونەری نێو ئەشکەوتەکانی (شانەدەر، هەزارمێرد، زەرزی، حەکاری، کۆسپە سپی، گوندۆک.. هتد)و پەرستگاکان و ئاتەشگاکان جا بۆ هەر مەبەستێک ئەنجام درابن، بەهەموو خرۆشێکەوە ئاوێتەی لاپەرەکانی مێژووی کۆنی کورد دەبن و دەچنە خانەی داهێنان و ئەفراندن و تێکەڵ بە دنیای ئەفسانەی کوردی دەبن و دەشێ بۆ لێکۆڵینەوەی زانستی و ئەکادیمی و ئەنترۆپۆلۆژی سوودیان لێوەربگیرێ، بەتایبەتی بۆ مەبەستی کردنەوەی گرێ کوێرەکان و شیتەڵ کردنی هاوکێشەکانی ژیانی مرۆڤی ئەوێ سەردەم، کە تەمەنی خۆی پێکرد لەگەڵ ململانێ و رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ کارەساتەکانی سرووشت و ئاژەڵە دڕندەو نەفرەجاکان و شتە غەیبییەکان وەک، ئەجندە و دێو و ئەژدیهای ئەفسانەیی و بالە و شەوە و عووج و خدری زیندە و چەرخ و فەلەکی پیرەژنی مەکرباز و...هتد. ئیتر ئەو ئامرازانە بوونە هەوێنی لەدایکبوونی هەزاران حەکایەتی خورافی و ئەفسانە نەمرەکانی کوردی و تێکەڵ بە بەرنامەی ژیانی رۆژانەی بوون و نەزمێک لە دڵەڕاوکێ و تۆقاندنیشی خوڵقاند، بەتایبەتی ترس لەمردن و پاشەرۆژ و چرۆنەکردنی خەون و مەرامەکان و نەگەیشتن بە نەمری بەجارێک ئۆقرەی لەمرۆڤ هەڵگرت.

مادام خەون و حەزەکانی مرۆڤیش وەک پێویست نایەتەدی، بێشک ئەو بەرهەمە بەمیرات بەجێماوانەی لەگەڵ رۆژگاری خۆی دەباتە ئایندەیەکی هێشتا نەهاتوو، کە چارەنووسی نادیاری خۆیەتی لەگەڵ هێزی ناوەوە و دەرەوە، بەپێی ئەو بیرورایانە ئەفسانە بەندی دنیای خواوەندو خوڵقان و لێکدانەوەی نهێنییەکانی گەردوونە.

یەكێك لەو ئامرازە ترسناك و بەدیومانەی ترسی لەلای خەڵكی دەشتی هەولێر و دەوروبەری پەیدا كردووە (باڵە)یە، كە وەك ئەفسانەو راستی لەناو خەڵكەكە بوونی هەیەو حەكایەتخوانیش لەشەوانی بەرئاگردان باسی دەكات و بەجارێ ترس دەخاتە دڵ و دەروونی خەڵكەكە.

ئەو (باڵە) سەرابییەی لەناو كوردان وجودی هەیە، لەناو عارەبانیش بەناوی (عووج) هەیە و بەپێی رووداوەكانیش باسی دەكرێ.

لەم لێكۆڵینەوەدا بەپێویستی دەزانین تیشك بخەینە سەر ژیان و هەڵسوكەوت و كەسێتی (باڵە و عووج) لە دیدو بۆچوونی ئەفسانەیی هەردوو نەتەوەی كورد و عارەب لەگەڵ گێڕانەوەی رووداوی ئەو كەسانەی بەچاوی خۆیان (باڵە)یان دیتییە و چیان كردووەو چۆن بەسەر ترسی دڵ و دەروونی خۆیان زاڵبوونە.

### كەسێتی باڵە لەئەفسانەی كوردیدا:

باڵە واتە (باڵا) كە بوونەوەرێكە لەشێوەی مرۆڤێكی چاكەخواز و خەمخۆر بەدیار دەكەوێ، بەڵام بەژن درێژ و نەفرەجا و بەدشێوە و رەنگ سپییە، وەك سەرابێكی بەرزەڕۆ بۆ كەشكەڵانی فەلەك هەڵكشاوە، خەڵكی دەشتی هەولێر دەڵێن:

ئەگەر ژنێك منداڵی ببێ، لە (٤٠) رۆژەی هەوەڵی شەوانە نۆبەتی لێدەگرن، چونكە (شەوە و باڵە) هەردەمەكی بێن، دێن! بۆیێ خەڵك بۆ پێش گرتن و نەهاتنیان، قورئان و خەنجەر و شتی دیكە دەخەنە بن سەری مەلۆتكەی تازە لەدایكبوو و شەوارە دەگرن. هەروەها دەڵێن: باڵە لەسەر گۆڕستان و لەسەر گۆڕی پیاو چاكان دەبینرێ، كە سپی و باڵا بەرزەو سەری لەعاسمانەو پێی لەسەر عەردییە، بەڵام خێرخوازەو هەر كەسێ ببینێ بەناوی خۆی بانگی دەكات، ئەگەر كابرا نەترسێ و وەڵامی بداتەوە، لەوانەیە یارمەتی بدات، ئەگەر بشترسێ لەوانەیە شێت ببێ یان لەهۆش خۆی بچێ.

لە كەندێناوەی سەر بەدەشتی هەولێر، كەندێكی قووڵ و ترسناك هەیە لەنێوان گوندی (لهێبان و قووچ) بەكەندی باڵەی بەناوبانگە، گوایە هەر كەسێك لەم كەندە تێپەڕێ (باڵە) دێتە سەر رێگای، لەم كەندەش ئەگەر لەبەری لای گوندی بێ، باڵە دەنگ ناكات، بەڵام هەر پەڕییەوە ئەوبەری ئیتر باڵە پەیدا دەبێ.

من خۆشم لەنزیكەوە زۆر گوێم لە سەربردەی (باڵە) بووە، بەتایبەتی، كە لەنێوان سالانی ١٩٦١- ١٩٦٥ ماڵمان لەگوندی (لهێبان) بوو، لەگەڵ منداڵانی گوندیش لەدوورەوە (كەندێ باڵە)م دیوە، بەڵام نەموێراوە نزیكی بكەوم، چونكە لە باڵەی دەترسام، ئەگەرچی نەشمدیتبوو، بەڵام زۆر گوێم لەعەنتەرباتی ببوو. لەدەشتی هەولێر ئێستاش كەسانێكی زۆر باس لە بوونی (باڵە) دەكەن وەك گێڕانەوەیەكی راستەقینە شەوان لە دیوەخان و مەجلیساندا ترس و تۆقین دەخەنە دڵ و دەروونی گەورە و گچكان، بەتایبەتی منداڵە بەستەزمانەكان، دەگێڕنەوە گوایە كەسانێك بەچاوی خۆیان باڵەیان دیتییە و لەبەری هەڵاتوون، وەلێ كاریگەری بوونی لەوەش گەورەترە تا ئەو رادەیەی كەسایەتی (باڵە) تێكەڵ بەفۆلكلۆری دەشتی هەولێر بووە، پێشینان دەڵێن: "فڵانە كەس دایەوە كەندێ باڵەی"، ئەو پەندە بۆ ئەو كەسانە دەوترێ، كە زیانێكی زۆر گەورە بكەن یان ماوەیەكی زۆر بەبێ سەرو سۆراغ و هەواڵ بزربن.

### خەڵكی دەشتی هەولێر دەڵێن:

* باڵە پێی لەعەردییە و هەور گەیشتۆتە چۆكانی و لەهەور ئاو دەخواتەوە.

* باڵە لەچیای قەرەچووغ چۆك دەداو لەچیای سەفین ئاو دەخواتەوە.

* باڵە بەدەستێك ماسی گەورە لەناو دەریا دەردێنی و بە دەستەكەی دی دەیداتە بەر تیشكی رۆژ، سوری دەكاتەوە و ئینجا دەیخوات.

* هەموو بەزازەكانی دنیا قوماشەكانیان لەیەكتر دووری شەرواڵەكیان لۆ باڵەی دروست

كرد، بەڵام هێشتا نەگەیشتە چۆكی.

**باڵە و سەربردەی خەڵكی دەشتی هەولێر:**

لە پانتایی دنیای ئەفسانە و حەكایەتی خورافی كوردەواریدا چەندین دێەن و شتی سەرنجراكێش هەن، كە حەكایەتخوان زیرەكانە پەنایان بۆ دەبات و هاوسۆز و هاوئاهەنگیان دەكات لەگەڵ دەقی ئەفسانەو حەكایەتەكان وەك: دێوی رەش و دێوی سپی و دایكە دێو، بەكارهێنانی هێلكە و ئەنگوستیلە و داوە موو بەكاری سیحری لەگەڵ پەرینەوە لەئاوی زەرد و كەسك و شین و مۆر و رەش، یان بەكارهێنانی ژمارەكانی (سێ، حەوت، چل) كە هەریەكەو مانایەكی سیحراوی دەگەیەنێ، لەبەر ئەوەی (باڵە)ش رەنگی سپیە، بۆیە خێرخوازە، بەڵام كە لەهیكرا پەیدا دەبێ، مرۆڤ لێی دەترسێ و لەبەری رادەكات وەك چۆن (كاسپێر) لە فیلمی كارتۆنی منداڵان، خێرخوازە، بەڵام ئاژەڵان بە دیتنی رادەكەن.

ترسان لە (باڵە)ش پەیوەندی بە دنیادیتەكان و حەكایەتخوانەكانە، كە بوونە هەوێنی پەیداكردنی ترس و تۆقاندن لە دڵ و دەروونی خەڵكەكە بەدرێژایی سەردەم، بەتایبەتی چۆنیەتی گێرانەوەی بەسەرهاتەكان، كە لەواقیعدا دوورەو شتی خورافی و ئەفسانەیین، چونكە بوونی (شت) بەر لەهەموو شتێك پێویستی بە (باوەڕ)ی هەبوونە! ئەگەر باوەڕەكە پەیدا بوو، ئەوە شتەكەش لەمێشك و دڵی خاوەن باوەڕ دەبێ بەراستی و حەقیقەت. لە لێرەوار و هەڵدێر و كەندالەكانی كەندی قووچی، پیاو سەربەخۆ چۆكی شل دەبێ و ورەی دادەبەزێ و ترسێكی سامناك دەیگرێ، لەناكاو دەنگێك لەغەیبێ بانگت دەكات، مرۆڤ دێنێتە سەر ئەو باوەڕەی كە (دەنگی تواوە لە هەوادا هەیە)، رەنگە زرینگانەوەی لەناكاوی گوێی مرۆڤیش جۆرە ئاگادار كردنەوەیەكی غەیبی یان پێشبینی كردنی رووداوێك بێت چەند چركەیەك پێش رووداني.

(قالە شوانی گوندی بوو، مەڕەكانی لەكەندی باڵەی دەلەوەڕاند، لەهیكرا دەنگێ لەغەیبێ بەناوی خۆی بانگی كرد، مووچركی بەلەشدا هات، چۆكی شل بوو، تەزوویەك لەبنی پێی خرۆشا لەتەوقی سەری دەرچوو، مەڕەكانی ژمارد، دووانیان دیار نەبوون، زۆر ترسا، دیسان ژمارديیەوە، بوون بە سێ، هاواری كردو قیژاندی، گۆپاڵی دەستی فڕێ داو بە غاردان رووی لەگوندی كرد، پێیەكانی تێكئالان، چاوەكانی لە مۆڵەق مان، تارماییەكی سپی و درێژی دیت، وەك سەرابێكی بەرزەڕۆ بەرەو كەشكەڵانی فەلەك هەڵچوو بوو...).

هەرچەندە ئەم جۆرە رووداوانە لە رۆژگارێك قەوماون، كە ترس و تۆقین بەسەر باڵەوانەكاندا زاڵ بووەو ناچنە ئەقڵی مرۆڤی هۆشمەند و كارامە، تەنیا پەیوەندییان بە سایكۆلۆژیەتی مرۆڤەكانەوە هەیە، بەڵام وەك ئەفسانە و حەكایەتە خورافییەكانی كوردی ملمڵانێی مرۆڤ و دەورووبەری بەهونەرێكی بەرز و دانسقەوە دەخاتەڕوو.

(مام كەریم، لەگەڵ رۆژئاوا بوون، لەگوندی قووچ بەرەو گوندی لهێبان ملی رێگای گرتبوو، بڕنەوی لەدەست و خەنجەری دەبانیشی لەبەر پشتێن، هیچ ترسی نەبوو، لەكەندێ باڵەی نزیك بوودەوە، مانگە شەو بوو، زۆر دیقەتی دەوروبەری خۆی دەدا، هەستێكی لەخۆڕاگرت، ترسا، گوێی بەدەنگێكی غەیبی زرینگایەوە، لەهیكرا تەمێكی سپی باڵابەرز كەوتە بەر نیگای چاوانی، رایكێشا باقە نەجمەی بڕنۆی، تەقەیەكی لێكرد، نەجوولا، (فاتیحا و ئایەتول كورسی) خوێند بێ سوود بوو، لەهۆش خۆی چوو، كەچاوانی كردەوە بەیانی بوو...).

**باڵە ژن دێنێ**

حەكایەتخوان دەڵێ: لەبەر ئەوەی خەڵكەكە لە باڵە دەترسان و برادەرایەتیان نەدەكرد، بۆیە بەتەنیایی بێزار ببوو، جا هەڕەشەی لەخەڵكی ناوچەكە كرد ئەگەر بەزووترین كات ژنی بۆ نەهێنن، ئەوا دەتوانێ بەمیزكردن لافاوێك

پەیدا بکات و هەموو گوندەکان بەمرۆڤ و ئاژەڵ و کشتوکاڵەوە بخاتە ژێر ئاو.

پاش گەڕان و سووڕانێکی زۆر، ئافرەتێکیان لەولاتی (مازەندەرانێ) دیتەوە، کە بە(میز)ی ئەو ئافرەتە حەفت ئاشی ئاو دەگەڕان، ئیتر هەردوولا بەیەکتر رازی بوون و شەوی گواستنەوەش، عەیب نەبێ (هەرامەکەی) باڵەیان لەسەر پشتی حەڤدە کەر بارکرد، لەگەڵ پاڵدانی هەرامەکە کەری یەکەمیش لەگەڵ چووە ژورێ، ئیتر کە ئیشی خێرێ خلاس بوو، کەرەکانیان بۆ خاوەنەکان بردەوە، تەنیا کەری یەکەمین نەبێ، کە هی پیرەژنێکی منجرو چەقاوەسوو بوو، هەرچەند ویستیان بەپارەو مەڕو بزن و گەنم و جۆ رازی بکەن، بەلام بێ سوود بوو هەر کەرەکەی خۆی دەویستەوە، بۆیە سێ پیاو دەستیان دا فانۆس و چوونە ناو هەرامەکەی ژنی باڵەی، حەفت شەو و حەفت رۆژ گەڕان، بەلام کەرەکەیان نەدیتەوە.

### عووجی کوڕی عەنەق

لە ئەفسانەی عارەبی باسی (عووجی بنی عەلەق) دەکرێ، کە مرۆڤێکی ئەفسانەییەو یەکجار بەژن و بالای بڵند و حەپ و حۆلە و کەسانی بیاباننشین دیتویانە، کە هاوشێوەی باڵەی کوردەوارییە، بەلام باڵە چاکەخوازەو عووجی عارەب شەڕخوازە، بۆیە لەکتێبی (تأريخ الطبري ولسان العرب) بەم جۆرە باسی عووج کراوە:

(عووج لەماڵی حەزرەتی ئادەم لەدایکبووە، دایکی ژنێکی ناشیرین و دەم و چاو بەڵەپکە بووە، یەکەم ئافرەتی سەر رووی زەمینە، کە ئیشی خراپی کردووە، ئەم عووجە بیژییەی بووە، عووج هەشت سەد باڵ درێژ بوو، لەکاتی لافاوەکەی حەزرەتی (نوح)، کە ئاو پازدە باڵ لەهەموو چیاکانی دنیا بەرزتر ببوو، کەچی هێشتا لەچۆکی عووج تێنەپەڕی بوو، ئەوەندەش نەمابوو دەست لەکەشتییەکەی حەزرەتی (نوح گیر بکات و وەری بگێڕێ). هەروەها لەئەفسانەیەکی دیکە باسی شەڕی نێوان (حەزرەتی موسا) و عووج دەکا، گوایە عووج لەم شەڕە بەدەستی حەزرەتی (موسا) کوژراوەو کردویانەتە (پرد) لەسەر رووباری (نیل) و موساو ئیمانداران لەکاتی رۆیشتنیان لەمیسرەوە بۆ ئەریحای فەلەستین بەسەر پشتی (عووج) لە (نیل) دەپەڕینەوە.

ئەفسانەی ئەم عووجە لەکۆمەڵگای کوردەوارییشەوە لەرێگای ئایین بڵاوبۆتەوە، بەتایبەتی لەدەڤەری بادینان و خەڵکی (زاخۆ) زۆر باوەڕیان بە بوونی (عووج) هەیە.

لەم بارەیەوە مەولود ئیبراهیم حەسەن لە لاپەڕە (٢٦)ی (قەدەغە شکێنی) دەڵێ: (عوێج یان "عوێجێ لیهڤێ" چیرۆکێت وی زۆر و بلاڤن ل دەڤەرا زاخۆ، ئەڤ عویجە دناڤ چیرۆکادە بڤێ رەنگێ تێتە بەرچاڤ، زەلامەکی هندی بێژی هند مەزنەو ب گەودەیە (ب- حەجمە) سەرێ وی دەگەهیتە کوپیتکا چیا، هندی بخۆت تێر نابت، چو جلک رویساتی یا لەشێ وی بەرزە ناکن، لێ د سەرڤێ چەندێ را ئەڤ عویجە بێ دویر بەلایە و نەخۆشی یێ بو کەسی چێ ناکت وێی ئامادەیە کەسپ و کاری بو خەلکی بکەت بەرامبەر ب دەستڤەئینانا شیڤا شەڤێ).

سەرچاوەکان:

١- مەولود ئیبراهیم حەسەن- قەدەغەشکێنی- ساڵی ٢٠٠٠.
٢- جەلال سنجاوی- باڵەی کەندێ قووچی- رامان ژمارە (٢٥).
٣- د. مصطفى جواد- من الاساطير العربية والخرافات- ١٩٧٧.
٤- هـ. فرانكفورت- الانسان في مغامراته الفكرية الاولى.
٥- ليڤي شتراوس- الاسطورة والمعنى، ت. جبرا ابراهيم جبرا.

ئەم بابەتە لە گۆڤاری (ئاسۆی فۆلکلۆر)، ژمارە (١٣) ساڵی (٢٠٠٥) بلاوبۆتەوە.

# سەفەری بە ناوەخت

## محەمەد کەریم نانەوا

لە دێرزەمانەوە پێشینان دەگێڕنەوە دەڵێن: لە گوندێک لەو گوندانەی دەوروبەری شاری هەولێری دێرین، کابرایەک کیژەکی هەبوو، خەڵکەکی زۆر دەچوونە داخوازی، بەڵام کیژەکە مەرجێکی هەبوو. دەیگوت: هەر کەسێک مەرجەکەم قبوول بکات شووی پێدەکەم. مەرجەکەش ئەوە بوو، دەیگۆت: من (خووی سەفەر)م هەیە. لەوانەیە ساڵی جارێک، مانگێ جارێک، شەو، نیوە شەو، کات و ساتی بۆ نییە، هەروەختێکی خووەکە بمگرێ، ئەگەر مردوومان لەبەردەستدابێ، چارە نییە من دەبێ بڕۆم. نابێ رێم لێبگرن، کە خەڵکەکە گوێیان لەو مەرجە دەبوو دەکشانەوە، رۆژێ لە رۆژان کوڕە جحێڵێکی دنیادیدە هاتە داخوازی کیژە، مەرجی کیژەی قبووڵ کرد، بەڵام گوتی: منیش شەرتێکم هەیە. ئەویش ئەوەیە، من (خوو)دارم، جاری وا هەیە نیوەشەوان دەمگرێ، جاری وایە دەمە و ساتی چێشتەنگاوان دەمگرێ، جاری وایە ساڵی جارێک دەمگرێ، کات و ساتی بۆ نییە کەی دەمگرێ، بەڵام کە دەمگرێ تەواو شێت و هار دەبم، کیژە بە شەرتی کوڕە رازی بوو، هەناردیان مەلا هات، لێکی مارەکردن، دوای سێ شەو و سێ رۆژ شایی و هەڵپەرکێ بووکیان گواستەوە، قەدەر عەیامەکی دوور و درێژ، نە ژنە خووی دەگرت تا بڕوات، نە پیاوە خووی دەگرت، سەریان پێکەوەنابوو دەیانگوزەراند، هەتا رۆژێکیان لە کتوپڕ خزم و کەسوکاری پیاوەکە بە سەردان هاتن بۆ ماڵی پیاوەکە، گوایە تازە ماڵە هاتوونە سەردانی، پیاوەکە لە خۆشیان چوو گیسکێکی هێنا کوشتیانەوە، کەرستەی چێشت لێنانیان ئامادەکرد، هەرمابوو دەستبکەن بە چێشتلێنان، ئافرەتەکە چوو خۆی گۆڕی جلی جوان و نایاب و رەنگاورەنگی لەبەرکرد، لەسەر یەک پل خۆی رازاندەوە، بوخچەی بەدەستەوە گرت، خەریکبوو بڕوا، پیاوەکە لێی پرسی: خێرە ئافرەت؟ لە وەڵامدا پێی گوت: پیاوێژگە، من لەکاتی خۆی پێمگوتی: هەروەختێکی خووی سەفەر بمگرێ من سەفەری خۆم دەکەم، تۆ پێی رازیبووی، ئێستاش خووی سەفەر گرتمێتی هەردەبێ سەفەری خۆم بکەم. وابوو یان نا.؟! ئەوەندەی پیاوەکە لەبەری پاڕاوە، کچێ، ئافرەت، داکت چا، بابت چاک، ئەو هەموو میوانە، ئەو هەموو کەرستەیە کێ بە ناوی دێنێ، ئاخر لە ساڵان لە مانگان ئەوڕۆ خزم و کەسوکار روویان تێکردووم، ئەتووش ئیلڵا و بیلڵا ئەوڕۆ دەچیە سەفەرێ، شەرمەزارم دەکەی، نەخێر، تەق تەق ترۆزی خۆشە، ژنە نەهاتە رایێ، پیاوەکە گوتی: قەیدی ناکە مادام هەر دەڕۆی. راوەستە بەدەست بەتاڵی مەڕۆ، چوو بەرچیغەکی لەبن کوندەرانی دەرکێشا، هاتەوە، چەشنی شێت دوو سێ جاران گوڕاندی، چاوی خۆی خێل و خوار کرد، وەریگەڕایێ بە خوترمان، کێندەرت نایەشێ، نەخوترمەکە و نەدوان داپەلۆسی، ژنە هاواری کرد کوڕە پیاوێژگە، راوەستە ئەوە لۆ وادەکەی، شێت بووی؟ چییە؟ پیاوەکە لە وەڵامدا گوتی: نەخێر شێت نەبوویم، بەڵام (خوو)دکە گرتمێتی بەدەستە خۆم نییە، ژنە حاڵی بوو، ما لەبەری بپاڕێتەوە. پێی گوت: ئەمن کردم تۆ نەیکەی، دەستم دامێنت، لێرە بەدوا نەسەفەری من، نەخووی تۆ، ئەوجا پیاوەکە وازی لێهێنا. خەڵکی ئێستاش دەگێڕنەوە دەڵێن: ئەو ژن و مێردە هەتا مردن دەنگیان لێوەنەهات.

* ئەم بابەت لە گۆڤاری (ئاسۆی فۆلکلۆر) ژمارە (٢٥)ی ساڵی ٢٠٠٧ وەرگیراوە.



# کولتووری خەڵکی هەولێر

## (توێژینەوەیەکی سوسیۆئەنترۆپۆلۆژییە)

**ستار باقی کریم**

بێگومان، مرۆڤ ئەگەر نەتوانێ لەبارەی خۆی و کۆمەڵگەکەی بەگشتی شت بزانێ و زیاتر لەمەعریفەی دائمی و ناجێگیری خۆی بڕوانێ و بەکاری نەهێنێ بۆ باشتر ڕێکخستنی ژیانی خۆی و کۆمەڵگەکەی، ئەوا ئەم مەعریفەیە، جا هەڕەمەکی یا زانستی بێت، لە ناو دەچێ. لێرەدا دەشێ بپرسین، ئایا لەو کاتە پێویستمان بەوە نییە کە سەراسیمەی مەعریفەیەکی باشترین لەوەی تێیدا دەژین؟ بەدڵنیاییەوە، بۆ نا. زۆرجار زانا کۆمەڵایەتییەکان دەڵێن کە بارودۆخی لێکۆڵینەودیەکی زانستی بریتییە لە ئامادەنەبوونی هەر ئامانجێکی خود-بەرژەوەندیخواز و پێشتر وێناکراو. بێگومان ئەمەش ئەرکی توێژەر گرانتر دەکات، وەک ئەوەی نەکارێ بەهیچ لایەک بیشکێنێتەوە وبابەتییەت پەیڕەو بکات، لێرەوە، لە خودەوە دەبێت هەنگاو هەڵبڕین بەرەو دنیایەکی گشتگر، لەڕێگەی گومان و پرسیارەکانی خۆی. هەروەها دەبێت هەوڵ بدرێت بۆ لێکۆڵینەوە لەگەشەسەندنی ئاکاری مرۆڤایەتی لەم شارە خۆڵ بەسەر داپرژاوە. لەمەش زیاتر پێویست دەکات کەکاریگەری پێشێلکردنی پێودانگە بنەڕەتییە ئاکارییەکان لەسەر تاک و لەسەر (کولتوور)یش بشکێندرێت؟ چونکە گشت مرۆڤێک یا کۆمەڵگەیەک لەمیانەی شێوازی ژیانییەوە گوزارشت لەچەندێتی و چۆنێتی کولتوور و ئاستەکەی دەکات. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە سروشتی سیستمی دەوڵەت و شێوازی بەدیهێنانی بەرادەیەکی دیار و بەرچاو کارلێکراو دەبن بە

چەندێتی و چۆنیەتی ئاستی کولتووری باوی نێو کۆمەڵگە.

ئەمە سەرەڕای کەسایەتی خودی مرۆڤەکانی کۆمەڵگە خۆیان کە هەڵهێنجراوی ئەو کولتووردن کە خۆیان تێیدا دەژین. واتە کولتوور، پرۆسەی بەرهەمهاتووی نێوان جەدوەلیەتی مرۆڤ(بکەر) و واقیعە کۆمەڵایەتییەکەیەتی. یەکێک لەزانایانی کۆمەڵناسی دەڵێ: "بڕوانە ئەو کەسانەی کە کۆمەڵگە ڕێزیان لێدەگرێت، ئەوسا دەزانی ئاراستەی شارستانییەت یاکولتووری ئەم کۆمەڵگەیە بەرەو کوێ و چارەنووسیان چییە"[1].

لێرەشەوە دێمە سەر قسەکردن لەسەر کۆمەڵگە یا خەڵکێکی یا تەنانەت عەینەیەکی نیمچە داخراوی کۆمەڵگەی کوردەواری، وەکو (هەولێر) کە ئەم توێژینەوەیە لەخۆیدا کارێکی ئاسان نییە.

لەگەڵ باوەڕی تەواوم، بەبوونی فاکتەرێکی وەکو کولتوور لە شکەست یا سستی و خاوی کەسایەتی مرۆڤەکانی ئەم شارە، بەرامبەر هەر کەسێکی تری شارێکی تر؟ چونکە کۆمەڵگە و کولتوور کەسێتی پەیوەندییەکی وایان لەگەڵ یەکتردا هەیە، کەوادێتە بەرچاو توێژەرەکان تووشی دوودڵی و هەڵە بکات لەو کاتەی هەوڵ دەدەن لەیەکتریان جیا بکەنەوە یاخود بەجیا شرۆڤەیان بکەن. هەر لەبەر ئەوەشە "کولتوور چەند ئەرکێکی تایبەتی هەیە، کە بە ئەخلاقیاتی مرۆڤ ناوبراون. کولتوور ئەوە دیاردەکات کە پێویستە خێزان چ پێکهاتەیەکی هەبێت، کولتوور هەندێ دیسپلین بەدی دەهێنێ لە پێناو بەکۆمەڵایەتی کردن و چاودێری کردنی منداڵان، پیاوێک دەتوانێ چەند ژن بهێنێت و ئایا پەیوەندی پێش هاوسەرگرتن قۆناغێکە بۆ خۆ ئامادەکردن بۆ پێکهێنانی خێزانی، یاخود کردەیەکی دژ بە ئاکار دادەنرێ"،[2] لەگەڵ ئەوەی من ڕێگە بەخۆم دەدەم بەشێوەیەکی جیاوازتر باسی کولتوور بکەم، لەچاو شێوە تەقلیدییە باوەکەی، لەهەمان کاتیش دەبێ ئەوە بڵێم کەتائێستا گیر و گاز و مشتومڕی زۆر لەئارادایە لەنێوان هەردوو تێرمی (کولتوور و شارستانییەت)، بەمەبەستی ساغکردنەوە و لەیەکتر جیاکردنەوەیان(تێرمی کولتوور-culture) لەلایەنی کۆمەڵناسی و زانستە پەیوەندیدارەکان پێیەوە گرنگییەکی گەورەی هەیە، زۆر بەداخەوە هەندێ نووسەری عەرەب دەبینین کە لە پاچڤەکردنی ئەم تێرمە بۆ زمانی عەرەبی لەیەک جیاوازن، هەندێ بۆ (کولتوور) و هەندێکی تر بۆ (شارستانییەت)یان پاچڤە کردووە. منیش بەلای پاچڤەکردنی بۆ (شارستانییەت) ناچم، هۆیەکەشی بەلای من لەبەرئەوەیە کە لەفزی (شارستانییەت) لەکۆندا لەزمانی عەرەبی بۆ واتای (مەدەنییەت) بەکاردەهات، تەنانەت (ئیبنی خەلدون)یش لەسەر دابەشکردنی خەڵک بۆ دوو فیئەی دژ بەیەکی (شارنشین و گوندنشین) ڕاهاتوون.

لەبەرئەوە من دەمەوێ پارێزگاری لەم تێرمە بەمانا کۆنەکەی (شارستانییەت) بکەم کە لەلای من واتای (مەدەنییەت) دەدات، بەڵام (ڕۆشنبیری) کە زۆر لە نووسەران لە میسر و وڵاتانی تر بەکاری دەهێنن، بەواتای(culture)ە کە لێرەدا من لایەنگری وان دەبم، ئەگەرچی ئەم تێرمەش لەم لایەنەبێ خەوش نییە،



بەکارهێنانیشی بە بەربلاوی بەواتای ئەبستمۆلۆژیا و پێگەیاندنی زانستی و خۆ ئامادەکردن دێ"[٣] لەگەڵ بوونی ئەم تەم و مژە لەنێوەندی بەکارهێنان و تایبەتمەندانی ئەم بوارە، بەڵام دەشێ تێگەیشتنێک پێک بهێنین بۆ قوولکردنەوەی واتای ئەم تێرمە لەلایەنی بەکارهێنانی بەشێوەیەکی بابەتی.

چونکە دەشتوانین بۆ مەبەستی لەیەکتر جیاکردنەوە یا دانانی ئاستێک بۆ ئەم مشتومڕ و گیروگازەی نێوان ئەم دوو تێرمەی لەموبەر باس کرا، واتای (کولتووری کۆمەڵایەتی) بەمانای (کولتوور) بەگشتی بەکاربهێنین.

بەر لە هەموو شتێک، واتایەک هەیە کە تێیدا کولتوور کەم تا زۆر ئاوەڵ واتای (شارستانییەت)ە، و لە دارشتنێکی کۆنتر و توندڕەوانە و هاودژیەکدا پێچەوانەی (بەربەریەت)ە. ئەمە ئەو واتایەیە کە لە ئینگلیزی کارایە، لە ئاوەڵناوی (culture)دا بە (رۆشنبیر یا ئەدیب) بەکاردێ، زیاتر لەمیش هێردەر دەڵێ: "هیچ وشەیەک لەوشەی کولتوور دوردۆنگتر نییە و هیچ شتێکیش لە پیادەکردنی بەسەر هەموو نەتەوە و زەمەنەکاندا چەواشەکەرتر نییە"[٤].

لێرەوە ئەو راستییەمان بۆ ئاشکرا دەبێ کە (هێردەر) پێی وایە کولتوور لەگەڵ پێکهاتە ئاڵۆزەکەشی ناشێ بەشێوەیەکی سەرەکی پشت بە زمان نەبەستێ، بە واتای سەیرکردنی وەکو پرۆسەیەکی کۆمەڵایەتی ناجێگیر و بەردەوام، بۆ دەرخستنی رووی مەعریفەیەکی کۆمەڵایەتی، چونکە دەرکەوتووە کە بوونی وشە و گوزارشتی گونجاو یا تەنانەت نەگونجاویش کاریگەری لەسەر یادەوەری و ئیدراکی تاکەکان بەگشتی هەیە.

لەمیانەی لێکدانەوەیەکی تر کە بۆ کولتوور (culture) کراوە، ئەو واتای "کشتوکاڵ و رواندن دەدات، لەزمانی عەرەبی و ئەوانی تریش، ئەم تێرمە واتای هەموو ئەم شتانە دەدات کە لەرێگەی ئەبستمۆلۆژیای تیۆری و پراکتیکی، لەرێگەی هزرین و هەڵوێستی جیای رێگەکانی ژیان دەستی دەکەوێت. کۆمەڵناسەکانیش پێیان وایە (کولتوور) هەموو شتە پەیوەندیدارەکانە بە تاک و کۆمەڵگە، لە لایەنی عەقیدەتی و هزری و ئاکاری و کۆمەڵایەتی"یەوە[٥].

من کاتێ قسە لەسەر خەڵکی (هەولێر) لەلایەنی (کولتوور)ەوە دەکەم، ناشێ لە کۆمەڵگەی کوردەواری بەگشتی بەدووری بگرم، بەڵام (هەولێر) عەینەیەکی ئەم کۆمەڵگەیەیە، چونکە هەولێر و خەڵکەکەی پێکهێنێکی سەرنجڕاکێشی پێکهاتەی ئەم کۆمەڵگەیەن. بۆیەش خودان کولتوورێکی ئاڵۆز و فرەچەشنن، سەرەرای ئەوەی بەواتا گشتگرد کۆمەڵایەتییەکەی پڕ سەرامەت نین. چونکە ئەم کولتوورە ئەگەر هیچ نەبێ، دەبووایە رێگە نیشاندەر بێت بۆ فۆرمەلەکردنی رەگەزە سەرەکییەکانی میتۆدێکی نوێی بیکردنەوە، بۆ خەڵکی ئەم شارە خۆیان، بێگومان دیارە کە ئەم خەڵکە لەم لایەنە بێ بەشن.

"کولتوور تەنیا کۆمەڵێک کەلەپوور و داب و نەریت و شێوە جیاوازەکانی ژیان نییە، بەڵکو سیستمێکی رێکخراوە لە رەفتارەکان یان بەشێوەیەکی گشتی ژیانی گروپێک یان چەند گروپێکە لەخەڵک. رەگەزەکانی کولتوور و داب و نەریت و بەها و بیروباوەرە هاوبەشەکان، مرۆڤەکان بەیەکەوە دەبەستێتەوە و ناسنامەی کۆمەڵایەتییان پێدەدات"[٦] ئەگەر بەشێوەی (کولتووری کۆمەڵایەتی) یا تەنانەت لایەنە ئایدیالییەکەی وەربگرین، ئەوا ئەم کاتە ئەم کولتوورە وەها دەردەکەوێ کە لەخۆیدا پێکهاتەیەکی لێکدراوە، نەوەکو کۆمەڵێک بەشی لەیەک دابڕاو، چونکە ئەمەیان لەخۆیدا خودان خەسڵەتێکی جیایە لەگەڵ تایبەتمەندییەکانی پێکهاتەی هەر بەشێک لەناویدا، لەکۆتاییدا بەگوێرەی ئەنسرۆپۆلۆژیکارەکان دەبێ بنووسین کە کولتوور"هەموو ئەو داب و نەریت و یاسا و رەمز و تەمسیلانەی گروپێک دەگرێتەوە"[٧] کولتوور بەشێوەیەکی تایبەتی پەیوەندی بەهەڵس و کەوتی مرۆڤایەتی بەگشتی و مرۆڤەکانی کۆمەڵگەیەک بەتایبەتی هەیە، چونکە زۆری لێکۆڵینەوەی ئەنسرۆپۆلۆژی پەیوەندی بەخەسڵەتی سیستماتیکییەوە هەیە، ئەمانەش وەک دیسپلینێکی زانستی

ئەنسرۆپۆلۆژیا قسەی لێوە دەکرێت. بێگومان لەوکاتەی قسە لەسەر (هەولێر) دەکەین ئەوا وەک عەینەیەک وایە، بەڵام عەینەیەکی پڕ زۆر سەیروسەمەرە، ئەمەشیان عەینەیەکی تایبەتە لەنێو کۆمەڵگەی کوردەواری. جیا لەهەموو لایەنێکی فۆرمەلەکراوی کەسایەتی و دەروونی، تەنانەت جل و بەرگی تایبەتیش. ئەمەش لەگەڵ بوونی چەندان بەرژەوەندی دژبەیەک کەلەناو کولتووری کۆمەڵگەدا خۆیان دەردەخەن.

کێشەی خەڵکی (هەولێر) ناکرێ تەنها لەیەک رەهەندەوە بخوێنرێتەوە، لەلایەنی ململانێی (دیار) ئەوەندە (مۆن) لەشتەکان دەڕوانێ تەنانەت زات ناکات، سەیرکردنی بەرامبەرەکەشی بکات. بەمەش بەرەنگاری و دەمارگیری کە خەسڵەتێکی زۆربەی کولتووری کۆمەڵگە رۆژهەڵاتییەکانە، لەم شارە (هەولێر) بەدی ناکرێ.

لەگەڵ ئەوەی ئەگەر واش دابنێین کولتووری کورد بەگشتی و هەولێر بەتایبەت سیستماتیزەکراوە بەم کولتووری ئایدیۆلۆژیای ئیسلامە، کە بە پرۆگرامبوونی سەپاندنی زۆرینەیە بەسەر تاکدا. لێرەشدا کورد رۆڵی (کەمینە)یەکی بەرامبەر زۆرینەیەکی کولتووری عەرەبی ئیسلامی پێدراوە و ئەویش وەک ترسێکی شاراوە لەناخی هەموو کەسێک بەرامبەر غەیب ملکەچی ئەو ئایدیۆلۆژیا خۆسەپێنەرە بەرۆحانی کراوە بووە. ئەمە لەو سەردەمەی کەدەبووایە



پرسیاری شوناسنامە لەنێو (کورد) بکرێ بەرامبەر (ئەوی تر)ی عەرەب، چونکە (ئەوی تر لەسادەترین مانادا واتە جیاکردنەوەی دەرەوە لەخۆمان و لە هەمان کاتدا گەورەکردنی خۆمان لەسەر حیسابی بچووکردنەوەی ئەوانی تر، بەئەوی تر کردن، واتە بوارنەدان بەئەوانی تر تاوەک ئێمە نەبن و لەئاست و پێگەی ئێمەدا نەبن، ئەمەش پەیوەندییەکی پتەوی هەیە بە مەسەلەی دروستکردنی (ناسنامە)وە، هەموو تاکێک یا گروپێک یاخود کۆمەڵگەیەک ناسنامەی خۆیان لەرێگەی پەراوێزکردنی ئەوانی ترەوە بەدەست دەهێنن: من کێم؟[٨] ئەمە دەبووایە پرسیاری هەموو کوردێک بەرامبەر ئەوی ترێکی عەرەب بووایە. ئەوانەی ئایدیۆلۆژیای ئایینییان کردە کڵاوێک و خستیانە سەری کورد، لەو کاتە من مەبەستم لە (هەولێر) و خەڵکەکەیەتی ئەوانەی لەگەڵ زۆرینەی ڕێژەیان لەنێو کولتوورێکی پڕ سەرامەتی عەقیدی و کۆمەڵایەتی شارەکەیان هەستی خۆبەکەم دیتنیش لە کولتوورەکەیان، کولتووری (چەپاندن، شەرم، میانڕەوی و...هتد) پرسیاری ناسنامەی ناکەن بەرامبەر هەموو ئەوی ترێک، واتە هەستی هەست کردن بە خۆمانمان لەرێگەی ئەوی تر نییە. لەو دۆزینەوانەی سۆسیۆلۆژی نوێ دانیان پێدادەنێت، ئەوەیە کە (کەمینەکان) نەک زۆرینەکان، بەگشتی پرسیاری ناسنامە دەخەنەڕوو. ئاساییە کە زۆرکات مرۆڤ نەتوانێ بوونی هەست، جا هەست بەهەر شتێک بێت، دەربڕێ یا تێرمێک بۆ پێشهاتەکان دابنابێت. وەک دەروونی گشت (کورد)، (هەولێر)یەکان بەردەوام گلەیی ئامێزن بێ ئەوەی هەست بەوە بکەن کە خۆیان (کەم

دەبینین) و خۆیان بچووک دەکەنەوە. ناشێ ئەوە لەم ئایدیۆلۆژیا (ئایین)ەوە بەدەربگرین، کە بەردەوام خەسڵەت و کایەیەکی بچووکتری داوەتە خەڵکانی بەدەر لە (عەرەب) یا بە پلە (دوو)ی سەیر کردوون. کەسایەتی مرۆڤانی ئەم شارە لەم کولتووره سەرچاوەی گرتووە، بۆیەش هەستی هەستکردن یا پرسیارکردن لە (من کێم؟!) یا (ناسنامە)ی لە ناخیاندا کوشتووە. چونکە کەمینەکان بەوە ناسراون کە نیگەرانن و پرسیاری ناسنامەش بۆ ئەوەیە کە پرسیارێکی چەسپاندنە، چونکە ناسنامە لە ئەنجامدا شتێکی ئەوتۆ نیە، تەنیا ئەوەنەبێت داواکردنێکی (ئینتیما) و لەنگەرگرتنی تاکەکەسەکانە لەبەندەری تێکچڕژان و بەردەوامی و سەقامگیریدا، ئەمە بەگوێرەی پێناسی ئینسکلۆپیدیای فەرەنسی لەمەڕ سایکۆلۆژیای سیاسی. جا ئەو کەمینانەی کە سۆسیۆلۆژیای نوێ قسەی لەبارەیانەوە هەیە تەنیا کەمینە ئایینی یا ئەتنیکییە ئاساییەکان نین، ڕەنگە لەبنەڕەتیشەوە کەمایەتی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیرییەکانیش بن. یا بەواتایەکی تر کۆمەڵە هەڵبژاردنە دینامیکییەکان بەجیاکردنەوەیان لەوانی تر زۆرینەی نەتەوەیی یا ئەو جەماوەرەی کە بە گشتی زۆرینەیەکی کپ و بێ دەنگ و مات پێکدێنێت وەکو (کولتووری بێ دەنگی) لەلایەن خەڵکی (هەولێر)ەوە. ئەوە لەوکاتەی لەلایەن ئەم خەڵکە گومان و پرسیار لەحەقیقەت دەشێ لەسەرەتایەوە بێت، کە ئەمەش بۆ ڕەواندنەوەی گومان و گەیاندنی حەقیقەت سەرەتاییترین توخمی پێگەیاندنە لەهەر کۆمەڵگەیەک، واتە لەنەهاتنەدی و نەدیتنی خەون ماونەتەوە. ئەمەش پەیوەندی بەشکستی خود لەلایەنی پەیوەندی بەکولتوورەوە هەیە کە بۆیان بنیاتراوە، واتە لەسەر ڕابردوو وێناو بیناکردنی داهاتوو دەکێشێ بەپشت بەستن بەو مەرجەعیەتە تەقلیدییەی لەنێو کولتوور توکمە و بەندکراوە و، بواری وەئاگاهاتنەوە لەنێو دەرەوەی کولتوور بەکوفر یا لەڕێ لادەر و لاسار ناودەبرێ. ئالێرەوە هەستکردن بەکەمی لەلایەن خەڵکی (هەولێر) بەکەنارخستنی ئەم شارەی لەڕووی ئیداری و سیاسی و ژیارییەوە بەگشتی دروستکردووە. ئەگەرچی هەولێرییەکان خۆیان بەخودان مێژوویەکی پڕشنگدار دەزانن، کە لەڕاستیدا مێژوویەکی ئەرشیفکراوی نێو مۆزەخانەکانی قەلاّ و منارە و...هتد و بەس، نەوەکو مێژوویەک بۆ تێگەیشتن و کارکردن لەسەر نوێکردنەوەی بێت. ئەمەش مێژووی خەڵکێکی پاسیڤکراوە، کەوایکردووە لەم نێوەدا بێتە کەسی دووەم، (کرێکار لای وەستا)یەک کە چۆنی بوێت ئاوا بۆ خۆی کارمان پێدەکات.

کولتووری کورد، لەزۆرینەیەکی ئایدیالی داتاشراو پێک هاتووە، خەڵکەکەی (هەولێر)یش وەکو کۆمەڵە خەڵکێکی مێژوو ئەرشیف کراو، کار لەنێو ئەرشیف هێشتنەوەو دانەتاشینی نوێتر لەچاو ئێستا دەکەن. ئەمەش وەک میکانیزمێک بۆ خۆپاراستنیان، بۆیەش پیرۆزی خۆیان لەوەدا دەبینن. یەکێک لەخەسڵەتەکانی هەر (پیرۆز)یەک، کۆمەڵگە، خەڵک، شار، قسەنەکردن و ڕەخنەنەگرتنە لەهەر پێکهاتەیەک. ئەمە جگە لەو شکستەی دەم مێژووەی کورد کە لەساتەوەختی ونبوونی پەیوەندی ڕۆحیانەی نێوان کورد و خودا دەست پێدەکات و ئەویش لەساتی خاپوورکردنی پەرستگا زەردەشتی و قودسیەتی زەردەشتییەکان. ئەمانە گورزی کەمەرشکێن بوون لەچەقی داینەمۆی بیرکردنەوەی کورد.

کولتووری خەڵکی (هەولێر)یش گەر لە ئەرشیف دەری بکەین و بیخوێنینەوە، ئەوا هەستی (بێدەنگی و شەرم و ترس و...هتد) لەهەموو ئەوان بەدی دەکەین. چونکە خەسڵەتی ئەم کۆمەڵگەیە بەردەوام خەسڵەتێکی کۆمەڵگە دواکەوتووەکانەو لەم (هەولێر)ە هەست و نەست تووشی سڕبوون بوون. یەکێک لەهۆکارەکانی درێژەدان بەهەر ململانێیەکیش کە لە (کولتووری هەولێر) لەنێو خۆی خەڵکی ئەم شارە لەبەر دەستبەرداربوونی لە پێشینەیانە بۆ ئەم پرۆسەیە، کە دەبوایە ئەگەر هیچ نەبێ لەگەڵ دەروون و کەسایەتی خۆیان بەشێوەی میانڕەو لۆژیکانە پیادەیان بکردایە. بوونی نییە. ئەوە لاوازبوونی هەستە بەرامبەر درکاندنی بەنەست، بۆیە ئاستی زاڵ بوونی

نەست زۆر زیاتر هەستی پێ دەکرێ، بەرامبەر هەست.

جا نابێ رۆڵی نەست لەمێشک لەیاد بکەین، چونکە نەست لەخۆیدا دەبێتە کاراو لۆژیکانە کار دەکات بۆئەوەی جێگەی میکانیزمی دینامیکی هەست بگرێتەوە. لەم شارەش نەوەکو سرپوونی هەست و نەست بەم شێوە ئاساییە بێت، بەڵکو سەراپای خەڵک کەوتوونەتە ژێر کاریگەری (تنویمی خۆبەکەمزانی و چارەسەری قەدەری)، ئالێرەش نەست و منی باڵا بەردەوام (من و نەست)ی هەولێری دەخەنە ژێر سزایەکی قورس، کەوادەکات ئێمەی (هەولێر)ی هەست بەشەرمەزاری و گوناهبار و خۆ بەکەم زانی بکەین. (هەولێر)یەکان خۆیان بەخاوەنی دوێنێ دەزانن کە هیچی لەبارەوە تێناگەن جگە لە بینینی چەند پاشماوەیەکی کولتووری مادی کە خۆی لە (قەلا و منارە و...هتد) دەبینێتەوە بۆیە لە ئەمرۆ تێناگەن و بەیانییان داوەتە دەست قەدەر. ئەمەش بۆتە (کولتوور) و خۆی لەشێوەی رۆشنبیری کۆمەلایەتی نمایش دەکات، کە ئەویش بریتییە لە و "کۆمەڵە ترادسیۆن و رێسا و هزرانەی کاروباری ژیان دەگرێتەوە وەکو (ناسین، رەوشت، یاساو هونەر و پیشە و زمان و ئەفسانە و هی تر".[9] ئەلێرەوە کەسایەتی مرۆڤەکان پێک دەهێنرێت، چونکە کەسایەتی وێنەیەکی بچوککراوەیی کولتووری کۆمەلایەتی پێک دێنێ. ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە خودی کۆمەڵگەی کوردەواری بەگشتی و (هەولێر) بەتایبەتی نوێنەرایەتی کۆمەڵگەیەکی نیمچە سەربەخۆی داخراوی کوردەواری دەکات، کە دووسیستمی تەواوکەری یەکتر (خێڵ و ئایین) دەیبەن بەرێوە، لەبەر ئەوە هەستی بوون بەکۆمەڵە یا مرۆڤیان زۆر کەم بەخۆوە بینیوە.

کەسێتی تاکەکەسیش، لەنێو کۆمەڵدا دەبنە نوێنەری کەسێتی ئەو شارستانییەتی تێیدا دەژی یا ئەو کولتوورەی دایدەتاشێ، وەک چۆن شارستانێک بەهۆی کەسێتی تاک لەنێو هەر کۆمەڵگەیەکی بەشەریدا وێنەیەکی بچووک یا جەستەیەکی بچووک نوێنەرایەتی دەکا بۆ هەموو کۆمەڵگە خۆی یا بۆ ئەو سیستمەی داونلۆدی کردوون بۆ پێکهێنانی کۆمەڵگەی (شار)ێکی گشتگر، کەئەمە لە (هەولێر) بەدی ناکەین. چونکە کەسێتی تاکەکانی ئەم شارە لەبەر زۆرهۆ کە دواتر دێمە سەر باسکردنی تەواو کامڵ نەبووە. ئەرستۆ پێی وایە کە "ئەوکەسەی هیچی لەبار نییە، دەبێتە ئەندامی کۆمەڵ، وا هەست بەخۆی دەکات خۆی بۆ خۆی بژی، پێویستی بە هیچ نەبێ، ئەوا ئەو کەسە توخمی پێکهێنەری دەوڵەتی نییە، ئەم کەسەش یا دەبێ بوونەوەرێکی ئاژەڵی یا خودایی بێت"[10] ئەمە لەو کاتەدایە کە مرۆڤ خۆی خۆرسکێکی ئەفریدەیە، بەبوونی کۆمەلایەتی خۆی چونکە مرۆڤەکان لە خۆیاندا بەشدار و پێکهێنەری مێژوون، ئەگەرچی لە (هەولێر) و لەلایەن خەڵکەکەی هیچ جۆرە ئەفراندنێک بەدی ناکرێ، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کۆمەڵگەیەکی مشەخۆرن، پەیوەندییە کۆمەلایەتییەکانیشی لەسەر بنەمایەکی داخراوی نێو سۆزی خوێن و دەمارگیری عەشایەری یا ئایدیۆلۆژیای عاتیفی ئایینی بنیاتنراوە..ئەوەی زانراویشە لەزۆربەی کولتوورەکان پەیوەندییە مرۆڤەیەتییەکان بەزۆری لەلایەن دەسەلاتی ناعەقلانییەوە دیاری دەکرێن. خەڵکی کۆمەڵگەی ئێمەش زیاتر مەبەستم (هەولێر)ە وەک خەڵکانی ناو کۆمەڵگەکانی تر کاردەکەن و بە (ئەرکەکانیان) هەڵدەستن، ئەویش بەخۆگونجاندنیان لەگەڵ رۆڵە کۆمەلایەتییەکانیاندا لەسەر حیسابی وازهێنان لە (ئیرادە) کە ئەمەش ئیلقائییەتی خۆیانە و لەهەولێر زۆر بەزەقی هەستی پێدەکرێت. هەڵبەت ئەم کەنارگیرییە دواکەوتوویەی لایەنی مەعریفی خەڵکی هەولێر لەپێکهێنانی کەسایەتی مرۆڤەکانی ئەم شارە رەنگی داوەتەوە. بەشێوەیەک کە بێ ئاگابوون لە بەئاگاهاتنەوەی خۆیان، دیارە لێرەدا مەبەستم لە هاوبەندبوون و گونجانی کۆمەلایەتی نییە، بەقەد ئەوەی ئەبستمێکی سیکولاری (عەقلانی) لەم شارە بۆ بەرژەوەندی گشتی خەڵکی ئەم شارە بەدی ناکەم، وا تێنەگەیشتنە لە مێژووی (ژیان) لەلایەن خەڵکی ئەم شارە، چونکە هەموو هۆشیارییەک دەبێتە سایکۆلۆژیایەکی کۆمەلایەتی، مێژوویەک لەهۆشیاری بنیات دەنێت.

لێرەدا هۆشیاری کۆمەڵایەتی دەبێتە گرنگیدانی تاکەکان بۆ ئاشنابوون بەڕەوشتی کۆمەڵگەکەیان و بەشداریکردن بۆ وەئەستۆگرتنی لێپرسراوێتی. کە ئەمەیان بەردەوام لە (هەولێر) ترس و دوودڵی بەرهەم دەهێنێت.

وەک لەمەوبەر باسم کرد، کەسێتی تاکەکان لەنێو کۆمەڵگە دەبێتە نوێنەری کەسێتی و پێکهاتەی کولتوورەکان. بەڵام (مارگریت مید) زیاد لەمەمان پێ دەڵێ: "کەسایەتی مرۆیی، لەتەنها خودێک پێک نایەت، بەڵکو لەچەندێتی ئەو کەسانەی کەتاک پەیوەندی پێیانەوە هەیە دیاری دەکرێ، بەڵام ئەمەش ڕێگەی سەیرکردنمان لەتاک وەک یەکەیەکی یەکگرتوو لەنێو ئەو کۆمەڵگەی ئینتمای بۆ دەکات لە بارودۆخێکی تایبەت لێ ناگرێت"(١١) کەسایەتی مرۆڤەکانی ئەم شارە بەو (تقلیدی)یەیان یەکتریان وون کردووە، چونکە هەستی نوێبوونەوەیان لە (تەقلیدی)یەتیان تێپەڕناکات و نەزعەی فەردیان تێیدا بەچەپێنراوی نەبێ ناشێ باس بکرێ، بۆیە وێڕای ئەم کولتووره کۆکتێلەی لەم شارە هەیە، زۆربەی کەسایەتییەکانی دیاریکراون لە بیرکردنەوە و داهێنان، کە ئەمەشیان خەسلەتێکی گرنگی دینامیکییەتی هەر شارستانیەت و کولتوورێکە. (تارد) لەمیانەی تیۆرە سۆسیۆلۆجییەکەی پێمان دەڵێ: "هەموو رەگەزە مۆدێرنەکانی شارستانییەت لەڕێگەی کەسانی ئەفرێنەر دادەهێنرێن، لەلایەن جەماوەریشەوە لاسایی دەکرێتەوە، بۆیەش دەرکەوتنی ئاکاری کۆمەڵایەتی پێویست بەبوونی دوو پرۆسە دەکات، ئەوانیش پرۆسەی داهێنان و ئەوی تریش لاسایی کردنەوەیەتی لەلایەنی جەماوەر". (١٢) لەگەڵ بوونی باوەڕی تەواوم بە کولتووری جیا لەلایەن کۆمەڵگەکەمان و بگرە تەنانەت شارەکانیش، سەرەڕای بوونی پەیوەندییەکی ڕێژەیی لە (کرانەوە یا داخرانەوە)ی کۆمەڵگەکان. جیاوازی کولتووری هەر کۆمەڵگەیەک لەگەڵ ئەوی تردا لەڕادەی کارایییان دایە لەبەرامبەر گۆڕانەکان کە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بۆشاییە مەعریفییە کۆمەڵایەتییەی لەنێوانیاندا هەیە. هەر ئەمەشە دەبێتە پێکهێنەری یا بەرهەمهێنەری دەروونی و کۆمەڵگە جیاجیاکان. بێگومان ئاستی خواستنی یا هەرسکردنی لە تاکێکەوە بۆ یەکێکی تر دەگۆڕێ، ئەمە سەرەڕای گۆڕانی لە کۆمەڵگەیەک بۆ یەکێکی تر. لە (هەولێر)یش بەهەمان شێوە ناکرێ سەرجەم تاکەکان بخەینە یەک تای تەرازوو. دورکهایم دەڵێ: "مرۆڤ زیاتر بەرهەمی بار ودۆخە کۆمەڵایەتییەکەیەتی لەوەی بەرهەمی نەسەبی یاخود بۆماوەیی سروشتی بێت"(١٣). ئەم بۆچوونە ڕەهاییانە قسە لەسەر هەڵکەوتنی مرۆڤ وەک بەرهەمێکی کۆمەڵایەتی ناکات، چونکە نابێ ئەوەمان لەیاد بچێ کە لەلایەنی سایکۆلۆژییەوە هۆکاری بۆماوەیی ڕۆڵێکی کاریگەر لەدروستکردن و پێکهاتنی دەروون و کەسایەتی مرۆڤ دەبینن، ئەو تا هەڵکەوتەی (قەڵا و منارە) و قەیسەری سەرەڕای ئەو هەموو مزگەوت و تەکیە و...هتد کاردانەوەی دەروونییان لەسەر کەسایەتی مرۆڤی (هەولێر) دروست کردووە. (ئیبنی خەلدون) پێی وایە کە "مرۆڤ رۆڵەی ژینگەکەیەتی، هەر ئەویش دەیهۆنێتەوە، نەوەکو رۆڵەی سروشت و میزاجی خۆی بێت، ئەوەی دەستیشی دەکەوێت دەبێتە رەوشت و داب و نەریت"(١٤). ئەمە ئەو بارودۆخەیە کە (هەولێر)ییەک تێیدا گەورەبووە و بەردەوامە لەگەشە. لێرەوە (سەرخانی کۆمەڵایەتی) ئەم شارە و خەڵکەکەی رەنگدانەوەی ئەو جوگرافیا شێوا و فەرامۆش کراوەی دەم دەسەڵاتە کە نەیتوانیوە خەڵک ئامادەبکات، بۆ هاوکاری بەرامبەر ئەوەی دیالەکتیکی شار ودەسەڵات تەواو دوورن لەیەک، ئەمەش وەک لۆژیکێک کە دەبێتە بەشێک لەلایەنی دەروونی، واتە (هەست)ی مرۆڤەکان. لێرەشەوە (بافلۆف) هەست وەک پێشڕەوێک لەبەرامبەر (نەست)ی مرۆڤ دەبینێ. لەکاتی قسەکردن (هەولێر)ییەکان خۆیان بەکۆمەڵگەی پیرۆز دەبینن بەبێ ئەوەی توانیبێتیان خۆیان لەگەڵ ئەم پیرۆزییە پیرۆز بکەن. ئەمەش خاڵێکی لاوازە سەرەڕای ئەوەی نەیانتوانیوە خۆیان لەتەنها ملکەچی بەدوور بگرن.

دەشێ بپرسین ئایا خودی

(هەولێرییەکان) توانیویانە درک بەکالای کولتووری خۆیان بکەن؟ دەشێ هەستیان پێکردبێت، بەڵام تائێستاش کاریان بۆ قۆزتنەوەی ئەم (کولتوورە و کالا)کەی نەکردووە، بەمەبەستی گۆڕین و سوود لێ وەرگرتنی. وەک لەمەوبەر ئاماژەم پێدا کە دەشێ ئەمەیان قسەی زۆر هەڵگرێ. کۆمەڵگەی کوردەواری بەهۆی سستی و لاوازی سەرخان و ژێرخانییەوە گۆشەیەکی تەواوی بەخۆوە نەدیوە، تاوەک کۆمەڵگەیەک پێی بناسرێ.

چونکە بەهۆی زۆر هۆکارەوە کۆمەڵگەی کوردەواری بەتایبەت (هەولێر) لە کۆمەڵایەتی خۆی نامۆبووە. ئەمەش وای کردووە کە ئەم کۆمەڵگەیە لەزۆربەی هەرەزۆری لایەنە کۆمەڵایەتییەکانی پێنەگات و گەشەنەستێنێت، دەشێ بڵێم بە کۆمەڵگەیەکی سەرەتایی و چەق بەستوومێنێتەوە. بێگومان رۆڵی (چەپاندن) کاریگەرە بەسەر دروست نەبوونی (هەولێریەتی) چونکە ئەمەی دواییان رێگە نادات نەست ببێتە (هەست).

هەر لەوکاتەی قسە لەسەر (هەولێر) و (هەولێر)یەکان دەکەم پێم، باشە ئەم بۆچوونەی (ئیبنی خەلدون) بێنمەوە یاد کە دەڵێ: "لە هەر شارێک ئەگەر هۆزی زۆری تێدابێ یا کۆمەڵی جیاجیای لەخۆگرتبێ، زەحمەتە بتوانرێ دەوڵەتێکی بەهێزی جێگیر دروست بکرێت". بێگومان دیارە دەمارگیری رۆڵێکی بەرچاو لەم نێوانەدا دەگێڕێ.

هەولێر هەر لەسەرەتای دروست بوونییەوە، کە بە نزیکەی (٦٠٠٠) هەزار ساڵ دادەنرێ، یەکێک بووە لەهەرەسەیرترین شارەکانی کوردستان، لەهەموو لایەنەکانی (کۆمەڵایەتی، ئایینی، ئابووری...) هەڵبەت ئەمەش رەنگدانەوەی لەسەر پێکهاتەی کەسایەتی (هەولێر)ییەکان پەیداکردووە. لەهەولێر سەرەتا قەڵا بنیاتنراوەو ئەمە و (تورک زمانەکان)ی ئەم شارە کە بە کوردەکان دەڵێن (کرمانج)، پێیان وایە کە ئەوان دروستکەر و یەکەم نیشتەجێبووی ئەم شارە بوون و دواتر چەندین گەڕەکی تر کە سیما و کەینونەی کۆمەڵایەتی و ئایینی و ئابووری (کار)یان پێوەدیارە، بنیاتراوە. ئەمە سەرەڕای دەمارگیریەکی تر لەلایەنی(هۆز یا ئایین یا تەنانەت نەتەوەش)، بەدی دەکەین وەکو گەڕەکەکانی (عەرەب، سورچی، مەنتک+ئاوا، مەلایان، کرێکاران، ماجید+ئاوا....) ئەمانە سەرجەمیان هزر و دەمارگیری هۆز یا خێڵ یا بنەماڵەیەکیان پێوەدیارە، لێرەدا، چۆن دەتوانرێ کەسایەتی دڵسۆز بۆ شار (هەولێر) پێک بهێنرێت، کاتێ بزانی هەر لەگەڵ وەرگرتنی (پایە، دەسەڵات) لەلای هەرکەسێک لەم هۆزانە لەدوایین ئاستیشیان بێت دەگەڕێنەوە بۆ رەسەنیەتییان و بنەچەی هۆزایەتی خۆیان و لەمەشیان خزمەتی گشتی خەڵکی شارەکە (هەولێر) ناکەن. بۆ نموونە گەڕەکێکی وەکو (کوران) کە

لەم دواییانە کرا بە (رزگاری)و بەیەکێک لەهەرە کۆنترین گەڕەکەکانی هەولێر دادەنرێ. هۆکاری ناولێنانیشی بە (کوران) دەگەڕێتەوە بۆ (کار-ئابووری)؟ چونکە زۆربەی دانیشتووانەکەی لە جاران (کورەچی) بوون و (کەرپووچ)یان دروست کردووە. ئەمەش لەخۆیدا دابەشبوونی کار بەرتەسک کردۆتەوە، کە بەفاکتەرێکی سەرەکی گۆڕانی کۆمەڵایەتی دەژمێردرێ، بەڵام لەحاڵی ئێستای هەولێر بەتایبەت دوای رماندنی (لادێ)کانی کوردستان لەسالانی (١٩٨٦) بەدواوە، بوو بە پاڵنەر بۆ داگەڕانی خەڵکێکی زۆری (چیانشین و دەشت نشین) بەرەو (هەولێر) نیشتەجێبوون تێیدا، کە ئەمانەش لەخۆیاندا خاوەن چەندان بۆچوون و (کولتوور)ی جیابوون لەگەڵ ئەوەی کە لە (شار-هەولێر) هەبوو، لێرەوە ململانێی شار وەدێ یا ململانێی کولتووری نێوان دوو خەڵکی یەک نەتەوە، دەستی پێکرد. دیارە هەردوو لایەنی (کۆچ پێکراو)، (دەشت و شاخ) بە کۆمەڵە خەڵکێکی کۆنسێرڤاتیزم لەڕووی کولتووری و عەقیدییەوە ناسراون. دیسانەوە دوای راپەڕین شەپۆلێکی تری دەرکردن و راگواستن لەلایەن حکومەتی بەعس و دوای شەڕی ناوخۆش لەلایەن هەردوو دەسەڵاتی کوردییەوە، دژ بە زۆرێک لە خەڵک ئەنجام درا. ئەمە دیسان کاریگەریی کردە سەر (هەولێر)، کە زیاتر بەرەو ئاراستەیەکی نێگەتیڤیان برد، چونکە ئەمانە ناشێ دووبارە لەلایەنی

کۆمەڵایەتی و سایکۆلۆژی و...هتد بنیات بکرێنەوەو بەرامبەر ئەو شاڵاوە زۆری ئەوان و (کەمینە)یەکی (هەولێر)ی (ئەوانەی خۆیان بۆ خزمەتی هەولێر دەبینن) کە تا ئەوسا لەچاویان کەمینەیەک بوون. چونکە ئەم خەڵکە راگواستراو و کۆچ پێکراوە ئینتمایان بۆ هۆز، خێڵ، بنەماڵە، شێخ، سەید...هەیە. بۆیە زەحمەتە بتوانرێ وەک ئەوەی (خوێندنگەی ململانێی) بەتایبەت رادیکاڵەکان کە پێیان وایە گۆڕانەکان دەبێ ریشەیی بن لەم کۆمەڵە خەڵک و شارە جێ بەجێبکرێت. ئەمە ناشێ بەدوورمان بگرێ لە کۆمەڵێک لەم گۆڕانانەی (رووکەش)ی بەسەر ئەم شارە واتە لەلایەنی (مادی-جوگرافیا)یایەکەی داهات جگە لەم لایەنە، هەولێر کرا بە (گوند)ێکی گەورە لەلایەنی عەقڵییەوە، ئەمەش وەک بەرهەمێکی کۆچ و شەڕی ناوخۆ کە فاکتەری گرنگی گۆڕانی پەیوەندی کۆمەڵایەتی و کولتووری دادەنرێن "کاتێ شەڕ یا داگیرکردن لەنێوان دوو نەتەوە یا لایەن روودەدات ئەوا دەبێتە هۆکارێکی گرنگ بۆ گۆڕینەوەی کولتووری و ئاوێزانبوونی نێوانیان ئەمەش دەبێتە هۆی گۆڕان"[15].

هەڵبەت ئەم گۆڕانانەی لە (هەولێر) کەوتەوە لەلایەنی (مادی) گرنگی و تایبەتمەندی خۆی هەیە، بەڵام کاردانەوەی خراپتری لێ کەوتەوە. ئەمە لەگەڵ بوونی هەستی بەرگری لە کۆنە پارێزی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هیچ شتێک بێ گۆڕان نابێ "سروشتی مرۆڤەکان بە گشتی بەلایەنی بەرگری و کۆنسێرڤاتیزم دەشکێنەوە بەرامبەر ئەو گۆڕانانەی رووبەڕوویان دێ، ئەمەش لە زۆربەی هەرە زۆری تەنانەت کۆمەڵگە پێشکەوتووە باڵاکانیش بەرچاو دەکەون، بەمەش دەڵێن بەردەوامیەتی کولتووری"[16]. بەردەوامکردن و درێژکردنەوەی لایەنی پاشڤەڕۆیی کولتوور، بەتایبەت دوای راپەڕین زیاتر قاڵ بووەو هاتەوە سەر پێکانی خۆی، واتە گەڕاینەوە دواوە (سفر)، ئیبن خەلدون دەڵێ: "ئەگەر دەوڵەت لاوازبوو و سێبەری دەسەڵات بەسەر زۆر لەبەشەکانی دەوڵەت نەما، ئەوا لەوکاتە لەسەر بنەمای دەمارگیری زۆر دەوڵەتی بچووک دروست دەبێ"[17]. ئەوەتا هەردوای راپەڕین شوناسی نەتەوەیی و کەسایەتی و خودسڕینەوە، جێیان بۆ ئەسڵی پێکهاتەی سیاسی و کۆمەڵایەتی سەرکردایەتی کورد دەربڕی، کاتێ گەڕانەوە سەر ئەسڵی خۆیان و شوناسنامە پراگماتیکەکەشیان بۆکاتی پێویست حەشاردا، ئەمەشیان پشتیان بە نفوز و دەسەڵاتی سەربازی و ئابووری بەست. تا کار گەیشتە ئەوەی لەدوای ناوی سەرکردایەتی (سیاسی)، هەر بەرپرسێک کەنوونە یا (لەقەب)ی شار، هۆز، لادێ... پێیانەوە بلکێندرێت، ئەمەشیان رێک و راست هەستی (هەولێر)یەتی وەکو پێکهاتەی خەڵک و شاری زۆر زۆر لاوازکرد و هزری دووڕوویی (دووفاقی) تاکی کوردی پشتراست کردەوە. بەتایبەت لەم شارە (هەولێر) کە شێوەیەک یاخود جۆرێک لە هەستی (ئەتنۆسەنتەریزم) لەئارادایە، ئەمە لەگەڵ ئەوەی دەبێ بزانین وەک لەمەوبەر ئاماژەم بۆ کرد (هەولێر) لە جۆرەها خەڵک و کولتوور و چەندان ئایینی جیاواز لەیەک پێک هاتووە کە ئەمەش وای کردووە ئەم هەستە لە ئێستای زۆر زیاتر قووڵ بێتەوە و هەستی پێبکرێت، بۆ نموونە هەستی (تورکزمانێک) بەرامبەر (کورد)، یاخود موسڵمانێک بەرامبەر (مەسیحییەک) یا (ئیزیدییەک) یاتەنانەت (ئاشووری) بەرامبەر (کلدانیک). جا هەستی (ئەتنۆسێنتەریزم) لە خۆیدا بریتییە لەو "بیرکردنەوەیەی کە داب و نەریتی گرووپی خود باشتر دەبینرێ لەداب و نەریتی گرووپەکانی دیکە، بەم هۆیەشەوە بۆچوونی گرووپەکانی دیکە خۆ بەخۆ بەکەم دەبینرێن"[18]. ئەمە لەوکاتەی هەموو ئامادەباشییەکی ئەتنیکی و ئایینی و کۆمەڵایەتی لەهەولێر بوونیان هەیە، لەوانە (کورد، تورکزمان، مەسیحی...).

ئەمەش بەتایبەت دوای راپەڕین کە هزری خۆسەپاندنی ئەوی تر (ئیسلام) وەک لەمەوبەریش راگەیەنرابوو، ئەمجارەش دووبارەکرایەوە و بەسەر هەموو ئەتنیک و ئایینەکانی تر راگەیەنرایەوە، ئەمە سەرەڕای ململانێی شاراوەی نێوان (کورد و تورکزمانەکان) لەلایەک و لەگەڵ (عەرەب) لەلایەکی تر. هەموو

ئەمانە لەو کاتە روودەدەن کە گۆڕانێکی لەسەرخۆ لەلایەنی (ماد)ی کۆمەڵگەی کوردەواری روودەدات. بێگومان ئەمانەش گۆڕانی بەناچارین و لەژێر گوشاری زۆر و بێ خواستی ئیدراکی لەپێشینەی خەڵکی هەولێر روودەدەن، چونکە خەڵکی ئەم شارە لەحاڵەتێکی نیمچە ناهۆشیاری دادەژین و بگرە تەنانەت گەیشتوونەتە ئاستێک کە زۆر کار (بەزیانی) خۆیان و بەئاگاییەوە دەکەن. لێرەشەوە دەمەوێت زیاتر بە بابەتەکە، قاڵ ببمەوە و رۆبچمە خوارێی بابەتەکە ئەویش سەرەکیترین پێکهاتەی کولتووری هەر کۆمەڵگەیەکە، بەتایبەت مەبەستم (هەولێر)ە کە دەمەوێ لێکدانەوەی لەسەر بکەم، ئەوانیش کاریگەرترین رۆڵی بەرچاویان لەسەر کەسایەتی خەڵکی ئەم شارە جێهێشتووە، ئەویش هەردوو لایەنی (جوگرافی و ئایینی) کولتووره.

**١- ئایین:** تا ئێستا بوونی هیچ کۆمەڵگەیەک بەبێ ئایین بەدی ناکرێ، بەتایبەت لە کۆمەڵگە رۆژهەڵاتییەکان کە بەگشتی بە لانکەی ئایینەکان دادەنرێت. ئاینیش لایەنێکە لە پەیوەندی دەسەڵات لەناو مرۆڤ خۆیدا. پەیوەندییەک دەشێ مرۆڤ خۆی بکەر و دروستکەری بێت. جا بۆ هەر مەبەستێکی دەروونی، کۆمەڵایەتی بێت. ئایین بریتییە لە، "هەموو ئەو بۆچوون و هەڵس و کەوتانەی کە مرۆڤ بەهۆیانەوە ئەوگیر وگرفتانەی هەن و بەگرنگ دادەنرێن، بەڵام بەهۆی ئەو تەکنەلۆژیایەی هەیانە، هەروەها ئەو شێوە ئۆرگانیکییەی هەیە ناتوانرێت رێگە چارەیان بۆ بدۆزرێتەوە بۆ زاڵ بوون بەسەر ئەو بێ دەسەڵاتییە، بۆیە مرۆڤ هەوڵدەدات دەسەڵاتی سەروو سروشت بەکار بهێنیت و بیخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە".[19] جەدەلی واقیع و مرۆڤ، دەبێتە مۆتیڤ و لێرەشەوە مرۆڤەکان بێ ئیرادەبیان و لەرزۆکی و سستییان بەرامبەر چارەسەری دۆزەکانی خۆیان و کۆمەڵگەیان بەگشتی جۆرێک لە نقارچی دەکەن، ئەمەش وەک رەنگدانەوەی ویست و ئارەزووەکانی نێو دەروونی تاکەکانی کۆمەڵگەیە بەرامبەر تەنویم کردنی بەشێک لەئیرادە و گۆڕینەوەیەتی بەنەوایەکی سادەتر لەوەی لە ژیانی هەنووکەیی بەرچاوی دەکەوێت، چونکە ئایین بریتییە لەو "پەیوەندییە رۆحی و سۆزدارییەی نێوان مرۆڤ و هێزە میتافیزیکییەکان، یا ئەوانەی قوربانی و سروتیان بۆ پیادە دەکرێ، وەک دروستکردنی پەیوەندی ئەمەش لەلایەن خۆیەوە دەبێتە بەردەوامیدەرێک کە لە نێو سیستمەکۆمەڵایەتییەکان دادەپۆشرێ"[20]. مرۆڤ دەزانێت سیستمێک هەیە سوودی بۆلایەنی دەروونی و دواتر کۆمەڵایەتی هەیە، ئەمەش زۆر زیاترە لەوەی کە لە ژیانی رۆژانەیدا دەبینێت. بەم شێوە هەوڵ دەدات کەناڵێک یا چەندان کەناڵی پەیوەندی دروست بکات بۆ خۆنەویکردن و رازی کردنی ئەوی تری نەبینراو. جا لەهەر رێگەیەکەوە بێت، لەوانە قوربانی کردن یا سازدانی سروت و مەراسیم بۆ بۆنە ئایینییەکان وەکو (نوێژ، خوێندنەوەی مەولود، زەکات، خێر....) دەشێ هەندێک لەم سروتانە گشتی و هەندێکی تریان (تاکگەرایی) بێت، لەوانە (نوێژ) کە تاک و تەنها خۆی دەیکا یا خوێندنەوەی (مەولودی) کە دەشێ چەندان کەس بەشداری تێدا بکەن، بۆیەک مەبەست. بێگومان مرۆڤ ناتوانێ بۆخۆی بەتەنها (ئایین)ێک لەنێو کۆمەڵگە پراکتیزە بکات، چونکە یەکێک لە خەسڵەتەکانی (ئایین) وەکو دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی گشتگرە کە ئەمەش بە کۆڵەگەی ئایین دادەنرێ. زۆربەی کۆمەڵگە رۆژهەڵاتییەکان بە پەروەردەیەکی ئایینی لەسەرەتا تەڵقین دەدرێت، بەتایبەت ئەم کۆمەڵگەی ئێمە (کورد) بەگشتی و (هەولێر) بەتایبەتی، تەنانەت واچۆتە ئەقڵییانەوە کەدەبێ لەگەڵ لەدایک بوونی (کۆرپە) بانگی ئیسلامی بەگوێیدا بدەن (بخوێنن). دواتر پرۆسەی بە کۆمەڵایەتی بوون لەچوارچێوەی ئایین دەست پێ دەکات.

بەهۆی پەیوەندەی میکانیکی ئەم کۆمەڵگەیانەش، تاک ناتوانێ و ناشێ بەتەنیا و تەریک بژی، بۆیە "مرۆڤ ناچارە هاوکاری لەگەڵ کەسانی تر بکات، وەکو بوونەوەر ناتوانێ بەتەنیا بژی، بۆیە کۆمەڵگە یارمەتی دەدات و پەروەردەی دەکات بۆ دروستکردنی سروشتێکی

مرۆیی"[٢١] بۆیەش (دۆرکهایم) لە پەرتوکەکەی (الصور الاولیة للحیاة الدینیة)دا دەڵێ: "ئایین پرسێکی کۆمەڵایەتییە، نەوەکو پرسێکی تاکگەرایی."[٢٢] بێ ئاگایی تاکەکان بەرامبەر بە (ئایین) زیاتر یا ئەودیوی ئەو، جۆرێک لە هاوبەشی ئایدیالی و بێ ئیرادەیی کۆیان دەکاتەوە، لەو کاتە ئیرادەی تاکگەرایی بەرامبەر هەموو کەسێک واتە کۆمەڵگە دەچەپێنرێت و مرۆڤەکان لەکاتی جێبەجێکردنی مەراسیم و سروتە کۆمەڵایەتییەکان ئەوانەی بەکۆمەڵن. لەوانە (حەج یا نوێژی بە کۆمەڵ) هەست بەیەکگرتوویی و رەوینەوەی ترس دەکەن؟! چونکە ئایین لەخۆیدا "دیاردەیەکە هەموو مرۆڤایەتی دەگرێتەوە. هەروەها عەقیدە هەرە کۆنەکانی مرۆڤ، یەکێک لە هەرە سەرەکیترین هۆکاری ئایینی بوون، باوەڕهێنان بە ئایین لەلایەک ترس لەمردنە و لەلایەکی تریش دۆش دامانی مرۆڤە لەبەرامبەر ئەو رووداوانەی ناتوانرێ شرۆڤە بکرێن، یاخود لێک بدرێنەوە و لە هۆکارەکەیان تێبگەن"[٢٣] هەڵبەت کۆمەڵگە تەڵقینییە سۆزدارییەکانی وەکو (کورد) سەرقافڵەی ئەو هزرەن کە کۆمەڵگەیەکن خۆیان بە بەرهەم و بەروبوومی ئایینی ئیسلامی دەزانن. یەکێک لە (کۆنترین دەقی نووسراو لەبارەی (هەولێر) دەگەرێتەوە بۆ سەردەمی مەلیک (شلوک)ی سۆمەری نزیکەی (٢٠٠٠ پ.ز) کە تێیدا ناوی (هەولێر) بە (ئۆربیلم)، هەروەها (ئەربلیم) هاتووە، لەنێوان ئیمپراتۆریەتی ئوری سێیەم (٣٠٥٠-١٩٥٠ پ.ز)، هەروەها بەشێوەی (ئەربا-ئیلو) هاتووە لەسەرچاوەی ئاشووری بابلییەکان کەمانای (چوارخودا) دەگەیەنێ"[٢٤].

دیارە پیرۆزکردنی هەر شتێک تاسەرنابێ، بەڵام کەتوپڕ لەدەستدانیشی یا لەرێگەی هەر نوشوستییەکەوە بێت، ئەوا مرۆڤەکانی ئەم دەڤەرە دەخاتە واری (نامۆبوون)، (هەولێر)ییەکانیش، دەشێن لەوسای خۆیان ناوەندێکی ئایینی ئەم ئیمپراتۆریەتانە بووبن و لەوکاتەش بەم هۆیەوە دووچاری گرێی (نەرسیسیەت) بووبنەوە، ئەم ئایین پەروەری و دۆستییەشیان، نەوە بۆ نەوە جێ هێشتبێت تا هاتنی سوپای ئیسلام، چونکە بەردەوام نزیک بوون لەپیرۆزیەتی، بەتایبەت لە کائینێکی سەراسیمەکاری وەکو (خودا)، مرۆڤەکان کۆجێک لەبیرکردنەوەی زات بەرامبەر خۆیان، وەکو مرۆڤ و ئیرادەی خۆیان بەرامبەر خودا، ناهێڵێتەوە و بگرە، دەشێ خۆیان بەهەناسە یا نەوەی (خودا)ش بزانن وەک ئەوەی لەلای کوردە مەسیحییەکان بەدی دەکرێت. دەشێ رۆژێک لە رۆژان ئەم دەڤەرە و خەلکەکەی تێکەڵییەکیان لەم (چوارخودا)یە پێک هێنابێ، بەڵام "دوای هاتنی ئایینی ئیسلام بۆ کوردستان لە (١٦-١٨)ک کوردستان بەسەرکردایەتی (عومەری کوری خەتاب) ئایینی ئیسلامی بەتەواوی تێدا بلاوبووەوە، هەولێریش وەک هەر بەشێکی تری کوردستان لەوکاتە لەژێر دەستی فارسەکان بوو، هەروەها لەرووی ئایینیەوە زەردەشتی بوون"[٢٥]. گرنگ لێرە بەنیسبەت (هەولێر) لەدەستدانی ئایینە کۆنەکەیان (زەردەشت)ی بوو، کەپێش ئیسلام پێی گۆش کرابوون. بەم لەدەست دانەش گەورەترین شکست بەسەر بێ ئیرادەیی کەسە (خودپارێزەکان) داهات تا ئەوکاتەی تەواو ملیان دایە دەست ئایینە نوێیەکەیان. لە "هەولێر و لە ٣٣٦ پ.ز وە لەسەردەمی مەلیکی گەورە (داریوش)، ئایینی رەسمی دەوڵەت لەهەموو ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی ئەم (میر)ە ئایینی زەردەشتی بوو."[٢٦] پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بکەم، "مێژوو ئەوەمان بۆ دەردەخا کە، یەکەم بڵێسەی شۆڕش لەدژی (عوسمانی عەفان) لە (کوفە) سەری هەڵدا؟ کاتێ بەرپرسی یا کاربەدەستی ئەوسای (کوفە) وتی (بن دەستەکان بە یەک و لەئەنجامدا بە (کوشتنی عوسمان) کۆتایی هات".[٢٧] بێگومان لەمەشیان (هەولێر)ییەکان نەیانتوانی وەکو (کوفە)ییەکان راپەڕن، بەڵکو وەک ئێستایان ملیان دایە ئاینە نوێیەکەیان، کە بە بەرچاویانەوە ئاتەشگە و شوێنە پیرۆزەکانیان روخێنران و سووتێنران. دەبێ ئەوەش بڵێین کە هەر "دوای ئەوەی ئایینی مەسیحی بلاوبووەوە، زۆرێک لەسەرکردە و پاشا و میرە کوردەکان، ئایینی مەسیحیان وەرگرت، بەم شێوە هەولێر بووە مەرکەز (سەنتەری) میزاڤولیتی"(٢٨).

دوای هەمــوو ئەمــانە، خــەڵکی (هەولێـر) بەبوونی تەنها ئەم (سێ) ئایینە سەرەکییە نەوەستان، بەڵکو (هەولێـر) بوو بەلانکەی سـەرەکی ئایینی (یەهودی) کـە ئەمـانەش لە زۆر گەڕەکی وەکو (تعجیل) هەروەها (لادێ)کـانی دەوروبەری هەولێـریش ژیانیـان بەسـەر دەبرد. ئێـسـتـاش پاشـمـاوەکـانیـان لەم خـەڵکانەی لەوناوە مـاون، بە (بن جـوو) ناو دەبرێن، وەک ئەوەی بە کـــوردە مەسیحییەکان ئەوانەی دواتر بوونە (مـوسـڵـمـان) دەڵێن (بن دیان). ناکرێ لە بەرامبەر ئەم بێ ئیرادەیی و نائاگـاییـەی، سـەرەڕای دووفـاقی خەڵکی (هەولێر) لەچوارچێوەی ئەم هەمــوو وەچەرخـــان و گـــۆڕان و شکەسـتـانە خۆبپـارێزین. ئەمـە ســەرەڕای ئەوەی کــە یەکــێـک لەخەسڵەتەکانی هەرکۆمەڵگەیەکی مرۆڤایەتی دۆڕاو دوای شەڕ، لاسایی کـردنەوەی لایەنی سـەرکـەوتووە کـە بەنیسبەت (هەولێر) ئایینی ئیسلام بوو، وەکو ئیبنی خەلدون بۆی دەچێ، کاتێ دەڵێ: "ژێرکەوتوو زۆربەی کات ئارەزووی لاســـایی کــــردنەوەی ســەرکــەوتوو دەکــات لەهەمــوو لایەنەکـانی وەکـو دروشم جل و بەرگ بـــارودۆخ و داهـــات"(٢٩). دیـــارە سـەرەکیترین هێز کە بەردەوام ئایین و بگرە سـیـاسـەتیش کـردوویانەتە کـۆڵەگـەی دروسـتـبـوونیـان، هزری عەشایەری و هۆز و خێڵ و بنەماڵە بووە، کـوردیش وەک کـۆمـەڵگەیەکی ڕۆژهەلاتی گـیـرۆدەی ئەم دەردەیە. تا کـار گـەیشـتـۆتە ئەوەی هەسـتی نەتەوایەتی لە بۆتەقــەی (ئایین) بتوێـەوە بۆ مەبەستی داکۆکی کردن لە ئیـســلام و بلاوکـردنەوەی بەسـەر ئەوانەی یاوەرانی پێـغـەمـبـەر و خەلیفەکانی پێینەگەیشتوون، ئەوەتا دکـتـۆر عـبـدلرەحمان قـاسملو دەڵێ: "ئەو تێکۆشـانە پڕ ئازایەتیـیەی کـە سەلاحەدین ئەیوبی بەرامبەر هێرشی خـاچ پەرسـتـەکـان کـردی، نەمـرترین سـەردەمە لە سـەردەمـەکانی مێژووی گـەلانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست"(٣٠). هەر چۆنێکی بێت ئەمـە جـۆرێک لەشـانـازی مـرۆڤی کـورد بەرامـبـەر (سەلاحەدین)ێکی خاچ پەرست کوژی پێـوە دیارە، ئەمـەش روونکردنەوەی خود و مێژووی گەلێکە بەرامبەر ئەوی ترێک کـــە دیارە تائێــســـتـــا (موسڵمانیەتی) ئەو (کورد) ناناسن دیارە لە هزری بەرامبەر بە (ئەوی تر) کــــردنێـک هەر لەســــەردەمی بلاوبوونەوەی ئیـســـلام بەرامــبـەر (کــورد) دروست بووە، کــوردیش بۆ سەلماندنی ئەوەی کەدڵسۆزە بەرامبەر (ئەوی تری عـەرەب) کـە خـۆیان لە ئیــســلام وێنە دەکــەن، بەردەوام سەلاحەدین وەک نموونەی پاڵەوانێکی کـــوردی دەســتی بەخـــوێنی خـــاچ پەرســتــەکـــان ســـوورە، بە نموونە دەهێننەوە. ئەمـە سـەرەڕای چاندنی هەست و ســـــۆز لەنێـــــو دڵـی (مــوسـڵــمـانانی تر) بەوەی کــورد بەشـداربووە، شـان بەشـانی عـەرەب لەڕزگـارکردن و شـەڕی بلاوکـردنەوەی ئایینی ئیــســلام. ئەمــانە چەند تایبـەتمەندییـەکی ئایینی (کــورد) بەگشتی و (هەولێر)ە بەتایبەتی کە ئاوێزانی سیستەمی خێڵەکی کراوە. چونکە سـەرەکیترین کۆڵەگەی ئایین، هزری (هۆز، خـێڵ، عـەشـایەر و هۆز پەرسـتـیـیـە) لەدوای ڕاپەڕین لەگەڵ نەمــانی دەســەلاتی حکومــەتی عـێـراقی، هزری ناوچەگەری جگە لە (هەولێر)یەتی لەنێو (هەولێر) زیاتر لەچاو جاران زەقتر بووەوە و تەشەنەی کـــرد، رووی راســـتی خـــەڵکەکـــە دەرکەوت. ئیبن خەلدون دەڵێ ئەگـەر "دەوڵەت لاواز بوو و دەسەلاتی نەما، ئەوا خەڵکی لەپێناو پاراستنی سـەر ومـاڵ و گـیـانیـان پەنا دەبەنە بەر بەهای بەدەوی".(٣١) یەکـــێک لە هۆکارەکانی سەرهەڵدانی توندڕەوی ئیـســـلامی لە (هەولێـــر) ئەمـــەی سەرەوەبوو، خەڵکی (هەولێر) لەنێو شارەکانی تر بە وەناسراون کە کۆمەڵە

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| -١ | کوران (رزگاری) | | ١٢ | میللی | |
| -٢ | کوردستان | | ٧ | عەشایەری-میللی | |
| -٣ | شۆرش (سورچیان) | | ٥ | عەشایەری-میللی | |
| -٤ | تەعجیل | | ٧ | میللی | |
| -٥ | باداوە | | ١٢ | عەشایەری-میللی | |
| -٦ | سێتاقان (هەردوو بەش) | | ١٦ | عەشایەری-میللی | |
| -٧ | تەیراوە | | ١١ | عەشایەری-میللی | |

خەڵکێکی لە (خوا) ترس و ئیماندارن. بێگومان ئەم باوەڕبوونە لەگەڵ ئەوەی زۆرێک لەهاندانی تێدایە بۆ سووربوون یا زیاتر کارکردن لەم لایەنەی لەلای خەڵکی (هەولێر) دروست کردووە، بەڵام لەهەمان کاتیش جۆرێک لەبێ ئاگایی و دووفاقی بەخشیوەتە خەڵکی (هەولێر)، ئەگەر سەرنج بدەینە (هەولێر) وەکو شار هەمـوو (مزگەوت)ە بەپلەی یەکەم ڕەنگە ئایین نەبێ بەڵکو (ئابووری)یە، چونکە دەستووری ڕژێمی بەعس لەبەرامبەر دروستکردنی هەر مزگەوتێک (باج)ی لەسەر دروستکەری مزگەوتەکە کەم دەکردەوە یا لێی نەدەسەند. ئێستاش هەمان یاسا لەم شارە بۆ ئەم مەبەستە پیادە دەکرێ. بێگومان یەکێک لە هۆکارەکانی بوونی مزگەوت با نوێژکردن تێیدا ئەوەیە کە (نوێژکردن بەگروپ ڕۆحی تاکەکان بەهێز دەکات، باوەڕبەخۆبوون و ئاواتەکانیان زیاد دەکات لەبەرامبەر ئەو مەترسیانەی ڕووبەڕوویان دەبێتەوە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی ڕەفتاری دەستەجەمعی لەنێوان موسڵمانان لەمزگەوت یا پەرستگە پەیوەندییان لەگەڵ یەکتر پتەوتر و بەهێزتر دەکات"[٣٢].

دەشێ زۆر یەکترناسینی (کۆمەڵایەتی) لەڕێگەی مزگەوتەوە سەر هەڵبدات، بەڵام ئەمە وادەگەیەنێ لەدەرەوەی مزگەوت جۆرێک لە (خۆپەرستی) لەئارادایە، کە بەم شێوە دەیانەوێت دەروونیان ئاودەن وێڕای ئەوەی هەولێر شاری (قەڵا ومنارە)یە لەهەمان کاتیشدا شاری (مزگەوت و گازینۆ) شە، کە ئەمانە لەخۆیان مانای بێکاری و بێزاری و بێ ئومێدی و بەرتەسکی زەوی نیشتەجێبوون دەدەن. دیارە لایەنێکی تری دەرهاویشتەکانی ئەمانە، بوونی کێشەی کۆمەڵایەتی نێوماڵەکان یا نەبوونی شوێنی پەرستن و یاری و حەوانەوەیە. (هەولێر) لەم لایەنە پشکی شێری بەردەکەوێت، دەبێ ئەوەش بڵێین ڕێژەی مزگەوتەکانی ئەم شارە لەگەڵ هەموو شارەکانی بەراورد بکەین شارەکە وەک هەموو شارێکی تر ڕێژەی مزگەوتی تێدا زۆرترە.

دیارە ئاستی ڕۆشنبیری ڕۆڵی بەرچاوی لەم دابەشبوونانە هەیە، کەلێرەدا تەنها بۆ نموونە هەندێ گەڕەک و ڕێژەی مزگەوت تێیدا وێنە دەکێشم.

ئەمە سەرەڕای چەندین مزگەوت و گەڕەکی تر. (کە کۆی گشتی مزگەوتەکانی (هەولێر) خۆی لە (٢١٦) مزگەوت (٣) خانەقا و (٢٥) تەکیە دەدات، لەڕووی ڕووبەریشەوە ئەوا کۆی گشتی ڕووبەری مزگەوتەکانی هەولێر (٢١٠٠٠کم٢)ە هەروەها ڕووبەری گشتی تەکیەکان ٩کم٢ە"[٣٣]. دیارە وەکو لەمەوبەر ئاماژەم پێدا کە لەدوای ڕاپەڕینی کورد بەگشتی و (هەولێر) بەتایبەتی گەڕانەوە سەر ئۆریگناڵی خۆیان و کەسایەتییە قەڵبەکەیان ئاشکراکرد. تەنها لەدوای (١٩٩١-١٩٩٩) (٤٣) مزگەوت و (٤) تەکیە لەم شارە دروست کراون لەدوای (١٩٩٩)ش بەتەنها (١٦) مزگەوت دروستکراوە، کە ئەمەش بەرزترین ڕێژەیە لەم شارە لەوەتەی سالی (١٩٨٠) کە ئەوکات تەنها لەم ساڵە (١٤) مزگەوت دروست کرا"[٣٤]. بێگومان من قسەم لەسەر باشی و خراپی مزگەوت نییە، چونکە ئەمە پەیوەستە بەچەندێتی ئاوەزو ئەبستمی ئەو خەڵکە ئەگەر درکیان بەبوونی ئەمە کردبێ یا ئەو ئەقڵییەتەی کار بەم شوێنانە دەکات.

یەکێک لە هۆکارەکانی دروستکردنی مزگەوت لەعێراق بەگشتی و کوردستان بەتایبەتی لەبەر (چاوپۆشین یا لێخۆشبوون)ی دەوڵەت بووە لە (باج). وەکو لەمەوبەر بەدرێژی باسم کرد کە بوونی مزگەوت بێهێزکردنی باوەڕبەخۆبوون و یەکگرتوویی ئیماندارەکان (ئاییندارەکان)ە. ئەمە سەرەڕای کردنی بە دەزگایەک بۆ گەیاندنی پاکی و دڵسۆزی سەرەڕای نزاوپاڕانەوە بۆ خودا، هەروەها سەیرکردنی مزگەوت وەک قەڵایەکی پۆڵایینی سەخت بەرامبەر هەر کردە یا کارەساتێکی دەرەکی، بۆیە لەمیانەی چەندین کارەسات و شەڕ پەنا بۆ مزگەوت برداوە، ئەمەش بەمەبەستی پاراستنی ڕۆحی بکەرەکان یا بە ئیمانداربەتی مردنیان. ڕووداوەکانی (١٩٩١ تا ١٩٩٥) ئەم ڕاستییەیان زیاتر سەلماند.

دیارە وێناکردن و بەسیمبول کردنی مزگەوت تەنها لە دۆگما و ئەقیدە تەقلیدییە باوەکەی نەوەستا، بەڵکو کاردانەوەی دەروونی بەهێزی (ئایین)ی لەسەر تاک و گروپ و

خێزانەكانیش وێنەكرد، دواتر ئەم رەنگدانەوە ئایینییە هاتە واری هەڵكۆڵین و نەخشكردنی لەشێوەی زەخرەفە لەسەر خانو و بیناكان، لەوانەش (هذا من فضل ربي، ماشاء الله، الله اكبر...هتد) هەموو ئەمانەش بەمزگەوت كردنی ماڵن، بەڵام ماڵێك تەنها بۆ خاوەنەكەیەتی و بەس، دەشێ خودی ئەم خاوەن خانووەش نەپارەكەی حەلاڵ بێت نەخۆشی نوێژ بكات، تەنانەت بگرە دەشێ زەوییەكیشی بەمزگەوت دەست كەوتبێ. ئەمەش جۆرێك لەرەنگدانەوەی ناواقیعی لەناخەوەی ئەم مرۆڤانە دروست كردووە، كاتێ لەم مزگەوتانە شت دەدزرێ (كەل و پەل یا پێلاو...) یا رەوتە سەلەفییەكان بوونی هەموو ئەم مزگەوتانەیان قۆزتۆتەوە و كردوویانەتە خوێندنگەیەكی ئایینی لەسەر شێوەی (حوجرە)ی كۆن كە تێیدا وانەكانی بۆ مەبەستی شەڕ دەڵێنەوە، هەڵبەت دیارە لەمەش هەست بەبوونی (پێگەیەكی ئارام بۆ یەكگرتن و یەكتر ناسینەوەی فەندەمەنتالیستەكان) بۆ بەرسڤی ئەوانی تر كراوە. ئەمەیان لە (هەولێر) زۆر زەق و بەرچاو بوو، دوای سەرهەڵدانی شەڕ و پێكدادان لەنێو مزگەوتەكان و گۆڕانەكانی ئەمڕۆی سەردەم، جۆرێك لەدوو (فاقی) لەكەسایەتی خەڵكی (هەولێر) بەتایبەت پراكتیزەكارانی ئەم میتۆدە ئایینییەی باس كرا خستەوە. دیارە ئەمەش دیاردەیەكی سەیر نیە لەم شارە، چونكە (هەولێر) سەیرترین شارە لەڕووی پێكهاتە ئایینی و ئەتنیكییەكەی، كە بێگومان دەستبەرداربوون و گۆڕان و پەیوەندی هاوسێیەتی لەنێوان مرۆڤەكانی ئەم ئایینانە بەردەوام هەبووە. ئەمەش خاڵێكی لاوازی پێداون بۆئەوەی لەداهاتوو بەئاسانی كارەكانی جێ بهێڵێت یا سازش و گۆڕانی پێبخەن. بێگومان وەك تایبەتمەندییەكی بەردەوام، مرۆڤەكان حەز بە نمایشكردنی هەموو بوویەكی خۆیان لەهەموو لایەنەكانی ژیان وەكو (ئابووری، جوانی، تەنانەت خودا پەرستیش، هەروەها لەخوداترسانیش....) بۆیە زۆرینەی خەڵكی ئەم شارە بەتایبەت دەوڵەمەندەكانی بەشێوەیەكی رووكەش و دنیای كار بۆ (ئایین) دەكەن و لەبۆنە و مەراسیم سرووتە ئایینییەكان دەستپێشخەری دەكەن و برا موسڵمانەكانیان كۆدەكەنەوە و (شیرینی یا گۆشت)یان بەسەردا دەبەخشنەوە. ئەمەش وەك ترسێكە لەمردن و دووپاتكردنەوەی ترس و هەستی ئیمانداریە بەرامبەر خودا، سەرەڕای راگەیاندنی ئاستی ئیمانی(خود) بەرامبەر ئەوێكی (هەژار) لەهەموو لایەنەكان كە لەئەوی تر (بەخشەر) بوونی نییە. بەهۆی بچووكی یاسای پۆزەتیڤیزم لەڕووی دەسەڵاتەوە لەبەرامبەر یاسا تەقلیدییەكانی (عورفی) ئەوا تائێستاش لەم شارە مەراسیمی ژن خوازی لەرێی (مەلا)وە بەڕێوەدەچێ، كە ئەمەش كزی و نێگەتیڤیەتی یاسای پۆزەتیڤیزمە. چونكە ئەمە جۆرێك لەدووفاقی لەنێو خەڵكی ئەم شارە ناوەتەوە، كە ئامادەیە لەبەردەم دادوەر یا (قاضی) سوێند بخوات بەوەی كەلەمەوبەر لەرێگەی (مەلا)وە ژنی مارەنەبڕیوە. ئەم درۆكردنەش رێگە خۆشكەرە بۆ بەردەوام بوون لەداهاتوو. چونكە "ئەمانە لەئایینەكەیان تەنها لایەنی عەقیدی و خوداپەرستییان گرتووە، بەڵام لایەنە كۆمەڵایەتییەكە، ئەوەی پێغەمبەر بۆی تێدەكۆشا، چی بۆ زیادناكەن و ناچنە ناویەوە، بەڵكو هەر بەتۆمارکراوەیی دەمێنێتەوە و خەڵك بێ ئەوەی كاری پێ بكات بۆی دەخوێنرێتەوە".[٣٥]

هەڵبەت دەكرێ ئایین لەگەڵ واقیع بگونجێندرێت، ئەمەش بەهۆی ئەو فرە رەهەندییەی دەشێ تێیدا بیدۆزیتەوە، وەلێ ئەوەی لای گوتار خوێن، و خەڵكە قەدەری و موتیعەكە باوە، تەنها بریتییە لەجێبەجێكردنی كۆڵەكە سەرەكییەكانی وەكو (نوێژ، حەج...هتد) كەچی، ئەمانە بەگشتی بەتەنگ بەرژەوەندی تاكەوەن، كەی لەمیانەی گوتارە ئایینییەكان باس لە درۆكانی بەردەوامی رۆژانەی ئەو خەڵكە یا تەنانەت بەرتیل و كوشتنی ژنان و هەراسانكردنی هاوسێ و...چەندان بابەتی تری پەیوەست بەژیانی سەردەم كراوە. ئەم دیاردە پیادەكردنەی سەرەوە هۆكارێكی گرنگی خستنەوەی تۆوی دووفاقییە لە كەسایەتی مرۆڤەكانی ئەم شارە. "كێشەی خەڵكی شار ئەوەیە، كە ئەوان رێز لە گوتارە ئایینییەكان دەگرن، بەڵام لەهەمان كاتدا ناتوانن

باوەڕ و نموونە باڵاکانی جێبەجێ بکەن"[٣٦]. وەک ئاماژەم پێدا، هەموو ئەمانە جۆرێک لە کاردانەوەی نێگەتیڤی لەلای خەڵکی (هەولێر) دروست کردووە، هەروەها ئەم دیاردەی دووفاقییەش لە کەسایەتییان بەئاسانی بەدی دەکرێت. دەتوانین خودی ئەم دیاردەی دووفاقییەش زۆر بەئاسانی لە مانگی (ڕەمەزان) بەدی بکەین. کاتێ هەر ئەم موسڵمانانە سوێند لەسەر فرۆشتن و کرینی شتەکان دەخۆن. سەرەڕای ئەوەی هەر لەم مانگە نرخی کەل و پەلەکان زیاد لەپێویست بەرز دەکەنەوە. هەردوو توێژەر (ماکیفر و بیج) باس لە دیاردەی دووفاقی دەکەن و ناوی دەنێن (دوالیزمی کولتووری)، کە تێیدا دەڵێن: "کاتێ تاک ڕووبەڕووی کولتووری کۆمەڵایەتی ناچونیەک دەبێتەوە، لەقۆناغی یەکەمی گەشەی ناتوانێ کەسایەتییەکی کامڵ لەدەروونی خۆی پێک بهێنێ. تاک بێ پسانەوە هەوڵدەدات هاوسەنگییەک لەنێوان ئەم داواکارییە ناچونیەکانە دابنێ. لەبەرئەوە، کەم تازۆر کەسایەتییەکی دووفاقی لێ دەردەکەوێ".[٣٧] "لەهەندێ کۆمەڵگەکان دووسیستمی ناچونیەکی بەهاکان بەدی دەکرێ کە یەکێکیان واقیعییە و بەپراکتیزە ڕێزی کەسەکان دەگرێت، ئەویتریشیان نموونەیی (میسالی)یە، کە خەڵک لەڕێگەی گوتار و پلەکانی وەریان دەگرێ. لەمیانەی ئەمە (دووفاقی کەسایەتی) دروست دەبێ، لەو کاتە خەڵک بەقسەی بریقەدار و نموونەی باڵا دەدوێ، بەڵام بەکردەوە دژی ئەوە دەڕۆن"[٣٨].

بەردەوام مرۆڤەکانی ئێمە نوستالیژیانە ژیان دەگوزەرێنن و حەزی لێکچوونیان بەڕادەیەکە بیر لەو جیاوازیانە ناکەنەوە کە بەشێوەیەکی دیفاکتۆ خۆی دەسەپێنێ، چونکە ئەمانە دەستەمۆکراوی دەم ئەم لێکچوونانەن کە ئاینی داوای بەدواداچوون و پراکتیزەکاریان لێدەکات.

بێگومان هزری ئایدیالیستی لەخۆیدا نزیکە لەدنیای میتافیزیک، لێرەشدا واری جێبەجێکردن دەکەوێتە ژێر پرسیار و گومانکردن لە چەندێتی ڕاستی و دروستی ئەو پراکتیزەکردنە، ئەوەی لە ئاینە ئاسمانییەکان هاتووە، بەدڵنیاییەوە جۆرێک لە سەرامەت و وشکی و زبرکاریان تێدایە، بۆنموونە لە ئاینی (مەسیحی) چوونی (دەوڵەمەند) بۆ بەهەشت مەحاڵە؟! کەوابێ، دەبێت (مەسیحییەکان) واز لە غەریزەی موڵکییەت بهێنن، کە ئایا ئەوە دەکرێت؟ یان لەلای موسڵمانان کاتێ باس لە دادوەری و ڕاستگۆیی و یەکسانی (پێغەمبەر و یاوەرەکانی) دەکەن، ئەوا موسڵمانان ئومێدی گەیشتن و لەیەکچوون بە کەسایەتی و تایبەتمەندییەکانی ئەوان دەکەن، کە ئەمەش پێکهێنەری سەری ویستی خودایە و لەقورئان ڕەنگی داوەتەوە، بۆیە لێرەدا موسڵمانان خۆیان بێ ئیرادە و توانا دەکەن بەرامبەر ئەو داوایانەی لە ئاینەکەیان هاتووە. لێرەشدا بۆیان ناکرێ و بۆیان جێبەجێ نابێت، ناچار مل دەدەن بە بەشێک لەداوا ئایینییەکان لەمەشیان بەرژەوەندی تەنها خۆیان بێ ڕەچاوکردنی بەرامبەرەکەیان کەئەمە پێچەوانەی باوەڕە ئایینییەکەیان پیادەدەکەن. بۆیەش لێرەوە دووفاقی لە کەسایەتییان سەر هەڵدەدات. نوێژکردنیش دەبێتە عادەت و لە عیبادەت دەردەچێ. بۆیەش ئەمانە بەردەوام ئاینی دەکەنە پاساو و پەرژین بۆخۆیان وەک ئەم گوتەزایەی کە لەنێو کوردان زۆر باوە کە دەڵێ: "بەقسەم بکە بەکردەم مەکە"، ئەمەش ڕاستی دووفاقی مرۆڤی کورد زیاتر دەسەلمێنێ.

گومانی ناوێ ڕێژەی مزگەوت لە(هەولێر) زۆرە، تەنانەت "یەکەم مزگەوت لەم شارە لەساڵی ١٧١٩ لەسەر قەڵا بەڕووبەری ١٢٥٠م٢ بنیاتنراوە"[٣٩]. سەرەڕای ژمارەی ئەم مزگەوتانە، بەڵام دیارە بەکۆمەڵایەتی نەکردنی پێکهاتە بەربڵاوەکەی خودی ئاین، هۆکارێکی سەرەکی دروست بوونی ئەم کەسایەتییەیە کە لە (هەولێر) بەدی دەکەین، کە بەڵای منەوە دەبووایە لەبری هەندێ مزگەوت چەند نەخۆشخانەیەک بۆ ساغ کردنەوەی عەقڵ و دڵی ئەم خەڵکە دروست بکرابووایە. خەڵکی (هەولێر) زانستییانە کارناکات و ژیانی نابات بەڕێوە. دیارە ئەمەش لەبەر دەستبەردارنەبوونی میتۆدە تەقلیدی و کۆنەکانیەتی کە دەشێ ژیان پێویستی بەهەندێک لەم میتۆدانە نەمابێت.

لە"هەولێر یەکەم خوێندنگە لەساڵی ١٩٢٦ دروست کرا."(٤٠) واتە دوای (٢٠٧) ساڵ لە دەسەڵاتی مزگەوت و حوجرە و تەکیە توانرا یەکەم خوێندنگە دروست بکرێت. وەک لەمەوبەر ئاماژەم بەبوونی ئەو چەندین (تەکیە و حوجرانە)دا، ئەوا ئەوە دەردەخات کە لەم نێوانەدا خوێندن ئایینی بووە، بەڵام سەرەڕای هەموو ئەمانە، ئەوەی بەدی دەکرێت، چەند کەسێکی بەنمرە زۆرکەم نەبێت، کەس لەم حوجرە و تەکییانە نەبوون بە نووسەری ناودار یا شاعیر، یا بوێر... بەپێچەوانەی دەشتی شارەزوور کە چەندین شاعیر و نووسەری لەم ڕێگەیەوە لێهەڵکەوت.

لەم شارە بەهۆی بوونی چەندین گۆڕستانی گەورە کە زۆربەیان لەناو چەقی شارن، ئەوا پەرچەکرداری ترس لە مردن بۆتە پاڵنەرێکی بەهێز بۆ دەستگرتن و نمایشکردنی خود لە مرۆڤێکی ئایین پەروەر و ئایین دۆست، کە ئەمەش زۆرکات هەولێرییەکانی پێ وەسف دەکرێت. بێگومان خودی مردوو دواتر گۆڕستانیش پێویست بەسازدانی سەمفۆنیا و سرووتی گونجاو دەکات بۆ مەبەستی وەبیرهێنانەوە و خۆ بەدوور گرتن لەو بەڵایانەی کە دەشێ بەس ئەوان (کەسی مردوو) هۆکاری سەرەکی بێت بۆ ئەم گرفتانە. چونکە مردوو سەرەڕای ترس لەمردن خۆی پانتاییەکی گەورە لە یادەوەری مرۆڤەکان جێ دێڵێ. بۆ ئەم ڕەواندنەوەی ترس و پیشاندانی نیەت پاکی و ئایین پەروەری (هەولێر) یەکان بەزۆری ڕۆژانی (پێنج شەم و هەینی)یان، سەرەڕای ڕۆژانی بەتایبەت (یەکەم)ی جەژن سەردانی گۆڕی مردووەکان دەکەن ئەمەش جۆرێک لە (نەشازی کۆمەڵایەتی) لەنێو کردەو گوفتاری خەڵکی ئەم شارە پێک هێناوە، نەشازی کۆمەڵایەتیش بریتییە لە (دابڕان و ناچوونیەکی کۆمەڵایەتی لەنێوان هۆکاری مادی و مەعنەوی لەسروشتی شێواز و ڕەفتار و ئامانج)(٤١). ئەم دیاردەیە، ئەمڕۆ زیاتر بەرچاو دەکەوێ، لەبەرامبەر هەڕەشەی گۆڕانی لایەنی (ئایدیالی) لەبەرامبەر گۆڕانی لایەنی (مادی)، بەتایبەت کاتێ دروستکردنی مزگەوت لەبەر مەرامێکی (سەرمایە یا مادی) بێتە بنیاتنان، ئیتر ئەو باوەڕانەی زۆر پتەو و قایمن. بەتایبەت لەنێو کۆمەڵە خەڵکێکی وا ساویلکە و نزم ئاستی ڕۆشنبیری، گەرنەشگۆڕین لەنێو ئەم کۆمەڵگە خۆش باوەڕەی (هەولێر) ئەوا بەدڵنیاییەوە درزی تێدەکەوێت. ئەوەتا لەم شارە بەهۆی ئامادەبوونی ڕۆحی مردوو لەجەستەی هەموو تاکەکانیان بەهۆی پاکانە ئایینییەی دەیکەن لەڕێگەی (نوێژ و، دروستکردنی مزگەوت، نزیک ناشتنی مردووەکانیان) لەم گۆڕستانەی کە بەشێک لەهەولێر پێک دێنن، بۆتە هۆی دروستکردن و پێکهێنانی نائاگایی و مت کردنیان ئەوا گۆڕی کچێکی وەکو (ئەمیرە یەزدان دۆخت) کە لەسەردەمی (قەرەداخ)ی سەرکردەی مەسیحی ژیاوە، ئەم کچە بەئایین و ڕەچەڵەک (مەسیحی بووە)، بەڵام موسڵمانەکانی هەولێر پێی دەڵێن "ست ئیمامی".(٤٢) موسڵمانەکانی ئەم شارە، بەهی خۆیانی دەزانن و زۆربەی لایان پیرۆزە و زۆرکات داوای بەزەیی و ڕەحمەتیشی لێ دەکەن، بەتایبەت لەڕۆژانی چوارشەم



و پێنج شەموان. کەبوونی ئەم چەندین مەزارگە و گۆڕستان و مزگەوتە بێ شومارانە هۆکارێکی سەرەکی پێکهێنانی ئەم شارەن لەڕووی رووخسارەوە. فیستیل دی کولا دەڵێ: "لەکۆندا ئایین فاکتەرێکی جەوهەری دروست بوون و گەشەسەندنی شاربوو"(٤٣) وێڕای هۆکاری تری ئابووری، سیاسی....ئەوا ئاییندۆستی و زۆری مزگەوت و مەزارگەی پیاوانی ئایینی وەکو (سولتان موزەفەر و شێخ محەمەد خوراسانی، ست ئیمام...) و چەندان تەریقەت و شێخی تری بەناوبانگ هۆکارێکی سەرەکی کۆچی خەڵکی (غەیرە هەولێری) بووە بۆ ئەم شارە و تێیدا نیشتەجێ بوون. بێگومان ئەمەش یەکێکە لە کوکتێل بوون و هەمەڕەگەزبوونی خەڵکی (هەولێر) و قۆستنەوەی لەلایەن کەسانی تر، بەبیانووی ئاییندۆستی ئەم شارە، کە بۆ مەبەستی قۆستنەوەی لەلایەنی ئایینییەوە لەهەموو ئان و زەمانێک لەلایەن دەسەڵاتی سیاسی و کۆمەڵایەتییەوە بۆتە خاڵێکی لاواز، بۆیەش ئیبن خەلدوون راستی گوتووە، کاتێ دەڵێ:"هەر شارێک هۆزی زۆری تێدا بێت یان کۆمەڵی جیاجیای لەخۆ گرتبێت، ئەوا زەحمەتە دەوڵەتی بەهێز و جێگیری تێدا دروست بکرێت". چۆن دەکرێ مرۆڤ واز لە غەیری موڵکییەتی تایبەت بهێنێ، بەتایبەت کاتێ رادەگوازرێ یا کۆچ دەکات بەرەو شارێکی وەکو (هەولێر)، ئەم مرۆڤە دەشێ مزگەوت بەماڵی موسڵمان (خۆی) بزانێ و بیپارێزێ، ئەمە لەڕوانگەیەکی ئایینییەوە، بەڵام چۆن دەتوانی غەریزەی بەشارکردنی(هەولێر) بۆ خۆت بچێنیت، کە زەحمەتە لەلای کۆچەرێک یا راگوێزراوێک، ئەمە بەدی بکەیت. بێگومان هەموو ئەمانە لەڕێی گۆڕانەوە چی دەکرێت کە بریتییە لە داهێنان و لاسایی کردنەوە. بەڵام لە (هەولێر) بەترسێکەوە ئەم پرۆسەیە پیادە دەکرێ، خۆئەگەر بشکرێت ئەوا دەستبەرداری پاشڤەڕۆیی نابن، واتە تەنها لایەنی (مادی) دەگۆڕێت، سەرەڕای پێک نەهێنان و دروست نەبوونی هزری خۆشەویستی بۆشار و خزمەتکردنی کە ئەمەیان لەلای خەڵکی (هەولێر) بوونی نییە. چونکە وەک خەسڵەتێکی بەردەوامی خەڵکی، ئەوا بەدەم گریان لەدایک دەبن و بەدەم هات و هاواریش دەمرن. چونکە ئەمە شارێکی کۆکتێلی گازینۆ و مزگەوت و گۆڕستانە.

**٢- جوگرافیا:** کاتێ سەیری هەولێر دەکەین، ئەوا ناکرێ بارودۆخی جوگرافی یا بەگشتی (ئیکۆلۆجیا) لەیاد بکەین. چونکە کاریگەرییەکی پتەوی بەسەر (کولتوور) و ئەویش بەسەر کەسایەتی مرۆڤەکانی ئەم هەرێمە هەیە. لەڕووی جوگرافییەوە هەولێر لەدەشتێکی پان و بەرین هەڵکەوتووە، ئەمە وێڕای چیای سەفین کەکەوتۆتە پشتییەوە.

کاتێ سەیری (هەولێر) دەکەین، دەبینین بەشێوەیەکی بازنەیی (داخراو) هەڵکەوتووە، دیارە لەم بازنەیی هەڵکەوتنەش شێوەکارتێکردنێکی دەروونی لەسەر خەڵکی ئەم شارە جێ هێشتووە. چونکە لەهەر خاڵێکی بازنەیی دەست پێ بکەین، ئەوا لەو شوێنە کۆتایی پێدێ، واتە پرۆسەیەکی داخراوی ژیان وێنە دەکات.

بازنەیی هەڵکەوتەی (هەولێر) لە (قەڵا)وە دەست پێ دەکات، دواتر رێگەی(٣٠م) ی و دواتر (٦٠م)ی و دواتر (٤٠م)ی دوایش (١٠٠م) کە هەر هەموویان عەقڵیەتێکی داخراویان داوەتە بواری هزری و عەقڵی خەڵکی ئەم شارە، وەک بڵێی لێرەوە ژیان دەست پێبکات و هەر لێرەوەش کۆتایی پێدێت.

وەک لەمەوبەر ئاماژەم پێدا (هەولێر) لەچەندین هۆز و خێڵ و بنەماڵە و دەرکراوی جۆرەها شار و ناوچەی تر پێک هاتووە، کە هەریەکەیان جۆرێک لە کولتوور و داب و نەریت و ئەبستمۆلۆژیای عەشایەری و ئایینییان هەڵگرتووە. بێگومان فراوانبوونی هەولێر لەدوای ساڵی (١٩٨٧)ەوە دەستی پێکرد، بەتایبەت دوای ئەم شەپۆلی راگواستنەی دەشتی هەولێری گرتەوە، دواتر راگوێزانی لادێیەکانی پشت چیای (سەفین). لەئەنجامی هەموو ئەمانەدا بێگومان رووبەڕووبوونەوە پاشان بەیەکداکەوتن و نەشاز گونجانی کولتووری، لێدەکەوێتەوە. ئەگەرچی کورد بەردەوام رەسەنی خۆی دەگەڕێنێتەوە سەر (هۆز، بنەماڵە، یا

تەنانەت، دێ...) کورد بەگشتی شانازی بە هۆز یا خێڵەکەی خۆیەوە دەکات، هەر لەم بارەیەوە های Hay دەڵێ: "زۆربەی کورد، شارنشین بێ یان دێ نشین، بنەچەی خۆی دەگەڕێنێتەوە سەر هۆز. بەمەش دەیەوێت بڵێ کە پەیڕەوی عورفی عەشایەری و داب و نەریتەکان دەکات و هیوا دەخوازێ کە کەسانی تریش بەم شێوە مامەڵەی لەگەڵدا بکەن."[٤٤] ئەمەیان تایبەتمەندییەکی سەرەکی هزری وفیکری کوردانە. لازاریف دەڵێ: "بەرچاوترین خسوسیەت کە لەسیستەمی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگەی کوردی بەدی دەکرێت، هێشتا مانەوەی پەیوەندی خێڵەکییە، کەسیستەمی دەرەبەگایەتی لەژێر خۆی حەشارداوە، هەروەها ڕێ و شوێنی پەنجەکانی بە ئاشکرا لەسەر ژیانی کۆمەڵگەی کوردەواری دیارە، سەر بەعەشیرەت بوون بۆ کورد شانازییە، واتە هەستی خێڵەکی لەپێشەوە دێت، لەپێشەوەی هۆشیاری ئایینی و نەتەوەییەوە دێت". ئەمە سەرەکیترین خاڵی پێکهێنەری کەسایەتی مرۆڤی کوردە، بەگشتی و خەڵکی (هەولێر) و ئەم شارە (هەولێر) بەتایبەت. کە ئەمەشیان داخراوەیی عەقڵی کورد دەگەیەنێ.

بێگومان ئەمە ڕەنگدانەوەی بەسەر پێکهاتەی یا دروست بوونی شاری هەولێر دیارە.

ئەم ڕاگواستنە و کۆچە بەزۆرەملێ و دەرکردنانە دووفاقی کەسایەتی خەڵکی ئەم شارەی قووڵ تر کردووە. لەدوای ڕاپەڕینیش گەڕانەوە بۆ ئەسڵ و نەسەب بوو بە بەردی بناغەی سیاسەت و کۆمەڵگەی کورد. بێگومان ئەم ڕەسەنەی کە بەردەوام تاک و کۆمەڵگەی کوردەواری پێی دەناسرێتەوە، کریکەریەکی جەدەلی نێوان ئەم هزرانە و جوگرافیاکەی (هەولێر) دروستی کردووە.

لە جوگرافیای (هەولێر) چەندین گەڕەک بەم ناوە عەشایەرییانە بەدی دەکرێت، کە هەموو ئەمانەش لەمیانەی دابەشبوونی جوگرافی و ژینگەییەکانەوە دروست بوون. بۆیە لێرەدا پێویست دەکات باس لەشێوە دابەشبوونی جوگرافی هەندێ گەڕەک لەڕووی دابەشبوونی دانیشتووان و پێکهاتەی هزریان و کاریگەری بەسەر دابەشبوونیان لەڕووی گەڕەک و جوگرافیای ژینگەییان بکەین.

مەبەست لەم هێڵکارییەی سەرەوە پیشاندانی پێکهاتن و هەڵکەوتنی جوگرافی و کاریگەری دەروونی ئەم شوێنانەیە بەسەر هەندێ گەڕەکی (هەولێر)، کە تەنانەت کاری کردۆتە سەر چێژ و میزاج و هزری خێڵ و بنەماڵەی دانیشتووانی گەڕەکەکان. کە بەم شێوەی خوارەوە دابەشیان دەکەم:

١- گەڕەکەکانی ڕێگای مەخموور و ئەوانەی لێیانەوە نزیکن، وەکو گەڕەکەکانی (ڕزگاری-کوران)، ماجیداوە، کرێکاران...

گەڕەکی (کوران) یەکێکە لە گەڕەکە میللی و هەرە کۆنەکانی هەولێر و لەسەر بنەمای (کار) دامەزراوە، چونکە لەکۆندا شوێنی سوورکردنەوەی کەرپووچ بوو لە ڕێگەی ئەو (کورە) جۆراوجۆرانەی لەجێی ئەم گەڕەکە هەبوو، دواتر کرێکارەکانیشی لەم شوێنەی نزیک کارەکانیان بۆخۆیان دەستیان کرد بە دروستکردنی خانوو. ئەمە سەرەڕای گەڕەکی (کوردستان) و شەهیدان و (نەسیج)، زۆرترین ئەگەر هەمووشی نەبێت، ئەوا لەبنەچەدا دانیشتووی (دەشتی هەولێر) بوون و ئێستاش ئینتیمایان بۆ (دێ و هزری گوند) هەیە. کەسایەتی عەشایەری و ئایدیۆلۆژیای ئایینی زاڵە بەسەریان. تەنها لەهەرسێ گەڕەکی (کوران، کرێکاران، کوردستان...)[٢٢] مزگەوت و (٤) تەکیە هەیە. خەڵکی ئەم گەڕەکانە وێڕای ئەوەی بەشێوەیەکی گوندییانە دەژین. ئەوا لەهەمان کاتیشدا لەنێو (هەولێر) بەئەقڵ و کردەی تەقلیدی گوندی بچووکیان پێک هێناوە. تەنانەت ئێستاش لە نزیک ماڵەکانیان ئاژەڵ یاخود پەلەوەر بەخێودەکەن و زۆربەی زۆریان خاوەن دوو خانو و و ماڵن، یەکێکیان دێ نشین و کشتوکاڵ و بیستانی تێدادەکەن، ئەوی تریشیان لە (شار)ە کە کاری تری تێدا دەکەن. ئەمەش دووفاقی دەروونی و کۆمەڵایەتی و کولتووری پێکهاتەی کەسایەتی ئەم گەڕەکە و خەڵکەکەی دەردەخات. خەڵکی ئەم گەڕەکانە گەر بۆ مەبەستی بەخێوکردنی پەلەوەر و ئاژەڵ نەبێ حەز بەباخچە دروستکردن و پەروەردەکردنی ناکەن میزاجیان خۆڵییە، بەڵام بەهۆی زاڵ بوونی

کاری کشتوکاڵی و شوانکارەییەوە، ئەوا پەیوەندی نێو خێزانەکانیان بەهێزە و زۆربەیان لەخێزانی درێژکراوە ژیان بەسەر دەبەن. سەرەڕای زۆری ژمارەی مزگەوت لەم گەڕەکانە بەتایبەت لەگەڕەکی (کوران) کە بەتەنها (١٦) مزگەوتی تێدایە، ئەوا ڕێژەی ئەم دوکانەش گەلێک زۆرە کە بەناوی (یاریدەدەری پزیشکی)یەوە دروست کراون. هۆی ئەوەش وێڕای عەقڵ، نەخۆشی خەڵکی ئەم گەڕەکانە ئەوا بریتییە لە پێی ژینگەیی ئەم گەڕەکانە و زۆرتری ئاستی ڕۆشنبیری زۆرینەی خەڵکەکەیەتی، بەڵام کاتێ سەیری گەڕەکی (ماجیداوە) دەکەین کە لەسەر بنەمای ئەتنیکی (بندیان) کە لەبنەچە ئەمانە (مەسیحی) بوون، دواتر بوونەتە موسڵمان و پاشان (بندیان)یان وەک عەشیرەت بەکارهێناوە زۆربەی هەرە زۆریشیان (بندیانن)، لەلادێکانی وەکو "دێمەکار و قورشاغلو"(٤٥) هاتوونەتە هەولێر و پەیوەندی کۆمەڵایەتییان بەهێزە و لەسەر بنەمای خوێن و دەمارگیرییە. ئەم خەڵکە لەڕووی روخساریشەوە وەک عەقڵیان دێ نشینن، ئەگەرچی لە کۆمەڵێ خانووی کۆنکرێت نیشتەجێن و ئامێری مۆدێرنی تەکنەلۆجی بەکاردەهێنن.

هەروەها کاتێ سەیری گەڕەکەکانی ڕێگەی (کەرکووک) دەکەین، بەتایبەت گەڕەکێکی وەکو (مەنتکاوە) کە دیارە ئەوەشیان هۆزی یا عەشیرەتی (مەنتک+ئاوا) ئاوەدانیان کردۆتەوە ئەمانەش لە "زورگەکانی قوشتەپە و تەق تەق"دوە(٤٦) هاتوون. بەهۆی زاڵ بوونی هزری خێڵەکی و عەقڵ و جوگرافیای گەڕەکەکە، حەز و ویستیان بەلای ژیانی دێ دەچێ و پەیوەندی خزمایەتییان لەڕێگەی خوێن و دەمارگیرییەوە دروست کردووە. دەبووایە دانیشتوانی ئەم گەڕەکە بەهۆی نزیکییان لەدامودەزگا رەسمییە زانکۆییەکان هۆشیارتر بوونایە لەگەڵ ژیانی مەدەنیەت، ئەمە سەرەڕای ئەوەی هاموشۆی زۆربەی شارەکانی تری لەسەرە، کاتێ دێیتە سەر باسکردنی ئەو گەڕەکانەی دەکەونە سەر ڕێگەی (عەینکاوە-موسڵ)، ئەوا زۆربەی پێکهاتەی خەڵکی ئەم گەڕەکانە دانیشتووی دۆڵی (بەرانەتی)ن، یاخود (گۆران و گەردی و فەقێ مەلکی) بوون. ئاستی هۆشیاری ئەمانەش پشت بە مەرجعییەتەکەیان دەبەستێ کەخۆی لە ئینتما بۆ خێڵ و هۆز و دواتر ئایین دەبینێتەوە.

هەولێر و خەڵکەکەی بەم پێکهاتە کولتوورییە سەیر و کۆکتێلەیان هزرێک و ئەبستمۆلۆژیایەکی عەقیدی و هەمە چەشنیان پێک هێناوە.

دەکرێ ئەمانە هەموویان هۆیەک بن بۆ خودپارێزی و کۆنسێرڤاتیزمیەتی پتر لەنیوەی خەڵکی (هەولێر) کە لەدوودڵی و نیگەرانی بەردەوام بەرامبەر ئەوی تری خاوەن گۆڕان، هەنگاو دەنێت بوونەتە جۆرێک لەخەڵکانی سەیر و دووفاقی لەکەسێتی.

گومانی ناوێ لەئێستا دەگەینە ئەو باوەڕەی کە زۆربەی خەڵکی (هەولێر) دێ نشین بوون و ئێستاش بەبەردەوامی لەشێوەی (گەرمیان و کوێستان) لەنێو شار ژیان بەسەر دەبەن، ئەمەش لەخۆیدا باوەڕنەبوون و بێ متمانەیی بە (شوێن) دەبەخشێ، ئەمەش کاردانەوەی ئەوپرۆسە دیالەکتیکییەی نێوان خەڵکی (هەولێر) خۆی و پێکهاتە سەیرەکەیەتی. جالێرەدا ئەم دیاردەیە دەتوانرێ لەلای (دێ) نشینەکانی دەرەوەی (هەولێر) وەکو (دەشت نشین یا چیا نشینەکان) بەدی بکەین، بەتایبەت لەلای خەڵکە دەشت نشینەکان ئەوانەی دەتوانم بڵێم لەژێر گوشار هاتوونەتە (هەولێر) و تێیدا نیشتەجێبوون. جالێرەدا ململانێی نێوان بەها (کۆن و نوێیەکان) سەری هەڵداوە. گومانی ناوێ لەم دوایانە هەولێر و خەڵکەکەی لەڕووی (مادی)یەوە و بیناکارییەوە گۆڕانیان بەسەردا هاتووە، بەڵام دیسانەوە ململانێی کۆن و نوێ لەبەردەوامی دایە و دڵنیاشم ناپسێتەوە. ئاساییە گەر لەنێو کوردبەگشتی و (هەولێر) بەتایبەتی کەسێکت بەرچاو بکەوێ کە خودانی نوێترین مۆدێلی خانو و تەکنەلۆجیا بێت، بەڵام خاوەن ئاوڕێکی پاشڤەڕۆیی ڕۆژهەڵاتییە، لێرە ڕێک تیۆرەکەی (ئۆگیبێرن) کە دەسەپێتە سەر ئەم جۆرە کۆمەڵگەیانە کاتێ دەڵێ: "هۆکاری دواکەوتنی کولتووری کۆمەڵگەیەک بریتییە لە پێشکەوتنی لایەنی ماددی بەرامبەر

دواکەوتوویی لایەنی ئایدیالی لەبەرامبەر پرۆسەی گۆڕان"[٤٧] ئەمە لایەنێکی دۆڕانە لەهزری تەقلیدی خەڵکی ئەم شارە کە جارانێکی پڕ لە سەرامەت و کۆنسێرڤاتیزمانە بەرگریان لە عەقیدە و کولتوورە تەڵقینییە تەقلیدییەکانیان لێ دەکرد، دیارە گۆڕانی ترسیشی دێتە شوێن. دەکرێ بڵێین ئەمانە گۆڕانی رووکەشن. بێگومان ئەم گۆڕانە بەددر لەریشەییە کاریگەری نەکردۆتە سەر پێکهاتەی شوناسی تاکی (هەولێر) یا بگرە گرووپە دەستە جەمعییە کاربەدەستەکان بۆ مەبەستی دروستکردنەوەی وەکو شار، نەوەکو شارێکی ناودرۆک لادێیی. دیارە ئەم ئاستە هزرییەی لەم گۆڕانە دێتە ئاراوە، ئەوا هزری پێکهێنەری ئەقڵیەتی هەولێرییەکانە کە زمان و دیالەکتیکی جوگرافی و خەڵکی ساویلکەی ئەم دەڤەرەن کە لایەنی ئەقڵیەتی تەقلیدی پێوە دیارە. بێگومان ئەم رەوشە ئەقڵیەی نێو ئەم شارە بە (دێ) کراوە، رەنگدانەوەی تەواوی کۆمەڵگەی کوردە کەخۆی لەسەنتەر بوونی زۆربەی هەرە زۆری عەقڵی تاکەکان، لەلایەنی عەشایەری و هزری خێڵ و بنەماڵە و هۆز دەبینێتەوە. ئەمەش سەرەکیترین بکوژی شوناسنامەی خود و شار پێک دێنێ. هەر ئەم تایبەتمەندییەش بەسەر تەواوی هەرەسی شۆڕشەکانی کورد دیاربووە. "زۆر بزاڤی کوردی سەریان هەڵداوە لەمێژوودا، بەڵام نەیانتوانی ئامانجەکانیان بەدەست بهێنن، چونکە سەرکردایەتی ئەم بزاڤانە بەدەست سەرۆک هۆزەکان بوون"[٤٨]. بێگومان لەلایەنی جوگرافییەوە نیشتەجێبوونی ئەمانە لەخۆیاندا، هەمان ئەقڵیەتی هۆز یا عەشایەری بنیاتنەری یا هێزی زۆرەملێ و راگواستنی خەڵک و پەیوەستبوون بەسۆز یا نوستالیژیا بۆ دوێنێ و گەڕانەوە بۆ بنیاتنانی هەمان هۆزی مونتەمی بوونیان بۆی، بەڵام لەفەزا و جوگرافیایەکی جیا لەودی جاران هەمان هۆز یاخێڵ یا دەسەڵاتی رۆحی شێخ یا سەید یا هەر یەکێکی تر، بەڵام لەگەڕەکێک لەسەنتەری شار لەنزیکترین دەوروبەری. دیارە لەمەشیان یەکێک لەسەرەکیترین پێکهێنەردکانی هەر شارێک جیاواز نییە، جیاوازی لەهەموو پێکهێنەرەکانی وەکو (ئابووری، پیشە، سیاسەت، ئیدارە، هزر...) بەڵام لەنێو، ئەم شارە جیاوازییەکی زۆر کەم یا رێژەیی زۆر کەم هەیە. بەتایبەت لەلایەنی عەقڵی، کە لەم شارە و لەم کۆمەڵگەیە تاکە دوو مەرجەعییەتی (ئایینی و عەشایەرییە) لەئارادا هەن، کە ئەم دووانەش تەواوکەری یەکترن. تەنانەت لەحاڵی ئێستا، ئەم چونیەکەش لەپێکهاتن و دروستکردنی خانووبەرەش زۆر بەزەقی دیارە. لە هەولێر زۆربەئاسانی دەتوانین هەست بەشێوازی دروستکردنی بیناو خانووەکانی ئەم شارە بکەین، کە زۆربەی خانوو بیناکانی ئەم شارە لە جۆری (ئاسۆیین). ئەمەش مانای نەبوون یا بیرکردنەوە لە جیاوازی و پێناسەکردنێکی جیاواز بۆ خود، دیارە مەبەستیشم ئەم یەک دوو ساڵەی دوایی نییە، کە لەژێر گوشاری تەکنەلۆژیا و ئابووری خەریکە جوگرافیای تەقلیدی و ساوەکەی هەولێر دەگۆڕێت. بێگومان ئەم دیاردەیەی خانووبەرە لەهەولێر لەسەرجەم ئەم چەندین گەڕەکەی هەولێر لەمەوبەر باسم کرد، بەدی دەکرێ، بەهۆی زاڵ بوونی ئەم هزری عەشایەرییە کە بریتییە لە، ویستی یا حەزی لەیەکچوون و نمایشکردنی شوناسنامەی (ئەویتر) کە دەشێ شێخ یا سەید یا مەلا وەکو مەرجەعێکی ئایینی یا وەکو هۆز، خێڵ، بنەماڵە وەکو مەرجەعێکی عەشایەری. لێرەدا ئەم هزرە وای کردووە خەڵکی ئەم شارە بەگشتی و لەو گەڕەکانەی لەمەوبەر و بگرە زیاتریش کە باسم نەکردوون، جۆرێک لەوێکچوون پیادە بکەنەوە وەک ئەوەی لە(دێ یا گوند) زۆر زۆر بەکەمی یا هەز جیاوازیان تەنانەت لەشێوازی ژیانیشیان بەدی نەدەکرد. بۆیە ئەمانە ئێستاش شێوازی ژیانیان لەگەڵ بەکارهێنانی هەموو ئامێرە تەکنەلۆجییە نوێیەکانی سەردەم هەر تەقلیدییە و نازانن چۆن یا بۆچی، یاخود کەی هەست ددکەن دەژین؟! بۆیە لە نێو شاریش ئەمانە دووچاری یا رووبەڕووی دووفاقی زیاتر لەچاو کەسانی تر یا توێژ و چینەکانی تری کۆمەڵگە دەبنەوە. چونکە لەگەڵ ئەوەی لەشارن، بەڵام زۆربەیان پەلەوەر یاوەک لەمەوبەر وتم ئاژەڵ بەخێو دەکەن یا لە (دێ بێستان و کشتوکاڵ) دەکەن، کە لەوکاتە

خانوویەک یامالێکیان لەشارە و ئەوی تریش لەدێ هەیە. کەچی بەپێچەوانەوە، دانیشتووانی ڕێگەی کۆیە زیاتر ئەم گەڕەکانەی لەم چەندان ساڵانەی دوایی دروست کران زۆربەیان دانیشتووانی دەشتەکانی (کۆیە، قەڵادزە، ڕانیە) بوون، جگە لەخەڵکی سێتاقان کە زۆربەی هەرەزۆریان (بیرێژی یا خۆشناون). دیارە ئەمانەش بەوە ناسراون کە وەلائی سەرسەختیان بۆ هۆز و خێڵەکانیان هەیە. ئاستی ڕۆشنبیری ئەم گەڕەکانە جگە لە سێتاقان تا ئاستێک باشترە لەچاو گەڕەکەکانی (کووران، کەرێکاران، کوردستان...هتد)، خەڵکی گەڕەکەکانی ڕێگەی کۆیە زیاتر حەز بەبوونی باخچە و پاک و خاوێنی دەکەن، سەرەڕای گرنگی دان بەپاک و خاوێنی گەڕەکەکەیان کە دیارە ئەمەش ڕەنگدانەوەی ژیانی لەمەوبەریان بووە کە زۆربەیان خاوەنی (ڕەز یا باغ) بوون.

کاتێ دێینە سەر گەڕەکەکانی تر، بەتایبەت ئەوانەی کەوتوونەتە سەر ڕێگەی (شەقلاوە)، بێگومان هەست بەجۆرێکی تر لەعەقڵییەت و سیستمی عەشایەری کورد دەکەین، کاتێ زۆربەی خەڵکی ئەم گەڕەکانە خۆیان لە عەشایەرەکانی وەکو (سورچی، خۆشناو، باڵەکی...) دەبیننەوە. بێگومان ئەوانە لەڕووی ئاینییەوە کەمتر بەتەنگ ئەوەوەن، بەڵکو زیاتر عەشایەری و ئینجا نەتەوەیی یا بێلایەنن. بەهۆی زۆربەی ڕێگەی هاتوچۆ، هەروەها ئەم ناوچانەی ئەوانە لێوەی هاتوون وەکو (ڕواندز، چۆمان، شەقڵاوە، مەسیف...) ئەوا خاوەن ڕۆشنبیری لاوەکی زیاتر و ئاستی هۆشیاریەکی کۆمەڵایەتی جیاوازن یا بەرزترن، ئەوەتا بە هەموو گەڕەکی شۆڕش تەنها (٥ مزگەوت هەیە) هەروەها زۆر بەتەنگ باخچە و جوانی و هێمنی و دیاریکردنی ڕێژەی منداڵ و پەروەردەکردنیانن، هەروەها زۆربەشیان پارەدار و موڵکدارن، سەرەڕای بوونی بڕوانامە لەلایان. هەروەها زۆربەشیان فەرمانبەری دەوڵەتن.

بەگشتی خەڵکی ئەم شارە لەناخیان ژیانی دێ یا ژینگەیی (دێ)یان لەنەستیان بیناکردووە، دیارە ئەمەش لەمیانەی ئەو پرۆسە بەردەوامەی چەپاندن بووە لەکۆمەڵگەی کوردەواری کەتاکی کوردی لە زۆربەی لایەنەکانی دووچارکردۆتەوە. ئەمەش وای کردووە نەتوانرێ نەست بکرێتە هەست. دیارە ڕاگواستن لە زێدی باب و باپیران خەیاڵێک یا وێناکردنێکی بەردەوامی گەڕانەوە بۆ شوێنی ڕەسەنایەتی جارانی ژیانیان لەدێ، یا گرتنە بەری ڕێگەی دروستکردن و پێکهێنانی ژینگەیەک کەڕێک یا نیمچە وێکچوونێک بەژیان و ژینگەی دێ پێک بهێنێ دروست کردووە. وەک لەسەرەتا ئاماژەم بۆ کرد بەهۆی هەڵکەوتەی جوگرافی (هەولێر) کە دەشتاییە، ئەوا ئەم تایبەتمەندییە زیاتر وای کردووە کە ئەم خەڵکە قەدەری و چاوەڕوانیکارانە بژین و لەنێو شار ژینگەی گوندی و لەبواری پیادەکردنیش لەدەوروبەریان پەلەوەر یا ماڵات بنیاد بکەن یا بەخێو بکەن، ئەمەش بۆتە هۆکارێکی پێکهێنانی کەسایەتی دووفاقی و بەرژەوەند چییەتی، چونکە یەکێک لەم خەسڵەتانە لەکارکردنی کشتوکاڵ دەکەوێتەوە، بریتییە لە (قەدەری بوون و ئاسمان دۆستی، هەروەها پێکهێنان و گەڕان بەشوێن بەرژەوەندی تاکەکەس یا خێزانێک بەتەنیا)، بۆیە ئیسماعیل بێشکچی ڕاستی بۆچووە کاتێ دەڵێ: "بەهۆی باری ئابووری و بەرهەمی ئاژەڵداریەوە، هەستی پێکهاتن و پێکەوە ژیان و هەستی نەتەوەیی و بیرکردنەوە لەسەربەستی گەل نەهاتۆتە ئاراوە". بێگومان هەستی بەرژەوەندچێتی بۆ بەرژەوەندی تاک خۆی، خەسڵەتێکی دەروونی و غەریزییە، بەڵام لەم شارە زۆر لە ئاستی ئاسایی تۆڵەسەندنەوەیان لەئەوی ترێک لە (خوا) داوا دەکەن بەمەیش بۆچوونەکەی لەمەوبەر دەسەلمێنن، چونکە کەمینەیەکی زۆر کەم کە نەبێ کەس بەتەنگ بەرژەوەندی گشتی و شار (هەولێر)ەوە نییە، دیارە دروستکردنی گەڕەکەکانیش بەناوی (کار و، هۆز و بنەماڵە و....) ڕاستی نزمی ئاستی هۆشیاری و نەتەوەیی دەسەلمێنێ. بێگومان دەشێ یەکێک لە هۆکارەکانی نزمی ئاستی هۆشیاری خەڵکی ئەم شارە، بوونی زۆرینەیەکی جوتیار و کشتوکاڵ کار بێ، کە بەردەوام کەمتر گرنگی بە خوێندن دەدەن و بەکارێکی لاوەکی

لەبەرامبەر کشتوکاڵ سەیری دەکەن، ئەمە سەرەڕای ئەو ئیلتیزاماتە چڕوپڕەی (ئایین) کە خەڵکی ئەم شارە پێی دەناسرێتەوە و دەیەوێت جێبەجێی بکات، بەڵام لێرەدا دووچاری دووفاقی دەبینەوە بەهۆی داخوازییە مادییەکانی ژیان و داوامیسالییەکانی ئایین. جا یەکێک لە پێکهێنەرەکانی دووفاقی کەسایەتی وەکو فاکتەر (درۆکردن)ە، بەڵام بۆ ئەمەشیان پاڵنەری (ترس) هەیە. بۆنموونە دکتۆر عەلی وەردی باس لەوە دەکات و دەڵێ: "سەرەکیترین و ترسناکترین کار بەلای ژیانی جوتیارانی عێراق، بریتییە لە ترسیان لەفەرمانبەران و سەرانەوەرگرانی دەوڵەت لەبەرامبەر مەرومالات و داهاتە کشتوکاڵییەکانیان بەمەبەستی دانان و سەپاندنی باج لەسەریان، ئەمانە (جوتیارەکان) هەوڵ دەدەن رابکەن لەدەستیان یا بۆئەوەی لێیان رازی بن و خۆیان بەدوور بگرن لێیان، ئەوا درۆیان لەگەڵ دەکەن"(٤٨). لێرەوە بەرژەوەندی تاک یا خێزان گرنگتر دەبینرێ لەبەرامبەر یاسای دەوڵەت و خزمەتی گشتی، دەشێ ئەمەیان هۆکارێکی پاڵنەر بێت بە جوتیارانی هەولێر کە کەمتر گرنگی بەخوێندن بدەن، ئەمە لەگەڵ ئەوەی هەر لە ساڵی (١٩٢٦)ەوە یەکەمین قوتابخانە لەم شارە کراوەتەوە، بەڵام دیارە تێگەیشتنێکی زانستیانە بەدی نەکراوە بۆ قوتابخانە و یاسای پۆزەتیڤیزمی دەوڵەت. هەموو ئەمانەی کە باسکران، خاڵێکی تری ئەم چەندان گەڕەکانەی لەسەرەتا باسکران، دێننە واری زێدەکاری، چونکە لەم گەڕەکانە زۆرترین ڕێژەی خانووی نایاسایی بەدی دەکرێت، ئەمەش واتای کارکردن دەدات بەیاسای عورفی و نزمی ئاستی هەر هۆشیارییەکی بەدەر لە عاتیفەی ئایینی و عورفی عەشایەرگەرییە لەم شارە.

سەرچاوەکان:

١- الوردي، د. علي الوردي، دراسة في طبيعة المجتمع العراقي، ص٣٢٣.
٢- موحسینی، مەنوچێهر، دەروازەکانی کۆمەڵناسی، و-کۆمەڵێک وەرگێڕ ص٦٠٤.
٣- هەمان سەرچاوەی (١) ص٣٥.
٤- گۆڤاری سەردەم، ژ ٢٩، ل٣٧، ساڵی ٢٠٠٣.
٥- الناطور، د-شمادة الناطور و د-احمد عوداث و اخرون، مدخل الي تاريخ الحضارة، ص١٤.
٦- هەمان سەرچاوەی (٢) ل١٠٣.
٧- کلۆس، پیتەر، کلۆس، ئەنسرۆپۆلۆژیای کولتووری. و-خلیل محمد شلماش، ل٦١.
٨- سیوەیلی، ڕێبوار، قەفەسی ئاسنین، ل٨٥.
9- Ruth benddict (Patterns of culture) p.42.43.
١٠- گ. مەدەنییەت، ژ٨٠، ساڵی ٢٠٠٠.
١١- الحسن، د. احسان محمد الحسن، النظريات الاجتماعية، ص٢٥٩.
١٢- هەمان سەرچاوەی (١١) ل٢٢٢.
13- Henrry Barnes (History of Soalogy). p206.
١٤- خلدون، ابن خلدون، المقدمة ص١٢٥.
١٥- هەمان سەرچاوەی (٥) ل٨٢.
16- Dawson and Caettys. (Anintroduction to Soaology) p583-585.
١٧- هەمان سەرچاوەی (١٤) ص٣٧٧-٣٧٨.
١٨- کلۆس، پیتەر کلۆس، و-خلیل محمد شەڵماشی ل٨٥.
١٩- هەمان سەرچاوەی (١٨) ل١٧٤.
٢٠- سلمان، عبد علي سلمان، الانثروبولوجيا الاجتماعيه، ص٦٩.
٢١- هەمان سەرچاوەی (١) ل٣٢٧.
٢٢- هەمان سەرچاوەی (٢٠).
٢٣- هەمان سەرچاوەی (٥) ل١٣٣.
٢٤- باقر، طه باقر و فواد سفر، المرشد الي موطن الاثار و الحضارة، الرحلة الخامسة ص٣.
٢٥- یوسف ئەحمەد دەرگەڵەیی، مێژووی شاری هەولێر. ص٢٩.
٢٦- هەمان سەرچاوەی (٢٥) ل٣٠.
٢٧- هەمان سەرچاوەی (١) ل٣٦٤.
٢٨- هەمان سەرچاوەی (٢٥) ل٣٤.
٢٩- هەمان سەرچاوەی (١٤) ل١٤٧.
٣٠- شریف، عبدالقادر طاهر شريف، المجتمع الكردي، ص٣٨.
٣١- هەمان سەرچاوەی (١) ل٦.
٣٢- الحسن، د. احسان محمد الحسن، موسوعة علم الاجتماع، ص٣٢.
٣٣- بەرزنجی، عومەر لەتیف بەرزنجی، مزگەوت و تەکیەکانی هەولێر ص٣٩٨-٤٠١.
٣٤- هەمان سەرچاوەی (٣٣) ص ٤٠١.
٣٥- هەمان سەرچاوەی (١) ل٣٢٥.
٣٦- هەمان سەرچاوەی (١) ل٢٩٤.
37- mAciever and Page (Socity) p580.
٣٨- هەمان سەرچاوەی (١) ل٢٨٦.
٣٩- هەمان سەرچاوەی (٣٣) ل١٣.
٤٠- هەمان سەرچاوەی (٢٥).
٤١- هەمان سەرچاوەی (٣٢) ل١٧١.
٤٢- هەمان سەرچاوەی (٢٥) ل٢٨.
٤٣- هەمان سەرچاوەی (٣٢) ل٤٢٣.
٤٤- هەمان سەرچاوەی (٣٠) ل٣٤.
٤٥- هەمان سەرچاوەی (٣٠) ل١٦٧.
٤٦- هەمان سەرچاوەی (٣٠) ل١٦٧.
٤٧- النوري، د. قيس النوري، د. عبدالمنعم الحسن، النظريات الاجتماعية ص ٢٣٨.
٤٨- هەمان سەرچاوەی (٣٠) ص٧٣.

# بەیتی توورگ

**کۆکردنەوە و ئامادەکردنی:**
**کەریم محەمەد شەریف**

زۆر لە منداڵییەوە گوێم لەخەڵک بووە، کە ئەگەر یەکێ باسی شتێکی کردباو کۆتایی نەهاتبا دەیانگوت: (بەیتی بلەیە، بویتە بەیتی بلەی هەر نەبڕایەوە). لەم گوتەیە ئەوە دێتە دەست کە، یان کەسێک ناوی (بلە) بووە و بەیتبێژ بووە و زۆری بەیت زانیوە و بەیتەکانی هەر نەبڕاوەتەوە! یان ئەوەتا بەیتبێژ بەیتێکی داناوە بە ناوی (بلە) ئەو بەیتە زۆر دوور و درێژ بووە و خەڵک زۆر درێژ هاتووتە بەرچاویان و کردوویانە بە نموونەی بەسەرهات و چیرۆک و باسی دوور و درێژ، لەهەردوو حاڵەتدا ئەم گوتەیە (بەیتی بلەیە) نیشانەی دەوڵەمەندی فۆلکلۆری کوردییە، بەداخەوە تا ئێستاش هیچ دەقێکم بەناوی (بلە) لە دەقەکانی بەیت نەکەوتووتە بەرچاو، بەو هیوایەی ڕۆژێک بێت و بەیتی بلەش کۆبکرێتەوە و چاپبکرێ.

بەیتی تورگ بەیتێکی گاڵتەئامێزە و شێوەیەکی کۆمیدی هەیە، لەم بەیتەدا (تورگ) کە گیانلەبەرێکی ناشیرین و ناحەزە و خەڵک خۆشیان ناوێ، ئەم گیانلەبەرە کراوەتە بەلایەک و بەردراوەتە گیانی (حکومەت) و (ئاغا) و (کرمانج) و (ژن) و (پیاو)ان و کەس دەرەقەتی نایێ، وەک لە بەیتەکەدا دەردەکەوێ، خەڵکەکە چەند لە تورگ دەترسێن، زیاتریش لە (بەیتبێژ)! چونکە بەیتبێژ بە وشە وێنەی ترسان و ترسنۆکییەیان دەگرێ، بۆیە (عومەراغەی شێخ شەروانی) نایەوێ (عوسمان)ی بەیتبێژ ئاگاداری ئەم ڕووداوە بێت، چونکە دەیکاتە بەیت و بەیتەکەش بەنێو خەڵکدا بڵاودەبێتەوە.

بەیت شێوەیەکە لە فۆلکلۆری کوردی و هەر تەنیا بریتی نییە لە بابەتی گاڵتەئامێز، بەڵکە بابەتی تراژیدی و ڕۆمانسی و ئایینی و پاڵەوانییەتیش دەگرێتەخۆ. لەڕووی کێش و قافیەوەش شێوەی کوردەوارییە و لەسەر کێشەکانی پەنجە دەڕوات و بەپێی پێویست و توانای بەیتبێژ کورتی و درێژی تێدەکەوێ، لەباری قافیەشەوە، بەشێوەی جووت قافیەو یەک قافیە بەیت دەهۆنرێتەوە، بەڵام لە بەیتی درێژ، بەیتبێژ یەکرەنگی بەیت دەپارێزێ، بەڵام، لەڕووی قافیەوە، قافیەگۆڕی دەکرێ، جگە لەکێش و قافیە بەیت ئاوازی تایبەتی خۆشی هەیە، کە زۆرتر لە هەندێ ئاوازی بەستەی شایی دەچێ. **سەرنووسەر.**

**دەبا بەحسێ تورگی بێ**
**تورگ تورگی زەمانی**
**بابی شێتە و ڕەحمانی**
**ئەو بە تورگان دەزانی**
**مام ڕەسورکەی لەدێیە**
**دوو گوجیلەی پوزەی پێیە**
**کارک و گۆرەی لەپێیە**
**دەڕێی کوڕە فەقێیە**
**دەگەڕا لە حەوشێیە**
**دەیگۆ تورگ لە کێیە**
**دەبڕۆنە ئەحمەد خانە**
**ردێنی نۆ بست پانە**
**دەیگۆ تورگ شەیتانە**
**هاتیە حەسەنی کوڕی**
**خەنجەر سرقی نابڕی**
**خۆی لە تورگی ڕاخوڕی**

مێرێ دەیگۆ وەی شێرە
دوو گیسکان بکەینە خێرە
نەوەک تورگ بێتە ئێرە
مارمان بکا بێ خێرە
سمایل دەیگۆ کانەبی
چاوێ داکت کوڕەبی
قەزامان لەبۆ دەبی
لەو کانەبی حەوێزی
لە هەسپی دانابەزی
دەیگۆ تورگ دەمگەزی
هاتیە عەزیزی پاشایە
خۆی لە قەمەرەی نایە
سۆجەری لەمست دایە
ئاغای وا لەگەردایە
خەبەری گوێری درایە
معاونەک هاتبوو
رەشاشی لەگەردایە
کۆدەرە و شیوەشایە
دەمبوو پێکرا لێکدایە
دەیگۆ تورگ ئەشقیایە
ئەحمەد گازی کرد فاتم
بەبن قەرات داهاتم
تووشی نۆ تورگان هاتم
بەپێی ماینێ هەراتم
عاسیە دەیگۆ قەد کەسێ
پیاو لە تورگان ناترسێ
تورگ تورگی ئێمەیە
ددانی وەک شەلفەیە
دەیدا لە عەمەراغەیە
عەمەراغەی شێخ شەروانی
خۆی ناهوو لەناو خانی
دوو کاوڕان بنێرن
ئەوشۆ لەبۆ عوسمانی
نەکو بەندان بزانی
هاتیە نادر سەرکارە
ددانی وەک بزمارە
لە تورگی بردە خوارە

هێشتان لەسەر ئەو حارە
ئەو دەیگۆ تورگ هارە
هاتیە عومەر سەوەرە
تفەنگی دەستی سۆجەرە
لەگەر تورگان برادەرە
ئەحمەد گازی کرد فاتم
هاتیە برایی حاجیە
دەستیان دەدا داریە
هەتا تورگی نەدیتبوو
هەر دەیگۆ تورگ چیە
چاوی بە توورگی کەتبوو
نۆ رۆژ ناوکی کەتیە
هەی حەوە برێ هەی حەوە
لە دیوەخانێ وەرەوە
دەس بدە ئەو دوو دەوە
لە دیار کۆریت وەرکەوە
ئەوشۆ تورگ دێتەوە
خەوە گازی کرد بابە
سوندم خواردیە بە کابە
لۆ خۆت پیاوەکی چابە
تورگ مریشکێ مە نابە
لەو لای هاتیە روقیایە
بەمستان لەخۆی دایە
دایە چاوم کوڕەبی
مریشکەکانمان نەمایە
سبەینە بوو گێم لێ بوو
بەندم لۆ دەرینایە
ئەحمەد گازی کرد فاتم
خدری ئەحمەد نەبیە
قاپ رەشی بە تەنیە
لە قسان تورگیان گرتیە
تورگ دەیگۆ ئەوە چیە
کوشتنم لەسە نیە
ئەسلم فەقێ مەرکیە
هاتیە حوسێنە شینە
سواری ماینێ بەزینە

# دەروێش ئیبراهیمی لهێبانی

سەعدوڵلا ئیسماعیل شێخانی

**- چەند دەقێكی حەیرانی ئایینی.**

١- خۆزی گوردك بام لە گوری نەورۆزێ،
شێن ببام لەسەر كێوی عەرەفات رۆژی عارفەی
وەكی خیوەتی حاجیان هەردەدا لەو مقامی عەرەفات لەناو غوبار و تۆزێ،
ئەی گەلی موسڵمانان دەیاڵلا بەعام بچینە خزمەتی شاهی مەدینەی،
ئەحمەدی موختار لەوێ لەگەر عەزیز و خۆشەویستان بكەین جێژنە و پیرۆزێ.
٢- بوارە گەواران دەبینی و دەبری،
گەوارەكی دادەمەزراند لە دەشتی قەراجی لە برندی سەڕناجی خەندەكی
خەلیفەی تەكیەی برایم، باولی ئەو رەحمەت و بارانە لەسەر جۆتە مەرقەدی دارەخورمایێ دەگری،
دەمگۆتە: بابی كاكەی عەبدولكەریمی دەبا هەگرین دەفە و دائیران تەپری و عەلەمان
لە بەرانبەر جۆتە مەرقەدان، شەمسەدین و گور محێدینی لەسەر ئاوێ رۆخانەی خیوەتێ هەردەین لەگەر تاوری.
٣- بابێ خۆم و دەروێشان مردم هەندێ ئاخت لۆ هەرینم،
ئەورۆ بەوێ پایزێ، نەخۆشەكی گەلە گرانم لەبۆ رەزامەندی خودای كەرەمكە دەمەكێ وەرە سەرینم،
ئەی گەلی موسلمانان با هەرگرین دەفە و عەلەمان و تەپری و بەیداغان شۆڕ ببینەوە لۆ شاری مەدینەی لەخزمەت حەزرەتی رەسولەڵلا عەزیز و خۆشەویستان ببینم.
٤- برام ئەورۆ سەرم زۆر دێشی، دەردێ من هەمووی برینە،
ئەمن دەمگۆتە بابی ئیسماعیلی لەبۆ رەزامەندی خوای دەمەكێم وەرە سەرینێ
دەردم گەلە گرانە بڕەك سەرم راژینە،
دەبا بەژنێ بابی سەید محەمەدی لەبۆ من بمینێ بە دارێ زینەتێ
لەسەر ئاوێ رۆخانەی بەرامبەری مەرقەدی شێخ حەسەنی لەوێ مەشهورە دەست چینە.

٥- دەرێمە درێ خۆم لۆ وها بەنازی،
گەلی ئیسلامی زەمانە دەروێش و مرید و دیوانان یا هەگرین تەپری و عەلەمان لۆ قاپی عەبدولقادری بەغدایێ
لەناو مورشیدان هەر بەخۆت بازی،
دەبا شۆڕ بینەوە لۆ شاری مەدینەی لەپێش رەوزەی راوەستین بەعام بکەین دوعایێ
رجا لە قاپی خودای بکەین بەرکو خودا دوعامان قبورکا مەخسود لەگەر مرازی.
٦- ئاکرێ و ئامێدی لەمن بەدار و ئاوە،
گەلی ئیسلامان با خۆ رێک بێخین بکەین تەدارەکێ مەکە و مەدینان
بچینە خزمەت ئەو پێغەمبەرەی کە خوا دنیا و قیامەتی لەبەر خاتری وی داناوە،
دەبا دەستەو دوعا رابوەستین لەقاپی خوای بەعام رجای لێ بکەین لەبۆ ئەو دینە پاکەی
لۆ خاتری موحەمەدی دینمان مەحفوز بکەی گەلی ئیسلامان دەنا کارمان کراوە.
٧- کاکە بەوێ نیوڕانێ قادر کەردم لەمن بە بەردە.
لە دەوری جێژنێ قوربانێ ئەمن دەچمە مقامی عەرەفاتێ
زەینێ خۆم دەدایێ رێز رێز و قەتار قەتار حاجی خیوەتیان لێ هەردا،
گەلی ئیسلامان چاک بزانن سەرێ چەند سارە
لە ئەسەفی ئەو دینە پاکەی حەزرەتی محەمەد کە لە بۆ موسلمانان بەجێما
ئەورۆ زۆر کەسەردارم ئەمن لۆێ دەستێ خۆم لەوێ دونیایێ بەردا.
٩- برام ئەورۆ سەرم زۆر دێشی درم دەکاتن ژانێ،
ئەی گەلیێ دەروێش و مریدان ئەی گەلیێ ئیسلامان با هەرگرین دەفە و دائیران
بپەڕینەوە لەزیێ دوکانێ بە شارێ کەرکووکێ
رێی باوەو تەرجیلان لە بۆ خزمەت سوڵتان حەسەنی مەشهوورە قوتبی رۆخانێ،
ئەی گەلی ئیسلامان با بکەین خزمەتی ئەو دینە پاکەی حەزرەتی موحەمەد
بۆمەی تەواو کرد لە بۆ رۆژێ قیامەتی پێغەمبەر شافیعە خودا حاکمە لەبۆ عالەمێ دادەنێ دیوانێ.
١٠- دەچمە سەرێ قەندیلی زەینی خۆم دەدا شاری شنۆیێ،
من دەچمە سەر هەیبەت سوڵتانی سەبارەتێ بە چاوی شێخ محێدین و شێخ نەجمەدینی
دەنۆڕمە شاری کۆیێ،
ئەی گەلی ئیسلام و موسلمانی زەمانە بادەرنەچین لە ئەمر و نەهی قورئانێ
جانفیدابین لۆ خزمەتی ئەو دینە پاکەی کە موحەمەدی بۆمەی دانا
لە بۆ رۆژی دیوانێ کە خودا حاکمە خڕدەکاتەوە جەمعی مرۆیێ.

* لە کتێبی سەربردەی کۆمەڵە حەیرانبێژێکی کورد

# كەریم و ستی

كۆكردنەوەی: پیرداود مەخمووری

هێ برا سەرێ من دێشی
دەردێ لەدرم دەناری
با بچین لۆ سەید عوبێدی
كانیە لە ڕۆخ كەنداری
ستی چاوان لێ مەشۆ
مەحبوبەكی نازداری
كەریم زەندێ ستێی گرت
ئاوای كرد لە دیواری
دوو ئاشقی جەوهەردار
دەستیان گرت بەیەكجاری
دەچن لۆ حەسارۆكان
ئەو نێزیكە لەشاری
لە بۆ ڕۆژی تەنگانەی
پۆلیسیان دێنە یاری
لەپیرە ژنەكمان پرسی
كانی ماری سەركاری
سەركار مەلا قادر بوو
سەگباب قەومی سەگساری
ژن و مندار و زەلام
بۆسەیان لێ داناوە
لەبرند و لەنزاری
هاشەی برنۆیان دەهات
لەدەشت و لە ئاقاری
كەریم ڕۆژێ مێردانە
دەستی دا جامبێزاری
نیشانەیەكی لێ گرتن
پێبەرت دەبوون لە كەنداری
ستی گاز دەكا كەریم
مردنم هاتە خەیاری

بابم گەلە گەوادە
پیر بوو لە خزمەتكاری
قەمەرەك بەدیار دەكەت
هاتەدەر لەناو شاری
تێیدایە برایمی عەلۆی
مەولود عەفان لەپاری
هەری كێشا دەمانچەی
هەردووكی كوشت یەكجاری
كاكە سەبرم زۆر دێشی
دەردێ لەدرم بە برینە
دوو كۆتر لە هێلانێ
ئەو كەریم و ستینە
كەریم زەندێ ستێی گرت
لەسەید عوبێدی دێنە
هاتن لەبۆ هەولێرێ
مێوان بوون لە پلكینە
دەیگۆ بڕۆ لێرانە
بابت گەلە بێ دینە
دوو ئاشقی جەوهەردار
هەردووك دەستیان گرتینە
هاتن لۆ حەسارۆكان
هەردوك گەلەك ماندینە
چوونە ماری قادری
ئیسرەحەتیان كردینە
سەركار مەلا قادرە
گەوادی ردێن شینە
ئەو قەومی حەسارۆكان
چ بكەم غیرەتیان نینە
گۆتیان بڕۆن لێرانە

دنیا گەلەك ئەمینە
ژن و مندار و زەلام
لەگوندیان دەركردینە
هەتا ئاشی حەمەرەش
بەقونە شەڕ ڕۆیینە
لەشكری هەرسێ گوندان
چاردەورەیان گرتینە
ستی گاز دەكا كەریم
ئەوجا دەستان هەرینە
تازە هیچ مەفەڕ ئەما
ناوی خودای لێ بێنە
دوو رەختت لەملی دایە
بێ تەخسیر بیتەقینە
كەریم گاز دەكات ستی
سەر هەرینە و بمبینە
بەهەمووان ئەیوێرانی
بەران كەسی خۆی نینە
چیبكەمێ هەرسێ برام
ئەورۆ لەپشتم نینە
قەوان لە تفەنگی پچڕا
خودا نگبەتی هینا
ترۆمبێلەك بەدیار كەت
پێم وابوو معاوینە
تێی دایە برایمی عەلۆی
چەند كافر و بێ دینە
هەری كێشا دەمانچەی
دوو یەخسیری كوشتینە

(لەكتێبی پیرە هەولێر) - لێكۆلینەوە
(٢٠٠٤)

# پەندی پێشینان لە هەولێر

مەحمود زامدار

**نقیشکەک:**

* ڕێک (٢٨) ساڵ بەر لە ئەمڕۆ، خۆم لە ڕێی دۆست و خزم و برادەران خەریکی کۆکردنەوەی فۆلکلۆری دەشتی بەرهەرای هەولێر بووم، لەوانەی کە کۆشم کردبوونەوە، پتر لە (٣٠٠) تاکە (پەندی پێشینان) بوو، هەر ئەو ساڵەش برادەری دێرین و وەفادارم کاک خالید جووتیار خەریکی هەمان شت بوو، کە زانی پرۆژەکەی من بەرفراوانە، بەوپەڕی دڵاوایییەوە نزیکەی (٤٠٠) تاکە پەندی پێشینانی خستە بەردەستم، ئەوەبوو پەندەکانی لای خۆم و ئەوەی کاکی جووتیارم کرد بە یەک و پەیتا پەیتا بڕێکیانم لە ڕۆژنامەی ئەو ساڵانەی (هاوکاری) لەگەڵ چەندین بابەتی دیکەی فۆلکلۆری بڵاو کردەوە و بەشە هەرە زۆرەکەی مایەوە و کەوتە نێو ئەرشیفە پەرپووتەکەمەوە...!

* (٢٥) ساڵیش بەر لەم ساڵە (١٠٠) تاکە پەندم کردە عەرەبی و بە پێشەکییەوە بە ناوی (أمثال من دشتی هەولێر) لە ڕۆژنامەی (العراق) و لە لاپەڕەی (الثقافة الكردية)دا بڵاوم کردەوە...

دوای ئەو هەموو ساڵانە بە دەرفەتم زانی و لەسەر داوای بەڕێز بەرپرسی ئەم گۆڤارە بەنرخە، هەر هەمووی لێرەدا بڵاو بکەمەوە...

بەڵام بەداخەوە لە بەر ئەوەی کارەکە زۆر بە پەلە بوو، ناچار بەبێ پێشەکییەکی تێرو تەسەل خستمە بەردەست، کە دەبووایە توێژینەوەیەکی قووڵی زمانەوانی و کۆمەڵناسی و ژیاری و سێکسی و پۆلێنداری بۆ بەرو پێش بکەم و فەرهەنگۆکێکی بۆ ساز بدەم، دەبا ئەم چەپکە پەندانەش بە دیاری بۆ ئەو باب و باپیر و دایک و داپیرانە بێ کە بە ئەزموونی دوور و درێژیان ئەم دانە مرواریییەیان وەک خەرمان بەرەکەتێک بۆ بەجێهێشتووین.

* باب مردیان خەوی لێدەکەوێ، زگ برسیان خەو لێ ناکەوێ.
* کەچە مەشکە، لە خۆی بەشیکە.
* ماری خۆت جوان تەقەت کە، سەی عالەمێ بە دز دەرمەکە.
* گەزە دەبڕی بەزە.
* ماری کودی، تاران بردی.
* کەس لە پڕەک نابتە کوڕەک.
* بە یەکی دەرێی یێش، بە یەکی دەرێی دۆش.
* دەرێی بزن مشکی بە هەردوو زمانان.
* هەر ئەقڵەک لە خەسارەکی.
* یەک بەناو مەیتاندا دەڕۆیی، دەیگوت خوایە چ سارتران نەدەی.
* خوا کەری باش دەداتە کەر فرۆش.
* پاشی ترێ، خەپشەی برێ.
* بە بەردەکی دوو کێلی پەڕاند.
* بە بەردەکی دوو کێشکەی کوشت.
* دەرێی جووە، خمی لێ پەشۆکایە.

* چاو بە كلی گەورە نابێ.
* چاوەك بە خۆی جوان نەبی، بە كلی جوان نابێ.
* بە گۆرم بڕی، دێر دەرچووە.
* بیست بەرد ببینەوە، یەک چەقوو دەسوی.
* مردی خەركی بە خەركی خەو لێكەتیە.
* پێش تایێ، بەڕێ بەخۆت دادە.
* دروستكەرم چاو لێكەر نیم.
* زگی من عەمباری كەس نییە.
* حیزی هەمبانەی لۆكەیە.
* مازی كەری، كون لە پاشۆل.
* نە مندارم لەناو مندارانە، نە سەم لەناو سەیانە.
* پووشكەی لە چاو خەركی دەبینی كاریتەی لە چاوی خۆی نابینی.
* بەوێ شەوێ، بەوێ ڕەوێ، برێشكەی دەوێ.
* دەرێی گیسكە نێری، حەسەن موتربی.
* كفن بە من ببڕێ، با مردن گۆڕ بە گۆڕچی.
* زستان دابێ و بە كوندە و بێ كوندە، دەبێتە یەک.
* لە دیار دێگەرەی، بە تەمای تەقەرەی.
* پوور نەدەتری، بە تۆبزی دەیانتراند.
* نازانم، ڕەحەتی گیانم.
* نە پێراوی تەنگ، نە خانەی بە جەنگ.
* شێلم تەنكتر، عەزابی كەمتر.
* جێی پێی خۆی نەكردیتەوە، سەری خەركی دەنێتە ناوی.
* كەم خواردن، لە بێ دەسەڵاتییە.
* ئەوی زۆر بخوا، زۆری ناژێ.
* لە قەشەیان دەدا، شەماشە لە خۆی دەڕی.
* خزمم نییە، كەرمان لە مشكیدانی یەكتر گەوزییە.
* دۆریان لۆ كەرێ لێدەدا، گێلاكی لێک دەدا و دەیگوت: ئەو تەپە تەپە چییە.
* خەتی خوار لەبن سەری گای بنەیە.
* كەسەک كەسی بێ، هەموو كەسی كەسە، كەسەک بێكەس بێ، كەسی كەس نییە.
* پیاوی فەقیر بكۆخی، دۆخینی دەپسێ.
* كەس بەتری بن هەنگری، نابێتە پیاو.
* ....... تەگەی، شاخی بزنێ.
* گا جووتی نەدەكرد، جوتیار منێی دەكرد.
* سبیلی خۆی، تووتنی خەركێ.
* هەوجار، بێ (سەرخە) ئیش ناكا.
* دەمە، چت لێكەمە.
* ئەگەر قشپلم لە پەرێزان نەدیتیە، لە هەوێزان دیتیتم.
* شتی خاس، لە خاس دەردەچی.
* ڕێی دوور، دەرمان نییە.
* سەری كەچەر، لەبن كراوی.
* با سەبەتی هەرنەدەمەوە، جوجكە بێتە دەرێ.
* ئاوی زۆر، ئاوی كەم دەبا.
* لە كێ شكایە، لە كێ دەنگی داوە.
* كورتێ و كەژێ، لێک دەهەژێ.
* قەرسەقول بە كەرتک بی، هەردووكیان بە نەحلەت بی.
* گریانم دێ بەنقرە، لۆ پیاوی بێ ئاقر.
* شەڕ لە بادینان، تۆز لە دەركی مە.
* شەڕ و نیوە شەڕ، هەر یەكە.
* كراسی بەرم تێک تێكە، خۆشبی ئەو ساكوفیكە، ئەوە نایەكی دیكە.
* دایكی كەریم خانی، هەر هەندەی لێدەزانی.
* ئەشقی سەری، دایتە بەری.
* ئەگەر بەڕیش با، بزن سەردار دەبوو.
* پیاو بە وەسیەت نامرێ.
* تۆرە بەسەبرە، بەس بە زەبرە.
* پەنجەی دەستان، لێم هەرستان.
* سیری نەخۆی بۆنت لێ نایێ.
* كوچک لە ئاگر گەرمترە.
* نەمردیان ئاگای لێیە، نە زندیان منەت پێیە.
* دۆی بدە بێ دۆیان، لەوان وایە ماستە.
* مەڕمان نەدیتبی لە هەوێزی، قشپرمان دیتیە لە پەرێزی.

* ئەگەر نەمدیبا داکت، دەمردم لە حەزمەت بابت.
* قسە فیشەکە، ئاگات لێ بی.
* داک و دۆت بە شەڕ هاتن، کەم ئاقران لە باوەڕ هاتن.
* گا بە گارانەوە دەچوو، پیرێژن لە گوێلکە سوری دەپێچاوە.
* گایەک نێکە، دوو جلی لێکە.
* تێرکەی لە کەرێ کە، هەردوولای وەکی یێکە.
* یوومەویابە، یەک حیسابە.
* سواری کەرێ حەیبەکە، هاتنە خوارێ دوو حەیب.
* میوانیان دەردەکرد، دەیگۆت: چەکم ببەنە لای ژووری.
* شەم لەخۆی نەبوو، سەی هاریش دەیگرت.
* شەڕ لەشۆ نەک لە تۆ.
* نە لە دوای چووان ئاخ بکە، نە کۆنەکای بەبا بکە.
* چ مێوژەک، چ کەوێژەک.
* شەدەم لۆ سەر پردێ نەبی، لۆ کەینێیە.
* لەهەموو دیزان ئەسکوە، لە هەموو بووکان خەسوە.
* کەرەباب بانگ دەداو گووش دەخوا.
* چێر بە دزی کەڵێ دەخوا، بە ئاشکرا دەزێ.
* بە تەماشا، کەس نەبوویتە پاشا.
* هەر سمێرە و مەقەسەک.
* لەبن بەردی بە نرخ و سەنگ، لە حەمامی بۆ زروزەنگ.
* دوو خوشک بە مێرد دەدران، ئەوەی دی دەیگۆ: بەدرێ منە.
* بڕۆنە بیتۆنی و بڕۆنە مەرۆیان.
* کەس نەما، رەجەب سەرپارەبی.
* لە مەملەکەتەکی مەڕ نەبوو، دەیانگۆتە بزنێ بەیرەم ئاغام.
* هەتا ئاقر، بەراوردی، شێت لێیداو بردی.
* کەو ئەو کەوەیە بەرامبەر کەو بخینی.
* شەڕوتڕ، بە دەست پیاوی نییە.
* گوێلکی خۆماڵی پەسەند نییە.
* ئەو ماستە مووەکی تێدایە.
* بەخۆم کۆکم و ئاگام لە عێلێ نییە.
* هێوارەت لە دەلینگان، سێ رێزەت لە کراوی.
* ئەگەر چێر بە دۆ بووا، لە دەرکەی ماخۆی دەبوو.
* چ تاس نییە نەزرنگابی، چ کیژ نییە نەگەوزابی.
* سە دەلووری و دەرێ: گوفەکم لەبنە، گوفەکیش دەرێ سەم لەسەرە.
* هاوینان شل و ملە، زستانان چوار لە ملە.
* هەر پیاوەک سەد پیاوی دەینی.
* شایی لۆ دووان، گڕ لە هەمووانە.
* بیست و یەکەی ئاورەمانی، کەری بردە سەر رێی کانی، کورتانی هێناوە بە شانی.
* با مەرزان و بندیانان، هەریانکێشاوە هیشکە نانان.
* ها... پایزە برا.
* هەتا ئیشی نەبێ، کەس بەسەر ناکاتەوە.
* بەینی قەراسنجێ و خۆران، گەورەکە.
* دیسان بایداوە، سەر یاسینی گوێلکی.
* خارخاران شێت بی، دەچێتە ئۆمەرمەندان، ئۆمەرمەندان شێت بی، دەچێتە کێ.
* لە لایەک شاییە، لەلایەک شین.
* کابرا خزمت کێیە، بە خوای ژنم نەهێنایە.
* ئاوەدان بی رازیانە، گوندەک و دوازدە شانە.
* کفر و کاریتەیان نەگۆتیە.
* کەری لە کن کەرێ ببەستیەوە، رەنگی هەر نەگری، سوخرەتی هەر دەگری.
* دەرێی کەرە گەورەی حەمە بلەی.
* لە ناوەندان دەخوا، لە رۆخان پار دەداتەوە.
* کابرا، لێرە رامەوەستە دەرێی: بەکرۆکەی.
* شەیتانی بنیادەمی، بنیادەمە.
* دەرێی جاحێری بێریا تیپە.
* بارگیری خەرکی و شوڕی چەمێ، لێدە بازۆ.
* نە (شعیر) مارێ تو، نە (بعیر) مارێ تو.
* بێگانە، یەک مەیدانە.
* لە گوێلکی خەرکی، هەر گوڕەسات لۆ دەمینێ.

* پیشەی لاوان، بۆق خواردنە.
* هەرچی لە دیزەی بی، دێتە ئەسکۆی.
* شەڕ بەشیر، مامرەت بە دراو.
* نەکردی نەبردی، لە سمیلان ریتی.
* کەلاک بکەوی، داراش زۆر دەبی.
* دەرێی حەسۆ و حەمۆنە.
* مەشکەی خۆی ناهەژینێ، مەشکەی ماری میر دەهەژێنی بە زرپۆلییە.
* دوو کەس زۆرانێ بکەن، یەک بە عاردی هەر دەکەوێ.
* هەنگری ملی، لەبن..........
* ئەگەر کوڕ کوڕ بێ، تاریکە شەو زۆرە.
* بە حارەب مەرێ مەرعەبا، هەندەم دەخوا، هەندەک دەنێ لەبن حەبا.
* کەر باری تفەنگیش بی، گورگ هەر دەیخوا.
* گا، گروایە، کلکی مایە.
* ماران گەستی لە گوریسی رەش دەترسێ.
* مارێ بوزێ نانیان نەبوو، داوای تەرەپیازیان دەکرد.
* لەگەر ساحێب مارشێن دەکا، لەگەر سەی سەرەو دەبا، لەگەر گورگ گۆشتی دەخوا.
* دێ دەنگی دۆرێ، پیرێژن ناگاتە کەچە سۆرێ.
* لۆمەی عەبدی، لە عەزابی قەبری گرانترە.
* عەزابی قەبری داوێمە سەرخۆم، لۆمەی عەبدی ناوێمە سەرخۆم.
* ساحێب مەڕان، دەچوونە کن ساحێب کەران، لۆ قیچەکی روونی سەران.
* پیری و سەد حەیب.
* مزگەفت رووخایە، مێرابی مایە.
* دەستی وی، لەبن سەری منە.
* قسە قسان رادەکێشی.
* لەمن مەدە لە برام بدەن، لەمن وایە لە رەشکەی کای دەدەی.
* پوورم لۆمەی منی کرد، بە خۆی هیشکەڕنی کرد.
* ئاقر ئەو کەسە لەگەڵ شێت بەرێوە بچێ.
* خۆر لە دۆی خۆت مەکە.
* مار لە خۆی نەبوو، میوانی لێ حازر دەبوو.
* کەری بە کاروانی قەرەو نابێ.
* مندار گورجیلەیە، کووی بەخێو بکەی وا دەبێ.
* گورگ پیر بێ، دەبتە قەشمەر باشی سەیان.
* لە دەرکان مەدە، لە دەرکەت نادەن.
* مێشەکی کردە گامێشەک.
* بەسەد دەرزی، گاسنەکی تێ نایێ.
* نەشیری حوشتر، نە دیداری عارەب.
* لە چاو شلان پەیتە.
* مار بە ماخۆی نەچی حەرامە.
* بە کەرێ ناوێری، تاو دەداتە کورتانی.
* بە نۆیان نەدەچووە شایی یێ، بە دەیان دەرنایێ.
* لە بنەی سامارە.
* پیاوی یەکچاو، لەناو کۆران پاشایە.
* دیزە لە دەست کابانێ بشکێ، تەقەی نایێ.
* قەرد، دانەوەی دەوێ.
* حەمام بە تڕان گەرم نابێ.
* گوریسی لە بن دنیا راخستیە.
* ژنی گەرۆک، لە سەگ ناترسێ.
* ئەوەی سمێری سۆر بوو، هەمزاغا نییە.
* لە ئاوی مەنگ و پیاوی مۆن بترسێ.
* دزو درۆزن لە یەک چینێ.
* دووروو دوژمنی خوایە.
* فێر کەران فێر مەکە، وەکی فێرت کردن لەبیریان مەکە.
* خۆ ماست نییە، بە بەرۆکتدا بێتە خوارێ.
* دەرێی گورگی باران دیتەیە.
* دەرێی کوردی دۆ نەدیتەیە.
* مریشک جیقنەش دەکا، هێلکەش دەکا.
* سێبەری هەموو کات، وەکی یەک نییە.
* شیوی زۆر، یان سورە یان بێ خێ.
* تەگبیری دووچاو، باشترە لە یەک چاو.
* گچکە لێم ناپرسی، گەورە لێم ناترسی.

* هەویری تۆ، ئەوەندە ئاوەی ناوێ.
* پیاوی تێنەگەیشتی، لە بەرای خوای خراپترە.
* هەتا ئیقناعم کرد، بەخۆم لەبیرم کرد.
* دەرێی بیسملای لێ نەکرایە.
* خۆ کوندەبۆ نی، بەخۆی لۆت بی.
* لێقەومان لەگەڵ پیاوی عاقل خۆشە.
* ناوی گەورەی، دەرکە وێران.
* تفی سەر هەوراز، بە رووی خۆت دەکەوتەوە.
* هەموو رۆژێ، گورگ بەسەر سەدەی مەحموودی بایزی دانایێ.
* ئەو هەوارە، ئەو بوارە نییە.
* بەرخ لەناو کۆز دا نابێ.
* پیاوی درۆزن، وەک گوریسی ناو هەمبانەیە.
* برووشی مێردان، بە نۆب دەکورێ.
* لەگەڵ بووکێ نەبێ، لەگەڵ بەربووکێ نابێ.
* سەری سبیلی وبنی پراوی.
* کەری نوو، هەوساری نوو، تەقرە و جریت و هاتووچوو.
* داکێ ببینە و دۆتێ بخوازە.
* کەرم تۆیی بە بارەوە، مەلا کورم فێری خیندن کە.
* جوو لەترسان، فەقێ لە برسان.
* شاباشی خۆم دەدەم، قیت هەر دەپەرم.
* ترکەن بمگری، فسکەن بەرمدا.
* نان نانی حاجی تاژدینی، رە سوولاغا مارت ئاوا.
* بووک لەسەر زینێ، یا رزق و یا نەسیب.
* گورگ مەری دەینی، ریوی دەرێ: هینامان.
* گۆتیانە هەسپێ بینە پێت نارکەین، قالۆچە لاقی برند کرد.
* شەڕی هێستر و بارگینان، کەر دێنە ناوێ.
* سەری دوو بەرانان، لە مەنجەرەکی ناکورێ.
* دوو گندۆرە، بە دەستەکی ناگیرێ.
* بنیشت زۆر بجورێ، تامی نامینێ.
* هەتا نەتخوارد تێرە، نەتگۆ سوێرە.
* پاروو لە دەو بەربیتەوە، بکەوێتەکۆشی باشترە.
* شین و شایی، دەستەوایی.
* دەست بکەوتە بن بەرداشی، دەری بینە بە هێواشی.
* کەرەکەی جارانە، بەس کورتانی گۆڕایە.
* هەتا گۆتم بیسمللا، گۆتی ئەلحەمدولیللا.
* قسە کەتە زارەکی، کەوتە شارەکی.
* پاش رووتکردن، تاسی زێڕ لەسەرت دانێ.
* کێشکەی ئەو سار، دەرێتە ئی پار نازانی جریوە جریوی بکەی.
* مەیدان، مشکان نەخواردییە.
* بزنی نەبی، کاری لە کێ بوو.
* کەس نەما، بولبولی بە برای بژێلێ لێدەدەن.
* ئاخوڕی دەکا وماینی نییە.
* تەقە تەق، تەرۆزی خۆشە.
* هەینێ دەکەم، وەکی هەنگ بە دارێ وەبی.
* خۆ بەروونییە، لە قەپێک بچتە دەرێ.
* پیرێژن منێ منێی بوو، مارە بکرێ، پاشان دوای هەشت یەکی دەکرد.
* بەختی داکان، جەهازی کچان.
* ئەوەی بەنگۆناشێ، بیدەنە پوورە رەشێ.
* زمان بەرای سەر و قەرای سەرە.
* گوللەی خۆی پێکەوتەوە.
* شەموو بە کەم کەس.
* ئاو و ئاگر، بێ ئامانن.
* ماران باریان کرد، خلە کەپری دەکرد.
* یەک لە مردنە، یەک لە تێوەرکردنە.
* قەل لاسایی کۆتری کرد، رۆینی خۆی لەبیر کرد.
* ئەو هەویرە ئاوی زۆر دەوێ.
* مامان برازان بزرکرد، خاران خوارزان مەزن کرد.
* زۆر گۆتن لە زگ سۆتن.
* ئەدی کێ گۆر هەرکەن، هەر دەکەنی.
* مار بە قسەی خۆش لە کونێ دێتە دەرێ.
* دوژمنی خۆت، بە شەکراوی بکوژە.
* دۆشاو لە پاشای قات نییە.
* کورز، تا لێی دەی، گەنمی لێ پەیدا دەبێ.

* یان ناچتە ئاشێ، یان ئاشەوانی دەکوژی.
* پیاوی درێژ ئاقری لە چۆکییە.
* عارەب مێوژی نەخوا بەس نییە.
* لەلایەک دوونیا خرا دەبوو، دووسوار لە جەردەیی دەگەڕان.
* پیاو لە ناحیلاجی، سەری بە ماری دوژمنیش دادەگری.
* چکەچکی دڕۆپەی، بینە ونییەی قەرداری مشەمشی زڕیابی.
* بە هەموو دینەکی، هەق هەر هەقە.
* لە وەختی ڕاوێ، گووی دێ.
* هەوێنێ مەنجەرە شیرە.
* مار هەتا سەری پان نەکەیەوە، نامرێ.
* بەراز هەتا پیر نەبێ ناکوژرێ.
* کراسەکی بە پیسی بدڕێنە و سەد بە خاوێنی، کەس پێت بڕوا ناکا.
* ئەگەر خزم نەمحەپێنی، بێگانە دەمچەغێنی.
* نانی شوانی، چ لە هۆری چ لە توری.
* کردەی پەشیمان مەبە، نە کردە پەشیمان بە.
* کێو بە لەقەی جاشەکەر، نزم نابێ.
* دۆشاو بە......، لە جێیەکی بێ ئاو.
* بارە گیزی لێ نێی، خرەی نایێ.
* سەری مەڕی، زگ گورگە.
* ئەگەر هێستر بزێ، دنیا خرا دەبێ.
* دەستی کوڕەیان لۆ خەزینە دەبرد، دەیکێشایەوە.
* برینی خەنجەران چادەبتەوە، برینی جوونان چانابتەوە.
* ئەگەر کابرایەک ساحێب بەخت بی، سەی بەردەکەی دڕ دەبی.
* هاوین لە دوای بەهارە.
* مێوانی بە دیاری، هاتیە لۆ ئیش وکاری.
* تەزبیحی ملم سەد قلە مەرجانە، سەد جوون بە جارێ لە بۆم هەرزانە.
* خوا غەزەبی لە مێروستان بگرێ باری دەداتێ.
* باراشت لە هەموو ئاشەکی هەیە.
* دەوی سەگ، بە تیکە نانەک ببەستە.
* حەشری ماری بەداری.
* دار هەڵبڕە سەی دز دیارە.
* ئەگەر پیاو هەژار بوو، قەرزی کۆن و خزمی دووری بەفیکر دێتەوە.
* دار کە لار بوو، سێبەریشی هەر لارە.
* لۆبێ پێت دەڕێم کاکە، هەتا کێشکەم لۆ بگری.
* هەر پەنجەک خینی خۆی لێدێ.
* ئەگەر پشیلە باری هەبا کێشکە کۆتا دەبوو.
* ڕەژوو هەر دەست ناسووتێنێ، ڕەشیشی دەکا.
* ئاگری دزان شەوێ دەگەڕێ، چەقووی پۆرا دوو ڕۆژ دەبڕێ.
* سەری نەدەهێشا، پەڕۆی لێدەئاراند.
* جاشکی کورکن، گۆلکی هورگن، منداری چرمن پەسەند نییە.
* ژووژک دەرێ تری خۆم و سری خۆم.
* درۆزن نیو ڕۆژی هەبی، هێوارەی نییە.
* شەمشەمە کوێر حەزیش لە ڕۆژ نەکا، ڕۆژ هەردێ.
* هێسک لە دەوی سەگ بکەوێ، کەرکی نییە.
* ژنی بە دووکەتی دەرێ، داک و بابم خرابوون.
* هانەهان و مشەمش. زەرو زۆری قازانج چش.
* مردنیان پێ نیشاندا، بەتایی مەمنوون بوو.
* ژنی هێنا، بە تەقەی سێرێ، بە قوڕەی چێرێ.
* لە مارێی نییە زات زەراقەت. پێشی دەرێن کێخا موراد.
* هەویری هەرات، پیشەی ورات.
* هی خۆم لۆ خۆم، هی توو دەخۆم.
* حەز لە شیوی پراو، لێ دەکاتە پەنیری ترشاو.
* لەبەر گورگی، مارداری تەرک ناکرێ.
* دادەنیشم گورگ دەمخوا، هەردەستم ئاو دەمبا.
* لە عاردی و لە عاسمانان، گاز دەکرێ هاوکووف.
* قەرداری، شەرمەزاری.
* گوتیان: سرکە لۆ ترشی، گۆتی: زەرەری خۆمە.

* ئاش لەمیزە میزیی، هەر دەمیزی.
* ناکەسان مەکە بە کەس، کوڕاوان مەکە بە ڕەز.
* خێر دیتم لە عەولافات، مەڕ بردم کاوڕ هاوردم.
* نە پێم هەیە ڕاکەم، نە زارم هەیە هاوارکەم، قوڕی کێندەرێ بەسەر خۆم کەم.
* نۆکی بە نۆ پاروان نەدەخوارد.
* هەردەوە کۆشی بڕۆنە کەرۆشی.
* ئەوەی لەبن بەرێ بێتە سەر بەرێ.
* سە، بە قوەتی کلکی هێسک دەشکێنێ.
* نە جوو جۆت، نە عارەب لاوک، نە هرچ گێرە.
* هەتا لەسەر دەست نەڕۆی، قەدری پێ نازانێ.
* سەد تەشقەرە بە ساتمەکی.
* هەتا دز ماخۆری گرت، ماخۆر دزی گرت.
* کلکی سە، بە قالبیش ڕاست نابتەوە.
* چەند سەی بشۆی هەر ئاوەگرە.
* ئێسک و سە، لە توو.
* چەکە لۆ ڕۆژەکی هەر دەگیرێ.
* لە زستانێ شەوەک، لە سوارێ هەوەک.
* حەفت دەردی لێبوو،.... دەرهات گوتی: یاخوا بەخێر بێی سۆرە گووری باخان.
* ئەگەر هەسپ چاک بێ، ئاوزنگی ناوێ.
* سوار ئەگەر عارەب نەبێ، بارە، شیر ئەگەر میسری نەبێ دارە، ژن ئەگەر ئامۆزا نەبێ هەر یارە.
* ڕەشە مانگ ڕەشی ڕەوان، بەشەڕ دەینی بووک و خەسوان.
* یان لە ڕێیە، یان لە جێیە، یان مزەڕەتی خوای پێیە، هەموو سەددەق مالۆخی، لە سڕی مالۆمی.
* مار لەچار، ماخۆ لە دیار.
* گۆلک بەگجی گجی، نابینێ.
* هەر کڕییە، جلەکی تەڕ بە خۆت دادە.
* قەت تاژی، بە توولە مەدە.
* پێش بالێ بەربوون، ئاورم لە دواوەت بدەوە.
* هەرچەندی دەیکەمە ناوزک، خۆی دەکاتەوە پاروو.
* پزنگشک لە ماری توڕەیی، گۆرمزەی دەخوا.
* خۆ نان و پیازم لەگەلێ نەخواردیە.
* کۆتەر گۆیە، هەر ئەورۆیە.
* ناوی نەبوو لە ناوان، گووی دەکرد لە سەروچاوان.
* ڕیوی بغەزری لە چیای، سوودی نییە.
* تەغدیر، تەکبیر هەر دەبڕی.
* چاوی لە دەریان، خۆری لە سەریان.
* بە ئاگر بڕۆ سەرێ، بە باوەشێن وەرە خوارێ.
* چیغ بێ چیغ ڕاناوەستێ.
* کە ڕدێنت هەبوو، دەبێ شانەی لە هەرگری.
* هەتا جاحێر بووم نەمزانی، وەکی پیر بووم نەمتانی.
* ماری مردن، با بردی.
* بیسمیللا، ڕۆژەکمان گرتیە، جارێ بیست و نۆ ڕۆژ مایە.
* بزن بە پێی خۆی، مەڕ بە پێی خۆی.
* نیشانەی بارانێ، نیشانەی مردنی تایە.
* ڕێوی بنوی، خەون بە گۆشت مریشک دەبینێ.
* بە قەدەر حوشتری خۆت، هۆیە هۆیی بکە.
* دەرێی جیوەی تێکرایە، ڕاناوەستێ.
* گا، گاگۆزی لۆ خۆی بچینی، ژانە سەری خۆیتی.
* حوشتری لە قەسابخانەدا، مردار مەکە.
* تڕ لە کێ و تەورداس لە کێ.
* سەری کەچەری، بە گۆلە ماستەکی دەشکێ.
* پیرێ، جوانییەکی خۆت، بەپیرێ.
* کەچەر شەرمت بێ، یان گەرمت بی.
* ماری میران، دەکەن دوو هەویران، یەک ئی جوانان یەک ئی پیران.
* کەنگر و دۆ، بە وەختی خۆ.
* هەق کەون دەبی، بەران ناچی.
* تفەنگی تو بەتارە، بەران دری من وەنارێ.
* دوازدە لێکیان دەژەنی، ئەوەی ئاخری دەیگۆ: خوایە لەو دەقەی ڕابگری.
* کەری بە کورتانی دەناسی.

* تێرکەی لە کەرێ کە، هەردوو لای وەکی یێکە.
* سەری نایێشی، سێتای لێدەئارێنی.
* خۆ لەسەر شێوە سۆرێی، پازنەدایە.
* حەیای بوویتە حەیای پیاز فرۆشێ.
* لە بەراوان راوەستایە، هەرچی بێ دەیگرتەوە.
* ئەگەر وا نەبوو، ئەو ردێنە بتراشە.
* تفەنگی خۆت، لەگەر تفەنگی من، بە دارێ وەمەکە.
* گوندەک و گندۆرەک.
* سەد گندۆرە، هۆهۆیەکی نایێنی.
* کلکی کەری قازی بڕیە.
* کەری خەساش، بە قەدەر خۆی ئیش دەکا.
* مار، بە گۆتنێ و نەدان، کەم نابی.
* لۆ بابت جاروبار بووم، لۆ عالەمیش تەبەڕا بووم.
* لە حەژمەت تووتنی، دەترِی.
* خۆ هێلانەی پەڕەسلکەم تێک نەدایە.
* هەر عەبا و عەسا، چوویتە دەرێ لە مارێ.
* خۆ ئەمن سەپانی تاوێران نیم.
* سێبەری لۆ من نییە، لۆ خەرکی لەکێ بوو.
* گندۆرە هاتنە برانێ، خزم هاتنە فرانێ.
* هەر برێ، هەندەم شیرو دوازدەم پەنیر.
* دەکوژێ و نایشێرێتەوە.
* شیوی گەرم، ئاوی ساردی تێ مەکە.
* شوڕەکی وای لێدا، عارەب لە حوشتری نەدابی.
* ئەوە چیە بە چاوت: گووە یان مووە.
* بەرگ ئەگـــەر نەشکانە دوو، دەنگانە یێک دوان بێنی.
* قسەی بکە کەلک بگری، ڕەی بپیوە سەریگری.
* بووکی سارێ، بەریدە مارێ.
* دەرێی مازی ناو تەبەقێیە.
* ئاشیش بە نۆبەتە.
* خێن بەری چاوی گرتیە.
* سۆری دیت، سەمای لەبیر چوو.
* جوانی بە دەستی، کەس پێی ناوەستی.
* عومری درێژ، شەرمێ لە کەس ناکا.
* ئەگەر لە خۆت نەخەفتی، وەکی کوندە بە جەختی.
* من ئاغا و تۆ ئاغا، کێ جێگامان بۆ راخا.
* کوڕ کە مندارییی، چاوی بابی دەرێنێ.
* ئەگەر باپیرم نەمردیایە، دوو کوڕی دێنی دەبوو.
* سەپانی داس رەش.
* دێزە باری ترش بوو، لەناو زینێ دەنووست.
* لە ناوەندی دوو بەردان، ئاردەکی هوردم دەوێ.
* ئەو قسەیە با لەناو دوو نانی گەرم بێ.
* بارە خێیانی لەسەر پشت بکە، دەنگێ ناکا.
* دەرێی چێرە، کەر درایە.
* هەر هەوارەک و بوارەک.
* کوو چاکرێ، لە چ جێیان رەش نابێ.
* خوا یاربی، دوژمن هەزاربی.
* نەخۆشی گردەچاری، هەر دەخوا و هەر دەناری.
* کلکی بە شاهی وەنایە، لێ بکاتەوە دەکەوێ.
* شەیتان عەجەلەی کرد، چاوەکی خۆی کۆر کرد.
* ئۆین، ئۆینی داکەمارانەیە.
* وەختی گاوگێران، سازم لێدەدا لۆ جوامێران.
* کردیە گێرەی ئۆمەرە خێلی.
* ئەوەل رۆیی، شەپۆری دوای بژمێرە.
* کلکی کەری وەیسی بڕییە.
* لە کەرەکی تۆپی دەگەڕێ، نارەکەی لێبکاتەوە.
* کەس نارێ، خارە پاقرەت بە چەندن.
* با دەستمان لە تیتکی یەکتر گیر نەبی.
* وەلحاسل، کەر راکێشانە.
* بەکن شەیتانی دابچی، پلەکی دەگەینیتێ.
* شەیتان یەک پەلکەیە، ئەو سێ پەلکەیە.
* نە ژنی کۆفی لار، نە ساری دوو بوار.
* مارێ بە تەنێ بحێشتی بدەنێ.
* سەری لە زێر بگری، هەر ئەو کوڕە دەبی.
* زۆر تەقەی لەسەر پشتی کرایە.
* دەرکی هەمبانەی درۆیانی کردیتەوە.
* ئیشی شەوێ، چشتەکی پێدەوێ.
* ژووژک دەرێتە تاوس، پێت رووتە.

* هەر ددانەکی، بە چل سار هاتیە.
* پیرە کەری، ئاقر جاشکانی.
* دەریێ ریوی، ناو پاوانێیە.
* جۆتی بێ سەردەکا.
* قسەی مەندان، هەموو جۆرەکی هەیە.
* چوومە کانێی ئەولاتر، ئەویش لەوی خراپتر.
* ئەگەریان لە مەگەر مارە کرد، بریاری لێ پەیدا بوو.
* داری (بریاریێ) قەت بەری ناگری.
* هەند زۆرزانە، دەریێ بە حەفت وەستایان پاراو کرایە.
* چاوی هەند قایمە، شەرمێ لە شای ناکا.
* دروونە لەبەری دەستی ناکرێ.
* کۆرەیان لۆ سەر خەزێنە دەبرد، دەیگۆ مەمبەن کۆزم ساوایە.
* هەندێ سەیەکی پیسووتای دەگەرێ.
* ئەو قسەیەی کردت، کەوتییەکیان لەبەر کردی.
* خۆ خمخانە نییە، بچم و بیهێنمەوە.
* بەراز دەعبایەکی درە، هێلکەی بکا دەکا.
* کەر و بارت بەخێر بێتەوە.
* کوردە، بەردی خۆی بەروونەوە.
* ئەقری منداری، تری کەنداری.
* ئیشکەرم بمرێ، تەگبیرکەرم نەمرێ.
* باری رازیا نەبوو، بەدرێشەی دەمرد.
* پیاوەک چل رۆژ رۆیشت، وەکی هاتەوە چل سواری میوان بوو.
* بە مستە ئاوەکی بە مەلە دەکەوی.
* دەشی خورێ و دەشی پێستی.
* نانت گەرم بی و ئاوت سارد.
* مرد، هەتا خۆری بە قسمەت بی.
* لەکێ فێرە ئاقر بووی؟ لە بنیادەمی بێ ئاقر.
* کورتانی، لۆ کچی دروست دەکا.
* کەس بەجەمە تێر ناخوا.
* سەری سەی بە دیاری هینایە.
* بە ماری خەرکی پیاوەتی دەکا.
* میوان چاکی، خانەخێ خراپ.
* بووە فسی ناو رانکێ.
* فران کەس نۆ پیاو و نیوە.
* تری بەنێو بیوران ناشکێ.
* هەر شەرەک، لۆ جوامێرەکی.
* خۆ قونجرکەی لە ژنە دۆمی نەدایە.
* لە تو ناترسێم، لە بەردی ناو هەمبانەی دەترسێم.
* جوان، بە نانی ناخورێ.
* زینی لە کەرێ دەکا.
* داری بگوشی، ئاوی لێدینی.
* کەس دوو برای لە قەبرەکی نەنایە.
* هەتا مرد، بە حەسرەت نانی گەرم بوو.
* نادار نەکا خەتاکار، خلە دەبرێ چەنگ و بار.
* وەکو پەسیو زۆربی دەڵێن: داخۆ چ بێوەژنەک مێردی کردیە.
* گوتیانە هێستری، کوری کێیی؟ گۆتی: خارم ئەسپە.
* مامناوەنجی دریان فەراحە.
* زەمانی عیسا و مووسا نییە، هەرچی درۆیان بکا، رووی رەش بی.
* گەیاندییە مریشکە رەشەی.
* خۆ سەری منت بە کاورە مێ نەکرییە.
* شەوم بە پەنجەی دەستان کردەوە.
* لە هەر کانییەک، ئاو ناخواتەوە.
* ئیشەکەی پووشی بەسەر کرد.
* نانەک و گایەکی لەکن یێکە.
* سارێ دوازدەی مانگێ، لە کورتانی خۆی دەلەوەرێ.
* گۆشتی خۆم، بە کەبابییەوە دیتیە.
* جوان بە جوانی پیر بەنانی.
* دەستەکی نەفتە، دەستەکی جەفتە.
* ئەو قسەیە، قاویت و رەشەبایە.
* بووە ئاگر و پووشە سۆرە.
* سە، زمانی بگاتە برینی خۆی، چا دەبێتەوە.
* خدر و ئەلیاس، سار بوو خراس.
* فێری مەلەم کرد، هەنووکە خەریکە بمخنکێنی.

* وا مەزانە ئیسلام بوویمە، دیری چاوم هەر لێتە.
* دەربێی ماری پێ لە زگە.
* سەری کەری، لەبەر بەری.
* دیزە و گۆزە نەبێ، ئەوی دی هەمووی بە لێدانی چا دەبێ.
* کابان ئەوە کابانە، پیستەی بکاتە هەمبانە.
* سەد کۆتکە گوو بخو، کەس نارێ عافیەتت بی.
* فێرە شاییم کرد، هەنووکە دەستم ناگرێ.
* دنیا نەینۆکە، کووی تەماشاکەی، ئەوهات تەماشا دەکا.
* دنیا چەمە چتک و خراپی تێدایە.
* بنیادەم جەرەبە، چاک و خراپی تێدایە.
* هەم زیارەت، هەم تیجارەت.
* خوا عەبدی خۆی باش دەناسێ.
* گۆشت قابیل بە بازە.
* لۆ خۆمان سەرەی ناکا، لۆ خەرکی بنەی دەکا.
* دنیا بەهەشتی پیاوی نوێژنەکەرە.
* پیاو بە پیری فێری پراو خواردن بێ، دەستی لۆ کەپووی دەبا.
* یێکەک ردێنی زۆربی، پێی دەڵێن: ردێنی دەرێی چەمکی ئاغۆڵانێیە.
* بە هەموو پیکەکی لێەدا.
* فران: بەنی دوو هەمبانەیە.
* یێکەک بەسەر مەیتانی پازدەدا، دەیگۆ: خوایە چەپارەمان بدەی.
* لۆ کۆتکت پڕ بووە.
* ئیشی کردنە، خۆشی، هەڤکردنەوە، ناخۆشی.
* سەد خۆزگە بە کفن دزی.
* جەرەی ئاوێ لە رێی ئاوێ دەشکێ.
* پیاو ئەگەر بە دۆستی داکی نەوێرێ، دەبێ پێی برێ خارە.
* گوریس بە یەکلایی نەگاتێ، کوو بە دوولایی دەگاتێ.
* پیاو کەسی نەبێ هەژار دەبێ، ژن کەسی نەبێ هار دەبێ.
* سرکە هەر چەندی بمێنێتەوە، ترشتر دەبی.
* ماری قەرپ، سەر بە ساحێبیەوەیە.
* هەندە شیرین مەبە قوتت دەم، هەندەش تار مەبە فرێت دەم.
* ختێ و فتێ رێک کەوتن.
* لەقەی لە بەختی خۆیدا.
* هەنجەتی ترێ، نانی جۆیە.
* ماسی لە ئاو مەعمەلە ناکرێ.
* چ سوحبەتەک نییە، راستی لەگەردا نەبێ.
* هەموو کابانەک ژنە، هەموو ژنەک کابان نییە.
* لە قەلانی کردم، لە کۆترانیشی کردم.
* هینی بزن هەردەم لە دەرێیە، ئەگەر هینی مەڕ جارەک بەدیار کەوی، هۆیهای لێدەکەن.
* پێی گەورە منەتە، سەری گەورە دەوڵەتە.
* چ دەخۆی قاورمەی بە لێوی، چ دەخۆی باسرمەی بە سێوی.
* فەقیری شامی تێرکە، کراس لۆ مەککەی مەکە.
* ئاوی پیسیش، ئاگر دەکوژێنێتەوە.
* ئەوەی زنجیرت لە پێ دەکا، بەخۆی دایناماری.
* دوو حاکم نابێ لە شارێ، دوو ژنیش نابی لە مارێ.
* ئەگەر پیاوی، هەر وەسۆی.
* هەر تەواو نەبوو، بووە کراسەکەی نارێ.
* نوێژی لە وەختی، پاشای سەر تەختی.
* هەشت بی مشت بێ، نەک نۆ بی نەبێ.
* ماری نییە شیوی شەوێ، بووکمان پاقراوەی دەوێ.
* کا لە کادینێ، جۆ لە جۆخینێ.
* ئەو جاشکەش لەو کارەیە.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر، ژمارە (٢)ی ساڵی ٢٠٠٠ وەرگیراوە.

# گاڵتەو گەپ

**دکتۆر هیمدادی حوسێن**
**کۆلیژی ئاداب- زانکۆی سەلاحەددین**

گاڵتەو گەپ، کە ئەو بەشە سەرەکی و سەربەخۆ گەورەی فۆلکلۆرە، لە لای نووسەران کەمتر بایەخی پێدراوە و هەقی خۆی نەدراوەتێ، چونکە ئاوڕدانەوێکی خێرا بە کتێبە فۆلکلۆرییە کوردییەکاندا ئەو راستییە دەسەلمێنێ. ئەوەیشی تائێستا نووسراوە لایەنێکی گاڵتە و گەپ یان گاڵتە جاڕی گرتۆتەوە، وەک کتێبەکانی (رشتەی مرواری)[1]ی مامۆستا سەجادی و (بۆپێکەنین)[2]ی مامۆستای خوالێخۆشبوو گیوی موکریانی و (گاڵتە و گەپ)[3]ی پیرەمێردی مەزن، نوکتە و قسەی خۆشیان گێڕاوەتەوە.

هەموو ئەمانە گاڵتە و گەپ لە شێوەی نوکتەو حیکایەت و کورتە چیرۆکدان، هەر بۆیەش لەبەر رۆشنایی ئەم کتێبانە (دکتۆر عیزەددین مستەفا رەسووڵ) وتویەتی:

(گاڵتە و گەپ لە شێوەی چیرۆکێکی کورتدا دادەڕێژرێ...)[4]، بەڵام ئەگەر سەیرێکی دەقی هۆنراوە فۆلکلۆرییەکان بکەین، ئەوا هەر زوو بۆمان دەردەکەوێت، کە مەرج نییە گاڵتەوگەپ تەنها لە شێوەی حیکایەت یان کورتە چیرۆکدا یان نوکتە و قسەی خۆشدا بێت، بەڵکو لە هۆنراوەی فۆلکلۆری و مەتەڵی فۆلکلۆریی کوردیماندا بە ئاشکرا بەرچاو دەکەوێ، بۆیە ئێمەش وا لەو چەند لاپەڕە کەمەدا کۆمەڵێ هۆنراوەی فۆلکلۆری دەخەینە روو، کە بۆ گاڵتەبازی و بەزم و کات بەسەر بردن و پلار و تیر و توانج وتراون و تۆزێ لە بارەیانەوە دەدوێم و دواتر بە کورتی هاوبەشیەتی ناوەڕۆکیان لە ئەدەبی کوردیشدا دەردەخەین.

تا ئێستاکە ئەو بەشەی فۆلکلۆر- گاڵتە و گەپ. لێکۆڵینەوەیەکی فراوان و لەسەر زەمینەیەکی زانستی و ئەکادیمیانەی بە خۆوە نەدیوە، کتێبی (لێکۆڵینەوەی ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی)، وەک بەشێکی سەربەخۆ زۆر لایەنی شاراوەی بە جوانی دەرخستووە و چۆتە ناخی بابەتەکەوە، بەڵام ئەویش وردە هەڵەی تێکەوتووە.

ئەگەر سەیری بەشەکانی دی فۆلکلۆری کوردی بکەین چ لە پەندی پێشینان و، چ لەداستان و، چ لە هۆنراوە و گۆرانی هەموویان نامیلکەو کتێبی سەربەخۆیان دەربارە نووسراوە و شیکردنەوەی پێویستیان تا رادایەک بۆکراوە.

بەکورتی: ئەگەر هەقی خۆیشیان نەدرابێتێ، ئەوا خۆماندوو کردنێکی زۆریان بۆ کراوە، کەچی هەرچی گاڵتەوگەپ لێیەوە بەدوورە. کاتێ کە دەڵێین: گاڵتە و گەپ، تەنها مەبەست پێکەنین و کات بەسەر بردن نییە، بەڵکو بە زۆری لە پشت پەردەی پێکەنینەکەوە لایەنێکی ناهەموار بەهۆی گاڵتەوە دەخاتە روو، کە خۆی لە خۆیدا رەخنەیەکە بەرامبەر بەو کارە.

* * *

* زۆر جار باوک و باپیرانمان لە کاتی دروونەو قەسەر و کوتانێ، لە گوێ ئاگردانان و دیوەخاندا بۆ کات بەسەر بردن یان بەدەم کارکردنەوە بۆ هاسانکردنی

کارەکەو هەست بە ماندوو بوون نەکردن و بۆ خۆشی دلان قسەی خۆش و عەنتیکەیان گێراوەتەوە چ بە شێوەی گۆرانی و، چ بە گێرانەوەی قسە و حیکایەت، یان بەیت و هۆنراوەی گالتەجاری بوو بێ. هەولدەدەین تەنها لایەنی هۆنراوە بگرین و بوارەکانی دی بۆ دەرفەتێکی دی هەلگرین.

لەم تێکستە درێژەی خوارەوەدا بە نێوی (زەمی یار)، شایەر وەسفێکی گالتەجارانەی تەواو هەموو گیانی یارەکەی دەکات. لە دەقەکەشدا زۆر ئاشکرا هۆیەکەی بەرچاو دەکەوێ، کە هەر ئەوەیە شایەر دەلێ کە من تەماشای دەکەم ئەو رووی خۆی وەردەگێرێ و پێی ناخۆشە، جا بۆئەوەی خەمی دەردی دلی خۆی هەلرێژێ، دانیشتووە بەم شێوەیەی خوارەوە وەسفی کردووە، هەروا وای بۆ دەچم، کە ئەو کەسەی شایەر پێوەندی لەگەل هەبووە و بەیاری خۆی ناوبردووە «کچ» نەبووە و «ژن» بووە و شووی کردووە، ئەمەش وەکو لە کۆتایی دەقەکەدا بە دەردەکەوێ: کە دەلێت:

**وەستا برایم کوورەبی**
**حەفت عەلبەی زەرەردایە**

وا دیارە مێردی ژنە ناوی برایم بووە و پێی گوتووە، کە حەوت (عەربە)ی زەرەردایە ئەو ژنەی خواستووە، رەنگە خوازبێنی کچەی بە حەوت عەربە گەنم یان جۆ کردبێ بە پارەی حەوت عەرەبە گەنمەکەبێ.

زۆر جاران لە کوردەواریدا بە ژنی خراپ و کارنەکەر و تەمبەلیان وتووە: «بەخوا کایشی لێ خەسارە» واتا: گەر لە جیاتی خواردن «کا»یشی بدەیتێ، چونکە نرخێکی ئەوتۆی نییەو دەدرێ بە مەڕ و کەر و ئاژەلی دیکە «کا» یەکە بە خۆڕایی و لە هەوەنتە دەروا و ئەوە ناهێنێ، ئەمەش دەقەکەیە:

**کاکە یارم وا رۆیی**
**دەلێن پشتی شکایە**
**سنگی لیسی کۆتران**
**جیقنەی لەسەر رژایە**
**خێوەتەکی لەبەردا**
**پێنج سەد پینەی تێدایە**
**وەکی تەماشای دەکەم**

**بەژنی چەندە بلندە**
**هوورگ پالی پێدایە**
**سوندەکی قایم دەخۆم**
**دوو گوجیلەی تێدایە**
**پەرچەمی بنە کفرە**
**بزنان دەورەی لێدایە**
**تا دەگاتە کۆتایی:**
**وەستا برایم کوورەبی**
**حەفت عەلبەی زەرەردایە**[٢١]

* * * *

**بێوەژن لە هۆنراوەی گالتەجاڕی کوردیدا:**

تێکستی زۆری هۆنراوەی فۆلکلۆریمان هەیە لەسەر جوانی و لەنجەولار و فرت و فێلی ئافرەتی بێوەژن گوتراوە، لە زۆر هۆنراوەی دیکەشدا بەشێوەیەکی گالتەجارانە گالتەیان پێ کراوە و بەشێوەیەکی ناشیرین باسیان کراوە. هەرچەندە من لێرەدا وا ئەو تێکستانە دەخەمە روو، کە بۆ گالتە وتراون، بەلام ئەمە شتێکی زۆر ئاساییە کە هەموومان دەزانین مەبەستی ئەم هۆنراوانە ئافرەتی خراپە، ئەگینا چەند ئافرەتی بێوەژن مێردەکانیان لە کۆڕی خەبات شەهید بوون کە جێگای شانازی و سەرفرازی ئێمەن و لەبیرناچنەوە، یان چەند ئافرەتی جوان دوای ماوەیەکی کەم مێردەکەی لە رووداوی ئۆتۆمبیل و رووداوی مرۆڤانە گولی ژیانی وەریوە، کۆشێ مندالی بەسەر ئافرەتێکی بەستەزمان بەجێهێشتووە، ئەویش بەهەر دەردەسەرییەک و بەکارەکەری و بەنان کەری و بەجلی شۆری ئیشی کردووە تا پارووێ نان بۆ خۆی و مندالەکانی دابین بکات و بتوانێ ئەو مندالانە پێبگەیێنێت.

بێ گومان ئەم جۆرە بیرکردنەوانیش پەیوەندی بە رادەی هۆشمەندی و باری ئابووری و کۆمەلایەتی میللەتەوە هەیە. هەر لێرەدا مەسەلەیەکی دی سەرهەلدەدات، ئەویش ئەوەیە، داخوازی کچ پێویستی بە پارەو پولێکی قەبە هەیە و لە توانای هەموو کەسدا نییە.

لە شوێنێکی دی شاعیر روو لە خەلک دەکات و دەلێ نەوتم پێداکەن و بسووتێنن (بێ گومان هەر

دەسووتێ)، لەسەر ئەوەش ئەگەر هەرنەسووتام، ئەمجا بێوەژنم دەنێ:

**نەفتم پێداکەن ئاگرم بەردەنێ**
**ئەگەر نەسووتام بێوەژنم دەنێ** [117]

یان لە شوێنێکی دی گوتوویانە: نەکەی خۆت لە بێوەژن بدەی و لێی نزیک بکەویەوە، دەردو بەلان، بۆیە گوتوویانە:

**دەڕوا دەڕوا بەنەبنە**
**سۆلی زەردە مەحسی چنە**
**خۆی لێ مەدە بێوەژنە**

هەروەها لەو تێکستەی خوارەوە دا هەمدیس نالەو ئازاری شایەر بە دەست بێوەژن دەردەکەوێت، هەرچەندە بێوەژن چاکەشی لەگەڵ کردووە، بەڵام ئەو هەر نەوێراوە لێی نزیک بێتەوە و دەڵێ:

**هەی دادو هەی بێداد چیم بەسەرداهات**
**لە کیژ دەگەرام بێوەژنم تووش هات**
**ئەو بێوەژنەی حەفت مێردان دەکات**
**ئەینۆک رادەگرێ بسکان لووس دەکات**
**ئەو بێوەژنەی رەشی بێ نیشان**
**کورتانی لێکەن بۆ زبڵ کێشان**
**باخی بەرماڵان بە گوڵە شیلانە**
**قسەی بێوەژن هەمووی بوختانە**
**مەمکی کیژۆڵان سەریان بەگۆیە**
**بێوەژنەک هەبوو ماڵ لە قەلاتێ**
**بەفێڵ گاز دەکا خورمان دەداتێ**
**خورمای تۆ ناخۆم حەفت دەردم گاتێ** [118]

### تێکستی هاوچەرخی گاڵتەوگەپ لە فۆلکلۆردا/فۆلکلۆرو تەکنەلۆژیا:

هەندێ بیروڕاهەیە دەڵێن: وردە وردە فۆلکلۆر روو لە کزی دەکا بە پێشکەوتنی تەکنەلۆژیاو ئامێرو زانست و پیشەسازی و بەشەکانی دی، بەڵام دەتوانین بۆ بەربەرچدانەوەی ئەم رایە ئەم نموونانەی خوارەوە بێنینەوە، هەروەها ئەوەش بڵێین کە فۆلکلۆر دەگەڵ سەردەم لە گۆڕان دایە، نەک لە کزی دایە، بۆ؟ جاران شایەر بەسەر کەرەستە سەرەتاییەکانی ژیانی لادێدای هەڵدەدا، بەڵام ئەمڕۆ بەسەر شتە نوێکان، فۆلکلۆریش بەبەردەوامی دەژی و لەپەرەسەندندا دەبێت، نموونە:

لەو نموونانەی سەرەوە دا کێشەیەکی گەورەی کۆمەڵایەتی رەنگی داوەتەوە، ئەویش نەبوونی سەربەستی ئافرەتە لەهەموو بوارێکی ژیانیدا، بەتایبەتی لە هەڵبژاردنی هاوسەری ژیانی لە پێناوی ژیانێکی سەرکەوتوو و بەختەوەر، هەتا نەبوونی سەربەستی کوڕیش لە هەڵبژاردنی ئافرەتێک کە بە دڵی خۆی بێ بەڵکو چ کوڕ چ کچ (زیاتر) بەزۆری بەشوودانی کچ و ژن هێنان بۆ کوڕ لەلایەن باوکانەوە زۆر لە گوندەکانی کوردستان باوبووە. هەتا لەلای گەلانی دراوسێشمان وەکو عەرەب و فارس و کچ تا ئامۆزای هەبوو بێ شووی بەهی دی نەکردووە، دەربارەی زۆرانبازی چینایەتی و کێشەی کۆمەڵایەتی زۆر ئاشکرا لە ئەدەبی نووسراوی کوردیدا رەنگی داوەتەوە، بۆ نموونە مامۆستا (ئەحمەد هەردی) شاعیر لە قاڵبێکی شیعری ناسکدا پەردە لە رووی ئەو نەخۆشییە کۆمەڵایەتییە هەڵدەداتەوەو دەڵێ:

**باخەوان بۆ ئەو مەبەستە گوڵ ئەلاوێنێتەوە**
**بۆ ئەوەی گەورەی بکاو بەپارە بیگۆڕێتەوە**
**بیفرۆشێ بەو کەسەی خەڵقی ئەروتێنێتەوە**
**کچ لەلای ئێمە گوڵێکە بۆیە پەروەردەی ئەکەن**
**تا برازێنێتەوە مێزی شەرابی دەوڵەمەن** [119]

یان (مستەفا ساڵح کەریم)ی چیرۆکنوس لە چیرۆکی (بریا نەهاتیتایەوە)[120] لە دەرگای هەمان باسی داوە و گەلێ نووسەری دیش زیرەکانە لە نووسینەکانیاندا ئەو لایەنەیان وەدەرخستووە جا لە هەر بوارێکی ئەدەبیدا بێت.

**پەراوێزەکان:**

١١٧- لەسەر زاری خەڵکیدا باوە.
١١٨- محەمەد کەریم شەریف،فۆلکلۆری هۆنراوەکانی کوردەواری، ل١٦٦.
١١٩- کاکەی فەلاح، کاروانی شیعری نوێی کوردی، ل١٥٦.
١٢٠- عومەر مەعرووف بەرزنجی، لێکۆڵینەوەو.....ل٩٠.

# دانه مرواریيەكانی هەولێر

عەلائەدین سەجادی

مامۆستا عەلائەدین سەجادی لە رۆژگارێكدا دەستی بە كۆكردنەوەی دانە مرواریيەكانی كوردەواری كرد نرخی بەو شتە بێ نرخ كراوانەدا و (رشتەی مرواری) لێ پێكهێنان، كە مەلا و خوێندەوارە هاوچەرخەكانی خۆی لە سەر ئەم كارە دۆعایان لێدەكرد و پێیان دەگوت: (مەلا بە مەندیلی خۆت بە خنكاندت چی!) مامۆستا گوێی بەم كوێرە دۆعایانە نەدا و رشتەی مرواری (دوری یەكدانە)ی خستە نێو كتێبخانە هەژارەكەی كوردەواری. مامۆستا بە لێهاتوویی خۆی زۆر مرۆڤانە و رۆشنبیرانە و كوردستانیانە ئەم كارەی كرد، لەپاڵ كارە پڕ نرخەكانی دیكەی. لەنێو ئەم رشتەی مرواريیەدا دانە مرواری ناوچە جیاجیاكانی شاری (هەولێر)یشی لەبیر نەكردووە، ئێمەش ئەمڕۆ بەوپەڕی شانازییەوە (ئینسكلۆپیدیای هەولێر)ی پێدەرازێنینەوە و خوێندەوارانی ئینسكلۆپیدیا لەهەر كوێیەك بن و سەر بە هەر نەتەوەیەك بن بە (پێكەنین) شاد و بە (حیكمەت) دەوڵەمەندیان دەكەین.

(ئـ. هـ)

* خانزادەخانی هەریری وتوویەتی لە دەوری ئەو پیاوە ئەگەڕێم كە بەنەوخوێنەكەی درێژە و بەنی كاڵەكەی كورت!.

* پاشا كوڕەی رەواندز لە جەنگدا بوو، فەرمانی دابوو كەس چرا نەسووتێنێ. شەوێك خۆی گۆڕیبوو، بۆ تاقیكردنەوە بەناو شاردا ئەسووڕایەوە، سەیری كرد وا لە دوورەوە لەبنە بەردێكا سووسەی رووناكییەك دێت، كە چوو تەماشای كرد ئەوا مۆمێك ئەسووتێ و ژن و پیاوێك لە بەرییەوە دانیشتوون، گەمە و گاڵتە دەكەن! پیاوەكەی بانگ كرد و پێی وت: ئایا ئەمناسی؟ وتی: بەڵێ. وتی: ئەی گوێت لەو فەرمانە نەبووە كە وتوومە: یاساغە بە شەو چرا داگیرساندن؟ وتی: بەڵێ گوێم لێبووە، بەڵام ئەمە چوار ساڵە لەگەڵ ئەو كچەدا دڵمان پێكەوەیە، تا ئێستا بۆمان رێنەكەوتووە پێكەوە دابنیشین، ئیمشەو بۆمان رێكەوتووە وا پێكەوە دانیشتووین. ئێستاش پاشا سوورە كە هەستا، نەگوێ بە پاشا كوڕە ئەدا نە بە پاشای ساغە! پاشا كوڕەكە ئەمە ئەبیستێ دەست ئەكا بە پێكەنین و ئەڵێ: برۆ هەموو شەو هەر لەخۆشیدا بن...

* مەلا فەتاحی خەتێ لە دیوەخانی پاشا كوڕەی رواندز ئەبێ، كابرایەك دێت، ئەڵێ: پاشا گایەكم هەبوو، یەكێ لە پیاوەكانی تۆ لێی زەوتكردم! مەلاش ئەڵێ: برا ئەگەر پاشا مەزرەعەی رۆژی دوایی خۆی بەگای هەژارێكی وەكو تۆ نەكێڵێ، چی بكا؟! پاشا ئیتر فەرمان ئەدا گاكەی پێئەدەنەوە.

* مەلا عیسای هەرتەل هەبوو، جارێك ئەیوت: خولێی گەڵێ ئیشی وا ئەكا ئەزی تیا شەرمەزار ئەبم!

* كابرایەكی كرمانج لە هەولێر بەشان و باڵی مەلا ساڵحی كۆزەپانكەدا دێ، ئەڵێ: مەلا كلكی پێوە برسكێ وەكو مەلا ساڵحی

کۆزەپانکە نابێ...!

* شاکر موجرم رەواندزی نوێژی خەوتنان ئەکا لەپشت مەلایەکەوە، هەر راست لە پشت سەری مەلاوە لە یەکەم ریزا رائەوەستێ، مەلا سورەتی "والمرسلات" لە نوێژەکەدا ئەخوێنێ، ئەگاتە ئەوە ئەڵێ: الم نهلک الاولین. شاکر موجرم دەچێتە ریزی پاشاوە، مەلا ئەڵێ: ثم نتبعهم الاخرین. ئینجا خۆی ئەکوتێتە ناوەراستەوە، مەلا ئەڵێ: کذلک نفعل بالمجرمین!، شاکر نوێژ بەرەڵڵا ئەکا و بە پێڵاوەکانییەوە بۆی دەرئەچێ و ئەڵێ، کەواتە ئەم بەزمە بۆمنە!

* مەلا عەلی قوچە بلباسی هەبوو، هاتە لام، پێم وت: هەر ئەوەندە دانیشە جگەرەیەک بکێشە و لە پاشان برۆ. دەستم برد جگەرەیەکم دایە. جگەرەی لە تەنیشت خۆیەوە دانا و دانیشت. وتم بۆچ نایکێشی؟ وتی: هەر وەخت ئارەزووم کرد بڕۆم ئەیخۆم! ئیتر من قسەم برا.

* جارێک سەید ئەحمەدی خانەقا لە مەلا ساڵحی "کۆزەپانکە" ئەپرسێ و ئەڵێ: ئەرێ مەلا! تۆی مەلا ساڵحی کۆزەپانکە؟ مەلا ساڵحیش بە سەید ئەڵێ: ئەرێ سەید جەنابتی سەید ئەحمەدی عەلی عەیری؟!

کۆزەپانکە: بە واوی کراوە گوندێکە لە دەشتی دزەیی، مەلا ساڵح خەڵکی ئەوێیە.

غەیریش: دێیەکە لەدەشتی کەرکووک، هی سەید ئەحمەدی خانەقا بووە، مەلا ساڵح نوختەی عەینەکە لائەبا "ی"ێکی موتەکەلیمی پێوە ئەنووسێنێ.

* کابرایەک ئەچێتە شاری کۆیە، هەژار ئەبێ، دەست ئەکا بە تور فرۆشتن، رۆژێک لە کۆڵانێکا بانگ ئەکا "های تور بەنان، بە پارە، برنج، بە ساوار، بە ترخێنە، بەنۆک، بەنیسک، بەماش". وا رێ ئەکەوێ گەلێ لە پیاوماقوڵی شارەکە لە ماڵی پیاوێکی گەورە دانیشتبوون، گوێیان لەتور فرۆشتنی کابرا ئەبێ، بانگی ئەکەنە ژوورەوە. ئەیانەوێ سەریخەنە سەری، ئەپرسن: تورەکەت بەچی ئەدەی؟ ئەڵێ: قوربان بە هەموو شت. ئەڵێن: بەگوی ئەدەی؟ ئەڵێ: ئەگەر بەکێری خۆم دەری بێنم، بەڵێ!

یەکێکیان لێی دەپرسێ: تۆ خەڵکی کوێیت و ماڵت لەکوێیە؟ ئەڵێ سلێمانی و ماڵیشم لە گەرەکی هۆڵییە. ئەڵێ: ئەرێ راستە ئەڵێن ژنی "هۆڵی" هەموو لەبەر دەرگا بەبێ سەرپۆش دائەنیشن و تەشی ئەرێسن و بنێشت ئەجون؟ هەر پیاوێ بە بەردەمیانا بڕوا تەماشای ئەکەن! کابرا ئەڵێ: بەخوا قوربان راستە، زۆر بێشەرمن ئەڵێی لە ئاوی حەمامۆکیان خواردۆتەوە!

(حەمامۆک: کانییەکە لە کۆیە)

* پیرێژنێکی بلباسەتی لە وەختی خۆیا بووە و لێی ئەقەومێ و لەرووشی هەڵنایە داوا لەکەس بکا. ئەچێتە لای حەماغای کۆیە، ئەڵێ: ئاغا! چەند رۆژێکە مشک لە ماڵەکەما نابینم. ئەترسم خانووەکەم ئاگری تێبەربێ. ئەمە قسەیەکە لە کوردەواریدا تاقی کراوەتەوە کە مشک شوێنێکی بەجێهێشت ئەوە ئەو شوێنە ئاگر ئەگرێ، بۆیە بەجێێ دێڵێ. حەماغاش ئەڵێ: بچۆ ئەوە دوو بارەگەنم و بارێک برنج و هیزەیەک رۆن بەرە. با ئاگری تێبەر نەبێ!

*جارێکیان ئاغایەک ئەچێتە سەرکارێزی "قەتەوی"، سەیر ئەکا، "عەدەرەش" مەلە ئەکا ئەڵێ: ها، رەشی بەشی قون فش چیت کردووە، کەرت گاوە؟ ئەویش ئەڵێ: نە بەسەری تۆ، ئاغا ژنم گاوە!

* لەسەر قسەکەی ئابید لە بەرزان هەندێ کەس هەڵئەپەرین، مەلایەکیش چوو سەرچۆپییەکەی لەدەست وەرگرتن، خەڵکەکە وتیان: ئەزبەنی ئەم فەلەهین! تۆ بۆچی داوەتێ گەڵ مە تکێ؟ مەلا وتی: هون فەلەهن ئەزێ قەشێ وە! وان گوتن: ئەزبەنی! چە د بێژی؟ تۆ پێغەمبەری مەیی، تۆ نە قەشەیێ، گوت: ئەز نشێم شەفاعەتا وا حەما بکەم، ئەز قەشەم! وتیان: ئەزبەنی کو دبێژیت ئەز پێغەمبەرم، تۆ چەڤان پێغەمبەر نی؟

ئەوا ئەویش سەرچۆپی گرتووە و بەدەم هەڵپەرینەوە وتی: بلا حسو پێغەمبەر بت، ئەز ژکژامتاوی، ئەز ژکژامتاوی!

* کابرایەکی بلباس بەکاروان رێی ئەکەوێتە کۆیە، ئەچێتە دیوەخانی حەماغای کۆیە. کابرا لە ولاتی خۆی ماینێکی بەدەستیاو هێنابوو. کە ئەچێتە ماڵی حەماغا، ماینەکەی ئەتۆپێ. لە رووشی هەڵنایە کە بە حەماغا بڵێ شتێکی وا رووی داوە و ئێستە منیش نیمە ماینەکە بێژێرم بۆ خاوەنی.

هەر لەوێ دائەنیشێ و خۆی ئەکا بەتول بڕ، بەیانی و ئێوارە ئەچێ

ئالیكی ماینە تۆپیوەكە وەرئەگرێ. ئیتر كەس لێی ناپرسێ كە كابرا تۆ ئیشت چییە لێرە ماویتەوە. ئەوەندە ئەمێنێتەوە تا لە ئالیكی ماینەكە پارەی ماینێكی دەست ئەكەوێ و ماینێكی تر ئەكڕێ. پاش ئەوە هەڵئەستێ بڕوا، ئەچێتە لای حەماغا مالاوایی لێ ئەكا و كارەساتەكەشی بۆ ئەگێڕێتەوە. حەماغا سەرباری ئەوەش فەرمان ئەدا ماینێكی تریشی بدەنێ.

* كابرایەك هەبوو لە هەولێر مستۆی وەستا چیچۆیان پێئەوت، خەنە و وەسمە و شتومەكی ئەفرۆشت لەناو گوزەرەكەدا، كابرایەكی دراوسێ دوكانی هەبوو لە بەرانبەرییەوە. لە بەیانی تا ئێوارە هیچ ئیشیان نەبوو، ئەوە نەبێ كە یەكێك بەوێدا تێئەپەڕێ دەستیان ئەكرد بەقسە پێوتن و تانوت لێدانی. كەس نەمابۆوە كە لە دەست ئەمانە دەرچێ و رزگاری بووبێ. ئینجا خەڵكەكە هەستان و چوونە لای بایزاغا (ئاغای هەولێر)، شكاتیان لێكردن. بایزاغا بانگی كردن پسوولەی سەد لیرەی لێ سەندن، كە جارێكی كە قسە بە كەس نەڵێن. كابراكان لەترسی ئەم جەریمەیە ئیتر بیرای بیرای ناوی كەسیان نەئەهێنا!

رۆژێك ئەوا قرچەی نیوەڕۆیە و دنیا زۆر گەرمە و كەس لە گەرمانا ئۆقرەی نییە، سەیریان كرد كابرایەكی كورد باوەشێ چەفتە و مشكی بەستووە بەسەریەوە، مرادخانی و شەرواڵێكی ناوداری لەبەرایە، هەر لەبەر موسڵدانییەوە تا سەر سنگی پشتێنی تێئاڵاندووە، لە سەرەوە پەستەكێكی لەبەرایە، لەسەر ئەوەوە پاڵتۆیەك قۆڵی لە عەبایەكی چۆغەی شان سورمەی زستانیش هەڵكێشاوە.!

مستۆ كە ئەمەی چاوپێكەوت هەر لە دوكانەكەی دەرپەڕییە دەرەوە و دەستی كابرای گرت و بانگی دراوسێ دوكانەكەشی كرد وتی: وەرە. هەموو پێكەوە چوونە لای بایزاغا و كیسەیەكی لەبەر دەمدا دانا و وتی: ئاغا شەقم برد، ئەمە سەد لیرە جەریمەكە و با قسەی خۆم بكەم. ئاغا! لەم كابرایە بپرسە ئەوا عالەم لە گەرمانا ئەكوڵێ، ئەم هەموو جلە چییە لەبەری كردووە؟ ئاغایش جلوبەرگ و خۆپێچانەوەكەی كابرای لەم قرچەی هاوینەدا پەلاوە زۆر سەیر بوو، ئینجا مستۆ هاتەوە قسە، وتی: ئاغا من كە قسە ئەكەم وەنەبێ قسەكانم بێجێ و خۆڕایی بێ، قسە ئا لەشتی واوە ئەكەم. ئاخر دە پێی بڵێ سەگی سەگباب عالەم لەبەر گەرما پرۆزەی بە ئامانا ئەچێ، تۆ بۆچی وەكو یاپراخ خۆتت پێچاوەتەوە؟!

ئیتر ئاغا سەد لیرەكەی دایەوە بە مستۆ و وتی: بڕۆ سەربەست بە، چی قسە ئەكەن لەگەڵ هاوڕێكەتا بیكەن، بۆم دەركەوت قسەكانتان هەموو لە شوێنی خۆیانە.

* لە گوندێكی ئەو خۆشناوە، ماڵێك لە گوندێكی تر "بووك"ێك دێنن. بووكە تا دوو سێ رۆژ میوان ئەبێ و هیچ ئیش ناكا. لەپاش سێ رۆژەكە خەسووەكەی پێی ئەڵێ: دە كچم هەڵستە ئەوە ئاوە و ئەو سوێنەیە و ئەوەش ئاردە لەو كەنووە لەودیوی كوڵەكەكەوە بیانهێنە و هەویرەكە بكە. كچە هەڵئەستێ و ئەچێتە بەر كەنوو، ئارد دەربێنێ. وا رێ ئەكەوێ، ئەبێ دەستی بەملا و بەولای كوڵەكەكەدا بەرێ تا ئاردەكە لە كەنووەكەی دەربێنێ. كە دەست ئەبا، پاشان دەستی بۆ دەرنایەتەوە و هەر لەوێ وشك ئەوەستێ! خەسووەكەی كە ئەیبینێ وا بووكە هەر دیار نەبوو، بانگ ئەكا: حایشێ، حایشێ! ئەوە چما دیار نیت؟ حایشێش ئەڵێ: مابا كەی؟ دەستانم حاسی بووینە!

خەسووە، كە ئەچێ راستە دەستی گیری خواردووە، چونكە دەستی بەم لاو بەولای كوڵەكەكەدا بردووە و پڕمستی كردووە لە ئارد، ئیتر چار نییە! ئەیكا بەهەرا و هەموو ئاوایی كۆئەبنەوە كە چاری ئەم بەڵێ گەورە بكەن، بووك رزگار بكەن! "مامۆتك"ێك ئەڵێ: ئەبێ هەردوو دەستی ببڕێتەوە! دەست ئەبا بۆ "هەرە- مشار" ئەیهێنێ هەردوو دەستی بووكە ببڕێتەوە! مامۆتكێكی تر ئەڵێ: نە بابە وانابێ بووكێمان بێدەستان دەبێ، با كوڵەكەی ببڕێتەوە! هەموویان ئەڵێن: ئەی ماڵت كاول بێ لۆ زەكاوەتت؟! چما ئەم فێڵەت زانی؟! هەریەكە دەست ئەدەنە تەورێك و كوڵەكە ببڕنەوە!

كابرایەكی كوێریش لەوێ بوو، سەیر ئەكا ئەگەر كوڵەكەكە ببڕنەوە خانووەكە ئەڕوخێ و ئەویش سەری تیا ئەچێ. هەر خێرا پەلاماری سەری بووكە ئەدا، دەرزی بە سەرەوە ئەبێ، دەرزییەكی لێئەكاتەوە و ئەیچزێنێ بە دەستی بووكەدا. بووكە كە چزەی

دەست هەست ئەکا، هەردوو دەستی خۆی بەرەڵا ئەکا! ئینجا خەڵکەکە دەوری کابرایاندا، ئەیانوت: تۆ فریشتەی! بووکانت لە کەندوان کردۆتەوە!

* حەمەغای کۆیە رایسپاردبوو بۆ پاسەوانێکی لێهاتوو، بە تایبەتی بۆ کۆشک و گەلەخانەکەی خۆی. "مام تەیموور"ێک هەبوو چوو وتی: قوربان من ئیشم نییە و هاتوومەتە خزمەتت بۆ ئەوە پاسەوانییەکەم بدەیتێ. ئاغا وتی: رۆڵە من پاسەوانێکی چوارپەل قەوی تێک سمراوم ئەوێ، ئازا و نەترس بێ، شەرە کوتەکی پێ خۆش بێ، تووشی هەرکەس ببێ بیترسێنێ، شەڕکردن و ئاوخواردنەوەی بەلاوە وەکو یەک وابێ، کە لەگەڵ شیرانی بەسەر یەکێکا، هەموو گەرەک بەئاگا بێن و کابرای تر زراوی بچێ، ئەوەندەش مۆن بێ، پیاو کە ئەوی دی، وا بزانێ شەیتانی چاو پێکەوتووە! ئەگەر ئەمانە لەتوا هەیە وەرە و چشت ئەوێ ئەتدەمێ! مام تەیموور وتی: قوربان ئەمانەی جەنابت ئەیفەرمووی: مەگەر هەر ژنەکەی من وابێ، ئەوا ئەچم بۆت ئەنێرم. لێیدا رۆیشت!

* لەم سالانەدا لە بناری کۆیە، کابرایەک هەڵکەوتبوو، "خورشە کوێر"یان پێ ئەوت، خورشە لە پیاو خراپیدا وەکو گورگی هاری لێهاتبوو، بە جۆرێ ناوی دەرکردبوو، منداڵی ناو بێشکەیان بەناوی ئەو ئەترساند و ژێر ئەبۆوە. خورشە "چەتە" بوو، دەستەیەکی پێکەوەنابوو، راو و رووت و پیاو خراپییان ئەکرد، ولاتی کۆیەیان هێنابووە زەلالەت. کاروانیان رووت ئەکردەوە، پیاویان ئەکوشت، سەرەڕای ئەمەش، لە شوێنێکا ئەگەر تووشی ئافرەتێک بیووایە ئافرەت ئەگەر پەلی بە پەلی پێغەمبەرەوە بووایە، خورشە ئەبووایە لاقەی بکردایە!ئیشی خورشە وایلێهات حوکمەتیش لەدایەخی دەرنەئەهات، ناچار حکومەت فەرمانێکی دەرکردبوو کە هەرکەس خورشە بە زیندوویێتی یا بە مردوویێتی بهێنێ، پێنج سەد روپیەی ئەو دەورە بەخشیشی ئەدرێتێ، بەڵام خورشە دەست کێ ئەکەوت و کێ ئەیوێرا شان بدا لە شانی؟!

لە دێی "شەوگێر" هەر لە بناری کۆیە، کچێک هەبوو "فاتە"ی ناو بوو، ئەم کچە بە "فاتە قۆرێتان" بەناوبانگ بوو، فاتە کەسی نەبوو، تەنها برایەک نەبێ، براکەی بەرۆژ ئەچوو بەلای کاسبی لادێیەوە و فاتەش بناوانیەکەی ئەکرد، بۆ خۆیان کولانەیەکیان پێکەوە نابوو، بە ژیانێکی خۆش و سەربەرزی و داوێنپاکی پێکەوە ئەژیان!

بەڵام فاتە گوڵێک بوو لە گوڵی جوانی، کە خوا لە گوڵستانی ولاتی کۆیەدا بە تاقانە دروستی کردبوو، کەڵەگەتێکی بالا بەرز، روومەتێکی پان و سوور و سپی، دوو چاوی گەورەی رەشکاری برژانگ درێژ، لوتێکی باریک بە بەینی دوو گۆنا سوورەکەیا هاتبووە خوارەوە. باسی گۆنایان بەسێوی سەردەشت ئەکرد! مەمکی تازە سێبەری کردبوو! دوو باسکەکەی سەری لەپیاو تێکدابوو، لە لایەکی ئەتبینی دوو باسکی زێوینە و بە فاتەوەیە، کەچی لە لایەکی دیکەوە ئەتبینی دوو باسکی مەردانەی پاڵەوانییە بە فاتەوەیە!

شەوێک لەپێش مەلا بانگدانا "کاکی فاتە" فاتە خەبەر ئەکاتەوە بۆ ئەوەی هەستێ، هەر سەر لەئێوارە هەویری کردووە بیکا بەنان و نان لەگەڵ خۆی بەرێ و بچێ بۆ سەر ئیش. دنیا تاریک بوو فاتە کە هەڵئەستێ سەیر ئەکا داریان نییە نانەکەی پێ بکا. ئەچێتە دەرەوە بۆ بناری ئاوایی باوەشە دارێک بێنێ خێرا نانەکەی پێ بکا و فریای کاکی بکەوێ!

لەبەر ئەوە دنیا تاریک بوو لە نزیکی ئاوایی داری بەرچاو نەکەوت و تۆزێ دوورکەوتەوە، باوەشە داری کرد و لەو کاتەدا ئەیەوێ بگەڕێتەوە، خورشە بەخۆی و پیاوەکانییەوە لەسەر سەریەوە پەیدا ئەبن! لەو دەشتەدا و لەو تاریک و لێڵەدا فاتە دەنگی بەخوادا نەبێ بە کەس ناگا. خورشە دەورەی فاتە ئەدا و تەنگی پێ هەڵئەچنێ، فاتە ئەپاڕێتەوە، هیچ کەڵک ناگرێ، کەوش و پێلاوی خورشە ماچ ئەکا، هیچ کەڵک ناگرێ. ئەڵێ: خورشە ئەوا وام لەبەر دەستتا بمکوژە و ئیشی وام لەگەڵ مەکە و ناموسی خۆم و برام مەشکێنە. هیچ کەڵک ناگرێ! لە فاتە گریان و پاڕانەوە و لەخورشە دڵرەقی و دڵپیسی. بە کورتی خورشە لاقەی فاتە ئەکا و پەردەی کچێنی لەو دەشتەدا و لەو تاریک و لێڵەدا هەڵئەگرێ و بەجێی دێڵێ.

ئەوا دنیاش بەرە بەرە رون بۆوە، فاتە دەستێکی ئەکەوێتە ئەملا و دەستێکی ئەکەوێتە ئەولا نازانێ چ

بکا، ئەگەر ئەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە و کارەسات بۆ برای ئەگێڕێتەوە، قورعانی کەعبە بکاتە ملی، برا بڕوای پێ ناکا و ئەیکوژێ، ئەی ناگەڕێتەوە روو بکاتە کوێ و بۆ کوێ بچێ؟! لەم دەریای فیکرەدا ئەمێنێ و دنیاش تا بێت روونتر ئەبێتەوە، چار ناچار ئاخر فیکری خۆی دێنێتە سەر ئەوە کە بگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە و دەنگ نەکا تا بزانێ پاشەڕۆژ بەچی ئەگا.

باوەشە داری خۆی هەڵئەگرێ و دێتەوە، نان بۆ کاکی دروست ئەکا و برا ئەچێ بۆ سەر ئیشی خۆی. ئەمیش ئەو ڕۆژە تا ئێوارێ پەژارە دایئەگرێ و نازانێ چی بکا؟ لە ئاخرا فیکری دێتە سەر ئەوەی کە بەشەو بۆی دەرچێ و بچێ بە شوێن خورشەدا بگەڕێ، بەڵکو لە شوێنێک تووشی ببێ و تۆڵەی خۆی لێ بکاتەوە و نامووسی خۆی و برای وەربگرێتەوە. خورشەش ئیتر ئەوە عادەتی بوو کە ئێوارەی لێ ئەهات نزیکی ئاوەدانی ئەکەوتەوە و بەڕۆژ لەگەڵ هاوڕێکانیا لەو شاخ و چیایانە خۆیان ئەشاردەوە، لە هەڵێکا ڕاو و رووت و پیاو کوژییەکیان ئەکرد و دیسان خۆیان ون ئەکردەوە.

فاتە، ئێوارە کە برای لە کەژ دێتەوە نانی بۆ دروست ئەکا، نان ئەخۆن و ئەنوون. برا هیلاکی ڕۆژە، زوو خەوی لێ ئەکەوێ. فاتە، کە دڵنیا بوو وا برای خەوی لێکەوتووە بە هێواشەیەک لەناو جێگەکەی دێتە دەرەوە، تفەنگ و فیشەکدانی برای وا هەڵواسراوە، فیشەکدان لە پشت ئەبەستێ و تفەنگ ئەکاتە شانی و لەماڵ دەرئەچێ و روو ئەکاتە ئەو دەشتە. لەم شیو بۆ ئەو شیو، لەم کێو بۆ ئەو کێو، تا بەری بەیان ئەسوڕێتەوە تووشی هیچ نابێ، کە ئەزانێ وا ئیتر دەمە دەمی بەیانە ئەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە. تفەنگ و فیشەکدان ئەکاتەوە بە دارا و خۆی ئەکاتەوە بەژێر جێگەکەیەوە.

فاتە، بەمجۆرە دەست ئەکا بە شەو دەرچوون و بەشوێن خورشەدا گەڕان، تا نزیکەی دە پانزە شەو، بۆ ئەگبەتی ئەو، تووشی هیچ نابێ و نیشانێکی لە خورشەوە دەست ناکەوێ، بەڵام هەر واز ناهێنێ و ئەو ڕێگەی دەرچوونە کە گرتوویەتی بە شەو هەر ئەیگرێ.

شەوێک فاتە لەسەرەڕێ و شوێنی خۆی ئەڕوا، کوڕەی برای لەنیوە شەوا کتوپڕ خەبەری ئەبێتەوە، بانگی فاتە ئەکا کە ئاوی بۆ بێنێ؛ تەماشا ئەکا دەنگ نییە، فاتە، فاتە، هیچ دەنگ نییە. ئەڵێ، ئافرەتە و چۆتە سەر پێشاو ئێستە دێتەوە، فاتە هەر نەهاتەوە، کوڕە دڵی کەوتە چەکەرە کردن و هەستا چووە دەرەوە و دەستیکرد بە گەڕان، سەیر ئەکا فاتە لەهیچ شوێنێ، نییە! هەر بە تەواوی کەوتە گۆمی پەژارەوە، کە هاتەوە ژوورەوە سەیری کرد تفەنگ و فیشەکدانەکەشی دیار نییە! ئیتر بە تەواوی سەری لێتێک چوو، زانی فاتە بردوویەتی و نازانێ چ باسیشە؟

لەم گێژاوی خەیاڵەدا بوو، کتوپڕ گوێی لە خشەیەکی بەهێمنی دەرگاکە بوو! گورج خۆی کرد بەژێر جێگەکەیەوە و خەوی لە خۆی خست. کە سەیری کرد وا فاتە بەبێ دەنگ و سەنگ و زۆر بە نەرمی هاتەوە ژوورەوە، تفەنگ و فیشەکی وەکو خۆی دانایەوە و خۆی کرد بەژێر نوێنەکەوە!

کوڕە لەم کارەساتە ئارامی لێ هەڵگیراو هات دەنگ بکا، پاشان وتی: ئەم ئیشە ئیشی تاقە شەوێک نییە، چاک وایە دەنگ نەکەم، سبەی شەوێ هەستم شوێنی کەوم بزانم چییە مەسەلە؟ ئەو شەوە ڕۆژیان کردەوە و بەیانی کوڕە هەستا چوو بۆ سەر ئیشوکاری خۆی و ئێوارە گەڕایەوە و نووستن، بەڵام کوڕە هەر ئەوە بوو خۆی کردە نووستوو ئەگینە نە نووستبوو.

شەوێ لەنیودشەوا فاتە وەکو جاران کە زانی برای خەوی لێکەوتووە، هەڵسا تفەنگ و فیشەکی هەڵگرت و چووە دەرەوە، کوڕەی برایشی لەپاش تۆزێک ئەمیش هەستا و دوور و نزیک زۆر بەبێ هەستی شوێنی کەوت. سەیر ئەکا فاتە لەم کێو بۆ ئەو کێو و لەم دۆڵ بۆ ئەو دۆڵ فیشەکی خستۆتە بەر لوولەی تفەنگ و بە دەستەیەوە و ئەگەڕێ! لەپاش گەڕانێکی زۆر، کوڕە ئیتر ئارامی لێ بڕاو چوو لێی ئاشکرا کرد و وتی: فاتە چییە و چ کارەساتێکە؟ شێت بووم، تێم بگەیەنە!

فاتە، کە لەو دەشتەدا و لەو ناکاوەدا برای خۆی لەبەر دەمیا چاوپێکەوت، تەزوویەک هات هەموو لەشی تەنییەوە و وشک ڕاوەستا! لەپاش ئەوە کە تاوێکی کش و ماتی پەردەی کێشا بە سەریانا، فاتە لە خەوی سەرسامی خەبەری بۆوە و

هۆشێکی هاتەوە بەخۆیا وتی: کاکە! دانیشە، لەم تۆی تاریکی شەوەدا و لەم دەشتی دوور لە ئاوەدانیەدا، کە تەنها خوا و تاپۆی سامناکی تاریکی شەو نەبێ، هیچی تر دیار نییە، دانیشە تا لە کارەساتی رۆژگار و لە چەواشەیی بەختی بەدکردارمت تێبگەیەنم!

برا دانیشت و خوشک لە بەردەمیا، ئەوی بەسەری هاتبوو، لەو شەوەوە کە هەستا نان بکا بۆ برای و داریان نەبوو لەپێش بەیانا رووی کردە دەشت بۆ دار و خورشە کوێر و هاورێکانی تووشی بوون و خورشە بەدەستی ستەمکاری هەرچەندە ئەم لێی پاڕایەوە کەڵکی نەبوو، پەردەی کچێنی هەڵگرت و ئەمەش چەند شەوە بەم جۆرە کە ئێستا ئەو ئەیبینێ، عەودالی شوێنی خورشەیە کە بەڵکو تۆڵەی خۆی لێبکاتەوە، تا ئێستا بەمجۆرە تووشی بوو بەبرا سەرسام و چۆگەردەکەیەوە بە شوێنیا! ئەمانەی هەمووی بۆ گێڕایەوە.

فاتە ئەم قسانەی کرد و دەستی برد تفەنگ و فیشەکدانی لەملی دامالی و لە بەردەمی کاکیا داینا و وتی: ئێستەش ئەوا شەوە و کەس دیار نییە، ئەگەر بڕوام پێ ئەکەی بەو خوایەی کە تەنها ئەو نەبێ کەسی تر لەم کاتەدا ئاگای لە ئێمە نییە، کارەسات بەو جۆرە بووە کە بۆت ئەگێڕمەوە. ئەگەر بڕواشم پێ ناکەی ئەوا فیشەک لەبەر لوولەی تفەنگایە، تفەنگێکم پێوە بنێ و بمکوژە بۆ ئەوەی کە ئێمە تا ئێستە بە سەربەرزی و بە رووسووری ژیاوین لە ئێستە بە دواوە لە ناوچەوانی منەوە تۆ لەکەدار نەبی و گیانی من ببێ بە گاوگەردوونی تاقە سەعاتێکی شەرەف و ناوبانگی تۆ. چۆڵیشە کەس نازانێ، ئەتوانی لەپاش کوشتنەکەم بچیتەوە مالی خۆت و بەیانی دەنگ وا بڵاوبکەیتەوە کە خوشکم دیار نییە و لەپاش گەڕان و پرسیار دیارە تەرمەکەم ئەدۆزرێتەوە و ئەنێژرێ و تۆیش گۆیا هەر لە ئەملاو ئەولا و پرسیار ئەکەی بە شوێن ئەو کەسەدا کە خوشکتی کوشتووە، ئەمەش بۆ ئەوە با پاش منیش قسەی کوشتنی من نەدەنە پاڵ تۆ و تووشی هیچ نەبی. ئەگەر ئەمە ئەکەی بیکە، ئەگەر خۆ ناشیکەی تۆزێ پشووت ببێ بێگومان خوا ئەم نهێنییە دەرئەخا، ئەو وەختە ئەگەر خوشکت و رووسوور و بێگوناه بوو، دەرئەکەوێ ئەگەر خۆ وایش نەبوو فیشەکەکەی ئێستە هەر ئەمێنێ!

کوڕە، کە گوێی لەم قسانە بوو، لەم عالەمەوە کەوتە عالەمێکی تر و دەنگی دەنگەی سەرسامی لە مێشکیا پەیتا پەیتا تەونی ئەتەنی! هەرچەند دنیا شەو بوو، بەڵام ئەگەر رۆژیش بووایە ئەوا دنیا لەو شەوە تاریکتر ئەبوو لەبەر چاوی، کەوتە گێژاوی ئەو هەرەسەوە؟ لەپاش لاکدانەوە و سێ و دوویەکی زۆر لە دڵی خۆیا تفەنگ و فیشەکی هەڵگرت و وتی: فاتە هەستە با بچینەوە بزانین ئەم دنیایە لەبارەی ئێمەدا بە چ کارەساتێکی تر ئاوسەو چ رووپەڕەیەکی ترمان بۆ دێنێتە پێشەوە!

سا، زۆری پێ نەچوو هەروا بەدەم کش و ماتی رۆیشتنەوە فاتە سەیری کرد لە کوێرە شیوێکی دوورا تارمایی دووکەڵێکی بەرچاو کەوت! وەستا و وتی: کاکە! ئەوا لەو شێوەدا چاوم لە دووکەڵێکە، برایەتیم لەگەڵ بکە و ئیزنم بدە، با بچم بزانم چییە؟ ئێ، بەڵکو ئەمە خوایە خورشە بێت، تۆ لێرە راوەستە بە فرکانێ ئەگەڕێمەوە لات!

کاکی کە لای کردەوە راستە دووکەڵێکی بەرچاو کەوت، بەلایە زۆر و بە لایە خواهێشت، ئیزنی داو وتی بچۆ!

فاتە کە چوو تەماشایکرد وا لە کوێرە شێوەکەدا خورشە و دوو زەلامی تر دانیشتوون، چایان لێ ناوە، چا ئەخۆنەوە! بەبێ ئەوەی ئەوان هەستی پێ بکەن خێرا گەڕایەوە بۆ لای براکەی و وتی: کاکە! خوا هاتووە بەهانای داوێنپاکی و بێگوناهی منەوە، ئەوا خورشە خۆی و دوو کەسی تر لە هاورێکانی لەوێ دانیشتوون چا ئەخۆنەوە. ئێستا منیش ئافرەتم و چست و چالاکیی پیاوم نییە بۆ راکردن، لێرەشەوە تا کۆیە رێگەیەکی دوورە، لە توانای منا نییە بەم دەم و دەستییە، تفەنگ و فیشەکەکە بدە بەمن، تۆ بچۆ بۆ کۆیە خەبەر بە مەفرەزە بدە با بێن، پێنجسەد رووپییەکەش وەرئەگری، تا ئێوەش ئەگەنەوە، ئەگەر من هێشتم ئەمانە دەرچن ئەو وەختە گوللەیەکم پێوە بنێ! کوڕە لە پاش لێکدانەوە تفەنگی دا بەخوشکی و خۆی رووەو کۆیە بۆوە. ماوەی کۆیە و ئەو شوێنەش سێ سەعاتە رێگەی پێیان ئەبوو.

لەولاوە کوڕە رۆیی و لەملاشەوە

فاتە تفەنگی گرت بە دەستەوە و وەکو شێری برسی کە بە شوێن نێچیرا بگەڕێ و نێچیری خۆی دەستکەوتبێ بەو جۆرە دەورەی خورشەی دا، تا گەیشتە ئەم پلەیە دنیا بەرە بەرە روون بۆوە.

ئەمیش لەسەر سەریانەودیە و کردوویە بەسەر کڵاوەیەکدا فیشەکی لەبەر لوولەی تفەنگایە و بۆیان چووەتە پارێزەوە بەو نیازەی کە یان تنۆکە خوێنە بەناموس و پڕ لە ئازایییەکەی خۆی لەوێدا بڕێژێ، یان ئەگەر هەور پەڵێکی راکێشێ و خورشە بفڕێنێ، ئەم نەیەڵێ.

لەو سەردەمەدا کە دنیا وا هەر پەردەی تاریکی ئەداتە لاوە، یەکێ لە هاورێکانی خورشە هەڵئەستێ بۆ ئەوە رێ و بان تاقیبکاتەوە و ئیتر ئەو شوێنە بەجێ بێڵن و برۆن. کە هەڵئەستێ و سەیرێکی ئەملاو ئەولا ئەکا تەماشا ئەکا وا لەتۆزێ دوورەوە یەکێک بە تفەنگەوە بەسەر سەریانەوە راوەستاوە. خۆی ئەکێشێتە پەنا بەردێکەوە و ئەویش دەست ئەداتە تفەنگ و بانگی هاورێکانی ئەکا. لەم کاتەدا فاتە دەستی لە کارا ئەبێ و تفەنگێکی تێ ئەگرێ، گوللە وەکو ئاگری قودرەت ئەڕوا، تا کابرا دەست بە تفەنگا دێنێ، گوللە ئەنیشێتەوە بەناو چەوانییەوە! لە نیوەی لوتی بەرەو ژوور بە مێشکیەوە ئەیپرژێنێتەوە ئەو ناوە!

هاورێ راست ئەبنەوە و ئەبێ بە شەڕە تفەنگ، بەهەر لایەکدا سەر دەردێنن، فاتە بە گوللە بەرەنگاریان ئەبێ! دیسان گوللەیەکی تر لە ئاوقەی ئەو هاورێکەی تری خورشە ئەکا، ئەیدا لە شانی و بریندار ئەکا، برینداریێکی وا کە کەڵکی ئەوەی ئەبرێ دەست بداتەوە تفەنگ. مایەوە سەر خورشە و فاتە، ئەم دووە وەکو دوو شێری تووڕە بە گوولە هاویشتن و بە بەرەنگاری یەککردن بەر ئەبنە یەک! دنیا تەنگی بەنیوەڕۆ هەڵنا، ئەو دووە بەو جۆرە لە جەنگا بوون و فاتە نەیهێشت خورشە لە شوێنەکەی دوور کەوێتەوە لەو وەختەدا برا، بەدەستە مەفرەزەی پۆلیسی حوکمەتەوە گەیشت و دەورەی خورشەیان دا! تا ئەم وەختە ئەوی لە ئەستۆیا بوو کە بەرەڵڵا نەکردنی نێچیرەکەی بوو بەجێی هێنا!

لە راستیدا خورشەش مەردانە هاتە دەست، تا ئاخر فیشەکی پێ نەما، ئەنجا تفەنگەکەی فڕێدا و ئەو وەختە پۆلیسەکان چوون گرتیان و دایانە پێش بۆ کۆیە، هاورێکانی ئەوە بوو یەکێکیان کوژرا بوو تەرمەکەیان خستە سەر وڵاغێک و ئەوی کەشیان بە برینداری لەگەڵ خۆیان برد. ئەم کارەساتە لەولاتی کۆیە دەنگێکی گەورەی دایەوە.

کە ئەمانە برانەوە کۆیە، کوژراوەکە نێژرا، بۆ خورشە و هاورێ بریندارەکەشی "مەحکەمەی کوبرا" هەر لەشاری کۆیە دانرا، یەکێک لە ئەندامەکانی مەحکەمە "مەلا سدیق"ی نازەنینی بوو، چەند رۆژ ئەو موحاکەمەیە درێژەی کێشا و باس و خواسیش ئاشکرا بوو، عالەمی کۆیە هەموو ئەچوون و تینووی بڕیاری مەحکەمە بوون، فاتەش بەبێ پسان هەموو رۆژێک لە سەرەتای موحاکەمەوە تا دوایی هاتنی، ئەچوو لە گۆشەیەکی ژووری مەحکەمەوە دائەنیشت و گوێی لە کارەسات و پرسیار و وەڵامی ئەندامی مەحکەمە و خورشە ئەگرت. لە دوایی هاتنی مەحکەمەدا ئەندامی مەحکەمە بە دەنگی بەرز بڕیاری "داد"ی بەسەر گوێگرانا بڵاو کردەوە بە پانزە ساڵ حەپس بۆ هاورێ بریندارەکەی خورشە و بەخنکاندنی خورشە تا مردن.

لەم کاتەدا فاتە راست بۆوە و رووی کردە ئەندامی مەحکەمە وتی: ئا، دەستوورم ئەدەنێ تەنها تاقە قسەیەک لەم ژووری مەحکەمەیەدا لەگەڵ خورشەدا بکەم؟ مەحکەمە لەپاش پشکنینی فاتە بۆ ئەوەی نەک چەکی پێ بێ، ئیزنیدا! ئینجا چووە بەردەمی خورشە و دوو سمێڵی زلی پێوە بوو، سمێڵەکانی گرت و دوو تفی کردە ناوچاوانی و وتی: خورشە ئەو شەوە چەندت لێپاڕامەوە کە دەستم لێ مەدە؟ چەند خواو پێغەمبەرم کردە تکاکارت؟ چەندە خۆم خست بەسەر پێڵاوەکانتا؟ کە خوا رەوای هەقی نییە تۆ والەمن ئەکەی. ئا ئەمە رۆژەکەیە کە خوا هەقی بێگوناحان ئەستێنێ و با ستەم درێژەش بکێشێ هەر ئەبێ ستەمکار بە تۆڵەی خۆی بگاتەوە. بەرەڵڵای کرد. خورشەش هەر ئەوەندە هاتە زمان وتی: راست ئەکەی و هەقتە. مەحکەمەش لەو شوێنەدا هەڵنەستا تا بڕیارێکی رەسمی بۆ فاتە دەرکرد کە بە شەرع و قانون ئەم کچە بە کچ بناسرێ و هیچ گەردێکی لێ نەنیشتووە!

فاتە بەرووبەکی لەمانگ نورانی

تر و گەشتر لەژووری مەحکەمە هاتە دەرەوە، کـاکـیـشی پێنج سـەد رووپیـیەی خۆی وەرگـرت، هاوڕێی خورشەش خرایە بەندینخانەی پانزە سالی خۆیەوە، خورشەش نێررایە هەولێر، لەوێ سێدارەی بۆ هەلخراو ملی کرا بە تەنافەوە و خنکێنرا، لە بەیانییەوە تا ئێواری بەدار قەواخەکەوە مایەوە. ولاتیش رزگاری بوو لە جانەوەرایەتی ئەو جانەوەرە بەهۆی باهووی مەردانەی فاتەی قارەمانەوە!

* محەمەد عەبدولواحید بۆی گێرامەوە گوتی:

لە گوندی "لهێبان" لەو دەشتی دزەییە دنیا شەو بوو، خێوەتێکمان هەلدابوو، دانیشتبووین. پاش نوێژی خەوتنان بوو، پیاوێک هەبوو "سمایلە گۆج"یان پێئەوت، لەلامان دانیشتبوو، قسەی خۆش بوو و سەرگوزشتەی کۆنی بۆ ئەگێڕاینەوە. بەدەم قسەوە کەوتینە وەختی خێل خەوتنان، کتوپڕ کوڕێکی مێردمنال هاتە ژوورەوە و دانیشت و سمایل پێی وت: هەتیم ئەوە لەکوێ بووی تا ئێستە؟ کوڕەش هیچ سێ و دووی نەکرد وتی: وەلّلا خالە سمایل هەنووکە لای ژنێک بووم کە لەگەل مێردەکەی خۆیا راکشابوو، منیش چوومە پالی! محەمەد وتی: هەر ئەوەندەم زانی سمایل دەستێکی هەلهێنایەوە و شەپە زللەیەکی دا بەناوچەوانی کوڕەکەدا! شەپە زللەیەکی وا کە ئاگر لە چاوی بروسکەی سەند. وتی: هەتیم ئەمە قسەیە تۆ دەیکەی؟!

منیش وتم خالە سمایل بۆچ لێی ئەدەی، کەی قسەی منال بایەخی هەیە؟ سمایلیش وتی: ئەفەندی دەسا من قسەیەکت لۆ دەگێڕمەوە، ئەو وەختە دەزانی کە لە ژنا چ پاردوانێک هەیە؟!.. ئینجا دەستی کرد بەگێڕانەوە و گوتی:

ئەفەندی ئا ئەم سمایلە گۆجە کە لە بەردەمتا کەوتووە و پیر و کەنفت بووە، لە وەختی خۆیا کە ناوی سمایلە گۆجیان بهێنایە منال لە بێشکەدا ژیر ئەبووەوە! دزێک بووم منالم لەبەر مەمکی دایکی ئەدزی و خۆی بەخۆی نەئەزانی! لە هەموو ئەم ولاتانەدا هەر ناو ناوی "سمایلە گۆج" بوو! سالێک لەم دەشتی دزەییەدا نەهاتی و قاتوقڕی بوو. کاول بێ دەشتی دزەیی، کە بارانی نەبوو ئیتر خەلکەکە هەموو ئەبێ بکەونە دەرۆزە کردن. سێ سال کە باران نەبوو جا ئەفەندی بزانە ئەبێ کو بووبێ؟! ئەو سالە بەهارێکی زۆر زوو بوو، هەرچەندە هەر لە زستانەوە باران چاکی هێنابوو، بەلام لەبەر زوویی هیچ پێنەگەیشتبوو. دەرامەتی منیش هەر دزی بوو، دزییەکەش دەست نەئەکەوت زۆر شڕ ببووم، ناچار زەلامێکم هەلگرت و لێمدا رۆیشتم. رێگەی ئەو کوێستانەمان گرتەبەر، لە تفەنگ و فیشەکیشا زۆر بە تەدارەک بووم، چەند رۆژێک هەر رۆیشتین تا گەیشتینە ئەو کوێستانەی سەرەوە، پێی ناوێ، رەوەیەکی سی چل سەری لەولاغی بەرزەمان هێناو بەلارێگەدا گەڕاینەوە دواوە رووەو مال. بەشەو ئەهاتین و بەرۆژ لە شیو و کەندەلانی دوور لە ئاوەدانیدا ستارمان ئەگرت.

شەو بوو، هیچمان نەخواردبوو، بە تەواوی پەکمان کەوت، شەوێک وا بە لارەلار من لەپێش ولاغەکانەوە بووم ئەهاتین، لە دوورەوە و لەپالی کێوەکەوە تارمایی رەشمالێکم بەدی کرد. بە هەتیوەکەی هاوڕێم وت: تۆ بەر و ولاغەکان بگرە من وا ئەچم بۆ ئەو رەشمالە، بەلکو نانێ شتێکم دەست کەوێ بیهێنم. ئەمەم بەو وت و تفەنگەکەشم فیشەکی تێدابوو لە ملم کردەوە و گرتمە دەستمەوە و بەبێ هەست لێمدا رۆیشتم.

وا دنیا زۆر تاریکە، بەرچاوی خۆم نابینم، وەختی وەها بوو تەپ و کـوت ئەکەوتمە کەندەلانەوە و هەلئەستامەوە. چووم هەتا نزیکی رەشمالەکە بوومەوە، وەستام، گوێم هەلخست سەیر ئەکەم نە دەنگێ، نە خشەیەک، هیچ نییە، دنیا کش و ماتە، زۆر بەبێ چرپە خۆمم گەیاندە رەشمالەکە، تەماشام کرد دەوارێکی زۆر گەورەیە، هەناسەی لێوە نایە، سەگ نییە، پشیلە نییە، لە دەری دەوارەکەدا سوورامەوە و بەدەست دەستم ئەخشان لە دەوارەکە، هەناسەی گیانلەبەرم شک نەبرد لەناویا. جارێکی کەش گەڕام بە دەوریا و دەرگایەکم دۆزییەوە. بۆ جاری سێهەم بەبێ خشە لە دەرگاکەوە چوومە ژوورەوە!

ئۆە، ئەفەندی! هەر ئەوەندەم ئاگا لێبوو پێم خستە ژوورەوە، ئیتر بە تەوقە سەرا کەوتم و تاوێرێک لەسەر کەوتە سەر سەرم، یەکێک بوو! تەنها ئەودەم بەخۆمەوە دی زرنگەیەک لە سەرمەوە هات و هەردوو پەلم لەدواوە وەکو بە دوو گوریس بەسترابێتەوە وابوو، نە زانیم تفەنگ چی لێهات،

نه زانیم خەنجەر چی بەسەرهات؟ دەنگێکم هاته بەر گوێ، وتی: هەی ناپیاو ئەوە بە تەمای چیت!

ئاگردانێک لەناو دەوارەکەدا بوو، ئاگرێکی کزی تیا بوو، من لە دەرەوە هەستم پێ نەکرد، دوو سێ سەرە بزووتی بەسەرەوە بوو، دەستێک بۆی کێشرا سەرە بزووتەکانی خۆش کرد و ئاگرەکە کڵپەی سەند. تەماشام کرد ئەمە ئافرەتێکە وا بە سەرمەوە. بەمجۆرە پەل و پۆی بریوم! بەڵام ئافرەتی چی؟ هەتا دەست هەڵبڕی کەڵەگەت، بەدیەن، هەر باسکێکی ئەڵێی توکمەی دارژاوە، روومەتێکی پان، چاو و برۆیەکی گەش، جووتێ گۆنای خڕی سوور، جلێکی ئاڵ و والێی جوانی لەبەرابوو، ئەفەندی بڕوام پێ بکە تا ئەو رۆژە و لەو رۆژەشەوە تا ئیمرۆ ئافرەتی وا جوان و نازدارم نەدیوە، تەمەنی لە دەوری حەڤدە و هەژدەدا ئەبوو، تفەنگێکی کورتی خستبووە ژێر باڵی، پەنجەی بەسەر پێکەیەوە بوون، ریزێکیش فیشەک لە پشتیا بوو! بەم جۆرە لەسەر سنگم دانیشت و دیسان وتی: هەی ناپیاو ئەوە بەتەمای چیت؟! منیش وتم: خوشکم خوا ئەیزانێ بەتەمای هیچ نیم و ڕێبوارم و ڕێم لێ تێکچووە و ئەم رەشماڵەم بەدی کرد و هاتوومەتە ئێرە!؟

وتی: تۆ ڕێبواری یا پیاو خراپی؟! بۆچی من ئاگام لێ نییە کە تۆ چۆن هاتیت، چۆن بە دەورەی دەوارەکەدا سێ جار سووڕایتەوە و پاشان بەبێ چریە هاتییە ژوورەوە؟ ئەمە هی پیاوی ڕێبوارە یا هی پیاوی خراپ؟! لەم بەینەدا سەیرم کرد تفەنگ و خەنجەرەکەم وا لەولاوە کەوتووە، منیش هیچم پێ ناکرێ، تەنها پاڕانەوە و ئەوە نەبێ کە ڕێبوارم و لەبرسا هاتووم. بەهەر جۆر بوو، ژنەکە لەسەر سنگم هەستاو لەولاوە تفەنگ و خەنجەرەکەی منی هەڵگرت و بردی لە سەرووی دەوارەکەوە دایناو هەر ئەشی وت: ڕاستە تۆ ڕێبواری؟ هەی عافەرم پیاوی ڕێبوار!

ئینجا رووی تێکردم وتی: لەو شوێنە کەلێی دانیشتووی دانیشە، هەر ببزوویتەوە ئەتکوژم. کە ئەو ئەمەی وت: خۆ من هیچم پێ نەماوە، تەنها "بەڵێ" نەبێ، ئەمجارە هێنای تفەنگەکەی خۆی لەژێر بنەنگەڵی دەرهێناو گرتی بە دەستێکییەوە. هەستا چوو لەولاوە قاوەیەکی هێنا خستییە سەر ئاگرەکە و رۆنیشی هێنا خستییە ناوی، چوو لەسەر هۆرێک پێنج شەش هێلکەی هێنا شکاندییە ناو رۆنەکە و دروستی کرد. چوو هەر بە دەستە خاڵییەکەی دەستەبەرەیەک نانی هێنا. لەبەر دەما داینا و تاوە هێلکە و رۆنەکەی هێنایە لامەوە، چوو کاسەیە دۆیشی هێناو وتی: دە بخۆ! خۆیشی لەولای ئاگرەکەوە دانیشت و بە عاستەم لوولەی تفەنگەکەی تێکردم، دەستیشی هەر لەسەر پەلەپیتکەیەتی! من بەجارێ شپرزەی ئەوە بوو بووم کە نەوەک دەستی بترازێ و بمکوژێ. لەمە زۆر ئەترسام. ژنە هەستی بەمە کردبوو، پێی وتم: مەترسە نانی خۆت بە ڕەحەتی بخۆ.

زۆرم برسی بوو. دەستم کرد بە خواردن تا تەواو تێرم خوارد. لەم ماوەیەشدا هەرچەندە سەیر ئەکەم لەم ژنە زیاتر کەسێکی تر لەم دەورو بەرەدا نییە، نەژن نە پیاو، نە مناڵێک هەر هیچ. نانەکەم خوارد، بە تەواوی تێرم خوارد. هات ئاوەکەی هەڵگرت و بردی خستییەوە سەر ئاگرەکە، دیسان چوو رۆنێکی زۆری هێنا خستییەوە ناوی، ئینجا چوو بەقیاسی پانزە شانزە هێلکەی تری هێناو شکاندییە ناوی، چوو دەستە بەرەیەکی زل نانی هێنا، تاوەکەی قلپەوە کردەوە ناو نانەکان و پێچایەوە و هێنایە بەردەستم وتی: دە هەستە برۆ ئەمەش بەرە بۆ هاوڕێکانت!

وتم: هاوڕێی چی من هەر خۆمم؟ وتی: هەستە، هەستە پیاوی بێ هاوڕێ بەمشەوە و لەم وەختەدا ڕێی ناکەوێتە ئەم شوێنە، هەستە درێژەی مەدەرێ، تۆ ڕێبوارنیت! پیاو خراپیت و هاوڕێشت هەیە، هەستە برۆ خوات لەگەڵ!

وتم: ئەی تفەنگ و خەنجەرەکەم؟ سەیرێکی کردم و وتی: تفەنگ و خەنجەرەکەشت ئەوێتەوە پیاوە ڕێبوارەکە، چوو لەولاوە تفەنگەکەمی هەڵگرت، فیشەکی لێ دەرهێنا و بۆی هێنام. لەبەر دەستی دانام، وتی: بیکەرە ملت! تفەنگم کردە ملم و چوو خەنجەرەکەشی هەڵگرت، لە دوورەوە بۆی فڕێدام و وتی: ئەوەش خەنجەرەکەت دە هەستە خوات لەگەڵ. ئەمجا بە تەواوی لوولەی تفەنگەکەی خۆی تێکردم و وتی: خەیاڵ نەکەی، هەر دەست ببزوێنیتەوە تەنها تاقە فیشەکێکت بۆ ئەنێرم.

منیش بەهێواشی خەنجەرەکەم

هەڵگرت و کردم بە بەر پشتێنەکەمدا و نۆردووە نانەکەم هەڵگرت و هەڵسام، رووم تێکرد و وتم: شێرەژن، بەو خوایەی بان سەرە سوێندت ئەدەم، تۆ چیت لێرە و چ کەسیت، من هەرچەندە لەم بەینەدا سەیرم کرد، لەتۆ بەولاوە کەسی ترم لەم چۆڵ و بیابانەدا نەدی. ئەوا من ئەڕۆم، بەڵام تێمبگەیەنە؟ وتی: هەستە برۆ ئەوە ئیتر ئیشی تۆ نییە. وتم: دەسا شەرت بێ یا ئەمەتە ئەمکوژی یا ئەمەتە پێم ئەڵێی! زەردەخەنەیەک گرتی و وتی: زۆر حەزئەکەی بیزانی؟! من ژنی کوڕێکی ئامۆزای خۆمم، مانگێک ئەبێ مێردم پێکردووە، لەو وەختەی مێردم پێکردووە، بەتاقە ماڵە هاتووین لێرە دانیشتووین، تەنها هەردووکمانین، سێ چوار رۆژ لەمەوپێشتر ماینێکمان لەگوند دز بردوویەتی، ئەو هەستا چوو بە شوێن ماینەکەدا و من تەنها خۆم لێرەدا بەدیار ئەم مەڕ و مالاتەوە ماومەتەوە، ئەمەیە سەمەرەی من!. منیش وتم: ژنەکە! من هەر شتێک هەم، هەم، بەڵام ئەوە بزانە بەلای خۆمەوە پیاوێکی ئازاو ناودار بووم، ئەوی تۆ بەمنت کرد و ئەوی من لەتۆوە دیم، تا ئێستە نەکەس پێی کردووم و نە لەکەسم دیوە.

هەستام و ئیتر بەڕێ کەوتم، ئەویش دوور و نزیک لوولەی تفەنگەکەی راست تێکردبووم". هەتا لەچاو ون بووم. ئەوەندەم ئەزانی هەر دەستم ببردایە بۆ تفەنگەکەم، بەبێ هێڵ و گفت ئەیکوشتم.

جا ئەفەندی هەنووکە ئەم هەتیمە دەرێ، من شتی وام کردییە! چما هەموو ژنێک وەکو یەک وایە؟ ژنی واش هەیە و ژنی واش هەیە، ئەوی من لەو حورمەیە چاوم پێکەوت، هەنووکەش هەر موچرکە بە لەشمدا دێتە خوارێ.

* شێخ محەمەدی شەشوولەیی، پەڵە گەنمێکی هەبوو لەو دەشتی دزەییە، رۆژێک ئەچێ بۆلای گەنمەکەی، سەیر ئەکا وا لەنزیک گەنمەکەی ئەوەوە شوانێک خەریکە "بلوێر" لێئەدا، ئەمیش بانگی ئەکا ئەڵێ: راعی راعی! ئەو سەوتە حەزینە لەو "نای"ە رەقیقەوە بە ئەنغامی شەفەتەینە؟ یا بە تەحریکی ئەصابیعانە؟ شوانەش ئەڵێ: مامۆستا بەسەری تۆ پێی مەڕی من نەچووەتە ناو دەغڵی تۆوە. مامۆستا ئەڵێ: ماشەڵڵا جەهل عەجایبە.

* هەر ئەم شێخ محەمەدە ژنێک ئەچێتە لای نووشتە بۆ کوڕێکی بکات، شێخیش نووشتەی بۆ ئەکا و پێی ئەڵێ: برۆ ئەم دوعایە بەرە موشەمەعی کە بە جلدێکی ئەخزەر، موخیتی کە بە خەیتێکی ئەبیەز، لە فەوقی رەئیسی تفلەکەی موعەلەقی بکە. ژنە ئەڵێ: مامۆستا نووشتەکەت خوێند چی لێبکەم؟!. دیسان مامۆستا ئەڵێ: ماشاڵڵا، جەهل عەجایبە!

* کابرایەکی دەوروبەری رەواندز، رۆژێک ئەچێتەوە و ئەم قسەیە ئەگێڕێتەوە و ئەڵێ: "نوکە لەو واکە واکێک لەسەر واکێک بوو، هەر واکە واکی بوو، واکم واک کردێ و واکم کرد، چە واکێ نەبوو پێی واک کەم، واک بوو"!

* شوانێکی زراری، ئێوارێ مەڕ دێنێتەوە بۆ ناو ماڵ و بانگ ئەکا: هۆ ماڵی واکێ، واکتان زایە، دوو واکی هێنایە، هەر واکە واکیتیان، بچن بیهێننەوە. ئیتر ئەو ماڵە لێی تێئەگەن کە ئەمە لەگەڵ ئەوانییەتی، ئەچن مەڕەکە ئەهێننەوە، سەیر ئەکەن دوو بەرخی بووە!

* مەلایەک هەبوو، چووە لای حاجی مەلا عەبدوڵلای کۆیە، وتی: قوربان بەقەرەیەک چووە ناو مەزرەعەیەک و تەخریبی هەموو مەزرەعەکەی کرد، مالیکی مەزرەعە مەدییەدی کرد بۆ ئەخزی حەجەرێک و حەجەرەکەی رەمی کرد بۆ عونقی بەقەرەو بەقەرەکە مەقتول بوو. ئەچمن مالیکی مەزرەعەکە بە (دیە)یبەقەرەکە ئەم لا؟! حاجی مەلاش ئەڵێ: بەسەری خۆت ئەگەر هەڵنەستی بچی ئەم درووێنەیە لە شوێنی کە بکە لا!

* مەلایەک هەبوو، لەو دەشتی دزەییە، کوڕێکی لاساری هەبوو، هەرچەند پێی ئەوت: بخوێنە. ئەو بەگوێی نەئەکرد. وایان لێهاتبوو دانیان لەیەک سپی ببۆوە. رۆژێک لەلا کۆلانێکا کوڕەکە بەگیر دێنێ و ئەم گفت و لفتەی لەگەڵ ئەفەرمووێ: بەخۆم و بە عەسای یەدم و مەخمەرەی سەرم، لەبەر من نەبووایە عەزر فوتیک ئەکلی ئەکردی. کەچی ئێستاکەش پشتت داوەتە جدارەکەوە و ئەڵێی وەڵڵا لا ئەقرەئ

* کوڕێکی "هەرتەلی" لەو خۆشناوە، ژنێکیان لەبەری "کۆیە" بۆ مارە کردبوو، رۆژێک کوڕە هەڵئەستێ دوو گوێدرێژ بار ئەکا لەمێوژ و

دۆشاو ئەچێ بۆ ماڵی دەزگیرانی، کە ئەگاتە ئەوێ خەسووەکەی لە دوورەوە چاوی پێ ئەکەوێ و دێتە پێشوازیی و گەلێ بەدەوریا دێت و ئەیباتە ژووردوە، بەڕەیەکی پاک و خاوێنی بۆ رائەخا و پێی ئەڵێ: کوڕم لەوێ دانیشە. خۆی ئەچێ بەلای تەقەت کردنی وڵاخەکانەوە.

کە دێتەوە تەماشا ئەکا کوڕەکە بەرەکەی هەڵداوەتەوە و لەسەر زەوییەکە، بە رانکە شڕەکەیەوە دانیشتووە، پێی ئەڵێ: کوڕم ئەوە من بەڕەم بۆ تۆ راخستووە لەسەری دانەنیشتوویت؟ کوڕە ئەڵێ: بەخودای دایە، قونانم بڕە موی پێوەنە، رایەم ناکەوێ لەسەر بەڕەکی دانیشم. خەسووەکەی سەرێکی بۆ بائەدا و ئەڵێ: دەک موبارەک نەبێ بۆ خۆم و زاوام. کوڕە گەڕایەوە بۆ ماڵی خۆیان لە پاش ماوەیەکی تر برایەکی لەخۆی گەورەتری هەبوو، دایکەکەی پێی وت: دە کوڕم تۆش بچۆ سەرێک لەماڵی خزمێکمان بدە و شتێکیشیان بۆ بەرە. ئەویش هەستا بارێک دیاری دایە پێش و چوو بۆ ماڵی دەزگیرانی برای.

ئەمیش کە گەیشتە ئەوێ، ئامۆژنی هات و پێشوازیکرد و رایەخی بۆ راخست و دانیشت، پاش بەخێرهاتن و چاک و چۆنی، گلەیی براکەی لاکرد وتی: من رایەخم بۆ راخستووە و پێم وتوە دانیشە، کەچی ئەو وای جوابدامەوە، ئەمە ئەقڵە ئەو هەیەتی؟ کوڕەی براش سۆر بۆوە و تووڕە بوو وتی: دەک لە قوڕێم نا، دەسا وەڵڵا دوو جارم گایە، چ بڕ مووی بە قونانەوە نییە، وەکو کسۆکی درۆی کردینە. خەسووەکە، کە گوێی لەمە بوو وتی: بەه هەتەر مەتەر ئەم لەو بەدتەر.

ئەویش گەڕایەوە، بۆ ماڵەوە و پاش بەینێکی تر باوکی کوڕە بە دەستووری ئەو وڵاتە ئەویش هەستاو دوو گوێدرێژی دایە پێش و چوو بۆ سەردانی بووک. کە گەیشت، خەسوو هات بە پیرییەوە و داینا و پاش حەسانەوە شکاتی کوڕەکانی لا کرد، کابراش وتی: ئەو هەتیمە بیژییە، گچکەکەیان هیچ، بەرا داخی کوڕە گەورە لە درا منە. وتی: بۆچی؟ وتی: ئەوی رۆژی کەران دەگێم ئەو بیژییە دێ پخەی لە کەران کرد، کیرم دە دوڕ قوزی کەرێ حاسی بوو، ئەویش لۆ خۆی پێدەکەنی. ژنە ئەڵێ: گوڵمە، گوڵمە، ئیشێکی باشمان کرد کچی چاکمان دا بەشوو.

کابراش ئەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە پاش چەند رۆژێک ئینجا دایکی زاوا هەڵئەستێ بە بارێ دیارییەوە ئەچێ بۆ ماڵی بووکێ بۆ سەردان، دایکی بووک زیاد لە هەموویان بە دەوریا دێت و پاشان ئەکەونە راز و گلەیی و هەموو قسەکانی بۆ ئەگێڕێتەوە و ئەڵێ: شکاتم بردە بەر خاڵە مستۆی باوکیان، کەچی ئەویش ئاوای وت. دایکی زاوا وتی: تو خوا واز بێنە. داخی باوکیان زۆر گەورەن لەدڵێ من. دایکی بووکیش وتی: بۆچی؟ وتی: کچێ ئەوا کوڕ و کاڵێ دێ هەموو بەمن خەنی دەبن، کەچی ئەویش دەچێ جاشکانی دەگێ، ژنە گوتی: دەخوا پێمان رەوا بینێ ئەم خزمایەتییە تازەمان!

* کابرایەکی خۆشناو خەڵکی گوندی "کونە فلوسە" بوو، گەلێ کەسی کوشتبوو، رۆژێک لە "کۆیە" زەفتییە بەگیری دێنن نەک بەو ناوەوە، کە خەڵکی کوشتووە، چونکە ئەو دەستەیە نەیانئەزانی ئەمە ئەوە، بەڵکو بۆیە هەڵیانپێچابوو بیبەن بۆ "سخرە" لە کابراش وایە بۆیە تێی ئالێون ناسیویانە، کە ئەمە ئەوە خەڵکی کوشتووە، دەستی کردبوو بە پاڕانەوە لە زەفتییەکان بۆ ئەوەی بەرەڵڵای کەن.

حاجی رەسوڵێکی کۆییش هەبوو، لەو وەختەدا بەسەرا ئەچێ پیاوێکی بەزمان و لێهاتوو بوو، کابرای خۆشناوەی ئەناسی، چووە بن دەست زەفتییەکانەوە پێی وتن: ئێستە ئێوە ئەم کابرایەتان بۆ "سخرە" ئەوێ و ئەویش ماڵ و مناڵێکی وردی هەیە، ئەو بەرەڵڵا ئەکەن و من لەباتی ئەو بگرن. بەهەر جۆر بوو زەفتییەکانی سازکرد و کابرایان بەرەڵڵا کرد، کابرا هەر کە لە دەستیان دەرباز بوو، ئیتر وەکو مووی مار خۆی ون کرد. حاجی رەسوڵیش دەنگی نەکرد تا کابرا لەچاو ون بوو، ئینجا ئەویش ملی رێی گرت و رۆیشت. زەفتییەکان ویستیان بیبەن پێی وتن: مردوتان مرێ، شێت بوون، بردنی چی؟ بێنن دو بدەن لەمە! ئەویش خۆی نەدا بە دەستەوە و رۆیشت.

حاجی رەسوڵ بۆ ساڵی دوایی چوو بۆ "کونە فلوسە" بۆ دارگوێز کڕین، دارێکی کڕی و کرێکاری خستە سەر بیبڕێتەوە، ئەم دارە لق و پۆپەکەی بەسەر ماڵێکا شۆڕ ببۆوە، کە ئەیانبڕییەوە حەیشی بەماڵەکە تاڵ کردبوو، ژنی خاوەن ماڵ بانگی کرد

له مێردەکەی و وتی:ئەرێ هیزه ئەوه بۆ چاری ئەو سەگبابانە ناکەی؟ خۆ حەیشیان پێ تاڵ کردین! مێردەکەشی دەست ئەداتە تفەنگ و دەرئەپەڕێ. تومەز ئەم ماڵە ماڵی کابرای پارەکەیە "حاجی رەسوڵ" لە دەست زەفتییەکان رزگاری کردبوو! کابرا هەر کە دێتە دەرەوە و چاوی بە "حاجی رەسوڵ" ئەکەوێ، لە شوێنەکەی خۆی سارد ئەبێتەوە، ژنەکەش لە خوارەوە هەر قسەی ئەکرد و جنێوی ئەدا و بانگی پیاوەکەی ئەکرد کە چاریان بکا؟ ئینجا کابرا رووی کردە ژنەکەی و بە دەنگێکی بەرز بانگی کرد و وتی: کچێ وس بە، ئەوە حاجی رەسوڵە حاجی رەسوڵ، ئەگەر ئەو نەبا جارێکی کە ئەو جووتە گونانەت بەر قونان نەدەکەوت، دە ئیتر وس بە.

* کابرایەک لەو دەشتی دزەییە ئەچێتە لای مەلایەک ئەڵێ: مامۆستا بێ عەدەبی نەبێ، پیاو کە چووە سەر ئاودەستان، چەندە قنگی بشوا پاک دەبێتەوە؟ ئەویش ئەڵێ: برام ئەوەندە بشوا تا جیرەو زیرەی لێوە دێت.

ئەمجا کابرا، کە دەچێتە سەر ئاودەست و دەست بە ئاو ئەگەیەنێ، پاشان خۆی ئەشوا، هەر دەست بەخۆیا دێنێت و ئاوی پیا ئەکا، کوت و پڕ ترێک ئەکا!.. ئەڵێ: ئەی بەکێری مەلاوە، چاک جیرەو زیرەی لێوە هات.

* پیاوێکم لابوو لە بەغدا "مام پیرداود"مان پێئەووت، خەڵکی "دیبەگە"ی دەشتی دزەیی بوو، پیاوێک بوو بەدوو بارا هەژار بوو، ئەوی خوا عەرەبیشی دانابێ ئەو نەیئەزانی. ئەو سەردەمە بوو، کە حاجییەکانی کوردەواری ئەهاتن، ئەچوون بۆ حەج. دیارە ئەمانە بە "بەغدا" تێئەپەڕن، ئەمانەش کە دێن، خۆت ئەیزانی، بە تایبەتی کە هاوین بێ، زۆرتریان دژداشەیەک لەبەر ئەکەن، پشتێنێکی بەسەرەوە ئەبەستن و حەمایلەکەیان ئەخەنە ملیان و دیارە جامادانییەکیشیان بە سەرەوەیە، راستی پیاو ئەمانە بەحاجی نازانێ، بەلام با حاجی بن!

مام پیرداودی لای منیش ئێوارە وەخت بوو، دژداشەیەکی سپی تازەی لەبەردا بوو، جامانە ریشووەدارەکەی بەدەور سەرەوە بوو، لە چەقی بەر دەرگای مزگەوتەکەدا لەسەر چیچکان دانیشتبوو، جگەرەیەکی قامیشی بە لالێوەوە بوو، جگەرەکەی ئەکێشا و سەیری ئەو عالەمەی ئەکرد، کە ئەهاتن و ئەچوون!. هەندێ کەسیش هەن لە بەغدا، قاوەی دەستگێڕ ئەگێڕن، تووشی هەر کەسێ ئەبن، ئەیدەنێ و پارەی لێ ئەسێنن، بڕوات بێ سواڵ گەلێ باشترە لەو ئیشەی ئەوان.

ئەوەندەم زانی کابرایەکی رەشی پیسی شڕی چڵکنی گرژن، جەزوویەکی قاوەی بەدەستەوەیە لە دوورەوە "مام پیرداود"ی بەدی کرد و بۆی کشا، لە باوەڕی ئەوا ئەو حاجییە و هاتووە بۆ حەج ئەچێ. هیچ نەبێ شتێکی لێ ئەبەستێتەوە!، هات و لەبەردەم "مام پیرداودا" تەقەیەکی لە فنجانەکەوە هێنا و قاوەیەکی تێکرد و لەبەردەمیدا رایگرت. مام پیرداودیش هیچ سێ و دووی لێ نەکرد وەریگرت و خواردییەوە. فنجانەکەی دایەوە دەست کابرا، جگەرەکەی نەفەسێکی مابوو، نەفەسەکەی لێداو تا ئەم ئەمەی کرد کابرا قاوەیەکی تریشی بۆ تێکرد و ئەویشی وەرگرت و خواردییەوە.

ئەم قاوەچییانە رەوشتیان وایە لەقاوەی یەکەم و دووهەمدا ئەگەر کابرا نەیوت بەسە، بۆی ئەکەن بەسێ فنجان و ئیتر بۆی تێناکەن، جا لەبەر ئەوە کە "مام پیرداود" نەیووت بەسە. کابرا قاوەی سێهەمیشی بۆ تێکرد، ئەویش وەریگرت خواردییەوە و فنجانەکەی دایەوە دەستی.

کابرا ئیتر راوەستاو چاوەڕێی ئەوە ئەکا، کە هیچ نەبێ مام پیرداود حاجییە، دەست بەرێ پەنجا فلسی بداتێ، خۆ مام پیرداودیش ئەسپێ لە گیرفانیدا فەتاح پاشا ئەکا، هەر نازانێ دنیا چ باسە. کابرا، کە سەیری کرد هیچ دیار نییە و زۆریش وەستا، رووی کردە مام پیرداود وتی:" عمی اشو ما تلعب ایدک؟" واتە: مامە وەکو ئەتبینم دەست ناخەیتە کار. مەبەستی ئەوەبوو یانی دەست ناکەی بە گیرفانتا پارە دەربێنی!

مام پیرداودیش هیچ چۆنیەتی دانیشتنەکەی تێک نەدابوو و نەشیئەزانی کابرا ئەڵێ چی. سەرێکی بۆ بەرز کردەوە وتی: چ دەرێی؟ کابراش نەیئەزانی ئەم ئەڵێ چی، هەر ئەیوت: عمی اشو ماتلعب ایدک؟!

لەو وەختەدا مام پیرداود دەستی برد کیسە توتنەکەی لە پشتێنەکەی کردەوە، پەڕەیە بەرماخی دەرهێناو ئەغزە کۆنەکەی کردبوو بە پێچی

جامەدانەکەیدا، ئەویشی هێنا، لەبەر ئەوەی قـاوەی خـواردبۆوە ئارەزووی جگەرەی بوو، دەستی کرد بە جگەرە تێکردن! کابرای قاوەچی، کە ئەمەی چاوپێکەوت دەستێکی راوەشاند و وتی: "انی اگـول هیـضی تلعب بیـدک" واتە ئەڵێم وا تۆ دەسـتت بخەیتە کار؟ ئەمیش هەر ئەیوت: چ دەڵێی؟!

کابرا سەیری کرد هیچ کەڵکێک لەمە وەرناگرێ، قـاوەکەی لەدەست دەرچوو، زۆریش مـاتڵ بوو و سـەری خۆی حیز کرد و بە بۆڵە بۆڵ لێیـدا رۆیشـت، لـەبـەر ئـەوەی چـاوی لـە خـەڵکی ترەوە بوو، نەیشـیـتوانی جامادانەکەی لەسەر بکاتەوە.

لێرەدا سەیرتر ئەوە بوو وەکو کابرا ئەڵێ: ئاش لە خەیاڵێک ئاشەوان لە خـەیاڵێک. کـابرای قـاوەچی لای وابوو نێـچـیـرێکی قـەڵەوی دەست کەوتووە و ئێستە بەبێ قرە پارەیەکی باشی لێ دەست ئەکـەوێ. مـام پیـرداودیش لای وابـوو، لـە دیوەخـانەکـەی "سلێـمـان ئاغـا"، لە "دیبـەگـە"یە. کـابرای قـاوەچی ئاغـا قاوە بەسەر کرمانجەکاندا ئەگێڕێ! ئیتر هیچ ئەوەی بەدڵێ نەئەهات، کە ئەمە "بەغدا"یەو ئەبێ پارە بدات.

تەنانەت لەپاشا من پێم وت: بۆچ ئەو قاوەت وەرگرت؟ وتی: لۆ؟ وتم: ئاخـر ئەبێ پارە بدەیت. وتی: کـو ئەبێ پارەش بدەم؟! وتم: ئەی بۆچ سێبەری بن ئەشکەوتە؟ وتی: کو خۆ لەکن خۆمان چ پارەو مـارە نینە، جا من پارەم لەکـوێ بوو بیـدەم! وتم: کەواتە زۆر چاکە؟!

* جـاران ئەو دەشـتی "دزەیی"یە مـەلای زۆر کـەم بوو، لە دە دوانزە گوندا بەحاڵ گوندێک مەلایەکی تیا هەبوو، "مـەلا مـحـەمـەدی بەهەشت فـرۆش" لە گـوندی "قـوشـتـەپە" دائەنیشت. ئەو مـەلایە لە جەژنانی رەمـەزانا سـەری ئەهلی هەمـوو ئاواییـەکـانی چاک ئەکـردەوە و سەرفیـترەی هەموویانی وەرئەگرت. لەناو کرمانجایەتیشا لایان وایە، سەر هەر رۆژی جـەژن چاک بکرێتـەوە، ئەگینا بەرناکەوێ، مەلاش خۆی پێی نەئەکـرا، هەر رۆژە بەسـەر هەمـوو گـوندەکـانا بسـوورێتـەوە و سـەریان چاک بکاتەوە، هەر ئەوەی پێـئـەکـرا یەک دوو دێ بگەڕێ.

جا ئاواییەکانی تر پێیان ئەوت: مـامۆسـتـا خۆ سەری ئێـمـەت چاک نەکردیتەوە کو سەرفیـترەت بدەینێ؟ ئـەویش ئـەیـوت: بـابم مـن هـەر لـە بەیانی رۆژی گـێـژنی و گـێـژنێـوە بەفیترە سەری هەمووم چا کردیتەوە!

مەبەستەکەش ئەوەیە، گۆیا سەر لەبەیانی لەو دێیـەدا کـەڵێی بووە، چووەتە قـەراخ ئاواییـەکە پەنجـەیەکی درێژ کـردەوە بە دێهـاتەکـانی تراو فیکەیەکی بۆ کێشاون، ئیتر بەم جۆرە ئـەو سـەری هەمـوویـانـی چاک کردۆتەوە!

* پیـاوێـک هـەبـوو "سـەیـد عـەبدولقـادر"ی ناوبوو خـەڵکی ئەو وڵاتی دزەییـە بوو، ساڵێک هاتبـووە بەغدا، بۆ ئیمامەتی لەشکر، کورێکی تریش لە بەغـدا هەبوو، دووکـانی بۆیاغـچـیـیـەتی هەبوو، ئەویش هەر "سـەید عـەبدولقـادر"ی ناو بوو، نەخوێندەوار بوو و خەتی رەش و سپی لێک جـیـا نەئەکـردەوە، لەگـەڵ ئەو سـەید عـەبدولقـادرەی تر، ناسراویان هەبوو. رۆژێک پۆستـەچی کـاغـەزێک دێنێ، کـە لە سـەرەکـەی نووسـرابوو: "مـەولانا سـیـد عـەبدولقـادر" ئەیدا بەدەست ئەو سـەید عـەلقـادری بۆیاغچییەوە، ئەمیش قاقەزەکە ئەدا بە یەکێ بۆی بخـوێنێـتـەوە، پاشـان سـەیر ئەکـا ئەوی لە قـاقـەزەکـەدا نووسراوە پەیوەندییەکی بەوەوە نییە، زانی کـە ئەمـە هی سـەی عەولقادرەکەی ترە، قاقەز هەڵئەگرێ و کە سـەید ئەچێتە لای قاقەزەکەی ئەداتێ.

سەید، کە سەیر ئەکا قاقەزەکەی هەڵپـچـڕاوە، پێی ئەڵێ: لۆ ئەم قـاقـەزەت هەڵپـچـڕییە؟ ئەویش پێی ئـەڵـێ: تـۆ خـۆت ئـەزانـی مـن نەخوێندەوارم، پۆستەچییەکە هێنای بۆ مـن و منیش نـاوم سـەی عەبدولقـادرە، لام وابوو هی منە، دام بە یەکێ بۆی خـوێنـدمـەوە، پاشـان زانیم هی من نییە و هی تۆیە، ئیتر مـن چوزانم. ئەویش ئەڵێ: کـو نازانیت هی تۆ نییە، مردیت مرێ؟! تۆ نابێ ئەقـرت ببێ، ئاخـر کـو لۆ تۆ دەنـووسـن "مـەولانـا"؟، تۆ کـەی مەولانا بوویتە؟ تۆ خۆت و مـەولانا لێک ناکەیتەوە؟!

* مـەلا عـیـسـای هەرتەل سێ قـرانی بەلای ژنێکەوە ئەبێ، لە ئاواییـەکـەی خـۆیان هەر داوای لێ ئەکاو نایداتەوە، رۆژێک مەلا لەسەر دەرسە، خەریکە دەرس بە فـەقێکانی ئەڵێ: سـەیر ئەکـا ژنەکـە وا مـاڵی باری کـرد و ئەوا ئەمـیـش هەر لە دەرسـەکـەدا بانگ ئەکـا: ژنەکـە ئافـرەتی چاک بە، سێ قـرانەکـەم

بدەردەوە. ئەوا تۆ ئەڕۆی ئیتر لەکوێ لێت بسێنمەوە؟ ژنە گوێی نەداتێ و هەر ئەڕوا. خێرا مەلا عیسا هەڵنەستێ رائەکا بەشوێنیا لە دواوە سێ کوتی پێوە ئەدا و ئەڵێ: دە برۆ قەحپە، هەر کوتی لەباتی قرانێک.!

* کابرایەکی کرمانج لە هەولێر بۆ ئیشی تەڵاقی ژنەکەی ئەیبەن بۆ لای "قازی". ناوبژیکەران ماوەی کابرا نادەن قسە بکا، قازیش دیارە گوێی بۆ راگرتوون، کابرا لەمە زۆر تووڕە ئەبێ کە نایەڵن ئەو قسە بکا، بە توڕەییەکەوە ئەڵێت: دە خزمینە وازبێنن، با من و جەنابی قازیش گویەک بخۆین! قازی لەمە زۆر تورە ئەبێ و حوکمی کابرا ئەدا!

* شاخێک هەیە لەو خۆشناوە شاخی "تف لەدەست"ی پێ ئەڵێن: گۆیا رۆژێک هەندێ لەکوڕ و کاڵی خۆشناو ئەچن بۆ ئەوێ و ئەکەونە دەمەتەقێ کە شاخەکە بپێون. هەندێکیان ئەڵێن بە گوریسان بیپێوین. هەندێکیان ئەڵێن بەداران بیپێوین. پیاوێکی زۆر دانایان تیا ئەبێ ئەڵێ: وا نابێ بابم!. بە زەلامان بیپێوین بۆ ئەوەی بزانین چەند باڵی پیاوە! هەموو ئەڵێن قسە ئەمەیە کە حەمەدێ دەیکا.

حەمەد ئەچێتە سەر شاخەکە دەست بە لووتکە بەردێکەوە ئەگرێ خۆی شۆڕ ئەکاتەوە، یەکێکی تر ئەچێ دەست بەقاچی ئەوەوە ئەگرێ و ئەویش خۆی شۆڕ ئەکاتەوە. بەو جۆرە حەوت هەشت کەس وا ئەکەن! حەمەدێ لە سەرەوە باڵی وەختە بپچڕێ. بانگ ئەکا: رەحمەتتان لێ بێ دەستتان توند بگرن تف لەدەستی خۆ دەکەم! ئەمە ئەڵێ دەستی لە لووتکەی شاخەکە بەرەڵڵا ئەکا بۆ ئەوە تف لە دەستی خۆی بکا، کە ئەوە ئەکا هەموو زرم ئەکەونە خوارەوە هەپروون ئەبن.

* کابرایەکی ئەو دەشتی دزەییە (پیوەن)ی وڵاخی لەو دەشتی قەراجە لێ ون ببوو، ئەچوو بە شوێنیا لەناو عەرەبەکانی قەراجدا ئەگەڕا. تووشی کابرایەکی عەرەب ئەبێ، لێی ئەپرسێ و تەزبیحەکەشی ئەگرێ بە دەستەوە و رایئەوەشێنێ و ئەڵێ: یابا! تۆ نەدیتە زرماڵ حێ حێ!. بەخەیاڵی خۆی ئەمە عەرەبییە!

* لەو وڵاتی خۆشناوەتییە دوو گوند هەیە یەکێکیان ناوی "کۆڕێ" و ئەویدیکەیان "ماوەران"ە. کابرایەی کوڕێیی، کیژێکی لە ماوەران خواست. شەوێ کە ئەچێتە لای کیژە و پاڵی پێوە ئەنێ، سەیر ئەکا هیچ نییە و بێ بنە. کابرا ئەڵێ: هوپ. کیژە پێیئەڵێ:

**هۆیت بە هۆیی**
**چاوی چۆیت لەگەڵی بقۆیی**
**لە کوڕ کوڕەی کۆڕیانێ**
**لە بنە تەراشەی ئەرماوانێ**
**چانییە هەندەشت لۆ مایە..**

* لەو خۆشناوە کابرایەک چاوی ژانی ئەکرد، پوورزایەکی هەبوو چووە لای وتی: پوورزا گیان چاوم زۆر ژان ئەکا نازانم چی لێ بکەم؟. پوورزاشی پێی وت: پوورزاگیان من پار ددانم ژانی ئەکرد هەڵمکەند!

* کابرایەکی دزەیی بارە گەنمێکی برد بوو بۆ هەولێر، لەناو شارا کەرەکەیان لێ دزی بوو، ئەویش چوو ملی کەری کابرایەکی خۆشناوی گرت، هێنای باری خۆی لێناو رۆیشت. کابرای خۆشناو هات وتی ئەم کەرە کەرەکەی منە، کابرای دزەیی وتی: هی خۆمە، خەڵک و خوا کەوتنە بەینەوە بە دزەییەکەیان وت: کەرەکەی تۆ نێرەکەر بوو یا ماکەر؟ وتی: نێرەکەر بوو. وتیان: دە ئەمە ماکەرە. وتی: بەڵێ کەرەکەی منیش نێرەکەرێکی تەواو نەبوو، ئەمەش ماکەرێکی تەواو نییە کەواتە هەر کەرەکەی منە!

* حاجی مەلا ساڵحی کۆزەپانکە و حاجی مەلا عومەری هۆمەر گونبەتی هاتنە لام، دنیا گەرم بوو، وتیان: ئاوی سارد ئەخۆینەوە. ئەو پیاوەی کە لام بوو مام پیرداودمان پێئەوت، پێموت: بچۆ ئاوی سارد بێنە. مام پیرداود چوو بەفری هێناو خستییە ناو سەتڵێکی گەورەوە پڕی کرد لە ئاو و هێنای تەق لەبەردەمی حاجی مەلا ساڵحا دانا! حاجی مەلا کە ئەمەی چاو پێکەوت وتی: دەک مردیت مرێ پیرداود هەر فیکەکەی مایە، دوو فیکەشمان لۆبکە! مام پیرداود هیچی بۆ نەمایەوە، وتی: قوربان هەمووجار هەروا دەکەم!

* مەلا فەتحوڵڵای هەرتەل لە گوندی "بێتواتە" ئەگەڕێتەوە بۆ گوندی "هەرتەل" لەرێگادا تووشی شوانێک ئەبێ لێی ئەپرسێ: مام شوان پەزێ تە ئەچەندن؟.. ئەڵێ: مامۆستا ئەپێنجن. ئەڵێ ئەچەند مێنە، ئەچەند نێرن؟ ئەڵێ: مامۆستا دوو ئەنێرن، سێ ئەنێرن. ئەڵێ: مانارێی هەر نێر پێنجن؟ ئەڵێ: مامۆستا ئاخر من وەکو تەسەفێخ

نیمە.. ئەڵێ لەپکەت زمان کەوێ، ئەرێ زارت لە زیانی دانینە!

* کابرایەکی مامشی هەبوو مام وسوی ناوبوو، کیژێکی زۆر جوانی هەبوو، هەر کەس ئەهات نەیئەدایە، ئەیوت من ئەم کیژەم نە بەژنی ئەدەم و نە بەماڵی دنیای ئەدەم، پرسیارێکم هەیە، هەر کەس وەڵامم بداتەوە ئەیدەم بەو کەسە، پرسیارەکەش ئەوە بوو: ئاو کاتێ کە دەیخەنە مەنجەڵ و ئەیخەنە سەر ئاگر، دەست ئەکا بە قوڵتە قوڵت و کزە کز، ئەڵێ چی؟

هەر کەس کە ئەهات داوای کچەکەی ئەکرد ئەم پرسیارەی لێ ئەکرد، ئەویش نەیئەزانی وەڵامی بداتەوە بۆ خۆی ئەچووە دواوە. هەر لەو دەورە لە گوندی "سیساوێ" پیاوێکی تر هەبوو مام هۆمەری ناو بوو.

کورێکی هەبوو "پیرۆت"ی ناو بوو، پیرۆت زۆر لاو چاک بوو، دڵی لە کچی مام وسو سەندبوو، ئەویش دڵی بەکچەوە بوو، بەڵام نەیئەتوانی بچێ داوای بکا، چونکە وەڵامی پرسیارەکەی نەئەزانی.

رۆژێک چووە بن دەست کچەکەوە پێی وت: ئەگەر تۆ منت ئەوێ، بەڵکو ئیشێکی وابکەی ئەو وەڵامە بە باوکت دەربخەیت و بەمنی بڵێیت. کچەکە وتی: باشە. کچە دەستی کرد بە خزمەتکردنی باوکی، خزمەتێکی وا کە بەجارێ دڵی باوکی سەند و باوکی هەموو جار دوعای خێری بۆ ئەکرد. رۆژێک کچەکە وتی: بابە ئەگەر تۆ منت خۆش ئەوێ، ئەو وەڵامە چییە وا هەر کەس دێتە داوای من، تۆ پرسیارێکی لێ ئەکەیت و ئەو نازانێ وەڵام بداتەوە. باوکە وتی: کچم لەوە گەڕێ، داوای هەر شتێکی تر ئەکەی بکە داوای ئەوە مەکە. کچە ماوەیەک لێگەڕاو دیسان هەمان داوای لێکردەوە، تا لە ئەنجاما پێی دەرخست. وتی: کچم ئەوە ئەو ئاوە ئەڵێ هەر شتێ کە کردم خۆم بەخۆمم کرد، ئەگەر من نەچوومایە ئاوی ئەو خەڵفەدارانەم نەدایە وا بەو جۆرە گەورە نەئەبوون، پاشان نە ئەهاتن بینە ئاگر و کسپە لە جەرگمەوە بێنن!

کچە چوو ئەم وەڵامەکەی بەپیرۆتی دەزگیرانی وت! لەپاش ماوەیەک پیرۆت بە باوکی وت: کە بچێت داوای کیژەی لە مام وسو بۆ بکا، باوکی وتی: جا رۆڵە مام وسو دیارە کیژ بەکێ ئەدا، بەو کەسەی ئەدا کە وەڵامی ئەو پرسیارەی بداتەوە. وتی: تۆ بچۆ، ئەگەر ئەو مەرجەی گرت بڵێ کورەکەم وەڵامت ئەداتەوە.

بە ناچاری مام هۆمەر چووە لای مام وسو و وتی: ئەبێ پیرۆتی کورم بکەی بە کوڕی خۆت. مام وسویش وتی: مام هۆمەر تۆ خۆت ئەزانی من تەمای دنیام نییە، کچ بەو کەسە ئەدەم کە وەڵامی پرسیارم ئەداتەوە. مام هۆمەر وتی: پیرۆت دێت پرسیاری خۆتی لێ بکە، ئەگەر وەڵامی دایتەوە کیژەکەی بدەرێ، ئەگەر نەیدایتەوە هیچ. مام وسو وتی: باشە. مام هۆمەر پیرۆتی کوری نارد، مام وسو وتی: رۆڵە تۆ کە کیژی منت ئەوێ ئەبێ وەڵامی پرسیارم بدەیتەوە، پیرۆتیش وتی مامە پرسیار بکە. مام وسو وتی: رۆڵە ئاو کاتێ کە ئەیکەنە مەنجەڵ و ئەیخەنە سەر ئاگر، دەست ئەکا بە قوڵتەقوڵت و کزەکز، ئەوە ئەڵێ چی؟

پیرۆت وتی: مامە ئەوە دەڵێ: هەر شتێ کە کردم خۆم بەخۆمم کرد، ئەگەر من نەچوومایە ئاوی ئەو خەڵفەدارانەم نەدایە وا بەو جۆرە گەورە نەئەبوون و پاشان نەئەهاتن بێن بە ئاگر و کسپە لە جەرگمەوە بێنن!

مام وسو کە ئەمەی گوێ لێ بوو وتی: هەرشتێ کە کردم خۆم بەخۆمم کرد. ئەگەر من بە کیژەکەم نەوتایە و ئەو بەتۆی نەوتایە وا ئێستە کیژەکەم لەدەست نەئەبۆوە!. ناردی مەلایان هێناو کچەکەیان لەپیرۆت مارە کرد.

* کابرایەک لەو دەشتی دزەییە بیلامانێ هاتبوو بەسەریا مانگایەکیان هەبوو، مانگاکەی گابوو. پاش ماوەیەک مانگاکە ئاوس ببوو دیارە گای لێ پەڕیبوو، کابرا دوو سێ کوری هەبوو، زۆر خۆشی خۆشی ئەوەیان بوو کە مانگاکەیان ئاوسە، هەموو جار ئەیان وت: باوە! ئیشەڵڵا مانگاکەمان گوڵکە مێچکەیەک دێنێت. کابراش زۆر ترسی لێ نیشتبوو ئەیوت: کورم هەر گوڵک بێ قەیناکا! کابرا ترسی ئەوەی هەبوو لەباتی گوێرەکە بەچکە ئینسانێک بێنێت!

*پاشا کوڕەی رەواندز لەشکری ناردبوو بۆ سەر هەولێر، کابرایەکی "سیان" لە لەشکرەکەدا بوو قەڵغانێکی پێ بوو، لەبن قەڵاتی هەولێر یەکێک لەسەر قەڵاتەکەوە بەردێک فڕێ ئەداتە خوارەوە، بەردەکە ئەکەوێ لەسەر کابرای سیان سەری ئەشکێ. جا کابرای سیان

ئەیوت: ئەرێ کابرا! چما تۆ کوێری ئەم قەڵغانە زلە نابینی وا بەردەکە ئەدەی لەسەری من و سەرم ئەشکێنی!

* کابرایەک هەبوو لە بالیسان زۆر فەقیر بوو، ئەگەر جارجار لە ئاوایی گۆشتیان بکوشتایەتەوە، هەندێ لە ریخۆڵە و ورگەکەیان بۆ ئەبرد بۆ ئەوەی بیکەن بە چێشت و بیخۆن. پشیلەیەک پێیان فێر بووبوو ئەهات لێی ئەدزین!

ڕۆژێک کابرا چوو بۆ هەولێر بەهەر جۆر "بیور"ێکی هێنا بۆ ئەوەی جارجار کوڵە دارێکی پێ بکا و بیدەن بەشتێک و پێوە بژین. کە بیورەکەی هێنا ژوورێکیان هەبوو لە پشتەوە بردی لەوێ دایناو توند توند دەرگاکەی پشتکۆڵ کرد لەسەری. ژنەکەی وتی: ئەوە بۆچی بیورەکەت بردە ئەوێ؟ کابرا وتی: تا پشیلە نەیدزێ! ژنە وتی: پیاوەکە پشیلە چۆن بیور ئەدزێ؟! وتی: چما تۆ ئەقڵت هەیە؟. ئەو گرتکە گۆشتێک کە چوار پول ناهێنی ئەیدزێ، هەنووکە بیورێک دە قران دێنێ کو ئەیدزێ؟!

* زەمانی شیر و تیر بوو، کابرایەکی کوردی باڵەکی کەمانێکی رووتی هەڵگرت و وتیان: لەگەڵ داسنیەکانا شەڕ ئەکرێ، چوو بۆ ئەو شەڕە. پێیان وت: کەمانی بێ تیر چی لێ ئەکەی؟ وتی تیر لەلایەن دوژمنەکانەوە دێت، هەڵیئەگرم و ئەیخەمە کەمانەکەوە شەڕی پێ ئەکەم! وتیان جا ئەگەر نەهات. وتی: ئەگەر نەهات ئەوە ئیتر شەڕ نییە!

* لە دەوروبەری هەولێر مەلا عەبدوڵڵای "دێرە بڕوشەیی" هەبوو، ئەمەش ئیشی هەر ئەوە بوو مارە بەجاشی ئەکردەوە، ئەوەش کە ئەیکرد بەجاش "مام وسو" ناوێک بوو. جا ئەم وسوە هەر وەخت تووشی مەلا عەبدوڵڵای ئەبوو ئەیوت: مامۆستا قسەیەکم هەیە بیڕێم یا نەیڕێم؟ ئەویش ئەیوت: برا من لە عەشیرەتی تاڵەبانیم. دەروێش واقی وڕئەمێنێ و هیچی بۆ نامێنێتەوە و ئەڵێ: بیرێ. ئەیوت: مامۆستا، راستی هەر وەخت تووشی تۆ ئەبم کێرم هەر ئەستێ. ئەویش ئەیوت: تف کەرە، جا وەرە پیاوەتی لەگەر بکە.

* لەو وڵاتی دزەییەتی بێوەژنێکی تەڕپیر هەبوو لەگەڵ مام عەولادا دەستیان تێکەڵاو کردبوو. مام عەولا برایەکی هەبوو مام عەلای ناو بوو. ڕۆژێک بێوەژنەکە لەگەڵ عەولادا ژوانی شەوێ ئەبەستن.

مام عالا ئاگای لێیان ئەبێ، ئەم لەپێش ئەوەی مام عەولا بچێتە سەرەوەخت ژوانەوە ئەچێتە لای بێوەژنەکە، دنیاش تاریک ئەبێ لەو کاتەدا کە خەریکی ئیشی خێر ئەبن، ژنەکە هەست ئەکا کە ئەمە مام عەولا نییە و مام عالایە. ئەڵێ: بژەنە با مام عەولا نەبێ مام عالا بێ، بژەنە لەمنت نەکەوێ!

* دوو کابرای خۆشناو بۆ ترێ فرۆشتن ڕێگایان ئەکەوێتە ئەو دەشتی دزەییە و بەلای گوندێکا تێئەپەڕن، سەیر ئەکەن وا یەکێک لە سەربانێک هەردوو دەستی خستۆتە بناگوێ و دەنگێکی لێوە دێت، یەکێکیان لای وا ئەبێت ئەم کابرایە "هەی ترێ" ئەکا، زۆری پێ ناخۆش ئەبێت، ئەڵێ: واترێ لەم گوندەی هەنە با بچین لۆ گوندێکی دیکە. ئەویکەیان ئەڵێ: کوڕە مار وێران نەبی ئەوە هەی ترێ نییە، ئەوە بانگی ئەدرێ. ئەڵێ بانگی چنە؟ ئەڵێ کوڕە چما نازانی، بانگی حەمەدی ریسوان. ئەڵێ: چما بانگی حەمەدی ریسوان چنە؟ ئەڵێ: کوڕە چنە؟ یانی دە ودرنە نوێژان، دە وەرنە نوێژان.

* لەو سەرە پیاوێکی ئەو دەشتی دزەییە بە میوانیتی ئەچێ بۆ خۆشناوەتی و لەوێ میوانی دۆستێکی زۆر کۆنی ئەبێت، لە راستیدا خۆشناوەتییەکانیش زۆر میوان پەروەرن، ڕۆژێک کابرای دەشتی لەگەڵ خۆشناوی خانەخوێدا ئەچنە دەرەوە لە گوندی بۆ ناو رەزان، کابرای خۆشناو خۆی کۆنەکاتەوە، رانک و چۆغەیەکی شڕی ئەبێ لەبەری ئەکا و پەتێک ئەکا بە پشتێن، تفەنگێکی حسکەی کۆنی ئەبێ ئەیکاتە شانی، خەنجەرێکی بێ فەڕ دەسکەکەی نیوەی شکابوو و نیوەی مابوو، ئەیکاتە بەر پشتێنەکەیا، تەزبیحێکی دەنک گەورەش ئەپێچێنێ بە دەسکی خەنجەرە شکاوەکەدا.

بەم تەدارەکەوە ئەچنە دەرەوە و ئەچن لەسەر تاوێرێک دائەنیشن و دەست ئەکەن بە قسەی خۆش کردن، کابرای دزەیی تۆزێ سەیری خەنجەری بەر پشتێنی خۆشناوەکە ئەکا و ئەڵێ: جا ئەم خەنجەرە چییە و چی لێ دێ وا تۆ هەڵتگرتووە؟. هەر ئەم وا ئەڵێ کابرای خۆشناو چاوی سوور هەڵئەگەڕێ و ئەڵێ: ماوادەری و بە خەنجەرەکەی پەلاماری کابرا ئەدا دوو

سێ خەنجەری بۆ دادێنێتەوە بەری ناکەوێ، کابرای دزەیی پشتاو پشت ئەکشێتەوە، بەپشتا ئەکەوێ و لە هەڵدێرەکە بەر ئەبێتەوە، ئەمجا خۆشناوەکە کە ئەزانێ وا لوزەی خەنجەر دەرچووە، دەست ئەداتە تفەنگەکەی و دوو سێ ساچمەی تێ ئەگرێ، بەرەکەتدا، ئەویشی بەرناکەوێ، ئیتر کابرای دزەیی هەر لەوێدا هەڵدێت و ئەگەڕێتەوە بۆ دەشتێ.

پاشان کابرای خۆشناو خۆی بە تەنیا ئەگەڕێتەوە بۆ گوندی، پێی ئەڵێن: میوانەکەت چی لێهات؟ ئەویش کارەساتەکەیان بۆ ئەگێڕێتەوە، ئەڵێن: ئاخر چۆن تۆ شتی وا ئەکەی؟ ئەو میوانت بوو. ئەڵێ: ئاخر چما دەبینن ئەو بە پۆزەی لەمەڕ بابی برێ، چ نینە، منیش لۆم راوەشاند و پاشان سێ بیست و نیویشم تێگرت، ئاوا دایەلی دەگیم.

* پاشا کورەی رواندز جوولەکەیەکی لا هەبوو، "حاتان"ی ناو بوو، خۆشی ئەویست، مەیتەرێکیشی لا هەبوو "وسە"ی ناو بوو، بەڵام هەتا حەز بکەی وسە ناشرین بوو، خۆت ئەزانی ئەو سەردەمە جوولەکە لە رواندز هیچ قەدر و قیمەتێکیان نەبوو، هەرکەس هەڵئەستا قسەی پێ ئەوتن، لەبەر ئەمە وسەش بە تەواوی بەقسە پێ وتن: فێری حاتان بوو بوو.

رۆژێک وسە بە حاتان ئەڵێ: کافر! تۆ خۆت و هەموو جوولەکەکان کافرن. حاتانیش ئەڵێ: بەخوا وسە! نە من کافرم و نە جوولەکەکان کافرن، کافر ئەو کەسەیە کە لای وایە خوا تۆی بەو جوانی دروست کردووە!

* پیاوێکی بارزانی هەبوو "محەمەد ئەمین بیجانی" ناو بوو، تەمەنی تەنگی لەحەفتا ساڵێک هەڵچنیبوو، ماوەیەک بوو لە کۆڕی شەڕ و شۆڕا برابوو. رۆژێک بیستی وا ئاگری شەڕێک کراوەتەوە بۆ ئەوە دیسان بارزان تێهەڵچێتەوە. کە ئەمەی بیست لوولەی تفەنگەکەی گرت، هەڵیسوڕاند و وتی:

پیاو ئەوەیە بکوژێنێ و بلوورێنێ بۆ شەڕ، نەوەک وەکو ژنان لەگوێ ئاگردانا دانیشێ!

* ژن و پیاوێک هەبوون لە رەواندز هیچیان چاویان نەبوو، لە ئەنجاما بوون بە هاوسەری یەک. ژنەکە بە پیاوەکەی وت: کوم دەبینی؟ پیاوەکەشی وتی: تۆ کو من دەبینی منیش وا تۆ دەبینم!

* حاجی مەلا عەبدوڵلای جەلی زادە کچی شێخ کەریمی کۆیی مارە ئەکا، ئەم کیژە لەبارەی خوێندەواری و زیرەکی و دینداریەوە لە هەموو وڵاتی کۆیە ناوبانگی دەرکردبوو، حاجی مەلا عەبدوڵلای دێت بۆ کەرکووک بۆلای شێخ عەلی ئەفەندی تاڵەبانی. حاجی مەلا عەبدوڵلا و شێخ عەلی دەستە برادەری زەمانی فەقیایەتی ئەبن و وەکو برا وا ئەبن. شێخ عەلی ئەڵێ: کاکەوڵا بیستوومە تازە زاوایت؟ حاجی مەلا عەبدوڵلاش ئەڵێ: بەڵێ قوربان ژنێکم هێناوە شێخە بەقەدەر عەلی، مەلایە بەقەدەر جەلی.

* کابرایەکی ئەو بناری خۆشناوە ژنێکی هێنابوو، خوا وای بۆ هێنابوو کە هەرچەندە خەریک بوو نەبوو بوو بەزاوا، لەم رووەوە زۆر پەرۆش بوو. رۆژێک هەروا کز و داماو بەرێگەدا ئەڕۆیشت، کەوتبووە ناو دەریایەکی داماوییەوە، پیاوێک هەبوو "مستۆ"ی ناو بوو، دۆستی کابرای بناری خۆشناو بوو، سەیری کرد وا کزو داماوە لێی پرسی: ئەوە بۆچ وا حاجزی؟ وتی: برا لۆ حاجز نەبم، ژنێکم هێنایە هەر چەندە دەکەم لۆم نابێ بەژن و نابم بە زاوا. مستۆیش ئەڵێ: ئەی لەمنت نەکەوێ، لەکوێیە؟ ئەوە تۆ زوو بۆچ دەنگت نەکرد؟ جا برا بە کەڵکی رۆژێکی وا نەیە ئیتر بۆچی چاکە، ئادەی برۆ پێشانم دە ئەو واوا لێ هاتووە بزانم چۆن نایەڵێ و وا تۆی تووشی ئەم دەردەسەرییە کردووە. ئادەی خێراکە با برۆین.

کابرا زۆر بەمە دڵی خۆش بوو وتی: ئەی لە حەمری منت کەوێ ئەوەتە دە با بچین. پێش مستۆ کەوت و چوون بۆ ماڵەوە، مستۆیش هەر ئەڵێ: ئەوە ئەو واوا لێ کراوە لەکوێیە؟ کە چوونە ماڵەوە، چوونە بەر ژوورەکە، کە بووکی لێیە، کابرا وتی: هۆ ئەوەتە! مستۆیش بە توڕەیی و بە گڤەگڤێکەوە لێی چووە پێشەوە و کابراش لە پشت دەرگاکەوە سەیر ئەکا.

کە هەر چووە پێشەوە دەرپێکەی داکەند و بلامانێ بووکێی کرد بەژن! لەو کاتەدا بووکێ بایەکی لێ بەربۆوە. کابرای پشت دەرگا وتی: ئەوە دەردت بێ، چما ئەویش منم، ئا بزانە کوت دەترێنێ! هەر چەندە پێم دەگۆتی لۆم راوەستە هەر گارتەت پێ دەهات، هەنووکە ئەو ئاوهات دەترێنێ دە بخۆ لۆخۆت!

* کابرایەکی کرمانج لەو بناری دزەییە سێ بەگایی ئەکا. سێ بەگایی ئەوەیە کە سێ لنگە گای هەیە، بەنۆرە هەر جارە تاکەوتاک ئەیانخاتە پاڵ یەک و جووتیان پێ ئەکا. ئەو گایە کە لە بەیانییەوە تا نیوەڕۆ جووتی پێ کردووە، لە نیوەڕۆ بەدواوە ئەوە بەرەڵا ئەکا و تاکەکەی تر دێنێت کە تا ئەو وەختە حەسابۆوە ئەو ئەخاتە پاڵ ئەم لنگە.

جا ئەم کابرایە لەباتی یەکێ لە گاکان کەرێکی هەبوو سێ بەگاییەکەی بە کەرەکە ئەکرد. لەو وەختەدا کە بەستبووی و جووتی ئەکرد، ئەمین ئاغا هەبوو لەگەڵ چەند خزمەتکارێکا بەوێدا تێئەپەڕن، کە سەیر ئەکا ئەم کابرایە بە لنگە گایەک و گوێدرێژێک جووت ئەکا پێی ئەڵێ: خاڵە بریا لنگەکەی تریشت گا بایە! کابراش ئەڵێ: ئاغەم گایە، هۆ لەوێ! خزمەتکارەکان ئەیانەوێ تورە بن. ئەمین ئاغا ئەڵێ: دەستی لێ مەدەن ئەگینا ئەنگۆش دەگێت!

* دێی "سێ گرتکان" هەیە لەولاتی کۆیە. ئەمانە زۆرتر شێوەی قسەکردنیان ئەچێتەوە سەر "هەمەوەن".

کابرایەکی خۆشناو بۆ ترێ فرۆشتن ڕێی ئەکەوێتە ئەوێ، سەیر ئەکا چەند پیاوێکی خەڵکی گوندەکە لە سەربانێک دانیشتوون و قسە ئەکەن. ئەمیش هەرچەند گوێی بۆ قوت ئەکاتەوە بەهیچ جۆر لە قسەکانیان تێ ناگا! ڕوویان تێئەکا و ئەڵێ: ئەم، ئەم ئەنگۆ بە شەویش لێکو دەگەن؟!

* کابرایەکی خۆشناو چوو بووە موسڵ، هیچ جارێکی تر موسڵی نەدیبوو، گەڕایەوە بۆ ولات، خزم و کەس و کار دەوریان داو باسی موسڵیان لێ پرسی کەچۆنە و چۆن قسە ئەکەن. وتی: بەخودای بابم هەموو بە حارەبی قسانی دەکەن، تەنها نوێژەکە نەبێ بە کوردی دەیرێن، چ بران کوردی گوتن بەسەر زاریانا نایەت!

* دوو کابرای ئەو ولاتی دزەییە هاوڕێی کۆن بوون و چەند ساڵێک لەیەک دوور کەوتبوونەوە. ڕۆژێک لەناکاو لە دووڕیانێکا تووشی یەک ئەبن و دەست ئەکەنە ملی یەک و چاک و چۆنی لەگەڵ یەک ئەکەن. ئەمجا ئەکەونە هەواڵ پرسیی یەک. یەکێکیان بەوی کەیان ئەڵێ: برا لەچ شتان ناتەواویم نینە، ئەمجا ئەو لەو ئەپرسێ. ئەڵێ ئەتۆ کویت؟. ئەڵێ برا لەمن مەپرسە، من زۆر خراپم! ئەڵێ: لۆ. ئەڵێ:

**کوڕە! ژنێکم هەیە ناوی زەمزەمە**
**سەری بەتەمە و قونی بە خەمە**
**من هەر لۆی دێنم، هەر دەرێ: کەمە**
**دەچم دەگەڕێم لەم شار بۆ ئەو شار**
**شتی لۆ دێنم بە کۆڕ و بە بار**
**من دەرێم: هانێ**
**ئەو دەرێ: کانێ!**

* لەو خۆشناوەتییە کابرایەک وەختی خۆی میر ژنێکی بۆ هێنابوو، کابرا ژنەکەی مردبوو، لەسەری پایزا چۆوە بۆ لای میر و پێی وتبوو: میران دەبێ ئەمجارەش خەمێکم لۆ بخۆی. مەبەستی ئەوە بوو ئەبێ ژنێکی ترم بۆ بێنی. میریش پێی ئەڵێ: خەمی چیت لۆ بخۆم؟ مەگەر گوێەکت لۆ بخۆم! کابراش ئەڵێ: بەخودای میرم ئەگەر ئێستاش لۆم نەخۆی دەبێ بەهارێ هەر لۆم بخۆی!

* لەو ولاتی هەولێرە چاکێک هەیە "هۆمەرمەندان"ی پێئەڵێن، نەخۆش و شتی ئەبەنە سەری و چاک ئەبێتەوە. کچێک پیرەدایکێکی هەبوو زۆر نەخۆش بوو، کچەش فرە حەزی لەمێرد ئەکرد، بە دایکەی وت: دایە با بتبەمە سەر هۆمەرمەندان، بەڵکو نەخۆشییەکەت چاک ئەبێتەوە. دایکیشی وتی: ڕۆڵە نەخۆشی من پیرییە پیری چاک بوونەوەی نییە. کچە وتی: دایە تۆ ئەڵێی چی؟ هۆمەرمەندان هەموو نەخۆشییەک چاک ئەکاتەوە.

بەهەر جۆرێ بوو دایکی هەڵخران و بردی بۆ سەر هۆمەرمەندان، بردی لەناو مەرقەدەکەدا پاڵی خست و خۆی بە دەوری مەرقەدەکەدا دەستی کرد بە سوڕانەوە و ئەیوت: یا هۆمەرمەندان دایکە پیرێکی بێکەسی بێ دەرەتانم هەیە، زاوایەکی چاکی وەجاخزادەی بۆ بنێرە با خزمەتی بکا!

دایکە گوێی لە پاڕانەوەکەی ئەم بوو وتی: هەی وا وا لێکراو! تۆ خۆت مێردت ئەوێ و منت کردووە بە بەهانا، یائەڵڵا هەڵمگرە با بچینەوە.

* ساڵی ١٩٥٩ چەبیرەی مامۆستا کوردەکان بوو لە شەقلاوە، هەرچی مامۆستای کورد هەبوو لەوێ کۆ ببوونەوە، قسەیان لەکاروباری خوێندنی زمانی کوردییەوە ئەکرد لە قوتابخانەکانا.

شەقلاوە هاوینەهەوارە، زۆر کەس ڕووی تێئەکرد، حەمە ڕەشید بەگی

کۆک لەگەڵ شێخ عومەری دەکە بەناوی رابووواردن لە هاوینەهەواردا ئەوانیش چووبوون بۆ ئەوێ، جێگا دەست نەئەکەوت، مام رەسو کاکۆ هەبوو، چاخانەیەکی هەبوو لە دۆڵەکەدا هەم چاخانە بوو، هەم نوێنیشی هەبوو، خەڵک لێی ئەنووستن، حەمەرەشید بەگ و ئەوان ئەچنە ئەوێ، مام رەسویش پیاوێک بوو وەزیرێک و گزرێکی بەلاوە وەکو یەک وابوو، کێ پارەی چای بە پوختی بدایە ئەوەی بەلاوە لە هەموو کەس پیاوتر بوو، لە هەمان کاتا وەکو ساویلکە بوو، تووڕەش بوو.

حەمەرەشید بەگ سەری ئەخستە سەری، بەڵام پارەی چاپیشی ئەدایە، پێی وت: مام رەسو من بەگزادەی جافم، گوندەکانم لەم سەردەمەدا بە چەپڵە داگیریان کردووە و لە دەستیان سەندووم. مام رەسوویش ئەڵێ: جا ئێستە ئەتەوێ چ بکەی؟ ئەویش ئەڵێ: وەڵڵا هەر لەهاتوچۆدام بۆ ئەوەی وەریان بگرمەوە. ئەویش ئەڵێ: کو وەریان دەگریتەوە؟! ئەمە لەسەردەمی جمهورییە. ئەویش ئەڵێ: دەسا وەڵڵا هەزار جمهوری بێ، هەر ئەبێ وەریان بگرمەوە؟ وەریان ئەگرمەوە لەداخی جمهوری و بەکوێرایی چاوی تۆ! مام رەسو ئیتر تووڕە ئەبێ و ئەڵێ:

هەرۆ! دە هەرۆ لۆ خۆت غار غارێنێ کە، بزانم چت پێ دەکرێ؟!

* فەقێیەکی خەڵکی "سیساوا"ی خۆشناو هەبوو، هەر ئەیخوێند و هیچ فێر نەئەبوو، پێیان وت: کە وایە بۆچ واز ناهێنی. ئەویش وتی: هەر دەخینم، هەر دەخینم تا دەگەمە شەرح حەقیدان، چم زانی، زانی، چم نەزانی دەگەرێمەوە سەر حەواملان. دیسان هەر دەخینم، هەر دەخینم تا دەگەمە شەرح حەقایدان، چم زانی چم نەزانی دەگەرێمەوە سەر حەواملان ئەمجارەش هەر دەخینم، هەر دەخینم تا دەگەمە شەرح حەقایدان چم زانی، چم زانی، چم نەزانی بەساقی کیرمەوە!

* شێخ مستەفای قەرەداغی لە موتەسەریفی کەوتبوو، خەریکی محاکەمات بوو، رۆژێک لە بەغدا لە کۆڕێکا دەردە دڵ ئەکا لە ئیشی حوکمەت کە ناڕوا، "مەلا حەوێزاغای کۆیی"ش ئەو سەردەمە نائب بوو، لە کۆڕەکەدا بوو، روو ئەکاتە شێخ مستەفا ئەڵێ: ئاخر قوربان ئەو سەردەمە کە جەنابت (متصرف) بوویت لە هەولێر ئێمەش هەر وامان ئەوت، کەچی تۆ ئەتگرتین و لە بەندیخانەت ئەکردین.. شێخ مستەفاش ئەڵێ: ئێستە ئەزانم کە ئەو وەختە ئێوە راستتان ئەکرد!

* کابرایەکی ئەو خۆشناوە بارێ گوزەو دیزە بار ئەکاو ئەیهێنێ بۆ هەولێر، لە قەراغ شار کابرایەکی باجگری تووش ئەبێ و دارێک بە هەموو هێزی خۆی ئەدا بەلای بارەکەدا، نیوەی ئەشکێنێ و ئەڵێ: ئەم بارە چییە؟ کابرای خۆشناویش ئەڵێ: ئەگەر دارێکی تری پیاکێشی هیچ!

*(ئەحەی جاو) هەبوو لە سلێمانی، پیاوێکی فەقیرۆکە و دەنگ بارێکێک بوو، حەڵوای لەناو تەبەقا ئەگێراو ئەیفرۆشت، هیچ عەزیەتی خۆیشی نەئەدا، بە شێنەیی و لەسەرخۆ ئەچوو بەرێگەداو لەژێر لێوەوە بانگی ئەکرد "حەڵوای نایاب". رۆژێ پیاوێکی خەڵکی ئەو دەشتی دزەییە رێی ئەکەوێتە سلێمانی، سواری ئەسپێک ئەبێ و بە تەنیشت ئەحەی جاوا تێئەپەڕێ، ئەحەی جاویش لەسەر کوڵانێکا دانیشتووە، لەبەر خۆیەوە حەڵوا ئەفرۆشێ. کابرای دزەیی هەر بەسەر ئەسپەکەوە ئەبزوێتەوە و هەر خنە خن ئەکا. کابرا ئەڵێ:" کوڕە! رابە، رابە" ئەحەی جاو لەمە تووڕە ئەبێ، چونکە بەشێوەی سلێمانی "رابە" ناوە بۆ "رابعە" لای وایە ئەمە بەو ناوەوە گاڵتەی پێ ئەکا. پێی ئەڵێ: کوڕە خۆت رابە، دایکت رابە، باوکت رابە! پاشان ئەحەی جاو تێئەگەیەنن کە ئەمە مەبەستی ئەوە نییە، مەبەستی ئەوەیە کە یانی زووکە. ئەحەش لەبەر خۆیەوە ئەڵێ: جا بۆ ناڵێ خێراکە!

* کابرایەک هەبوو لە "کۆیە" کەریمە گۆجیان پێ ئەوت، ئەو کەریمە گۆجە، کوڕی حاجی مەلا ئەمینی کۆیی بوو، خەڵک و خوا سەریان ئەخستە سەری ئەیانووت: کەریمە گۆج، دنیا کێ ئەیخوا؟ ئەیوت: کێ ئەیخوا؟ زمانلوسان، تالوسان، بێناموسان!

* کابرایەکی کرمانجی ئەو دەشتی هەولێرە لە خزمێکی خۆی پرسی، چ کەست لا هەیە؟ وتی: کاکە و کاک نەبی، نەبییە پۆزو پۆز بەراوە، غەزاییە و کامراوە، مندرەکانیشم لە دەورەیان وەستاوە!

* پیاوێکی خۆشناو دنیا زستان بوو هەر باران بوو، شەوێ چووە دەرەوە هاتەوە یەکێک لێی پرسی:

هاســمــان کــووە؟ وتی: وەڵڵا ئەبێ پشیلان لێستبیتیانەتەوە! مەبەستی ئەوە بوو کە سامالە.

* کــابرایەکی لەک هەر خــۆی هەڵدەکێشا کە پیاوێکی چاکە، ئەم لەکــانەش دەســتــەیەکن لە ئەترافی هەولێر، ئەو لەکانە نین کــە کــەریم خــانی زەند لەوانە. جـا کــابرایەکی کرمانجی هەولێری پێی وت: ئەگەر چاکـیت لەک نیت. ئەگــەر لەکـیت چاک نیت!

* حاجی مەلا عەبدوڵڵای جەلی زادەی کــۆیە ئەچێت بۆ بەغــدا بە ناوبانگی مــوفــتی زەهاوی بۆ چاو پێکەوتن و زیارەتکردنی، پاش ئەم دیدەنییە ئەگەڕێتەوە بۆ کۆیە ئەمجا خــەڵک لێی ئەپرسن: قــوربان تۆ مەلاتری یا مـوفـتی زەهاوی! ئەویش ئەڵێ:

هەردووکــمــان مــەلاین، ئەوەندە هەیە من شوێن کتێب ئەکەوم، موفتی زەهاوی کتێب شوێنی ئەو ئەکەوێ.

* هەولێــــرییــــەک تـووشی سولەیمانییەک ئەبێ پێی ئەڵێ: ئەوە لۆچی ئەنگۆ بەلۆچی دەرێن بـۆچی؟ ئەویش ئەڵێ: ئەی ئەوە ئێـوە بەبۆچی ئەڵێن لۆچی؟!

* کـوڕێکی هەولێری بە کـوڕێکی سلێــمــانی وت: ئەوە لۆچی بەرۆن دەرێــن روون و بـەروون دەرێــن رۆن؟ کـورە سـولەیمانیـیـەکـەش وتی: ئەی بۆچی ئێــوە بە روون ئەڵێن: رۆن و بەرۆن ئەڵێن رون؟

* شــێخ رەزا لەکــۆیە ئەبێ، جــارێک ئافــرەتێکی جــوان بەناو کۆلانێکا ئەڕوا. شێخ رەزا زۆر بەسۆز سـەیری ئەکا، ئافرەتەکە ئەڵێ: بۆچ سەیرم ئەکەی؟ تۆ کێرت هەڵئەستێ و یەکێکی تر ئەو ئیشە ئەکا!

* حاجی مـەلا عـومـەری چۆمـان دووبزی گێڕایەوە وتی: ساڵی کوللەکە بوو ئەفەندییەک هاتبوو ژارەکوللەی هێنابوو بەو دەشتی هەولێردا ئەگەڕا وتی هاتە گوندی گردەسۆر. مامۆستا مەلا "شەریفی بەشیر" لەوێ مەلا بوو و یەکێک بوو لە مـەلا چاکەکانی ئەو وڵاتە، ئەفەندی مامۆستای بەگیرهێنا پێی وت: مامۆستا چەند ئەستێرە بە ئاســمــــانەوە هەیە؟ ئەویش وتی: نازانم. ئەفەندی وتی: من ئەزانم. ئەم نازانمەی مـامۆستا وای لە مـامۆستا کرد بەجارێ هەموو شتێکی لێتێکداو ئەفەندی بە تەواوی خۆی قیت کردەوە و بەراســتــی لەســەرەوە بوو، هەمــوو جاریش دەستی بە سـمێـڵـیـا دەهێنا ئەیوت ئێــــوە هــیــچ نازانن و هەروا بەخۆڕایی هاتوونەتە ناوەوە!

لەو کاتەدا کرمانجێک هەبوو ناوی عەزیز بوو، هات بەسەراو سەیری کرد مــامــۆســتــا زۆر حــاجــزە بەدەست ئەفـەندییـەکەیەوە. وتی: مـامـۆسـتـا ئەوە لۆ وا حاجزی؟ وتی وەڵڵا حەزیز ئەم ئەفەندییە شڕی کردیمە. وتی: لۆ؟ وتی پرســیــارێکی وای لێ کــردیمە نـایزانم و ئـەویش دەرێ من دەیـزانم. بەوە تەواوی سوارم بووە! عەزیز وتی: مــامــۆســتــا ئەتەوێ من وەرامـی بدەمـەوە؟ وتی جا عـەزیز لۆ کـەیتـە؟ عــەزیز رووی کــردە ئەفــەندی و وتی ئەرێ ئەفـەندی! ئەوە ئەو بەسـتـۆڕدیە چەند بەردی تێدایە؟ ئەفـەندی وتی: نازانم. عـەزیز وتی: جا ئەفـەندی تۆ لەحــەردی نەزانی لە ئاســمــانان کــو دەزانی؟ ئەفـەندی وشک بوو و ئیـتـر هیچ نەهاتە قسـە، ئەم سـەرەی کـە دایخـست بەرزی نەکـردەوە، هەسـتـا لێیـدا رۆیشت، ئەمجا عـەزیز کەوتە جنێودان پێی!

* مستەفا نەریمان گێڕایەوە وتی:

حەیدەرە لە هەولێر عەمری خوای کــردبوو، من لە کــەرکــووک بووم، دەستەی مامۆستایانی سلێمانی هاتن بۆ کــەرکــووک و پێکەوە لەگــەڵ مامۆستاکانی کەرکووکدا چووین بۆ هەولێـر بۆ پرسـە، رۆژی سـێـیـەمی پرسەکە بوو، ئەمانویست زوو بگەین، بۆلای ئێوارە چووینە هەولێر، جێگای پرســەکــەمــان نەئەزانی، چووینە بارەگــای پارتـی بۆ ئەوەی ئەوان بمانبەن، کە چووین ساڵح شێرە لەوێ بوو، تۆزێ لۆمــەی ئەومـان کـرد کـە بۆچی تەلەفــۆنێ شــتــێکی بۆ نەکردووین تا ئێـمـەش بمانزانیـایە و زوو بهــاتـینایە؟ ئەویش وتی: برا لۆمــە لەســەر خــۆتانە، بۆچی زوو تەلەفۆنی شتێکتان نەکردووە بپرسن کێ مـاوە؟ کێ مــردووە؟ تا منیش خەبەرم پێ بدانایە.

* لە ســــەردەمی ســـــوور سووررییـەکەدا هەر ئەم ساڵح شێرەیە وەکــو گــەڵا دار جنێــوی ئەدا بە ســـوورەکـــان و ســەربـاری ئەوەش سـەرئەکـەوت بۆ لینین و سـتـالین. سوورەکان چوونە لای پارتییەکان لە هەولێر وتیان: ئێستە ساڵح شێرە جنێوی بە ئێمەدا ئەوا لێی ناگرین، بەڵام بۆ سەر ئەکەوێ جنێو بە لینین و ســتالینیش ئەدا؟ ئێـمـە ئەمەی لێ هەڵناگرین.

لە بارەگــای پارتـیـیــەوە ســاڵح شێرەیان بانگ کرد بۆ موحاکەمە و

لێیان پرسی: تۆ شتی وات وتووە؟ ئەوا سوورەكانیش دانیشتوون، ئەویش لەباتی ئەوەی بلێ نەموتووە، وتی: بەلێ وتوومە. وتیان جا چۆن شتی وا ئەلێیت، كارت چییە بەسەر ئەوانەوە؟ وتی: برام ئەگەر یەكێ تووڕە ببێ لە یەكێ كە هاروهاجی بكا، پێی ئەلێ سەگی سەگباب، ئەگەر باوكە كەرانباوگاوەكەت باش بووایە ناجسنێكی وەكو تۆی لێ نەئەكەوتەوە. منیش هەر وام وتووە خۆ هیچی ترم نەوتووە. وەللا هەموو دەست ئەكەن بە پێكەنین و وازی لێدێنن!

* سێ كابرای "سیان" ئەچنە هەولێر مەنارەی شێخی چۆلی ئەبینن، بەلایانەوە زۆر سەیر ئەبێ و هەر سەیری ئەكەن، یەكێكیان ئەلێ: ئەمە چییە؟ ئەمە، بەهەقری من قاربی، ئەرزە. یەكێكی تریان ئەلێ وانییە. ئەمە بیرەكەی قوصە بلباسە هێناویانە لێرە هەلیان گێڕاوەتەوە لۆ ئەوەی ئاوەكەی وشک ببێ دیسانەوە سواغی بدەنەوە. سێیەمیان ئەلێ: ئەوە ئێوە چ دەرێن؟ ئەمە كیری ئەرزە و ئەچێ بەقوزی خوشكی ئاسمانێدا.

* حاجی ئاوڕەحمانی كۆیی هەبوو، جارێک ئەچێ بۆ ئەو خۆشناوەتییە و ماوەیەک ئەمێنێتەوەو خۆت ئەزانی ناشوكرێ نەبێ خواردنی هەرە خۆش لە خۆشناوەتی هەر گەنمەكوتاوە! ئەویش لەو ماوەدا لە گەنمە كوتاو بەولاوە هیچی تری دەست ناكەوێ. هەر زۆر زۆر هەلهای برنج ئەكا. رۆژێک سەر لەبەیانی كت و پڕ گوێی لە دەنگی "دنگ" ئەبێ، خۆی بۆ خۆش ئەكا كە ئەمە برنج ئەكوتن، ئەو رۆژە بەیادی برنجەوە، نیوەڕۆ نیوەڕۆژە ناكا، ئەلێ با ئێوارە زۆر بخۆم! ئێوارە پاش نوێژی شێوان ئاو دێنن و دەست ئەشوا، ئەویش سمێلی خۆی لێ داوەتە لاوە ئێستە پلێو ئەخوا، كە نان دائەنرێ سەیر ئەكا هەر گەنمە كوتاوە! بەجارێ ئەچێتە تاسەوە و نایخوا، سكیشی لە برسانا هەر قوڕەی دێ!. كابرای خانەخوێ پێی ئەلێ: حاجی ماناخۆی؟ ئەلێ ناخۆم، ئەلێ: ئاخر كە دەستت شووشت ماناخۆی؟ ئەلێ: كوڕە كە دەستم ششت، دەستم لێی ششت!

* كابرایەكی سیان لەسەر رووبارەكەی بەیانلو دەستنوێژی ئەشووشت. كە لێ بۆوە تاكێ لە پێلاوەكانی لەدەستیكەوت و كەوتە ناو رووبارەكە و ئاوەكە بردی. خێرا ترێكی كەندو وتی: ئەوە دەستنوێژەكەت، بێنە تاكە پێلاوەكەم بدەرەوە! لای وابوو رووبارەكە لەباتی هەقی دەستنوێژەكە پێلاوەكەی بردووە!

* مەهدی عەزیز خۆشناو گێڕایەوە وتی:

لە گوندێكی ئەو خۆشناوەتییە كوڕێک دلی ئەچێ بە كچێک بەم بەیتانەی خوارەوە ستایشی ئەكا و ئەلێ:

**ئەو حەزێ من دەیرێم**
**ئەو دۆستەكەم كەدەیرێم**
**كە شەدەی لەسەر نایە**
**كە لێی دەدا (قورابە)**
**چەند دەروێشی دێنە جێ**
**دەروا (كشكۆری) نابە**
**چەند (مەرا)ی سەر دەرسان**
**حەرفەكیان وەبیر نەمان**
**چەند حاكمی سەر تەختان**
**هەموو ژنیان تەراق دان**
**سورتان رەشاد دەیهەنارد**
**لۆیان بەخەرات دەنارد**

كوڕەش پاش ماوەیەک ئەنێرێ بۆ خوازبێنی كچە و كچە شووی پێ ناكات! ئەمجا لێی پاشگەز ئەبێتەوە و بەم جۆرەی خوارەوە باسی ئەكا:

**كەپوت (هێرانە) قورتی**
**تازە بنیشتی تێدایە**
**گێت مراكی سەپانان**
**هێستر لەقەی لێدایە**
**برژانگت كركی كەرێ**
**تاق و جووت راوستایە**
**ددانت خاكەناسە**
**لۆ قۆرتێ چا كرایە**
**پەرچەم پەركی كفرییە**
**بزنان دەوری لێ دایە**
**كەزیت پەركی كارییە**
**دەریخێ وەردرایە**
**روومەت پەركی شفتییە**
**مریشكان دندوک لێ دایە**
**بەژنت چەندە برندە**
**هورگ پاری وێ دایە**
**سوندەكی مەحكەم دەخۆم**
**سەد (گوجیر)ی تێدایە**
**قونت تۆقەرەی ئاش**
**نۆ (حەربە) زەرەر دایە**

* هەر مەهدی گێڕایەوە وتی:
پیاوێک هەبوو لەو ولاتە "لەشكرێ"ی ناو بوو. ژنەكەی بڕیاری لەگەلدا كە ئەو شەوە بكەن بەجەژن، بەوە پێنج هەرامان بكەن. پیاوەش وتی: ئەمری خواو رەزای هەقە، كابرا

خوا یاریدەی ئەدا لەباتی پێنجان هەرامە ئەگا بەشەش! ژنە ئەمەی پێ خۆش ئەبێ و ئەڵێ:

**لەشکری خۆش لەشکری**
**قەولمان پێنج بوو ئەو شەش کری**
**تفاقا ماڵا مە خۆش کری!**

* لەو خۆشناوەتییە، جارێک مریشکێک ئەچێتە دیوەخانی میرەوە، میر هەر کشەی لێ ئەکا و نارِوا، یەکێک لە خوڵامەکانی میر لەوێ ئەبێ و هەر هەڵئەسێ شەقێک لە مریشک هەڵئەدا و ئەڵێ: دایێی ماخۆت بگێم، میر بە زمانا خۆی سێ جاران فەرمووی کشە، چما نارِۆی! بەخودای ئەگەر من بام هەر دەتولێمەوە!

* ئۆف دڵداری، ئاخ دڵداری، یادت بەخێر دڵداری!

لەو خۆشناوەتییە ئەیانەوێ ئێستر دروست بکەن، ئەمەش ئەبێ نێرەکەر ببێ بە زاوا و ماین بە بووک، تا تاقانەیەک ببێ و ناوی بنێن ئێستری نێرەموک!!

باجی ماین هەر چەند خۆی لە نێرەکەری لۆتی هەڵبسوێ شاپلیتەی لە شوێنی خۆی نابزوێ، ناچار ماکەرێکی تازە لە بەهاری ماکەریدا ئەخەنە پێش، نێرەکەر السەلتەنە چاوی بەدۆستی دێرینە و هاوسەری گیانی بکەوێ بەملادا لووشکەیەک و بەولادا لووشکەیەک، حەیتە وەکو گورزی رۆستەم ئەکەویتە جولان، کە ئیتر ئامادەی کەوان کرا، خێرا ماکەر لابراو ماین لە شوێنی دانرا، حەیتە لە کارایە، گورزی درزی دۆزییەوە، دەستە گوڵی بردەوە، ئاوی ژیان چووە زێی ماینی خۆشناوان، ماکەری بەسەزمان لەولاوە گوێی بوو بە قەنجگە لاشکی گوێ سەربان، چونکە لەو رەق کراو لە یەکێکی تر خرا، تاقانەی باوک و دایک پەیدا بوو، ناونرا ئێستری بەچکە کەری لەماین بوو! خوا یەکە و نەبووە بەدوو، ئەمەیە حاڵی کەر و یابوو. ئەمجا زەماوەند و زورِناو دەهۆڵ لە خۆشناوان لەدەشت و دۆڵ، ما خۆ چما گوێ رەپ ئەکا؟ لە ئاش و زورگ خۆ دەردەکا! رەدەکێشێ و ئەسپێنداریێ، ئاخۆ دەبیا لۆ ناو شارێ؟ کە لێی پرسی بابەت کێیە؟ دەرێ دایکم ماینی شێیە!

ئۆف دڵداری، ئاخ دڵداری، یادت بەخێر دڵداری!

* کورەکەی کەمال بۆی گێرمەوە وتی:

شاگردی وەستا بووم لەکۆیە، وەستا پێی وتم: ئا کورِم! بچۆرەوە بۆ ماڵەوە بزانە چیان ئەوێ بۆیان بکرِەو بۆیان بەرەوە، منیش چووم بە وەستا ژنم وت، ئەویش وتی: کورِم ئەمەوێ بۆ ئەم نیوەرۆیە یاپراخ بکەم، بچۆ هەندێ کەرەستەی یاپراخمان بۆ بێنەوە، منیش بە فرکانێ هاتمەوە و بەوەستام وت، وەستاشم وتی: کورِم بچۆ بۆیان بکرِەو بۆیان بەرەوە، چووم خێرا کریم و بردمەوە، وەستا ژنم خەریکی قاپ و قاچاغ شتن بوو، دامێ و گەرامەوە، پێی وتم: کورِم تۆیش بۆ قاوەڵتی وەرەوە لەگەڵ منالەکان نان بخۆ. هاتمەوە بۆ دوکان بۆلای وەستام.

نیوەرۆ بەسەعاتی پێش وادە، چوومەوە سەیرم کرد وەستا ژن مەنجەڵە یاپراخی خستۆتە سەر ئاگر و چەند بەردێکی خستۆتە سەری بۆ ئەوەی تێک نەچێ، لەو لاشەوە دەوری و فەخفورییەکانی هەموو شتوەوە و لەناو سینییەکا دایناون و ناو ماڵەکەش گەسک دراوە و هەموو شت لەشوێنی خۆیایە. لەم کاتەدا حسامی کورِی هاتەوە و وتی: دایە! برسیمە نانم بۆ تێکە. دایکیشی وتی: گیانی دایکێ تۆزێ راوەستە هێشتا یاپراخەکە نەکولێوە، با بکوڵێ بۆت تێئەکەم، ئەویش وتی: برسیمە راناوەستم، هەر ئێستە بۆم تێکە، دایکی وتی: کورِم پەلە مەکە با بکوڵێ بۆت تێ ئەکەم! لەسەر ئەمە ئەم هەر ئەڵێ و دایکیشی ئەڵێ نەکولێوە، تۆزێ راوەستە، بوو بە دەمەقاڵێیان، دایکی وتی: دە برِۆ ملت بشکێ ئێستا نەکوڵاوە. هەر کە دایکی ئەمەی وت، حیسام نەیکردە نامەردی سینییە فەخفوری هەڵگرت و دای بە عەرزا، هەمووی ورد و هەراش کرد بەسەر یەکا.

لەم کاتەدا کاک سابیری برای حیسام هاتەوە، کە سەیری کرد ماڵەکە شڵەژاوە و لەدایکی پرسی ئەمە چییە و چوو بەلای رادیۆنەکەوە، دایکیشی کارەساتەکەی بۆ گێرایەوە، ئەمیش لەمە تووڕەتر بوو، هەر هەڵیگرتەوە رادیۆنی دای بە زەویدا و شکانی، وتی: دیارە ئەم هەتیوەی برام شێتە! پاش ماوەیەک وەستام هاتەوە بە سەرا، ئەمیش پرسی ئەم هەرایە چییە؟ وەستا ژنم کارەساتەکەی بۆ گێرایەوە. ئەویش سەعاتەکەی لەگیرفانی دەرهێناو دایە بەر رۆژەکە و سەیری کرد وتی: خۆ هێشتا نیو سەعاتی ئەوێ بۆ نیوەرۆ،

دەستیانکرد بە جنێودان بە منالەکان و ئەمیش لە رقانا سەعاتەکەی هەلگرت و دای بە دیوارەکەدا سەعات هەراش هەراش بوو!

وەستا ژنیش کە ئەمەی دی سەرسام بوو و لەبەر خۆیەوە وتی: بۆم دەرکەوت کە ئێوە هەمووتان شێتن، نەیکردە نامەردی مەنجەلە یاپراخی هەلگرت و قلپی کردەوە ناو حەوزەکە! هەر من مامەوە، منیش لەداخی ئەمانە و لەداخی برسێتی دەستم کرد بە سوڕدان و چەقەنە لێدان و هاتمە دەرەوە!

* شێخ عەزیز بۆی گێرامەوە وتی:

سالێک مافەتەیەک لەعێراق کەوتبووەوە باو باوی "بژی بژی" ی چەپلە" بوو، خەلک ئەیاندا لە چەپلە و ئەیانووت: "بژی گەل، رۆلەی گەل، عەبدولکەریم قاسم" بەم هۆیەوە کاروباری عێراق بە تەواوی تێکچوو بوو. دوو پیاوی پەرپووتی هەژار هەبوون لە هەولێر یەکێکیان ناوی "پیرداود" ئەویکەیان "مارفە شەل"یان پێ ئەوت. ئەمانە لەولاتی هەولێر ببوون بە پێشرەوی عالەمەکە! رۆژ ببوو بە رۆژی ئەوان. دەستەیەکی تر کە ئەو رۆژانە جەوری لێکردبوون، ئەمەیان بۆ پیرداود و مارفەشەل هەلبەستبوو، ئەیانوت:

بژی گەل و رۆلەی گەل، پیرداود و مارفەشەل!

* کابرایەکی خۆشناو رێی ئەکەوێتە ئەو ولاتی خوارەوە دار خورما ئەبینێ کە هێشووی خورمای پیا شۆڕبۆتەوە، ئەمیش زۆر دلی بەو خورمایەوە دەستیشی نایگاتێ، هەر لە بنکەیا رائەوەستێ و سەری بۆ بەرز ئەکاتەوە و دەمی بۆ ئەتەقێنێ و ئەلێ: (دەک لەبەرت مرم خورمێ!).

* کوێخا قادر هەبوو خەلکی "گراو"ی خۆشناوی و پیاوێکی زۆر زۆر ئیختیار بوو، ئەیووت: ئەگەر یەکێ بیەوێ لە کاروبارێکی دنیاییدا سەرکەوێ ئەبێ دوو شتی تێدا هەبێ: یەکەم ئەبێ چاکەی کەسی لەبەر چاو نەبێ، دووەم: ئەبێ تەمەنێکی زۆر درێژی هەبێ!

* مەلا سالحی کۆزەپانکە ئەچێتە گوندی دیبەگە. دوو برا لەوێ هەبوون یەکێکیان خەتەنە ئەکرا، کەچی ئەویتریان ئەگریا! مەلا سالح پێی ئەلێ: مردیت مرێ تۆ لۆ ئەگری؟ ئەویش ئەلێ: ئاخر مامۆستا نۆرەی منیش دێ.

* مەلا سالحی کۆزەپانکە ستایشی موحسین ئاغای دزەیی ئەکا ئەلێ: پیاوێکی سیاسی وایە پێشکە بگێت نایەلێ ئاگای لەخۆی بێت!

* پیاوێک لەو دەشتی هەولێرە هەبوو "عەزیزۆک"ی ناو بوو، ژنێکی هەبوو "ئایشۆک"ی ناو بوو، رۆژێ میوانیان دێت، عەزیزۆک بە ئایشۆک ئەلێ: ئەوا میوانمان هاتووە بچۆ مریشکێکیان بۆ بکوژەوە، ئایشۆکیش ئەچێتە ژوورەکەی تر، دەرپێکەی دائەکەنێ و هەر دەرناچێ. عەزیزۆکیش سەیر ئەکا ئایشۆکێ هیچ دیار نییە و میوانیش دانیشتووە، ئەچێتە ژوورەکە بۆلای ئایشۆکێ کە چاوی پێ ئەکەوێ، ئەلێ: پیاوەکە تۆ وەخت و ناوەخت نازانی ئێستا کەی وەختی ئەوەیە؟ عەزیزۆکیش ئەلێ: خوا بتگرێ من وتم: بچۆ مریشک بکوژەوە یا دەرپێ داکەنە؟

* لەو دەشتی دزەییە فەقێیەک هەبوو "مەلا برایمی مەشهور"یان پێ ئەوت، ئەم مەلا برایمە هەم سەر و فەسالێ و هەم کردەوە و قسەی لەوانە بوو هەموو کەسێکی ئەهێنایە پێکەنین. ئەمەش هەر خۆی لەخۆیا وابوو، وەنەبێ بە ئەنقەست وای بکردایە. مەلا برایم ئاوەل موستەعدێکی ئەبێ. سوختەکە رۆژێک مەلا برایم تورە ئەکا. مەلا برایمیش پێی ئەلێ: کێرت بە قنگی مەلا یەحیای مامۆستات. ئەگەر مامۆستاکەت پیاو بووایە، تۆیش پیاو ئەبوویت. سوختە ئەچێ ئەمە بۆ مەلا یەحیای مامۆستای ئەگێڕێتەوە. مەلا یەحیا لەم قسەیە زۆر تورە ئەبێ و وەکو فیشەکە شێتە ئەچێ بە ئاسمانا!

کوتەکێکی ئەبێ هەلیئەگرێ و ئەچێ بۆ مەلا برایم! کە ئەگاتە بەردەمی مەلا برایم کوتەکی لێ هەلئەسوڕێنێ و رووی تێ ئەکا ئەلێ: مەلا برایم! نالێیت بەحیزی هاتۆتە سەرم، ئەو کوتەکەت چاو لێیە؟ تۆیش هەلسە بکەرەوە خۆت، یا من سەر و گوێلاکی تۆ ئەنێمە یەک یا تۆ. ئەبێت ئیمرۆ یەکێکمان بەدەست یەکێکمان بیخۆین، قسەیەکی وات نەکردووە شوێنەکەی سارێژبێتەوە! مەلا برایمیش ئەلێ: ئەوجا شەڕ کەی وا ئەبێ؟ شەڕ ئەوەیە، کە ئەبێ تۆ بچی لەولاوە دابنیشی دەست بکەی بە قسەکردن، منیش دەست بەم بە قسە لە هەوەلەوە بە نزمی، لەپاشا بە توندی ئەمجا هەردووکمان لەیەک زیت بینەوە، تۆ دەست بکەی

بەجنێودانم. من بلێم گو بخۆ، تۆ بلێیت ئەوە کێ گو بخوا؟ من بلێم! باوە حیز بەتۆ ئەلێم! ئەمجا تۆ راست بیتەوە، منیش هەستمە سەرپێ، تۆ هەنگاوێک بێیتە پێشەوە. من قۆڵم هەڵکەم، تۆ توڕەتر بیت هەنگاوێکی تر بێیتە پێشەوە ئەمجا منیش بێم باوەش بکەین بە یەکا لەمن زیل و لەتۆبەم! دەست لەدەست و قەوەت لەخوا. تا یەکێکمان ئەکەوینە تونی بابە عەمرەوە! برا شەڕ ئاوا ئەبێ. کەی بەو جۆرە ئەبێ کە تۆ بۆی هاتوویت؟! کە مەلا برایم ئەمانە ئەلێت: مەلا یەحیا جوان و پوخت خاو ئەبێتەوە و دەست ئەکا بە پێکەنین و ئەگەڕێتەوە دواوە.

* بابەشێخی شێخ عومەری بالیسان بۆی گێڕامەوە وتی: لەسەردەمی حەمە پاشای رەواندزدا ئاغایەک لە دەوروبەری "وەلاش" هەبوو، تۆزێ سەری لە گەورەیی ئەخورا. لەگەڵ دەوەشا هەر لەژێر قەڵەمڕەوی پاشای کوڕەدا بوو. پاشا پیاوێکی ناردە سەری بۆ دەیەک و زەکات، ئاغاکە دەماری گەورەیی دەستی کرد بە جوولە جووڵ لە لەشیاو پیاوەکەی دەرکرد و هیچی نەدایە، ئەم ئاغایە گردێک لە تەنیشت قەڵاتەکەی بوو، پاشای کوڕەش جۆگە ئاوێک لەبەر قەڵاتەکەیا بوو، کابرا چۆوە و کارەساتەکەی بۆ میر گێڕایەوە، میر تێکچوو ئەمجا کابرا وتی:

**ئەگەر میر خورتە تخوب گردە**
**ئەگەر میر زراوە تخوب ئاوە!**

* جەمیل ئاغای بەحرکە و مەجید ئاغای "دێرێ" هەردووکیان برا بوون و لە عەشیرەتی گەردی بوون، گوندێکی زۆریان هەبوو، جەمیل ئاغا دەستی بەسەر هەموویانا گرتبوو، سەرباری ئەمە بەتەما بوو "دێرێ"ش داگیر بکا، لەو گوندانەش کە هەیبوو یەکێکیان "هەرشەم" بوو، ئەم قسەیەش بڵاوبۆوە و کە ئەیەوێ دێرێش داگیر بکا. چونکە هەموو جار ئەیوت:

**ئەگەر خودا بدا دەمێ، دێرێش دەخەمە سەر هەرشەمێ**

مەجید ئاغاش ئەیوت:

**ئەگەر خوداش نەدا دەمێ، سەد کێر بەدێرێ و دوو سەد بە هەرشەمێ.**

* مەلا عەلی قووچە بلباسی گێڕایەوە وتی:

پیاوێکی خەڵکی ئەو سەرە هاتە لای نوێژ بکا. پیاوەکە منالێکی لەگەڵا بوو، نوێژمان کرد و پاشان منالەکە رووی لە باوکی کرد و دەستی بۆ من کێشاو وتی: باوە ئەوە کێیە نوێژی کرد؟ باوکیشی وتی: ئەوە مەلا گیانە، منالەکەی لێی پرسییەوە وتی: ئەی ئەوە بۆ کێ نوێژی کرد؟ وتی: بۆ ئەڵلا گیان.

* حسێنی مەلا، لە هەولێر قسەکانی بەدانسقە ئەشیان، لەم ئاخرەدا چوو بوو بۆ حەج، لەپاش بەجێهێنانی هەموو کار و فرمانێکی حەج، سەربەرز ئەکاتەوە و ئەڵێ: خوایە ئەگەر چ خزمەتێکی دیکەت هەنە بفەرموو تا بیکەین!

* لەو ولاتی خۆشناوەتییە لە گوندی "هەناروێ" مەلا وەیس ناوێک هەندێ پەنیریان بۆ بردبوو، فەقێکان پەنیرەکەیان خواردبوو. لەهەر کامیانی ئەپرسی، ئەیوت: من نەمخواردووە. پەنیر سەری تیاچوو! ئەمجا بە مەلایان وت: وا پەنیرەکە نەماوە و کەسیش نازانێ کێ خواردوویە؟ مەلاش وتی: ئاو ئەزانێ پەنیری مەلا کێ خواردوویە!

* میرانی کوڕی دکتۆر سەلاح میرانی، تەمەنی لەشەش سالانا بوو. لە هەولێر بە دوو ترومبێل ئەچووین بۆ هەوارگەی پیرمام. من هانی ژنەکانم داو خستمنە ترومبێلەکەی دکتۆر سەلاحەوە و ئەو لێی خوڕی، من و هەندێ کەسیش لە ترومبێلەکەی لای منا بووین، میران لەگەڵ من بوو، هەر کەهاتم سوار بووم ئەوەندە تووڕە بووم لەژنەکان، وتم: هەرکەس لەگەڵ ژنا بێ لە جەهەننەمدایە! ئەوەندەم زانی میران بەبێ وەستان وتی: کەواتە باوکم ئێستە لە جەهەننەمدایە!

* "تامووراغا" هەبوو پیاوێکی دەوڵەمەندی بەدەسەلات و خاوەنی مەڕ و شوانکارە بوو، لە هەولێر دائەنیشت، تووشی نەخۆشییەکی گران ببوو، گەلێ ولاتان گەڕابوو. دکتۆرەکان هەر ئەوەیان بۆ دەرکەوتبوو کە ئەمە ریخۆڵەی پێچی خواردووە. لەبەر ئەوەش کە عومری سەرکەوتووە تاقەتی ئەوەی نەماوە کە عەمەلیات بکرێ. دوکتۆری مووسڵ و بەغدا و شام هەر لەسەر ئەمە بوون، بەڵکو هی لەندەنیش. لەبەر ئەمە تامووراغا رۆژ بەرۆژ هەر لەکورتی ئەدا و هەر بەرەو پیری مردن ئەچوو، ئیتر دەستیان لێ شت و چاوەڕێی ئەوەیان ئەکرد ها ئێستە، ها سەعاتێکی تر بمرێ.

ئەم لەم حاڵەتەدا بوو، شوانکارەی

هەبوو، ڕۆژێک یەکێ لەو شوانکارانە (کە ناوی مستۆ بوو) هاتبوو ڕۆنی هێنابوو. سەیری کرد ماڵی تامووراغا لەشین و شەپۆردان. ئەپرسێ ئەمە چییە؟ ئەڵێن: تامووراغا لەحاڵی خۆیایەتی و هەموو دوکتۆرەکان وتوویانە ریخۆڵەی پێچی خواردووە و لەبەر عومر گەورەییشی ناتوانن دەستی لێ دەن. دەڵێ: ئا بمبەن حەز ئەکەم منیش چاوم پێ بکەوێ. ئەیبەن ئەویش سەیری ئەکا لەپاش ئەوە دەست ئەنێ بەسکی تاموراغادا. ئەڵێ: بەڵێ ڕاستە ریخۆڵەی پێچی خواردووە، بەڵام من ئێستە چاکی ئەکەمەوە، بەمەرجێک هەر شتێک ئەڵێم: بۆم بێنن و قسەش نەکەن ئەڵێن: باشە. دەڵێ سێ هەڵماتی شووشە و قوتوویەک ڕۆنی زەیتم بۆ بێنن و هەر ئێستەش گونکێکی هەویر لەسەر ساج بکەن بە کولێرەیەکی گەرم و بۆم حازرکەن. هەڵماتەکان و قوتووە ڕۆن زەیتەکەی بۆ دێنن. تاموراغاش هیچ هێزی تیا نەماوە و تەنانەت قسەشی نەماوە.

کابرا دەمی تاموراغا ئەکاتەوە، یەکە یەکە هەڵماتەکان دەخاتە گەرووی، بە پەنجە دەیخاتە خوارەوە. ڕۆن زەیتەکەی ئەکا بە شوێنا. کەس و کاری تاموراغا ئەیانەوێ دەستی بگرن، ئەڵێن ئەو لەو حاڵەدایە تۆ بە تەواوی خنکاندت! ئەڵێ: من نەموت نابێ قسە بکەن! هەندێکی تر لەکەس و کارەکەی ئەڵێن: خۆ ئەو مردووە، واز لەم پیاوە شوانە بێنن ئەگەر چاک بۆوە ئەوا چاک بۆتەوە ئەگینا خۆ هەر مردووە.

کابرای شوانە هەر کە هەڵمات و ڕۆن زەیتەکە ئاوا لێ ئەکا، ئەڵێ: خێرا کولێرە گەرمەکەشم بۆ بێنن. کولێرەی لەسەر ساج بۆ لائەبەن و بۆی دێنن. کولێرەی گەرمی سوور ئەنێتە سەر سکی تاموراغا و بەسەر سکا ئەیگێرێ. ئەوەندەی ئەگێرێ تا کولێرە وردە وردە سارد ئەبێتەوە. ئەویش هەر بەدەست، دەستی پیا دێنێ، سەیر ئەکەن تامورئاغا چاو ئەکاتەوە. زۆری پێ ناچێ کەمە کەمە زمانی گۆ ئەکا و ئەڵێ: بمبەنە سەر ئاودەست. شوانەکەش لەگەڵی ئەچێ، تاموراغا دائەنیشێ و پاش هەڵسانی، شوانەکە لەناو پیساییەکەیا هەڵماتەکان هەڵئەگرێتەوە، وا خزمەکانیشی هەموو چاویان لێیە! تامورئاغا ئەمجا بەپێی خۆی ئەگەڕێتەوە بۆ سەر جێگای خۆی. لەپاش تۆزێک داوای نان ئەکا و ئەڵێ: برسیمە، شوانە ئەڵێ: شۆربایەکی تەڕی بۆ بکەن. شۆربای ئەدەنێ ئەیخوا، دیسان داوا ئەکاتەوە، شوانە ئەڵێ هەر شۆربای بدەنێ. لەو ماوەیەدا جارێکی کەش ئەچێتە سەر ئاودەست، شوانە دوو ڕۆژ لەوێ ئەمێنێتەوە، تا تاموراغا بە تەواوی ئەکەوێتە خواردن و ئەڵێ: هەموو شتێکی ئیتر بدەنێ.

لەراستیدا تاموراغا بە تەواوی ساغ ئەبێتەوە و هیچ عەلەمی تیا نامێنێ. ئەمجا لەکابرای شوانە ئەپرسن ئەمە چییە و تۆ چۆنی تێ ئەگەی؟ ئەڵێ: من وای ئەزانم ئەمە ریخۆڵەی پێچ خواردووە، ئەبێ شتێکی سافی قورس هەبێ بەو شوێنەداو بەناو ریخۆڵەکەدا بڕواو بۆ ئەوە پاڵ بە شوێنە پێچ خواردووەکە بنێ، ئەو شتەش بەعەقڵی من هەر ئەبێ هەڵماتی شووشە بێ، چونکە هەر ئەوە سافە و قورسە. ڕۆن زەیتەکەش بۆ ئەوەیە لەگەڵ هەڵماتەکمدا بڕواو ناو ریخۆڵەکە لوستر بکا و ڕێگا بکاتەوە بۆ ڕۆیشتنی هەڵماتەکە، کولێرە گەرمەکەشی بۆ ئەوەیە کە گەرمایی بگا بەرۆن زەیتەکە نەوەستێ، چونکە ڕۆن زەیت بە گەرمایی زیاتر ئەکەوێتە جووڵە، ئەمانە هەریەکە ئیشی خۆیان کرد. هەتا لەولاوە ئەوە بوو هەڵماتەکان دەرچوونەوە پێچی ریخۆڵە ڕاست بۆوە هاتە سەر دۆخی خۆی.

تاموراغا ئەوا چاک بووەوە. ئەمجا ڕووی کردە مستۆی شوانکارە وتی: هەرچی خێر و بێری ئەمساڵی ئەو مێگەلە مەڕەی من هەیە، سا هەزار سەرە یان کەمترە هەمووی بۆ تۆ. جگە لەمە دیسان خەلاتێکی تریان کرد و گەڕایەوە بۆ لای مەڕ و مێگەلی خۆی...

* مەلا عوسمانی کوڕی مەلا ساڵحی کۆزەپانکە ڕۆژێک لە ژووری دەرسا (پۆلی شەشەمی سانەوی) قوتابییەک لێی ئەپرسێ: مامۆستا مارە بەجاش چۆن ئەکرێ؟ ئەویش بەبێ وەستان ئەڵێ: بچۆ لە دایکت بپرسە!

* حاجی حەمەدەمینی سیساوە گێڕایەوە وتی:

مەلا مەجید هەبوو لە سیساوە، پیرێژنێکیش لەوێ بوو، باجی مەیرەمی ناو بوو، ڕۆژێک باجی مەیرەم سەری ڕێ بەمەلا مەجید ئەگرێ، پێی ئەڵێ: مامۆستا! ئەو قوڕە کە خوا ئادەمی لێ دروست کرد

"کا"ی تێدا هەبوو یان نا؟ مەلا مەجیدیش تۆزێ ئەقڵەکەی تەواو نەبوو، هەر دەست بۆ ناولنگی باجی مەیردم درێژ ئەکا و ئەڵێ: پیرێژن! ئەگەر "کا"ی تێدا بووایە ئەو قڵشە چی ئەکرد لەوێدا؟!

* مەلا عومەری چۆمە زەردەڵە گێڕایەوە وتی:

مام وەسمانی سبیلەک بۆی گێڕامەوە وتی: گرانییەکەی پێشووە، ئەوی پێی بڵێن: زادی خودای دەست ناکەوێ بە تەواوی دنیای قات و قڕە. وراتی دزەیی هیچی لێ نییە. هەندێ قرۆش و مەتالێکمان هەیە لە ماڵەوە بە وەزن گران و قەبە، بەڵام بەقیمەت سووکە، بەدایکی مندارانم گۆت لۆم بینە، ئەچم بزانم لەو وراتی کۆیەیە دەستی ئێکێکی پێ نابڕم، بەرکو شتێکی لێ بستێنم ئەم زستانی پێوە بەرینە سەر. لۆی هێنام پڕ بە دەستەسرێک ئەبوو زۆر قورس بوو، بەرام نرخەکەی هیچ نەبوو.

پاردم خستە باخەرم و چووم لۆ وراتی کۆیە: "چێر و گۆلک"ێکم پێ کڕی و هەندێکیشم مایەوە خستمە باخەرم. چێر و گۆلکم وەپێش خۆمدا و گەڕامەوە تا کەوتمە ناو دزەییان، گەیشتمە نزیکی گوندی "قازی خانە" شەوم بەسەردا هات و دنیاش زستانە، باران وەکو کوندەی سەر بەرەو ژێر دێتە خوارەوە، هێندەش ساردە تف هەردەی بە ئاسماندا ئەیبەستێ، هیشکایی بێ و لە لەشما نەمایە، دەشتی دزەییش میوان داناکەن، خۆ قازی خانە لە هەموو خراپتر.

چارم نەما رووم کردە گوندێ، ئەچم لۆ هەر مارێ، بەخۆم و بەچێر و گۆلکەکەوە دەرم دەکەن، هەم خۆم هەم چێر و گۆلکەکە وەختە بمرین لە سەرمانا. لە گوندەکەدا مار نەما نەچم، ماری "مەلا" نەبێ. کەس داینەکردم. ئەمجا بە ناچاری بەخۆم و بەچێرەوە رووم کردە ماری مەلا. هێندەم زانی مەلاژن دەریەڕی و دەستێکی گرت بەمەلای دەرگاکە و دەستێکی بەولاوە. وتی: کابرا بگەڕێوە جێمان نییە. منیش ئیتر دەرەتانم نەمایە، چێر و گۆلکم بەدار گرت و دامە پێش و گێم بە ژنە نەدا و دەستم کرد بە جنێودان و هەر ئەڕێم گو بەگۆڕی، ئەوا هەر رووەو پێشیشەوە ئەڕۆم، وەکو ئەوەی کە ژنە لەگەر منی نەبێ!

وتی کابرا ئەوە جنێو بەکێ ئەدەی؟ وتم بەو گۆڕ بەگۆڕە کە منی تووشی ئەم حەزیەتە کرد. لای وابوو مەلا لە دنیادا قاتە، تەنها مەلای قازی خانە نەبێ، ژنە تۆزێ شل بۆوە وتی: لۆ چ بووە؟ وتم: ئەو کابرا لەوراتی کۆیە مردییە ئەم چێر و گۆلکەی کردییە بە ئیسقات لۆ مەلای قازی خانە، لای وەهایە مەلا لەدنیا برایە بەم باران و قیامەتە منی تووشی ئەم حەزیەتە کردییە! ژنەکە گوێی لەم قسە بوو وتی دە بابم تۆ لۆ دەنگ ناکەی؟ بەر دەرکەکەی بەرداو وتی: فەرموو، ئاخر تۆ بەزەییت بەخۆتا نایەتەوە ئەم بەستە زمانانەت لۆچ وا تووشی ئەم باران و سەرمایە کردییە؟ خێرا چێر و گۆلکی دایە پێش و کردنیە تەویلەوە، مافورێکیشی لۆمن راخست، ئاگری کردەوە. چوو کەوێ و سەڵتەیەکی تری مەلا هەبوو لەگەڵ کراس و دەرپێ، وتی جلەکانت بگۆڕە با ئەوانەی خۆت هیشک کەمەوە. لەولاشەوە کاو دەسکاوی هەویر و جۆ ئەبا لۆ چێر و گۆلکەکە، چونکە بەهی خۆیانی ئەزانێ مەلاش لەمار نییە هێشتا لە مزگەوت نەهاتۆتەوە، مەنجەڕیشی خستە سەر ئاگر لۆ شیوێ.

پاش ئەمانە زۆری پێ نەچوو مەلاش هاتەوە، مەلاژن مەلای تێگەیاند، کە ئەو خوالێخۆشبووەکەی کۆیە چێر و گۆلکێکی بە ئیسقات ناردییە لۆمان، مەلا بەم قسەیە بڕوای نەکرد بەرام پیاوێکی ئەرباب و خۆش بوو، وتم مەلا پیاوەتیت ببێ خۆم دامەزراندییە لێم تێک مەدە! مەلا دەستی کرد بە پێکەنین و وتی: جا بەیانی کو رزگاری ئەکەی؟ وتم عسابی بەیانی لەسەر خۆم. بەرام مەلاش لە مەلا ژن ئەترسا! مەلا ژن لەبەر ئەوە کە چێر و گۆلکم بەهی خۆیان ئەزانێ ئەوا هەر ئەچێ بۆ لایان و ئاو و ئالێکیان لۆ دەبات.

ئەو شەوەمان رۆژ کردەوە و بەیانی مەلاژن دیسان شیوی لێ نایەوە و شیومان خوارد پاش ئەمە رووم کردە مەلاژن وتم: مەلاژن ئەتۆ ئەرکت زۆرە با مامۆستا ژنێکی تر بێنێ هەم خزمەتی تۆ ئەکا و هەم خزمەتی مارەکەشی ئەکا! هەر ئەمەم وت مەلاژن وتی: ئەوە چ دەرێی؟ مەلاش لەولاوە گوتی: بابم وازبێنە من پاردم کوا؟ هەر خێرا دەستم کرد بە باخەرما ئەو قرۆش و مەتالیکەکان کە مابوونەوە و لەبەرئەوە لەناو دەستەسڕەکەدا بوون بەچاو زۆری

ئەنواند بەرام هەموویت بخستایەتە سەر یەک بایی سی مەجیدی نەدەبوون. دەرمهێنا و فڕێمدایە بەردەستی مەلا وتم: ئەوە پارە!

مەلاژن کە ئەمەی دی بە تەواوی شێت بوو، پەلاماری دامێ دەستەسڕە پارەکەی هەڵگرت و خستییەوە باخەڵمەوە، خێرا چوو چێر و گۆلکەکەی دەرکرد و کردنییە دەرەوە، هات وتی: هەستە سەگی سەگباب گوو بەگۆڕی خۆت و ئەو گۆڕەش کە ئەم چێر و گۆلکەی ناردییە لۆ ئێمە، هەستە ئەوە خۆت و ئەوە چێر و گۆلکت، بەو شێخ کەمارە یەک سەحاتی تر لەم مارە دانانیشیت! ئیتر منیش هەستام خوا حافیزیم لە مامۆستا کرد و چێر و گۆلکی خۆمم دایە پێش و هاتمەوە. مەلاش بە دزییەوە پێدەکەنی.

* کابرایەک لەو دەشتی دزەییە، لە کابرایەکی دوورە دەست ئەپرسێ ئەڵێ: برا یارانتان؟ ئەویش ئەڵێ: پەڵەی ئێمەی دایە و خەڵکی بە گونان!

* کابرایەکی خۆشناو کەرێکی هەبوو لێی ون بوو بوو، گەلێ بە شوێنیا گەڕا نەیدۆزییەوە. ئەمجا لەپاڵ بەردێکا دەستی کرد بە هەڵپەڕین و بەدەمیشیەوە گۆرانی وتن. یەک دوو کەس لەوانە کە ئەو لێی پرسیبوون بۆ کەرەکەی، هاتن بە سەریاو لێیان پرسی ئەمە چییە؟ یەکی کەری لێ ون بێ وا ئەکا! وتی: خارینە! ئەنگۆ نایزانن. من ئاوا دەکەم لۆ ئەوەی کەرەکێکم لەبنە تاشێکا بەچاوە خۆ ببینێ کە من چ بەتەنگییەوە نیمە، ئەمجا لۆ خۆی بێتەوە لۆ مارێ!

* کابرایەکی خۆشناو ئەچێ بۆ حەج و ئەگەڕێتەوە، لێی ئەپرسن حەج و مالی خوا کوو بوو؟ ئەڵێ: خودا لەمارێ نەبوو، پێغەمبەریش حەمری دابوو بەنگۆ، منیش لۆ خۆم هەر وا گەڕامەوە، چ دەستێم ماچ مەکەن!

* قادر حەمەومین لە شەقڵاوە ناردوویە ئەڵێ:

جارێک دوو کابرا لە شەقڵاوە لەسەر تخوب ئەبێ بە شەڕیان، لە ئەنجاما ئەچنە لای میر بۆ ئەوەی ناوبژیوانییان بکا، یەکێکیان روو ئەکاتە میر و ئەڵێ: میران ئەو کابرایە گەڕی تێ ئاراندیە، ئەتۆ بەو ئەقڕەی خۆت شەرعمان بکە تخوبەکەمان تۆ دیاری کە میران! ئەتۆ چێرە بی، بنە کرۆسکیش دە تودا بێ، چ گو بخۆی و چ کروسکات بخۆی هەر یەکە! من دەرێم هی منە و ئەو دەرێ هی منە، دە ئەتۆ دارێکمان دەناودا بنێ، با لەم شەکر خواردنە بکەوین!

* لە سیساوە پیاوێک هەبوو "وەسمان" و ژنێکی هەبوو "گوستان"ی ناو بوو، شەوێ دانیشتبوون گوستان وتی: پیاوەکە ماشەڵڵا لە شەرع، قسەی لە هەموو شتێکەوە کردییە! ئیمرۆکە چووم لۆ ئاوێ و هاتمەوە، گێم لێ بوو مەلا وەحزی دەدا، دەیفەرموو هەر کەس بەشەوی هەینییان "عەیب نەبێ" بکاتن، قەسرێک لە بەحەشتێ دروست دەکاتن، بەخودای پیاوەکە ئەو شەو هەینییە دەبێ قەسرێکم لۆ دروست بکەی. وەسمان خێرا قەسرێکی لۆ دروست کرد! گوستان وتی: دەلۆ خۆیشت دەبێ قەسرێک دروست بکەی. وەسمان قەسرێکی بۆ خۆشی دروست کرد، پاش تۆزێک ژنە وتی: بەخودای پیاوەکە، دەبێ لۆ دایکیشت قەسرێک دروست بکەی، هەقی بەسەر منەوە زۆرە، ئەگەر ئەو نەبا، من تۆم کوو دەست دەکەوت. وەسمان وتی: ژنەکە! ئەوە خۆت و ئەوە وەستای قەسران، چی لێ دەکەی بیکە، ئیتر بە گێی من ناکا، ئەگەر ئەتۆش درت بەداکم دەسووتێ، بەخێری بابت واز لە کوڕەکەی بێنە!

* مەلا عەلی قوچە بلباسی گێڕایەوە وتی:

کوڕێکی خارۆزام هەبوو دایکێکی پیری هەبوو، چووینە ئەوێ، هەر بانگی داکەکەی ئەکرد. ئەویش نەدەهات، کوڕە تووڕە بوو وتی: دە وەرە پیرەژنە قوڵترە! ئەمجا پیرێژن هات و بەکوڕەکەی وت: کوڕم پێم برێ قوڕترە، بەڵام مەرێ پیرێژن!

* لەو بناری لای خۆشناوە کابرایەکی زۆر تەبوز، کچێکی منالکاری مارە کردبوو، بۆ شەوێ کە دەچێتە لای کچە، کچە ئازارێکی زۆری ئەگاتێ و خۆی راناگرێ هاوار ئەکا: وەی مامە! کابرا ئەڵێ: کەسی مامی! کچە ئەڵێ: زۆر دەیەشێ! کابرا ئەڵێ: دەری بێنم؟ ئەڵێ: نا. ئەڵێ ئەدی زیاتر بیبەم؟ ئەڵێ: نا. کابرا ئەڵێ: دەسا کێژم نە دەریکێشم و نە راپێشی کەم، ئەدی خۆ لەکیری خۆم خۆش نابم!

* بابە شێخ گێڕایەوە وتی:

لەو وڵاتی هەولێرە باوە، لەکاتی حەجا یەکێک حاجییان کۆ ئەکاتەوە ئەیانبا بۆ حەج و هەر کەسە و شتێکیان لێ ئەسەنێ بەرانبەر بەو

ئیشکردنە کە بۆیان ئەکا. حاجی بەکر هەبوو کە ئەویش خەریکی ئەو ئیشە بوو، رۆژی یەکێ لە دەلاڵەکانی تر دێت بۆلای و پێی ئەڵێ: حاجی بەکر تۆ هەموو حاجییەکانت راکێشاوە بۆ لای خۆت و نانی ئێمەت بڕیوە. حاجی بەکریش تا ئەو وەختە هەر پانزە حاجی بۆ کۆکرا بۆوە ئەوانیش لای دانیشتبوون، هەڵئەداتێ: ئەڵێ نانی ئێوەم چی بڕیوە؟ من هەمە و نیمە پانزە حاجی حیز، ئیتر لەکوێ هەمووم کۆکردۆتەوە.

حاجییەکان کە ئەمە ئەبیستن، دەست ئەکەن بەجنێودان و قسەوتن پێی و لێی ئەڕەونەوە. هەرچەندە حاجی بەکر هاوار ئەکا کە مەبەستی هیچ نەبووە، کەڵکی ناگرێ. ئەم قسەیە خۆی، بوو بە بەڵا بەسەر خۆیەوە، لە ئەنجامدا وای لێهات کەس رووی تێنەئەکرد و هەولێری بەجێهێشت.

هەر ئەو گێڕایەوە وتی:

* ساڵێک چووم بۆ دەرەوە بۆ دەرویش گرتن، لە گوندێکا لەو بناری نزیکی "هەرکی"یە تووشی کوڕێکی گەنج بووم، وتم تەوبە بکە و ببە بە دەرویش. وتی: قوربان من هێشتا ژنم نەهێناوە و تەوبەم پێ راناگیرێ. وتم: برا، تۆ تەوبە بکە من بڕیارت ئەدەمێ تا ساڵێکی کە ئەم وەختە ژنیش دێنێت، وتی بەهەر جۆر بوو رازیم کرد، تەوبەم داداو بوو بە دەرویش، لە بەهارا کە هێشتا ساڵی بەسەرا نەسووڕابۆوە، چوومەوە بۆ ئەوێ، سەیرم کرد کوڕەکە جەزبە گرتوویەتی و بەزیکرکردن و هەیاهو، هات بۆ لام، پێم وت: ها هێشتا ژنت نەهێناوە؟ وتی: یا شێخ بەقوربانت بم تۆم بۆ خۆش بێت، ژنم بۆ چییە.

* دوو کابرای هەرکی دوژمنی یەک بوون، بەخوێنی سەری یەک تینوو بوون، لە دیوەخانی فەتاحاغای هەرکیدا بە تەنیشت یەکەوە دانیشتبوون. ئەمانە هەردووکیان قەنەکێش بوون، بەڵام یەکێکیان لەو وەختەدا قەقەکەی پێ نەبوو، بەری کرد بەولاوە دەستی بۆ لای کابرای دوژمنی راکێشاو وتی: کیسکێ خۆ بدە بەمن بلا قەنەیکی چێ کەم، ئێ لەدڵی منیشا بلا هەر لەدڵی من بی!

* مامۆستا مەلا ساڵحی کۆزەپانکە لە هەولێر فەقێیەکی لابوو ئەیویست ئیجازە وەربگرێ، ئەویش نەیئەدایە، فەقێکە چوو بۆ لای مەلا ئەبوبەکر، کە ئەو بە مەلای مامۆستا بڵێ ئیجازەی بداتێ، ئەویش چوو پێی وت، مەلا ساڵح وتی ئیجازەی نادەمێ. ئەمە زۆر کەرە! وتی کەرێتییەکەی چییە؟ وتی: کوڕە ئەوە رۆژێک نێرەکەرێکی بردووە ئاوی بدا پێی ئەڵێ: یا اختي اكلي الماء.

* کابرایەکی خۆشناو ئەچێت بۆ ئەو گەرمیانە بۆ هەنار فرۆشتن، لە گوندەکە ئەچێتە بەر ماڵی ماڵێک، بارەکەی دائەگرێت و لە هەیوانەکە بارەکە دائەنێت، گوێدرێژەکەش هەر لەوێ ئەبەستێتەوە، ئەمجا لەولاوە دەست ئەکا بە بانگەواز کردن: هەی هەنار سەر بەسەر بەگەنم، وەرن دەنا دەڕۆم. ژنی ماڵەکە چەند دانەیەک هەنار ئەدزێت. کابرا چاوی لێ ئەبێت، بەڵام دەنگ ناکات ئەگەڕێتەوە بۆ لای هەنارەکان، لەو کاتەدا کەرەکەی دەست ئەکا بە لوشکە، کابرا ئەڵێ چەندم پێ گوتی: ئەگەر چووینە ماڵی خەڵک، دەنگ مەکە و مەیەرە قسە، قەیدی چییە هەناری بردووە، بردوییە ئیتر ئەم چەنەبازییە چییە؟ ژنەی خانەخوێ ئەمەی بەلاوە زۆر سەیر ئەبێ!

کابرای هەنار فرۆش ئەچێتەوە بەولاوە دەست ئەکاتەوە بە بانگەواز کردن، چاوی لێ ئەبێ ژنە هەنارەکان ئەهێنێتەوە لەجێگای خۆی دایان ئەنێتەوە. دیسان کابرا دێتەوە بەلای هەنارەکانەوە کەرەی بەستەزمان لەبرسانا دەست ئەکاتەوە بە لوشکە لوشک کردن. کە چاوی بە خاوەنەکەی ئەکەوێتەوە، کابراش ئەڵێ: وەڵلا سەگباب خێو ئاخری تۆ حەیام ئەبەی! دە هێنایەوە و هێنایەوەئیتر با بیبڕێتەوە. ژنە هەر زۆر زۆر بەلایەوە سەیر ئەبێت! ئێوارە مێردەکەی لەئیش ئەگەڕێتەوە هەموو کارەساتەکەی بۆ ئەگێڕێتەوە، کە ئەو کەرە شتی وایکردووە و خاوەنەکەشی شتی وای وتووە!

ئەمجا مێردی دێت بەلای کابرای هەنار فرۆشەوە، پێی ئەڵێ ئەرێ برام ئەوە ئەو کەرەت چۆن فێری ئەو گفت و لفتە بووە کەوا شتت بۆ بگێڕێتەوە؟ کابراش ئەڵێ: برا ئەوە لە راستیدا کەر نییە، ئەوە ژنمە، کە ئەچم بۆ کاروان دوعایەک هەیە ئەیخوێنم بەسەریا ئەبێ بەکەر، بار و شتی لێ بارئەنێم، کە گەرامەوە بۆ ماڵەوە ئەبێتەوە بەژن!

کابرای خانخوێ ئەڵێ: دەسا بە قوربانت بم، من پیاوێکی هەژارم، هیچ باربەر و شتم نییە دوعایەکی

واش بەسەر ژنەكەی منا بخوێنە، بەڵكو ئەویش وای لێ بێت كە چووم بۆ ئیش و بارو شتی لێ بنێم و تۆزێ ئەركم سووک ببێ، كابراش ئەڵێ: باشە، لەبەر ئەوە خزمەتتان زۆر كردووم ئەو ئیشەتان لەگەڵ ئەكەم، بچۆ بیهێنە من چیت پێ ئەڵێم وابكە، ئەڵێ بیهێنە بیچەمێنەرەوە، سەری بگرە و چاو بنوقێنە ئیتر كارت نەبێ.

كابرا ژنە دێنێت ئەیچەمێنێتەوە سەری ئەگرێ و خۆیشی چاو ئەنوقێنێ، كابرای هەنارفرۆش لەدواوە دەرپێ دائەكەنێ و تێی بەرئەبێ! لەو كاتەدا كابرا تۆزێ چاو بەرز ئەكاتەوە سەیر ئەكا ئەم كابرایە بەربووەتە ژنەكەی، هاواری لێ بەرز ئەبێتەوە، ئەڵێ سەگباب ئەوە چی ئەكەی؟ كابرا كە ئەزانێ ئیشەكەی شڕە لەترسانا بەنیوە و نیوە چڵێ دەری ئەهێنێتەوە! ژنە هەر بەو جۆرە رووئەكاتە مێردەكەی و ئەڵێ: چیت كرد؟ زۆری نەما بوو گوێم درێژ بێ، گوێم قووت بوو بوو، سمم خڕ بوو بوو، هەر ئەوەندەی مابوو بانگم بكەی بڵێی كورو، كورو، چوش، چوش، بمبەی بۆ ئاشی، هەی پیاوی ئاشی وشو، وشو، چوشو، چوشو!

* لەو خۆشناوەتییە لەگوندی "هەرتەل" كابرایەک باوكی مردبوو، بوو بوو بە شیوەن و شین و شەپۆر، نێرەكەرێكیان هەبوو، لەو كاتەدا ئەویش ئێرەقی كردبوو و وەكو سنگی لێ هاتبوو و بەرزی ئەكردەوە شڵپ و ئەیدا بەسەر سینەی خۆیا و بەری ئەدایەوە، كابرای خاوەنی (باوك مردوو) هەر راست بۆوە بە خەنجەرێكەوە پەلاماری داو خەنجەری كرد بەورگی نێرەكەردا جەرگ و هەناوی خستە ئەو ناوە! وتی: دایەما خۆ بگێم، باوە مردییە بەودیەوە، وام بۆ دەرێی؟! وتیان: ئەوە بۆچ ئەو كەرەت كوشت؟ وتی: ما خۆ دەرێ بابی تۆ مردییە یا نەمردییە بە كیرمەوە، منیش دایەلێی دەگێم وای لێ دەكەم، چما وا دەرێ و بابی من چما لەكیری وی كەمترە؟ ئەو دایە حیزە وادەرێ!

* لە گوندی "باشتەپە" لە نزیكی "پردێ" عەبدولكەریم زێدبەكی گێڕایەوە وتی:

دوو كابرا بوو بە شەڕیان، یەكێكیان بەوی كەیانی وت: دایكت بگێم. ئەوەی كە ئەم جنێوەی دا دایكی خۆی وەستابوو، لەناو شەڕەكەدا بوو، ئەوی كەیان، واتە جنێو پێ دراوەكە وتی: دەسا وەڵڵا من بێزم نایە دایكی تۆ بگێم. ئەمجا دایكەكە پەلاماری بەردێكی داو شالاوی برد بۆ كابرا وتی: سەگی سەگباب! تۆ كو بێزت نایە دایكی ئەو بگێیت؟

* مەسعود محەمەد گێڕایەوە وتی:

مەلا ئەورەحمانێكی بانگبێژ هەبوو لە "كۆیە" دوو ژنی هەبوو، عاشقی ژنە گەورەكەی بوو، وای لێهات كە خۆی بكوژێ، "مچە سووكە" هەبوو هەر لە كۆیە، زۆر تووڕە و كەللەشەق بوو، مەلا ئەورەحمان وتی: چاكوایە بچمە لای ئەو بمكوژێ! چوو بۆ لای و دەستی كرد بەجنێودان پێی. مچە سووكە بۆی راست بۆوە و بەخەنجەرەوە پەلاماریدا. مەلا ئەورەحمان هەر كە چاوی بە خەنجەر كەوت هەڵهات و هاواری كرد: خەڵكینە بۆ خاتری خوا بیگرن، پەشیمان بوومەوە، گوم خوارد!

* حاجی حەمەدەمینی سیساوە گێڕایەوە وتی:

حەمەداغای "سەرچیا" تۆزێ بزێو بوو. رۆژێک ئەچێتە لای قائمقامی رواندز، ئەویش دەمێكە لەراوی ئەوەدایە كە بیگرێ، ئەوا بە ئاسانی كەوتۆتە بەر دستی! كە دائەنیشێ قائیمقامەكە بەتوركی ئەڵێ: تووتن وێزنە. حەمەداغا هەر راست ئەبێتەوە، خەنجەر هەڵئەكێشێ و یەخەی قائیمقام توند ئەگرێ! قائیقام ئەڵێ ئەوە تۆ شێت بوویت؟! حەمەداغا ئەڵێ: گەلێجار بەو تووتنە گیرایە. قائیمقام ناچار وازی لێ دێنێ.

* كابرایەكی نەمەڵی ئەكەوێتە ناوچەی "كۆیە" و دەچێتە ناوشار شمەک بكڕێ لە هەندێ لە شێوە قسەكردنی كۆیە سەری سر ئەمێنێ هەر لەبەر خۆیەوە دەڵێ:

**كەوتوومەتە ناو كۆیە بەفڕو فێر**
**مانگایان لێ كردووم بەچێر**
**خاكەنازیان لێكردووم بە بێر،**
**ساجیان لێ كردووم بەسێر.**
**ئەمە شار بوو من كەوتمە ناوی**
**وەكو كوێر.**

* قادر حەمین لە شەقلاوا ناردی وتی:

پیاوێكی چیرۆک بێژ هەبوو لە شەقلاوە ناوی "عەول" و خەڵكی سلێمانی بوو، كە چیرۆكی ئەگێڕایەوە

و حەقایەتی ئەخوێندەوە، ئەگەر باس باسی دڵداری و عەشق بوایە ئەمەی خواردەوەی ئەکرد بە سەرەتای حەقایەتەکەی و ئەیووت:

**یادی بە یادی　　تەختی مرادی**
**خواردنی کاردی　　بەناوی ساردی**
**خەوی لبادی　　ئاوی لەدێمکی**
**سێبەری بن کەپکی　　ماچ کردن لەکچی خەڵکی**
**بە مەلا گەرمیانێ　　فەقێ کوێستانێ**
**کیری جووێ　　بەقوونی دیانێ**
**ئەو یار لە ئەستۆی　　ئەو مامۆستایەی کەمن لێم زانی**

ئەمجا ئاغەم بگەڕابای، هەڵکشاوێ، شۆخ و شەنگێ، نەرم و نۆڵێ، خڕ و خۆڵی، بەلوتفی شیرین، بەزمانی شەکرین دایم قەندی لە لێو دەبارێ!

ئینجا ئاغەم مەپرسە! چ ناسک سەنەمێک بوو؟ شۆخ بەدەمێک بوو؟ هەنار مژێک بوو؟ چاوی دەتوت پیاڵەیە، کەپووی دەتووت قەڵەمە، ددانی دەتووت: سەدەفە، چەناگەی دەتووت گۆبە، گەردنی دەتووت بلووری سێ نمەیە، دەیسێ، سینەی دەتووت قاقەزی سەمەرقەندییە، دوو لیمۆی لێ نەسب کرایە، یەکیان تامی شەکری لێ دێ، یەکیان تامی هەنگوینێ!

ئەوجا ئاغەم دەستەکی بەسنگی دەنا، لاقی پێ کردە دەستی دوعاکەری بەیانی، هەر چەندە هەر گێری کرد و وەرگێری کرد کونەکەی نەدۆزییەوە، ئینجا دەستی دە چەکمەجەیەکی راکرد، دووربینێکی هەشت تەرخانی هێنا دەرێ، دایە پێش چاوی، دووری نۆڕی، نزیکی نۆڕی، چۆن دەرەزێکی لە شووشەی دابێ، بەو میساله دەرەزی، ئینجا دوری لە یاقوتی گیرکرد، یاقووتی لێ بە کەرت کرد، رووباری ماوەرانێ و گۆمەتەنگی کرد دوو بەوەدی، یەکێ بەوەکەی خۆی!

خۆ ئەگەر حەقایەت داستانی پاڵەوانی و شەڕ و شۆڕ بووایە، ئەمەی خواردەوەی ئەکرد بە سەرەتا:

ئەو رۆستەمی داستانە، ئەو پاڵەوانی زەمانە، گورزی هەڵسوڕاندو دایهێنا لەگەڵ ئەستێرانی جووت ئەکرد، پرژی ئاگری لێ دەباری، کە لێی داخستی، جووتە چۆکێکی ئەوتۆی لەدەفەی سنگیدا، یەکێ ئەوتۆی لێ بەردا گاسنی تەورێزی پێ سوور بکرێتەوە!

* مامۆستا مەلا ساڵحی کۆزەپانکە لە هەولێر و شێخ بابە عەلی تەکیەیی لە سلێمانی لە مەلایەتی و لەقسە خۆشی و لە تەمەندرێژیدا شانیان ئەدا لە شانی یەک. لە سەردەمی مەلا ئەفەندی هەولێردا بۆ ئەو فەقێیانە، کە لە خزمەتی ئەودا لە مزگەوتەکەی ئەو ئەیانخوێند هەر یەکە مانگێ لەدوانزە رۆپییەی لەکیسەی خۆی بۆ بڕیبوونەوە، سامانی مەلا ئەفەندیش وەکو مەلایەتییەکەی هەر بەناوبانگ بوو.

جارێک مەلا حەمەمین ناوێکی خۆشناوی لە گوندی "هەرتەل"ەوە دێ بۆ هەولێر، بۆ ئەوەی لەخزمەتی مەلا ئەفەندیدا بخوێنێ و مانگی دوانزە رووپییەش وەربگرێ. دامەزران لەلای مەلا ئەفەندی زۆر بەگران ئەکەوت، چونکە تا شوێنی یەکێک خاڵی نەبووایە یەکێکی تر لەجێگای دانەنەمەزرا، ئەم مەلا حەمەمینەش ماوەیەکی زۆر بەمە خەریک بوو شوێنەکەی دەست نەدەکەوت. رۆژێک لەلای مەلا ساڵحی کۆزەپانکە دەردەدڵ ئەکا، کە لەمێژە ئەیەوێ لای مەلا ئەفەندی دامەزرێ، کەچی هەر دانەمەزراوە، مەلا ساڵحیش ئەڵێ: ئەرێ بابە تۆ لە هەرتەل لۆ دەبزوێیت؟ دەرزەکەت لەوێ هەیە، هیچ نەبێ مانگی بایی دوانزە رووپییەش هەر کەران دەگێیت، ئیتر جگە لە نانەکەت.

* کابرایەک ئەچێتە لای مەلا ساڵحی کۆزەپانکە ئەڵێ: قوربان بەدەستنوێژێک چەند نوێژ دەکرێ؟ ئەڵێ: زۆر ئەڵێ، نوێژی سوننەتانیشی پێ دەکرێ؟ ئەڵێ: بەڵێ، هی قەزایانیش؟ ئەڵێ: کابرا هەر زۆری لەسەر ئەڕوا، مەلا ساڵح لە ئاخرا ئەڵێ: دەبڕۆ مردیت مرێ، بەدەستنوێژێک سەد کەرانی پێ بگێ.

* کابرایەکی خۆشناو گوێدرێژێک بار ئەکا لەترێ و ئەیباتە مەخموور بۆ فرۆشتن، ترێ ئەگۆڕێتەوە بەگەنم و بار دائەگری بۆ گەڕانەوە، گەنمەکە گران و قورس ئەبێ کەرەکە نایتوانێ، لەبەر ئەوە کەر لە شوێنی خۆی ناجووڵێ، کابرا کە بە بارەوە دائەگرێ بەلێدان، خەڵکەکەش لەوێ دانیشتوون سەیر ئەکەن ئەم کابرایە زۆری دا، لەم کەرە بەستەزمانە. ئەوانیش دێن تێر و پڕ ئەدەن لە کابرا، هەندێ لەباری کەرەکە کەم ئەکەنەوە و ئەیدەن بە کوڵی کابرا خۆیا ئەڵێن: دە ئێستە بۆ خۆت برۆ ملت بشکێنە، کەر کە بارەکەی تۆزێ

سووک ئەبێتەوە ئیتر ئەڕوا، جا کابرا، کە لە گوندەکە دەرچوو سەری نابووە بناگوێی کەرەکە و پێی ئەوت: هەنووکە چ دەرێیت؟ والێرەش خزمت و هەنە؟!

* لەو دەشتی دزەییە کابرایەک پەلە قەرسیلێکی هەبوو، چوار پێنج کار پێی فێر بووبوون. ئەچوون ئەیانخوارد، کابرا هەر دەری ئەکردن و ئەوان هەر ئەهاتنەوە. یەکێ لە کارەکان کارەپەلێک بوو سەری سپی بوو، کابرا گەیشتە تینی راوی نان و کارە پەلەکەی گرت بەدار هاتە وێژەی وتی:

هەی سەگی سەگبابی لەسەی بوو، ئەوە ئەوان سەریان رەشە و لەهیچ تێناگەن خۆ تۆ سەرت سپییە، ئاخر نابێ تۆزێ شەرم لەو مووە سپییەی سەرت بکەی؟ ئەوا چەند جارە من دەرتان دەکەم، لەباتی ئەوە تۆ پێیان بڕێیت دە حەیبە ئیتر با نەچینەوە، کەچی خۆت پێشیان دەکەوی و دەیانهێنیتەوە. دە بڕۆ بیخۆ لۆ خۆت.

* جارێک لە هەولێر ئاغاکان کابرایەکی کرمانج (کە سمایلی ناو بوو) ئەبەن عەرەقی ئەدەنێ شەوێک و سەرخۆش ئەبێ، ئەمجا ئەچنەوە لە قەلاتێ ئەو شەوە ئەنوون. بەیانی کابرا کە هەڵئەستێ تینووی ئەبێ، سەیر ئەکا شەربەیەک لەسەر بانەکە دانراوە. دانیشتووەکانی قەلات هەر لە ئێوارەوە شەربە ئاو لەسەر ئەو بانە بەرزانە دائەنێن تا بەیانی ئەبێ بە تەرزە سمایل شەربە ئاوەکە ئەنێ بە سەرەوە، تەماشا ئەکا تا ئەو وەختە ئاوی ساردو بەلەزەتی وای نەخواردۆتەوە، ئەڵێ: ئای لە قوونیان بەم هەولێرییان، هەنووکە زانیم کە

لۆچی حەرەقان دەخۆنەوە.

* مەلا ساڵحی کۆزەپانکە و مەلا سمایلی دیبەگە و چەند کەسێکی تر (کە یەکێک لەوانە مام عەزیز بوو) رۆژێک لە دیبەگە بەناو کۆڵانێکا ئەڕۆن. بەلای دیوارێکا تێئەپەڕن، دیوارەکە زۆر بەرز نابێ بەحاڵ سەریان لەو دیوی دیوارەکەوە دیار ئەبێ، دیوارەکەش دیواری حەوشەیەک ئەبێ، منالێک لەودیو دیوارەکەوە هەر ئەگری و دایکەکەی بۆی ژێر ناکرێتەوە، مام عەزیز سەر بەسەر دیوارەکەدا شۆڕ ئەکاتەوە و بەدایکی منالەکە ئەڵێ: دایکم ئەو منالەت بۆیە ئەوەندە ئەگری هەڵبەت "بسم الله"ی لێ نەکراوە!.. ژنەش چاوی لە مەلا ساڵح و ئەوان نەبوو وتی: برام بسم اللەی چی لێ نەکراوە؟. منداڵەکانی مامۆستا مەلا سمایل اعوذ بالله شیان لێکراوە، کەچی هەر دەست بە دەمی سەیدا ئەکەن!

* کابرایەک لەو ولاتی دزەییایەتییە ژنێکی هەبوو، هەر لەگەڵ هەر شتێک ئەبوو، کابرا بەژنەکەی ئەوت: بیڵێم؟! ژنەش لەبەر بیڵێم بیڵێمی مێردەکەی زۆر ئەسڵەمییەوە و لەوانە بوو پاشەڵیشی وادیار بوو پیس بوو! ئەیوت: ببێ و نەبێ، ئەبێ بە شتێکی زانیبێ، بۆیە وا هەموو جار وا ئەڵێ. ئاخری وای لێهات کوناوە جەرگ بوو، رۆژێک لە وزەیا نەما وتی: دە بیڵێ بزانم ئەمە چییە، هەر ئەڵێیت بیڵێم؟ کابرا ئەمجا وتی: دەسا وەڵڵا ئەیڵێم: ئەمەت بمرم! ئەمجا ژنە وتی: دەک بەزیاد نەبێ ئەمە بوو تۆ ئەمە چەند ساڵە منت پێوە کوشتووە!. ئەمری نامری جارِ و جەحەنەم!

* لە گوندی "گردەسۆر" لە ولاتی هەولێر باو وابوو کە میوان روویان ئەکردە ئەوێ یەکێ لە خەڵکی گوندەکە بەسەرە نانی بۆ ئەو میوانە دروست ئەکرد. رۆژێک دەستەیەک لە گوندێکی ترەوە لەگەڵ کوێخادا بەمیوانی چوونە گردەسۆر. ئەو رۆژە مەلای گوند وتی: ئیمڕۆ نۆبەی منە و ئەبێ من نانیان بۆ دروست کەم. چووە ماڵەوە رایسپارد، ئەهلی گردەسۆریش وا پشت ئەستوور بوون کە مەلا نان دروست ئەکا.

ئێوارە نوێژی شێوان کرا لەمزگەوت میوان هەموو بەمەلا فەتاحەوە چوونەو بۆ ماڵەوە. مەلا، کە ئەچێتە ژوورەوە سەیر ئەکا ژن هیچی نەکردەوە مەلا فەتاح دێتە دەرەوە، لاقێکی ئەخاتە ئەم لای چاپێکەوە لاقێکی ئەخاتە ئەولای ئەڵێ: کوێخا چارێکی خۆتان بکەن، مەلاژن هیچی نەکردووە.

* لەو ولاتی باڵەکایەتییە لەگوندی "بێتواتە" مام تەها هەبوو هەر خەریکی ئیش و کاری لادێ بوو، وەکو رەز و باخ و جووت و گا، ژنێکی هەبوو ئەویش خەریکی تووتن و مەڕ دۆشین و نان و هەویر بوو، هەموو عومریان بەمجۆرە پێکەوە رابوارد بوو. رۆژێک مام تەها سەیری کرد وا ژنەکەی بارێکی بار کردووە و بەهەچە هەچە کەوتۆتە شوێنی، لێی پرسی: ئافرەت ئەوە بۆ کوێ ئەچی؟ وتی: وەڵڵا پیاوەکە ئەچم بۆ سەر ئەو قسنە و ئەم باوەشەی بەدیاری بۆ ئەبەم، بەڵکو دوعام بۆ بکا لەلای خوا کە خوا بمکا بە پیاو، من ئەم عەزیەتەی بەسەر شانمەوەدیە بۆم هەڵناگیرێ. مام تەها تۆزێ راما و

وتی: ئافـرەت! واز بێنە، لەم کـەلی شەیتانە وەرە خوارەوە، ژن بی و پیاو بی، من تازە پێت فـێـربووم هەر ئەتگێم!

* گەلێ ناوداران و شاسواران و خـاوەنی دیواخـان لەو وڵاتی کـوردەوارییـە هەڵکەوتوون، بەڵام ناویان لەگەڵ لەشیانا چووەتە گۆڕەوە! "معن ابن زائدە" لە نەتەوەکی تردەوە گەلێ قـەڵەمی بۆ نانبدەیی کـەوتۆتە کار، بەڵام لە کورددا کەسێک نەبووە کە کەسێک زیندوو بکاتەوە!

حەمەی باجی هامینە هەبوو، ئەم حـەمـەیە لە سـەردەمی تورکـەکـانا زەفتییـە، پاشان دەرچوو بوو پیاوی مـاڵی خۆی بوو، تەمـەنێکی باشی رابوارد بوو، تا ئەم دەورەی دوایەش هەر مابوو وتی:

گـەلێ پش گـرانی گـەورە، رێم کەوتە "کۆیە" حەمە ئاغای کۆیە بوو بووە پیاو، وردە وردە ناوی دەرئەکرد، دیوەخانی راکێشابوو، هەموو رۆژێ نیـوەرۆ و ئێـوارە چەند سینی ئەهاتە دیوەخـان، هەر بەدوو زەلام لەسـەر سینەیەک دائەنیشتن، پلاو و چێشتی شلە لەسەر سینییەکان بوو، ئەم جۆرە شتانە لە هەموو دیوەخانێک هەبوو، بەڵام لەدیوەخانی حەمەغادا ناسراو و نەناسـراو و جـیـا نەئەکـرایەوە، ئەو مـیـوانە ناسـراو بووایە یا نەناسـراو، خزم بوایە یا بێگانە، ئاغا بووایە یا سـەپان، سـوار بووایە یا پیـادە، لە دیوەخـانا بەیەک چاو سـەیر ئەکـران ئالیکیش بۆ وڵاخ یەک ئالیک بوو، لێپـرسـینەوە بۆ هیچ شـتێـک نەبوو، وتی:

لـەرێـگـایەکی دوورەوە چووم بۆ کـۆیە، بووم بە مـیـوانی دیوەخـانی حـەمـەئاغـا بەبێ ئەوەی بمناسن، مـاینێکم لەژێرا بوو، لەپاش چەند رۆژێک مـاینەکەم تۆپی، لە دەوڵەتی دنیـاش لەو مـاینە بەولاوە هیـچی تر شـک نـابـەم، زۆر بـۆی کـــــەوتمە پەرۆشەوە، تا ماینەکەم مابوو هەموو رۆژێ ئەچووم تۆرەکـەم ئەبرد کـا و جۆکە وەربگرم، هەموو رۆژێ بەیانی ئەمـجـا هێنام فـرۆشـتم، بەو پارەیە مـاینێکی ترم کـری. لەم مـاوە دوور و درێژەدا یەکێ نەبوو لێم بپـرسـی بڵێ ئەرێ برا تۆ چیت؟ چ کـەسـیت، لە کـوێوە هاتووی! کـە بوومـەوە بەسـوار ئیتر هاتمە سەر ئەوە برۆم، چووم بۆلای حـەمـاغـا دەسـتم مـاچ کـرد، وتی: هەرامە تۆ کێیت؟ حاڵەکەی خۆمم بە تەواوی بۆ گـێـڕایەوە، وتم: خـوا ئەم دیوەخان و وەجاخە تێک نەدا، وتی: هەرامە بۆ ئەرۆی؟ دانیشە لەلای من، وتم: قـوربان ئەبێ بچـمـەوە بۆ وڵاتی خـۆم و بۆناو مـاڵ و منالم، وتی: هەرامە ناوت چییە؟

وتم قوربان حەمەی باجی هامینەم پێ ئەڵێن: وتی رۆڵە ئەم بەینە بە نەناسراوی دانیشتووی ئیمشەویش بە ناسراوی دانیشە، و تۆش بەڵێ.

بەیانی دەمە و چێشـتـەنگاوێک بوو، بانگی کـردم هەرامـەکـەی سلێمانی، هەستام چوومە بەردەمی و وتم بەڵێ قـوربان، وتی: رۆڵە تۆ ئەو مـاینەت وای لێـهـات بۆ لە هەوەڵجـارەوە دەنگت نەکـرد وا ئەم بەینە خـۆتت بەمـاڵ و منال دوور خستەوە! دەستت بێنە. مستی هێنا شتێکی کردە دەستم و وتی: ئەوەش بەرە بۆ مـاڵ و منالەکـەت، هەر جارەش هامشۆمان بکە. دەستم ماچ کـرد و هاتمە دەرەوە، کـە شـتـەکـەی مستیم بژارد سەیرم کرد پەنجا لیرەیە. وتی:

هەر جـارەش هاتوچۆم ئەکـرد. لەساڵی گرانییە گەورەکەدا کە ئەو قات و قڕە بوو کە هەبوو، حەمەغا چەند مـەنجـەڵی زنجیـری لەمل ریز ئەکـرد، هەمـوو ئێـوارەیەک هەرچی هەژار و بێـدەسـەڵاتی کـۆیە هەبوو (تەنانەت هی لادێ نزیکەکـانیش) ئەهاتن بۆ قەرەوانە شۆربایان ئەبرد و هەریەکە نوێردووە نانێکیان ئەدانێ، ئەمـە حـاڵی حـەمـەغـای کـۆیە بوو تاگرانییەکە بەسەر چوو.

* حـاجی مـەلا سـاڵحـێکی هەولێری هەبوو پیاوێکی دەوڵەمەند و بەدەسـەڵات بـوو. رۆژێـک لـە کـۆڵانێکا رووپییـەکی لێ ون ئەبێ، زۆر بۆی ئەگەڕێ نایدۆزێتەوە. حەوت هەشت منال کـۆ ئەکـاتەوە، پێـیـان ئەڵێ: بگەڕێن بۆ ئەو روپیـیـە، هەرکـەس دیەوە دوو رووپیـیـەی ئەدەمێ! منداڵان ئەگەڕێن، یەکێکیان ئەیبینێتەوە ئەیداتەوە بەحاجی مەلا سـالح، ئەویش لێی وەرئەگـرێ و ئەیخاتەوە باخەڵی، دەست ئەبا دوو رووپیـیـە ئەدا بە منداڵەکـە و لێک جیا ئەبنەوە، لێیان پرسی حاجی مەلا تۆ ئەمـە چی بـوو کـردت، دوو رووپیـەت دا بە رووپیـەیەک؟! وتی: من مـەبەسـتم رووپیەک نەبوو، بەڵام تا من ماوم هەر جار بگەیشتمایە ئەو شـوێنە بەدڵـمـا ئەهات کـەمن رووپییـەکم لەم شوێنەدا ون کردووە، چاوێکم بۆ ئەگێڕا! ئێستە خۆمم لەوە رزگار کرد.

* لەو خـۆشناوەتیـیـە پیـاوێک هەبوو "هەمـزۆکـە"یان پێ دەوت، ئەم هەمـزۆکـەیە چوو بوو بۆ کـاروانی بۆ

ئەو دەشتی دزەییە بۆ ترێ فرۆشتن ترێکەی نە ئەفرۆشرا. لە گەڕانەوە زۆر دواکەوتبوو، رۆژێک ژنەکەی بەکاروانچی ترا خەبەری بۆ ئەنێرێ کە بگەڕێتەوە، ترێ ئەفرۆشرێ نافرۆشرێ قیروسیا ماڵ بێ خاوەنە با لەمە زیاتر دوا نەکەوێ. هەمزۆکە ئاگری جگەر و ئاگری گێزەر هەڵی ئەگری، ترێ بەجێ دێڵێ و سواری نێزەکەرەکەی ئەبێ و ئەگەڕێتەوە، بە تاو ئەڕوا لە رێگا هەر جارە بەهەردوو پێ ئەماڵێ بەژێر سکی نێرەکەرەدا بۆ ئەوە خێرا بڕوا، جار جارێ پێی ئەکەوێ لە شتێکی رەپی رەقی درێژ بەلایەوە سەیر ئەبێ، لای وا ئەبێ سەری قەیاسەکەیە شۆڕ بووەتەوە، دەست ئەبا هەڵیگرێتەوە و بیبەستێتەوە کەچی کێری رەپی نێرەکەری دێ بە دەستەوە! ئەمەش ئەوا لەنێزیکی ئاوایی و لای ماڵەوە روو ئەدا.

هەمزۆکە توورە ئەبێ و دائەبەزێ و دێتە وێزەی کەری بەستەزمان ئەڵێ: دایکت دەگێم ما بەشوێن تۆیانا ناردییە یا من؟ وا بەم جۆرە ئیرەقت کردییە! چما تۆ هەمزۆکەیت و لۆ لای "سەمەنێ" دەچییەوە! من هەمزۆکەم تۆ چ رایەت دەکەوێ دەست لۆ سەمەنی درێژکەی؟ چما داکو ناگێم ئوی من گۆتم تۆ بیرێیت!

سەمەن ژنی هەمزۆکە بوو.

* جەمیل ئاغای حەوێزی لەکۆیە پیاوێکی بەنان و خوان و دیوەخانگێڕ بوو هێشتا ئەم پاکەت و ماکەتە دانەهاتبوو، باو هەر باوی جگەرەی قامیش بوو، جەمیل ئاغاش دوو جۆرە جگەرەی لە باخەڵێ بوو، جۆرێکی تووتنی پێشەمە بوو، ئەوە هەر بۆ خۆی بوو، جۆرەکەی تری تووتنی کۆیە بوو.

کە میوانێک ئەهات دەستی ئەبرد لە تووتنەکەی کۆیە جگەرەکی ئەدایە و لە پێشەمەکەش جگەرەیەکی بۆ خۆی دەرئەهێنا، خەڵکیش وایان ئەزانی هەردوو تووتنەکە هەریەکە، بەڵام لە ئاخرا هەستیان پێ کردبوو کە ئەمە وانییە! رۆژێک لە دیوەخان دائەنیشن و لەسەر عادەتی جاران جگەرە دەردێنێ بۆ میوان وجگەرەیەکیش لە پێشەمەکە بۆ خۆی دەردێنێ، قوتووە جگەرەکەی خۆی کەوتبووە سەرگۆی مەمکی، لەو کاتەدا کە ئەینێتەوە بە یەکا، بەر مەمکی ئەکەوێ زۆر عەزیەتی ئەدا، لە تاوانا ناوچاو دێنێتەوە یەک! هەمزەی خۆمان لەوێ ئەبێ هەستی پێی ئەکا کە چ باسە ئەڵێ:

ئاغا! جگەرەیەکمان بدرێ و خۆت بەو دەردە مەبە، جگەرەیەک ئەوەی ناوێ کە پیاو خەریکی ئەو فرت و فێڵە بێت بۆی و مەمکی خۆی بۆی بریندار بکا! جەمیل ئاغاش ئەڵێ: هەمزە مردووت مرێ جارێ وەختی ئەو قسانە نییە. هەمزەش ئەڵێ: ئاخر ناڵێم!

* مەلا پیرۆت لەدێی بێتواتە بوو، شەوێ لەگەڵ مەلاژنا ئەکەونە گەمە و گاڵتە. کە خۆت ئەزانی داخوازی ژنیش هەر دوایی نایە، شتێکی بۆ جێبەجێ ئەکەی دوو شتی تری دێنێتە سەر، لەو وەختەدا مەلاژن هەر داوای کراس و کەواو چارۆکەی ئەکرد، مەلا پیرۆت هیچی بۆ نەمایەوە ئەوە نەبێ دەستی برد مێزەرەکەی لە تەنیشتی مەلا ژنەوە داناو وتی: مەلاژن بیکە بەخاتری ئەم مێزەرە وازم لێ بێنە و لەمە زیاتر سەرم لێ تێک مەدە!

* مەلا عەلی قوچە بلباسی کتێبێکی لەبەر دەستا بوو، وتم: ئەوە چییە؟ وتی "قصص الانبياء "وتم: کتێبێکی باشە بۆ وەعزکردن وتی: بەڵێ کتێبێکی چاکە، بەڵام خەڵکەکە زۆر سەگ بوون بڕوای پێ ناکەن!

* کابرایەک هەبوو ناوی "براپۆکە" و خەڵکی کونەفلوسەی خۆشناو بوو. رۆژێک چوار بار ترێ دێنێ بۆ هەولێر، ترێکە ئەفرۆشێ و ئەگەڕێتەوە، سواری یەکێ لە گوێدرێژەکان ئەبێ و سێ کەری تری ئەداتە پێش خۆی، لەو سەرەو ژوورکەیەی لای پیرمامدا سەیر ئەا وا سێ کەری لەپێشە، ئەڵێ من کە هاتم بۆ هەولێر چوار بوون، ئێستا مابوون بەسێ؟! دائەبەزێ ئەیانژمێرێتەوە سەیر ئەکا چوارن، سوار ئەبێتەوە ئەبنەوە بەسێ! ئەڵێ: دەسا هەولێرییان کەرێکیان لێ دزیمە.

دائەبەزێتەوە ئەیانژمێرێتەوە چوارن، سوار ئەبێتەوە سێن. ئەڵێ یارەبی بە گوناحانم لێ نەگری، هەولێرییان نەیاندزییە، ئەمە ئیشی ئەم پیر مامەیە، پیر بووە ناتوانێ بڕوا لۆ عەجان، کەر لەمن دەدزێ، ئەمە لای خۆی شێخی دوو گردانە کەچی دزیش دەکا! لەو سواربوون و دابەزینە کابرایەکی ماوەرانی چاوی لێ ئەبێ ئەچێ بەلایەوە پێی ئەڵێ: ئەوە لۆ وادەکەی؟ ئەڵێ: چوزانم، کە زانیم بردییە لۆ هەولێر، چوار بوون، کەچی هەنووکە دەمێ چوارن و دەمێ سێن! ئەڵێ ئەی ئەوەی خۆت حیساب ناکەی کە سواری بووی؟! ئەڵێ: دەک مارت بەقوڕ نەگیرێ، ئەوە کو زانیت؟ دەسا دەبێ پێم بڕێی من

كەینێ دەمرم، دیارە تۆ هەموو شتان دەزانی؟ كابرای ماوەرانی بەلایەوە زۆر سەیر ئەبێ، ئەڵێ: ئەو كەرەی سواری بوویت هەر وەخت سێ ترو نیوی كەند لەم هەورازەدا، تۆ دەمریت! لێک جیا ئەبنەوە.

برایمۆک زۆر ناروا پیرە نێرەكەر ترێک ئەكەنێ! كابرا ئەڵێ ئەوا هەندێکی چوو، ترێکی تر و ترێکی تر، ئەڵێ مایەوە سەر نیوەكەی! زۆر نارِوات كەرەكە تسێک دەكەنێ، كابرا ئەڵێ ئەوا تەواو من مردم. لەكەر دائەبەزێ و لەو ناوەدا لێی رائەكشێ و كەر بەو ناوەدا بڵاو ئەبنەوە. لەلای ئێوارەدا كابرایەک بەوێدا تێ ئەپەڕێ، سەیر ئەكا وا زەلامێک لەوێدا كەوتووە، ئەچێتە سەری نووكە پێیەكی تێوە ئەژەنێ، ئەڵێ كابرا بۆ لێرە كەوتووی! ئەڵێ لێم گەڕێ من مردیمە! ئەڵێ چۆن! ئەڵێ: خدری زیندە پێی وتم: هەرودخت كەرەكەت سێ ترو نیوی كەند تۆ ئەمری، هەنووكە ئەو كەندی و من مردم! پێی ئەڵێ: هەستە هەی كەر، هەستە هێشتا ماوتە بمری. هەڵی ئەستێنێ، كەرەكانی بۆ كۆ ئەكاتەوە و ئەڵێ: برۆ لەماڵەوە بمرە!

* دوو كابرای "سیان" ئەبن بەهاوڕێ و ئەچن بۆ هەولێر، لەرێگادا هەروا دەست ئەكەن بە قسەكردن بۆ ئەوە رێگاكە بەقسەكردن ببڕن، یەكێكیان ئەڵێ: ئێستە لەم رێگایەدا كۆیەڵەیەک لێرە ئەدۆزینەوە. بەشی ئەكەین لەبەینی خۆمانا، من بەشەكەی خۆم ئەچم رانەمەڕێکی پێ ئەكڕم، پێوە بەتەواوی ئەحەسێمەوە. ئەوەی كەشیان ئەڵێ: دەسا من بە بەشەكەی خۆم چەند گورگێکی پێ پەیدا ئەكەم بكەونە ناو مێگەلەكەت بیانخۆن، تو لە باب كو مەڕ رائەگری؟! لەسەر ئەمە ئەبێ بە شەڕیان و سەر و گوێلاكی یەک ئەنێنە یەک! لەو كاتەدا سەیر ئەكەن پیاوێکی ریشسپی لەرێگای خۆشناوا سواری كەرێک بووە و جەوەنەیەكی لەبەر دەمایە و هات وتیان: با ئەو پیاوە شەرعمان بكا، بزانین كامان لەسەر حەقین! كەر سواریان راگرت و كێشەكەی خۆیانیان بۆ گێڕایەوە. ئەویش تووڕە بوو، هەر دەستی برد پشكی جەوەنەكەی كردەوە دۆشاوی تێدابوو، دۆشاوی بەو ناوەدا هەڵڕشت و وتی: خودا خێنم وەكی وی دۆشاوەی لەسەر وی عەردی بڕێژێ، برام چ هەقرتان نینە و شێتن!

* مەلا سالحی كوزەپانكە لەبارەی حەجەوە وەعزی دائەدا، كە هەركەسە جارێک بروا بۆ ماڵی خوا، خوا لە هەموو گوناهی خۆش ئەبێ، حسەینی مەلا لە كۆڕی وەعزەكەدا بوو وتی: مامۆستا ئەگەر یەكێک نەیبووبێ چی بكا؟ مەلا سالحیش وتی كە نەیبوو هیچ با هەر لۆ خۆی گوناهان بكا! وتی: ئەگەر خانوویەكی هەبوو، خانووەكەی بفرۆشێ و پێوە بچێ بۆ حەج، یا هەر گوناهان بكا؟! وتی: حسەینی مەلا خۆمن كفرم نەكرد ئەو قسەیەم كرد، دەبا بیفرۆشێ و بچێ حەجی خۆی بكا! ئەمجارە وتی: توخوا مەلا سالح! من بەتۆ ئەرێم، ئەوا كابرایەک خانیەكەی فرۆشت و چوو لۆ حەجێ، ئەوا حەجی كرد یا دێتەوە، یا نەیەتەوە. ئەگەر هاتەوە لەكوێ دانیشێ؟! ئەگەر نەهاتەوە ئەبێ لە عەجێ لەماری خودادا ئەبێ، ئەو وەختە خودا لێی ناپرسێ: ئەرێ هەی كەر! تۆ چوویت خانی خۆت فرۆشتییە هاتوویت لێرە لەبن پاری منا دانیشتییت و منەتی من هەردەگری، دە هەستە هەڕو لۆ كوێ دەچی بچۆ! كە هاتەوە لێرەش خانی نەمایە، دەست لە گونانی بەرەو ژێرترا! ئەمە رێگایە تۆ لۆ ئەو غەریبەی دائەنێی؟! مەلا سالحیش وتی:

حسەینی مەلا! چووزانم تۆ بوویتە محامی ئەو كابرایە، دەبا نەچێت و ملی هورد ببێ، هەر لۆ خۆی گوناهانی بكا تا چاوی دەردێت، وەدەزانێ حەج لۆمن دەكا؟!

* حسەینی مەلا جارێک ئەچێ بۆ حەج و هەموو شتێکی حەجەكە بەجێ دێنێت، پاشان سەر بەرز ئەكاتەوە ئەڵێ: خودایە چ خزمەتی دیكە ماینە تا بیكەین! ئەگەر نەماینە ئەوا خواحافیز!

* لەگوندی "عالڵا" مام پیرداود ئەچوو بۆ شار، ژنان دەوریان لێدا، هەریەكە چەند دراوێکیان دایە بۆیان بدات بەشت، ژنێک لەناو ژنەكانا ئەویش چوو بەلای مام پیرداود و وتی: مام پیرداود بە سەدەقەی سەرت بم، وی مەجیدییەم لۆ بەرە بۆم بدە بەدوو گەز جانگ لۆ ئاوەركراس چم نینە!

مام پیرداود دوو گەزە جانگی لۆ هێنا، پلكە هامێن ئاوەر كراسێکی زۆر تەسک و تروسكی لێكرد و هەندێكیشی مایەوە، دای بەسەربا و چوو لەناو ژنەكانا دەستی كرد بە شایی و ئەیوت: هاوەر كراسم بە هاوەر كراستان، چەقەڵانەشم بە بەرتان!

* مەلا محەمەد دەرگەڵەیی هەبوو، مەلا بوو لە گەڵاڵە، ڕۆژی جومعان کە سەلامی جومعەی ئەدایەوە، هەڵئەسا ڕووی ئەکردە خەڵکەکە و ئەیوت: سەگبابینە چاوان زەق مەکەن، کیر و ڕدق مەکەن و لە قوزی ژنی خەڵکی ڕۆمەکەن!

* کوێخا حەوێزی شاخەپیسکە دایکی ئەمرێ، پوورە مەیرەم هەبوو ئەچێ ئەیشواو هەمووجار بەکوێخا حەوێزی ئەوت: کوێخا دایکی ڕەحمەتیت ژنێکی بەهەشتی بوو. لەو وەختەدا کە ئەمشۆرد هەر پێئەکەنێ! چەند جارێک ئەمەی وت، هەرجارەش کوێخا حەوێزی لەبەر خاتری قەبرەکەی دایکی شتێکی ئەدایە، لەئاخرا پوورە مریەم لەتامی دەرکرد! ئاخرجار ئیتر وتی: پوورە مریەم! وازبێنە، ئەوە بەقوزی تۆ و ئەقڵی من پێئەکەنی. ئەگینا کەی ئەو شوێنە شوێنی پێکەنینە؟!

* کابرایەکی کۆیی "عەزیز"ی ناو بوو، جارێک ئەچێتە شاخەپیسکە لەماڵی ناسراوەکیان نان و ماست ئەخوا، دەم و لێوی پاک ناکاتەوە، ماستەکە هەروا بە لێوییەوە ئەبێ، بەو جۆرە ئەچێتە لای کوێخا حەوێز، کوێخا حەوێز لێی ئەپرسێ: عەزە ئەوە چیت خواردووە؟ ئەڵێ: کوێخا وەڵڵا کە گەیشتمە جێ لەماڵی خانەخوێکەما مریشکێکیان بۆ کوشتبوومەوە، بەبێ تۆ ناخۆش مریشکم خوارد. کوێخا حەوێزیش ئەڵێ: وەڵڵا ڕاست ئەکەی، ئەوەتە ڕیقنەکەی بەبەر کولانەکەوەیە!

* مەلا محەمەدی دەرگەڵەیی لە گەلاڵە ڕۆژی جومعان خوتبەی ئەخوێند، کە ئەچووە سەر مینبەرەکە دارێکی ئەگرت بەدەستەوە لەکاتی خوتبە خوێندنەوەکەدا ڕایئەوەشاند. پێیان ئەوت: مامۆستا! خەتیب کە دەچێتە سەر مینبەر شیر ئەگرێ بە دەستەوە، تۆ لەباتی شیر دارێک ئەگری بەدەستەوە ئەوە بۆچی؟ ئەویش ئەیوت:

ئەم تولەبابانە پێویست ناکا من شیریان بۆ بگرم بەدەستەوە ئەگەر بەگوێیان نەکردم بەم دارە سەر و بەچکیان ئەنێمە یەک و ئەیانترێنم بەگۆڕی بابیانا.

* لە گوندی "وەرتێ" لەو خۆشناوەتییە خەڵکەکە کۆبوونەوە وتیان: بچین بۆلای میر بۆ دیدەنی و ئەبێ دیاریشی بۆ بەرین. هاتنە سەر ئەوەی کە "نێری"یەکی بۆ بەرن، بەڵام "حەچە" بەبێ دەستنوێژ بچێتە خزمەتی میر نابێ! هێنایان خستییانە حەوزێکەوە لە ئاوەکەیان هەڵئەکێشا، هەر کە دەریان ئەهێنایەوە "نێری" خۆی ڕائەوەشاند و بۆ ئەوەی ئاوەکە لەخۆی بتەکێنێ و تریی ئەکەند! ئەیانووت: پەککو دەستنوێژی شکا!

بەهەر جۆر بوو دەستنوێژیان پێگرت و ترکەندن دوایی هات. بردیان بۆ میر و میریش سەرو جووت کەوشی سووری بەخەڵات دانێ و گەڕانەوە، لە گەڕانەوەدا هەموو لەسەر تاشە بەردێک دانیشتن و قاچیان شۆڕ کردەوە سەیری کەوشەکانیان ئەکرد. پاشان سەریان لێ تێکچوو و نەیانزانی کامە قاچی کامیانە تا هەڵبیکێشنەوە، هەروا ڕەپ لەوێ مانەوە و ڕۆژ درەنگ بوو و لە ئاوایی چاوەڕیان ئەکردن، لە ئەنجاما هاتن بەدەنگییانەوە سەیریان کرد هەموو لەوێ وشک دانیشتوون و قاچیان ڕاکێشاوە. ئەوانیش سەریان لێتێکچوو و نەیانزانی چۆنیان هەڵسێنن!

ئەمجا "مامۆتک" هات دارێکی هەڵگرت یەکە یەکە ئەیدا بە قاچیانا، دیارە ئێشی پێ ئەگا، قاچی ئەجوولێنەوە، مامۆتک ئەیگرت و بەخاوەن قاچی ئەوت: ئەوە قاچی تۆ! ئەویش هەڵی ئەکێشایەوە و ئەڕۆیشت، کە هەموو ڕۆیشتن، وتیان: ئەگەر مامۆتک نەبووایە ئێمە لێرە هەموو ورچ و دەعبا ئەیخواردین!

* هەر لەگوندی "وەرتێ" دوو کەس هەڵئەستن ئەچن بۆ ڕاوە مێش (مەگەز). گەلێک ئەسووڕێنەوە هیچیان دەست ناکەوێ، لە ئاخرا لەسەر کانییەک دائەنیشن، کت وپڕ مێشێک ئەنیشێ بە ناوچەوانی یەکێکیانەوە. ئەوەی کە مێشەکەی بە ناوچاوەوە نیشتۆتەوە بەبێ ئەوەی قسە بکا "فیتۆیەک" بۆ کابرای هاوڕێی دائەهێڵێ و بە پەنجە ئیشارە ئەکا بۆ ناوچەوانی خۆی و ئەڵێ ئەوە مێشێکە بیکوژە! کابرای هاوڕێی فیشەک ئەخاتە بەر تفەنگ و تەق گوللەیەک ئەنێ بە ناوچەوانی کابراوە و ئەیکوژێ! دیارە لەو وەختەدا دەم و لێوی لێک ئەبێتەوە و ددانی دەرئەکەوێ. ئەمجا ئەویتر پێی ئەڵێ: ما گرەکەی ئەکەی؟ مالێم نەدایە! یانی بۆچ پێئەکەنی؟ بۆچی لێم نەداوە؟!

* لە "وەرتێ" ئەڵێن هەموو شت ئەچێنرێ چما خوێ ناچێنرێ؟ چەند کەسێک ئەچن خوێ ئەبەن ئەیپرژێنن بۆ ئەوە بروێ! پاش ماوەیەک ئەچنەوە بزانن شین نەبووە!. دیارە هیچ دیار نییە، یەکێکیان بەردێک لەناو

وەردەکە هەڵئەگرێ بۆ ئەوە بزانێ کە خوێکە چەکەرەی کردووە یان نا؟ بەرێکەوت دووپشکێک لەژێر بەردەکەدا ئەبێ بە چەکەری ئەزانێ! هەڵی ئەگرێ و ئەیبا بۆ دەمی بۆ ئەوە بیچێژێ! دووپشک ئەدا بەسەری زمانییەوە! ئەڵێ: پەکوو! ماشەڵڵا چەند سوێر و تیژە، چ بران ناخورێ!

* بەگە میران هەبوو رۆژێک لە هەولێر لەگەڵ "معلم"ێکدا ئەبێ بە شەڕیان و شەڕەکە زل ئەبێ. پاشان بە "معلم"ەکە ئەڵێ: سەگباب تۆ کو لەگەڵ من شەڕ ئەکەی؟ من ژنەکەم "معلم"ە هەموو شەوێ جارێک سواری ئەبم!

* رووپیە لەعێراق باوی هەبوو، دینار هات بەسەریا، کابرایەکی برینپێچ هەبوو لە هەولێر، پیاوێکی بەدیمەن و کەڵەگەت بوو، هەموو سەرشان و بەرۆکی خۆیشی پڕ کردبوو لە نیشان و جوقەقە. لەهەر شوێنێک دائەنیشت، جا ئەو شوێنە چاخانە یا چێشتخانە بووایە، پارەی دانیشتووەکان هەمووی ئەو ئەیدا، لەم رووەوە حەماغایەک بوو بۆخۆی.

جا لێیان ئەپرسی کاکی خۆم، تۆ ئەم پیاوەتی و بەخشندەییە ئەکەی، مانگانەکەت چەندە وا بەم جۆرەی لێ ئەکەی؟ ئەویش خۆی نەئەشکاند ئەیوت: من و رەئیسی سحە پەنجاو پێنج دینار مانگانەکەمانە! بە مەرجێ مانگانەکەی رەئیسی سحە پەنجا دینار بوو، هی ئەو پێنج دینار بوو، بەڵام وای بەلاوە گەورەیی بوو کە خۆی بخاتە پاڵ ئەو!

* لە گوندی "گۆمەشێن" لەو خۆشناوەتییە مام ئەولێ کچێکی هەشت ساڵانی هەبوو، ناوی "خەجە" بوو، کوڕێکی برازاشی هەبوو داوای خەجەی ئەکرد کە مامی بیداتێ، خەجەش راوەستابوو، مام عەوڵاش ئەیوت: کوڕم! زۆر مناڵە چۆن ئەبێ؟ خەجە لەو ناوەدا هەڵیدایە وتی: بەخوای بابە، هیچ پەک لەمن ناکەوێ! مام عەوڵلای هەژار دەمی بوو بەتەڵەی تەقیوەوە، ناچار دایە و راستیش بوو خەجە چ پەکی پێ نەکەوت!

* عەزە شوکێ هەبوو، جارێک رێی ئەکەوێتە ئەو ناو دزەیایەتییە، ئەچێتە ماڵی حاجی سەلیم، ماڵی حاجی ساوەریان ئەبێت، حاجی و عەزە پێکەوە دائەنیشن، حاجی ژن ساوەری لێنابوو، چووبوو بۆ کانی ژنان بۆ ئاو، عەزەش بەپەلە بوو نەیەویست بڕوا، حاجی کوڕێکی لەماڵ بوو، وتی: رۆڵە هەستە لۆی تێکەو لۆی چەورکە.

عەزەم عەزە بوو هەر هەستا لووس و باریک رۆیشت. حاجی سەلیم وتی: بۆ کوێ؟ عەزەش وتی: نە ئەم نانە ئەخۆم نە بشمگێن، لۆی چەورکە مەعنای چی؟!

* کابرایەکی دەوری شاخەپیسکە ژنێکی خۆشناوی هێنابوو، ژنەکە ئەوەڵ شەو (بلامانێ) یەکێکی پیاهێنا! زۆر تەریق بۆوە، مێردەکەی دڵی دایەوە وتی: قەیدی نییە شتی وانیشانەی ئەوەیە کە ساڵەکەی خۆش ئەبێت! ژنە تۆزێ کرایەوە و شەرمی شکا وتی: پیاوەکە کەواتە با یەکێکی تریش بکەنم! پیاوە وتی: ئافرەت نا، مەکە عەمارەکە جێی هیچی تری تێدا نابێتەوە!

* کابرایەکی سیان ژنێکی هێنابوو، شەوێ کە ئەچێتە لای ژن، تەماشا ئەکا ژنە بەری خۆی پاک نەکردۆتەوە! پێی ئەڵێ: ئافرەت! ئەوا من مێرد و مەحرەمتم قەیناکا، بەڵام ئەگەر بەم حاڵە چوویتە لای یەکێکی نامەحرەم و بێگانە هیچ خەجاڵەتی ناکێشی و ناڵێیت عەیبە!

* شێخ محەمەدی بالیسانی وتی: مەلا مەجیدی شەقڵاوە گێڕایەوە وتی:

مەلا مەحمودی مەزناوا لەوەختی خۆیا لەگەڵ چەند کەسێکا بەکاروان ئەچن بۆ شوێنێک، رێگاکە نازانن، دەروێشێک هەبوو لەگەڵ خۆیانی ئەبەن بۆ شارەزایی، دەروێش هیچی نەخواردووە و ناخوا، وای لێدێ لە برسانا پەکی ئەکەوێ، هەرچەندە لەگەڵی خەریک ئەبن هیچ ناخوا، ئەڵێن: بۆچ ناخۆی؟ ئەڵێ: شێخ فەرموویەتی لەکسمی دەستی خۆت نەبێ، نابێ شت بخۆی. ئەوانیش سەیر ئەکەن وا کابرا بەلادادێ و ئەمانیش لەو رێگا چۆڵەدا پەکیان ئەکەوێ.

مەلا مەحموود ئەڵێ: باوکم وەرە مادام وایە بەکرێت ئەگرین بەدوو نان، بچۆ ئەو کەرە بگێ. کابرا رازی ئەبێ، بەڵام لەبەر برسییێتی ناتوانێ بچێ بەلای کەرەکەوە، هەڵی ئەگرن و ئەیبەن بەلای کەرەکەوە، وانێکەکەی ئەخەنە دوا براوی کەرەکەوە، ئەویش هیچ هۆشی لای خۆی نییە. لەپاش بەینێک کە گەرمایی ئەگاتێ و تۆزێ هەستی پیا دێتەوە ئەڵێ: وازبێنن خێرتان بنووسێ، ئیتر خۆم خەریک ئەبم!

* کابرایەک لەو دەوروبەرەی دزەییە ژنێکی هەبوو "گوستە"ی ناو بوو، تۆزێ پیویان هەڵواسیبوو، هەر

وەخت کە گوستە شیوێکی لێ بنایە، پیوەکەی ئەهێنا لەباتی تامە چێشت جارێک ئەیکرد بە مەنجەڵە شێوەکەدا و خێرا دەری ئەهێنایەوە!

ڕۆژێک میوانیان هاتبوو، گوستە ساواری لێنابوو و هێنای داینا. پیاوەکە وتی: ژنەکە شیوەکە هیچ چەور نییە. ژنە ساوارەکەی کردەوە مەنجەڵەکە و چوو جارێکی کە پیوەکەی تێ هەڵسووراند و وتی: تۆ بەزەییت بە خۆتا نایەتەوە، ئەوە برامە لۆچ نەخۆش بکەوێ؟! دە با سکتان بچێ! پاشان نەریتی گوستە سووچی تۆ بوو!

* کابرایەکی خۆشناو جووتێ پێڵاوی تازەی هەبوو، چوو بۆ کاروان بۆ ئەو دەشتی "بێتوین"ە تووشی چڕو دڕک و داڵێک بوو و پێڵاوەکانی داکەند و بەپێی پێ خاوس نایەمل دڕک و داڵەکە. کتوپڕ چقڵێک ئەچەقێ بەژێر پێیدا لەسەر پێیەوە دەرئەچێ! لەو کاتەدا کە چقڵەکەیان لەپێ دەرهێنا ئەیوت: یارەبی شوکر هەر باش بوو پێڵاوەکانم لەپێدا نەبوو ئەگینا کونی تێ ئەبوو!

* لەو دەشتی دزەیی و گەردییە لە گوندی "گێژی" ڕۆژێک دەنگ بڵاوبۆوە کە لە گوندی "گراوێ" بزنێک دەستی خستۆتە بناگوێ و حەیرانان ئەڵێ! ئەم دەنگە گوندەکەی شڵەژاند. سەید عەزیز هەبوو وتی: تا ولاغم بۆ بێنن بچم بۆ گراوێ بزانم وایە؟! وتی: سوار بووم لەکاتی عەسرا گەیشتمە ئەوێ، پێش هەموو شتێ پەلەی نوێژەکەم بوو، چووم بۆ مزگەفتێ، ئەوەندەم زانی خەرکی پێشیان لێگرتم وتیان: ئەرێ سەید عەزیزا! ڕاستە دەرێن لەگێژی بزنێک دەستی خستۆتە بناگوێ و حەیرانان دەرێ! وتی: کە ئەمەم زانی، خێرا نوێژەکەم کرد و گەڕامەوە بۆ گێژی.

* قەزا و قەدەر هەیە، ئەمە شتێکە ڕاستە و بینراوە:

لەو نزیکی خۆشناوەتییە پیاوێک کوڕێکی سێ چوار ساڵانی خۆی لەگەڵ ئەبێ ئەچێتە دەرەوە بۆ سەر ڕەز و باخ. ئەگاتە سەر ڕەزەکە لەپاش هەندێک، کوڕەکەی خەوی لێ ئەکەوێ، هەڵی ئەگرێ لەبن دارێکا دایئەنێ، جامەدانەکەی خۆی ئەدا بە سەریا و خۆی ئەچێتەوە بەلای بێڵکارییەکەی خۆیەوە. خەریکی بێڵکاری ئەبێ، کتوپڕ بەدەم بێڵێکەیەوە دووپشکێکی گەورە دەرئەپەڕێ و ڕووئەکاتە مناڵەکە کە نووستووە.

کابرا بە بێڵەکەیەوە هەرا ئەکا بە شوێنیا هەرچەندە ئەکا نایگاتێ! کابرا ئەیووت: ئەوا تەکان ئەدەم لەخۆم کە بیگەمێ کەچی وەکو یەکێ لەدواوە پێی گرتبم هەر چەندم ئەکرد نەئەڕۆیشتم! وتی: دووپشک لەدەست دەرچوو و ڕاست ڕووی کردە کوڕەکە و چووە ژێر جامەدانەکە و پاش تۆزێک هاتەوە دەرەوە و ملی ڕێی گرت و بە شوێنەکەی خۆیا گەڕایەوە! وتی: من لەتاو کوڕە ئاگام لە دووپشک بڕا. چوومە سەر کوڕە و جامەدانەکەم لادا، سەیرم کرد مارێک قەفی خواردووە بەدەوری کوڕەکەداو سەری نزیکی بن ملی کوڕەکە کردۆتەوە. لەو کاتەدا دووپشکەکە گەیشتووە، چووە داویە بە تەپڵی سەری مارەکە، مار هەر لەجێی خۆی ڕەق بووە و ئیتر ڕاست گەڕاوەتەوە.

وتی: کە ئەوەم دی چاوم بەدوو پشکەکەش کەوت لە گەڕانەوەکەیا، منیش ئیتر گورج بوومەوە ئەمتوانی بیگەمێ، بەڵام کە ئەو کارەساتەم دی، نەچووم بە شوێنیا وازم لێ هێنا تا چۆوە کونەکەی خۆی.

* لە هەولێر خدر بەگی ئەحمەد پاشا پرسەی هەبوو. لەگەڵ شێخ بەشیر ئەترووشی و شێخ ئەحمەدی نەقشبەندی لەڕۆژی ١٢/١٢/١٩٧٦ چووین بۆ ئەو پرسەیە، قسەی مردن هاتە ناوەوە، خدر بەگ گێڕایەوە وتی:

ساڵێک لەگوندی "قازی خانە" لەدیوەخانی حسێنی مەلادا دانیشتبووین، زۆر بووین، باسی مردنی مەڕ هاتە گۆڕێ کە ئەو ساڵە مەڕ قڕانی کردووە، یەکێ وتی: من بیست سەرم مردوو، یەکێ وتی: من سی سەر، یەکێ وتی: من پەنجا سەر، هەریەکە شتێکی وت: یەکێ وتی: ئەوە مەڕ چۆن ئەمرێ بەو جۆرە؟ کابرایەک هەبوو مستەفا بۆری ناو بوو، ساغ و سەلیم لەئێمە ساغتر، هەر هەڵسا لە ناوەڕاستی دیوەخانەکەدا لەبەر چاوی ئێمەوە ڕاکشاو وتی: ئاوا ئەمرێ. دەستیکرد بەدەست و قاچ وەشاندن و لرخە لرخ کردن، ئیتر هەڵنەستایەوە، کەلێی کۆبووینەوە سەیر ئەکەین ئەویش مردووە!

**ڕشتەی مرواری، عەلائەدین سەجادی، بەرگی یەکەم و بەرگی دووەم، ٢٠٠٥، سلێمانی، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم.**

# یاریی فۆلکلۆری دەشتی هەولێر

بێستون سەعید

منداڵی کورد لە یاری کردن و کات بەسەربردن زۆر زیرەک و لێزان بووە، توانیویەتی بۆ هەرکات و ساتێک خۆی بگونجێنێ و جۆرە یاری و گەمەیەکی تێدا ئەنجام بدات، یاری لەوەرزەکان جیاواز بووە، یارییەکانی زستانە بۆ کوڕان جیاوازی هەبووە لەگەڵ هەمان ودرز بۆ کچان، هەروەها لەکوردەواریدا بۆ هەر تەمەنێک جۆرە گەمەو یارییەک دەکران، بەزۆری یارییە فۆلکلۆرییەکان بەچەند بەشێک دەکران.

ئەو یاری و گەمانەی کە منداڵی تەمەن ٩- ١٢ساڵی ئەنجامیان دەدا جیاوازبوو لەگەڵ ئەو یاری و بەزم و رەزمانەی کە لەوان بەتەمەنتر دەیانکرد. بە زۆریش یارییەکانی گەنجان و مێرد منداڵان بریتی بوون لە (قاوقاوانێ، جگ جگانێ، کەلەمستانێ، تەندورە سوورە، کەری کەرناژۆ، قاشوانێ، کێلە بەردانێ، گەنم گوڵ جۆ بەناو، چاوشارکانێ، تەپە تەپە، کەللایانێ، زۆرە ملانێ). رەنگە لەهەندێ یاری گەورەو گچکە پێکەوە بەشدارییان تێدا کردبێ، بەڵام زۆرجاری وا هەبووە، کە جیاوازی دەکرا، هەروەها سەبارەت بەکچان و کچی بەتەمەنتر یاخود کچی عازەب، ئەو یارییانە ئەنجام دەدران، کە لەگەڵ تواناو هێزو کاتی ئەوان بگونجابووایە.

هەروەها ئەو یاری و گەمەو گەڕەلاوژانەی ئەنجام دەدران گەمەی شەوو رۆژیش جیاوازی هەبووە، بۆ نموونە کەم وا دەبوو چاوشارکێ بەرۆژ بکرابووایە، چونکە یارییەکی شەوانە بوو، یاری کەران دەبووایە خۆیان حەشاردەن و کەس نەیانبینێ. هەروەها یاری کێلە بەردانێ دەبووایە لە جێگەیەکی چۆل و بەرۆژ ئەنجامدرێ.. بەکوردی و بە کورتی هەر جۆرە یاری و گەمەیەک شوێن و کاتی دیاری کراوی هەبوو. شتێک هەیە پێویستە هەڵوەستەیەکی بۆ بکرێت، زۆربەی زۆری ئەو یاری و گەمانەی کە لەفۆلکلۆری کوردیمان ئەنجام دراون، ئێستا لەجیهان یاری گەورانن و بگرە زۆربەشیان لەسەر ئاستی وڵاتان پێشبڕکێی زۆریان لەسەر دەکرێ، بۆ نموونە (قاشوانێ) کەجۆرە یارییەکی فۆلکلۆری کوردییە و هەزاران ساڵە کورد گەمەی پێکردووە، ئێستا لەجیهان بە یاری (گۆلف) دەناسرێ. هەروەها زۆرانێ کە لەجیهاندا بە (مصارعە) دەناسرێ، هەزاران ساڵە لەکوردەواری ئێمە زۆرانێ دەکرێ و پیاوی خۆی هەبووە، لە ئەفسانەکان بەزۆری هەستی پێدەکرێ.

**کێلە بەردانێ..**

ئەو یارییە کوڕگەل و پیاو ئەنجامی دەدەن، یاریکەران دەبنە دوو دەستە، هەر دەستەیەک لەچەند یاریزانێک پێکدێ لەگەڵ سەردەستەیەک، هەروەها هەر دەستەیەک بۆ خۆی چوار بەردی گەورە، کە پێی دەگوترێ (کێل) دەچەقێنێ یەکێکیان لەپێشەوە کەپێی دەگوترێ (مەلا)و ئەوانی دیکەش لەدواوەی (مەلا) دەچەقێندرێن، ئەو بەردەکێلەی راستەوخۆ لەپشت کێلە مەلایە، پێی دەگوترێ پاش مەلا. دوو بەردەکەی دیکەش دەستەراست و دەستەچەپن.

پاش ئەنجامدانی تیروپشک یاخود زۆرجار پێی دەگوترێ (تەڕو وشکانێ) کێ بردییەوە ئەو یەکەمجار دەست بەیاری کردن دەکات. هەرکەسێک لەیاریزانەکان بۆی هەیە بەردێک کە پڕ گوڵی بێ رایبوەشێنێتە بەردەکێلی مەلا.. هەتاکو بەردی مەلا نەکەوێت نابێ ئەوانی دیکە بخرێت، هەر یاریزانێک کێلێکی بەردایەوە بەردێکی دیکە دەهاوێت و لەیاری دادێش بۆی هەیە دوو بەرد بهاوێت، ئەگەر تیپی (١) هەرچوار کێلی تیپی (ب) بەردایەوە، ئەوا بەحەجێک دەنووسرێت، بۆ زانین سەرەتا لەسەر (ئەوەندە) حەجە رێکدەکەون، بۆ نموونە ئەگەر گرەویان لەسەر (٥) حەج بوو، ئەوا هەر تیپێک ئەو ژمارەیەی شکاند ئەوا براوەیەو تیپەکەی دیکەش دۆڕاوە.. ئەم جۆرە یاری و گەمانە تەنیا بۆ کات رابواردنە و بەزۆریش بەهاران لەدەشت و دەر دەبێت.

**کەلەمستانێ**

(کەرەمستانێ، کلاوێن)ی پێدەگوترێ، ئەو جۆرە یارییە هی خەڵکی بە تەمەن و گەوران بوو، منداڵا و تەنانەت گەنجیش بەشداریان نەدەکرد، کات و وەرزی دیاریکراو نەبوو، بەزۆری لەکاتی گەرەڵاوژەی ژنهێنان و بووک گواستنەوە بۆ خۆشی ئەنجامدەدرا... یاریزانان لەو یارییەدا دەبوونە دوو دەستە، هەر دەستەیەک سەردار و سەرۆکی خۆی هەبوو، سەرۆک دەبووایە زۆر زیرەک و لێزان بووایە، لە هەموو قسە و کردارێک پرسی پێدەکرا، ژمارەی یاریزانان دیار نەبوو، لەم یارییەدا هەندێ جار (٧) یاخود (٩) کلاو دادەندرا، هەر تیپێک تیروپشکی بردبووایەوە بۆ یەکەمجار ئەو دەبووایە ئەنگوستیلەکەی لەژێر کلاوەکان شاردبایەوە، (سەرداری تیپ) یان هەر یاریزانێک بۆی هەبوو ئەنگوستیلە شاردنەوەکە ئەنجامبدات... لەکاتی ئەنگوستیلە شاردنەوە، تیپی دووەم بۆیان هەبوو (٢) کلاو هەڵبژێرن. ئەگەر لەو دوو کلاوەدا نەبووایە، ئەو چەند کلاوەی مابووایەوە بۆ تیپی یەکەم دەژمێردرا. تاکو دەگەیشتنە چەند خاڵێک کە لەسەرەتای یاریکردندا لەسەر خاڵەکان رێککەوتبوون، بە زۆریش (١٠٠) خاڵ دەبوو، هەچ تیپێک ئەو سەد خاڵەی تەواو کردبا، دەگەیشتە قۆناغی دووەم، کە ئەویش دەستە گوڵی پێدەڵێن، لەکاتی دەستە گوڵدا، لە نۆ کلاو شەش کلاو دەمایەوە و یاری پێدەکرا... هەر تیپێک دەستە گوڵی دۆڕاندبا چەند خاڵێک دەگەڕایەوە دواوە، بە پێچەوانەوە هەر تیپێک دەستە گوڵی بردبایەوە کەواتە یارییەکی دەبردەوە، ئەو یارییە جگە لە بردنەوە و دۆڕاندنی یارییەکە، ئەو تیپەی بدۆڕابووایە، دەبووایە گوێز یان مێوژ یان هەر شتێک بکڕێ و زەرەرمەندبێ، زۆرجاری وا هەبووە کەلەمستانێ لە ئێوارەوە دەست پێدەکرا، لەگەڵ مەلابانگدانی بەیانیان کۆتایی دەهات. من لە دیوەخانی گوندەکەمان چەندینجار ئەو جۆرە یارییەم دیتوە و لەدیار یارییەکە خەوم لێکەوتووە، هەروەها زۆرجار گوێم لە گەورەکان بووە، کە چەندین گوندیان بریوە بۆ ئەم یارییە خۆشە.

**هەلیکانێ (پەلیکانێ)...**

ئەو یارییە بە زۆری هی منداڵانە تا دەگاتە تەمەنی (١٥) ساڵی، لەم یارییەدا منداڵان دەبنە دوو دەستە، هەر دەستەیەک سەردار و سەرتیپی خۆی هەیە، ژمارەی ئەندامانی تیپ گرنگ نییە، دەکرێ هەر تیپێک لە چەندین منداڵ پێکدێ، لە دوو دار پێکدێ بۆ یاری پێکردن، دارێکیان درێژییەکەی دەگاتە نیومەتر و پێی دەگوترێ (هەلیک)، دارێکی کورت درێژییەکەی یەک بست دەبێت پێی دەگوترێ (پەلیک)، ئەو شوێنەی یەکەمجار یاخود شوێنی یاریکردن پێی دەگوترێ (قزگە)، (بۆ زانین ئەو ناوانە هی دەشتی هەولێرن)، رەنگە لە دەڤەرێکی دیکە ناوی تریان هەبێ، وەکو هەر یارییەکی دیکەی فۆلکلۆری پاش ئەنجامدانی تیروپشک دەستەی براوە یاری دەکات... مەرجەکانی ئەم یارییە ئەو تیپەی یاری دەکات لە شوێنی (قزگە) دەمێننەوە، تیپەکەی دیکە دەچنە ئەو شوێنەی، کە پەلیکی بۆ دێ یان لێدەکەوێتەوە. هەر یاریزانێک بۆی هەیە سێجار بە هەموو توانای هەلیک لە پەلیک بدات و لە قزگە دووری بخاتەوە، بۆ ئەوەی نێوان قزگە و پەلیک زۆربێ.

**گەنم گوڵ جۆ بەراو...**

ئەم یارییە چەند منداڵێک ئەنجامی دەدەن، دەکرێ کوڕ و کچ تێیدا بەشداربن، ئەم ئامێرەی لەم

یارییە بەکاردەهات بریتیی بوو لە گورزێکی پەڕۆ، یەکێک لە یاریزانان پێی دەڵێن (میر)، ئەوە مەتەڵەکانی دەڵێ، ئەوی گورزی لە دەستە، پێی دەڵێن وەزیر، میر چەند پرسیارێک لە وەزیر دەکات، ئەگەر مەتەڵ یان پرسیارەکانی زانی، ئەوا بۆی هەیە بەو گورزی دەستی لە یاریزانەکانی دیکە بدات... ئەگەر پرسیارەکانی نەزانی یان لە سێ پرسیار هیچی نەزانی، یەکێکی دیکە لە یاریزانان دێت دەبێتە وەزیر... بۆ نموونە میر پرسیار لە وەزیر دەکات و دەڵێ: شتێک هەیە دەبریسکێتەوە، ئەویش دەڵێ: چرایە یان ئاگرە یان ئەستێرەیە، هەر وەڵامێک لەو وەڵامانە راست بوو، میر دەڵێ (لێدە بە نیازی فلان شت). هەر کاتێک میر بیگوتبایە (گەنم گوڵ جۆ بەراو)، ئەوا دەبوایە کەسی گورز بەدەست یەکسەر هەمان مەیل یان مەتەڵ یان رەنگ دووبارە بکاتەوە، ئەگەر نا یان بەهەڵە مەیلەکەی دووبارە بکردبایەوە ئەوا یاریزانەکان هەموویان بۆی دەهاتن و گورزەکەیان لێ وەردەگرت و لێیاندەدا.

**قاوقاوانێ...**

ئەو یارییە لە نێوان دوو دەستە یان تیپ ئەنجامدەدرا، هەڵبژاردنی ئەندامانی تیپەکان لەلایەن دوو سەردار یان دوو لێزان هەڵدەبژێردران، سەردارەکان هەر یەک دەیگوتە ئەوی دیکە... بلێ قیر، سەرداری یەکەم دەیگوت قیری دنیایێم لێ سپی بی ناڵێم قیر، دووەم دەیگوت قیر... یەکەم دەیگوت (خۆم لا پیر). بەمجۆرە هەر کەسە و چەند یاریزانێکی بۆ تیپەکەی هەڵدەبژارد... ئەوجا نۆرەی تیروپشک دەهات بۆ ئەوەی کامە تیپ یەکەمجار دەست بە یاریکردن دەکات، زۆرجار وادەبوو ئەو تیپەی یەکەم جار دەیگوت قیر ئەو دەبوایە دەست بە یاریکردن بکات، شوێنی یاریکردن جغزێکی گەورە لەسەر شێوەی بازنەیەکی گەورە دروست دەکرا، لەلایەکی دیکە بە دووری سەد مەترێک جێگایەک دەستنیشان دەکرا و دەبووە (شار).. یارییەکەش بەمجۆرە بوو.. تیپی یەکەم لەناو بازنە دادەنیشتن، تیپی دووەم بەدەوری جغزەکەدا دەسوڕانەوە هەر کاتێک یەکێک لە تیپی دووەم هەلی بۆ برەخسابایە، دەستی لەسەر یەکێک لە یاریزانەکانی تیپی یەکەم بدابایە، دەبوایە بلێ (قاو) بۆ لای شار غاری بدابوایە، ئەگەر لە راکردنەکەدا بگیرابوایە، ئەوا تیپەکەی دەدۆڕا، ئەگەرنا، کە دەگەیشتە سەر شارەکە خاڵێکی بۆ دەژمێردرا، بەمجۆرە هەتاکو کۆی خاڵەکانی هەر تیپێک بگەیشتبایە، ئەوەندە خاڵەی کە لەسەری رێککەوتوون... ئەوا براوە بوو، تیپی خاڵ کەمیشی دەدۆڕا، ئەو یارییە هی مێرد منداڵان بوو.

**کەللایانێ... ماتانێ**

ئەم یارییە، لە هەموو کوردستان وەکو یەکە، زۆرجاریش دەکەوێتە خانەی قومارەوە، چونکە براوە و دۆڕاوی تێدابوو، کەللایانێ یارییەکی گەورانە پێش گچکان، دوو جۆر کەللا هەبوو، هەندێک کەللایان لە بەرد دروست دەکرد یاخود کەللا هەبوو لە شووشە دروست کرابوو، کەللایانێ دوو لای هەبوو، شار + قزگە یان زۆرجار تکە و منەشیان پێدەگوت.. یەکەم کەس کەللای بە دەست بۆ لای شار هەڵدابوایە، نزیکترین کەس دەبووە (مەلا)، ئەوی دیکە دەبووە پاش مەلا، ئەوجا یەک دنکە و دوو دنکە و ئەو یاریزانەی لەدوای هەموان بهاتبایە پێی دەگوترا (قارە)، کەللای یاری پێکردن پێی دەگوترا (تیر). تیر دوو جۆری هەبوو: یەکەمیان بە شێوەی غڕۆلکە بوو، ئەویدیکەیان پێی دەگوترا هەڵگرتە. لە کاتی تیر کردندا ئەگەر کەللا بە کەسێک بکەوتایە، دەیانگوت (حاپول). خاوەن کەللا بۆی هەبوو یەک هەنگاو کەللایەکەی خۆی دوور بخستایەوە، کەللا هەبوو زۆر جوان و رێک بوو یان لە بەردێکی چاک دروست دەکرا، پێیان دەگوت (دەستکەللا) بە زۆریش کەللای رەنگدار دەکرایە دەستکەللا...

تێبینی:

ئەو یارییانەی بۆمان هەڵبژاردوون بە زۆری لە دەشتی هەولێر ئەنجام دەدرێن، هەمان یاری لە ناوچەکانی دیکەی کوردستان هەن، بەڵام رەنگە یان ناویان یا جۆری کردنیان جیاوازی هەبێ.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری (ئاسۆی فۆلکلۆر) ژمارە (١٦)ی ساڵی ٢٠٠٦ وەرگیراوە.

# یارییەکانی دەشتی هەولێر

محەمەد کەریم شەریف

## ١- یارییەکانی کوڕانە

*** ئەستێرە پەنگەستێرە**

لە بەینی (٤-١٠) منداڵدا دەکرێت، لەتەمەنی (٨-١٢)ساڵیدا، هەموو بازنەیی بەرانبەر یەک دادەنیشن و پێیەکانیان بۆ پێشەوە درێژ دەکەن، یەکێکیان لەبەینی هەموویاندا بەپێوە دەوەستێ، لەجێگەی خۆیەوە دەخولێتەوە و دەڵێت:

**ئەستێرە پەنگەستێرە**
**ئاگرەکی باوێ ئێرە**

لەپڕ خۆی دەخاتە خوارەوە بۆسەر منداڵەکان، ئەوانیش بە پێلەقە لێی دەدەن و هەر یەکەیان لەخۆی دوور دەخاتەوە، لەدواییدا کەوتە سەر کامیان و پێی دەرنەکرێت لەسەر پێیەکانی ئەویان تێدەکەوێت و لەجێگەی منداڵەکەی پێشوودا لەناوەڕاستا دەوەستێ و ئەسوڕێت وەکوو منداڵەکەی پێشوو هەتا یەکێکی دیکە تێدەکەوێت و خۆی ڕزگار دەکات و منداڵە تێکەوتووەکە جێگەی دەگرێتەوە... ئیدیکە هەروەها.

*** پشیلە سوور**

لەبەینی (٥-١٢) منداڵ دەکرێت، یەکێکیان تێدەکەوێت و دەبێ بەپشیلە سوورە، ئەوانەی دیکەیش هەموو بەپێوە بازنەیی دەوەستن و دەستی یەک دەگرن. پشیلە سوورە دەکەوێتە ناوەڕاستیان، هەوڵدەدات لەناو لنگی یەکێکیان دەرچێت، ئەوانیش گشتیان بەرگریی دەکەن و ڕێگای نادەن لەناویاندا دەرچێت و دەلەرێنەوە و دەڵێن:

**پشیلە سوورە کوێرا چوو**
**عەرزی دڕی پێیدا چوو**

پشیلە لەناوەڕاستیاندا بەم لاو بەو لادا دەگەڕێت، هەتاکوو جارێک بۆی هەڵ دەکەوێت لەناو لنگی یەکێکیاندا دەردەچێت و خۆی ڕزگار دەکات و جێگەی تێکەوتووەکەی تازە دەگرێتەوە، کە بەناو لنگیدا تێپەڕیوە. ئەویش دەبێت بە پشیلە سوورەو دەچێتە ناوەڕاستدا.....

ئەویش لەناو لنگی کام منداڵ دەرچێت جێگەی دەگرێتەوە.

*** پیسکە**

لە بەینی سێ منداڵ دەکرێ، یەکێک دەبێ بە پیسکە، دووەکەی دیکەیش کڵاوەکەی پیسکە دەبن و لەیەک دوور دەبنەوە پیسکە لەناوەڕاستی هەردووکیاندا دەوەستێ و هەوڵدەدا کڵاوەکەی بکەوێتە دەستی خۆی. هێرش بۆ هەر یەکێکیان دەبات کە کڵاوەکەی لایە منداڵەکە ڕادەکات و کڵاوەکەی ناداتەوە کە زۆریش لێی نزیک بووەوە ئەمەیان کڵاوە کە هەڵدەدات بۆ منداڵەکەی دیکە و دەڵێت: ئەوەی بیدات دایکی بدات!.. ئەوەی دیکەیش بە پەلە کڵاوەکە دەگرێتەوە و کە پیسکە لەویش نزیک دەبێتەوە وەکوو منداڵەکەی پێشووی لێدەکات. بەم جۆرە هەتا جارێک پیسکە لەلای یەکێک لە منداڵەکاندا کڵاوەکەی چنگ دەکەوێتەوە.

ئەم منداڵەی کە پیسکە کڵاوەکەی لێی ساندووەتەوە دەبێت بە پیسکە، پیسکەی پێشووش جێگەی دەگرێتەوە و گاڵتە بەپیسکەی تازە دەکەن و ئازاری دەدەن لەم سەر بۆ ئەو سەر تا ئەویش لای یەکێکیان کڵاوەکەی چنگ دەکەوێتەوەو تێکەوتووەکە جێگەی دەگرێتەوە.

*** تاژتولە**

لە هاویندا کە دەغل و دان

دەدرویتەوە، منداڵ لە گۆڕەپانی جۆخینان قەنگەلاشک و بنە سۆرناتکی گەورە گەورە (زل) دەگرنەوەو هەر یەکەیان داوەبەنێکی لە قونکی گرێ دەدا و دەیکات بە تاژتولەی خۆی.

هەر جارەی چەند منداڵێک هەموو لەگەڵ یەکدا رستەکەی دەستەیان بەر دەدەن و تاژتولەکانیان با دەیانبات منداڵەکانیش بە دووایانەوە رادەکەن تا ماوەیەکی زۆر، جا کامیان پێشکەوت لە تاژتولەکان خاوەنەکەی شانازی پێوەدەکات و هەر یەکە تاژتولەی خۆی دەگرێتەوەو رستەکەی بەدەستەییەوە دەگرێ، کە نەختێ هەسانەوە هەمیشە رستەکانیان بەر دەدەنەوە و بەدوایاندا رادەکەنەوە.

یان چەند منداڵێک دەچن بۆ جێگایەکی بەرداوی وەکوو کەند و زوورگەکان، بەردی پان و خڕ بە دەستەیانەوە دەگرن و بۆ پێشەوەی خۆیان هەڵی دەدەن بزانن کامیان بازوویان بەهێزترە. جا تاژتولەی کامیان زۆر بڕوات ئەو سەردەکەوێت.

یا لەسەر زوورگ و گردەکاندا بەردی خڕی وەکوو تۆپ گلۆڵ دەکەنەوە بەدامانی زورگەکاندا بۆ خوارەوە، بەردی کامیان بگاتە دامانی خوارێی گردەکە یا زورگەکە ئەو سەر دەکەوێت.

*** تەقڵە لێدان**

منداڵ کە بۆناو دارستانەکان دەچن، خۆیان بەلقی دارە گەورەکاندا هەڵدەواسن بەهۆی ئەم پەلانەوە، کە لەزەوی نزیکن، هەر دوو دەستەکانیان بستێک لەیەک دوور دەخەنەوەو خۆیانی پێدا هەڵدەواسن و پێکانیان لەزەویدا بەرز دەکەنەوەو لە بۆشاییەکەی بەینی هەردوو دەستەیاندا ئاوای دەکەن و بەسەر سەریانەوە دەستورێنەوە و تەقڵەیێک لێدەدەن، ئەمجار دەستەکانیان لەدارەکە بەر دەدەن و خۆیان هەڵ دەدەنەوە سەر زەوی، هەمیشە بەم جۆرە خۆیانی پێدا هەڵدەواسنەوەو تەقڵەیێکی دیکە لێ دەدەنەوە، جا کام منداڵ لەهەموویان تەقڵەی لێدا ئەو سەر دەکەوێت.

لەناو ئاواییش خۆیان بەم شەقلانەوە هەڵدەواسن، کە لەخانییە جزیرییەکاندا درێژ بوینەوە بۆ ژێر سواندەکان، یا سەرێ دوولق بێت، ئەوا لەژێر سواندەکانەوە خۆیان بە شەقڵەکەوە هەڵدەواسن و تەقڵەی بەسەردا دەخۆنەوە، یا هەردووگێی دارە دوو لقەکە دەگرن ئینجا تەقڵە لێدەدەن.

*** تیرو کەوان**

تیر: کەڵە (لیلک) کە درێژاییەکەی دوو بست دەبێ و لە پەنجەی بچووک باریکترە، پارچە تەنەکەیێک بەسەریدا دەپاچێندرێتەوە بۆ ئەوەی زۆر بڕوات و لەکاتی هاویشتنیدا گرانایییەکەی بکەوێتە پێشەوە.

کەوان: دارێکی نەرمی تەڕە کە لەگەڵ چەماندنەوەدا نەشکێت لاباڵێک درێژەو بەقەدەر پەنجەی بچووک ئەستوورە. دارەکە دەچەمێننەوە و دەیکەن بە کەوانەیی و داوەبەنێک بەتوندی لەهەردوو سەریدا دەبەستن.

ئەو منداڵانەی کە تیر و کەوانیان هەبێ یاری دەکەن لە سەر ئەوەی بزانن تیرەکەی کامیان زۆرتر ئەڕوا، ئەگەر باش بێت زۆرتر لە (١٠٠)م ئەڕوات، یا نیشانەی پێ دەگرن تاکوو بزانن کامیان زۆرتر لە نیشانەکە دەدەن.

(*) لیلک: (قەرەمە) کە وەکوو قەمیشە، بەلام لووس و بێ گرێیە ناوەکەشی بۆش نییە.

*** جگانێ**

جگ: گرێیەکە هێسک (ئێسقان)ێکە لە قاچەکانی پاشەوەی ئاژەڵ لە چۆکیدا هەیە. جگ دوو رووی هەیە لایێکی ناوەڕاستەکەی قۆڵاییکی تێدایە پێی دەڵێن (میر)، لایەکەی دیکەی لووس و راستە پێی دەڵێن (کەر).

کە دوو منداڵ دادەنیشن لەگەڵ یەکدا جگانێ دەکەن هەر جارەی یەکێکیان جگەک بەدەستە هەڵ دەدەنە پێش خۆیان، جگی کامیان میر بێت جگێک لە منداڵەکەی دیکە وەردەگرێت تا یەکێکیان هەموو جگەکانی منداڵەکەی دیکە بۆ خۆی دەباتەوە، یا لە یاری بێزار دەبن ئەمجا وازدێن.

جۆرێکی دیکە جگانێ هەیە وەکوو کەڵلایانی دەکرێت، هەر منداڵێک جگێک، یا چەند جگێک دەکات بەتاکە، جا چەند منداڵ هەبن، هەر یەکەیان جگێکی گەورە بەدەستەیانەوە دەگرن، کەپێی دەوترێ (حوڵە) لە قرگەکەوە دەیانهاوێن بۆتاکەکان.

جۆرێکی دیکەی جگانێ هەیە کە بەجغز دەکرێ، جغزێک لەسەر زەوی دادەنێن و هەر یەکە جگێکی دەخەنە ناو، بەریزە لەدەرەوەی جەغزەکە هەر جارەی یەکێکیان بە حۆلەکانی دەستەیان لەجگەکانی ناو جغزەکە دەدەن و لەناو جغزەکە دەری دەکەن جا هەر یەکە چەند جگێکی لەگەڵ لێدانا لە ناو جغزەکە دەرکرد بۆ خۆیەتی، هەر یەکێکیش کە هاویشتی و لەهیچ جگێکی نەدا لەیاری کردندا دەکەوێت و یەکێکی دیکە دەست بەیاری دەکات هەتاکوو جگەکانی ناو جغزەکە هەموو دەردەکرێن، ئەمجا لەسەرییەوە دەست بەیارییەکە دەکەنەوەو هەر یەکە جگێکی دیکە دەخەنەوە ناو جغزەکە.

*** چەق چەقوکەی بن گونان**

(٦-٢٠) منداڵ بازنەیی شان بەشانی یەک دادەنیشن، رانیان بەیەکەوە دەنووسێنن، یەکێک لەدانیشتووەکان دەبێت بە سەردار، دوو بەرد لەژێر رانی خۆی بەهەردوو دەستەکانییەوە دەگرێت و لەیەکیان دەدا، یەکێک لە بەردەکان دەدا بە یەکێک لە دانیشتووەکانی تەنیشتیا بەبێ ئەوەی تێکەوتووەکەی ناوەڕاست هەستی پێبکات یا بیبینێت، هەریەکە لەدانیشتووەکانیش کە بەردەکەی لەوەی ئەم تەنیشتەی وەرگرت دەیدات بە دانیشتووانەکەی ئەو تەنیشتی دیکەی و لەژێر رانیاندا ئەڕوات لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی دیکە هەتا دەسوڕێتەوە و ئەگاتەوە دەستە سەردارەکە هەر دوو بەردەکە چەند جارێ لەیەک دەدات و هەمیشە دەیداتەوە دەستە یەکێک لە دانیشتووەکانی تەنیشتی.

منداڵە تێکەوتووەکە کە لە ناوەڕاست وەستاوە، چاوەڕوانی ئەوەیە کە بەردەکە لەدەستە وەستا دەربچێت و لە لای یەکێک لە دانیشتووانەکانی دیکە بیدۆزێتەوە. چونکە بەردەکە کە گەیشتە لای وەستاو هەردووی لەیەک دا ناتوانێ داوای بکات، تا لەدەستی وەستاکە دەرنەچێتەوە، جا لای هەر منداڵێک بیدۆزێتەوە لەکاتی سوڕانیدا ئەوا خۆی رزگار دەکات لەجێگەی ئەو منداڵە دادەنیشیت، کە بەردەکەی لەلای دۆزیوتەوە، منداڵەکەش تێدەکەوێت و دەچێ لەناوەڕاست بەپێوە دەوەستێ و یارییەکە دەستە پێدەکەنەوە تا ئەویش بەردەکە لەلای یەکێک لە دانیشتووەکاندا دەدۆزێتەوە (جگە لە وەستایەکە).

*** حەلاّلیشک**

حەلاّلیشک: دارێکە بەئەستوورایی پەنجەی نێوان و نەختێ لەپەنجە درێژترە، سەرێکی دەقەڵێشن و دوو پەڕی گەورەی باڵی مریشک دێنن قونکەکانیان ئەخەنە ناو قەڵیشەکە، سەری دیکەی دارەکەش تیژ دەکەن.

منداڵ کە یاری پێدەکەن پەڕێکیان دەگرێت و دەڵێت:

**حەلاّلیشک**
**پەڕە مریشک**
یا دەڵێت:
**حەلا حەلا لیشکێ**
**پەڕم پەڕێ مریشکێ**

ئەمجار بەهێزی خۆی حەلاّلیشکەکە بۆ ئاسمان هەڵدەدات و پەڕەکان لەئاسماندا وەکو فرفرۆکە بەدەوری یەکدا دەسوڕێنەوە لەژێر دارەکەو نووکە تیژەکەشی بۆ ئاسمان دەڕوات، کە بۆ خوارەوەش دەگەڕێتەوە سەرە تیژەکەی بۆ خوارەوە دێت، پەڕەکانیش لەسەرەوە بەدەوری یەکدا دەسووڕێن. حەلاّلیشکەکە کە دەکەوێتە خوارەوە سەرە تیژەکەی لەزەوی ئەچەقێ، منداڵەکە هەڵی دەکێشێتەوەو دووبارە هەڵیدەداتەوە بۆ ئاسمان.

*** حەمبەلە تقفانێ**

لەبەینی (٢-٨) منداڵ دەکرێ. لە تەمەنی (٨-١٢)ساڵیدا.

دیوارێک دەکەن بە قوڕگەو ماوەیەک لێی دووردەبنەوە هەموو بەریز لەتەنیشت یەکدا دەوەستن، هەموو بەجارێ بە چوززەکە بۆ دیوارەکە دەچن، دەستی لێدەدەن و دەگەڕێنەوە بۆ دێتەوەکەی خۆیان هەر بە چوززەکەو بەپەلەش دەڕۆن، لەگەڵ چوون و هاتنەوەکەشدا دەڵێن: (حەمبەڵە تقققق......) جا کامیان توانی لەسەر یەک هەناسە بگاتە دیوارەکەو بگەڕێتەوە جێگەی خۆی بەبێ ئەوەی (هەناسە وەر بگرێ یا لەدەنگ بکەوێ) ئەویان زۆر ئازایە.

*** خەتی ژنان خەتی مێردان؟**

کە دوو منداڵ لەسەر شتێک قڕەیان دەبێت و بەگژ یەکدا دەچن. یەکێک لەو منداڵانەی کە بۆ سەیر کردنیان وەستاون، بەپێ خەتێک لەبەینی هەر دوو منداڵە ناکۆکەکاندا

لەسەر زەویا ئەکێشی و دەڵێ: -
ئەمــە خـەتی ژنان و خـەتی مێردان؟....
یەکێک لەدوو منداڵەکە خەتەکە بەپێی دەسڕێتەوە و بزری دەکات و دەبێت بە مێردی منداڵەکەی دیکە، ئەوەی دیکەیش کە نەویرابوو خەتەکە بسڕێتەوە دەبێت بەژن. لەبەر ئەمە مێردەکە بەوەی دیکە دەڵێت:

**ژنم پڕ بە گونم**
**مێردی هەڵیت هەر ئەمنم**

منداڵە تر سنۆکەکەش لەتاو ئەم جنێوە هێرشی بۆ دەباو لێی دەدا، دەبێت بە شەڕیان بۆ ئەوەی خۆی دەربخا کەژنی ئەو نییە شەڕێکی باش دەکەن، منداڵەکانی دیکەش کە بۆ سەیر کردنیان وەستاون هەر تانەیان لێدەدەن و لەسەر شەڕەکە رشتیان دەکەن و گاڵتەیان پێدەکەن. ئەم دوو منداڵەش هەتا شل و کول دەبن هەر لەسەر و گوڵاکی یەک دەدەن.

زۆر جار دوژمنایەتی ئەم دوو منداڵە درێژە دەداو دەبێتە هۆی بەشەڕ هاتنی هەردوو خێزانەکانیان یا خێزانی ئەو منداڵەی کەخەتی بۆیان کێشاوە لەگەڵ خێزانی یەکێک لە منداڵەکان.

*** داک داکانێ**

لە بەینی (٣- ١٢) منداڵ دەکرێ، هەر یەکە قاشۆیێک بەدەستەییەوە دەگرێ، قزگەیێک (قوڵتێکی بچووکە) دیار دەکەن، گۆیێکی دار نەختێ دوور لە قزگەکە هەڵدەدەن. هەر یەکە لەمنداڵەکان قاشۆیێکی لەسەر قزگەکەوە بو گۆیەکە هەڵدەدات، هەتا هەموو قاشویەکدانیان لە گۆیەکە دەدەن تەنیا یەکێکیان نەبێ کە هیچ جارێ، لێی نادات، گۆیەکە دەبێت بە دایکی ئەو.

لەسەر منداڵەکە پێویستە دایکی خۆی (کە گۆیەکەیە) بخاتە ناو قوڵتەکە تا دایکی خۆی رزگار بکات، بەڵام منداڵەکانی دیکە بەرگری دەکەن و بە قاشویەکانیان لەگولەکە دەدەن و لە قوڵتەکەی دوور ئەخەنەوە، منداڵەکەش هەر بە قاشویەکەی لە گۆیەکە دەدات و بو قوڵتەکەی دەبات، بەڵام ئەگەر منداڵەکە قاشویەکەی خۆی بەلەشی هەر منداڵێک بخا دەڵێ داک، ئەوا گۆیەکە دەبێت بە دایکی ئەو منداڵەی کە قاشویەکەی بەلەشی کەوتووە، ئەوەی دیکەیش بەم جۆرە دایکی خۆی رزگار دەکات بەبێ ئەوەی بیخاتە ناو قوڵتەکەوە. منداڵەکەی دیکەیش هەوڵدەدا کە گۆیەکە بخاتە ناو قوڵتەکەو دایکی خۆی رزگار بکات، بەڵام منداڵەکانی دیکە بەرگری دەکەن کە بۆیان هەڵکەوت لەپڕ دارێک لە گۆیەکە دەدەن و لە قوڵتەکەی دوور ئەخەنەوە، منداڵەکەش هێرشیان بۆ دەباو قاشۆیەکەی بۆیان درێژ دەکات هەتا گۆیەکە ببێت بە دایکی ئەو کەسەی کە قاشۆیەکەی بەلەشی دەکەوێت، بەڵام منداڵەکان لە دەستی رادەکەن و لێی دوور دەبنەوە... هەروەها تا جارێک قاشۆیەکەی لە لەشی یەکێکیان دەدات و دەڵێت: (داک) واتە بوو بەدایکی ئەو منداڵەی کە قاشۆیەکەی بە لەشی کەوتووەو دایکی خۆی رزگار دەکات... بەم جۆرە هەتا یەکێک لە منداڵەکان دایکی خۆی رزگار دەکاو دەیخاتە ناو قوڵتەکە لەسەریەوە دەست بەیارییەکە دەکەنەوە.

بەڵام ئەگەر یەکێکیان بەهیچ جۆرێ دایکی خۆی پێ رزگار نەکرێ، ئەوا هەموو منداڵەکانی دیکە یەکە یەکە (هەنەرکی، نەرکی) بە گۆیەکە (کە دایکی منداڵەکەیە) دەکەن کە هەر یەکە لەمنداڵەکان قاشۆیەکەی خۆی بە هەردوو دەستەکانییەوە دەگرێ و سەری قاشۆیەکە بەژێر زگیدا دەگرێ و سەرەکەی دیکەیشی بۆ پێش خۆیەوە درێژ دەکاو گۆیەکە لەسەر ی گۆمک قاشۆیە کە دادەنێ و دەڵێ:

**هە نەرکی نەرکی نەرکی**
**دەتبەمە پشت ئەستێرەکی**
**دوو قلە قەسپی ئەدەمێ**
**مشتی گونانی دەبەمێ**

بەمجۆرە جنێوی بێزەوەر بەگۆیەکە دەدا، کە دایکی منداڵە تێ کەوتووەکەیە، هەتا گۆیەکە لەسەر قاشۆیەکە دەکەوێتە خوارەوە، ئەمجا یەکێکی دیکە بەم جۆرە یەکە یەکە ئەم کارەساتە بەگۆیەکە دەکەن. جاری وا دەبێت منداڵەکە خۆی پێ ناگیرێ، کە ئەم کارە بە دایکی دەکەن بە گریان دەچێتەوە بۆ ماڵەوە و لەشەرما لە منداڵەکانی دیکە دوور دەکەوێتەوە.

*** دزیی بێستان و رەزو نیسک و نۆک**

لەبەهار و هاویندا کە نیسک و نۆک دان دەگرێ، رەزو بیستانەکان بەردەگرن، منداڵ هەر ئارەزووی خواردنی ئەم شتانە بەجۆرێکی وا

دەکەن کە مەترسی لەگەڵدا هەبێ. بە تایبەتی ئەو منداڵانەی نیسک و نۆکیان نەچاندبێ، یا ڕەزو بیستانیان نەبێت.

بەرۆژ بەناو کەند و چۆمەکاندا بەرەو بیستانەکان دەچن کە بزانن خاوەنەکانیان ئاگادار نینە، بۆ خواردنی گندۆرە و تەرۆزی و کالیار و شەمامە، هەتا دڵیان لەسەربێ دەیانخۆن.

*** سەری بەبن کڵاو کەوتیە**

جاری وا دەبێ منداڵێک کە بە دوای باوکیدا دەگەڕێ و نایدۆزیتەوە. دەچێتە ناو گوندی یا لە منالەکانی گەڕەکدا بە دوای باوکیدا دەگەڕێ چونکە بەزۆری هات وچویان دەکا، یا دەچێتە مزگەوت یا دیوەخانی گوندی. لە پیاوەکان دەپرسێ، باوکم لەکوێیە؟ ئەوانیش گاڵتەی پێدەکەن و دەڵێن:

کوڕە نازانی باوکت سەری بە بن کڵاو کەوتووە؟!

منداڵەکەش دەڵێ: ناوەڵڵاهی بەقەستی وا دەڵێن. گەورەکان سوێندی بۆ دەخۆن، کە باوکیان دیوە سەری بەبن کڵاو کەوتبوو.

منداڵەکە ناچار باوەڕ دەکا و بەگریانەوە دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە، کە دایکی بەگریانەوەی دەبینێ دەڵێ:

کێ لێیی داوی؟ منداڵەکە دەڵێ: کەس لێمی نەداوە.

دایکی دەڵێ: ئەی بۆچ دەگرییت؟!

دەڵێ: باوکم سەری بەبن کڵاو کەوتییە؟!

دایکی دەکەژێتەوە و دەڵێ: کێ وای پێ گوتی؟

منداڵەکە ناوی کابرای پێدەڵێ کە وای وتبوو، ئەمجا دایکی دڵی دەداتەوە و دەڵێ کوڕم ئەی باوکت کڵاوی هەر لەسەر نییە؟.سەری هەر لە ژێر کڵاوەکەیەتی، بۆچی هەندە نەزان و ناتێگەیشتی؟. ئەمجا منداڵەکە دێتەوە سەر خۆی و لەگریان دەکەوێ.

*** سی ریزکانێ**

دوو منداڵ بەرانبەر یەک دادەنیشن و چوار گۆشەیێکی بە درێژایی ئەم پەڕاوە لەسەر زەوی دروست دەکەن، دوو دێر بە ناوەڕاستی ئەم چوار گۆشەیەدا ئەکێشن، دەبێ بە چوار گۆشەیی.

*** شەپلە قونانی**

ئەم یارییە لە بەینی شەش منداڵ دەکرێ لە تەمەنی (٦-١٢) ساڵیدا. دوو منداڵ لەسەر زەوی لەسەر گازی پشت درێژ دەبن، چوار منداڵەکەی دیکەیش هەر بەدووان یەکێک لە منداڵە درێژ بووەکان هەڵدەگرن، هەر یەکێکیان بە هەر دوو دەستەکانی پێیەک و دەستێکی درێژ بووەکە دەگرێ و لە زەوی بەرزیان دەکەنەوەو وەکوو جۆلانە بۆ پاش و پێش دەیانهەژێننەوە وەکوو مەشکەی دۆ، لەپڕ قووتی هەردووکیان لە یەک دەدەن و هاوار هاواریان پێ دەخەن بەم چەشنە چەند جارێک لە ئاسمانەوە قوونی هەردووکیان لەیەک دەدەن لەگەڵ هەژاندنەوەکەدا. چەندی ئەم دوو منداڵە هەوڵدەدەن لەدەستی چوار منداڵەکەی دیکە رزگار نابن، هەتا هەردووکیان دەست بە گریان دەکەن یا یەکیان دەگرێیت لەبەر ئازاری لەشیان، کە بەم جۆرە لە یەکیان دەدەن ئەمجا بەریاندەدەن و لەچنگیان رزگار دەبن.

*** شەڕە بەرد**

کە دوو منداڵ، یا دوو تیپە منداڵ، یا منداڵەکانی دوو گەڕەک، یا منداڵەکانی دوو گوندی دراوسێ لەسەر شتێک ناخۆشیان دەکەوێتە بەینی، لەیەک گیر دەبن بەجنێو شەڕ. لە یەک دوور دەکەونەوەو دەستدەکەن بە شەڕە پەلار و بەرد هاویشتن بۆ یەک.

ئەگەر شەڕەکەش گەورەبێ، منداڵەکانی دوو گەڕەک یا دوو گوند بن، ئەوا دار لاستیق و بەردەقانی دەکەوێتە کار، هەر منداڵێک یەکێک لەم چەکانە یا هەر دووی لەگەڵ خۆیا هەڵدەگرێ لەکاتی شەڕ کردنیدا. بەردە قانییەکە لەپشتی ئەبەستی و دار لاستیقەکەش دەخاتە ملی. پێویستی بەکامیانەوە هەبێ ئەویان ئامادە دەکا و بەدەستەوە دەگرێ لەکاتی شەڕدا.

کە لەیەک نزیک بن بەدار لاستیق شەڕ دەکەن، لەیەکێش دووربن بەردەقانی دەکەوێتە کار. تا بەشێکیان بەشەکەی دیکە دەشکێنی و رایاندەپێچن و تەنگەیان پێهەڵدەکەن و راویان دەنێن بۆ گەڕەک، یا گوندی بەشە شکاوەکە. جا چەند بریندار و سەر شکای لەهەردوو بەشدا دەبێ، دەستەکەوتی هەردوو لاشیان ئەوەیە کە هەر بەشێک منداڵێکی بەشەکەی دیکە

بگرن، چ دار لاستیق، چ بەردەقانی لابێت لێی دەستێنن و لەگەڵ لێدانیشدا مارکوژی دەکەن، ئەمجا بەرەڵلای دەکەن.

تا بەم دواییەش شەڕە گەڕەک لەناو شاری هەولێردا هەر مابوو بەتایبەتی لەبەینی قەڵات و تەیراوە. کە هەرجارەی تێک دەگیران چەند حەفتەیەک درێژەی ئەکێشا، هەردوو لایان شکەست و برینداریکی زۆریان ئەبوو، چەند جاریکێش ئۆتۆمبیلی پۆلیسی چەکدار دەهاتنە بەینیان بۆ پەرت کردنیان، بەڵام بێ سوود بوو لە شەڕەکە نەئەکەوتن، بەڵکو بۆ ڕۆژی دوایی بەردەوام دەبوونەوە لەسەر شەڕەکە.

زۆر لە گەنجەکانیش بەشداریان دەکرد لەشەڕی قەڵات و تەیراوە.

کە یەکێ لەسەر قەڵات دەکەوتە خوارەوە تەیراوەییەکان دەیانگرت هەر شتێکی بەکەڵکی لابوایە لێیان زەفت دەکرد و زۆریشیان لێی دەدا، ئەمجا ڕەوانیان دەکردەوە.

لەزستاندا کە بەفر زۆر دەبارێ، (٢- ١٢) منداڵ دەبن بە دوو بەش، هەر یەکەیان چەند تۆپەڵە بەفرێ بەهەر دوو دەستەکانیان دروست دەکەن و بۆ بەشەکەی دیکەی ئەهاوێن تا هەموو لەشی یەک سپی دەکەن لەگەڵ بەفر و بەشێکیان دەشکێن و ڕادەکەن، بەشەکەی دیکەیش بەدوایانەوە. یا هەردوو بەش بەرگری دەکەن و هەندە لە یەکتر نزیک دەبنەوە پێراناگەن تۆپەڵە بەفر دروست بکەن، هەر یەکەیان بەهەردوو دەستەکانی بەفری ورد وەکو ئارد هەڵدەدا بۆ بەشەکەی دیکە تاکوو ماندوو دەبن و لەشیان سپی دەبێ لەگەڵ وردە بەفر.

گەورەکانیش زۆر جار لە کاتی بێکاریدا ئەم یارییە دەکەن بۆ ڕابواردن و خۆ گەرم کردنەوە بەهۆی جووڵانەوە و ڕاکردنیان، کە زۆر خۆشترە لە تۆپ تۆپێن و گورز گورزانێ.

*** شەوتا**

ئەگەر یەکێ چەند شەوێ لە سەر یەک تایێکی گەرمی بێ و بەرۆژ وازی لێبێنێ و بەریبدا. ئەو کابرایەی شەوتای گرتووە، خاوەنەکەی شەوێ چەند منداڵێ کۆ دەکاتەوەو پێیان دەڵێ: بڕۆن شەوتا بانگ بکەن بۆ نەخۆشەکەمان.

منداڵەکانیش بە ڕاکردن دەچنە بەر دەرگای ماڵی پیاوێکی خاوەنی دوو ژن (ئافرەت)، هەموو بە جارێ لە بەر دەرگاکەوە بە دەنگێکی بەرز هاواردەکەن:

**شەوتا**

**بە شەو ئەگرێ تا بە ڕۆژ بەر دەدا**
**خودانی چوار چاو چ دەرمان دەدا**

چەند جارێ دووبارەی دەکەنەوە تا خاون ماڵەکە خواردنێک بۆ نەخۆشەکە دیار دەکا، دەڵێت: گۆشت مریشک، یا دەڵێت: گۆشتی ئاژەڵ. کە خاوەنی چوار چاو ناوی خواردنەکە دەڵێ، منداڵەکان هەموو بەهەیهاوو هاوار هاوار بۆ دەرەوەی ئاوایی ڕادەکەن، نەخۆشەکە (شەوتا) هەڵەتە دەکەن و لەنەخۆشەکەی دوور دەخەنەوە. ئەمجا دەگەڕێنەوە بۆ ماڵی نەخۆشەکە و لەدوورەوە بەدەنگێکی بەرز دەڵێن: گۆشت مریشک، یا دەڵێن: گۆشت کاور، یا هەر گۆشتێکی کە خاوەن دوو ژنەکە دیاری کردووە کە بەزۆری گۆشت مریشکە لەبەر ئەوەی بە ئاسانی لە گوندەکاندا هەموو کەسێ چنگی دەکەوێ.

جا کە وەڵامەکەیان بۆ دەبنەوە، خاوەنی نەخۆشکە ئەم گۆشتەی کە خاوەنی چوار چاو دیاری کردووە ئەکەن بە شێو و دەرخواردی نەخۆشەکەی دەدەن تا بۆی ببێ بە شیفا.

*** شەوی شەوبەراتێ**

هەموو ساڵێ لەشەوانی شەوبەراتدا، پۆل پۆل منداڵ کۆدەبوونەوە و هەر پۆلەی ڕووی لەگەڕەکێک دەکرد، بەکۆڵانەکاندا ئەگەڕان و ماڵ بەماڵ لەبەر دەرگاکان ئەوەستان و دەیانوت:

**شەوە شەوی شەو بەراتێ**
**خوا دوو کوڕ و کچێکتان بداتێ**
**خاتوونی سەر زێڕێ**
**دەستە لە کەندووان بگێڕێ**
**بەشی منداڵان بنێرێ**

کابانی هەر ماڵێکێش چنگە قەسپێک، یا چنگە مێوژێک، یا هەر خواردنێکی دیکە دەدا بە منداڵەکان. جاری وا دەبێ کچێک شتەکە دەدا بە منداڵەکان، چەند منداڵێکی ئاڵچاغ کە لەو پۆلەدا دەبن پێی دەڵێن:

**خوا مێردێکی جوانت بداتێ**
**لەجوانیدا کەس نەیگاتێ**

کچەکەش شەرم دەیگرێت و بەتوورەیی جنێو بە منداڵەکان دەدا. بەم جۆرە هەر تاخمەی خواردنێکی زۆریان کۆدەکردەوە و لەگەڵ یەکدا دەیانخوارد.

*** قورت قورتانێ (چالێن)**

لەبەینی (٢-٨) منداڵ دەکرێ کە قوڵتێکی بە قەدەر دوو گوڵم لە زەوی دا دەکوڵن، یەکێ لەمنداڵەکان دەبێ بەسەرکار و لەنزیک قوڵتەکەدا دەوەستێ، یا دادەنیشێ. منداڵەکانی دیکەیش دوو هەنگاو دوور لە قوڵتەکە، قزگەییک دەکەن. لەسەر هەر شتێک یاری بکەن چەند دانەیەک لەو شتە لە قزگەکەوە بە دەستە بەجارێ هەڵدەدەن بەم جۆرە بەریزە یەک لەدوای یەک. جا بەرِوو یا کەڵلا یا گوێز یا هەر شتێکی دیکە بێ.

لەگەڵ هەڵدانەکەدا چەند دانە لە شتەکە بکەوێتە ناو قوڵتەکە ئەی ژمێرن. ئەگەر جووت بێ ئەوەی هاویشتوویەتی هەند جووتە لە منداڵەکەی سەر قوڵتەکە وەردەگرێ جگە لەوانەی هەڵیداون کە بۆ خۆی کۆیان دەکاتەوە، بەڵام تاک بێ ئەوا چەندی کەوتبێتە ناو قوڵتەکە هەمووی بۆ منداڵەکەی سەر قوڵتەکەیە.

ئەگەر سەرکارەکەش هەموو شتەکانی خۆی دۆڕاند، کە یاری لەسەر دەکەن و هیچی لانەما ئەوا لەیارییەکە دەردەچێ و یەکی دیکە لەیاریکەرەکان جێگەی ئەگرێتەوە.

*** قومەت قومەتانێ**

ئەم یارییە لە بەینی (٦-٢٠) منداڵ دەکرێ لە تەمەنی (١٠-٢٠) ساڵیدا. منداڵەکان ئەن بەدوو بەشی وەکوو یەک، ئەم دوو بەشە (هۆپ هۆپ قەرەتۆپ) دەکەن ئەوەی تێبکەوێ لەدێتەوەکەی خۆیا ئەمینێتەوە، بەشەکەی دیکەیش دەچن لەناو گەرەکەکاندا دەسورێنەوەو هەر جێگەییکی خۆڵ یا کای زۆربێ بە پەلە چەندەها قومەتی لێ دەکەن کە هەر یەکە هەندەی لەپێک دەبێ، بەم چەشنە لەکاولێک دەچنە کاولێکی دیکە یا لەسەر ڕێگاکاندا، کە خۆڵی زۆربێ، بەپەلە تا بتوانن زۆر لەو گومبەتە بچووکانە دروست دەکەن. ئەمجا دەگەرێتەوە بۆ لای بەشەکەی دیکە و لەگەڵیاندا دەگەرێن بەم شوێنانەی کە قومەتیان لێی کردووە بەبێ ئەوەی پێشانیان بدەن، بەڵکو دەست خەلەتیشیان دەدەن. بەشەکەی دیکەیش هەر جێگەیەک کە هەستی پێبکەن قومەتی لێکراوە بە پێی قومەتەکانی تێکدەدەن و بزریان دەکەن. تا بتوانن دەگەرێن، کە وازیان لەگەران هێنا بەشەکەی دیکە ئەم قومەتانەیان پێشان دەدەن، کە دروست کراون و نەدۆزرابنەوە. یەکە یەکە دەیانژمێرن و بەژمارەی قومەتان ژمارەیان بۆ دادەنرێت و لەسەریەوە دەست بەیارییەکە دەکەنەوە و بەشەکەی دیکە دەچنە ناو ئاوایی بۆ قومەت کردن بەشی یەکەمیش لەسەر قرگەکە دەمێنێتەوە، بەڵام چەند قومەتیان لەسەر بەشەکەی دیکە هەبێ هەر بۆیان دەژمێردرێ.

کە بەشەکەی دیکە لەقومەت دەگەرێتەوە ئەم بەشەش دەچن بەدوای قومەتەکانی ئەواندا دەگەرێن وەکوو جاری پێشوو بەم جۆرە هەر جارەی بەشی دادەنیشێ و بەشەکەی دیکە دەچنە قومەت کردن... تا لەیاری تێر دەبن.

کام بەش ژمارەی ئەم قومەتانەیان زۆردیکەبێ کە بەشەکەی دیکە نەیاندۆزیوەتەوە، ئەم بەشە سەر دەکەوێ و بەشەکەی دیکەیش تێدەکەوێ.

*** کەری باقاڵان (دیوەرە)**

دیوەرە: ئەم بەقاڵە بوو کە وڵاخێک، یا کەرێکی بار دەکرد لەجۆرەها پێویستی دێهاتیەکان، لەپێویستی ناوماڵ، شیرنایتی و خواردەمەنی خۆش، کەرەستەی دەستەی یاری منداڵان، وردە جل و جور، بازن و ئەنگوستیلە و موری و زەنگیانە.... هتد.

*** کێشمانە کێش ؟**

گەورەکان ئەم یارییە لەگەڵ منالەکاندا دەکەن، گەورەکە بەهەردوو دەستەکانی هەر دوو گوێی منداڵەکە دەگرێ، بەپەنجەی گەورە و دۆشاومژەی، بەمنداڵەکە دەڵێ: کێشمانە کێش؟ ئەگەر منداڵەکە وتی: گێی فەقیران رامەکێش، ئەوا رزگار دەبێ و گەورەکە گوێیەکانی بەردەدا، بەڵام ئەگەر منداڵەکە وەڵامەکەی نەزانی گەورەکە بەم پرسیارانە ئازاری دەدا. پێی دەڵێ: دەچییە سەرداریێ یا دێیەخوارێ ؟. کە منداڵەکە بڵێت دەچمە سەرداریێ گەورەکە بەتووندی هەردوو گوێیەکانی منداڵەکە بۆ سەرەوە بەرز دەکاتەوە و منداڵەکەش لەبەر ئازاری گوێیەکانی دەستە بەهاوار و گریان دەکا، کە منداڵەکە ئەم جارە لە ترسان بڵێ دێمە خوارێ، گەورەکە هەردوو گوێ منداڵەکە بۆ خوارەوە رادەکێشی. کە بۆ سێهەمین جار پرسیارەکەی

لێدەکاتەوە، منداڵەکە چاوترساو دەبێ و هیچ وەڵامی ناداتەوە لەگریان زیاتر. ئەمجا گەورەکە پرسیارەکەی یەکەم جاری بۆ دووبارە دەکاتەوەو دەڵێ: کێشمانە کێش؟. ئەگەر وەڵامی دایەوە ئەوا رزگار دەبێ، ئەگینا ئەوا هەر بە پرسیارەکەی دیکە ئازاری دەدا تاکو یەکێ لە دانیشتووەکان وەڵامی پرسیارەکەی یەکەم بە منداڵەکە دەڵێ، منداڵەکە ئەمجا وەڵامی گەورەکە دەداتەوەو لە چنگی رزگار دەبێ.

*** گلۆلە موو**

دوو منداڵ، یا دوو گەنج، یەکێکیان لەسەر زەوی دادەنیشێ ئەوەی دیکەیش لەپشتیەوە خۆی بەسەریدا خوار دەکاتەوە تا سەری دەگاتە نێوک ناوکی دانیشتووەکە، ئەویش لە ژێرەوە وەکوو ئەو دەکاو پژدێنی دەدرێ و خۆی گلۆڵ دەکاتەوە، سا هەر یەکێکیان کە دەکەوێتە سەر زەو تەکان دەداتە خۆی و تاوەکو گلۆلە ماوەیێکی دوور لەسەر زەویدا دەرۆن و غل دەبنەوە بەسەر یەکدا.

*** مێش گرە**

لەهاویندا کە زەردەواڵە زۆر ئەبوو بەجوولە ئەکەوتن، جۆگەلە ئاوەکانی هەر بیرێک چەند منداڵێکی بە دەوریدا کۆدەبوونەوە. هەر یەکەیان چەند داوە موویکی لە کلکی وڵاخێکدا هەڵئەکێشا و چەند قەسەڵێکی بە درێژایی پەنجەی نێوانیشی بەدەستەییەوە دەگرت، هەر داوە موییکیان بەدوو قەدی دەخستە ناو کەلە قەسەڵێکەوە، هەردوو سەری مووەکە لەسەرەکەی دیکەی قەسەڵەکەوە دەردەچوو، سەرەکەی دیکەیشی دەبوو بە کەوانە، بەدەستێک ناوەراستی قەسەڵەکەی دەگرت و بەدەستەکەی دیکەیشی هەردوو سەری داوە مووەکەی دەگرت، لەسەرخۆو بەزانایی کەوانەی مووەکەی بۆ ژێر سکی زەردەواڵەیەک راپێش دەکرد و لەپڕ هەردوو سەری مووەکەی رادەکێشا، زەردەواڵەکە دەکەوتە بەینی داوەکەو سەری قەسەڵەکە، منداڵەکە هەردوو سەری مووەکەی گرێ دەداو کەلە پووشێ، یا کەلە قەسەڵێکی بچووکی دەخستە بەینی قەسەڵەکەو گرێی داوەکە، بەم جۆرە زەردەواڵەکە لەکەوانەکەدا بەند دەبوو، توانای دەرچوونی نەدەبوو.

بەم چەشنە منداڵەکە زەردەواڵەکەی هەڵدەدا بۆ ئاسمان و داوە قەسەڵەکەشی هەر بەدوایەوە، لەبەر ئەمە بەفرین لەچنگی رزگار نەدەبوو و کە نەختێ لێی دوور دەبووە بەدوایا رایدەکرد و دەیگرتەوە.

*** ویلی ویلی**

ئەم یارییە لەبەینی دوو منداڵ دەکرێ لەتەمەنی (٧-١٢) ساڵیدا. بەردێکی خڕ دەکەن بەگۆ، هەرجارەی یەکێکیان دەستە بەیاری دەکەن و بە بەردێکی پان لە بەردە خڕەکە دەدا بۆ جێگەییەکی دیار کراوە لەوێشەوە بەم جۆرە دەیگێڕێتەوە بۆ دێتەوەکەی پێشووی، هەمیشە دەیباتەوە و ئەیگێڕێتەوە چەند جارێ تاکو جارێک کە بەردەپانەکە بۆ گۆیەکە ئەهاوێ و پێی ناکەوێ ئەمجا لەیاری دەکەوێ و منداڵەکەی دیکە دەستە بە یاری دەکا هەروەکوو ئەوەی پێشوو.

*** هۆپ هۆپ قەرە توپ**

ئەم یارییە پەیوەندی بەزۆر لەیارییەکانی دیکەەوە هەیە، وەک (پەلیکانێ، چاوشارکێ، قۆمەت قۆمەتانێ، کەری پشت درێژ، کێلەبەردانێ.....)، کە سەرداری هەردوو بەشەکان، یا ئەگەر تەنیا دووکەس بن ئەم یارییە دەکەن بۆ ئەوەی بزانن کام بەش تێدەکەوێ.

هەردوو منداڵەکە لەیەک دوور دەبنەوەو بەرانبەر یەکدا رادەوەستن، کامیان زوو دیکە لەدێتەوەکەی خۆیدا راوەستا بە منداڵەکەی دیکە دەڵێ: هۆپ هۆپ قەرە توپ، منداڵەکەی دیکەیش لەجێگەکەی خۆیدا رادەوەستێ تا ئەمەیان سێ پێ بۆی دەچێتە پێشەوە هەتا سەری پەنجەی پێیەکی لەگەڵ قوونپانی پێیەکی دیکە بە درێژی بەدوای یەکدا ریز دەکا، بەم جورە پێیەکەی پاشەوەش ئەگوازێتەوە و ئەیخاتە پێشەوەی ئەم پێیەی، تا بەم جۆرە سێ پێ بۆی دەچێتە پێشەوە، لەگەڵ گواستنەوەی هەر پێیەکێشی دێرێک لەم هەڵبەستە دەڵێ:

**ئەمن لەم بەری زێ**
**ئەتوو لەوبەری زێ**
**لەملت دەکەم زریزێ**
**دەتگێم هەتا پایزێ**

کە سێ پێ بۆی چووە پێشەوە لەجێگەی خۆیدا دەوەستێ و منداڵەکەی دیکەیش وەکو سێ پێ بۆی دێتە پێشەوەو لەگەڵ هەر پێ هاویشتنێکدا دێرێک لەم هەڵبەستە

دەڵێ کە وەڵامی منداڵەکەی دیکە دەداتەوە:

**هەڵتـــــەدەگـــــرم داتدەنێم**
**لەناو جـۆرکی کـات دەنیم**
**هەتا دەمـــری تێـــتـدەنێم**

کە ئەو منداڵەش سێ پێ دێتە پێشەوەو لەدێتەوەکەیدا ئەوەستێ، ئەوەی دیکە سێ پێی دیکەیش دێتە پێشەوەو جۆرەهەڵبەستێکی دیکەی لەگەڵدا دەڵێ. ئەمـــجـــا ئەوەی دیکەیش سی پی بوی دێتە پێشەوەو بە هەڵبـەست وەڵامی دەداتەوە. بەم جۆرە تا هەردوو منداڵەکە پێیەکانیان ئەگاتەوە پێی یەک و لەیەک دەخشێن و جا لەکاتی ڕۆیشتنی کامیـان بێ ئەو سـەرئەکـەوێ و وەسـتـاوەکـە تێدەکەوێ.

## ٢- یاری یەکانی کچانە

### * بووکوکە

کچێک یا چەند کچی لە تەمەنی (٦-١٢) سـاڵێـدا کـە بیـانەوێ بووکـۆکەیەک دروست بکەن دارێکی بەدرێژایی بسـتێک، دارێکی بەدرێژایی دوو گرێی لەسەری ئەپێچن ڕاست و چەپ کـە وەکـو سـەلیبی لێـدی، چەند پارچە پەڕۆکێکی لەدەوریدا دەئاڵێن و دەبێ بەسـەرکی بووکـوکـە، بەدرێژایی پەنجەیێ لە خـوارەوەی ئەم سـەرکـە دارێکی بەدرێژایی پەنجەی نێـوان هەمـیشـە ڕاست و چەپ لەگەڵ دارە درێژەکـەدا ئەپێـچن و تێـڵـمـە پەڕۆی پێـوە دەئاڵێنن و دەیکەن بەهەردوو دەستی بووکـۆکـەکـە، لەپاشـان پەڕۆ لەهەمـوو لاشەی بووکەکە دەپێچن و ئەستووری دەکەن.

ئەمجـا جلی بووکـێنیی لەبەردەکەن، سـەر کـڵاو و دەسـتـرۆک و هیـزاری لەسـەری دەپێچن، تۆڕ یا سەرکەلەی لەپشتی دەپێچن، دوو تیڵمە پەڕۆش دەکـەن بە ئەنگوچکی کراسـەکـەی و لەهەردوو دەسـتـەکـانی دەپێـچن و ئەنگوچکەکـانی شـۆڕ دەبێـتـەوە، دەستماڵێکیش ئەخەنە سەر سەری و دەبێ بە بووکـێکی ڕازاوە. ئەمـجـارە گۆرانی بو دەڵێن:

**بووکــــانە بووکــــانە بـووکێ**
**بووکـمـان گـەلەک جووانە بووکێ**
**بەمــــۆری و مـــــەرجـــانە بووکێ**

بەمــجــۆرە هەر چینێ بەســەر بووکۆکەکەی خۆیاندا دەڵێن و سووقی ئەو کـچـانەی پێـوە دەکـەنەوە کـە بووکۆکەیان نییە.

### * بەنتک

کە لە هەر ماڵێ پرتەقاڵ یا لیمۆ بخـورابوایە، کـچـە بچکۆڵەکـان پەلکەکـانیـان کـۆدەکـردەوە هەمـوویان دەکـرد بە پارچەی بچـووک بچـووک، هەر پارچەی بەقـەدەر قـۆپچـەیێکی بچـووک، چەند داوە دەزوویێکیـان ئەهێنا هەر یەکـــەی بەدرێژایی پەنجـەیێک ئەم پارچانەیان وەکـوو دەنکە تەسبیح بەداوەکانەوە ئەخست و دەیانکردن بە بەنتک، سـەری چوار پێنج بەنتکیان بەیەکەوە گرێ دەداو بەزێی (یاخە)ی خۆیانەوەیان دەخست بەهەردوو لایەخـەی کـورتەکـیـانەوە ئەدووری. هەروەها ســوتکـە و قـەنەفلیـان لە دایکیـان ئەسـتـاند و دەیانکرد بە بەنتک، هەموویان بەریزە ئەدووری بەهەر دوو لا یاخـــەی کـورتەکـیـدا، کـە بۆنێکی خـۆشی سۆتکە و قەنەفل و پرتەقاڵ و لیمۆی لێـەهات، کـچـەکـە زۆر شـانازیی پێیانەوە دەکرد. جاری وا دەبوو یەک دوو جووتیشی لەم بەنتکانە بەدیاری پێشکەش بەدەستە خووشکیکی زۆر خۆشـەویسـتی دەکـرد کـە زۆر بەم دیارییە شادمان و خۆشحاڵ دەبوو.

### * پێنجوکانێ

ئەم یارییە لە بەینی (٢-٥) کچ دەکرێ لە تەمەنی (٨-٢٠) ساڵیدا. پێنج بەردی بەقـەدەر هێلکە کێشکە کۆدەکەنەوە، تەڕ و هیشکانێ دەکەن لەسەر ئەوەی کامیان لەپێشا دەست بەیاری بکا، سەرکەوتووەکە دەست بە یاری دەکـا و یەکـێـک لەبەردەکـان بەدەسـتـەییـەوە دەگرێ و بەردەکـانی دیکەیش هەڵدەداتە ســەر زەوی، بەردەکــەی دەسـتی بۆ ئاســمــان هەڵدەدات و بەردێک لەســەر زەوی هەڵدەگرێتەوە و بەردەکەی ئاسمانیش دەگرێتەوە پێش ئەوەی بکەوێتە سەر زەوی بەم چەشنە هەر چوار بەردەکەی سـەر زەوی بەدەسـتێک یەکـە یەکـە هەڵدەگـرێتـەوەو لەناو دەسـتـەیدا دەیانگرێ، هەر چوار بەردەکــــە هەڵدەداتەوە سەر زەوی و هەر جارەی بەردەکەی دەستی بۆ ئاسمان هەڵدەدا و دوو بەرد بەجـارێ لەسـەر زەویدا هەڵدەگرێتەوەو بەردەکەی ئاسمانیش دەگرێتەوە پێش ئەوەی بکەوێتە سەر زەوی. تا بـەدووجــــار هەر چوار بەردەکەی سـەر زەوی هەڵدەگرێتەوە هەمــیـشــە هەر چوار بەردەکــە هەڵدەداتەوە سـەر زەوی، بەردەکـەی دەستی بۆ ئاسـمـان هەڵدەدا و سێ بەرد لە زەویدا هەڵدەگـرێتـەوە و

بەردەکەی ئاسمانیش دەگرێتەوە، بەردەکەی دیکەیش بەم جۆرە لەسەر زەویدا هەڵدەگرێتەوە. لە پاشان هەر چوار بەرد بۆ زەوی هەڵدەدا و هەر چواریان بەجارێ هەڵدەگرێتەوە. دیسان هەڵیان دەداتەوە کە یەکە یەکە بەردەکان هەڵدەگرێتەوە بەچەشنی یەکەم جار دەست بە بەشی دووەمی ئەم یارییە دەکا.

هەر چوار بەردەکەی دەستی هەڵدەداتەوە سەر زەوی و تەنیا بەردێک لەدەستەیدا دەمێنێتەوە، پەنجەی گەورە و دۆشاو مژەی دەستێکی وەکو کەوان لێدەکات و لەسەر زەویدا دەیانچەقێنێ لەپێش چوار بەردەکە، کچەکانی دیکەیش بەردێک لە چوار بەردەکە لەپێش چەقاوەکەیدا دەکەن بە (مەلا).

پێویستە کچە یاری کەرەکە هەر جارەی کە بەردەکەی دەستی بۆ ئاسمان هەڵدەدا بەردێک لەسێ بەردەکانی سەر زەوی (جگە لەمەلا) لەژێر دوو پەنجە کەوانەکەیدا دەربیکا بەبێ ئەوەی بەردەکە بە مەلا بکەوێ، بەردەکەی ئاسمانیش دەگرێتەوە پێش ئەوەی بکەوێتە سەر زەوی، بەم جۆرە هەر سێ بەردەکە لەژێر دەستیدا دەردەکا لەپاشان بەم جۆر مەلاش دەردەکات بەژێر کەوانەکەدا. لەدواییدا هەر پێنج بەرد لەناو دەستەکانی دەگرێ و بەخێری هەڵیان دەدات بۆ ئاسمان بەپشتی هەردوو دەستەکانی کە (بەیەکەوە پانیان دەکاتەوە) بەردەکان دەگرێتەوە، جا چەند بەردی بەم جۆرە گرتەوە هەر یەکێکیان بەئارەزووی خۆی دەکا بە شتێ کە ئازاری کچەکانی دیکەی پێوەبدا. یەکیان دەکا بەمار، یەکێ بە لیفە، یەکێکی دیکە بەشانە.... هتد.

منداڵەکانی دیکەیش هەریەکە دەستی خۆی لەسەر زەویدا پان دەکاتەوە پشتی دەستی دەکەوێتە سەرەوە، هەر جارەی یەکێکیان بەهەموو بەردەکان ئازار دەداو هەر جارەی یەکێک لەم بەردانە بۆ ئاسمان هەڵدەدا و نینۆکی هەر چوار پەنجەی دەستی بەهێز بەپشتی دەستی کچەکەی دیکەدا دەخشێنێ و دەڵێ (شانە) و بەردەکە لە ئاسمانەوە دەگرێتەوە پێش ئەوەی بکەوێتە سەر زەوی. بەمجۆرە تا جارێ بەردەکە دەکەوێتە سەر زەوی پێش ئەوەی بیگرێتەوە، ئەمجا بەردێکی دیکە هەڵدەدا و قونجیلکەییکی بەهێز لەپشتی دەستی کچەکە دەدا و دەڵێ (مار) و بەردەکە لە ئاسماندا دەگرێتەوە بەم جۆرە تا ئەم بەردەش دەکەوێتە سەر زەوی. بەردەکانی دیکەیش بەم جۆرە هەر یەکە بەناوی خۆی ئازاری کچەکەی پێوە دەدا تا هەموو بەردەکان کۆتاییان دێ. ئەمجا کچەکانی دیکەیش یەکە یەکە وەکو کچەکەی پێشوو بە هەموو بەردەکان دەدرێن.

بەڵام ئەگەر سەرکەوتووەکە کچێکی خۆشەویستی تێکەوتبێ، ئەوا هەموو بەردەکان دەکا بەشتی بێ ئازار وەکو (سابوون) واتە، کە بەردەکە بۆ ئاسمان هەڵدەدا و ناو لەپی خۆی بە نەرمی بە دەستی کچەکەدا دەخشێنێ و دەڵێ (سابوونە) و بەردەکە دەگرێتەوە بەم چەشنە تا جارێ بەردەکە دەکەوێ، هەروەها بەردەکانی دیکەیش دەکا بەشتی بێ ئازار.

ئەمجا لەسەرەوەیەوە دەست بە یارییەکە دەکەنەوە. ئەگەر لەبەشی یەکەم و دووەمی ئەم یارییەدا هەر جارێ کچەکە بەردەکەی ئاسمان نەگرێتەوە پێش ئەوەی بکەوێتە سەر زەوی، یا بەردێکی لێجێ بمێنێ لەکاتی هەڵگرتندا، یا لەدەستیدا بکەوێتە خوارەوە کچەکە لەیاری دەکەوێ و کچێکی دیکە لەسەرییەوە دەست بەیارییەکە دەکاتەوە.

### * تیتلی سماق

دوو کچ پشتیان بەیەکەوە دەکەن و لەتەنیشت یەکدا دەوەستن، واتە هەر یەکەیان روویان لەلایەکە، هەر یەکێکیان دەستێکی دەخاتە ژێر هەنگڵی کچەکەی دیکە و لەسەر ملی کچەکەدا دەیسورێنیتەوە، دەستەکەی دیکەشیان بۆ تەنیشتە بەرملاکەیاندا درێژ دەکەن، لەسەر ئاوازێکی تایبەتی هەڵدەپەرن و بەدەوری یەکدا دەستورێنەوە یەکیان دەڵێ: تیتلی سماق؟.

ئەوەی دیکە دەڵێ: نانی گەنم.

ئەوەی یەکەم دەڵێ: تیتلی سماق؟.

ئەوەی دیکە دەڵێ: نانی جۆ.

لەهەر گۆرەپانێکدا چەند قۆپەنە کچێک بەم جۆرە دوو دوو بەتوندی بەسەریەکدا دەسورێنەوە بەم جۆرە پرسیار و وەڵام دانەوەیە، کە دەستەیان لەسەر ملی یەک داناوە، دەنگ و ئاوازەکانیان تێکەڵدەبێ وەکوو دەنگی بولبول کە لە دارستانەکاندا دەخوێنن و دیمەنێکی

زۆر جوان ئەبەخشێ بۆ ئەو کەسەی، کە سەیریان دەکا لەکاتی یارییدا.

*** چۆل چۆلیانێ**

ئەم یارییە لەبەینی (٢-٥) کچ دەکرێ لە تەمەنی (٨-١٢) ساڵیدا. لەسەر زەوی حەوت خانە دروست دەکەن لەتەنیشت یەک، کە درێژایی هەر خانەیەک بەژنە منداڵێک بێ بە بەژنی خۆیان، بەرینایییەکەشی دوو پێ بێ، لە دوای خانەی حەوتەمیش چۆڵێ کە چوارگۆشەیەکی بەدرێژایی بەژنێکە.

بەردێکی پان، یا تاسولقەیێک، بەقەدەر ناولەپێک یا بچووکتر دەکەن بەساپ، یەکێکیان دەست بەیاری دەکا، ساپەکە بەدەستە بۆ خانەی یەکەم هەڵدەداو بە چوززەکە لەسەریەک پێ ئەڕوا و بەردەکە بەپێیەکەی خانە بەخانە ئەباو ئەیگێڕێتەوە لەخانەی یەکەم دەری دەکا، جاری دووەم ساپەکە بۆ خانەی دووەم هەڵدەدا و وەک جاری پێشوو ئەیباتە چۆڵی و ئەی گێڕێتەوە لەخانەی یەکەم دەری دەکا، ئەمجا بۆ خانەی سێیە و چوارە و پێنجە و شەشە و حەوتە و چۆلی بەم جۆرە هەڵیان دەدا و بە چوززەکە ئەی ئەیگەیەنێتە بەمەرجێ بەردەکە بۆ هەر خانەیێک هەڵبدات بکەوێتە ناویەوە و، ئەو پێیەی بەرزی دەکاتەوە نەیخاتە سەر زەوی تا ساپەکە دەباتە چۆلی و ئەیگێڕێتەوە، پێیەکەی دیکەیشی نەکەوێتە سەر خەتی خانەکان و چۆل هەروەها بەردەکەش نەکەوێتە سەر خەتەکان، خۆشی لەکاتی هەڵدانی ساپەکە بۆ خانەکان شەقاوێ لەدووری خانەی یەکەم بوەستێ ئەگەر یەکێ لەم مەرجانەی تەواو نەبێ لەیاری دەکەوێ و کچەکەی دوای ئەو دەست بەیاری دەکات لەسەریەوە ئەویش هەر بەم مەرجانە، بەڵام ئەگەر یاریکەرەکەی پێشوو هیچ کەم و کوڕی نەبێ و هەموو مەرجەکانی تەواوبێ ئەوا هەر لەیاری بەردەوامە و لەکاتی هاویشتنی بەردەکە بۆ چۆلی لەسەر ئاوازێکی تایبەتی دەڵێ:

**ئەی چیلکە بەڕیالیکە**
**مالم دوورەو نزیکی کە**

ئەگەر ساپەکە کەوتە ناو چۆلی، ئەوا بە چوززەکە دەچێ و بەردەکە خانە بەخانە دەگێڕێتەوە تا لەخانەی یەکە دەریدەکا ئەم کچە چۆل تەواو دەکا و خانەی دواوە دەبێ بە پشوو بۆ ئەوە لەکاتی یاریدا هەر جارێ گەیشتە ئەم خانەیە هەر دوو پێیەکانی دەخاتە سەر زەوی و لەناو ئەم خانەیەدا (بین) دەدا بە ئارەزووی خۆی. ئەمجا پێیەکەی بەرز دەکاتەوە لێی دەردەچێ. جا چەند جارێ چۆلی تەواو بکا هەندە لەخانە جووتەکان دەبێ بە ئیسرەحاتی کە (٦.٤.٢) هەمووی دەبێ بەپشووی ئەو سێ جاریش زیاتر چۆل تەواو بکا ئەوا لەناو چولی دا چەند جێگەیێک بۆ پشووی خۆی دیار دەکا بەقەدەر زیادەکەی. تا جارێ لەیاری دەکەوێ، بەڵام پشوو هەردەمێنێ بۆ جاریکی دیکە کە ریزەی نەگاتەوە سەر. ئەمجا کچەکەی دوای ئەو لەسەرییەوە دەست بەیاری دەکا بە مەرجێ لەکاتی یاری کردنیدا لەسەر هەموو پشووەکانی کچەکەی پێشوو بازبداو پێی نەکەوێتە ناویانەوە و هەروەها ساپەکەشی، تا ئەویش چەند جارێ چۆل تەواو دەکا و هەندێ پشووی دەبێ لە خانەی (٦.٤.٢، چۆلی). هەروەها کچەکانی دیکەش بەمجۆرە یەکە یەکە یاری دەکەن تا لەیاری تێردەبن. جا کامیان پشوویان لەهەمووویان زۆرتر بێ ئەو سەردەکەوێ.

*** حووحایی**

(٢-١٠) کچ لەتەمەنی (٨-١٢) ساڵیدا بەرانبەر یەک لەسەر زەویدا بە چینچکان دادەنیشن کە هەموو گرانایی لەشیان دەکەوێتە سەر هەردوو پێیەکانیان و هەموو لەگەڵ یەکدا بەپەلە و بەبێ وەستان خۆیان بۆ ئاسمان هەڵدەدەن و لە سەر چنچکان دادەنیشنەوە لەگەڵ خۆهەڵدانەکەشیاندا دەسوورێن و یەکێکیان لەسەر ئاوازەیەکی تایبەتی ئەم هەڵبەستە دەڵێ و ئەوانەی دیکەیش دێر بەدێر بەدوایدا ئەیگێڕنەوە:

**حووحایی**
**خۆ نەمرم دەت بەزێنم**
**دۆخینت دەپسێنم**
**بو برای خومت دێنم**
**یا دەڵێ:**
**حووحایی**
**نانی دایکی خۆمە**
**یەک بە بەژنی خۆمە**
**بەژنی خۆم چنارە**
**نەختی خۆم هەزارە**
**لەسەر بەردە بۆری**
**کەزیم بوونە گۆری**
**ناکەم پەستەک سۆری**

**لەسەر بەردە سپیمە**
**ترێ تایفیمە**
**بەگولەی قایل نیمە**
**خوشکی تفەنگ چیمە**
**بەگولەی رازی نیمە**
**لەسەر بەردە رەشی**
**کەزیم گەییە لەشی**
**ناکەم پەستەک رەشی**

جا هەر یەکێ ماندووبێ و بوەستێ، یا بکەوێتە سەر زەوی لەکاتی یارییدا، لە یارییەکە دەردەچێ تا یەکێکیان دەمێنێتەوەو بەسەر هەموویاندا سەردەکەوێ و دەیانبەزێنێ.

*** حەممەشکێ**

دوو منداڵ بەرانبەر یەک دەوەستن و بەهۆی پەنجەکانیان هەر دوو دەستەیان وەکوو چەنگاڵ لەیەک گیردەکەن، لەسەر ئاوازێکی تایبەتی ئەم یارییە دەڵێن:

**حەممەشکێ**
**دۆدانەی سەر بەرشکێ**
**کابانی دەو بەکەشکێ**

واتە هەر جارەی یەکیان ئەوەی دیکە بۆ لای خۆی رادەکێشێ و دەڵێ: حەممەشکێ، ئەوی دیکەیش خۆی بۆ شل دەکا و دەڵێت: دۆدانەی سەر بەرشکێ. ئەمجا کچەکەی دیکە خۆی راست دەکاتەوە بەپێچەوانەوە کچەکەی یەکەم بۆ خۆی رادەکێشێ خۆی بەلای پشتێدا خوار دەکاتەوە و دەڵێ: حەممەشکێ. کچەکەی یەکەمیش خۆی بەسەریدا خوار دەکاتەوە و دەڵێت: کابانی دەو بەکەشکێ.

بەمجورە بەلای یەکدا خوار دەبنەوەو هەر جارەی یەکێکیان ئەوەی دیکە بۆ خۆی رادەکێشێ، هەندە بەتوندی بە لای یەکدا خوار دەبنەوە لەگەڵ ئەم یارییەدا کە پەرچەمەکانیان وەکوو دەرویشان ئەلەرێتەوە.

*** حێللانێ**

(٣-١٠) کچ لەتەمەنی (٨-١٢)ساڵیدا دەستی یەک دەگرن و بازنەیی لەتەنیشت یەکدا دەوەستن، هەموو بازنەیی دەسوورێن بەتوندی بێ راوەستان، لەسەر ئاوازی ئەم هەڵبەستە، کە یەکێکیان دەیڵێ کە هەر دێرێک دەڵێت: لە هەڵبەستەکە کچەکانی دیکە هەموو بەجارێک دەڵێن: حێللانێ. ئەمەش هەڵبەستەکەیەتی:

**هە چەرمە چەرمە چەرمە حێللانێ**
**حەز لەبووکێ خۆ شەرمە حێللانێ**
**بووکم بوو حەللارم بوو حێللانێ**
**لەگەڵ وسوە لارم بوو حێللانێ**
**وسوەلاری دوو گردی حێللانێ**
**دەم هێناو و دەم بردی حێللانێ**
**لەبرام مارە دەکردی حێللانێ**
**مارە مارە هەڵبەزی حێللانێ**
**بەسنجاق و بەدەرزی حێللانێ**
**سنجاقی تۆم زێرینە حێللانێ**
**لەخالانم گێرینە حێللانێ**
**خالانی تۆم خەندەکە حێللانێ**
**ماینۆکێ گێ بەڵەکە حێللانێ**
**ماینۆکە ماخۆت مری حێللانێ**
**لەدەو گەروان بمری حێللانێ**
**گەرووی لە قوم قومۆکی حێللانێ**
**دوو چاو لە نێرگزۆکێ حێللانێ**
**نێرگزۆکە ماهییە حێللانێ**
**دوو گێیی لەپشت کەزییە حێللانێ**
**ئەو کەزیانە چ لێ کەی حێللانێ**
**ماڵ و مێردی پێ دەکەی حێللانێ**
**ماڵ و مێردت خرابی حێللانێ**
**دەرکۆڵی پێوە درابی حێللانێ**
**دەرکۆڵەی بەزنجیرە حێللانێ**
**تێدایە شێخ و میرە حێللانێ**
**شێخ و میر و ئەحمەد بەگ حێللانێ**
**جووتە سوارەکی چەلەنگ حێللانێ**
**لە بلباسی بووە دەنگ حێللانێ**
**بلباس هاتییە بەقنجی حێللانێ**
**شەرە لەسەر برنجی حێللانێ**
**سمایلاغەی هاوار کرد حێللانێ**
**تفەنگا قوتەی سوار کرد حێللانێ**
**بیست و شەشی مردار کرد حێللانێ**

تا هەموو کچەکان شل دەبن ئەمجا دەستی یەک بەر دەدەن و بێن دەدەن. چل پەنجا ساڵی لە پێش ئێستا کچە عازەبەکانیش تا تەمەنی شانزە ساڵی ئەم یارییەیان دەکرد، بەڵام ئێستا بووە بە یارییەکی تایبەتی کچان.

*** سابوونە رەقە**

دوو منداڵ لەتەمەنی (٦-١٢) ساڵیدا بەپێوە دەوەستن و پشتیان بەیەکەوە دەنووسێنن، یەکێ لە کچەکان هەر دوو دەستی لەسەر هەردوو شانی کچەکەی دیکە ئاوا دەکاو لە ژێر قۆڵییەوە دەریدەکا، کچەکەی دیکەیش هەر دوو دەستی دەخاتە ژێر قۆڵێ کچەکەو هەر دوو باسکی دەستەکانی بە دەستەکانی خۆی دەگرێ.

هەر جارە و یەکێکیان ئەوەی دیکە بەرز دەکاتەوەو سینگی خۆی بۆ پێشەوە خوار دەکاتەوە و دەڵێ: (سابوونە رەقە). ئەوەی دیکەیش دەڵێ: بەتەقە تەقە. ئەمجا

بەپێچەوانەوە ئەوەی دیکە ئەمەیان بەرز دەکاتەوەو دەڵێ: کیسە و کەمەر. ئەویش دەڵێت: یا پێغەمبەر.
بەمجۆرە هەڵبەستانە هەر یەکەیان دێرێک دەڵێن و پێدا دەچنە خوارەوە، ئەمەش هەڵبەستەکەیەتی:

**سابوونە رەقە**
**بەتەقە تەقە**
**کیسە و کەمەر**
**یا پێغەمبەر**
**چەقەڵی جۆمی**
**مەسینەی گۆمی**
**ئاگر گەشە**
**پلاو خۆشە**

*** سووتام، برژام**
ئەم یارییە لە بەینی (٦-١٢) کچ دەکرێ لەتەمەنی (٧-١٠) ساڵیدا. دوو کچ دەبن بەسەردار و نەختێ لە منداڵەکانی دیکە دوور دەبنەوە، دوو تاسولقە لەپێش خۆیان کە هەڵبەستەکە دوایی هات دەستی لەسەر کام قومەت بێ ئەویان ئەبژێرێ و ئەی پشکنێتەوە، ئەگەر دەنکە موورییەکەی تێدابێ ئەوا بۆ خۆیەتی ئەگینا کچەکەی دیکە لەناو قومەتەکەی دیکەدا بۆ خۆی دەیدۆزێتەوە.
کچەکەی دیکەیش بەم چەشنە قومەتێکی پێش ئەم کچە بۆ خۆی دەبژێرێ و لەناویدا دەگەرێ ئەگەر تێیدابێ بۆ خۆیەتی ئەگینا کچەکە بۆ خۆی لە قومەتەکەی دیکەدا دەریدێنێ.

*** مەگری، مەگری مەگری**
(٤-١٥) کچ لە تەمەنی (٧-١٢) ساڵیدا دەستی یەک دەگرن و بازنەیی بە پێوە دەوەستن، بەجارێ دەسوورێن و خۆیان دەلەرێننەوە لەسەر ئاوازەی ئەم گۆرانییە کە یەکێ لەکچەکان دەیلێ:

**مەگری، مەگری مەگری**
**پێکرا بچینە قەبرێ**
**قەبری تەنگ و تارە**
**پر لە مشک و مارە**
**مشک و مار حەزیایە**
**خۆی لە رمبی دایە**
**رمبی هووکە هووکە**
**بردیان جووتە بووکە**
**بووکی مارێ میری**
**بردیان بۆ یەخسیری**
**یەخسیری قەلاتێ**
**ئەحمەد بەگی کاتی**
**دوو دسترۆکی داتی**
**دسترۆکی هەوریە**
**لەبرینی پێچییە**
**برینی کامێشێ**
**بەردان دەقەلێشێ**
**بەردی ئەو لەماڵی**
**پێدادەن دەستماڵی**
**دەستماڵی پیرۆزە**
**لەماینەکی بۆزە**

لەسەر ئاوازی ئەم گۆرانییە دەسوورێن و کچەکە چەند جارێ لە سەرییەوە دووبارەی دەکاتەوە تا هەموو شل دەبن.

*** هەڵوور بەلوور (زایی مایی)**
ئەم یارییە لە بەینی (٣-٦) کچ دەکرێ لە تەمەنی (٦-١٠) ساڵی دا. هەموو لەتەنیشت یەک دادەنیشن و پێیەکانیان بۆ پێشەوە درێژ دەکەن و تا چۆکیان رووت دەکەن و یەکێکیش دەبێ بەسەردار لە بەرانبەریان دادەنیشێ، پەنجەی شادە (دۆشاو مژە)ی دەستی راستی دەخاتە ناو دەمییەوەو تەری دەکاو یەکە یەکە ئەیخاتە سەر لاقی منداڵەکان و هەر وشەیەک لەم هەڵبەستە دەڵێ و پەنجەکەی لەسەر لاقێکەوە دەخاتە سەر لاقێکی دیکە بەریزە، ئەمەش هەڵبەستەکەیەتی:

**زایی مایی**
**دوو زورنایی**
**زورنا چەککە**
**پێ بە لەککە**
**عەیشی ماوان**
**لە خۆشناوان**
**دەگری چاوان**
**چاوێ بەگوو**
**پیم تێوە چوو**
**هەڵگر ئەتوو**

یا دەڵێ:

**هەڵوور بەلوور تەکامە**
**زەرد و سوور و شەمامە**
**ئاوە بەرە**
**دەنکە زەرە**
**مێخم کوتا مێخ هەڵبەزی**
**تیکەی راستم ئەمەی گەزی**

دوا وشە لەهەڵبەستەکە لەسەر کام لاق کۆتایی بێ قونجیلکەیەکی لێدەدا، منداڵەکەش ئەو لاقەی دەکێشێتەوە ژێر لەشی خۆی و دایدەپۆشێ بەکراسی خۆی، هەر کاتێ جێگەیێکی گۆشتی ئەم لاقە دیاربێ سەردارەکە قونجیلکەیەکی وای لێدەدا سووری دەکاتەوە. ئەمجا لەسەرییەوە دەست بە هەڵبەستەکە دەکاتەوە، بەم جۆرە یەکە یەکە تا هەموو منداڵەکان لاقەکانیان ئەکێشنەوە بۆ ژێر خۆیان و

دایدەپۆشن.
ئەمجا بەشی دووەم لەم یارییە دەست پێدەکا کە هەر جارەی کچێک بانگ دەکا و ئەم پرسیار و وەڵامانەی لەگەڵ دەڵێ:
سەردارەکە دەڵێ: کچەکەش دەڵێ:
١- چیت لە بنە؟ ١- مافورە.
٢- چیت لەسەرە؟ ٢- تەندوورە.
٣- چی پێوە دای ؟ ٣- زەنگە زوورە.
٤- چیت تێراچوو؟ ٤- درزیلە.
٥- نەختێ ئاوم بدێ؟. ٥- ها (لەگەڵ دەستە درێژ کردنێکدا).
سەردارەکەش دەستی بۆ دەمی دەباو دەمی لێکدەدا و زۆر بە تامەزرۆ (وەکوو یەکێ شتێکی خۆش بخوا)، دەڵێت: تاڵە، جارێکی دیکە دەمی لێکدەدا و دەڵێ: شیرنە، جاری دوایەی دەڵێ: زەقنە بووتە.بەکچەکە دەڵێ: هەڵسە کەرەکە ئاوبدە ؟ کچەکەش هەردوو دەستی دەخاتە سەر چۆکەکانی خۆی و بەپەلە هەڵدەستێتەوە، ئەگەر چۆکی قرچەی لێوەهات دەبێ بەزێر، ئەگەر هیچ چرقەیەکێشی لێوە نەهات ئەوا دەبێ بەگوو.
کچەکانی دیکەش بەم چەشنە بانگ دەکاو ئەم پرسیارو وەلام و فەرمانەیان لە سەر دەکا، ئەوەی زێری دەچێتە جێگایەک دادەنیشی، گووە کانیش لە لایەکی دیکە دادەنیشن.
ئەمجا بەشی سێیەمی ئەم یارییە دەست پێدەکەن، زێرەکان هەر یەکە نەختێ لە کراسی خۆیان بە هەر دوو دەستە لەپێشە خویەوە دەگرن وبە دەورەی گووەکاندا دەسوڕێنەوە دەڵێن: پیسکە هەندەم بو بشۆ نیسکە، ئەوانیش هێرش بو زێرەکان دەبن بو ئەوەی دەستە لە سەریان بدەن پێش ئەوەی دانیشن.

### * هەڵیسکۆ

دوومنداڵ بەرانبەر یەک دەوەستن و لەسەر ئاوازێکی تایبەتی ئەم یارییە خۆیان بو ئاسمان هەڵدەدەن و پێیەکانیان لەیەک دوور دەخەنەوەو دەستەکانیشیان بۆئاسمان بەرز دەکەنەوە و لەسەر سەریان هەر جارەی چەپڵەیەک لێدەدەن و دەستەکانیان بەخوارەوە شۆڕ دەکەنەوەو شەپێک لەرانەکانیان دەدەن و پێکانیان جووت دەکەنەوە. هەریەکەیان لەسەر ئاوازەی هەڵپەرینە کە جنیو بە کچەکەی بەرانبەری-دەدا بەم هەڵبەستانە، هەر کچێک بە ناوی کچەکەی بەرانبەری. کە یەکیان ناوی ئایش بێ ئەوەی دەڵێ:

**هەڵیکسۆ ئەمن و ئایش**
**هەڵیسکۆ دەرێ قایش**

ئەگەر ئەمەش ناوی زارا بێ، ئەوا ئایش بەم هەڵبەستە وەلامی دەدانەوە:

**هەڵیکسۆ ئەمن و زارە**
**هەڵیکسۆ لەسەر دارە**
**هەڵیسکۆ وەرە خوارە**
**هەڵیسکۆ بی بن و بارە**

جاکامیان ماندوو بێ و لە یارییەکە رابوەستێ تێئەکەوێ.

### * هەی مشک، مشک مشک ؟

(٣-١٢) کچ دەستی یەک دەگرن و بە پێوەک بازنەیی دەوەستن بەرانبەر یەک، یەکێک لە کچەکان ئەم هەڵبەستە لەسەر ئاوازەیەکی تایبەتی ئەم یارییە دەڵێ، کچەکانیش هەموو لەسەر ئاوازی گۆرانیبێژەکە ئەم هەڵبەستە هەموو بە جارێ دەڵێن: هێ هێ، ئەمەش هەڵبەستەکەیە:

*** هەی مشک، مشک مشک؟**
**مشک هاتە کولینی**
**دەستی کرد بە فنە فنی**
**خواردی ماستی هەمینی**
**هاجەر حەمرت نەمینی**
**دەچمە گەرێ گۆرانی**
**دەکوژم نێری و بەرانی**
**سەرو پێچک لۆ کابانی**
**ریخەڵوک لۆ شوانی**
**جەرگ و ناو لۆ میوانی**

### ٣- یارییەکانی هاوبەشی کور و کچ

### * بابی بابی

ئەم یارییە لە بەینی (٢-١٠) منداڵ ئەکرێ لە تەمەنی (٤-٧) ساڵیدا. گەورەیەک دەبێ بە سەرداریان، منداڵەکان هەموو لە بەرانبەریدا دادەنیشن، گەورەکە ئەم شتانە لە دەستە خۆیدا ئەگرێ کە هەر یەکە ناوێکی تایبەتیان هەیە لەم یارییەدا:
١- پارچە پەرۆکێک (قاوە).
٢- نەختێک پەمۆ (پەنیرە).
٣- هەر مردییەک (گۆزە).
٤- پشولە پووشێکی بچووک (داسووکە).
٥- لە قشپلێک (گایێ رەش ).
هەر جارەی یەکێ لەم شتانە لە ناو دەستی خۆیدا ئەگرێ و بۆ پێش منداڵەکان یەکە یەکە لێیان ئەپرسێ: قاوە، پەنیر، گۆزە، داسوکە، گایێ رەش؟

منداڵەکەش ناوی یەکێک لەم شتانە دەڵێ، ئەگەر ئەو شتە لە دەستە گەورەکە بێ ئەوا منداڵەکە سەر دەکەوێ و لە یارییەکە دەردەچێ، گەورەکەش دەستی خۆی دەکێشێتەوە و شتێکی دیکە دەخاتە ناو دەستەییەوە بۆ منداڵیکی دیکەی درێژ دەکا و ناوی هەموو شتەکان بۆ ئەو منداڵیش دەژمێرێ، منداڵەکەش ناوی یەکێ لەم شتانە دەڵێ. ئەگەر ئەو شتە لەناو دەستی گەورە کەبێ ئەویش لەیاری دەردەچێ و سەردەکەوێ. هەویش نەبێ ئەوا دەستەکەی بۆ پێش منداڵێکی دیکە درێژ دەکا، ئەگەر ئەویش نەیزانێ یەکی دیکە.

بەمجۆرە تاهەموو منداڵەکان یەکە یەکە دەردەچن، تەنیا یەکێکیان ئەمێنێتەوە لە دوای هەموویاندا کەهیچ جارێ ناوی شتەکەی ناودەستی گەورەکە نازانێ لەو کاتەی کە لە پێشیدا رایدەگرت، ئەومنداڵە تێدەکەوێ.

سەردارەکە سەری تێکەوتووەکە دەخاتە سەر رانی و لە ژێرەوە بەدەستەکانی هەر دوو چاوی دەگرێ و دەڵێ: تەپە رەپە، تەپە رەپە.... هتد.

منداڵەکانی دیکەیش هەموو رادەکەن و هەر یەکە خۆی لە جێگایەکدا دەشارێتەوە. ئەمجا سەردارەکە چاوی تێکەوتووەکە دەکاتەوە و دایدەنیشێنێ، کە سەیری هەر چوار دەوری خۆی دەکا هیچ منداڵێک نابینێ، سەردارکە ناوی یەکێ لە منداڵەکان دەڵێ کە دەڵێت: (فیسار) لەکام لا بێتەوە، منداڵەکەش دەستی بۆ لایەک درێژ دەکا و دەڵێ: لەم لایە، گەورەکە بانگی منداڵەکە دەکا و دەڵێ: فیسار (ناوی منداڵەکە) زەڕ، منداڵەکش لەو جێگەیەی کە خۆی شاردووەتەوە دەرئەپەڕێ و دەڵێ: عۆزۆ ئەگەر لەو جێگەیە دەرچوو کە تێکەوتووە پەنجەی بۆ درێژ کردبوو ئەوا گەورەکە پێی دەڵێ: وەی ماکەر، بەڵام لە لایەکی دیکە دێتەوە ئەوا سەردارەکە پێی دەڵێ: وەی نێرەکەر. هەموو منداڵەکان یەکە یەکە بەم جۆرە کۆدەکەنەوە، ئەوەی ماکەر بێ تێدەکەوێ، نێرەکەرەکانیش سەر دەکەون.

لەپێشانا منداڵە چاو-گیراوەکەی پێشوو لە سەر چینچکان دادەنیشێ سەری دەخاتە سەر کۆشی سەردارەکە، یەکێ لە نێرەکەرەکان سواری پشتی دەبێ، سەردارەکە هەر جارەی چەند پەنجەیەکی دەستێکی دەخاتە سەر پشتی ملی داچەقاوەکەو دەڵێ:

**بابی بابی**
**حەمەدەی رابی**
**تەقڵەی لەچەندان دابی**

منداڵەکەش ژمارەیەک دەڵێ کە لە ژمارەی پەنجەکانی دەستێک زیادتر نەبێ، ئەگەر ئەم ژمارەی کە دەڵێ لەگەڵ ژمارەی ئەم پەنجانە یەک بێ، کە لەسەر پشتی ملیەتی، ئەوا منداڵەکەی سەر پشتی دێتە خوارەوەو نێرەکەرێکی دیکە سواری پشتی دەبێ. بەم جۆرە یەکە یەکە نێرەکەرەکان سواری پشتی دەبن، کە ژمارەی پەنجەکانی لەپشتی ملیدا زانی دێنە خوارەوە. ئەمیش بەم جۆرە یەکە یەکە سواری پشتی هەموو ماکەرەکان دەبێ.

*** بچین بچین**

ئەم یارییە لە بەینی (٢-٥) منداڵ دەکرێ لە تەمەنی (٤-٧) ساڵیدا. هەموو بازنەیی بەرانبەر یەک دادەنیشن، یەکێکیان هەردوو دەستەکانی لەپێش خۆیەوە دەگرێ بەدەستێکی پەنجەکانی دەستەکەی دیکەی یەکە یەکە دەچەمێنێتەوە لە پەنجەی بچووکەوە دەست پێدەکا و دەڵێ: بچین بچین؟، کێوە بچین؟ بچینە دزی!. خودا و پێغەمبەر قەبوڵ ناکا؟، بەملی من!.

ئەم یارییە چیرۆک و بەسەرهاتی ئەم پەنجانە دەگێڕنەوە پەنجەی بچووک بە پەنجەکانی دیکە دەڵێ: بچین بچین؟ تاکو بیر لەکارێک بکەنەوە بیکەن، پەنجەی دووەم (برای تووتە) سەری سوڕدەمێنێ و دەڵێ: کێوە بچین؟! پەنجەی نێوان (هەڵمەقۆ) دەڵێ: بچینە دزی!!، پەنجەی شادە (دۆشاو مژە) بەرگری دەکا و دەڵێ: خودا و پێغەمبەر قەبوڵ ناکا؟. چونکە دزی شتێکی ناپاکە، گوناهبار دەبین، پەنجەی گەورە دەڵێ: بەملی من!! واتە گوناهی هەموو پەنجەکان دەخاتە ئەستۆی خۆی و رشتیان دەکا لەسەر دزی کردن. بەمجۆرە منداڵەکان بەریزە یەکە یەکە پەنجەکان دەژمێرن و لاسایان دەکەنەوە.

*** بووکە بە بارانە**

دوو مانگ لەپایز بچێ دەغڵ و دان پێویستی بە باران هەیە، کە بگاتە سەری زستان و مانگێ لە

زســتـــان بچێ و پەڵە نەکـــەوێ، خـەڵکەکـە بۆ باران تەنگاو دەبن، پاش بـاران پەڵەش تا جـــوزەردان حـەفـتـە حـەفـتـە دەخڵ و دانە چاندراوەکان پێویستیان بە باران هەر هەیە، ئەگـەر جـارێ مـاوەی دە پانزە رۆژ باران نەبارێ ئەوا هەمـــیـــشـــە تەنگاوی دەکـەوێتـە ناو خـەڵکداو چاوەڕێی باران دەکەن.

جـــا کـــە باران یا باران پەڵە لەکـاتی خـۆی تێـپـەڕبێ، منداڵیش هەست بەپەســـتـی و دڵ تـەنگی خـەڵکەکـە دەکـەن لەبەر بێ بـارانی، بووکۆکەیەکی گەورە دروست دەکەن و دوو منداڵ هەر یەکە لە لایەکەوە بن پیلی دەگرن و منداڵەکـانی دیکەیش بە دوایانەوە دەڕۆن، بەمـاڵەکـانی گوندی، یا گەڕەکەکاندا دەستورێنەوەو لەبەر دەرگـای هەر مـاڵێ دەوەستن و دەڵێن:

**هەیارانە بووک بارانە**
**گەنم رزی لە چاڵانە**
**گەنمی حەسەن و حوسەینیانە**
**هەموو قڕبوون لە تونیانە**
**هەروەها دەڵێن:**
**هەیاران و مەیاران**
**یاخوا بنێری باران**
**لۆ فەقیر و هەژاران**
**ئەم ساڵ بباریێ باران**

کابانی ماڵەکەش کوتکە ئاوێ، یا جـامــە ئاوێ دەپرژێنێ بەســـەر بووکۆکەکەو دەرزیەکی لێدەدا، لەگەڵ دەستی خۆشیـدا چەنگە گـەنمێ، یا چەنگە جۆیەک دەدا بەمنداڵەکان.

منداڵەکان ئەم گەنم و جویەی کە کۆی دەکـەنەوە گـشـتی بەقـەسپ، یا مێوژ، یا هەر جۆرە خواردنێکی دیکە دەدەن و لەگـــەڵ یەکـــدا بەخـــۆشی ئەیخۆن.

*** پڕنا پووش**

(٢-٧) منداڵ بەرانبـــەر یەک دادەنیـشن، یەکـێکیـان شـتێک لەم شتـانەی، کە یاری لەسـەر دەکەن لە دەســـتی خـــۆیدا دەگـــرێ و هەردوو دەستەکانی دەخاتە کۆشی بەبێ ئەوەی منداڵەکـان هەست بکەن، دەسـتـەکەی شتێکی تێدا هەیە یا نییە بۆ پێش یەکێ لە منداڵەکـانی درێژ دەکـا بە قوچاوەیی و دەڵێ: پڕنا پووش؟.

منداڵەکـەش بە ئارەزووی خـۆی دەڵێت: پڕ، یا دەڵێ: پووش، ئەگـەر دەستەکە شتی تێدا هەبێ ئەوا پڕە، هیـچـیشی تێـدا نەبێ پوشە، کـە دەستی خۆی دەکـاتەوە، ئەگـەر چۆنی منداڵەکـەی دیکە وتی وابوو، ئەوا ئەوەی دەســـتـی بۆی درێژ کـــردووە شـــتـــێک دەدات بەدەست بۆ درێژ کـردووەکـە، ئەگـەر بەپێـچـەوانەش بێ ئەوا ئەوەی دایگرتووە شتێک لەوەی دیکە وەردەگرێ. بەم جۆرە یەکە یەکە دەستی بۆ هەموو منداڵەکان درێژ دەکا هەر جـارەی بۆ پێش یەکـێکیـان جـا سـەرکـەوێ یا ژێر بکەوێ. ئەمـجـا منداڵەکـەی دەسـتی راسـتی ریزەی دێتــەســەر واتە ئەویش هەر وەکـــوو ئەوەی پێـشـــوو دەســتی خـــۆی بۆ هەموویان یەکە یەکە رادەگرێ ئەمجا ئەوەی دەســـتـــە راســـتی ریزەی ئەگاتێ...

*** تاقمانە جووت**

ئەم یارییەش وەکوو (پڕنا پوش) دەکـــرێ، بەڵام هەر منداڵێـک کـــە شتـەکـە لەناو دەسـتـەیدا دەگـرێ پێویستە ئەو دەستـەی بۆ پێش هەر منداڵێک درێژ دەکا شتێک یا چەند شـتێکی تێدابێ، کـە یاری لەسـەر دەکەن، ئەمجا بەمنداڵەکە دەڵێت: تاقـمـانە جـووت؟. منداڵەکەش کـە دەستی بۆ درێژکراوە دەڵێ: تاق، یا دەڵێ: جـــووت بە هەردووکـــیـــان شتەکانی ناو دەستەکە دەژمێرن ئەگەر چۆنی دەست بۆ درێژ کراوەکە گـوتی: وابوو ئەوا ئەو شـتانەی ناو دەستەکە هەمـــووی بۆ خـــۆیەتی، بەڵام بە پێـچـەوانەی، ئەوا منداڵەکە چەندی لەم شتە لەناو دەستی خۆیدا گرتبێ هەندە لەم شتـە لەمنداڵەکـانی دیکە وەردەگـــرێ، کـــە دەســـتی بۆی درێژ کردبوو. جا چ تاق بێ، یا جووت.

*** تەڕ و هشکانێ**

لە یاریەکی وا کـــە دوو منداڵ بـــیـــکـــەن، یـــا دوو بـــەش بـــن ســەرۆکـەکـانیـان تەڕ و هیـشـکانێ دەکـەن بۆ ئەوەی کـامـیـان لەپێـشـا دەست بە یاری بکا، یا کە دوو منداڵ لەسـەر شتێ ناکۆکـیـان دەبێ تەڕ و هیـشـکانێ دەکــەن بۆ ئەوەی بزانن قسەی کامیانە.

تەڕ و هیشکانێ دوو جۆرە:

ا- یەک لە منداڵەکـــان پارچە بەردێکی پان، یا تاسـولقـەیەک بە دەستـەییەوە دەگرێ و روویەکی بەتف تەڕ دەکا و بەمنداڵەکەی دیکە دەڵێ: تەڕت ئەوێ یا هێـشـک (وشک)؟. منداڵەکـــەش دەڵێ: تەڕ، یا دەڵێ هێشک (وشک). ئەمجا پارچەکەی ناو دەستی بۆ ئاسـمـان هەڵدەدا، کە کـەوتە سـەر زەوی ئەگـەر ئەو رووەی

بکەویتە سەرەوە کە منداڵەکە داوای کردووە ئەوا داواکەرەکە سەر دەکەوێ، ئەگینا تێدەکەوێ.

ب- یەکێ لەم دوو منداڵە هەر دوو دەستەکانی بەدەمییەوە دەگرێ بەبێ ئەوەی منداڵەکەی دیکە بزانێ ناولەپی دەستێکی بە زمان تەڕ دەکا و پشتی دەستەکانی دەخاتە لای منداڵەکەی دیکە و بۆ پێشیدا درێژیان دەکا و پێی دەڵێ: کام دەستت ئەوێ؟ واتە کامیان تەڕە. منداڵەکەش لەگەڵ ئاوازی ئەم هەڵبەستە هەر جارەی پەنجەی بۆ یەکێ لەدەستەکانی درێژ دەکا و دەڵێ:

**هۆ زیوانە زەگەتتانە**
**لەپشت بیریێ مزگەوتانە**
**(خودا دەڵێ): لەوە نییە ئەوەتانە**

واتە کە پەنجەی بۆ دەستێک درێژ دەکا دەڵێت: (هۆ زیوانە)، بۆ دەستەکەی دیکەی دەبا دەڵێت: (زەگەتتانە) بۆ دەستەکەی پێشووی درێژ دەکاتەوە دەڵێ: (لە پشت بیری) بۆ دەستی دیکە دەڵێ: (مزگەوتانە) ئەمجا دەڵێ: (خودا دەڵێ لەوە نییە)، دەستەکەی دیکە دەگرێ و دەڵێت: (ئەوەتانە). جا ئەو دەستەی کە گرتوویەتی تەڕ بێ ئەوا سەر دەکەوێ، ئەگەر وشک بێ و دەستەکەی دیکە تەڕبێ، ئەوا منداڵەکەی کە دەستی خۆی تەڕ کردووە سەر دەکەوێ.

*** حندر حۆپ**

ئەم یارییە لە بەینی (٢-٦) منداڵ دەکرێ لە تەمەنی (٥-٨) ساڵیدا، ناوەڕاستی کاریتەیەک یا شەقلەیەک ئەخەنە سەر دارێکی ئەستوور، منداڵەکان دەبن بە دوو بەشی وەکوو یەک، هەر بەشەی لەسەرێکی دارەکەدا دادەنیشن، بەشێکیان بەپێی خۆیان بەرز دەکەنەوە، بەشەکەی دیکەیش خۆیان گران دەکەن تا سەری دارەکە دەگاتە سەر زەوی ئینجا ئەوانەی دیکە خۆیان گران دەکەن و ئەوانەش خۆیان بەرز دەکەنەوە واتە هەر جارەی بەشێکیان بەرز دەبنەوەو بەشەکەی دیکە نزم دەبنەوە.

ئەو بەشەی بەرز دەبێتەوە دەڵێن: حندر حوپ، بەبەشەکەی دیکە کە بەرز دەبنەوە دەڵێن: بارت چییە؟ بەشەکەی یەکەمیش کە دووبارە بەرز دەبنەوە دەڵێن: نیسک و نۆک، واتە هەر بەشێکیان کە بەرز دەبنەوە لە رێگا ئەم قسانە دەکەن و بە پەلە هەر جارەی بەشێکیان بەرز دەبنەوەو ئەم پرسیار و وەڵامە لەگەڵ یەکدا دەکەن و چەند جارێ دووبارەی دەکەنەوە تا لە یاری تێر دەبن.

*** حەکایەتی مێشە**

ئەم یارییە لە بەینی دوو منداڵ دەکرێ لە تەمەنی (٦-١٠) ساڵیدا. یەکێکیان بەوەی دیکە دەڵێت: حەکایەتی مێشت بۆ بگێرمەوە؟ منداڵەکەی دیکەیش دەڵێ: باشە بۆمی بگێرەوە، منداڵەکە دەڵێ: بۆچ دەڵێی باشە بۆمی بگێرەوە؟! منداڵەکەی دیکە دەڵێ: ئەی بڵێم چی؟!. منداڵەکە پێی دەڵێت: بۆچ دەڵێ ئەی بڵێم چی؟ ئەوەی دیکە دەڵێ: ئەمە چییە؟! منداڵەکە پێی دەڵێ: بۆچ دەڵێ ئەمە چییە؟.

جا ئەگەر منداڵەکەی دووەم شارەزای ئەم یارییەبێ دەڵێت: خودا گەورەیە، منداڵەکەی یەکەم قسەی دەبڕێ و ناتوانێ بەرگری بکات. ئەگینا هەرچی منداڵەکەی دووەم لە دەمیدا دەرچێ، منداڵەکەی یەکەم دەڵێ: بۆچ دەڵێت.. وتەکەی منداڵی دووەم، دووبارە دەکاتەوە. تا منداڵەکەی دووەم کە چاوەڕوانی حەکایەتەکەیە بێزار دەبێ و خوا خوایەتی، کە منداڵەکەی یەکەم وازی لێ بێنێ و لاسای نەکاتەوە، تا ئەگەر پێبکەنێ، یا هەر جێگەیەکی بجوڵێتەوە، منداڵەکەی یەکەم پێی دەڵێ: بۆچ پێدەکەنی، یا بۆچ ئەم جێگایەت ئەجوڵێتەوە.

*** دەچییە بەر مەڕی؟**

دوو منداڵ لە تەمەنی (٥-٧) ساڵیدا، بۆ ئەوەی بزانن کامیان ترسنۆکە، یەکێکیان بە ئەوەی دیکە دەڵێ: دەچییە بەر مەڕی؟ ئەوەی دیکە دەڵێت: ئا دەچم. یەکەمیان دەڵێ: نان بۆ شوانی دەبەی؟ دووەم دەڵێت: ئا ئەبەم، یەکەمیان دەڵێ: لە گورگی ناترسی؟ ئەوەی دیکە دەڵێ: نا ناترسم.

کە ئەم پرسیارانەی هەموو لێکرد لەپڕ منداڵەکەی یەکەم دوو پەنجەی شادە و نێوانی دەستێکی بو هەردوو چاوی منداڵەکەی دیکە درێژ دەکا و دەڵێ: وشت. ئەگەر چاوی نوقاند بەترسنۆک دەردەچێ، بەڵام ئەگەر چاوی هەر زەق بێ و نەی قوچێنێ، ئەوا بەئازاو دلێر دەردەچێ.

ئەوەی دیکەیش ئەم کارە بەمەیان

دەکا. ئەمجا بۆیان دەردەکەوێ کامیان ترسنۆکە. جا هەر کامیان ئازاترێ گاڵتە بە ترسنۆکەکە دەکا.

*** سوێندە گورگانە**

گەورەکان ئەم یارییە لەگەڵ بچووکەکاندا دەکەن، گەورەکە دەستەسڕێ، یا ئەنگوچکی کراسی، یا هەر شتێکی پەڕۆیینی خاوێن دەخاتە سەر ناولەپی دەستێکی و خواردنێکی خۆشی دەخاتە ناویەوە، لە قوڕتایی بەینی سێ پەنجەی (گەورەو نێوان و دوشاومژە)، بە منداڵەکە دەڵێ: ئایا دەتوانی ئەم خواردنە لەناو دەستەمدا بەزمان هەڵبگرییەوە بیخۆی؟ منداڵەکەش لەخۆشیان زمانی بۆ خواردنەکە درێژ دەکا بۆ ئەوەی بیخوا. گەورەکە لەپڕ بەهەرسێ پەنجەکانی ناوبراو زمانی منداڵەکە بەتوندی دەگرێ و هاوار هاوار بە منداڵەکە دەخا، پاش ئەوەی هەموو منداڵ و گەورەکانی دیکە زۆری پێی پێدەکەنن و گاڵتەی پێدەکەن، ئەمجا گەورەکە زمانی منداڵەکە بەر دەدا و رزگار دەبێ و دەبێ بە پەند بۆ هەموو منداڵەکان بۆ ئەوەی تا بیر لەشتێ نەکەنەوە خۆیان بە هەموو شتێ راپێش نەکەن و بەدوای نەوس نەکەون بۆ هەر شتێک بچێ تا بەتەواوی لەئەنجامی نەگەن و بیری لێنەکەنەوە.

*** فڕوی فڕوی قەل فڕوی**

ئەم یارییە لە بەینی (٥-١٢) منداڵ دەکرێ لە تەمەنی (٥-١٠)ساڵیدا. یەکێ دەبێ بە سەردار، ئەوانەی دیکەیش هەموو لەبەرانبەریدا دادەنیشن، سەردارەکە هەر جارەی کەناوی باڵندەیەک دەڵێ هەموویان دەستەیان بەرز دەکەنەوە بۆ ئاسمان، لەناوەڕاستی ئەم ناوانە سەردارەکە جار جار ناوی شتێکی دیکە دەڵێ کە باڵندە نەبێ، هەر منداڵی دەستی بەرز بکاتەوە لە چوارەمدا (دۆشاو مژە) دەڵێ: شادە نیژ لە (قامکی گەورە)شدا دەڵێ: ئەسپێ کوژ. جا کە منداڵەکانی دەرخست، کە ناوی هەموو پەنجەکانی ئەزانێ، منداڵی دیکە دەست بە ژماردنی پەنجەکانی خۆی دەکا. بەم جۆرە هەموویان یەکە یەکە بەرێزە هەر جارەی یەکێکیان ناوی هەموو پەنجەکانی خۆی دەڵێ، هەر یەکێکیش نەیزانی هەموو گاڵتەی پێ دەکەن.

*** کەرەکەم بار کردییە**

کە منداڵێک حوشدی کەلووکی، یا شێرە کلۆیەک، یا زەردەواڵەیەک (زەنگە زۆرە) دەگرێ چوزە ژەهرییەکەی زەردەواڵەکە بەدەست هەڵدەکێشی و دەچێتە ناو قۆیەنە داڵێک ئەو شتەی، کە گرتوویەتی بەدزی دەیخاتە سەر لەشی یەکێک و دەڵێت:

**کەرەکەم بار کردییە**
**ئاگای لەخۆی نییە**

منداڵەکانیش هەر یەکە دەستی بەسەر شان و سەری خۆیدا دەگێڕێ بۆ ئەوەی بزانن کامیان بارکراون، بارکراوەکە دەستی بەشتەکە دەکەوێ و ئەیگرێ، کە فڕێی بدا، کە چاوی بە زەردەواڵەکە (یا ئەو شتەی کە لێی بارکراوە) ئەیهاوێ.

*** هەڕی زمزمی**

ئەم یارییە لە بەینی (٨-٢٠) منداڵ دەکرێ، لەتەمەنی (٦-١٠) ساڵیدا، هەموو بەریزە لەتەنیشت یەکدا رادەوەستن و دەستی یەک دەگرن، یەکێکیان دەبێ بە مەلا دەڵێ: قاز و قورینگ گوریسی ماڵی میری درێژکەنەوە؟ منداڵەکان هەر یەکە بە درێژایی باڵێک لەیەک دوور دەبنەوە بەبێ ئەوەی دەستی یەک بەربدەن، مەلا دەڵێ: تاژیان جل کەن؟ ئەوانیش هەموو بەجارێ لەشیان ئەلەرێننەوە دەڵێن: جل ل ل. مەلا دەڵێ: ماینان جل کەن؟. ئەوانیش خۆیان دەلەرێننەوە دەڵێن: جل ل ل. مەلایەکەیان دەڵێ: مەلا دەڵێت: نوێژێکی پشتاو پشت بکەن؟ منداڵەکان هەموو لەسەر گازی پشت درێژ دەبن بەبێ ئەوەی دەستی یەک بەربدەن. بەم جۆرە هەرچی مەلا بیەوێ بە منداڵەکانی دەکا، کە لەم پرسیار و وەڵامانەوە دەبنەوە منداڵەکەی دوایی بەمەلا دەڵێت کە لە پێشەوە وەستاوە: بەدۆڵ بێین یا بە زورنا؟ ئەگەر مەلا وتی: بەزورنا ئەوا منداڵەکان دەستی یەکیان گرتووە و بەدوای منداڵەکەی پێشەوە دەکەون و لەو سەرەوە بۆ لای مەلا دەچن و دەڵێن: تیو ریو ریو ریو... تا گشتیان لەژێر دەستی دوو منداڵەکەی پێشەوە دەردەچن (کە بەیەکەوەیان گرتووە و بەرزیان کردوونەتەوە) تەنیا منداڵەکەی دەستە سەردارەکە نەبێ دەرناچێ و پشتی دەکەوێتە مەلا و رووی دەکەوێتە منداڵەکەی دیکە، کە دەستی دیکەی گرتبوو. منداڵەکانی دیکەیش چۆن هاتبوون بەم چەشنە

بەتەنیشتەکەی دیکەدا دەگەڕێنەوە جێگەی خۆیان. ئەمجا مەلا دەڵێ: مەڕی (فیسار*) زا کاوڕێکی نێری هێنا (ئەگەر کوڕبێ) یا کاوڕێکی مێی هێنا (ئەگەر کچ بێ).

ئەوەی دوایی دیسان بەمەلا دەڵێ: بەدۆل بێین یا بەزوڕنا؟ ئەگەر مەلا گوتی: "

(*) ناوی باوکی ئەو منداڵە دەڵێ کە پشتی کەوتۆتە مەلا."

بەزوڕنا ئەوا وەکو جاری پێشوو بۆیان دەچن، ئەگەر گوتیشی: بەدۆڵ ئەوا وەکوو جاری پێشوو بۆیان دەچن، بەڵام لەکاتی ڕۆیشتندا هەتا دەڕۆن هەر دەڵێن تەپ، تەپ، تەپ.... وەکوو دۆڵ کوتان تا هەموویان لەژێر دەستە بەرزکراوەکانی دوو منداڵەکەی پێش مەلا دەردەچن تەنیا یەکێک دەگەڕێتەوە پشتی دەکەوێتە کاوڕەکەو سەرکارەکەی پێشوو، دیسان مەلا دەڵێ: مەڕی فیسار زا کاوڕێکی... هینا جا کچ بێ یا کوڕ. بەم جۆرە یەکە یەکە مەڕی باوکیان دەزێ و هەموو منداڵەکانیان دەکەوێتە یەک و وەک شەمەندەفەر بەدوای یەکدا ڕیز دەبن و پشتی یەک دەگرن.

ئەمجا مەلا و منداڵەکەی دوایی هەر یەکەیان لەسەرێکەوە منداڵەکان بۆ خۆی ڕادەکێشێ تا ڕیزەکە دەپسێتەوە، جا کامیان زۆرتر منداڵی بەدوای خۆیدا ڕاکێشابێ، ئەو سەردەکەوێ.

*** ئەزە لەزە (ئەشکە لەشکە)**

چەند کەسێ لە جێگایەکی وا کە بیانەوێ لە خۆیان زیاتر هیچ کەسێ تێنەگا، یا بەیەکێکی نەشارەزای ئەم جۆرە قسەکردنە بێتە لایان گاڵتەی پێدەکەن بەبێ ئەوەی لە قسەکانیان بگات.

قسەکردنەکەشیان ئەمەیە: کە هەر پیتێک دەڵێن لەکاتی قسەکردندا ئەم وشەی بۆ زیاد دەکەن (ئەشکە، یا ئەزە) بۆ ئەوەی لەخۆیان زیادتر کەسێکی دیکە تێنەگا. بۆ وێنە کە بڵێن سیروان، دەڵێن: سەشکە، یەشە، ڕەشکە، وەشکە، ئاه شکە نەشکە، یا دەڵێن: کەزە، یەزە ڕەزە، ئاهزە نەزە. ئەوانەی کە زۆر لەگەڵ یەکدا بەم جۆرە دوابن زۆر بەئاسانی و بێگرێ وەڵامی یەک دەدەنەوەو وەکوو بولبول پێدا دەچن، بەبێ ئەوەی هیچ کەسێکی دیکە تێ بگا.

*** بارە خێیانی**

ئەم یارییە لەبەینی سێ کەس دەکرێ، یەکێکیان لەسەر چنگ دادەنیشێ و هەردوو چوکی دەخاتە سەر زەوی، دووەکەی دیکەیش هەر یەکەیان هەر دوو پێیەکانی دەخاتە سەر پشتی داچەماوەکەو لەسەر قوون دادەنیشێ، هەر یەکەیان لە تەنیشتێکیەوە. هەردوو پێی بەرانبەرەکەی خۆی بەدەست دەگرێ لەسەر پشتی داچەماوەکەوە.

داچەماوەکە هەوڵدەدا کە هەر دوو کەسەکەی سەر پشتی هەڵگرێ و لەزەوی بەرزیان بکاتەوە، جا ئەگەر هەڵیان بگرێ ئەوا بەهێزە. دووەکەی دیکەیش بەم چەشنە هەرجارەی یەکێکیان دادەچەقێنەوە دوو منداڵەکەی دیکە بەرزدەکاتەوە، جاری وا دەبێ یەکێکیان دووەکەی دیکە بەرز دەکاتەوەو لە ئاسمانەوە هەڵیان دەداتە سەر زەوی، یا دووەکەی سەر پشتی یەکێکیان پێیەکانی ئەوەی دیکەی لەدەست بەردەبێ و هەر دووکیان هەریەکە بە لایەکدا وەرئەگەڕین و ئازاریکی باش ئەخۆن.

*** بەللووری و وەیاروک**

کچە عازەبەکان کە دەچوونە سەر زەوی و دەشت و زوورگ کێلگەکان بۆ چۆغانان، یا کەنگر و تۆلکە و کاردی و قەڵوغانە... هتد لە ڕێگادا کە بە نزیک شوانێ یا کاروانێ، یا ڕاوچی، یا جوتیارێکدا تێ ئەپەڕین، بە هەڵبەستێ بەلووری و وەیارۆک جنێویان پێ دەدا، یا کچەکان نەختێ لەیەک دوور دەبوونەوەو خۆبەخۆیی جنێویان بۆ یەکتر ڕەوان دەکرد، ئەم هەڵبەستانەیان بەدەنگ و ئاوازەیەکی زۆر خۆش ئەوت بەدەنگێکی بەرز کە لەناو گوندیەوە گوێیان بۆی شل دەکرد و لە دەنگەکان کچەکانیان دەناسیەوە.

لە بەلووری کچەکە پەنجەی گەورەی زوو زوو لە گەردەنی خۆی دەدا لەسەر ئاوازەی گۆرانییەکە وەکوو لێدانی پیانۆ، بەڵام لە وەیارۆک پەنجەی شادە (دۆشاو مژە) لە گەردنی دەچەقێنێ و لەسەرەوە بۆ خوارەوە پێدا دەسوێ و هەڵیناگرێ و زوو زوو لێی دەدا.

زۆربەی هەڵبەستەکانی بەلووریێ وەیارۆک بۆ نووسین ناشێن لەبەر جنێوە بێزەوەرەکانیان، تەنیا ئەم چەند دێرە نەبێ کە لەچاو ئەوانەی دیکە بە حەوت ئاو شوراینەوە.

(١) بەلووری، بەلووری

**مەری عەولاّ شوانی هەلّکاتە تەلانی**
**دەخوا دار شیلانی**
**خۆزی دار شیلان بام**
**لەزێی کیژۆلان بام**
**لەریزی دوگمان بام**
**لەسەر مەمکولان بام**

(٢) بەللوری، بەلووری
**بەللورێی بادینی کیژ چوو ئاوێ بینی**
**کوڕ چوو لێی بستینی**

(٣) بەلووری، بەلووری
**وەرە خوارێ لەگردی**
**دەرپێیەکەت ئاو بردی**

یەکەمیان دەمە تەقییە لەبەینی شوانێک و کچێک، دووەمیان دەمەتەقییە لە بەینی کچەکانی سۆرانی و بادینی، کە لەسەر (زێی بادینان*) ئەوەستان بەرانبەر یەکدا، بەلاّم بەداخەوە وەلاّمی کچە بادینییەکانم چنگ نەکەوت، کە بەکچە سۆرانییەکانی دەلێن. سێیەمیش کچێک بە کچێکی دیکە دەلێ.

لەوەیارۆکێشدا هەر ئەم هەلّبەستانە بەکاردێن تەنیا لەجێگەی بەللورێ دەلێن: هۆ هۆ وەیارۆک ئەمجا هەلّبەستەکە دەلێن، و هەر وشەیەکی بەللوری لەناو هەلّبەستەکەدا هەبێ دەیکەن بە وەیارۆک.

(*) زێی بادینان: لەسەر کەلەکی یاسین ئاغاوە دەبێتە سنووری شێوەی سۆرانی و بادینی.

**تەرکی بن بەری:** لە ئاهەنگی بووک گواستنەوەو شەوانی درێژی زستاندا لەحوجرەی فەقییان و دیوەخانەکاندا دەکرا، کە چەند گەنجێک کۆدەبوونەوە یەکێکیان دەخستە ژێر بەڕە، یا لبادێک، گشت لەشیان دادەپۆشێ و هەر یەکەیان لنگە کلاشێکیان بەدەستەیانەوە دەگرت و هەر جارەی یەکێکیان کلاشەکەی بەهێز لە لەشی داپۆشراوەکە دەداو ئەویش ناوی یەکێ لەدانیشتووەکانی دەگوت: ئەگەر ناوی ئەو کەسە بوایە، کە لێی داوە، ئەوا ئەوەی ژێر بەڕەکە رزگار دەبوو ئەوەی لێی داوە تێدەکەوت و دەچێتە جێگەی لێدراوەکە. ئەگەر ناوی ئەویش نەبێ ئەوا یەکێکی دیکە لێنگە کلاشێکی لێدەدات، بەم جۆرە هەر جارەی یەکێک لێی دەدا و ئەویش ناوێک دەلێ، تا جارێ لەکاتی لێدانا ناوی ئەو کەسە دەلێت کە لێی دەدا، ئەمجا رزگار دەبێ و ئەوەی لێیداوە جێگەی دەگرێتەوە... ئەویش هەروەها، بەلاّم ئەوەی کە جاری یەکەم خۆی بەخت بکا و بچێتە ژێر بەڕەکە، پاش رزگار بوونی لەژێر بەڕەکەدا لەهەریەکێ بدا و ناویشی بلێین: دەیبوورن. لەبەر ئەوەی کە جاری یەکەم سەربەخۆ خۆی بەخت کردووە و چۆتە ژێر بەڕەکەوە.

*** تەلّە و رێویانی**

ئەم یارییە لە بەینی دوو کەس دەکرێ، یەکێکیان دەبێ بەتەلّە، هەر دوو دەستەکانی بەیەکەوە دەبەستن، هەر دوو پێیەکانیشی بەیەکەوە دەبەستن و لەسەر دەستە و پێیەکانی ئەوەستێ. مندالّەکەی دیکەیش دەبێ بە رێوی و لنگێکی دەخاتە مەیدانی هەردوو دەستی تەلّەکە و لنگەکەی دیکەیشی دەخاتە بەینی هەردوو پێیەکانی تەلّە، سەرپشتی دەخاتە ژێر سکی تەلّەکە.

ئەوانەی کە بۆ سەیرکردنیان وەستاون پالێ بەتەلّەکەوە دەنێن و دەیخەنە سەر زەوی، رێویەکە بەتەلّەوە دەبێ. تەلّە بەهێزی خۆی دەست و پێیەکانی لەیەک دوور دەخاتەوە، رێویش دەستدەکا بەهاوار هاوار لەبەر ئازاری قاچەکانی، کە هەر یەکە بە لایێکدا دەکشێن، بەلاّم ئەگەر رێوی لەتەلّەکە بەتینتربێ سەری دەخاتە سەرسکی تەلّە و پالّەپەستۆی لەسەر دەکا و هێزی لێدەبڕێ، تەلّە ناچار خۆی بۆ رێویەکە شل دەکا و رێوییەکە بەبێ ئازار رزگار دەبێ، بەلّکو هێشتا تەلّە لەبەر ئازاری سکی هاوار دەکا، بەلاّم هەر یەکێ شارەزای ئەم یارییە نەبێ، نابێ بەرێوی چونکە زۆر ئازار دەخوا، ئەگەر هێزی تەلّە و رێوییەکە وەکوو یەک بێ.

*** تەندوورە سورکە**

(٨-١٤) گەنج دەبن بەدوو بەشی وەکو یەک، هەر بەشەی سەردارێکیان هەیە، هەردوو سەردارەکە (هۆپ هۆپ قەرەتۆپ) دەکەن، کامیان تێ بکەوێ هاوبەشەکانی دادەچەقێنەوە*) و سەردارەکەشیان بەدەورەیاندا دەسووڕێ و پارێزگاریان دەکا بەشەکەی دیکەیش هەموو بە دەورەیاندا دەسوورێن، هەر یەکێکیان بۆی هەلّکەوێ خۆی بۆ سەر تەندوورەکە هەلّدەدا بەبێ ئەوەی

سەردارەكە بتوانێ لەقەی لێبدا، چونكە سەرداری داچەقاوەكان لەقە لەهەر یەكێكیان بدا، ئەوا بەپێچەوانە بەشەكەی دیكە تێ دەكەون و ئەم بەشە داچەقاوەی پێشووش لەدەورەیاندا دەسوورێن و خۆیان بۆ سەر سەریان هەڵدەدەن، بەڵام ئەگەر یەكە یەكە خۆیان هەڵدایە سەر تەندوورەكە بەبێ ئەوەی سەردارەكە بتوانێ لەقە لە هیچێكیان بدا، ئەوا سەردارەكە لەدیاریاندا دەوەستێ، چونكە هەریەكێ كە خۆی هەڵدایە سەر تەندوورەكە و پێیەكانی لەزەویدا بەرز بووەوە سەردارەكە ناتوانێ لەقەیان لێبدا. تەنیا لەوانەی سەر زەوی نەبێ و بەمەرجێ دەستیشی لە هاوبەشەكانی خۆی بەرنەدا لەكاتی لەقە هاویشتندا.

كە هەموو خۆیان هەڵدایە سەر تەندوورەكەدا چەماوەكان ملیان شل دەبێ لەبەر گرانی و سەنگی ئەوانەی كە سواری سەریان بووینە، ناچار تەندوورەكە كور دەكەنەوە، یا دەڕووخێن و دەكەونە خوارەوە. ئەمجا لەسەرییەوە دەست بە یارییەكە دەكەنەوەو هەر داچەقاوەكانی پێشوو دادەچەمێنەوە، بەشەكەی دیكەیش بە دەورەیاندا دەسوورێن و خۆیان بۆ سەر سەریان هەڵدەدەن، تا جارێ سەرداری داچەقاوەكان لەقە لە یەكێ دەدا لەبەشەكەی دیكە لەوكاتەی پێی لەسەر زەویدایە بەبێ ئەوەی دەست لە داچەقاوەكانی هاوبەشی بەربدات. ئەمجا هاوبەشەكانی رزگار دەبن و بەشەكەی دیكە تێدەكەون و ئەوانەش خۆیان بەسەر سەریان هەڵ دەدەن لەكاتی هەڵكەوتا، سەرداری داچەماوەكانیش پارێزگاری هاوبەشەكانی دەكا.

(*) هەموو بازنەیی لەتەنیشت یەكدا دەوەستن و روویان لەیەك دەكەن و سەریان بو ژوورەوە خوار دەكەنەوە.

*** جغزێ**

(٦-١٢) گەنج دەبن بە دوو بەشی وەكو یەك، بەشێك تێدەكەون و دەچنە ناو جغزێك (دیرێكی بازنەیی كە لەسەر زەویدا دەكێشرێ)، بەشەكەی دیكەیش لە دەورەی جغزەكە دەسوورێن و بە توپێكی پەڕۆیینی رەق لەبەشەكەی ناو جغزەكە دەدەن و لەجغزەكە دوور دەبنەوە، ئەوانەی ناو جغزەكەش تۆپەكە دەگرنەوەو بەپەلە بۆ ئەوانەی دەرەوەی دەهاوێن بەمەرجێك لەناو جغزەكە دەرنەچن، ئەگەر تۆپەكەیان لەهەر یەكێدا ئەوا ئەوەی لێی داوە لەناو جغزەكە رزگار دەبێ و لێدراوەكە لەجێگەی ئەودا دەچێتە ناو جغزەكە. ئەگەر لەهیچ كەسێكیشیان نەدا ئەوا ئەوانەی دەرەوە تۆپەكە دەگرنەوەو یەكێكیان دەهاوی بۆ یەكێكی دیكە تا یەكێكیان بۆی هەڵدەكەوێ و تۆپەكە بەتوندی لەیەكێكی ناو جغزەكە دەدا ئەگەر لەهیچ كەسێكیشی نەدا تێدەكەوێ و دەچێتە ناو جغزەكە، هەر یەكێكیش لەوانەی ناوەوە لە یەكێكی دەرەوە بدا رزگار دەبێ و لەجغزەكە دێتە دەرێ لێدراوەكەش تێ دەكەوێ و دەچێتە ناو جغزەكە.

*** خەجە روو (خواجە روو)**

(٨-١٦) گەنج دەبن بە دوو بەشی وەكو یەك، هەر بەشی سەردارێكیان هەیە، ئەم دوو سەردارە (هۆپ هۆپ قەرەتوپ) دەكەن. كامیان تێبكەوێ هاوبەشەكانی بازنەیی لە تەنیشت یەك دادەنیشن و پشتیان لەیەك دەكەن، هەر دوو سەردارەكەش لەنزیكیانەوە دەوەستن، سەركەوتووەكە چاوی تێكەوتووەكە دەگەرێ بەهەردوو دەستی، هاوبەشەكانی هەموو لەگەڵ یەكدا رادەكەن و خۆیان دەشارنەوە تا سەردارەكەیان دەڵێ:

**قەرە، قەرە، قەرە یەك**
**قەرە، قەرە، قەرە دوو**
**قەرە، قەرە، قەرە سێ**
**خۆتان بكەنە داوو دەرزی**

سەردارەكە تا بتوانێ ئەم وشانە یەكە یەكە درێژ دەكاتەوە بۆ ئەوەی هاوبەشەكانی بەتەواوی دوور بنەوەو خۆیان بشارنەوە كە هەموو قسەكانی تەواو كرد چاوی سەردارەكەی دیكە بەردەدا. ئەمجا هەر دوو سەردارەكە بەدوای ئەوانەدا دەگەرێن، كە خۆیان شاردووەتەوە. سەرداری تێكەوتووەكان روو لەهەر لایێ دەكا دەڵێ. تاوە (واتە لەم لایە خۆیان شاردووەتەوە). سەردارەكەی دیكەیش دەڵێ: تاونییە (واتە لەم لایە نینە). بەم چەشنە بۆ هەر لایێ دەچن یەكەمیان دەڵێ تاوە؟. ئەوەی دیكەیش دەڵێ: تاونییە، ١- تاوە؟ ٢- تاونییە..... ١- تاوە؟ ٢- تاو نییە؟ ١- تاوە؟ ٢- تاونییە.....

ئەگەر ئەو بەشەیان دیتەوە (دۆزییەوە)، كە خۆیان شاردووەتەوە، ئەوا بەپێچەوانەوە ئەوان دادەنیشن و بەشەكەی دیكە خۆیان دەشارنەوەو

لەســـەریەوە دەست بە یارییـــەکـــە دەکـــەنەوە، بەڵام ئەگـــەر نەدۆزرانەوە ئەوا لـەپڕ هێـــــرش دەبەنە ســـــەر دانیـشـتـووەکـان و دەڵێن: (پێدادە، پێدادە...)، بەهەردوو دەستەکانیان چەپەڵۆک لەســـەرو گـــێـــلاکی دانیــــشــــتــــووەکـــــان دەدەن، دانیـشـتـووەکـانیش دەست بە هاوار هاوار دەکەن و دەڵێن: هەی داد هەی داد هەی داد ئەمجا دەڵێن: خەجە رۆ پینە و پەرۆ، خەجە رۆ پینە و پەرۆ، خەجە رۆ پینە و پەرۆ....

سەردارەکەیان کە گوێی لەهاوار هاواری هاوبەشەکانی دەبێ بەراکردن دەگـــەڕێتـــەوە بۆلایان، لەدەوروبەریان ئەسووڕێ و پارێزگارییان دەکا، ئەگەر لەقەی لەیەکێکی بەشەکەی دیکەدا بەبێ ئەوەی دەست لەهاوبەشـەکـانی خـۆی بەربدا، ئەوا بەپێـچـەوانەوە دەست بەیارییـەکـە دەکـەنەوە، بەڵام ئەگـەر سـەردارەکـە نەیتـوانی لەقـە لەهیچێکیان بدا بەشەکەی دیکە هەر بە دەورەیانـدا دەســـــووڕێن و هـەر یەکـــێکیـــان بۆی هەڵـکەوێ لەپڕ چەپەڵۆکی لەســـەر و گـــولاکی یەکی لەدانیـشـتـووەکـان دەداو بەپەلە دوور دەبێتـــەوە پێش ئەوەی ســـەرداری دانیـشــتـووەکـان بیگاتێ و لەقـەی لێبدا.

بەم چەشنە لەســـەر و گـــوێلاکی دانیـشـتـووەکـان دەدەن تاکـو جـارێ سەرداری دانیشتووەکان لەقە لەیەکێ لە بەشەکەی دیکە دەداو لێدراوەکە و هاوبەشەکانی تێدەکەون و دادەنیشن، ئەوانەی دیکەیش خۆیان دەشارنەوە و لەسـەرییـەوە دەست بە یارییـەکـە دەکەنەوە.

*** دار کێشکانێ**

کـــــە دوو گـــــەنج دەبێ بە رکابەرییان، هەریەکەیان خۆی لەوەی دیکە بەهێـزتر بزانێ، گـۆپالێ، یا دارێکی وەک گۆپاڵ ئەسـتـوور دێنن، هەردوو گـەنجـەکـە لەبەرانبـەر یەکـدا دادەنیـشن و پێیـەکـانیـان بۆ پێش خۆیان درێژ دەکەن و لەگەڵ پێییەکدا ئەیکەنە رکە، هەر یەکەیان بەهەردوو دەستەکانی ناوەڕاستی دارەکە دەگرێ لەناوەڕاسـتی خۆیان گرتوویانە، هەر یەکە لەگـەنجـەکـان دارەکـە بەهەمـوو هێزی خۆی بۆلای خۆیدا رادەکێشێ، جـا کـامیـان ئەوەی دیکەی بۆ خـۆی راکـێـشـێ ئەویان سـەردەکـەوێ و بەهێزترە.

*** درووێنەی بەکرەیی**

هەمـوومـان دەزانین کـە دروێنە چ مـاندوو بوون و ئازارێکی بو سەپان و کـرێ پاڵەکـان هەیە، بەڵام بێ چاری بوو دەبوایە هەر بیکەن. لەبەر ئەوە رێگایەکی وایان دۆزیبوە کە بەرگری ئەم ئازار و مـاندووبوونەی پێوە بکەن و بیکەن بە ســەیرانێ کـــە ئەویش بەکـرەیی بوو، واتە بەگـۆرانی گـوتن دروێنەیان دەکرد. زۆربەی سەپانەکان دروێنەی بەکرەییـان دەکرد و باشترین شـایەر لەناویاندا هەڵبەسـتـەکـانی بەکـرەیی لەسـەر ئاوازەیەکی تایبـەتی دروێنە بە گـــۆرانی دەوت، ئەوانەی دیکـەیش دیڕ بە دیڕ بـە دوایـەوەدا هەمـــوو بەجـــارێ دەیانگـێــرایەوە، دروێنەکان وا گەرم دەکرد کە هەستیان بەمـــاندوو بوونەکـــە نەدەکـــرد، کێشـەکـەرەکـەش لەدوایاندا رشـتـتـر دەبوو لەسـەر کۆکردنەوەی سوالەکان.

ئەگەر بێ و هەڵبەستەکانی بەکرەیی هەموو بنووسرێتەوە ئەم پەڕاوە بەشی ناکـــا. ئەمـــەش چەند وێنەیەک لە هەڵبەستەکانی بەکرەیین:

**-( تاخمەی کیژان ئەوا هات)-**

**تاخمەی کیژان ئەوا هات**
**یاری من لەگەڵ نییە**
**لەولا زوڵفی گەورۆنەی**
**زوڵەیخای خدرییە**
**مەمکی دوو سێوی لاسوور**
**بەجووتە هەڵیان داوە**
**ئەوا سەری دوو ساڵە**
**بۆ تۆ پاوان کراوە**
**وەک پاوانی ئاغاکەت**
**کەس دەستی لێ نەداوە**
**دەچمە شاری هەولێرێ**
**بەقەیسەری و دوکانە**
**ئەگەر باوەرم پێ ناکەی**
**چاوکاڵی زۆر تێدانە**
**سەردارمان محەمەدە**
**خۆشەویستی خودایە**
**سەری لەعەرشی فەلەک**
**بنی لەئەرزی دایە**
**لەگوارەکەی سێ گۆێی**
**بەهییەی حەسەنییە**
**گۆتم بەدایکی بڵێم**
**دایکی لەماڵێ نییە**
**بابی وا لەهەولێرە**
**کاکی وا لەجۆتییە**
**دەستەم هاویشتە ملی**
**دایکی بەسەر هاتییە**
**کولکەکی لەزگی بێ**
**ئەستووری بچێتە رانی**
**کرمی کەوێتە گیانی**
**وەک سەی بن کوندەلانی**
**خواردنی درک و دارێ**

لەباتی ئاوو نانی
***
تاخمەی کیژان ئەوا هات
یاری من لەگەڵدایە
ئەگەر باوەڕم پێ ناکەی
تۆزێ کورتە باڵایە
ئەویش بەعەیب ناشێ
چونکە، نەخشەی خودایە
قۆندەرەکی لەپێ دا
دەگرێ پەنجە و پاش پانی
چاوی وەستای کۆرەبی
لەگەڵ دەرزی و دوورمانی
شلکۆکەی ناوقەد باریک
لەنواران پاڵی داوە
دڵم نەهات چی بڵێمێ
دەمم لەدەمی ناوە
-( ئەزە)-
دەک نەمێنم ها ئەزە
سینگت بیستان و رەزە
بەدڵی خۆم لێکرد حەزە
حەزم کردبوو لەچاوی
لەسی بەندەی کلاوی
ناوێرم بینم ناوی
لەبەر تەرسە باوی

* دزینی هەش

کە یەکێکی شارستانی چەند رۆژێ لە گوندێکدا بمێنێتەوە و دانیشتووانی دێیەکە بێزاری لێبکەن لەبەر ئێسک گرانی، ئەم یارییەی پێدەکەن.

چەند گەنجێک دۆستایەتی لەگەڵ دەکەن بەجۆرێکی وا کە باوەڕیان پێبکا، ئەمجا پێی دەڵێن: جوولەکەیەک لە گوندەکەمان هەیە یەک فەردە هەشمان لێ دزیوە، کە زۆر لەزێر بەنرخترە، وا لەناو کاولێک شاردوومەتەوە، تۆ هەر ئێستا هەشەکە ببەو بۆ شار تا جوولەکەکە هەستی پێنەکردووە، کە لێی دزراوە، بیفرۆشە و بەشی ئێمەش لەپارەکە بێنەوە ئەم دێیە، هەمووومان وەکو یەک تێدا هاوبەش دەبێن.

بەهەر جۆرێ بێ تەماح دەدەنە کابراو رازی دەکەن و دەیبەنە ئەو جێگایەی کە هەشەکەیان لێ شاردۆتەوە، ئەو فەردەی، کە لە پێشتردا چەند پارچە خشتێکیان خستۆتە ناوییەوەو زاریان توند گرێداوە، دەیدەن بەکابرا و دەڵێن: فەرموو بیبە، بەڵام کەس هەست نەکا کە تۆ بردووتە، چونکە ئێستا پۆلیسێک هاتۆتە دیوەخان نەوەک بگیرێین.

کە کابرا هەشەکە دەبا و نەختێ لێیان دوور دەبێتەوە. ئەوانیش بەپەنا دزە دوورو نزیک هەر بەدوایەوە دەڕۆن. کە نەختێ لە گوندەکە دوور دەبنەوە یەکێکیان لاسای جوولەکە دەکاتەوە دەستدەکا بەجنێوو بەدوای شارستانەکەدا رادەکاو دەڵێ: (ئەی هاوار هەشەکەمیان برد، کوڕە بسوڕمان بمگەنی ماڵم کاول بوو)، بەم شەوە چەند کەسێکی دیکەیش کە ئاگادارن لەم کارەساتە کۆ دەبنەوەو بەدوا شارستانەکەدا رادەکەن، ئەویش کە گوێی لەدەنگی جوولەکە و ئەم کۆمەڵە خەڵکە دەبێ تا تینی تێدا هەیە رادەکا، جوولەکە دەڵێ: ( کوڕە پۆلیس بەقوربانت بم). یەکێکی دیکە لاسای پۆلیس دەکاتەوەو دەڵێ: کوڕە ئەم سەگ باوکەم بۆ بگرن تا بیدەم بەقانوون.

شارستانەکە کەهەست دەکا ئیش هەندە گەورەبوو، فەردەکە بەهەشەوە فڕێ دەدا و تا توانای هەبێ رادەکا و لەگوندەکە دوور دەبێتەوە، بێرای بێر ناوێرێ جارێکی دیکە تخوونی ئەم گوندە بکەوێ، هەر جارەی ناوی ئەم گوندەش بەر گوێی بکەوێتە موچرکەی پێدا دێتەوە، گەنجەکانیش گەلێکی پێی پێدەکەنن و لەدەستی رزگار دەبن.

سی، چل ساڵی پێش ئێستا یەکێ لەشاری کەرکووک هات لە گوندی (خرابە دراو*) میوان دەبێ، ئەم کابرایە زۆر را لەخۆبووە بەتایبەتی لە راست کچان خۆهەڵکێش و ئاڵچاغ بووە، کابرای خانەخوێ چەند هاوڕێیەکی خۆی کۆدەکاتەوە پێیان دەڵێ: ئێوە چۆن ئەم میوانەم لەکۆڵ دەکەنەوە و لەچنگی رزگارم دەکەن؟ یەکێ پێی دەڵێ: بۆ منی لێ گەڕێ! هەڵسا ئەم پلانەی بۆ دانایەوەو وای لێکرد جارێکی دیکە نەگەڕێتەوە بۆم ئەم دێیە. پاش ئەوەی بەدزی گێڕایانەوە گوندەکە و بەچەند جۆرێکێش ئازاریان دا، لەجۆخینان لەسەر گۆشتی رووتی وردە کوتیان لەپشتی دەسوی و دەیانوت: پشتت بۆنی هەشەکەی فەردەکەی هەڵگرتووە، ئەویش هەر هاوار هاواری بوو لەبەر ئازاری پشتی، لەسەر ئەو حاڵەش هەر دەیووت: دەی چاوەکەم بۆنەکەی بچوێنن تا ئاشکرا نەبێ کە من هەشەکەم دزیوە. بەم شەوە رەوانی هەولێریان کردەوە، ترسیشی هەر مابوو دزییەکەی لێ ئاشکرابێ تا خۆی گەیاندەوە کەرکووک. کابرای خانەخۆی زۆر سوپاسی کابرای خاوەن

پیلانەکەی کرد، کە لەدەست ئەو میوانە رزگاری کرد.

* خرابەدراو: دەکەویتە سەرووی رۆژئاوای هەولێر نزیکی بیست کیلۆمەتر دوور دەبێ.

*** دەستارِ**

هەر مالێک کە ساواریان لێ بکردایە، شەوێک چەند کچێکی عازەبیان کۆ دەکردەوە و بۆ ئەوەی ساوارەکەیان بەدەستارِ بۆ لێ بکەن، بەتایبەتی ئەو کچانەی، کە هەلبەستی دەستاریان زۆر دەزانی، دەبوو بەئاهەنگێکی زۆر خۆش لەم مالەدا کچەکانی گەرەک و گوند سەربەخۆ روویان لەم مالە دەکرد، جاری وا ئەبوو لە ئێوارەوە تاکو بەیانی بەدەم هەلبەستەوە دەستاریان لێدەکرد بێ ئەوەی بێزار بن، بەلام کە بیانزانیبوایە کچێکی وایان تێدا نییە هەلبەستیان بۆ بلێ، هیچێکیان نەدەچوون بۆ ئەم مالە، ئەگەر چەند کچێکیشیان کۆ بکردایەوە ئەوانیش زوو پەرتەیان لێدەکرد.

کە دەستارِ لێ کردنەکە گەرم بوایە، هەر جارەی سێ کچ بەرانبەر یەک لەدەورەی دەستارەکە دادەنیشتن (لەبادینان دوو کچ و کورێک دادەنیشتن)، هەریەکە دەستێکیان بە باسکی دەستارەکەوە دەگرت و لەگەل یەکدا دەیانسوراند، یەکێکیان بەدەستەکەی دیکەی (بەجۆری پێویست) هەر جارەی چەنگێ ساواری دەکردە ناو دەستارەکە. کە ئەم سێیە ماندوو دەبوون سێی دیکە جێگەیان دەگرتنەوە.

لەگەل دەستارِ سوراندنەکەشدا یەکێکیان هەلبەستی تایبەتی دەستارِ لێ کردنی دەگوت: لەسەر ئاوازەی تایبەتی خۆی، ئەوانەی دیکەیش دێر بەدێر بەدوایدا دەیانگێرایەوە. بۆ وێنە:

**بادە بادە دایکی**
**تو دەدەمە میرەکی**
**میری من کێ لەوانە**
**میرێ تور عەلۆ جوانە**
**عەلۆ جوانە من ناوێ**
**عەلۆی بەینە سەر ئاوێ**
**لێی برشێنن گولاوێ**

*** راوە بەراز**

سی، چل سال لەمەوپێش ئەم ئاوو رووبارانە وەکو ئێستا دەشتێکی پان نەبوو، کە کرانەوە بە سەوزەو شینایی و بەهۆی مەکینە دەکێلدرێن و ئاو ئەدرێن، بەلکو هەموویەک تەختە دار و باری خۆرسک دایپۆشیبوو هەموو لایەک پالیان دابووە یەک و تێک ئالابوون بەتووترک و بیسیر و کرتی و گەزو قەمیش و قەڕەم، کە پڕ بوو لەبەرازو رێوی و چەقەل و گورگ. بیوون بەهۆی مەترسییەکی گەورە بۆ ئەو کەسانەی کە رێگایان کەوتە ئەم چەم و دارستانانە وەکو خاوەن چوار بێستان و سەیناغەکان و ئەو کەسانەی دەچوون بۆ هەلاتن بۆ گرتنی سەری خانووی تازە دروستکراو.

لەبەر ئەوە هەر کژەی چەند جارێ، بەتایبەتی لەکاتی هەلسانی ئاوی رووبارەکان، گەنج و پیاوەکانی گوندەکان خۆیان ئامادە دەکرد و چەند سەگێکی دریان لەگەل خۆیاندا دەبرد، هەر یەکێکیش تفەنگێکی حوسکە، یا حەشکەی هەبوایە لەگەل خۆیدا دەیبرد، هەموو بۆ رابواردن و سەیران روویان دەکردە چەم و دارستانەکانی بەگۆرانی و بەستەو حەیران دەرۆیشتن بۆ راوە بەراز.

کە دەگەیشتە ناو ئەم دارستانە تێکئالاوانە، دەیانکرد بەهەیهاو و هەرا و بەردی گەورە گەورەیان هەلدەدا بۆ ناو ئەو دارە تێکئالاوانەدا کە بەخشەخش بەناو دارەکاندا دەرۆیشتن، سەگەکان هەموو بەدوای بەردەکان دەکەوتن و هێرشیان بۆناو قوپەنە دارەکان دەبرد کە مرۆڤ بەهیچ جۆرێ توانای نەبوو بەناویدا بروا لەبەر بۆری و قەبەیی ئەم دارانە، کە هیچ رێگای لێ نەبوو.

لەژێر ئەم قوپەنە تۆترکانە دەبوو بە مرە مری بەرازو وەرینی سەگەکان کە بەگژ یەکدا دەچوون، چەند بەرازو دەعبای لەژێر ئەم توترکانە هەبوایە هەموو دەردەپەرین خەلکەکە بەسەر دار تووەکان دەکەوتن و بەتفەنگ و قەمیشی تیژکراو لەبەرازەکانیان دەدا کە سەگەکانیان بەدووایەوە بوون جا چەند بەرازێ سەگەکان دەیانخنکاندن، چەندیکێش راوچییەکان دەیانکوشتن، بەرازەکانیش چەند سەگێکیان دەتۆپاند و بریندارایان دەکردن، بەرازەکانی دیکەیش ناچار روویان لەرووبارەکە دەکرد و بەمەلە لێی دەپەرینەوەو ئەم ناوچەیان بەجێدەهێشت و روویان لەناوچەیەکی دیکە دەکرد و لانەیان لێدەکرد.

راوچییەکان هەتا ئێوارە بەم چەشنە رایاندەبوارد لە جێگایەکەوە بۆ جێگایەکی دیکە دەچوون تا دەمەو رۆژ ئاوا ئەمجا بەرەو ئاوایی

دەگەڕانەوە، تا چەند ڕۆژی لەناو گوندی باس هەر باسی ڕاوە بەرازەکەبوو، فیسار بەرازێکی کوشت، هەندە نەمابوو بەرازێ لەفیسکە بدا، سەگەکەی فلان بەراز لێی دا، سەگی فلان کەس بەرازێکی خنکاند... هتد.

بەلاّم ئێستا بەدەگمەن بەرازێ نابینرێ لەناو ئەم چەم و دارستانانەدا، کە هەر ڕۆژێ هەزارەها کەس هات و چوی پێدا دەکەن بەبێ مەترسی لەدرندە، لەبەر نەمانی ئەو دار و بارە خۆڕسکانەی، کە دەبوون بەجێنشینی ئەم درندانە و لانەیان لەژێریدا دەکرد.

*** ڕاوە ژیشک**

چەند گەنجێکی گالتەچی کۆدەبنەوەو پیلانێک بۆ یەکێکی نەشارەزای ئەم یارییە دادەنێنەوە بەتایبەتی لەگەلّ ئەو شارستانیانەی، کە بەمیوانی دەچنە گوندەکەیان کە شەوێ ڕاوە ژیشکی پێبکەن.

گەنجەکان دۆستایەتی لەگەلّ شارستانییەکەدا دەکەن و بەدەوریدا دەگەڕێن، لەبەینی خۆیاندا دەلّێن: دەبا ئیمشەو ڕاوە ژیشکێک بکەین!. کابرای نەشارەزاش کە گوێ لە قسەکەیان دەبێ و شتی وای نەدیوە دەلّێ: منیش لەگەلّ ئێوە دێم بۆ ڕاوە ژیشک. گەنجەکانیش ئەم داوەیان هەر بۆ ئەوەو دەلّێن: باشە. بەم شەوە خۆیان ڕێکدەخەن و تەنەکەیەک لەگەلّ خۆیان دەبن و ڕوو لەدەشت دەکەن، کە لەئاوایی دوور دەبنەوە بەشارستانییەکە دەلّێن: تو لەگرتنی ژیشک شارەزانیت، لێرە دانیشە بە بەردێ هەر لەم تەنەکە

بدە، تا ژیشکەکان لە گەل تەقە تەقی تەنەکەکە جێ لەق بن و ڕابکەن و لەژێر پرچکەکاندا دەرچن، بەلاّم تۆ لەتەنەکە کوتانی خۆت نەکەوێ ئێمەش دەچین ئەو ژیشکانەی ڕادەکەن کۆیان دەکەینەوە.

کابرا دەست دەکا بەتەنەکە کوتانی خۆی، گەنجەکانیش دەست دەکەن بەهەیهەیهـا هو بو ڕاپەڕاندنی ژیشکەکان و هەر یەکەیان بەلایەکدا دەڕۆن و پەرتەی لێدەکەن بەهاوار هەیهاو تا لەشارستانەکە دوور دەبنەوەو هەموو ئەگەڕێنەوە گوندی و دەچنە دیوەخان، تا درەنگ دادەنیشن ئەمجا پەرتەی لێدەکەن و هەر یەکە لەمالّی خۆی لێ ڕادەکشێ و دەنوێ تا بەیانی.

کابرای بەستەزمانیش لەم چۆلّییە هەر تەنەکە کوتانییەتی و چاوەڕوانی گەڕانەوەی هاوڕێکانی دەکا، ئەگەر زوو هەست بە پیلانەکە بکا ئەوا دەگەڕیتەوە بۆ ئاوایی ئەگینا هەر لەسەر تەنەکە کوتانی خۆیدا بەردەوامە تاخەوی لێ دەکەوی لەسەر تەنەکە کوتانەکەدا، یا هەر تەنەکە کووتانییەتی تا بەری بەیان. جارێکیان یەکێکی شاری هەولێر هاتە دێی گالینج، ئەم کارەیان پێکرد، تا چەند سەعاتی هەر تەنەکەیان پێ دەکوتا، گەنجەکانیش گەڕانەوە و لەدیوەخان دانیشتن، لەپاشان بانگیان کردەوە و گوتیان: ئیمشەو مانگە شەوە هیچ ژیشکێک نەهاتووەتە دەرەوە با بگەڕێینەوە ئاوایی.

*** ساوار کوتان (حەلاّو)**

لەدێهاتەکاندا کژی ساوار کوتان خۆشترین کژە بۆ گەنجەکان، هەر مالّێ لەگوندێکدا ساواریان بکوتابوایە گەنجەکانی گوندی هەموو ڕوویان تێدەکرد بۆ ساوار کوتان لەپاش بانگی شێوانەوە.

ساوارەکەیان دەکردە ناو قۆلّتێکی بازنەیی و هەرجارەی چوار گەنج یەکە کوتکێکیان بەدەستەیانەوە دەگرت و بازنەیی بەدەورەی قۆلّتەکەدا دەوەستان و دەستیان دەکرد بە ساوار کوتان، کە ئەم چینە ماندووەبوون چواری دیکە جێگەیان دەگرتنەوە.

لەگەلّ ساوار کوتانەکەشدا وردە وردە دەسوڕان بە دەورەی قۆلّتەکەداو یەکێ هەلّبەستی ساوارکوتانی لەسەر ئاوازێکی تایبەتی دەلّێ، کەهەر نیوە دێرێک لە هەلّبەستەکە دەلّێ ئەوانەی دیکە هەموو بەدوایەوە دەیگێڕنەوە، کچێکیش ئەو دەنکە گەنمانەی بەدەستە دەخستەوە ناو قۆلّتەکە، کە لەگەلّ کوتکەکاندا دەپەڕێن، کچەکانی گوندیش هەموو بۆ سەیرکردنیان ڕوو لەم مالّە دەکەن.

خاوەن ساوارەکە سەبەتەیەک یا دوو سەبەتە دیکەی، یا هەنجیر، یا هەر میوەیەکی دیکەی دەکڕی پاش کۆتایی هاتنی ساوارکوتانەکە گەنجەکان دادەنیشن و بەدلّێکی شاد دەیانخوارد و شەویان بەم جۆرە ڕائەشکاند و تا بۆ نووستن پەرتەیان لێ دەکرد، جا هەر شەوێ ساواری مالّێکیان دەکوتییەوە. ئەمەش چەند وێنەیەکە لەهەلّبەستەکانی ساوارکوتان:

**هەلّبەستەکانی پێشەکی ساوارکوتان: –**

حەللاو حەللاو
دەلێدە دەبکوتە
بیکە کا، بیدە با
کیژ لێنێ، کوڕ بیخوا
دەن لەناوی دەڕێنن چاوی
لەبۆ خادیکەی، زێ بەدراوی
دەن لەرۆخی، دەڕێنن پۆخی
لەبۆخادیکەی، مەمک خۆخی
سوفی و مەلاحەی حەی دەکەن
چاو لەکوفتەی هەر زەق دەکەن
جار و نۆیان ئاوا دەکەن!
بەقاڵ هاتن هەشت و نۆ
نە نانیان هێشت نەفرە دۆ
ئێمە چ بخوین بابەڕۆ!
لەگەڵ تۆمە تۆ بگێرەوە
چاوی حیزت مەشێرەوە
ئەوەی لەکنت بنێرەوە
بەکلدان و ئاوێنەوە
لەگەڵ تۆمە لەگەڵێتە
گەردن مامزی بەقەرێتە
ئاقل دار بووم لۆت بووم شێتە

بەمجۆرە پێدا دەچنە خوارەوە بە (لە گەڵ تۆمە) تا زیاتر لە (١٠) دێر دەڵێ: ئەمجا بەهەوەسی خۆی هەرچی هاتە بەر دەمی نایگێرێتەوە کە زۆربەیان هەڵبەستی دڵدارین.

٢- هەڵبەستەکانی دڵداری کە زۆربەی هەڵبەستەکانن، هەر چەندی بنووسرێتەوە تەواو نابێ:

**- (دەمە تەقێ لەبەینی دایک و کچێک)-**

**مالێ تەنکەی لەقەد گردی**
**جەرەی پڕ بوو داینا عەردی**
**دایکی گوتی ماچیان کردی**
کچ:
**بەپێش مالیاندا رابردم**
**جەرەم خوار بوو لۆی راست کردم**
**سەیان دڕیوو لێی پاس کردم**
**دەستی راستی لەمل کردم**
**بەدەستی چەپ مەمکی گرتم**
**بەزۆرداری ماچی کردم**
دایک:
**ئەرێ کیژم چەند عەییاری**
**شەقت نەکەی وەک خەییاری**
**کیژ ماچ ناکرێ بە زۆرداری**
کچ:
**ئەرێ دایە مەمکە لۆمە**
**ئەو هەتیمە جەرگی خۆمە**
دایک:
**ئەرێ کیژم ناتکەم لۆمە**
**سەرم سپییە و پشتم کۆمە**
**ئەو فێلانە لەمەڕ خۆمە**
**لەگەڵ بابت جارو بار بووم**
**لو جاحێلان تەبەرا بووم**
کچ:
**ئەتۆ شیشی من کەبابم**
**ئەمن لەتو چێتر نابم**

*** سەر لێشێواندن و زمان تەتلە پێکردن**

گەورەو بچووک بەژن پیاوو کوڕ و کچ ئەم یارییە دەکەن، کە چەند کەسێ لەکن یەک دادەنیشن، یەکێکیان رستەیەک دەڵێ و داوا لەدانیشتوانی دیکە دەکا و دەڵێ: کە هەر یەکێکیان لەسەر یەک و زوو زوو دووبارەی بکەنەوە، ئەمەش چەند وێنەیەکە:

١- قوری کوڕێ کەر تێ قرپێ.
٢- سەد دەرزی، دوو سەد دەرزی بەکونە دەرزی دایکم دابەزی.
٣- شلە ساوار سێ شلە ساوار و ئەی بابە لەو سێ شلە ساوارەی.
٤- پیرەژنە گوو زەردە، گوو زەردەم بەدەمت، دەمت بەگوو زەردەم.
٥- شەکی سەر رەشی پاشای سوارە شەکی سەر رەشی دایکم بوو.
٦- سێ سنگم دەستە دایێ، دووم کوتا کایێ، یەکم دا دایێ.
٧- چل چرگی چلمن، ها چل چرگی چلمن، مل ئەقی مل رووتی مل رنیاو.

*** قسەی نەستەق**

کە چەند کەسێ کۆدەبنەوە کاتێکی خۆش بەم قسانە دەبنە سەر، بەتایبەتی لەشەوانی زستاندا، کە بەریزە هەر یەک قسەیەک دەگێرنەوەو چەند جارێ نۆرەیان دێتەوە سەر، هەموو شل دەبن لەبەر پێکەنین.

ئەمەش چەند وێنەیەکێتی:

١- یەکێکی گێل و گوار دەبێ بە سەرباز، فری عەرەبی نەدەزانی، لەبەر ئەوە عەریفەکەی فێری چەند پرسیار و وەلامێکی دەکا، یەکێ لەم فێرکردنەی ئەمە بوو: ئەگەر پرسیان (کم عمرك)؟ بلێ (١٧سنة). کە وتی (کم صار لك بالخدمة)؟ بلێ (سنة واحدة). کە وتی (تطوعت من اجل الوطن لو للراتب)؟ بلێ (الاثنين معا). سەربازەکە لەدڵی خۆیدا دەڵێ: جاری یەکەم دەڵێم (١٩) سنة). جاری دووەم دەڵێ:

(سنة واحدة). جاری سێیەم دەڵێم (الاثنین معا).

بەخت و نیوچاوانی ئەم هێر و هورە رۆژی پێنج شەممە لەكاتی پشكنینی جل و بەرگدا، ئەفسەرەكە بەشپرزەی دەیبینی و پێی دەڵێ: (ولك هاي كم صار لك بالخدمة؟) ئەویش وەڵامەكەی پێشووی لەدڵی خۆیدا بەریزە گرتووە و دەڵێ: (۱۹ سنة سیدي). ئەفسەرەكی لێی مر دەبێتەوەو خۆی گف دەكاتەوەو دەڵێ: (انا حمار لو بقر گدامك؟). ئەویش دەڵێ (الاثنین معا سیدی).

۲- سەپانێک لەگەڵ ئاغاكەی لە جۆخینان رەوسەیان بر دەكرد، ئاغا بە سەپانەكەی گوت: برۆ لەماڵەوە شوژنێ بێنە دەركی خرارەكەی پێ بدوورین؟. سەپانەكەش كە دەچێ تەنیا كچێكی ئاغاكەی لەماڵەوە دەبێ، بە كچەكە دەڵێ: ماچێكم بدێ؟ كچەكەش دەڵێ: كورە برۆ هەی سەگی سەگباب. سەپانەكە دەڵێ: دیارە باوەرم پێ ناكەی وەرە تا بەباوكت بڵێم، كچەكە لەگەڵ خۆی دەباتە بەر دەرگای حەوشەو لە دوورەوە ئاغاكەی دیارە لەجۆخینان، هاوار دەكاتە ئاغاكەی و دەڵێ: مامە وا نامداتێ؟ ئاغاكەش دەڵێ كچێ بیدێ هەی.. كچەكە ناچار ماچێكی دەداتی، ئەمجا شوژنەكە بۆ ئاغاكەی دەبا.

۳- كابرایەكی ترسنۆك خەنجەرێک و دەمانچەیەكی لا دەبێ، بە رێگایەكی چۆڵدا دەروا لە پر كابرایەكی سەڵتی تووش دەبێ هیچ جۆرە چەكێكی لانابێ، بەكابرای چەكدار دەڵێ: كورە رووت بە ؟. ئەویش خەنجەرەكە بەدەستی دەگرێ و دەمانچەكەش بەدەستەكەی دیكەی بەبێ ئەوەی بیانوەشێنێ، كابرای سەڵت دەست دەداتە گاشە بەردێک و بوی دەچێ و دەڵێ: سەگباب پێت دەڵێم رووت بە ؟. چەكدارەكە لە ترسان هەموو چەكەكانی بۆ دادەنێ و كابرا دەیانبا و دەروا.

رووت كراوەكە كە دەگەرێتەوە ناو دۆست و برادەرەكانی پێی دەڵێن كوا چەكەكانت ؟. دەڵێ: رێگرێ لێی ساندم. دەڵێن: كورە تۆ. چۆن بۆی رووت بووی ؟. دەڵێ: باوكم دەستێكم خەنجەر بوو، دەستێكیش دەمانچە، خۆ كەڵەباب نەبووم بە دەندووک شەربكەم.

### * كلاو دركانی

ئەم یارییە تایبەتی بە شوانەكان، كە لە دەشتێكدا كۆدەبنەوە. یەكێكیان گۆپاڵەكەی خۆی بە پەلار دوور هەڵدەدا، لە كوێ كەوتەوە دەچێ لەو جێگەیە ئەی چەقێنێ، شوانەكانی دیكەیش لە جێگەی خۆیانەوە گۆپاڵەكەی خۆیان بۆ چەقاوەكە هەڵ دەدەن، هەربەكێ لێی بدا خۆی رزگار دەكاو جارێكی دیكە نایهاوێ، ئەوانەی دیكەیش بە نۆبە هەر یەكە چەند جارێ

گۆپاڵەكانیان بو گۆپاڵە چەقاوەكە هەڵ دەدەن و هەر یەكی لێیبدا رزگار دەبێ، تا لە دواییدا تەنیا یەكێ ئەمێنیتەوە كەهیچ جارێ لە گۆپاڵە چەقاوەكە نادا، ئەوانیش بەهەموویان كلاوەكەی لی ئەسێنن و بە گۆپاڵان هەر جارەی بۆ لایەكی هەڵ دەدەن، خاوەنەكەشی بەم لاو بەو لادا رادەكا بە دوویدا، بەڵام هەر یەكێكیان كە بو ئەوەی دیكە هەڵی دەدا دەڵێ: ئەوەی بدا دایكی بدا. لەبەر ئەوە هەر یەكەیان پێش ئەوەی خاوەنەكەی بیگاتێ بۆ یەكێكی دیكەی هەڵ دەداو جوونەكە لە خۆی دوور دەخاتەوە، بەم لەم یارییەدا بەشداربێ دەبێ ببێ بە ئاش، كە هەر یەكە لە گەنجەكان دەڵێن: من دەبم بەئاش سەردارەكەیان دەڵێ: نە، تۆ ببە بە ماكەر، تۆش ببە بە ئاشەوان، تۆش ببە بە خاوەنی باراش، خۆشم دەبم بە ئاشوەستا، تاوا لە نەشارەزایەكی دەكەن خۆی داوای ئەوە دەكا ببێ بە ئاش، لای وایە بێ ئازارترە، چونكە هەموویان داوایان دەكرد، ببن بە ئاش.

كراسێكی ژنانەی درێژی بە باخەڵ دەكەنە بەر ئاشەوان و بالیفێكی لەژێر كراسەكەوە لە سگی دەبەستن و دەبێ بە كابرایەكی تەنگەستوور، دووانیش دەبن بە كەر، كە یەكێكیان بە پێوە دەوەستێ و ئەوەی دیكەیش لە پشتی دەچەمێتەوەو سەری بە پشتی ئەوی پێشەوە دەكا، پارچە پەرۆكێكی گەورە یا جاجمێكیان بە سەردا دەدەن و دایاندەپۆشن. بۆرییەكێش دەدەنە دەست ئاشەكەو پێی دەڵێن: تۆدەمت بخە ناو ئەم بۆرییەو هەر بڵێ (پپ، پپ، پپ،...).

ئاشەوان بە ناو (دانیشتووەكان) دا دەگەرێ هەر جارەی لە پر لەقەیەك لە رانی یا لە

پێی یەکێکیان دەداو دەڵێ: هەها ئەوە کونە جرجە شەپڵتەیەکی لێدە؟.. یەکی بە دوایەوەیە دوو سێ لەقە لە دانیشتووەکە دەدا، لە یەکێکی دیکە دەداو دەڵێ: ئەی سندانت لێدا ئەوەش کونە مشکە شەپلەیەکی لێدە؟. بەم چەشنە تا دەرۆن هەر بە لەقە لە دانیشتووەکان دەدەن، لەپڕ کوڕی ئاشەوانەکە لە بەر دەرگاوە بانگ دەکا و دەڵێ: باوکە باراش هات! باوکی دەڵێ: باراشەکە چییە؟. کوڕەکە دەڵێ: گەنمە. باوکی دەڵێ: کەرەکەی چییە؟. کوڕەکە دەڵێ: نێرەکەرە. باوکی دەڵێ: بۆی درشت لێکە.

پاش نەختێ کوڕەکە دووبارە دەڵێ: باوکە باراش هات. باوکی دەڵێ: باراشەکە چی یە؟. کوڕەکە دەڵێ: ساوارە. باوکی دەڵێ: کەرەکەی چییە؟. کوڕەکە دەڵێ: ماکەرە. باوکی دەڵێ: بۆی بکە بەئارد. ئاشەوان لەخۆشیان گەش دەبێتەوەو لەتاوا بەم لاو بەولادا دەگەڕێ و لەبەر خۆیدا وردە گۆرانی دەڵێ، کە خاوەنی باراشەکە لە کەرەکەی دوور دەبێتەوە ئاشەوان کەوچکێکی گەورەی بۆ (ئەسکو) بەهەردوو دەستەکانی لەبەینی هەردوو رانی خویدا دەگرێ و سەرەکەشی بۆ پێشەوە درێژ دەکا و یاغر یاغر بۆلای کەرەکە دەچێ و ئەسکوییەکە لەپاشەوەی کەرەکە دەسوێ، هەموو دانیشتووەکان دەستەدەکەن بە پێکەنین، ئاشەکەش لەبەر پێکەنین نەختێ لە (پپ پپەکەی) دەکەوێ، (ئاش وەستا) خۆی تەنگاو دەکا و دەڵێ ئەها ئاشەکە تێکچوو، دەنگی چاک نابێ، دەچێتە لای ئاشەکەو (ئاش وەستاکە لە پێشا لەناو لەپی هەردوو دەستەکانی بەتنی ساج رەش کردووە) دەستی بەرووی ئاشەکەدا دەسووێ و رووی رەش دەکا، هەموو خەڵکەکە پێدەکەنن، ئاشەکەش هەر سەیری کەر و ئاشەوان دەکا لە پێکەنینی خۆی ناکەوێ، ئاش وەستا بەم جورە هەر خەریکە رووی ئاشەکە رەش دەکا، کەپووی دەگرێ و رەشی دەکا و دەڵێ: ئەوە بۆ ئیش ناکا؟!. هەروەها گوێیەکانی و چەناگە و کوڵمی، یا هەموو رووی رەش دەکا.

خاوەن باراش بەسەر ئاشەوانەکەدا دەچێ، کە بە کەرەکەیەوە خەریک دەبێ، دەبێ بەهات و هاواری ئاشەوان و خاوەنی کەرەکە، هەر چەندی ئاشەکە لەسەر رووڕەشی خۆی بە کەرو ئاشەوانەکە پێدەکەنی، دانیشتووەکان هەندەی دیکە لەبەر پێکەنین بەحاڵی ئاشەکە لەسەر پشت دەکەون، کەهەموو رووی رەش کراوەو هەر دەڵێ (پپ، پپ پپ). ئەمجا دانیشتووەکان دەڵێن: کوڕینە ئەم ئاشە چەند دووکەلی گرتووە؟ ئاشەکەش کە دەستی بەرووی خۆیدا دەسوێ هەموو دەستی رەش دەبێ، ئاش وەستا رادەکا و ئاش بەدوای دەکەوێ بە جنێودان، تا بەهەر جۆرێ هەموو دانیشتووەکان دڵی ئاشەکە دەدەنەوەو چاوی دەشۆن، بەڵام بێ کەلکە، تا پاش چەند رۆژێکی دیکەیش هەر جارێ ئاشەکە ئاش وەستا دەبینێ جنێوی پێدەدا و لەدڵی دەرناچێ، چونکە لەپێش هەندە خەلکە ئابڕووی بردووەو کردوویییە بەگاڵتە.

*** کەری کەر هاژوو**

(٦-١٤) گەنج دەبن بەدووبەشی وەکوو یەک، هەربەشەی سەرۆکێکی هەیە. هەردوو سەردارەکە (هۆپ هۆپ قەرەتۆپ) دەکەن، کامیان تێبکەوێ هاوبەشەکانی نەختێ لێیان دوور دەبنەوە و پشتیان دەخەنە بەشە سەرکەوتووەکە و بەپێوە دەوەستن بێ ئەوەی ئاوڕ بۆ پاشەوە بدەنەوە.

هەرجارەی یەکێ لەبەشە سەرکەوتووەکە ئەچێ سەری بەپشتی یەکێ لە تێکەوتووەکان دەکا، سەرۆکەکان بەتێکەوتووەکە دەڵێن: کێت داژوانی؟. ئەویش ناوی یەکێ لە سەرکەوتووەکان دەڵێ، ئەگەر ناوی ئەو کەسە بێ کەسەری بەپشتیەوە ناوە ئەوا ئەوەی پشتی بەکۆڵ هەڵی دەگرێ تا جێگایەکی دیارکراو دەیگێڕێتەوە. بەڵام ئەگەر ناوی ئەو نەبێ ئەوا تێکەوتووەکە ئەوەی پشتی بەکۆڵ هەڵدەگرێ تا جێگە دیار کراوەکە و ئەیگێڕێتەوە ئەمجا یەکێکی دیکە لەسەرکەوتووەکان سەری بەپشتی یەکێ لە تێکەوتووەکان دەکا.

بەم چەشنە تاهەموو سەرکەوتووەکان، یەکە یەکە سەریان بەپشتی تێکەوتووەکان دەکەن جا لەپشت دەکرێن یا لەپشتیان دەکەن.

ئەمجا بەپێچەوانەوە بەشەکەی دیکە دەچنە پێشەوەو بەشە تیکەوتووەکەی پێشوو یەکە یەکە سەر بە پشتی تیکەوتووەکانی تازە

دەکەن. بەم چەشنە هەر جارەی بەشێکیان تێدەکەون تا لەیاری تێر دەبن.

*** کەلەک داپڕین**

(٦-١٤) گەنج دەبن بەدوو بەشی وەکوو یەک، قومەتە خوڵێکی گەورە دەکەن و بەردێکی هەندەی ناولەپێکی دەخەنە ناوییەوە، بەشێکیان تێدەکەوێ و پارێزگاری قومەتە خۆڵەکە دەکەن و هەوڵدەدەن لەقە لە بەشەکەی دیکە بدەن کە نزیکیان دەبنەوە بۆ ئەوەی تێبکەوێ، بەشەکەی دیکەیش هەوڵدەدەن بەردەکەی ناو قومەتەکە دەربخەن، هەریەکێ، پارێزگارەکان لەقومەتەکە دوور بێتەوەو یەکێ لەهێرشبەرەکان بە بەینی قومەتەکەو دوور کەوتووەکەدا بڕوا (بەبێ ئەوەی لەقەی لێ بدرێ) دەڵێ: بڕ. ئەوا بڕ کراوەکەی پارێزگا لەیارییەکە دەردەچێ. هەر یەکێش لەبەشە پارێزگارەکە لەیەکێ بدا، لەبەشەکەی دیکە لەقە لێ دراوەکە لەیارییەکە دەردەچێ. بەمجۆرە یەکە یەکە لەیارییەکە دەردەچن تا تەنیا یەکێ لەهێرشبەرەکان ئەمێنێتەوە لەقەی لێ نەدرابێ ئەویش ئەوەیە (چیلە بەکەڵ) و هەموو ئەو پارێزگارانەی کە ماونەتەوە بەدوایدا رادەکەن، ئەگەر توانییان لەقەی لێبدەن ئەوا پارێزگارەکان گاسنێکیان لەهێرش بەرەکاندا دەبێ، ئەگەر نەشیانتوانی لەقەی لێدەن تا ئەگاتە قومەتە خۆڵەکە و بەلەقە بەردەکەی لەناویدا دەردەخا (کەلەک دەڕوخێنێ) و بەشە هێرشبەرەکان گاسنێکیان لەبەشەکەی دیکە دەبێ. ئەمجا بەپێچەوانەوە بەشەکەی دیکە هێرش دەبەن.

*** گوریسی بن سنگی**

(٥-١٠) گەنج هەریەکە گورزێکیان بەدەستەوەیە سنگی لەزەوی دەکوتن و سەری گوریسێکی دووباڵ درێژی پێوە دەبەستن، یەکێک تێدەکەوێ هەموو گورزەکان لە یاری کەرەکان ئەسێنێ و لەتەنیشت سنگەکە دەیانخاتە سەر زەوی و سەرەکەی دیکەی گوریسەکە بەدەستەییەوە دەگرێ و دەڵێ: (تۆز بەری ئاسمانی گرت) واتە یارییەکە دەستی پێکرا. هەموو بەپەلە لەسنگەکە دوور دەکەنەوە تێکەوتووەکەش سەری گوریسەکە دەگرێ و بەدەوردی سنگەکەدا دەسوڕێ و پارێزگاری گورزەکان دەکا و ناهێڵێ ئەوانەی دیکە بیبانبەن، ئەوانەی دیکەیش بەدەورەیدا دەسووڕێن و هەوڵدەدەن گورزەکان ببەن. ئەگەر گوریس بەدەستەکە لەقەی لەهەر یەکێکدا بەبێ ئەوەی دەست لە گوریسەکە بەردا ئەوا لەقە لێدراوەکە تێدەکەوێ و سەری گوریسەکە دەگرێ و ئەوەی دیکە رزگار دەبێ. بەم چەشنە هەریەکێ لەقەی لێبدرێ تێئەکەوێ و ئەوەی پێشوو رزگار دەبێ تا یەکێ بۆی هەڵ دەکەوێ و هەموو گورزەکان دێنێ. بەبێ ئەوەی لەقەی لێدرێ. گورزەکان بەسەر خاوەنەکانیان دابەش دەکا، ئەمجا بەهەموویان لەتێکەوتووەکە دەدەن بۆ گورزەکانیان هەتا جارێ لەقەیەک لەیەکێکیان دەدا و خۆی رزگار دەکا، لەقە لێدراوەکەش تێدەدەکەوێ و سەری گوریسەکەی دەگرێ و هەموو بەگورزان لێی دەدەن تا ئەویش لەقە لەیەکێکی دیکە دەدا و خۆی رزگار دەکا....

*** گەنم گەنانێ**

ئەم یارییە لەبەینی (٣-١٢) گەنج دەکرێ، هەموو بازنەیی بەرانبەر یەک دادەنیشن، هەر یەکەیان لەجێگەی ناوەکەیدا ژمارەیەکی بۆ دادەنێن یەکێ دەبێ بە (٩) یەکێکی دیکە (١٨) یەکی (٣)، یەکێکی دیکە..... هتد.

یەکێکیان دەست بەیارییەکە دەکا و دەڵێ: گەنم گەنم (ژمارەیەک دەڵێ کە بۆ یەکێ دانرابێ، بو وێنە دەڵێ لە نۆیانە). نۆ دەڵێ: لەنۆیان نییە. کابرا دەڵێ: ئەی لە چەندانە؟ نۆ ژمارەیەکی دیکە دەڵێ کە لەیەکێ لە دانیشتووەکان دابێ بۆ وێنە دەڵێ: لەسێ یانە. سێ دەڵێ: لەسێ یان نییە!... نۆ دەڵێ: ئەی لەچەندانە؟ سێیش بەم چەشنە ژمارەیەکی دیکە دەڵێ، واتە هەر یەکەیان ژمارەکە لەسەر خۆی لادەدا و دەیخاتە سەر یەکێکی دیکە. هەریەکێکیان ژمارەیەک بڵێ کە لەم یارییەدا نەبێ یا زمانی ببەستێ و قسەی بۆ نەکرێ، (چونکە پێویستە ئەم پرسیار و وەڵامانە بەپەلە بکرێن و وەڵام بدرێنەوە) لەیارییەکە دەردەچێ و لەسەرییەوە دەست پێدەکەنەوە. بەمجۆرە یەکە یەکە لەیارییەکە دەردەچن تا لەدواییدا یەکێ

دەمێنێتەوە کە هیچ هەڵەیەک ناکات و بەسەر هەموویاندا زاڵ دەبێ.
ئەم یارییە بەزۆری فەقێیەکان دەیکەن لەپاش راتبە کۆکردنەوەدا، کە تەنیا شیوێکی خۆشیان لەگەڵ راتبەکەدا کۆکردێتەوە، هەر یەکێ لەم یارییەدا سەرکەوێ ئەوەیان شیوە خۆشەکە دەخوا، یا هەر خواردنێکی دیکە بێ کە لە خواردنەکانی دیکە خۆشتر بێ و تەنیا بەشی یەکێ بکا، ئەوانەی دیکەش خواردنەکانی دیکە دەخۆن.

*** مەتەڵ**

گەورەو بچووک، کوڕ و کچ، ژن و پیاو ئەم یارییە دەکەن، هەر تەمەنی جۆری مەتەڵی خۆی هەیە، کە چەند کەسێ بۆ رابواردن لەگەڵ یەک دادەنیشن، بۆ تاقیکردنەوەی وشیاری و زیرەکی ئەم یارییە دەکەن، هەر جارەی یەکێکیان مەتەڵێ دەڵێ و ئەوانەی دیکە هەموو بەجارێ بیری لێدەکەنەوە تا یەکێکیان هەڵی دێنێتەوەو ئەیزانی. ئەمانەش چەند وێنەیەکن لەم مەتەڵانە:

١- سێ هێلکە بەسەر حەفسەت و دووکەس دابەش بکە بەمەرجێ هەر یەکەیان هێلکەیەکی بەرکەوێ؟
(مەبەست لەم مەتەڵە حەفسەتە (حفصە) کە ناوی کچێک یا ژنێکە، نەک حەفسەدی ژمارە).
٢- هەتا پل (پەنجە)ی لەقووتی رانەکەی کاوێژ ناکا؟ (مەقەست).
٣- هەتا لێیبدەی هەر دەرێژی (بێژینگ).
٤- هەر جێگایەک گای سووری لێ بنوێ گیای لێ شین نابێ؟ (ئاگر).
٥- سەری بەتۆ بنی بەدایکت؟ (مەمک).

بەڵام مەتەڵ بەشێوەی هۆنراوە زیاتر بەکاردێ، وەک:

١- بنوێ گایە هەڵسێ چیایە؟ (رەشماڵ).
٢- چوار برا هەنە لەچۆمەکی تیران داوێنە گۆمەکی؟
(گوانی چێڵ لەکاتی دۆشیندا).
٣- هەورۆکە هەورۆکە لێی دەبارێ بەفرۆکە (هێلەگ).
٤- مامێکم هەیە لەدەشتێ کەچە شێرێکی لەپشتێ. (دووپشک).
٥- بەعیساکەم بەمووساکەم هەردوو لنگی لەحەواکەم زیڕ و هۆری پێ پەیاکەم. (شەغرە لەکاتی بارکردندا).
٦- دوو بەندو بەندەکە، دوو دەف و دارەکە. (تەرازوو).
٧- ئەم لای دارە ئەولای دارە تێیدا دوو گوجیلەی هارە (خەنجەر).
٨- بەپێیە شەپڵتەی تێوە. (کەندوو).
٩- چواری مامە فەقێ، هەشتی حەتەلحوتی
حەتەلحوتی رەوکوتی مامە فەقێ شەوکونی (جووت کردن).
١٠- تەپ لەسەر تەپی دەستەت لەرەپی. (دەستاڕ).
١١- لەسەری یەکە لەبنی دوو بەقوونی باب و باپیرتدا چوو؟ (شەروال).
١٢- نەبایە نە بارانە چک چکە لەدارانە. (کوندەڵان).
١٣- نۆ نوردی نۆ نان نۆ نان هەر نانی نۆ کفتە لەسەر هەر کفتەی نۆ پشیلە لەسەر پشیلەی نۆ فەرخە لەبەر. ((٥٩٠٤٩) فەرخە پشیلە).
١٤- هەر لێرە هەتا مەککە هەموو مەڕی سوور بەلەکە بە ئەستەویری گوانان دەکا؟ (کچ).
١٥- خۆی هەندوکە بەدەندۆکە لەپێش حاکمان دەڵێی بووکە. (چرا).
١٦- مامێکم هەیە لەدەشتێ حەفسەت کوتنی لەپشتێ (ژیشک).
١٧- خانەیەکم هەیە تاریک پڕ حوشتر مل باریک (شارە مێرووستان).
١٨- دەرخۆنە لەسەر قوونە چەند خۆشە بەروونە (دوونگی مەڕ).
١٩- هرک کردە مەرەکی سەد مەڕ هات لە رەنگەکی (زەردەواڵە).

*** میری گزیرانی**

ئەم یارییە لەشەوانی درێژی زستاندا لەدیوەخانەکاندا دەکرا، کە زۆربەی دانیشتووەکان تێیدا بەشدار دەبوون. پەنجەی نێوان میرە، پەنجە شادە (دۆشاو مژە) گزیرە، پەنجەی (برای تووتە) مەلایە، پەنجەی بچووک مەلا ژنە. ئەنگوستیلەیەک دێن بەریزە هەرجارەی یەکێ لەبەشدارەکان ئەنگوستیلەکە بۆ ئاسمان هەڵدەدا و لەکاتی هاتنە خوارەوەی لەئاسمانەوە پەنجەکانی

دەخاتە بەرێ، هەر یەكەیان هەوڵدەدا ئەنگوستیلەكە بكەوێتە پەنجەی نێوانی تاكو ببێ بە گزیر كە یەكێ لەیاریكەرەكان بوو بەمیر، ئەوا بەئارەزووی خۆی فەرمان دەردەكا، بەمجۆرە یەكێكیش دەبێ بەگزیر، گزیر گورزێ بەدەستەییەوە دەگرێ بۆ بەجێهێنانی فەرمانەكانی میر. كە یەكێ دەبێ بەمەلا، میر دەڵێ: مەندیلێك و كەوتو سەلتە بۆ مەلا بكە؟ گزیر گورزێ لەسەری مەلا دەدا و دوو گورزیشی لەپشتی دەدا و دەڵێ: میرۆم بۆیم كرد. میر دەڵێ: دوانزە قران مانگانە بۆمەلا ببڕەوە؟ گزیر دووانزە گورز لەدەستی مەلا دەدا و دەڵێ: میرم بۆیم بڕییەوە. بەم چەشنە هەر شتێكی پێویستی مەلابێ میر فەرمان دەكاتە سەر گزیر كە بۆی بكا، گزیریش بەگورز لێدان بۆی دەكا. كە یەكێكیش دەبێ بە مەلاژن. میر بەگزیر دەڵێ: چارۆگە و كڵاو دەسترۆك بۆ مەلاژن بكە، گزیریش چەند جارێ گورزەكە لەسەرو گۆلاكی مەلاژن دەدا و دەڵێ: میرم هەمووم بۆی كرد، میر دەڵێ: دەقرانیش مانگانەی بۆ ببڕەوە لەبەر خاتری مەلا بابێ مانگانە نەبێ، گزیریش دە گورز لەدەستی مەلاژن دەدا.

ئەوانەی دیكەش كە ئەنگوستیلەكە هەڵدەدەن دەیانەوێ ببن بەمیر وبە مرازەش ناگەن. میر دەڵێت: گزیر ئەم مرۆڤانە زۆر حەز لەگەورەیی و زەنگینی دەكەن، هەر یەكە مانگانەیەكی زۆریان بۆ دەبڕیتەوە و دەڵێ: ئەمەیان (٢٠) قرانی بدێ، ئەوەشیان سی قرانی بدێ... هتد.

گزیریش هەریەكە چەندیان بۆ بڕابێتەوە هەندە گورزەیان لەدەستی دەدا. ئەگەر یەكێكیش ئەنگوستیلەی هەڵداو بوو بەمیر ئەوا دەبێ بەفەرمانڕەوا، فەرمان دەكاتە سەر گزیر و دەڵێ: چل، پەنجا قران بدە بەمیری پێشوو، چونكە پیاوێكی گەورەبوو دەست و پێ سپییە لێ كەوتییە، كاسبی پێ ناكرێ گزیریش هەندە گورزە لەدەستی میرەكەی پێشوو دەدا و دەڵێ: قوربان قرانەكانم دایی، میر دەڵێ: كورتەك و شەرواڵێكی باشی بۆ بكە، گزیریش دوو گورزی چاك لەپشتی كۆنە میر دەدا، میر دەڵێ پڕدێن و پێلاو و مشكیەكی چاكیشی بۆ بكە. گزیریش دوو گورز لەپێیەكانی كۆنەمیر دەدا و دوو لەسەری و یەكێشی لەناوقەدی دەدا و دەڵێ: قوربان هەمووم بۆی كرد.

ئەگەر یەكێكی دیكەیش ببێ بە میر ئەوا دەبێ بەفەرمانڕەواو فەرمان دەكاتە سەر گزیر بۆ لێدانی میرەكەی پێش خۆی بەجل و بەرگ و پوول بڕینەوە.

*** نان نانانی**

سێ كەس لەم یارییە بەشدار دەبن، یەكێ دەبێ بە نانەوا، یەكێكیش دەبێ بەتەندوور، یەكێكی دیكەیش هاوار بۆ نانەوا دەبا.

نانەوا خەریكی نان پێوەدان دەبێ، دەستی خۆی پان دەكاتەوە لەیەكی دەدات و دەستێكی بەتین لەپشتی تەندوورەكە دەدا. لەم كاتە یەكێ بەتەنگاوی دێ و بەنانەوا دەڵێ: بڕۆ ماڵەوە دایكت مردووە!... نانەوا هیچ خۆی تێك نادا. كابرا دەڵێ: كوڕە باوكت مردووە؟! نانەوا دەڵێ: من دەست لەكاری خۆم هەڵناگرم. كابرا هەر دەڵێ: یەكێكت مردووە تا هەموو خێزانەكەی نانەوا دەژمێرێ و لەخوشك و براو دایك و باوكی، نانەوا هیچ گوێ ناداتێ و كاری خۆی ناوەستێنێ.

*** هەڵگرتنی شاهی ئەجندان**

ئەم یارییە لەبەینی پێنج گەنج دەكرێ، یەكێكیان لەسەر پشت درێژ دەبێ و هەردوو گوێەكانی دەگرێ بەهۆی پەنجەی دۆشاو مژەی، هەردوو دەستەكانی تاگۆی لەقسەی هیچ كەسێ نەبێ خۆی دەكا بەمردوو، چوارەكەی دیكەیش دوویان لەبەرانبەر یەكدا لەدیار سەری مردووەكە دادەنیشن دووەكەی دیكەیش لەبەرانبەر یەك لەسەر چینچكان دادەنیشن لەنزیك رانەكانی مردووەكە.

ئەوەی لای سەری كە لە تەنیشتی راستی دانیشتووە دەبێ بەسەردار، هەر چوار سەریان لەیەك نزیك دەكەنەوە. سەردارەكە بەدەنگێكی نزم دەڵێتە دانیشتووەكەی دەستە راستی خۆی: ئەمە چییە؟ ئەویش لەگەڵ بەرانبەرەكەی دا ئەم قسەیە دووبارە دەكاتەوە، بەم جۆرە هەر یەكێكیان ئەم پرسیارە لە دانیشتووەكەی دەستە راستی خۆی دەكا تا ئەسوڕیتەوە لای سەردارەكە، ئەمجا سەردارەكە دەڵێ:

ئەمە شاهی ئەجندانە مردووە، هەر چواریان لەگەڵ یەكدا ئەم وتەیەش دووبارە دەكەنەوە تا ئەگاتەوە سەردارەكە. سەردارەكە دەڵێ: چی لێدەكەن؟. دیسان هەموو دووبارەی دەكەنەوە وەكوو جارانی پێشوو. ئەمجارە سەردارەكە دەڵێ: ئەیبەین بۆ قەبران. كە ئەم قسەیەش لەناو هەر چواریاندا گەڕا، سەردارەكە دەڵێ: چوار لەئێمە هەزاران لەوان. كە هەموویان ئەم قسەیەش دووبارە دەكەنەوە، هەریەكەیان دووپەنجەی شادەی لەڕاستی خۆیدا دەخاتە ژێر لەشی مردووەكەو سەردارەكە فیتەیەكی دوورو درێژ دەكا، لەگەڵ فیتەكە هەموویان بەزانایی دەستەكانیان لەسەرخۆ بەرز دەكەنەوە بۆ ئاسمان كە مردووەكەی لەسەرەو بەهێزێكی كەم لەگەڵ دەستەیاندا بەرز دەبێتەوە لە زەویدا، كە هەر پاڵی داوەتەوەو لەسەر گازی پشت درێژ بووە، جاری وادەبێ تاراستی سەریان بەرزی دەكەنەوە ئەمجا دەیخەنەوە سەر زەوی، بەڵام لەكاتی بەرزكردنەوەیدا، یا لەكاتی هێنانە خوارەوەی یەكێ بڵێ (بسم الله) مردووەكە لەسەرڕا دەكەوێتە خوارەوەو ئازارێكی زۆر دەبینێ.

*** هەیاران (كۆسە بەبا)**

لەساڵانی كەم باراندا دیارە مەترسی دەبێ لەسەوز بوونی دەخڵ و دانە چاندراوەكان. لەبەر ئەمە چەند گەنجێ كۆ دەبنەوەو یەكێ دەكەن بە (كۆسە بەبا)، هەموو رووی رەش دەكەن بەتەنی سیل (ساج)، زەنگوڵێكیشی دەخەنە ملی، جلێكی كۆن و شڕیشی دەكەنە بەر، تۆبزێكی ئەستووریش بەدەستەییەوە دەگرێ. گەنجێكی جوانیش دەكەن بەبووك، جلی بووكینێ بەتەواوی لەبەر دەكەن، وای ئەڕازێننەوە كە لەگەڵ بووك جیانەكرێتەوە بۆ ئەو كەسەی سەیری دەكا. بەم چەشنە بەناو گەڕەك و كۆڵانەكاندا ماڵ بەماڵ دەگەڕێن یا لەگوندێكەوە دەچن بۆ گوندێكی دیكە. لەپێش هەرماڵی كوسە دووسێ تۆبز بەهێز لەدەرگای ماڵەكە دەدا هاوڕێكانیشی دەڵێن:

**هەیاران و مەیاران**
**یاخوا بنێری باران**
**لۆ فەقیر و هەژاران**
**ئەو ساڵ بیارێ باران**
**گەنم برزی لەچاڵان**
**گەنمی حەسەن و حوسینان**
**هەموو قڕبوون لەتێنان**

جا هەر ماڵی نەختی دانەوێڵەیان بۆ دێنن و مەنجەڵە ئاوێک، یا چەند جامە ئاویش ئەڕشێنن بەسەر كۆسەكەدا. جاری وا دەبێ چەند گەنجێک بووكەكە لەكۆسە دەشارنەوە، كۆسەش كە بووكەكە بزر دەكا چەند جەڕەو گۆسكەی دەكەوێتە بەرچاوی هەمووی بەتۆبزان ورد و خاش دەكا، لەبەر ئەوە گەنجەكان ناچار دەبن بووكەكەی بۆ دێننەوە، ئەمجا كۆسە بووكەكە ماچ دەكا و بەدەورەیدا دەگەڕێ ماڵ بەماڵ دەستوڕێنەوە تا ئێوارە دەمەو رۆژئاوا، چەند منداڵی ئەم گوندەش هەیە هەموو بەدوایان دەكەون و گاڵتەیان پێدەكەن:

**كۆسە مەمە سترمە**
**نانی دەخوا بەخورمە**

بەڵام كە كۆسە هێرشیان بۆ ئەباو تۆبزەكەی هەڵدەشەقینی هەموو منداڵەكان بەجارێ رادەكەن لەترسان لەبەر دیمەنە ترسێنەرەكەی، كە ترسیان شكا هەمیشە بەدوایدا رادەكەنەوە.

ئەمجا ئێوارە ئەم گەنم و جۆیەی كە كۆیان كردوەتەوە هەمووی بە خواردنێكی خۆش دەدەن و لەگەڵ یەكدا ئەیخۆن جا مێوژ بێ، یا هەنار، یا هەر شتێكی دیكە.

*** هەی كەر هەی كەر**

كە چەند گەنجێ هەست دەكەن یەكێكی لاساریان لە گەڵدایە كە لەم یارییە نەشارەزایە، هەموو گەنجەكان لەناو خۆیاندا رێكدەكەون و پیلانی بۆ دادەنێنەوە، لەناو خۆیاندا دەڵێن: با یاری (هەی كەر هەی كەر) بكەین، نەشارەزاكەش لە گەڵیاندا بەشدار دەبێ، هەر یەكە چاوی بەدەستەسڕی یا پارچە پەڕۆكێكی خاوین دەبەستێ، كە نەشارەزاكە چاوی خۆی دەبەستێ، ئەوانەی دیكە هەر یەكە پەڕۆكەكە لەچاوی خۆیان دەكەنەوەو ئەیخەنە باخەڵیان، تەنیا لاسارەكە بەچاو بەستراویی دەمێنێتەوە.



# جل و بەرگی دزەییاتی

**هوشیار عەبدوڵڵا**

جلوبەرگی جارانی پیاوانی ئەو دەڤەرە بریتی بووە لە"کورتەک و شەرواڵ"، "رانکو چۆغەڵ".

کورتەک و شەرواڵ کۆنترین جلوبەرگی پیاوانە لەدەڤەرەکەماندا، بەرگی کوردی پیاوان لە "٢" بەشی سەرەکی پێک هاتووە کە پێی دەگوترێت"کورتەک و شەرواڵ" یان "شەرواڵ و مرادخانی" یان "ستارخانی" یا"رانکو چۆغە". لەدەشتی هەولێرێ بەبەشی سەرەوە دەرێن: "کورتەک"، جاران کورتەکی دوولای بە لۆکەیان لەبەردەکرد، قۆپچەو دوگمەی پێوە نەبوو، بەرکی لەبەری ژوورەوە بوو، لای چۆپەیان دێخستە لای راستە، کورتەکەکە هەندێک ئەستوور و قەبەو گەورە بوو، ناوی بە لۆکە بوو، ئەم جۆرە کورتەکانە جودایی لەگەڵ کورتەکی "مراد خانی" و "ستار خانی"هەبوو، یێقەو مێقەی نەبوو، بە پشدێن توند دەکرا، ئەوجۆرە کورتەکە "مامەش" یان پێدەگوت، لەوانەیە کاتی خۆی لەناو "عەشیرەتی مامەش"ی کوردەوە باو بووبێت و لە "دەشتی لاجان"ەوە، لە رۆژهەڵاتی کوردستانەوە کەوتبێتە ئەو دەڤەرەو بۆیە ئەو ناوەی لێندرابێت و وەرگرتبێت، ئەوجۆرە کورتەکانە لەناو عەشیردتی فەیزوڵڵا بەگی لەدەڤەری موکریاندا لەکۆنەوە هەر هەبووە. ئەوجۆرەکورتەکە"سەلیم بەگی"شیان پێ گوتووە، لەپاشان کورتەکی بە قۆپچە و دوگمە پەیدابوو، ئەویش "٢" دوو جۆر بوو "١- مرادخانی. ٢- ستار خانی" بوو، وابزانم ستارخانی لە رۆژهەڵاتی کوردستانەوە کەوتۆتە شاری سلێمانی ئینجا لەوێوە بە شارو شارۆچکەکانی دیکەی کوردستاندا بڵاوبۆتەوە، کورتەکی ستار خانی "٢" دوو رێز قۆپچەی پێوەبوو، لەوەرزی زستانان قۆپچەکان دادەخران، لە هاوینانیش

دەیانکردنەوە، هەرچی مراد خانی بوو یاخەی دەکرایەوە، لە چەشنی یەخەی چۆغەی بوو، سوخمەیان لەبن لەبەر دەکــــــــرد، کــــــــراسی بە ئەنگوچک"لەوەند"یان لەگـــــەڵ لەبەردەکرد، کراسەکەش لە جانگی سپی و خام و شەعادە و قوماشی چاپان، واتا ژاپۆن دروست دەکرا، "٢" دوو کـــــەلانگوچکی درێژو پانی پێوەبوو.

پشــدێن یان پشـــتێن یا پژدێن ئـەویــش بـریـتـی بـوو لـە پـارچـە قوماشێکی ژنانەی زۆر جوان، چەند گەزێک"مەتر"ێک درێژ بوو، هەندێ جــار وەبوو لە"١٠"دەگـــەز زیاتریان کردۆتە پشدێن، هەمیشە پشدێنی ئەو دەڤەرە گەورەو پان بووە، پشدێنی ئەو دەشتە قەف قەف نەبووە وەکو خەڵکی لای سەرێ، ئەو پشدێنەیان لەسەر کورتەک و شەرواڵەکەیان لەناوقەدی خۆیان دەئاڵاند و توندیان دەبەستا، ئەوجا خەنجەرێکی جۆری "دەبان" یان "سالح بەگی" یان لەبەر رادەکرد و تەسبیحێکی قل گەورەشیان لەدەسکی خەنجەرەکەی دەئاڵاند بۆ جوانی.

مشکی "شەدە"و هەوری، لەپێش پەیدابوونی جەمەدانی خەڵکی ئەو دەشتە شەدەی رەشیان لەسەری دەنا، بەزۆریش گەنجە تازە پێگەیشتووەکان هەوری مۆریان لەسەر دەکردو ئەوجا لەگەڵ هاتنی ئینگلیزەکان لەساڵی ١٩١٨ز بەدواوە "جـــەمـــــەدانی" پەیدابوو خەڵک لەسەری دەکرد، بەستنەوەی سەرپێچ و جەمەدانی هەر ناوچەو دەڤەرێک شێوەیەکی تایبەتی خۆی هەبوو، "٤٠" چل ساڵێک لەمەوبەر ئەگەر پیاوێکی دنیا دیتە لەناو شاری هەولێر تەماشای هەر یەکێکی بکردابوایەو دیقەتی بدابایە چ ژن چ پیاو یەکسەر بە جلوبەرگەکەی و سەروجەمەدانی بەستنەکەی دەیزانی ئەوا ئەوکەسە خەڵکی چ ناوچەو دەڤەرێکی کوردستانە! چونکە هەر ناوچەو تایبەتمەندییەکی خۆی لە جل پۆشیندا هەبووە، هەرنا بە کڵاوەکەی سەری یاخود جەمەدانی بەستنەکەی دیاربوو. کڵاو "کراو" لەو دەڤەرەدا کڵاوی خامەکی مۆریان لەسەری دەکرد و دەنەخشێنراو خۆ کردبوو.

پەستەک و کەرک هەندێک کەس پەستەک و کەرکیان لەسەر کورتەک لەبەر دەکرد، پەستەک لە لوا دروست دەکرا، بەڵام جلوبەرگی ئیختیار و سەرۆک هۆز و کێخواو پیاو ماقووڵان و ریش سپی ئەو دەڤەرە بریتی بوو لە کەواو سەڵتە"کەوێ و سەڵتە"لەپاشان بووە"کەوێ و چاکەت"عەباشیان لەبەر دەکرد، لە زستانان عەبایەکی رەشی ئەستووریان کە نەخشێنرابوو بەشانی خۆیان دادەدا، لە وەرزی هاوینانیش عـــــەبایەکی تەنک، هەندێک لە ئیختیارەکان خۆرە کڵاوێکی خورییان لەسەری دەنا کە لە لواو مەرەز دروست دەکـــرا تاک و توک هەتا ســـاڵانی چلەکان هەر مابوو، ئەوجۆرە کڵاوانە هەنووکەش لەناوچەی لیـجـە"لجێ" و"فارقێن" لەویلایەتی دیاربەکر لە باکووری کوردستاندا پیاوە بەساڵاچووەکان لەسەری دەنێن. کاتی خۆی "چیت"یش، لەو دەڤەرە لەسەری نراوە وەکو کوردەکانی رۆژهەڵاتی کوردستان پاشان نەماو خەڵک بەکاری ناهێنن و لەسەری نانێن. هەنووکەش خەڵک هەیە لەو دەڤەرەدا پەستەک لەگەڵ کورتەک و شەرواڵ یان رانکو چۆغەر لەبەر دەکات، پەستەک جۆرە پۆشاکێکی تایبەتییە لەناو کۆمەڵگەی کوردەواریدا لەهەموو بەشەکانی کوردستانی گەورەدا باوەو لەبەر دەکرێت، کارگەچییەکان "هەلاج" لە لواو مەرەز دروستیان دەکرد، وەستای کارامەی خۆی هەبوو، بەڵام کەرک بەزۆری شوانەکان لەبەریان دەکرد بۆ خۆپاراستن لە بەفرو سەرماو سۆڵی زستان.

رانک و چۆغەر "چۆغە" ئەم جۆرە جلوبەرگە زۆر کۆنە، بەتایبەتی لەناوچەی هەورامانەوە سەریهەڵداوە و کەوتۆتە ناوچەو دەڤەرەکانی دیکەی کـــوردســـتـــان، لەزۆربەی ناوچە شاخاوییەکانی کوردستان دروست دەکرا لە مووی بزنە مەڕ، وەستای تایبەتی و کارامەی دەوێ هەموو کەسێک نازانێ دروستی بکات بەشێوەی جولەیی دروست دەکرا، کە پێیان دەگوت: "کر- بزوو- بووزی" ئەم کرانەش زۆر جۆرو چەشنی هەبوو لەوانە گورگەیی، شەقڵاوە، زاخۆ، بێتواتە، مەرگە، لەباکووری کوردستاندا دەکرا بە"شاڵ و شەپک" یان "شەل و شاپک"واتا رانک و چۆغەر، ئەم وێنەیەی خوارەوەش وێنەی پیاوێکی دەڤەری دزەییاتی دەشتی هەولێرە بەناوی"عەزیز کارەش"وێنەکە دەگەرێتەوە ساڵانی چلەکان، شەدەی رەشی بە گورینگی لەسەرنیاوە.



# قاپووت... لە سەودا و فرۆشتن

**ناشتی عەدۆ**

لە سەرەتای بازاڕی شێخەڵلا، لەبەردەم گازینۆی باخی شار کۆمەڵێک پیاوی بە تەمەنی جەمەدانی بەسەری قاپووت لەبەر راوەستاون و سەودا و مامەڵەی قاپووتی کۆنە دەکەن. کۆمەڵ کۆمەڵ راوەستاون و گاڵتە و فشە و قسەی خۆش لەگەڵ یەکتر دەکەن و سەرقاڵی قاپووت فرۆشتنن.

پیاوێک دەبینی سێ قاپووتی لەبەردایە، پیاوێکی دیکە دەبینی پێنج قاپووتی بە دەستەوەیە، پیاوێک دەبینی سێ قاپووتی لەسەر شانە، لەو بازاڕە سەیرەدا، کە زیاتر پیر و گەنجە بێ ئیشەکان، خەریکی پەیدا کردنی پارەیەکی کەمی رۆژانەن.

من لەو بڕوایەم هەندێ لەو پیرانە تاکو زستان تەواو دەبێت، هەر دوو ئێوارە جارێک بە قاپووتێکی جیاواز لە مۆدیل و لە رەنگ خۆیان دەکەن بە حەوشەی ماڵەوەیاندا و سەرنجی منداڵەکانیان رادەکێشن.

دەتوانی قاپووتی بەری خۆت لەو بازاڕەدا ئاڵوگۆڕ بکەیت، بەڵام دەبێت وەک خۆیان وتیان دەبێ هەموو دەم پارەی لەسەر بدەی ئەگەر نا، ناتوانی ئەو سەودایە بکەی.

بێگومان ئەوانیش بە حوکمی ئەوەی، کە رۆژانە یەکتر دەبینن،

بوون بە برادەری مامەڵە. کاتێک ڕێبوارێک دەیەوێ قاپووتێک بکڕێ، لە کاتی مامەڵەکەدا، برادەرانی کابرای قاپووت فرۆش بۆ ڕازیکردنی کابرای کڕیار یارمەتی دەدەن، و هەزار سوێندی بۆ دەخۆن: قسە لەسەر ڕەنگ و باشی و هەرزانی قاپووتەکەش دەکەن، وەڵلا هەرزانە بە بیست هەزار، کوڕە برام ئەوە بەشی بیست ساڵت دەکات، ئەو قوماشە خەنجەری لێدەی نایبڕێ، برام ئەتوو تەماشای ڕەنگەکەت کردووە، ئەو ڕەنگەکەی پیاوانەیە.

جا ئەگەر کابرای کڕیار قاپووتەکەی بۆ خۆی نەبێت، دەگەڕێ بزانێ ئەو کەسەی قاپووتەکەی بۆ دەکڕێ لە قەڵەوی و لاوازیدا لە کابرایانی برادەرانی مامەڵەچییەکە دەچێت، ئەوانیش بێ سێ و دوو قاپووتەکەی لەبەر دەکەن و لەپێش کابرای کڕیار دەسووڕێنەوە و قۆپچەکانی دادەخەن و خۆیان بادەدەن، زۆربەی ئەو قاپووت فرۆشانەش پۆشتە و قۆز و جەمەدانییەکی قیتی کڵا و سیمداریان لەسەردایە، چونکە ئەو جۆرە کەسانە و ئەو جۆرە بازاڕانە هەر



هەبووە و هەر ئەوەهاش دەمێنێتەوە. بازاڕی مامەڵەچی مانای درۆ و فرت و فێڵ و فرۆشتن و شتێک بە دە دینار دەکڕن، بە سەد دینار دەیفرۆشنەوە. ئەو بازاڕانە لە سەردەمی بازاڕی عەکازەوە تاکو ئەوەی لای خۆمان بازاڕی شێخەڵڵا هەر ئاوا بووە، بێگومان ئەو پیرانە زۆربەیان خانەنشین و مووچە وەردەگرن، بەڵام لەوانەیە لە دڵ تەڕی و کات بەسەربردنی خۆیان بێت، کە کەیفیان بەو بازاڕ و مامەڵەیە بێت، کە ڕۆژانە چەند کاتژمێرێک لەو بازاڕەدا بەسەر دەبەن، بەڵام ئەو پیرانە هێشتا باشترن لەو پیرانەی، کە هەموو ڕۆژێک لە سێبەری مزگەوتێکدا خەریکی دامەن. بێگومان لە

وڵاتی خۆشمان هێشتا بواری سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووریمان نەگەیشتووەتە ئەو ئاستەی، کە بیر لەو پیرانە بکرێتەوە و جێگا و شوێنی خۆیان هەبێت تاکو چەند کاتژمێرێک لەگەڵ یەکتردا لە شوێنێکی شیاودا ڕۆژەکانیان بەسەربەرن لە بەینی یادگاری و یاری و نەخۆشی و قسەکردندا.

بێگومان بازاڕی شێخەڵڵا هەر ئەو کۆمەڵە پیرە قاپووت فرۆشانەی تێدانییە، بەڵکو زۆر جۆری دیکەی مامەڵەچی تێدایە، بەڵام ئەوەی لەو بازاڕەدا زیاتر منی نیگەران کرد، ئەو گەنجە مل ئەستوورە ڕەشتاڵانە بوون کە لە تەمبەڵی خۆیان یەک قەمسەلەیان بە دەستەوەیە و لە هەڵسوکەوت و جل و بەرگیاندا دیارە کە ناتوانن بەردێک لەسەر بەردێک دابنێن بۆ ئەم کۆمەڵگایە، ئەگەرنا گەنجێکی مل ئەستووری بەشان و باهووی بیست وپێنج ساڵە، دەبێ ئەوە ئیشی بێت؟!.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری مێرگ ژمارە (٢١)ی شوباتی ٢٠٠٧ بڵاوکراوەتەوە.



# ئاسنگەری و کوورە ئاسنەکانی هەولێر

ئا: ئەحمەد حەمەدەمین قادر حەیران

بێگومان گۆڕان و پێشکەوتنی قۆناغەکانی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بەهەر پێوادنگێک سەیری بکەی، ئەوا ڕەنگدانەوەی بارو کات و ساتی خۆیەتی. کێشانی شەقڵی سەردەم و مۆرکی دەوروبەرەکەیەتی. هەر قۆناغەش بیگرە ئەوا جوانکارییەکی تێدا کراوە، چونکە نەیتوانیوە لەبەردەم گۆڕانی کرۆکی ژیان دان بەخۆیدا بگرێ و بە شێوەیەک خۆی نووتەک بدا کە ریزبەربێ لەگەڵ چوار دەورەکەی، بۆیە ئەمیش ئەگەر بەگوێرەی پێش خۆی پێشکەوتووتر بێ، ئەوا نەیتوانیوە دەست لە دواوەی خۆی هەڵبرێ، چونکە ئەمیش بە گوێرەی دوای خۆی کەم و کوورییەکی هەبووە. ئیتر بەم شێوەیە ژیان بە روخسار و ناوەڕۆکەوە لە گۆڕانێکی دیالیکتیکی بەردەوامدا بووە. هەر سەردەم و ڕۆژگارێکیش شتێک داوا دەکا و جۆرە دیاردەیەک بەسەرماندا دەسەپێنێ، کە نابێ لەبەرامبەری بە چۆکدا بێین، بەڵکو دەبێ بە بارتەقای ئەو دەستی بۆ راست کەینەوە. لێرەوە چیتر پێ لێ هەڵناکێشین، بەڵام ئەوە هەیە لە کوێوە بچینە ناو بابەتەکە؟ لە خاڵێکی نەناسراوەوە دەست پێبکەین یان بە پێچەوانەوە. ئایا هیچ بەڵگەی راستیمان بەدەستەوەیە لە بوونی ئەم جۆرە بابەتە لەناو کۆمەڵەکەمان یان نا؟ ئایا بگەڕێینەوە سەر ئەم چەند دێرە هۆنراوە فۆلکلۆرییانە و پەند و قسە نەستەقانە؟ یان ئەمانە بگەڕێنینەوە بۆ ئەو سەردەمە؟.

ئایا هەر ئەم جۆرە قاپ و قاچاخ و کەرەستە کەلەپوورییانە بەسە بۆ چەسپاندنی راستی قسەکانمان یان نا؟. ئەمانە و چەندان پرسیاری تر لە خولگەیەک سووڕ دەخۆنەوە، کە پێویست بەمە دەکا گرێکەی بکرێتەوە و بخرێتە بەردەم تەقەڵی واژووکردنەوە... بەڵام ئەگەر بە

شێوەیەکی بابەتی و ژیربێژانە سەر بەم لایەنە داگرین، پێویستە دەستنیشانێک بۆ ئەم زەمینەیە بکەین، کە ڕێخۆشکەر بووە بۆ پەیدابوونی ئەم جۆرە دیاردەیە لە کۆمەڵەکەمان... ئەمیش ئەوەیە ئایا شارستانیەت چەندان سەدە بەر لە ئێستا لە کوردستان هەبووە؟ دیارە ئەمە وەڵامەکەی بەڵێیە، چونکە بەڵگە دەستکەوتووەکانی ئەشکەوتی شانەدەر هەموو نموونەی راستی و نەمرین بۆ ئەم جۆرە لایەنە. کەواتە ئەم هەورازەی تووشی بووین بووە پانتایی. مادام شارستانیەت هەبووبێ و ئادەمیزاد چەندان هەزار ساڵ لەم ناوچەیە ژیابێ دەبێ شتێکی واشی کردبێ بەری خۆی پێ لە ناو بردبێتە دەرەوە. بەڵام ئەگەر لەبەینی سەردەمێک بۆ سەردەمێکی دیکە تووشی پووکانەوە و لەناوچوون بووبێ، ئەوا شتێکی دیکەیە... جگە لەمانەش لە رۆژگاری قەڵای دمدم لە بازاری ئەم قەڵایەدا چەند کارگەیەک هەبووە، کە لە ئاسن کەلوپەلی جەنگییان دروست کردووە، وەک شیر و تیرو رم و مەتاڵ، لەمەش گەورەتری تیابوو ئەمیش دروستکردنی تۆپ بوو، کە خانۆی لەپ زێڕین وەستایەکی فەلەی لە بازاری وان هێنابوو بە ناوی وەستا (خاچۆ) تۆپی لە ئەشکەوتێکدا دروست دەکرد، ئەم وەستایە (١٠) تۆپی دروست کرد و ئەم پارچە ئاسنانەی بۆ دروستکردنی تۆپەکان کەلکی لێ وەردەگیرا هەمووی لە بازاری (وان) دەهات، هەروەها لەسەردەمی پاشای گەورە (میر محەمەد مستەفا بەگی سۆران) (١٨٢٠ - ١٨٣٦) لە رەواندز لە گەڕەکی کاولۆکان چەند کارخانەیەکی دانا یەکێ لەم کارخانانە کاری دارشتنی تۆپ و گوللە تۆپ بوو، کە وەستا (ڕەجەب) سەرپەرشتی دەکرد و دایدەڕشتن، پاش ئەوەی کار بە تەواوی لەم کارخانەیە مەیسەر بوو وەستا رەجەب (٢٢٢) دانە لوولە تۆپی دروست کرد، کە لە سەردەمی (تەها ئەفەندی) لە ساڵی (١٩٢٦) قایمقامی رەواندز بوو هەندێ نموونەی لەم تۆپانە لە چۆمی رەواندز لە ژێر پردێک دۆزییەوە، کە ئێستاش ماون جگە لەمەش هەندێ لەم تۆپانە نموونەیان لەلای والی موسڵ هەبووە، کە لە ناوەراستی چەرخی نۆزدە (٨٠) تۆپی لە ژێر دەستدا بووە زۆربەیان لە رەواندز دروست کرابوون، ئێستاش هەندێک لەم تۆپانە نموونەیان لە مۆزەخانەی سەربازی لە بەغدادا هەیە، کە درێژی هەندێکیان لە سێ مەتر زیاترە، بەرینی دەمەکەشیان (٤٥) سانتیمەتر. دەبێ هەروەها لە ساڵی (١٩٠٢) مارک سایکس بە سلێمانیدا رەت بووە دیویەتی، کە نزیکەی (١٥٠) کەسێک بە دروستکردن و چاککردنەوەی چەک خەریک بوون، ئەم کارە زۆر سەرنجی ئەم پیاوەی راکێشاوە. لەسەردەمی خۆی کە (ئەدمۆنس)یش دانی بەمە داناوە.

بێگومان ئەمانە چەند نموونەیەکی بەرچاو بوون بۆ راستی و هەبوونی ئەم جۆرە کارە لەناو کۆمەڵەکەمان، کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ چەند سەدەیەک لەمەوبەر، بۆیە بە شتێکی سەمەرە دانانرێ، ئەگەر لە رۆژگاری ئەمڕۆش هەندێ لەم جۆرە کارانە مابن و درێژە پێدەری رۆژگاری پێش خۆیان بن. لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەم جۆرە کارانە و هەموو کارەکانی تریش رەنگدانەوەی پێویستی ژیانی رۆژگار و سەردەم و کات و ساتی خۆیانن، بۆیە پێبەپێ هەندێکیان تواونەتەوە و لەناوچوون، چونکە گۆڕان و پێشکەوتن کە هەر چوار ئیقلیمی دنیای گرتۆتەوە کوردستانیش لێی بێبەری نەبووە، ئینجا بەهەر شێوەیەک بێ و لەژێر پەردەی هەر جۆرە گۆڕانێک بێ ئەم کار و پیشانە بەرەو نەمان رۆیشت و تەنانەت هەندێکیان خەریکە بە تەواوی لە رەگەوە دەربێ، بۆ نموونە ئەم باسەی کە ئێستا ئێمە لەسەری دەنووسین لە هەولێر تەنیا یەک دوکان ماوە ئەم جۆرە کارەی تیادا ئەنجام بدرێ. ئەویش رۆژ تا ئێوارە دۆژەی خەو دەباتەوە بەرانبەر بە بێکاری. بۆیە ئەگەر دەستە پاچە بەرانبەر ئەم جۆرە لایەنە بوەستین ئەوا روویێکی گەش نادەینە کەلەپووری نەتەوایەتیمان بۆ بەرز روانینی لەلایەن گەلانی جیهانەوە. هەر لەبەر ئەمەش ئێمە ئەم جۆرە کارە بە دەستپێشخەرێک دەزانین بۆ داکۆکی کردن لە کەلەپوورەکەمان و رزگار کردنی لە فەوتان، هەرچەندە ئەم بە دەنگەوە هاتنە لە کاتێکی زۆر درەنگ دەکرێ بەرانبەر ئەم جۆرە بابەتانە، بەڵام کورد وتەنی "زەرەر لە نیوەی بگەڕێتەوە هەر قازانجە". ئەوەی لێرەش دەمانەوێ بیدرکێنین چۆنیەتی پێکهاتن و جۆشدانی کوورەی ئاسنە

بۆ توانەوە و نەرمکردنەوەی ئاسن تاکو پێویستییەکانی کۆمەڵگا دابین بکا، ئەوەی بە شێوەیەکی تایبەتیش دەستی بۆ درێژ دەکرێ ئەم کەلوپەلانەیە کە لە ژیانی رۆژانە و وەرزی جووتیار و عەمەل مەندەکانی کوردستان کەلکیان لێ وەردەگیرێ، **ئەگینا بابەتەکە فراوانە و زۆر لایەنی دیکە دەگرێتە خۆی، کە لە کاری تاکە کەسدا نییە و پێویستی بە لیژنەی تایبەتی هەیە. بۆیە خستنە رووی ئەم جۆرە دیاردەیە لەلایەن ئێمەوە تەنیا لە هەڵوێستی هەست بە لێپرسراوی** کردن بەرانبەر بە نەمانی ئەم جۆرە لایەنە و داتەکاندنی تەپ و تۆزی سەرشان و باڵی دەیان بازوو پۆڵاینی کوورە تەنیمۆکاوییەکانە و لە رێسمە بردن و شەقار شەقار کردنی تەونی جاڵجاڵۆکەی سەدان ساڵەی سەر دیواری کوورە ئاسنینەکانی ئەم وڵاتەیە و پەرۆم بە پەرۆم کردنی هەموو ئەو دەستە نەگریسانەیە بۆ شێواندنی روخساری گەشی کەلەپووری نەتەوەی کورد، بۆیە ئێمەش وا لێرەدا بە شێوەیەک دەچینە ناو بابەتەکە، کە جێگای رەزامەندی هەموو دڵسۆزانی دەرک پێکەری ئەم هەوار و بوارەن.

**شێوەی پێکهاتنی:**

پێکهاتنی کوورەی ئاسن نەرمکردنەوە شێوەیەکی تایبەتی خۆی هەیە، کە پێویستییەتی ئەم جۆرە لایەنە وای سەپاندووە، لە کوورەیەکی ئاسایی پێکدێت و شێوەی دروستکردنی تا رادەیەک وەک فڕنی نان وایە، بەڵام تەنوورەکەی وانییە. بەڵکو لە قۆرتێکی نیمچە خڕ پێکدێت، بۆ ئەوەی پارچە ئاسنی بخەنە ناوی لە کاتی سوورکردنەوەدا.

هەروەها جگە لە کوورە چەند شتێکی تریش هەیە. وەکو (دەزگا) یاخود (سندان)، کە پێکهاتووە لە ئاسنێکی خڕی پان لەسەر نیمچە سەکۆیەکی خڕ دادەنرێ لە تەنیشت کوورەکە، ئەمەش بۆ ئەوەیە لە کاتی ئاسنی سوورکراوە لە کوورەکە دێتە دەرەوە. دەیخەنە سەری و بە چەکوش لێی دەدەن تاوەکو ئەم شێوەیە وەردەگرێ کە دەیانەوێ، ئەمە جگە لەمانەش چەند چەکوشێکی قەوارە جیاوازی سەلک گەورە هەیە بۆ لێدان بەکاردێ. هەروەها (گاز)یش هەیە بۆ گرتنی پارچە ئاسنەکانە لە کاتی سوورکردنەوە. لەگەڵ چەند (قەڵەم)ێک بۆ برینی سومبە و کونکردنی ئاسن کەلکی لێ وەردەگیرێ، بە شێوەیەکی گشتی لە کوورەدا ئەمانە هەیە، ئەگەر یەکێک خاوەن کوورە بایە دەبوایە ئەمانەی هەبێ بۆ دابینکردنی پێویستییەکانی تاوەکو کارەکەی بە تەواوی مەیسەر ببا و بێ گرێ برۆیشتبا.

**چۆنییەتی کارکردن**

کارکردن لەم جۆرە لایەنە بە گوێرەی رۆژگار گۆڕاوە و شێوەی جۆراوجۆری وەرگرتووە، لە سەرەتاوە کوورەی ئاسن توانەوە یان نەرمکردنەوە بە هەوای پێستە گەرم کراوە یان سوور کراوەتەوە، کە بەم جۆرە بووە:. چەند تەختە دارێکیان هێناوە سەری دارەکانیان خۆش کردووە بۆ ئەوەی بچنە ناو یەک، بەم کارە تەختەدارەکان شێوەیەکی گەورە و پانیان وەرگرتووە. بۆ ئەوەی بە تەواوی دڵنیابن، کە ئەم دارە هەوا نادا، ئەوا بە جۆرە مادەیەک کە پێی دەڵێن (ئەسرێلک) وەکو سمغ وایە لێی دراوە و پارچە پێستێکی لەسەر رایەخراوە. بەم جۆرە چوار تەختەداری گەورەیان ئامادە دەکرد ئینجا بەجووت



سەری دارەکانیان دەگەیاندەوە یەکتری. لەم شوێنە سەری تەختەکان پێک دەگەیشتن دارێکی باریکی درێژ لە نێوانیان توند دەکرا و سەری نەختێ لە تەختەکان بڵندتر دەبوو، بەم دارەیان دەگوت (ملە) لەلاکەی تریش دارێکی تریان بە هەمان ناو و جۆر دادەنا، ئینجا چەند دارگەزێکی باریکیان دەهێنا لە بەینی ئەم دوو ملەیان بە شێوەی کەوان توند دەکرد، ئینجا پێستێکی گەورەیان بەسەردا دەدا. سەری پێستەکە لەم سەر و لەوسەری هەردوو تەختەدارەکە بزمارڕێژ دەکرا. بەم شێوەیە لایەک تەواو دەبوو لایەکی تریش بە هەمان شێوە دەکرا. ئینجا هەردوولا بە شێوەی تایبەتی خۆیان چەسپ دەکران و شوێنی زەلامێک لە نێوانیان دەمایەوە بۆ کارکردن، کە ئەویش بەم جۆرە بووە. شاگردەکە دەچووە بەینی هەردوولا دارەکان، کە شوێنی دەستیشی بۆ کراوە بۆ گرتن. ئینجا لایەکی پاڵ دەدا و لایەکی بۆ خۆی رادەکێشا، بەم جۆرە هەوا دەکرایە کوورەکە و گەرم دادەهات، ئەم هەوایەش بە بۆڕی لە تەختە دارەکانەوە بۆ ناو کوورەکە دەچوو. ئەوەی شایانی وتنیشە کونێکی بچووک لەم تەختەیەی، کە شاگردەکە دەیهێنا و دەیبرد هەبووە، بۆ ئەوەی هەوا بچێتە ژوورەوە لە ژوورەوەش پارچە دارێک بە ریزەی لەسەری کونەکە دەدرا بۆ ئەوەی هەواکە نێتە دەرەوە لە کاتی هێنان و بردن. پێویستە ئەمەش بگوترێ ئەم بۆڕییانەی لەملاو لەولای دارەکانەوە دەهاتنە دەرەوە هەردووکیان تێکیان دەکردەوە دەبوونە یەک بۆڕی و بۆ ناو کوورەکە دەچوون. ئەوەی شایانی گوتنیشە لە رۆژگاری کوورە بەم شێوەیە کاری کردووە رەژوو بەکارهاتووە بۆ سوورکردنەوە و گەرمکردنی ئاسن. بەڵام پاشان بەپێی گۆڕان و پێشکەوتنی رۆژگار گۆڕاوە و شێوەی جیاوازی بە خۆوە گرتووە. پاش ئەمە نەوت دۆزراوەتەوە رەژوو لابراوە و نەوت بۆ سوورکردنەوەی کوورەکە کەلکی لێ وەرگیراوە، پاش ئەمەی کارەبا دۆزراوەتەوە و گەیشتۆتە ئەم وڵاتە شێوەی هەوا کردنە کوورە بەم جۆرەی باسمان کرد ئەویش گۆڕاوە و ماتۆڕی کارەباییان بەکارهێناوە بۆ هەوا کردنە سەر نەوتەکە و سوورکردنەوەی کوورەکە. ئەمە بەردەوام بووە تا گەیشتۆتە رۆژگاری ئەمڕۆ، بەڵام ئێستا کاری ئەم جۆرە لایەنە کەم بووە و بە تەواوی شیرازەی لێک پچڕاوە بەرەو خاشە بڕی دەچێ، لە شارێکی وەکو هەولێر تەنیا یەک کوورە ماوە.

### شێوەی کارکردن

شێوەی کارکردن لە کوورەی ئاسن، لە کۆنەوە تا وەکو ئێستا بە رۆژانە بووە. بە گوێرەی رۆژگار و سەردەم ئەم رۆژانەیەش گۆڕاوە... لەهەر کوورەیەکیش چەند شاگردێک هەبووە، بە زۆریش لە دەوری (چوار هەتا پێنج) کەس بوونە، لەوانە یەک دووانیان منداڵ بوونە ئەوانی تریش گەورە، گەورەکان عادەتەن بۆ لێدانی ئاسن لەسەر دەزگا کاریان کردووە، منداڵەکانیش بۆ هەوا کردنە کوورە و وردەکاری دیکە.

شێوەی کاتی کارکردنیش دیار نەبووە، بەڵکو (ئەو تاریک و ئەو تاریک) بووە، واتە لە بەیانی پێش ئەوەی رۆژ دەربێ کار کراوە تاوەکو رۆژئاوا بووە و دنیا تاریک داهاتووە. واتە لە تاریکایی بۆ تاریکایی، هەندێک لە شاگردەکان دەڵێن ئەم کات کار ئەوەندە کەم بوو خەڵک منداڵی دەنارده کارکردن زۆر جار دایک و باوک بە خاوەن کوورەکەیان دەوت ها ئەوە منداڵەکەمان ئیشی پێبکە (گۆشتەکە بۆ تۆ ئێسک بۆ مە). هەروەها دەڵێن کارکردن ئەوەندە بە زەبروزەنگ بووە زۆر جار خاوەنی کوورە یان کارگە ئەگەر ئیشێکی هەبایە یاخود شاگردێکی بۆ شوێنێ رەوانە بکردابایە (تفێکی لەسەر زەوی رۆدەکرد. دەیگوت هەتا دێیتەوە نابێ ئەم تفە وشک بێتەوە). هەروەها دەڵێن کاری ئەم جۆرە لایەنە ئەوەندە ناخۆش بووە (شمەکی شاگردەکان ئاوی لێ دەهات لەبەر ئارەقەکردن لە حاڵەتێک ئەگەر بتگوشیبا) بۆیە دەیان کەس تووشی نەخۆشی دەبوون و دەمردن، بەرگەی ئەم جۆرە ئیشانەیان نەدەگرت....

بەڵام دەربارەی کرێی دەستی بازووی شاگردەکان، ئەوا شێوەیەکی چەسپاوی نەبووە، بەڵکو ئەمیش لە گۆڕانێکی بەردەوامدا بووە، بۆ نموونە ئێمە هەندێک تیشک دەخەینە سەر ئەم لایەنە بەگوێرەی تەمەنی ئەو کەسەی قسەی لەسەر زار وەرگیراوە دەردەخرێ.

لە ساڵی (١٩٤٧) شاگردی منداڵ لە کوورەکانی ئاسن بە (٣) عانە واتە (١٢) فلس کاری کردووە.

بەڵام گەورەکان واتە ئەوانەی چەکوشیان وەشاندووە، بە (٦) درهەم کاریان کردووە، ئەمە وابووە تا شۆڕشی ١٩٥٨ی تەمموز لە پاشان بووەتە (٨) درهەم، پاش یەک دوو ساڵ تێپەڕبوون بەسەر شۆڕشەکە بووەتە (١٢) درهەم، هی منداڵیش هەروا بووەتە ٢ - ٣ درهەم، یەکێ لە شاگردەکان دەڵێ: لە ساڵی ١٩٥٨ کە داخلی سەندیکا (جقات) بووین وەستایەکان، واتە خاوەن پیشەکان لە خۆیانەوە کرێیان بۆ کردینە (٨) درهەم، ئەمە وابووە تا ساڵانی کۆتایی شەستەکان بەدواوە لەوێ کرێ زیادی کردووە و بووەتە (١) دینار، هەروەها ئەم شاگردە دەڵێ: لە ١٩٥٨ هەموو شاگرد و خاوەن پیشەکانی هەولێر هەر لە سەفارچی و چەخماخساز و ئاسنگەر و کوورەچی و لبادکەر، ئەمانە هەمووی بوونە یەک و سەر بە سەندیکاوە بوون، هەروەها دەڵێ سەرۆکی بەشی ئێمە واتە ئاسنگەری (وەستا عیزەت بەدرەدین) لەگەڵ (مەلا تاهیری تەنەکەچی) بوون، سێ چوار مانگ ماینەوە لە دوایی سەندیکا نەما و تێکچوو، لەبەر ئەوەی خەڵکەکە زۆر بە باشی ڕێکخراو نەبوو، ژمارەشمان واتە هی شاگردەکان بە هەموو بەشەکانەوە (١٠٠) کەس دەبووین.

## کەلوپەلە دروستکراوەکان

بێگومان چەند کەلوپەلێک لە کوورەی ئاسن دروست دەکرێ، کە هەریەکەش بە گوێرەی ڕۆڵی خۆی پێویستییەک لە پێویستییەکانی کۆمەڵ پڕ دەکاتەوە، گرنگترین ئەم کەلوپەلانەش ئەمانەن: گاسن، داس، باڵتە، پێمەڕە، کوڕنگ، قەرانگ، قەڵەمی لێدانی بیر، پیشەقان، بیور، سەلکە تەوشوو، تەورداس، دوودەم.

## گرنگترین خاوەن کوورەکان

بە گوێرەی ڕۆژگار و سەردەم گەلێ خاوەن کوورە هەڵکەوتوون لە مانەش پێ بەپێ هەندێکیان لەگەڵ گێژەلووکەی سەردەم پووکاونەتەوە و لەناوچوون، هەندێکی تریشیان مردوون و نەماون، هەندێکیش پیشەکەی گۆڕیوە، بەڵام پێویستە ئەوە بگوترێ، کە کوورەی ئاسن هەر لە شاردا نەبووە، بەڵکو لە گوندەکانیش هەبووە لەمانەش:

وەستا محەممەد شێخۆ، حاجی تۆفیق عەبدولواحد، وەستا نامیق ڕەفیق محەممەد، حاجی یونس حاجی ئیدۆش، حاجی عەباس ئیدۆش، وەستا ئەمینی شێت، وەستا عەبۆ چاوەش، حاجی شێخ ونسە شەل، وەستا سابیر فەتحوڵلا، حاجی خدر ئیدۆش.

ئەمانە زۆربەیان لە سەردەمی زوو لەم سەدەیە خاوەن کوورە بوونە لە هەولێر ئێستا هیچیان نەماون، بەڵام چەند کەسێک ماون و ئێستا لەبەر بێکاری وازیان هێناوە، کە تەمەنیان لەنێوان ٦٥ هەتا ٧٠ ساڵ دەبێ، لە مانەش: سەید جەلال کەریم، سەید سەعید کەریم، وەستا تەها عەبدوڵلا، بەڵام ئەمانەی لە گوندەکان خاوەن کوورە بوون ئەمانەن: حاجی قادر لە گوندی سۆڕبەش، حاجی سەعید لە گوندی زەمزەمۆک حاجی مستەفا لە گوێر، حاجی ئەحمەد لە دیبەگە، حاجی حەمدی لە گوندی عالەلا.

هەروەها لە چەند گوندێکی تریش هەبووە، بەڵام ئێمە پێمان نەزانیوە، پێویستە ئەوەش بگوترێ کە ئەم جۆرە پیشەیە هەر لەم ناوچەیە باوی نەبووە، بەڵکو بە گوێرەی سروشت و پێویستییەتی ناوچەکان ڕێژەی خۆی وەرگرتووە، بۆیە ئێمەش ناونیشانێکی گشتی و فراوانمان داوەتە بابەتەکە، هەرچەندە خۆشی زیاتر باری ناوچەیی پێوە دیارە.


سەرچاوە و پەراوێزەکان

١- حسێن حزنی موکریان مێژووی میرانی سۆران: ، چاپخانەی کوردستان، هەولێر ١٩٦٢، ل٤٩.

٢- هەمان سەرچاوە، ل٥٤.

٣- عەرەب شەمۆ، دمدم، شوکور مستەفا کردوویە بە کرمانجی خواروو، چاپی دووەم، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، ساڵی ١٩٨٤، ل٢٧.

٤- هەمان سەرچاوە، ل١٩٨.

٥- الدکتور کمال مظهر احمد، الطبقة العاملة العراقية - التكوين وبدايات التحرك، دار الرشيد للنشر، بغداد ١٩٨١، ص. ٦٨.

٦- دوو سەردان بۆ کوورەی سەید جەلال کەریم لە ڕۆژانی ٣/٧/١٩٨٦و ١١/١٥/ ١٩٨٦/ چاوپێکەوتن لەگەڵ وەستا محیەدین محەممەد محیەدین، کە لە دایکبووی ساڵی ١٩٣٣یە.



# ڕەوسەی کوردەواری (دروونە لە ناوچەی کەندێناوە)

شوان

هەر لە کۆنەوە تاکو ئەمڕۆ بنچینەی ژیانی ئێمەی کورد کشتوکاڵ و دەغڵودان چاندن بووە، بێگومان کلتوورێکی دەوڵەمەندی تایبەت بە ڕاپەڕاندنی ئەوتۆشمان هەیە، کە لە باوک و باپیرانمان لە کاتی کێڵان و دروونەکردندا بۆمان ماوەتەوە، وەک: (هەوجاڕ، داس و داسوولکە، قەرانگ، هەسان، کەرەدان، کوندەی ئاو و دۆدانە و مەڵەغان و .... تاد) و کەپرۆکەیان هەڵدەدا لە کاتی ئیش و کارکردندا و ئەم کەرەستە کەلەپوورییەیان بەکار دەهێنا، وێڕای دابینکردنی ئەم کەرەستانەش هەوڵیاندەدا پەرەشیان پێدەن تا زیاتر کارەکانیان پێ ڕاپەڕێنن.

بەدوای پەڵەکەوتن، دەغڵودان شین دەبێ و خاوەنەکەی هەوڵدەدا سەپان و تیلەکێشی پەیدابکا و سەر لە دەغڵودانەکەی نابڕێ و لە گیاوگۆڵ و زیوان و کەنگر و کاردی پاکی دەکاتەوە کاتی دروونەش کەلوپەلەکانی هەڵدەگرت و سەپان و تیلەکێشی بەگەڵ خۆ دەدا و زەوییەکەی بۆ دەستنیشان دەکردن، ئینجا بۆ بەیانی سەپان پێش مەلابانگدانێ یەک دوو تەبارەیان دەدوورییەوە...

دوای لێبوونەوە لە دروونە، دەغڵەکەیان بە شەغرە دەکێشاوە و پاشان جەنجەڕ کوتیان دەکرد، ئەوجا شەنەبا... هەرکاتێ ڕەوسە سوور هەڵگەڕا و کووزر و کا و کۆتی تێدا نەما، ئەوا یەکێک دەبێتە سەرپاڵەی بڕکردن و ئیدی بەو جۆرە بەردەوام دەبوون هەتا ڕەوسە کۆتایی دەهات و دەستگرەکانیان دەدایەوە و پەیوەندییان لەگەڵ یەکتر دەبڕایەوە و کۆتایی دەهات.

دروونە لە ناوچەی کەندێناوە و ناوچەی مرکییە زووتر دێ، مانگی

چوار و پێنج لەوانەیە بگەڕێ. دروونە کاتی خۆی زۆر بە زەحمەت دەکرا لەبەر ئەوەی ئەم پێداویستییانەی ئەمڕۆ لە ئارادایە کاتی خۆی نەبوو، بە مەبەستی پتر ئاشنا بوون و تیشک خستنە سەر ئەم کارە زەحمەتە بە پێویستمان زانی بەڕێز (سمایل عەلی سمایل)، کە لە ساڵی (١٩٢٩) لە قازیخانە لە دایک بووە و لە تیکالۆ - قەبری عەلی ژیانی بەسەر بردووە و ئێستاش لە هەولێر دادەنیشێ، بەسەر بکەینەوە و سەبارەت بە دروونە بە گشتی و چۆنیەتی خۆ ئامادەکرنیان و تا قۆناغی کۆتایی گوتی:

- من کاتی خۆی دوو سەپانم دەگرت، دوو سەپان نزیکەی چوار پێنج عەربە مزاشی پێ دەدوورێتەوە. تێلەکێشێکیشم دەگرت، ئەوجا ئەو تێلەکێشە چی لەسەر جووتیارە، بەرامپیلێکم بۆ دەکڕی لەگەڵ کراسێکیش، ئەو ڕۆژەی سەپان چووە دروونەی ، سبەینەکەی دەهات و مەشکەی دەژاند بۆ سەپانەکان دۆی ئامادە دەکرد، ئەوە تێلەکێشە و گرتیتم ئای بە دوو عەربە مزاش یان بە سێ عەربە مزاش، ئەوە گرانی و هەرزانیی دەغڵی خراپ و باش دەزانێ، لە پاشان کە مەشکەی هەژاند و نانیش دەکڕێ و دۆی لە دۆدانێ دەکات و ڕاست بۆ لای سەپانان دەچێت و نانی چێشتانان دەبات، سەپانیش هەتا تێلەکێش دێت دروونەی دەکات، هەرکە تێلەکێش هات، دادەنیشێ و تێلەکێش نان و دۆیان لەپێش دادەنێ و دەست دەکات بە گیشە دانانێ، سەپانیش کە نان و دۆیان خوارد و کەڵە شاخ هەیە چەوری تێ دەکەن، هەسان هەیە داسی پێ دەسوون، پێی دەڵێن: "بێنە داسەکەمان بسووین لۆ خاتری ببرین ماندی نەبین". کاتێ نانیان خوارد و داسیان سوو، دەگەڕێنەوە و دووبارە دەست دەکەنەوە بە دروونەکردن، بەدەم دروونەوە دەڵێن:-

**هەدروونە دروونە دروونە**
**دەسکێ داسێم بە روونە**
**هەدروونە دروونە دروونە**
**تێلەکێش...**
**بابم چوێتە هەولێرێ**
**کاکم لەبەر مەڕییە**
**ئەوان لە ماڵێ نەبن**
**داکیشم بێ قەیدییە**
**دەوم لە گەردنی نا**
**دوو ماچم لێ کردییە**
**چاوی ئەستێرەی ڕۆژێ**
**غەزال دەوری گرتییە**

تێلەکێش ئاویان بۆ دێنێ و ئاوی دەخۆنەوە، جگەرەی خۆیان پێدەکەن و هەڵدەستنەوە دوو بەری دی دەدوورنەوە، عادەت وایە دووبەر وچانە، ئەوا بەو جۆرەی دەست پێدەکەن، وەکە لە دروونەی جۆی بوونەوە تێلەکێش هەقی نامێنێ و دەچێتەوە ماڵی خۆی، لە پاشان ماوەیەکی پێدەچێ دەچینە شاری قادە و زەنگوڵە و ئەو پێویستییانە دەکڕین ئەوجا خوری دەکڕین و ژن دەیهۆنتەوە بۆ جێی جۆخین خۆشکردنێ، سبەینێ شەغرەکێش وڵاخی خۆی تەواودەکات و شەغرەکان داوێتە پێش و پشتە خۆی و قەراسە و وڵاخی لە دەستە و بۆ سەر گیشەی دەچێ، بە قەرات ئەم دیو و ئەو دیوی دەکات، تێکی دەپەڕێنێ بۆ خاتری ئەوەی گوریس بکەوێتە ناوەندی و ڕایدەکێشێ بۆ ئەوەی شەغرە نەزێ، ئەوەندەی دەستی گەیشتێ و ئەوەندەی وڵاغ دەیبا توندی دەکا، شەغرەکێش لەسەر جۆخینێ ڕۆدەکات و سەپانیش هاوکاری دەکات، چونکە دروونەی جۆی سەر بە سەپان دەبێ، ئەوانەی



سەپانی جووتیارێکن، یەکیان شەغەرەی لێ دەنێ و ئەوەی دیکەشیان دەیکێشێتەوە.

هەروەها خاڵە حاجی سمایل لەبابەت دروونەی گەنمی گوتی: "دروونەی گەنمی شەغرەکێش هەیە و تێلەکێش، سبەینان مەشکەی خۆی دەژێنێ و دۆی لە دۆدانی دەکا و دەچێتە کن سەپانان و دۆیان لۆ تێدەکا، و دیسان وەکی جاران دەست پێدەکەنەوە و تێلەکێش گەلاوێژان دەکات، جارەک سوارە لەولایە و جارەک لەولایە، بۆ خاتری ناوەندی دەبنە کوڵ دێتە سەرشانی. شەغرە لە دروونەی گەنمی ژن بیکات، دەبێ شەغرەش لێنێ، مەلۆیەکەش هەڵدەگرتەوە. (مەلۆ: ئەوەی دووراوە، خڕی دەکەنەوە.) هەتا لێدەبنەوە، وەکی لێبوونەوە و هاتنە سەر جۆخینان، جەنجەڕی دادەبەستن و قرشەی داوێنێ و دوو گوشان لێک دەدەن و کەپرۆکۆکەی هەڵدەدەن لۆ وچانێ... یەکێک سواری جەنجەڕ دەبێ چاوە و رۆخەکەی لۆ دەداتەوە، بە نۆبەت سواری جەنجەڕی دەبن و قرشە شکێن هەڵدەدەنەوە، لەلایەکی دی وەکی لە قرشە شکێنی بوونەوە، ناوەندی جۆخینی چۆڵ دەبێ، سنگەکی تێ کوترایە و ئەوجا دەسووڕێ و وڵاغە و جەنجەڕە، ئەوەل پێ برەک ناخۆشە، چونکە دەبێ ئاگات لێبێ هەرکە پێیەکت هەڵداوە ئەوە (هووردە کوتی پێدەڵێن) لایەکی هووردە کوتە و لایەکی قرشە شکێنە، ئەوجا جەنجەڕی داژۆی هەتا هوورد دەبێ ئیدی هەڵدەدەینەوە. ئەو پێیە هوورد بوو، هەڵدەدەینەوە قرشە شکێنی داوێینە بەرێ دیسان ئەویش هوورد دەبتەوە هەتا ئاخیر پێ خلاس دەبێ، لێرە ئەوە ناوەندی جۆخینێ پڕ بۆوە وەکی لە قرشەی بووینەوە ئەوجا دەبێ بە بای کەین، پێی دەگوترێ (تارمە).. تارمە، لەولایە قووچەکەک دەکەین، هەریدەدرین، لەولایەش قووچەکەک. ئەو ناوەندەی هەڵدەدەینەوە و تارمەی هەڵدەبەستین، کە تارمە هەڵبەسترا، پێی دەگوترێ (شەنەبای شەماڵێ) دێ و لە کاتی شەنەبادا، کە سەپان هووردەکە بە شەنەبا بۆ ئاسمان بڵند دەکاتەوە، لای دانەکەی لێ دەکا، برەکی لۆ خوار دەکاتەوە (با)ش ئەوەی دی دەبات، بەردەکی لەلایەک دادەنێین، ئەو (کا)یە لێی دێتە ئەولایە ئەوجا دەڵێ (کا)ی دەبڕین و لایەکی لێدەکەینەوە، وەکی زۆر دێ ئەوجا (کا) سەربەخۆ دێتە خوارێ.

کە شەنەبامان کرد و دەرچوو دەبێتە رەوسە. ئەوجا سبەینێ دەچووین بێژینگمان خڕ دەکردەوە (١٠) کەس (٢٠) کەس ملمان پێوەدەنا و دەمانکردە کۆمەڵ کۆمەڵ، گەنم (٦) کۆمەڵە و جۆ (٥) کۆمەڵە و ئەوەی دەیپێوا و دەیگوت:

**یەکە و دوو نییە**
**هیچ شەریکی لەبۆ نییە**
**بە غەیری تۆ قەت کەس نییە و یەک...**
**دوو... بەرەکەت بێ لەکنە توو**
**لە شەیتانی رەش بی روو دوو..**
**سێ... بەرەکەت بکەویتە رەوسێ**
**مار لە قودس سێ...**
**چار... بەهەشتی هەر چار یاران**
**بەرەکەت بێ لە هەرچار کەناران**
**چار...**
**شەش... قاپی بەهەشت**
**نوور بە ئیلاهی گەیشت شەش..**
**نۆ... نۆی نەبی بەزیاد بی**
**قەت کەم نەبی نۆ...**
**نۆ**
**نۆ نۆی نەبی بە (زێدە) بی**
**بەرەکەت بی قەت کەم نەبی**
**نۆ، نۆ**
**ئەوە دە:**
**دە هەزار سەڵەوات لەسەر محەمەدەلمستەفا**
**دنیا و قیامەت لەسەر شەرافەتی وی داندرایە**
**دە، دە**

ئەوجا لە کۆتاییدا خاڵە سمایل... گوتی: "لەو شەش کۆمەڵەی من و تۆ سەپانین، کۆمەڵەک هی ئێمەیە ئەویدیش هی ئاغایە. کەر و جوار (جەواڵ)مان دەهێنا و دەمانکێشاوە و لە عەمبارمان دەکرد، جێی جۆخین دەماوە هەتا کە دی ئەوجا وەکی لە گێرەی دەبووینەوە و شۆمان دەبڕی و بواران وەردمان دەداوە و ئەوجا دەبوومە رەنجبەری پیاوەکی وەکی توو، هەشت نۆ مانگان جۆتم دەکرد، رۆژێ دوو سێ ربەم دەبرد و تۆم دەدا و بە هەوجاڕ دەهاتم و دەچووم و سێ چار عەربە مزاشم لۆ ئاغای دەچاند، کە بەوەش دەگوترێ پایزە جۆت، ئەوەش بە جۆتە وڵاغەکی دەکرا."

*** ئەم بابەتە لە گۆڤاری (ئاسۆی فۆلکلۆر) ژمارە (١) ی ساڵی ٢٠٠٠ وەرگیراوە.**



# کارگە و کارگەچییەکانی هەولێر

ئەحمەد حەمەدەمین قادر حەیران

شتێکی بەڵگە نەویستە، کە میللەتی کورد وەک هەموو خەڵکی سەر گۆی زەمین خاوەنی چەند پیشەیەکی دەستییە. ڕەنگە زۆریش لەو پیشانە بە هەمان جۆر و شێوە لای میللەتانی تر هەبن، جا چ دوور چ دراوسێ، هۆی ئەمەش هەر لە شەڕ و شۆڕەوە دەگەڕێتەوە تا دەگاتە هاوبیری مرۆڤایەتی. لەگەڵ ئەمەشدا هەندێ کار و پیشە هەن بەرگێکی خۆماڵییان پێوە نووساوە، ئەمەش یا ئەوەتە پەیوەندی بە بار و سروشتی ناوچەکەوە هەیە، یان شێوە و جۆری ژیانی خەڵکەکە ئەمەی داسەپاندووە. بۆیە تاوەکو ئێستا زۆر لەم پیشە دەستییانە ماون و بە شێوەیەکی بەردەوام ئەنجام دەدرێن، جا لە شار بێ یاخود لە دێ. هۆی مانەوە و بەردەوام بوونەکەشی دەگەڕێتەوە سەر گۆڕانە کۆمەڵایەتییەکان و پەیوەندییە بەرهەمهێنەکان. هەر وەک دیارە کۆمەڵی کورد لە ڕێڕەوی ژیانیدا ڕێچکەی قۆناغەکانی گۆڕانی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی گرتووە: بەڵام مەرجیش نییە لە سەدا سەد ئەم ڕێچکەیەی بەرنەدابێ، چونکە تا ئێستا زۆر بیروڕای دژیەک هەیە دەربارەی قۆناغی کۆیلایەتی و زۆر لە زانایان دەڵێن، کۆمەڵی کورد بەم قۆناغە تێنەپەڕیوە و بوونیشی نییە،

لەگەڵ ئەوەشدا لە هەندێ کۆیلەی حەیران و بەندی فۆلکلۆری پەیڤی (کۆلە) بەکار هاتووە، کە بە مانای کۆیلە دێ. بە هەر شێوەیەک بێ ئەم گۆڕان و پێشکەوتنانە زۆر بە سستی رووی داوە، تەنانەت لە زۆر باردا گۆڕانەکە لە شێوەی سروشتی خۆی داکەلاوە و لایەنی پچڕ پچڕی گرتووە و بە شێوەی باری ناسایی خۆی تێنەپەڕیوە، بۆیە لەپەیوەندییەکانی بەرهەمداری دەرەبەگایەتی و خێڵدا تا ساڵانی نیوەی ئەم سەدەیەش هەر مابوو، لەبەر ئەمە بەرهەمهێنانی وەرزێری لە کشتوکاڵ و ئاژەڵداری لایەنێکی زۆری لە ژیانی کۆمەڵی کوردەواری رووپۆش کردبوو، دیارە ئەگەر کار بەم جۆرە بێ، دەبێ لە پیشە و کارە دەستییەکانی کۆمەڵەکەش رەنگ بداتەوە.

کۆمەڵێک ئەگەر ئاژەڵداریی تیادا بەهێز بێ، دەبێ هەندێک لە بەرهەمە چەنگ کەوتووەکانی لە پیشە میللییە ناوخۆکان بەکار بێ، هەروەک ئەم بابەتەی ئێمە، کە لە دروست کردنیدا بە تەواوی پشت بە بەرهەمداری ئاژەڵ دەبەستێ، بەڵام ئێستا و چەندان ساڵێکی بەر لە ئێستا بەهۆی ئەو گۆڕانانەی بەسەر باری گوزەرانی کوردەواریدا هاتووە، ئەم پیشەیە و زۆر لە پیشەکانی تریش بەرەو کزی رۆیشتوون، تەنانەت زۆربەیان لە بن و بۆتکەوە خاشەبڕ بوون و نەماون، دیارە نەمانەش هۆیەکەی لە گەشەکردنی بازاڕی ناوخۆ و چەکەرە کردنی پەیوەندییەکانی بۆرژوای نیشتمانی خۆی دەنوێنێ، ئەمە سەرباری ئەوەی

دەبێ باوەڕمان بە بارە گشتییەکان هەبێ، کە نوێ جێگای کۆن دەگرێتەوە، کۆنیش دەبێ جێگای بۆ نوێ چۆڵ بکا. ئەمە کرۆک و ناوەڕۆکی ژیانە و هەر دەبێ وابێ، چونکە سروشت وەک هۆیەکی ماددیی بەرهەمهێنان، هزریش وەک هێزێکی بەرهەمهێنان، ئەوا لە دژایەتیدان، هەموو دژایەتییەکی راست و دروستیش دیارە ئەنجامەکەی پێشکەوتن و گۆڕانە، ئێمەش ئەو پێشەکییەمان هەر بۆ رێخۆشکەرێک هێنایەوە بۆ سانایی چوونە ناو بابەتەکە. ئەگینا مەبەستی سەرەکیمان چۆنیەتی دروستکردنی (لباد و رایەخە).

بێگومان لباد و رایەخ هەروەک دەزانین یەکێکە لە پێویستییە هەرە گرنگەکانی ناو ماڵ بۆ لەسەر نووستن و دانیشتن، هەروەها دیاردەیەکی ئاشکرای ناو ماڵ و دیوەخانی کوردەوارین، بەتایبەتی رایەخ کە تەنیا بۆ دیوەخان بەکاردێ، لبادیش لە ماڵەوە بۆ نووستن، لەبەر ئەمە بە پێویستی دەزانین پێشەکی ئەم ماددەیە بخەینەڕوو، کە ئەم دوو کەرەسەیەی لێ دروست دەکرێ.

لباد و رایەخ هەردووکیان لە (لوا) دروست دەکرێن، لواش بە خوری بەرخ دەوترێ، کە بۆ یەکەمین جار دەبڕدرێتەوە، بەڵام ئەگەر ئەم بەرخە خوری هاتەوە و بۆ جاری دووەم بڕدرایەوە ئەوا ئەم کاتە بەم خورییە دەڵێن (روونگ)، کە هەم دیسان بۆ دروستکردنی ئەم دوو کەرەسەیە کەڵکی لێ وەردەگیرێ، بەڵام لباد و رایەخێکی باشی لێ دەرناچێ، بۆیە

بە رادەیەکی زۆر کەم خەڵک روونگ بەکار دێنێ، دەتوانین بڵێین کەس بەکاری ناهێنێ، تەنیا (لوا) نەبێ رادەی بەکارهێنانی ئەم لوایەش لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی تر جیاوازە، ئەوی شوانکارە و خاوەن مەڕ بێ ئەوا دەتوانی لوایەکی زۆر دانێ و تەرخان بکات بۆ دروستکردنی لبادی گەورە و رایەخی درێژ، ئەوی نەشیبێ یان یەک دوو سەر مەڕی هەبێ، ئەوا بە دوو سێ ساڵ یالڵا دەتوانێ لوای رایەخێک یان لبادێک دانێ، زۆر جاری واش هەبوو بۆی تەواو نەکراوە، کریوەتی، رادەی بەکارهێنانی ئەم لوایەش دەوەستێتە سەر توانای خاوەن لوا، لەبەر ئەمە کورت و درێژی و پانی دەگەڕێتەوە بۆ خۆی، کە بە حیسابی (هۆقە) دروست دەکرێ، بە زۆریش (٣) تا وەکو (٥) هۆقە دادەنرێ، زۆر جاریش لەم رادەیە تێپەڕ دەکا و دەگاتە (٨) هۆقە، کە هەر هۆقەیەکیش دوو کیلۆیە.

## چۆنیەتی دروستکردنی لباد و رایەخ

پاش ئەوەی بەرخ دەبڕدرێتەوە و لواکەی لێ دەکرێتەوە هەر بە شێوەی خۆی دەپێچرێ، واتە بێ شۆردنەوە رەوانەی کارگە دەکرێ بۆ لای وەستا، لەوێش بە تەرازوو دەکێشرێ، ئینجا جیا دەکرێتەوە، واتە رەش لەگەڵ رەش، سپی لەگەڵ سپی، سوور لەگەڵ سوور، لە پاشا بە جۆرە ئامێرێکی تایبەتی پەرە دەکرێ، کە بۆ ئەم جۆرە کارە دانراوە، کە پەرە کرا وەستا دەیخاتە سەر (چیغ)، ئەم چیغەش لە

(گـوش) دروست دەكـرێ، درێژی بە قەدەر (١٠)م دەبێ، پانییەكەشی بە قـەدەرایی (٣)م، بە قـەدەر درێژی و پانی ئەم چیغە لواكەی لەسـەر درێژ دەكرێ، ئینجـا نەخشـەكەی سـەری دادەنرێ، ئەمـەش دەگـەڕێتـەوە سـەر وەسـتـاكـە، زۆر هەیە پێش ئەوەی لواكە درێژ بكات نەخشـەكە پێشتـر لەسەر چیغەكە دادەنێ، بۆ ئەوەی بە توندی لەگەڵیدا تێكەڵ بێ و یەكتری بگرن، نەخـشـیـش هەر بە لواكـە دەكرێ، ئەگـەر لباد یان رایەخ سپی بێ، ئەوا نەخـشـەكـە بە لوای رەش دەكـرێ، ئەگـەر رەشـیـش بێ ئەوا نەخشەكە بە لوای سپی دەكرێ، جگە لەم رەنگانەی رەنگی تریش بەكـار دێ، وەك: (زەرد، سـوور، مـۆر، پەمـبـە)، بەڵام بە زۆری (زەرد و سوور) بەكار دێ، كە ئەمەش بەهۆی دەرمـانی تایبـەتی دەبێ، لە دوای ئەمانە كە لواكە لەسەر چیغەكە درێژ كـرا، ئینجـا ئاوی بە دەست پێـدا دەپرژێنرێ و هەر بە چیـغـەوە لوول دەدرێ و بە توندی بە پـەتـێكـەوە دەپێـچـرێ، ئەوسـا دوو كـەس بە پێلەقان بۆ ماوەی (٤٠) خولەک لێی دەدەن لە پاشان دەكرێتەوە، ئەمەش بۆ ئەوەیە تا وەكـو (وەسڵ) بكرێ، وەسڵیش بریتییە لە نوشتاندنەوەی رۆخەكـانی، تاكو لێوەكـانی لباد و رایەخەكە بە جوانی دەرچێ. ئینجا بۆ دووبارە ئاوی لـێ دەدرێتـەوە، دەپێچرێ بە هەمان شێوەی پێشوو دەدرێتـە بەر پێلەقـان، بە چەند خولەكێک زیاتر لە جاری یەكەم، لە پاشان دەكرێتەوە، لێرەدا هێشتا هەر خاوە.

بەم جـۆرە قـۆناغـێكی تر دەست پێ دەكات، ئەمیش ئەوەیە دەكەوێتە بەردەست یەكـێـكی تر پێی دەڵێن (بگێڕ)، ئەمە كە دەیكـاتەوە دەبینێ شێوەیەكی لاكێشـەیی وەرگرتووە، ئینجـا ئـاوی پێـدا دەپرووشـێـنێ كـە لـە رشـاندنەكـە تەواو بوو، (قەد)ی دەكات، قەدیش بەم شێوەیە سـەرێكی (نیـو مـەتر) قـەد دەكـا سـەرەكـەی تریش چەند مـاوە قـەدی دەكا و دەیگەیەنێتـە سـەرەكـەی تر، دووبارە ئاوی پێـدا دەپرووشـێنێ، ئینجا قەدەكان داوێتە سەر یەكتری و لوولی دەدا، ئەوسـا لەسـەر ئەژنۆ بە باسكی رووت وەریدەگـەڕێنێ و دەست بە لێدان دەكات.

هەر سـەرێكی (٥) خولەک لێی دەدات، ئەم كرداره چوار جار دەكات، واتە بۆ هەر سـەرێک دوو جـار، كـە هەمـووی بە یەكـەوە دەكـاتە (٢٠) خـولەک لێـدان. لە پاشـان وەری دەگـێـڕێ بۆ دیوەكـەی تر، كـە پێی دەڵێن (تەخت)، دووبارە ئاوی لێدەدا و لوولی دەكـاتەوە بە باسكی دەست بە لێدانی دەكات، بە هەمان شێوەی پێـشـوو هەر لای دوو جـار بۆ مـاوەی (٥) خـولەک كـە هەمـووی بە سـەر یەک دەكاتە (٢٠) خولەک. بەم جۆرە قـەدێک تـەواو دەبێ، واتە هـەر قـەدێک (٤٠) خـولەک دەخایەنێ بۆ هەردوو دیو، كـە ئەم قـەدی یەكـەمـە تەواو بوو دووبارە دەكـرێتـەوە، قـەدە



گچکەکە، واتە نیو مەترییەکە جێگەی گەورەکە دەگرێتەوە، گەورەکەش جێگەی بچووکەکە دەگرێتەوە، واتە پێچەوانەی جاری یەکەم. بەم شێوەیە دیسان ئاوی لێ دەدرێ، هەر دوو قەدەکە دەهاوێشترێتە سەر یەکتری و لوول دەدرێ و دەست بە لێدان دەکرێت، بە هەمان کات و جۆری پێشوو تاوەکو چوار قەد تەواو دەبێ، کە هەر قەدی (٤٠) خولەک دەخایەنێ، واتە چوار (٤٠) خولەک.



## کارگەکانی لباد و رایەخ لە هەولێر

بێگومان سەرەتا و پەیدابوونی ئەم کارگانە بە تەواوی نەزانراوە لە کەیەوە سەری هەڵداوە، بۆ ئەمەش پەیوەندیمان بە هەر یەکێ دەکرد، دەیوت لەوەتی من بە بیرم دێ ئەمە هەر هەبووە. بەڵام بە گوێرەی بۆچوونی بابەتیی دیارە شتەکە لە دوای نیشتەجێ بوونی کۆمەڵ و پەیدا بوونی گوند و شار و خەریکبوونی مرۆڤ بە ئاژەڵدارییەوە سەری هەڵداوە، نزیکترین بەڵگەش بۆ ئەم مەبەستە ناوی ئەم کەسانەیە کە لە دوا سەردەمی عوسمانییەکان کارگەیان هەبووە لە هەولێر، واتە سەرەتای ئەم سەدەیە کە بە ساڵاچووەکان دەڵێن (زەمانی گرانی). بۆ ئەوەی بابەتەکەش زیاتر لە راستی نزیک بێتەوە و دوور بێ لە گرێ کوێرە، ئێمەش خاوەن کارگەکانمان بەسەر سێ قۆناغ دابەش کرد. قۆناغی یەکەم، ئەمانەی لە کۆتایی دەسەڵاتداری عوسمانی و سەرەتای هاتنی ئینگلیز کارگەیان هەبووە. قۆناغی دووەم، پاش هاتنی ئینگلیزەکان. قۆناغی سێیەم، ئەوانەی ئێستا کارگەیان هەیە.

### ١- کارگەکانی سەرەتای ئەم سەدەیە:

هەروەک وتمان ئەمانە دەگەڕێنەوە بۆ کۆتایی دەسەڵاتی عوسمانی و سەرەتای دەسەڵاتی ئینگلیز، بێگومان ئەم کارگانەش هەریەکە بە ناوی خاوەنەکەیەوە ناونراوە، چونکە هی خۆی بووە، نەک هی دەوڵەت، شاگرد و بگێڕ لەگەڵ پەڕەچی کاریان لا کردوون، گرنگترینیشیان ئەمانەن کە ئێستا هیچێکیان لە ژیاندا نەماون و مردوون:

١- کارگەی وەستا عەباس.
٢- کارگەی سەید رەمەزان عەوڵا پەروەر.
٣- کارگەی وەستا هەمزە.
٤- کارگەی سەید کەریم عەوڵا پەروەر.

جگە لەمانە لەوانەیە هی تریش هەبووبن بەڵام ئێمە هەر ئەوەندەمان دەست کەوت، دەشبێ ئەمانە لە هی پێش خۆیان فێر بووبن و لە دواییدا کارگەیان بۆ خۆ دانابێ، چونکە تاقمی دوایی ئەمانە زۆریان لەسەر دەستی ئەمانەی ناومان بردن فێر بوونە، و کاریان لا کردوون، لە دواییدا بۆ خۆیان بوونەتە وەستا و کارگەیان دامەزراندووە.

بەڵام دەربارەی کرێی دەستی ئەم شاگرد و پەڕەچی و بگێڕانەی لای ئەم وەستایانەی ناومان بردوون، بەم جۆرە بووە:

بگێڕ بە (رووپییەیەکی) کاری کردووە، کە دەکاتە (٧٥) فلس، پەڕەچیش هەر بەم نرخە، ئەمە لە کاتێکدا ئەمانە بە حیسابی (باتمان) کاریان کردووە، واتە رۆژانەیان

وەستاوەتە سەر باتمان، ئەگەر رۆژێ دوو باتمان لوایان پەرە بکردایە یان بیانگێرابا ئەوا دوو روپیەیان وەردەگرت، ئێستاش بگێڕ هەر بە هەمان حیسابی باتمان کاردەکات.

**٥- کارگەکانی سەردەمی ئینگلیز و بەرەودواتر:**

لێرەدا ناوی ئەو کەسانە دەخەینە روو، کە لە کاتی ئینگلیز و پاشتریش کارگەیان هەبووە، بەڵام ئێستا هیچ کامیان لە ژیاندا نەماون، تەنیا دووان نەبێ:

١- حاجی حەمە رەزا.
٢- شێخ یونس.
٣- شێخ تەها.
٤- عەزیز چاوڕەش.
٥- خەلیفە وەلی.
٦- حاجی خالە.
٧- وەستا قادر.
٨- محەمەد حەمە رەحیم.
٩- پیرداود حەمە رەحیم.
١٠- وەستا وەهاب.
١١- رەحمان مامزە شەل.
١٢- شێخ محەمەد سەید کەریم.
١٣- خەلیفە شێخۆ.
١٤- شەهاب محەمەد نەبی.
١٥- دەروێش یەحیا، ماوە تەمەنی (٨٠) ساڵ دەبێ.
١٦- محەمەد قادر داود بلباس، ماوە تەمەنی (٨٠) ساڵ دەبێ.

ئەمانە تاوەکو سالانی چل کارگەیان هەبووە، لە دوای ئەمانەش ئەم ناوانەی خوارەوە وەستا و کارگەچی بوون لە هەولێر:

١- حاجی سەعید گوڵچین، نەماوە.
٢- حاجی رەحمان، مردووە.
٣- ئەنوەر رەشید، مردووە.
٤- حاجی سلێمان، ماوە.
٥- ئەحمەد عەبدولقادر، ماوە.
٦- کەریم عەبدوڵڵا، ماوە.
٧- محەمەد عەبدولوەهاب، ماوە.

بێگومان لەم ماوەیەدا بە گوێرەی گۆڕانی رۆژگار و پێشکەوتنی ژیان کرێی دەستی بگێڕ و پەڕەچییەکان زیادی کردووە، بۆ نموونە دوای ئەوەی رووپیە نەماوە، دینار و درهەم پەیدا بووە، بگێڕ لە سەرەتا (١٠٠) فلسی هەبووە، دوایی بەرە بەرە زیادی کردووە بۆ (١٥٠)، پاشان (٢٥٠) فلس. بەم جۆرە رۆیوە تاوەکو هەندێک دەڵێن لە سالانی پەنجا بگێڕ یەک باتمانی بە (٥٠٠) فلسی دەپەستاوە، ئەمە لە کاتێکدایە کە لباد یان رایەخ نرخی (٣ - ٤) دینار بووە. ئێستر بەم شێوەیە لە شەستەکانیش تۆزێ زیادی کردووە بۆ (٧٥٠) فلس و بەرەو ژوورتر.

**٦- کارگەکانی ئێستای لباد و رایەخ:**

لێرەدا ناوی ئەوانە دەنووسین کە تاوەکو کاتی ئامادەکردنی ئەم بابەتە کارگەیان هەیە و ماون و لە تەمەنی (٥٠ - ٥٥) ساڵ دان.

١- ئەحمەد حەمەد مەولود.
٢- محەمەد گرد گراوی.
٣- مشیر مامە.
٤- تەلعەت حاجی یونس.
٥- جەمیل قادر.
٦- هەیاس حاجی محەمەد.
٧- جەوهەر ئەنوەر.
٨- قاسم عوسمان.
٩- بەکر محەمەد قادر.
١٠- کەریم فەتاحە سوور.

ئەوەی شایەنی گوتنیشە ئێستا بگێڕ باتمانی بە (٧) دینار دەپەستێتەوە، واتە دەگێڕێ و نرخی لواش بە کیلۆ یان بە هۆقەیە، بەڵام بە زۆری هۆقە بەکار دەهێنن بۆ کڕینی لوا، هەر هۆقە لوایەکیش بە (١٢-١٣) پەنجاییە، بەڵام نرخی رایەخ یان لباد، ئەوا بە گوێرەی ئەو لوایەی تێی دەچێ دەفرۆشرێتەوە، بۆ نموونە ئەگەر رایەخێک (٨) هۆقە لوای تێ بچێ، ئەوا هەتا (٤٠) دینار نرخی دەڕوا، ئەمە لە کاتێکدا ئەگەر وەستاکە خۆی لوا بکڕێ، بەڵام ئەو کەسەی رایەخ یان لباد بە کردن دەدات، لواکەی هی خۆی بێت، وەستا لە هەر هۆقەیەک (چوار) دینار بۆ خۆی دەگێڕێتەوە. پێویستە ئەوەش بگوترێ کڕینی دەرمانی نەخش و پەڕە کردن لەگەڵ کرێی ئەو دوکانەی کاری تێدا دەکەن، ئەوانە هەموو لەسەر وەستا خۆی بووە، هەروەها وەستا خۆشی وەک بگێڕ و شاگردەکان کاری کردووە بۆ راختنی لواکە لەسەر چیغ و پەستانەوەی.

**ئامێرەکان:**

ئەو ئامێرانەی بۆ دروستکردنی ئەم جۆرە رایەخە کەڵکیان لێ وەردەگیرێ، زۆر نین و لە دوو ئامێر تێپەڕ ناکەن، کە شەنە و کوتک وکەوانە، واتە ئامێری پەڕەکردن.

**١- شەنە:** لە چەند پەلە دارێکی باریک پێک دێت، کە دەمەکانیان

وەکو شەنە پەرپەڕ دەکرێت لە قونکەوەشڕا سەرەکانیان دەگەیەنرێتەوە یەکتری و بە شتێک دەیپێچن، هەر لە سەلکە شەنەش دەچێ، بۆیە ئەم ناوەیان لێ ناوە و بۆ راخستنی لوا لەسەر چیغ بەکاردێ.

**۲- کوتک و کەوان:** ئەمەیان ئامێری پەرەکردن دەگرێتەوە، کە لە دار و چەرم پێک دێت، چەرمەکەش بە زۆری ریخەلۆکی وەردەگیرێ، بەڵام دارەکان کە لە داری تایبەتی و ئاسایی پێک دێت، هەر یەکی ناوێکی هەیە، وەک (دەفە، کەوان، کوتک، دارەسما)، ئەم ئامێرە دوای ئەوەی بەرێ و شوێنی خۆی دانرا، ئینجا پەرەچییەکە لە لایەکەوە ژێیەکە دەخاتە ناو لوا پەرە کراوەکە بۆ لایەک دەڕوا ئیتر بەرە بەرە و بەم پێیە تا وەکو هەمووی پەرە دەکرێ، بەڵام پێویستە ئەوە بڵێین، کە ئەم ئامێرە هەر تەنیا بۆ پەرەکردنی لوا بەکار نایەت، بەڵکو بۆ لۆکە و پەمۆش بەکار دێ.

### چیرۆکێک دەربارەی رایەخ و لباد:

دەگێڕنەوە دەڵێن: لە یەکێ لە شارەکانی ئەم دەوروبەرە پاشایەکی زۆر بە زەبر و زەنگ هەڵدەکەوێت، کچێکی زۆر جوانیشی دەبێت. رۆژگار دێت و دەڕوا، کوڕە هەژارێک حەز لەم کچە دەکات. ئیتر رۆژ بە رۆژ خۆشەویستییەکەی زیاتر کڵپە دەستێنێ، تاوەکو رۆژێک دێ دەنێرێتە خوازبێنی کچەی پاشای، پاشا کە بەمە دەزانێ سەری سوڕ دەمێنێ: چونکە خۆی و ئەم کابرا هەژارە زۆر بە لێک دوور دەزانێ، بۆیە پێی دەڵێ: باشە من کچی خۆم دەدەم بە تۆ، بەڵام داوایەکم هەیە دەبێت یان بمریت یان جێبەجێی بکەیت، کابراش پێی دەڵێ: فەرموو داواکەت بڵێ، پاشا دەڵێ: مادام تۆ داوای کچی منت کردووە دەبێ بەیانی فەرشێکم لە خوری یاخود لوا بۆ دروست بکەی، ئەگەرنا لە سەرت دەدەم، واتە هەڵتدەواسم.

کە وای پێ دەڵێ، کابرا سەرێک دێنێ و سەرێک دەبا، چی بکات تازە تووش بووە، یان دەبێ دروستی بکات یان دەبێ لەسەری بدرێ، بۆیە بە پەلە دەگەڕێتەوەماڵەوە، هەندێ خوری و خار و لوا کۆ دەکاتەوە، لە ژوورێکەوە لەسەر زەوی درێژ دەکات، ئینجا دەست دەکات بە هاتوچوو لەسەری، بەم شێوەیە پێوەی خەریک دەبێ تاوەکو بەترەکی شەو، چەندی دەکات و دەکات یەکتری ناگرێ و نابێتە فەرش، هیچ چارێشی نییە بۆ بەیانی دەبێ دروستی بکات، ئەگەرنا بۆ هەر لایەک رابکات هەر دەکەوێتە دەست پاشا. بۆیە ئەو شەوە ناخەوێ هەر خەریکی لوایەکە دەبێت، تا وای لێ دێت زۆر هیلاک دەبێ و ئارەقەیەکی زۆر لە قەلبی دەچۆڕێتەوە، لە شوێنی خۆی لەسەر لواکە دادەنیشێت پاشان هەڵدەستێ دەبینێ شوێنەکەی لەسەری دانیشتووە توند بووە. مەزانە ئەو ئارەقەی لە لەشی هاتبووە دەرێ، وای لێ کردبوو، ئەویش مەزەندەیەکی لێ دەکا و دەڵێ: بە خودای ئەمە کاری ئارەقەکەیە ئەم شوێنە وا رەق بووە.



بۆیە هەڵدەستێ چەند جامێ ئاو دێنێ و بەسەر هەموو لواکەیدا دەیڕژێنێ، ئینجا دەست بە هاتوچوو دەکات لەسەری، ماوەیەک وا دەکات دەبینێ لواکە تەواو یەکتری گرتووە، ئیتر بەرە بەرە بەم جۆرە تاوەکو بەیانی بە تەواوی رەق دەبێ و دەبێتە فەرش و بۆ لای پاشای دەبات، پاشا کە وای دەبینێ، ناچار کچەکەی خۆی لێ مارە دەکات و دەیداتێ، لە شوێنی خۆشی دەیکاتە پاشا، کە ئەو گسترانە روودەدات جڵەوی فەرمانڕەوایی دەکەوێتە دەست کوڕە هەژارەکە، ئیتر بە تەواوی هێمنی و ئاسایش دەست بەسەر ناوچەکە دادەگرێ، بۆیە کابرا جەماوەرێکی زۆر بە دوای دەکەوێ و خەڵکەکە بە تەواوی لایەنگیری دەکەن، چونکە گوزەرانیان خۆش دەبێ و باری ئابوورییان بە هۆی ئەم فەرشە دۆزراوەیە دەگۆڕێ و کارگە پەیدا دەبێ، واتە گۆڕانێکی تەواو لە رووی خۆشیی گوزەران لە قۆناغی فەرمانڕەوایی ئەم کابرایە روو دەدات،

دەڵێن ئەو کابرایە واتە کوڕە هەژار ناوی (مەنسوور) بووە.

خەڵکەکە بە (مەنسوور هەلاج) ناویان بردووە، هەلاجیش لە زمانی کوردیدا واتە (شی کەرەوە) یان (پەڕەچی)، هەتا وەکو دەڵێن: پاش ئەمانی ئەو کابرایە باری گوزەرانی خەڵکەکە تێک چووەتەوە و پشێوی و ناکۆکی باری بەسەردا کێشاون، بۆیە دیسان چاوەڕێ بوونە، کە ئەو کابرایە (مەنسوور هەلاجە) بگەڕێتەوە، دنیایان بۆ شی بکاتەوە و پەڕە بە پەڕەی بکات، تاوەکو ئاسایش سەر بە ولاتدا بگرێ، تەنانەت دەڵێن: پێشیان وتووە مەنسوور هەلاجی پێغەمبەر!!!

### فەرهەنگۆک

**بگێڕ:** ئەو کەسەیە لەسەر ئەژنۆ بە باسکی رووت رایەخ یا لباد دەپەستێتەوە دوای ئەوەی لای وەستا لە چیغ دەدرێ و دەردەچێ.

**هۆقە:** جۆرە کێشێکە بەرانبەر بە (دوو) کیلۆ دەوەستێ.

**باتمان:** جۆرێکە لە کێش بەرانبەر بە (شەش) هۆقە دەوەستێ، واتە دەکاتە (١٢) کیلۆ.

**رووپیە:** جۆرێکە لە پارە بەرانبەر بە (٧٥) فلس دەوەستێ، دەڵێن پارەیەکی هیندییە لەگەڵ هاتنی ئینگلیزەکان کەوتۆتە کوردستان.

**چیغ:** لێرەدا مەبەست ئەم چیغە نییە، کە لە دەوری رەشماڵی دەئاڵێنن، بەلام لە زوویێکەوە هەمان چیغ بەکار هاتووە بۆ لوولدانی لباد یان رایەخ، بۆیە ئێستاش بە هەمان ناوەوە ناو نراوە، ئەگینا ئێستا بۆ ئەم مەبەستە گوش بەکار دەهێنن.

**بەتر:** نیوە، درەنگ، بەترەکی شەو، واتە درەنگی شەو، نیوەی شەو.

### دوو وردە تێبینی:

١- لە زووەوە بگێڕەکان لە کاتی زستاناندا لە حەمام ئیشیان کردووە، واتە خۆیان رێک کەوتوون حەمامێکیان گرتووە، زستانان کاریان تیادا کردووە، بۆیە زۆربەی زۆریان یەکتریان ناسیوە: چونکە لەم شوێنە یەکدیگیر بوون، هەروەها هەندێ جاریش وەستا لەگەڵ شاگردەکان بۆ کارکردن.بە گوند و ناوچەکاندا گەڕاون

٢- مام محەمەد قادر داود دەڵێ: لەدایکبووی ساڵی (١٩٠٠) نیم، بەڵکو بە (٥ - ٦) ساڵ بچووک ترم، بەلام لە نفووسم وا نوسراوە.

### سەرچاوەکان

١- سەردانێک بۆ کارگەی (ئەحمەد حەمەد مەولوود) رۆژی ١٢/ ٣/ ١٩٨٦، گفتوگۆ کردن لەگەڵ خۆی و بگێڕەکەی، کە ناوی (عەبدولواحید شێخ محەمەد)ە، هەر ئەویش واتە کاک عەبدولواحید چۆنیەتی پەستانەوە و گێرانی لباد و رایەخی بۆ دەرخستین و روونیکردەوە، تەنانەت خۆشی بۆی نووسین.

٢- سەردانێک بۆ کارگەی (قاسم عوسمان) رۆژی ١٩/ ٣/ ١٩٨٦، گفتوگۆ کردن لەگەڵیدا، لە هەمان کاتیشدا باوکی لەوێ بوو، کە ناوی (مام عوسمانە) و لەدایکبووی ساڵی (١٩٠٧)ە، ئەم گوتی لە پەنجاکاندا بگێر باتمانی بە (٥٠٠) فلس دەپەستاوە، کە خۆم یەکێ بوومە لەو بگێرانە.

٣- سەردانێک بۆ کارگەی (بەکر محەمەد قادر) رۆژی ١٩٨٦/٣/٢٢، گفتوگۆ کردن لەگەڵ مام (محەمەد قادر بڵباسی) باوکی کە لەدایکبووی ساڵی (١٩٠٠)ە، ئەم ناوی خاوەن کارگەکانی سەردەمی گرانی، واتە سەردەمی عوسمانی و سەرەتای دەسەڵاتی ئینگلیز و دواتری پێ گوتین، هەروەها وتی: ((خۆم بگێڕ بوومە لای (وەستا عەباس) بە رووپیەیەکی، پەڕەچیش هەر ئەوەندەی هەبوو))، هەروەها گوتی: ((وەستا پاش ئەوەی کرێی من و پەڕەچی شاگردی دەدا، هەر ئەوەندەش بۆ خۆی دەمایەوە، رووپیەک یان دووان، لەبەر ئەوەی لباد و رایەخ نرخی زۆر نەبوو))، هەروەها ئەمەشی گوت: ((دوای ئەوەی دینار و درهەم پەیدا بوو، بگێڕ بە (١٠٠) فلس لباد یان رایەخی دەپەستایەوە، واتە باتمانی بە (١٠٠) فلسی دەگێڕا)).

بەلام دەربارەی سەندیکا، نەقابە وتی: ((لە ساڵی (١٩٥٨) داوایان لە ئێمە کرد داخلی نەقابە بین کە ئەو کات ژمارەمان بە وەستا و شاگردەوە لە دەوری (١٠٠) کەس دەبوون سەرۆکی بەشەکەشمان، واتە کارگەچییەکان ئەمانە بوون: (ئیبۆ دلبەر، محەمەد حاجی وەهاب، خەلیل عەزیز گوڵناز) کە ئێستاش ماون و لە هەولێر دادەنیشن)).

٤- دانیشتنێک لەگەڵ کاک (ئازاد ئەحمەد) دەربارەی ئەم چیرۆکە ئەفسانەییەی لەسەر چۆنیەتی دروستکردنی رایەخ ولباد گوتراوە، کە ئەویش لە باپیری گوتی لێ بووە، کە ناوی (محەمەد حەمە رەحیم)ە، ئێستا نەماوە و کارگەشی هەبووە، شایەنی باسیشە دانیشتنەکە لە رۆژی ١٩٨٦/٤/٥ بوو لە ژووری کارگەی (بەکر محەمەد قادر).



# پیشەی نانەوایی لە هەولێر

محەمەد کەریم نانەوا

لە گۆڤاری یادی (١٠٠) ساڵەی دامەزراندنی شارەوانی لە هەولێر، بە پێنووسی (م. مەولوود مەم)، سەبارەت بە پیشەی نانەوایی دەڵێ:

(وەک بۆم ساغ بووەوە، حەوت خێزانی عەرەبی حەویجە و موسڵاوی هاتوون لە گەڕەکی (عەرەب) نیشتەجێ بوون، خەریکی نانەوایی بوون و..) بەڵام نەینووسیوە لە چ ساڵێک ئەو خێزانە عارەبانە هاتوون بۆ هەولێر.

واتا لە سەرەتادا پیشەی نانەوایی لە ناو ماڵ بووە، ئافرەت ئەم کارەیان کردووە، پیاوەکان لەسەر سەبەتە لەناو بازاڕ فرۆشتوویانە، دوای بەدواداچوون، پێکەوتم کە کۆمەڵێک خانەوادەی بەڕێز لە سەرەتا خەریکی پیشەی نانەوایی بوون لە شاری هەولێر، وەکو: خانەوادەی حوسێن کەسرە، مام وادی، ئیبراهیمە سوور، مام ئەیووب، مام نەبی، نامق، ئەکرەم، سەید ئەحمەد، حاجی جبرائیل، کە لە ژیاندا ماودو لەناو بازاڕی (نەجاران) لەسەر پیشەکەی بەردەوامە، هەروەها خانەوادەی سەید خەنجەر، ئەم خانەوادەیە قۆنتەراتی نانی بەندیخانەی گرتبوو.

- دواتر بۆ یەکەم جار لەسەرەتای پەنجاکان لە شارەکانی ئێراق بە گشتی و لە شاری هەولێریش بە هۆی گرانی و نەبوونی دەغڵ و دان لە گەڕەکی میللی و هەژارنشینەکان ژمارەیەک نانەواخانەی بە پاڵپشتی (میری) بە ناوی (إعاشە) دامەزران، ئەوانەی وەبیرم بێ مۆڵەتی کارکردنیان پێ درابوو: هەردوو خودا لێخۆشبوو (سەید گوڵ و سەلیم شێرە) بوون.

لە کاتی خۆی سەنگی یەک نان دوو سەد گرام بوو، نرخی یەک نان (چوار) فلووس بوو.

دواتر هەر لە سەرەتای پەنجاکان، پیشەی نانەوایی لە دەستی ئافرەتان وەرگیرا، کەوتە ژێر دەستی پیاوان و ناو بازاڕ، دوای پرسین بۆم ساغ بووەوە، کە (دەروێش ئەحمەد نانەوا)، لە کەرکووکەوە هاتبوو بۆ هەولێر، بۆ یەکەم جار نانەواخانەیەکی (تیجاری) لە کۆڵانی قشڵەی کۆن دامەزراندووە.

هەروەها خانەوادەی (عەباس عەولا سوور) بە (عەباس حەرەسە) ناسرابوو، ئەویش لە شاری

كەركووكەوە هاتبوو، لە گەراجی (تەنەكە) نانەواخانەیەكی بازرگانی دامەزراندووە، ئیتر بە پێی گەشەسەندن و فراوانبوونی شار پیشەی نانەوایی پەرەی سەند، ئێستاكە، پتر لە (٢٠٠) نانەواخانەو نزیكەی (٢٥٠) سەموونخانەی تێدایە.

لە هەر نانەواخانەیەك چوار كرێكار كاری تێدا دەكەن.

١- شاتر - نانپێژ: ئەو كەسەی نان پێوەدەدات.

٢- عجان: هەویر شێل

٣- شەلاع: ئەو كرێكارەی نان لە تەندوور دەردەكات،

٤- پاداو: شاگرد، یان بەردەست.

ڕۆژانەی هەریەك لەو كرێكارانە لە رابردوو و ئێستا بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

* (نانپێژ) پێشان لە بەرامبەر هەزار نان یەك دیناری سویسری وەردەگرت، ئێستا چواردە هەزار دیناری بریمەر وەردەگرێت.

* هەویر شێل و ئەنگوتك بڕ، لە بەرامبەر هەزار نان شانزە (درهەم)ی وەردەگرت، ئێستا دوازدە هەزار دیناری بریمەر وەردەگرێ.

* ئەو كەسەی نانیش لە تەندوور دەردێنێت: پێشان لە بەرامبەر هەزار نان هەشت درهەمی وەردەگرت، ئێستا دە هەزار دیناری بریمەر وەردەگرێت.

**كەرستەی نانەواخانە، لەمانەی خوارەوە پێكهاتووە:**

تەندوور، ماشە، مادە یان (مایە) ئەرفێدەشی پێ دەڵێن. پوش یان



ئیسفەنج لەسەر ئەرفێدە دەبەستریّ شاڵ یان بووزی، ئەمەیان بە زۆری لە شاری مووسڵ و بەغدا دەیچنن، هەروەها تەندوور ماڵ، بۆ خاوێنكردنەوەی تەندوور بەهۆی (خێواوك)، تانكی ئەوت بەهۆی (بۆری) رایەڵ دەكریّ بۆ ناو تەندوور لەگەڵ (عەگال) بۆرییەكی لوولدراو لەگەڵ (دەرزی) یان (مەمە) قایم دەكرێت، لەگەڵ پارچە بۆرییەكی ئەستوور بۆ ناو عەگال، دەچێتە ناو كووره، هەروەها (كەرپووچی ئاگرین: ئەستبێز) بۆ كوورەی ناو تەندوور، هەروەها: ئارد، ئاو خوێ، سۆدە، بۆ دروستكردنی نان.

* دروستكردنی تەندوور، لە شاری كەركووك، لە گەڕەكی (پیریادی) ئافرەتی پیریادی دەستێكی رەنگینیان هەیە لە دروستكردنی تەندوور، لە سەرتاسەری ئێراق، ئەویش بە هۆی (گڵ)ەكەی خاكی كەركووك، چاكترین گڵە بۆ دروستكردنی تەندوور، پێویستە ئەوەش بڵێین: یەكەم كەس تەندووری هێنا بۆ فرۆشتنەوە لە شاری هەولێر (حاجی ئیحسان) بوو یادی بەخێر، دەستێكی باڵای لە دامەزراندن و سووركردنەوەی تەندوور هەبووە،

دواتر: ئەنوەر عومەر نانەوا، تەندوور و كەرستەی نانەوایی هێنا بۆ هەولێر، ئێستاشی لەگەڵ دابێت، لەناو بازاڕی نەجاران لە شاری هەولێر، بەردەوامە لەسەر فرۆشتنی كەرەستەی پێویست بۆ پیشەی نانەوایی.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری مێرگ ژمارە (٢٣)ی نیسانی ٢٠٠٧ لا ١١٦ - ١١٩ وەرگیراوە.



# ڕەوەند و بواری گەشتیاری

سەلمان برادۆستی

زۆربەی گوندەکانی ناوچە شاخاوییەکان لە شوێنی لێژ دروست کراون و شێوەی پلیکانێکیان وەرگرتووە، کە لە دوورەوە سەیر دەکەی دەڵێی نهۆمی باڵەخانەیە بەسەریەکەوە بەستراون، لە دامێنی گوندەکان هەمووی رەز و باخات و سەوزاییە، دیمەنی ئەوەندە جوانە کە چاو لێی تێر نابێت.

دانیشتووانی گوندەکان ژیانێکی سادە و ساکار بەسەر دەبەن، هەندێکیان خەریکی دانانی رەز و باخات و کشتوکاڵ و ئاودێرین و هەندێکی تریان خەریکی دروستکردنی کار و پیشە میللییەکانن، هەروەها هەندێکیان خەریکی بەخێوکردنی مەڕ و ماڵاتن.

لە سەرەتای مانگی نیسانەوە رەوەندەکانی کورد بۆ کۆچ و کۆچباری خۆیان ئامادە دەکەن و روو دەکەنە کوێستانەکان و هەڵدەکشێن بەرەو بناری چیا بەرزەکان لە پێناو گەران بەدوای باشترین لەوەڕگا بۆ ئاژەڵەکانیان لەسەر مێرگ و چیمەن و نزیک کانیاوە سازگارەکان و ئەو کەوییە بەفرانەی، کە تاکو درەنگی ساڵ لە کوێستانەکاندا دەمێنن رەشماڵ و هۆبە هەڵدەدەن.

رانە مەڕەکانیان بە بناری کێو و مێرگ و چیمەنەکان پەرش و بڵاو دەکەنەوە، لەگەڵ دەنگی هاژەی تاڤگەکان و کەو و پەلەوەر و دەنگی شمشاڵی شوان و بۆن و بەرامی

هەزاران گوڵ و گیای بۆن خۆشی وەک: نێرگز و سووسن و بەیبوون و شلێر و گوڵە روون و هەڵاڵە و ... چەندان بۆنی دیکە.

لەو شوێنە و لەناو ئەو بۆن و بەرامەدا رەوەندەکان لە بەروبوومی ئاژەڵەکانیان چەندان جۆری پیشەسازی دەستکرد بەرهەم دێنن، لە موو و خوری ئاژەڵان چنین و رستن دەکەن، وەک مافوور و بەڕە و رەشماڵ و چەندین جۆری نەخش و نیگاری رەسەنی کوردەواری تێدا بەکاردەهێنن. هەروەها لە بەروبوومی شیر، چەندین جۆری خواردەمەنی لێ دروست دەکەن، وەک: ماست پەنیر، ژاژی، لۆر، کەشک، کەرە. لە کارەکانیان تا کۆتایی مانگی ئەیلول بەردەوام دەبن، ئینجا بەرەو گوند و شوێنەکانیان دەگەڕێنەوە و بەرهەمی پیشەسازییەکانیان دەبەنە بازاڕی شارەکانیان.

لەم شوێنانەدا گەشتیاران دەتوانن لە نزیکەوە ئاشنایەتی و شارەزاییان لەگەڵ پیشەسازی دەستکرد و کار و پیشەی رۆژانەی ئەو ناوچانەدا هەبێت.

ژیان و داب و نەریتی ئەم رەوەندانە بەشێکی هەرە گرنگە لە کلتووری میللەتەکەمان، هەر بۆخۆی گەشتیاران حەز و ئارەزوویان لە دیتن و تێکەڵاوی داب و نەریت و کەلتووری گەلانە، جا بۆیە لەسەر ئەم بنەمایە کوێستانەکانمان باشترین جێگان بۆ تێکەڵاوی گەشتیاری بە کەلتووری میللەتەکەمان، ئەوکاتەی گەشتیار روو لە ناوچە گوندنشینەکان دەکات و تێکەڵ بە کەلتوور و داب و نەریتی ئەوان دەبێت. لەو کاتەیدا گەشتیار هەست بە گەورەترین خۆشی و شادی دەکات، چونکە لە نزیکەوە ئاشنایەتی لەگەڵ کەلتوور و شارستانیەت و ئەو پیشەسازییە دەستکردانە دەکات. کە چۆن گوندنشینەکان ژیان و گوزەرانیان دەبەنە سەر و خەریکی کاری رۆژانەی خۆیانن: گوندنشینەکان سوود و قازانجێکی باشیان دەست دەکەوێت، لەو گەشتیارانەی روو لە ناوچەکانیان دەکەن. ئەویش بە فرۆشتنی کاڵا و بەروبوومەکانیان. هەروەها زۆرجاریش بە بارگیرەکانیان دەتوانن گەشتیاران لە شوێنێک بۆ شوێنێک بگوازنەوە. ئەمەش تام و چێژێکی تایبەتی خۆی هەیە لەلای گەشتیار، هەر بۆخۆشی هەنگاوێکە بۆ تێرکردنی حەز و ئارەزووەکانی گەشتیار.

ئەو داب و نەریت و کەلتوورەی کوردەواری ئەمڕۆ لە شارەکان بە دەگمەن بەبەرچاو دەکەوێت و وردە وردە بەرەو نەمان دەچێت.

کەچی لە زۆربەی گوندە دوورە دەستەکاندا تاکو ئێستاش پەیرەوی ئەو دابونەریتەیان دەکەن، ئەمەش جێگای خۆشحاڵییە، دەبێت بەردەوام هەوڵی بۆ بدرێت و لە فەوتان رزگار بکرێت.

بە بوونی ئەم هۆکارە گەشت و گوزارییە، رێژەیەکی یەکجار زۆر گەشتیاری ناوەوە و دەرەوەی وڵات زیاد دەکات و چەندین سوود و بەرژەوەندی تریش بە هەرێمەکە دەبەخشێت وەک:

١- بە هۆی ئەم دیاردەیەوە رێژەی دانیشتووانی شارەکان کەم دەکاتەوە، لەبەر ئەوەی گوندنشینی شارەکان روو دەکەنە گوندەکانیان و ئاوەدانیان دەکەنەوە و زیاتریش بایەخ بە بەروبوومی کشتوکاڵ و ئاژەڵداری و کاڵاکانیان دەدەن، چونکە دەبێتە بەشێک لە داخوازی گەشتیارانی ناوچەکە.

٢- قەیرانی نیشتەجێبوون لە شارەکان نامێنێت و گرانی بازاڕەکانیش کەم دەکاتەوە و خەڵکانێکیش لە بێ کاری رزگار دەکات.

٣- سروشتی جوانی کوردستان و داب و نەریت و ژیانی ساکاری میللەتەکەمان بە گەشتیارانی جیهان دەناسێنێ و باری رۆشنبیری وڵاتیش روو لە پێشکەوتن دەکات. هەروەها بواریش بۆ بەرەو پێشچوونی کەرتی گەشتوگوزار لە هەرێمدا دەڕەخسێنێ.



# کۆچەر و ڕەوەندایەتی لە ناوچەکانی هەولێر دا

ئا: سەید مەولود سەید قادر بێخاڵی

گەلی کورد وەکو گشت گەلانی دووروبەری بەشێکی ڕەوەندی کۆچەرە، زۆربەی ئەو کۆچەرانەی لە ناوچەی پارێزگای هەولێردا دەژین، لە سەرەتای وەرزی بەهار تا کۆتایی مانگی جۆزەردان لە کوێستانەکانی سەر سنووری عێراق و ئێران و تورکیادا هاوسەنگ دەبوون، لەبەر فێنکی ناوچەکە و بە برشتی پاوانی لەوەڕگاکانی چەند زیاتر هەڵکشابانە سەر کێوە بەرزەکان، دوور کەوتبانەوە لە رووی دەریا ژیانی هاوینان خۆشتر دەبوو، بە پێچەوانەی وەرزی زستان، لەبەر داماڵین و رووتبوونەوەی زەوی و سارد و سڕی کەژ و گەوەکی ناوچەکە و بێ کەڵکی لەوەڕگەکانی بۆ بەخێوکردنی مەڕ و ماڵات و چاندنی ڕووەک و دەغڵ و دان، بەڵام لەو گوندانەی دەکەوتنە پاڵ بەرز و نزمی ئەو کێوە بەرزانە، دەکرا گەنمی تێدا بچێنن بە ماوەی (١٣) سێزدە مانگ پێ دەگەیشت، بە مانای لە مانگی پووشپەڕ دەیانچاند و لە مانگی گەلاوێژی ساڵی دوایی دەیاندوورییەوە، جا لەبەر ئەو ئاستەنگانە و ناخۆشی ڕێگاوبانیان بە دەگمەن گەنمیان تێدا دەچاند، بەیار دەمانەوە و دەبووە لەوەڕگای ئاژەڵداران، لەوەڕیش دوو جۆرە: لەوەڕی نزیک بە گوند، لەوەڕی داوێنی پاڵ شاخە بەرزەکان.

أ- لەوەڕی نزیک بە گوند: ئەو لەوەڕگایانەن، کە دەکەونە ناو ئەو بەرزی و نزمییانەی کە بە دەگمەن بەفریان لێ دەبارێت، بشبارێت بە ماوەیەکی کورت دەتوێتەوە.

ب- لەوەڕگای دووەمیش... ئەو لەوەڕگایانەن کە دەکەونە نێوان دەوەن و داری کێوە بەرزەکان. لەوەڕی ئەو لەوەڕگایانە چڕ و بەژن کورتن، جۆرەها گوڵی سروشتییان لەگەڵدا دەڕوێت، بەرووبوومی ئەو ئاژەڵانەی لەو لەوەڕگایەدا دەلەوەڕێن، بەتام و چێژن.

## کۆچەرایەتی

مەبەست لە وشەی کۆچەرایەتی - بزاوتنی مەڕ و ماڵاتە لە وەرزی خۆیدا بەرەو کوێستان بردن و بەرەو گەرمیان کردنەوەیان، بۆ سوودوەرگرتن لە لەوەڕگا بە گیا و گۆڵە بە پیزەکان. کۆچەرەکانیش دوو بەشن - کۆچەری تەواو، کۆچەری بنەجێ:

أ- کۆچەری تەواو: ئەو کۆچەرانەن زستان و هاوین هەوارگەیەکی هەمیشەییان نییە و خەریکی کشتوکاڵیش نین.

ب- کۆچەری بنەجێ: ئەو کۆچەرانەن هەوارگەی گیرسانەوەی تایبەت بە خۆیان هەیە، زستانان لە ناو خانوواندا دەژین و لە هاوینە هەوارانیشیاندا لەژێر خێوەتدا دەژین، سەرەڕای ئاژەڵداری خەریکی کشتوکاڵیش دەبن.

ج- کۆچەری تەواو: لە کوێستانانی ئێمەدا زۆر کەمە، تەنها خێڵی هەرکییەکانی پارێزگای هەولێر لە کۆچەری تەواو نزیکن، زستانان لە دەوروبەری هەولێر لە ژێر رەشماڵاندا دەژیان، لە هاوینە هەوارەکانیشیاندا لە نزیک سنووری ئێران و تورکیا لە ناوچە فێنکەکانیاندا لەژێر رەشماڵاندا دەژیان، چەند ماڵێکیان نەبێت چەند ساڵێکە لە گوندی - میراخوڕو - دەربەندی سەیدو - رەشوانی ئەسعەد ئاغا - لە خانوواندا دەژین. لەبەر چەند ئاستەنگێکی لەوەڕی مەڕ و ماڵات زستان و هاوین هەوار گۆڕییان دەکرد، بە خێڵێکی کۆچەری گەورەی ناوچەی هەولێر دەژمێردران، هەتا رووخانی رژێمی پادشایش لە




سەردتای وەرزی بەهار لە مانگی بانەمەڕ - ئایار - بە مەڕ و ماڵاتەوە بە دەشتە دیانێدا بە گەردەن حیشتر و سەری بەردی و مێرگەمیر و رووباری لۆلان خۆیان دەگەیاندە گادەر - لە هەرێمی گەلاز لە قوژبنی باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا و دامێنەکانی چیای - چارچەلی هەرکییان، هەوارگەیان لە بەردە سپیان و چەلێ دارا دادەکوتا. بنەجێیەکانیشیان لە مەڵبەندی - مزووری باڵا - شێروان مەزن - باکووری قەزای زێبار لە باکووری گوندی - ئەرگۆش - لە گوندی بیداو، دری، ستونێ و هەرکیدا دەژین. بیداو دوو کەرتە، کەرتێکی لە نێو عێراقە و کەرتەکەی دیکەشی لەناو تورکیادایە. ئەو هەوارگە کوێستانییانەی خوارەوەش هاوینەهەواری ئەو خێڵە ساتە رەوەندانەی بەرامبەریان و چەند شوانکارەیەکی مەڕدارانی ناو شاری هەولێر و گوندانی دەوروبەری بوون:

١- کوێستانەواری بەردەسۆر و مێرگەسەکۆ، هاوینەهەواری

مـاڵینە عـەلی ئاغـای رایەتێ و مەحمود رەوشەنی بوو.
٢- کـوێسـتـانەواری سـەرێی ژێر، هاوینەهەواری مـاڵینە ئەحـمـەد شابازی بوو.
٣- کـوێسـتـانەواری کـێلەشێن و خواکورک، هاوینەهەواری ماڵینە شێخ حەسەنی سورچی بوو.
٤- کـوێسـتـانەواری سـپی رێزی خـەیلانیـیـان، هاوینەهەواری مـاڵینە سـەلیمی حاجی ئاغای بوو.
٥- کوێستانەواری هۆرنی باڵەکییان و هاوینەهەواری بەربزن و کـانێ سەر بە نەستێـرە، مـاڵینە مـەلا وسواغای سورچی مام سالان بوو.
٦- کـوێسـتـانەواری هەوارە جـۆ، هاوینەهەواری مـاڵینە حـاجی ئەحمەدی باڵەکی بوو.
٧- کـوێسـتـانەواری هەڵگورد بەردەسۆر و گوندی ژووری و کانێ خوارستێ و شاخی مـەکۆک و سـەرسـول و مـەرگـە درێژان، هاوینەهەواری بۆلێ و بابۆلێ و مەنتکان بوو.
٨- کوێستانەواری کانێ خورمارویێ و دەوڵـەترشێن و دالانپـەرو ناوچەی شەهیدان، هاوینەهەواری سـورچییـان و ئەسـعـەد سـورچی بوو.
٩- کـوێسـتـانەواری مـێـرگـەر، هاوینەهەواری ماڵینە برادۆسـتان بوو.
١٠- کـوێسـتـانەواری قـەندیل و مـامـەرووت و سـەری سـاوەی، هاوینەهەواری ماڵینە مەنگوڕ و مامەشان بوو.
١١- کـوێسـتـانەواری بنی بەدری شینمان و مێرگە کاروان و هەوار سامی و سەکران و بەردە بووک و هەوارە بڵندۆک و قـەنتـەرە، هاوینەهەواری هەرکی سـەیدان و خـەیلانیـیـان و گـشـت رەوەندە کـۆچەرەکـان و شـوانکارەی مەڕدارانی دیکە بوو.



هەتا دوا ساڵانی شەستەکانیش مەڕوماڵات و خانەوادەی ئەو رەوەندە کـۆچەرانەی سـەرەوە کـە بەرەو کوێستانان و گەرمیان دەبوونەوە رێگا سەرەکییەکان - گەلی عەلی بەگ - بوو، جـا بۆ ئەو دوو هاتوچۆیەی سـەرەوە ئەو رێگایە لە کـاتی خـۆیدا رۆژانە پاش نوێژی عـیـشـایێ هەتا رۆژهەڵاتی بەلای کـەمـەوە پازدە رۆژ هاتوچۆی ئۆتۆمـبـێلی بۆ رەواندز و دەشتەدیانان تێدا قەدەغە دەکرا. بنکە و لەوەڕگـا گـەرمـیـانەکـانیـشـیـان لە دەشـتـی بەڕانەتی و زرارایەتی و کـەندێناوە و قـەراج و ناو دەشت و بیتوێن و کۆیێ بوو. بەرهەمە هەرە بە پێز و ناودارەکـانیـشـیـان - مـاست و پەنیـر و ژاژی و روون بـوو، ئـەو بەرهەمـانەش بەم شـێـوەی خـوارەوە بەنێـو دێندران لە شـیـر دروست دەکران.
١- شـیـر دەکـوڵێندرا و هەوێن دەکرا و دەبوو بە ماست.
٢- مـاسـتـەکـەش لە مـەشکە دەژێندرا و دەبووە دۆ و کەرە.
٣- کـەرەکـەشـیـان دەپالاوت و دەبووە رۆن.
٤- دۆیەکەشیان دەکردە کەشک و داندۆک.
٥- پەنیـر و لۆر و ژاژیش هەر لە شیر بەرهەم دێن.

**سەرچاوەکان**

١- زۆربەی زۆری ئـەو بابـەتـانـەم لـە مـاوەی فـەرمـانبـەری خـۆم لە ناوچەکاندا پاشەکەوت کردووە.
٢. چەند خاڵێکی گرنگیشم لە بابەتی ترانس هیـوانـی گـۆڤـاری کـۆڕی زانیـاری سـالی (١٩٧١ ز) هەڵێنجاوە.

*** ئەم بابەتە لە گـۆڤـاری ئاسـۆی فـۆلکلۆر، ژمـارە ١٩، سـاڵی ٢٠٠٦ بلاوبۆتەوە.**



# شوانکارە و مەڕدارانی دەڤەری دزەییاتی دەشتی هەولێر

**هوشیار عەبدوڵلا**

دەڤەری دزەییاتی دەشتی هەولێر، دەڤەرێکی گەورە و پان و فراوانە، دەشتی راستان و زنجیرە زوورگ و دۆڵ و بان و کەندو لەندی زۆرە، زنجیرە "چیای قەرەچووغ"یش کە درێژییەکەی لە رۆژهەڵاتەوە بۆ رۆژئاوا "٢٢" کیلۆمەتر دەبێت، ئەم چیایە گەلی زۆرە، گیاو گوڵێکی باش و لەباری هەیە، بناری چیای قەرەچووغ و دەشتی قەراج زستانەهەوار و بەهارەهەواری مەڕدارانی عێلانی دەڤەرەکەی بووە، بۆیە ناوچەیەکی جوگرافی لەباری هەیە بۆ بەخێوکردنی مەڕ و ماڵات بە تایبەتی مەڕ، پەنجا شێست ساڵێک لەمەوبەر هەر گوندێکی دەڤەرەکە شەش تا حەوت مێگەلە مەڕی هەبووە، مێگەلەکانیش ژمارەیان لە ٤٠٠، ٥٠٠، ١٠٠٠، ١٥٠٠، ٢٠٠٠ بگرە ژمارەیان زیاتریش بووە، بە درێژایی چیای قەرەچووغدا لە چەندین جێگە و لە گەلی و بناری شاخەکەدا بەدیوی دەشتی قەراج و دەشتی کەندێناوەدا غەر "غەرەبەرد" دەبینرێت، کە کاتی خۆی لە سەردەمێکی زووەوە شوانکارە و مەڕدارانی دەڤەرەکە بۆ مێگەلەکانیان کردووە.

لێرەدا با بزانین شوانکارە و مەڕدار چییە؟

شوانکارە بەو کەسە دەگوترێت کە ئیش و کاری شوانی و بەخێوکردنی مەڕ و ماڵات بێت، لەوانەیە ئەو کەسە مەڕوماڵاتەکە هی خۆی بێت، یا ئەوەتە شوانکارەی خەڵک بێت، واتە مەڕ و ماڵاتەکە هی خۆی نەبێت، بەو رێکەوتن و گرێبەستەی کە لە نێوانیاندایە واتە لەنێوان خاوەن مەڕ و شوانکارەکەدا هەیە بۆی بەخێو دەکات، بەڵام مەڕدار ئەوە خۆی خاوەن مێگەلەکەیەو هی خۆیەتی خۆی بەخێوی دەکات.

غەر یان "غەرەبەرد" شوانکارەکان و خاوەن مەڕ و ماڵاتەکان لە زستانە هەوارەکاندا لە بناری شاخەکاندا دیواریان بە بەرد هێشکە کەلەک دەکرد، بەڵام سەریان نەدەگرت، وەکو شوورەی دەورەی خانیان وابوو، بەخڕنووک و بەتانۆک ناودەوەی غەرەکانیان دادەپۆشی، شەوان مەڕەکانیان خڕ دەکردەوە لەو غەرانەیان دەکرد، یەکەم لە

ترسی دەعبا بوو وەک گورگ، دووەم لەبەر ساردی و تەڕو تووشی بوو، جاری واش هەبوو رەشماڵیان لەسەر هەڵدەدا، بەم شووره بەردانە دەگوترا "غەر"، ئەم جۆرە غەرانە لە بناری چیای قەرەچووغیدا بەمدیو و بەمدیودا زۆرن وەکو "غەری حەمەدی شوانی، غەری تەهای جەوەی" لە ئاقاری گوندی خۆشاوێ، "غەری شاسواری" کە لە نێوان ئاقاری گوندەکانی "قەراتە سۆرانی مەرزان" و "ئازیکەند"ی هەڵکەوتووە، ئەو غەرە زۆر بەناوبانگە تێکەڵ بە بەیت و بالۆرە و ئەدەب و فۆلکلۆری دەڤەرەکە بووە، تەنانەت زۆربەی حەیرانبێژەکانی دەڤەرەکە ناوی "غەری شاسواری" دێنن، ئەو پیاوە "شاسوار" کاتی خۆی لە سەردەمێکی زووەوە خاوەن مەڕ و ماڵاتێکی یەکجار زۆر بووە لە دەڤەرەکەدا، لە بناری چیای قەرەچووغی بەدیوی دەشتی قەراجێ لە ئاقاری گوندی "ئازیکەند"ی لە ١٠-١٢ شوێنان "غەر" هەیە، کە پێی دەڵێن "غەران" کۆی وشەی "غەر"ە، کە کاتی خۆی هەوارنشینەکان هەواریان لەو شوێنانە دادەنا لە ئاقاری گوندی "قەراتە سۆرانی مەرزان"، کە گوندێکە دەکەوێتە دەشتی قەراجێ، لەوێ کوورگەک هەیە ناوی "خرە بەردان"ە، بەرامبەر گوندەکەیە، "دوو مەران" و کەنگر و کاردی و پووشە سۆرەی یەکجار زۆرە، لەو شوێنەدا لە دەشتی قەراجێ بەهار لەپێش هەموو شوێنەکانی دیکەدا دێت، ئەو شوێنە هەردەم هەواری شوانکارەو مەڕدارانی دەڤەرەکە بووە، غەرەبەردی زۆر بووە، زستانان شوانکارەو مەڕدارەکان لەناو غەرێ لەوێ دەمانەوە "زستانەهەوار"یان بووە. تەنانەت هەندێک لەو هەوارانە پاشان کە "قەراج" ئاوەدان بۆوە بوونە گوند وەکو "هەوار غەر، دوازدە هەوار"، لە "گەلی ئازیکەند"ی ٤-٥ غەر هەیە، ئەو گەلییە لە چیای قەرەچووغییە لەناو ئاقاری گوندی ئازیکەندی هەڵکەوتووە، کاتی خۆی شوانکارەو مەڕدارەکانی دەڤەرەکە لە بەهاراندا کە دەچوونە بناری چیایەکە رەوەیان تێدا بەرەڵلا دەکرد، گورگ نەدەهاتە ئەو گەلییەی، لەبەرئەوەی گورگ لە شوێنی عاسێدا زۆر حیزانەیە، ئەو گەلیە "غەردارە"ی یەکجار زۆرە، غەردارەی ئێرە زۆر گەورە دەبێت، بە تایبەتی لە "تساری یێک مەرێ" هەر لەو چیایەدا دۆڵێک هەیە پێی دەڵێن "درێ گورگان"، ئەو دۆڵە هەمیشە گورگی تێدایە، بازگەی گورگانە، ئەم دۆڵەش کەوتۆتە خوار "ئاشی بای".

**ناوی هەندێک لە شوانکارە و مەڕدارانی دەشتی ملکیەی:**

"حوسێنی ئەحمەداغا": ناسراو بە "ئاغای پاشا"ی، هەشت مێگەلە مەڕی هەبوو بە شوانکارەی دابوو، هەر مێگەلەی لە ٦٠٠-٧٠٠ سەر مەڕ پتر دەبوو، پاوانەکانیشی لە "زوورگەزراو"ی بوو، شوانکارەکانیشی ئەمانە بوون:

١- حاجی مەولودی برایم خەلیل، خەڵکی گوندی قورشاغلوی بوو لەدایکبووی ساڵی ١٨٩٤ز بوو، هەتا ئەو دوو ساڵانەی دواییش لە ژیاندا بوو لە گەڕەکی مەنتکاوەی هەولێر نیشتەجێ بوو تەمەنی لە "١٠٠" ساڵی بە سەرەوە بوو، چاوەکانی کز ببوو، گوێشی گران ببوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا توانای هاتوچۆکردن و هاتنە دەرەوەی هەبوو. لەم بارەیەوە "مام حاجی عەزیزی حەمەد قورشاغلویی لەدایکبووی ساڵی ١٩٢١ز بۆی گێڕامەوە و گوتی: تەمەنم ١٤-١٥ ساڵان دەبوو، شوانی حاجی مەولوودی بووم، دەچووینە "دەشتی بیتوێن"ێ لە ئاقاری "چوارقوڕنە و سەرخمە"ی رەشماڵمان لێ هەڵدەدا و بنگەمان لێ دێخست، ئەمەش لە ئاخر و ئۆخری هاوینێ و سەری پایزێ لە دەشتی هەولێرێ بارمان بار دەکرد بەرەو دەشتی بیتوینێ بە قۆناغ دەڕۆیشتین لە ئاوی "مێرخوزار و قەتەوی" مەڕمان ئاودەدا، بەڕێی کەسنەزان- هەورازە نەفتە- دەربەندی گۆمەسپان- دۆڵی سماقولی- لە "ئاوەگرد"ی ئاوا دەبووین بەرەو هیزوپ و دەشتی بیتوێن، نزیکەی ٣ مانگ لەوێ دەماینەوە لە کۆتایی پایزێ و سەرەتای زستانێ بەڕێگای خۆمان دەگەڕاینەوە بەرەو دەشتی هەولێرێ، بۆ ماوەی ٣ ساڵان مام حاجی شوانکارەیی کرد پاشان وازی هێنا.

٢- سلێمان شوانکارە: ئەم مرۆیەش یەکێک بوو لە شوانکارەکانی ئاغەی پاشای، بەڕەسەن سورچی بوو، هەر لە سەرەتاوە کاری شوانکارەیی بووە، لەم بارەیەوە بەڕێز "حاجی عوسمان فەقێ" لەدایکبووی ساڵی ١٩٣٢ بۆی گێڕامەوە گوتی: بەبیرم دێ لە ساڵی ١٩٤٤ز من "پاش شوان"یان بووم چووینە دەشتی

بەرانەتی، ئەوکاتی دەشتی بەرانەتی زۆربەی پاوان بوو گژوگیا و پووش و پەراش و کەنگری یەکجار زۆر بوو، چووینە گوندی "گردەچاڵ"ی، ئەو دەمی ئەو گوندە ١٠-١٢ ماڵێک دەبوون.

٣- برایم ئەحمەد حەسەن ناسراو بە "برایم شوانکارە".

٤- مەولودی قادری دەروێش مەولود: ئەو پیاوە لە بنچینەدا خەڵکی گوندی "پێمەرە بڕ"ی دەشتی شەمامکێ بوو، لە هۆزی مەمەوند بوو، سەردەمانێک شوانکارەی ئاغەی پاشای بووە.

٥- حەمەد موراد: مورادی باوکی لە دەشتی بیتوێنەوە کەوتبووە گوندی قورشاغلوی دەشتی مرکیە، لە "تیرەی رەمک"ی بلباسان بوو، ئەوە و ئەوەزاکانی هەر لەو گوندەی مانەوە نەگەڕانەوە دەشتی بیتوێن.

٦- مەجید عەیشێ.

**مێگەلەمەڕی خدری پاشای**

خدری پاشای "....- ١٩٨٦" لە دەشتی مرکییەدا ٨-٩ مێگەلە مەڕی هەبوو، هەر مێگەلی ٤٠٠، ٥٠٠، ٧٥٠ سەر مەڕ دەبوو، بەزۆری زستانە هەواریان لە "زوورگی شێخانان و مەخشووشە و دەو چەولکی پردێ و شێراوەی بوو، مەڕی دەچووە وێ، نەیان دەهێشت مەڕی کەس بچیتەوێ، پاوانیان بوو، لەوەڕی باش بوو، شوانکارەکانی خدری پاشای ئەمانە بوون:

١- برایم شوانکارە: یەکێک بوو لە شوانکارەکانی خدری پاشای، بواران پاوانی لە کێخوا عەلی کوڕی کێخوا جەردیس دەکڕی دەهاتە بن چیاو بناری قەرەچووغی لە ئاقاری گوندی "قەراتە سۆران" لە دەشتی قەراجێ دەمایەوە هاوینانیش دەهاتەوە گوندی "سۆربەش" بۆ پەرێز خواردنێ.

٢- قادر عەزیز و حەمەد عەزیز برا بوون.

٣- ئەحمەد جەراح و ئەسعەد جەراح برابوون خەڵکی گوندی "باشتەپە"ی بوون، "سارمەمی" بوون، گەلەک جاران بە مێگەلەوە داهاتنەوە گوندی "سۆربەش" لە سەرەوەی "بیرە ئیرتوازییەکە" لە دووری گوندی رەشماڵی هەڵدەدا.

٤- قورشیدی ئەحمەد رەزای

٥- سلێمان شوانکارە

٦- مەجید عەیشێ

٧- تایەر ناوێک

٨- شینەی فەللاح پاشان چووە گوندی "دۆڵە بەکرە"ی بووە شوانکارەی حەمەدی پاشای.

٩- حاجی سمایل حەسەن ناسراو بە "سمە حەسەن" خەڵکی گوندی "دۆڵە بەکرە"ی بوو، شوانکارەی "حەمەدی پاشا"ی بوو، مێگەلەکەی ٤٠٠-٥٠٠ سەر دەبوو، هاوینان دەچووە گوندی "ئیلینجاغ"ی پەرێزی دەکری، زستانان لە "دۆڵە بەکرە"ی دەمایەوە.

**مەڕ و ماڵات و مێگەلی حوسێنی مەلای حەوێزی:** ئەو پیاوە یەکێک بووە لە بنەماڵەی بایزی برای مامەندی مەلای، لە گوندی "قازیخانە"ی دەشتی ملکیەی دادەنیشت، ٣ مێگەلە مەڕی هەبوو بە شوانکارەی دابوو، هەر مێگەلی ٦٠٠، ٧٠٠، ١٠٠٠ سەر مەڕ دەبوو. شوانکارەکانیش ئەمانە بوون:

حەمەدی شوانی: ئەو پیاوە بەڕەسەن سوورچی بوو کاتی خۆی باوکی لە ناوچەی سورچیایەتی کەوتبووە دەشتی هەولێرێ لە گوندی "باقرتە و کەسنەزان"ی دەشتی ملکیەی دادەنیشت، ببوونە شوانکارەی حوسێنی مەلای، زستانان لە بناری کێوی قەرەچووغی لە گوندی "خۆشاو"ێ لە زستانە هەوارەکانیان دەمانەوە، چونکە گوندی "خۆشاو و سێقوچان" هی حوسێنی مەلای بوو، خۆشاو گوندێکە کەوتۆتە بن چیای قەرەچووغی، لەوەڕ و پووش و پاوانی زۆر بوو، کانیاوێکی سارد و سازگاری هەبوو ناوی "بیرە مشکە" بوو لەبن شاخەکە دەردەبوو، ئاوێکی ساردی هەبوو لەبەری دەڕۆیی، تەنیا ئەو کانیە لەو گوندەدا هەبوو، ئەو گوندە لە ساڵی "١٩٣٩- ١٩٤٠" ٢٠-٢٥ ماڵێک دەبوو، بەڵام پاش ئەوەی کەش و هەوا گۆڕاو بەفر و باران کەم بوو ئاوی ئەو کانییەش کەمی کرد بەشی دێیەکە و مەڕ و ماڵاتی نەدەکردن، هەستان چەند بیرێکیان لێدا بۆ مەڕ و ماڵاتەکەیان. ناوی هەندێ لە گەلییەکانی چیای قەرەچووغی کە کەوتۆتە ئاقاری خۆشاوێ لەوانە: گەلی حاجی مەلای، گەلی کونەبای ئەو گەلییە هەوایەکی ساردی هەبوو، لە بناری چیاکەدا لە ئاقاری ئەو گوندەدا چەند غەرەبەردێک هەیە، کە زستانەهەواری شوانکارەو

مەڕدارەکان بووە، لەوانە: "غەری حەمەدی شوانی، غەری تەهای جەوەی" لە شوانکارەکانی دیکەی "حوسێنی مەلای": (حاجی ڕەحمان و تەهای جەوەی) بوون لە سالآنی سییەکاندا لە زستان و بەهاراندا لە ئاقاری گوندەکانی "خۆشاو و سێقوچان"ی بناری چیای قەرەچووغی بەدیوی دەشتی کەندێناوەدا دەمانەوە، هاوینانیش بەرەو دەشتی مرکییەی دەبوونەوە، دەهاتنەوە گوندی "قازیخانە"ی ناو پەرێزەکانیان، گەلێ جاریش هاوینان شوانکارەکانی حوسێنی مەلای دەچوونە ئاقاری گوندی "کۆڕێ" لە ئاقاری گوندەکانی "هەرماوان- ئارماوان، زرگویز، ئاشگە، پاوانیان دەگرت، چونکە ئەو ناوە پووش و پەراشی زۆر بوو یان لە زەمانی "میرانی قادر بەگ"دا دەچوونە ئاقاری شەقلاوەی پاوانیان دەکرێ.

**مێگەلە مەڕی "حاجی جوکل"ی:** ئەو پیاوە ٢ مالی هەبوو، مالێکیان لە گوندی "قۆڕیتان"ی دەشتی مرکییەی بوو، مالێکیشی لە گوندی "خدرجە"ی دەشتی کەندێناوەی بوو، کە گوندێکە دەکەوێتە بناری چیای قەرەچووغی. "مەولود ئەحمەد" شوانکارەی بوو، زستانان مەڕ و مالاتەکەی لە ئاقاری گوندی "خدرجە"ی دەمایەوە، لەپشت حەسارەکەی لە سەرەوەی گوندی رەشمالیان هەلدەدا، بواران هەلدەکشان بۆ سەرەوەی گوندی لەناو دۆل و گەلییەکانی چیا رەشمالیان هەلدەدا، ئەو ناوە گیاو گۆل و لەوەڕێکی چڕوپڕی هەبوو، لەوێ مەڕ و مالاتەکەیان دەلەوەڕاند، لە گەلییەکانی "حەمشینی، حام رەشی، پووتەی، حەوێزی، گەلی عارەب کوژرا"ی ئەم گەلیانە لە ئاقاری گوندەکانی "خدرجە و لاوەر"ی بوو، گەلەک جاران خەلکی ئەو ناوە لەسەر پاوانەکان بەشەڕ دەهاتن.

**مێگەلە مەڕی کێخوا سێوێ:** ئەو ئافرەتە کچی حاجی عەبدولقادر بوو خەلکی گوندی "سەلماس"ی دەشتی قەراجێ بوو، هیچ برای نەبوو، هەنووکەش لە ژیاندا ماوە و مێردی نەکردووە، مێگەلە مەڕێکی هەبوو نزیکەی ٤٠٠- ٥٠٠ سەر دەبوو، پاوان و پەرێزی لە ئاقاری "قەراتە سۆران" لە کێخوا عەلی دەکرێ لەبن چیای قەرەچوغی، بنەگەی لێدێخست و رەشمالی لێ هەلدەدا، ئەو ئافرەتە لە "عەشیرەتی سنجاوی" بوو، گەلەک جاران رەخت و فیشەکدانی دەبەست و شەوانە تفەنگی هەلدەگرت لە ترسی گورگ و پیاو خراپان نۆبەتی دەگرت، ئەگەر شاش نەبم وابزانم کاک "عەزیزی مەلای رەش"ی ئەدیب و نووسەر ڕۆمانەکەی کە بەناوی "کێخوا سێوێ"یە بەناوی ئەو ئافرەتەی کردووە.

**مێگەلە مەڕی مالی حاجی حەمەدی گەزۆکی:** ئەو پیاوە خەلکی گوندی "گەزۆک"ی دەشتی قەراجێ بوو، مێگەلە مەڕێکی گەورەی هەبوو ٧٠٠-٨٠٠ سەرە مەڕ دەبوو، گەلەک سالان لەگەل بنەمالەی سەفری ئەوانیش مەڕیان هەبوو لە وشکەسالیدا دەچوونە ناوچەی خۆشناوەتی لە گوندەکانی "توتمێ و خەتێ و دۆلی بالیسان"ێ پاوانیان دەکرێ. سالێکیان لەوێ واتە لە ناوچەی خۆشناوەتیدا کچێکی جاحێلیان نەخۆش دەکەوێ، لەوێ دەمری، لەوێوە مەیتەکەیان لەسەر جواری کایێ دانا بە هێستری هێنایانەوە دەشتی قەراجێ لە گوندەکەی خۆیان ناشتیان.

**مێگەلە مەڕی حەمەد چاوشینی** باوکی رۆلەی هەلکەوتووی دەشتی هەولێر "مام وسو حەمەد دزەیی ١٩١٧- ١٩٨٩" ئەو پیاوە خاوەن مەڕ و مالاتێکی یەکجار زۆر بووە زیاتر لە ٧٠٠-٨٠٠ سەر مەڕیان هەبوو لەگەل ولاغی سواری و هێستر و ماینی و بەزۆری زستانەهەواریان لەچیای قەرەچووغی بوو، هاوینانیش دەچۆوە گوندی "برایم باول"ی دەشتی قەراجێ، پاشان چووە گوندی "نەبیاوا"ی ناوچەی سالەیی، کاتی خۆی دەو "چەولکی پردێ" و ئاقاری هەنووکەی گوندی "شێراوە"ی بن پردێ کە "١" کیلۆمەتر لە "پردێ"وە دوورە چۆل بوو ئاوەدان نەبوو، گیاو گۆل و پاوانێکی یەکجار باش و زۆری هەبوو، دوا سنووری دەڤەری دزەییایەتی بوو، تەنیا بواران شوێن و هەواری مەڕدار و شوانکارەکانی بوو، هۆبە و رەشمالیان لەو ناوە هەلدەدا، مەڕ و مالاتیان لێ دەلەوەڕاند "خدری پاشای" ویستی ئەو ناوە ئاوەدان بکاتەوە هەستا لە سالی ١٩٣٥- ١٩٣٦ کابرایەکی بەناوی "سلێمان پۆڕێ بە مەڕداری بە تاقە مالە ناردە وێ پاشان حەمەد چاوشین بە مەڕەوە چووە وێ، ئەو پیاوە لە شارۆچکەی "پردێ" کۆچی دوایی کردووە و لەوێ نێژراوە.

**مێگەلە مەڕی بنەمالەی شێخ جامی و شێخ شێروان "شەروان"،** ئەو بنەمالەیەش مەڕێکی زۆریان هەبوو بە

تایبەتی شێخ عەلی باوکی شێخ جەلالی، خەڵکی گوندی "عەلیاوەی شێخان" بوو، نزیکەی ٧٠٠-٨٠٠ سەر مەڕی هەبوو، باپیرم بۆ ماوەی "٥" ساڵان شوانکارەیان بووە، مەڕی خۆشمانی لەگەڵدا بوو، لەم بارەیەوە دایکم "عازەب کەریم عەبدوڵلا" لەدایکبووی ساڵی ١٩١٧ز هەنووکەش لەژیاندایە و تەمەنی لە "٩٢" ساڵ بە سەرەوەیە بۆی گێڕامەوە گوتی: باپیرت شوانکارەی ماڵی شێعەلی عەلیاوەیی بوو، بواران بە مەڕەوە دەچووینە گوندی "ساقیە"ی دەشتی شەمامکێ، ئەو گوندەش بە موڵک هی ماڵی شێخ جامی بوو، کە پەرێزە جۆ دەبوو، دەگەڕاینەوە گوندی "عەلیاوە"ی.

**مێگەلە مەڕی کێخوا خدری باوکی کێخوا عەدۆی ئازیکەندی:** ئەویش مێگەلە مەڕێکی گەورەی هەبووە لە گوندی "دێمەکار"ی دەشتی کەندێنانەوەی دادەنشیشت زستانان و بەهاران دەچووە چیای قەرەچووغی بە دیوی دەشتی قەراجێ هەواریان لە ئازیکەندی بوو، لەو ناوە دەمانەوە هەتاکو لەوەڕ و گیاو گۆڕ نەدەما ئەوجا دەگەڕانەوە گوندی "دێمەکار"ی پاشان هەر لەوێ مانەوە گوندێکیان ئاوەدان کردەوە و ناونرا "ئازیکەند".

**مێگەلە مەڕی "قادر وەقان"ی:** ئەو پیاوە باپیرە گەورەی "مەجید عەیشێ"یە، مەڕ و ماڵاتێکی زۆری هەبووە لەگەڵ بنەماڵەی "حاجی عەلی"دا، بنەگەو هەواریان لە چیای قەرەچووغ بووە. لە "هۆزی بندیان" بوون.

**مێگەل و مەڕو ماڵاتی بنەماڵەی "عەلی خاسانی قورشاغلو"ی:** ئەو بنەماڵەیە لە دێر زەمانەوە مەڕ و ماڵاتێکی زۆریان هەبووە "مەولودی حاجی ئۆمەر"ی کوڕی نزیکەی "١٠٠٠" سەر مەڕی هەبووە، شوانکارەی تایبەتی خۆیان بووە زستانە هەواریان لە گوندی "دینگاوە"ی دەشتی قەراجێ بووە، ئەوکاتی "دەشتی قەراج" چۆڵ بووە تەنیا "مەخموور" هەبووە وەکو گوندێکی بچووک، ئەگینا گوند لەو دەشتەی قەراجیدا نەبووە زستانە هەوار و بەهارەهەواری عێلانی دەشتی هەولێر بووە، زستانان مەڕ و ماڵاتەکەی ئەو بنەماڵەیە دەهاتەوە گوندەکانیان "سۆربەش، قورشاغلو، میراوە" ئەو گوندانەش بە موڵک هی خۆیان بووە، پاشان ئەو بنەماڵەیە وازیان لە شوانکارەیی هێنا و گوندەکانیشیان لەدەست دا، ئەوجا "سیان"ەکانی گوندی "دۆڵەزە"ی چوونە هەوارەکانی وان، گوندی "دینگاوە"یان لەوێ ئاوەدان کردەوە.

**مێگەلە مەڕی "حاجی سمایل حەسەن"ی ناسراو بە "سمەڕووت":** ئەو پیاوە دوو برا بوون "سمایل و مەولود" خەڵکی گوندی سۆربەشی دەشتی ملکییەی قوشتەپەی بوون، کاتێ خۆی نۆبەتدار و پیاوی "خدری پاشا"ی بوو، لە شەڕی یەکەمی جیهانیدا ١٩١٤- ١٩١٨ کاتێ کە لەشکری روسیای قەیسەری بەرەو باشووری کوردستان هات و شارەکانی "پێنجوێن و خانەقین، ڕەواندزی" داگیر کرد، حکومەتی عوسمانی داوای لە هۆزەکانی کورد کرد، کە بە ناوی غەزاوە بەشداری شەڕ بکەن. ئەوەبوو ژمارەیەکی زۆر لە پیاو ماقوڵان و سەرۆک هۆزەکان بەشدارییان کرد، لە دەڤەرەکەی مە "مام سمەڕووت" لەگەڵ "خدری پاشا و عەدۆی سەلیمی" ناسراو بە "عەوڵلاغای سێبیران و مام عەلی" ناسراو بە "عەلە قاوەچی" لەگەڵ کۆمەڵێک چەکدار بەشداری ئەو شەڕەیان کردبوو، پاشان "سمەڕووت" رووی کردبووە مەڕ و ماڵات بەخێوکردن، ئەوەبوو بووە خاوەن مێگەلە مەڕێکی گەورە لە دەڤەرەکەدا، گەلەک ساڵان کە پەرێز و پاوان کەم دەبوو لە کۆتایی هاوین و سەرەتای پایزان "مام سمەڕووت" بە مێگەلەوە بەرەو ناوچەی خۆشناوەتی هەڵدەکشا بۆ گوندەکانی "کۆلکەڕەش و کامووسەک"ی دۆڵی هیرانێ، ئەوێ دەو رووبار بوو، پووش و پەراش و پاوانی زۆر بوو، خەڵکێکی باشیشی هەبوو، لەگەڵیان یەک ماڵ بوون، خۆشناوەکانیش کە دەهاتنە خوارێ بەرەو دەشتی دزەییان قۆناغیان ئەو ماڵانە بوو. "مام حاجی سمەڕووت" لە ساڵی ١٩٦٤ کۆچی دوایی کردووە، هەنووکەش نەوە و نەوەزاکانی بە مەڕدارییەوە خەریکن.

**مێگەلە مەڕی حاجی سادقی خەزنەی:** ئەو پیاوە ناوی حاجی سادق کوڕی مستەفای کوڕی هەمزەی وسو ئامان"ییە، پیاوێکی هۆشمەند و ماقووڵ و لێوەشاوە و خێرخواز و دەوڵەمەند و دیار بووە لە دەڤەرەکەدا، بە "حاجی سادقی خەزنەی" ناسراوە و ناوبانگی دەرکردووە لە گوندی خەزنەی دەشتی شەمامکێ دادەنیشت کە هی خۆیان بووە و خۆیان ئاوەدانیان کردۆتەوە، ئەو پیاوە بە کشتوکاڵ و مەڕدارییەوە خەریک بووە، مەڕ و ماڵاتێکی یەکجار

زۆری هەبوو، مێگەلە مەڕی حاجی سادقی ٥٠٠- ٧٥٠- ١٠٠٠- ١٥٠٠- ٢٠٠٠ سەر مەڕی دەدا، ڕەسەنایەتی مەڕی حاجی سادقی خەزنەی لە دەشتی هەولێر و باشووری کوردستاندا بەناوبانگ و دیار بووە، هەنووکەش لە دەشتی هەولێر و دەڤەرەکەدا مەڕێکی باش ببینن دەڵێن:

"دەڕێی لە ڕەسەنی مەڕی حاجی سادقی خەزنەیە"

یان "بوویتە مەڕی حاجی سادقی خەزنەی؟!"

یان " خۆ لە ڕەسەنی مەڕی حاجی سادقی خەزنەی نییە؟!"

یان "دەمنی لە ڕەسەنی مەڕی حاجی سادقی خەزنەیە"

بنەماڵە هەولێرییەکانی ناو شاریش ئەوانیش هەندێ لە بنەماڵەکانیان مەڕ و ماڵاتیان هەبوو بە شوانکارەیان دەدا، لەوانە "بنەماڵەی شێخی چۆلی ١٨١٧- ١٨٩١" شێخی چۆلی مەڕیان زۆر بووە مەڕەکانیان بە شوانکارە دابوو لە گوندەکانی "ئاغولان، گاینج" لە دەشتی بەرانەتی بوو، هەروەها لە گوندی "کۆزەپانکە"ی دەشتی کەندێناوە بووە، تەنانەت بیستوومە "ڕەوە حوشتر"ێکیشیان لە "دەشتی قەراج"دا هەبووە.

بنەماڵەی خوالێخۆشبوو "حاجی ڕەشیداغای وەیساغا" ئەوانیش مەڕیان زۆر بووە، مێگەلەکانیان لە گوندەکانی "بنەسلاوە و بن بێرز و تەرجان"ی بووە، ئەو گوندانە موڵکی خۆیان بووە، بنەماڵەی چەلەبییەکانی هەولێری بە تایبەتی ماڵی "ئەحمەدی چەلەبی و هاشم چەلەبی و شەهاب چەلەبی" مێگەلە مەڕێکی زۆریان هەبووە، بە شوانکارەیان دابوو، لەوانە ماڵی "هاشم چەلەبی" سێ مێگەلە مەڕی هەبوو، هەر مێگەلەی لە "١٠٠٠" سەری کەمتر نەبوو، شوانکارەی تایبەتی خۆیان هەبووە، شوانکارەکانیشیان بەزۆری "مەنتک"یان کرمانجەتی خەڵکی دزەییاتی دەشتی هەولێرێ بوون، مەڕیان زستانان و بواران لە ئاقار و هەڵەت و زوورگی "باغەمرە ڕەقە"ی بوو، کە "باغەمرە شەهاب"یشی پێ دەڵێن، ئەو گوندە موڵکی خۆیان بووە، هاوینانیش مەڕیان دەهاتەوە گوندی "مورتکەی گچکە" هی ماڵی "شەهاب چەلەبییە" کاتی خۆی ئەو بەشەیان کڕییە، ئەو گوندە کاتی خۆی لە "پووکە سەرییەکان" کڕایە، "حاجی وەسمانی کامەلا"ی کڕیوەتی پاشان ئەو بەشەی فرۆشتووەتەوە چەلەبییەکان، لە شوانکارەکانیان "ئەحمەد ئۆمەر" بوو، گوندی مورتکەی گچکە ئەو تیرەو هۆزانەی تێدابوو "برایم ئاغایی، نانەکەلی، بندیان" کە کاتی خۆی لە گوندی "دێمەکار"ی ناوچەی کەندێناوەدا کەوتوونەتە ئێرەو بوونەتە سەر کاری ماڵی "شەهاب چەلەبی، داڵداغان"یشیان کڕیوە هەنووکە موڵکی خۆیانە، کاتی خۆی ڕەزو باغێکی لەوێ چاندبوو بە تایبەتی ترێ، ترێی داڵداغان زۆر بەناوبانگ بووە، هاوینان ترێی داڵداغان لە بازاڕی هەولێر دەفرۆشرا.

شوانکارەی هەولێرییان دەگێڕنەوە جارەکیان کابرایەکی هەولێری ٥ سەر بزنی بۆ کابرایەکی کرمانجەتی ئەو دەشتەی کڕیبوو تاکو بۆی بەخێوبکا و ماست و دۆیەکەی بۆ خۆی بی، سەرەکەش بۆ کابرای هەولێری بی، ماوەیەکی بەسەردا دەچی، کابرای هەولێری سەردانی شوانکارەکەی دەکا، کە دەچی تەماشا دەکا هیچ نەماوە، پرسیاری دەربارەی بزنەکانی لێ دەکا، کابراش هەموو بزنەکانی خواردییە، هیچ نەمایە، بۆ ئەوەی قەناعەت بە کابرای هەولێری بێنێ پێیدەڵێ:

**یەک مرد، یەک مردار بوو**

**یەک لە قوڕێ گرفتار بوو**

**کابرای هەولێریش دەرێ:**

**ئەدی بزنی گوردی پۆش؟!**

**کابرا دەرێ:**

**ئەمن و ئەتو خۆش**

**کابرای هەولێری دەرێ:**

**ئەدی بزنی گوردی کار؟!**

**کابرا دەرێ:**

**ڕۆیی بەرەو خوار**

پاشان کابرای کرمانج دەرێ: "دەها ئەو جامە ماستەش مایە لۆ خۆتی ببە" کابرای هەولێریش ناکاتە نامەردی، دەست دەداتە جامە ماستەکەی و لەسەر سەری کابرای رووەدکا، کابراش ماستی بە دەم و بەرۆکی دادێتە خوارێ، دەست بە ڕدێنی دادەینی و دەرێ:

"ئەلحەمدولیللا بەرووسپیاتی دەستمان لێک بەربوو".

یەکێکی دیکە لە بنەماڵەی هەولێرییەکان کە مەڕ و

مـالاتی هەبوو "نادرەفـەندی" بوو، مێگەلە مەڕێکی هەبوو خـۆی لە ۳۰۰-٤۰۰ سـەر دەدا، لە سـیـیـەکـاندا باوکم خوالێخۆشبوو "حاجی تەیراو عەبدوڵلا ۱۸۹۲- ۱۹۷۳" ببـووە شـوانکارەی، نزیکەی ٥-٦ سـالان شـوانکارەی ئەو پیـاوەی بووە، لەم بارەیەوە "مـام حـاجی عـەزیز حـەمـەد" لەدایکبووی گـوندی قـورشاغلوی سـالـی ۱۹۲۱ز گـێڕایەوە گـوتی: "دێتـەوە یادم لە زەمـانی مەلیـک فـەیسـەلـی یەکـەم بوو، تـەمـەنم ۱۲-۱۳ سـالان دەبوو شـوانی مـالـی بـاوکت بووم، شـوانـکارەی "نادرەفـەندی" بوو، مـالـمـان لە گـوندی قـورشاغلوی دەشـتی مرکییەی بوو، چووینە "پایزە بنەگەی" کە کۆتایی هاوین و سەرەتای پایزییە، لە دەشتی زرارەتی پاوانمان لە گـوندی "چرە"ی کـری بوو، بە دەشتی بەڕانەتیـدا رۆیشتین لە "بەستۆرە"ی پەڕینەوە ئەوبەری دەشتی زرارەتی بوو، چووینە "چرە"ی، رەشمـالـمـان لێ هەلدا ئەوکـاتی ئەو گـوندە گـوندەکی بچووکی ۱۰-۱۲ مـالێک دەبوون لەسـەر "زێـی بادینان- زێـی گـەورە" هەلـکەوتووە، زۆر لێـی دوور نییە ئەو گوندە مەڕ و مالاتیان زۆر کەم بوو، تەنیا چێل و بزنیـان هەبوو، ئەو دەمی دەشـتی هەولێـرێ لەچاو ناوچەی بەڕانەتی و دەشــــتی زرارەتی زۆر بە دەرامـــەتتــــر و دەولەمەندتر و پێشکەوتووتر بوو، لەوێ مایـنەوە هەتا ئاخر و ئۆخری پایزێ، "سـەرپەر" بوو بنەگەمان بەجێهێشت، بارو بارخانەمـان تێکناو بە مەڕەوە گەڕاینەوە "زسـتـانەهەوار"ی کە لە بناری چیـای قـەرەچووغی بەدیوی دەشـتی قـەراجێ بوو، لە ئاقـاری گوندی "قـەراتە سـۆرانی مەرزان" بوو، بەو دەشـتـەی هەولێـرێ بە کـۆچ و کـۆچبـاری بەمـەڕ لەوەڕاندن دەڕۆیشـتـینە خـوارێ قـۆناغ بە قـۆنـاغ، لە "زوورگـەزراو"ی ئاوای دەشـتی کـەندێناوە بووینەوە، لە "بیـری مـەحـمـودی سـەنان" کـە دەکـەوێتـە نزیکی دەرکی بازاڕگـەی لەو ناوە مـەڕمـان ئاودەدا، بە "گـەروو بازاڕگـە- دەرکی بازاڕگـە"یدا دەچووین بەرەو دەشـتی قـەراجێ، بە رۆژهەلاتی شـارۆچکەی مـەخـمووری بن چیـاو بن چیـا دەڕۆیشـتین، جـارێکیـان لە کـەرخی گـوندی "ئازیکەند"ی بندیانان رۆژمان لێ ئاوا بوو، "ئەمـن و مـام حـاجی تـەیراو" بووین، گـوتی: با ئـەوشـۆ نەڕۆین لادەینە مـالـی "کـێـخـوا عـەدۆ"ی ئازیکەندی، ئەو کـاتی "ئازیکـەند" دوو مـال بوو، مـالـی "کـێـخـوا عـەدۆ"ی و مـالـی "حـەبیب"ی ئامـۆزای لەوێ بوو، لاماندا مـام کـێـخـوا زۆر زۆر بەخـێـرهاتنی کـردین، وا دیار بوو مـام کـێـخـوا برادەرایەتی و دۆسـتـایەتـیـیـەکی بەتـینی هەبوو لەگـەل بنەمـالـەی مـام حـاجیـدا، شەو لەلای مـاینەوە خزمـەتێکی زۆری کـردین، کـاک حـەبیب هاتە لامـان، ئەمـە وابزانم لە سـالانی "۱۹۳۱- ۱۹۳۲"دا بوو، بەداخـەوە ئەو "حـەبیب" ناوە پاشان گۆتیان لەسەر گوندی "دێمەکار"ی کوژرا، هەزار رەحـمـەتی لێ بێت، بۆ بەیانی چووینەوە هەوارەکـانمان لە ئاقاری گوندی قەراتە سۆران.

## ناوی هەندێک لە شـوانکارە و مـەڕدارانی دەشـتی پشترێ:

مـەڕدارانی دەشـتی پشـترێ دەشـتی هەولێـر بەزۆری دەچوونە "زوورگی زەرگەتەن و زوورگی بیستان و هەرەجە و دێدەوان"ی، ئەو زوورگانە لەوەڕ و پاوانی خۆش بوو بۆ وان نزیکتر بوو لە چیای قەرەچووغ و دەشتی قەراجێ. ئەمەش ناوی مەڕدارەکانە:

١- ئۆمـەر کـاشـێخ: خـەلـکی گـوندی "باغـەمـرە نەرمـە"ی دەشتی پشترێی بوو، مەڕێکی زۆری هەبوو.

٢- حـاجی حـەمـەشـەریف: مێـگەلە مـەڕێکی هەبوو ٦٠٠ مەڕ دەبوو، ٥ شوانی هەبوو.

٣- حـاجی قـادری کـامـەلای گـوندی دارەتووی، ئەویش مێگەلەمەڕی هەبوو.

٤- عـەلی فـاتم و هادی فـاتم برا بوون، خـەلـکی گـوندی "کونە گورگ" بوون، مێگەلە مەڕێکی گەورەیان هەبوو، شوانەکەیان ناوی "قادر ئاودەل" بوو.

٥- مـەدە کـەڕ هەبوو خـەلـکی گـوندی "پارانیـان" بوو، مـێگەلە مـەڕێکی گـەورەی هەبوو، بواران دەچووە "زوورگی زەرگـەتەن"ی، هەنووکەش هەوارێک هەیە لەو زوورگەی بەناوی "هەواری مەدە کەڕ"ی.

٦- حەمەد گۆران هەبوو خەلـکی گوندی "هەمزەکۆر"ی بوو، ٥٠٠ سەر مەڕی هەبوو.

٧- کێخوا عـەلی قادر، خەلـکی گوندی "گـەرەشێخان"ی بوو، مێگەلە مەڕێکی هەبوو خۆی ٥٠٠-٦٠٠ سـەری دەدا.

٨- ئۆمەر پەرچەم خەلـکی گوندی "هەمزەکۆر" بوو، مێگەلە

مەڕی هەبوو.
٩- حاجی قادری پارانی مێگەلە مەڕێکی گەورەی هەبوو ٧٥٠-٨٠٠ سەر دەبوو.
١٠- عەزیز خوچێ مێگەلە مەڕێکی گەورەی هەبوو، بواران دەچووە زوورگی بیستانەی.

لە دەشتی هەولێر پەندێک هەیە دەڵێن:
(ئەگەر ناچیە "کێلێ و کیستانان"، هەروە "هەرەجە و بیستانان)

مەبەست لێردا ئەوەیە دەڵێن: مەڕدار و شوانکارەکانی دەشتی هەولێرێ ئێوە ئەگەر ناچنە "کێلەشێن" و کوێستانەکان و زۆزانانی کوردستان، ئەوا بڕۆنە زوورگەکانی "هەرەجە" و هۆردوو "بیستانان"، چونکە دوو گوند بەناوی بیستانەی هەیە: "بیستانەی گەورە، بیستانەی گچکە"، ئاقاریان لەسەر یەکە، زوورگی بیستانە و هەرەجەی، زوورگێکی خۆشە، پاوانێکی باشی هەیە، زۆر لە بارە بۆ مەڕداری. بڵندترین لووتکەی زوورگەکە "سەری گیرەی رەش"ە.

وەختی خۆی شوانکارە و مەڕدارانی "دەشتی مرکییە و دەشتی شەمامک و دەشتی کەندێناوە"ی لە سەرەتای بواراندا بە مەڕ و مالاتەوە کۆچ و کۆچباریان لێدەنا بەرەو "دەشتی قەراج"ێ دەکەوتنە رێ، ئەوجا دوو رێ هەبوو بۆ دەشتی قەراجێ:

رێگای یەکەم رێی بازاڕگەی بوو لە رۆژاوادا بە بەینی هەردوو گوندان "کەندار و گاوەرە"ی بە "بیری مەحمودی سەنان" تێدەپەڕین و لە چیای قەرەچووغی لە "دەرکی بازاڕگە"ی ئاوای ئەودیو دەبوون بە "کەرخی حوسێنی غازی" و بن چیاو بن چیا لەسەر جۆگەی مەخمووری "ئاوی بن بەردی" مێگەلەکانیان ئاودەدا ئەوجا بەرەو دەشتە رەنگینەکەی پیرە قەراجێ دەڕۆیشتن، لەو دەشتەدا هەواریان دەگرت و رەشماڵیان لێ هەڵدەدا هەتا "یێکاوێ" دەڕۆیشتن، کە کۆتایی دەشتی قەراجییە، لەو دەشتەشدا هەتا درەنگی ساڵێ گۆماو هەر دەمینێ، چونکە دەشتی قەراجێ گۆماوی زۆرە.

رێگای دووەم: رێی دارە بزماران بوو لە رۆژهەڵاتدا، کلکەی چیای قەرەچووغی لە رووی رۆژهەڵاتییەوە کە کۆتایی دێت بەرە بەرە نزم دەبێتەوە، لەوێ پێی دەڵێن "کلکەی چیای برباسان" یان کلکەی "دارە بزماران" هەر لەوێ ئاودیو بێن دەشتە رەنگینەکەی پیرە قەراجە، لەوێوە ئەگەر تەماشا بکەین هەتا چاو حوکم دەکات ئەو دەشتە دیارە، تەنانەت دوا سنووری کوردستان کە زنجیرە چیاکانی "حەمرین" و "مەکحوول"ن بەدیار دەکەون و لە دوورەوە دیارن، لەو بنار و زوورگ و گرد و تەپۆڵکانە شوانکارە و هەوار نشینەکان هەواریان دەگرت و لەو شوێنەدا ماوەیەک دەمانەوە، جێگایەکی دڵگیر و خۆشە، بۆیە حەیرانبێژانی دەڤەرەکە و شاعیرانی میللی و تەنانەت شاعیرانی دیکەش وەسفی "دارە بزمارە" و دەشتە رەنگینەکەی پیرە قەراجی دەکەن، کە خەناوکەی ئەڵماسی ملی کچە شۆخ و شەنگەکانی دەڤەری دزەییاتین، ئا ئەوەتە شاعیری نیشتمانپەروەری کورد خوالێخۆشبوو "شێخ لەتیفی شێخ سادق ١٩٣٧-٢٠٠٠" پێشمەرگەی ماندوونەناس و دێوانەی ئەو چیایە دەڵێ:

**دارە بزمارە**

**پرسیم لە شوانێ دارە بزمارە**
**هەر رێگەی کۆچە و بۆ خێڵ هەوارە**
**رەشماڵ نیشەکان هۆبەی شوانکارە**
**بەهاران دێنە دەوری ئەم دارە؟!**

شوانکارە و مەڕدارانی دەشتی هەولێر کوێستان و گەرمێنیان نەدەکرد، لە دەڤەرەکەی خۆیان دەمانەوە، چونکە دەڤەرەکە فراوانە و کەند و لەند و دۆڵ و نشێو و بان و زوورگ و هەڵەت و هەڵدێر و دەشتی راستانی زۆرە، تاقە چیایەکیشی هەیە ئەویش قەرەچووغە، گیاو گۆڵی زۆرە پاوانی لەباری هەیە بۆ مەڕو مالات، بۆیە خەڵکەکە لە ناوچەکەی خۆیان دەمانەوە، بەڵام لەکاتی وشکە ساڵی و بێ بارانیدا شوانکارە و مەڕدارەکان مێگەلەکانیان بەرەو باکووری هەولێر دەبرد، بە تایبەتی بۆ دەشتی بەرانەتی و دەشتی زرارەتی و هەندێ جاریش بەرەو دەشتی کۆیە و دۆڵی سماقولی بەرێگای "کەسنەزان، هەورازە نەفتە، بەردەباز، دەربەندی گۆمەسپان، سووسێ" لە دۆڵی سماقولی لەوناوە پاوانیان دەکری لە "سێنان و ئاوەگرد"ی، یان دەچوونە دۆڵی بالیسان و توێمێ و خەتێ، یا ئەوەتە بۆ

دۆڵی هیرانێ لە گوندەکانی "کامووسەک و کۆلکەڕەش و فریز"ی دەمانەوە، گەلەک جاریش بەرەو دەشتی بیتوێنێ بەرێدەکەوتن.

ئەوکاتی دەشتی بیتوێن دەشتێکی گەورە و فراوان بوو کانی و کانیاو و ڕووباری زۆر بوو، لەوەڕ و پاوانی زۆر بوو، ئەو پرۆژەیەش نەکرابوو هەر باسیشی لە ئارادا نەبوو، ئەویش "بەنداوی دوکان"ە، کە ژمارەیەکی یەکجار زۆری لە گوندەکانی دەشتەکەی فەوتان و کەوتنە ژێر ئاوەوە بە "ناحیەی میرزا ڕۆستەم"ەوە، لەو بەیتە فۆلکلۆرییەدا وا هاتووە:

ئەوا هاتەخوار ئاو لە بیتوێنێ
دەشتەکی خۆشە دزەیی دێنێ

**بەزۆری ئەو جۆرە مەڕانە لە دەشتی هەولێرێ بەخێو دەکران:**

١- قوولە، ڕەنگی سەروچاو و گوێی سوور بوو، "قولەمس"یش هەبوو.
٢- ڕەسەر.
٣- کەویسار: سەروچاو و گوێی سپی بوو.
٤- تە، تەی، تەو، ڕەنگی سەروچاویان شین بوو.
٥- سەرڕەش
٦- مەڕی گەرعەی چاوسوور، وەکی مەڕی عەرەبی بوو، بەڵام لەوان گەورەتر و بەشیرتر و تووکنتر بوو، پەندێک لەو دەشتەدا هەیە ئەگەر یەکێک جوان بێت، دەڕێن: "دەرێی مەڕی گەرعەیە"، یان "دەمنی مەڕی گەرعەیە".
٧- مەڕە کەڕە، گوێچکەی گچکە بوو، هەر ئەوە گوێی هەبوو.
٨- سەر بە بۆرت "چاو بەگاز".
٩- مەڕی حەمدانی ئەو جۆرە مەڕانە گوێیان گەورەو پان و درێژ بوو، کە دەلەوەڕین گوێیان لە عەردی دەخشا، بە زۆری لە ناوچەی "حەمدانیە"ی پارێزگای موسڵ بەخێو دەکرا، بۆیە ئەو ناوەیان لێنابوو، وشەی "حەمدانی" لە "حەمدانیە"وە هاتووە.
١٠- عارەبی.
١١- کۆلانی.

**ئەو جۆرە بزنانەی کە لە دەشتی هەولێرێکەدا بەخێودەکران ئەمانە بوون:**

١- کۆریس: بەو جۆرە بزنانە دەگوترا کە بێ قۆچ واتە بێ شاخ بوون.
٢- قەش: ئەو جۆرەیان نێوچەوانیان سپی بوو، بوویتە پەند لە دەڤەرەکەماندا دەڵێن: "دەرێی بزنی قەشە!" یان "دەمنی بزنی قەشە".
٣- پۆش یان "بەلەپۆش"، دێتەوە یادم کە منداڵ بووم مەردار بووین، دەیانگۆت بزنە پۆشەکە نەدۆشرایە بیهێن بیدۆشن.
٤- مس، ئەو جۆرە بزنانە سەروچاویان سوور بوو.
٥- بەلە "بەلەڕەش".
٦- دوڕە.
٧- غەڕ
٨- گوردی کار.
٩- قوولە ڕەنگیان سوور یا سوری تاریک بوو.
١٠- گوردی پۆش.
١١- بەلە کار: ئەوجۆرە بزنانە گوێیان "پێچ" بوو، واتە گوێیان پان ەبوو، شیریان زۆر بوو، بۆیە لە فۆلکلۆری دەشتی هەولێردا هاتووە و دەڵێن:

بزنێ بەلەکار "بەعیرە"
تێیدایە نۆ مەنجەر شیرە
چار ماستە و پێنجی پەنیرە

١٢- عارەبی: ئەو جۆرە بزنانە گوێیان گەورە و درێژ بوو، لە کاتی لەوەڕاندنیان گوێیان لە عەردی دەخشا، یا لەکاتی ئاو خواردنەوەدا نیوەی گوێیان دەکەوتە ناو کۆلی ئاوێ.

جگە لە عێلاتی دزەییاتی دەشتی هەولێر ژمارەیەکی دیکە لە هۆز و عەشیرەتەکانی دیکەی کوردستان لە دەڤەرەکانی دیکە دەهاتنە ئەو دەڤەرە بە کۆچەری و مەڕ لەوەڕاندن، چونکە ئەو دەڤەرە دەڤەرێکی گەورە و بەرفراوان بوو، پاوان و گژوگیای زۆر بوو، لەو هۆز و عەشیرەتانەش وەکو "بلباس، مەنتک، هەرکی، سورچی، خەیلانی،

گەردی، ئێزیدی" بەداخەوە گەلەک جاران لەسەر پاوان و ئاو و هەوار گرتن دەبووە شەڕیان و زەلامیان لێکدی دەکوشت و کارەساتی گەورە رووی دەدا، هەروەکو ئەو شەڕەی لەنێوان "بلباس و عێلاتی دزەییاتی" رووی دا، ئا ئەوەتە لەنێوان "گەردی و برباسان" رووی دا، لەنێوان "گەردی و عێلاتی دزەییاتی"، ئەو شەڕەی لەنێوان برا یەزیدییەکان و کانەبی فەقێ وەیس برباس رووی دا، پاشان شەڕی نێوان "مەنتک و فەقێ مەرکی"یەکان و کوشتنی "سمایلاغای مەنتک" و پاشان شەڕەکە گەورەبوو "سیان و مامەسێنی"یشی گرتەوە، فەقێ مەرکییەکان ناچاربوون گوندەکانی "شەحل، سێقوچان، خۆشاو، قەپران" لە دەشتی کەندێناوە و گوندی "قازیخانە"ی دەشتی مرکیە بەجێ بێڵن و ئەو ناوە چۆڵ بکەن بەرەو دەشتی شەمامکێ رەو بکەن لە لێواری زێی گەورەدا بگیرسێنەوە، لەوێ لە گوندەکانی "کوشاف، گوێر، گامێش تەپە" ئاکنجی بێن، مەنتکەکانیش پاش ئەو رووداوە جارێکی دیکە نەهاتنەوە ئەو دەڤەرە، بەداخەوە خەڵکێکی زۆر کوژراو تێچوو، زۆریش زەرەرمەند بوون، "حاجی مستەفا"ی گەورە و ریش سپی فەقێ مەرکییەکانیش کوژرا. ئەو گوندانەشیان بە پارەیەکی کەم فرۆشتە بنەماڵەی بایزی، "مامەندی مەلای، قازیخانە"ی کێخوا رەزای برای حاجی مستەفای کڕی و لە "چەمەدوبز"ی هاتە وێ مامەندی مەلای لە ساڵی ١٩٢٥ کۆچی دوایی کردووە، لە پاشانیش حوسێنی مەلای لەوێ دادەنیشت، قورشیدی بایزیش چووە "قەپران"ی سێقوچان و خۆشاویش بووە هی ماڵی حوسێنی مەلای.

مێگەلە مەڕ و مەڕوماڵاتی "مەحمودی سەنان" ئەو پیاوە بەڕەسەن خەڵکی گوندی "هەرەشێ"ی دەشتی هەریرێ بووە، لە بنەماڵەیەکی سورچییە لە تیرەی "ماراباس" یان هەندێ جار "مەلا عەباس"یان پێدەڵێن، کە یەکێکە لە چوار تیرە سەرەکی و بەناوبانگەکەی هۆزی سورچی تیرەکانی سورچی بەری سۆران، واتە ناوچەی سۆران ئەمانە:

١- ماراباس "مەلا عەباس"
٢- یوسف کاسکی "وسوو کاسکی"
٣- مام سار "مام ساڵ"
٤- مام سام

ئەم مرۆیە پیاوێکی ئازاو چاونەترس بووە، کۆچەری بوو، مەڕ و ماڵاتێکی یەکجار زۆری هەبووە، لەگەڵ بنەماڵەکەیدا بە مەڕوماڵاتەوە کوێستان و گەرمێنیان دەکرد، لە کۆتایی بەهارێ بەرەو کوێستانەکانی کوردستان هەڵدەکشان، لە کۆتایی پایزیشدا بەرەو گەرمێن دەبوونەوە، بە مەڕداری و کۆچەری کەوتۆتە دەڤەری دزەییاتی دەشتی هەولێرێ، زستانە هەواریان لە دەشتی کەندێناوەی بناری چیای قەرەچووغی بووە، "مەحموودی سەنان" کە لەو ناوە بووە هەستاوە بیرێکی لێداوە، ئەو بیرە دەکەوێتە نێوان گوندی "گاوەرە و کەندار"ی، لە بناری چیای قەرەچووغە، بەدیوی دەشتی کەندێناوەی دایە، لە دەرکی بازارگەی نێزیکە، بیرێکی کۆنە، نزیکەی بەژنێک قوولە، مێژووەکەی دیار نییە، ئێمە نازانین لە چ ساڵێک ئەو بیرە لێدراوە، بەلام ئەوەندە هەیە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ چەند سەد ساڵێک، لە زەمانی خۆی کابرایەکی مەڕدار و کۆچەر بەناوی "مەحمودی سەنان" ئەو بیرەی لێداوە بۆیە بەناوی ئەو کراوە و ناسراوە، لە حەفتاکاندا کاتێ کە شەقامەڕێی هەولێر- مەخموور دەست پێکرا، ئەو بیرە کەوتە بەر ڕێگاکەوە، ناچار مان پردێکی لەسەر دروست بکەن، هەنووکە ئەو بیرە کەوتۆتە بن پردەکەوە، ئاوی هەر هەیە، ئاوێکی شیرین و سازگارە. پیرە بەساڵاچووەکانی دەڤەرەکە دەڵێن ئەو پیاوە لە چیای قەرەچووغیدا گورگ خواردوویەتی، خزمەکانی هێسک و پروسکەکەی دەبیننەوە و دەیهێننەوە لە گردی پیرداودی دەینێژن، چونکە ئەو دەمی هەندێ لە خزمەکانی لە گوندی "پیرداود و مزەحمەد" دادەنیشتن، هەنووکەشی لەگەڵدابێت خزم و کەس و نەوە و نەوەزاکانی ئەو پیاوە ماون و لە گوندی "مزەحمەد"ی سەر بە ناحیەی قوشتەپەی پارێزگای هەولێر نیشتەجێنە، هەنووکە ئەو شوێنەوارانە بوونەتە کەلەپوورێکی بەنرخ و بە بەهاو تێکەڵ بە فۆلکلۆر و کەلەپووری نەتەوەکەمان بوونە و بوویتە مێژوو، لە بەیت و بەند و حەیراندا رەنگی داوەتەوە، لە فۆلکلۆری دەشتی هەولێردا واهاتووە:

**بیرێ مەحمودی سەنان، لەسەر ڕێی کۆچانە**
**کیژێ سەر گەران هاتن، بەعام کوڕیان لێدانە**

# لانک

## کازم عومەردەباغ



هیچ کەسێک نییە لەکۆمەڵگای ئێمەی کوردەواریدا ماوەیەک لەناو"لانک"واتا"بێشکە رانەژێنرابێت و پەروەردە نەبووبێت. لانک بووە بە شوێنی حەوانەوەو حەسانەوەی هەموو منداڵێک.

کۆرپەی کورد چەند رۆژێک دوای لەدایکبوونی دەبێت لانکی بۆ ئامادە بکرێت. ئەوجا ئەم منداڵە کۆرپە ساوایەی لەناو درێژ دەکەن و بە دەسترازە خورییە رەنگاو رەنگەکەش توند دەست و قاچەکانی دەبەستنەوە بۆئەوەی لەناو لانکەکە نەکەوێتە خوارەوە. لەسەر سەری منداڵەکەش ملوانکەیەک مووری رەنگاو رەنگ و مازییەشین و زەنگورەک بە لانکەکەوە شۆڕ دەکەنەوە.

ئەوەی لێرەدا جێگەی باسکردنە ئەو لانکەیە کە تەمەنی شەست و یەک ساڵەو تائێستا سێ بەرە دایک و منداڵی براو خوشکەکانم و منداڵی کچە خوشکەکانیشم لەم بێشکەیەدا راژێنراون. ئەم لانکە ئەندامی مەکتەبی سیاسی و پرۆفیسۆرو دکتۆرو مامۆستای تێدا پەروەردەکراوەو هەروەک خۆیەتی و ئەم ملوانکە مووری و مازییە شین و زەنگورەیەی کە جوولەکەکانی کۆیە پێوەیان کردووە هەروەک خۆیەتی. لانک شتێکی فۆلکلۆری زۆر بەنرخە لەرووی تەندروستییەوە زۆر گونجاوە بۆ پەروەردەکردنی منداڵ. ئەم لانکە مێژوویەکی بێدەنگە ئاگاداری هەموو خۆشی و ناخۆشییەکی ژیانمە، تاکە کەلوپەلی منداڵیم کە لەلام خۆشەویست بێت ئەم لانکەیە. کە بوەتە جێی ئۆقرەییم.

بەڵام بەداخەوە ئەمڕۆ کارەکان بەپێچەوانەی ئارەزووەکانمان هەنگاو دەنێن. چاوم کزبووەو عەینەک لەچاوم و لەشم لەرزۆکە، توانای رێکردنم نەماوە، کە هەڵدەستم خۆم بەدیوار دەگرم، ددانەکانیشم یەک لەدوای یەک دەکەون و گوێگرانم. سەرو سمێڵم مووی رەشی تێدا نەماوە ماش و برنجە. لۆچ پری سەر رووم بووە. کاتێ سەیری ئاوێنە دەکەم زۆر دڵگرانم کە سەروسیمای خۆم بەم شێوەیە دەبینم. بۆیە ناچار هەناسەی سارد هەڵدەکێشم. دەڵێم لەدەست چوو بەخوا قەت نایەتەوە. هەربۆیە کۆتایی باسەکەم بەم دێرە هۆنراوەی مامۆستا هەردی دێنم کە بۆتە ویردی سەر زمانم:

**بە سەرسامی لەسەر لوتکەی بڵندی گەنجی وەستاوم**
**شریتی عومری رابردوو وەکو خەو دێتە بەرچاوم**



# ژنە دەستگێڕەکانی هەولێر

**شوان غەمبار**

ئەگەر پیاوان ئەرکێکیان لە سەر شان بووبێ ئەوا (ژنان)ەیان ئەرکی زۆر گرانتریان لەسەر شان بووە، ئافرەت هەمیشە بووە بە(قوربانی) ڕەنجی زیاتری داوەو ژیانی خۆی وەک مۆم تاواندۆتەوە...لە پێناوی دوا ڕۆژی منداڵەکانی و مێردەکەی خۆی بەخت کردووە ئەگەر شۆڕش و خەباتیش بووبێ ئەوا لە پێشەوەی پێشەوە بووە لە پیاوان زیاتر عارەقی ڕشتووە ڕەنجی داوە ماندووبوونی کێشاوە خۆ ئەگەر بێوەژن کەوتبێ مێردەکەی قەزاو قەدەر یان بە هەر هۆیەک مردبێ ئەوا جێگای مێردەکەی گرتۆتەوە گەنجی و جوانی خۆی لە ژێر پێی خۆی ناوەو لێ نەگەڕاوە بێ ناز بکەون و بێ باوکییان پێوە دیار بێت بە دیاریانەوە دانیشتووە بە سەد هەژاری و دەردەسەری و کوێرەوەری و نان پێوەری و خزمەتچییەتی توانیویەتی سەربەرزانە منداڵەکانی پێبگەینێ ڕەنگە ئەگەر پێدابچین بە کتێبێک و دوو دەیان تەواو نەبێ.

جا لێرەدا باسی هەندێ لەو ئافرەتە کۆڵنەدەرانە دەکەین کە (ژنانە) قۆڵی مەردایەتییان لێ هەڵماڵیوە بە سەبەتە و بەرانپیل و شتومەکیان بەکۆڵی خۆیان داداوە کۆڵان بەکۆڵان دێهات بە دێهات گەڕاون سەربەرزانەو ڕوو سوورانە ژیاون متمانەیان کردۆتە سەر تواناو هەبوونی خۆیان پارێزگارییان لە ناو و ئابرووی خۆیان کردووە بە جۆرێکی وا پەنجەیان بۆ ڕاکێشراوە ئافەرینیان لێ کراوە، ڕێزیان لێ گیراوە.

### هەمین چاو ڕەش

ئافرەتێکی شۆخی سوورو سپی بوو سەرو تاسی خۆشناوەتی لەسەر دەکرد جلی کوردی کوودەری دەپۆشی...هەمیشە بسکی لە خەنە دەنا لوولی دەدا ، گوارەی سێگۆی لە گوێ دەکرد... بسکۆکەو کرمۆکەی بە خۆوە دەکرد هەمیشە بازنی لە دەستی دابوو هەمیشە چاوەکانی پڕ کل بوو

(ژنێکی) چاو کــراوەو زیرەک بوو گران و سەنگینی روو خۆش و مامەڵە خــۆش. بەیانیـــــان زوو دەچووە (گومرگ) میوەی دەهێنا کۆڵان کۆڵان دەگـەڕا بە زەخـیـرەی زسـتـانێی دەگۆڕییەوە برووش، نیـسک، گەنم کوتا، ساوار سەرێک بە دووسەر دوو دەس دانەویڵـەی دەکـێـشـا. ئەو جارێک مێوە زەخیـرەی یەک ساڵی دابین دەکرد جا وەنەبێ بێوەژن بێ یان دەست کورت و هەژاربێ، خاوەن مێرد بوو وەزعیشیان خراپ نەبوو، بەڵام هەر حەزی لە کارکردن بوو.

**پلکە زولێ**

پلکە زولێ ژنی (سەیدە لارەی) بوو ئەویش مـیـوەی بە زەخـیـرە دەگۆڕییەوە هەمیشە بەرامپیلی پڕبوو زۆر قـــورس بوو تەرازووی داری پێبوو.

**(پلکە خەجیج)**

پلکە خـەجـیـج (پایزان) گـێـوژو مێوژی دەفرۆشت خاوەن ماڵ و مێرد بوو بە کۆلاناندا دەگەڕا هاواری دەکرد (های گـێـوژ های گـێـوژ) کڕیارێکی یەگجار زۆری هەبوو چونکە مامەڵەی لەگەڵ خەڵکی خۆش بوو (ژنێکی) بە ڕێزی مـەردانە بوو دڵ پڕ بەزەیی بوو زۆر دیندار بوو جــــاروبار دڵی منداڵانی خۆش دەکرد بانگی دەکردن مسـتـە مـێـوژ و گـێـوژی بە خـۆڕایی دەدانێ یارمەتی هەژارانی دەدا.

**پلکە ماسێ**

خێزانی مـام فـەتاحە کـە دەکـاتە داپیـری (مـەلا نەوزاد) ئافـرەتێکی بەناوبانگی هەولێرە. ڕەمەزانان لەپاڵ مـێـردەکـەی بە کـرێ بۆ حکومـەت (تۆپیـــان) دەتەقـاند تۆپی (پلکە مــاسێ) چۆتە ناو پەندو ئیـدیۆمی کـوردییـەوە. ئەم ئافـرەتە ڕووسـوورە هەمیـشـە یارمەتی مێردەکەی دەدا. هاوینان ماستاوی ساردی دەفرۆشت. زسـتـانیش ڕەژوو‌داری دەفـرۆشت، ئافرەتێکی پیاوانەی شۆخ و شـەنگ بوو...بەڵام تۆزێـک دەم و چاوی بـە خـــوریکە بوو. چاپووک و چوست و ئازا بوو هەمـیـشـە کـەلانگوچکی لە سـەر شـانی دابوو قـۆڵ و باسکی هەڵماڵیبوو کاری قورسی پیاوانەی دەکرد.

ڕەمەزانانیش لەگەڵ مێـردەکـەی هەر خـۆی (تۆپی) ئاگـــردەدا دەی هاویشت خەڵکی هەولێر متمانەیان بە تۆپەکـەی دەکـرد بە تۆپی ئەو بە ڕۆژی دەبوون و ڕۆژییان دەشکاند ئەم (ژنە) بە جەرگە ناوی خۆی (مەیاس) بوو هەندە بەناوبانگ بوو. تەنانەت مێردەکەشی بە ناوی ئەو دەناسرا پێی دەگوترا (فەتاحی پلکەماسێ)

**پلکە سوڵتان**

وەک خــەون بە بیـــرم دێ لە حەفتاکان لە بەستە پیازە ژنێکی روح سووکی قسە خۆشی سوحبەتچی... ئێـواران تۆڵەیەکی سپی بە پشـتی خـۆی دادەدا (سـەمـونی ئیـعـاشـەی) دەفـرۆشت. گـاڵـتـەی لەگـەڵ گـەورەو بچووک دەکـرد مـێـردەکـەی (عـومـەر خەمۆکـیان) پێ دەگۆت جا لە ترسی ئەوەی نەوەکو سەمـوونەکە بێنێتـەوە کەس نەیکڕی ناچار ئێواران خۆی ئەو کـارەی دەکـرد. هاواری دەکـرد یەڵڵا سـەمـوون ئەوی نەکـڕی داکی مـەیمون خەڵکی لە بەر قـسـە خـۆشـەکـانی سەموونیان لێ دەکڕی...

**دواقسە**

داخی گرانم تا ئێستا ئەم باسانە بە تاریکی مــاونەتەوە شــتـێکی ئەوتۆیان لە سەر نەنووسراوە شایانی باسکردن بێت، من شاری هەولێرم بە نموونە هێنایەوە. ڕەنگە لە شــارو شـارۆچکەکـانی کـوردسـتـان سـەدان ئافـرەت و ژنی لەم جـۆرەیان هەبووبێ بە داخــــەوە چوونە خــــانەی لەبیـرچوونەوە. کە دەبوایە تا ئێـستـا دەیان کـتـێـب و نامـیـلکەیان لە بارەیەوە بنوسرێ.

سڵاو لە ئافرەتانی کورد. لەو ژنە مەردانەی بوونە قوربانی ئەم خاک و نەتەوەیە. سـلاو لـە وانەی بە کـردەوە سەلماندیان کـە هیـچیـان لە پیـاوان کەمتر نییە ئەگەر زیاتر نەبێ.

سـەرچاوەکان:

١- بیـــرەوەرییــەکـــانی خـــۆم (دەسنووس)

٢- دایکی بەڕێزم حاجی عەیشێ حەمەد خۆرانی

٣- پووری خـوالێ خـۆشـبـووم حاجی فاتم حەمەد

٤- خاڵی بەڕێزم اسعد حـەمـەد خۆرانی

٥- باوکی خوالێ خۆشبووم: خدر قادر گراوی

* لە هەفـتـەنامـەی بەدرخـان بڵاوکراوەتەوە



# گوێنی و بەرهەمەکانی لە کوێستانەکانی هەولێر

نادر ڕوستی

کوردستان دەیان جۆر بەرهەمی سروشتی لەسەر خاکەکەیدا هەیە (کانزاکان، درەختەکان، گژو گیاکان)، کە دەکرێ لە ڕێگای ئامێر و کەرستە و تەکنەلۆژیای نوێ لە ڕێگای بە پیشەسازی کردن، ماددەکان بگۆڕدرێن و چەندان جۆر سوودیان بۆ مرۆڤ و مرۆڤایەتی لێ وەربگیرێ. کورد توانیویەتی بە بێ بە پیشەسازی کردن سوود لە زۆرێک لەو ماددە خاوانەی سەر ولاتەکەی وەربگرێ و لە ڕێگای بیری میللی بە شێوەیەکی سادە، کانزاکان، درەختەکان و گژو گیا، بۆ سوودی خۆی بەکار بێنێ، بۆ نموونە: هەریەک لە کانییە کانزاییەکان بۆ جۆرێک لە نەخۆشی بەکارهاتوون. درەختەکان جگە لەوەی بۆ خواردن بەکار هاتوون، سوودی لەبەری زۆرێکیان بۆ دەرمانی میللی یاخود کارێک، یان بەشێوازێک بۆ خواردنی زستان وەرگیراوە، گژو گیا کوێستانییەکانیش بە هەمان جۆر.

دەکرێ لێرەدا بپرسین ئایا تا چەند لە ڕۆژگاری زانست و تەکنەلۆژیادا پسپۆر و شارەزاکانی خۆمان و بگرە لە ڕێگای پەیوەندی بە پسپۆرانی بیانیش دەتوانین سوود لە خاک و بەرهەمی خاکی کوردستان وەربگرین و چیتر ئەم خەزێنە سروشتییە بە هەدەر نەدرێ؟ ئایا دوای سەربەخۆیی کوردستان و ئیدارەی کوردستان بە دەستی کورد خۆی و پەیوەندی کورد بە هەموو جیهان و والآ بوونی دەرگا داخراوەکانی سەر کوردستان و بوونی دەیان بیانی و کۆمپانیای جیهان لە کوردستان، کاتی ئەوە نەهاتووە بە ڕێگای زانستی سوود لەو ماددە خاوانەی سەر خاکی کوردستان وەربگرین؟

لێرەدا بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە و پشتڕاستکردنی ئەو چەند دێڕەی سەرەوە، تەنیا یەک درەختی بچووک کە ناسراوە بە (گوێنی = جوینی) و لە کوێستانەکاندا هەیە باس دەکەین.

### شێوە و شوێنی گوێنی

گوێنی درەختێکی بچووکە ١٠ تا ٦٠سم بەرز دەبێتەوە، پانی و درێژی لە نێوان ٢٠ تا ١٠٠سم دەبێ، قەبارە و بەرزی جۆراوجۆری هەیە، لە شێوەی رەشماڵ و کوارگ بەرز دەبێتەوە و هەڵدەکەوێت. بن و قەد و لقەکانی لە شێوەی دارێکی ئەسفەنجاوی و نیمچە رەقدایە، گەڵاکانی ورد و بچووکن لەنا و گەڵاکانی گوڵی بچووک و شیلاوی دەردەچن، لەگەڵ ئەمەشدا درکی تیژ لە شێوەی دەرزی و دەمبووز بە دەوری گەڵاکانی دەردەچن. بە شێوەی گشتی گوێن شێوەی دەوەن یاخود تەراشی بچووک وەردەگرێ.

گوێنی لە کوێستان و ناوچە سارد و بەرزەکان دەڕوێت. لەگەڵ هاتنی بەهار لەسەر بنجی خۆی یاخود لە شوێنی نوێ دەردەکەوێتەوە.

### سوودەکانی دەوەنی گوێنی

١- **جەوی:** جەوی ماددەیەکی سپی ئاویی رەقە، لە شێوەی سروشتی. لە مانگەکانی ٧ و ٨ لە قەدی دەردەچێ، خەڵکی لادێ بە مەبەستی فرۆشتن دەچوون بۆ کۆکردنەوە، چونکە بۆ بازاڕەکان دەبردرا و سوودی لێ وەردەگیرا (ئەمە زیاتر پێویستی بە لێکۆڵینەوە هەیە، چونکە نەمزانی لە بازاڕ و کارگەکان چ جۆرە سوودێکیان لێ وەردەگرت).

٢- **جەوی بۆ سپیکاری:** دانیشتووانی گوندی روست، توانیویانە جەوی لەگەڵ خۆڵی سپی تێکەڵا بکەن سپیکاری خانووی پێ بکەن، ئەمەش بۆ ئەوە بوو سپیکاری خانوو تۆز و رەنگ نەداتەوە بۆ جل و بەرگەکان، لە هەمان کات بە هێز بوونی سپیکارییەکەش بێت.

٣- **گەزگولە:** خواردنێکی شیرینە، لە گوڵی گوێنی بەرهەم دێت، دوای پێگەیشتنی گوڵە بچووکەکەی دەچووین لەبن دەوەنی گوێنی پارچێک قوماش یاخود لایلۆن (نایلۆن)مان رادەخست، ئینجا بە دارێک لە دەوەنی گوێنمان دەدا، بەم شێوە گوڵەکانی گوێنی دەکەوتنە خوارەوە و کۆمان دەکردنەوە، ئەنجا بە بێژینگ پەلک و شینەکەمان لە یەک جیا دەکردەوە و ئامادەمان دەکرد بۆ خواردن، تامێکی شیرین و خۆشی هەیە.

٤- **کەتیرە:** لە مانگی ٦ و ٧ خەڵک بۆ کەتیرە کردن دەچێت، لە ژێرەوەی هەر بنجە (دەوەنێ) گوێنییەک قورتانێک (چاڵێک) بە قەوارەی قاپێک دروست دەکەن و پاکی دەکەنەوە، ئەنجا لە ژێرەوەی گەڵاکان واتە لە قەدی گوێنی، بە هۆی پاچێکی دەم تیژی دەسکدار، کە تایبەتە بۆ ئەم کارە. قەدی گوێنی لە چەند شوێنێک بریندار دەکرێ. ئەنجا بۆ ماوەی هەفتەیەک وازی لێ دێنن. دواتر دێنەوە سەری و دەبینن، کە لە شوێنە برینداریەکانەوە کەتیرەکە هاتۆتە دەر و چۆتە ناو ئەو چاڵەی دروست کرابوو، کەتیرەکە شێوەی سپییەکی ئاوی نیمچە رەقی دروست کردووە، بەم جۆرە کۆی دەکەنەوە، بۆ بازاڕ و فرۆشتن دەینێرن. شیاوی گوتنە بۆ ماوەی ٦ تا ٧ هەفتە ئەم کەتیرە بەردەوام دێتە دەرەوە، بەڵام لە هەفتەکانی دوایی رەنگی کەتیرەکە بەرەو قاوەیی و سوور دەچێتەوە، لە رووی نرخەوە کەتیرەی هەفتەکانی یەکەم باشترە. رەنگە کەتیرە و جەوی زۆر جیاوازییان نەبێ، بەڵام جەوی شێوەی سروشتی هەیە و کەتیرە بە هۆی دەستکردن دەردەهێنرێ. کەتیرە کردن لە ناوچەی پشدەر زۆر باو بووە و گرنگی پێ دراوە. لە کاتی کەتیرە کردن ئەگەر وشیار نەبی دڕکەکانی دەوەنی گوێنی ئازارت پێ دەگەیەنن.

٥- **گوێنی وەک ئالیکی ئاژەڵ:** لە وەرزی پایز، خەڵکی خاوەن ماڵات لە گوندی دەچوون دەوەنی گوێنییان بە هۆی داسی دار لە بنەوە دەبڕیەوە و بە هۆی گوێدرێژ بۆ گوندیان دەگواستەوە، ئنجا بەهۆی ئاگر دڕکە تیژەکانیان دەسووتاند و پاشماوەکەی بە هۆی داسی دار لەسەر پارچەیەک داری ئەستوور ورد ورد دەوەنی گوێنییەکە دەکوترا، ئەمەش لە زستان لەگەڵ کا و ئالیک دەدرایەوە ئاژەڵەکان، بەتایبەت مانگا و گاجووت و کەر و ئێستر.

سەرچاوە:
١- گەشتێکی مەیدانی بۆ کوێستانەکانی گوندی روست.
٢- چاوپێکەوتن لەگەڵ ژمارەیەک لە دانیشتووانی گوندی روست.
٣- رێبوار جەمال، چەپکێ لە کەلەپووری گوندی ئێمێوە لە هەرێمی کوردستانی عێراق، بەرگی یەکەم، ٢٠٠٣.

*** ئەم بابەتە لە گۆڤاری مێرگ ژمارە (٩) وەرگیراوە.**



# جۆرەکانی تووتنی کوردستان و بازرگانیی تووتن لە هەولێر

ئا: عەباس هورمزیار

سەرچاوە جیهانییەکان ئاماژە بە هەبوونی تووتن لە کیشوەری ئەمریکا دەکەن و گوایە سەرەتا (ئەمریکۆی گەریدە) هێناویەتییە ئەوروپا و تەنیا پاشاکان پێیان دەکرا، پاشان بە هەموو جیهاندا بڵاو بووەوە، ناوی تووتنیش وشەیەکی هیندییە سوورەکانە، بەڵام دوای لێکۆڵینەوە دەرکەوت، کە تووتن لە ئەمریکاوە نەهاتۆتە کوردستان، بەڵکو لە زۆر کۆنەوە تووتن لە کوردستان چاندراوە و جۆری تووتنی کوردستانیش جیایە لەگەڵ جۆرەکانی تووتنی جیهان و لە کۆنەوەش وڵاتانی دەوروبەری کوردستان، لە کوردستانەوە تووتنیان بۆ دابین کراوە.

یەک لەم جۆرە تووتنە جیهانییانە جۆری (ساسۆن)ە، کە دوای راپەڕین زیاتر لە دەوروبەری شاری هەولێر دەچێنرێت و تووتنێکی خراپە و پەسند نییە، جا بە هۆی ئەوەی جگەرە کۆڕی کۆچک و دیوانی خۆش کردووە و بووەتە خەمڕەوێنی خەمباران و کات بەسەربردنی بێ کاران، هەمیشە رەواجی هەبووە و خەڵکانێکی زۆر خەریکی چاندنی تووتن بوون و خەڵکانێکی فرەش بازرگانییان پێوە کردووە. ژمارەیەک لە پۆلیسیش رەشە راویان بە دوای کاروانچییانی تووتن کردووە، جا بازرگانان بە شەو لە ناوچە شاخاوییەکان تووتنیان بار دەکرد و بۆ بەیانی دەگەیشتنە دەشت و پێدەشتەکان و بە رۆژ تووتنەکەیان لە گوندێک لە گوندەکان دەشاردەوە و ئێواران باریان دەکردەوە و بۆ بەیانی تووتنیان دەگەیاندە جێگای مەبەست یان بۆ نێو عارەب و تورکان، تووتن فرۆشەکان دەڵێن هەر لە کۆنەوە بازرگانیکردن بە تووتن قاچاغ بووە، لەبەرئەوەی حکومەت بە نرخێکی کەم وەری دەگرت و لە بازاڕیش زیاتری دەکرد، خەڵکەکەش نەیاندەفرۆشتە حکومەت، بەڵکو خۆیان دەیانفرۆشت و بازاڕی تووتنیش هەمیشە زۆر گەرم بوو.

له باشووری کوردستان، بازرگان تووتنی دەگەیاندە گەیارە، شەرگات، عانە، راوە، سامەڕا. جاری وا بووە دەیانگەیاندە شاری بەغداش، جا دانیشتووانی ناوچە شاخاوییەکان ئەم کارەیان دەکرد یا لە دەشتەکان دەچوونە ناوچە شاخاوییەکان و تووتنیان بە حیسابی شیشە دەکڕی، جا لە (٤ - ٥) بار دەگەیشتە (٤٠-٥٠) بار تووتن. بازرگان هەمیشە چەکی هەبوو بۆ ئەوەی خۆی بپارێزێت لە ڕێگر و پۆلیسی گومرگ، لە دەوروبەری سالانی سییەکان کەروبار بە (٤) درهەم بە کرێ دەگیرا، ئەگەر خاوەن ولاخ چەکی هەبووایە ئەوا (٥) درهەمی وەردەگرت، ئینجا بازرگان ئەگەر بە راسپاردن تووتن بۆ عارەبێک بهێنێت، ئەوا سەرەتا پارەکەی لێ وەردەگرێت و تووتنەکەی بۆ دەبردە سەر رووباری دیجلە و لەوبەریش تووتن کڕیان ئاگادار دەکردەوە، ئینجا بە قایغ تووتنیان دەرباز دەکرد و هەر بەو شەوە تووتن لە حوشتران بار دەکرا بۆ سنووری سووریا و عانە و راوە دەبردرا.

زۆرجار کاروانچییەکان تووشی مەفرەزەی گومرگ دەبوون و تووتنەکەیان لێ دەگیرا، ئەگەر کاروانچی چەکی هەبووایە، ئەوا بە ئاسانی نەیاندەتوانی تووتنیان لێ بستێنن، بۆ نموونە حاجی عەبدوللای تووتن فرۆش دەڵێ: جارێک هەشت بار تووتنمان لە گوندی بلەی ژێری دۆڵی مەلەکان بار کرد بۆ ئەوەی بۆ گۆبجەلیلی ببەین، چونکە ئەوێ خانەخوێی ئێمە بوو، کاتی نیوەڕۆ گەیشتینە گوندی (ترپەسپیان)ی ناوچەی بەردەڕەش و لەناو هەندێ دار و بار پشتێنەکانمان کردەوە و کلاو و جامانەکانمان لەسەر کردەوە و بەسەر لقی دارەکانمان دادا و چوار ولاخمان زۆر ماندوو ببوون، بارەکانمان لێ داگرتن و بەرەڵامان کردن بۆ ئەوەی بە تەواوی پشوو بدەن و چوار ولاخە بە بارەکەشمان بەستنەوە، خۆشمان لە ژێر درەختەکان لێی خەوتین، هەر ئەوەندەمان زانی پیکابێک گەیشتە سەرمان و رەشاشێکی لەسەر بوو، یەکسەر ئێمەی رشاند و جلەکانمان بەر دەستڕێژەکە کەوت و سووتاندیان، ئێمەش رامان کرد و چووینە سەر گردێک و ولاخە بێ بارەکانیش رەوینەوە و هەرەتەی گوندی گۆمە زەردێ بوون. ئێمەش چوار کەس بووین و سێ چەکمان پێ بوو، یەک لە ئێمە گوللەی لە معاونەکە دا بەریداوە، باشچاوەش رای کرد هەڵی بگرێتەوە، گوللەکمان لە تەنگەی باش چاوەشی دا، یەکسەر هەڵاتن و رەشاشەکەش لە سەیارەکە کەوت و بەجێما، ئینجا یەکێکی ترپەسپیان هات ویستی لەسەریان بکاتەوە، ئێمەش ئاگادارمان کردەوە ئەگەر یەک گوللەمان بۆ بهاوێی دەکوژرێی، بۆیە لە ترسان چووە ناو گوندی ئینجا باری چوار ولاخەکەی دیکەشمان لە چوارەکەی دیکە بار کرد و چووینە گوندی گۆمە زەردی، جەمیل ئاغا، ئاغای گوندی گۆمە زەردێ، هەرچوار هێسترەکەی بۆ گرتبووینەوە و تووتنەکانیشی بۆ شاردینەوە. ئێمەش گەڕاینەوە بلەی ژێری، دوای بیست رۆژ گەڕاینەوە، هاتینەوە گوندی گۆمە زەردی دووبارە ولاخەکانمان بار کردەوە و گەیاندمانە ماڵی حاجی مەجید شەبەکی خانەخوێمان لە گۆبجەلیل بوو. دوای فرۆشتنی گەڕاینەوە گوندی بلەی ژێری، ئەمە نموونەیەک بوو لەو تێکهەڵچوونانەی بازرگانانی تووتن لەگەڵ مەفرەزەی گومرگ دووچاری دەبوونەوە. ئیدی بازرگانیکردن بە تووتن هەر بە قاچاغ بوو تا ساڵی ١٩٥٨ لە عێراق و پاشان بە هۆی زۆربوونی پاکەت و هەرزان بوونی، بازرگانی تووتن ڕێبەندی و قاچاغی لەسەر هەڵگیرا.



### جۆرەکانی تووتنی کوردستان

تووتنی کوردستان دوو جۆر بوو، بێشەمە (بۆندار)، تووتنێکی باش بوو، جۆرەکەی دیکەش پێیان دەگوت رەشۆکی، تووتنێکی خراپ بوو، هەر جۆرێک لەم دوو جۆرەش چەند ناوێکی هەیە: تووتنی بێشەمە تووتنێکی نەرمە، ئەگەر مێش بچێتە سەری لەبەر بۆنەکەی دەمرێ، رووەکەکەی تەنها (٢-٣) بست بەرز دەبێتەوە، بە جۆری خاکەکەی و خزمەتکردنی و وشککردنەوەی گۆرانی بەسەردا دێت، بۆ نموونە خاکی (زێوە و هەرتەل) باشترین خاکە بۆ تووتن، جا بۆ ئەوەی تووتن باش دەربچێت، واتە تام و بۆنی خۆش بێت ئەم مەرجانەی خوارەوەی پێویستە:

١- پێویستە تۆوێکی باش لە خاکێکی باش لەبەر سێبەر بچێنرێ و بە ئاوێکی سارد ئاو بدرێت.

٢- ئەو خاکەی کە تووتنی لێدەچێنرێت، پێویستە تەواو بە میزی مەڕ و مالآت تێر کرابێت، بۆ نموونە ئەو زەوییەی کە دەیانەوێت تووتنی تێدا بچێنن سەرەتا بیکەن بە چەند بەشێکەوە، هەر بەشێکیش شەوێک مەڕی لەسەر رابگرن.

٣- دوای ئەوەی ماوەی پێگەیشتنی تەواو بوو، کە سێ مانگ و دە رۆژە، گەلاکانی تووتنەکە دوای لێکردنەوەیان بە دار یان بە شیشیان وەدەکەن و لە ژوورێک هەڵیدەواسن، بە مەرجێک لای بنی لە خوارەوە بێت، بۆ ئەوەی بە باشی وشک ببێتەوە، جا ئەو کەسەی سەرپەرشتی تووتنەکە دەکات کاتی وشکبوونی تووتنەکە و زەردبوونی دەزانێ، هەروەها دەزانێت تووتنەکە پێویستی بە هەوایە یان نا، بۆیە لە کاتی پێویست پەنجەرەکانی دەکاتەوە و دایاندەخات.

تووتنیش دوای ئەوەی گوڵ دەکات و گوڵەکەی، کە گوڵێکی سپییە دەقرتێنرێت، هەندێ جاریش بەم گوڵە دەوترێت جووتە یا جووتکە، پاشانیش دوو جار کارتە دەکرێت، واتە چەقێرەکەی یان شین بووەکەی دەبڕدرێت، ئینجا گەلای تووتنەکە ئەستوور دەبێت، تووتنی خراپیش کە رەشۆکی پێدەڵێن بۆنی نییە و توندیشە، هەشیانە شیرنن، دوای ئەوەی دووبارە تووتن شین دەبێتەوە، کە پێی دەڵێن (کارتە) ئەمەیان جۆرە تووتنێکی خراپە، جۆرێکی دیکە هەیە بە (گوێ کەرە) ناودارە لەبەر ئەوەی گەلایەکەی گەورەیە وەکو گوێی کەر وایە و (زڕە تووتن)یش زۆر بە بڕشتە و زۆر بڵند دەبێت، جۆرێکی دیکەی تووتنی خراپ (سۆرەبل)ە، ئەم تووتنەش یا خڵتوخاری تووتنە یان بنی گەلای تووتنەکەیە و وشک دەکرێتەوە. (تووتنی داوێ)ش جۆرێکی خراپە لە جیاتی ئەوەی بە دار هەڵیبواسن بە داو هەڵیدەواسن. جۆرە تووتنێکی دیکەی خراپ لە بالیسان هەیە پێی دەڵێن (فەقێ حەوێز) تووتنی بێشەمە گەلاکەی خڕە لە شێوەی گەلای رێواسە.

جاران دوای ئەوەی تووتنیان تەتەڵە دەکرد واتا دارکەکەی و تۆزەکەی دەرژیشت، ئینجا نمە ئاوێکیان لێدەدا و دوای کزربوونەوەی هەندێک گیای دۆنگزی وردکراویان پێدا دەکرد، ئینجا لە هەمبانەیەکیان دەکرد و دەیانپەستا وەکو گروانی لێدەهات، ئینجا هەمبانەکەیان توند دەبەست، پاش ماوەیەک هەمبانەیان دەکردەوە و وردە وردە لە تووتنەکەیان دەکردەوە، ئەم جۆرە تووتنە گرانبەهاترین تووتن بوو، بۆن و تامی خۆش بوو.

### چۆنیەتی ئامادەکردنی تووتن بۆ کێشان

دوای ئەوەی گەلای تووتنەکان پێدەگات، واتە تەواو زەرد دەبێت، ئەگەر لە ژوور وشک نەکرێتەوە لە قوژبنێکدا ژێرەکەی بە مووورتک دادەپۆشرێت، کە پێی دەوترێت (تەرد) ئینجا گەلا تووتنەکانی لەسەر ریز دەکرێت بە مەرجێک بنەکەی بکەوێتە لای خوارەوەی، ئینجا بە چینێکی دیکەی مووورتک دادەپۆشرێت تا بە تەواوی گەلا تووتنەکان وشک دەکرێنەوە و زەرد دەبن، جاری واش هەیە تووتن لەبەر سێبەر یا لەبەر رۆژ وشک دەکرێتەوە و بۆ بۆن خۆشی تووتنەکە پوونگی بەسەردا دەدەن.

**پەراوێزەکان:**

* هەر تووتنێک دارکی تێدا مابێت نرخەکەی دێتە خوارەوە، چونکە دارکی تووتن تاڵە و پەڕی جگەرەش دەدڕێنێ و جگەرەکەش ئاگر باش ناگرێت.
* تووتن وەک میوە وایە تا تەواو پێنەگات پەلکی زەرد نابێت و تامی خۆش نابێت.
* ئەمریکۆی گەریدەی ئیتالی ئەم کیشوەرەی دۆزییەوە.
* تووتن بە کیمیا بێ تام دەبێت، بەلآم بە زبر کردن بەتام دەبێت.

# پیشەی مامانی لە هەولێر (شێوەی باو- مۆڵەت پێدراو- کارامە)

ئا: فاتح یاسین مودەڕیس

**دەستپێک:**

بنچینەی هۆشیار بوونەوەی تەندروستی خێزان و کۆمەڵگا نزیکە لەچەمکی نۆژداری خەڵکەوە.. پلەو پایەو، پیرۆزترین کردەوەی مرۆڤایەتیش پیشەی (مامانی)یە. بەوەی کە ئەم پیشەیە هیچ جیاوازییەکی نییە لەگەڵ پیشەکانی تردا، وەک پیشەی (زانستی و یاسایی و ئەندازەیی و پزیشکی و نەخۆشیاری...تد)، بۆیە ئەم پیشەیە بەچەشنی زانستی پیرۆز، مرۆڤ هەر لە کۆنەوە بەکاری هێناوە. ئەویش لەئەنجامی هۆشیاری و زانینی پێویستییەکانی خۆی بووە، کە بەم چەشنە ئەم پیشەی هەڵبژاردووە تا خۆی بپارێزێ و بەرگری لە جەستەی خۆی بکات.

مامانی چەشنە خزمەتگوزارییەکە لەگەڵ کۆمەڵ تێکەڵ دەبێ و هۆشیاریان دەکاتەوەو ئامۆژگاری جیا جیایان بەچەشنی زانستییانە ئاراستە دەکات. بەپێی بنەمایەکی زانستییانەی سروشتی و کۆمەلایەتی و نۆژدارانە مامان دەبێتە راوێژکارو رێنیشاندەری نەخۆش و خێزان.

مامان وەکو پیشە ریشەی مێژوویی قوولی خۆی هەیە، کە دەگەڕێتەوە بۆ هەردوو سەردەمی مەسیحی و ئیسلامی. دیارە بۆ ئەوانەی ئەم پیشەیان ئەنجامداوە و چاودێری نەخۆشیان کردووە، پاڵنەر و هاندەرێکی مرۆڤایەتی بووە.

زانستی مامانی، لە هەموو زانستەکانی تر زیاتر شیاوی سروشتی ئافرەتە، چونکە پێویستی بە ئارامگرتن و بەزەیی هاتنەوەو بەخشندەیی هەیە.

بێگومان فێربوونی ئەو پیشەیە لە سەرەتادا بەبیستن و لاسایی کردنەوە بوو، بە دەرس خوێندن و نەخشەکێشان نەبووە، جا لێرەدا بۆمان ئاشکرا دەبێت، کە ئەم پیشەیە لەکۆندا لەلایەن نەخوێندەوارانیشەوە بەکاردەهێنرا، واتە زانستییانە نەبووە. لە کوردەواریدا ئەم پیشەیە لەلایەن ئافرەتانی بەساڵاچوو پەیڕەو دەکرا.

هەرچەندە تارادەیەک بەدرێژایی ژیانیان رۆڵی بەرچاویان بینیوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەش بەکەوتنە مەترسی ژیانی ئافرەتی دوو گیان و کۆرپەی تازە لەدایکبوو کارەسات و رووداوی دڵتەزێنی زۆر لێ کەوتۆتەوە. هەر بۆیە فەرمانگەی تەندروستی هەولێر، بەشی چاودێری و دایکایەتی منداڵ لە سەرتاسەری پارێزگای هەولێر، چەندین خولی پێشکەوتووی مانگانەی بۆ ئەو مامانە کردۆتەوە بۆ ئەوەی لە رووی تەندروستی ئاگاداریان بکاتەوەو، پێویستی دروست بۆ ئەو بارەی ئافرەتانی دوو گیان و کۆرپەی تازە لەدایکبوو بەکاربهێنن لەبری ئەوەی مووسی ژەنگاوی یاخود چەقۆی کۆر بەکاربهێنن. شایانی ئاماژە پێکردنە ئەو مامانانەی کە لەو خولانە بەشدارییان کردووە، مۆڵەتی (مامانی رێگەپێدراو)ی پێدراوە. هەڵبەتە ئەو خولانە بۆ ئەو مامانانە زۆر سوودمەند بوون و تارادەیەک شارەزاییان لە پیشەکەیان پەیدا

کـردووە، چونکە لەسـەر دەسـتی شـارەزاو پسـپـۆرانی خـولەکـان کـراونەتەوەو راهێنراون. لە سـەدەی رابردوو و دەستپێکی سەدەی بیست و یەکـدا، مـامـان زۆر لەسـەر بنەمایەکی زانستـیـانە راهاتووە و فێرکراوە. بۆیە لە نەخۆشخانەو بنکە تەندروستییەکان بە لەخۆ بردووانە لەپێناوی بەرز کـردنەوەی ئاسـتی تەندروستی بۆ کۆمەڵگاکەمان کار دەکەن، شان بەشانی پزیشکەکان هاریکارن بۆ خزمەتکردنی نەخۆش. شیاوی گوتنە لە سەدەی بیستدا ئاسۆی مرۆڤایەتی بەرفراوان بوو شارستـانیـەت بەرەو پێش چوو. چـونـکـە تـوانـای زانـین بـۆ پێویستـیـیـەکانی زیاتر بوو، هەر لەبەر ئەوەشە پێناسـەی مـامـانی دوێنێ لەگەڵ ئەمرۆ جیاوازی هەیە. چەمکەکـەی بەو پێـشـکەوتنە زانستـیـانە گـۆڕا، کە لەم بوارەدا بەکـار دەهـێندرێت. هـۆی ئـەم پێشکەوتنەش دۆزینەوەی هۆکـاری نەخۆشییەکان و داهێنانی دەرمان و بەرزکـردنەوەی ئاسـتی گـوزەران و دەرکـەوتنی شـۆڕشی پیشـەسـازی بووە. جگە لەمـەش زۆر کـتـێب و گۆڤارو رۆژنامە بەهەموو زمانەکان لەلایەنی جیـا جیـای ژیانی ئافـرەت دەکۆڵنەوە. ئەمەش لەلایەک ئاستی پێـویسـتـیی بە ژنان لەم بوارە بردووەتە سەرێ و لە لایەکی دیکەش بۆتە هۆی ئەوەی زیاتر خۆی بناسێ و یارمەتیدەریش بێ بۆ مامان تا زیاتر لەم لایەنانە بگات، کە پەیوەندیدارن بەکـاروباری ئافـرەتان. ئافـرەتی ئەم سـەردەمـە، بەتایبـەتی ئافـرەتی کـورد بایەخـێکی یەکـجـار زۆر بەخـۆی دەدات، ئەمـەش وایکردووە زیاتر لەبارەی خـۆی بزانێت و لەگـەڵ ئەم گۆڕانکارییـانەی، بە بەردەوامی و لە گـشـت قـۆناغـەکـانی تەمـەنیـدا لە جـەسـتـەیدا روو دەدەن. ئەمـەش هەمـــــووی بۆ ئـەوەیە، بـایـەخ بەپاراسـتنی تەندروسـتی خـۆی و منداڵەکەی بدات.

بێگومـان شـاری هەولێـریش لەم پیـشـەیە بە دەر نەبووەو ئافـرەتان لەبواری ئەم پیشەیە هاتوونەتە پێش و خـزمـەتیـان بە کـەسـوکـارو هاوشاریانیان کردووە.

شایانی ئاماژە پێکردنە مامان و نەخۆشیارێک بەناوی "ئەنجیلا"، کە خەڵکی شـاری کـەرکـوک بـووە، لە سـاڵی ١٩٥٤و مـاوەی زیاتر لە (٢٠) ساڵ لە نەخۆشخانەی هەولێر خزمـەتی کـردووە، ئەوسا ئەو کـاری مـامـانی لە هەولێر ئەنجام دەدا، کە شـارەزایی و توانایەکی باشی لەم پیشەیەدا هەبوو و خەڵک متمانەی زۆریان پێکردووە(*).

لە هەشتـاکـانی سـەدەی رابردوو "ئامـادەیی مـامـانی" لەهەر سێ پارێزگای هەولێر، سلێمانی و دهۆک کـرایەوە. لە پارێزگـای دهۆک لەبەر ئەوەی پێـشـوازیـیـەکی ئەوتۆی لێ نەکرا، تەنیا قوتابیانی ساڵی یەکەم وەرگیـران و دواتر داخرا. واتە تەنیـا وەجـبـەی یەکـەم کـە لەسـاڵی کردنەوەیدا وەرگیرابوون دەرچوون. لە شـاری سلێمـانی سـەرەتاو بۆ مـاوەی چەند سـاڵێک پێـشـوازی لێ کـرا، بەڵام دواتر ئەویش داخـرا. کـەچی لەشاری هەولێر لە ساڵی ١٩٨٧ بۆ یەکەم جار ئامادەیی مامانی هەولێر بۆ قـوتابیـانی کچ دەرگای واڵا کـردو پێشوازی لەقوتابیان کرد.

کـردنەوەی ئەو فـێـرگـەیە لەو سـەردەمـەدا بۆ قـوتابیـانی کچ و ئافرەتی کـورد زۆر پێـویست بوو. لە لایەک تاوەکو لەشێـوازە کـۆنەکـەی خـــۆی دەرچێ و لەلایەکـی دیکە، ئێمەی کوردیش وەک گەلانی دیکەی جیـهـان لەم بوارەدا دوا نەکـەوین و شانبەشانی ئەوان بەرەوپێش بچین و بتـوانین ئەرکی نیـشـتـمـانی و نەتەوەیی بۆ کۆمەڵگاکەمان بەهێنانە کـایەی کـۆمـەڵگایەکی لەش سـاغ بەجێ بگەیەنین.

هەر چەندە ئەم فـێـرگـەیە ئارەزوومەندانەیە، بەڵام لە سەرەتادا لە رێگەی بەڕێوەبەرایەتی گـشـتی پەروەردەی هەولێـــر بەرێگەی ئینسیابییەوە (٢٠ تا ٢٥) قوتابی کچی بۆ دەنارد.

### مەرجەکانی وەرگرتنی قوتابی

سـاڵانە بەپێی ئەم مـەرجـانەی خوارەوە قوتابیانی کچ لە(ئامادەیی مامانی) وەردەگیرێن:

١- دەرچووی پۆلی سـێـیـەمی ناوەندی بێت.

٢- تەمەنی لە (٣٥) ساڵ پتر نەبێت.

٣- ئەو قوتابیانەش وەردەگیرێن کـە نەیانتـوانیـوە درێژە بەقـۆناغـەکـانی خـوێندنی (ئامـادەیی و پیـشـەیی و

پەیمانگاو کۆلێژەکان) بدەن. کە ئەمەش خۆی لەخۆیدا دەبێتە دەرفەتێک بۆ ئەو قوتابیانە تابتوانن درێژە بە رەوتی خوێندنی خۆیان بدەن.

**ئیمتیازاتی ئەو ئامادەییە**

١- بڕی دەرماڵە (٢٥٠٠٠) دینار بەقوتابیانی ناو شار دەدرێت.
٢- بڕی (٣٠٠٠٠) دینار بەقوتابیانی دەرەوەی شار دەدرێت.
٣- دوای تەواوکردنی راستەوخۆ مۆڵەتی ئەنجامدانی ئەم کارەی بەناوی (مامانی کارامە) پێدەدرێت.
٤- لە سەندیکای خاوەن پیشە تەندروستییەکان پلەی ئەندامێتی وەردەگرێت و تەواوی ئیمتیازاتەکانی ئەو سەندیکایە دەیگرێتەوە.
٥- بەشی ناوخۆی خۆراک بەهەموو شێوەیەک بۆ قوتابیانی دەرەکی دابین کراوە.
٦- ئۆتۆمبێلی تایبەت بەپێی ژمارەی قوتابییەکان بۆیان دەگیرێت و گواستنەوەیان بۆ شوێنی کرداری و تیۆری دەکرێت.
٧- لە نزیکترین بنکەی تەندروستی کە لێی نیشتەجێیە لە بەشی چاودێری دایکایەتی و منداڵ بەشە پێویستییەکانی مامانی (بەخۆڕایی) وەردەگرێت.
٨- بەڵگەنامەکەی بەرامبەر بەڵگەنامەی ئامادەییەکانی دیکەیە بۆ مامەڵە کردن و دامەزراندنیان.
٩- بۆ یەکەم جار لەساڵی ٢٠٠٤-٢٠٠٥ بەپێی بڕیارێکی خوێندنی باڵا لەپەیمانگای سۆران بەشی مامانی ٥٠٪ وەرگیران. دواتر رێژەی وەرگیران لەو بەشەی پەیمانگا بوو بە ١٠٠٪.
١٠- لە ساڵی خوێندنی ٢٠٠٥-٢٠٠٦ بۆ یەکەم جار دەرچووی یەکەمی ئامادەیی مامانی هەولێر لەکۆلێژی پەرستیاری زانکۆی سەلاحەددین وەرگیرا. کە ئەمەش زیاتر دەرگای والاکرد بۆ قوتابیانی ئەو ئامادەییە، تابتوانن درێژە بەخوێندنیان بدەن، گەر ئارەزووی تەواوکردنیان هەبێت.
١١- ساڵانە لەگەڵ قوتابخانەکانی دیکەی سەر بە پەروەردە لەپێشانگا بەشداری دەکەن.
١٢- یەکەم و دووەم و سێیەمی دەرچووانی پۆلی شەشەم هاوشان لەگەڵ یەکەم و دووەم و سێیەمی دەرچووانی قوتابیانی ئامادەیی و پیشەییان لەلایەن وەزارەتی پەروەردەی حکومەتی هەرێمی کوردستان خەڵات دەکرێن.
١٣- گەر ئارەزووی دامەزراندنیان هەبێت، ئەوا راستەوخۆ لەنەخۆشخانەی لەدایکبوون و منداڵان یاخود لە بەشی چاودێری دایکایەتی و منداڵی بنکە تەندروستییەکان دادەمەزرێندرێن.
١٤- ساڵانە لەلایەن هۆبەی نەخشە کێشان و فێرکردنی تەندروستی لە فەرمانگەی تەندروستی هەولێر پێویستییەکانی قوتابخانەیان بۆ دابین دەکرێت.

**ئامادەیی مامانی لە رووی هونەرییەوە**

ئەو ئامادەییە لەرووی میلاکەوە سەر بەفەرمانگەی تەندروستی هەولێرە، بەڵام لە رووی هونەرییەوە بەهەموو شێوازەکان سەر بە بەڕێوەبەرایەتی گشتی پەروەردەی هەولێرە. ساڵانە بەپێی رێنمایی تازە، بەمەبەستی بەرەو پێشچوونی رەوتی خوێندن لەو ئامادەییە، پەیڕەو و پرۆگرام لە بەڕێوەبەرایەتی ناوبراو دەگاتە ئامادەیی مامانی هەولێر، ئەزموونە گشتییەکان ساڵانە لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی ناوبراو هۆبەی ئەزموونەکان ناوی قوتابیانی پۆلی شەش و ژمارەی ئەزموونیان دەدرێتێ و پرسیارو هەڵەچن کردن لە بەشی کۆنترۆڵی ناوەوەی سەر بەپەروەردە بەڕێوە دەچێ.

**ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی WHO و ئامادەیی مامانی هەولێر**

ئامادەیی مامانی هەولێر هەر لە سەرەتای دامەزراندنییەوە لەلایەن فەرمانگەی تەندروستی هەولێر، هۆبەی نەخشەکێشان و فێرکردنی تەندروستی بۆ دەستەبەر کراوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەش هێشتا نەتوانرابوو تەکنەلۆژیای نوێ بۆ ئەو ئامادەییە دەستەبەر بکرێ. هۆیەکەش لەلایەک بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە تەیارکردنەکە لەلایەن حکومەتی ناوەندی بووە و لەلایەکی دیکە بۆ جەنگی کەنداو و داسەپاندنی ئابلۆقەی نێودەوڵەتی بەسەر عێراق دەگەڕێتەوە. بەڵام دوا بەدوای پەسندکردنی بەرنامەی نەوت بەرامبەر بەخۆراک (٩٨٦)ی نەتەوە یەکگرتووەکان و تەرخانکردنی بڕێ پارە لەو گوژمەیەی بۆ وەزارەتی تەندروستی ئامادە کرابوو، تایبەت کرا بەفێرکردنی تەندروستی، کە ئامادەیی مامانی هەولێریش خۆی دەگرێتەوە، گەلێ پێویستی هەمە چەشنەی تەکنەلۆژیای تازە کە چەندین ئامێر لەخۆ دەگرێت بۆی دابین کرا، لەوانە:

١- قەرەوێلەی منداڵبوون (سرير الولادة)
٢- داینگەی منداڵ (حضانة الطفل)
٣- دومیە
٤- ئۆڤن
٥- ئۆڤەر هێد
٦- پۆستەراتی جۆراو جۆر
٧- ئامێری تەوژمی خوێن (جهاز الضغط)
٨- (گەرمی پێو - محرار) (کۆم- دەم)
٩- کانولە
١٠- کانیتەر
١١- سلاید (گەورەو بچووک)
١٢- سەدرییە

وێڕای ئەوانە کورسی بۆ قوتابییەکان و تەختەڕەش بۆ پۆلەکان و مێزی گەورە بۆ تاقیگە و پێویستییەکانی تاقیگە دابین کردا. شایانی ئاماژە پێکردنە ئەو ئامادەییە دوو تاقیگەی هەیە: (تاقیگەی بنەماکانی نەخۆشیاری) و (تاقیگەی نەخۆشیاری ئافرەتان) بۆ ڕاهێنانی قوتابییانی هەر سێ قۆناغەکە چونکە قوتابییانی ئەو ئامادەییە لەسەر تەواوی کاری نەخۆشیاریش ڕادەهێندرێن لەپاڵ پیشەی مامانیدا بەشێوەیەکی پراکتیکی و تیۆرییەوە، جگە لەمانەش هەر هەموو ڕاپەڕاندنی کاری ئەو ئامادەییە لەلایەن هۆبەی نەخشەکێشان و فێرکردنی تەندروستیی وەزارەتی تەندروستی حکومەتی هەرێمی کوردستان ڕادەپەڕێندراو ڕادەپەڕێندرێت.

**وانە تیۆرییەکانی ئامادەییەکە**

١- پۆلی چوار

زمانی کوردی- زمانی عەرەبی- ئایین- ماف و دیموکراسی- تویکاری- بنەماکانی نەخۆشیاری- ڕەوشتی پیشەیی- زمانی ئینگلیزی- نەخۆشیاری ئافرەتان- وێنە- وەرزش- زانستی زیندەوەرانی- کۆمپیوتەر.

٢- پۆلی پێنج

زمانی کوردی- زمانی عەرەبی- زمانی ئینگلیزی- ئایین- تەندروستی کۆمەڵ- نەخۆشیاری ئافرەتان- دەرمانسازی- کۆمپیوتەر- وێنە- وەرزش- پزیشکی نەخۆشیاری منداڵان.

٣- پۆلی شەش

زمانی کوردی- زمانی عەرەبی- زمانی ئینگلیزی- ئایین- نەخۆشیاری ئافرەتان- نەخۆشییەکانی ئافرەتان- ئاماری تەندروستی.

**وانەی پراکتیکی**

شێوەی دەوامکردن لەو ئامادەییە ٣ ڕۆژ تیۆرییە و وانەکان لەپۆلدا لەسەر دەستی پسپۆران بەشێوەیەکی ئەکادیمیانە دەخوێنن... بەڵام سێ ڕۆژەکەی تر دەوامکردنەکە ڕاستەوخۆ دەبێت بەپراکتیکی و لە یەکەکانی نەخۆشخانەی لەدایکبوون لەسەر دەستی مەشقکاران بەسەرپەرشتی پسپۆرانی دەرچووی کۆلێژی نەخۆشیاری بەهەماهەنگی لەگەڵ بەڕێوەبەرو کارمەندانی نەخۆشخانەی لەدایکبوونی هەولێر ڕادەهێندرێن. ئەو ڕۆژانەی کە پراکتیکیان هەیە، پۆلی چوار تا نیوە ساڵ لەتاقیگەی ناو قوتابخانە بەشێوەیەکی پراکتیکی ئەو وانانەی بەشێوەی تیۆری لەبنەماکانی نەخۆشیاری خوێندوویانە لە تاقیگە بەپراکتیکی وەک سەرەتایەک بۆ ئاشنابوونیان بەر لەوەی ڕوو لە یەکەکانی

تەندروستی بکەن لەسەر دەستی مەشقکار رادەهێندرێن. جاران پۆلی چوار لە دوای پشووی نیوە ساڵ کە دەگەڕێنەوە هەر لەناو نەخۆشخانەی لەدایکبوون بەسەر بەشەکان دابەش دەکران. بەڵام دوای ئەوەی یەکەکانی نەخۆشخانەی ناوبراو بەرفراوان کران، ئەو ئامادەییە لە نەخۆشخانە هاتە دەرەوە. بۆیە پۆلی چوار شێوازی پراکتیکی گواستەوە بۆ بنکەی تەندروستی و نەخۆشخانەکانی دیکە. سەرەتا لەبەشەکانی بەشی راوێژکاری ناو نەخۆشخانەی فێرکردنی هەولێری ئەنجامیان دا. دواتر گوێزرانەوە بۆ بنکەی تەندروستی نازدار بامەڕنی. پاشان بۆ نەخۆشخانەی منداڵان.

بەڵام سەبارەت بەقوتابیانی هەردوو پۆلی پێنج و شەش، پراکتیکییەکەیان لە یەکەکانی نەخۆشخانەی لەدایکبوون ئەنجام دەدەن، وەک ئەو یەکانەی تایبەتن بەمنداڵ، لەوانە (ناکام).

جگە لەوەش کە کاری سەرەکییان ئافرەتانە، تەواوی ئافرەتان دەبینن و بەسەر ئەو یەکانەو بەشەکانی تر دابەش دەکرێن. وەک کورتاج و ساڵەی نەشتەرگەری و هۆبەی نەشتەرگەری- راوێژکاری ئافرەتان. دەرمانخانە- تاقیگەکان. بڕوانە خشتەی ژمارە (١).

ریزی ناوی ئەو مامانە تەقلیدی و مۆڵەت پێدراوانەی کە خزمەتیان بەخەڵکی هەولێر کردووە

١- سەید ئایش- تەیراوە
٢- حەسیبە مەحمود- تەیراوە
٣- هەدیە- تەیراوە
٤- مامز حەوێز- بەستەپیازە
٥- پلکە خاتوون- باداوە
٦- پلکە سورمێ- باداوە
٧- زەکیە- کوران
٨- ئوم سەعد
٩- سستەر فەخریە- زانایان
١٠- سستەر کافیە
١١- سۆفیە
١٢- ئیخلاس
١٣- بەفرین
١٤- نیشتمان جوبرایل
١٥- نیشتمان شەقلاوەیی
١٦- سستەر جانێت
١٧- سستەر رێزان
١٨- مریەم
١٩- حەسیبە- نەورۆز
٢٠- حاجی ئامینە
٢١- حاجی حەلیمە
٢٢- سستەر زاهیدە
٢٣- پلکە ناهیدە
٢٤- سێوێ
٢٥- پلە ستی- تەعجیل
٢٦- سستەر نەجیبە- ئازادی
٢٧- سستەر لایەقە- ئازادی
٢٨- سستەر سوعاد- تەعجیل
٢٩- سستەر سێدی- عەنکاوەو هەولێر
٣٠- ئوم عەلا- راپەڕین
٣١- حاجی سەعدیە- سایلۆ
٣٢- فاتان- سایلۆ
٣٣- هەمین عارەب
٣٤- بەسێ
٣٥- سەید خەتومە
٣٦- حاجی مەلیح
٣٧- حاجی زارا
٣٨- حاجی مریەم
٣٩- سەنجان
٤٠- ساریە
٤١- ئامینە
٤٢- جوان
٤٣- پەخشان
٤٤- حاجی عەیشێ
٤٥- عەتییە
٤٦- مەحبوبە- برایەتی
٤٧- ئامینە- گوندی دەربەند/ شەقلاوە
٤٨- ئەسمەر- گوندی دەربەند/ شەقلاوە
٤٩- سستەر مریەم- کۆیە
٥٠- سستەر لیمۆ- کۆیە
٥١- ست مەهیە- بنەسلاوە
٥٢- گەلاوێژ سابیر- بنەسلاوە
٥٣- مەهیە ئەحمەد سابیر- بنەسلاوە
٥٤- حەسیبە سەلیم ئۆمەر- بنەسلاوە
٥٥- فەوزیە مستەفا- بنەسلاوە
٥٦- زەریفە مستەفا- بنەسلاوە
٥٧- بەدریە عومەر وەهاب- بنەسلاوە
٥٨- شانا محەمەد ئیسماعیل- بنەسلاوە
٥٩- هاجەر عەبدوڵڵا عەلی- بنەسلاوە
٦٠- سیەبا عەلی مەحمود- بنەسلاوە

خشتەی ژمارە (١)

**ریزی ناوی بەڕێوەبەرو مامۆستایانی ئامادەیی مامانی هەولێر**

| ناو | پیشە | بەڵگەنامە |
|---|---|---|
| نەرمین محەمەد عومەر | بەڕێوەبەر | بەکالۆریۆسی نەخۆشیاری |
| سۆزان ئەنوەر حوسێن | بەڕێوەبەر | بەکالۆریۆسی نەخۆشیاری |
| نەورۆز عەبدولواحید | ی/ بەڕێوەبەر | بەکالۆریۆسی نەخۆشیاری |
| فاتح یاسین قادر | ی/ بەڕێوەبەر | بەکالۆریۆسی عەرەبی |
| خەبات ئەبو بەکر محەمەد | ی/ بەڕێوەبەر | بەکالۆریۆسی نەخۆشیاری |
| جولیت گورگیس سلیمان | نەخۆشیاری زانکۆ | بەکالۆریۆسی نەخۆشیاری |
| ئاواز سەعید | مامۆستا | ماستەر نەخۆشیاری |
| ئاوات عەبدولحەمید | مامۆستا | بەکالۆریۆسی نەخۆشیاری |
| شیرین حەمەسور رەسول | نەخۆشیاری زانکۆ | بەکالۆریۆسی نەخۆشیاری |
| یونس محەمەد یونس | مامۆستا | قوتابی دکتۆرا |
| نیگار جەمال عەبدولوەهاب | مامۆستا | قوتابی زانکۆ |
| ئالان محەمەد حەبیب | مامۆستا | بەکالۆریۆسی زانست بایۆلۆجی |
| سۆلاف مستەفا | مامۆستا | بەکالۆریۆسی زانست بایۆلۆجی |
| ڤیان جەمال | مامۆستا | بەکالۆریۆسی زانست بایۆلۆجی |
| تارا مستەفا | مامۆستا | بەکالۆریۆسی زانست بایۆلۆجی |
| ئەحلام جەمیل سڤریك | مامۆستا | بەکالۆریۆسی نەخۆشیاری |
| رەوا سامی ئیستیفو | مامۆستا | ماستەرنەخۆشیاری |
| قاسم رەحمان ئیسماعیل | مامۆستا | دیبلۆم ئینگلیزی |
| بەختیار خدر ئەحمەد | مامۆستا | بەکالۆریۆسی عەرەبی |
| یادگار عەدنان عەبدولقادر | مامۆستا | بەکالۆریۆسی عەرەبی |
| ئەغادیر شاکر حەمەد | مامۆستا | بەکالۆریۆسی ئینگلیزی |
| کامەران شەهاب محەمەد تاهیر | مامۆستا | بەکالۆریۆسی کوردی |
| شیرین حامید مەجید | مامۆستا | بەکالۆریۆسی کوردی |
| بەلقیسە موراد | مەشقکار | پەیمانگای پزیشکی |
| نادیە شەریف | مەشقکار | پەیمانگای پزیشکی |
| سوهام نوری عیزەدین | مەشقکار | پەیمانگای پزیشکی |
| چۆڤین کەمال جوبرایل | مەشقکار | پەیمانگای پزیشکی |
| ڤیان سابیر ئیسماعیل | مەشقکار | پەیمانگای پزیشکی |
| مەی محەمەد عەلی | مەشقکار | پەیمانگای پزیشکی |
| بێخاڵ مەجید | مەشقکار | ئامادەیی نەخۆشیاری کۆیە |

# یاری منداڵان
# جگ و جگانێ لە دەشتی هەولێر

**عەزیزی مەلای رەش**

* جگ چوار لای سەرەکی هەیە:
لایە بەرزەکانی لووسە کە پێیدەگوترێت «کەر» ئەوی دی «میر».
لایە پانەکانی لووس و بەرزەکەی«پشت» ئەوی دی «قۆیزان».
* جگ بە گشتی دوو جۆرە: جگی «راستە» و جگی «چەپە».
جگی راستە لەجگانێدا پشتەکەی دەکەوێتە کەرخی ناو لەپ. چەپەش بە پێچەوانەوە.
* جگە بەران و نێری لە بەر گەورەیی پێیان دەگوترا: جگە «حۆلە». جگە گۆلک گەورەتر بوو و یاری پێنەدەکرا. ئەو ناوەی بە سەردا نەسەپا.
* جگ، کە رەنگ دەکرا بۆ گەمە کردن نەبوو. بەڵکو کون دەکراو وەک شەقشەقە بەلانک، لە ئاست سەری منداڵ هەڵدەواسرا.
* جگە کرووز: جگێکە لە بەر کۆنی کونی لێ پەیدا دەبوو.
* جگە پووزە جگی گچکە و سووک.
* جگە کەنووش، ئەو جگەیە کەهێندێکی لێ شکابێت.
* جگە جاقی، بە هۆی لەخەنەنان و چەورکردنی و هەڵسووینی لە گیا و گۆڵدا لووس و پتەو دەبوو.
* دەسکەڵلا، ئەو جگەیە کە یاری پێدەکرا.
جگانێ
لە دەشتی هەولێر سێ گەمەی سەرەکی جگانێ هەبوو:
١- جغزانێ.
٢- کەللایانێ لە سەر جگ.
٣- هەرستی = «هەڵستی».
* یەکەمیان: جغزانێکی خڕ لێدەدراو لە ناویدا بە جگ لە جگ دەدرا تاکو لە جغزەکەی وەدەر دەنا، ئەوسا مانای وا بوو بردییەوە.
* دووەم: کەللایانێ لە سەر جگ دەکرا، ئەمڕۆ چۆن دینار دەکرێتە «منە، تکە» ی گەمەکە، ئەوسا پارە نەبوو لە جیاتی جگ دادەنرا.
* سێیەم: تایبەتە بە گەوران، لە سەر پارە بوو. دوو کەس هەریەکەیان جگێکی تایبەتی خۆی هەبوو. یەکەم جگەکەی خۆی لە سەر باری میر سەر زەوی دادەنا و ئەوی دی بە جگەکەی خۆی لێیدەدا و دەیگوت: « هەستە». ئەوە ئەگەر میقداری پارەکەی لە سەری دەکرا دیار بوایە. ئەگەرنا دەیگوت: «یەک عانە»، یان «دە فلووس»....
جا ئەگەر جگەکان هەردوکیان لە سەر باری «پشت» یان «میر» یان «قۆیزان» یان «کەر» بکەوتبووانایە بە هیچ حسێب نەدەکراو کابرای وەستا دەبوایە هەننۆب جگەکەی لێ بدابووایەوە.
ئەگەر یەک لە جگەکان میر بچەقی بووایە مانای وابوو کابرای جگ لە دەست بردییەوە و بۆ دووەم جاریش جگەکەی لێدەداوە.
خۆ ئەگەر یەکیان کەر بچەقی بووایە، مانای وابوو دۆڕاندی.
پارەکەی دەدا و لێدانەکەشی لە دەست نەدەما.

* گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر / ژمارە (٥) / تەمووزی ساڵ (٢٠٠١) وەرگیراوە.

# سوارچاکی لە هەولێر

عومەر شێخ لەتیف بەرزنجی

لە کۆنەوە خەڵکی کوردستان بایەخی تەواویان بە وڵاخی بەرزە داوە، هۆیەکەشی بۆ باری جوگرافیای ناوچەکەیان دەگەڕێتەوە. بە دەیان شێوە و لە دەیان بواردا بەکاریان هێناوە، هەندێجار کەسانێک هەبوون بەم جۆرە گیانلەبەرانەوە شانازیی کردووە. ئەسپ و ماین و هێستر و ڕەشەوڵاخ و مەڕ و ماڵات مایەی بەختەوەری بوونە. ئەوەی کە لەم بابەتەدا بە نیازین بیوروژێنین سوودەکانی وڵاخی بەرزەیە لە کۆمەڵگەی ئەو سەردەمەی کوردەواری، بە تایبەت (سوارچاکی).

## سوارچاکی لە دەشتی هەولێر

هەولێر بە یەکێ لە شارە دێرینەکانی کوردستانی گەورە لە قەڵەم دەدرێ، خاوەن مێژوویەکی هەزار ساڵییە، لە هەموو لایەنێکەوە ڕەوشی لێهاتوویی هەبووە، کەسانی خاوەن توانا و ناوداری زۆر بوو، بۆ زیاتر شارەزا بوون لەم بارەیەوە وا ڕاستەوخۆ هەندێ کەسایەتی شارەزا و خاوەن ئەزموون دەدوێنین و راو بۆچوونەکانیان لەمەڕ ئەم تەوەرە بۆ ئێوەی زێدە خۆشەویست دەنووسینەوە.

## سوارچاکی چۆنە؟

هەر کەسێک کە خاوەن ئەسپ و ماین بووبێ و بە شارەزایانە بە کاری هێنا بێ، بە سوارچاک دانراوە و ناویانگی دەرکردووە.

## ئەسپ و ماینی چاک لای کێ هەبووە...؟

بە شێوەیەکی گشتی لە کوردستان و بە تایبەت لە دەشتی شاری هەولێر، چەندین چین و توێژ هەبوون، کە بێ ئەسپ نەدەبوون، لەوانە:

١. شێخەکان و خاوەن هۆزەکان.
٢. هەندێ لە زانا ئاینییەکان.
٣. ئاغا و بەگ و خاوەن قۆناغ و دیوەخان.
٤. گەنج و لاوی دەوڵەمەند و بەتوانا.
٥. پیاوماقووڵ و کوێخوا و ردێن سپی.

## بە زۆری ئەسپ و ماین بۆچی بەکار دەهێنرا؟

وەکو لە سەرەتاوە ئاماژەمان بۆ کرد، خەڵکی ئەم دەڤەرە بایەخی زۆری بەم جۆرە گیانلەبەرە داوە، هەرچەندە رێژەی بوونی لە رێژەی جۆرەکانی دی کەمتر بووە، بەڵام گوندێک نەبووە دەیان ئەسپ و ماینی رەسەنی تیا نەبووبێ، ئەمە بەڵگەیەکی دیکەی دەوڵەمەندی شارستانییەتی ئەم دەڤەرە دەگەیەنێ. تارادەیەک لە شێوەی جۆرەکانی بەکارهێنانی ئۆتۆمبێلی ئەمڕۆ دەچوو، کاتی خۆی ئەسپیش

وابوو لەو بوارانەی کە تیایدا بەکار دەهێنران، ئەمانە بوون:
١. گەڕان و گەشت و گوزار
٢. لە ئاهەنگ و هەمــوو جــۆرە بۆنەیەک بەشداربووە.
٣. لە جـــەنگ و هێـــرش و بەرگریی بەشداربووە.
٤. لە خۆ رزگـارکردن و هەڵاتن بەشداربووە.
٥. لـە تـەرم نـاشـتن و بـۆنـە ماتەمینیەکان بەشداربووە.
٦. لە گــــەمـــــە (یـاری) وجــــۆرەکـــــانی وەرزش بەشداربووە.
٧. لە قـۆشـمـە و راووشكار و پێشبڕکێ بەشداربووە.

ئـەسپ و مــــایـن لەو چینـە گـیـانلەبەرانەن، کـە بە دۆسـتی ئادەمیزاد دەژمێرێن، لەهەمان کات ئەگــــەری کـــەوی بوونـەوەیان لێـدەکـرێ، زیان بە کـۆمـەڵگەی مرۆڤایەتی ناگەیەنن. لەگەڵ ئەوەی بەشی زۆریان مـاڵیین، هاوکـات هەیە (کــێـــویی)یە، دووره لە کۆمەڵگەی ئادەمیزاد، بەڵام دەکرێ ئەوانیش کـەوی (دەســتــەمــۆ) بکرێنەوە و ببنە هاوڕێی مرۆڤ.

## جۆرەکانی ئەسپ و ماین لە کوردستان

هەزارەها ســـاڵـە نەوەی ئەم گـیـانلەبەرە لە کـوردسـتـانـدا بڵاو بۆتەوە و لە دەیان بواردا خزمەت بە مـــرۆڤــایـەتی دەگـــەیەنێ، بۆ ناسینەوەی ئەم نەوەیە رەسـەنێتی ئەسپ و مـایـن، شـارەزایان چەند خـاڵـیـــان دانابوو، لە ســـەرووی هەموویانەوە، گوایە ئەم جۆرە کاتی خـۆی بەشـداری لە غـــەزاکـانی ئیـسـلامـدا کـردووە، بە ئـەمـەکن، سـوارەکـانیـان لە گۆڕەپانی جەنگ بەجێ ناهێڵن، چ بە برینداریەتی، یان شەهید بوون، وەکو ئاماژەشمان بۆ کـرد، جۆریان زۆرە، بەڵام ئەوەی کـە لە کـوردسـتـان هەبوو ئەمـانە بوون:
١. ئەسپ و ماینی رەسەن.
٢. کەحێلە.
٣. حەمدانی.
٤. عوبەیە.
٥. شێ.
٦. بەحراوی.
٧. کەوێتی.
٨. سەرگیش.
٩. ناوچەوان قەش.
١٠. چوار پەل سپی.
١١. حدود. ١٢. پۆلیس.

کـــەوابوو ســـــەرەڕای ئـەم جۆرانەش، لە هەندێ وڵات جـۆری دیـکـەی هـەبـوو کــــــە نـەوەیـان نەگـەیشـتـۆتە کـوردسـتـان، بەڵام لە ســەرووی هەمـــوویـانـەوە جـــۆری (رەسەن) بوو.

## خاڵە جیاوازەکانیان

١. ئەمجۆرە خاوەن سەرجەلەی رەســـــەنـایەتـین لە لایـەن کـەســانی شـارەزاوە مـۆر کراون.
٢. نـاوەڕاست پشـتــیـــان بە بارستایی پەنجەیەک قووڵە.
٣. کـونە لووتـیـان (کـەپوویان) گەورەیە.
٤. لێــوی لای خـــوارەوەیان (لچـیـیـــان) ئەسـتــوور و شۆڕە.
٥. بەر سینەیان پان و بەرینە.
٦. لە رۆیـشـتن ســــــەربەرز و رەقن.
٧. گوێیان خاوە.
٨. کـــەم ئەسپ لە راکـــردن پێشیان دەکەوێ.

## چۆنیەتی پەروەردە و بەخێوکردنیان

تـا رادەیـەک، شـــێـــوەی بەخێوکردنی ئەم گیانلەبەرانە لەگەڵ جـۆرەکـانی دی لە کـوردسـتــان جـیـاوازە، خـەڵکی بەزۆری مـاین دەکرێ، هۆی ئەمـەش زاوزێکردن و نەوە خستنەوە بوو، خاوەن جوانیی ماین کاتێکی زۆری بۆ بەخێوکردن و پەروەردەی تـەرخــان دەکـــرد، زۆرجــار خــۆی ســەرپەرشـتـی لەوەڕاندنی دەکرد، خۆراکی شیـاو بۆ جـوانـیــەکــە دابین دەکــرا. بەمـشـێـوەیە بەئەوپەڕی سنوور بایەخیـان پێـدەدا، تاوەکـو کـاتی راهێنان و ســوار بوونی پشـتـی دەهات.

## چۆنیەتی راهێنانیان

لە هەموو دەڤەرێک کەسانێک هەبوون لەم بوارە شارەزا و پسپۆر بوون. بەم کـــەســـانە دەوترا

(مەیتەر). زۆر خاوەن جوانیی ناچار دەبوو هانای دەبردە بەریان و دەیان رۆژ ماینەکەی یان ئەسپەکەی بۆ راهێنان لای ئەو (مەیتەرانە) بەجێ دەهێشت تاکو کەوی دەبوو.

### ناوی هەندێ لەو شارەزایانە

ئەمەش ناوی هەندێ لەو کەسانەیە کە لەم بوارە شارەزابوون و خەڵکی رووی تێدەکردن:

١. مەلا عەبدولرەحمان - گوندی گردە شینە. ٢. حاجی کانەبی حەویز. ٣. مام عەزیز - باوکی کاک محەمەد بەریەیار. ٤. مام سمایل فەقێ ئۆمەر - گوندی لهێبان. ٥. مام کەریم گوندی سێقوچان - کەریمە گۆج.

### چۆنیەتی راهێنان و قۆناغەکانی

وەکو لە سەرەتاوە ئاماژەمان بۆ کرد، ئەم زاتانە مامۆستای راهێنان و پەروەردەی جوانی ماین بوون، لە سەرەتاوە ناوبەناو سواری سەر پشتی وڵاخەکە دەبوون، تاکو بە تەواوی کەوی دەبوو، پاش ئەوە هەنگاوەکانی یەک لە دوای یەک دەستی پێدەکرد، لەوانە:

١. قۆناغی نەرمە رۆیشتن.
٢. قۆناغی لۆقە کردن.
٣. قۆناغی تەراتێن.
٤. قۆناغی قۆشمە.
٥. قۆناغی پرتاو.
٦. دوا قۆناغی غاردانی.

### جۆرەکانی سوارچاکی

لە هەموو سەردەمێک کەسانێک خولیای مەشقکردن و خۆراهێنان بوون لە چەند بوارێک. بواری ئەسپ سواریش بەم شێوەیە، لاوانی سەرگەرم و کەسانی بەتوانا، بە دەیان جۆر پاڵەوانەتیان لەم بوارەدا نواندووە و بە دەیان کردەوەی سەیریان لە سەر پشتی ئەسپ ئەنجام داوە، لەوانە:

١. خۆ شۆڕکردنەوە بۆ بن سکی ئەسپ لە کاتی راکردن.
٢. تەقە کردن و نیشان شکاندن لەسەر پشتی ئەسپ بەدەم راکردنەوە.
٣. بەشداریی لە قۆشمە و پێشبڕکێ کردن.
٤. هەستانە سەرپێ لەسەر پشتی ئەسپ بە دەم راکردنەوە.
٥. هەڵگرتنەوەی (گوریس و کڵاو و جەمەدانی) لەسەر زەوی لەسەر پشتی ئەسپ بەدەم راکردنەوە.
٦. راو وشکار و دوای نێچیرکەوتن.
٧. لە ئاودان و پەرینەوەی رووباری گەورە.

ئەمانە و دەیان بواری دی لەم جۆرە لەسەر پشتی ئەسپ و لاوی کورد و سوارچاکەکان رۆژانە دەیاننواند. سوارچاکی هەر دەڤەرێک بەم کردەوانە ناوی دەدایەوە، هەر کەسێک ئەم توانایەی هەبووایە، سوارچاک بوو، لەوانە:

١. خدری پاشا - گوندی قورشاغلو.
٢. مەلا عەبدولرەحمان.
٣. کوێخا خدری - گرد قۆشەنی.
٤. مام عەزیز - باوکی کاک محەمەد بەریەیار.
٥. حسێن عەلی ئاغا - گوندی قەپران.
٦. حەبیب برایم ئاغا - گوندی سیاو.
٧. حاجی حامد - سوارچاکی مامەسێنی سەرگەڕان.
٨. عەولا ئاغای بنادی.
٩. خورشید ئاغای گوندی لهێبان.
١٠. حاجی حەوێز حاجی جوکل راوچی.
١١. مام ئاغای کاک خدری.
١٢. کاک شێخ محەمەد کاک خدری.

### کورتەیەک دەربارەی چەند سوارچاکێک

یەکەم: خوالێخۆشبوو خدری پاشا، دەگێڕنەوە دەڵێن: ئەم زاتە ئەوەندە سوارچاک بوو، دەست و تفەنگ رەنگین بووە، دەیان جار لەسەر پشتی ئەسپەوە تەقەی لە گۆزەی سەرشانی کچانی رێگای ئاوکێشان کردووە و گۆزەکەی شکاندووە، بێ ئەوەی ئافرەتەکە

بریندار بێ.

دووەم: خوالێخۆشبوو (حاجی حامدی سەرگەڕان) دەگێڕنەوە دەڵێن: ئەم زاتە تاکە کەس بوو لە راوە گورگ. هەر بە سواری ئەسپ لای راستی لە رەوە گورگەکە دەگرت و یەک لە دوای یەک دەیکوشتن.

سێیەم: خورشید ئاغای گوندی لهێبان، دەگێڕنەوە دەڵێن: ئەم زاتە و دەیان سوار لەگەڵ خوالێخۆشبوو خدری پاشا و چەند کەسانی دی، بەرامبەریان لە سوپای (روسیا) گرت و شکاندیانن، ئەمانە و سەدان کەسایەتی لەم شێوەیە، لەم کوردستانە سوارچاکی خۆیان نواندووە و بەرگریان لەدەڤەر و ناوچەکانی خۆیان کردووە، لە سەرووی هەموویانەوە (دوانزە سوارەی مەریوان)ە تاکو رۆژگار دەمێنی، مێژووی کورد شانازیی بەم جۆرە کەسانەوە دەکات.

**کەرستەو پێویستی سوارچاکی**

یەکێ لە ئاواتی خاوەن ئەسپەکان رازاندنەوەی ئەسپ و ماینەکان بوو، جوانترین و باشترین کەرستە و هۆکاریان بۆ دابین دەکرد، لەوانە:

١. سەرج: ئەو بەشە بوو کە بە هۆی چەند پشتێنێکەوە لەسەر پشتی ئەسپەکە شەتەک دەدرا و سوارەکەی لەسەر دادەنیشت.

٢. هاوزین.

٣. رکێب.

٤. لغاو - جەڵەو.

٥. قووش قون.

٦. تەنکێش و هەگبە.

٧. سەرکەلە و گولەنگ.

چاکترین سەرجی ئەو سەردەمەش ئەو سەرجانە بوو کە (حسێن سەراج) لە شاری کەرکووک دروستی دەکرد.

**بایەخدان بە جۆری بەخێوکردنی ئەم گیانلەبەرانە**

خاوەن ئەسپ و ماین زیاد لە پێویست و لە سنوور بەدەر بایەخی بە ئەسپەکەی دەدا، هەر ماوەی جارێک سەرتاپای بە سابوون دەشووشت، ئەگەر سابوون نەبوایە ئەوا (گڵە سوور، یان گڵە سەر)ی بەکار دەهێنا.

هەر ماوەی جارێک نالبەندی شارەزا، نالی دەکرد. خۆراک و ئاو و خوێ و قەشاویش رەچاو دەکرا، زۆر بە پەلە بە دەنگی کزی و نەخۆشی و لاوازییەوە دەچوون و هانایان بۆ بەیتەرەکانی ئەو سەردەمە دەبرد و پێویستی تایبەتیان بۆ دابین دەکرد.

**هەندێ لەو نەخۆشییانەی کە دووچاری ئەسپ و ماین دێ**

ئەم گیانلەبەرانەش، وەکو سەرجەم گیانلەبەرەکانی دی دووچاری نەخۆشی دەبوون، لەوانە:

١. بێ نالی.

٢. نەخۆشی (تانەی ناوچاو).

٣. نەخۆشی بالووکە.

٤. نەخۆشی کەسمە.

٥. نەخۆشی میز.

٦. نەخۆشی گەنە لێدان.

ئەمانەو چەند جۆرە نەخۆشییەکی دی رووبەرووی ئەم گیانلەبەرانە دەبۆوە، بەڵام تەقەلای چارەسەری دەدرا.

باشترین نالبەندی دەشتی هەولێر، لە پەنجاکان خوالێخۆشبوو (یابە عەلی) نالبەند بوو.

بەم کۆپلە حەیرانە کۆتایی بەم بابەتە دەهێنین، هیوادارین جێگای رەزامەندی هەموو لایەک بێ:

**لە زینان لە زینە تیرێ**
**کۆمەڵێکی ناسکە سوارێ**
**تاژییان رست دەکرد**
**مێوان دەبوونەوە لە شێخ**
**نەجمەدینی ماڵ لەسەر بیرێ**

*** سەرچاوەکانی ئەم بابەتە**

سەردان و دیدەنی ئەم بەڕێزانە:

١. حاجی حەویز جوکل ئاغای راوچی.

٢. حەسەن ئەفەندی رواندزی.

٣. مام جەوهەر یابەی نالبەند.

٤. هەندێ زانیاری تایبەتی خۆم.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر، ژمارە ١٢، ٢٠٠٥ بڵاوکراوەتەوە.

# شەوانی زستانی هەولێر لە چلەکاندا

نەژاد عەبدوڵلا عەزیز

ئەوا لەم رۆژانە کە زستان دەست پێدەکات، سەرما و باران دەبارێت، لە پێش سۆبەی غاز و نەوت دادەنیشین تەماشای تەلەفزیۆن و سەتەلایت دەکەین و گوێ لەرادیۆ دەگرین، دەبا بزانین شەوانی زستانی هەولێر لە چلەکاندا چۆن بوو؟

ئەوکاتە لەپایزدا دەستیان دەکرد بەکۆکردنەوەی دار، کە دوو شێوە بوو، داری تەڕ و داری وشک، لەپێش مالان دارشکێن هەبوو، پێیان دەوت (ئۆدون قران) دارەکەی وردورد دەکرد بۆ ئەوەی بەکەلکی سۆبەی دار بێت، چونکە زۆربەی مالان سۆبەی داریان بەکاردەهێنا، لەهەمان کاتدا لەمالان یەک دوو گونیە (فەردە) خەلوز (رەژوو) دادەنرا بۆ ناو شتێک لەتەنەکە دروست دەکرا پێیان دەوت (مقلی یا مەقەلە)، ئەو رەژووە لەدەرەوە دادەگیرسێندرا، پاش ئەوەی دەبووە پشکۆی ئاگر دەیانهێنا ژوورەوە، چونکە ئەگەر لەژوورەوە داگیرسابایە (غازی کاربۆن)ی لێ پەیدا دەبوو و دەبووە هۆی گێژبوون یان زۆر جار لەخۆچوون و مردنیش. لەپاڵ ئەم کەرستانەش فەردەی گوێز و مێوژ بۆ شەوچەرەی زستانان دادەنرا، لەپێش بارانیشدا لەبەر دەرگای ماڵ قوڕیان دەکرد، (بەخۆڵی سووروکا)، بۆ ئەوەی سەربانی پێ سواخ بدەن.

ئینجا زستان دەهات و باران دەباری و سەرما دەستی پێدەکرد، نە کارەبا هەبوو نە تەلەفزیۆن و رادیۆ و شتی دیکە، باشە ئەمانە چۆن شەویان بەسەر دەبرد؟

باوەڕم پێبکەن لەئێستا زۆر زۆر خۆشتر بوو.

شەوان چەند ماڵە دراوسێیەک و چەند خزمێک هەر شەوێ بەژن و منداڵ و پیاو دەچوونە ماڵێک، ژنەکان بە تەنیا یان بەتێکەڵاوی، منداڵەکانیش لە عالەمی خۆیاندا، پیاوان پێکەوە دادەنیشتن، باس و خواس و حکایەت گێڕانەوە و رووداوی رۆژانە و رابردوو، باسی ژیانی عەسکەری عوسمانی خۆیان دەکرد، شەوانی هەینی باسی دین و شەریعەت و ئەگەر مەلایان لەگەڵ بایە ئەوا

مەولودنامەی بۆ دەخوێندنەوە، لەبەینی قسەش بێجگە لەجگەرە کێشان، کە چاوچاوی نەدەدی لەبەر دووکەڵ، شەوچەرەی خواردنیان لەمێوژ و گوێز دەهێنا، چا خواردنەوەش هەر بەردەوامە، ئینجا یەکێک دەیگوت: خزمینە شەوە سەعات سێیە (سێی عەرەبی یەعنی نزیکەی ٩- ١٠ سەعات) ئینجا منداڵێک فانۆسی دادەگیرساند و پێش دەکەوت، لەو کۆڵانە تەسکانە هەر کەسێک بەرەو ماڵی خۆی دەڕۆیشت.

ئەمە شەوانی خەڵکی هەولێر بوو، بەڵام لەماڵە ئاغاکانی هەولێریێ وەکو: (ئەحمەد ئاغا و داود ئاغا و مەلا ئەفەندی و عەلی ئاغا و عەتەولاغا و موسا ئاغا.. هتد) شەوان پیاو ماقولان دادەنیشتن باسی شەڕوشۆڕی ئینگلیز و ئەڵمان دەکرا، چینێک دژی ئەو بوو چینێکی دیکەش ئەوی دیکە، هەتا درەنگ، ئینجا خزمەتکاری ئاغا بە فانۆسەوە هەر کەسی دەگەیاندە ماڵی خۆی.

لەساڵی ١٩٤١ موتەسەریف (ساڵح زەکی بەگ) بوو، کە کەسایەتییەکی ڕۆشنبیر و بەناوبانگ بوو، وەختی خۆی (سەرکردەی هێزەکانی) شێخ مەحموودی نەمر بوو، ئەو ساڵەی ئەو لێرە بوو زۆربەی ڕۆشنبیرانی کورد و بەتایبەتی لەسولەیمانی هاتبوونە هەولێر چ بەوەزیفە یان بەدامەزراندن لە هەندێ فەرمانی گونجاو.

لەم ڕۆشنبیر و شاعیرانە کە لەهەولێر بوون: (ڕەمزی مارفی شاعیر و نووری شێخ ساڵحی شاعیر و عەبدوڵڵا بەگی گۆرانی شاعیر، ئەحمەدی عەزیز ئاغای ڕۆشنبیر و شێخ سەلامی شاعیر و فایەق بێکەسی شاعیر و مەلا زیوەر ئەفەندی شاعیر و زۆرانی دیکە. ئەمانە شەوان لەماڵی موتەسەریف یان لەماڵی ئێمە (خزمایەتییەک هەبوو مابەینی ئێمە و ساڵح زەکی بەگدا، چونکە داود بەگی برای مێردی پورم بوو).

شەوان دادەنیشتین، بە شیعر خوێندنەوە و ئەدەب و ڕەخنە هەتا درەنگی شەو، زۆر جاریش گاڵتەو گەپیان هەبوو وەکو ئەم ڕووداوە بچووکەتان بۆ دەگێڕمەوە:

ڕۆژێک موتەسەریف جارێ نەهاتبووە ماڵمان، هەموویان لەو ڕۆشنبیرە بەرزانە لەوێ دانیشتبوون، پاش ماوەیەک (ساڵح زەکی بەگ) هات، هەموو لە بەری هەستان، بەڵام فایەق بێکەس هەڵنەستا، هەموو دانیشتووان زۆریان پێ ناخۆش بوو، چونکە زۆر ڕێزی یەکیان دەگرت، لەپاش ماوەیەک شێخ سەلامی ڕەحمەتی هەستا و بەفایەق بێکەسی گوت، نابێ حورمەتت هەبێ! بۆچی، کە ساڵح زەکی بەگ هات هەڵنەستای؟ ئەوجا- بەرەحمەت بێ- فایەق بێکەس هەستا گوتی دەتەوێ بەم حاڵە هەڵسم...

چونکە بەنتەڵۆنەکەی تەقیبوو، پێی شەرم بوو بەم حاڵە هەڵسێتە سەرپێ، ئینجا بووە پێکەنین و بەزم و ڕەزم، ناردیانە ماڵی موتەسەریف قاتێک جل بۆ فایەق بێکەس بێت، قاتی جلی موتەسەریف هات، موتەسەریف خۆی کورتە باڵا بوو، لەفایەق بێکەس کورتر بوو، کە بەنتەڵۆنەکەی لەبەرکرد وەکو جلی پۆلیسی جاران لەچۆکی بەرەو خوارتر بوو، بووە قاقای پێکەنین.

* ئەم بابەتە لە ڕۆژنامەی برایەتی، ژمارە ٢٢٥٤ لە ١٤/ ١/ ١٩٩٧ وەرگیراوە.

# كوردەواری ڕەنگ و نیگار

مەحموود زامدار

* كورد و ڕەنگ دوو جمكانەن و لە یەكتر ناترازێن. كانیاوی بە تافی سرووشان و بەهرە و توانای مرۆڤی كورد لە ڕەنگ و دەنگ و خاكە ڕەنگینەكەیەوە هەڵدەهێنجێ. سەرچاوەی سۆز و چێژ پەروەرانەی خۆی لە ڕەنگی بەرەبەیان و زەردەپەڕ و لەپەڵكە ڕەنگینە و بەندەنی شاخ و ڕەنگی بەفر و زریان و وەشەن و تۆف و ڕەشەبا و باهۆز وەردەگرێ. گوڵاڵەی هەزار چەشن و مێرگی لیزگدار و ترۆپكی ئاستەنگ و نوالەی نزار و تاڤگەی بەهارژن و بلووری هەنگ و پەپوولە و خاڵبەڵەكی بەفران و خوزنەوەزان و زەنگوڵ زەنگوڵی نێو شكەفتان و لەوەڕگەی شین و لالەزار و گوڵشەنی پڕ لە گوڵاڵە سوورە، وردە بەهرەكانی نێو دڵە خەمناك و قامكی ناسكۆڵەی دەجووڵێنێ... لە لای كورددا خەزان هەزار ڕەنگ، زستان هەزار ڕەنگ، هاوین هەزار ڕەنگ، بەهاریش بە هەزاران ڕەنگ خۆی لە ڕۆنیاس دەدا... ناشزانم گەر هەتاوێ لە هەتاوەكانی دنیا هەبێ لە هەتاوی ئاسمانی كوردستان جوانتربێ! یا هەیڤێ لە هەیڤەكانی دنیا لە هەیڤی دەرە تەنگی نێو كێوان جادووبەندتر بێ..!

* هەموو شتێ لەم خاكە خاسە ڕەنگەدا ڕەنگ دەدا و ڕەنگ وەردەگرێ و ڕەنگ دەڕێژێ، بۆیە فۆلكلۆرەكەی نوقمەساری نێو زەریای ڕەنگە و لە نێو ڕەنگدا شانەلە و پێمەلە دەكا... بۆیە ڕەنگەكانی شەبەنگە بە ڕۆژ خۆی ئاخنیوەتە نێو هەموو كون و كاژێرك و دڵ و داڵانی ژیانی ئەم كوردەوارییە ڕەنگپەرستە..!

* هەر بۆ نموونە و بەس: نەخش و نیگار و ڕەنگە جۆراوجۆرەكانی نێو فۆلكلۆر بێنە بەرچاو، بە قووڵی دەرك بەو ڕاستییە دەكەی كە نەتەوەی (جوانیخوازی) ئێمەش وەك گەلانی تر لە بەردەم جیهانی بەر هەرای ڕەنگدا دۆشدامێنێ و شانازی پێوە بكا...! دەی دە تەماشایەكی هونەرمەندانە و كوردانەی ئەمانە بكە: (نیگاری بێشك - بەرگە ڕادیۆ - بەرگە تەلەفزیۆن - كولە باڵا - كەل و پەلی كۆرپە و ساوا - كڵاو - شاڵ و شەپك - ڕانك و چۆغە - مراد خانی - كەوا و سەڵتە - سوخمەی ژنانە - چنینی فەقییانەی ژنانە - كراسی سەر قۆڵ و سەر سینە و سەر دامان - دامێنی كەوای ژنان - گولینگی جامانە و هەوری و شەدە - سەر گۆرەوی - سەر پێپەشمین - سەر پەردە - سەر سەڵتە - كۆڵوانە - لەچەك - چارۆكە - شلیف - چارشێو - تارای بووكێنی - كوڵلەی چارپایە - دۆشەك و بالیف - پژدێنی ژنە دێهاتی - دۆخین - سوخمەی قۆڵدار - فەرمانە - مێزەری هەجیجی...! تاد).

سەیرێكی بە داو و دڵ بدە، دەبینی هەریەك بە ڕەنگێ یا بە چەند ڕەنگ و جۆر یا بە گرێ و زنجیرە یا بە سادە یا بە كۆكلێ و قەنەویچە و چنین و هۆنینەوە ئارایش دراوە... دە هەر وردە سەرنجەك لە: ئاڵای كورد - بەرگە تاق - هەوسار - تیرۆك - بەردەقانی - فاق - گاسن - داسوولكە - هەوجاڕ - سەركەڵەی وڵاغ - لغاو - كورتان - سەر زین - ئاوزینگ - نەقیزە - زین كەوش و كەڵاش و پانی بەرز - نەخشی سەر دەرگا و شوێنی قاپ و ئاسنجاو - باوەشێن - حەسیر - جۆرك - چیغ - مەسینە - پەقرەج - لباد - گەڵا كوتك - جاجم - كەوچكی ماستاو - دار جغارە - سەر سەماوەر - سەر سینی - شەكردان - پڵاو پاڵێو - سەبەت - خەرار - هەگبە - شەكر شكێن - پیاڵەدان - زەمبیل - قەرتاڵە - تەوەرزین - گومگومە - گڵبینە - كەندو - گۆزە - كرمەك - پەروانە - دوگمە و دۆڵاب - لووتەوانە - بازیبەند - لاگیرە - لوولە و زنجیرە - گێل گێلە - تاسكڵاو - كڵاوزەڕ - هەیاسە - كەمەرە - كلچووك و كلتوور - ناو برێشك - تەختە بەند - دەسكی چەقۆ - تەشی - بلوێری مێز - مەقاشە - قەڵفە هەزار پیشە - كاسەی ماستاو - شەن - پلووسك - تووتەك - باڵەبەن - شمشاڵ - كەڕەنا - تەپڵ - دووزەڵە - نیگاری دەسك و سەر خەنجەر... تاد، كە هەر یەكەیان بە نەقشێك، بە نیگارێك، بە رووخسارێك، بە رووكارێك ڕەنگی داوەتەوە..

* هەر لێرەدا بێ دوو دڵی دەڵێم: جگە لەم هونەرە جوانانە، كە دەبێ بكرێنە سەر مەشقی هونەرمەندان و مایەی سەرخستنی پەیامی هونەر و جوانی، ئەوا هەزاران شتی دیكەشمان هەیە، كە ڕەنگی هەرە بەنگینی نەتەوەی ڕەنگخوازی كورد دەڕەنگێنێ و لە ڕەنگ دەردان ناكەوێ..!

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری مێرگ ژمارە(٢٤)ی ئایار ٢٠٠٧ لا٩٤-٩٧ وەرگیراوە.

# چەند خواردنێكی دۆڵی خۆشناوەتی

ئا: ئاشتی خۆشناو

هەر میللەتێک یاخود نەتەوەیەكی ئەم دنیایە بە خۆراكی خۆی ناسراوە، ئێمەی كوردیش وەكو ئەوانی دیكە بە خواردنی بە تام و لەزەت خۆمان دەناسین و هەر دەڤەرێک یاخود ناوچەیەكی ئەم زەمینە بە جۆرە خۆراكی خۆی بەناوبانگە. لەم بابەتەدا باس لە چەند خواردنێكی دەڤەری خۆشناوەتی دەكەم. هەروەكو دیارە ئەم ناوچەیە هەر لە كۆنەوە بە مێوەجات و تەڕە و مرەبا و شتی دیكە ناوی دەركردووە.

**١. دۆین:** پێكهاتووە لە گەنمە كوتاو ماست، سەرەتا گەنمەكە دەكوڵێنن پاشان ماستی تێدەكرێ تاوەكو جوان تێكەڵاو دەبێ جا بە ئارەزووی خۆت هەندێ پیاز یاخود پەرپینەی تێبكە و بە شلی دادەنرێ و دەخورێ.

**٢. ماش و گەنم:** بریتییە لە ماشی وشككراوە لەگەڵ گەنمە كوتاو پێكەوە دەشۆرێنەوە و لەسەر ئاگر دادەنرێ تاوەكو جوان دەكوڵێن و تێكەڵاو دەبن، ئینجا هەندێ روون و پیازی تێدەكرێ و بە شلی دەخورێ.

**٣. داندۆک:** بەوە ناسراوە كە بریتییە لە ماست و ساواری وشككراوە، سەرەتا رۆژێک پێشتر داندۆكەكە لە ناو دەكرێت، ئینجا بۆ رۆژی دواتر لەسەر ئاگر دادەنرێ، تاكو جوان دەكوڵێ، لە دوایی روون و پیازی تێدەكرێ و بە شلی دەخورێ.

**٤. جلّ بر:** یەكەم جار ترشاوی سماق حازر دەكەین ئینجا هێلكە و روون ئامادە دەكەین لە دوای برژانی هێلكەكە ترشاوەكەی تێدەكەین پاشان هەندێ پیازی تێدەكرێ و پاش كوڵانی بە شلی دەخورێ.

**٥. برنج بە شیر:** یەكەم جار برنجەكە بە ئاو دەكوڵێنن ئینجا هەندێ شیری حەیوان دێنن و لەناو برنجەكەی دەكەن جوان تێكی دەدەن تاوەكو تێكەڵاو دەبێ پاشان بە شلی دەخورێ.

**٦. نیسک بە پەرپینە:** پەرپینە جۆرە گیایەكە لە ناوچەی خۆشناوەتی لە نێو باخچەكاندا بۆ خۆی شین دەبێ، هەندێكی لێدێنین جوان هوردی دەكەین، ئینجا دەیكوڵێنین لە پاشان هەندێ نیسكی تێدەكەین لە دوایی كەمێک پەسیرە دەكوشین و ئاوەكەی لەناو دەكرێ تاوەكو دەكوڵێ، بە شلی پێشكەش دەكرێ.

**٧. گەنم بە پونگ:** یەكەم جار هەندێ گەنمە كوتاو دێنین و دەیكوڵێنین پاشان پوونگی تێدەكەین تاوەكو جوان تێكەڵاو دەكرێ ئینجا ترشاوی سماق حازر دەكەین ئەویشی تێدەكرێت تاوەكو پێكەوە دەكوڵێن و لە دوایی بۆ خواردن ئامادە دەبێت.

**٨. گیای برژانێ:** جۆرە گیایەكی بەهارییە پاش چاک كردنی لەسەر ئاوی گەرم دەكرێ و دەبێ زۆر بكوڵێ تاوەكو نەرم دەبێ، ئینجا دەیپارزنین و جوان دەیكوشین دوایی لەسەر روون و پیازی دەكەین.

**٩. سمرکە:** ئەمیش جۆرە گیایەكە پاش كوڵاندنی دەیپارزنین و دەیكوشین لە دوایی لەسەر هێلكە و رۆنی دەكەین.

**١٠. گۆرمزە:** جۆرە گیایەكی بەهارییە پاش كوڵاندنی كە دەبێ كەم بیكوڵێنین دەیپارزنین و دەیكوشین پاشان لەسەر هێلكە و روونی دەكەین.

**١١. كاردی:** بەوە ناسراوە كە گیایەكی بەهارییە و هارە، یەكەم جار ترشاوی سماق حازر دەكەین و دەیكوڵێنین تاوەكو كەفی لێهەڵدەستێ و فرێی دەدەین پاشان كاردی لە ناو سماقاوەكە دەكەین لێی دەگەڕێین تاوەكو بە كوڵ دێ، پاشان دەیپارزنین و لەسەر روونی قرچاوی دەكەین.

**١٢. كوارگ:** لە دەڤەری خۆشناوەتی چەندین جۆری هەیە لەوانە كوارگی بن عەردی - كوارگی گێ بەرخە - كوارگی حەسیر - كوارگی چیایی - هەر هەموویان بەم شێوەیە حازر دەكرێن، سەرەتا دەیشۆرینەوە و هوردی دەكەین ئینجا دەیكوڵێنین، پاشان دەیپارزنین و لەسەر هێلكە و روونی دەكەین.

**١٣. ساوار بە كوڕادە:** كوڕادە جۆرە گیایەكە یەكەم جار ئەو هورد دەكەرێ دوایی بە ئاوەوە لەسەر ئاگر دادەنرێ لە پاشان هەندێ ساواری تێدەكرێ، پاش ئەوەی بە یەكەوە جوان كوڵان دەیانپارزنین و هەندێک روون دەقرچێنین و بەسەریان دادەكەین ئینجا دایدەنێین دێم بێنێ. جگە لەم خواردنانەی كە لە سەرەوە باسمان كرد هەندێ خواردنی دیكە هەن كە تایبەتە بەم ناوچەیە، زۆربەیان لە تەڕە و مێوەجات دروست دەكرێن، وەكو ترش و شیرین، كە بریتییە لە ترێی ترش، هەروەها سركەی هەنار و سێو و جۆرەها مرەبا وەكو هەنجیر و هەرمێ و گەراز و ترێ و هەرچووكە و باینجان هەروا ئانەقەیسی و ئانە گەراز و ئەستووركە هەنجیر و مێوژ.

*** ئەم بابەتە لە گۆڤاری ئاسۆی فۆلكلۆر، ژمارە ١٤، ٢٠٠٥ بڵاوبۆتەوە.**

# گۆرانیبێژەکانی کۆیە

تاهیر ئەحمەد حەوێزی

ئەو گۆرانیبێژانەی کە ناویان دەنووسین، هیچیان لە ساڵانی پێش (١٨٥٠) تێناپەڕن، بێگومان هی رابردووش هێجگار زۆر بوون، بە خۆیان و دەنگە خۆشەکەیانەوە، لە ئێمە ون بوون. دەبێ تەنها ئاهی ساردیان بۆ هەڵبکێشین و دەستی حەسرەتیان بۆ لەدەستی بدەین.

ئەوەندەش کە دەیان نووسین، زۆرتریش هەبوون، بەڵام جارێ هەر هێندەم دەست کەوتووە:

شتی سەیر لە هەندێ لەم گۆرانیبێژانە دەگێڕنەوە، پیاوی وەک: (قادر ئۆمەری قاڵە)ی، لەناو رەزان لەکاتی بەهاردا، کە گوڵەباغ پشکوتووە، گۆرانی گوتووە، لەکاتی گوڵچنیندا، بولبول لەسەر سەری نیشتووە!.

گۆرانیبێژی وا هەبووە، لەناو رەزەکان دەنگی بڵند کردووە لە (قشڵە) گوێیان لە دەنگی بووە.

عەولای قادرۆکی، ئۆمەری حەمدی خاڵی، عەبدوڵڵای حەمدی خاڵی، ئەحمەد لەیلە، مستەفای ئۆمەری قالەی کەمەندی، قادری ئۆمەری قالەی کەمەندی، دەروێش حەمدی قالەی، حەمەدئەمینی قادری مام تەها، تەهای خەلیلی، حەمدی گارفێنی، نەشئەتی رەشید ئاغا، قادر حەمەد، قادر حەمەد عەبدوڵڵا، حەمە عەربەی گەڕەکی هەوا و ئەو سێیانە بەستەی کۆنیان دەگوت. مەلا ئەسعەد و مەلا سەعید کوڕانی مەلا قادر (چارگا و سێگا)یان دەگوت، (کەمال) خاڵی سەعید فەهیم، ئەحمەدی مەلا شەمسی غەفووری، مەلا رەسوول بێتووشی (غەزەل)یان دەخوێندەوە.

حەنیلە خڕە، سێوە، سەعیدی فەقێ رەسووڵ، ئەمینی فەقێ رەسوولی، واحیدی موختار بەستەی (ئەمین ئاغا)یان دەگوت، تۆفیقە درێژ، سمایلە خڕە.

تۆفیق خالیدی[1]، عەلی عەبدوڵڵا خاڵی سەعیدی فەقێ رەسوولی، سەید ئەحمەد شێخ نەجمەدین کوڕانی شێخ عەبدولکەریم، شێخ نەجمەدین لەگەڵ تاقمە سوارێک دەچنە (بێتواتە)ی کە ژنی بۆ (شێخ محێدین)ی کاکی بێنن، کە دەگەنە ئاقاری (بێتواتە) شێخ نەجمەدین هەڵدەکاتە سوارۆ، خەڵکەکە لەبەر دەنگە خۆشەکەی، هەموو حەیران دەبن، لە (کەبار) کردن و بانگدانیشدا دەنگی خۆش بووە.

عەولای موسا، شەریفی شازەمانێ، سلێمان شێخ محەمەد، قادر حەمەد گەڕەکی بایزاغا، حوسێن-کە بە حوسەی حەبەتۆز دەناسرا، رەشیدی حەمە خالیدی، باپیرە کەر، حەمەدئەمینی مەلا رەسوولی بەفریقەندی مشکی مۆر هەر لەوی دەوەشاوە، عەبدولرەزاق حەمە مەلا.

لە پیاوانی ئایینی دەنگخۆش: حاجی مەلا عەبدوڵڵا، حاجیەفەندی، مەلا عەبدوڵڵای مەلا یاسین، شێخ عزەڵڵا تاڵەبانی، حاجی مەلا مەعسوم ئەفەندی.

(رەفیق)ی چارچاوی: کوڕێکی قۆز و لاوچاک و کاتب و دەنگخۆش و شاعیر بوو ماڵی باوکی لە جێ خانی (ئەسعەد)ی (کاکەڵڵا)ی بوو، لە نزیک حەمامی ناوەندی باوکی ناوی (ئەسڵان ئاغا و خەلقی سلانیک بوو، لە کۆیە هەر باوکی عەینەکی لەچاو بوو، بۆیە پێیان دەگوت (چارچاوە)، باوکی یوزباشی چەغماغچی عەسکەری بوو کوڕەکانی شەوقی، شەوکەت، تۆفیق، رەفیق، ئەمەیان تەوەلودی کۆیە بوو، لەقەبی شیعری خادیم بوو، قورئانی خۆش دەخوێند، ئەم جووتە شیعرە هی ئەوە:

**ئەگەر یارم بکا نیمی نگاهی**

**خادما شەرت بی**
**بكەم تەركی سەرو ماڵم وەكو**
**مەجنون لەبۆ لەیلا**

رەفیق (٣) دەنگی هەبوو، دەنگێكیان هەر مەجلیس گوێی لێدەبوو، دەنگی دووەم، كیلۆمەترێك دوور گوێیان لێدەبوو، دەنگی سێیەم (٣) كیلۆمەتر دوور گوێیان لێدەبوو، توركی بگوتبا دەتگوت (ئەستەنبۆڵییە) ئاوازی عەرەبی بگوتبا دەتگوت (بەغدادیە) فارسی هەروەها، زۆر چەشنە هەوای كوردستانیشی دەزانی.

شەوێك لە ماڵی مەلا ئەحمەد ئاغای مام سلێمانی مەولوودێك كرا، شێخ محێدین مەولوودەكەی دەخوێندەوە، سەید ئەحمەد و شێخ نەجمەدینی برایانیشی (تەنزیل)ەیان دەخوێندەوە.

بەو ناوەی رەفیق ناوی دەركردووە و چی وا نازانی، شێخ محێدین دەڵێ: "رەفیق دە (لەبەر نازی چاوبازانێك) بڵێ"، كە ئەو وەختی لە مەولوودان بەستە و غەزەل یەعنی شتی غەرامی نەدەگوتران، كە مەولوود دەخوێندرایەوە، كەس نەدەبووایە جغارەش بكێشی، رەفیقیش راستێك دەڵێ، كە پێكهاتبوو، لە ١٢ مەقام و ٢٤ پارچە و ٤٨ شوعبە. ئای ئایەكیشی بۆ گوت، ئەو عالەمە هەموو سەرسام بوون، حەمە ئاغای غەفووریش، كە لە مەولودییەكە دەبێ دەڵێ: "هەرامە ئەوە كوڕی كێیە؟" ئیدی هەرچەند جاری رەفیق شتێكی بگوتبا، حەمە ئاغا سەری خۆی لەبۆ رادەژاند، بە شێخ محێدینی دەگوت: "هەرامە، جارێ ئەتو كتێبەكەی پێوەبدە!".

رەفیق زۆر حەزی كردبوو لە دەنگی (عەلییە) خەڕەی پوورزای حاجی قادری پەرەكەر. لەناو رەزی لەبن هەنجیران، بە مندالی گۆرانی دەگوت، رەفیق خۆی لە پەنای مات دەكرد، دوایی خۆی لێ ئاشكرا دەكرد و پێیدەگوت: "وەرە لامان دەنگت زۆر خۆشە، فێری وەستاییت دەكەین" بەڵام نەدەچووە لایان.

باوكی حاجی قادر رەفیقی لە (مێردین)ی دەبینێتەوە، سەری سپی ببوو، زۆر گۆڕابوو، پێیدەڵێ: «ئەوە بۆ وات لێهاتییە؟» دەڵێ: «مام حوسێن بڵێم چی؟ ئەوە وامان لێهاتووە!».

لەپاش سەفەربەرلگ وەختێكی لە توركیا بووبووە قائیمقام، لە جەزیرەی ئەمری خوای كردبوو، دەڵێن: «بولبول لەناو رەزان بە دەنگی رەفیقی بەربوویتەوە!».

**لە دیانەكانیش دەنگخۆش زۆربووە:**

پووتە، كە مامی سێوەی بووە، ئەمین ئاغا لێی عێجز دەبێ، دەنێری گۆرانیبێژێك لە سلێمانییەوە دەهێنی، لەناو رەزان دادەنیشن، كابرا گۆرانی دەڵێ، پووتەش لە پەنا دارێك خۆی مات دەكا، تێهەڵدەكاتە گۆرانییەك لەگەڵ چریكەی گۆرانی، كابرای تر مات دەبێ، ئەوجا ئەمین ئاغا لەدوای دەنێرێتەوە و لەگەڵی چاك دەبێتەوە.

پووتە برایەكی دەمرێ، زۆری خۆش دەویست، نزیكەی (٢٠٠) موسڵمانیش لە كۆیەوە، لەگەڵ جەنازەكەی دەچنە هەرمۆتە. پووتە دەڵێ: «گوێ بگرن، لەدوای برایەكەم، ئەوە ئاخر جارە، كە گۆرانی بڵێم» گۆرانییەك دەڵێ، ئەو عالەمە كەس خۆی پێ ناگیرێ و لە قوڵپەی گریانی دەدەن، ئیدی لەپاش برایەكەی چیتر گۆرانی ناڵێ.

حەنیل كوڕی مەتی وجاغكوێر بوو، مەرێتێن وجاغكوێر و خەڵقی سلێمانی بوو لە كۆیە مردووە، دەشێ ئەویش هەر دیانی لای كۆیە بووبێ، چونكە دیانەكانی سلێمانی-كە لەوێ گاوریان پێدەڵێن-دیانی هەرمۆتەی بوون چوونە سلێمانی.

سێوە: زۆر كەس بە دەنگی سێوەی خەوی لێكەوتووە، سێوە هەتا جاحێڵ بوو دەنگی لە كەلەی دەهاتەدەر، وەكو پۆڵا زرینگەی لێوە دەهات و دەلەرییەوە، زۆر وەستا بوو[٢].

وەختی خۆی (حەنیل)ە خڕە، كە لە ساڵی ١٩٣٧ ئەمری خوای كردووە و دەنگی زۆر دەڕۆیشت، بە سێوەی گوتووە «ئەوە چییە گووت لە مەقامەكان كردووە؟» سێوەش دەیگوت: «حەنیل لە هەر كەلیمەی دە شەقی تێهەڵداوم هەتا فێربووم، ئێستاش هەرچی راست دەبێتەوە دەم تێدەدا و دەڵێ: گۆرانیبێژم!».

سێوە دەنگی بە زەمزەمە بوو، خرار و توورەگەی دروستدەكرد، مجێوڕ و خوێندەواری كەنیسەی بوو، ئەو مەقامانەی لە ئێستگەی بەغدا بەشی كوردی تەسجیل كردووە: ئایشە گوڵ، محمر، كراسی شەنگ مێرەم، شەنگێ، ماوەیەكی مەلا حەوێز ئاغا یارمەتیدەدا، شەوان لە دیوەخانەكەیدا شتی دەگوت.

(گۆمی چەلی) یا (گۆڕەی

چەلی) گوتووە، (پێش بارە، پێش بارە)ی گورج و خاویشی گوتووە، (شلە و خانان) و (زالم) و (نیوە شەوی) لەگەڵ مەلا ئەسعەد زۆر گوتووە، وەختێکی سێوە بووە کاتبی حەمە زیاد ئاغا و وەکیلی عەنباری گەنم و جۆی.

لە ئاهەنگی ئیجازەی فەقێ و مەلایان، لە مزگەوتان بەشداری کردووە، لە شەوارەی ماڵە دۆستان بانگ کراوە.

سەعدی ئاغا، قالە کەچەڵ، مەلا ئەسعەد، کەلی سەرگرمە و لە کەپرانە و شەماڵیان زۆر دەگوت.

سمایلە خڕە و حەمەدئەمینە گۆجە باغچەمزەیی ئەمین ئاغایان دەگوت، عەولای قادرۆکی گەڕەکی قەڵاتێ، کە لەسەر ڕەزی حاجی فەتاح ئاغای غەفووری بوو، نیوە شەوی دەگوت. (مەڕێن)ی قەشەی زۆر دەنگخۆش بوو.

باپیرە کەڕ برای عەلی دووپێی گەڕەکی قەڵاتێ، ڕەنجبەری دەکرد و وجاغکوێر بوو، ژنێکی جاحێڵی هەبوو، پێوەی دانەدەنیشت، ماوەیەک لە ماڵی (موفتی)ش ڕەنجبەر بوو لەپاش بۆمبەردومانی، لە تەمەنێکی (٦٠) ساڵی ئەمری خوای کرد، ئەم بەندانە و ئیتریشی دەزانی: ناسر و ماڵ ماڵ، کاکە مەم و خاتوو زین، ساڵح و کەژێ، (قەر) کە کوڕی ئەحمەد پاشای قاجار بوو، (مەمێ زەرد)....

ئەسعەدی فەقێ مستەفای بەفریقەندی، فەقێ عەلی باوکی کێخوا عومەر، کە بە عەلییە گۆج دەناسرا. مەلا کەریمی پۆلیس، کە گەڕاوە سابلاغ، سۆفی عەبدوڵلا و مەحموود و مستەفا کوڕانی حەمشینی گەڕەکی هەواو لە سەلاوات و بانگداندا، و فەقێ ڕەسوول موئەزینی مزگەوتی گەورە، یەکێکی کورتیلەی خڕیلەی دەنگ قەبە و خۆش بوو، لە گرانییەکە لەلای میر سەیدی لە برسان مرد، مەلا حەبیبی سورقاوشانی، ڕەشید و قادر کوڕانی مام حوسێنی لبادچی، عەبدولڕەحمان مەلا شەمسی، وەستا حەسەنی لبادچی، تەها کوڕی وسوو- چەرچیەتی دەکرد، حەمەدی کوڕی جانبازیەتی دەکرد، کەر و ولاغی لەگەڵ تەهای خەلیلی دەکری و بۆ فرۆشتن دەیانبردە هەولێرێ، لە سەفەربەرلگی نەهاتەوە، تەهای باوکی لە تاوان وەزگیدا.

حەمەد خۆشناو: قاوەچی ماڵی سادق ئاغای غەفووری بوو، لاوک و حەیرانەی باشی دەزانی، سەعیدی قادری مەلا وەیسی: کە لە سەفەربەرلگی بە سەعید قانوون دەناسرا، قەسابی گەڕەکی قەلاتێ بوو، کەوتە شەقلاوەی، دۆستی کاویس ئاغا بوو، دەنگی خۆش بوو، لە قەوانێکدا یەکێک دەڵێ: «ئافەرین کاویس»، (لە چاوی عەلی فلەیح» ئەمە قسەی (سەعید قانوون)ە، وەستا قادر و وەستا مەجیدی برای کە سۆلدروو بوون،

(حەمەد عەنیف)ە، لەپێشان پیاوی حاجی جەلیل ئاغا بوو، دوایی کەوتە گومرگ، لاوکی خۆشی دەگوت، کوڕێکی هەبوو مرد، بابەکەی لە تاوان تۆقی کرد، ژنەکەی ناوی عیسمەت لە گەڕەکی (هەواو) بوو، زۆر کاسب بوو، هەرچی لە (ئیدارە)ی پەیای دەکرد، لە کوڕەکەی خەرج دەکرد، کوڕەکەی ببووە سێی ئیبتدائی، ژنەکەی زۆر پیربوو، منداڵی تری نەبوو.

سابیری عەدوولی ئەحمەشینی: لە سەفەربەرلگی لەلای ئاشی حەمامۆکی کوشتیان، لاوکی دەگوت، مێرەمی دایکی هەر ئەو تاقە کوڕەی هەبوو سەیدەوانەی[٣] باش دەگوت.

(قالە گچکەلی ئەمین چاوشینی): غەزەلی دەخوێندەوە، عەلی وەسمانی شێخانی، عەبدولواحیدی موختار و حەمیدی برای، ئەحمەدی برازای حەمە خێلی فەقێ ئۆمەری لە حەیرانان، وەستا غەفووری خەیات تەنزیلەی دەگوت. حوسێن حەمەد: کە بە حوسەی حەبەتۆز دەناسرا، گەڕەکی قەلات، دەنگی خۆش بوو، لە شایی و ئاهەنگ و بووک هێنانان، لەگەڵ مەلا ئەسعەد و هیتر بانگدەکرا، لەپێشان قاوەچی بوو، لە سەفەربەرلگی ئینگلیز بە دیلی دەگیرێ و دەینێرنە هندستان، کە هاتەوە لە چایخانەی حەکیمی گۆرانی دەگوت، وەختێکی زۆر کورت بوو، لە پردێ لە ساڵی ١٩٤٣ ئەمری خوای کرد، ژنێکی هەبوو ناوی (عەیشێ) شێتۆکە بوو، ئەم چەند قەوانەی دەرپناوە:

(لێدەن دەردی حەلۆکی)، (هە کاروانە کاروانە)، (لەیلێ هەی وایە)، (ناچمە دیانان، گوندی فەلانە)، (چوومە ماڵی حاجی عەلی، تێرم نەخوارد نان و قەلی، خاتوونێ لۆلکێ).

(حەبە) ناوی داکی بوو، وەختێکی پیاوی حاجی عەوڵلا بەگ بوو: (نەینۆک دانا سەر چۆکی،

لێدەن بەزمی حەلۆكی) (مەمدەن بە تایەر خۆم دەخنكێنم، بمدەن بە عەولا بەگ قەندەک دەشكێنم) قەدەرێكیش لەكن مەلا رەئوفی دەبی، لە (پردا) لەبن دار عەمودەكی راوەستا بوو، رادەقەنێ و ئەمری خوای دەكا، لەوێش دەنێژرێ، خوشكێكی هەبوو ناو (غوربەت) لە گرانییەكە مێردی بە شیلانەییان كردبوو.

باپیرە كەرِ بەیتی (سالّح و كەژالّێ)ی باش دەزانی، (وسوو) باوكی (عەزیز)ی عەمبالّ بەیتی (مێر و وەفای) باش دەزانی، (مێر) ناوی (مێرەم) و (وەفای) عاشقەكەی بووە.

(مەلای حاجی مینی) كە ئێستا مالّی لە قەلآدزێیە، سلێمان كورِی ئاورەحمانی ئەحمە سەلكی، شێخ ئەنوەر، شێخ جەلال، شێخ جەمال كورِانی سەید ئەحمەدی بەرزنجی، حەمەدئەمین عەباس، باقی سالّح، باكووری، خالید دلێر، رەشید حەیران، رەسوول ئەفەندی خدر.

تاقمێک لەپاش عەسران دەچوونە دەم رووبارەكان، لەناو هەندێ رەزان تا درەنگ بە گۆرانی و مەقام و بەستەگوتن رایان دەبوارد، (شلە و خانان) و لە باغان ئاه و نالّینیان دەگوت، زۆر غەزەلی: ئەمین ئاغا و سافی و تاهیر بەگ و وەفایی و مەیلی و عەونی و ئیتریان دەگوت، هەروەها كۆرِێكیان پێكەوەنابوو، وەک: سێوە، مەلا ئەسعەد، ئەحمەدی حەمە مەلای، عومەری مام عەولآی، تاهیر تۆفیق، مەلا ئەحمەد، ئەحمەدی مەعروفی كرۆسكی خمخانەچی، حەمە رەشیدی كورِی ئەمینی رەمۆكان-كە بە حەمە رەشیدی شێرزادی دەناسرا زۆر زەوقانی و دەنگخۆش بوو.

زۆر ئافرەتی دەنگخۆشیش هەبوون، كە لە مەولوودان، تەنزیلە و غەزەلیان خوێندۆتەوە، وەک: (ئامەی فاتمی)، گولّێ كچی وسووی كەمەندی، جەمیلەی حاجی رەسوولّی، ئامینەی ژنی خەلەف چاوەشی....

بەهۆی نەشیدەكانی مەكتەب، زۆر قوتابی دەنگخۆش پەیدابوون، ئێستاش بەهۆی تیپە هونەرییەكان، گەلێ مۆسیقاژەن و دەنگخۆش لە كچ و كورِ پەیدابوون، بە تایبەتی تیپی باواجی....

حاجی قادری پەزِەكەر و عەلی سەمەنی ئامۆزای و رەشیدی برای ئاوازەكانی ئەمین ئاغایان لە ئیجازەی فەقێیان دەخوێندەوە، مەلای گەورە دەیفەرموو: «مێزیان لەبۆ دانێن، با جێیان بلّند بێ، كە ئەو ئاوازانەیان دەگوت، مەلای گەورە لە خۆشییان دەرِۆیشت!».

رۆژێكی مەلا ئەسعەد دەچێتە دوكانی حاجی قادر و پێیدەلّێ: «فلآنكەس ئەتوو چابوو خۆت نەجاتدا» دەلّێ: «راستە ئەمن كاسبییەكی دەزانم حالّم خۆشە، بەلآم ئەتوو ناچاری، چونكە چ ئیشت پێناكرێ» دەلّێ: «مردەنییە، ئەمن لای خۆم ئەوە لەبۆ توو مقامێكی لەبۆی هەستاوم، یەكێک لەناو مەجلیسەكە، دەنگ بلّند دەكا و دەلّێ: «ئەوەی ببرِدوە، كراس زەردێیەكی بلّێ!».

یا جارێكی ئەوە خۆم كوشتووە، مقامێک دەلّێم، گەیشتمە نیودی تف لە دەما وشک بووە، ئاگری لە قورگی بەرداوم، كچی كچێک لە پەنجەرەیەكا سەری دەرێنا و دەلّێ: «وس، وس، ئەوەی بلّێ: خوام بە قوربانی ئەو حەوز و ئاوە، كە تۆ لێی دەشۆی ئەو دەم و چاوە»، گوتم: «كچم بە خوای ئەمن خۆم بە قوربانی ئەو چلّكاوەی ناكەم، كە لە دەم و چاوی تۆ دەرِژێتە خوارێ!».

حاجی قادر گوتی: «زەوقی ئێستا لەگەلّ جاران زۆر گۆرِاوە، تەلەفزیۆنی بەشی كوردی و ئێستگەی بێتەلی كوردیش، لەبەر دووبارە و سێبارە كردنەوە، بەو كابرایەی دەچێ، كە شایی بۆ ژنان دەگێرِا و چی پێنەبوو، هەر دەیگوت: «لەوەی دەنێم، لەوەی نانێم!».

فەقێ ئەحمەد: ناوی (ئەحمەد حەسەن ئەحمەد)ە، دایكی ناوی زولەیخا بووە، لە سالّی ١٩١٤ لە گوندی سماقە لە دایک بووە، بە منداڵی هەتا نۆ مانگیش چاوەكانی ساغ بووە، كە شتیان داوەتێ یا لێیان ستاندووە، شتی بە چاوەكانی دیوە، لەبەر زریكە و گریانی چاوەكانی نەماوە، كاتێكی كە بەسەر پێیان دەكەوێ، تەماشادەكەن دەكەوتە ئاگردانی، یا سەر لە دەركەی دەدا بەوەی دەزانن، كە چاوەكانی كۆر بووە.

چاوی راستەی وەک هی چەپەی كەمەک دەكراوە، بەلآم دختۆران لێیان سەقەت كردووە، زۆرجار چاوەكانی ئاوی كردووە و دەرمانی تێكردووە، دختۆرە ئینگلیزەكەی كە هاتوچۆی سلێمانی و هەولێری دەكرد، لەپاش فەحسێكی دوورودرێژ، پێی دەلّێ: «چاوەكانت بیناییان نەماوە!».

زۆری ژیانی لە گوندی ئێلنجاغی

گەوره رابواردووه، هەندێکی خوێندووه، بەڵام لێدانی زۆر پێکەوتووه، خێرومەندێک لە گوندی پێیدەڵێ: «بچییە شاری بۆ تۆ باشە، بۆ خۆت لەوێ دەژی و خەڵک خێرت پێدەکەن».

دێتە کۆیە و دەچێتە تەکیەی تاڵەبانییان و ماڵی (شێخ ئەدیب)ی، ئەو ساڵی کە مەلیک فەیسەڵی یەکەم ئەمری خوای کردووە، تەمەنی (٢٠) ساڵان بووە، گوتی: «مەلا ئەورەحمانی موئەزینی مزگەوتی گەورە هەندێ قورئانی پێگوتم، کە بۆ من زۆر کاریگەر بوو لە ژیانم، و لەگەڵ خۆی دەیبردمە مەولوودییان، زۆرجار لەگەڵ مەلا محەمەدی حەتکی دەچوومە رەزی شاخی مشکە بۆ لای سۆفی سەدیقی باغەوان، باوەشێک گوڵەباغی لەبەردەمی دادەناین».

(مەلا ئەحمەد)یشی پێدەڵێن، تا ئێستا (٣) ژنی هێناوە، لە (فاتم)ی تاقە کچێکی هەیە بە مێردی داوە، خۆی دەڵێ: «ئەمن ئەو هەموو قاشۆیانە، بۆ گۆیان دەوەشێنم، جارێ چ فایدەی نییە!».

حەیرانەی زۆر خۆش دەزانی، (مەولوود)ی حاجی مەلا عەبدوڵڵای جەلی لەبەرە، جاری وا هەبووە، شەو و رۆژ دوو مەولوودی خوێندۆتەوە، دەنگی بە سۆز و خۆشە زۆر غەزەل و بەستەی لەبەرە، دەنگی زۆر تەسجیل کراوە، بە دەفەکەی تەواو گەرمی دادەنێ، دڵی کەس ناشکێنێ، هەتا لەو ساڵانە، ماندیبوونی نەدەزانی، زۆر شارەزای شارەکەیە، زۆر کەسان بە دەنگ و هەندێکیش بە دەست لە دەست خشاندن دەناسێتەوە، ئێستا قورئان خوێنە لە (مەحفەل)ی مزگەوتی گەورە.

گوتی: «جارێکی لەگەڵ مەلا ئەسعەد بە بەردەرکەی ماڵی حاجییە گەورەی تێپەرین، مەلا ئەسعەد لە تەندروستی پرسی و هەندێ لامان دا، مەلا ئەسعەد شتێکی گوت[٤]، هەتا لێبۆوە، حاجییە گەورە هەر دەیگوت: «ئەوە وانابێ، وادەبێ» ئەمنیش عەشەرە قورئانێکم خوێند، دەستی بە گریانی کرد و هەر لە رانی خۆی دەدا، گوتم: «بریا هەر نەم خوندبا»، گوتی: «قورئانم چەند چاک لەبەر بوو، ئێستا چاوم کۆرە بووە و چم لەبیر نەمایە».

### دەنگخۆشی فەقێیان

دەیانگوت: «فەقێ بۆیە دەنگیان خۆشە، چونکە سیسرکەی دەخۆن» ئەو سیسرکەی کە لە بەهاران و هاوینان لەناو ماڵی قەدیە، بە تایبەتی کە دنیا تاریک دادێ و شەو رادەکشێ، لە کون و کەلێنان دەیانخوێند، کە نەدەدیتران و نیشانەی چۆڵ و هۆڵی و بێدەنگی بووە».

(ئەگەر بیانویستبا دەنگی دەنگخۆشێک بخەن، بە فیلێک کلیان داوەتێ).

(مەلا عەزیز)ی شاخە پیسکە، لە (هیران)ی دەیخوێند، لە دەورکردنەوەی (سیوطی) و (کافی) لە سەعات چواری عەرەبی شەو، لە ترسی ژنان، دەوری دەکردەوە، لە سەربانی مزگەوت و حوجرەکە، کە خەڵک دەنووستن، دەستی پێدەکرد، خەڵک کە گوێیان لە دەنگی دەبوو، دەستی لە ئیشێ رەق دەبوو.

دە ژن بە لانکەوە، تا منداڵیان نەگرێ، لەگەڵ خۆیان دەبردە باخچەی (واحید بەگی هیرانێ) تا نەگرین، ئەوە بێجگە لەو ژنانەی منداڵیان نەبوو، بۆ ئەوەی گوێ لە دەنگی (مەلا عەزیز) رابگرن، لە بۆ بەدینیش یەکەم بوو، هەتا دوو سەعاتی شەو دەما، ئەوە بەو دەنگە خۆشەی دەوری دەکردەوە.

### هەندێ دەنگخۆشی گوندەکان

مەحموود حەمەد ئێلنجاغی گەورە، (عەبدوڵڵا مارفی) پێبازۆکی لە (بەندان)، (مەلا رەزای سادق)ی لە بانگدانا.

(فەتاح مستەفا)ی شیوەجانی لە مەقامی بەکرەیی دروونەی یەکەم بوو، لاوک و حەیرانەی چاک دەزانی و زێدە سەپانی چاک بوو، خوشکی تێلەکێشی بوو، سوارە (مەلۆ)ی گەفی قەندەهاری تێلەکێش زیاتری پێهەڵنەگیراوە.

فەتاح بە تێلەکێشی گوتووە: «من کە دووریمەوە، ئەتۆ بیکە بە (گەلاوێژ)، بزانم دەرەقەتم دێی «هەتا بەری بردە سەرێ، ئەو ژنە لە دووی گەلاوێژی کرد، ٢٠-٢٥ ساڵە ماوە، کە فەتاح بەرەی گەیاندۆتە سەرێ.

لەو ساڵانەی دوایی مەلا حەوێز ئاغا و حەمە زیاد ئاغا وەکو ئەمین ئاغای ئەختەر، شەوان لە دیوەخانەکەیاندا، گۆیندەیان دادەنا و گۆرانی خۆش خۆشیان دەگوت و مێزیان بۆ دەرازاندنەوە، (سێوە، مەلا ئەسعەد، ئەحمەدی حەمە مەلای) و هی دی بەشدارییان دەکرد، باروبووی (سێوە و مەلا ئەحمەد)یان دەکرد، بەڵام ئەمە زۆر دەوامی نەکرد،

جەنگی دووەمی جیهانی بەسەرداهات، ئەو بەزم و رەزمە نەما، ئەحمەدی حەمە مەلای دوکاندار و حاڵ خۆش بوو، هەرچەند لە زۆر ئاهەنگەکان بەشداری دەکرد، بەڵام ئەگەر خۆی هەوەسی نەبا، کەس نەیدەتوانی بە زۆر پێی بڵێ.

(سێوە و مەلا ئەسعەد و تاهیر تۆفیق) پێی ناوێ من چیان لەسەر بنووسم، چونکە زۆر ناسراون و زۆریشیان لە سەر نووسراوە.

(کاک ئەحمەد)یش، جێگای چۆڵ نییە، وا (وریا ئەفەندی) کوڕی، لە مۆسیقا و وتن و ئاوازدانان و لێکۆڵینەوە، دەستێکی باڵای هەیە و بێ وێنەیە.

**دەنگخۆشە زیندووەکان:**

سەلاح محەمەد، حەمەدئەمین عەباس، باقی ساڵح، باکووری، خالید دلێر، مەجید سمایلە خڕە، عەلی سەمەنی، پەلەی سێوەی، ئامە شەل، عەبدوڵلا.

محەمەد عەبدوڵلای چایچی لە دەنگ تەسجیل کردنی گۆرانیبێژەکان دەستێکی باڵای هەبوو، زۆر شەوان لە ماڵی خۆی کۆی دەکردنەوە و شتی خۆشی دەرخوارد دەدان و دڵگوشادی دەکردن، بە شریت و دەنگەخۆشەکان گازینۆیەکەی کردبووە جێگای لاوان، خۆی هەوەسی زۆر لە دەنگی (ئوم کەلسوم) بوو، نزیکی هەموو گۆرانییەکانی هەبوو، بەپێی وەقت لێی دەدان.

**قسەخۆش و سوحبەتچییەکان**

حەمەدئەمینی سۆفی سمایلی، پلکە سوراحی کچی حاجی بەکر ئاغا، خومەیسی، عەبۆی عەمبەرێ، مەلا سەعدە کەرە، تەهای مەعروفی گولانی، کە عەمبالی حاجی ئەسعەد ئاغا بوو، دەللی فاتە، ئامینەی قالەی، عەیشێ زەلام کچی حەمە ئاغای، ئەحمە رەشی وەسمانی، حەمەد حەبیبی رحانێ، حەمەدئەمین حەمە چاوەش، ساڵحی ئۆمەر شەمامی، حەمەدی وەستا تەهای، ئەسعەدی مەلا مستەفای، مەلا سمایلی حاجی مەلا مینی، مام ئەورەحمان مل درێژ، مستەفا ئاغای محەمەد ئاغا، وەستا حەمەدئەمین.

**خەتاتەکانی کۆیێ تا ساڵی ١٩٧٠**

حاجی مەلا ئەمین، دکتور عەبدولرەحمان نورجان، محەمەد عەبدولواحید، عومەر جەلال حەوێزی، عەزیز جەلال حەوێزی، سەدیق نورجان، مەسعود محەمەد، تاهیر سەعید، عیزەت تاهیر، فاروق مەلا محەمەد، کەریم مستەفا ئاغا، جەلال نەجیب بێتووشی، جەلال حەوێز حەوێزی، زەکی ئەحمەد، دلشاد نەجیب، نوری عەلی، سەلاح حوسێن، عەبدوڵلا حاجی مستەفا، موسلح حەمەدئەمین، ئازاد بیلال، فەرهاد بیلال، دلاوەر تاهیر حەوێزی، جەوهەر حەوێز.

**وێنەکێش**

دلشاد نەجیب، کەیفی باپیر، کەمال ئیسماعیل، حەمە عەلی عومەر کەریم (مومیاچی)، محەمەد سۆفی مەولود، کەمال سادق، حەمەدئەمین مەعروف، کەریم حەمەد.

**پەراوێزەکان:**

١- لە غەزەلی فارسی.

٢- جارێکی کاوێس ئاغا و سێوە لە چایخانەی سەعدی ئاغا گوتنی دەڵێن، کابرایەکی دەروێش بە دەفەوە پەیادەبێ و شیعری ئایینی دەڵێ، تا خەڵک خێری پێبکەن، سێوەش بە گۆرانی و بەبێ دەفە جوابی دەداتەوە، لە ئاخری دەروێش دەرەقەتی نەهات و ڕۆیشت.

٣-(سەیدەوانەم ڕۆ، مەلکەوانم ڕۆ، نێچیری بازان نەوشێروانم ڕۆ...) باب و کوڕێ بوون دەچنە ڕاوێ، کوڕەکەی بزنە کێوییەکی گەورە ڕاودەکا و پێستەکەی لەبەر خۆی دەکا و لەبۆ بابی دێ، لە بابی وابی حەیوانە، تەقەی لێدەکا، کوڕەکەی دەکوژێ، مەیتەکەی حەوت ساڵان لە کوڵێ دەکا و دەگەرێ و ئەو بەیتەی پێهەڵدەڵێ....

٤- جارێکی کاک مستەفا هیرانی لە دیوەخانی (مەلا حەوێز ئاغا) دانیشتبوو، مەلا ئەسعەد دەشتییەکی دەگوت، کاک گۆچانەکەی دابووە بەر سەری و سەری خۆی داخستبوو، بە تەواوی گوێی دابوویە، لە شوێنێکدا مەلا ئەسعەد غەڵەتێک دەکا، کاک دەڵێ: «ئەسعەد بگەرێوە» ئەویش دەگەرێتەوە و ڕاستییەکەی دەڵێ.

* ئەم بابەتە لە کتێبی (مێژووی کۆیە)ی تاهیر ئەحمەد حەوێزی، بەرگی دووەم، چاپی یەکەم ١٩٨٤ وەرگیراوە.



# رۆژانی ڕەمەزان لەکۆیە

**کازم عومەر دەباغ**

کێکە لەمانگە
ەتمەندی خۆی هەیە
ن. بەمانگی خەلەو
شین دەناسرێت.
، کۆیە بەتایبەتی
، شەستەکاندا زۆر
ازییان لەم مانگە

شەوانە کاتی پارشیو زوڕنا لەناو کۆڵانەکانی شار لێدەدرا، ئەوانەی کە بەم کارەش هەڵدەستان دووپیاو بوون بەناوی مام حەمە عەبۆو مام عەزیز زەینەل. ئێوارانیش بە سەدەها کەس لەگەورەو بچووک لەبەردەرگای مزگەوت رادەوەستان خەریکی

کەلوپەل و شیرینی کڕین بوون بۆ بەربانگ، ئەم شوێنە پێیان دەگوت: "ئیستیلاک" کابرایەک هەبوو ناوی "سابیر حەلوا" ئەم پیاوە سێ چوار مێزی گەورەی دادەنا لەتەنیشت یەک، هەموو جۆرە شیرنەمەنی و لقوم و پاقلاوەو بادام و چوکلات و

شەربەتێكی لەسەر دادەناو بە گلۆپ دەیرازاندەوە بەشێوەیەک هەركەسێک چاوی پێ بكەوتبایە حەزی دەچووە شیرنەمەنییەكانی. جگە لەمە منداڵانیش لەسەر قادرمەكانی بەردەرگای یانەی فەرمانبەرانی كاتی خۆی دادەنیشتن، ئەم شوێنە دەكەوتە تەنیشت سەرای كۆنی جاران ئێستا بووە بە دوكان لەلای فلكەی حاجی قادر. ئەم شوێنە بەرانبەر گردی قشڵەبوو. كاتێ بانگ نزیک دەبووەوە مەلا عەبدولڕەحمان كە بە مەلا فندق ناسرابوو، بەخۆی و مەندیلە سپییەكەی سەری دەهات بەسەر قالدرمەكان دەكەوت و لەناو منداڵەكان رادەوەستا، مەندیلەكەی لەسەری دەهێنایە خوارەوە چەند جارێک ئەم مەندیلەی بەرەو گردی كەكۆن رادەوەشاند. تۆپی رەمەزان لەم گردە دەتەقێنرا. ئەم تۆپە بەتۆپی وەستا رەجەب بەناوبانگ بوو، رۆژانە ئەم تۆپە پڕ دەكرا لە كۆنە پەڕۆ، جوان دەپەسترا بەدارێكی ئەستوور لەلایەن پیاوێک بەناوی "حەمە عەبۆوی دەهۆڵچی" ئەم تۆپە كە دەتەقێنرا لەهەموو لایەک دەنگی (الله اكبر) بەرز دەبووەوە، لەمزگەوتەكان خەڵكی رۆژووی دەشكاندو فتاری دەكردەوە. شەوانەش تا پارشێو دووكانی بەرگدروو و چایخانەكان هەبوون. شەو وەک رۆژ بوو دنیا ئارام بوو هەموو كەس لەسەرومالّی خۆی ئەمین بوو. ئەوەی سەیربوو پارشێوان لەهەموو ماڵێک تەشتۆكەک هەویر دەشێلدراو هەویری ترشی تێدەكراو بەلێف و بەتانی دادەپۆشرا پێش بانگی عەسر ئەم هەویرە دەكرا بە ئەستووكە بەڕوون و لەسەر تریانان دادەنرا. ئێمەش ئەم تریانە ئەستووكانەمان دەبرد بۆ فرنی بازاڕ لای مەلا تەهاو وەستا مستەفا بۆ سووركردنەوەیان، جاری واش هەبوو دەمانبردە ماڵی حەمە گران و ماڵی مام عەویز لەگەڕەكی هەواوان.

بەڕاستی ئەم جۆرە ئەستووكانە زۆر بەتام بوون، پارشێوان لەگەڵ ماست دەمانخوارد.

جگە لەمە لەشاری كۆیە جۆرە خواردنێكی دیكەش لە رەمەزانان دروست دەكرا پێیان دەگوت: "شلكێنە" ئەم جۆرە خواردنە لەجۆرە هەویرێكی شلی وەک "كاستەر دروست دەكرا" بەسەر "سێر"یان دادەكرد پاش ئەوەی سێرەكەیان چەور دەكرد. پاش هەندێک برژان نانەكەیان لەسێرەكە دەكردەوەو لەناو تەشتێک دایاندەنا، شیلەی شەكریان بەسەردادەكردو دەیانخوارد. پیاوانیش لەدوای نیوەڕۆ بەولاوە لەسەر تاتی دەوروپشتی حەوزی دادەنیشتن كە شوێنێكی فێنک بوو بۆ رۆژوەوان.. دوای نوێژی عەسر گەورەو بچووک لەمزگەوتی گەورەی كۆیە كۆدەبوونەوە گوێیان لەوەعزی مامۆستا مەلا مەعسوم دەگرت، جاری واهەبوو لەژووری مزگەوت جێگا نەدەما خەڵكی لەسەربان بەرێز دادەنیشتن، بەڵام ئەوەی سەیرە لێرەدا پێمخۆشە شتێک بگێرمەوە كە راستییەكی حاشا هەڵنەگرەو هەموو خەڵكی ئەم سەردەمەش كە لەكۆیە ژیاون گەواهی بۆ راستی ئەم مەسەلەیە دەدەن: جاران قازی لەرێگای رادیۆ داوای لەخەڵكی دەكرد هەركەسێک مانگی دیت با ئاگاداری نزیكترین داگا بكاتەوە بۆ شاهێدی دان، چەند كابرایەكی مەشروب خۆر هەبوون لەكۆیە لە "كانیلە" بە چەپڵە رێزانەوە بەدوو یەكتری دەكەوتن و دەچوونە دادگای كۆیە دەیانگوت: مانگمان دیتووە. لێپرسراوانیش بێ هیچ دوودڵی بروسكەیان بۆ هەولێركرد بەم شێوەیە دەبوو بەجەژن و كۆتایی بە رەمەزان دەهات، ئەوانەی بەم كارە هەڵدەستان خورشیدی مام رەفعەت و عومەری حاجی كاكەمین و جەلالی مام قادر و غەفوری بایەزیدبوون.

# شەوانی زستان و میوانداریی لەشاری کۆیە بەر لەساڵانی پەنجاکان

محەمەد دارياس

هاتنی کارەبا بۆشاری کۆیە بۆ ساڵی ١٩٥٢ دەگەڕێتەوە، هەربۆیە بەر لەم مێژووە شارەوانی ئەم شارە بەمەبەستی ڕووناککردنەوەی هەندێ شوێنی گشتی وەکو ناو بازاڕو ڕێگا سەرەکییەکان شەوانە فانۆسی داگیرساندووە، ئەم کارەش لە ئەستۆی مووچە خۆرێکی شارەوانی بووە کە لەئێواران فانۆسەکانی یەک یەک سڕیوەتەوەو پڕی لە نەوت کردووەو دایگیرساندووە، بۆ بەیانی کە دنیا ڕووناک بۆتەوە دیسانەوە گەڕاوەو فانۆسەکانی کوژاندۆتەوە، ئەم مێژووە دەگەڕێتەوە بۆ "٦٠"ساڵ بەرلەئێستا، کە ئەوکات هیچ جۆرە کلۆجێک نەبوو، وەکو تەلەڤزیۆن یا رادیۆ کە زۆر دەگمەن بوو، بۆ خۆ خافلاندن یا بەسەربردنی کات وەک ئێستاکە، بەتایبەتی شەوانی دووردرێژی زستان بۆیە دیاردەی میوانداری لەکوردستان بەگشتی و لەکۆیە بەتایبەتی باو بووە لەنێوان خزم و هاوڕێ و دراوسێدا کە بەخێزانەوە شەوانە ڕوویان لەماڵی یەکتر دەکردو بەدەم قسەی خۆش و گێڕانەوەی سەربوردەو چیرۆکی خۆش و خوێندنەوەی شیعرو گوتنی گۆرانی خۆش لەلایەن کەسانی لێزان بە مەقام و حەیران و لاوکەوە، هەروەها بەخواردنی شەوچەرەی وەکو کاکڵە گوێز و بادەم و مێوژ و قەسپ و هەناری موشتاغ کاتێکی خۆش و بەتام و بەسوودییان دەبردە سەر کە ئەم هاتوچۆکردنەی یەکتریش دەبووە مایەی زیاتر خۆشەویستی و پتەوبوونی پەیوەندی و هەست و سۆز لەنێوان ئەندامانی ئەم دوو خێزانەو زیاتر لێک نزیکبوونەوەو هۆگربوونی یەکتری و شارەزا پەیداکردن لە ناسینی دڵ و دەروونی یەکتری و گەلێ شتی دیکە.

کاتی گەڕانەوە بەتایبەتی تاریکە شەوان یا ماڵی میوانەکە گەر هاتباو دووربا ئەوە خاوەن ماڵەکە خێرا شەپڵتەیەکی بۆ ئامادە دەکردن کە بریتی بوو لە دارێکی درێژ پەڕۆی بەسەری دارەکە دەبەست و هەندێ نەوتی پێدادەکردو ئینجا ئاگری لێدەداو یەکێکک بەتایبەتی کوڕی گەنج لە ئەندامانی میوانەکە شەپڵتەکەی دەخستە سەر شانی و لەپێش خێزانەکە ڕێی دەکردو ئیتر پێش چاوی خۆیان جوان دەبینی و ئەم ناوەی زۆر بەجوانی ڕووناک دەکردەوەو کەس نەدەکەوت بەهۆی تاریکی و نەبینینەوە کە ئەمەش نیشانەی خۆشەویستی و ڕێزلێنان بوو لە یەکتری. شایەنی وتنە کە ناوە ناوە یەکێک بە شەپڵتە هەڵگرەکەی دەوت: ئاگات لە سواندان بێ. واتا هۆشیاربە سواندەی ماڵان کە داری تیا بووە ئاگر نەگرێ و نەسووتێ، کە نەخوازەڵڵا ببێتە هۆی ئاگر تێبەربوونی ماڵی خەڵکی، ئیتر بەم شێوە گەر هاتباو بارانیش با ئاگری شەپڵتەکە نەدەکوژایەوە تادەگەیشتنە ماڵەوە، جا لەوێ ئاگرەکە خامۆش دەکرا.

ئەمەبوو شێوازی کات بەسەربردن لەزۆربەی شەوانی درێژی زستان لەنێوان خێزانانی ناسیاو و دۆست و خزم و کەس و هاوڕێیان، کە منیش دڵنیام سەد خۆزگە بەڕۆژگاری ئەوکات بۆ ئەم سادەیی و ساکاری و بێفیزی و تێکەڵاوبوونە، بۆ ئەم پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەو پێکەنینانەی کە لە قووڵایی دڵەوە دەردەچوون و کاتیان پێ بەسەر دەبرد، نەک وەک ئەم ڕۆژگارەی ئێستا کەهیچ کەس شادو بەختیار نییە لەبەر کێبڕکێی پارەو خۆ سەرقاڵکردن بەماڵی دنیاوە.



# هەولێر و کۆنە شێتەکانی

عیزەدین خەلیل سەعید

ئەم جارە پێمان خۆش بوو، دەرگای مێژوویی شاری هەولێر بخەینە سەر پشت و پەنجا ساڵێک بگەڕێینە دواوە، با بزانین لەو شارە دێرینەدا کە چەند هەزار ساڵێک دەبێت دروست کراوە و خەڵکی لەسەر ژیاوە، لەو سەردەمەدا گەڕەکە سەرەکییەکانی ئەو شارە پێک هاتبوون لە قەڵات و خانەقا و تەعجیلی ئیسلام و جوولەکە و گەڕەکی عارەبان، دواتر گەڕەکی تەیراوە دروست کراوە. زۆربەی خەڵکی ئەو شارە یەکتریان دەناسی و خزم و دۆستی یەکتر بوون، لەخۆشی و ناخۆشیدا بەشدار و هاوکاری یەکتریان دەکرد. بەکاسبییەوە خەریک بوون. کارە سەرەکییەکان وەستایی و ئاسنگەری و دارتاشی و بەقاڵی و عەتار و نانەواچی و خمچی و چایچی و چێشتخانە و خانچی بوون. میوانخانەیەکیش هەبوو بەناوی (ئوتێلی فەرح)، لەم شارە دێرینەدا چەند کەسانێکی بەرچاو هەبوون، کە بە (کەم عەقڵ) ناسرابوون، وەکو، حەمەشێت، بەرخۆکەو ،کسۆک و هەیاس و مەمەد مەمەد و مستەفا علک، دەروێش عەلی و


هەیاسە شێت


مەمەد شێت


بەرخۆکە شێت

سالّح ئاغا و چەند کەسانی دیکە. لەم باسەماندا، تیشکێک دەخەینە سەر ژیاننامەی یەکێک لەوانە، کە ئەویش دەروێش عەلییە... ئەو دەروێش عەلییە، کە من بەچاوی خۆم بینیومە و بە وردی چاودێری ژیان و هەڵسوکەوتی ئەو مرۆڤەم دەکرد، چونکە ژیانێکی سەیری هەبوو، لە دنیایێکی دیکەدا دەژیا.

دەروێش عەلی پیاوێکی کورتە باڵای رەنگ سوور و سپی چاوشین بوو. تەنکە ردێنێکی سپی و سمێڵێکی گەورە، کە بەسەر ردێنی هاتبووە خوارێ، جلوبەرگی شڕە قاپووتێکی مشەمەعی قاوەیی کە بەهاوین و زستانێ فڕێی نەدەدا، لەگەڵ کلاشێکی قاوەیی بەبێ گۆرییە و مشکییەکی رەشی لەسەری خۆی دەنا. ساڵ دوانزەی مانگێ لەخانێ دەنووست، هیچ شوێنێکی تری نەبووە ئەم مرۆیە خووڕەوشتێکی سەیری هەبوو: بە بەردەوامی لەبازاڕدا دەسووڕایەوە، بەتایبەتی سەردانی دوکانی قەسابەکانی هەولێری دەکرد و لەبەردەم دوکانەکاندا رادەوەستا، قەسابەکانیش دەیانزانی بۆ وەستاوە، ئەوانیش یەکسەر بەشە ئازوقەی رۆژانەی خۆیان پێ دەدا، کە پێک هاتبوو لە فاتەڕەش و سیپەلاک و ریخەڵۆک و گورک نەخۆرە و ئەو گۆشتانەی کە بەکەڵک خواردن نەدەهاتن، ئەویش لەباغەڵ و گیرفانەکانی خۆی هەڵی دەگرت، ئەگەر زیادیش بوایە لەناو جۆرکەکی دادەنا و بەیانییان ئەو گۆشت و خواردەمەنییەی بەسەر پشیلە و سەگی گۆڕستانەکانی هەولێر بەیەکسانی دابەش دەکرد، لە گۆڕستانی ئیمام محەمەد، لەگۆڕستانی گەورە، گۆڕستانی چراغ، خۆشییەکەشی لەوەدابوو، هەر سەگ و پشیلەیەک ناوەکی تایبەتی هەبوو، ئەم گیانلەبەرانە، بەڕێزەوە بەرامبەری وەردەکەوتن، تاوەکو هەریەکەو بەشە ئازوقەی خۆی وەردەگرت، زۆرجار وارێک دەکەوت، پشیلەیەک کە بەشە ئازووقەی خۆی وەرگرتبوو، دووبارە دەهاتە بەرامبەری لەلای خۆیەوە هەستی پێ دەکرد.

شەوانی هەینیش دووبارە بەشی دەکرد خواردنی خۆشی کە لە چێشتخانەکاندا بوو، پێکهاتبوو لە خواردەمەنی شلە و نیسک، زۆریش حەزی لە هیشکەنان دەکرد، تا ساڵانی شەستەکان ئەو پیاوەم دەبینی، بەڵام دواتر شوون بزر بوو، کەس نەیزانی چی بەسەر هات..!.


کسۆک شێت


جومعە شێت



# حەمەشێت شای شێتان

**هۆشیار عەبدوڵڵا**

خوالێخۆشبوو (حەمە شێت) یەکێک بووە لە شێتە هەرە ناسراو و بەناوبانگەکانی شاری هەولێر، زۆربەی دانیشتووانی شار حەمەیان دەناسی، کەس نەبوو، حەمەی نەناسی، پیاو، ژن، منداڵ، پیر، گەورە، گچکە ڕێزیان لێدەگرت، کەس دڵی عاجز نەدەکرد، حەمەیان بە مرۆڤێکی خواناس و خاوەن کەرامەت لە قەڵەم دەدا.

کاک (سەید مەولوود بێخاڵی) لەبەرگی سێیەمی کتێبەکەیدا (هەولێرم وادیوە و بیستووە) لەلاپەڕەی ٣٥٠ دەربارەی حەمەشێت دەڵێت: ((گوایا بەنەژاد لە شێخەکانی ناوچەی ڕانیەیە)). ئەوەی ڕاستی بێت حەمە نە شێخە و نەخەڵکی ناوچەی ڕانیەیە، بەڵکو بە ڕەسەن خەڵکی (قەشقە)ی سەر بەناحیەی قوشتەپەی قەزای مەڵبەندی هەولێر بووە، لە(عەشیرەتی لەک)ە، ئەو گوندەش دەکەوێتە دەشتی پشترێی، ئاقارەکەی لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی گردەسوور، ئازیانە، چاڵەگردەرە، پەرکانە، خوڕ خوڕ لە سەرەیەکە، لایەکیشی زێی بچووکە، گوندێکی کۆنە، مێژووی ئاوەدانکردنەوەی دەگەڕێتەوە بۆ زیاتر لە (٢٠٠) دووسەت ساڵ لەمەوبەر. عەشیرەتی لەک بۆ یەکەم جار کە کەوتوونەتە دەشتی هەولێرێ لێرە دامەزراون و ئاوەدانیان کردۆتەوە، زێدی باو و باپیرانیشیان (لەکستان)ە کە دەکەوێتە باکووری ڕۆژهەڵاتی

لوڕستان لە کوردستانی ڕۆژهەلاتە، حەمە ناوی تەواوی (محەمەد کوڕی ئەحمەد کوڕی حاجی مستەفا)یە، لە گوندی (قەشقە)ی سەر بەناحیەی قوشتەپە لەدایک بووە، هەروەکو (مام حوسێن مەولود قادر حاجی مستەفا) خەڵکی گوندی قەشقەیە و لەشاری هەولێر لە گەڕەکی ئازادی نیشتەجێیە بۆی گێڕامەوە گوتی: حەمە ئامۆزای باوکم بووە سەرەتا شێت نەبووە، سەردەمێک شوانی لەناوچەکانی ناو شوان و شێخ بزێنیدا کردووە. پلکە (فاتم محەمەد ئەمین عەولا) بەئەسڵ خەڵکی گوندی قەشقەیە و هەنووکە لەگەڕەکی ئازادی شاری هەولێر نیشتەجێیە، گوتی: حەمە ئامۆزای باوکمە، برایەکی هەبووە ناوی محەمەد سەعید بووە، خوشکێکی هەبووە بەناوی (ئایشە) پاشی گرانی ١٩١٧ کەوتۆتە دەشتی دزەیی، لەوێ لەناو (لەک)ەکان گیرساوەتەوە و شووی کردووە، وا بزانم لە گوندی (جدیدەی لەکان) بووە، لەوێ بە ئایشە لەکە ناسراوە، حەمە کاتی خۆی کە گەنج بووە لە گوندی (قولەسووتاو) لەناوچەی شوانی شاری کەرکووکدا جوتیار بووە، لەوێ لاقێکی شکاوە و گەڕاوەتەوە ناو خزمەکانی لە گوندی قەشقەی، لەوێ ڕەبەن بووەو ژنی نەهێناوە، لەناو خزمەکان نەحەواوە و هاتە شاری هەولێر و لە مزگەوت و خانەقای شێخ ئەبوبەکری هەرشەمی نەقشبەندی گیرساوەتەوە، پاشان تێک چووە و چووەتە مزگەوتی شێخی چۆلی و تا مردووە هەر لەوێ ژیاوە، لەساڵی ١٩٧٩ کۆچی دوایی کردووە و خەڵکی بەشەرەف و بە ئەمەکی شاری هەولێر تەرمەکەیان بەرێزەوە بردووەتە قەبرستان و بەخاکیان سپاردووە.

دێتەوە یادم جارێکیان باسی ئەو حەمەشێتەیان دەکرد، منداڵ بووم باوکم گێڕایەوە گوتی: چەند ساڵێک لەپاش گرانی ساڵی ١٩١٧ ئەو حەمەشێتەم دیت لە ئاقاری گوندی قەشقەی جوتی دەکرد، کوڕێکی گەنجی سوورەی موو زەردی لاواز بوو، بەلام ئەوەدەم شێت نەبوو، کوڕێکی زۆر لەسەرەخۆ و هێمن بوو، ئەوکاتی ئێمە مەڕداربووین لە ئاقار هەڵەت و زوورگەکانی قەشقەی ڕەشماڵمان هەڵدابوو. (نووسەر).

خوالێخۆشبوو (سمایل نادر) ناسراو بە (سمەناقە) خەڵکی گوندی قەشقەی بوو گێڕایتییەوە گوتبووی: ((لەساڵانی شەستەکاندا هاتمە هەولێرێ بۆ کرێکاری و کاسبی، لەسەر جادەکە چاوم بە (حەمە)ی کەوت لێی نزیک بوومەوە، پێمگوت: نامناسی؟! گوتی: کوو.... ناتناسم (سمەناقەی). لەساڵی ١٩٦٨ کارەبای هەولێر بۆماوەی چەند ڕۆژێک پچڕا بوو، هۆیەکەشی ئەوەبوو هێزی پێشمەرگە چەند عەموودێکیان لەدژی حکومەت تێکدابوو، ئاو نەبوو، خەڵکەکە زۆر پەرێشان ببوون، دەچوون لە دەوروبەری شار لەناعوورەکان ئاویان دەهێنا، ئەو دەمی لە دەرەوەی شارچەند ناعوورێک هەبوو سەوزە و شینایی لەبەر دەکرا.

خوالێخۆشبوو (حەمەشێت) لە مزگەوتی (شێخی چۆلی بوو لەوێ لۆلای بەلوعە (حەنەفییە) کان چوو، گوتیان: حەمە ئاونییە! (حەمە)ش لەناو حەوشەی مزگەوتێ هاتوچۆی دەکرد و دەهاتو دەچوو و هاواری دەکرد دەیگوت: ((لۆ ئاونییە، لۆ ئاو نییە، سێ چارێکی دونیایێ ئاوە، دەرێن حەمە ئاونییە!)).

دەرێ یەکەم جار کە هاتۆتە هەولێر لە مزگەوتی شێخ ئەبووبەکری هەرشەمی نەقشبەندی بووە، پاشان ئەحوالی تێک چووەو گۆڕاوە و لەناو بازاڕ دەسووڕایەوە. (حەمە) شتی زۆر سەیر و سەمەرەی هەبووە کەبەناو شاردا دەسووڕایەوە هەردەم کەل و پەلەکەی کە بریتی بوو لە ئاسن و پاسنی بێ کەلک و بێ سەروبەر بەکۆڵی دادەداو بارێکی قورس و گران بوو، هەندێکیشی بەدەستەوە

دەگرت، هەردەم چەکووچ، مشار، جاری واش هەبوو دیومە مەنجەلی سفری بچووکی پێدەبوو، گەلەک جار لەتەنیشت رەسیف- پێرۆی جادەکەدا یا ئەوەتە لەهەر شوێنێک عەقڵی بگرتایە ئەوە مەنجەڵەکەی دادەنا و کەرپووچ بایە یان سێکوچکەی هەبوو، مەنجەڵەکەی لەسەردادەنا و ئاگری دەکردەوە، روون و ئاو و سەلکە پیاز بە ساغی، بیبەر، کەوەر، کەرەوز، مستەک لەمیدووزی، سماق، نیو کیسەخوێی تێدەکرد، جارێکیان بەخۆم (نووسەر) لەدیاری بووم شیوی لێدەنا، دەبێ شیو لێنانی حەمەی کووبێ؟! سەلکێک پەنیری گەورەی لە توورەگەکەی پشتی دەرێناو لە چێشتەکەی کرد، پاشان هەندێ بووز- بەفری هێنا ئەویشی تێکرد، خەڵکەکەی لە دەوروبەری بوون حەڵقەیان بەستابوو، گوتیان: حەمە نابێ! بەفری تێمەکە، نابێ! ئەویش لەسەرەخۆ ئاگرەکەی خۆش دەکرد و پفی لێدەکرد و دەگرژییەوە و دەیگوت: ((کوونابێ، کوو نابێ، باوکم ئەبێ، ئەبێ؟!)).

**هەنووکەش لەناوشاری هەولێر وا باوەو بوویتە پەند دەرێن:**

١- دەرێی شیوی حەمە شێتییە!
٢- دەمنی شیوی حەمەیە!
٣- بوویتە شیوی حەمە شێتی!
٤- خۆ نەبوویتە شیوی حەمەشێتی!

گەلەک جاران دەمدیت لەجادەی دادەنیشت هۆرەهۆڕ دەگریا و فرمێسکی لەچاوان دەباراند و گوڕ گوڕ ئەو فرمێسکەی دەهاتە خوارێ زۆر بەکوڵ دەگریا و دەیگوت: ((سەگباب ئەگەر شوانیت پێناکرێ بۆ شوانی ئەکەی؟!)) گەلەک جار ئەگەر میزاجی تەواو نەبایە، ئەگەر یەکێک پارەی بدابایە ئەوە هاواری دەکرد و دەیگوت: ((من ئەمەم بۆ چییە؟! من ئەمەم بۆ چییە؟!، ئەی هاوار، ئەمەم ناوێ!)) حەمە پیاوێکی سوور وسپی، ریشێکی سپی درێژی هەبوو، چاوێکی کوێر بوو، جل و بەرگێکی چڵکنی لەبەر دەکرد، کەم خۆی دەشووشت، جار بەجار خێرۆمەندێک جلکێکی نوێی بۆ دەکڕی و لەبەریان دەکرد ئەویش بەماوەیەکی کەم چڵکن دەبوو، پیاوێکی هەولێری گێڕایەوە گوتی: لەسالانی پەنجاکان حەمەم دیت لە (ئاوی میری) لەخوار نەقابەی کرێکارانی ئێستا کە گۆمێکی گەورە هەبوو حەمە شێت مەلەوانی دەکرد و خۆی تێدا دەشووشت.

حاجی فەتاحی فیتەر دەگێڕێتەوە و دەڵێت: گەنج بووم لەکۆتایی ساڵی پەنجاکان پێش مەلا بانگدانێ زوو لەماڵ دەردەچووم دەچوومە بازێرێ بەیانیان نانم لەوێ دەخوارد، بەیانییەکی زوو دەرچووم لەپەنا دیواری مزگەفتی شێخەڵای دیتم (حەمەشێت) وا خەریکی نوێژ کردنە! بەهێمنی سەبر سەبرە لێی نزیک بوومەوە گوێم لێبوو سورەتی فاتیحەی تەواو دەکرد و دەستی دەکردە سورەتێکی درێژ، هەرکەگوێی لەخشپەی پێم بوو دەستی بەرداو دەستی کردە قسەی هەلەق و بەلەق دەیگوت (٢) دوو هەسپ ئەوها هات، هێسترەکە ئەوها رۆیی، دەستی بەو قسانە کرد، منیش رۆیشتم چووم لەپەنا دیوارەکەی خۆم لێگرتەوە، دووبارە دەستی کردەوە بە نوێژ کردنێ.

حەمە لەساڵی ١٩٧٩ لە مزگەوتی شێخی چۆلی لەشاری هەولێر کۆچی دوایی کردووە هەر لە قەبرستانی شێخی چۆلی بەخاک سپێردراوە.

**سەرچاوەکان:**

بۆ نووسینی ئەم بابەتە سوودم لەو تەمەندارانە وەرگرتووە:

١- حاجی مولود عەولا گوستان لەدایک بووی ساڵی ١٨٩٢ لەژیاندا نەماوە.
٢- فاتیمە محەمەد ئەمین عەبدوڵلا لەدایک بووی ساڵی ١٩٣٠.
٣- حوسێن مەولود قادر حاجی مستەفا لەدایک بووی ساڵی ١٩٥٠ خەڵکی گوندی قەشقەیە و باوکی ئامۆزای حەمەیە. (حەمە شێت).

**لە هەفتەنامەی بەدرخان بڵاوکراوەتەوە**

# شێتەکانی کۆیە

**کازم عومەر دەباغ**

شتێکی روون و ئاشکرایە لەهەموو شارێک چەند کەسێک هەیە لەژن و لە پیاو عەقڵیان لەدەستداوەو وەک مرۆڤێکی ئاسایی هەڵسوکەوت ناکەن، لەشاری کۆیە چەند کەسێک هەبوون لەمجۆرە مرۆڤانە کە ببوونە جێگای رابواردن و گاڵتەو گەمەی منداڵانی کۆیەی ساڵانی سەرەتای ١٩٦٠ز بەدواوە.

لەبیرمە کە منداڵ بووم لەشاری کۆیەدا چەند "شێتێک"ی ژن و پیاو هەبوون. ببوونە جێگای رۆژ بەرێکردن. چونکە ئەوکات منداڵانی کۆیە هیچ هۆیەک نەبوو کە خۆی پێوە خەریک بکات بۆئەوەی کاتەکانی ژیانی لەشەو و رۆژدا پێی بەرێ بکەن، تەلەڤزیۆن و سەتەلایت و ئینتەرنێت و کۆمپیوتەر و ئەتاری و مۆبایل و سیدی هیچی نەبوون. لەبیرمە لەساڵانی ناوەراستی شەستەکان بوو بۆ یەکەم جار سینەما هاتە کۆیە لە گەراجی شارەوانیان دانا بەرانبەر بەنزیخانەی ناوشاری کۆیە دواتر گوازرایەوە بۆ بەرامبەر سەرای نوێ. رادیۆ بۆ یەکەم جار لەساڵی ١٩٣٥ز باوکم هێناویەتیە کۆیە، چونکە باوکم کاری بازرگانی گەورەی دەکرد هی دەباغی هاتوچۆی بەردەوامی هەبوو بۆ شاری بەغدا و موسڵ و پەیوەندی بازرگانی ناردنە دەرەوەی خوری هەبوو بۆ حەلەب. بۆیە ئەو زیاتر هەستی بە هێنانی دووشت



کردووە بۆ شاری کۆیە. یەکێکیان هێنانی رادیۆیەکی"فلیپس"کە رەنگی رەشە و پێشەکەی خڕە، تائێستاش کار دەکات و ماوەمانە، دووەم شت، بۆ یەکەم جار باوکم دار پرتەقاڵ و نارنج و کەباتێکی هێناوەو لەناو ئەم خانووە کە تازە دروستی کردبوو لە گەرەکی بایز ئاغا نزیک مزگەوتی بایز ئاغا چاندوویەتی، ئەم دار پرتەقاڵە تائێستا ماوەو پرتەقاڵ دەگرێت هەموو خەڵکی کۆیەش شاهێدی ئەم راستییەن. دوای باوکم خوالێخۆشبوو، کاکە زیاد کە چاوی پێکەوتووە دارێکی جوانەو پرتەقاڵ دەگرێت، ئەویش چەند دار پرتەقاڵێک لە قەسرەکەی لە رێگای حەمامۆک دەروێنێت. بۆیە لێرەدا باسی ئەم شتانەم، کرد چونکە بابەتەکە وایکرد رامکێشێتە ناو باسکردنی هەندێک شت کە لەکۆیە نەبوون تا خەڵکی بتوانن کاتی خۆی پێ بەسەربەرێت. لەوانە وەک باسمان



کرد سادەترینیان "رادیۆ"بووە. باوکم دەیگوت رادیۆکە دەنگی لێدەهات ئەوانەی بەرامبەری دانیشتبوون دەیانگوت: ئەی بۆ وێنەکەی بەدیار ناکەوێت وا ئێستا خەونی ئەم خەڵکەی ئەوێ رۆژێ هاتەدی، دەنگ و رەنگ پێکەوە دەردەکەون لە تەلەڤزیۆن.

جگە لەمە، لەم شارە هەندێک گەمەو یاری باو هەبووە کە منداڵان خۆیان پێوە خەریک کردووە. وەک یاری قەڵا قەڵایانەو چاوشێرکانە. کڵاو کڵاوانێ، کورسی کورسییانێ، تۆپانێ و کێل و بەردانێ و کەوشەکانێ و کەللایانێ و مووشانێ و پەلیک پەلیکانێ و کۆللارە هەڵدان و مەزرەحانێ و قۆچەقانێ هاوێشتن. ئەمانە هەندێک لەم یارییانە بوون کە منداڵان خۆیان پێوە خەریک دەکرد. بەڵام لەمانە خۆشتر گەمەکردن و رابواردن بوو بەم شێتانەی کە لەم شارەدا هەبوون.

یەکێک لەو شێتانەی کە زۆر قسە خۆش بوو، قسەکانی لە وەلی زەمانە دەچێت" عەبدولڕەزاقە شێتە بوو" ئەم پیاوە، سەرگوزشتەی ئەوەندە خۆشی هەیە ئەگەر بیگێڕنەوە لەوانەیە هەبێت بڵێت ئەم قسانە قسەی پیاوێکی هێژا و زیرەک و عاقڵە، عەبدولڕەزاق لەماڵێک دەژیا بە تەنها کە نزیک کۆڵانەی تەنگەبەر، کەرێکی هەبوو زۆر خۆشی دەویست، هەربۆیە زۆر بەسەرهات و سەرگوزشتەی سەیروسەمەرەی هەیە لەگەڵ ئەم "کەرە"، عەبدولڕەزاق جلۆکەی رەنگاورەنگی لەسەر پشتی کەرەکەی دادەناو گورینگەی رەنگاو رەنگی پێوە دەکرد، شەوانیش "فانۆس"ی، بۆ دادەگیرساند و لەملی دەکردو دەیگوت: زیندە روحە با بەرچاوی خۆی ببینێت، جگە لەمە عەینەکەکی لە نایلۆنی کەسک بۆ





دروست کردبوو لەچاوی دەکرد. لە هاویناندا پووشی دەخستە بەردەمی و دەیگوت: با بەگیای تێبگات. کەرەکە پووشەکەی بۆن دەکردو نەیدەخوارد. عەبدولڕەزاق دەیگوت باشە کە فێڵت لێنەکرێت بۆ ناویان ناوی کەر!!.

جگە لەوە عەبدولڕەزاق هەفتەی جارێک کەرەکەی دەبرد بۆ چیای فەقێیان لەپشت کۆیە هەندێک دارو چیلکەی لە کەرەکە بار دەکردو بە کەرەکەی دەگوت بەکێندەردا هاتی بەهەمان رێگا بگەڕێوە نەکەی بەم لاو بەولا لادەی تێگەیشتی؟ لەدوای چەند کاتژمێرێک خۆی دەگەڕایەوە. منداڵان کەرەکەی عەبدولڕەزاقیان دەناسی کەس هەقی بەسەرییەوە نەبوو کەرەکە بەخۆی و دارەوە دەهاتەوە بەردەگای ماڵەوە!!!.

سەرگوزشتەیەکی دیکەی عەبدولڕەزاق کە زۆر سەیرە ئەویش

ئەوەیە، عەبدولڕەزاق چای دەفرۆشت لەسەر تەنەکەیەکی هەڵپچراوی دادەنا چاپەست و کتلییە ڕەشەکەی و ڕەژووشی گەش دەکردەوە.بەبازاڕی دەگێڕا دەیگوت: چا، چای باش، خەڵکی عەبدولڕەزاقیان زۆر خۆش دەویست چایان لێدەکڕی، ئەوکات چا نرخەکەی یەک عانە بوو کە دەیکردە "چوار فلس"عەبدولڕەزاق بە"چای ڕەش" و"قوون ڕەش"زۆر تووڕە دەبوو، ئیمانی نەدەما، کە منداڵ وایان پێدەگوت دەیگوت:"هی بابت ڕەش"عەبدولڕەزاق دەنگی نەدەکرد، خۆی مات دەکرد ئەگەر یەکێک بیگوتبایە "چای ڕەش"هەتا پارەکەی لێ وەردەگرت، ئەوجا دەیگوت: هی بابت ڕەش. دەیگوت: خوا فەرموویەتی چیان پێگوتی ئەوەیان پێ بڵێوە.

سەرگوزشتەیەکی دیکەی ڕۆژێک لە ساڵانی سەرەتای ١٩٦٠ز دا بوو، بەناو بازاڕی کۆیەدا هاتە خوارەوە، نزیک قەیسەری گەورە ڕاوەستاو هاواری کرد"مەلا مەجیدی موفتی"زۆر عەیبە بۆتۆ ناوی پێغەمبەرت بەدرۆ لە کوڕەکەت ناوە"مەلا مەجید". لەوەڵامدا گوتی: کاک عەبدولڕەزاق دەبێت"محەمەدی کورم بەقوربانی تۆ بکەم "پێدەچوو"محەمەد" کە کوڕی مەلا مەجید موفتی بوو گەمەی پێکردبوو و بێزاری کردبوو!! شتێکی دیکە، عەبدولڕەزاق ڕۆژێک لەسەر کۆسپەکەی بەردەگای خانی مەحمود ئاغا لەناو بازاڕی کۆیە لەسەر چیچکان هەڵ توتڵکابوو بەدیار چاپەست و کتلییە ڕەشەکەی، دوو مامۆستاش بەم ناوانە لەلای دانیشتبوون چایان دەخواردەوە، منیش بەرامبەریان ڕاوەستام و مامۆستاکانیش مامە ئەفەندی مەلا فەتاح و واحیدی کەبابچی بوون. دەیانگوت: کاک ڕەزاق بەڕاستی چایەکی ڕەش و بەتامە، بەڵام زۆر حەیفە ئەم چاپەستە بڕژێت. عەبدولڕەزاق دەیگوت بۆ دەڕژێت، مامۆستا مامە ئەفەندی دەیگوت: چما نازانی زەوی دەسووڕێت بەبەردەوامی. کە سووڕا چاپەستەکە دەلەقی و ئەم چایە ڕەشە دەڕژێ، عەبدولڕەزاق دەیگوت: باشە بەڕاستتانە کە زەوی دەسووڕێت، مامۆستاکانیش دەیانگوت: قابیلە گەمە بکەین، عەبدولڕەزاق دەیگوت: باشە گەروایە بۆ ئێوە ناکەونە سەر کۆشم..!! بەڕاستی ئەم وەڵامدانەوەی هی پیاوێکی زیرەک و عاقڵە.

ئەو دوو مامۆستایە دەیانکردە پێکەنین و دەڕۆیشتن، گەر یەکێک بیگوتبایە کاک عەبدولڕەزاق. چایەکەت بۆ زەردە، لەوەڵامدا دەیگوت: لەکنەخۆی وابێت چای سەیفەینە!!

عەبدولڕەزاق ڕۆژێک لەسەر کۆسپەکەی پێش خانی مەحمود ئاغا لەناو بازاڕ لەسەر چیچکان هەڵ توتڵکابوو، پیاوێک مامەڵەی بارە داریکی لەگەڵ خۆشناوێک دەکرد. وادیاربوو خۆشناوەکە بەم پیاوەی دەگوت: بارە دارەکەم نرخی سێ درهەمە. کابراش دەیگوت نا بە ڕوپییەک واتا درهەم و نیوێک، کابرای خۆشناو تووڕەبوو گوتی: شەیتان بەنەعلەت بێت ئەم بارەدارە چۆن بە ڕوپییەک دەبێت. عەبدولڕەزاق هاتە پێشەوە خۆی کرد بە ناوبژیوان. عەبدولڕەزاق بەکابرای خۆشناوی گوت: تووڕە مەبە برا سەلکی ئەو پیاوە هەندی سەلکی کەرەکەتە! کابرای خۆشناو پێکەنی و گوتی: ڕاست دەکا. لەدوای ڕۆیشتنی خۆشناوەکە عەبدولڕەزاق بەکابرای گوت: باش ڕزگارم کردی لەکەرێ کەرتر!!

جگە لەمە گەلێک جار خەڵک بە عەبدولڕەزاقیان دەگوت: عەبدولڕەزاق ئەوانە ئارەق دەخۆنەوەو قومار دەکەن و نوێژ ناکەن، نەسیحەتیان بکە بابگەڕێنەوە. عەبدولڕەزاق دەیگوت:" لەم کەسە شێتتر نییە کە خۆی لەسەر خودا خراپ دەکات"دەمانگوت بۆ عەبدولڕەزاق، لەوەڵامدا دەیگوت: خودا لە قورئان نەیفەرمووە "فأن الله لغنيٍ حميد" واتا خودا دەوڵەمەندە منەتی بەکەس نییە!!

لەبەرئەوەی دوکانمان هەبوو لەناو بازاڕ و ماڵمان نزیک بازاڕ بوو، هەمیشە ئاگاداری هەموو هەڵسوکەوتەکانی عەبدولڕەزاق بووم،

مامۆستا سەیفەدین سەعدی ئاغا بەسەرهاتێکی زۆر خۆشی عەبدولڕەزاقی بۆ گێڕامەوەو گوتی: جارێک من لەگەڵ مامۆستا "ف.آ"بووم، بە عەبدولڕەزاقی گوت:"قون رەش". عەبدولڕەزاق راوی نا لەم کۆڵان بۆ ئەو کۆڵان. مامۆستا"ف.آ"خۆی کوتایە ماڵی"کەریمی ئەوقاف"چووە ژوورەوەو بەسەربانی کەوت، عەبدولڕەزاقیش بەدوایدا چووە ژوورەوەو چووە سەربان. مامۆستا "ف.آ" لەبانی بڵند خۆی هەڵدا و بازی دا بۆ بانێکی هاوسێیان لەکاتی خۆهەڵدان کەوتە ناو تەشتەکی گەورەی پڕ لە مەعجون تەماتە"ئاوی تەماتە" بەم جۆرە مامۆستای قوربەسەر رزگاری بوو لەدەست عەبدولڕەزاق!!!

پێمخۆشە سەرگوزشتەی هەندێک لە شێتەکانی دیکەی شاری کۆیە بگێڕمەوە. یەکێک هەبوو ناوی"عەبدولکەریم"بوو، خەڵکی تیمارۆک بوو، ئەم پیاوە، بەژن درێژی بەتەمەن بوو، هەمیشە ساقۆیەکی لەبەر بوو. ئەم پیاوە بە"هێلکەی کەرێ" تووڕە دەبوو. ئێمەی منداڵ هاوارمان دەکرد" عەبدولکەریم هێلکەی کەرێ"هەموو کۆڵانەکانی کۆیەی پێدەکردین!!.

پیاوەکی سەقەتی دیکە هەبوو بەدوو شەقەی دار کە لەژێرپیلی دابوو دەرۆیشت. ئەم پیاوە بە"پشیلە یا بەمیاو"ی، تووڕە دەبوو، شەقەی بەم لاو بەولادا دەوەشاند، ژنێک هەبوو پێیاندەگوت:"قەپلاغدار"هەزار جنێوی دەدا بە دایکمان. پیاو ماقوڵانی بازاڕ ئامۆژگارییان دەکردین کە وای پێ نەڵێین، بەیانی کە ئەم ژنە دەهات یەک منداڵ قسەی نەدەکرد.ئەوجارە قەپلاغدار دەیگوت: کا ئەم منداڵە قەحپە دایکانە لەکێندەرن!!.

ئەوجا پیاوەکان دەیانگوت: خەتای خۆتە منداڵان بەخەبەر دەهێنی!!! جا ئەم قسەیە لەکۆیە بووە بە"پەند" ئەگەر یەکێک بیەوێت یەکێک بەقسە بێنێت دەڵێن: جێی قەپلاغداری گرتۆتەوە دەبێت بەدەنگت بێنێت!!.

شێتێکی دیکە هەبوو ناوی"ئەحمەد گیانە"بوو، ئەم پیاوە هەمیشە سەری خۆی سفر دەکرد، لەناو ئاودەستی مزگەوتی گەورە کە بەبازاڕ دادەهات پێ خاوس بوو، منداڵ لەم بەرو ئەوبەر پەلکە شوتی و گندۆرەیان لەسەری دەگرت، ئەویش هەڵدەهات و جنێوی دەدا، جاری وا هەبوو رادەوەستا دەیگوت: گیانە برسیمانە، گیانە چۆنن، هەموو قسەی کە دەیکرد بەشێوەی کۆ بوو، ئەم شێتە زۆر خۆشەویست بوو لای خەڵکی کۆیە، دەنگێکی زۆر خۆش و سازگاری هەبوو.

چەند شێتێکی دیکە هەبوون کە خەڵک کەمتر گەمەی پێدەکردن، شێتێک هەبوو ناوی" حەمە رەفیقی نادری قەساب"بوو، ئەم شێتە زۆر نازاری بوو، کفری زۆر دەکرد. دەیگوت: باوکی خەڵکی دەمرێ سەروەت و سامانی بۆ بەجێ دەهێڵێت، بەڵام باوکی من جووتە پێڵاوێکی تاکەو تاکی بۆ بەجێهێشتووم، ئەم شێتە هەمیشە دەچووە سەر گۆڕستانی دەروێش خدر. شێتێکی دیکە هەبوو ناوی"خارە ستار"بوو، ئەم شێتە بە"کارخانە"تووڕە دەبوو، شێتێکی دیکە هەبوو ناوی"سەید ئەحمەد"بوو، ئەویش زۆر شێت بوو، زۆر خۆمان تێنەدەگەیاند.

ئەم شێتە وەک "حەمە شێت"دەیگوت: باوکم گەر دەرەقەت نەدەهاتی بۆ دارت لە کۆڵانکەی زەردەواڵە وەردەدا. مەبەستی لەم دەستەواژەیە سیاسی بوو، چەند شێتێکی دیکەش هەبوون. وەک: نوورییە شێت و قالە پیرەو دارا شێت و جگە لەمانە چەند ژنە شێتێکیش لەم شارە هەبوون. وەک: مریەم قەدیشەو پلکە سەفیەو، هەر یەکێک لەمانەش بەقسەیەک تووڕە دەبوون.

ئەم شێتانە هیچیان لەژیاندا نەماون، بەڵام سەرگوزشتەو قسە خۆشەکانیان تا ئەمڕۆ بۆتە وێردی سەرزمانی خەڵکی ئەم شارە.

# جێژنان لە کۆیە

## تاهیر ئەحمەد حەوێزی

(حەوێزی)ییەکان هەتا (رەشید ئاغا) مابوو، لەدوای نوێژی جێژن، کە لە مزگەوتی گەورە دەهاتنە دەر، هەرکەس دەچووە ماڵێ، نانی جێژنیان دەخوارد، ئەوجا هەموو دەچوونە ماڵی (رەشید ئاغای حاجی بەکر ئاغا) و لەگەڵ ئەم دەچوونە سەرایە، بۆلای قائیمقام، ئەوجا دەچوونە قشڵەی بۆلای (بینباشی)، لەوێوەش لەگەڵ (بینباشی) دەهاتنەخوارەوە، لە سەرا قاوە دەخورایەوە.

(غەفووری)یەکانیش هەموو لەدوای (حەمە ئاغا)ی دەڕۆیشتن، ئەمان نوێژی جێژنیان لە مزگەوتی (مەحموود ئاغا) دەکرد، ئەوجا دەچوونە سەرایە و دەچوونەوە دیوەخانی (عەولا ئاغا) و (جەمیل ئاغا) و دەچوونە مزگەوت و تەکیە و خانەقاکان. پاش عەسرێ (حەوێزی)ییەکان دەچوونەوە دیوەخانی (حەمە ئاغا)، ئەوجا دەچوونە دیوەخانی (مەلا ئەحمەد ئاغای مام سلێمانی). لەدوای وەفاتی (رەشید ئاغا)، (جەمیل ئاغا) دەهاتە ماڵی (عەولا ئاغا) و پێکەوە رەسمیاتەکەیان بەرێدەکرد، لە ئاخری زیارەتی یەکەم رۆژ (عەولا ئاغا) دەچووە ماڵی (جەمیل ئاغا) و سەرو قاوە و چایەیان دەخواردەوە و بڵاوەیان لێدەکرد. (حەوێزی)ییەکان لەدوای ماڵی (مەلای گەورە) دەچوونە ماڵی (سمایل)ی (مەلا خالید)ی، ئەوجا مزگەوتی بایزئاغا، تەکیەی شێخ کەریم، تەکیەی شێخ رەسول، مزگەوتی موفتی، خانەقای شێخ نەبی، مزگەوتی قامیش، مزگەوتی رەشە. رۆژی دووەم ئاغاکان دادەنیشتن، رۆژی سێیەم ئەسناف و هەندێ بازرگان دادەنیشتن. رۆژی یەکەم دەچوونە لای ئەو خاوەن مردووانەی، کە لەپێش یەکەم جێژن مردوویان لێ مردووە و دڵیان دەدانەوە. کە ئینگلیز هاتە کۆیە، یەکەم جەژن لە مزگەوتی گەورە کرا، (حەمە ئاغا) بەو ناوەی کراوە بە قایمقام، ئەمیش لە مزگەوتی گەورە نوێژی کرد، کە ئەو هەموو قەڵەباڵغییەی دیت و دەنگی (الله أکبر) لەناو گومبەتی مزگەوت دەنگیدەداوە و لە هاتنەدەر ئەو هەموو عالەمە، دەستی یەکیان ماچ دەکرد و جێژنە پیرۆزانەیان لێکتر دەکرد، رووی لە مەلای گەورە دەکا و دەڵێ: (هەرامە نەمزانی نوێژی جێژن ئەوەندە خۆشە!).

لە زەمانی (جەمیل ئاغا) کە بووە قایمقام، لەدوای نوێژی جێژن، خەڵقەکە هەموو دەچوونە سەرایە، ئەوجا بڵاوەیان لێدەکرد و بۆ نان خواردن دەچوونەوە ماڵێ. (حەوێزی) لە رۆژی یەکەمی جێژنی (رەمەزان) و یەکەم رۆژی جێژنی (قوربان) هیچ لێنانێن، نەدەبوایە ئاگریش بکەنەوە، لە ماڵی غەفورییەکان و دۆست و ئاشنا و خەزوورە رەعییەکانیان چێشتیان بۆ دەهاتەوە، (غەفوری)ییەکانیش لە یەکەم رۆژی هەردوو جێژنان سەر لە سبەینان پلاو ساواریان لێدەنا. ئەهالییەکەی دیکە، مانگێک زووتر خەریکی تەرتیباتی پلاولێنانی جێژنە بوون و کیژۆڵان، بەڵکو کوڕی بچووکیش دەستیان لە خەنەدەگرت و دەیانەقشاند، سبەینێ پلاوەکەیان بە دەستی دەخوارد، بە روون و چەوریەکەی، خەنەکەی بەری لەپیان هێندەی دی دەبریقایەوە.

لە جێژنان و دانیشتنی سوڵتانەکان لە دۆخی شوورەی قشڵەی بە رووکاری شار و لە بانی بەلەدیە و سەرایە، قەپوچکەی خۆڵەمێشی حەمامەکانیان، لە ریز یەک دادەنا، کە بە نەوت دەیانشێلا، یا هەریەکێ هەندێ نەفتیان پێدادەکرد و سەر لە ئێوارێ بەریز ئاگریان پێوەدەنان و بە هی سوڵتانەکانیان دەگوت (جلوس).

(حاجی قەلایی) کە لە رۆژهەڵاتی کۆیە هەڵکەوتووە و شوێنی بڵندیان هەیە، بنەماڵەیەکیان لە حکومەت معاشیان بۆ برابۆوە، کە مانگی رەمەزان و جێژنەکانیان دەدیت، لەسەر چیای ئاگرێکیان دەکردەوە و لە کۆیە ئاگرەکەیان دەدیت.

لە شەوی (١٤)ی مانگی (ئەیلوول)ی رۆژئاوایی - کە دەکاتە یەکی مانگی (ئەیلوول)ی رۆژهەڵاتی - لە فەلەستین، وەختی خۆی دیانەکان خاچ (صلیب)یان دیتیتەوە، لەسەر گردان ئاگریان کردۆتەوە، گرد بە گرد هەتا خەبەر گەیشتیتە (ئەستەنبول) و کردیانە جەژن، لەسەر ئەمە ئێستاش دیانەکان لەسەر دەستووری کەنیسەی رۆژهەڵاتی، لە عەینی شەو ئاگرێ دەکەنەوە، هەندێ ساڵ کە ترسیان نەبێ و دڵیان خۆش بێ، دەیکەنە ئاگربازی، لە کۆیەش دەڵێن (ئاگری دیانان) لە سەرەتای پایزی سێ مانگ سێ مانگییە، پێشی دەڵێن (ئاگری پایزی) کراوە، لەبۆ سبەینێ هەوا بە تەواوی دەگۆڕێ.

*** ئەم بابەتە لە کتێبی (مێژووی کۆیە)ی تاهیر ئەحمەد حەوێزی بەرگی دووەم، چاپی یەکەم ١٩٨٤ وەرگیراوە.**

# هەندێک داب و نەریتی شاری کۆیە

کازم عومەر دەباغ

خەڵکی کۆیە زۆر خولیاو شەیدای خوێندن بوون. لەساڵی ١٩٢٣ز یەکەم قوتابخانەی کچان لەم شارە کرایەوە، بەڵام لەکوردستان یەکەم قوتابخانەی کچان لە شاری هەڵەبجە لە٢١/٤/١٩٢٦ کرایەوە. وەک دەگێڕنەوە لەکۆیە چەند قوتابخانەیەک دوا بەدوای ئەم قوتابخانەیە بۆ کوڕان کرایەوە لەوانە قوتابخانەی ئەوەلی لەشوێنی کۆنە کتێبخانەی کۆنی کۆیە وەک دەڵێن ماموستا" جەلال حەویز" بەڕێوەبەری ئەم قوتابخانەیە بووە، لەدواییدا ئەم قوتابخانەیە لەساڵی ١٩٦٠ز گوازرایەوە باڵەخانەی ئێستای قوتابخانەی ئەوەلی. لەگەڕەکی دیانان، قوتابخانەیەکی دیکەی کوڕن هەبوو لەماڵی" حەمشین" لەنزیک مزگەوتی منارە بەڕێوەبەری ئەم قوتابخانەیە وەک دەگێڕنەوە ناوی" هاشم ئەفەندی" بووە، دواتر گوازرایەوە خانووەکانی" عەبدولڕەحمانی حاجی ئەسعەد" لەنزیک کۆنە ئینحساری تووتن، پێیان دەگوت قوتابخانەی" سانیە" لەپاشان گوزرایەوە بۆ شوێنی ئێستای قوتابخانەی" زانست ". خانووەکەی" عەبدولڕەحمانی ئەسعەد" بوو بەقوتابخانەی ئامینەی کچان، ست خانە بەڕێوەبەری ئەم قوتابخانەیە بوو، من ئەو قوتابخانەیەم باش لەبیرە. جگە لەمە لەناو شاری کۆیە دوو قوتابخانەی دیکە هەبوون، بۆ کوڕان یەکێکیان ناوی" قوتابخانەی قادرییە "بوو، لەماڵی حاجی جەلال بوو، نزیک مزگەوتی مەلا ئەسعەد. لەبەرئەوەی قوتابی زۆربوو پاشکۆیەکیان بۆ زیادکرد. خانووی ماڵی "حاجی مەجید "یان بەکرێ گرت، بوو بە "پاشکۆی قوتابخانەی قادرییە" بەڕێوەبەری ئەم قوتابخانەیە مامۆستا" مەجید شێخ نووری" بوو. جگە لەمە قوتابخانەی" باواجی" هەبوو، لەساڵانی کۆتایی پەنجاکان ناوی" قوتابخانەی باواجی" مامۆستا" زەکی هەناری" بەڕێوەبەری بوو، دوایی هەر لەساڵی کۆتایی پەنجاکان قوتابخانەیەکی دیکە هەبوو بەناوی زانست، مامۆستا غەریب بەڕێوەبەری بوو، لەشاری کۆیە تا کۆتایی ساڵی شەست یەک قوتابخانەی ئامادەیی کچان هەبوو جگە لەمە لەسەرەتای ساڵی شەست ٢ قوتابخانەی دیکەی کچان هەبوو، یەکێکیان قوتابخانەی کۆیسنجقی کچان لە دەباخانان کە" ست نەزیرە" بەڕێوەبەری بوو." قوتابخانەی شیرین" هەبوو" لەماڵی سەمەدی حاجی تەها" بوو. بەڕێوەبەری ئەم قوتابخانەیە" ست کافیەی حاجی سەعید بوو" جاران قوتابی دوو شەفت دەوامی دەکرد. شەفتی بەیانیان لەهەشت تا دوانزە بوو، چوار وانەبوو، شەفتی دووەم لەکاتژمێر دووی دوای نیوەڕۆ تا چواری عەسر، دوو وانە بوو تەنها ڕۆژانی پێنج شەممە شەفتی ئێواران نەبوو.

جاران ئەگەر قوتابییەک لاساری یا کارێکی نارێکی بکردبایە بەفەرمانی بەڕێوەبەر ئەم قوتابییە

لەسەر پشت درێژەكرا لەلایەن فەراشی ئەم قوتابخانەیە، ئێمە لەقوتابخانەی قادرییە دوو فەراشمان هەبوو چوار شانەبوون یەكێكیان ناوی" عومەری ئەحمەد شوان" بوو، ئەوەی دیكەشیان ناوی" دەروێش قادر" بوو، بەم كارە هەڵدەستان، كاتێ قوتابییەكەیان لەعاردی دەدا هەردوو لاقیان بەرزدەكردەوەو پێلاوو گۆرییەكانیان لەپێ دەكردەوە، بەڕێوەبەریش كە مامۆستا" مەجید شێخ نووری" بوو، بەخۆی و شوورە هەنارەكان بەئارەزووی خۆی دە پانزە داری لەبن پێی دەداو ئەوجا وازی لێدەهێنا. جاری واهەبوو خوێن لەژێر پێی دەچۆڕایەوە، بەڵام ئەوەی لێرەدا گرنگە ئەوەیە كە هیچ باوكێك نەدەهات بە بەڕێوەبەر بڵێت: جەناب بۆ وات لەكوڕەكەم كردووە، بەپێچەوانەوە، باوك هەمیشە كە دەهات بۆ قوتابخانە بە مامۆستای دەگوت: ئێسك بۆمن گۆشتیش بۆ ئێوە!!.

ئەوەی لێرەدا گرنگە باسی بكەین ئەوەیە لەساڵانی پەنجا لەقوتابخانەكانی كۆیە خواردن دەدرا بەقوتابی یان كاتژمێر دەی بەیانی خواردنەكەشی بریتی بوو لە حەبی روونی ماسی كە ڤیتامین" ٨" بوو حەبێكی وردی قاوەیی شەفاف بوو. پرتەقاڵ و سەموون و شیر و تەرەپیاز و هێلكە. هەر منداڵە دەبوو كە دێتە قوتابخانە قۆتیلەیەكی فافۆنی پێبووایە. جار جاریش لەلایەن ڕێكخراوی مرۆیی جلوبەرگ یا قوماش دابەش دەكرا بەسەر قوتابیانی هەژارو كەم دەرامەت.

ئەمە پەروەردەبوو، ئەوەی لێرەدا پێویستە باسی بكەین ئەوەیە جاران قوتابی دەرامەتی كەم بوو وەك ئێستا نەبوو بتوانرێت هەموو شتێك بۆ قوتابی دابین بكرێت، چونكە باری گوزەرانی خەڵكی زۆر خراپ بوو، بۆیە لەپشووی هاویندا قوتابی دەبوو بە كرێكار، یا لەگەڵ تیپی قەڵاچۆكردنی زیندەوەران دەچوونە گوندان لەبری وەرگرتنی مووچەیەكی كەم ئەم تیپانە" دەرمانی،"دی، تی" یان بە پەمپ دەرشاند لە لادێیەكان، جاران قوتابی كتێبی بە تەواوی نەبوو، لەبەر چرای كوڵان دەیخوێند، لەگەڵ هەموو ئەم مەینەتییانەش ئەوجا زیرەك بوو لەئێستا بەهێزتربوو پرۆسەی پەروەردەو فێركردن، لەبیرمە جاران نەوت كەم بوو خەڵكی بەشووشە دەیانكڕی یا بەتەنەكە. لە لادێیەكان دەهاتن بۆ كۆیە شووشە نەوتێكیان دەكڕی و دەنكە قەسپێكیان دەخستە سەر شووشەكە لەجیاتی تەپەدۆر، بۆئەوەی نەڕژێت داوێكیان لەملی شووشەكە دەكرد و بەپشت قوونی كەرەكە یا هێسترەكەیانەوە دەكرد و دەیانبردەوە گوندی. تەنها بۆ داگیرساندنی قەندیلە بەكاریان دەهێنا، كە كارەكەیان تەواو بووایە فووەكیان لێدەكردو دەیانكوژاندەوە. خەڵكی چێشتی بۆ ئێواران لێدەنا، خواردنی برنج زۆر كەم بوو جەژنەو جەژن بوو، خواردنی سەرەكی ساوارو نیسك و ماش و تەماتاوو داندۆك و گەنمەكوتابوو، پانكەش نەبوو لەجیاتی ئەم ئامێرە باوەشێن هەبوو كە پیرەژنەكان چواردەوریان بەپەڕۆ دەدووری بۆئەوەی پووشەكەی دەرنەیەت. كۆیە هەندێك تایبەتمەندی خۆی هەیە كە لەشارەكانی دیكەدا نییە. وەك دروست كردنی كولێرەو شلكێنەو شێلم بەترشی، جگە لەمە لەم شارەدا كە بەیانی دادەهات ژنە لادێییەكانی دەوروپشتی كۆیە مەشكەو دۆیان دەهێنا بۆ كۆیە ماڵ بەماڵ دەگەڕان جامی دۆیان بە عانەیەك دەفرۆشت، ئەوكات عانە چوار فلس بوو.

ناوی دوو ژنە كافرۆشم تائێستا لەبیرماوە یەكێكیان ناوی" یا خەزار" بوو ئەوی دیكەشیان ناوی" پلكە ئاڵتون" بوو.

لەشاری كۆیە سێ گۆڕستانی گەورە هەیە، دەروێش خدرو گۆڕستانی شەهیدان و گۆڕستانی كەكۆن. هەر گۆڕستانێك لەم گۆڕستانانە تایبەتە بە گەڕەكێك. دەروێش خدر تایبەتە بە مردووەكانی گەڕەكی بایز ئاغاو هەواوان، كەكۆن تایبەتە بە قەڵات و بەشێك لە گەڕەكی بەفری قەندی، گۆڕستانی شەهیدن تایبەتە بە مردووەكانی بەشێك لە گەڕەكی بەفری قەندی و گەڕەكی جوولەكان.

لەشاری كۆیە ئەم چوار گەڕەكەی

کە باسمان کردن کاتی خۆی هەبوو، بەڵام لەکۆتایی پەنجاکان گەرەکی سەرباغ کە بە گردی جوولەکەکان ناسراوە دروست کرا، کە ئەم گردە لەلایەن قائیمقام هادی چاوەشلی دابەش کرا. یەکەم خانوو خانووی مام مستەفای دۆندرمە فرۆش بوو، دووەم خانووی مەلا حەمید عەزیز بوو، سێیەم خانووماڵی کاک مەهدی بوو، چوارەم خانوو ماڵی حەمەدەسی تەکەوری بوو کە دۆستێکی نزیکی باوکم بوو.

جاران لەکۆیە چەند نانەوایەک هەبوون کولێرەیان دروست دەکرد، لەوانە: مەلا تەها، وەستا مستەفای نانەوا، ماڵی حەمەگرانی بوو.

رۆژێکی مێژوویی هەیە لەکۆیە پێیدەڵێن رۆژی لافاوی" عەدەبەرەک" لەم رۆژەدا کە ١٩٥٧/٦/٥ بارانێکی بەتوند باری بووە هۆی ئەوەی کە ئەم پیاوە لەسەر وڵاغەکەی بوو رووباری شیوی رەزان بیباو تەرمەکەیان دوای نیوەڕۆ لە کەونە پرد نزیک کانیلە گرتەوە. ئەم رۆژە بوو بەمێژوو، چونکە لەم وەختە ئەم باران بارینە چاوەڕێ نەدەکرا.

جاران لەکۆیە ئۆتۆمبێل زۆر کەم بوو، چەند کەسێک سەیارەیان هەبوو وەک جەلال حەوێز، مستەفا مەروان، محەممەد مەروان، سمکۆی مام برایم، مام زرارو مام حەمید، جۆری سەیارەکان" تەنتە، مۆریس، پاسی دار" بوو لەکۆتایی پەنجاکان سەیارەی" جێب" ی، ئەمریکی بەچادر پەیدابوون کە بە" هندر" ئیشیان دەکرد، لەجیاتی" سلف ".

خەڵکی کە سەفەریان دەکرد بۆ هەولێر یا کەرکووک زۆرمەینەتی و نا رەحەتیان دەدیت لەرێگا، لەبەر خراپی رێگا، خەڵکی هەردەبوو بێنەخوار پاڵ بە سەیارەکەوە بنێت، جاری واهەبوو شەوانە لەرێگا دەمایەنەوە کە دەگەیشتینە هەولێر یا کەرکووک دەبوو خەبەرمان رەوانەی کۆیە بکردبایە کە گەیشتین، کۆیە پێش ژیانی ئەوکات. دەگێڕنەوە رێگا کەرکووک - کۆیە پێش رێگای هەولێر هەبووە. جاران دەبوو زنجیر بەکاربێنن بۆ تایەی سەیارە لەترسی چەقین.

لەبیرمە کە منداڵ بووم لەگەڵ ماڵەوەمان چووین بۆ رانیە، ئەوکات رێگای ئۆتۆمبێل نەبوو تا گوندی سەرخە لە نزیک هێزۆپ بە وڵاغ دەچووین، ئەوکات چەند کاروانچییەک لەکۆیە هەبوون لەوانە: حەمە غەریبی کاروانچی، مام قادر، قولە، سمایل حەمە خان، حاجی رەزاو حاجی برایم، کە گەیشتینە" سەرخە" لەوێ بە سەیارە چووین بۆ رانیە، چونکە سەیارە لەرانیە هەبوو لەسلێمانی دەهات بۆ دۆکان و بە کەلەک" میرزا رۆستەم" دەپەڕاندراوە لە دەربەندی رانیەوە لەوێشەوە دەهات بۆ رانیە. ئەم زانیارییەم لەخزمێکی خۆم وەرگرت دەربارەی هاتنی سەیارە لەسلێمانییەوە بۆ رانیە، لەساڵانی ١٩٥٦ز رانیە زۆر بچووک بوو، لە فلکەی ناو بازاڕ و قولە تێنەدەپەڕی، ئاوی ساردی کوێرەکانی بەجۆگە بەناو بازاڕدا دەڕۆیشتن، ئێوارەی ساڵانی پەنجا تا ساڵانی شەستی شاری کۆیە زۆر خۆش بوو چەند چایخانەیەک هەبوون کە ئێواران دادەنران لەسەر باخچەکانی شیوی رەزان و دەوروپشتی شار. لەمانە چایخانەی حەمە سەعید لە تەم تەما، چایخانەی سەر قەبرۆکان لەدەرگای خۆشناوەتی کە زاهیری مام رەشید کاروباری بەڕێوەدەبرد. چایخانەی کانی لەسەر رێگای دەروێش خدر، کاک فائیق ئاغا مستەفا کاروباری بەڕێوەدەبرد. چایخانەیەکیش هەبوو لەبن پردی ئازادی مام تەها بەڕێوەی دەبرد. ئەم چایخانانە هەتا درەنگی شەو هەبوون.

کاتی خۆی کەئێمە منداڵ بووین هەندێک گەمەو یاری فۆلکلۆری لەم شارەدا هەبوون. وەک، قەڵا قەڵایانێ، چاو شیلکانێ، مەزراعانێ، پەلیکانێ، قۆچەقانی، جیخزە، کەوشەکانێ، کێل و بەردانێ، مووشانێ، هی کچانیش شیشانێ و پێنج بەردانێ و پەیانێ بوو.

جگە لەمە لەکۆیە بۆنەیەکی زۆر خۆشمان هەبوو ئەویش ساڵێ یەک دوو شەوبوو" شەوبەرات" بوو، لەکۆڵانان دەگەڕاین، لەدەرگای ماڵانمان دەداو دەمانگوت:" شەوی شەوبەراتێ، خودا دوو کوڕو کچتان

داتێ، كابانێ دەست لەمالێ بگێرێ بەشی مندالە ورتكان بنێرێ" خاوەن مال قەسپ و نوقل و پارەیان دەداینێ. جاری واهەبوو ئاویان پێدادەكردین، یەكەم جار لەشەوی شەوبەرات رووت كرام لەبن تاقی مالی حەمە ئاغا كابرایەک سەرو دەمامكی كردبوو هاواری كرد گوتی: هەرچی پێتانە داینێن. كابرا لێمان نزیک بۆوە كیسە پرەكەی لەدەست ستاندین و بردی من و براكەم بەدەست بەتالی گەراینەوە. لەمالەوە كە چاویان بەئێمە كەوت غەمبارین، گوتیان: چی بووە؟ ئێمەش رووداوەكەمان بۆ گێرانەوەو باوكم پارەی داینێ و قەرەبووی كردینەوە لەجیاتی دزە.

لەشاری كۆیە چەند پیرەژنە دیانێک هەبوون وەک" هەنیسە، وارێ" ئارەقیان دروست دەكرد بە جام دەیانفرۆشتە مندالە موسلمان. كە ئارەقەكەیان بۆ لە شووشە دەكردن بە مندالە موسلمانەكانیان دەگوت:" بخۆنەوە قوزەرقورتان بی ".

لەنزیک ئەم شارە هەندێک هاوینە هەواری خۆشی هەیە وەک چنارۆک و ئۆمەر خوچان و كانی ئۆمەر ئاغاو جەلی و نازەنین و حەمامۆک. جگە لەمە لەنزیک ئەم شارە" ئاوی مەعدەنی" هەیە، كە بۆ نەخۆشی پێست بەكاردێت، وەک ئاوی" گەراوان" لەدۆلی ئەسحابان و ئاوی گەراوانی ناو رووباری جەلی. جگە لەمە لەو شارە گەچ و نەوت هەیە. نەوت لەسالانی حەفتا بەئاشكرا بینرایەوە لەناوچەی شیواشۆک. وەک لەمێژوودا باس كراوە.

هەر لەكۆنەوە كۆیە مەیدانی ململانێی بیرورای سیاسی بووە، لەسالانی دوای ۱۹۱۸ز خەلكی كۆیە تەقەیان لەجێگری حاكمی ئیداری ئینگلیز" برادشۆ" كرد. داوای دابەشكردنی گەنجینەی دەولەتیان دەكرد. ئەمە خۆی لەخۆیدا ئەوە دەگەیەنێت كە بیری بەلشەفی واتا شیوعییەت گەیشتبووە ئەم شارە و باخە بەربوون.

دوای شۆرشی ١٤ی گەلاوێژی ۱۹۵۸ز لەشاری كۆیە لەبیرمە هەندێک رێكخراوی شیوعییەكان هەبوو یەكێک لەمانە" بارەگای مافی ئافرەتان" بوو كە لەپشت كۆنە كتێبخانەی كۆیەوە، بەرێز" خەجیج خان" لێپرسراوی ئەم شوێنەبوو. ئەم ژنە قارەمانە شۆرشگێرە زۆر هێژاو لێهاتوو بوو كە بە زیرەكی خۆی تا رادەیەكی زۆر توانی كار بكاتە سەر هوشیاركردنەوەی ژیانی شاری كۆیە. لەم شارەدا لەبیرمە لەسالی ۱۹۵۸" المقاومە الشعبی - واتا بەرگری میللی" هەبوو مەشقیان دەكرد لەسەرای كۆن. بەرگی خاكیان لەبەربوو پانتۆرەكانیان كورت بوو، جگەلەمە لەبیرمە دووكەس لەكۆیە رۆژنامەیان دەفرۆشت یەكێكیان ناوی حەمە بگرەز بوو كە رۆژنامەی "خەبات"ی دەفرۆشت، ئەوی دیكەیان" بەشیرەكۆر" بوو كە دیان بوو رۆژنامەی" ئازادی" دەفرۆشت، بەیانیان ئەم دوو رۆژنامەفرۆشە لەناو بازاری گەورە لەكاتی هاوار هاوارو دەنگ بەرزكردنەوە بەسەر یەكتریدا لێیان دەبوو بەشەر.

حەمە بگرەز هاواری دەكردو دەیگوت:" خەبات، خەبات ".

بەشیرە كۆریش دەیگوت" داری ئازادی بەخوێن ئاو نەدرێ قەت بەرناگرێ، سەربەخۆیی بێ فیداكاری ئەبەد سەرناگرێ ".

لەم رۆژگارەوە ململانێی سیاسی هەبوو لەم شارە، هەر زوو زوو خۆپێشاندان دەكرا، لەكاتی خۆپێشاندان كرێكار خاكەناسی لەسەر شان نابوو و جوتیار داسی بەدەستەوەبوو، بەرگدروو مەقەس و نیوگەزی بەدەستەوەبوو، لەپێشیان مامۆستایەک بەناوی" بلال" درویش دەیگوت:

**لەسەریاندە كەریم لەسەریاندە**
**مەیان هێلە**
**گەل و سوپای مەزن بە خائینان**
**مەپارێزە**

ئەمەی خستمەروو هەندێک زانیاری بوو دەربارەی شوێنەوارەكانی كۆیە، هەر كەسێک زانیاری دیكەی هەیە با هیمەت بكاو مشتێكی دیكە بخاتە سەر خەرمانی زانیارییەكان بۆئەوەی بابەتەكە بە پێزتر و دەولەمەندتر بێت.

# خواردنە میللییەکانی خەڵکی هەولێر

د.هیمداد حوسێن

**پێشەکی:**

رەنگە ئەم ناونیشانە سەیر بێتە بەرچاو، خواردن چییە؟! بەڵام خۆی لە راستیدا هەر میللەتەو تایبەتمەندی خۆی هەیە، لە هەموو بوارەکانی ژیاندا، ئادەمیزاد رەنگە بەرگەی هەموو کەش و هەوایەک نەگرێت و بەناوچەی هەرێمی خۆی راهاتبێ، خۆ رووەک و گیاو گوڵیش هەر بە هەمان شێوە زەمینەی خۆیان هەیە و لەناوچەی خۆیان دەرسکێن، بەهاران خەڵکی روو لەو خواردنانە دەکەن، کە بەگیاو گوڵی کوردستان و رووەکی خۆرسک دەروێن، لەگەڵ چەند کابانێک دانیشتبووم، هەندە بەتام باسی ئەو خواردنانەو دروست کردنەکەیان دەکرد، تەماحیت دەچووێ، بیرم لەوە کردەوە، بینووسمەوە.

گیروگرفتی ئەم جۆرە نووسینانە ئەوەیە لەهەر ناوچەیەک و خواردنەکان ناوەکانیان دەگۆرێ و رووەکەکانیش کەم و زۆر جوایەزییەکیان هەیە، ئەو خواردنانە لە دەشتی هەولێرێ دەخورێ رەنگە لە جێی دیش هەروەبن.

بۆ کاری ئاسان کردن و جیاوازکردنەوە، بەشێوەی خواردنە شل و خەستەکان و ئەو خواردنانەی لە هەولێر دروست دەکرێن، جیاکراونەتەوە.

بە ئومێدم رێنوێنییەک بێ بۆ ئامادەکردنی ئەم جۆرە خواردنە میللییانەی میللەتەکەمان و لە نووسینەوەی کەلتوورو کەلەپووری دێرین و دەوڵەمەندمان هەنگاوێک بێت.

*** خواردنە خستە میللییەکان.**

*** کاردی بەگەنم:-** کەرەستەکان (کاردی، گەنمەکوتاو، خوێ، ئاو، رۆن)

کاردییەکە زەرد دەکرێ و بەترشی سماق لەبەردەخرێ، دوایی گەنمەکوتاوی بۆ زەرد دەکرێ تێکەڵ دەکرێ لەگەڵ کاردییەکە، بەڵام کاردییەکە پاش زەرد کردنی دەپاڵێورێ، ئینجا تێکەڵ بە گەنمەکە دەکرێ ئینجا جوان دەکوڵێنرێ تاکو خەست دەکرێتەوە، پاشان رۆنی قرچاوی پێدادەکرێ یاخود هەندێ جار لە جیاتی گەنمەکوتاو، برنجی تێدەکرێ پێی دەڵێن (کاردی بە برنجی)

*** گەنمەکوتای بەسلق:-** کەرەستەکان " گەنمەکوتای، سلق، رۆن، ئاو، خوێ، ترشی، سماق)

گەمەکوتاوەکە زەرد دەکرێ تا جوان دەکوڵێ سلقەکەش لەناو رۆن زەرد دەکرێ و ئینجا ئاوی سماقی تێدەکەین لەگەڵ گەنمەکوتاوەکە تاکو خەست دەبێتەوە ئینجا بە گەرمی پێشکەش دەکرێ.

*** ساوەر بەتۆڵەکە:-** کەرستەکانی (تۆڵەکە، ساوەر، رۆن، ئاو خوێ)

تۆڵەکەکە زەرد دەکرێ دەپاڵێورێ ئینجا رۆن دەقرچێنرێ تۆڵەکەکەی تێدەکرێ تاکو سووردەبێتەوە ئینجا ئاوی تێدەکرێ بەپێی ساوەرەکە دوایی ساوەرەکەی تێدەکرێ دوای تەواو کوڵانی خەست دەبێتەوەو لەیەکتر دەئاڵێن.

*** پلاو گامێش:-** کەرستەکان (گەنمەکوتاو، رۆن، ئاو، خوێ، کشمیش)

گەنمەکوتاوەکە وەکو برنج زەرد دەکرێ و دەپاڵێورێ پاشان وەکو پلاوی برنج نانی لەژێر دادەنرێ و رۆنی داخ بووی بەسەردا دەکرێ دەمی پێدەکێشرێ دوایی لەگەڵ ماستاو یان شلە لەگەڵ سەوزە دەخورێ.

*** قەرە خەرمان:-** کەرستەکانی (قەرە خەرمان، رۆن، خوێ، کشمیش).

قەرە خەرمان خواردنێکی میلليی کوردییە لە شێوەی ساوەرە هاوینان خەڵک لە گەنم دروستی دەکەن پێش ئەوەی گەنمەکە بە تەواوەتی پێبگات، کە بە شێوەیەکی قبوولی لێدەنرێ، ئەویش رۆنی بۆ داخ دەکرێ دوایی ئاوی تێدەکرێ بەپێی قەرە خەرمانەکە ئینجا قەرە خەرمانەکەی تێدەکرێ تاکو خەست دەبێتەوە، لەگەڵ شلە یان زەڵاتە دەخورێ.

*** پیرخەنی (پیرخەنیلە):-** کەرستەکانی (وردە ساوەر، رۆن، ئاو، پیاز، خوێ)

پیازو رۆنەکە سووردەکەینەوە ئینجا ئاوی تێدەکرێ بەپێی وردە ساوەرەکە، کە ئاوەکە کوڵا وردە ساوەرەکەی تێدەکەین تاکو خەست دەبێتەوە.

*** پەردە پلاو:-** کەرستەکانی (برنج، کشمیش، قیمە، پەتاتە، هەرشتە، رۆن، دۆشاو، خوێ)

برنجەکە دەکرێتە ئاوەوە، واتە دەشۆردرێتەوە، زەرد دەکرێ و دەپاڵێورێ، دوایی چەند شتێکی بۆ سوور دەکرێتەوە وەکو قیمە، پەتاتە، کشمیش، هەرشتە، ئەم شتانە لەگەڵ رۆن و دۆشاوی تەماتە سووردەکرێنەوە دوایێ لەژێر مەنجەڵەکە نان دادەنرێ چین چین برنج و قیمە و هەرشتەکە دادەنرێت و ئینجا دەخرێتە سەر ئاگرێکی کزو رۆنی قرچاوی بەسەردا دەکرێت و وازی لێدەهێنرێ تاکو جوان دەم دەکێشێ و ئامادە دەکرێ بۆ خواردن، کە خواردنێکی فۆلکلۆری کوردییەو لە هەولێریش دروست دەکرێ.

*** گەشکەک:-** کەرستەکان (گەنمەکوتاو، گۆشت، رۆن، ئاو، خوێ)

گۆشتەکە جوان دەکوڵێنرێ ئینجا ئاوی دیکەی تێدەکەین تاکو دەکوڵێ ئینجا ئەگەر گۆشتەکە زۆر چەور بێ، ئەوا رۆنی کەمتر تێدەکرێ ئینجا گەنمەکەی تێدەکرێ تاکو خەست دەبێتەوە ئامادە دەکرێ بۆ خواردن.

*** یاپراخ (دۆڵمە):-** کەرستەکانی (برنج، قیمە، کودی، باینجان، تەماتە، سلق، گەڵامێو، سماق، شبیت، پیاز، رۆن، ئاو، خوێ، بەهارات و زەردەچەوە).

برنجەکە دەشۆردرێتەوە دوایی ناوی کودییەکە و باینجان و تەماتە و پیاز لەگەڵ قیمەو دۆشاو سوور دەکرێتەوە دەخرێتە ناو برنجەکە ئینجا برنجەکە دەخرێتە ناو ئەو کەرستانەو دەپێچرێنەوە چین بە چین دوایی بە گوێرەی برنجەکە ئاوی گەرمی تێدەکرێ لەگەڵ هەندێ ئاوی سماق تاکو دەکوڵێ.

*** قبولی بە مریشک:** (برنج، گۆشتی، مریشک، رۆن، ئاو، خوێ).

گۆشتەکە دەکوڵێنرێ تاکو گۆشتاوەکە پەیدا دەبێ، ئاوی تێدەکرێ بەپێی برنجەکە ئەوجا برنجەکەی تێدەکەی لەگەڵ خوێ تاکو خەست دەبێتەوەو لێک دەئاڵێن قبولی، بەمریشکی لێدەردەچێ.

*** خواردنە شلە میللییەکان**

*** ماشێنە:** (ماش، ئاو، خوێ، رۆن، گەنمەکوتاو، پیاز).

خواردنێکی زستانەیە بەتایبەتی بە رۆژانی باران و سارد، بەم شێوەیە لێدەنرێ: گەنمەکوتاو لەگەڵ ماشی رەش دەخرێتە سەر ئاگر تاکو جوان لێک دەئاڵێن و دەپشکوێ ئینجا رۆن و پیازی بۆ دەقرچێندرێ و تێیدەکرێ، لەگەڵ بیبەری تیژ تاکو پێدەگات.

*** نیسک بەترش:** (نیسک، دۆشاوی تەماتە(ئاوەتەماتە)، کەرەوز، رۆن، پیاز، برنج، سلق).

نیسکەکە دەخرێتە سەر ئاگر تا وەکو دەکوڵێ لەگەڵ هەندێ برنج، بێگومان لەسەرەتادا رۆن و پیازی تێدەکرێ ئینجا هەندێ ئاو ئینجا نیسک و برنجەکە دوای کوڵانی هەندێ دۆشاوی تەماتەو خوێی تێدەکرێ لەگەڵ کەرەوز سلقیش تاکو کوڵانی بۆ ئەوەی تام بگرێ ئینجا بەشێوەی شۆربا دەخورێ.

*** نیسکێنە:** (نیسک، برنج، پیاز، رۆن، خوێ، زەردەچەوە و بەهارات، کەرەوز)

پیازەکە لەگەڵ رۆنەکە دەقرچێندرێ دوایی ئاوی تێدەکرێ لەگەڵ بەهارات و زەردەچەوەکە دوایی نیسک و برنجەکەی تێدەکرێ کەرەوزی هوردکرای تاکو پێدەگات بەشێوەی شۆربا دەخورێ.

*** شۆربا بە ساوار:** (رۆن، ساوەر، ئاو، خوێ)

رۆنەکە دەقرچێنرێ ئینجا ئاوی و پاشان ساوەرەکەی تێدەکرێ.

*** شیربرنج:** (برنج، شیر، رۆن، ئاو، خوێ)

رۆنەکە دەقرچێنرێ و تۆزێک ئاوی تێدەکرێ لەگەڵ شیر تاکو

دەکوڵێ، ئینجا برنجەکەی تێدەکرێ لەگەڵ خوێ تاکو برنجەکە لێک دەئاڵێ بەشێوەی شۆربا دەردەچێ.

*** دۆکولیو:** (ماست، ئاو، گەنمەکوتاو، جاترە)

لە پێشدا ماستەکە دەکەین بە ماستاو و گەنمەکە زەرد دەکرێ ئەوجا ماستاوەکەی تێدەکەین و جاترەکەشی تێدەکەین تێکی دەدەین، بە بەردەوامی بۆ ئەوەی هەڵنەگەرێ بەشێوەی شۆربا دەردەچێ.

*** قورماوی:** (گۆشتی قەڵەو، ماست، جاترە، ئاو، خوێ، رۆن)

رۆنەکە دەقرچێندرێ ئەگەر گۆشتەکە قەڵەو نەبێ و ئەگەر قەڵەوبێ پێویست ناکات. گۆشتەکەی تێدەکرێ ئینجا تا ماوەیەک ماستەکە لە مەکینە دەدرێ بۆ ئەوەی لووس بێ دەکرێ بە ماستاو لە گۆشتەکە دەکرێ کاتێ گۆشتەکە کوڵابێ ئەوجا جاترەی تێدەکرێ تێکی دەدەین بەبەردەوامی بۆ ئەوەی هەڵنەگەرێ.

*** گیپە:** (سەرو پێی مەڕ، ورگ و ریخەڵۆکەکانی، برنج، کشمیش، بەهارات و زەردەچەوە، ئاو، خوێ).

سەرو پێیەکان لەگەڵ ریخەڵۆکەکان لەسەر ئاگرێک دادەنرێ بۆ ئەوەی بکوڵێت، ورگەکەش پاش پاک کردنەوەی پارچە پارچە دەکرێ بەشێوەی گەورەو بەشێوەی تورەکە دەدورێت ئینجا کشمیش و بەهارات و زەردەچەوە دەخرێتە ناو برنجەکە، برنجەکەش دەخرێتە ناو تورەکەکانی (ورگە مەڕ) ئینجا بە دەزووی سپی دەدورێتەوە ئینجا دوو سێ کون لە گیپەکان دەکەن تا هەڵنەوەشێن پاشان دەکوڵێ و پێشکەش دەکرێ.

*** زۆرچکار:** (پیاز، پەنیر، خوێ، ئاو، رۆن).

پیاز و رۆنەکە سووردەکرێتەوە پەنیری هوردکراوی تێدەکرێ تاکو سوور دەبێتەوە، ئینجا ئاوی تێدەکرێ تاکو دەکوڵێت نانی تێدەگوشرێ.

*** هێلکاو:** (پونگ، برنج، دوو تاسێ هێلکە، دۆشاوی تەماتە، رۆن، پیاز، برنج)

یەکەمجار هێلکەکە دەکرێ بە هێلکەو رۆن، پاشان رۆن و پیاز دەکرێ و دۆشاوی تەماتەی تێدەکرێ، ئینجا ئاوی تێدەکرێ تاکو دەکوڵێ ،پاشان پونگ و برنج دەکرێتە ناوی بەشێوەی شۆرباو ئینجا پاش کەمێک هێلکەکە ورد ورد دەکرێ و دەکرێتە ناوی و بەگەرمی پێشکەش دەکرێ.

*** دۆینە:** (شیرێژ، بروێش(برووش)، رۆن، خوێ، ئاو)

شیرێژ خاو دەکرێتەوە لەگەڵ بروێش لە ئاوی دەکەن هەندێ خوێ تێدەکرێ و دەکرێتە سەر ئاگر لە سەرەتادا کەمێک رۆنی تێدەکەن ئینجا بەشێوەی شۆربا دەردەچێ و دەخورێت،کە خواردنێکی فۆلکلۆری کوردییە لە کوردستان و بەتایبەتیش هەولێر زۆر باوە.

*** شلە میللییەکان (مەرەگە)**

*** کەنگر بەترش:** (کەنگر، دۆشاوی تەماتە، پیاز، رۆن، ئاو، خوێ).

کەنگرەکە زەرد دەکرێ دەپاڵێورێ ئینجا رۆن و پیاز سووردەکرێتەوەو کەنگرەکەی تێدەکرێ و ئاو و خوێی تێدەکرێ تاکو دەکوڵێ، ئینجا دۆشاوەکەی تێدەکرێ تاکو دەکوڵێ و لەگەڵ برنج دەخورێ.

*** پیازاو:** (پیاز، دۆشاوی تەماتە، رۆن، خوێ، ئاو، لەتکەنۆک، گۆشتی مەڕ).

گۆشتەکە چاک دەکوڵێنرێ پاشان رۆن و پیازو دۆشاوەکە لەسەر ئاگر دادەنرێ تا ماوەیەک ئینجا گۆشتاو و گۆشتەکەی تێدەکرێ لەگەڵ برنج یان بەتەنیا دەخورێ.

*** شلەی ماشەسپی:** (ماشە سپی، پیاز، رۆن، ئاو، خوێ)

ماشەکە دەکوڵێندرێ و ئینجا دەپاڵێورێ دوایی رۆن و پیاز سووردەکرێتەوە و ئاوی تێدەکرێ لەگەڵ خوێ تاکو دەکوڵێ، ئینجا دۆشاو و ماشە سپییەکەی تێدەکرێ.

*** شلەی بامیەو باینجان:** (بامیەو باینجان، دۆشاوی تەماتە، پیاز، رۆن، ئاو،خوێ)

پیازو رۆنەکە سووردەکرێتەوە لەگەڵ باینجانەکە ئاوی تێدەکەین تاکو دەکوڵێ، پاشان دۆشاوەکەی تێدەکەین و لەگەڵ بامیەکان تاکو دەکوڵێت.

*** شلەی تەماتە:** (تەماتە، رۆن، ئاو، خوێ، پیاز)

پیازو رۆنەکەی سووردەکرێتەوە ئینجا تەماتەکەی تێدەکرێ تاکو دەکوڵێ ئەوجا بەپێی ئارەزوو ئاو و خوێی تێدەکرێ.

*** شلەی فاسۆلیا:** (فاسۆلیا، ئاو، خوێ، رۆن، دۆشاوی تەماتە)

رۆنەکە دەقرچێندرێ دۆشاوی تەماتەو ئاو و خوێیەکەی تێدەکرێ کە فاسۆلیاکە پێشتر زەردکراوە تاکو دەکوڵێ و نابێ پیازی تێبکەی، چونکە فاسۆلیاکە دەبات.

*** شلەی پەلَپینە:** (دۆشاوی تەماتە، پەلَپینە "پرپرە"، ئاو، خوێ، رۆن)

ئاو و خوێ و رۆن و دۆشاوی تەماتەکە باش دەکولێنرێ ئینجا پرپرەکەی تێدەکرێ و هەندێ جار لەگەلّ کفتەی برویش پێشکەش دەکرێ و ئەم جۆرە شلە لەناوچەی کۆیە زۆر دەخورێ.

*** خواردنە رووەکییە میللییەکان.**

*** قەیسی و رۆن** (قەیسی، رۆن، ئاو، خوێ، شەکر)

قەیسییەکە دەکولێندرێ بە کەوچک پاندەکرێتەوە بۆ ئەوەی جوان لێک بئالێ ئینجا شەکری تێدەکرێ لەگەلّ هەندێ خوێ، ئینجا رۆنی قرچاوی بەسەردا دەکرێ.

*** هەرمێ و رون:** (هەرمێ، رۆن، خوێ، ئاو، شەکر)

هەرمێیەکە ورد دەکرێ و دەکولێنرێ و پاشان شەکری تێدەکرێ لەگەلّ خوێ، ئینجا رۆنی قرچاوی بەسەردا دەکرێ و پێشکەش دەکرێ.

*** دۆشاو و رۆن: (حاسیلکە):** (رۆن، دۆشاوی خورما)

رۆنەکە بە گوێرەی پێویست دەقرچێندرێ و دۆشاوەکەی تێدەکرێ و نانی تێدەگوشرێ و دەخورێ، کە یەکێکە لە خواردنە قورسەکان.

*** تەماتەو رۆن:** (تەماتە، رۆن، پیاز، خوێ)

پیازو رۆنەکە سووردەکرێتەوەو تەماتەکە قاش قاش دەکرێ و دەکرێتە ناوی تاوەکو سوور دەبێتەوە، ئامادە دەکرێ بۆ خواردن.

*** حەلوا و رۆن:** (ئارد، رۆن، شەکر، ئاو، کەمێک خوێ)

رۆنەکە باش دەقرچێنرێ پاشان ئاردەکەی تێدەکرێ سوور دەکرێتەوە هەتاوەکو رەنگی قاوەیی دەبێ، ئینجا شەکر لەگەلّ ئاوەکە وەکو شەکراو دەکرێتە ناوی پاشان خەست دەبێتەوەو پێشکەش دەکرێ.

*** پەلوی کودی:** (کودی، رۆن، ئاو، خوێ).

کودییەکە هورد دەکرێ و زەرد دەکرێ و دەیپالێوین و ئینجا رۆن دەقرچێنرێ، کودییەکەی تێدەکەین لەگەلّ خوێ تا جوان سووردەبێتەوە رەنگێکی پرتەقالّی دەردەچێ.

*** سلّقی سوورکراوە:** (سلّق، خوێ، رۆن، ئاو)

سلّقەکە ورد دەکرێ لەگەلّ خوێ زەرد دەکرێ پاشان رۆن و پیازو هێلکەی لەگەلّ تێکەلاو دەکرێ و سووردەکرێتەوە.

*** خواردنە گیاییە سروشتییەکان.**

*** تۆلّەکە(تۆرکە):** (رۆن، پیاز، هێلکە، تۆلّەکە)

تۆلّەکە گیایەکی بەهارییە بەشێوەیەکی سرووشتی لە دەشت و دەر سەوز دەبێ، کە بەم شێوەیە ئامادە دەکرێ: تۆلّەکە، زەرد دەکرێ دوای پالاوتنی لەناو رۆن و پیاز و هێلکەدا سووردەکرێتەوە ئینجا پێشکەش دەکرێ.

*** کەنگر:** (رۆن، خوێ، هێلکە، ئاو)

خواردنێکی بەهارییە، کە لە شاخەکاندا دەروێ بەمجۆرە ئامادە دەکرێ: کەنگرەکە دوای ورد کردنی زەرد دەکرێ دوایی دەپالێورێ ئینجا لەناو رۆن و پیازو هێلکە سووڕ دەکرێتەوەو پێشکەش دەکرێ.

*** کەنگر کەباب:** (کەنگر ماسی): (ئارد، رۆن، کەنگر، خوێ، ئاو)

کەنگرەکە زەرد دەکرێ ئارد و هێلکەی تێکەلّ دەکرێ بەیەکەوە ئینجا کەنگرەکان لەناو هێلکەو ئاردەکە هەلّدەکێشین و دەیخەینە ناو رۆنی قرچاو دانە دانە تاکو جوان سوور دەبنەوەو پێشکەش دەکرێ.

*** کاردی:** (کاردی(کاردوو)، سماق، رۆن، پیاز)

کاردییەکە جوان زەرد دەکرێ و بە سماق لە بڕ دەخرێ، بۆ ئەوەی زمان نەبڕێ دوایی لەناو رۆن و پیازدا سووردەکرێتەوە ئینجا پێشکەش دەکرێ.

*** کارگ (قارچک):**

بەمشێوەیە ئامادە دەکرێ: کارگەکە بە هیشکی دەبرژێنرێ و وەکو گۆشت دەخورێ،یاخود زەرد دەکرێ دوایی لەناو رۆن و پیاز وەکو کەنگر سووردەکرێتەوە.

*** پونگ:**

گیایەکی بەهارییە لە دەشت و دەر دەروێ بۆ زۆربەی چێشتە فۆلکلۆرییەکان بەکار دەهێنرێ و تێی دەکرێ.

*** خواردنی بەرهەمی ئاژەلّی**

*** کەرە:** ئەو خواردنە کاتێک پەیدا دەبێ، کە بەهاران ماست زۆر دەبێ. ماست دەژێنن بەمەشکە هەتا رۆن لە ماستەکە جیا دەبێتەوە، کە بەشێوەی تۆپەلّی خڕ لە مەشکەکە دێتە دەرێ و دۆیەکەش وەک ماستاو

دەخۆنەوە.

* **پەنیر:** ئەمەش لە کاتی بەهاران دروستدەکرێ لە ماستی مەڕ، کە شیرەکە زۆر دەکوڵێ تا خەست دەبێتەوە، دوای هەوێن دەخەنە ناو شیرەکە تاکو ببێ بە پەنیر، ئینجا ئەو پەنیرە دەخەنە ناو پێست بۆ ئەوەی خراپ نەبێ لە وەرزی زستان بیخۆن.

* **شیرێژ:** لەوە دروست دەبێ کە دۆی ناو مەشکە زۆر دەکوڵێنن تاکو خەست دەبێتەوە ئینجا دەیپاڵێون دەیخەنە ناو راوکەوە بۆ ئەوەی تیزاوکەکەی لێ جیا ببێتەوە ئەوەی لێی دەمێنێتەوە پێی دەڵێن شیرێژ.

* **کەشک:** " گەنم، کەشک، رۆن، خوێ، ئاو"

ئەم کەشکە بەهۆی ماستی مەڕەوە دروستدەکرێ، کە بەم شێوەیە ئامادە دەکرێ کەشکەکە لە ئاوی گەرم دەکرێ بۆ ئەوەی کەشکەکان بخوسێن،دوایێ گەنمەکە زەرد دەکرێ تا جوان دەکوڵێ ئینجا ئاوی کەشکەکان دەخەینە ناو گەنمەکوتاوەکە، ئینجا رۆنی قرچاوی بەسەردا دەکرێ و دەخورێ.

* **دۆفرۆ:** ئەوەیە کە لە شێوەی ماستدایە،کە بەهاران مەڕ بۆ یەکەمجار دەدۆشرێ، شیرەکەی دەبێ بەفرۆ لەبەرئەوەی تازە زاوە لەبەرئەوەش تامێکی شیرینی لێدێ.

* **قەیماغ:** خواردنێکی شیرەمەنییە کە شیرەکە دەکوڵێ، کە سارد دەبێتەوە قەیماغەکەی لێدەگرن دەیخەنە ناو شوێنێکی سارد بۆ ئەوەی رەق ببێ ئینجا دەخورێ بەتایبەتی بەیانیان.

* **هەنگوین و رۆن:** هەنگوین بەهۆی مێشی خۆماڵی دەستمان دەکەوێ، کە لەگەڵ رۆن واتە کەرە دەخورێ.

**خواردنی هەویری.**

* **نانی تیری:** نانێکی میللییە هەتاوەکو ئێستاش بەکاردەهێنرێ، نانەکە گەورەو تەنک یان ئەستوورە.

* **کولێرە پەنجەکێش:** کە هەویرەکە دەشێلدرێ دوایی بە ئاو و رۆن بە پەنجە نانەکەیان دەکەنەوە، کە ئەو نانەش بە پەنجە پاندەکرێتەوە.

* **ناوساجی:** هەویرەکە بە خومرە ئامادە دەکرێ و دەبێ هەندێ شلتر لە هەویری نان ئامادەبکرێ ئینجا دوای ماوەیەک هەویرەکە هەڵدێ، دوایی لەسەر قاپێک پان دەکرێتەوە بە پەنجە پاشان لە رۆنی قرچاودا سوور دەکرێتەوە و (ناوسێری)پێ دەڵێن..

* **شلکێنە:** هەویرەکە بە هێلکەو ئاو و خوێ تۆزێ بەشلی ئامادە دەکرێ پاشان بە کەوچکی گەورە بە ساجیدا دەکەی پاشان هەڵیدەگێڕییەوە دوایی چەوری دەکەی و دەیخۆی.

* **کەلانە:** هەویرێکی وەک هەویری نانکردن ئامادە دەکەی پاشان پیازی تەڕ (شین) ورد دەکەی لەگەڵ شەکر دەکرێتە ناو هەویرەکە،کە بەشێوەی نانی بچووک دروست دەکرێ و پاشان بەسەر سێڵیدا دەدەێ تا دەبرژێ و رۆنی لێدەدرێ و بە گەرمی دەخورێ.

* **لالەنگی:** ئاردی سفر لەگەڵ هێلکەو خومرە تێکەڵ دەکرێ دەیشلەقێنین تاکو یەکدەگرن ئینجا بە کەوچکی خڕ دەیخەینە ناو رۆنەکە بۆ ئەوەی سوور ببنەوە دوایی شیلەی بۆ دەکەین دەیخەینە ناو شیلەکە، ئینجا دەخورێ.

* **دۆغەوا:** هەندێ خواردنی میللی هەیە، کە تایبەتە بە ناوچەیەک، وەک خواردنی (دۆغەوا) کە خواردنێکی میللیی کوردییە،کە تایبەتە بە ناوچەی هەولێر زیاتر، بەمشێوەیە دروست دەکرێ، ئەو کەرستانەی کە بۆی بەکاردەهێنرێ: بروێش، هێلکە، ناسکی پیاز، بەم شێوەیە ئامادە دەکرێ، یەکەمجار رۆنەکە دەقرچێنرێ، ئینجا ماستەکە لوس دەکەین و تێیدەکەین و ئینجا کەرستەکان سووردەکەینەوەو دەخرێتە ناو کفتەکان، کە پێشتر بروێشەکە خوسێنراوە ئەوجا کفتەکان دەخەینە ناو ماستاوەکە کە بە بەردەوامی تێکی دەدەین بۆ ئەوەی هەڵنەگەڕێ.

* **تیچمە:** ئەمەش خواردنێکی میللیی کوردییە، زیاتر لە هەولێر دروست دەکرێ، بەم شێوەیە: ناوی کولەکە یاخود باینجان دەکولێنرێ، قیمەی سوورکراوە دەخرێتە ناویان، ئینجا دەخرێتە ناو شلەکە وا پێشتر بۆی ئامادەکراوە،کە شلەکەش هەر لەو کەرستانە دروست دەکرێ.

* **کفتەی عەجەمی:** خواردنێکی میللیی کوردییە، بەم شێوەیە ئامادە دەکرێ، کە تایبەتە بە هەولێریان، زیاتر یەکەمجار برنجەکە زەرد دەکرێ دوای زەرد کردنی قیمە سوور دەکرێتەوە، برنجەکە لەگەڵ قیمەکە لێک دەدرێ، ئینجا بەشێوەی کفتە دەخرێتە ناو شلەکە، شلەکە رەنگێکی سپی هەیە، کە بە لەتەنۆک(لەپە) ئامادەکراوە ئینجا تاکو دەکوڵێ.

# شایی و سەمای هەولێرییانی

پیرداود مەخموری

بەپێی لێتۆژینەوە ئارکۆلۆژیی و ئەتنۆگرافییەکان، سەلمێندراوە کە شایی و سەما کۆنترین شێوەی چالاکی هونەری مرۆڤی سەر رووی زەمینە، هەر لەسەرەتای پەیدابوون و گەشەسەندنی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی....

ئەگەر چاوێک بەرابردوو و مێژووی گەلانی سەر زەمیندا بخشێنین، تەنانەت ئەگەر میتۆلۆژیای ئەو میللەتانە بخوێنینەوە و لێیان بکۆڵینەوە، ئەو راستییەمان بۆ ئاشکرا دەبێ کە دەڵێ: (هونەری شایی و سەما لە شارستانییەتی هەموو میللەتاندا هەیە، قەوارەکەی هەر چەند بێت، شایی و سەما لە هەموو لایەن و بوارەکانی ژیانی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی وەک، لە دایکبوون، ژن هێنان، مردن و شەڕوشۆڕ و چەندین بواری دیکە). ١ شایی و سەما حالەتێکی داهێنان نییە، چونکە گواستنەوەیە لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی دواتر، تەنانەت لە میللەتێکەوە بۆ میللەتێکی دیکە، لە گەڵ پاراستنی سادەترین بەشە هونەرییەکانی بۆ ئەوەی لە ناوەرۆکی بابەتەکەمان دوور نەکەوینەوە، کە شایی و سەمای ناوچەی هەولێرە، کە رەنگە هەمان ئەو جۆرە شایی و سەمایەی لە ناوچە جیاجیاکانی هەولێر ئەنجام دەدرێن، هەمان جۆر لە ناوچەکانی دیکەی کوردستاندا هەبن، گۆرانی و شایی و سەمای فۆلکلۆری و میللی، هۆکارێکی سەرەکییە لە زیندوو مانەوەو کەمکردنەوەی ئەرک و ماندووبوونی کورد.

بە حوکمی ئەوەی کە هەولێر کۆنترین شارە لە سەر رووی زەمین و بە بەردەوام ژیانی تێدایە و پارێزگاری لە کیان و بەردەوامی خۆی کردووە، کەواتە لە هەموو ناوچەکانی دیکە پتر فۆلکلۆری شایی و سەمای هەیە. شایی و سەما لە هەولێر پەیوەندی بە ژیانی هەولێریانەوە هەیە و بە پێی ئاهەنگ و وەرزو بۆنە تایبەتییەکانی دەگۆڕێن، لە بەهارو کاتی دروێنە و کاروان و کاروانچیایەتی و.....هتد.

هەر جۆرە شایی و سەمایەک جل و بەرگی تایبەتی خۆی هەیە، بە شێوەیەکی گشتی شایی و سەما لە کوردەواری بە تایبەتی لە هەولێر بۆ چەند جۆرێک پۆلێن دەکرێت.

* **بە پێی شێوەی شاییەکە:** کە چەندین کەس لە ئافرەت و پیاو بەشداری تێدا دەکەن، کە شاییکاران دەستدەگرن و بە شێوەی بازنەیی، یان نیوە بازنە یا خود راستۆکی.
* **بەپێی جۆری شایی:** ئافرەت و پیاو بەشداردەبن.
* **شوێنی شایی:** هەر جۆرە شاییەک شوێنی دیاریکراوی خۆی هەیە.

بایەخدان بە لایەنی ئارکۆلۆژیای ژیانی کوردەواری و لێکۆڵینەوە لە هەندێ داب و نەریتی باپیران هەموو لایەک لێی بەرپرسن و هەر کەسێکیش مافی خۆیەتی چۆن مامەڵەی لەگەڵدا دەکات، بە مەرجێک کە رەسەنایەتی و مۆرکی کوردی لەدەست نەدات. بە قەناعەتی من ئەگەر ئەو بوارەی کەلتووری میللەتەکەمان فەرامۆش کرا، ئەوا دەستمان لە کونی هەمبانەی دێتە دەرێ، هیوا دارم کەس بە بەرەواژی لە مەسەلەکە نەگات، کەسیش پارووییەکی چەوری پێوە نەخوات و کەسیش بە سەلەفیمان لە قەڵەم نەدات. لێرەدا پێشنیازی ئەوە دەکەم کە ئەدەب و هونەری میللی کوردەواریمان، ئەگەر وەک بابەتێکی پرۆگرامی خوێندن لە هەموو قۆناغەکانی خوێندن هەبێت، ئەوا پێویستە و زەروورەتێکە کە لە پەیمانگای هونەرە جوانەکان لە پاڵ

هونەرەكانی مۆسیقا و شانۆ، هونەری شایی و سەمای كوردەواری وەک بابەتێكی مەنهەجی بخوێندرێت.

ئەگەر ئاورێك لە رابردووی نزیک بدەینەوە و بزانین لەم بارەوە چی كراوە، سەرێك لە یەكێتی مامۆستایانی كوردستان بدەین و بڕیارەكانی كۆنگرەی شەقلاوەی ساڵی ١٩٦١ بخوێنینەوە، كە لە یەكێک لە بڕگەكانی بڕیارەكان هاتووە (گرنگی بە ئەدەب و هونەری فۆلكلۆری بدرێ و لە هەموو قوتابخانەكان بخوێندرێ) ٢ كە باس لە هونەری شایی و سەمای كوردەواریمان دەكەین، دەبێ هەر لە شایی و سەمای منداڵانەوە دەست پێبكەین، كە منداڵی كۆرپەڵەی سەر لانک چۆن هەڵدەپەڕێندرێ و چ جۆرە شایی و سەمایەكی پێدەكرێ و ئەو گۆرانییانەش چین كە لە گەڵ جۆری شاییەكاندا دەگوترێن، پاشان ئەو جۆرە شایی و هەڵپەرین و سەمایانەی كە وەک یاری منداڵان و مێردمنداڵان لەسەر جۆخینان و گۆڕەپانەكانی لادێ دەگوتران و ئەنجام دەدران. هەندێ لەو یاریانەی منداڵان خۆیان لە قالبی شایی و سەمای كوردی دەنوێنن، بە تایبەتی:

* ئەو گەمە و یاریانەی كە تایبەتە بە كچان، دەستی یەكدی دەگرن و دەسوڕێنەوە و گۆرانی تایبەتی بۆ دەڵێن، (هەلەكسە، هەلەكسەما فاتەكە مەگری مەگری، هەی ریوی ریوی، چەندین جۆرە یاری دیكە).

* ئەو جۆرە شایی و سەمایەی كە لە كاتی بووک گواستنەوەدا دەكرێن، بەتایبەتی لە كاتی بووک هێنانە دەر لە ماڵی باوكی، كچان و كوڕانی شاییكەر بەتایبەتی لە داوەتكراوانی خزمی زاوا، جۆرە شایی و سەمایەكی تایبەت هەیە لە بووک بەرێكردن، كە جۆرە چەپڵە لێدان و سەماو گۆرانییەكی بۆ دەگوترێ ئەو جۆرەیان لە دەشتی هەولێر زۆر باوی هەیە و گۆرانی (بووكانە بووكانە بووكێ)ی بۆ دەڵێن، هەمان دەستوور لە ناوچەكانی سیدەكان و میرگەسۆرو ناوچەكانی دیكە پێی دەگوترێ (نارین)، ئەویش جۆرە شایی و سەمایەكی لە گەڵدا دەكرێ.

* ئەو جۆرە شایی و سەمایانەی كە لە كاتی گەرەڵاوژەی نەورۆز و بۆنە نەتەوەیی و ئایینییەكان ئەنجام دەدرێن.

**شایی لە داب و نەریتی كۆن**

شایی و سەما بەپێی میتۆلۆژیا جۆری زۆرە بەتایبەتی لە لادێكانی كوردستان هەروەک (شایی ئەجندان ئەوەی هەتاكو ئێستاش هیچی بۆ نەكراوە ئەوەیە پەیوەندی شایی و بەزم و سەمای كوردی بە پەندی كوردییەوە هەیە، رەنگە زۆر جار گوێ بیستی ئیدیۆمی (فشەی بنەسلاوەیی) بووبین، ئەوەیان لەوەوە هاتووە، كە لەم كۆرە گوندەی دەشتی هەولێر بە بۆنەو بێ بۆنەی تایبەت گەنجانی ئەو گوندە هەموو دانی ئێوارەیەک شایی و سەمایان دادەبەستا، بەڵام بێ ئەوەی بە شایی بچێ، ئێستاشی لە گەڵدابێ لە گەڕی شاییدا ئەگەر شاییەكە تێكچوو دەڵێن (بووە فشەی بنەسراوەیی) هەروەها پەندی كوردی ئەوەشی فەرامۆش نەكردووە كە دەڵێ: (شین و شایی دەستەوایی)، خۆ ئەگەر كەسێک نەویستبا كارێک ئەنجام بدات، پاشان رازی دەبوو ئەوجا خۆی وازی لێنەدەهێنا، دەیانگوت: (بە حەفتان نەدەچووە شاییێ بە دوازدان نایەتە دەرێ).

* دیارە بەزۆری شاییكردن لە بۆنە خۆشەكاندا دەبێت، بۆیە كورد دەڵێ: (كەر تۆپیە و شایی سەیە)، هەروەها (پشیلە لە ماڵێ نییە، مشكان ترنی ترنیانە) ئەم دوو وشەی (ترنی ترنی) لە جیاتی شایی و سەما بەكارهاتووە.

* هەندێ جار شایی و سەما بۆ تەماعكارو خۆویستی بەكاردێ، كورد دەڵێ: (سەرچۆپی بدە سەی لۆلای تەشتی نانی رایدەكێشی).

* هەندێ جاریش بۆ نارێكی كاركردن بەكارهاتووە، كورد دەڵێ: (كورە نەیدەزانی شایی بكا دەیگوت عارد خوارە).

* لە كاتی شاییكردن و لە گەرێتی شاییدا چەند كەسێک یان تاكە كەسێک هاوار دەكا و دەڵێ: (هەیدۆ هەیدۆ)، ئەو كورەی لە شایی رەشبەڵەک كچی لە دەستی نەبوایە، بەمجۆرە بانگی دەكرد، لێرەدا (دۆ) بەواتای ئافرەت دێ.

هەروەها كورد دەڵێ: (شایی لۆ دوانە گر لە هەموانە)، ئەم وشەی (گرە) بە واتای ئاگر دێت.

**شایی و حەیران**

هونەری حەیران تایبەتمەندییەتی خۆی هەیە لە كاتی

شایی گێڕاندا، هەموو حەیرانبێژێک توانای ئەوەی نەبووە لە گەڕی شاییدا حەیران بچڕێ، بەزۆری حەیرانبێژ لە سەرچۆپی یاخود لە دوای سەرچۆپییکێش دەهات لە کاتی حەیران گوتندا نزمی شایی هێور دەکرایەوە تاکو حەیرانبێژ لە حەیرانەکەی تەواو دەبوو، زۆربەی ئەو حەیرانانەش سەربردەبوون یان بەسەرو پەرچەمێ نازدار حەیرانیی هەڵدەدا.

زۆربەمان سەربردەی ئەو حەیرانە دەزانین، کە کاتی خۆی ئافرەتێک بەبێ رەزامەندی خۆی دەدەنە کابرایەک، بۆیە لە کاتی جلەو کێشانی ئەو ولاغەی کە بووک لەسەر پشتییەتی، کابرا هاناو هاوار دەباتە بەر (سەید حەسەنی) رەشوانی، دەبا لێرەدا گوێ بۆ حەیرانبێژ شل بکەین و بزانین چۆن وەسفی دڵبەرەکەی دەکات و دەڵێ:

(حەیران لە گردی گۆمێ، بەژنی برندە بەیداخی رۆمێ، ئەمن دەمگۆتە نازدار حەیرانەکەی خۆم، ئەوەندەی زێڕ بەخۆوە مەکە، بەژنۆکەت گەلە ناسکە نەوەک لەگەڕێی شایێ بەژنت بچۆمێ).

جاران لەبەر ئەوەی زورنابێژ زۆر نەبوونەو بۆ هەموو شایی و داوەتێک نەدەچوون، بۆیە بەتایبەتی لە هەندێ گوندی بچووک شاییکردن بە گۆرانی و بەستەی تایبەت دەگەڕا. زۆربەی حەیرانبێژەکان بەستەی شایی و هەڵپەڕکێیان دەگوت، لەپێش هەموو ئەو حەیرانبێژانە (خدر حەیران) ی ئازیکەندی بوو، ئەو حەیرانبێژە ئەگەرچی خەڵکی ئازیکەند نییە، بەڵام چونکە زۆربەی ژیانی لەوێ بەسەر بردووە بۆیە ئەو نازناوەی بەسەردابڕاوە، ئەو حەیرانبێژە رۆژێک دەچێتە گوندی (خدر جیجە) کە شایی و بووک گواستنەوە دەبێ، ئەویش دەستدەکات بە مەقام گوتن، ئەگەرچی لێرەدا وشەی مەقام بەکارهاتووە کە بە واتای بەستەو گۆرانی دێت، نەوەک مەقامی رەسەنی کوردی، خدر حەیران دەڵێ:

| | |
|---|---|
| **هێی برام سەرێ من دێشی** | **دەردێ لەدرم وەی وەیە** |
| **سبەینەکێ سەحەری** | **فکرم چەغەمیرەیە** |
| **خۆم لە چیای شۆڕ بوومەوە** | **گەیە خدرجیجەیە** |
| **شاییەک ئەوا دەگەڕێ** | **هەر لەمەوابی گەمەیە** |
| **فیقە فیقی شمشاران** | **تورتورەی دێوەرەیە** |
| **برادەر دەهاتنە پێشم** | **ئەوە خدر شاییەرە** |
| **کاکە فەرموو دابەزە** | **دەمەکێ لادە ئێرە** |
| **چەند رۆژە شایی دەکەین** | **چەند یەکەین ناپێ تێرە** |
| **ئەنگۆ بەبێ من هاتن** | **ئەمن و کردیە مەغدورە** |
| **هێ برا سەرێ من دێشێ** | **دەدرێ لەدرم بەژانە** |
| **تەسبێحەکەم وەردەگرت** | **دەستم کرد بە بەندانە** |
| **ئەمن وا بەندی دەرێم** | **شایەر وا راوەستانە** |
| **شایەر خدر مەجیدە** | **ئەویان لە کن زۆرزانە** |
| **ئەو شاییە لۆێ خۆشە** | **خزمی سێ چار گوندانە** |
| **دیە کارو خدرجە** | **ئازیکەند لە گەردانە** |
| **شاییەکم دادەبەستا** | **سۆر دەکرا لە کیژانە** |
| **پیرەژن هاتنە دەرێ** | **یەک یەکە لەمارانە** |
| **خۆشکینە با بگەینێ** | **لەو داوەت و دیلانە** |
| **ئەو شایەرە غەرییە** | **لە کێ هات بەو نیورانە** |

### سەما

سەما کردن لە شایی کوردی بە بەشێکی سەرەکی و گرنگ دەژمێردرێت، سەما جیاوازی لە گەڵ شاییکردن هەیە، شایی جۆرە هەژان و هەڵپەڕین و خۆ گونجاندنێکە بە کۆمەڵ ئەنجام دەدرێت، هەرچی سەمایە کارێکی تاکە کەسییە، ئەگەر چەند کەسێکیش بەشداری لێبکەن، ئەوا هەر کەسەو بە تەنیا سەما دەکات و بەزمەکە پتر جۆش دەدات و ئاهەنگەکە پتر دەرازێنێتەوە، ئەمە لە لایەک، لە لایەکی دیکەشەوە شایی بۆنەو کاتی تایبەتی خۆی هەیە، لە هەموو ئاهەنگ و گەڕە لاوژەیەک ئەنجام نادرێت، هەرچی سەمایە جگە لەوەی کە لەگەڵ شایی کردنیشدا سەما دەکرێت، بەڵام لە بۆنەی بچووک و گەورەی هەمە جۆر ئەنجام دەدرێت. هەڵپەڕاندن و سەماپێکردنی منداڵ، کە تەمەنی لە شەشی مانگدا بێ، لە گەڵ سەماکردنەکەشی دایک جۆرە گۆرانییەکی بۆ دەڵێ و منداڵەکەشی لە گەڵ گۆرانییەکە بەجۆرە سەمایەک رادێ، پاشان ئەو جۆرە سەمایە دێت، کە منداڵی تەمەن (١٠ - ١٢) ساڵ ئەنجامیان دەدات، نەخاسمە لە کاتی یاری و گەڕەلاوژەی منداڵان.

### دەستگرتن و سەما کردن

سەرەتای دەستپێکردنی هەموو جۆرە شایی و سەمایەک

لەسەرەخۆ و هێدی دەبێت، تا شایی و شاییکەران گەرم دەبن، ئەو کاتەی هەڵپەڕکێ دەگاتە ئەوپەڕی گڕگرتن و خۆشی، لەو کاتەدا یەکێک لە شاییکەران لە ریزی شایی دەردەچێت و خۆی دەخزێنێتە ناوەراستی شاییەکە، دەستدەکات بە ئەنجامدانی جۆرە سەمایەک، کە جیاوازی هەیە لە گەڵ شاییەکە، هەموو جۆرەکانی شایی و سەمای کوردەواری بە هێڵێکی راست یاخود بە بازنەیی دەست دەگیرێت، ئەگەرچی جۆرە وێکچوونێک هەیە لە نێوان شایی و سەمای ناوچەکانی دیکەی کوردستان، وەلێ هەندێ جار جیاوازییەک بەدی دەکرێ لە نێوان ناوچەکان، تەنانەت گەلێ جار لە یەک جۆر شایی جیاوازی لە نێوان گوندێک و گوندێکی دیکەدا هەیە. رەنگە جیاوازییەکەشی ئەوەندە نەبێ، بەڵام لە ناوچەکانی هەولێر ئەو جیاوازییە بەدی دەکرێ نەخاسمە لە دەستگرتن و سوڕانەوە و خۆ هەژاندنی شاییکەران و پێ کوتان و دەست قوتانی جەماوەری دەوری شایی.

### جۆرەکانی شایی و سەما

شایی و سەمای کوردەواری بەزۆری دەکرێتە دوو بەشی سەرەکییەوە، کە ئەمانەن:

* شایی و سەمای ئاسان و لە سەرەخۆ، ئەم جۆرە شاییە بەزۆری ئافرەتان بەشداری لێ دەکەن، چونکە ئافرەت وەک پیاوان توانای هەڵبەزین و دابەزینی بە حێل و توندی پێناکرێ، جاری واش هەیە رەشبەڵەکیش دەکرێت، کە کوڕو کچ پێکەوە دەست دەگرن.

* شایی و هەڵپەڕکێی پیاوان، ئەو جۆرە هەڵپەڕکێیە بە زۆری کوڕانی گەنج ئەنجامی دەدەن، ئەو جۆرە شاییانە لەبەر ئەوەی بەزۆری و زۆر بە خێرایی و سووک و جوولەی شان و هەژانی سینگ و ناوقەدو پێ کوتان، بەگەرمی دەبێت، بۆیە ئافرەت زۆر بەشداری ناکەن، بەتایبەتی لە شایی (سووسکەیی).

### جۆرەکانی دەستگرتن

لە شایی و هەڵپەرکێی بەچەندین جۆر دەست دەگیرێت:

* گرتن و تێکپەڕاندنی پەنجەی بچووک (قلینچک)ی سەماکەر لە گەڵ پەنجەی بچووکی هەردوو شاییکەری (دەستەراست و دەستە چەپی)، دەست و باسکیش لە هەنیشکەوە بۆ پێشەوە دەبێت.

* جۆرێکی دیکەی دەستگرتنی شاییکەران پەنجەکان هەموویان تێکدەپڕن و قۆڵەکانیش تێکهەڵدەکێشرێت، ناو لەپیشی لێکدەدرێت و باسک و قۆڵ بۆ خوارەوە شۆڕدەکرێنەوە، هەردوو لاشانی شاییکەران لێکدەخشێ، دەستی چەپی سەرچۆپیکێش دەکەوێتە پێش دەستی راستی شاییکەری دوای خۆی، بەم شێوەیە تاکو دەگاتە گاوانی.

* دەست و باسک بۆ هەردوو لا درێژ دەکرێت، شاییکەران لەسەر شان یەکدی دەگرن، ئافرەت زۆر لەم جۆرە شاییەدا بەشداری ناکەن.

* گەلێ جار، لە هەندێ جۆرە شایی دەست ناگیرێت، شاییکەران بە شێوەیەکی بازنەیی دەسوڕێنەوە، بێ دەستگرتن، ئەم جۆرە شاییە دەکەوێتە قاڵبی سەما کردن هەرچەندە تاکەکەس ئەنجامی نادات، بەڵکو بە کۆمەڵە، ئەو شایی گۆرانی (ئایشۆکێ وەیشی وەیشی) ی بۆ دەگوترێت.

### جۆرەکانی شایی: (چۆپی)

رەنگە بە سەهوو نەچووبم ئەگەر بڵێم: ئەم جۆرە شاییە موڵکی میللەتی کوردە و مافی هیچ کەسێکی دیکە یاخود نەتەوەیەکی دی پێوە نییە، چونکە چۆپی لە وشەی (چەپەوە) هاتووە، کە شاییکەران لە کاتی رۆیشتن و شایی کردندا بۆ لای چەپ دەچن و دەسوورێنەوە، بە حوکمی تێکەڵاوی کورد لە گەڵ میللەتانی دراوسێی کورد، دیارە ئەم جۆرە شایی و سەمایە پەڕیوەتە لای ئەوانیش، لە زۆربەی شارو گوندەکانی عەرەبنشین شایی و سەمای چۆپی دەکرێت و هەمان ناویشی هەڵگرتووە بۆ ئەوەی پتر رایەکەمان بە بەڵگەی بەرجەستەکراو بسەلمێنین، راوبۆچوونی دوو زانای عارەب وەردەگرین.

* زانای خوالێخۆشبوو دکتۆر (مستەفا جەواد) لەو باوەڕەدایە، کە وشەی چۆپی بۆ خێڵێ (چۆپی) شۆپی دەگەڕێتەوە.

* زاناو زمانزان (جەلال حەنەفی) لە گەڵ رایەکەی (د. مستەفا جەواد) دا کۆکەو دەڵێ: وشەیەکی کوردییە و

شایی و سەمایێکی کوردەکانە.

لەو جۆرە شایی و سەمایەدا هەردوو توخمی نێرومێ بەشداری تێدا دەکەن و پێی دەگوترێت (ڕەشبەڵەک)، سەرچۆپی کێش دەستەسرێک یان هەر پارچە قوماشێکی جوان بە دەستەوە دەگرێت، هەڵی دەشەقێنێت و شاییەکە پتر جۆشدەدا، یەکێک لە شاییکەران لە گەڕی شاییکردن دێتە دەرەوە و بەتەنیا جۆرە سەمایەک ئەنجام دەدات، ئەو جۆرە سەماکردنە بەزۆری لە نزمی شاییەکەدا دەبێت، لەم جۆرە شاییەدا دەستی چەپی شاییکەری یەکەم دەکەوێتە پێشی دەستی ڕاستی شاییکەری دوای خۆی، بەم شێوەیە تا کۆتایی.

*** فەقێیانە:**

ڕەنگە ئەو جۆرە شاییە جۆرە تایبەتمەندییەکی تێدا هەبێت، چونکە جاران لە حوجرەی مزگەوتەکان تەنیا فەقێکان ئەنجامیان دەدا، زۆر باویش نەبووە، تەنیا لە بۆنە ئایینی و دەرچوونی دەستەی مەلایان ئەنجامدراون، جۆرە وێکچوونێک هەیە لە نێوان شایی فەقێیانەو شایی (سووسکەیی)، جۆرە شاییەکی خێرایە، دەست و باسک تێکدەگیرێت و شۆڕدەکرێتەوە، لە کاتی هاتنەپێش دەستەکان بۆ پێشەوە بەرزدەکرێنەوە، پێی چەپ بڵند دەکرێت و تۆزێک بۆ لای ڕاست دەچەمێندرێتەوە پێی ڕاست بڵند دەبێت، لە گەڵ شۆڕ کردنەوە و چەماندنەوەی نیوەی سەرەوەی قەدی شاییکەران و ڕاست دەبنەوە.

*** بابلەکان:**

ئەم جۆرە شاییە بەزۆری لە ناوچەکانی شێروان مازن و مێرگەسۆر ئەنجامدەدرێت، شاییکەران زۆری حەزی لێناکەن، لەبەر ئەوەی ماندووبوونێکی زۆری تێدایە، هەموو جوولە و کردارەکانیش خێران، پەنجەی بچووک دەگیرێت، لە هەنیشکەوە دەست و باسک بۆ پێشەوەیە، پێی چەپ هەنگاوێک بۆ پێشەوەو ناگەڕێتەوە، لە دواییدا پێی چەپ هەنگاو دەنێت بێ گەڕانەوە، ئەم کردارە سێ جار دووبارە دەبێتەوە، پاشان شاییکاران، هەنگاوێک بۆ لای ڕاست دەڕۆن و دەست شۆڕ دەکەنەوە، کچ و کوڕ بەشدارن، شاییکەران، پەنجەکانیان تێکدەپرن لە کاتی شاییکردندا، چوونە ناو ئەڵقەی شاییکاران هاتنە دەر و چوونە ناو شایی دەبێ یاسای تایبەتی هەبێ، پیاو کە دەچێتە ناوشایی لە لای پێشەوەڕا دەچێت، ئافرەت بەپێچەوانەوە لەدواوەڕا دەچێتە شاییکردن، لە گەڵ دەست بەشاییکردن پێش هەموو شتێک چوار جار شان هەڵدەتەکێ، ئینجا پێی چەپ هەنگاوێک بۆ پێشەوە و پاشان دەگەڕێتەوە جێگای خۆی، ئینجا پێی ڕاست دەچێتە پێشی و دەگەڕێتەوە، دوو جار پێی چەپ لەزەوی دەکوترێ، ئەم کردارە چەند جار دووبارە دەبێتەوە.

*** گوڵشێنی:**

ئەم جۆرە شاییە گەنجانەیە، کچ و کوڕ بەشداری تێدا دەکەن (ڕەشبەڵەک)، پەنجەی بچووک دەگیرێت، پێی چەپ هەنگاوێک بۆ پێشەوەو گەڕانەوەی بۆ شوێنی خۆی، پێی ڕاست هەنگاوێک بۆ پێشەوەو گەڕاندنەوەی، دوو هەنگاو بۆ لای چەپ ڕۆیشتن، ئەم کردارە دووبارە دەبێتەوە، ئەم گۆرانییەشی لە گەڵدا دەگوترێت.

**گــوڵ شــێنی شــێنی شــێنی**
**گــوڵ شــێن یا من مــاڵا من**
**گــوڵ شــێنی شــێنی شــێنی**
**ســەرێ مــەمکا عــەمــرا من**

گۆرانیبێژێک بە تەنیا گۆرانی دەڵێ و شاییکەرانیش وەک کۆرس بۆی دەگێڕنەوە، گۆرانیەکەشی جۆرە حیوارێکە.

**بابلیەکان کوڕێ فاتێ    تو چیتکی ل بن کراتێ**
**جلیتکم بۆ میراتێ**

*** سنجانێ:**

وشەی سنجانێ لە ناوی گوندێکی کوردستانی تورکیا هاتووە، ڕەنگە شاییەکەش هەر هی ئەو دەڤەرە بێ، بەڵام پەڕیوەتەوە ناوچەکانی هەولێر، جۆرە شاییەکی یەکجار خێرایە، پەنجەی بچووک دەگیرێت، هەنگاوێک بەپێی چەپ بۆ پێشەوە، هەنگاوێک بە پێی ڕاست بۆ پێشەوە، پاشان سێ هەنگاو بە پێی چەپ و سێشی بە پێی ڕاست بۆ پێشەوەو دەست شۆڕ دەکرێتەوە.

*** ملانێ:**

ئەم جۆرە شاییە تایبەتە بە ئافرەتانەوە، لەسەرەخۆو

سانایە، پەنجەکان تێکدەپەڕێندرێت، دەست و باسک بۆ خوارەوە شۆڕ دەکرێتەوە، تەنها شان هەڵدەتەکێ، لە گەڵ هەر سێ جار شان هەڵتەکاندندا جارێک سینگ دەهەژێت، دوای سینگ هەژاندن نیو هەنگاو پێی چەپ بۆ لای چەپ و لە گەڵیدا ئەژنۆ سووکە چەماندنەوەیەک دەکات.

*** سێ پێیی (سێ گاف)!**

ئەم شاییە لە هەموو دەڤەرەکانی هەولێر هەیە لە دەشت و ناوچە شاخاوییەکان، سێ هەنگاو بۆ پێشەوە دەڕۆن بە پێی چەپ، پاشان هەنگاوێک بۆ دواوە بە پێی راست، هەنگاوێک بە پێی چەپ بۆ پێشەوەو گەڕانەوە بۆ دواوە، لە گەڵ جوولەیەکی لەسەرەخۆ بۆ لای راست، ئەم گۆرانییەشی لەگەڵدا دەگوترێت.

**باعەدرێ خۆشی باعەدرێ**
**باعەدرێ گوندێ مەیە باعەدرێ گوندێ فەللەیە**

بەڵام لە هەولێر و دەشتەکانی بەزۆری گۆرانی نازدار و نازداری بۆ دەڵێن:

**نازدارو نازدار نازدارێ بابی**
**خۆ من دەمزانی تۆ بۆ من نابی**
**رەشە رەیحانە خۆمی پێ رەشکەم**
**لە دوای بالاکەت دڵ بە کێ خۆشکەم**

لە شایی سێ پێیی ئەوەی کە لە دەشتی هەولێر جیاوازی هەیە لە گەڵ ناوچەکانی دیکە، ئەوەیە خەڵکی دەشت بۆ لای راست دەڕۆن، بەڵام ئەوانی دیکە بۆ لای چەپ دەڕۆن لە شاییکردندا.

*** باگیێ:**

ئەو جۆرە پتر تایبەتمەندی (دیان) و فەلەکانی عەنکاوە و شەقڵاوەی پێوە دیارە، هەر لەوانیش هەموو هەولێرییەکان ئەم شاییە فێر بوونە، پەنجەی بچووک دەگیرێت، دەستەکان بۆ پێشەوە دەبن، نیو هەنگاو بەپێی چەپ بۆ پێشەوە دەڕوات و دەگەڕێتەوە، نیو هەنگاو بە پێی راست بۆ پێشەوە و گەڕانەوە بۆ شوێنی خۆی، شاییکەران پێکرا بۆ لای راست وەردەگەڕێن و دوو هەنگاو بەپێی چەپ بۆ پێشەوە دەڕۆن، پاشان بە نیوەی خۆ چەماندنێکەوە بۆ پێشەوە وەردەگەڕێنەوە.

**باگیێ هۆی باگیێ وەرە لۆ لۆی باگیێ**
**باگیێ هۆی باگیێ رەوشێ لەوەندییێ**

*** مەم عەباسی:**

شایی و سەمای مەم عەباسی بەناوی (عەباسی) ناوێکەوە کراوە، گۆرانیەکەشی بەهەمان ناو دەگوترێت، پەنجەی بچووک دەگیرێت، دەست بۆ پێشەوە دەبێت و شۆڕدەکرێتەوە، تەنیا پێ کوتانی، تێدایە جارێک بە پێی راست و جارێک بە پێی چەپ لە گەڵ شان و سینگ هەژانێک و هەنگاوێک بۆ لای چەپ دەڕۆن، رەنگە ئەو شایی و گۆرانییە لە هەموو ناوچەکانی دیکەش هەبێت، بەڵام لە هەولێر بە تایبەتی لە مێرگەسۆرو دەوروبەری زۆرە.

ئەم گۆرانیەشی بۆ دەڵێن:

**هۆی هۆی مەمۆ عەباسی خۆش عەباسی**
**هۆی هۆی مەمۆ کورتەکی ل سەر کراسی**
**ژارا مەمۆ دایکا کورێ نە نیاسی**

*** شێخانی:**

ئەگەرچی ئەو جۆرە شاییە تایبەتمەندی دەڤەرەکانی ئاکرێ و شێخانی پێوەیە، بەڵام لە هەولێریش زۆری شایی پێدەکەن، پەنجەی بچووک دەگیرێت، دەست بۆ پێشەوە دەبێت، هەنگاوێک بە پێی راست بۆ پێشەوە و گەڕانەوە، پاشان وەرگەڕان بۆ لای راست و دوو هەنگاوی لەسەر یەک بۆ پێشەوە، ئەم گۆرانییەشی بۆ دەگوترێ.

**هە تەمە تەمە تەمە سوسنێ مارومێ تەمە**
**حەمایلۆکا پڕ مۆری بازنێ دەستێ تەمە**

**ئەو سەرچاوانەی کە سوودیان لێ وەرگیراوە**

* گۆڤاری (التراث الشعبي) ژمارە ١١ ساڵی.١٩٧٦
* گۆڤاری (کۆنگرەی مامۆستایانی کوردستان) ژمارە (٩١) شەقلاوە.
* هەندێ چاوپێکەوتنی مەیدانی.
* ئەم بابەتە لە گۆڤاری هەولێر / ژمارە ١٥ ی هاوینی ساڵی ٢٠٠٢ وەرگیراوە.



# جلوبەرگی ژنانی دەشتی هەولێر

ئامادەکردنی: عەزیز مەلای رەش

(دەشتی هەولێر) لە ناوچەی قەراج و کەندیناوە و شەمامک و سەنیە و مرکییە و پشتڕێ و بەرڕێ و بەرانەتی دەگرێتەوە.

شمەکی ئافرەتانی ئەو ناوچانە یەک تەرزە و جیاوازییەکی ئەوتۆی نییە باس بکرێت. ئەویش بەم چەشنەیە.

١- کراس: یەکجار گەورە بوو (١٤) تا (١٦) گەز قوماشی دەویست، "گەز ئامێرێکی پێوانەییە و لە مەتر گچکەترە".

کراسەکە نزیکەی مەتر و نیوێک لە بالآی ئافرەتەکە درێژتر بوو. لەلای درێژییەوە، لە قەدی دوو (تیرێژ) ی سێگۆشەیی هەڵدەبڕا و پانییەکەی لەلای سینگی دەکرایەوە و لەگەڵ دامێنی دەیەخرا، لای سنگ تەسک دەبووەوە و دامێنیشی زۆر بەرین.

ئافرەت بۆ ئەوەی پێی هەڵبگیرێت پشتێنێکی باریک (سەرکەلە) یان پارچە قوماشێکی باریکی لە پشت دەبەست و کراسەکەی ئەوەندە لەژێر پشتێنەکەی هەڵدەکێشا تا دامێنەکە لەگەڵ پێی رێکدەکەوت، دوو قەدە کراسەکەش دەبێ لە ئەژنۆ رەت بێت کە پێی دەگوترا: (باخەڵ): (ئەم ئافرەتە باخەڵ و دامێنی یەکە) واتە باخەڵ شۆڕە، کە ئەو سەردەم زۆر پەسند بوو. کلکە ئەنگوچک زۆر درێژ بوو و سەرەکانیان بەیەکەوە گرێ دەدرا و لە پشتەوە بەسەر چارۆگەکەی مل شۆڕ دەبووەوە.

ئەمەی باسمان کرد کراسی ئافرەتانی گەورە بوو. بۆ کیژی پارچەڵە بێ باخەڵ بوو، هەڵبڕینی کراسی دوودەم یەک تیرێژی بوو، کە پێی دەگوترا (شەیتان بڕ).

لە شەستەکان بەسەرەوە ئافرەتە گەنجەکانیش کراسی بە باخەڵیان فرێدا، ئەمڕۆ تاک و لۆک لای ئەو ژنە بەتەمەنانەی کە خۆیان بە بنەماڵە لە قەڵەم دەدەن ماوە، لەبەر ئەوەی کراسەکە قوماشی زۆری دەویست، هەندێ ئافرەتیش لەبەر نەبوونی بۆی نەدەلوا چوارده، پازده گەز قوماش بکڕێت: پشت و قۆڵی کراسەکە کە دەکەونە ژێر کورتەکەوە قوماشێکی کۆنی تێدەبردەوە.

ئەو قوماشەی کە دەکرایە کراس بە زۆری قوماشی (جورجێت، کوودەری، چیت)ی تەنک بوون، ئەگەر ئەستوور بوایە هەڵگرتنی قورس دەبوو.

٢- بن کراس: کە لە بریتی فانیلەی ئەمڕۆ، قوماشێکی تەنک و سپی دەکرایە بن کراس، هەندێ جار ڕەنگاوڕەنگیش دەکرا.

٣- کەوێ: ئەوەندە شۆڕ بوو داوێنی دەگەیشتە پاشپانی ئەمەیان دوو جۆر بوو:

أ. کەوای سێ پارچەیی: قوماشەکە دەکرایە سێ پارچە، هەر پارچەیەک دەکرایە ئاتەگێک.

ب. کەوای نۆ پارچەیی: (٦) پارچە دەکرایە هەردوو ئاتەگی پێشەوە و (٣) سێش ئاتەگی دواوە.

٤- بن کەوێ: (کورتەک) لەبەر ئەوە لەژێر کەوا لەبەر دەکرا بە زۆری پێی دەگوترا، بنکەوێ. قوماشی بەر و پشتی کورتەک یەک بابەت بووە و لۆکەی تێدەکرا و بە تەقەڵی شاش دەدوورا، هەردوو ئاتەگی پێشەوە، کە لە لەبەرکردندا بە دەرەوە بوون، لەگەڵ سەر قۆڵەکانی قوماشی جوان و ڕەنگاوڕەنگ و نایابی لێدەدرا و لێوارەکەشی بە قەیتانی سیم و ئارموش دەنەخشێندرا.

٥- سەرکەوێ: لە کورتەک درێژترە و لە کەوا کورت تربوو و دامێنی دەنەخشێندرا، ئەمەش بە زۆری ژنە ناودارەکان لەسەر کەوێ لە بەریان دەکرد.

٦- دەسرۆک: بریتی بوو لە هیزار (هیزار قوماشێکی تایبەت بۆ دەسترۆک دروست کرابوو، چوار قەد لەکلاوی سەر دەپێچرا).

هێندەجار هەوری سرکەییش دەکرایە دەسرۆک، کلاوەکە لێوار ڕەق و توند و سەر پان بوون. هەندێ جار سەری کلاوەکە دراوی زێڕ، یان زیوی تێدەیەخرا، ئەگەرنا پارچە خامەکی بەسەردا هەڵدەکێشرا.

کلکە ئەنگوچکی هیزار بە ئارمووش و سیم چەشنی کەژی بە عەردی دروست دەکرا و پێی دەگوترا (لفکە) سەرەکانیشی گوڵنگیان پێوە شۆڕ دەکراوە، گولینگی هەوری پێی دەگوترا (سوارە و پیادە) هێندە جار بۆ جوانی لە بریتی سوارە و پیادە (قۆیتاس)ی پێوە دەکرا، قۆیتاس خشڵێکی زیو بوو.

٧- چارۆگ: لەسەر شمەکان لەبەردەکرا و جلوبەرگەکانی دیکەی لە پشتەوە دادەپۆشت.

٨- دەرپێ: لەبەر باری ئەدەبی (ئاوەڵکراس)ی لەجیاتی بەکاردەهات، ئەمەش سێ جۆر بوو:

أ. ئاوەڵکراسەکە سەرتاپا لە یەک قوماشی ڕەنگاوڕەنگ دروست دەکرا.

ب. دەلینگەکانی تا ئەژنۆ قوماشێکی جوان و ڕەنگاوڕەنگ، ئەوی دی قوماشێکی سادە و ئاسایی بوو.

ج. سەرتاپا چاوپان بوو، یان قوماشێکی سادەی لە خم دراو.

هەندێ ئافرەت بە تایبەتی ڕەوەندەکان، مەترێک زیاتر لە بەژنی خۆیان دروست دەکرد، دەلینگەکانیان هەڵدەوێزنی و خڕدەکردەوە، تا لە سەرەوەی گوزینگ وەک خرخاڵ ڕادەوەستا.

٩- چەفیە و چەفتە: چەفیە پارچە قوماشێکی سێگۆشەیی بوو ئافرەت لەسەری دەبەستا.

چەفتە لەم دواییە پەیدا بووە، درێژ و گولینگدارە و لە بریتی چەفیە لەسەر دەکرێت.

١٠- سوخمە و هێلەک: هەردووک شێوەیان یەک بوو. لەسەر کراس لەبەر دەکرا. تەنیا سوخمە پێشەوەی قوماشێکی باش و جوان بوو ئەوەی دیکەی ئایر، کەچی هێلەک یەک قوماش بوو.

*** ئەم بابەتە لە گۆڤاری (ئاسۆی فۆلکلۆر) ژمارە (١) ی ساڵی ٢٠٠٠ وەرگیراوە.**



# تەزبێح

ئەحمەد حەیران

تەزبێح ئامرازێکی دەستگیری کۆمەڵایەتی میللی و بەرچاوە، بازاڕی هەمیشە لە برەودایە، دەم و ساتی نییە، تەنیا درەنگی شەوان پشوو دەدات، ئەگینا ڕۆژ تا ئێوارە لە دەستی گەنج و پیران لە گەڕاندایە، هاوڕێیەکی بێگیان و زیانە تا نەیگێڕی دەنگی نایە.

بۆ ئاشنابوون بە جیهانی ئەو ئامرازە کۆمەڵایەتییە بەربڵاوە، لە جێگەی تەزبێح فرۆشان تەنیشت باخی شار چاومان بەیەک دوو تەزبێح فرۆش کەوت بەم شێوەیە بۆمان هاتنە ئاخاوتن..

*** سەید خالید ئەحمەد، کاک سەید خەڵکی کوێی؟**

- خەڵکی هەولێرم باب و باپیرم لە هەولێر بووە، گەڕەکی عارەبان بەناوی باپیری من داندرایە، لە پشت کەرکووکێ گوندەکانی کەتاحیەو ئەبو سەبیح و حەسار و حەویجە، سەید و شێخ بوونە لەوێ هاتوونەتە هەولێر، گەڕەکی عارەبان نەبووە، لەوێ ساکن بوونە، ئاناوا بوونە، ئیتر بوویتە گەڕەکی عارەبان.

*** لە مێژە کاری تەزبێح فرۆشی**

دەكەی؟

- لە ساڵی (١٩٧٤)ەوە، پێش هەینێ، تەزبێح فرۆش نەبووم لە مەرەقی تەزبێح بوومە تەزبێح فرۆش، زەوق و ئارەزوویەكە، كو پیاو هەیە مەرەقی كەوە یا كۆترە یا شتی ئەسەرییە یا سەیارە و جلكی جوانە، تەزبێحیش وایە، ئێمە ئیشەكەمان بەوانە هەیە كە مەرەقن، تەزبێحی جوان جوانم دەكڕی وەختی كە عادز دەبووم دەمفرۆشتەوە، فێرە ئەو كڕین و فرۆشتنە بووم.

*** ناوی تەزبیح لەچی هاتووە؟**

- تەزبێح توركییە، بە كوردی هەر تەزبێحە، عارەب پێی دەڵێن (سبحە)، ئێرانیش هەر دەڵێن تەسبیح.

*** بنەچەی لە كێ هاتووە؟**

- هەر نەوعەكی لە جێیەكی هەیە، كارەب لە ئەڵمانیاو پۆڵۆنیا، ئەو كارەبایە دارە، ماددەیەكی لیچقاو دەردەدا دێتە خوارێ دەكەوێتە ناو دەریا، كلس دەكا دەبێتە ئەو كارەبایە لە هەموویان گرانترە.

*** تەزبێح زیاتر بۆچی بەكاردێ؟**

- لە كنە مە لۆوەیە لە دەستی بگێرن، هەیە زەوقی پێدێ، شێخ و مەلاكان تەزبێحاتی پێدەكەن بۆ پاڕانەوە لە خودای گەورە و سەلاوات لەسەر رۆحی پێغەمبەر (د.خ)، هەیە ئەو فاتیحا و دۆعایەی دەیخێنێ، پێی حیساب دەكات. هەیە بۆ مەشغول بوون و خەم بەرێكردن.

*** ئەو پیاوە ناودارانەی تەزبێحیان زۆر دەكڕی و بەكاریان دەهێنا كێ بوون؟**

- زۆربوون، كابرایەك مەتعەمی هەبوو ناوی حاجی مەجید بوو، ئەوە زۆر مەرەقی بوو، حاجی فازڵ بەقاڵ ئەمری خودای كردییە، براكانی حەیدەر موسا ئاغای وەكی رەشۆو زۆرانی دیكە، پارەیان بە تەزبێحی باش دەدا، نەك ئەوانەی ئێستا لە بازاڕ هەیە.

*** جۆرەكانی تەزبێح چەندە؟**

- بیست تا سی جۆری هەیە،، سەندەلووس، سەندەلووس فایەر، یوسرە، نێرجیل، كرمان، كارەب، عاج، شاخ، پیرۆزە، پلاستیك... هتد.

*** لە كوردەواری ئەوەی لە ولاتی خۆمان هەیەو بەرهەم دێت چییە؟**

- كارەبا و كرمان و سەندەلووس بووە دەیانكردە بازنی دەستی ژنان، یان ملوانكە لەگەڵ زیو یاخود (تاسی) سەری قەدیم، ئەوانەی ئێستا لە دەرێش هەیە لە ئەورووپا، زۆری هەیە لێرە چوویتە ئەوێ.

*** لە كوردستان چ ماددەیەك لۆ تەزبێح بەكار دێت؟**

- قەزوان. هی چیای خۆمانە ئەوە كرایتە تەزبێحەكی چاك، بەدەمچە، باوی، چەقەلە، ناوكی خۆخ، دەكرێنە تەزبێح و دەفرۆشرێن.

*** هەیە لەولاتی دیكەوە بۆ ئێرە بێت؟**

- بەڵێ، نەرجیلە، یوسرە، مینا كارییە مینای لەناو كرایە، ئەوانە ئیشی دەستن، هەیە لە ئەفغانستان و پاكستان دێ، تەسبێح هەیە لە ددانی فیل یاخود شاخ دروست دەكرێ، ئەوانە زەخرەفەشی لێدەكەن ئەوجا دەیهێننە ئێرە.

*** ئافرەت تەزبێحی تایبەت بەخۆی هەیە؟**

- ئافرەت تەزبێحی پیاوان و هی خۆی هەر لە ملی دەكات وەك ملوانكە، ئەگەر باش باشەكە بێت، ئەوە هەر لەملی دەكەن. جۆری كارەباكە ئەوەی لەدەرێ مەرغووبە بە دەفتەر دۆلار دەكڕدرێ، ئافرەت لێرە لە ملیان یان لە دەستیان دەكەن، لۆ تەزبێحات بەكاری نایەنێ، ئیللا ئەگەر ژنەكانی خۆمان نەبێ بە تەمەنەكان، هی دار هەیە لە ملی دەكەن و تەهلیلەی پێدەكەن.

*** ئەو جۆرانەی لێرە دەچنە دەرەوە چنە؟**

- كارەبایە، كرمانە، یوسرە، نێرجیلە، ئەوانە هەموو لێرانە دەڕواتە دەرێ.

*** ئەو تەزبێحانەی لێرانە هەنە نرخیان تا چەند دەڕوا؟**

- تەزبێح هەیە بە وەزنە، وەزنی دەوێ بە دۆلار دەكرن بە دۆلار دەفرۆشن، لەوانە: كارەبا، كرمان، ئێستا كرمان بەو ئاخیرەی غرامی گەیشتە (٨) دۆلار.

*** گرانترین تەزبێح كامەیە و نرخی چەندە؟**

- كارەبا گرانترین تەزبێحە،

غرامی بە (١٥- ١٠- ٨) دۆلارە لە (٥) دۆلار کەمتر نییە.

*** هەرزانترین تەزبێح کامەیە؟**

- ئەم پلاستیکانە هەرزانن.

*** کامەیان زۆر باوی هەیە، خەڵک دەیکڕێ؟**

- ئەوەی تەزبێح ناس بێ تەزبێحی باش دەکڕێ، گوێ ناداتە پارەکەی، بەعام مامناوەندییەکەی دەکڕن، چونکە لە خراپەکەی باشترە، باشەکەشی پێناکڕێ.

*** جوانکردن و رازاندنەوەی تەزبێح چۆنە؟**

- لێرە وەستا هەیە ماددەی دەکەنە تەسبێح، وەستا سابیرە، وەستا مەجیدە، وەستا ئازادە، ئەوانە ئێستا تەزبێح لە هەولێرێ دروست دەکەن، تەزبێحێکی ناشیرین بێ، چەرخی دەکەن تا جوان دەبێ، ئێستا ئەوە سەدەفە دەنکی گەورەیە، دەیکەنە تەزبێحێکی (١٠١) دەنکی وردی جوان، دوو گولێنگی لێ دەرازێننەوە، هۆنانەوەی لێ دەکەن، (مام عومەر) هەیە ئەوەتە لەناو تەزبێح فرۆشان هۆنانەوەی لێ دەکا باشترین شێوە دەردەچێ.

*** تەزبێحە باشەکان سیفەتیان چییە، چەند کۆن بێت زیاتر دەبریقێتەوە یان رەنگیان ناڕوا، چییە؟**

- شەرت نییە، تەزبێحی باش هەیە رەنگی تەحەجور دەبێ، وەکی بەردی لێدێت هەر ناینا سییەوە، بەشێوەی چەرخ کردن رەنگی جوان دەبێ دوایی دەگۆڕێ بە رەنگی دی نایناسییەوە، نازانی ئەوە تەزبێحە.

*** ئەو تەزبێحانەی زوو رەنگیان دەڕوات کامەیە؟**

- پلاستیکن، بۆیاغ دەکرێن، بۆیاغەکەش زوو بەردەدا، هەرشتەک ئەگەر ئەساسی خۆی نەبێ، رەنگی خۆی نەبێ دەڕوا، بەس ئەوەی مەواد کیمیاوی ناڕوا.

*** تەزبێح هەیە رەنگەکەی پیرۆزە بێت وەکو چۆن مۆری شین لەسەر ئەنگوستیلە دایە؟**

- بەڵێ، ئێستا ئەو تەزبێحە شینە ئەوە پیرۆزە، رەنگی خۆیتی رەنگەکی مویارەکە، ئەوانە بە ئەحجار کەریمە دەخوێندرێنەوە، دەڵێن: سیفاتی وەی ئەوەیە ئەگەر لەناو ئەنگوستیلە بێت، یاخود وەکو تەزبێح لە دەستت بێت، ئەوا برووسک لێت نادات.

*** ئەدی لە بۆ چاووزاری هەیە؟**

- لۆ چاووزاری ئەنگوستیلەی هەیە پێی دەڵێن:

(أم العين/ سليمان أم العين)، تەزبێح هەیە بەدەستی چاویان لێ دروستکردییە، ئەوە ئەساسی نییە، بەڵام تەزبێحی جوان هەیە دەڵێن موبارەکە، ئەو (نێرجیلە) دەڵێن: هەموو پێغەمبەرەکان هەریەک و عەسایەکیان هەبووە نێرجیل، دەرێن لانکەکەی حەزرەتی عیسا، نێرجیل بووە، واتە ئەو دارە موبارەکە، لە دەرێ باوی هەیە.

*** ئەو رەنگانەی زۆر باون، بەزۆری چ رەنگێک دەڕوا؟**

- تەسبێح ناس تەماشای رەنگی ناکات، بەس ماددەکەی دەوێ، ئەگەر جسن بێت باش بێت دەیکڕێ، عیلاقەی بە رەنگی نییە، تەزبێحێکی باش بێ، زەرد بێ، سوور بێ، تێکەڵ بێت، کەسک بێت، مۆر بێ لەکنەوی فەرقی نییە، بەس گرنگ شتەکە چاک بێ ئەو دەیکڕێ.

هەر لەناو تەزبێح فرۆشان چاومان کەوت بە کاک (رومێل هورمز لاوەندە) گوتی: (٢٠) ساڵ دەبێ خەریکی تەزبێح فرۆشیم، کاک رومێل خەڵکی هەریر و باتاسە، لە دایک بووی (١٩٧٤)ە، ئێستا لە هەولێرە.

*** تەزبێح فرۆشە کەونەکان کێ بوون؟**

- قەدیەکان ئەمانە بوون: (مام عوسمان، مام وەلی، سەید خالید، مام وەهاب، مام غەریب، یونس، مام کانەبی، کاک هیدایەت) لەوانە هەندێکیان ماون، هەندێکیشیان ئەمری خوایان کردییە.

*** ژمارەی دەنکەکانی تەزبێح چەند جۆریان هەیە؟**

- لە یۆنان (١٧) دەنک هەیە، لە تورکیا (٣٣) دەنک هەیە لای خۆمان (١٧، ٣٣، ٥١، ٦١، ١٠١) هەیە، تەمەندارەکان (١٠١) دەنک دەکرن، گەنجەکان (٣٣) دەنک.

**ئەم بابەتە لە گۆڤاری مێرگ ژمارە (٤)، ساڵی یەکەم ٢٠٠٥ وەرگیراوە.**



# هەولێر و دامە

ئا: شیرزاد رەسوڵ فەقێ

بە چاودێری و ئامادەبوونی بەرێز فەلەکەدین کاکەیی وەزیری رۆشنبیری و بە ئامادەبوونی بەرێوەبەرە گشتییەکانی دیوانی وەزارەتی رۆشنبیری، بەرێوەبەرایەتی گشتی وەرزش و لاوان بە مەبەستی زیندووکردنەوەی یارییە فۆلکلۆرییەکان، لە هۆڵی زەرد پاڵەوانییەتی خولی دامەی بۆ دامەزانانی سەرووی تەمەنی چل ساڵی سازکرد، سەرەتای رێوڕەسمەکە وەزیری رۆشنبیری لە پەیڤێکدا گوتی: دامە یەکێکە لە یارییە فۆلکلۆرییەکانی نەتەوەکەمان، کە پەیوەستە بە زەین و هۆشی مرۆڤ و زیرەکی و توانای مرۆڤی پێ تاقی دەکرێتەوە لە بواری پلاندانانیدا، ئەم یارییە جگە لە هەولێر لە کەرکووک و گەرمیانیش بلاوە، هیوادارم لە داهاتوودا لەسەر ئاستی کوردستان ئەم پاڵەوانەتییە ئەنجام بدرێت، دواتر رێوڕەسمەکە بە بەشداری (٢٧) دامەزان و هۆگری ئەم یارییە دەسکرا بە پاڵەوانەتییەکە، سەرتیپ تاریق شارەزا لە وەزارەتی رۆشنبیری لەبارەی ئەم پاڵەوانەتییە گوتی: دامە یارییەکی فۆلکلۆرییە، لە بنەڕەتدا یارییەکی کوردییە یان فارسییە و لەلایەن ئەم دوو نەتەوە داهێنراوە، ئەم پاڵەوانەتییە بە نیازبووین لە ساڵیادی شۆڕشی مەزنی ئەیلوول ئەنجامی بدەین، بەڵام لەم یادە نەمانتوانی خۆمانی بۆ ئامادە بکەین، بۆ ئەم پاڵەوانەتییە بەشداربووانمان لە هۆگرانی ئەم یارییە لە گشت لایەک کۆکردۆتەوە، مەبەستمان لە ئەنجامدانی ئەم یارییە بۆ زیندووکردنەوەیەتی و تا بتوانین لەم رێگایە بایەخێک بە بەساڵاچووەکانمان بدەین، کە بەشێکی زۆریان ئارەزووی ئەم یارییە دەکەن، ئیبراهیم عومەر سەرپەرشتیاری خولەکە گوتی: بیرۆکەی دامەزراندنی خولی یاری دامە لەبەرێوەبەرایەتی وەرزش و لاوانی

هەولێـر سـەربەخـۆدا، ئەمـەش بۆ زیندووکـردنەوەی یارییـەکـە بوو بە تایبـەت یارییـەکی فـۆلکلۆرییـە، هەرچەندە سـەردەمی بڵاوبوونەوەی کۆمپیـوتەر و یارییە ئەتارییـەکانە، بەڵام لەگەڵ ئەمەش ئەم یارییە مەترسی لەناوچوونی نییـە، هیـوادارم بۆ ئەوەی ئەو یارییە هەر بە زیندوویی بمێنێتەوە بەردەوام سـاڵانە خـولی لەم شـێـوەیە بکرێتەوە، مام ساڵح تەها حوسێن ٧٠ ساڵی بەشدار بوو گوتی: من کوڕی ئەم هەولێـرەم، بە بیـرم دێ لە سـاڵانی پەنجاکاندا لە چایخانەکانی کەوکەو حاجی مسـتیل و حاجی مەچکۆ چەند کـەسـانێک هەبوون لەم یارییـە زۆر شـــارەزا بـوون، ئـەوانیـش خـوالێـخۆشـبـووان سـادق بەزاز و عـەبدوڵڵا شـورتە و بابە غـەوسی هیـرانی و مـام حـاجـۆ بوون، لە دامـەزانەکـانی شـاری هەولێـر بوون، ئەمـڕۆ گـەنجی دامـەزانی باش هەیە یارییان لەگەڵدا دەکەم، لێم دەبەنەوە و لێـیـان دەبەمـەوە، بەڵام تەمـەنم بەسـەرچووە، زەین و هۆشی جـارانم نەماوە، لە یاری دامە ئۆین و پشت بە پلانی وەختە دەبەسەترێ، هەروەها ئەو کەسە دامەزانە، کە ئاغـای زیاتر بە دەست بێنێ و بەردی زیاتری کـەسی بەرامـبـەر بخـوا، نەک بەرد بە بەرد بێت، درێژی و کـەمی یارییـەکـە بۆ زانایی و شـارەزایی دامـەزانەکـە دەگەڕێتەوە، چونکە یارییـەکە چەندە درێژ بخایەنێت، واتە ئەوانە دامەزانن، هەندێک جـار (٣٢) ئۆین دەکـرێت، مام ساڵح روونی کردەوە و گوتی: کە دەڵێن (ئاغـا) واتە خێـرایە و دەتوانێ بەردی زیاتر بخوات، ئۆینیش بە مانای بردنەوە دێت و بەدەست هێنانی بەرد خـواردنە، ئەم یارییـە لە کـۆنەوە لە

شارەکانی هەولێر و کۆیە و کەرکوک و مـوسڵ بڵاوبووە، مـەلا سـابیـر سـاڵح مـامۆسـتـای ئایینی و بەشدار گوتی: دامـە وەرزشـێکی فکرییـە و لە کۆنەوە باوە، دیارە فکریش بەشـــێـکە لە ئینسـان، پێـویسـتی بە فـراوان بوون هەیە، وانەی بیـرکـاری کـە لە قوتابخانەکاندا دەخوێندرێت فکرییە، ئەگـەر بە مـێـژووی مـرۆڤـایەتیـدا بگەڕێینەوە، کاتێک مرۆڤی کۆن تازە هۆشی دەبووەوە، کـە هەسـتـیـکرد پێویسـتی بە ژماردن و بەراوردکردنی شت هەیە، سەیری دەوروپشـتی خـۆی دەکرد، گەلێ شتی سـەیر و سەمـەرەی سەرسوڕهێنەری دەکەوتە بەرچاو تاکو وای لێـهـات ئەمـڕۆ و دوێنێ لێک جیـابکاتەوە و خـۆشی و ناخـۆشی و زیان و قـازانجـیـان پێک بگرێ و بەراوردیان بکات، تاوای لێـهـات گـەیشـتـە قۆناغی بەراوردکردن، دوای ئەوە مرۆڤ بیری زیاتر بۆوە و ئەمجارە دەستی کرد بە ئاڵوگۆڕکردنی شت، ئەم یارییـە هەرچەندە لە کـوردەواری کـەس بایەخی پێنەداوە، بەڵام نەفـەوتاوە. یوسف هەولێری توێژەری کۆمەڵایەتی و نووسـەر و بەشـدار لەم یارییـە گـوتی: یـاری دامـە یارییـــەکی فـــۆلکلۆری کـوردەوارییـە، کـورد تاکـو کـاتێک هەسـتی بە مـاندووبوونی جـەسـتـەیی کردووە، بیری لە داهێنانی یارییـەکی هزری کـردەوە... کـە مـێـشـکی بەکـاربێنێت، بۆیە دامـەی داهێنا، کـە بێگومـان ناوەکـانی وەک دار و بیـخـۆ، ئەوانە وشـەی کـوردین، کـە بەڵگەن بۆ ئەوەی ئەم یارییـــە کـــوردییـــە، بەناوبانگـترین دامەزان لە رۆشنبیران، شـاعیری گەورە جەمیل سدقی زەهاوی بووە، کـە یەکـێک بووە لە ناودارترین دامـەزانەکان و دەڵێن کـتێبێکی داناوە

لەم بـوارە، بەڵام تا ئێـــــســتـــا بەرچاونەکـەوتووە، بۆیە بە پێـویسـتی دەزانم ئەو یارییانە و یاری دیکە وەک شیروچکە نۆرچکە زیندوو رابگیرێت و سـاڵانە خـولی بۆ ئەنجـام بدرێت، وابڕیارە هەر پێنج سـەرکـەوتووەکـانی ئەم خولە لە یارییەکی سەرتاسەری بۆ شـارەکـانی دیکەی کـوردسـتـان کـە ئەم یارییـەیان تێدا باوە بەشـداری بکەن، چونکە ئەم یارییـە چەندین سـاڵە لە شـاری کـەرکـوک سـاڵانە خـولی لەو شـێـوەیە بەڕێوەدەچێ، بەڵام لە شـاری هەولێـر یەکـەم جـارە خـولێکی لەم شێوەیە بۆ ئەو یارییە ئەنجـام بدرێت، خۆزگە ئەم یارییە وەکو یاری شەترەنج دەخرایە سـەر کۆمپیـوتەر و دەکرا تاکو ئەوەی نوێ لەسـەر ئەم ئامـێـرە ئەم یارییە بکەن.

لە کـۆتاییـدا خـەڵات بەسـەر (١٠) دامەزانی سەرکەوتوو دابەشکرا بەم شێوەیە:

* سەرکەوتووی یەکەم: لەتیف محەمەد عەلی
* سـەرکـەوتووی دووەم: شـەمـسـەدین موشیر
* سەرکەوتووی سێیەم: عەزیز محەمەد
* سـەرکەوتووی چوارەم: سـاڵح تەها حوسێن
* سـەرکـەوتووی پێنجـەم: تۆفـیـق شەوکەت
* سـەرکـەوتووی شـەشـەم: عـەلی جەرجیس
* سەرکەوتووی حـەفـتـەم: محـەمـەد مەحموود
* سەرکەوتووی هەشتەم: تەلعەت رەزا
* سـەرکەوتووی نۆیەم: عـەبدولخـالیق جەمیل
* سەرکەوتووی دەیەم: قاسم عەبدوڵڵا
* ئەم بابەتە لە گـۆڤـاری ئاسـۆی فـۆلکلۆر، ژمـارە (٢٤)ی سـاڵی ٢٠٠٧ بڵاوبۆتەوە.

# سوار و سوارچاكی

ئەحمەد حەمەدەمین

لە كوردەواری وشەی "سوار" یاخود دەستەواژەی "سوار و سوارچاكیّ" باوە، وشەیەكە یەكسەر خەیاڵی مرۆڤ بۆ لای ئازایەتی و داستان و قارەمانییەتی دەبات، گەلیّ جار قسەی (سوار تا نەگلیّ نابیّ بە سوار) و (تاقە سواریّ تۆزی ناكات)، یا لە یاری دامە دەگوتریّ (ریزم سوارە) یان تفەنگچی دەلّیّ: (تفەنگم سوارە)، یان دەگوتریّ (سواری خەڵكی هەر پیادەیە)، دەیان وێنە و نموونەی دیكە لەم چەشنە لە نێو گۆتە و زمانی كوردی بەدی دەكریّ.

سوار بە مانای ئامادە، ساز، كۆك، دێت، بۆیە سوار و سوارسوارانیّ كۆمەڵێك تەدارەك و ئامراز و كەل و پەلی تایبەت بەخۆی هەیە، هەروەها سواری ناو سواران، ئەویش چەندین خاڵ و مەرج و سیفەت و خاسیەتی تێدایە، لە كۆنەوە ئافرەتی كوردەواری كاتی منداڵی ساوای لاواندۆتەوە و گۆرانی بەسەردا هەڵداوە، هیوا و ئاواتیان خواستووە كورەكەیان ببیّ بە سوار و لە گۆرەپانی پێشبركیّ و رمبازیدا ببیّ بە پێشەنگی تاقمی سواران، بۆیە گوتوویانە:

**سوارە لەپێش قۆشەنیّ**
**خارو مامی دەگەنیّ**
**یەك و كەسەری دەدەنیّ**

قۆشەن واتە لەشكر، ئافرەت تامەزرۆی ئەوە بووە رۆڵەكەی پێبگات، لە پێش لەشكر سوارێكی چاپووك و قۆشمەبازی لێدەرچیّ، گۆرانی بەسەرهات و رووداو، كە گیانی ئازایەتی و قارەمانی دەوروژێنیّ، تەژی و پرە لەمجۆرە نموونانە، نەك هەر لە سترانی شادی و بەختەوەری، بەڵكو لە گۆرانی ئیشوكار و بۆنەی دڵتەنگ و كارەسات و رووداوی ناخۆش، لە شیوەن و پرسەدا، ئافرەتان بە رۆڵەی سوار چاك و مەرد و چاونەترسیان هەڵداوە، گەلیّ جار بۆ مرۆڤی مێرخاس و بەتوانا و خاوەن قۆناغ و بنەمای كۆمەڵایەتی، یاخود كەسانی ئاسایی سوار چاك و ئازا كۆتەڵیان سازداوە، بۆیان مەینەتبار و نیگەران بوون، شیوەن و چەمارۆیان بۆ كردوون.

**ئەو ناریەندەم كورە كوردە**
**ناران لێدەن هوردە هوردە**
**سوار هاتن لەشكر گردە**
**كەسم نما هەولێر گردە**
**كەسم نما ئەسپی غوردە**
**كەسم نما نسكۆی بردە**
**كەسم نما سواری مەردە**

سواری ئازا لە بۆنەو بەسەرهات و رووداوەكان، بەهرە و توانایان دەركەوتووە، لە كاتی راوكردن و بووك گواستنەوەدا یان لە شەڕ و بەسەرهاتدا، لێوەشاوەیی و شارەزایی سوار چاكەكان ئاشكرا بووە، جاران لەبۆنەی بووك گواستنەوەدا كۆمەڵێك سواری چاپووك و لێوەشاوە، لەپێش وڵاغی بووكیّ تەقڵە و جلیتنی و غارغاراێنیان كردووە، گۆرانییان گوتووە و پێشبركیّ و ركەو سوارچاكییان سازداوە، خەڵك هەیە دیویەتی سوار لەبای غاریّ، چەكی فڕێداوەتە ئاسمان، تەقڵەی بە تفەنگەكە لێداوە و گرتوویەتییەوە، سوار هەبووە زۆر بە خێرایی بەتاو هاتووە و كڵاوی لە زەوی هەڵگرتۆتەوە.

لە داستان و بەسەرهاتەكانی قارەمانییەتی و ئەڤینی، سوار چاكی عەگید و مێرخاس دەركەوتوون، گەلێك قارەمان و سوارچاك هەن، ئێستاش وەك نموونە ناویان ئاماژەی پێدەكریّ، سوار چاكی بە تەنیا لێهاتوویی بۆ مرۆڤ ناگەرێتەوە، لە سوارچاكی ئەسپ و ماینی رەسەن و پەسند رۆڵی خۆیان دەگێرن، دیارە وڵاخی جسن تایبەتمەندی و مەرج و بنەرتی خۆی هەیە.

**مەرجەكانی وڵاخی رەسەن**

*** هەستیار و چاپووك:** لە دووردوە تا مەودای (٣٠٠) مەتر هەست بە بوونی رێگر و ناحەز و گیانەوەری درندە دەكات، دەپرمێنیّ و

گوێی قولاغ دەکا و گۆڕان لە جوولە و لەشی ڕوودەدات، بۆیە هەڵدەستێتەوە سەر پاشوو دەحیلێنێ، هەردوو قاچی پێشەوەی بەرز دەکاتەوە و چەپۆک دەوەشێنێ.

* **چاونەترسی و سڵ نەکردن:** لە کاتی ڕمبازێ و غاردان تفەنگی پێوە بنێی سڵ ناکاو لە گووره ناچێ و ناشێوێ.

* **وەفاتی نمەک خوانی:** کە سوار گلا یاخود بریندار بوو، دەگەڕێتەوە سەری و دۆش دادەمێنێ، تەنانەت پاڵدەکەوێ تا خاوەنەکەی بچێتەوە سەرپشتی.

* **سوارناس و هێمن:** سوار چاک دەناسێ، پشتی چاڵ دەکا و هێمن دەوەستێ، ئەگەر سوار خراپ بێ تووکی لێدێ و شووم و سەرشێت دەبێ.

* **شوێنناس و شارەزا:** خاوەنی هەڵە بکاو شوێن بزر بێ، ڕێگا و ماڵ و شوێن دەناسێتەوە، لە شەڕ دەتوانێ بریندار بێنێتەوە.

* **سەبوور و خۆڕاگر:** هەر چەندە برسی بێت دان بەخۆدا دەگرێ وپاشاخوڕ ناخوات.

* **دەرکبەر و توانادار:** هێز و توانای خۆی دەزانێ، لە خۆی ڕانەبینێ باز نادا و خۆی و خاوەنی بە فەتارەت نابات، لە مێشکی خۆی شوێنی بازدانەکە دەپێوێ.

## جیاوازی ماین و ئەسپ

لە سوارسوارانێ ماین و ئەسپ بەکار دێت، کە دوو بەرزە وڵاخی دیار و بەرچاون، هەریەک لەمانە خاسیەت و ئاکاری تایبەتمەندی هەیە..

* ماین لە ئەسپ پشوو درێژتر و هێمنترە

* ئەسپ فێلاوییە لە کاتی تووڕەبوون هەڵدەستێتە سەر پاشوو و چەپۆکان دەکا، ماین ئەم خاسیەتەی نییە، ماین دووربین و هەستیارە، ئەسپ لە خۆباییە بۆیە کەم ئاگایە.

## جۆرەکانی وڵاخی بەرزە

وڵاخی ڕەسەن و جسن چەند ڕەنگ و جۆری هەیە، ئەمانە لەناو وڵاخان بە توخمی نایاب و دەگمەن دەژمێردرێن، لە میانی گوێگرتن لە لاوک و گۆرانی و داستان و بەسەرهاتەکانی ئەڤینی و قارەمانییەتی ناوی وڵاخ و توخم و جۆریان دیار دەکەوێ لەوانە:

* کەوێت یاکوێت. * بۆرە. * شێ. * سەگلاو. * قەڵە باڵداری بەحری (وڵاخی حەسەنی والیکێ لە لاوکی گەنج خەلیل). * تێلی عەیشان (وڵاخی چەتۆ لە لاوکی چەتۆو فەرحۆ). * دامرقەلی (وڵاخی گەنج خەلیل). * بێزوت. * جان جان. * شێ غەزال (لە لاوکی لاس و خەزال).

## تایبەتییەکانی سوارچاک

سوارچاک چەند پێویستی و خاسیەتی تایبەتی هەن لەوانە:

ئازایەتی و بە جەرگی، خوێن گەرم و ڕاستگۆیی و بە وەفایی، نەرم و مەند و لەسەرخۆ، چوست و چالاک و لێوەشاوە، دڵفراوان و چاوکراوە و داوێن پاک، بەزەیی و بەتەنگ لێقەوماوانەوە بێت، جەستەی توند و تۆڵ و تێکچەقیو بێ، سوار دەبێ شایانی هەڵگری نازناوی سوارچاک و شۆرە سوار و بووکا سواران بێت، هەروەها پێویستی بە وڵاخێکی خۆشبەز و ڕەوهان هەیە، کە زین و بەرو لغاو کرابێ، ڕکێب و تەدارەکی تەواو بێت، تەنگەوبەری توند و شەتەک بێ. سوار زۆر جار بەوڵاخەکەی دەناسرێ، نەک بەسەرو سیمای خۆی، سوارچاک وڵاخی خۆی خۆشدەوێ و لەسەیرکردنی تێرنابێ، لەخۆی زیاتر ئارەزوو ناکات کەسی تر بچێتە سەرپشتی. سوار پێدەخاتە ئاوزینگ و دەست بە قەڵبۆزی زینەوە دەگرێ و سواری وڵاخەکەی دەبێ. سواری شارەزا وڵاخ تەنگاو ناکات، سەرەتا جڵەوی بۆ شۆڕدەکات تا دەکەوێتە پێهەڵگرتن و نەرمەغار، کاتێ گەرم داهات و ئامادەی غار بوو، جڵەو توند دەکات و ڕکێب لێدەدات، خۆی توند دەگرێ، دەنگی دەدا و جارجارە سەرە قامچی بەرەو دوواوە ڕەوان دەکات، سوار چاک ئەوەیە جینگزترین وڵاخ نەرم بکات و سواری پشتی بێت، ئەگینا بە (کەرسوار) یان (سواری تازیان) ناو دەبردرێت. سوارچاک لەپڕ بۆ نەیار و ناحەزی ناچێت، بەڵکو ئاگاداری دەکاتەوە. جاران ئەوەی لە مەیدانی جەنگ بکوژرایە هەیاسەی پشتی بۆ ئەو کەسە بوو کە لێیداوە، سواری جەنگ و سواری پێش بووک و ڕاو و شکاری جیاوازن لە یەکتری، هەریەکە تایبەتمەندی خۆیان هەیە.

سەرچاوە:

* سوارچاکی لە لاوکی کوردەواریدا، محەمەد کەریم شەریف، دەزگای ڕۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی، بەغدا، چاپخانەی ئەسعەد، ١٩٧٨
* مێرگ- فۆلکلۆری کورد و سرووشت، حەسیب عەبدولقادر قازی، چاپخانەی حوادث، بەغدا، ١٩٩٠.
* ئەم بابەتە لە گۆڤاری (مێرگ) ژمارە (٤)ی ساڵی ٢٠٠٠ وەرگیراوە.

# راو و راوچییەکانی هەولێر

ئەحمەد حەیران

بێگومان یەکێ لە دیاردە هەرە بەرچاو و دیاردەکانی راو و راوشکار ئەوەیە کە جگە لەمەی وەک بابەتێکی رووکەش یان پیشەیەکی سەرەڕۆیانە سەیر بکرێ، مێژوویەکی دورو درێژی هەیە، بەدان پیدانانی زۆر کەس لەزانا، کۆمەڵناس و خاوەن تیۆرەکان. راوشکار لەسەرەتای بوونی مرۆڤەوە هەبووە بەڵکو دەڵێن: مرۆڤ لە قۆناغەکانی سەرەتای ژیان واتە کۆمۆنەی سەرەتایی کە ئەوکات کۆمەڵ هێشتا دابەشی چین و توێژ نەبوو بوو ئادەمیزاد تەنیا مشوری خۆراکی هەبوو بۆ خۆ ژیاندن.

ئەم خۆ ژیاندنەشی لەرێگای راوشکارەوە ئەنجام داوە لەبەرد کەرەسەی داتاشیوە و لەگەڵ نێچیر کەوتۆتە ململانێ تاکو بەسەریا زاڵ بووە. هەروەها جگە لەمەش زۆر لە شارەزایانی شانۆ سەرەتای بزوتنەوەی درامی یان نواندن دەگەرێننەوە بۆ سەر ئەم شێوە راوکردنەی مرۆڤ کە بۆ نێچیر لە چەرخەکانی سەرەتای ژیان کردوویەتی لە پێناوی مانەوەی خۆی. بێگومان ئەمانە نموونە و بەڵگەی بەهێز بوون بۆ بوونی ئەم جۆرە پیشەیە لە کۆنەوە تاوەکو ئێستا. ئەگەرچی پاش ئەم قۆناغە کۆمەڵ گۆڕاو دەستەوتاقم پەیدا بوون و هەندێک دەست رۆیشتووتر بوون لە هەندێکی دیکە تەنانەت زۆر لەدەست رۆیشتووەکان لەبەر راووشکار و رابواردن. ئاگایان لە کێشە و گیروگرفتی کۆمەڵ و دەوروبەریان برا. تەنانەت وایان لێهاتبوو دنیایان تەنیا هەر بۆ زەوق و رابواردنی خۆیان دەویست. بێگومان ئەمە وابوو. ئینجا ئەگەر ئێستاش ئەوە درێژە پێدانی ئەوکات و سەردەم و رۆژگارانە بێ، ئەوە گرنگ ئەوەیە شتەکە هەرواماوەو شێوەیەکی گشتی وەرگرتووەو هەموو کەسێ بۆ داتەکاندنی زەوقی هونەری خۆی ئەگەر ئەم جۆرە خولیایەی هەبێ ئەوا دەیکا. بۆیە لێرەوە چی دیکە بە پێویستی نازانین درێژە دادری بکەین.

بەڵکو بەرەو کاکڵەی بابەتەکە دەڕۆین و لایەنە گرنگەکانیش بەریز دەخەینە بەر دەست. لە بەرایی هەموو ئەمانەش دەبێ ئەوە بزانین کە راووشکار زەوقێکی مرۆڤانەیە خولق و خوویەکی دڵ فێنککەرە کە زۆر کەس متوی دەبێ تەنانەت کەسانی واهەیە دەیکاتە خاسیەتێکی تایبەتی ژیانی، هەروەها جگە لەمەش راووشکاری یەک جۆر نییە و تایبەت بە لایەنێکەوە نەبووە بەڵکو ئەمیش پۆلێن دەکرێ هەرکەسە لە جۆرە راوێک زەوق دەبینێ. بۆ نموونە راوەکەو جیاوازە لەراوی کەروێشک و مامز یان سیخور یان بەراز، سەرباری ئەمەش لەوانەیە زۆر جۆرە راو بەگوێرەی سروشت و خاسیەتی تایبەتی ناوچە و وڵاتێک بگۆرێ. لەوانەیە جۆرە راوێک لە هەرێمێک یان وڵاتێک هەبێ، بەڵام لە شوێن و ناوچەی دیکە نەبێ. بۆیە لێرەوە ئێمەش بە گوێرەی توانا لایەنە گرنگەکانی سەر بەم خوو زەوقە مرۆڤایەتیە دەخەینە روو، بەگوێرەی هەل و مەرجی بابەتی خۆی پۆلێنی دەکەین و بەریز دیاردەکانیان دەخەینە روو، بەڵام ئەوەی مەبەستی سەرەکی ئێمەیە لێرەدا راوە مامز و کەروێشکە.

### ١- راوچی (راوکەر)

هەروەک لەناوەکەیەوە دەردەکەوێ راوچی بەکەسێ دەگوترێ کە پیشەی راو بکاتە لایەنێکی تایبەتی لە ژیانی و پسپۆری لە ئیشەکەی پەیدا بکا، بەپێی ئەم جۆرەی هەڵی دەبژێرێ لەلایەن خۆیەوە، چونکە راویش جۆری هەیە. هەر کەسە بەگوێرەی زەوق و لێهاتوویی و توانای خۆی

لایەنێک هەڵدەبژێرێ. بۆ نموونە راوچی تفەنگ جیاوازە لەراوچی تاژی. یان راوچی تۆڕ. چونکە ئەمیان پشت بەهێز و توانای خۆی دەبەستێ، بەر لە هەموو شتێ دەبێ نیشانشکێنێکی زۆر بە توانا و لێهاتوو بێ، جگە لەچەند خاسیەتێکی دیکە. ئەمانی دیکەش هەروا.

وێڕای ئەمانەش دەبێ ئەم کەسە خولق و خویەکی راوچیانەی هەبێ و لە چوست و چالاکی گیانی و لەشی سەر پشک بێ. دڵ تەڕ و دڵ فراوان بێت. گیانی تەبابوونیشی هەبێ لەگەڵ هاوڕێکانی.

## ٢- وەرزی راوکردن:

راوچییەکان دەڵێن هەر لە کۆنەوە، لەوەتەی ئێمە بە بیرمان دێت راو لە پاییزان کراوە تاوەکوو مانگی رەشەمێ، بۆیەش لەم وەرزە راووشکاری بەزۆر دەکرێ، چونکە ئەم نێچیرانەی راویان دەکەین لەم سات و وەرزە ئاوس نین و وەختی زاوزێیان نییە. لەبەر ئەوەی نێچیری ئاوس بە لای ئێمە راوکردنی کفرەو لەگەڵ رەوتی وێژدان و مرۆڤایەتی ناگونجێ، چونکە راو بۆ بەزم و رەزم و رابواردن و کردنەوەی گرێ کـڕێرەی رۆژانی ژیانە. بێگومان دەبێ ئێمە ئاگامان لەوەبێ کە ئەم جۆرە راوە، ئەو جۆرە گیاندارانە دەگرێتەوە کە لەم وەرزەدا ئاوسن، چونکە جۆرەکانی راو جیاوازە و شەرت نییە هەموو جۆرە راوێک لەم وەرزەدا قەدەغە بێ.

## ٣- کەرستەکانی راوکردن

هەروەک دیارە لەژیانی رۆژانەی هەموو لایەکمان سرووشتی هەر کارێک چەند پێویستیەک دەسەپێنێ بۆ خۆ گەلاڵە کردن بە ئەنجام گەیاندنی ئامانجەکانی. دیارە راووشکاریش لەم جۆرە لایەنە بەدەرنییە و ئەمیش دیاردە و شتی بابەتی سەربەخۆی پێویستە بۆ خۆگەیاندنە مێرابی مەبەست، لەمانەش:

**أ - وڵاغ:** سرووشتی: راوچییەتی وای سەپاندووە پێویستە ئەم کەسە وڵاغێکی خۆش بەزی توند و رەسەنی هەبێ. واتە ئەسپێکی کەوێتی قاپ رەشی رەسەن. سەر و کلکی یەک بێت. بەمانای تەواو دەبێ ئەسپەکە کلکی بەرز بێ بەئاستی سەری، جگە لەمەی پێویستە ئەم ئەسپە سەری لەگەڵ سنگی راوچی لەیەک ئاستابێ لەکاتی سواربوونی لەسەر زین. سەرباری ئەمانەش هەمووی دەبێ زۆر میهرەبان بێت، چونکە لەکاتی کوشتنی نێچیر کە سوارەکە دادەبەزێ نابێ جێی بهێڵێ و لێی دوور کەوێتەوە، بەڵکو دەبێ لەسەری راوەستێ. بەکورتی نابێ لەسواری خۆی دوورکەوێتەوە.

**ب - تاژی:** شتێکی ئاشکرایە هەر راوچییەک چەند تاژیەکی هەیە، ئەمانەش دەبێ خاسیەت و تایبەتمەندی خۆیان هەبێ تاوەکوو راوچی رایانگرێ. چونکە تاژیش جۆری هەیە و هەریەکە لەرەنگ و رووی جیاوازی خۆی دەردەکەوێ کە بەلای راوچییەکانەوە جێگەی پەسندە.

**تاژییەکانیش چەند جۆرێکن وەک:**

١- تورمە رەنگی زەردە.
٢- هەڵۆ رەنگی سپییە.
٣- سەقر رەنگی سوورە.

زۆر جاریش هەیە راوچی لە خۆشەویستی تاژییەکان چوارِ پەل و قاچیان لەخەنە دەگرێ بۆ جوانی و ناسکی.

بەڵام پێویستە ئەمەش بڵێین کە تاژی چۆن پێدەگا و لەچەند سالی و مانگی نێچیر دەکوژێ - راوچییەکان دەڵێن: گوجیلەی تاژی پاش دوانزە مانگ دەبێ بکوژێ، ئەمە لە کاتێکدا ئەگەر گۆڵ بێ واتە نێر بێ، بەڵام ئەگەر دێڵ بێ واتە مێ ئەوا بەشەش مانگ پێویستە نێچیر بۆ لای سوار بگێڕێتەوە، واتە بۆ لای راوچی نەیەڵێ لە دەورو بەری دەرچێ، بەڵام کە گەیشتە ٨ مانگ ئەوا پێویستە بکوژێ، هەروەها دەشڵێن گۆڵ و دێڵی یەک کۆڵێت بە ١٠ مانگ دەکوژێ، بەڵام دەربارەی پەروەردە کردنی تاژی. راوچییەکان دەڵێن دەبێ خواردنی چاکی بدرێتێ وەکو مرۆڤ هەرسێ ژەم، هەروەها شوێن و جێگەی خەوتنی باش بێ، زوو پاک بکرێتەوە ئەم خواردنانەی کە پێویستە بیدرێتێ نیسکێنەیە، چونکە پێی لووس و باریک دەبێ و لەکاتی تێبەردان سووک هەڵدەستێ، جگە لە گۆشت و شتی دیکە، هەروەها دەشڵێن ئێسکی قاچی مریشکیش باشە بیدرێتێ.

## ٤- تەدارەکی راوکردن:

لە راوکردندا چەند تەدارەک و کەل و پەلێ هەیە تایبەتن بە راوچی کە پێویست لێیان بەدەر نەبێ تا وەکوو بتوانێ کارەکەی بەپێی مەبەست بگەیەنێتە ئەنجام. لەم تەدارەکانەش:

١- زین: زۆربەی زۆری کەسان لە کوردەواری خۆمان زینی دیوە، بۆیە بەپێویستی نازانین چۆنیەتی و شێوەی دروستکردنی بخەینە روو.
٢- لغاو: بۆ راگرتنی پارسەنگی رۆینی وڵاخە.
٣- رێشمە: لە زیوو مەعدەنی تایبەتی دروست دەکرێ بۆ دەرخستنی جوانیەتی شێوەی وڵاغەکەیەو بەڵای سەروملیدا دێتە خوارەوە و سەرەکەشی بەدەست سوارەکەوە دەبێت.
٤- تەرلگ: بۆ بن زین بەکاردێ نەوەکو زینەکە پشتی وڵاغەکە بریندار بکات.
٥- بەردی بەرسنگ: بەرسنگی وڵاخ شتێکی پێوە دەکرێ پێی دەڵێن (بەرسنگ) کە لە شتی تایبەتی دروست دەکرێ ( بەرەکەش) بۆ ئەمەیە تاوەکو پارسەنگی بەرسنگەکە رابگرێ و نەیەڵێ و شۆربێتەوە.
٦- دۆشەکی سەر زین: بۆ ئەمەیە سوارەکە جێگەی نەرم و خۆش بێ تاوەکو بێ تاقەت نەبێ.
٧- ئاوزەنگ: واتە رکێب بۆ قاچ خستنە ناوەوەیە.
٨- قوشقون: دەخرێتە بن کلکی وڵاغەکە بۆ ئەوەی هاوسەنگی زینەکە راگرێ.
٩- قەرێتە: بۆ خستنە ملی تاژییە تاوەکو پێی رست بکرێ.

ئەوەی شایانی باسە زۆربەی زۆری ئەم تەدارەکانە لە قایش و لباد دروست دەکرێ، تەنیا هەندێکیان نەبێت.

**٥- چۆنیەتی تێبەردان**

راوچییەکان لەنێوان خۆیاندا تەگبیر لەسەر ئەوە دەکەن کە رۆژێک دیاری بکەن و بچن بۆ راو. بێگومان بۆ ئەم مەبەستەش پێخۆری تایبەتی دەگەڵ خۆیان دەبەن. ئەم پێخۆرەش بە زۆری نان و هێلکە و مریشکی سورەوە کراو هەندێ شتی سووک دەگرێتەوە کە لەکاتی برسیەتیدا دەیخۆن. هەرکە گەیشتنە شوێنی دیاریکراو راوی خۆیان دەخەنە ئەم شوێنەی مەبەستیانە. دابەش دەبن بەریز، بەڵام ریزەکە، دەبێ بەپانایی بێت. نێوانی هەر یەکێکیشیان دەبێ لاتێک بێ و رووی هەمووشیان لەیەک رێرەو دابێ. ئەمەش بۆ ئەوەیە کە نێچیر هەڵسا ببینرێ، چونکە لە کەرخی هەر یەکێکیان ئەگەر نێچیر هەبوو نەدیترا ئەوا ئەم کەسە سەرکۆنە دەکرێ، لەلای راوچییەکان. بەڵام ئەگەر نێچیر دیتراو دەنگی لێکرا ئەوا ئەم کەسەی زیاتر لێی نزیکە بە دەنگێکی بەرز دەڵێ و هاوار دەکا (دیاردە قوربانی سەری راوچیانم هەهای) کە ئەمەی گوت: تاژییەکان وشت دەبن، راوچیش رستیان بەردەداو دەنگیان دەدات دەڵێت (دەی دایکم. دەی باوکم) تاژییەکانیش لە چ رەنگێک بن بە ناوی ئەم رەنگە تانیان لێ دەدەن وەک دەی زەردێ. دەی سوورێ... هتد.

ئینجا تاژی وەکو فیشەکە شێتە دەردەپەرێ و سەر لە دوو نێچیر دەنێ تا لە خرتۆرتی وەردەدا. ئەگەر نێچیرەکە کەروێشک بوو ئەوا دەیخاتە ژێر چەپۆکی خۆی خۆ ئەگەر مامز یان رێوی بوو ئەوا گازی لێ دەگرێ جاری واش هەیە دەیکوژێ، بەڵام زۆرکەم. خۆ ئەگەر نێچیرەکە توانی دەرباز ببێ یاخود خۆی ون بکات ئەوا تاژییەکە بەخرایی دەگەرێتەوە بەردەمی راوچی و دەست بە نووسکە نووسک دەکات، راوچیش هیچی لێناکا بەس پێی دەڵێ (ها حیزە خرایت) واتە فەشەل بوویت.

بەڵام زۆر جاری واهەیە نێچیرەکە دەچێتە ناو کونەوە. ئەوا ئەم کاتە بە تولە دەریدەهێنن، چونکە بەدوایا دەچێتە ناو کونەوە لەبەر ئەوەی باریکە.

ئینجا پاش ئەمە کە راوچی نێچیری گرت ئەوا بە کەیف خۆشی بەگۆرانی و بەزم و رەزم بەرەو ئاوایی دەگەرێنەوە، نێچیرەکەش لەپشتە خۆی بەقەپۆزی زینێ وەدەکا، زۆر جاریش واهەیە لەکاتی گەرانەوەی دەداتەوە پێش ئاوایی تاوەکو خەڵک ببینێ، کۆفیشی دینێتە سەری، ئەمە لەکاتێکا ئەگەر راوی بەتاڵ نەبێ، بەڵام ئەگەر بەتاڵ بوو ئەوا پانەپانە و بێ زەوق دەگەرێتەوە. لەکاتی گەرانەوەش پێویستە ئەو تاژیانە جل بکرێن ئەگەر تێبەردرابن، چونکە ئارەقەی دەکەن و قەلبیان لێکدەکشێ. ئەگەر گەرم دانەپۆشرێن ئەوا رەق دەبن. هەروەها راوچییەکان دەڵێن: لەمانگی گوڵانەوە هەتاوەکو مانگی گەلاوێژ واتە رەزبەر جایز نییە تاژی لە نێچیر بەردرێ. لەبەر ئەوەی زەوی درە بۆ تێبەردان دەسنادات.

**رەنگدانەوەی راو لە گۆرانیدا:**

هیچ دەستبەرداری ئەوەنین ئەگەر بڵێین: گۆرانی کوردی دەنگدانەوەی چینە سادە و ساکارەکانی کۆمەڵی

كـوردەواریمانە، لەهەمـان كـاتیش رەنگدانەوەی باری گوزەرانی چین و توێژەكانی ئەم كۆمەڵەی پێوەدیارە. گۆرانی فۆلكلۆری كوردی ئەم جۆرە گۆرانییەیە كە بەر لەوەی تووشی دەستە دەستە كردنی ئەم چین و ئەم تاقم بووبێ، ئەوا سەداو هەوایەكی ئاسوودەیی مرۆڤایەتی بووە لەدڵ و دەروونێكی سادە و ساكارەوە هەڵقوڵاوە زادەی بیر و هۆشێكی بێ قین و بوغوز بووە. جا بۆیە هیچ زۆرمان نەگوتووە ئەگەر بڵێین گۆرانی كۆنی رەسەنی كوردی هەر بۆ خێر و خۆشی و دڵ فێنك كـردن و تورِدانی غـەم و پەژارەی دەروون هاتۆتە ئەنجام. لەهەمان كاتیش لەكێشانی وێنەی ئەم بارە سەخت و ناهەمـوارەی كە چینە كۆمەڵایەتیەكانی ئەم میللەتە لە قۆناغ و سەردەمە جیاجیاكان كەپێیدا تێپەرِ بووە بەدەر نییە، راووشكار دیاردەیەكی كاری رۆژانەی كوردەوارییانە، باری سەردەم سەپاندوویەتی و لەناو خەڵكی ئەم گەلە بە رادەیەكی زۆر ئەنجام دراوە. گۆرانی كوردیش ئەگەر بۆبەشی جیـا جیـا پۆلێن كـرابێ ئەوا لقێكیش بەر راووشـكاری كـەوتووە و بووە بەگـۆرانی راو، كـە ئەمـیش نەزم و ئاوازی تایبـەتی و هۆنراوەی سـەربەخـۆی هەیە كـە لەناوخـۆیان رەنگدانەوەی كـاروباری راووشكاری تیـایا دەردەكـەوێ هەر وەك لەم نموونانەدا دیارە.

**دریغـــە بۆ قـــەراج و كـــەندی ناوێ**
**چ خــۆش بوو بەزم و ســەیرانی گــراوێ**
**هەتا چۆكــان كــەتینە ناو قــوراوێ**
**بە بیـــرت دێ كـــە رۆژی چووینە راوێ**
**هەزار كـەومـان لەسـەر یەك گـرت بەداوێ**

***

**وەرن ســـەیرانە بەزمی راوەكـــارێ**
**كــــەتـانجی بـەردەیێن وەرزی بـەهـارێ**
**بســـورێنن بە هـەل هەل چەند ســـوارێ**
**لەبستی داو لەكـەندێ بچـتـە خـوارێ**
**لەعـــەردی دەن لەناو جـەرگـەی ئەڤـارێ**

***

**گـەزەنگی رۆژ كـەنیـوەی سـەر دەرینا**
**چریكەی داركـــەر و بازو شـــەهێنە**
**لە بـۆ جـــێگـەی ژوانـان دڵ تەزێنە**
**بەحـــەیران بە لاوك كــــور بەزێنە**
**دەگـــەینە یەك كـــورو كچ لەو بەڵێنە**

***

**بەتـیـــــری یـا بە تـاپـر بە تـۆرێ**
**بە تـانجی یـا بە تـولە یـا لـەگـــــۆرێ**
**بەكـــۆمـــەڵ یا بچـــینە راوە پۆرێ**
**لەگـەڵ دنیــا رەوشـتـــە بانەگـــۆرێ**
**بەزانـاو گـــەداوە دەچنە كـــۆرێ**
**تفـەنگی ســاچمـــەیە قـــۆنداغ لەزیوی**
**كـــەچەر هات و بەدالفـــە قـــورِ دەپیـــوی**
**پـەری شـــــــانم لـەداخی راوی ریـوی**
**دەمـــێكە ئارەزوومـــە گــۆشـتـی كـێـوی**
**لەهەولێـــر كـــەوتوومـــە هەر وەك هەتیـــوی**
**بەســـــەر چوو بەزم و رەزمی چونە راوێ**

جگە لەمـە گـۆرانی راو هەر بەتەنیـا بەشـێـوەی بەسـتـە ناگـوترێ، بەڵـكو بەشـێـوەی مـەقـامـیش دەردەبردرێ كـە حـــەیرانیش بەشـــێكە لـێی، هەر وەك لەم نموونانە دەردەكەوێ...

**ســەرم دێشی براینە نازانم درم لۆ توند و تارە. دەچمـە كلكەی دارە بزماران. پرسیار دەكەم لە دایە راوكەران.**
**مەعدەنێ كاران و كار غەزالان لەكێو شیرن دێ.**
**دەیانگۆ برۆ پانیێ تاشی شـەریفی گـەلەك بە بزن و كارە.**
**چەتیم حەیران. ئەمن راوكەرێی تو بووم.**
**ئەوسار سەرێی چەند سارانە.**
**لۆچ راوێژگەت لێكردم بەتارە.**
***
**حەیران لەبرندان لەبرندی شۆرێ.**
**حەیران مامزە دەلەوەرێ لەساكە گۆرێ.**
**ئەمن سـوندەكـەم خـواردییـە لۆ بەژنی باریك، دەست هەرناگرم لەنازدار حەیرانێ.**
**هەتا تەسمیلەم نەكەم.**
**بەخاك و خۆرێ.**

**راوچییە بەناوبانگەكان:**

بێگومـان ئەگـەرچی مەبەستی ئێـمە نەك لەم كـارەو لە هەمـوو كارێكی سەر بابەتە تایبەتیەكانی خۆمان ناوناتۆرە ریزكـردن و بەشـان و باڵ پیـاهەڵدانی كـەس نەبووە، ئەوا

لێرەدا وەک بەڵگەیەکی بابەتی و راستییەکی مێژوویی ناوی چەند راوچییەکی بەناوبانگ دەخەینە روو تاوەکو مافی کەس نەخرێتە ژێر قاچەوە ئەگەرچی ئەمانە شایانی زۆر لەمە زیاتریشن.

١- حەوێز جوکل ئاغا لەگوندی خدرجیجە.
٢- قادر مولود فەتاح لەهەولێر.
٣- رەحمان حەسەن لەگوندی شعەل.
٤- سدیق حاجی عەبدوڵلا بەگ لە هەولێر.
٥- حەسۆی حەمەدی سلێمان لەگوندی خەرابە.
٦- شێخ یوسف ئیسماعیل بەرزنجی لە هەولێر.
٧- شێخ سیراج فەتاح لە هەولێر.
٨- کاک نوری عبدالکریم لە هەولێر.
٩- رەحمان تەماتە لە گوندی عاڵلا.
١٠- مامەند شکور مەحمود.
١١- قادر عومەر ئاشەوان لە دیبەگە.

ئەمانە ئێستا هەموو لەژیاندا ماون و هەریەکە بە گوێرەی ژیانی خۆی لەجێگەیەک دەژی. هەروەها بەگوێرەی کارەکە پێ دەچێ زۆری تر هەبن، بەڵام ئێمە هەر ئەوەندەمان دەستکەوت، بۆیە ئەگەر ناویان نەخرابێتە روو ئەوا سەرکۆنە بۆ ئێمە ناگەڕێتەوە.

*** فەرهەنگۆک**

مێراب: لێوار. رۆخ.
کەرخ: لا. کن. لە کەرخی لەلای. لەکنی.
لات: ئەم بەشە زەوییە کە جوتیار لەکاتی تۆدان دای دەبڕێ و دەکەوێتە پێش تۆدەر.
سەرکۆنە: لۆمە.
وشت: وشیار.
گاز: گەزە، قەپاڵ.
تاپڕ: تفەنگی ساچمە.
خرا - خران: فەشل. خرایت واتە فەشەل بوویت.
خرتۆر: لەعاردی دان.
بستی: بەرزاییەکی تۆزێ لە گرد نزم تر.
گوجیلە: بێچوو. تووتک.
پەردە و بڵاو: پەرش و بڵاو.
گراو: گوندێکە لە دەشتی هەولێر.

کلکەی دارە بزمارەی: کۆتایی چیای قەرەچوغ دەگرێتەوە بەلای رۆژهەڵات.
پانیێ تاشی شەریفی: تیشە شاخێکی پانە رووی لە دەشتی قەراجە لەنزیک کلکەی دارە بزمارەی بەنێچیر بەناوبانگە وادیارە بەناو شەریفێ ناونراوە.

**تێبینی:**
ئەم کەسانەی بۆ ئەم بابەتە سوودیان لێ وەرگیراوە و قسەیان لەسەر زار کۆکراوەتەوە ئەمانەن:

١- حاجی قادر مەولود فتاح. لەڕۆژی ١٩٨٦/٦/٢٧ بەدوو قۆڵی لەگەڵ کاکی شاعیر کاک (ئیسماعیل بەرزنجی) چووینەماڵەوەیان لەگەڕەکی سەیداوە. کۆڕێکمان دەربارەی ئەم بابەتە لەگەڵیا سازکرد، بە ئامادەبوونی دوو راوچی دیکەش بەم ناوانە، رەحمان حەسەن ناوبانگ بە کەچەر. لەگەڵ رەحمان مەولود فەتاح کە ئەمانە تەمەنی خۆیان لەراووشکاری بردۆتە سەر. بە لوتف و کەرەمێکی زۆر شیرین دەستی یارمەتیان بۆ درێژ کردین. سوپاسیان دەکەین هیوامان تەمەن درێژیانە.

٢- حەوێز جوکل ئاغا.. یەکێکە لەراوچییە بەناو بانگەکانی دەشتی هەولێر، توانایەکی زۆری هەیە لەبەستە و حەیران دەربارەی راو و لایەنەکانی تر. کتێبێکی ئامادەیە بۆ چاپ کە (٥٠٠) لاپەڕە دەبێ، هەموو جۆرەکانی راوی تییێدا روون کردۆتەوە بەوێنەوە. هیوادارین دەزگا رۆشنبیرییە کوردیەکانیش گرنگی بەم لایەنانە بدەن و ئەم کتێبەش بەماوەیەکی کەم بکەوێتە بەردەستی خوێنەران. پێویستە ئەمەش بگوترێ کە بەیتەکانی ئەم بەستەی خراوەتە روو هی ئەمە و لەوی وەرگیراوە لەڕۆژی ١٩٨٦/٦/٢٩ لە چایەخانەی راوچیان.

٣- رەحمان حەسەن، ناوبانگ بە کەچەڵ، یەکێکە لە راوچییە کۆنەکانی ناوچەی کەندیناوە هاوڕاوی حەوێز جوکلە لەساڵی (١٩١٠) لەگوندی شعەل لەدایکبووە، حەیرانەکانیش لەوی وەرگیراوە، لە رۆژی ١٩٨٦/٦/٢٩ لە چایخانەی راوچیان. لە کۆتاییدا زۆر سوپاسی کاک شێروان نامیق دەکەم. خاوەنی ستۆدیۆی (سپۆرت فەنی) کە وێنەکانی بەکاتێکی خێراو دیارکراو بۆ شۆردینەوە..



# جەژنی کەران - هەولێر ١٩٦٣

دکتۆر وریا عومەر ئەمین

رەشبگیربی (کەرگیرانی) سالّی٦٣، یێکێکە لەو رووداوە هەرە سەیرانەی کە مایەی ئەوپەڕی سەرسوڕمان و پێکەنین و گاڵتەجارییە. رووداوی وا هەرگیزا و هەرگیز لە مێژووی هیچ میللەتێکا رووی نەداوە و هەرگیز روو ناداتەوە و دەبێ بچێتە کتێبی گنیسەوە.. گومانم لەوەدا نییە کە هەموو هەولێرییە تەمەندارەکان ئەمەیان لەبیرە. هیوادارم هەچ بیرەوەرییەکیان لەم بارەیەوە لایە تۆماری کەن تا جیهان و نەوەکانی دوا رۆژ بزانن ئێمەی کورد چیمان دیوە و چیمان بەسەرا هاتووە.

لەو رۆژەدا هەرچی کەری ناو شاری هەولێر و گوند و لادێی دەور و بەریەتی هەموو گیران و خرانە ناو حەوشە گەورەکەی بەندیخانەکەی هەولێر کە کەوتبووە پشت بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی پۆلیسی ئەوسا (بەرامبەر پارێزگای ئێستا)، بەو تۆمەتەی کە بەهۆیانەوە ئازووقە بۆ پێشمەرگەکان دەبرێ و کاروباری شۆڕشیان پێ ئەنجام دەدرێ.

لە شاری هەولێر ژیان وەستا.. توور و سڵق و کەرەوز

و تەڕەپیاز و ماست و پەنیر کە بە پشتی کەر لە باغچە و لادییەکانەوە بۆ شار دەهێنران لە بازاڕا نەمان...ئاشەکان کە باراشیان بە پشتی کەر بۆ دەچوو هەمسوو وەستان...دەنگی نەوتفرۆش و دار فرۆش لەگەرەکەکانا نەما. نالبەند و کورتاندروو و کافرۆش و کۆڵهەڵگرەکان بازاڕیان مرد. مەیدانی کەر داخرا و کەرفرۆشەکان خۆیان شاردەوە.

نزیکەی هەزار کەر بەندکران. خاوەنەکانیان ڕۆژ تا ئێوارە لەبەر دەرگای بەندیخانەکە بە هەندێ کا و جۆوە لە ریزدا دەوەستان نۆرەیان بێ بچن مواجەهەی کەرەکانیان بکەن و ئاو و خواردنیان بۆ بەرن...کاوجۆفرۆش، وەک میوە فرۆشەکانی بەردەم نەخۆشخانەکان، بە فەردە کاوجۆیان هێنابووە نزیک بەندیخانەکە. ماڵەکانی نزیک بەندیخانەکە سۆندەی ئاو و پەقرەجیان لەبەر دەرگا دانابوو..

کەرەکان ئەم گرتنەیان یەکجار پێ خۆش بوو...ڕزگاریان بووبوو لە بار هەڵگرتن و عارەبانە راکێشان و نەقیزە و دارکاری و بێ بەزەیی



منالان...لەهەمسوو ژیان و مێژوویانا هەرگیز خۆشی و شادیی وایان بە خۆوە نەدیبوو و ئەوەندە نەحەسابوونەوە.. بازدانیان بەسەر یەکا و لووشکە و قەپگرتن و زەڕەزەڕ عەڕەعەڕ و زەرینیان لە ناو حەوشەی بەندیخانەکەدا شانۆیێک و سیمفۆنیاییێک بوو بۆخۆی، زۆر شتیان دەردەبڕی و دەگێڕایەوە.

ئەوسا ئێمە دەستەییێک هاوڕێ بووین لە قوناغی ناوەندیدا، دوای دەرچوونمان لە قوتابخانە دەچووینە بەردەم سەرا لەناو خاوەن کەرەکانا دەخولاینەوە گوێمان دەدایە قسەکانیان و خەمەکانیان. بیرمە مەحموود زامدار کە تازە موچرکی کەریزم بە دەمارەکانیا دەگەڕا دڵی گەلێ لە کەرەکان خۆشتربوو. لەوانەشە هەر ئەو

ڕۆژە و ئەو ڕووداوە بوو عیشقی کەری لەدڵا چەسپاند.

ئەم ڕووداوە بوو بە بابەتی سەرەکیی قسە و باس و خواس و خەم و پێکەنین و پێکەنی خەڵکەکە. گەلێ شتی سەیر ڕوویدا و باس کرا.

ڕۆژێ دوو قوتابی لە پۆلەکەمانا نەهاتبوون.. کە مامۆستا ناویانی خوێندەوە یەکێ لە هاوڕێکانی وتی (مامۆستا ئەوانە دراوسێمانن...کەریان گیراوە چوونەتە مواجهه).

کابرایێک کەرەکەی خۆی لە ژوورێکی ماڵەکەیا دەشارێتەوە...شەو دەزەڕێ و لێی ئاشکرا دەبێ...خۆی و کەرەکەی ڕاپێچی بەندیخانە دەکەن. پاشان کەرەکەیان بەردا و خۆی تا ئیستا شوونبزرە.

عەزیز ناوێک کەرەکەی خۆی دەرباز دەکا و لە ناو زوورگەکانی دەورو بەری هەولێردا دەیشارێتەوە...دوای ئەمە بە (عەزە کەرفیرار) ناوی دەرکرد.

دوای حەفتەیێک جاڕدرا کە هەر کەرگیراوێ عەرزوحاڵێ بنووسێ تیایا بەڵێن بدا کە کەرەکەی بۆ کاری نایاسایی بەکار ناهێنێ، کەرەکەی ئازاد دەکرێ. خوا دەرگاییێکی والای

لەســـــەر گــــازی پشت بۆ عەرزوحاڵچییەکان کردەوە. وێنە گــرەکــان کــەوتنە گــازاندە و دەیانوت حـــەقی وایە وێنەی کـەرەکـانیش بە عـەریزەکـانەوە بلکێنرێ.

بە دەیان کـەرگـیـراو دەوری عەرزوحاڵچییەکان دابوو و وەک زەردەواڵە بەسەریانا نیشتبوون. کـەرگـیـراوێ نەختێ پیـر و بێ تاقەت دەبێ چەند دەکا ناتوانێ خــــۆی بـگـەیـێـنـێـــــتــــــە عـەرزوحـاڵچی...داوا لە یەکێ دەکــــا یـارمــــەتـیـی بدات و عەریزەکەی بۆ بنووسێ.. ئەویش دیارە کابرایێکی فشـەکەر بووە، ئەمـــەی بۆ دەنـووسێ: (بەرێز مــوتەســەریفی هەولێــر...ئەوە شەش رۆژە کەرەکەم گیراوە. من لە جـیــاتی ئەو ســوێندتان بۆ دەخـۆم و شـایەتیی بۆ دەدەم کـە ئـەم کــــــــەرەی مـن هـیـچ پەیوەندییەکی بە هیچ لایێکەوە نیـیـــــە و بێ خـــەتایە و هیچ کارێکی نایاسایی نەکردووە.. تا بلـێـی هـیــمن و ئـیــشکەر و لەسەرەخۆیە.. هەرگیز لووشکەی لە کەس نەداوە و قـەپی لەکەس نەگرتووە. هەرگیز بە دەنگی بەرز نەزەڕیوە...ســـەرچاوەی رزقی منالەکـــانمە...داوا لە بەڕێزتان ئەکـەم رەحــمـێکی پێ بکەن و ئازادی کـەن) یەکــســەر کـابرا دەگــیــرێ و کـــەرەکـــەی بیـــر دەچێتەوە.

رۆژی دوایـــی بـــوو و دوای ئەوەی زۆربەی کـەرگـیـراوەکـان بەڵێننامـەی خـۆیان پێشکەش کـرد، بڕیاری لێبووردنی گشتی درا. کــات دوای نیــوەڕۆ بوو، دەروازەی بەندیخانەکەیان کردەوە و کـەرەکـانیـان بەرەڵلا کـرد. ئەو سەدەها کەرە پێکەوە بەڕاکردن و خزینە پاڵ یەک و لووشکە لێدان و هـەڵبــــــەزین و دابەزینـەوە بەبەردەم چاپخانەکەی مامۆستا گـیـو و دوکـانەکـەی مـەجـیـد پەقـلاوەچـیــیەوە بەرەو ناوبازار کـەوتنە رێ. سـەروسـیـمــایان خۆشی و سەرکەتن و سەربەرزی و شــــانـازیـــان لێ دەباری. خاوەنەکانیان بەناویانا بەربوون، هەریەکـــە لەمـبـــەر بۆ ئەوبەر رایدەکـرد لە کـەرەکـەی خـۆی دەگـەڕا و هەر کـە دەیدۆزییـەوە دەسـتی لە ملی دەکـرد و هـیـوا هەبوو مـــاچـیــشی دەکـــرد و فـرمـێـسکی بۆ هەڵدەڕشت و دەیچرپاند بە گوێیدا کەفارەتییە ئینشاڵلا.



دوکاندار و خەڵکەکە لەمبەر و ئەوبەری شەقامەکە وەستابوون سەیری ئەو کۆڕڕەوەیان دەکرد، بە پێکەنین و گاڵتە لە گەڵ یەکترا دەدوان. هەندێ گـەنج لەبەردەم دوکـانۆکـەکـەی مـام حـەیدەری پینەدۆز وەسـتــابوون بەو پەڕی ریزەوە دەسـتی خـۆیان بەرز، بە سـلاو و ریزەوە دەشـەکـاندەوە، پێـشـوازیی قـارەمـانانیـان لێ دەکردن.

کـــــەرەکـــانیش...ئەوەی خاوەنەکەی دۆزییەوە، ئەوە لێی خـوڕی و بردییـەوە.. ئەوانی تر لەناو سـووچ و کـۆڵانەکـانی ناو بـازاڕدا بـلاو بـوونـەوە و لـەنـاو خەڵکەکە توانەوە.

با ئەو رۆژە بکرێ بە ساڵیاد و جـــــەژن و رۆژی کـــــــەران کەرنەڤالی ساڵانەی بۆ سازبدرێ سێ رۆژ پشــــوویان بـدرێـتـێ نەختێ بحەسێنەوە.

# پیشەی ناڵبەندی لە کوردستاندا

عومەر لەتیف بەرزنجی

لە کوردەواری خۆماندا کار و پیشەی جۆراوجۆر هەبووە، خەڵکەکە هەم ژیان و گوزەرانی خۆی پێ بەڕێوە بردووە و هەمیش بەهۆی ئەم پیشانەوە کاتەکانی خۆی بەسەربردووە، بۆیە خەڵکەکە لەم پیشانەدا شارەزاییان پەیدا کردووە و هەندێک لەم پیشانەش بە چەندان جۆر و شێوە بەکارهاتوون، ئەم پیشانە پێویستییەکی ئەو کاتەی کۆمەڵگای کوردەواری بوون و چەندان کەسی پسپۆڕ و کارامەیان تێدا هەڵکەوتووە، کە بەهۆی بنەماڵەکانیانەوە ئەم کار و پیشە کوردەواریانەیان بۆ بەجێماوە و نەوە دوای نەوە بۆیان ماوەتەوە تا کۆمەڵگای کوردەواری پێویستی بە هەندێک لەم پیشانە نەماوە، بەڵام هەندێک کەسی کارامە تا ئێستاش هەر بە ناوی ئەم پیشانەوە بانگ دەکرێن و دەناسرێنەوە، یەکێک لەم پیشانەی کوردەواری خۆمان تا ئێستاش لە هەندێک لادێ و شوێنی دووری کوردستان ماوە، پیشەی (ناڵبەند)یە، کە مامەڵەکردنە لەگەڵ ولاغی بەرزە وەک ئەسپ و ماین و هێستر و گوێدرێژ.... بەگشتی ناڵکردنی ولاغی یەک سم کە پێویستییەکی ژیانی کوردەواری بووە، بەتایبەتیش لادێنشینەکان کە بێگومان ئەم ولاغانەش بەهۆی ئیش پێکردن و بارهەڵگرتنەوە پێویستییان بە ناڵکردن هەبووە، بۆیەش ئەم پیشەیە پەیدابووە و لە چەندان شوێن و ناوچەی جیاجیا هەبووە و کەسانی شارەزا و لێزانی بۆ دروست بووە... خاوەن ولاغ بۆ کار و پێویستی ژیانی خۆی یا بۆ کاری بازرگانی ولاغەکەی خۆی توند و بەند کردووە هەر لە پێویستی زین و لغاو و رەشمە و گوریس و کورتان و توورەگە و هەگبەوە بگرە تا هەموو پێداویستییەکانی ولاغ و، ساڵانەش ولاغەکانیان ناڵ دەکرد، بۆ ئەوەی لە رۆیشتن پەکی نەکەوێ و کارەکەی مەیسەر بێت، بەم شێوەیە کاروباری کوردەواری، بەتایبەتیش لە لادێدا بەڕێوەچووە، بێگومان ئەوەی کاری باش بەڕێوە چووبا دەبوایە ولاغی باش و بەهێز و تەواوی هەبێت ولاغی بە توانا و لێهاتووش، ئەو ولاغەبوو تەدارەکی تەواوی هەبێ... ئێمە بۆ لێدوان لەم پیشەیە، مام (جەوهەر بابە عەلی) دەدوێنین، کە بە مام جەوهەر ناڵبەند بەناوبانگە، ناوبراو لەدایکبووی (١٩٣٤)ە و خەڵکی گوندی (لهێبان)ی خورشید ئاغایە لە کەندیناوە، بۆیە سەرەتا لە پیشەکەیەوە پرسیارمان لێی کرد:

*** چۆن فێری ناڵبەندی بووی؟**

- من ئەم پیشەیە لە باوکمەوە فێر بووم، رەحمەتی باوکیشم لە باوکییەوە فێر ببوو، چەند پشتێک ئێمە ئەم پیشەیەمان کردبووە سەرچاوەی داهاتی بژێوی خۆمان.

*** ئەم پیشەیە چییە و چۆنە؟**

- ئەم پیشەیە، یەکێکە لە پیشە کوردەوارییەکان، لە لادێ کەم کەس هەیە لە جووتیارەکان ولاغی بەرزەی نەبێ و بۆ ناڵکردنیان ساڵی جارێک یان دوو جار پێویستی بە ناڵبەند نەبێ، لە هەندێ ناوچە بە تایبەت لە کوێستانەکان، ساڵ (١٢)ی مانگ ولاغ بەبێ ناڵ ئیدارە ناکات.

*** هەقدەستی ناڵکردن لەو سەردەمە چەند بووە؟**

- بە شێوەیەکی گشتی لەو سەردەمەدا پارە کەم بوو، زۆرینەی خەڵک ژیانێکی سادە و مام ناوەندییان دەگوزەراند، لەو کاتەدا ناڵکردنی ولاغی بەرزە (٤) درهەم بوو، بۆ گوێدرێژیش (٢) درهەم، لەگەڵ ئەوەش کەسانێک هەبوون توانای دانی کرێیەکەیان راستەوخۆ یان دەمودەست نەبوو، ناچار ناویانمان لە دەفتەرێک دەنووسی بۆ کاتی بەروبووم کۆکردنەوە.

*** چەند جۆرە ناڵ لە کوردستان بەکاردەهێنرا؟**

- ناڵ دوو جۆری هەبوو، جۆرێک (تەختە)یان پێدەوت و جۆری دووەم ئەڵقە (چەکوش کاری). جۆری یەکەم بن پێی ولاغەکەی

هەمــوو دەگــرتەوە و بزمــاررێژ دەکــرا، جــۆری دووەم ئەڵقــاوئەڵق بوو، لای دواوەی بەتاڵ و نەگەیشتبۆوە یەک، ســەرچاوەی ئەم دوو جــۆرە شــاری کــەرکــووک و مــوسڵ بوو، خــەڵکی ناوچە نەرمــانیــیــەکــان بە زۆری تەختــەکەیان بەکــار دەهێنا و ناوچە شاخاوییەکانیش ئەڵقە.

*** چۆن وڵاغ ناڵ دەکرا...؟**

- لە سەرەتاوە دەکەوتنە تاشینی ســمی وڵاغــەکــە تاکــو ناڵەکــە بە ڕێکوپێکی لەسەری دانیشی، ئەوسا ناڵەکەمان بە سمی وڵاغەکە دەگرت و بەراوردمان دەکردەوە، پاشان هەر لای (٣ - ٤) کــونی بۆ بزمــــار ڕێژی هەبوو، بەهۆی بزمــارەوە ناڵەکــە بە ســمــەکــەوە دەلکا، ئەوســا لێــوارە زیادەکەیان دەتاشی و ڕێکدەخرا.

**کەرەستە و ئامێرە پێویستەکانی نێلبەندی:**

پیــشــە نیــیــە بێ کــەرەســتــە و ئامــــێــــری تایبــــەتی بێ، بۆ ئەم پیشەیەش هەندێ کەرەستە هەبوون، کە لەمانە پێکدەهات:

**١- لەواشــە:** ئامــێرێکی لە دار دروست کــراو بوو، وەکــو فــاق، یان تەڵە لە لێــوی وڵاغــەکــە دەدرا و دەیتــاسـاند تاکــو ناڵکردنەکــە تەواو دەبوو.

**٢- گاز:** ئامێرێک بوو لە ئاسن دروست دەکــرا و لە شــێــوەی گــازی پینەدۆز، بە زۆری بۆ قرتاندنی سەرە بزمــــارە زیاد دەرچووەکــــان بەکــــار دەهێنرا.

**٣- سم تراش:** ئامــێــرێکی لە ئاسن دروســتکراو بوو، شــێــوەیەکی لاکێشی هەبوو، قەبارەی لە قەبارەی نــاو لــەپ دەچوو، دەسکــی ئــاســنــی هەبوو، بۆ تاشــینی ســمــەکــان بەکــار دەهێنرا.

**٤- سم بڕ:** ئامــێرێــک بوو لە سم تــاش دەچــوو، لــە ئــاســن دروســت کرابوو، لە سەرێکەوە دەسکی ئاسنی هەبوو، لە سەرێکەوە دەسکی دار، بۆ ڕێکخــســتنی لێــواری ســمــەکــان بەکاردەهێنرا.

**٥- بزمــــار:** بزمــــاری ناڵ، لە بزمــاری دی نەدەچوو، جــیــاواز بوو دەستکردی کووردچییەکانی کەرکووک بوو، هەندێ ئاسنگەری کــووردەچی هەبوون پیشــەیان هەر دروستکردنی ئەو بزمارانە بوو.

**٦- سندان - دەزگا:** ئامــێرێکی چوارگــۆشـــەی لە ئاسن داڕژاو بوو، بەرزی بســــتــــێــک دەبوو، زۆربەی کارەکــان بەهۆی ئەوەوە دەکــرا، لەلای سەرەوە کونێک هەبوو، بزمارەکانیان یەک لەدوای یەک تێ دەکــرد و یەکی چەکــوشــێکیــان پێــدا دەدا تاکــو سەرەکەی پان بێتەوە و بۆ بەکارهێنان بلوێ.

**٧- هەگــبــە:** زیاتر لە تووردەگــە دەچوو، تەواوی کــەرەســتــەکــانی ناڵبــەندی لەخــۆ دەگــرت، یان دەدرایە شان، یان دەخرایە سەر وڵاغ.

**ناڵکردن:**

لەســەر داواکــاری براگــەورەی دەڤــەرێک، هەواڵ بۆ ناڵبــەند ڕەوانە دەکــــرا، ئەویش بە خـــۆی و بە کەرەستەوە دەهاتە ئەو گوندە و لەبەر دیوەخان بارگەی رادەگرت و تەواوی وڵاغی ئەو گــوندەیان بۆ دەهێنا و بە یەک دوو ڕۆژ هەمــوویانی ناڵ دەکــرد، خـــواردنی چاک، پێــخـــەفی چاک، بەخێرهاتنی گەرم لە ناڵبەند دەکرا.

هەندێ لە ڕدێن سپی گوندەکــان لەوانەی مــام جــەوهەر هاتوچۆیانی دەکرد و لە داواکارییان دەرنەدەچوو:

١- خوالێخۆشبوو حاجی عەزیز خدر بسکان، لە گــوندی دارە خورما.

٢- خــوالێــخــۆشــبــوو ئیــبــراهیم ئەحمەد مامەسێنی، لە گوندی سەرگەڕان.

٣- خوالێخۆشبوو کوێخا سادق گابەڵەکە.

٤- هادی ئەحـــمـــەد ئاغـــای سەربەشاخ.

٥- خوالێخۆشبوو عەزیز پاشای عاڵلایی.

٦- خوالێخۆشبوو کانەبی حەوێز، لە گوندی چەغەمیرە.

**هۆکــارەکــانی کــەمــبــوونەوە و لەدواداني ئەم پیشەیە:**

وەکــو مــام جــەوهەر ئامــاژەی بۆ کـــرد، پەیدابوونی ئۆتۆمـــبــــیــل و تەراکتۆر و دەرِاسە و ... بوونە هۆی کەمبوونەوەی وڵاغی بەرزە، بەتایبەت لە ناوچە نەرمــانیــیــەکــان، بۆیە بۆ (٤٠) ساڵ دەچێ مام جەوهەر وازی لەم پیشــەیە هێناوە لەوانەیە هەر لە بیریشی نەمابێ.

**هەندێ لە ناڵبەندە ناودارەکان:**

هەر بوارێــک ســوارچاکی خــۆی هەیە، دەست و پەنجــەی ڕەنگینی هەیە، لە ناڵبەندە لێهاتووەکان.

١- وەســتــا حــەمــە شــەریف ئەڵلاوێردی ناڵبـــــەند لە هەولێر.

٢- وەســتــا ڕەئوف وەســتــا کــەریم ناڵبەند.

لەگەڵ کەمبوونەوەی وڵاغی بەرزە و بەرەو لەناوچوونیان، بەڵام لە ناوچە کوێستــانییەکان هەرماون و پیشــەی ناڵبــەندیش هەر بەردەوامــە، بەڵام کەمتر لە جاران.



# پێشبڕکێی کۆتر
# لە کوێتەوە هەتا هەولێر

**هێمن حەمید**

کۆتر ئەو باڵندە جوان و دڵڕفێنەیە، کە مرۆڤ بە دیتنی سەرسام دەبێت، باڵندەیەکە هەرچەند بڵێی روحسووکە و مرۆڤ گەلێک جار تا ئەو رادەیەی عاشقی دەبێ، بۆیە بەخێوکردنی ئەم باڵندەیە لە هەموو کوردستان و بەتایبەت لە شاری هەولێر دیاردەیەکی بەرچاوە و خەڵکانێکیش هەن زۆر خولیای کۆتر بەخێوکردنن و کۆتر بۆتە بەشێک لە ژیانیان، بۆ ئەم مەبەستە سەردانی چەند کۆتربازێکمان کرد و چەند پرسیارێکمان لێکردن.

*** ئەم خولیایە چییە وای لێکردوون کە کۆتر بەخێو بکەن؟**

ئیدریس حوسێن (تەمەنی ٣٨ ساڵە) دەڵێ: ئەم خولیایە هەر لە منداڵییەوە لام دروست بووە و تێکەڵ بە خوێنم بووە، کۆتر بابەتێکە، ئارەزووییکە و مەرەقە، جۆری کۆتریش بە کەسان دەگۆڕێ هەر کەسە و حەز لە جۆرە کۆترێک دەکات، هی وا هەیە حەزی لە کۆتری تەقڵەبازە، هی واش هەیە حەزی لە کۆتری ئەو جۆرانەیە کە زۆر دەفڕن، بەڵام بە گشتی من حەزم لە کۆترە، نەک هەر من هەموو ئەو کەسانەی کە کۆتر بەخێودەکەن لایان دەبێتە مەرەق و ناتوانن بە ئاسانی وازی لێبهێنن، سەرەڕای ئەمەش کۆتر بەخێوکردن ئێستا بژێوی ژیانیشم بۆ دابین دەکات،

چونکە من لە دوکانێکدا کۆتر دەفرۆشم، هەرچەندە پێم ناخۆشە، کە بازرگانی بە کۆتر بکەم، زۆرجار هەست دەکەم ئەوانەی، کە کۆتر دەکڕن ئازاری ئەو باڵندەیە دەدەن، چونکە نرخ و بەهای نازانن، بۆیە ئەگەر ئیشێکی باشتر هەبوایە، ئەم کارەم نەدەکرد، تەنها لە ماڵەوە بەدڵی خۆم چەند کۆترێکم رادەگرت.

*** سەبارەت بە جۆری کۆترەکان و کامەیان گرانبەهایە؟**

جەمال رەزا روونی کردەوە: کۆتر جۆری زۆرە، بەڵام ئەوەی داخوازی لەسەرە کۆتری عەردییە، وەک عەمبەری و زازل و نەجەف، کە ئەمانە زۆر بە قیمەتن و خەڵکانێک هەن لە ماڵەوە رایاندەگرن، زیاتریش بۆ پێشبڕکێ رایاندەگرن، کە ساڵانە ئەم پێشبڕکێیانە دەکرێت. خەڵکی دیکەش هەن کۆتری جۆراوجۆر رادەگرن، کە لە رووی نرخەوە زۆر هەرزانن، بەڵام ئێمە زیاتر ئەو کۆترانە رادەگرین، کەوا نرخیان گرانە.

کۆتربازە بەناوبانگەکانی هەولێرێ، کە زۆر کۆنن لەوانە: مام ئەسکەندەر کوورەچی، حاجی خورشیدیش کۆتری زۆر بوو و عەبدولخالیق چەلەبی و مام حەسەن هیدۆش کۆتری زۆر نایابی هەبوو، لە ئاغاکان: مام داوود ئاغا بەخێوی دەکرد، بەراستی پیاوی گەورە وەک وەزیرەکان و پاشاکان و بەگ و ئاغا و ئەم جۆرە پیاوانە، کۆتریان بەخێو دەکرد، بەڵام ئەمڕۆ کۆتربازی بۆتە گاڵتەی منداڵان.

*** سەبارەت بە پێشبڕکێی کۆتر کە ساڵانە دەکرێ؟**

کاک ئەمجەد محەمەد دەڵێ: من ٤٠ ساڵە کۆتری بەخێو دەکەم و ئێمە کۆتری نایاب رادەگرین، لەگەڵ چەند برادەرێکیش ئەم ئارەزووەمان هەیە، خۆمان پێ خەریک کردووە، سەبارەت بە گرانبەهایی کە کۆتری وا هەیە هەزار دۆلار تا ٢ هەزار دۆلاری پێدراوە و پێشبڕکێیەکە لەسەر سنووری کوێت ئەنجام دەدرێت، کە سێ ساڵ لەمەوبەر کۆتری "کاک زرار" یەکەم بوو، ساڵی دوایی کۆتری "کاک غانم حەداد" یەکەم بوو، ساڵی پاریش کۆتری "کاک کەریم فەتحی" یەکەم بوو، کە ئەمانە لەسەر سنووری کوێتەوە گەڕانەوە هەولێر، ئەم جۆرە کۆترانە زیاتر بە کۆتری (زازڵ) بە ناوبانگن بۆ ئەم پێشبڕکێیە.

هەرچی پێشبڕکێی دووەمە ئەوەیان بۆ مانەوە و (کاتە) واتە چ کۆترێک زۆرترین کات لە ئاسمان دەمێنێتەوە، ئەم ساڵ کۆتری "کاک فاخیر" یەکەم بوو، کە بەیانی زوو هەڵماندا و ئێوارەی درەنگ پاش مەغریب نیشتەوە.

دیارە هەر لە دێرزەمانەوە ئەم جۆرە پێشبڕکێیانە هەبووە، کە پاشا و میرە گەورەکانیش بەشدارییان تێدا کردووە، جگە لەوەش کۆتر وەک نامەبەر بەکارهاتووە کە چەندین مەملەکەتیان بڕیوە تا نامەیان گەیاندۆتە شوێنی مەبەست، هەر لە کۆنەوە کۆتر هاوڕێیەکی نزیکی مرۆڤ بووە و لەتەک مرۆڤ ژیاوە، بۆیە پێویستە ئێمەش ئەمڕۆ، قەدری ئەم گیانەوەرە هەستیارە بزانین و بە شێوەیەکی جوان و ناسک رەفتاری لەگەڵدا بکەین.

# راوەکەو لە چیای قەرەچووغ

**جەلال سنجاوی**

**بەرایی:**

بەهۆی جوانی سرووشتی کوردستان و دلڕفێنی کەش و هەوایەکەی و ئەو برە زۆرەی باران و بەفر کە سالآنە لێی دەبارێ، بۆیە لە ناوچە جیاجیاکانی کوردستان ژمارەیەکی زۆر لە مامز و بزنە کێوی و کەروێشک و سمۆرە و گەلێک ئاژەڵی کێوی دیکە و هەزاران کەوی گەردن بەخاڵ و سوێسکە و پۆڕ و قولینگ و باز و شەهێن و هەڵۆی بەرزەفڕ، دیمەنێکی هەرە جوانیان بە کوردستان - وڵاتی کوردان - بەخشیوە و وەک سامانێکی گرانبەهای نەتەوەیی وڵاتی ئێمەیان دەوڵەمەند کردووە و ناکرێ دەستبەرداریان بین و ناحەزانە مامەڵەیان لەگەڵدا بکەین، بەڵکو میوانی ئازیزی ئێمەن و پاراستنیان لە ئەستۆی هەموومانە، بەڵام بەداخەوە تا ئێستاش راوکردنی باڵندە و ئاژەڵی کێوی لە کوردستان بەردەوامە و راوچییەکانیش لە کاتی راودا زۆر رێگا و چەکی کوشندە بەکار دێنن، کە پێویستە بە پێی یاسا سنوورێک بۆ راوکردن و کوشتنی ئەو ئاژەڵە دەگمەنانە دابنرێ، کە هەندێکیان ژمارەیان ئەوەندە کەم بۆتەوە،-خەریکە بەرەو قات و قڕی و نەمان دەچن.

بەهەرحاڵ وەک ئاماژەمان پێدا، راوکردن لە شوێنە جیاجیاکانی کوردستان درێژەی هەیە، هەر وەک لە چیای قەرەچووغی باشووری دەشتی هەولێر دەبینرێ، بەتایبەتی راوی (کەو) لە قەرەچووغ بۆتە جێگای مشتومڕو کێبڕکێی راوچیان: چونکە ئاشکرایە کەوی قەرەچووغ رەنگی سپییە و بە قەبارە گەورەیە و لە شەڕە کەویش لە کەوەکانی دیکە ئازاتر و بوێرترە و قازانج و داهاتێکی باش بۆ خاوەنەکەی مسۆگەر دەکات لە کاتی شەڕەکەودا، هەروەک لە چایخانەی (کەوبازان) لە هەولێری پایتەختدا دەبینرێ.

**راوەکەو لە قەرەچووغ**

چیای قەرەچووغ، دەشتی کەندێناوە و قەراج لە یەکتر جیا دەکاتەوە و لە رۆژهەلآتی بە کلکەی دارە بزماران (قەرەبێتک و قەرەبۆتکان) دەست پێدەکات و لە رۆژئاواش لە دەربەندی بازرگە کۆتایی پێدێت، ئینجا بەرزاییەکانی مەلەک ئاغا دەست پێدەکات تا دەگاتە کلکەی میجانی درێژ دەبێتەوە.

بەگشتی قەرەچووغ چیایەکی کەم ئاو و وشکە، بەڵام لە بەهاراندا وەک بەهەشتی رازاوە بەگوڵ و گوڵزار و باڵندە و پەپوولەی رەنگین خۆی دەنوێنێ، بۆیە لە دەشتی شەمامک و سەنیە و مولکیە و کەندێناوە و قەراج، مەڕداران رووی تێدەکەن و راوچییەکانیش لە هەموو لایەکەوە میوانی بەردەوامی ئەشکەوتەکانی ئەم چیایەن و بەزۆری لەم ئەشکەوتانە کاتیان بەسەر دەبەن:

١- ئەشکەوتی جارەڵلا. ٢- ئەشکەوتی دووکوون. ٣- ئەشکەوتی بێ بن. ٤- ئەشکەوتی دلۆیە.

کەو باڵندەیەکی دەگمەن و

خنجیلانە و جوان و دەنگ خۆشە، بەژن و باڵای بچووک و نزمە و بە راوەستان نزیکەی (١٥)سم دەبێ و درێژییەکەی لەسەری تا کۆتایی کلکی لە نێوان (٢٥ - ٢٨)سم دەبێ.

کەوەکانی گەرمەسێر بەتایبەتی لە چیای قەرەچووغ و ژەنگار و قەرەداغ و سەگرمە لە (١٣)ی مانگی ئاداردا دەست بە هێلکە کردن دەکەن، کەو زۆر هێلکە دەکات، پاش کورک بوون و هەڵهێنان جوجەڵەکانی بە دوای خۆیدا دەگێڕێ و فێرە خواردنیان دەکات تا (٢٠) ڕۆژەی تەمەنیان، لە پاشان سەربەست دەبن و (گەنم و جۆ و ماش و هەرزن) و دانەوێڵەکانی دیکە دەخۆن و بەرەبەرە لە دایکیان جیا دەبنەوە و دادەبڕێن.

کەو زۆر جۆری هەیە، دیارترینیان ئەمانەن:
١- بارەکەو: واتە کەوی تەمەن یەک ساڵ.
٢- شابارِ: کەوی تەمەن دوو ساڵ.
٣- خرتەکەو: کەوی تەمەن سێ ساڵ.
٤- سەرەکەو: کەوی تەمەن چوار تا پێنج ساڵ.
٥- پیرەکەو: کەوی گەورەتر لە پێنج ساڵان.

**چۆنیەتی راوەکەو لە قەرەچووغ**
لەم چیایە راوەکەو لە ناوەڕاستی وەرزی (پایز)دا دەست پێدەکات، بەتایبەتی کە یەکەم باران دەبارێ و گیا لە چیا و دۆڵەکانی شین دەبێ، ئینجا کەوەکان بەدوای خۆراک دەگەڕێن و تێر گیای پایزە دەخۆن، لە پاش هەفتەیەک راوچییەکان خۆیان ئامادە دەکەن و هەموو پێداویستییەکانی نووستن و جلوبەرگ و خواردن و کەلوپەلی راو لەگەڵ خۆیان هەڵدەگرن و بەرەو ئەشکەوتەکانی چیای قەرەچووغ دەکەونە رێ و چەندەها شەو لەم ئەشکەوت و کێوانە بە راوکردن کات بەسەر دەبەن.

جاری وا هەیە راوچی لە موسڵ و دەوروبەری و لە چیای ژەنگاریش بۆ راوەکەو هاتوونەتە چیای قەرەچووغ، چونکە کەوی ئەم چیایە خەسڵەت و تایبەتمەندی خۆی هەیە و هەندێ ئەدگاری لە کەوەکانی دیکە جیایە.

ئەو راوچیانەی بەردەوام ساڵانە راویان لە چیای قەرەچووغدا دەکرد ئەمانە بوون:

(مام حەوێزی جوکل ئاغای دزەیی، ئەحمەد مەولودی قەراتە سۆری مەرزان، حوسێنی عەلی خورشید ئاغای قەپلانی، مام جەباری کەریم سێ تیری دەرماناوەیی، مام وسوی دەرماناوەیی، دەروێش عەولای خەزارێ، عەلی شەریف مام حوسێن، عومەری مەولود عەدێی عالڵایی، مام سمایلی مامەسێنی سەرگەران، عەلی کوڕ، فەیسەڵی عەلی رەش و رەحمانی حەسەنی، شەعەلی و... هتد).

**راوچییەکان بەم ڕێگایانە راوەکەویان دەکرد:**

**١- راوەکەو بە (کەوی رەبات):**

راوچییەکان ئەو کەوەی کە مەشقیان داوە و فێرە راویان کردووە پێی دەڵێن (کەوی رەبات)، جا ئەم کەوە لە شوێنی مەبەست لە دارێک یان بەردێک دەبەستنەوە، پاشان دەوروبەری بە کۆمەڵە داوێک ڕێکدەخەن، کە هەموویان زیاتر لە (١٥٠) هەڵقەیان هەیە، ئینجا راوچییەکە دوور دەکەوێتەوە و لە پەنا درەختێک یان رەوەزە بەردێک خۆی دەشارێتەوە و کەوی رەباتیش دەستدەکات بە خوێندن (قاسپە قاسپ)، ئینجا کەوەکان گوێیان لە دەنگی دەبێ و دەورەی دەگرن و دەیکەن بە شەڕە دەنووک لەگەڵ کەوی رەبات، پاشان هەندێکیان بەداوەوە دەبن و ئەوانی دیکەش دەفڕن و کاکی راوچیش دێ کەوەکانی بەداووەبووی لێدەکاتەوە و لەناو قەفەسیان دادەنێ.

**٢- راوەکەو بە دوو کەو (رەبات و سەردار):**

کەوی رەبات بە دارێک دەبەسترێتەوە و دەوروپشتی بە زیاتر لە (٢٠٠) قەف و هەڵقە دەتەنرێتەوە، ئینجا کەوی دووەم (سەردار) کە لەناو قەفەس دایە لە جێگایەکی بەرز دادەنرێت و

دەوروبەریشی بە بەردی پان دەگیرێت تا کەوی (رەبات)ی لێ دیار نەبێت، کە تەنها سێ مەتر لێی دوورە. راوچییەکەش خۆی دەشارێتەوە، ئینجا کەوی سەردار دەست بە قاسپە قاسپ دەکا و کەوی رەباتیش وەڵامی دەداتەوە بە جۆرێک دەنگیان ئەو ناوە پڕ دەکات، لەم کاتەدا کەوەکان دەورە لە کەوی رەبات دەدەن و دەبێتە شەڕە دەنووک، بەڵام کەوی سەردار هەر دەخوێنێ، لەم کەین و بەینەدا (٤ - ٥) کەو بە جەلەداوەکەوە دەبن و راوچییەکەش بە ئاسانی راویان دەکات.

**٣- راوەکەو بە تەپکە:**

لە زستاندا بەهۆی بەفر و باران زەوی دادەپۆشرێت و دانەوێڵەی باڵندەکان نامێنێ، بۆیە کەوەکان روو دەکەنە پەنا شاخ و رەوەزە بەرد و ناو ئەشکەوتەکان بەدوای جێگای گەرم و دانەوێڵە پەیدا کردن.

راوچییەکان لەم جێگایانە تەپکە دادەنێن و هەندێ کا و دانەوێڵەی لەبن روو دەکەن و کەوەکان دەکەونە بن تەپکە بەردەکان و راوچییەکان دەیانگرن.

**٤- راوەکەو بە چرێش (سمغ):**

سمغ لە رووەکی تاڵە بنێشت دەردەهێنرێ و لەم شوێنانە دادەنرێ، کە راوکەر بە مەزندەی خۆی بە شوێنی حەوانەوەی کەو و سوێسکەی دەزانێ، ئەم چرێشە ئەوەندە چیڕ و بەهێزە قاچی هەر باڵندەیەک بگرێ بەری نادات، ئینجا رۆژی دوایی راوچییەکە دێت و هەرچی باڵندەی گیرتبێ بە ئاسانی لێی دەکاتەوە و دەیبات.

**٥- راوەکەو بە دیوجامە:**

بریتییە لە قوماشێکی رەنگ زەردی خاکی و بە رەنگی کەسک و سوور و شین وێنەی باڵندە و گیان لەبەری بچووکی لەسەر نەخش کراوە، راوچییەکە ئەم قوماشە وێنەدارە دەداتە پێش خۆی وەک سینگ پۆش ئینجا بەرەو رووی دێن و راوچییەکەش لە کونێکی بچووک تەقەیان لێدەکات و کەو و سوێسکە و ئاژەڵی دیکە دەکوژێ و راویان دەکات.

**کورد و کەو**

کورد ئەشقی هەموو باڵندە جوان و دەنگ خۆشەکانە، لە ریزی هەرە پێشەوەیان بولبول و کۆتر و کەو، دیارە کەو لە نێوانیاندا بە پلەی یەکەم دێت، چونکە باڵندەیەکی جوان و هێمن و دەنگ خۆشە و لە هەمەوو ناوچەیەکیش دەست ناکەوێ، پیاوی وا هەیە بە درێژایی تەمەنی هەر کەوی بەخێو کردووە و بە نرخێکی زۆریش کەوی کڕیوە، لەم شارە دێرینەی پیرە (هەولێر) هەن کەو بەخێو دەکەن و پێیان دەڵێن کەوبازەکان، تەنانەت لە گەڕەکی تەیراوە چایخانەیەکی تایبەت بە خۆیان هەیە، کە چایخانەی وەستا عەبدولوەهابە و شوێنێکی تایبەتی هەیە بۆ شەڕە کەو.

کەو لە فۆلکلۆری کوردیشدا شوێنێکی تایبەت و پیرۆزی هەیە و لە حەکایەتە خورافییەکان و پەندی پێشینان و قسەی نەستەق و حەیران و هۆنراوە فۆلکلۆرییەکاندا باس کراوە و بە هەند هەڵگیراوە.

فۆلکلۆر دەڵێ:

**دوو کەو لە قەفەس گفتوگۆیانە**<br>
**باسی دڵداریی من و تۆیانە**

* * *

**دوو کەو دەخوێنن لە باسکە باسکان**<br>
**دەبا تێکەر کەین سمێر و بسکان**

* * *

**کەوێ لە چیای دەربەندی**<br>
**گوور بووی لە باغم چاندی**<br>
**لەبەرچاوم زۆر رەندی**

* * *

**وەک کەوی قەفەس داد بێداد دەکەم**<br>
**گشتی بۆ تۆیە وا فریاد دەکەم**

* * *

حەسەن زیرەکیش لە گۆرانییەکیدا دەڵێ:

**قاسپە قاسپی کەو دێ**<br>
**کەو لە بناری گردێ**<br>
**کەو و کەوباز دەخوێنێ**<br>
**لەنێو ئیزاعەی کوردی**

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر، ژمارە ٧، ساڵی ٢٠٠٥ بڵاوبۆتەوە.

# کەو و کەوبازانی هەولێر

مەولود خدر مەولود

کەو مێژوویێکی کۆنی هەیە لە کوردستان، کە کۆنییەکەی لەگەڵ کۆنی هەبوونی مرۆڤە، شاخەکانی ئەم کوردستانە هەر لە زووەوە باوەشی بۆ مرۆڤ و گیانلەبەر و باڵدار و زیندەوەر کردووتەوە، کەویش یەکێکە لەو باڵندە دەنگ خۆش و جوانانەی کە لەگەڵ مرۆڤ پێکەوە شاخەکانیان ئاوەدان کردووتەوە و سەروکاریان لەگەڵ یەکدا هەبووە و ژیان و جوانییان بەم ناوچەیە بەخشیوە. کەو یەکێکە لە جوانترین ئەو شاکارانەی کە یەزدانی مەزن بەناوچە شاخاوییەکانی کوردستانی بەخشیوە. (کەو) دەنگی هەتابڵێی خۆش و دڵفرێنە، خاوەنی لەش و لارێکی زۆر جوان و سەرنج راکێشە.... حەز بەجێگای فێنک و ئاشقی بناری چیا سەرکەشەکانی کوردستانە و لە بنارانیش دەژی.

کەو مەخلوقێکی جوان و گەردەن بەخاڵە و دەنووک و قاچەکانیشی سوورن، لە رۆیشتنیشدا لەنجەو لارێکی دڵگیری هەیە و سەرنجی مرۆڤ بۆ لای خۆی رادەکێشێت، لە چەند دێرێکی شیعری فۆلکلۆریشدا هاتووە:-

**دوو کەو دەخوێنن لە باسکە باسکان**
**دەبا تێکەر کەین سمێر و بسکان**
**دوو کەو لە قەفەز گفت و گۆیانە**
**باسی عەشقەکەی من و تۆیانە**

هونەرمەند حەسەن زیرەک لە یەکێک لە گۆرانییەکانی دەڵێ:

**قاسپە قاسپی کەو دێ لەبناری گردی**
**کەو و کەوبار دەخوێنێ لە نێو نیزاعەی کوردی**

هەروەها ئیبراهیم بارزان کۆیی دەڵێ:

**یا کەو لە نێو کێوا شادی**
**ئەزی لە چۆڵی ئازادی**
**بەیانی کە هەستام لەخەو**
**دەنگی تۆم دەبیست لە شاخی**

**

**یا کەو لە کێوی شێخ زەردە**
**لە رازی بەرزی هەر بەردە**
**دێ دەنگی (دوو بانگی) خۆشت**
**عەجەب لەم قورگە بێ گەردە**

**

**یا کەو لە کێوی سامرەندی**
**یا لە قەندیل سەر قەندی**
**یا وێڵی بەندی شامەندی**
**یا بەندی دیوان سەهەندی**

**

**یا کەو لە کێوی کوردانی**
**یا زیرەکی لە بۆکانی**
**کە هەڵئەدەی دەنگ و سەدا**
**کوردان ئەهێنییە گۆرانی**

**پێناسەیەکی کەو:**

کەو باڵندەیەکی جوان و پەڕ نەخشینە و بەخەت و خاڵە، دەنووک سوورە، لە بناری چیا و ناوچە شاخاوییەکاندا دەژی.. ئەگەر خاوەنەکەی لێزان بێت ئەوا زوو دەستەمۆ دەبێت.

**راوەکەو**

راوەکەو و کەوبازی: جاران لە کوردستان باو بوو،

بەتایبەتی راوە کەو، کە خەڵکێکی زۆری سەرقاڵ کردبوو، بەڵام بەداخەوە لە ئەنجامی زیاتر باوبوونی ئەم دیاردەیە و رەفتاری هەندێک کەسی گێرەشێوێن کەوێکی زۆر لە کوردستاندا بەتایبەتیش لە بناری چیایەکان و لە ناوچە شاخاوییەکاندا دووچاری کوشتن و قڕکردن و ئاسمیلە و راوکردن و کوشتن و برین بوونەوە و بە ساچمەی پەرت هاوێژ ئەم گیانلەبەرە بەستەزمانە دوای زامدار بوونی خۆی دەنایە پاڵ بەردێک و بە زامداری، دوور لە دیدەی خاوەنەکەی یاخود راوچییەکەی لەپاڵ بەردەکە سەری دەنایەوە. ئەم جۆرە کرداره نارەوایانە، بوونە هۆی لەناوبردنی ئەم گەنجینە و سامانە بەنرخەی وڵاتەکەمان.

**راوەکەو چۆن دەکرێ**

لە ناوەراستی مانگی شوبات کەو جووت دەبن، هەر جووتێک شوێنێکی دیاری کراو بۆ خۆی هەڵدەبژێرێ بۆ ئەوەی زاوزێی لێبکات، ئەو شوێنە بە خاک و نیشتیمانی خۆی دەزانێ، راوچییەکان وەک پیشەی هەمیشەیی، کەوە ماڵەییەکانی خۆیان دەبەن لە ناوچەیەکی شاخاوی یان لێواری کانییەکان یەک لەو شوێنەی، کە خۆیان مەبەستیانە راوی تێدابکەن دایدەنێن... کاتێک ئەو کەوە (ماڵییە) چاوی بەو دەشت و چیا و شاخانە دەکەوێ هەستی دەبزوێ بۆ ئازادی و سەربەستی دەخوێنێ، بە گڕ و تینێکی زۆرەوە، کاتێک ئەم کەوانەی لەم ناوچەیە دەژین گوێبیستی ئەم دەنگە بیانییە (واتە کەوە ماڵییەکە) دەبن بە پەلە بە پیری ئەم دەنگەوە دەچن، بۆ ئەوەی لە سنووری خاکی خۆیان دەری بکەن و ئەم ناوەی لێ پاک بکەنەوە. راوچی، (فێلباز)یش چوار دەوری ئەم کەوەیان کردووە بە داو... یەکسەر بەداوەکەوە دەبن و راوچییەکانیش بەپەلە بۆیان دەچن و لە داوەکەیان دەکەنەوە و دەیانخەنە ناو (تووڕەگە)ی تایبەتەوە، دەیانهێننە شار یان ئەوەیە دەیانفرۆشن یان بۆ خۆیان رایدەگرن و بەخێوی دەکەن.

**روونکردنەوەیەک لە هەڵوێستی کەو بۆ مێژوو**

زۆر جار گوێمان لێ دەبێ یان بە بەر چاومان دەکەوێ لە گۆڤار و نامیلکەکان.. گوایە کەو ئەو باڵندە جوان و نیشتمان و خاکپەروەرە، (خۆ خۆرە) واتە خائینە، خیانەت لەگەڵ رەگەزی خۆی دەکات، بەڵام من بەدڵنیاییەوە بۆ ئاشقان و هەوادارانی کەو دەڵێم: کەو هێما و نیشانەی میللەتی کوردی نەبەردە، کورد لەهەر شوێنێک بێت ئەو شوێنە کەوی لێ دەژی.. کەو لە نیوەی مانگی شوبات جووت دەبن و هەر جووتێک شوێنێکی سنووری دیارکراو بۆ خۆی تەرخاندەکات بۆ ئەوەی هێلانە و هێلکەی تێدا بکات، ئەو شوێنەش بە نیشتمانی خۆی دادەنێ.. ئێمەی راوچیش کەو لە ماڵەوە دەبەینە ناوچە شاخاوییەکان لەو شوێنەی کە مەبەستمانە دای دەنێینەوە.. (داوی راو) لە دەوروبەری دادەنێین هەرکاتێک ئەو کەوە (ماڵی)یە چاوی بەکێو و شاخ و درەخت کەوت هەست بە خۆشی و ئازادی دەکات، دەست بە خوێندن دەکات بۆ ئازادی.. بۆ سەربەستی.. بۆ خۆشی...، کەوە کێوییەکانی شاخ هەر کە گوێیان لەو دەنگە بیانییە، واتە (غەریبە) بوو. بەپەلە بۆی ئەچن بۆ ئەوەی ئەو کەوە بیانییە لە سنووری خاکیان دەربکەن، ئێمەی راوچی فێڵبازیش داومان لەدەوروبەری کەوە (ماڵی)یەکە چەقاندووە، کەوی شاخ کە چاوی بە کەوە بیانییەکە کەوت پەلاماری دەدات بۆ ئەوەی دەریبکات لەسەر خاکەکەی.. یەکسەر بەداوەکەوە دەبێت.

جا لێرەدا بۆ ئاشقان و هەوادارانی کەو و کەوبازی روونی دەکەمەوە کە خوێندنی کەوی یەکەم واتە کەوە (ماڵی)یەکە، بۆ ئازادی و سەربەستی بوو.. خوێندن و پەلاماردانی کەوی دووەم واتە (کەوی شاخی) بەرگرییە لە شوێن و نیشتمانی خۆی.

هەروەک میللەتی کوردی قارەمان چۆن دەیان ساڵ خەباتیان کرد و سەدان شەهیدیان دا بۆ بەدەستهێنانی ئەو ئازادی و سەربەستییەی کە ئێستا تێیدا دەژین.. هەر کاتێکیش دیتی دوژمنان دەستدرێژی بۆ خاک و نیشتمانی دەکەن یاخود مافی چارەنووسی کورد پێشێڵ دەکەن.. ئەوا کورد بە تێکرایی.. بەیەکریزی بە خۆبەخت کردن لە پێناو ئەو خۆشی و سەربەستی و ئازادییەی، کە ئێستاکە بەخۆوەی دەبینین دوژمنان لەناو دەبەن، کەویش هەروەها وەک میللەتی کورد

هەرکاتێک دیتی (خاکەکەی) لە مەترسی بێگانە دایە پەلاماری ئەدا و بەهیوای ئەوەی لە شوێنەکەی خۆی دەریبکات.
ئەوە هەڵوێستە خیانەت و ناپاکی نییە بەرامبەر بەردگەزی خۆی، بەڵکو هەوڵە.. کۆششە.. خەبات و بەرگرییە..، لە شوێن و نیشتمانەکەی.

## جۆرەکانی کەو

بە شێوەیەکی گشتی کەو دوو جۆری هەیە:-
١- کەوی رەش.
٢- کەوی سپی

## کەویش دڵداری دەکەن

بەڵێ.. کەویش دڵداری دەکەن، زۆر جاریش نێرەکەو لەسەر ماکەو بەشەڕدێن، چونکە کاتێک ماکەوەکانیان لە سەر هێلکە کورک دەبن و چەند ماکەوێکی کەم دەمێنن، لەسەر ئەم ماکەوانە بەشەڕدێن زۆر جاریش نێرەکەوێک حەزی بچێتە سەر ماکەوێک لە سەرەتادا بۆی دەخوێنی و پاشان لەسەری دەسووڕێ و بەردەوام دەبێت لەسەر سوڕانەکەی هەتا ماکەوەکە سەری دەداتێ و وەڵامی دەداتەوە و لە گەڵی جووت دەبێ. کەو بە شێوەیەکی گشتی لە سەرەتای مانگی ئادارەوە دەست پێدەکەن بە هێلکە کردن و ئەگەر خاوەنەکەیان جێگا و شوێنی تایبەتیان بۆ دانێتەوە ئەوە لە ماوەی (٢١) رۆژ هێلکەکان هەڵدەهێنێ. زۆر جاریش ماکەو بەدزی نێرەکەو هێلکە دەکات و دەیشارێتەوە، چونکە نێرەکەو بەم کارەیان بەو دانانی هێلکەیە بزانێ شوێنەکە و هێلانەکە تێکدەدا. هێلکەکانیش دەشکێنێ، لەبەرئەوەی نێرەکەوەکان حەزناکەن ماکەوەکانیان بەم کارە سەرقاڵبن و لێیان دوور بکەونەوە، بەڵام زۆر جاریش بەپێچەوانەوە هەندێکیان یارمەتی ماکەوەکانیان دەدەن، بەنۆرە دەکەونە سەر هێلکەکان و کورک دەبن..
کەو بە هیچ شێوەیەک کوێستان و گەرمیان ناکات، چونکە هەر جووتە کەوێک یان هەر رەوەیەک مەوتەن (شوێنی تایبەت بە خۆیان) و سنووریان هەیە و مەسافەیەکیان داگیرکردووە. هەندێک جاریش وادەبێ ئەم سنوورە دەبەزێنن، بەڵام بەشێوەیەکی کەم، ئەگەر بێت و باسی کاتی خوێندنی کەویش بکەین، ئەوا کەو لە چەند کاتێک دەخوێنێ، لەوانە:- لە کاتی شەڕدا ئەگەر بیەوێت لەگەڵ کەوێکی دیکە بەشەڕبێ. ئەگەر ماکەوەکەی لێ دابڕێت و لێ ون بێت، هەروەها بۆ رەوەکەی خۆی دەخوێنێ ئەگەر لێیان دابڕێت، زۆر جاریش لە بێزاری و بێ عدووری و ناگزووری خۆی دەخوێنێت و غەمباری و بێ تاقەتی خۆی نیشاندەدات.

## خواردنی کەو

ئەگەرچی خواردنی سەرەکی کەو (گەنم)ە، بەڵام زۆر لە کەوبازان هەن (هەرزن و ماش)یان دەدەنێ بۆ ئەوەی قەڵەو بن، هەروەها کەوبازەکان بەنیازی زیاتر (خورت) بوون و زووتر هەڵسانی نێرەکەوەکان گیای (تاڵیشک) دەدەن بەکەوەکانیان.
بەشێوەیەکی گشتیش کەو هاوینان کەم ئاو دەخواتەوە، ئەویش لەبەرئەوەی هاوینان جۆرە گیایەک دەخوات پێی دەڵێن (گڵێخە) و گیایێکی زۆر تەڕو بە ئاوە، تینووی کەو دەشکێنی و ئاو کەمدەخواتەوە..

## کەوی دەستباز

کەوی دەستباز واتە (کلۆ دەشتە)... لە بێچوواتی بەخێو کراوە، ئەو کاتە هەڵدەستێت دەبێتە دەستباز و بە دەنووک و باڵەکانی لە خەڵک و خاوەنەکەی دەدات، ئەگەر یەکێک دەستی بۆ ببات بەدەنووک لە دەستی دەدات و بریندای دەکات.. ئەگەر یەکێک غار بدات کەوی دەستباز بەدوای دەکەوێت و وازی لێ ناهێنێت، بۆ خوێندنیش هەموو کاتێک ئامادەیە، هەر کاتێک چاوی بە یەکێک بکەوێت دەست بە خوێندن دەکات.. کەو هەیە تەنیا ئولفەتی بە خاوەنەکەی گرتووە و دەستبازی لەگەڵ خاوەنەکەی دەکات، بەڵام هەندێکیان دەستبازی لەگەڵ منداڵان و هەندێکیشیان تەنیا لەگەڵ ئافرەتان دەستبازی دەکەن.

## کەو لە ماڵەوە زاوزێ دەکات

بۆ ئەو کەوانەی کە لە ماڵەوە زاوزێ دەکەن پێویستیان بەرێ و شوێنی فراوان هەیە وەک باخچە و

حەوشەی گەورە.. جووتە کەوێکی نێر و مێی (ماڵی) لە ناو باخچە و حەوشە بەرەڵلا دەکەین و نێرە کەوەکە لە بەهاردا هەڵدەستێ و چەند جارێک دەچێتە سەر پشتی ماکەوەکە، دوای ماوەیەک ماکەوەکە جێگایەک بۆ خۆی ئامادە دەکات و هێلکەی لێدەکات هەتا هیچ هێلکەی پێ نامێنیت.. ئینجا هەتا ماوەی (٢١) رۆژ لەسەر هێلکەکان کورک دەبێت و لەو حاڵەتەشدا کەوەکان پێویستیان بە رێ و شوێنی تایبەتی هەیە وەک لە پێشتریشدا باسمان کرد، وەک: دانەوێڵەی تایبەت و کوللە و پەپوولە و شارە زەرگەتە و شتی دیکە.

**کەو رقی لە قەفەزە**

بەڵێ، کەو ماوەیەک هەست بەبەندی دەکات و رقی لە قەفەز دەبێتەوە، بەڵام دوای ماوەی چەند مانگێک خۆی لەگەڵ قەفەز دەگونجێنێت، وای لێدێت بەبێ قەفەز هەڵناکات..

**راوچییەکان و کەوبازەکان**
**دەنگی نێر و مێ لێک جیادەکەنەوە**

هەندێ کەوباز و راوچی و خاوەن ئەزموون هەن دەنگی نێر و مێ لە یەکتری جیا دەکەنەوە، دەنگی نێرە کەو یان قاسپەی نێرە کەو لەگەڵ قاسپەی ماکەو جودایە و دەنگی ماکەو باریک و تیژترە.

**دارە**

دارە، جێگەیەک تایبەتە بەشەرە کەو.. پاش ئەوەی کەوبازەکان ئەو شوێنە لەبارەیان بۆ شەرە کەو تەرخان کرد.. دەبێ ئەو شوێنە گۆرەپانێکی بەرفراوان بێت.. رێکی دەخەن.. ئینجا سەر لە بەیانی هەموو رۆژێکی هەینی پێش خۆرهەڵات کەوبازەکان کەوەکانی خۆیان بۆ ئەو شوێنە دەبەن.. بەمەرجێک کەوەکە هەڵسا بێت و گەرم بوو بێت، واتە ئامادە بێت بۆ شەڕ کردن. بەم شوێنە دەگوترێت (دارە) ئێستا شوێنێکی تایبەت هەیە لە پشت باخچەی خێزانیی خانزاد، کە خاوەنەکەی (وەستا عەبدولوەهاب)ە شوێنێکی زۆر لەبار و شیاوە بۆ شەرە کەو.. کەوبازەکانیش هەموو ئێوارەیەک لەم چایخانەیە دادەنیشن و هەر باسی کەو و کەوبازی و راوەکەو دەکەن، هەر هەواڵێک دەربارەی کەو هەبێت هەر لەو شوێنە پێیان دەگات.

**دیمەنی شەڕەکەو**

شەڕەکەو دیمەنێکی یەکجار دڵگیر و سەرنجراکێش و سەیر، بەتایبەتیش لەلای کەوبازەکان دروست دەکات، بۆیە سەر لە بەیانی زۆربەی رۆژانی هەینی کەوبازەکانی شارو شارۆچکەکانی کوردستان لە (دارە) ئامادە دەبن بۆ بینینی دیمەنی شەڕەکەو لە شاری هەولێر، چونکە دارەی هەولێر لە هەموو دارەکانی شارانی دیکە گەورەتر و بەرفراوانترە.

چەند مەرجێک هەیە بۆ هەستانی کەو، ئەگەر ئەم مەرجانە لەم نێرەکەوانە بەدی بێت ئینجا نێرەکەو بۆ شەڕ بەردەدرێت.

**مەرجەکانیش ئەمانەن:-**

١- سووڕان
٢- چوونە سەر پشتی ماکەو
٣- فیکە کردن

**کەوی رەش و سپی لە شەڕدا**

کەوبازەکان کەوی سپی لەگەڵ کەوی سپی و کەوی رەش لەگەڵ کەوی رەش بۆ شەڕ بەردەدەن، چونکە هاوکوفی یەکترین و هیچ یەکێکیان مافی پێشێل ناکرێت و مەغدوور نابێت، بەڵام ئەگەر کەوی سپی لەگەڵ کەوی رەش بە شەڕ بدرێ، ئەوا کەوە سپییەکە مافی پێشێل دەکرێ و دەبەزێ لە بەرئەوەی کەوی رەش بەتواناتر و قەبەترە... بۆیە دەڵێن کەوی سپی باش ناتوانێ کەوی رەشی ببەزێنێ، بەڵام بەپێچەوانەوە کەوی سپی باش دەتوانێ کەوی رەشی خراپ ببەزێنێت. لە کوردستان، چیای (قەرەچووغ) کە بە چیای بلباسان ناسراوە بەوە بەناوبانگە کە کەوی سپی و دری هەیە.

**درێژترین ماوەی شەڕەکەو**

درێژترین ماوەی شەڕەکەو لە شەڕەکەو بۆ

شەڕەکەوێکی دیکە دەگۆڕێ... جاری وا هەبووە پتر لەسەعاتێک شەڕی کردووە، کەویش هەیە ماوەی کەمتر لە دەقیقەیەک شەڕ ناکات، هەندێکی دیکەش هەیە ماوەی (١٥) خولەک هەتا نیو سەعات شەڕ دەکات و لە بەر ئازایی کەوی بەرامبەری هەیە هیچیان نابەزن.... دیارە ئەم مەسەلەیە پەیوەندی بەتوانا و لێهاتوویی کەو هەیە.. کەو لە کاتێکدا توانای شەڕکردنی نامێنێت دارە بەجێ دێڵێ و دەکەوێتە سەر لێواری بەزین.

**کەوبازەکان بە**
**سەرکەوتنی کەوەکانیان ئاسوودە دەبن**

کاتێک کەوباز کەوەکەی لە شەڕ سەردەکەوێت هەست بە ئاسوودەییەکی زۆر خۆش دەکات، لای وایە موڵکی دنیا هەمووی هی ئەوە، بەڵام ئەگەر کەوەکانیان شکەست بێنن ئەوەندە نیگەران و بێزار دەبێت رەنگە لە خەفەتان نانی نیوەڕۆی پێنەخوری.... بۆ نموونە (دەروێش ئەحمەد) کەوبازێکی دیار و بەناوبانگ بوو.. لە شەستەکاندا کەوەکەی لە شەڕێکدا بەزی... ئەوەندە نیگەرانی بوو بەشێوەیەک دووچاری ئیلفیج هات بە عەرەبانە بردیانەوە ماڵێ.. کاتێک خێزانەکەی بەوشێوەیەی بینی لە خۆیدا گوتی: چیت بەسەر هاتووە هەی لەبەرت مرم دەروێش، هەر لەسەر عارەبانەوە وەڵامی دایەوە گوتی: نازانی کەوەکەم بەزییە کەو....!

هەر کەوێک لەشەڕ ببەزێت هەتا رادەیەکی زۆر نرخ و بەهای دادەبەزێت، خاوەنەکەی بەپارەیەکی زۆر کەم لە کۆڵ خۆی دەکاتەوە، جا کەوبازەکە پێش ئەوەی شەڕە کەوەکە دەستپێبکات کە ئایا کەوەکان بۆ ماوەیەکی دیاری کراو بۆ شەڕ بەردەن و پاشان بیانگرنەوە یان بەریان بدەن نا با یەکێکیان ئەوی دیکەیان ببەزێنن، کەوی قەرەچووغ و شەنگار باشن، خورت و ئازاو بەناوبانگن، بەڵام هەندێک کەوی رەش هەن لە وانیش خورتتر و ئازاترن.

**بریندار بوونی کەو لە کاتی شەڕدا**

کاتێک لە ئەنجامی شەڕەکەودا کەوێک بریندار دەبێت یان کوێر دەبێت، خاوەنەکەی بەزەیی پێدا دێتەوە دەیگرێتەوە، زۆر جاریش دەیکاتە بیانوو دەڵێن، ئەگەر کەوەکەی من وای بەسەر نەهاتبایە نەدەبەزی و بەڵکو سەردەکەوت و کەوەکەی بەرامبەری دەبەزاند.

مەرج نییە ئەو کەوانەی بەشەڕدێن لەگەڵ یەکتر لە رووی تەمەن و قەبارە هاوکوفی یەکتر بن، بەڵام باشترە هاوکوفی یەکتر بن، ئەگینا یەکێکیان زەرەرمەند و مەغدوور دەبێت.

**نرخی کەو**

نرخی کەو هەر ساڵەو شێوەیەک لە گرانی و هەرزانی بەخۆیەوە دەبینێ، بۆ نموونە چەند ساڵێک لەمەوبەر کەوێک بە (١٨٥٠٠) دیناری سویسری فرۆشرا، کابرایەک بردییە تورکیا کەوەکەیان بۆ شەڕەکەو برد، بەڵام کەوەکە شەڕی نەکرد... خاوەنەکەی ئەوەندە تووڕە بوو بەکسەر سەری بڕی. لە هەشتاکان من کەوێکم هەبوو بەناوی کەوە (نازەنین) ماوەی چوار ساڵ بوو خۆی پاڵەوانی گۆرەپان بوو، بە شێوەیەک لە هەر شوێنێکی کوردستان کەویان بۆ هەولێر دەهێنا، لە شەڕدا دەیبەزاندن، پاشان بە (١٠٢٥) هەزار و بیست و پێنج دینار فرۆشتم، کە ئەو کات میسقاڵی زێڕ کەمتر لە (٢) دینار بوو. بە شێوەیەکی سرووشتیش ئەو کەوەی لە شەڕدا دەدۆڕێنێ و شکست دێنێ نرخی و بە های ئەو کەوە دادەبەزێت.

**چایخانەی کەوبازان**

چایخانەیەک هەیە لە هەولێر تایبەت بە کەوبازان، بەڵام کەوبازەکان و خەڵکی دیکەش کەم و زۆر هاموشۆی ئەم چایخانەیە دەکەن، چایخانە شوێنێکی گشتییە ناکرێ رێگا بە خەڵکی دیکە نەدرێت، کە هاموشۆی نەکەن.. ئەویش چایخانەی وەستا (عەبدولوەهاب)ە.

**کەوبازە بەناوبانگەکانی شاری هەولێریش ئەوانەی وەفاتیان کردووە ئەمانە بوون:-**

١- عەزیز محێدین قەساب. ٢- محەمەد حەقۆی چایەچی. ٣- یاسین مەقسود. ٤- مام مەقسودی

پەنیر فرۆش. ٥- حوسێن شکاک. ٦- بەشیری حاجی نوری. ٧- برایم دەوخوار. ٨- شەمسۆکی رەحمەتی. ٩- جەلال بۆرێ. ١٠- سەلاح عیزەت. ١١- رەسول نەقار. ١٢- عەباس شورتە. ١٣- واحیدی حەمەد مەحموودی چایچی. ١٤- حەمید قەساب. ١٥- قاسم ئاغا. ١٦- قالەی مەسیفی. ١٧- ئەسعەد بەقال. ١٨- وەهاب ئاغای قەساب. ١٩- مام عەبدوڵلا شورتە. ٢٠- مستەفا زراری. ٢١- رەشید کەبابچی. ٢٢- سەلیم لاواز قەلادزێ. ٢٣- حەبیب ئاسوری لە کەرکووک. ٢٤- حاجی بیلال موختار.

**کەوبازە بەناوبانگەکانی شاری هەولێر ئەمانەن:-**

١- مامۆستا ئیبراهیم مەلا رەسول. ٢- مامۆستا نەجات پیربال. ٣- وریای قالەی مەسیفی رەحمەتی. ٤- وەستا عەبدولوەهاب چایەچی. ٥- حاجی سوارەی قەساب نامیق. ٦- حاجی مەجید. ٧- مەغدید خۆرانی. ٨- دیداری برایم کاکۆی رەحمەتی. ٩- عەبدولخالیق کەکۆ. ١٠- عەزیز شورتە. ١١- رەشاد سورچی. ١٢- مامۆستا ئیبراهیم و باپیر کونە فلوسەیی. ١٣- عەلی سۆر. ١٤- دکتۆر جەرجیس. ١٥- سلێمان سوسەیی. ١٦- سەلمان خەیات. ١٧- خالید فیتەر. ١٨- عەبدولوەهاب شەمسەدین. ١٩- رەشۆی لەفە فرۆش. ٢٠- عەلی خۆرانی. ٢١- شامل عەساف. ٢٢- خالید مەحمەد حەقۆ. ٢٣- سالح رەشاد سورچی. ٢٤- دارا بەگ. ٢٥- مامۆستا سۆران نەجات. ٢٦- شێخ ونس کۆری. ٢٧- وەستا ئیسماعیل بێ جەرگ. ٢٨- هیمداد نازەنینی. ٢٩- غازی مام سمایل. ٣٠- هێرش شەقلاوەیی. ٣٠- مامۆستا جەمال هیرانی. ٣١- سادق نەجار. ٣٢- وەستا سەلیم. ٣٣- براتان مامۆستا مەولود خدر مەولود.

**کەوبازەکانی شارۆچکەی کۆیە:-**

١- کەریم کەوباز. ٢- تۆفیق تەنەکەچی. ٣- محەمەد جەلی. ٤-ئیبراهیم جەلی. ٥- عەزیز تاهیر چایەچی. ٦- شێروان حەوێزی. ٧- کەیفی مام حەوێز. ٨- حەربی عەزیز. ٩- ئەحمد سەمەد. ١٠- عەبدوڵلا لبادچی.

**کەوبازە بەناوبانگەکانی شارۆچکەی رانیە:-**

١- عەلی زێرینگر. ٢- محەمەد عەزیز. ٣- ئەنوەری خالە حەمەدی. ٤- سەید عەلی. ٥- سەید عومەر. ٦- کاک کامل. ٧- کەمالی حاجی قادری. ٨- جەوهەر بچکۆل.

**لەبەر ئەوەی کەوبازەکانی کوردستان پەیوەندیەکی توندیان لەگەڵ یەکدا هەیە واچاکە ناوی کەوبازەکانی شاری سلێمانیش بنووسین:-**

١- کاک حەسەنی مام عەبە. ٢- وەستا بەکر. ٣- کەمال کەرکووکی. ٤- عەلی خەلیفە. ٥- شێخە کەوباز. ٦- محەمەدی هەیبەتێ. ٧- بورهانە سوور. ٨- کاک سەدیق.

**کەوبازەکانی شارۆچکەی هەریر:-**

١- شێخ شەهاب. ٢- شێخ تەلعەت. ٣- کاک عەدۆ. ٤- گەنجۆ ئەحمەد خان. ٥- کوردۆ. ٦- خەلیل کاشیچی. ٧- عەباس قەساب. ٨- خەسرۆ بارزانی.

**کەوبازە بەناوبانگەکانی شارۆچکەی شەقلاوە:-**

١- وەستا شێرزاد. ٢- خەسرۆ حەریق. ٣- کاکۆ چایەچی. ٤- مەجیدی رەشید چایەچی.

**راوچییە بەناوبانگەکانی شاری هەولێری دێرین:-**

١- غەفور نازەنینی. ٢- محەمەد نازەنینی. ٣- هیمداد نازەنینی. ٤- جەوهەری مام مەولودی. ٥- تاهیر و زاهیر و خەلیل و جەلیل لە گوندی قیرژە. ٦- کاک مزەفەر حوسێن. ٧- مامە سۆرێ مام عوسمان. ٨- کاکۆ. ٩- وەستا ئەحمد نەقار. ١٠- کاک مەجید چاورەش. ١١- عەبدولرەحمان بەرید. ١٢- مەهدی سەلاح. ١٣- نەجات و خەسرۆ گراوی. ١٤- کاک بەهجەت. ١٥- هیمدادی کاکە سوار. ١٦- حاجی خدر. ١٧- کاک بەهادین نوری. ١٨- شێخ عوسمان ئاوارە و فەتاح ئاوارە. ١٩- فارس و دەروێش قادر و کاک فاخر خۆرانی. ٢٠- مامۆستا سابیر سورچی.

٢١- حەسەن سورچی و تەها سورچی. ٢٢- نەزیر قیرژەیی. ٢٣- وەستا عەبدوڵلا محەمەد حەسەن کاشیچی. ٢٤- کاک مەحموود بیریژی و خدر بەگ. ٢٥- سالار. ٢٦- بورهان و کاک بەهرام. ٢٧- سەردار ئەسپیندارەیی. ٢٨- نەسرەدین. ٢٩- رەشید نازەنینی. ٣٠- ئەکرەم مەعروف ئۆخسری.

**ئەو کەوبازانەی کەوا وازیان هێناوە لە کەوبازی:-**

١- کاک محەمەد ئاقوبانی. ٢- کاک سەدرە. ٣- شاکر قەساب. ٤- کەریم حەریق. ٥- کەریم پاقلاوەچی. ٦- خەلیل کاوانی. ٧- وەستا عەلی سۆر سێوەکەیی. ٨- حاجی سلێمان قیرژەیی. ٩- وەستا رەئوف. ١٠- وەستا عارف. ١١- وەستا شەفیق. ١٢- خەلیل محەمەد حەقۆ. ١٣- جەردیس باشچاوەش. ١٤- سەدیق شیری قوتی. ١٥- بەکرە سۆر. ١٦- باوەکر سماقوڵی. ١٧- یوسف مەنگور. ١٨- مامۆستا فازڵ شەهاب. ١٩- مامۆستا نەجات شەهاب. ٢٠- دینۆ بەگزادە لە شاوێس.

**ئەوانەی کەو دەکڕن و دەفرۆشن:-**

١- مەلا فوئاد کۆیی. ٢- بارزان حەمید قەساب. ٣- موحسین سماقوڵی. ٤- هیمداد نازەنینی.

**ئەوانەی قەفەزی کەو دروست دەکەن:**

١- کاکە شەلی کۆیی. ٢- وەستا غەفور کۆیی. ٣- سەلاحی عەلاوەدینی. ٤- دلشادی مام سابیری. ٥- وەستا ئیدریس لە چوارقورنە. ٦- وەستا عومەر حاجیاوەیی. ٧- حەکیم و عەدنان لە چوار قورنە. ٨- وەستا حەسەنی قەڵادزەیی- ٩. وەستا قادری قەڵادزەیی- ١٠. وەستا نەجات نەجار- ١١. وەستا زراری مامە رەش- ١٢. کاک عەزیز فەقێیانی- ١٣- مامۆستا عەبدولرەحمان کۆیی.

**هەندێک زاراوە سەبارەت بە کەو**

ئەم جۆرە زاراوانە لە ناو کەوبازان باو بوو کە بەکورتی لێکیاندەدەینەوە: -کەوی فسۆس، کەوی کۆڵچی، رەسەنە کەو، کەوی شلتاغ...

**کەوی فسۆس:** کاتێک ماکەوەکانی چیا کورک دەبن.. نێرە کەوەکانیان بێ ماکەو دەمێننەوە لەناو خۆیان نێرە کەوێک هەڵدەبژێرن و بە هەموویان دەچنە سەر پشتی و لەسەری بەشەڕ دێن. بەو کەوە دەگوترێت فسۆس.

**کەوی کۆڵچی:** هەندێ کەو هەن لە شەڕدا بەرامبەر کەوەکەی دی راناوەستن، بەڵکو هەر غاردەدەن و ناشبەزێ.. کەوەکەی دی بەدوای غار دەدات بەم جۆرە کەوە دەڵێن کەوی کۆڵچی.

**کەوی رەسەن:** کەو بە رەسەنە و بە شوێنە، شوێن هەیە کەوی باشی لێ هەڵدەکەوێت، وەک: چیاکانی نازەنین، گراو، هەنارە، دەو بەستۆرە، چیای سەفین، ژەنگار، کولک، قەرەچووغ، بەنی هەریر.. هتد، شوێنیش هەیە باش و رەسەنی لێ هەڵناکەوێ، وەک ناوچەکانی کوێستان و قیرژە.

**گێلەکەو:** گێلەکەو لە شوێنێک دەبەزێ و لە شوێنێکی تر شەڕ دەکات چ ماکەوی لێ بمرێ و چ لێی بگۆڕێ کاری تێناکات و زووش دەکەوێتە داوی راوچیان.

**کەوی شلتاغی:** کەوێکی من بوو لەبەر گەورەیی و زەبەلاحی ئەم ناوەم لێنابوو، هەتا ئەو رۆژەی مرد لەشەڕە کەودا نەبەزی.

**راوەکەو**

**شێوەکانی راوەکەو**

بەم شێوازانەی خوارەوە کەو راو دەکرێن:

١- راوی سەر نێرەکەو لە بەهاراندا.

٢- راوی سەر ماکەو لە سەرەتای وەرزی هاویندا.

٣- راوی سەر کانی لە کۆتایی وەرزی هاویندا.

٤- راوی بەتفەنگ و بە دێوجامە لە وەرزی پایزدا کاتێک کەوەکان دەبنە رەوە.

راوکردنیش بە دێوجامە گوناهێک و تاوانێکی زۆر گەورەیە دەرهەق بەو باڵندە جوان و بێ ئازار و دەنگخۆشە ئەنجام دەدرێت.

# کۆتربازەکانی هەولێر

شوان سەرابی

پایتەختی هەرێمی کوردستان وەکو هەموو پایتەختەکانی وڵاتانی دنیا مرۆڤی وەهای تێدایە، کە حەز لە بەخێوکردنی تەیر و تواڵ و ئاژەڵی کێوی دەکات و هەندێک کەسیشی تێدا هەیە کە وەک پیشەیەک ئەم حەز و ئارەزووەیان پەیڕەو کردووە و بژێوی ژیانی خۆیان و ماڵ و منداڵیان پێ دەستەبەردەکەن.

### چایخانەی ئارەزوومەندەکانی کۆتر

چایخانەی ئارەزوومەندەکانی کۆتر- ناوەڕاستی بازاڕی قەیسەری لە شاری هەولێر لە تەنیشت بازاڕی زێرینگرانە و خاوەنەکەی - بەڕێز (عەلی پۆلیس)ە و ئەو کەسانەی، کە کۆتری عەردی بەخێو دەکەن لەو چایخانە دادەنیشن و هەر جارێ لەسەر کۆترێک مجادەلەی دەکەن و کۆتری وەرزی (موسم) دەستنیشان دەکرێت.

### بازاڕی ئارەزوومەندانی کۆتر لە هەولێردا

جگە لە چایخانەی ئارەزوومەندانی کۆتر، بازاڕێکی گەورەی کڕین و فرۆشتنی کۆتر و بولبول و ئاژەڵی کێوی و..تاد هەیە لە شاری هەولێر، کە سەرەتا ئەم بازاڕە لە تەنیشت چایخانەی ناوبراو بوو، دواتر بەهۆی گەورەبوونی شاری هەولێری لەساڵی (١٩٨٧) بۆ مەیدانی مریشکان گوازرایەوە لە گەڕەکی خانەقا، بەو دواییەش واتە لە ساڵی (٢٠٠٠)یش ئەم بازاڕە واتە مەیدانی مریشکان و کۆتربازی بۆ شوێنی گومرگی کۆن - کە دەکەوێتە نێوان گەڕەکی سەیداوە و سێتاقان - گوازرایەوە.

### کێن ئەوانەی کۆتری عەردی بەخێو دەکەن؟

بەڕێز (عەلی پۆلیس) خاوەن چایخانە سەبارەت بە کۆتر بازی و ئارەزوومەندانی شاری هەولێر گوتی: چەلەبییەکان، ئاغاکان، پیاوماقووڵانی شاری هەولێر زۆربەیان ئەم ئارەزووەیان هەبوو، لەوانە: (حاجی خورشید ئەمین، عەزیز محێدین قەساب، فەرید عەبدولخالیق چەلەبی، داود ئاغا، حاجی فایق بەزاز، نورەدین سوار ئاغا، عوسمان کارگەچی، وەستا رەفعەت، رەئوف بەنا، حاجی رەفعەت کورەچی، مام عەبۆ کورەچی..تاد)

### کۆتربازی
### ئایا کۆتر بازی و ئارەزوومەندانی کێیە؟

(کەریم فەتحی)، کە لە ساڵی (١٩٥٦)، لە گەڕەکی تەعجیل لە هەولێر لە دایک بووە و نزیکەی (٣٥) ساڵە کۆتری ئاسمانی بەخێو دەکات گوتی: کۆترباز واتە کۆتر ناس، و بەو کەسانە دەگوترێت کۆترباز، کە کۆتری باش و خراپ دەناسن و بەخێوی دەکەن، کۆتر بازیش ئیرەیی و چکۆبسییە، چونکە هەرکەس دەیەوێ بۆ خۆی کۆتری باشی هەبێ، ئەمەش تەنیا بۆ تێرکردنی هەوەس و ئارەزووە..!

### جۆرەکانی کۆتر

(عادل خەلیل) کە لە ساڵی (١٩٤٣) لە دایک بووە، لەبارەی جۆرەکانی کۆتر گوتی: کۆتر دوو جۆری هەیە (عەردی و ئاسمانی)، کە کۆتری عەردی بۆ جوانییە و هی ئاسمانیش بۆ فڕینە و مەرجی لەسەر دەکرێ.

هەروەها گوتی: کۆتری عەردی بریتییە لە (کۆتری قەرغاوی، کۆتری ڕەشی سەرسپی، کۆتری شینی سەرسپی، سپی سادەی

نەجەفی..تاد) كۆتری عەردی نرخیان گرانە و هی وا هەیە نرخی دەگاتە (٥٠٠٠) دینار، ئەو كەسەی بیەوێ كۆتری عەردی بەخێو بكا، دەبێ ژوورێكی بۆ تەرخان بكات و رۆژێ (٣) جار ئاوی بەردەمیان بگۆرێت، هەفتەی جارێكیش ژێریان پاك بكاتەوە. كۆتری عەردی هیچ ئاژاوەیەكی بەدواوە نییە، ئەوە نەبێ كۆتربازی، جار جارە لە چایخانە لەكاتی مجادەلە لەسەر كۆترێك رووبەرووی دەمەقالی دەبێتەوە. بۆ ئەم مەبەستەش حەكەمێكمان هەیە، واتە هەر جارێك لەناو خۆمان حەكەمێك دەستنیشان دەكەین، ئەو چ بریارێك بدا، لە كۆتاییدا مجادەلەكەی پێ یەكلادەكەینەوە.

**سیفەتەكانی كۆتری عەردی**

كۆتری باش هەر رەنگێك بێت لە (رەنگ و دەنووك، كورتی و درێژی، قەپلاخ و نیوچەوان، چەحچول، قەتحی بن سینگ،..تاد)دا بەرجەستە دەبێت.

**كۆتری ئاسمانی**

جۆرەكانی كۆتری ئاسمانیش زۆرن: عەمبەری، سیاو، تار، ئیرانی، فاو، ورفە، زاجل، حەلەب، شام، هنداوی، یاهو..تاد) ئەمانە و چەندانی دیكەیە كە جۆرەكانی كۆتری ئاسمانی دەگەرێتەوە و (زاجل) جاران نامەی دێنا و دەبرد. یاسا و رێسای كۆتری ئاسمانی باش دەبێ كۆتر نیو كاتژمێر بە ئاسمانەوە بێ و جوان بفرێ، كە لە باكوور رۆیشت دەبێ لە باشوور بێتەوە و باڵ نەكوتێ.

**كۆتر چۆن كەوی دەكرێ؟**

كۆتر ئەو كاتە هەوڵ دەدرێ كەوی بكرێ، كە توانی بفرێ لە ماڵەوە كەمێك دووری دەخەینەوە و بەرەڵلای دەكەین، ئینجا بۆ خۆی دێتەوە و هەمدیس جارێكی دیكە كەمێك دوورتر بەرەڵا دەكرێ و دێتەوە، هەروەها هەتا ئەو شوێنەی بۆ خۆمان مەبەستمانە دووری دەكەینەوە و رۆژ نا رۆژێ ئەمە پراكتیك دەكەین هەتا فێردەبێت. ئەمە سەرەرای ماندووبوونێكی زۆر دەرامەتێكی باشیشی گەرەكە و تەنیا بۆخۆ هەڵكێشانە بۆ ئەوەی بڵێی كۆترێكم هەیە لە فلانە شوێن بەرەڵلای بكەی دێتەوە و كەوی بووە.

**بازرگانی كۆتر..!**

بازرگانی كۆتریش هەیە، بەلام لە بازرگانی كردنی كۆتردا كریار و فرۆشیار بەدەگمەن قازانج دەكەن، چونكە كۆترەكان زۆربەیان كەوی دەبن، كە دەفرۆشرێن یەكەمین شت ئەوەیە، كە بەرەڵا دەبن، بۆ ماڵی خاوەنەكەی دەگەرێنەوە لە هەر كوێیەك بێت، تەنانەت لە نێوان دوو شاری گەورەشدا بێت، لە لایەكی دیكە. (سعود) كە لە ساڵی (١٩٥٢) لە هەولێر لە دایك بووە و خۆی بە كۆنترین كۆترباز دادەنێ، دەڵێ: بازرگانی و كرین و فرۆشتنی كۆتر بۆ زەوق و هەوەسە. كە كۆترێكی دەكرێ زۆر جوانە ئەگەر كەویش نەبێ و نەرواتەوەش، دواتر دەبینێ هێلكە ناكا یان نەزۆكە یا تەمەنی گەورە بووە و بەسەرچووە، كە بە سەر كۆتردا دەفسێ هێلكەكە بەتاڵ دەبێت، لەو حاڵەتەشدا كریار دڵی سارد دەبێ و بە زەرەر دەیفرۆشێتەوە و هەوڵدەدا كۆترێكی دیكە بكرێت.

**قازانج و زیانی كۆتر**

بۆچوونێك دەڵێت: كۆتر بەخێو كردن مرۆڤ خەریك دەكاو ناهێڵێت بەبێ كاری بسورێتەوە و بیر و خەیاڵی بۆ شوێنی پروپوچ بروا و لە ماڵەوە بۆخۆی چەند كاتژمێرێك خەریك دەبێت، بەلام بۆچوونێكی دیكە لەگەڵ ئەم رایەدا هەیە و دەڵێت: وا باشە منداڵ لەو سەردەمەدا فێرە كۆتر بەخێوكردن نەبێت، چونكە كاری تێدەكات و وای لێدەكات پارە بە هەدەربدات و جاری وا هەیە ئەم مەراقە وای لێدەكات لە رێگای نایاسایی و ناشەرعیەوە پارە پەیدابكات و بچێ كۆتری پێ بكرێ و دەرو دراوسێیان هەراسان و بێزار بكات.

**كۆتر بەدێومە یان نا؟**

نازانرێ تا چ رادەیەكیش ئەم گوتەیەی لە سەرەوە ئاماژەی بۆ كراوە راستە یان نا، ئەدی ئەگەر چەوتە بۆ گوتراوە و زۆربەی كۆتربازەكان لە وەلامی ئەم پرسیارە سەرسام دەبن و پێیان راست نییە. ماوە بڵێین دوو جۆرە كۆتر هەیە: عەردی و ئاسمانی، یەكەم لە هی دووەم باشترە، چونكە خەڵك بێزار ناكات و كۆترەكەش هەست بە ئازار ناكات و حەزو ئارەزووش تێر دەكات.

# کۆتر و بولبول

محەمەد سەعید کوردە

هەر مرۆڤێک لە ژیان جۆرە ئارەزوویەکی هەیە، جا یەکێک لەوانە چۆنیەتی پەروەردەکردن و ماڵیکردنی تەیر و تواڵ و پەلەوەرە، ئەو حەز و ئارەزووەش لە زۆربەی خەڵکیدا هەیە، ئەوانە لە هەموو تەمەنێکدا هەوەسیان بە پەروەردەکردن و ماڵیکردنی ئەو پەلەوەرانە دێت، لەوانەش کۆتر و بولبول، کە دوو باڵندەی جوان و بەرچاون و هۆگران و هەوادارانێکی بێ ئەندازەیان هەیە، ئەو دوو باڵندەیەش جگە لە جوانییە بەرچاوەکەیان سەودا و کڕین و فرۆشتنێکی زۆریان پێدەکرێ.

### جۆرەکانی کۆتر

حوسامەدین نەسرەدین، کە بۆماوەی (٢٥) ساڵە کۆتر بەخێودەکات و خۆشەویستیی ئەو باڵندەیە لەگەڵ خوێنی تێکەڵ بووە، لەبارەی جۆرەکانی گوتی: "کۆتر بەشێوەیەکی گشتی دوو جۆری هەیە، یەکێکیان پێی دەگوترێ کۆتری عەردی، واتا ئەو جۆرەیان توانای فڕینی کەمە و تەنها بۆ جوانییە، ئەوی دیکەش کۆتری فڕینە، جا ئەوەی من لە دووەمیانە کە کۆتری فڕینە، ئەوانیش چەند جۆرێکیان هەیە، وەک زاجل و تار و ئێرانی و مسەجەم و ولفە و شامعی و سیا و نەجەفی و دەمکاش و... هتد.

### کۆتری زاجل

کۆتری زاجل سیفەتێکی زۆر سەیر و تایبەتی هەیە و لەگەڵ جۆرەکانی دیکەی کۆتر تەواو جیاوازە، چونکە ئەوەیان پێشبڕکێی پێدەکەن لەنێوان شارەکاندا، هەر بۆیە نرخەکەشی لە نێوان (٣ تا ٤) هەزار دیناری سویسرییە، کەچی نرخی کۆترەکانی دیکە تەواو جیاوازە، کۆتری زاجل بە کۆتری نامەبەریش ناسراوە و دەتوانێ نامە لە شارێک بۆ شارێکی دیکە ببات، هەر بۆیەشە ئەو جۆرەیان داواکاری زۆری لەسەرە.

### کۆتری قەللاج

کۆتری قەللاج خراپترین جۆری کۆترە و خەڵکان بۆ سەربڕین دەیکڕن و نرخەکەشی لە نێوان (١٥ - ٢٠) دینارە، بە پێچەوانەی کۆتری چلی و شامعی و سیا کە جووتی بە (١٠٠٠) دیناری سویسرییە و هەمیشە لەلایەن کۆتر بازەکانەوە داواکاری زۆری لەسەرە.

### هێلکەکردن و خواردنی کۆتر

کۆتر بە گشتی هێلکە دەکات و بە (١٨ تا ٢١) ڕۆژ دەیکاتە فەرخە، بەڵام زۆرجاریش هێلکەکە پیس دەکات، بە تایبەتی ئەگەر دەستکاری هێلکەکە بکەی یان لە شوێنێک بۆ شوێنێکی دیکە بیگوازییەوە، سەبارەت بە خواردنی کۆتریش ئەوە دەڵێن کۆتر بە گشتی گەنم و جۆ و دانەوێڵە دەخوات و هەندێک جاریش نانەرەقی بۆ دەخەنە نێو ئاوەوە تا نەرم بێت، ئینجا دەرخواردی دەدەن.

**کۆتر گرفت و کێشەی زۆرە**

ئەوانەی بە بەردەوامی کۆتر بەخێودەکەن هەمیشە گرفت و کێشەیان هەیە، چونکە کاتێک کۆترەکەت دەفرێ و لە شوێنێکی دیکە دەنیشێتەوە، جا هی وا هەیە دەستی بەسەردا دەگرێ و نایداتەوە، بۆیە کۆتر بازەکان دەڵێن: ئێمە چەند جارێک کۆتری خۆمان بە پارە کڕیوەتەوە.

**کۆتری عەردی**

جۆری دووەمی کۆتر وەک لە سەرەوە رۆشناییمان خستەسەر، کۆتر عاردییە. وەک "سەیفەدین هەولێری" دەڵێ: ئەو جۆرەیان تەنها بۆ جوانییە و نافرێ، ئەو جۆرەشیان بە زۆری رەنگیان شین و رەش و زەرد و سوورە، ئەوانەی لە سالانی حەفتا و هەشتاکان سەودا و مامەڵەی ئەو جۆرە کۆتردیان دەکرد و بە بەردەوامی بەخێویان دەکرد، ژمارەیەکی دیاریکراو بوون، وەک عەلی پۆلیس و خالید محەمەد حەقۆ و مەغدیدی برای و حاجی خورشید و پیربال مەلا نادر و خدر و رەسول و سلێمان باخچەچی و زولفەقار شاکر و گەلێکی دیکە، ئەوانە چایخانەی تایبەتیان هەبوو کە لێی دادەنیشتن.

**کۆترو لە هێلکە چوونەوە**

زۆرجار دەبینین کۆتر لە هێلکە دەچێتەوە، واتا هێلکە ناکات، ئەویش هەندێک جار هێلکەدانی بەز دەگرێت و هەندێ جاری دیکەش کۆتر بازەکان بە مەبەستی زەرەر گەیاندن بە خاوەن کۆترەکە کرکراگەی قوونی کۆترەکە تووشی شکست دەکەن، ئیدی کۆتر بازەکان بە (زیوان) چارەسەری ئەو حالەتە دەکەن کە دانەوێڵەیەکی یەکجار بچووکی رەنگی شین باوە، هەر بۆ زانیاری زیاتریش هەموو کۆترێک (٢ تا ٣) هێلکە دەکات و تەمەنی کۆتریش پتر لە (١٠) ساڵە، من خۆم کۆترێکم هەبوو (١٣) ساڵ ژیا.

**بولبول و جۆرەکانی**

بولبولیش وەک کۆتر، هەوادارێکی زۆری هەیە و دەتوانین بڵێین ئەمڕۆ زۆر ماڵ بۆ جوانی بولبول بەخێو دەکەن، چونکە بە راستی جوانییەکی ئەفسووناوی بە دیمەنی ماڵ دەبەخشێت، لەم بارەیەوەش کازم جەبار خەیات، کە یەکێکە لەوانەی سالانێکی زۆرە بولبول بەخێو دەکات، بۆیە زانیارییەکی زۆری لە بارەی ئەو باڵندەیە هەیە، ئیدی لە بارەی جۆرەکانی بولبول گوتی: تیورلحوب و فنجس و خورمایی و کەناری و غندور جۆرەکانی بولبولن، جگە لەوەی تیورلحوبیش چەند جۆرێکی هەیە، وەک هۆڵەندی و سویدی و ئوردنی.

**بولبول چی دەخوات**

بولبولیش وەک زۆربەی باڵندەکانی دیکە هەندێک جۆری دانەوێڵە دەخوات، وەک هەرزن و هەندێک جاریش کەرەوز و ناوکە سەموون، دوای ئەوەی لەنێو ئاودا وەک پەمۆ دەتوێتەوە.

**بولبول چەند هێلکە دەکات**

بولبول هەتا (٩) هێلکە دەکات و بە ماوەی (٢١) رۆژ هێلکەکە دەکاتە فەرخە، پاشان قاچی فەرخەکان لێک دەئاڵێنێ، دیارە ئەوەشیان بۆ ئەوەیە لە مەترسی کەوتنە خوارەوە و لێک جیابوونەوە بیانپارێزێت، بولبولیش وەک هەندێک لە باڵندەکانی دیکە دەست لە هێلکەکەی بدەی پیسی دەکات و هەڵی ناهێنێ.

**نرخی بولبول چەندە؟**

نرخی بولبول بە پێی جۆری بولبولەکە دەگۆرێت، بۆ نموونە بولبولی وا هەیە نرخەکەی لە نێوان (٣٠٠ - ٤٠٠) دینار دایە، هی واش هەیە کەمترە، بۆیە ئەوەی هەواداری بولبولە لە کرینی ئەو باڵندە قەشەنگەدا پارە و دراوی نایەتە بەرچاو، هەر بۆ زانیاری زیاتریش زۆرکەس ئەو باڵندەیان بۆ دیاری و خەڵات بەکار هێناوە.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر، ژمارە (١٥)ی، ٢٠٠٥ بلاوبۆتەوە.

